# ئینسکلۆپیدیای هەولێر

# (ئەربیل)

چاپی یەکەم ٢٠٠٩

# مەلا مستەفای بارزانی
# ١٩٠٣-١٩٧٩ز

**پ. د شوکریە ڕەسووڵ**

**پێشەکی:**

سەدەی بیستەم بەسەدەی بووژانەوەی کورد و بزووتنەوەی نەتەوەیی لە مێژووی هاوچەرخی کورددا دادەنرێت، کە گەلێ شۆڕش و ڕاپەڕین و بەرخوودانی گرتۆتە خۆ، گەلێ کەڵەمیران و شۆڕشگێڕانی تیا هەڵکەوت لە نموونەی شێخ سەعیدی پیران، شێخ عەبدولسەلام بارزانی و شێخ مەحموود و قازی محەمەد و مەلا مستەفای بارزان، ئەمانە شۆڕش و ڕاپەڕیان لە پێناو ڕزگارکردنی نەتەوەی کورد و مافی خودموختاری و سەربەخۆییان بەرز کردۆتەوە، ناویان لە پاڵ گەورە پیاوان و سیاسەتمەدارانی جیهان چۆتە ناو لاپەڕەی مێژووەوە و مێژووش بە شانازییەوە ناو و هەڵوێست و خەبات و کردارە مەزنەکانیان یاد دەکاتەوە.

بازنەی باسەکەمان کە شوێنی دیاری لە مێژووی ڕۆژهەڵات و کوردستاندا داگیر کردووە، بارزانی یاخود مەلا مستەفای بارزانە کە



مێژوو و خەباتی پڕ سەروەری لەگەڵ ناوی کورد و کوردستاندا یاد دەکرێتەوە، و وەک ڕەمز و هێمایەکی سەرۆکی نەتەوەی کورد ناوزەند دەکرێ، بەوەی هەر لە تەمەنی هەرەتی ژیانیدا، تێکەڵ بە دۆزی

ناسیۆنالیستی نەتەوەکەی بووە تا ڕۆژی کۆچکردنی، تاڵی و سوێری و ساردی و ئاوارەیی و غووربەتی چەشتووە، بەرەبەرەکانی ڕژێمە دیکتاتۆرییەکانی یەک لە دوای یەک کردووە، بڕوای بە هێزی بەگەلەکەی بووە، خۆڕاگر و پشوودرێژ و بێ فیز و ئارام بووە، بێ جیاوازیی ڕەگەز و ئاین گەلەکەی لەخۆ نزیک خستۆتەوە و کەسیەتیی عەسکەریش لە پاڵ ئەمانەدا بووە. هۆی ئەوەی ودک سەرکردایەتیی ئازا دەردەکەوێت. ئەڵبەتە خوێندنەوەی ژیانی سەدساڵەی بارزانی کە دوو کۆنگرەی (نەوەد ساڵە و سەد ساڵەی) بۆ گێڕا و لە هەموو ڕوویەکەوە گەلێ لێکۆڵینەوە لە ژیان و خەباتی سیاسی و ڕۆڵی کۆمەڵایەتی و دیبلۆماسی لەسەر کراوە. ئەمانە گەواهی ئەوە دەدەن بارزانی وەک سەرکردەیەکی مێژووی ڕۆڵی خۆی بینیوە. هەر لە سۆنگەی ئەو دەورەی بارزانی بینیویەتی دەتوانین

لێکۆڵینەوەکەمان بکەینە چەند تەوەر یاخود بازنەیەک کە بەشێوەیەکی چڕ و پڕ و کورت و سنووردار بخەینە ڕوو:

١- بازنەی خێزان و ژینگە و ژیان.
٢- بازنەی نەتەوەیی و شۆڕشەکان.
٣- چوونی بارزانی بۆ مەهاباد.
٤- کۆڕەوییە مێژووییەکە و چوونی بۆ سۆڤیەت.
٥- گەڕانەوە و هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوول.
٦- نسکۆی ١٩٧٥ و پیلانی جەزایر.

### ژیانی بارزانی و ژینگەی (١٩٠٣، ١٩٧٩ز)

بەپێی ئەو سەرچاوە و دیکۆمێنت و کتێبی جۆراوجۆر ئەرشیف و کەلەپوورێکی گەورە لە ژیانی بارزانی و خێزانە بارزانییەکان و ڕۆڵیان تۆمار کراوە.... ئەو سەرچاوانە ئەوە دەخەنە ڕوو کە مەلا مستەفا لە ژینگەیەکی شۆڕشگێڕیدا لە ناوچەی بارزان سەر بەشاری هەولێر لە ١٩٠٣/٣/١٤ هاتۆتە دونیاوە و خۆی و بنەماڵەکەیان زوڵم و زۆرداری و ژێردەستەیان قبووڵ نەکردووە، ئەوان لە پاڵ ئایین و ڕێبازەکەیان ئامانجێکی نەتەوەییان هەبووە و بۆ کورد تێکۆشاون و بیری نەتەوەییان لە ڕێگەی (تەکیەی بارزان) بڵاو کردۆتەوە، چ لە ڕووی چاکسازیی کۆمەڵایەتی یا نەتەوەییەوە بێ کاریان لە بارزانی نەمر کردووە،



بەتایبەتی ئەو یەکسانییەی لە نێوان کەسانی بێ جیاوازی ڕەگەز و ڕەنگ و ئایین ئامانج خزمەتکردن بوو، لە ڕێگەی کاری چاکە و هاریکاریی یەکتری و یارمەتیی لێقەوما و هەژاران و جیاوازی نەکردن بوو، لە نێوان گەورە و بچووک بووە و لە هەموو چین و توێژێک سەردانی کردووە. ڕێزی لێ ناون، بەڵێ ئەو گیانی نەتەوەیی و باوەڕبوون بە میللەت و بەخوا وەک هێزێکی تەواوکەر پەرەدەستێن و بازنەکە فراوانتر دەبێت بەرەو هێزی بەرەنگاربوونەوە لە زوڵم و زۆرداری هێزی داگیرکەری ئینگلیز و دەسەڵاتی تورک بەرامبەر بنەماڵە و ئەرمەنییەکان و کورد هەر بۆ نموونە ساڵی ١٩١٩ بارزانی بۆ یارمەتیی شۆڕشەکەی شێخ مەحموودی نەمر بە هێزێکەوە ڕوو لە ناوچەی (دۆڵی بیاو) و ناوچەی باڵەک دەکەن و لە ڕێگا تووشی چەند پێکدادان لەگەڵ ئینگلیز و سەرۆک هۆزەکان دێن...

بەڵام تا گەیشتنە سلێمانی شۆڕش کۆتایی هاتبوو و شێخی نەمر بەدیل گیرابوو...

- ساڵی (١٩٢٠-١٩٢١) بارزانی بەخۆی و هێزێک دەچێتە هاواری (ئەندرانیک) پاشای ئەرمەنی لە تورکیا کە دەسەڵاتی تورکیا ڕەشگیر و قەتل و عامی ئەرمەنییەکانی دەکرد، بارزانی توانی ئەندرانیک و خێزانەکەی و چەندین ئەرمەنی ڕزگار بکات و تا سنووری سووریا دەیانگەیەنن و لەو پێناوەدا (١٤) شەهید دەدەن بۆ گیانی ئەم هاریکاری و مرۆڤایەتییە چەندین سەرچاوە باسی ئەو ڕووداوە مێژووییە دەکات...

یەکێ لەو سەرچاوانە کاتێ بارزانی نەخۆش دەکەوێ و بەتایبەتی دوای نسکۆی (١٩٧٥) ڕوو لە ئەمەریکا دەکات و بەیاوەریی چەندین کەس چاوی بەنەوەی (ئەندرانیک) دەکەوێ و لە زاری کوڕەکانیانەوە ڕووداوە تراژیدییەکە و

دەوری بارزانی دەگێڕنەوە.

- هەر لە سۆنگەی بازنەی نەتەوایەتی و مرۆڤایەتیی بارزانی هەمیشە باوەڕی بەزمانی یەکگرتن و کۆکردنەوە و نەخشەکێشانی چارەنووسی دەکرد، لە پێناو کۆمەڵبوونەوەی پەرش و بڵاوی پەراگەندەیی نەتەوەیی... هەر بۆیە بازنەکە فراوانتر دەبێ بەتایبەتی لە ساڵانی سییەوە کە توانی پەیوەندی بە کۆمەڵ و ڕێکخراوەکان بکات و لە هەمان کاتیشدا دەوری لە ڕاپەڕینەکانی بارزاندا لە (١٩٣١، ١٩٣٢...... ١٩٣٦)دا و پاشانیش لە شۆڕشی بارزان (١٩٤٣-١٩٤٥)دا هەبووە کە بووە هۆی دەربەدەری و ئاوارەیی و ڕووکردنە کوردستانی ئێران و بەشداری و کۆمەککردن بەشۆڕشی حکوومەتی کوردستان و وەرگرتنی پلەی (جەنەراڵ).

**بارزانی و کۆماری کوردستان (مەهاباد):**

هەڵوێستی بارزانی و فراوانبوونی بازنەی فیکگری و نەتەوەیی و مرۆیی لەو چاوپێکەوتنەدا دەردەکەوێت کە لە گۆڤاری هاواری نیشتمان (١٩٤٦) لەگەڵی کراوە کە چ زوڵمێک لە نەتەوەکەی کراوە و ئامانجی بەرگریکردن و کۆڵنەدان بووە تا دوایین نەفەسی، ((ئەو زوڵمە میللەتی مەی وەئاگادار کرد هەتا ئاخرین نەفەسی لەگەڵ ئیستیعمار ملە بکەین)).

ئامانجی بارزانی ئازادکردنی کورد لە ژێر دەستی ئیمپریالیزم و دامەزراندنی دەوڵەتێکی یەکگرتووی کورد لەو چاوپێکەوتنەی لە گۆڤاری هاواری نیشتمان ژمارە (١) ساڵی ١٩٤٦ بەناوی (موحاسەبە لەگەڵ جەنابی مستەفا بارزانی) دەردەکەوێ. دەڵێ. ((من بۆ خۆم لەو ڕێگەیەدا تاڵیبی هیچ مەقامێک نیم، بەبێ قەید و شەرت ئامانجی من ئازادکردنی عێراقە و سەربەخۆیی و.. لە دواییدا ئازادکردنی ئەو کوردانەی کە لە ژێر دەستی بێگانەن و دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئیتحادی کورد))[1].

- دەوری بارزانی لە کۆماری کوردستاندا دەورێکی باڵای هەبووە بەتایبەتی هەر بەگەیشتنیان ڕێزێکی زۆریان لەلایەن خودی پێشەوا قازی محەمەد لێ گیراوە... هەر بۆیە بەدامەزراندنی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و ئەفسەرە کوردەکانی کوردستانی عێراق و جەنگاوەرانی بارزانی بوونە پشتگیریی تەواوی کۆمار و باشترین بەڵگە ئەو وتارەی بارزانی بوو کە لەلایەن (محەمەد قودسی لە هۆڵی ئەنجوومەنی فەرهەنگی مەهاباد) پێشکەش کرا کە بەیەکەم وتاری بارزانی لە کۆماری مەهاباد دادەنرێت کە باسی لە ڕێکەوتنی بارزانییەکان لەگەڵ پێشەوا قازی محەمەد و هانیان بۆ ڕێزی کۆماری کوردستان دەکات. بەمەبەستی گەشەپێدانی دیموکراسی، گەشەپێدانی باری ئابووری، دابینکردنی ئازادیە دیموکراتییەکان و هەوڵدان بۆ ئازادکردنی بەشەکانی تری کوردستان و سەربەخۆیی گەلی کورد لە چوارچێوەی کوردستانی مەزندا.[2]

- بەڵێ پاش ئیعلانکردنی کۆماری کوردستان مستەفا بارزانی بووە سەرلەشکر و بەرپرسی هێزی



لەشکر، سێ تیپیش بە سەرۆکایەتیی هەرسێ ئەفسەری باشووری کوردستان (بەکر عەبدولکەریم، مستەفا خۆشناو، مرحاج، رەئیس عیزەت) کاتێ شەڕ رووبەرووی حکومەتی کوردستان بۆوە هێزەکان و پێشمەرگە و ئەفسەرەکان شوێنیان بۆ دانرا و شەڕەکانی (مامە شا، مل قەرەنی، قاراوا))یان بەرکەوت و سەرکەوتنی مەزن و سەرسووڕهێنەریان بەدەست هێنا و چەندین دیلیان گرت و چەک و تەقەمەنییەکی زۆریان دەست کەوت[3].

- سەرباری ئەم ئەرکانە بارزانی هەمیشە لە هێزەکانی پێشمەرگەی لە بەرەی شەڕی (سەرا) رادەگرت و فەرمانی بۆ دەردەکردن کە بەرپەرچی هاتنە پێشەوەی هێزەکانی ئێران بدەنەوە و چاوەڕێی فەرمان بن... کاتێ بارزانی لە ١٦/١٢/١٩٤٦ چاوی بەقازی محەمەد دەکەوێ بۆی دەردەکەوێ هیچ کام لە لێپرسراوانی مەهاباد نیازی بەربەرەکانی سوپای ئێرانی نییە و قازی محەمەد ئەوەی پێ رادەگەیەنێ ((بۆ ئەوەی خوێنی خەڵکی مەهاباد نەڕژێ خۆم بەدەستەوە دەدەم)) و بارزانی ئەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ : ((قازی هەستایە سەرپێ و بەگریانەوە ماچی کردم و گوتی: لە خوا دەپاڕێمەوە بتپارێزێ و سەرکەوتوو بی... با ژیانی من فیدای هاونیشتمانەکانم بێت.... ئەوەی گوت و ئالآیەکی کوردستانی لە گیرفانی دەرهێنا و



دایێ))[4].

- بەمجۆرە پێشەوا قازی و سەیفی قازی و سەدری قازی بەپێشوازی سوپای ئێران چوون تا خەڵکی مەهاباد لە کوشتن و کوشتار بپارێزن و خۆیان گیانفیدا کرد و سەرلەبەیانی ١٩٤٧/٣/٣١ لەو جێیەی کۆماری دیموکراتی کوردستانیان دامەزراندبوو لەسێدارە دران.

- ئەوەی جێگەی سەرنجە لە کاتی دادگاییکردنی قازی محەمەد وەک سەرۆک و باوەڕ بەخۆ و بەنەتەوە هەرگیز پشتی کورد و هاوەڵەکانی بەرنەداوە و سەبارەت بە بارزانی کە پرسیاری لێ دەکەن ئەوەی بەوپەڕی نەسەلمێنەوە بەیارانی وتووە: ((ئەوەی لە پیاوەتی و کەرامەت و شەرافەت و ئینسانییەت و شوجاعەت و نەبەزی و سەخاوەت و نەترسی لە مێژوودا کەسانی مەزن بوویێتیان مەلا مستەفا هەیەتی، ئەوەی موسڵمانانی ئیسلام لە باوەڕ و راستی و پاکی و دڵسۆزی بۆ خودا و ئایین و خەڵکی هەژار و داماوی میللەت بوویانە بارزانی هەموو ئەمانەی تێدایە))[5].

- نابێ ئەوەش لە یاد بکرێ بارزانی پێش چوونی بۆ سۆڤییەت سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو.

### کۆڕەوییە مێژووییەکە

- بارزانی بۆ رزگارکردنی پێشمەرگە و بنەماڵەکەیان، سەرەتا رووی لە تاران کرد و نەگەیشتە ئەنجام و کەسوکار و خێزانی بەهەر کۆڵەمەرگێک بوو، پاش نەهامەتی و نەخۆشی و مردنێکی زۆر لێیان ئەنجام گەیشتنەوە عێراق و چارەنووسیان ئاوارەی شارەکانی خوارووی عێراق بوون و بارزانیش بەخۆی و (٥٠٣) پێشمەرگە رێگای مان و نەمانی هەڵبژارد بەرەو سۆڤیەت، دەستی بەدانان و نەخشە و پلان کۆکردنەوەی پێشمەرگەکانی دا و قسەی بۆ کردن و لە پاڵیدا (٥٠٣) پێشمەرگە ژیانیان بەژیانی بارزانییەوە پەیوەست کرد و هەڵبژارد و دەستیان بەشەڕی پارتیزانی سێ دەوڵەتی ئیقلیمی عێراق - ئێران - تورکیا کرد، ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەو نەخشە و پلانەی بۆ هێزەکەی دانابوو کردبوونی بەپێنج بەشەوە و هەر بەشەی بەسەر لقێکی لە شارەزایانی شەڕی پارتیزانی دانا بوو چ (لە شێخ سلێمان، ئەسعەد خۆشەوی، مامەند موحسین

محەمدامین میرخان، مستۆ مزووری) هەریەکە لەمانە جێگەی باوەڕ و متمانە و کوڕی ڕۆژی تەنگانە بوون بارزانی هەر خۆی نەخشەڕێژ و چاودێر بوو.... بەناو هێزەکاندا بێ ماندووبوون کەوتبووە ڕێگای کاروانەکەی.... بۆ هەر شوێن و گوندێک ڕۆشتن هێزە سێ قۆڵییەکەی ئێران و عێراق و تورکیا لە تۆپ و فڕۆکە و هێزی سوپایی دوایان کەوتبوون..... سەیر لەوە دابوو بۆ هەر گوندێکی کوردنشین چوون دانیشتوانەکانی بەخۆشییەوە پێشوازییان لێ کردووە و هاریکاری و پێداویستییان جێبەجێ کردوون. دوای برسی و ماندووبوون و شەهیدان. لە ١٩٤٧/٦/١٨ لە ماوەی ٥٢ ڕۆژدا گەیشتنە سەر ڕووباری ئاراس و هەموو پەڕینەوە و بارزانیش ئاخر کەس بوو لە چۆمەکە پەڕییەوە... بەگەیشتنی پێشمەرگەکانی ڕووسەکان، چەکەکانیان لێ سەندن و فیشەکەکانیان لێ بەتاڵ کردن و مامەڵەی سەربازە ڕووسەکان وەکو دیلی شەڕ بوو، بارزانییان لێ جیاکردنەوە... ئەوەی لە دوو توێی پاداشتی پێشمەرگەدا نووسراوە لە ناو کاروانەکەدا چاوساغ و شارەزا (مام میرزا شکاک) بوو بارزانی سوپاسی کرد و ویستی پارەی بداتێ و بگەڕێتەوە بەڵام ڕازی نەبوو چاوی پڕ بوو لە گریان و بە بارزانی وت (بەبێ تۆ خاکی کوردستان لە من حەرام بێت، لەگەڵ خۆم بەڵێنم داوە ناگەڕێمەوە)[٦]. هەر بەگەیشتنی بارزانی و یاوەرەکانی بۆ سۆڤیەت لە ١٩٤٧/٦/١٩ حکوومەتی عێراق هەر چوار ئەفسەرەکەی لەسێدارە دا. بەڵێ گەیشتنی بارزانی و هاوەڵەکانی بووە جێگای باسکردنی هەموو ئێزگەکانی جیهان زۆربەی شاعیرانی کوردیش کەوتنە پەسنی کۆڕەوییەکە و ناوی مناڵەکانیان بەناوی (ئاراس) و (بارزانی) ناونا و پیرەمێردی شاعیریش یەکێک بوو لەو شاعیرانەی بەشیعری (عەشرەت هاوارە) جۆش و کوڵ و هاوار و غەمەکانی دەردەبڕی و ئاواتەخواز بووە یەکێک بووایە لەو یاوەڵانە بەڵام پیریەتی ڕێگەی لێ گرتووە و دەڵێ:

**عەشرەت هاوارە، عەشرەت هاوارە**
**کەوتوومە ئاراس ئاو بێ بوارە**
**ڕێم نییە منیش شوێن ئەوان کەوم**
**پیرم هەنگاوێک بنێم ئەکەوم**
**لێرەش وا کەوتووم بەدەم دەردەوە**
**لە ئێشی دووری و ئاهی سەردەوە**
**دوکتۆر دەوای تۆم ناوێ لێم گەڕێ**
**بەڵکم بەناهەم دەوران وەرگەڕێ**
**با وا وەرگەڕێ ئێلم وەرگەڕێ**
**یا زرمەی تۆپی زەرەی بەرکەوێ**
**ئەوساکە دوعای من وا گیرابێ**
**لە خانەی خاکا ئاواتم نابێ**
**ئینجا ئەلقینم بدەن بە کوردی**
**بڵێن ئاواتت هاتە جێ و مردی**

بەگەیشتنی بارزانی بۆ سۆڤیەت ئیمان و تەحەداکردن بەرامبەر هێزی دوژمن زیاتر سەرکەوتن و بردنەوەی کێشەی کورد بوو کە توانی بەجیهانی بناسێنێ و ببێتە نامەی زانستی و لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی... ئیتر هێندە بەسە یەکێکی وەک مستەر دیگبرونی ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی بەریتانی بڵێ: ((ئەم پیاوە یەکێکە لەو پاڵەوانانەی دەبێ مێژوو ناوی بەپانتایی زێڕ لە تۆماری گەورە پیاوانی جیهاندا تۆمار بکات))[٧].

**بارزانی لە دۆسیەی سۆڤیەتدا:**

سەردەمێکی تری خەباتی سیاسیی بارزانی کە ماوەی (١١) ساڵی خایاند لە یەکێتیی سۆڤیەت... هەڵسوکەوتی بارزانی بەپێی بارودۆخی سیاسیی ئەو سەردەمە بوو... هەر پاش گەیشتنی خۆی و پێشمەرگەکانی دەسەڵاتی ئەو سەردەمە دوای (٤٠) ڕۆژ لە شاری نەخچەوان گوازرانەوە.... چونکە سەرۆک کۆماری ئازربایجان (باقروق) بەکنە و هاندانی دەسەڵاتی تورکیا، ڕەفتارێکی شۆڤینییانەی بەرامبەر بارزانی و پێشمەرگەکانی نواند، بوونی نەتەوەی کوردی ئینکار دەکرد، کە بارزانی لەو ڕێگەیەدا خەباتی دەکرد.... هەر بۆیە لە ١٩٤٨/٨/٢٩، باقروش، بارزانی و هەڤاڵەکانی لە باکۆوە بەرەو تاشقەندی پایتەختی کۆماری ئۆزبەکستان گواستەوە، پاشانیش لە ١٩٤٩/٣/١٣، هەر باقیرۆڤ بارزانی لە هەڤاڵەکانی جیا کردەوە وەک دەستەبەسەر و چاودێریی توندیان بۆ دانا و لە ١٩٥١/١٢/١ جارێکی تر بارزانییان گەڕاندەوە تاشقەند و لە ١٩٥٣/٣/٢٥، لە

سەردەمی خورۆشۆف بارزانییان هێنایە مۆسکۆ.... ئیتر ڕەوشی سیاسی و ژیانی خۆی و هەڤاڵانی تۆزێک باشتر بوو.[٨]. وە چەند جارێکیش چاوی بە خورۆشۆف دەکەوێ و ئازادیی هاتوچۆکردنی پێ دەدرێت هەر بۆ نموونە ساڵی ١٩٥٦ لە مۆسکۆوە سەردانی کوردەکانی ئەرمەنستانی کرد و، چاوی بەکوردێکی دەسەڵاتی بەرزی پلەی جێگری وەزیر (نادۆیی خۆدۆ) لەگەڵ چەند ڕۆشنبیری کورد و گوندنشینی کورد و ئەرمەن کەوت. تەنانەت لە ناو دوو توێی بیرەوەرییەکانی سیاسەتمەداران و ڕووس و ئەرمەن و کوردی سۆڤیەتی جاران زۆر شت سەبارەت بە بارزانی و ژیانیان لادەست دەکەوێت. ئەوەتە ئەندامێکی لێژنەی مەرکەزی حزبی کۆمۆنیستی سۆڤیێتی (پاڤێل سوودۆ پیلاتۆف) سەبارەت بە بارزانی نووسیویەتی: ((یەکێتیی سۆڤیەت پشتگیریی تەڤگەرا ئازادیخوازانی کورد بە سەرۆکایەتیی مستەفا بارزانی دەکات و بەمە پرسی کورد چووە ناو ئاسایشی یەکێتیی سۆڤیەت KGB پاش گۆڕانکاری دەسەڵات لە سەردەمی خرۆشۆف ئیتر بارزانی وەک سەرکردەی کوردان دەناسرا و بەتەواوی ڕێگەی پێ درا لە مۆسکۆ بمێنێتەوە و گوێیان لە هەموو داخوازییەکانی دەگرت و لە ئەکادیمیای زانینی جەنگدا وەرگیرا و هونەری جەنگی لەوێدا فێر بوو[٩]. پاشان بەئازادی سەردانی هەندێ لە گوندنشینانی کورد لە ئەرمەنستان کرد بەتایبەتی گوندە (جەنجەرش، هەککۆ، تالین،... هتد) لەگەڵ ئەرمەنییەکان پەیوەندیی دۆستانەی بەست و پێشوازیی گەرمی لێ کرا.

- بارزانی نەمر بووە هۆیەکی کاریگەر کە ئاوڕ لە کورد و نووسینی کوردی بدرێتەوە و هەر بۆیە وەک سەرچاوەکان دەڵێن: گرنگیدان بەزمان و کولتووری کوردی لەلایەن سۆڤیەتەکان بەتایبەتی لە سەردەمی بارزانی بووە هۆی کردنەوەی ناوەندێک بۆ کوردناسی لە یەریڤان و لە لینینگراد.

کەواتە لە ناو ئەو بەڵگە و دیکۆمێنتانەی لە سۆڤیەت پارێزراون بەڕوونی دەوری سۆڤیەت ئاشکرا دەبێت کە ((سوود لە بزووتنەوەی کورد لە ڕووبەڕووبوونەوەی سۆڤیەت لەگەڵ ڕۆژئاواییەکان لە کاتی شەڕی ساردل وەربگرن، هەر بۆ ئەم مەبەستە (سۆسلۆڤی)ی سۆڤیەتی ئەرکی کێشەی کوردی پێ سپێردرابوو بەڵێنی بە بارزانی دابوو لە هەموو بارێکەوە لە خەباتکردندا بێت بۆ وەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی و بەرامبەر ئەوەش بارزانی یارمەتیی ڕووخانی نووری سەعید لە عێراقدا بدات... بەمە لە ناوەڕاستی پەنجاکاندا کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا تاکە هاوپەیمانی ئێمە بوون.[١٠].

لەم سۆنگەیەوە ئەرکی مەلا مستەفای بارزانی لە نێوان بەرژەوەندی و چاوچنۆکی زلهێزەکاندا و مافی خەباتەکەیدا ئەرکێکی ئاسان و سەرپێی نەبوو... لەلایەک ڕووبەڕووی ڕژێمەکانی عێراق و پەیوەندی کێشەکە بەوڵاتە زلهێزەکانی جیهانەوە بەسۆڤیەتەوە هەبوو کە ئەم دەوڵەتانە وا دەیانڕوانییە گرفتی کورد و دەیانویست بارزانی بکەنە دەستکەلا بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکان چ وەک دوژمنی ئیمپریالیزم و چ وەک سەرکردەی گەلێک کە خاوەنی کانگای پترۆڵن[١١].

- بەڵێ بارزانی لە هونەری دیبلۆماسیدا لەوە تێگەیشتبوو کە داش بەداش لە هۆشیاری دیبلۆماسی بۆ بەرژەوەندیی کورد بکات. کە دەڵێ ((بەڵێنم پێ بدەن کۆمەکی شۆڕشی کورد بکەن و ئامادەم پارە و چەکتان لێ وەرگرم و هاوکاریی سیاسەتتان لە ناوچەکە بکەم بەمەرجێک شۆڕشی کورد و بەرژەوەندی بپارێزم))[١٢].

- بەمجۆرە یەکێتیی سۆڤیەت و وڵاتە زلهێزەکان و دەوڵەتانی ئیقلیمی (ئێران، عێراق) لە ڕوانگەی بەرژەوەندییەوە کوردیان وەک بە هێزێکی تۆقێنەر یا بابەتێکی سەودا و ڕووبەڕووبوونەوە دادەنا و هەر لەم (ڕووەشەوە وەک سەردەم و قۆناغێکی دیاریکراو و مەسەلەی بەرژەوەندییەکان کوردیش سۆڤیەتی وەک پاڵپشتێک لە مافی چارەنووسی میللەتانی ژێر دەستە هەڵبژارد.

**- گەڕانەوەی بارزانی و شۆڕشی ئەیلوول و نسکۆی ١٩٧٥ز:**

بەگەڕانەوەی بارزانی بۆ عێراق و

گۆڕانی ڕژێمی عێراق لە ڕژێمی پاشایی بۆ کۆماری توانرا بۆ یەکەم جار مافەکانی کورد لە دەستووری عێراقی ساڵی ١٩٥٨دا بچەسپێ، چ لە ڕووی نەتەوەوە کە کورد و عەرەب دوو نەتەوەن چ لە ڕووی دابینکردنی زمانی کوردی لە ناوچە کوردییەکان و ڕێگەدان بەکاری حزب و ڕێکخراوەکان. بەڵام پاش دەسبەردانی داخوازییەکانی کورد، کورد ناچار بوو بۆ وەدەستهێنانی مافەکانی شۆڕشی ئەیلوول هەڵگیرسێنێ کە یەکێک بوو لە شۆڕشە مەزنەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە مۆرکێکی نەتەوایەتیی هەبوو... شۆڕشێکی سەرتاسەری کوردستانی عێراق بوو بەسەرکردەی بارزانی نەمر... بارزانی بۆ سوود و بەرژەوەندیی کێشەی کورد پەیوەندیی بە سۆڤیەتەوە کرد لە ساڵی ١٩٦١-١٩٧٢ و سۆڤیەتیش پشتی کوردی گرت و پەیوەندیی بە بەغداوە بڕیبوو. بەتایبەتی لە ١٩٦٣/٧/٩، لە ڕێگەی (گرۆمیکۆ) یاداشتێکی بە باڵیۆزی (عێراق، ئێران، تورکیا، سووریا)دا بزووتنەوەی کوردی بە (ڕەسەن و دیموکراسیی ناوبرد) ئەم پەیوەندییەی سۆڤیەت بەشۆڕشی کوردەوە گەیشتە ئەو ڕادە بەهێزە کە (نیقۆلای فیدرینکۆ) یاداشتێک بدات بە ئەنجوومەنی ئاسایشی نێونەتەوەیی سەبارەت بەکارە چەوتەکانی حکوومەتی عێراق بەرامبەر بەگەلی کورد و دەستێوەردانی دەرەوە[١٣].

بەمجۆرە سۆڤیەت بۆ بەرژەوەندیی خۆی کوردی وەک کارتێک بەکار هێنا و بارزانیش بەدوای هێزی ناوچەیی بەدوای دەوڵەتێکی دراوسێدا دەگەڕا کە ئەویش ئێران بوو... هاریکاریی شای ئێران بۆ کورد بۆ دوو هۆکار دەگەڕێتەوە:

١- ڕژێمی قاسم کۆماری بوو- شای ئێران حەزی لێ نەبوو.

٢- ئێران ویستی یارمەتیی بارزانی بدات تا سنووری ئێران بپارێزێ و هەم هێزی عێراق پتر لاواز بکات [١٤].

ئیتر شای ئێران کۆمەکی بەکورد کرد و ڕژێمی بەعس هەستی بەمەترسی و کارتی یارییەکە کرد و بایدایە لای بارزانی و ڕێکەوتنی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ لەگەڵ مۆر کرد بەرامبەر بە داخوازییەکانی کورد داخوازییەکانی ڕژێمی بەعس (بڕینی پەیوەندی لەگەڵ ئێران بوو و بۆ یەکەم جار ڕژێمی عێراق دانی بەمافی نەتەوایەتی و کولتووریدا نا- ئەم ڕێکەوتنامەیە کورتخایەن بوو، زوو جێبەجێ نەکرا و ماوەی چوار ساڵی بۆ دانرا و کۆمەڵێ کێشەی (ناوەخۆ و ناو شۆڕشی و دەوڵەتە زلهێزەکان و دەوڵەتی ئیقلیمی) بۆ کورد دروست بوو، کە پەیوەندیی بەنەخشەی شاری کەرکوک و دانانی پلان بۆ کوشتنی بارزانی و دوورکەوتنەوەی سۆڤیەت لە کورد و خۆدانە پاڵ عێراق و پاشان ڕێکەوتنی شای ئێران و ئەمەریکا و نزیکبوونەوەیان لە عێراق و ڕۆژ بەڕۆژ کێشەی کورد ئاڵۆزتر دەبوو. ئەوە بوو بارزانی لە ناوەڕاستی ١٩٧٣دا بۆی دەرکەوت ڕژێمی عێراق نایەوێت ڕێکەوتننامەکە جێبەجێ بکات.... بۆیە داوای لە ئەمەریکا کرد پاڵپشتی کێشەی کورد لە ڕووی سیاسی و سەربازی و مرۆڤایەتی بکەن ئەمە بەلایەکی ترەوە. ڕژێمی بەعس لە ڕۆژی ١٩٧٤/٣/١١ یاسای ئۆتۆنۆمی کاتۆنی ئاشکرا کرد و بارزانیش بۆ چارەسەرێک گەڕا ساڵی ١٩٧٤ شەڕی مان و نەمان جارێکی تر یەخەی کوردی گرتەوە و سوپای عێراق هێرشی کردە سەر کوردستان و گەمەی بەلای شا و ئەمەریکا و چارەنووسی کوردیش لە مەترسیدا بوو زەرەر و زیانی زۆری لێ کەوت و ڕێکەوتنی جەزائیر ١٩٧٥ی لێ کەوتەوە کە تووشی نسکۆ و ماڵوێرانی و دەربەدەری بوو. کورد و کێشەکەی بووە قوربانیی ململانێی بەرژەوەندیی نێوان زلهێزەکان و دەوڵەتی ئیقلیمی بە تایبەتی کە شای ئێران تۆڵەی ڕێککەوتننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ کردەوە و خەنجەری لە پشتی کورد دا و ئیدارەی ئەمریکی کە بەهەموو شێوەیەک کۆمەکیان بە شۆڕشی کورد کرد پشتی لە کورد کرد و تاوانباری یەکەمیش هینری کیسنگەر بوو کە هۆکاری ئەم هەموو کارانە بوو وەک لە ڕاپۆرتی پایک pik ئاشکرا بوو.[١٥].

- ئەنجامی پلانی جەزایر بەزەرەی کورد تەواو بوو و شای ئێران

بەکۆمەڵێ دەستکەوت گرەوی بردەوە و رژێمی بەعس دوو هەلی مێژوویی بەنرخی لە کیس چوو:

١- رێکەوتنامەی ١١ی ئازاری بەجدی و دڵسۆزی جێبەجێ نەکرد.

٢- دوای نسکۆی ١٩٧٥ لەبەرئەوەی گەلی کورد بەلای خۆیدا راکێشێ مامەڵەی نامرۆڤانە و تەهجیر و تەعریب و توانەوەی لە ناو گەلی عەرەبدا کردە ئامانج.

- لەگەڵ ئەم هەموو تراژیدیا و مالوێرانیەدا کورد هیوای نەبری سەرلەنوێ شۆڕشی هەڵگیرسانەوە و باوەڕی پتەوی بەهێزی گەل و پێشمەرگە کردە بۆمبایەک رژێمی بەعسی ئاگادار کرد (کورد نافەوتێ و نامرێ) مێژوو ئەوەی دووبارە کردەوە وەک لە دیکۆمێنتوو راپۆرتی pik هاتبوو سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر کورد دەردەخات و دەڵێ:

(( سیاسەتی ئێمە ئەمەریکا بەرامبەر کوردان بێ رەوشتانە بوو، چونکە نە یارمەتیمان دان و نە وازیشمان لێ هێنان کە گیروگرفتی خۆیان لەگەڵ حکومەتی عێراقدا بەدانوستان چارەسەر بکەن. ئێمە نە هانمان دان و دوایش دەستمان لێ کردنەوە و جێمان هێشتن))[١٦].

**- بارزانی وەک سەرکردەیەک لە شۆڕشی ئەیلول (؟! - ١٩٧٥ز)**

ئەوەی بە وردی دەوری ئەو سەرکردە مێژووییەوە دەور بکاتەوە وردە وردە هەنگاوەکانی بەناو ئەو چوارده سادا هەڵبێنێ لەگەڵ کەموکورییەکانی شۆڕشدا دەوری سەرکردەی لەم خاڵانەدا بۆ دەردەکەوێت:

١- بارزانی لە شۆڕشی ئەیلولدا رۆڵێکی گەورەی لە کۆکردنەوە و یەکگرتنەوە و لکاندنی ئەندامانی نەتەوە بەهەموو چین و توێژەکانەوە هەبووە.

٢- بارزانی وەک ئەرکێکی نیشتمانی و نەتەوایەتی توانی رێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان لە خۆی و شۆر و حزب نزیک بخاتەوە بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتی خەڵکی.

٣- پەیوەندیی بارزانی بەشۆڕش و چینی رۆشنبیران و مەلا و پیاوانی ئایینی و قوتابییان و جووتیاران و خاوەن زەوی پەیوەندییەکی گرێدراو بوون بە شۆڕشەوە.

٤- لە ناو شۆڕشدا بارزانی تەنیا سەرکردەیەکی سیاسیی هەڵکەوتوو نەبوو، بەڵکو شارەزای کاروباری عەسکەری و هونەری سەربازی بوو، نەخشە و تاکتیکەکانی لە شۆڕشەکانی بارزان، کۆماری کوردستان، رێپێوانە مێژووییەکەی بۆ سۆڤیەت، دەوری لە شۆڕشی ئەیلولدا گەواهی ئەو راستییە دەدەن... بێجگە لە دان پێدانانەکانی دوژمنانی کوردیش بەو توانا و لێهاتووییە[١٧].

٥- لە ناو شۆڕشدا رێز و پایەی بۆ ئافرەتان دانابوو یەکەم ئافرەتی خستە ناو لیژنەی مەرکەزی و زۆر کاری نهێنی و سیاسیی بە ئافرەتان دەکرد و لە ناو شۆڕشدا دادپەروەرێکی کۆمەڵایەتیی بوو. ئەوەی زوڵمی لێکرابووایە چ پیاو چ ئافرەت بەسزای خۆی دەگەیشت و نەریتی کچ بەشوودان و مارەیی منالی ناو شۆڕشدا نەهێشتنی دژی ئەوانە بوون ئەو کارە چەوتە دەکەن.

٦- بارزانی لە ناو شۆڕشدا هەولی دۆستایەتی لەگەڵ دەوڵەتانی عەرەب بەتایبەتی میسر دەدات.

٧- بارزانی رێزێکی زۆری لە نەتەوەکانی ناو کوردستان بە (تورکمان، کلدان و ئاشوور، عەرەب، ئەرمەن) دەگرن.

٨- بارزانی توانی کورد کێشەی کورد بەجیهان بناسێنێ و لە بازنەی ناوچەیی بەرەو بازنەی نێونەتەوەیی بەرێ و دەوڵەتە زلهێزەکان بەلای خۆیدا رابکێشێ.

٩- بارزانی هەمیشە لە پێناو بەرژەوەندیی گەلی کورد و شۆڕشەکەی بەدوای دۆستێکدا دەگەڕا کە چارەی کێشەی گەلی بێچارە بکات و هەمیشە لە گەمەی ململانێ (سۆڤیەت، ئەمریکا) بوو وەک سیاسەتمەدارێکی زانا لە (١١)ی ئازاردا رەفتاری کرد لەلایەکەوە پێی لەسەر داواکانی کورد راگرت و لەلایەکی تریشەوە پەیوەندیی لەگەڵ ئەمریکا نەپساند[١٨].

١٠- بارزانی و شۆڕشی و پارتی هەرگیز بەوە رازی نەبوون واز لە کەرکوک بێنن و لە کوردستانی دابڕن وەک لە فەرموودەکانی دەردەکەوێ سیاسەتی بارزانی بەرامبەر کەرکوک روون و ئاشکرایە

و بەکردەوەش ئەوەی سەلماند کە دەڵێ:

((من نە ئێستا و نە پاشەڕۆژ تا ئەمرۆ رازی نابم بەمساوەمە و تۆمەتی نەفرەتی مێژوو ناخەمە سەر رووی خۆم)) گرنگ لای ئێمە چەسپاندنی سنووری جوگرافیای کوردستانە لە خاکی عێراق و ئەویش مافێکی سروشتی خۆمانە.(١٩).

پێداگرتنی بارزانی لەسەر کەرکوک و ئامادەباشی شەڕکردنی لە پێناو راستییەکی مێژوویدا دەردەخات و دەڵێ:

((دە ساڵ لە پێناوی خود و موختاری جەنگاین... پێنج ساڵی تر توانای شەڕمان هەیە لە پێناوی (کەرکوک) بجەنگین ئەگەر ویسترا)).(٢٠).

یان دەڵێ: کەرکووک دڵی کوردستانە.

- کاتێ ڕژێم بەپێی پلانێک هەوڵی کوشتنی بارزانی لە ڕێگەی چەند مەلایەکی بەناو ئایینپەروەردا، مەلاکان تەقینەوەکان کوژران و بارزانی و مەحموود عوسمان بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر ڕزگاریان بوو... مەکتەبی سیاسی بڕیاری تۆڵەسەندنەوە و شەڕ هەڵگیرسانی دا... بارزانی رازی نەبوو شەڕ لەسەری بکرێ و وتی:

ئەگەر لەسەر من شەڕ دەکەنەوە مەیکەن لەسەر کەرکوک شەڕ بکەنەوە.

١١- بەپێی هەموو بەڵگە و دیکۆمێنتەکان و سەرچاوەکانی



شۆڕشی ئەیلوول بەپێی پلانێکی نێونەتەوەیی و ڕێکەوتنی جەزائیر ١٩٧٥ شۆڕش لەناوبراو بووە نەکسە و نوشستی و ماڵوێرانی و ئاوارەیی و چەک دانانی هەزاران کورد و خۆکوشتنی سەدان لاو و شۆڕشگێڕ....

١٢- بارزانی وەک سەرکردە لە دواین ماڵئاواییکردنیدا مژدەی سەرلەنوێ شۆڕشێکی بەنەتەوەیی نوێ ڕاگەیاند و زۆری نەخایاند ڕۆڵەکانی گەل کەوتنە خۆ خرکردنەوەی چەک هەڵگرتن لە پێناو مافە ڕەواکانیان تا بەم ڕۆژە نوێیە لە سایەی حکومەتی هەرێمی کوردستان و پەرلەمانێکی هەڵبژاردەوە بەری ڕەنج و خەباتی نەپساوەی سەرکردە قارەمانەکانی دوێنێ بە ئەمڕۆوە چرۆیی گرت.

**ئەنجام:**

لە ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا گەیشتینە ئەم خاڵانەی خوارەوە:

١- بارزانی لە ناو سەختیدا لەدایک بوو، هێشتا منداڵ بوو گوێبیستی چەوسانەوەی گرتووخانە بوو و تیایدا ژیا واتە قاڵبوونی شۆڕشگێڕانەی ئەو کەوتبووە پێش هۆشە سیاسی و نەتەوەییەکەی، لەسەر سنووری هەردوو سەدە و لە ناو ئەو زوڵم و زۆرە سەختەدا لەدایک بوو کە بەرەو ڕووی کەسوکار و گەلەکەی ببوو، وەک ئەوەی لەدایک بووبێ بەرەنگاری ئەم زۆردارییە ببێتەوە و پاشانیش لێی ڕاپەری(٢١).

٢- بارزانی یەکەم سەرکردەی کورد بوو شۆڕشەکەی سەرتاسەری بوو، بادینان و سۆرتنی گرێ دا و لێکی نزیک خستنەوە وەک یەک بەرە، یەک سەرکردە، یەک حزب.

٣- یەکەم سەرکردەی کوردە بەشداریی شۆڕشەکانی کوردی کردبێ.

٤- باسکردنی مێژووی هاوچەرخی کورد و لێکۆڵینەوە لێی بێ بارزانی مێژوویەکی ناتەواوە.

٥- بارزانی توانی کێشەی کورد لە کێشەیەکی ناوچەییەوە بکاتە کێشەیەکی نێونەتەوەیی.

٦- بە بەڵگەوە روون و ئاشکرایە کە بارزانی هەرگیز مساوەمەی لەسەر کەرکوک نەکردووە و بەبەشێکی کوردستانی زانیوە.

٧- بارزانی توانی لە ڕێگەی

شۆڕشی ئەیلوولەوە ڕێکەوتنامەی ١١ی ئازار و مافی ئۆتۆنۆمی بۆ گەلی کوردستان دەستەبەر بکات.

٨- لە ناو شۆڕشدا بارزانی دەورێکی گەورەی بەگرنگیدانی ئافرەتان و پیاوانی ئایینی و ئیسلام و ڕۆشنبیران و قوتابییان دا سەرباری نەتەوەکانی ناو کوردستان.

٩- بارزانی بەدرێژایی تەمەنی وەک لازاریفی ڕووسی دەڵێ:

هەوڵی ئازادی و سەربەخۆیی گەلەکەی داوە و بووە بە ڕەمزی خەباتی ئازادیخوازی گەلی کورد.

١٠- بارزانی وەک سەرکردە و شۆڕشگێڕێک چووە ناو شیعری شاعیرانی کورد و عەرەب، چیرۆکنووسان، ڕۆماننووسان، نامەی بەرزی (ماجستێر و دکتۆرا) و بووە جێگەی سەرنج و ڕێزلێنانی سیاسەتمەدارانی جیهان و ڕۆژنامەنووسان....

١١- ناوی بارزانی بووە ڕەمزێک باوکان ناوی منداڵەکانیان لە نەوەکانیاندا لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا ڕەنگی داوەتەوە.

١٢- بارزانی لە ناو شعری شاعیرانی هاوچەرخی کوردیدا بووە بە ڕەمزی (قارەمانیەتی، سەرکردە، شێر، باوک، کاوە، زەردەشت، خەبات، شۆڕشگێڕ، سوارچاک.... خدری زیندە... نەمر).

١٣- بارزانی باوەڕی تەواوی بەخۆی، بەگەل و نیشتمان و بەخوا و ئیسلام هەبووە واتە وەک چەرچڵ باوەڕ و ئیمانی بەخوا و گەل هەبوو.

١٤- بارزانی لای گەلەکەی و لای کوردستان خۆشەویست بوو باشترین بەڵگە ئەو هەڵوێست و خۆشەویستی و نیشتمانپەروەرییەی ڕۆڵەکانی کورد بوو لە کاتی کۆچی دوایی (١٩٧٩) لە شنۆ کردیان و پاشان هەمان مەراسیم لەکاتی هێنانەوەی تەرمەکەی بۆ بارزان و پێشوازیی گەرمی ڕۆڵەکانی بەهەموو چین و توێژ و سەرکردەکانی کورد بێ جیاوازی.

سەرچاوەکان:

١- گۆڤاری هاواری نیشتمانی - ژ١، ساڵی ١٩٤٦.
٢- ڕۆژنامەی کوردستان، ژ٢٣، ساڵی ١٩٤٦/٣/٦، ل٣.
٣- حەسەنی دانیشفەر- بارزانی لە ویژدانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان - بەرگی یەکەم هەولێر ٢٠٠٣، ل ٨٥.
٤- مەسعوود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد ١٩٣١-١٩٨٥.
٥- نهێنییەکانی موحاکەمەی قازی و سەیفی قازی، کۆکراوەی محەممەد ڕەزا.
٦- حەسۆ میرخان، ٦٢ ڕۆژ لەگەڵ بارزانی جدا، چ١، ١٩٩٧.
٧- د. شوکریە ڕەسووڵ، بیری نەتەوایەتی و کوردایەتی لای بارزانی نەمر، هەولێر ٢٠٠٣، ل ٣٦.
* هەروەها بنوارە:
- مەسعوود بارزانی - البارزاني والحركة التحررية الكردية - پورە بارزان ١٩٤٥-١٩٤٨. کوردستان ١٩٨٧.
- شەوکەت شێخ یەزدین - لە مەهابادی خوێناوییەوە هەتا لێوارەکانی ئاراس - چ١، پیرمام ١٩٩٦.
٨- حەسەنی دانیشفەر..... ل ٢٣٤.
٩- وەزیرێ نیشۆ، دۆسیا بارزانی د سندۆقا ستالین یا پۆلایی دا چاپخانەی هاوار - دهۆک ٢٠٠٧ل ٤٥.
١٠- د. ئەفرسیاب هەورامی، مستەفا بارزانی لە هەندێ بەڵگەنامە و دیکۆمێنتی سۆڤیەتدا ١٩٤٥-١٩٨٥ هەولێر ٢٠٠٢ ل ٨٤-١٨٥.
١١- هەمان سەرچاوە..... ل ١٨٥.
١٢- ڕۆژنامەی میدیا - ژ ١٣٨، ٢٠٠٢/١٢/١٥ (چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەلکساندەر ڤیکۆرڤیچ).
١٣- کریس کۆچێرا - الحركة القومية الكردية في ثورة ايلول ١٩٦١-١٩٧٥، ص ٢٤٩-٢٥٠.
١٤- کریس کۆچێرا.... مێژووی کورد لە سەدەی ١٩-٢٠ و. محمد رباني تاران ١٣٦٩، ل ٣٩٢.
١٥- د. شوکریە ڕەسووڵ (بارزانی و کێشەی کورد لە نێوان بەرژەوەندیی دەوڵەتە زلهێزەکان و دەوڵەتانی ناوچەییدا ١٩٤٥-١٩٧٥ کۆنگرەی یادەوەری سەد ساڵەی بارزانی، بەشی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٣، ل ٤١٣).
١٦- ئارۆن لاتمام - التقرير الخاص بنشاطات وكالة المخابرات الامريكية ١٩٧٦/٢/٢٣.
١٧- حەسەنی دانیشفەر.... بارزانی لە ویژدانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان.. ل٢٨.
١٨- کۆنگرەی نەوەد ساڵەی بارزانی...... ل ١٦٩.
١٩- فرهاد عوني - اللقاء كان في ديلمان - خەبات ١٩٩٣/١/٧ العدد ٦٨٢.
٢٠- کریس کۆچرا - الحركة القومية الكردية.... ص ١٨٣.
٢١- عەزیز محەممەد - هەندێ لە ڕواڵەتە سیاسییەکانی بارزانی - کۆنگرەی نەوەد ساڵەی لەدایکبوونی بارزانی نەمر..... ل٢٩.



# کەسایەتی و زانایانی هەولێر لە کتێبی (مەشاهیری کوردی بابا مەردوخی روحانی)دا

ئامادەکردن و وەرگێڕانی لە زمانی فارسیەوە:
رەحیم سورخی

*** مەجدودین نشابی ئەربیلی**

مەجدودین نشابی، لە شاعیرانی و زانایانی سەدەی سێیەمی کۆچییە کە لە بارەگای فەرمانڕەوای هەولێردا ژیاوە و چەندین جار لەلایەن ئەم فەرمانڕەوایەوە، نێردراوە بۆ دەرباری فەرمانڕەوایانی دیکە و بە سەرکەوتنەوە ڕاسپاردە سیاسییەکانی خۆی ئەنجام داوە و بەردەوام ڕێزی لێ گیراوە و پاداشتی دراوەتێ. ئەم زانایە لە نیوەی دووەمی سەدەی سێیەم کۆچی دوایی کردووە.

* (مشاهیر الکرد، امین زکی بیک، ج٢، ص١٥٢، لە قاموس الاعلام وەرگیراوە).

*** ئەبولعەباس خدری ئەربیلی**

ئەبولعەباس خدری کوڕی نەسری کوڕی عەقیل، زانایەکی فیقهی شافیعییە و مامۆستایە لە زانستی ئوسول و فیقهی ئیستدلالی کە لە ساڵی ٤٧٨ لە شاری هەولێر لەدایک بووە و ساڵی ٥٦٧ لە هەمان شار کۆچی دوایی کردووە. لە بەغدا لای "کیاهراسی و ئیبنی شاشی" خوێندنی تەواو کردووە و گەڕاوەتەوە بۆ هەلێر. لە ساڵی (٥٣٣ک) میر مەنسوور فەرمانڕەوای هەولێر قوتابخانەیەکی بۆ وانەگوتنەوەی ئەو زانایە دروست کردووە و تا کۆتایی تەمەنی لەوێ خەریکی خزمەت و سوود گەیاندن بە خەڵک بووە. ئەبولعەباس لە زانستی تەفسیر و حەدیس و فیقە، نووسراوەی زۆرە: لەوانە، کتێبێکە لە ٢٦ وتاری حەزرەتی ڕەسووڵی ئەکرەم (د.خ) وێڕای ئاماژەکردن بەسەرچاوەکانیان لایەنە گرنگەکانیشی روون کردوونەتەوە و سەرەڕای پلە و پایەی زانستی، ئەبولعەباس لە رووی تەقوا و پارێزکارییەوە جێگای ڕێز و متمانەی خەڵک بووە و هەمووان بەچاوی ڕێز و تەقدیرەوە سەیریان کردووە.



* (ابن خلکان، ج١، ص، ١٧١، طبقات الشافعیة، ج٤، ص٢١٨، الاعلام، ج٢، ص٣٥٤)

*** شێخ ڕەزییەدین یونس ئەربیلی**

ڕەزییەدین یونس کوڕی محەمەدی کوڕی مەنعە خەڵکی هەولێرە. سەرەتا لە زێدی خۆی خوێندوویەتی و پاش تەواوکردنی وانە سەرەتاییەکان چووە بۆ مووسڵ و لەوێ لەلای (تاج الاسلام) ئەبوعەبدوڵا حوسێن کوڕی نەسر، ناسراو بە "ئیبنی خەمیس کەعبی جەهنی" فیقهیش فێر بوو. ئەمجا چووە بۆ بەغدا و لە خزمەت شێخ ئەبومەنسوور سەعیدی کوڕی محەمەدی کوڕی عومەر، ناسراو بە "ئیبنی ڕەزاز" مامۆستای قوتابخانەی نیزامییە، ماوەیەک سودی وەرگرت و ئیجازەی وەرگرت. پاشان شێخ ڕەزییەدین لەلای میر ڕەزییەدین ئەبولحەسەن عەلی فەرمانڕەوای هەولێر و پلە و پایەکی شایانی وەرگرت و لە یەکێ لە قوتابخانەکانی هەولێر خەریکی وانە گوتنەوە بوو و سەرەنجام لە ساڵی (٥٧٦ک.) پاش ٦٨ ساڵ ژیان. لە مووسڵ کۆچی دوایی کرد.

* (تاریخ ابن خلکان، ج٢، ص٤١٩)

*** موەفەقەدین ئەربیلی**

ئەبوبەکر عەبدوڵا محەمەد کوڕی یوسف ناسراو بە "موەفەقەدین" خەڵکی هەولێر لە پێشەوایانی زانستی ئەدەب و مامۆستای کێش و سەروا و ڕەخنەی شیعر و مۆسیقا بووە و لە زانستی دیکەش زانیاریی تەواوی هەبووە. باوکی بە دوای کار و کاسبییەوە ڕۆیشتووە بۆ بەحرەین لەوێ بەو بەرە سەرمایەیەی هەیبوو خەریکی کڕین و فرۆشتنی مرواری بووە. موفەقەدین لە بەحرەین لەدایک دەبێ و پاشان باوکی لەگەڵ خۆی دەیهێنێتەوە بۆ هەولێر و پاش پەروەردەبوونی و پێگەیشتنی لەوێ و هێندێ ناوچەی دیکەی عێراق دەخوێنێ. ئەمجا بەرەو دیمەشق بەڕێ دەکەوێ و چەند ساڵێکیش لەو شارە دەخوێنێ. پاش و پاش تەواوکردنی خویندنی و وەرگرتنی ئیجازە لەسەر دەستی زانایانی ئەوی دەگەڕێتەوە بۆ هەولێر و دەست دەکا بە وانە گوتنەوە و فێرکردن.

قوتابییەکی ناسراو موفەقەدین، ئەبولبەرەکاتی ئیبنولمستەوفی ئەربیلی بووە. موفەقەدین هەر لە سەردەمی منداڵییەوە، بەهۆنینەوەی شیعر و هۆنراودوە خەریک بووە و شیعرەکانی لەوپەڕی هەست بزوێنیدا و پوختی دان. دوو بەرهەمی لە پاش بەجێ ماوە: دیوانی شیعرە عەرەبییەکان و کۆمەڵە نامیلکەیەکی بە زمانی عەرەبی.

یەکێ لەوانەی پەسنی موەفەقەدینی کردووە، سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبی بووە. موەفەقەدین ئەربیلی لە ساڵی (٥٨٥ک) کۆچی دوایی کردووە.

* ابن خلکان، ج٢، ص٢٤، الاعلام، ج٨، ص٢٣

*** قازی زیائودین عوسمانی هەزبانی مارانی**

زیائودین ئەبوعەمر عوسمانی هەزبانی، لە هۆزی بەنی ماران، کوڕی عیسا کوڕی دەربازی کوڕی پیران، زانایەکی گەورەی فیقهی شافیعی بووە کە خوێندنی خۆی لە هەولێر لەلای ئەبولعەباسی کوڕی عەقیل دەست پێ کرد و پاش ئەوە چوو بۆ دیمەشق و لە کۆڕی دەرسی ئەبوسەعید کوڕی عەبدوڵای کوڕی عەسرۆن و ئەبولجیوش عەساکەری کوڕی عەلی بەشدار بووە و بەفێربوونی فیقە و حەدسیەوە خەریک بوو.

پاشان چووە بۆ قاهیرە و لەوێ نیشتەجێ بوو و ماوەیەک جێنشینی براکەی قازیولقوزات سەدرەدین عەبدولمەلیکی هەزبانی بوو. لەساڵی ٥٦٦ک لە میسر بوو بە دادوەر و وتڕای دادوەری کردن، تاکو دوایین ڕۆژی ژیانی خۆی بەوانەگوتنەوە خەریک بوو. زیائودین لە ئەدەب و ئوسوول و فیقە و زۆربەی زانستە باوەکانی ئەو سەردەمە مامۆستا بووە. بەرهەمی زۆری لە پاش بەجێ ماوە: لەوانە، شیکردنەوەیەکی لەسەر (المذهب) لە فروعدا، کە

دەقەکەی شێخ ئەبوئەسحەقی شیرازی کۆی کردۆتەوە و کتێبی (الاستقصاء لمذاهب الفقهاء) لە ٢٠ بەرگدا و شیکردنەوەیەک لەسەر (الملع) لە ئوسوولی فیقەدا. ساڵی لەدایکبوونی (٥١٦ک) و ساڵی کۆچی دوایی (٦٠٢ک) تۆمار کراوە.

* (تاریخ ابن خلکان، ج١، ص٣١١. طبقات الشافعیة، ج٥، ص١٤٣. الاعلام، ج٤، ص٣٧٥)

*** ئەبوحامید عیمادەدین محەمەد ئەربیلیی شافیعی**

ئەبوحامید کوڕی یونس کوڕی محەمەدی کوڕی منعە و برای کەمالەدین ئەبولفەتح و پێشەوایەکی فیقە و ئوسووڵ بووە لە شاری هەولێر. خوێندنی خۆی لەلای باوکی دەست پێ کرد و پاشان ڕۆیشت بۆ بەغدا و لە قوتابخانەی نیزامییە لە پۆلی وانەکانی سەدیدەدین محەمەدی سەڵماسی و ئەبومەحاسن یوسفی دیمەشقی بەشدار بووە و سوودی وەرگرتووە و زانستی حەدیسی لە ئەبوحامید محەمەدی کوڕی ئەبورەبیع غرناتی و زانایانی دیکە بەهرەمەند بووە پاش گەڕانەوەی بۆ هەولێر، کەوتووەتە بەردڵی نوورەدین فەرمانڕەوای ئەو شارە و هەندێ ڕاسپاردەی تایبەتی لەلایەن ئەو میردوە پێ سپێردراوە. ئەبوحامید عیمادەدین بەرهەمی زۆر بووە، بۆ نموونە: (المحیط في الجمع بین المهذب والوسیط)، شیکردنەوەیەکە لەسەر کتێبی (وجیز)ی ئیمام غەزالی، کتێبێکی بەناو (التحصیل) لە هونەری جەدەلدا و کتێبێکی لەسەر باوەڕەکان (عقاید) نووسیوە.

ئەبوحامید، سەرەڕای پلەی زانستی، مرۆڤێکی پارێزکار و خاکی بوو، هیچ کات جلکی نۆی و بۆشناغی لەبەر نەکرد. لە ساڵی ٦٠٨ی کۆچی لە مووسڵ کۆچی دوایی کرد.

* (ابن خلکان، ج١، ص٤٧٦، طبقات الشافعیة، ج٥، ص٤٥، الاعلام، ج٨، ص٣٤ هدیة العارفین)

*** عومەر خەلەکانی ئەربیلی**

عومەری کوڕی برایم کوڕی ئەبی بەکر خەلەکانی، برای شەهابودین محەمەد و مامی قازیولقوزات شەمسەدین ئیبنی خەلەکان نووسەری مێژووی بەناوبانگی (وفیات الاعیان)ە. لە هەولێر دەژیا و لە زانایان و ئەدیبانی بەناوبانگی ئەو شارە بووە و تا ساڵی (٦٠٩ ک) کە کۆچی دوایی لەو شارە بەوانە گوتنەوە خەریک بووە.

* (طبقات الشافعیة، ج٥، ص١٣٠)

*** شەهابەدین محەمەد خەلیکانی ئەربیلی**

شەهابەدین محەمەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەبی بەکر، لە زانایانی ناسراو کۆتایی سەدەی شەشەم و سەرەتاکانی سەدەی حەفتەم، خەڵکی گوندی خەلیکانی دەوروبەری هەولێرە. لە مێژووی (التحفة السنیة في تاریخ القسطنطنیة)، چاپی بەیرووت، ساڵی (١٨٨٧ز)، نووسراوە: "خەلیکان زێدی ئیبنی خەلەکان (المورخ و الراوي المشهور كان في مدینة اربیل من كوردستان) "ە. کەواتە خەلیکان ناوی شوێنە و شێوەی بێژکردنی دروستی (خەلیکان) بووە کە پاشان گۆڕاوە بە شێوە (خەللەکان = خلکان)ی لێ هاتووە و، چونکە شەهابەدین و ئەندامانی دیکەی ئەم خێزانە، لەم شوێنەوە هاتوون، بە کوڕانی خەللەکان(ابناء خلکان) ناسراون. بەڵام بەرەبەرە ناوبانگی ئیبنی خەلەکان، بەقازی شەمسەدین مێژوونووسی ناوداری کوڕیرئەم شەهابەدینە تایبەت دراوە و بۆتە ناوێکی تایبەت بەو. شەهابەدین محەمەد، لە مامۆستایانی ناوداری شاری هەولێر بووە و لە ڕێکەوتی (٦١٨ک)دا کۆچی دوایی کردووە.

* طبقات الشافعیة سبكي، ج٥، ص٩ و ١٤پایان کتاب تاریخ وفیات الاعیان، ابن خلکان، بقلم نصر هوریني، ص٤١.

*** ئەبولقاسم عیزەدین نەسری ئەربیلی**

ئەبولقاسم، برازای ئەبولعەباس خدری کوڕی نەسری کوڕی عەقیلە و زانایەکی هەولێرە کە لە ساڵی (٥٣٤ک) چاوی بە دنیا پشکوت و لە زێدەکەی خۆی هەولێر دەستی بەخوێندن کرد. پاشان ڕۆیی بۆ بە غدا و ماوەیەک لە نیزامییە بە بەدەستهێنانی هونەر و زانستەکانەوە خەریک بوو. ئەمجا گەڕاوە بۆ هەولێر و پاش کۆچی دوایی مامی (٥٦٧ک)، لە جێگای ئەو بوو بەمامۆستا و وانەکانی دەگوتەوە، بەڵام پاش ماوەیەک، مەلێکی مەزن موزەفەرەدین فەرمانڕەوای هەولێر، دڵی لێیی هێشا. ئەبولقاسم بە ناچار (لە ڕێکەوتی ٦٠٣) هەولێری بەجێ

هێشت و چوو بۆ شاری مووسڵ و بە فەرمانی میری ئەوێ، وانە گوتنەوەی دەست پێ کردووە. سەرەنجام لە ڕۆژی هەینی ١٣ی (ربیع الاخر) ساڵی (٦١٩ک)دا ماڵئاوایی لە جیهانی فانی کرد.

کاتێ کە ئەبولقاسم لەبەر دڵئێشانی مەلیکی مەزنەوە، ناچار بوو هەولێر بەجێ بێڵێ، یەکێ لە دۆستانی بەناوی "ئەبودور یاقوتی رومی"، شاعیر و ئەدیبی ناسراوی بەغدا، قەسیدەیەکی بۆ نووسی و وێرای بەداخبوونی لەم ڕووداوە، ئاماژە دەکات کە لەبەرئەوەی هۆی ئەم ئاوارەییەی، دووزمانی و قسەلۆکی ناحەزانی ئەو بووە لەلای مەلیکی مەزن. ئەمەش سێ دێڕ لەو قەسیدەیە:

**انا ابن عقیل لا تخف سطوة العدی    وانا ظهرت ما اظمرت من عنادها**

**واقصتك یوما عن بلادك فتیة    رات فیك فضلا، لم یكن في بلادها**

**كذا عاده الغربان تكره ان تری    بیاض الشهب دون سوادها**

واتای ئەو سێ دێڕە: ئەی کوڕی عەقیل! لە هەڕەشەی دوژمنان مەترسە، ئەگەرچی ڕۆژێک بیانهەوێ کنیەیەکی لە دڵیاندایە، ئاشکرای بکەن. ناحەزان تۆیان لە زێدەکەت دوور کردەوە. چونکە لە تۆدا ئەو لایەنە باشانە هەبووە لە کەسانی دیکەدا نەبوو. ئەم ئاژاوەگێڕانە وەک قەلی ڕووڕەش وان، قەڵەڕەشەکانیش تووڕە دەبن، کاتێ لە جیاتی قەڵەڕەش، بازی سپی دەبینن.

* (تاریخ ابن خلكان، ج١، ص١٧١، طبقات الشافعیة، ج٥، ص١٦٣)

*** شەرەفەدین ئەبولفەزل ئەحمەد ئەربیلی**

شەرەفەدین ئەبولفەزل ئەحمەدی کوڕی شێخ کەمالەدین ئەبولفەتح مووسا، ناسراو بە "ئیبنی یونس" لە پێشەوایانی فیقە و مەزنانی مووسڵ بوو کە لە ساڵی (٥٧٥ک)دا لەدایک بووە و لە ساڵی (٦٢٢ک) کۆچی دوایی کردووە. لەلای باوکی خوێندن دەست پێ کرد و پاشان لە کوڕی وانەکانی مامۆستایانی ئەو سەردەمە، بەشدار بووە تا ئەو کاتەی پێ گەیشتووە.

شەرەفەدین زانایەکی دەروون پاک، خۆش ڕەفتار، میهرەبان، بەژن و باڵا ڕێک بووە و خاوەنی بیر و هۆش و حافیزەیەکی بەهێز بووە. لە قوتابخانەی مەلیکی مەزن (سوڵتان موزەفەر) کوڕی زەینەدین فەرمانڕەوای هەولێر، ساڵی ٦١٠ دەستی کرد بە وانە گوتنەوە. پێش ئەو مامۆستاکەی ئەوێ، باوکی قازی ئیبنی خەلەکان بووە. ئیبنی خەلەکان لە مێژووەکەی خۆیدا، (وەفیاتولعەیان)دا دەنووسێ: "باوکم کۆچی دوایی کردبوو و من بچووک بووم کە شەرەفەدین لە قوتابخانەکەی باوکم بۆ وانە گوتنەوەی دانرا، من لە پۆلی وانەکانی ئەو بەشدار دەبووم و سوودم وەردەگرت و هیچ کەسم لە دەسەڵاتی نووسین و مەنتیقی دروست و دەربڕینی ڕوون و پاراو وەک ئەو نەدی."

شەرەفەدین، لە ساڵی (٦١٧ ک) چوو بۆ حەج و لە کاتی گەڕانەوەی لە مووسڵ نیشتەجێ بووە و لە قوتابخانەی "قاهیریە" بە وانە گوتنەوە خەریک بووە.

شەرەفەدین، لە ساڵی (٦١٧ک) چوو بۆ حەج و لە کاتی گەڕانەوەی لە قوتابخانەی "قاهیریە" دەستی کرد بە وانە گوتنەوە و هەر لەوێ ڕۆژی دووشەممە ٢٤ ڕەبیع الاخر ساڵی ٦٢٢ک کۆچی دوایی کرد. ئەم زانایە بەرهەمی زۆر بووە، لەوانە: (غنیة الفقیە) لە شیکردنەوەی کتێبی (التنبیه) لە زانستی فیقە دا و (مختصر احیاء العلوم)ی ئیمام محەممەدی غەزالی دەکرێ ئاماژەیان پێ بکرێ.

* طبقات الشافعیة، ج٥، ص١٧. تاریخ ابن خلكان، ج١، ص٣٢. الاعلام، ج١، ص٢٤٦. هدیة العارفین، ج١ ص ٩١.

*** ئەبولعەباس سەلاحەدین ئەحمەدی ئەربیلی**

ئەبولعەباس سەلاحەدین ئەحمەدی کوڕی عەبدولسەیدی کوڕی شەعبان ئەربیلی، لە پیاوانی ئەدیب و زانای ناسراوی سەدەی حەفتەمە کە لە سەرەتادا پەردەدار (حاجب)ی مەلیکی موعەزەم، موزەفەرەدین فەرمانڕەوای هەولێر بوو، بەڵام پاش ماوەیەک کەوتە بەر ڕق و تووڕەیی مەلیک و زیندانی کرا. پاش ئازادی ڕۆیشت بۆ شام (ساڵی ٦٠٣ک) و، ماوەیەک لەلای مەلیک قاهیر بەهائەدین ئەیووبی و پاش ئەویش لەلای براکەی مەلیک موغیسی کوڕی مەلیک عادل بەکاری سکرتێری و نووسینەوە خەریک بوو. پاش مەرگی موغیس بەرەو میسر بەرێ کەوت و بوو بە نزیکانی دەرباری مەلیک کامل. پاش ماوەیەک کەوتە بەر ڕقی ئەویش و خستییە زیندان (لە ٦١٨ تا ٦٢٣ک) پاش ئازادی، بە گشتی لە کاری دیوان و دەرباری وازی هێنا و بە خوێندنەوە و نووسین و

شیعرەوە خەریک بوو. بەڵام، هەروا گەورە و گران بوو، تا ئەوەی کە لە ساڵی ٦٣١ کۆچی لە "رها" ماڵئاوایی لە ژیان کرد. لە شاری هەولێر لە ساڵی ٥٧٢ چاوی بە دونیا پشکوت. سەلاحەدین دیوانێکی شیعری لە پاش بەجێ ماوە و شیعرەکانی ناسک و هەست بزوێنن لە وانە:

**واذا رايت بنيك فاعلم انهم**
**قطعوا اليك مسافة الاجال**
**وصل البنون الى محل ابيهم**
**وتجهيز الاباء للسحال**

شاعیر لەم دوو بەیتەدا ئاماژە دەکا: کاتی کوڕەکان دەگەنێ و شایانی وەرگرتنی پلە و پایەی باوک دەبن، دەبێ لە ئامادەی سەفەرکردن بن و چاوەڕوانی گەیشتنی مەرگ بن.

دیسانەوە لە شیعرەکانی سەلاحەدین:

**اصنع ماشيئت انت المحبوب**
**مالي ذنب، بلي كما قلت: ذنوب**
**هل تسمع بالوصال في ليلتنا**
**تجلو صد القلب و تعفو و اتوب؟**

شاعیرانی هاوچەرخی سەلاحەدین، ڕێزێکی تایبەتیان بۆ دادەنا و بە پێشەنگیان دەزانی و لەگەڵی شیعریان گۆڕیوەتەوە. دوو دێری خوارەوە لە "شەرەفەدین کوڕی عونێن" شاعیری دیمەشقییە کە وێرای نامەیەک بۆ سەلاحەدینی نووسیوە:

**أبيك مالقيت من الليالي   فقد قصت نوائبها جناحي**
**وكيف يفيق من عنت الرزيا   مريض مايرى وجه الصلاح**

واتای شیعرەکە: ئەو ئازارانەی شەوی دووری خۆم لەبەر گرتن، پێشکەشی تۆیان دەکەم ئەو دەردانەی باڵەکانی منیان بڕی و دەسەڵاتی فڕینیان لێ زەوت کردم. ئەو کەسەی کە لە بینینی ڕۆحی سەڵاح بێبەش بێ، لە ئێش و ئازار چۆن ڕزگاری دەبێ؟

لە دێری کۆتاییدا، وشەی "سەڵاح" بە دوو واتا دێت. هەم دەکرێ بەواتای خێر و چاکە بێت و هەم دەکرێ "سەڵاح" ناوی ئەو کەسە بێت پێیدا هەڵگوتووە.

* الاعـلام، ج١، ص ١٤٦. تاريخ ابن خلكان، ج١، ص ٥٩، كشف الضنون، ج٢، ص٧٩٧.

*** شەرەفەدین محەممەد ئەربیلی**

شەرەفەدین محەممەد ئەربیلی کوڕی (ئەبولقاسم عیزەدین نەسر)ە - کە پێشتر ئاماژەمان بە باوکی کرد- شەرەفەدین پاش کۆچی دوایی باوکی، پیشەکانی ئەوی بە تایبەت وانە گوتنەوەی وەئەستۆ گرت. پیاوێکی ئەدیب و قەزان و شاعیر بوو. لە شیعرەکانی شەرەفەدین، هەندێ دێری کە لەبارەی دوورخستنەوەی لە بابی و بنەماڵەکەی لە هەولێر و بەراوردکردنی لە گەڵ هێرشی (کەرج)ییەکان بۆ شاری مەرەندی ئازەربایجان و تاڵان و بڕی ئەو خەڵکانە لەو شارەدا ـــکە هەردوو ڕووداوەکە هاوکات ڕوویان دابوو (ساڵی ٦١٢ک) و ئەمەش ئەو دێرە شیعرانەیە:

**ان يكن اخرجوا النساء من ال و**
**طان ظلما واسرفوا في التعدي**
**فلنا اسوة بمن جارت الكر**
**ج عليهم وأخرجوا من مرند**

شەرەفەدین لە ساڵی (٥٧٢ک) لە شاری هەولێر لەدایک بووە و لە ساڵی ٦٣٣ هەر لەو شارە کۆچی دوایی کردووە.

* تاريخ ابن خلكان، ج، ص١٧١

*** ئیبنولمستەوفی ئەربیلی**

ئەبولبەرەکات موبارەکی کوڕی ئەبی لفەتح ئەحمەد کوڕی موبارەک، مولەقەب بە "شەرەفەدین"، و ناسراو" ئیبنولمستەوفی"، پیاوێکی خاکی و سەخی و بەڕێز، وێچوو و دەریایەکە لە شیعر و ئەدەب و قسەزانی. کە لە ٥٦٤ک، لە هەولێر چاوی بە دونیا هەڵێنا. لە ساڵی٦٣٧ک لە شاری مووسڵ، لە تەمەنی ٧٣ ساڵیدا وەفاتی کرد.

ئیبنولستەوفی، زۆربەی کەماڵاتی تێدا کۆ ببووە و لە هەموو هونەرەکانی ئەدەب و ڕستەسازی (نحو)، زمان، کێش و سەروا، زانستی ڕەوانبێژی، شیعر و پەند و زانیاری عەرەبی شارەزا بووە و بە سەریاندا زاڵ بووە و لە زانستی حەدیس و هونەری ژمێریاری و کاروباری دیوانی و ئیداری بێ وێنە بووە. هونەرمەند و ئەدیبان و زانایان لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانی ئەبولبەرەکاتدا بازاڕیان گەرم بووە و لە بەرانبەر پێشکەشکردنی کاڵای بابیداری پەخشان و هۆنراوەدا خەڵات و دیاری و شتی باشیان وەرگرتووە. هەر زانا و ئەدیبێکی تازە هاتبێتە هەولێرەوە. لە پێشدا چووە

بۆ لای ئەبولبەرەكات و دیارییەكی بۆ بردووە.

ئیبنولستەوفی لە سەرەتادا، مەقامی "ئیستیفا"ی هەبووە، كە لەو رۆژگارەدا هاوتای "وەزیرایەتی" بووە. ساڵی ٦٢٩ك سەرەنجام لە كاری وەزارەت ماندوو بووە و بۆ ئەوەی دەرفەتی خوێندنەوە و نووسینەوەی زیاتر بێ، بۆ مووسڵ كۆچی كردووە و هەر لەوێش بەرەو دنیای هەرمان كۆچی دوایی كردووە.

ئیبنولستەوفی لە خانەدانێكی ناسراو بووە كە ژمارەیەكی زۆریان مەقامی سەرۆكایەتی و وەزیریان هەبووە. لەوانە: باوكی و مامی سەیفەدین ئەبولحەسەن عەلی كوڕی موبارەك یەكێ لە كوڕە مامەكانی پیاوێكی زانا بووە و كتێبی "نصیحة الملوك"ی ئیمام غەزالی لە فارسییەوە بۆ عەرەبی وەرگێڕا. بەڵام نووسراوەكانی ئیبنولستەوفی مێژووی هەولێر لە چوار بەرگدا بەناوەكانی "نباهة البلد الخامل فیمن ورده من الماثل"، "النظام" شیكردنەوەی شیعرەكانی "متنبي" و"ابوتمام" لە ١٠ بەرگدا، "اثبات المحصل في نیسبة ابیات المفصل" لە ٢بەرگدا، سرالصنیعیە"ی (ئەبوقوماش) لە بواری "هەڵكەوتەكانی ئەدەب"( نوادر ادب) و دیوانی شیعرەكانی.

ئیبنولستەوفی ئەم دێرە شیعرانەی خوارەوەی بەبۆنەی برینداربوونی سەر و باسك و دەستییەوە نووسیوە كە بەهۆی كەسێكی نەناسراو لە رێگەی چوونی شەوانەی بۆ مزگەوتدا بەسەری هاتووە، شیعرەكانی بۆ مەلیك موعەزەم موزەفەرەدین فەرمانڕەوای هەولێر نووسیوە. لەم شیعرانەدا ئەندامە بریندار و پێچراوەكانی بەمنداڵێكی شیرەخۆرە دەچوێنێ كە مەلۆتكەیان كردبێ:

| | |
|---|---|
| یا ایها الملك الذي سطواته | من فعلها یتعجب المریخ |
| ایات جودیك محكم تنزیلها | لاناسخ فیها ولامنسوخ |
| اشكو الیك وما بلیت بمثلها | شنعاء ذكر حدیثها تاریخ |
| هي لیلةٌ ففیها ولدت وشاهدي | فیما ادعیت القم والتمریخ |

* الاعلام، جلد ٦، ص١٤٩. تاریخ ابن خلكان، جلد١، ص٤٤٢- ٤٤٣



## * كەمالەدین ئەبولفەتح مووسا ئەربیلی

كەمالەدین ئەبولفەتح مووسا كوڕی شێخ رەزییەدین یونس كوڕی محەمەد كوڕی مەنعە لە ساڵی ٥٥١، لە مووسڵ لەدایك بوو. سەرەتا لەلای بابی دەستی بە خوێندن كرد. پاشان لە ساڵی ٥٧١ چووە بۆ بەغدا و لە مەدرەسەی نیزامییە لەلای كەمالەدین ئەبولبەرەكات عەبدورەحمان كوڕی محەمەد ئەنباری، ئوسووڵ و ئەدەبیات فێر بوو و لە ماموستاكانی دیكەی ئەو شارەش سوودی زۆری وەرگرت.پاش ئەوەی پێ گەیشت، گەڕاوە بۆ مووسڵ و تائەو كاتەی باوكی مابوو، زیاتر بە خوێندنەوە خەریك بوو، بەڵام لە دوای ئەو بوو بە مامۆستا و وانەی گۆتەوە و لە ماوەیەكی كەمدا ناوبانگی و زانستی لێرە و لەوێ بڵاو بووە خوێندكاران و توێژەرانی زانست، پۆل پۆل لەبەر سوودمەند بوون لە كۆڕی دەرسەكانی ئەو، بەرەو مووسڵ وەرێ دەكەون، بەو هیوایە كە بتوانن لە دەرسی ئەم مامۆستا زانا و هەڵكەوتووە بەهرەمەند بن و شوێنی بۆ خۆیان دەستە بەر بكەن.

ئیبنی خەلكان، لە مێژووەكەی خۆیدا دەنووسی: "كە لە رێكەوتی ٦١٦، لە مووسڵ چوومە خزمەتی كەمالەدین، ئەوی بە مامۆستای هەموو زانستەكان دەناسی."كەسانی هاوسەردەمی شایەدی دەدەن كە كەمالەدین لە ٢٤ هونەردا مامۆستا بووە، لەوانە ئوسوولی فیقە، فیقە، پزیشكی، حیكمەت،مەنتیق، فەلەكناسی، حیساب و، تەنانەت مۆسیقا و زانستی كاكەشان تەفسیر و حەدیس و تەورات و ئینجیلیشدا بە تەواوی ئاگایی هەبووە.

بەردەوام كۆڕی ئەم زانایە پڕ بوو لە ئەدیب و زۆر لە مامۆستایانی پایە بەرز كە زۆر جار بێ ئەوەی بیانناسێ لە جێگای دوورەوە، دەهاتن بۆ لای ئەو و لەگەڵ (عقال) و (گیاسان) لە كۆڕی دەرسەكانی دادەنیشن و گرفتی خۆیانیان لای ئەو چارەسەر دەكرد. عیماد ئەبوعەلی عومەری كوڕی عەبدولنوور سەناجی لەم بارەیەوە دەڵێ:

**کـمـال کمال الدین للعلم والعلي فهيات ساع في مساعيك يطمع**
**اذا اجتمع النظار من كل موطن فغاية كل ان تقول ويسمع**
**فلا تحسبوهم عن غناء تطيلسوا ولكن حياء واعترافا تقنعوا**

تەزکەرەنووسان ئاماژەیان بەم بەرهەمانەی کەمالەدین کـردووە: کـشف المشكلات لە تەفـسـیـری قـورئانی پیرۆزدا،کتێبێک لەسەر زاراوە و وشەکانی (قانون)ی ئبنی سینا، کتێبێک لە ئوسوڵ، (عيون المنطق، لغزفي الحكمة والاسرار السلطانيه) لە ئەستێرەناسیدا، (رسالة في البرهان على المقدمة التي اهملها ارشميدس في كتابه في تسبع الدائرة وكيفية اتخاذ ذالك وشرح الاعمال الهندسية).

کەمالەدین لە زێدەکەی خۆی، شاری مووسڵ، لە ١٤ ی شەعبانی ساڵی ٦٣٩ کۆچی دوایی کردووە.

* تاريخ ابن خلكان، ج ٢، ص١٣٢، طبقات الشافعيي. ج٥، ص١٥٨ الاعـلام، زركلي، ج٨، ص٢٨٨.

*** ئیبنی خەبازی ئەربیلی**

شەمسەدین ئەبولعەباس ئەحمەدی کوڕی حوسێن کوڕی ئەحمەد کوڕی مەنسوور ئەربیلی، ناسراو بە "ئیبنی خەباز" لە زانایانی ڕستەسازی (نحو) و شاعیرانی نابینایە کە لە (٦٣٧ یا ٦٣٩ک) لە شـاری هەولێـر کـۆچی دوایی کـردووە. هێندێ لە مـێـژوونووسـان بە ئەبوعەبدوڵا ناساندوویانە. لە بەرهەمەکانی:

شرح المقدمة الجزولية، شرح اللمع لابن جني، التوجيه في النحو، النهاية في النحو، الغرة المخفية في شرح الدرة الالفية لابن معطي، شرح الميزان العربية الابن انباري.

* الاعـلام، ج١، ص١١٤. كـشف الظنون، ج٣، ص١٩٨٩ هديةالعارفين، ج١ ص٩٥.

*** قازی ئەبوبەکر شیبلی ئەربیلی**

قـازی ئەبوبەکر کـوڕی ئیبراهیم شـیـبلی خـەلیکانی ئەربیلی لە عەشیرەتی کوردی زەرزایە، لە ساڵی ٥٧٦ لە هەولێـر لەدایک بوو و هەر لەوێش لە سـاڵی (٦٥٣ک) کـۆچی دوایی کـردووە. زانایەکی باوەڕپێکراوی سـەردەمی خۆی بوو کە لە "ئەخمیم" دادوەر بووە.

* طبقات الشافعية ج٥، ص٥٧.

*** جوبرەئیل شوجاع ئەربیلی**

جـوبرەئیـل، ئیبن لئـەوانی، ناسـراو بە "شـوجـاع" لە زانایانی کـوردی هەولێری بـوو. هاوچەرخی مـێـژوونـووسی ناودار قـازی ئیبن خـەلکان (٦٠٨-٦٨١) بووە، مـوفـتی شاری هەولێر بووە لە ناوەڕاستی سەدەی حەفتەمی کۆچی دەژیا. لە کتێبێکی (نفحات الانس)دا چاپی تاران، ساڵی (١٣٣٧ک.ه) لاپەڕەی ٥٢٥، ئاماژەی بەناوی عـارفێک بە ناو محەمەد ئەلئەوانی ناسراو بە "ئیبن القاید" کردووە کـە لە یارانی شێخ مـحـیـەدین عـەبدولقـادری گـەیلانی (٤٨٠-٥٦١) بووە و شـێخ عـەبدولقـادر ئەوی لە ریزی ئەولیا داناوە. لەوانەیە جوبرەئیل شوجاع، کوڕ و یان نەوەی ئەو (محەمەد ئەوانی) بێت.

(لغتنامەی دەخدا، حرف ج، ص١٩٧)

*** عیزەدین حەسەن ئەربیلی**

عـیـزەدین حـەسـەن کـوڕی مـحـەمـەد کـوڕی ئەحـمـەد، دانیشتووی هەولێر، زانایەکی شارەزای زانست و فەلسەفە بووە و لە ساڵی ٥٨٦ لە شاری نەسیبین لەدایک بووە. بۆ خوێندن چووە بۆ دیمشق و پاش تەواوکردنی خوێندنەکەی، هەر لەوێ ماوەتەوە و بە وانەگوتنەوە و فێرکردنەوە سەرقاڵ بووە. بەو شێوەیەی مێژوونووسان ئاماژەی پێ دەکەن، عـیزەدین ناشیرن و ناقۆڵا بووە لە نیعـمـەتی بینایش بێ بەش بـووە. بەڵام لەبەر زانایی و زانسـتی زۆری، بەردەوام خوازیارانی زانست وەک پەپوولە بە دەوری مۆمی وجوودی ئەوەوە لە نووری زانستی بەهرەمەند بوون. عیزەدین لەگەڵ دەوڵەمـەند و دەسـەڵاتداران ناکـۆک بووە. زۆر کـەم لە مـاڵ بەدەر کـەوتووە: سـەردانی کـەسی نەکـردووە. سـەرەڕای ئەمەش لەلای خەڵک ڕێزدار و گەورە و گران بووە. زانایان لە دوور و نزیکەوە بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی سەردانەوەی ئەو بن بەردەوام سەردانیان کردووە لە زانیارییەکانی بەهرەمەند بوون. لە ئەدەبیاتی عـەرەبی زۆر باڵادەست بووە و شیعری باشی هۆنیـوەتەوە، بەڵام شـیـعـرەکـانی هەجـوی توند و قەبیحی زۆر تێدایە. لە دەمەتەقێ و(جەدەل) و دەمبەدەم (مـناظرە)دا زۆر هاوتای نە بووە و کـەسـە نەیتـوانیـوە وەڵامـدەری بێ و مـوشـاعـیـرەی لەگـەڵ بکا. لە سـاڵی (٦٦٠ک) لە دیمشق کۆچی دوایی کردووە.

* الاعلام، ج٣، ص٢٣٢

*** کەمال ئەربیلی**

ئەبو عەبدوڵا ئەحمەد کوڕی یەحیا ناسراو بە کەمال ئەربیلی پیاوێکی عارف، زانا و بەکار بووە کە هەموو تەمەنی لە پێناو وانە گوتنەوەدا و پەرەسەندندا تێپەر کردووە و لە ڕێکەوتی (٦٥٥ک) کۆچی دوایی کردووە. شێخ محیەدین ئیمامی نەوادەی قوتابییەکی کەمال ئەربیلی بووە.

* طبقات ملا ابوبکر مصنف، چاپ، بەغدا. ص٥٨

*** ئەمینەدین عەلی ئەربیلی**

ئەمینەدین عەلی کوڕی عوسمان کوڕی عەلی کوڕی سلێمان سۆفی ئەربیلی، لە ساڵی (٦٠٢ ک) لە هەولێر لەدایک بووە و لە (٦٧٠ک) لە شاری "فیوم" کۆچی دوایی کردووە. پیاوێکی زانا و ئەدیب و شاعیرێکی ناسراو بووە. لە سەرەتای گەنجێتیدا، لە دەزگای مەلیک ناسر سەلاحەدین میری شام سپایی بووە. بەڵام دواتر دەستی لەو کارە هەڵگرتووە و ڕووی کردووەتە گۆشەگیری و خواپەرستی.

ئەمینەدین قەسیدەیەکی هەیە بەناوی "القصیدة الفاخر" بەزمانی عەرەبی کە هەر دێڕە شیعرێکی بەشێک لە هونەرەکانی (بەدیع)، لە شیعرەکانی:

**هديـــة عبد مـخلص فـي ولائة لها شاهد منها على عدم المال**
**وليست على قدري ولاقدر مالكي ولكنها جا ءت على قدرالحال**

* الاعـلام، ج٥، ص١٢٥، هدیە العارفین، ج١، ص٧١٢.

*** شێخ کەمالەدین ئەبولفەزایل سالار ئەربیلی شافیعی**

شێخ کەمالەدین ئەبولفەزایل سالار ئەربیلی شافیعی، کوڕی حەسەن کوڕی عومەر سەعید. لە زانایانی گەورە و پێشەوایان و فەقیهانی شام بووە. ماوەیەکی زۆر لە خزمەت "عەلامە تقیەدین کوڕی سەلاح شارەزوری"دا بە کۆکردنەوەی زانست و زانیارییەوە خەریک بووە و لە گفتوگۆ لەگەڵ مامۆستا ناودارەکانی دیکەی عیشقدا، زانیاریی مەعنەوی و زانستی زۆری "زەخیرە" کردووە. شێخولسوننە شیخ محیەدین ئیمام نەواوی لە قوتابییانی شێخ کەمالەدین ئەبولفەزایل بووە و لە کتێبەکەی خۆیدا بەچاکە ناوی بردووە.

ئەبولفەزایل دوای شەست و چەند ساڵ ژیان لە مانگی جەمادیولئوخرا ساڵی (٦٧٠ ک) کۆچی دوایی کردووە و چەند نووسراوەیەکی لە پاش بەجێ ماوە لەوانە: "مختصر روضە الحاکم" کە لە بنەڕەتدا ڕەوانی کۆی کردووەتەوە.

* طبقـات الشـافـعيـة، ج٥، ص٥٦، هدية العـارفين، ج١، ص٣٨٠

*** مەجدەدین، ئیبنی زەهیری ئەربیلی**

مەجدەدین محەمەد کوڕی ئەحمەد کوڕی عومەر کوڕی ئەحمەد ئەربیلی، ناسراو بە "ئیبنی زەهیر" پیاوێکی هەولێری بووە و بۆ بەدەستهێنانی زانست زۆربەی شارەکانی عێراق و شامی بە هەنگاوی هەوڵ و کۆششی خۆی پێواوە و لە هەر گوڵزارێ گوڵێکی چنیوە و سەرەنجام لە دیمەشق گیرساوەتەوە و هەر لەوێ لە ساڵی (٦٧٧ک) بارگەی لە هەواری ئاخیرت و جیهانی هەرمان خستووە. مەجدەدین پیاوێکی ئەدیب، شاعیر و فەقیهێکی زانا بووە و ئەم بەر هەمانەشی هەبووە: تذکـرە الاریب وتبصره لادیب، مختصر امثالا لشریف الرضی و، دیوانی شیعرەکانی بە زمانی عەرەبی لە دوو بەرگدا. ساڵی ٦٠٢ لەدایک بووە.

* الاعلام، ج، ص٢١٨.

*** زیائودین حەیدەری ئەربیلی**

زیائودین حەیدەری ئەربیلی، لە بنەماڵەی حەیدەرییەکان، پیاوێکی زانا بووە و لە شاری هەولێر دادوەر بووە. لە ساڵی (١٣٠٧ک) کۆچی دوایی کردووە.

کتێبی (غاية المرام في شرح براة الامام) بەرهەمی ئەو زانایەیە.

* نصاح المكنون، ج١، ص١٤١، هدية العارفين، ج١، ص٣٤٢

*** مەجدەدین ئەبومحەمەد عەبدوڵا ئەربیلی**

کوڕی حوسێن و لە زانایەکی بواری فیقە و ئوسووڵە کە لە هەولێر لەدایک بووە و لە دیمەشق نیشتەجێ بووە و لە زانستی تەجوید و خوێندنەوە، زانیاریی زۆری هەبووە و لە ساڵی (٦٧٧ک) کۆچی دوایی کردووە. مەجدەدین بێجگە

لە مەقامی زانستی، مروڤێکی خاکی، پارێزکار و داوێنپاک بوون.

* مشاهیر الاکراد، امین زکی بەگ.ج٢، ص٥١.

*** فەوزەدین ئەبوبەکر هەولێر**

ئەبوبەکر فەوزەدین کوڕی محەمەد کوڕی برایم ئەربیلی، پیاوێکی ئەدیب و شاعیر بووە لە ساڵی (٦٧٩ک) کۆچی دوایی کردووە. لە بەرهەمەکانی: (الالغاز الخفیة)، کە هۆنراوەیەکە هەزار ناوی تێدایە.

* هدیة العارفین ج١ ص٢٣٥

*** شێخ سەدیق کوڕی بەدر کوڕی جەناح ئەربیلی**

پیــــاوێکی لە خـــــواترس و رەوشت چاک بووە، لە دیاربەکرەوە کە تەمەنێکی زۆری لەوێ تاعەتی خوا کردووە و بە خەڵکی خوای بانگ کردووە و ئامۆژگاری کردوون بۆ حاشا لە خراپە و نزیکی لە چاکە و لە کۆتاییی تەمەنیدا هاوسێیەتی مەکەی هەڵبژاردووە. چین و توێژی جەماوەر لە عارف و عامی و میر و هەژار خۆشیان ویستووە و لە رێزگرتنیدا درێغییان نەکردووە، سوڵتانە ئەیبوبییەکانیش باوەڕیان بە زوهد و تەقـــــوای ئەو هەبووە، پەند و ئامۆژگارییەکانیان بە دڵ و گیان گوێ داوەتێ.

مەلیک مەسعوود، کوڕی مەلیک کامیل ئەیوبی - کە لە ساڵی (٦٢٦ک) لە مەکەی موکەڕەمە بەرەو دنیای هەرمان کۆچی کردووە، پێش مەرگی وەسیەتی کردووە تەرمەکەی بە شێخ سەدیق بسپێرن کە بەبێ هیچ رێ و رەسمێک وەک کەسێکی ئاسایی کفن و دفنی بکەن. شێخ، راسپاردەکەی بە جێ هێناوە و لە ئیحرامی خۆی کە چەندین ساڵ بوو حەج و عومرەی پێوە کردبوو، تەرمەکەیان پێ کفن کرد و تەنانەت لە ماڵی حەڵاڵی خۆی خەرجی ناشتنی پێ دابین کرد.

* تاریخ ابن خلکان، ج٢، ص٥٢.

*** قازیولقوزات شەمسەدین ئەحمەد ئەربیلی "ئیبنی خەلەکان"**

شەمسەدین ئەبولعەباس ئەحمەد، ناسراو بە "ئیبنی خەلەکان" ئەربیلی شافیعی، کوڕی ئیبراهیم خەلیکانییە. لە قازی ئیبنی خەلەکان، یازدەی مانگی ربیع ولئاخری ساڵی (٦٠٨ک) لە شاری هەولێر لەدایک بووە و لە سەرەتای پێگەیشتنییەوە، لەلای باوکی بەخوێندنەوە خەریک بووە. دوای مەرگی باوکی چوو بۆ مووسڵ و لەوێ لای شێخ شەهابەدین ئەبولحەسەن یوسف کوڕی شەداد، بە تەواوی فیقە فێر بوو و لە خزمەت ئەبولبەقا یەعیش کوڕی عەلی بۆ دیمەشق و وانەکانی عەلامە ئیبنی سەلاحی شارەزووری تێ گەیشتووە. پاشان بەرەو قاهیرە وەرێ کەوتووە (٦٣٧) و لەوێ جێنیشینی قازیولقوزات بەدرەدین سنجاری بەو سپێردراوە. واتە ماوەیەک بۆتە دادوەر لە شام و دەسەڵاتی تەواو ئەم پیشەیەی هەبووە. پاش ئەو کەسێکی دیکە لە جێی دانراوە ئەو گەڕاوە بۆ میسر. پاش حەفت ساڵ، دووبارە بۆ کار بانگ کراوەتەوە و پلەی قازیولقوزاتی لە شام پێ دراوە.

قازی شەمسەدین ئیبنی خەلەکان، لە گەورە پیاوانی دەوڵەمەند و سەرۆکی زانایان و ئەدیبانی سەردەمی خۆی بووە. گەلێ شاعیر بەردەوام لە دەزگای دەسەڵاتی ئەودا ئامادە بوون و خەڵات و پاداشی ئەویان پێ براوە و قەسیدە و شیعری پاراویان پێدا هەڵگوتووە.

لەوانە رەشیدەدین فاروقی لەبارەی دادوەریی ئەو لە شام و ماوەی وەلاتانی لەو پیشەیە لە قەسیدەیەکیدا گوتوویە:

**انت في شام مثل يوسف في مصر وعندي ان الكرام جناس**
**ولكل سبع شدادٌ وبعد السبع عام فيه يغاث الناس**

و ئەوەی دیکە گوتوویەتی:

**أذقت الشام سبع سنين جدبا　غداه هجرته هجرا جميلاً**
**فلما زرته من ارض مصرٍ　مددت عليه من كفيك نيلاً**

ئیبنی خەلەکان بێجگە لە شارەزایی لە زانست و ئەدەبیاتدا، بۆ خۆشی شاعیرێکی بەتوانا بووە و شیعرەکانی باش و پاراون. لە وانە:

**يارب ان العبد يخفي عيبه　فاستر بحلمك مابدا من عيبه**
**ولقد اتاك وماله من شافع　لذنوبه، فاقبل شفاعة شيبه**

هەروەها ئەم شیعرانە ئیبنی خەلەکان:

**وسرب ظباء في غدير تخالهم　بدورا بأفق الماء تبدو تغرب**
**يقول عذولي والغرام مصاحبي　اسالك عن هذي الصبابة مذهب؟**
**وفي دمك المطلول خاضوا كما ترى　فقلت لهم "دعهم يخوضوا ويلعبوا**

سرب: کاروان، قافلە، ران، ڤبا: ئاسکان و کینایەیە لە کچانی ئاسک ئاسا، غدیر: ئەستێرە، حەوز، ئیستەخر، عذول: لۆمەگەر، صبابە: عەشق و عاشقی، مذهب: رێگەچارە، رێگەی دەربازبوون. مطلول: خوێنی رژاو، خوێنی بە فیڕۆچوو. خاضوا (لە خوج): رۆچوون، مەلەکردن، لەئایەتی: فذرهم یخوضوا ویلعبوا حتى یلاقوا...

(سورەی معارج).

ئیبنی خەلەکان رۆژی شەممە ٢٦ی رەجەبی سالّی(٦٨١ک) لە دیمەشق کۆچی دوایی کردووە و لە (سەفەح قاسیون) نێژراوە. لە کۆکراوەکانی: مێژووە ناودارەکەی (وفیات الاعیان) و (انباء ابناء الزمان)، ژیان نامەی زۆربەی پیاوانی زانست و عیرفان و شیعر و ئەدەب و میران و فەرمانرەوایانیشە کە لە رووی تۆمارکردنی دروستییەوە و بەتایبەت سالّەکانی لەدایکبوون و وەفاتی ئەو کەسانەی باسی ژیانیان کراوە، باوەر پێکراوترین کتێبە.

* طبقات الشافعیة سبکي، ج٥، ص١٤. الاعلام، ج١، ص٢١٢. تاریخ ابن خلکان، پایان ج٢، نصر هوریني.

*** ئەبی فەخر ئەربیلی**

میر بەهائەدین عەلی کوڕی فەخرەدین عیسا کوڕی ئەبولفەتح ئەربیلی، ناسراو بە ئیبنی (فەخر) لە ئەدیبان و نووسەرانی پایە بەرزە کە پاش تەواوکردنی خوێندنەکەی، سەرەتا لە هەولێر لە خزمەت فەرمانرەوای ئەو شارەدا خزمەتی دەست پێ کرد و بوو بەسکرتێری ئەو. پاش ئەوە چوو بۆ بەغدا و لە رۆژگاری فەرمانرەوایی عەلائەدین ساحیبی دیوان، بوو بە ئەندامی (دار الانشا) و تا کۆتایی تەمەنی لەو مەقامەدا مایەوە. لەبارەی رێباز و مەزهەبی ئیبنی فەخر رەوایەتیی جیاواز هەیە: هێندێ بە شیعەی ئیمامییەی دەزانن و هێندێکی دیکەش بە سوننی و گرووپێکی تریش بە (زەیدی )یان داناوە، باوکی والی هەولێر بووە و پیاوێکی زانا بووە.

لە کۆکراوەکانی ئیبنی فەخر: المقامات الاربع، رسالة لطیف، کشف الغمة في مناقب الائمة و دیوان شیعری عەرەبی، ئیبنی فەخر لە سالّی (٦٩٢ک)کۆچی دوایی کردووە.

یەکێ لە شێعرەکانی:

**ایا هاجري من غیر جرم جنیته ومن دابه ظلمي وهجري، فدیته**

**اجرني، رعاك الله من نار جفوه وحر غرام بالعباد اصطلیته**

**ولن مسعفي فیما الاقی من الهوی فهجرك یاکل المنی ما نویته**

* (اثار الشیعة الامیة، ترجمة علي جواهر کلام، چاپ مجلس، ج٤، ص١٦٦، الاعلام، ج٥، ص١٣٥. ذیل کشف الظنون، ج٢، ص٨٩.)

*** مەجدەدین محەممەد ئەربیلی**

ئەبوعەبدوڵا مەجدەدین محەممەد ئەربیلی کوڕی ئەحمەد، شاعیرێکی سەدەی حەفتەمە کە لە سالّی (٦٠٧ک) لە هەولێر لەدایک بووە و بۆ بەدەستهێنانی زانست دەستی کرد بەگەڕان و سەفەر و لە خزمەت ئەدیب و زانایانی وەک ئەبوبەکر کوڕی خازن و سەخاوی و کاشغەری لە دیمەشق سوودی وەرگرتووە. پاشان ماوەیەک لە بەغدا و سەردەمێکیش لە دیمەشق بە وانە گوتنەوە خەریک بووە و لە سالّی ( ٦٩٧ک) کۆچی دوایی کردووە.

*** بەدرەدین حەسەن ئەربیلی**

بەدرەدین حەسەن ئەحمەد خەڵکی هەولێر، زانایەک بووە لە زانستی ئەدەب و مێژوو و پزیشکی شارەزا بووە و زۆر ولاّتان گەراوە و سەرەنجام لە دیمەشق گیرساوەتەوە. بەرهەمەکانی: مدارس دمشق جوامعها وربطها وحماماتها). وروضة الجلیس ونزهة الانیس.

بەدرەدین لە سالّی (٦٦٣ک) لە دایک بووە و لە سالّی(٧٢٦ک) کۆچی دوایی کردووە.

*** ئیبنولخەتیب ئەربیلی**

ئەبولمەعالی قازیولقوزات بەدرەدین محەممەد کوڕی عەلی کوڕی ئەحمەد ئەربیلی مووسلّی، ناسراو بە"ئیبنولخەتیب" زانایەکی خەڵکی هەولێر بووە، شارەزا بە زانستی مۆسیقا و مامۆستا لە زانستی رستەسازی (نەحو) و فیقە بووە جارێک لەلایەن فەرمانرەوای مووسلەوە وەک بالّوێز راسپێردرا بۆ ولاّتی میسر و لەو سەفەرەدا شایستەیی

خۆی لەو كاروبارانەی پێی سپێردرابوو، دەرخست. ئیبنولخەتیب نووسەر و شاعیریش بووە و بەرهەمی زۆرە. وەک: شیكردنەوەیەكی لەسەر "كافیە " لە ڕستە سازی (نحو)دا، شیكردنەوەیەكی لەسەر "شافیە" لە وشەسازی (صرف)دا و زنجیرە پەراوێزێكی لەسەر كتێبی "الحادي" لە فروعدا و كۆمەڵە پەراوێز نووسینێكی پۆلینكراو لەسەر "تسهیل"ی ئیبنی مالیک و نامیلكەیەكی لەبارەی پێناسەی زانستەكانەوە. یەكێكی دیكە لە بەرهەمەكانی: (ارجوزە) یەک لەسەر ئاواز و گۆرانییەكانە كە لە (٧٢٩ك)دا هۆنیوەتەوە و ناوی "جواهر النظام في معرفة الانغام "ی لەسەر داناوە.

ئیبنولخەتیب لە ساڵی (٦٨٦ك) لەدایک بووە و(٧٥٥ك)كۆچی دوایی كردووە.

* الاعلام، ج٧، ص١٧٦، هدیة العارفین، ج٢، ص١٣٥

*** عەلامە عەبدولڕەحیم بارزانی**

لە فەقیهان و زانایانی بواری حەدیس لە سەردەمی خۆیدا بووە، لە كوردەكانی ناوچەی بارزانی كوردستان و لە سەرەتای سەدەی نۆیەم ژیاوە.

حافیظی كوڕی حەجەر عەسقەلانی لەو ئیجازەی گێڕانەوەیان وەرگرتووە.

*** عەلائودین تەبیب ئەربیلی**

عەلائەدین كوڕی وەلیەدین زانای هەولێری، شارەزا بەهەموو زانستە عەقڵی و نەقلییەكان بووە. پسپۆڕ بووە لە پزیشكی و دەرمانسازیدا، لە شاری حەڵەب دەژیا و وێڕای وانەگوتنەوە خەریكی دەرمانكردن و چارەكردنی نەخۆشەكانیش بووە و لە ساڵی٩٢٦ لە جیهانی فانی ماڵئاوایی كردووە.

* مشاهیر الاكراد ج٢، ص٧١.

*** مەحموود كوڕی ئەحمەد ئەسكەلیبی (سەدەی دەهەم)**

مەحموود كوڕی ئەحمەد ئەسكەلیبی ناسراو بە "ئیبنی بەرزان" باوكی لە كوردە بارزانییەكان بووە كە بە ئەسكلیب بۆ ناوچەكانی ئەسكلیب توركیا كۆچی كردووە و مەحموود لەوێ هاتۆتە دونیا، پاش ئەوەی فامی كردۆتەوە دەستی بە خوێندن كردووە و بە هەوڵ و كۆششی زۆر، بەدوای مەبەست و ئامانجەكەی داچووە و سەرەنجام لە خزمەت زانای گەورە، موفتی ئەبولسەعد عیمادی بڕوانامەی زانستی بەدەست هێناوە. ئیبنی بارزان لە ئەدەبی عەرەبدا ناوبانگێكی زۆری هەبووە و لە مانگی شەوالی ساڵی (٩٨٣ك) لە شاری ئەستەمبوڵ كۆچی دوایی كردووە.

*** سیبغەتوڵلا ئەفەندیی حەیدەری ماوەرانی**

سیبغەتوڵلا ئەفەندیی حەیدەری ماوەرانی، كوڕی ئیبراهیم حەیدەری كوڕی حەیدەری دووەم، كوڕی حەیدەری یەكەم لە خاندانی حەیدەرییە ماوەرانییەكان، لە لیوای هەولێرە. كاتی لەدایک بوونی، باپیرە گەورە، حەیدەری دووەم لە ژیاندا بووە و ویستوویە ناوی لێ بنێ. لە ئیبراهیم حەیدەری دەپرسێ ناوی بنێین چی؟ ئیبراهیم وەڵامی دەداتەوە سیبغەتوڵلا، باپیرەگەورەی دەڵێ "وهو صبغهچ" بە هەڵكەوت ئەم ڕستەیە بەپێی حیسابی ئەبجەد بەرانبەرە لەگەڵ (١١١٤ك) واتە ساڵی لەدایكبوونی.

سیبغەڵلا ئەفەندی حەیدەری یەكەمین كەسە لە زانایان خاندانی حەیدەرییەكان كە كۆچی كردووە بۆ بەغدا. كۆچكردنی ئەم زانا كوردە بۆ بەغدا، زۆربەی خوێندكارە كوردەكانی بۆ خوێندن بۆ ئەوێ ڕاكێشا و زانایانی بێ ژماری لە كوردستان پاش ئەو، ڕێگەی بەغدایان گرتووەتە بەر لەو شارە ماونەتەوە. كۆچی سیبغەتوڵلا بۆ بەغدا لە نیوەی دووەمی سەدەی ١٢ دا بووە و والیی ئەو كاتەی ئەوێ بەناوی ئەحمەد پاشا، بەخێرهاتنی كردووە و پێشوازیی گەرمی لێ كردووە. زۆری پێ ناچی دەبێتەوە سەروكی لێژنەی زانستی بەغدا و بە (شیخ المشایخ)ی بەغدا ناوبانگ دەردەكا.

سیبغەتوڵلا ئەفەندی پاش چەندین ساڵ وانە گوتنەوە وە خزمەتی شایانی زانستی و ئایینی لە ساڵی (١١٨٧ك) كۆچی دوایی كردووە و دوو كوڕی زانا و بەڕێزی لە پاش بەجێ ماوەتەوە حاج محەمەد ئەسعد سەدرەدین حەیدەری و ئەوی دیكەشیان عەبدوڵا ئەفەندی حەیدەری زانای ناوداری كوردە عەلامە بێتووشی لە شاگردانی سیبغەتوڵلا بووە.

بەرهەمەكانی ئەم زانایە، تەعلیقات لەسەر (المحاكمات والعقاید) بەرهەمی باپیرە گەورەی ئەحمەد كوڕی حەیدەر و تەعلیقات لەسەر (الفوائد الضیافة) لە ڕستەسازی (نحو)دایە.

* الاعلام، ج٣، ص٢٨٦. هامش كتاب البيتوشي، (کۆکردنەوەی شێخ محەممەدی خاڵ).

*** محەممەدی ئەفەندی شەقلاوەیی**

محەممەدی ئەفەندی کوڕی ئەبی بەکر خەڵکی شەقلاوەی سەر بە پارێزگای هەولێرە، مرۆڤێکی زانا بووە لە زانستەکانی (حیکمەت و کەلام)دا بالادەست بووە و لە ئەدەبیاتی عەرەبدا مامۆستا بووە کە پاش تەمەنێک وانە گوتنەوە و توێژینەوە لە ساڵی (١١٨٩ک) کۆچی دوایی کردووە.

* مشاهير الكرد، امين زكی بەگ، ج٢، ص١٨٠

*** مەلا جەرجیس ئەربیلی**

مەلا جەرجیس کوڕی مەلا محەممەد ڕەشادی، پاش تەواوکردنی خوێندنی سەرەتایی ئەو سەردەمە، بۆ درێژەپێدانی خوێندن شارەکەی خۆی بەجێ هێشتووە، ماوەیەک لە ماوەران لەلای دوو زانای مەزنی حەیدەری بەناوەکانی "مەلا فەتحوڵڵا حەیدەری" و براکەی، "مەلا ئیسماعیل حەیدەری" خویندنەوویەتی و پاشان قوتابی سیبغەتوڵڵا ئەفەندیی حەیدەری بووە و پاش تەواوکردنی کار و وەرگرتنی ئیجازە لە هەولێر وانەی گوتووتەوە.

لە ساڵی (١١٨٠ ک) چووە بۆ مووسڵ و ماوەیەک لەوێ وانەی گوتووەتەوە و پاشان گەڕاوەتەوە بۆ هەولێر و شەش ساڵ و ماوەیەک لەوێ لەسەر داوای والی مووسڵ (سلێمان پاشا جەلیلی) دووبارە چۆتەوە بۆ مووسڵ و لە (جامع عمرية) وانەی گوتووەتەوە.

لە ساڵی (١٢٠٤ ک) شێخ محەممەد ئەمین عومەری یەکێ لە زانایانی مووسڵ کۆچی دوایی کردووە و وانەگوتنەوە لە قوتابخانەکەی ئەو کەوتۆتە ئەستۆی مەلا جرجیس.

مەلا جەرجیس عەللامەی سەردەمی خۆی و لە فەقیهی سەردەمی تاقانە بووە. لە تەقوا و پارێزکاریدا ناوبانگی ڕۆیشتووە. ژمارەیەکی زۆر لە زانایانی مووسڵ و هەولێر لەوانە: شێخ سەلاحەدین یوسف ئەفەندی کوڕی ڕەمەزان قوتابی ئەو بوون و لەو ئیجازەیان وەرگرتووە:

مەلا جەرجیس شاعیریش بووە، ئەمەش چەند دێرە لە شیعرێکی ئەو بە عەرەبی.

**و رب حمامة بالدوح باتت　　بأشجان وحزن مستكن**
**علی ايام وصل حيث فاتت　　تعيد النوح فننا بعد فنا**
**أقاسمها الهموم اذا اجتمعنا　　وتروي قصة الاشواق غني**
**علی حكم الهوی فنيا اقتسمنا**
**فمنها النوح والعبرات مني**

واتای دێرەکان: چەن زۆرن ئەو کۆترانەی کە لەسەر لک و پۆپی درەختان بەخەم و پەژارەی نهێنییەوە سەریان کردووە بە ژێر باڵی خۆیاندا لە ڕەنجی بەیەک نەگەیشتن، خۆ هەڵدەگلۆفن و هاوارەکانیان بە ئاهەنگ و نەوای جۆراوجۆر دەردەبڕن.

کاتێ بەدەوری یەکەوە کۆ دەبینەوە، خەم و پەژارەکانمان لە نێوانماندا دابەش دەکەین و ئەوانە چیرۆکی عەشق و دڵداری لە زمانمانەوە دەگێڕینەوە و بەپێی عەشق و دڵداری لە زمانی منەوە دەگێڕنەوە و بەپێی عەشق و ئەرک کارەکەمان وا دابەش کردووە، کە ناڵە و هاوار لەوان بێت و ئەشک و حەسرەتیش لە من.

ئەم چەند دێرەش دێرەش لەوان، کە بۆ دۆستێکی بەناوی سەعدی نووسیوە.

**كن معافا وبالسعادة دائم　　وعمود السعود بالعز قائم**
**انت سعد ألزمان في كل حال كيف نرضي بان نری السعد نائم**
**ارتجي ربنا الكريم شفاء　　عاجلا سيدي! رفيع الدعائم**
**بارك الله صومكم بهناء　　وثناء وعز مجد ملائم**

مەلا جەرجیس لە ساڵی (١٢٠٦ک) لە مووسڵ کۆچی دوایی کردووە.

* (غايه المرام)

*** مەلا عەبدوڕەحمان جەلی کۆیی**

مەلا عەبدوڕەحمان کوڕی مەلا عەبدوڵا یەکەم کوڕی محەممەد (مەلازادە) لە زانایان و مامۆستایانی ناودار و سەرۆکی جەلی لە شاری کۆیە لە کوردستانی عێراقە و تا کۆتایی تەمەنی لەو شارە وانەی گوتووەتەوە و عەبدوڕەحمان پاشای بابان (وەفات ١٢٢٨ ک) بەڕێوەبەر و بەرپرسی قوتابخانەکە و لە قوتابییەکانی ئەو بووە.

مەلا عەبدوڕەحمان لە ساڵی (١٢١٧ک) کۆچی دوایی کردووە.

* علماؤنا في خدمة العلم والدين

*** عوبەیدوڵا ئەفەندی حەیدەری ماوەرانی**

عوبەیدوڵڵا ئەفەندی حەیدەری ماوەرانی کوڕی سیبغەتوڵڵا ئەفەندی (یەکەم) حەیدەری و برای محەمەد ئەسعەد سەدرەدین، لە خانەدانی ناوداری حەیدەرییەکانە و لەو لقەیە کە لە ماوەرانی کوردستانەوە بەرەو بەغدا کۆچیان کردووە موفتی حەنەفییەی بەغدا و لە زانایانی گەورە و مامۆستایانی ناوداری عێراق بووە.

عوبەیدوڵڵا ئەفەندی لە هەرەتی لاوێتییدا قوتابێتی (قطب الطريقه مولانا خالد ذي الجناحين)-کە لەوکاتە دا لە سلێمانی حەوزەی وانە گوتنەوەی هەبووە هەڵبژاردووە و لە خزمەتیدا سوودی بینیوە تا ئەو کاتەی خوێندنی تەواو کردووە، پاش گەڕانەوەی مەولانا لە هیندستان، جارێکی دیکەش عوبەیدوڵڵا ئەفەندی دەچێتەوە خزمەتی و دەبێتە مریدی ئەو و زۆر حەزی لە (سیروسلوک) بووە و لە سەفەر و لە حەزەردا لەگەڵی دەچێتە بەغدا و لەوێشەوە دەچێ بۆ دیمەشق. لە سەرەتای سلوکەوە، مەشکە ئاوێک و گوزەیەکی بەشانەوە بوو لەسەر ڕێگاوبانەکان ئاوی بەخەڵک دەدا و لەبەر ئەوریازەت و خۆشکێنییەی شایستەیی مەقامی ڕێبەریکردنی لە تەریقەتدا بەدەست هێنا و لەلایەن مەولاناوە ئەو ڕێگەیەی پێ درا. پاش گەڕانەوە لە دیمەشقەوە بۆ بەغدا فەرمانی مەولانا بۆ ڕێنوێنی کرد و ڕێبەریکردنی ڕێبازی نەقشبەندی، بە وانە گوتنەوەش خەریک بوو و سەرەنجام بوو بە موفتی حەنەفییەی بەغدا.

ئەم زانا بەرێزە، کە لە عیرفانیشدا مەقامێکی بەرزی هەبوو، خاوەنی زۆر بەها ئەخلاقی و ڕەوشتی باییدار بووە. بۆ ناسینی کەسایەتیی زانستی ئەو چەند رستەیەک لە نامەیەکی بۆ عەلامە عەبدوڵا بێتوشی مامۆستای زانست و ئەدەبی ئەو سەردەمە، لە وەڵامی نامەکانیدا نووسیویتی. لێرەدا دەگێرینەوە.

ئەم نامەیە زۆر بە تێروتەسەلی و لەوپەڕی پاراوی و ڕەوانبێژیدا نووسراوە:

"أهدي من التسليمات رياضا تفتقت من كمام الولاء ازهارها وتدفقت من ينابيع الوفاء انهارها وسجعت بمحض الوداد اطيارها ورقت من نسيم الاخلاص أصائلها واسحارها و..." تا دەگاتە ئەو جێگایەی کە دەڵێ:" الى من ربته المكارم في حجرها، وغذته من افاويق درها حتى ترعرع وبرع وورد منه الفضل وشرع و...رابطة نظام العقيدة من صبغة الله باحسن صبغة وروى حديث قديم شرفها الاعلام، باقلام الالسنة والسنة الاقلام، وصارصيتها مدى دهر لاشهر وازدهت بها ماوران على ماوراء النهرو...اعني به شمس العارف المشرقة في الافاق، شيخ مشايخ العراق على الاطلاق، العلامة الذي اسبح العلم منه متقلد بالصارين الهندي، حضرة سيدنا المكرم عبيدالله بن صبغة الله افندي و..."

**ان فاخرت دجلة في فيضها علم عبيدالله، قل: أقصر**
**فعلمه ليس له معبرٌ وكم رأينا لك من معبر**
**ودالسما تشري علاه ولو بلشمس ولمريخ والمشتري**
**اقلامه تفعل في مهجه الحاسد ما يفعله السمهري**
**زهت به بغداد زهو الربا**
**بالنبت، غب العارض المطر**

* بغية الواحد في مكتوبات مولانا خالد، ص٢٠٠-٢١٨، دمشق ١٣٤٤ه.ق: البيتوشي، بغداد، ص٢٢٥-٢٥٢.

*** سەدرەدین محەمەد ئەسعەد ئەفەندیی حەیدەری:**

عەللامە سەدرەدین محەمەد ئەسعەد ئەفەندیی، کوڕی عەبدوڵا ئەفەندیی کوڕی سیبغەتوڵڵا ئەفەندیی حەیدەریی حوسێن ئاوایی ماوەرانی، سیمایەکی درەوشاوەی دیکەی خانەدانی زانست و فەزیلەتی حەیدەرییەکانە. لە زانایانی گەورەی بەغدا و موفتیی حەنەفیی مەزەبی لەوێ بووە، ولە هەموو زانستەکانی مەعقول و مەنقولدا تاقانەی سەردەمی خۆی بووە.

ئەسعەد ئەفەندی تەریقەتی نەقشبەندی لە مەولانا خالیدی نەقشبەندی (ذی الجناحين) وەرگرت. لە گەورەپیاوانی نزیکی ئەو بووە، بەڵام زۆر حەزی لە ئیرشاد نەبووە و کاری وانە گوتنەوە و فتوادانی درێژە پێدا و لە ساڵی (١٢٤٢ک) - پاش کۆچی دوایی مەولانا- لە شاری بەغدا ماڵئاوایی لە ژیان کرد. ئەو زانایە گەلێک بەرهەمی لە بواری پەراوێز نووسین (حەواشی) لەسەر (توحفە)، (تەعلیقاتی خەیاڵی) لە عقاید، لەسەر (سعدینی) لە (سەرف)دا، پەراوێز لە (قەرەباغی) لە مەنتیقدا، پەراوێز لەسەر (الدرالمختار) لە فیقهی حەنەفیدا، نووسیوە.

* بغية الواجد، ص١٨٠: یادی مەردان، ص٣٧٧

*** مەلا محەممەد ئەفەندیی خەتێ رەواندزی**

خەتێ - كە بەهەڵە بە (خطی) دەینووسن- گوندێكە سەر بە قەزای رەواندز و بەشێكە لە ناوچەی شەقڵاوەی سەر بە هەولێر. عەلامە مەولانا محەمەد ئەفەندی لەم گوندە چاوی بە ژیان هەڵێناوە مامۆستایەكی زانا و شارەزا و موفتییەكی بەناوبانگ بووە، كە زۆربەی زانایانی ئایینی ئەم دواییانەی كوردستان لە دەستی ئەو ئیجازەیان وەرگرتووە. لەوانە: وەك (حجة الاسلام) شێخ جەسیم مەردووخی و حاجی مەلا ئەحمەدی (نۆدشی)، ناسراو بە "حاجی مامۆستا" عەلامە عومەر ئەفەندیی خەیلانی رەواندزی و مەلا عەبدوڵا پیرە باب و (خاتمة المحققین) مەولانا عەلی قزڵجی تورجانی. ئەم زانایە خۆی لەلایەن مەلا عەبدورحمانی رۆژبەیانییەوە ئیجازەی پێ دراوە. مەلا محەممەدی خەتێ لە سەردەمی میر محەممەدی سۆران ناسراو بە "میرە گەورە" دەژیا و لە سالّی (١٢٤٤ك) بوو بە ناوبژیوانی ئاشتی لە نێوان ئەو و دەوڵەتی عوسمانی. ئەمڕۆ نەوەكانی مەلا محەممەد و شارەكانی دیكەی ئێران دەژین و زۆر زانای گەورەیان لێ هەڵكەوتووە.

*** كتێبی میرانی سۆران، حوزنی موكریانی**

**حاجی مەلا عەبدوڵا جەلی كۆیی**

حاجی مەلا عەبدوڵا كوڕی حاجی مەلا عەبدوڕەحمان جەلی كۆیی، زانا و مامۆستا و عارف و پیاوچاكی خەڵكی كۆیەیە. خوێندنی لای باوكی دەست پێ كرد و لە سالّی (١٢١٧ك) پاش وەفاتی بابی لە قوتابخانەی عەبدوڕەحمانی بابان لە كۆیە دەرسی گوتۆتەوە لە سالّی (١٢٣٢ك) گەیشتۆتە خزمەت پیری مەزن مەولانا خالید نەقشبەندی: پاش وەرگرتنی تەریقەت و شەش مانگ سەیر و سلووك ئیجازەی وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە بۆ كۆیە و وێڕای درێژە پێدانی بە كاری فێركردن و دەرسدانەوە، بە فەرمانی مەولانا جاروبار بە فێركردنی تەریقەتی نەقشبەندیشەوە خەریك بووە.

مەلا عەبدوڵا لە زانایانی بەناوبانگ و عارفانی ناسراوی سەردەمی خۆی بووە و ئەو جۆرەی تۆماریان كردووە گەیشتۆتە پلەی وەلی. چەند بەرهەمێكیشی هەبووە وەك هۆنراوەیەكی لە رەوشتی پێغەمبەری ئەكرەم (د.خ) بەناوی "وسیلة الوصول الی ساحة عنایة الرسول" و (تعلیقات)ی لە سەر (قسطلانی شرح صحیح بخاری)، پەراوێز نووسینی لەسەر (انسان العیون) و پەراوێز نووسینی لەسەر (جامع الاصول)ی ئیبنی ئەسیر و نامیلكەیەكی لەسەر پووچەڵبوونەوەی چاكەی سەدەقەی ئەو كەسەی كە قەرزی لە رادەی سامانەكەی بێت.

مەلا عەبدوڵا لە سالّی (١٢٤٦ یان ١٢٤٧ ك.م) كۆچی دوایی كردووە.

* هامش بغية الواجد، ص١٢٦: یادی مردان، ص٩٣: هدية العارفين، ج١، ص٤٨٩.

**عەللامە ئەبوبەكر ئەفەندیی یەكەمی هەولێری**

زانا و فەقیهی بەناوبانگ، ئەبوبەكر ئەفەندیی هەولێری، سەرقافڵەی بنەماڵەی زانست و زانیاریی ئەفەندییانی هەولێرە. زاتێكی مەزن و بەهرەدار بووە، كە گەلێك لە زانایانی ئەم دواییانەی كورد لەلای ئەو و كوڕەكانی فێری زانست و زانیاری بوون و مۆڵەتیان پێ دراوە.

ئەبوبەكر ئەفەندیی دانیشتووی هەولێر بووە و لە مزگەوتی جامیعی قەڵای هەولێر دەرسی گوتۆتەوە و تاكو نزیكەی (١٢٥٠ك.م) ژیاوە.

علماؤنا في خدمة العلم والدين

**عەللامە عومەر ئەفەندیی ئەربیلی**

عومەر ئەفەندیی ئەربیلی كوڕی ئەبوبەكر ئەفەندی، زانایەكی بەناوبانگی سەردەمی خۆی بووە. خوێندنی لەلای عومەر ئەفەندیی خەیلانی تەواو كردووە و، پاشان لە مزگەوتی (جامیعی قەڵا)- كە باوكی لەوێ دەرسی گوتووەتەوە- وانەبێژ بووە. عومەر ئەفەندیی پیاوێكی دەوڵەمەند بووە و خەرجی مەكتەب و فەقێكانی لە ماڵی خۆی دابین دەكرد. زانایەكی رێگەی پێ دراوە لە پۆلی وانەگوتنەوەكەی وانە بڵێتەوە، مەلا عەبدوڵای موفتی (دێشی)یە. عومەر ئەفەندی لە سالّی (١٣٠٩ك) كۆچی دوایی كردووە.

* (یادداشتەكانی نووسەر)

**میرزا محەممەد رەواندزیی رازنووس**

میرزا محەمەد رەواندزیی رازنووس (چیرۆكنووس و

مێژوونووس) سکرتێری تایبەتی میر محەمەدی ڕەواندز، ناسراو بە "میرەگەورە" (١١٩٨- ١٢٧٢)یە. شاعیر و زانایەکی گەورە بووە و سەرەڕای زمانی کوردی، شارەزای زمانی فارسی و تورکی و عەرەبیش بووە. تا کۆتایی نیوەی دوەمی سەدەی ١٣ ژیاوە. میرزا محەمەد کتێبێکی لەبارەی ڕووداو و بەسەرهاتەکانی سەردەمی فەرمانڕەوایی میرەگەورەی ڕەواندز بە زمانی فارسی هۆنیوەتەوە، کە ڕووداوەکانی ساڵانی (١٢٢٩ تا ١٢٥٢ک.م) دەگرێتەوە، کە زانای کورد خوالێخۆشبوو سەید حوسێن حوزنیی موکریانی لە کۆکردنەوەی مێژووی میرانی سۆران سوودی لێ وەرگرتووە. ئەم کتێبە نووسەرەکەی بە "مەلیخا" ناوی بردووە.

* مێژووی میرانی سۆران

### کەمالەدین عەبدولقادر

کەمالەدین عەبدولقادر کوڕی محێدین سەدیقی ئەربیلی لە زانایانی شاری هەولێر و قوتابی شێخ عەبدولڕەحمانی تاڵەبانی، کەرکووکی بووە و کە لە ساڵی (١٣١٥ک) لە یەکێ لە شارەکانی تورکیا بەناوی "ئورفە" کۆچی دوایی کردووە. ئەم زانایە تەمەنێکی لە وانەبێژی و خوێندنەوە و توێژینەوە و نووسین بردووەتە سەرێ و ئەم بەرهەمانەی لە پاش بەجێ ماوە:

١- حجة الذاكرين
٢- تفريج الخاطر
٣- الطريقة الرحمانية
٤- مرات الشهود في بيان وحدة الوجود
٥- حديقة الازهار في الحكم والاسرار
٦- اداب المريدين ونجات المسترشدين
٧- شرح المعات فخرالدين عراقي

هێندێ لەم کتێبانە چاپ کراون

* (هدية العارفين، ج١، ص٦٠٥، مشاهير الكرد. ج٢، ص٣٢)

### سوڕەییا ئەربیلی

ئەحمەدی کوڕی ئەبی بەکر کوڕی عەبدولقادر ئەربیلی، بەنازناوی "سوڕەییا" زانایەکی خەڵکی هەولێر بووە کە سەرپەرشتیاری قوتابخانەکانی ئەستەمبوڵ بووە و لەوێ نیشتەجێ بووە لە ساڵی (١٣٢٥ک.م) کۆچی دوایی کردووە. بەرهەمەکانی بریتین لە:

نظم الاسماء الحسنى، سانحات الرحمن في مسألة خلق الاكوان

* الاعلام، ج١، ص١٠١، ايضاح المكنون، ج٢، ص٢، هديەالعارفين، ج١، ص١٩٥

### شێخ ئەبوبەکری هەرشمێی ئەربیلی

زانای موتتەقی، غیاسەدین ئەبوبەکر کوڕی مەولانا مەلا محەمەد، لە گوندی هەرشێم، گوندێکی دەوروبەری هەولێر، لەدایک بووە و لە ژێر دەستی باوکی پەروەردە بووە و خوێندنی دەست پێ کردووە. پاش ماوەیەک چووەتە قوتابخانەکانی دیکە تاکو هەموو زانستەکانی (مەعقوڵ) و (مەنقوڵ) تەواو کردووە و تێیاندا خاراوە. ئەمجارە دەستی کرد بە وانەگوتنەوە. لە دەرفەتێکدا سەفەری کردووە بۆ ئاوایی "تەوێڵە" و نەرێتی تەریقەتی نەقشبەندی لە پیری مەزن شێخ سیراجەدین فێر بووە و ماوەیەک بە سەیر و سولوکی غیرفانییەوە سەرقاڵ بوو. پاشان گەڕاوە بۆ شاری هەولێر و وێڕای وانەگوتنەوە و فێرکردنی قوتایان خەریکی ڕاهێنان و ڕێنوێنیکردنی خەڵک بوو لە پێناو پەسندکردن و فێربوونی ئادابی تەریقەتدا.

شێخ ئەبوبەکر زۆر حەزی لە تەفسیری قورئان، بە تایبەتی تەفسیری "بەیزاوی" بووە و لەڕاستیدا ئەویندای ئەو دەرسە بووە و قوتابییەکانی ناچار کردووە کە لەگەڵ دەرسەکانی زانستەکانی تردا، لانی کەم لە هەفتەدا یەک - دووجار دەرسی تەفسیریان هەبێ. ناوبراو پاش تەمەنێک خزمەت بە شەریعەت و تەریقەت، لە ساڵی (١٣٢٦ک.م) کۆچی دوایی کردوە و لە شاری هەولێر نێژراوە.

* (علماؤنا في خدمة العلم والدين، ص ص٣٢ و ٣٣، یەک دوو سەرچاوەی دیکەش)

### شێخ محەمەدئەمین

شێخ محەمەدئەمین کوڕی شێخ فەتحوڵڵای زانایەکی هەولێرییە کە خوێندنی لەلای زانایانی ئەربیلی تەواو کردووە و پاشان تەریقەتی نەقشبەندی لە (قوتب العارفين) شێخ عومەر زیادئودین بیارەیی وەرگرتووە. ئەمجار چۆتە حیجاز و لە مەدینەی منەوەرە بۆ ماوەی دە ساڵ ماوەتەوە و

لە یەکێک لە قوتابخانەکانی ئەو شارە وانەی گوتووەتەوە. پاشان ڕێگەی قاهیرەی گرتۆتە بەر و لە (جامع اللازهر)دا خەریکی خوێندنەوە و تەواوکردنی زانیارییەکانی خۆی بووە. پاش ماوەیەک، لێپرسراوێتی و بەڕێوەبەرایەتی (ڕەواق) کە بە خۆی سپێردراوەوە بە تەرخانی بە وانەگوتنەوە وتوێژینەوە خەریک بووە و گەلێ کتێبی نووسیوە. ژمارەیەک بەرهەم و نووسراوی ئیمام غەزالی بۆ زمانی عەرەبی وەرگێڕاوە. نزیکەی ١٢ بەرهەم و وەرگێڕانی لە قاهیرە چاپ کراوە کە بریتین لە:

١- (تنویر القلوب) لە سۆفیگەریدا.
٢- (هدایة الطالبین لاحکام الدین) لە فیقهدا.
٣- ارشاد المحتاج الی حقوق الازواج .
٤- فتح المسالك في ایضیاح المناسك.
٥- العهود الوثیقة.
٦- دیوان الخطب.
٧- سعادة المبتدئین.

شێخ محەممەد ئەمین مرۆڤێکی پیرۆز بووە و زانایان و ئەدیبانی میسری بەچاوی ڕێزەوە سەیریان کردووە. لە مانگی (ربیع الاول ١٣٣٢ک. م) لە قاهیرە کۆچی دوایی کردووە و لە (قرافە) نێژراوە.

* الاعدام، ج٦، ٢٦٩: المعجم الاعلام الشرق والغرب، ص٤٣٥: ذیل کشف الظنون، ج٢، ص١٣١.

**نیهانی کۆیی**

شێخ محێدین نیهانی کوڕی شێخ عەبدولکەریم، زانایەکی شاری کۆیەی کوردستانی باشوورە کە ١٢٨٢ک. چاوی بەدونیا هەڵێناوە و لە ساڵی (١٣٤١ ک. م) لە کۆیەوە بەرەو شاری هەڵەبجە کۆچی کردووە و لە ساڵی ١٣٥٣ک هەر لەو شارە کۆچی دوایی کردووە.

شێخ محێدین شاعیرێکی باشیش بووە بە نازناوی "نیهانی" بووە.

* ڕۆژژمێری چیا، (١٣٦٥ک. هەتاوی)

**مەلا تەها شەقڵاوەیی**

مەلا تەها شەقڵاوەیی زانایەکی دیار بووە لە زانستی فیقه و ئوسوول و مامۆستا بووە کە فەلەکیات و ماتماتیک. مرید و پێرەوی قوتبولعارفین شێخ حیسامەدین بووە: کە پاش شەست ساڵ تەمەن لە ساڵی (١٣٦٠ی ک.هـ) لە شەقڵاوە کۆچی دوایی کردووە.

* علماؤنا في خدمة العلم و الدین ص٢٥٤.

**نوورەدین شەقڵاوەیی**

شێخ نوورەدین ئەفەندی کوڕی شێخ ئیسماعیل شێروانی کوڕی شێخ حەسەن بەگ لە ساڵی (١٢٨٣ک.م) لە شاری هەولێر چاوی بە دنیا هەڵهێنا و پاش تێپەڕینی تەمەنی منداڵی چووەتە مەکتەب و پاشان خوێندنی زانستە ئایینیەکانی دەست پێ کردووە. کاتێک کەبرا گەورەکەی (شێخ تەها ئەفەندی شێروانی) ڕاسپێردرا بۆ وانەگوتنەوە لە قوتابخانەکانی کەربەلا، نوورەدینیش لەگەڵی چوو بۆ ئەوێ و لە خزمەتی زانایانی ئەو شارە، میرزا باقری یەزدی سوودی وەرگرت. وێڕای وانە ئایینی و ئەدەبییەکاندا ماوەیەکیش لە دوو پزیشکی ناسراوی ئەو سەردەمە (نیزامەدین بەگ) و (تۆفیق بەگی سۆفی)دا خەریکی فێربوونی زانستیی پزیشکی بوو و پاش گەڕانەوە لە کەربەلا چ لە شاری هەولێر و چ لە شاری بەغدا -خوێندنی خۆی درێژە پێدا و لە هەموو ڕوویەکەوە بەتەواوی گەشەی کرد و بڕوانامەی وەرگرت. پاشان بەرەسمی خزمەتکردنی دەست پێ کرد و گەلێ پیشەی وەئەستۆ گرت، لەوانە: مامۆستایەتی لە قوتابخانەی ڕوشدییەی بەغدا، مامۆستایەکە لە قوتابخانەی ڕوشدییەی بەسرە، وانەگوتنەوە لە یەکێ لە قوتابخانەی غەربا، ئەندامەتی لە ئەنجومەنی مەعاریف لە بەغدا، کارگێڕی دارولموعەلەمینی بەغدا و مامۆستایەتی لە وانەکانی فەلسەفە و زانستی پەروەردە و ئەخلاق لەو قوتابخانەیەدا، کارگێڕی دارولموعەلەمینی کەرکووک و، سەرۆکی کۆلێژی ئەعزەمییەی بەغدا بۆ ماوەی شەش ساڵ. پاش ئەوە لەسەر داوای خۆی خانەنشین کراوە و پاشماوەی تەمەن لە پێناو وانە گوتنەوە لە قوتابخانەی ئایینی ئوزبەکییە و وتار و ئامۆژگاری بووە لە زانکۆی حاج ئەمین لە پەنای (کەرخ)ی بەغدا بەسەر بردووە.

نوورەدین پیاوێکی زانا، پارێزکار، دروستکار و خەڵک دۆست بوو لە کاتی پشوودانیدا خەریکی خوێندنەوەی و توژینەوە دەبوو.

بەرهەمە چاپکراوەکانی شێخ نوورەدین بریتین لە:

١- خلاصة تاريخ الاسلام
٢- الفلسفة العلمية والفلسفة الاخلاقية
٣- حقيقة الحقايق
٤- المنطق القديم والمنطق الجديد
٥- الفلسفة العليا
٦- زبدة الهندسة
٧- تاريخ التربية

بەرهەمە چاپ نەکراوەکانی شێخ نووردین بریتین لە:

قانون المناظر، ئاداب البحث، البعث بعد الموت، علم الاخلاق، تاريخ القرون الاولى (مختصر تاريخ بيزانس القسطنطينية) بە زمانی تورکی، السنوحات الامية في شرح احوال السلسلة النقشبندي.........

شێخ نوورەدین لە نزیکەی ساڵی (١٣٦٠ک.هـ) کۆچی دوایی کرد

* (لب الالباب، سهروردی)

*** ئەبوبەکر ئەفەندی ئەربیلی "مەلای گچکە"**

عەلامە ئەبوبەکر ئەفەندی ئەربیلی، دووەم فرزەندی حاجی عومەر ئەفەندی کوڕی مەلا ئەبوبەکری یەکەم مەلا عوسمان، لە پیاوماقووڵان و زانایانی ناسراوی هەولێر بووە کە لە زانستە عەقڵانییەکاندا بەتایبەت لە فەلەکیات و ماتماتیکدا شارەزا بووە..قوتابییانی زانستەکان پاش تەواوکردنی خوێندن، لە شوێنی دووردەستەوە خۆیان گەیاندووەتە هەولێر و بۆ ئەوە چەند رۆژێک لە دەریای زانستە و زانیاریی ئەو سوود وەربگرێت. باپیرەگەورەی ئەم بنەماڵەیە خەڵکی گوندی (سەلەوات ئاوا)، لە گوندەکانی سەر بە ناوچەی رۆژهەڵات شاری سنە کە چووەتە هەولێر و لەوێ جێگیر بووە. ئەبوبەکر ئەفەندی، پیاوی دین و دنیا بووە و سەروەت و سامانێکی هەبووە و خەرجی قوتابخانە و قوتابی و مامۆستایانی دابین کردووە. هەروەها لە گوندەکانی دراوسێی گوندەکانی خۆی، قوتابخانەکانی بەخەرجی خۆی، بەڕێوە بردووە و مامۆستا و قوتابییانی ئەو قوتابخانانە لە خۆشیدا ژیاون.

شوێنی وانە گوتنەوەی مەلا ئەبوبەکری ئەفەندی مزگەوت و قوتابخانەی قەڵا لە شاری هەولێر بووە و لەو بۆ خۆی لە گوندی "باداوا" لە شەشکیلۆمەتری هەولێر دانیشتووە و هەموو رۆژی چووەتە شاری هەولێر و پاش تەواوبوونی دەرسەکەی گەڕاوەتەوە.

ئەبوبەکر ئەفەندی پیاوێکی مەتین، ڕێزدار و وێچوو و جێگا متمانەی خەڵک و حکوومەتی عێراق بووە و لەوپەڕی سەرفرازی و دەسەڵات و شەرافەتدا دەژیا و میوانخانەکەی بەشەو رۆژ بە رووی مسافیرانی ئاشنا و بێگانەدا کراوە بوو و هەموو کەس بۆ هەموو کارێک پەنای بۆ بردووە بەبێ بریتی و دەستبەجێ هەوڵیداوە کارەکەی بۆ چاک و جێبەجێی بکا و هەوڵیداوە پێویستیی کەسانی نیازمەند تا ئەو جێی بۆی دەکرێ دابین بکات. "مەلا گچکە" ناوی باپیرەی بووە و بۆیە بەم ناو ناویراوە.

ئەبوبەکر ئەفەندی لە ساڵی (١٣٦١ ک.م) کۆچی دوایی کردووە.

* علماؤنا في خدمة العلم والدين، ص (٣٦-٣٤). و یەک دوو سەرچاوەی تریش

**مەلا عەبدوڵا بێتواتەیی ئەربیلی**



مەلا عەبدوڵا بێتواتەیی کوڕی مەلا محەمەد ئەمین، زانایەکی خەڵکی هەولێر خەریکی وانە گوتنەوە بووە و لە نزیکەی (١٣٦١ک) کۆچی دوایی کردووە. باوکیشی پیاوێکی زانا بووە و ئەم باوک و کوڕە پێکەوە لە قوتابخانەی حاجی قادر وانەیان گوتووەتەوە.

بەرهەم و کۆکراوەکانی مەلا عەبدوڵا کتێبێکە بە ناوی (المنحة الوهبية) کە شیکردنەوەی نامیلکەی (الارادة الجزئية) لە مەولانا خالد (ذي الجناحين)ی شارەزوورییە. ئەم کتێبە لە ساڵی (١٣٤٧ک.م) چاپ کراوە و لەم ڕێکەوتەشدا باوکی مەلا عەبدوڵا لە ژیاندا بووە.

* مقدمة المنحة الوهبية.

**شێخ محەمەد تاهیر**

شێخ محەمەد تاهیر کوڕی شێخ عەبدولقادر، زانای عارف و بەدین، خەڵکی هەولێر کە خوێندنی لە "جامع الازهر"ی میسر، لە"رواق الاکراد" تەواو کردووە.

نامیلکەیەکی بەناوی "تحفە العباد فی حقوق الزوجین والوالدین والاولاد" لە پاش بەجێ ماوە. کە لە ساڵی (١٣٤٧ک.م) لە کاتی ژیانی نووسەرەکە خۆیدا - لە چاپ دراوە. باوکی شێخ محەمەد تاهیر پیاوێکی زانا بووە.
* مقدمة تحفة العباد.

**شێخ ئەحمەد موختاری ئەربیلی**

شێخ ئەحمەد موختار ئەفەندی ئەربیلی، کوڕی شێخ عەبدوڵای کوڕی شێخ ئەحمەدە، لە ساڵی (١٣٠٤ک.م) لە سلێمانی لەدایک بووە و لە حوجرەی باوکی - کە پیاوێکی زانا بووە- پەروەردە بووە و دەستی بەخوێندن کردووە. سەرەتا ماوەیەک لای بابی دەرسی خوێندووە و پاشان خەریکی گەشت و گەڕان بووە. گەلێ قوتابخانەی بەسەر، کردووەتەوە و دەرسی تێدا خوێندووە تا تەواو بووە و بڕوانامە و ئیجازەی لە دەستی مامۆستایانی بەناوبانگ وەرگرتووە.

شێخ ئەحمەد ئەفەندی پاش تەواوکردنی خوێندن، لە ناوچەی قەرەداغ و ماوەیەکی کورتیش لە "قطیف" لە ناوچەی بەسرە، بۆ کاری داوەریی شەرعی راسپێردراوە. پاش دوو ساڵ چووە بۆ بەغدا و لە کۆرسی دادوەریی قوتابخانەی"دادوەریی شەرعی"بەشداریی کردووە و پاش تێپەڕکردنی کۆرسەکەی، بڕوانامەی رەسمی بەدەست هێناوە. ئەمجا، سەرەتا لە "شارباژێر" و پاشان لە ناوچەکانی دیکەی وەک : "نەسیبین، وان و دهۆک" بەکاری دادوەرییەوە خەریک بووە. ماوەیەک لە هەولێر دادوەری کرد و پاشان چوو بۆ سلێمانی. دوایین لێپرسراوێتیی شێخ ئەحمەدی ئەفەندی، دادوەری کردن لە دادگای تەمیزی شەرعیی بەغدا بووە و لە ساڵی (١٣٧٣ک).کۆچی دوایی کردووە.

شێخ ئەحمەد زانایەکی زۆر ئاگا، شارەزا لە کاروباری دادوەری، پیاوێکی دروستکار، بە ئیمان و داوێنپاک بووە.
* تاریخ المشاهیر الالویة العراقیة: جزئ اول ص١٥

**نافیع یونس ئەربیلی**

نافیع یونس، لە ساڵی (١٣٤٧ک) لە شاری هەولێر چاوی بە دنیا پشکوتووە و لە ساڵی (١٣٦٩) لە لقی قانوونی زانکۆی بەغدا بڕوانامەی وەرگرتووە.

نافیع پێش ئەوەی خوێندنەکەی تەواو بکات، تێکەڵ بەریزی خەباتگێڕان بووە. کەسێکی کاریگەر لە رێکخستنی رێکخستنەکانی خەباتگێڕانی عێراقیدا بوو. لە ساڵی (١٣٦٦و١٣٦٥) چووە ریزی رێکخراوی شۆڕشگێڕی "شۆڕش"وە و لە رێکەوتی ١٣٦٩ دەستگیر کرا و بۆ ماوەی دە ساڵ بەرەو بەندیخانەی ناوەندیی بەغدا راگوێزرا.

پاش شۆڕشی تەمووزی ساڵی (١٣٧٩) نافیع و ژمارەیەکی دیکەی هاوبیرژان، رۆژنامەی "ئازادی "یان بە زمانی کوردی - لە کەرکووک - بڵاو کردەوە و پاش ماوەیەک بڵاوبوونەوە، رایانگواست بۆ بەغدا، بەڵام نافیع پاش ماوەیەک سەرلەنوێ دەستگیر کرایەوە و بەند کرا و لە ساڵی (١٣٨٤ک) لە بەندیخانە کۆچی دوایی کرد.
(روزنامە نگاری در کردستان، چ.(١٣٥٧ ک.ه) ترجمەی احمد شریفی.ص.٧٠)

*** شێخەکانی بارزان**

خوالێخۆشبوو مامۆستای نەمر عەبدوڕەحمان شەرەفکەندی "هەژار" لە کۆتاییی چاپی دووەمی شەرەفنامەدا، لەم بوارەدا ئاوا دەنووسی:"دەگێڕنەوە کە شێخەکانی بارزان لە بنەڕەتدا لە بنەماڵەی میرانی ئامێد بوون، یەک لەوانە بەناوی مەسعوود ژیانی میری و حکوومی بەجێ دێڵێ و رێگای تەریکی هەڵدەبژێرێ و لە داوێنی کێوەکانی "زێبار" ژیانێکی زۆر ساکار و هەژارانە دەست پێدەکا و بە نوێژ و تاعەتەوە خەریک دەبێت.

پاش مەسعوودیش هەموو ئەولاد و نەوەکانی، هەر ئەو رێگەیە دەگرنە بەر و هاوکات لەگەڵ (سەیر و سلووک)، خەریکی خوێندنی زانستی دینیش دەبن. لەبەر ئەو هۆیە بەشێک لە کەسایەتییەکانی ئەو عەشیرەتە بە ناوی شێخ و بەشێکی دیان بە مەلا ناسراون.

کتێبی (الاکراد في بهدینان)، شێخەکانی بارزان بە مندالانی میرانی بادینان دادەنێ و بنە چەکی ئەو خانەدانە بەم شێوەیەی خوارەوە باس دەکا:

مەلا مستەفا کوڕی شێخ محەمەدی کوڕی شێخ عەبدوسەلام کوڕی سەعید کوڕی مەلا محەمەد کوڕی عەبدوڕەحمان کوڕی تاجەدین کوڕی عەبدوسەلام کوڕی

سەعید کوڕی شێخ محەمەد کوڕی مەلا ئەحمەد کوڕی عەبدورەحیم کوڕی سەعید بووە.

لە کۆتایی شەرەفنامەدا لە مەلا تاجەدین دەگێڕێتەوە، دەبێ مەلا محەمەد نەوەی مەلا تاجەدین بێت. بەهەرحاڵ کوڕەکانی مەلا عەبدوڵا، یانی مەلا عەبدوسەلام و مەلا عەبدورەحمان هاوچەرخی مەولانا خالید نەقشبەندی شارەزووری (١١٩٣-١٢٤٢ ک) و خەلیفە سەید تەها شەمزینانی بوون.

لەبەرئەوەی سەید تەها خەلیفەی مەولانا خالید بووە، لەم ڕێکەوتەوە شێخەکانی بارزانی بە پەیڕەوانی تەریقەتی نەقشبەندی دادەنرێن.

شێخ عەبدوسەلام لە بزووتنەوەی سەربەخۆیی کوردستان و تێکۆشان بۆ ڕزگاری لە دەست ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکان (١٢٩٦ک) بە سەرکردەیی شێخ عوبەیدوڵڵا شەمزینان، بەشدارییەکی کاریگەریی بووە. هەروەها شێخ محەمەد بارزانی، کوڕی گەورە و جێگری شێخ عەبدوسەلام، دژی ستەمکار و بەکرێگیراوی حکوومەت هەستاوە و دوای ماوەیەک لەلایەن حکوومەتی عوسمانییەکانەوە ماوەیەک لە زیندانی بەدلیس حەپس کرا و دوایە بۆ مووسڵ گوێزرایەوە.

شێخ محەمەد بارزانی پێنج کوڕی هەبووە: شێخ عەبدوسەلام (دووەم)، شێخ ئەحمەد، شێخ محەمەد سەدیق، شێخ بابۆ و مەلا مستەفا.

## شێخ عەبدوسەلام دووەمی بارزانی



عەبدوسەلام لاوێکی شایستە و کارزان بوو. پاش مەرگی بابی بەبۆنەی ڕەفتارە باشەکانی کەوتە بەر سەرنجی عەشیرەتی بارزانی و بۆ ماوەیەکی کەم خەڵکێکی زۆر لە دەوری کۆبووەوە. لە نێوان ساڵەکانی (١٩٠٧-١٩٠٨م)، (١٢٨٧هـ.ش)- کە دەسەڵاتێکی پێک هێنابوو - بەدژی حکوومەتی عوسمانی ڕاپەڕی و لە چەند قۆناخدا توانی هێزەکانی دەوڵەت تێک بشکێنی. پاش ماوەیەک لەشکرێکی گەورە لە سوپای عوسمانی و کوردەکانی سەر بە حکوومەت، گەمارۆی ناوچەی بارزانییان دا. ئەنجامی ئەو شەڕە تێکشکانی بارزانییەکان و هەڵاتنی شێخ عەبدوسەلام بوو. کۆمەڵێکی زۆر لە بنەماڵەی شێخ بەدیل گیران. ئەوکات مەلا مستەفا منداڵێکی بچووک بوو، کە لەگەڵ دایکیدا بەدیل گیرابوون.

پاش ساڵێک، شێخ عەبدوسەلام سوپایەکی گەورەی پێک هێنا و شەڕی بەدژی عوسمانییەکان دەست پێ کردەوە. ئەمجار تورکەکان بە سەختی تووشی شکست هاتن. پاشان حکوومەتی عوسمانی ناچار بە پەسندکردنی مەرجەکانی شێخ بۆ ئاشتەوایی بوو. لەسەر ئەو بڕیارە هەموو ئەسیرەکان لە بەند ئازاد کران و پەیمانیان بەست بە گوژمەی حکوومەت ژمارەیەک مەکتەب و خەستەخانە لە کوردستان دروست بکرێ.

چەند ساڵێک لەسەر ئەو پەیمانە بەئارامی ژیان. لە ساڵی (١٩١٣م). مەحموود شەوکەت، سەرۆکی حکوومەتی تورک تیرۆر کرا. کەسێک بەناوی (سەفوەت بەگ) ناوێک کە لە دۆستانی شێخ عەبدوسەلام و لە کارگێرانی مووسڵ بوو، بە بەشداری لەو قەتڵەدا تاوانبار کرا. سەفوەت بەگ، لە دەست هێزەکانی حکوومەت هەڵات و پەنای بۆ شێخ لە بارزان هێنا. ئەویش پەنای دا. لە ئاکامی ئەو کارەدا سەرلەنوێ ئاوری شەڕ هەڵگیرسایەوە. لەشکرێکی یەکجار زۆر بارزانییان گەمارۆدا. دوای بەسەرچوونی ماوەیەک شێخ توانایی بەربەرەکانی بەرامبەر دوژمن نەما و بەرەو ئێران رای کرد و لەگەڵ سماعیل ئاغای سمکۆ پەیمانی دۆستایەتییان گرێدا.

ڕۆژێک شێخ میوانی ماڵی سۆفی عەبدوڵایەک دەبێ. میواندار بە تەماحی ماڵ، پلە و پایە، تورکەکان ئاگادار دەکاتەوە شێخ دەسگیر دەکرێ و پاش ماوەیەک لە مووسڵ لە ساڵی (١٩١٤م) لەدار دەدرێ.

پاش شێخ عەبدوسەلامی دووەم، براکەی سەرۆکایەتی عەشیرەتی بارزان دەگرێتە ئەستۆ.

## شێخ ئەحمەدی بارزانی

هەر لەو ساڵەدا کە شێخ عەبدوسەلام دووەمی بارزانی لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە لەدار درا، شەڕی یەکەمی

جیهانی دەستی پێ کرد. کە ماوەی چوار سالّی خایاند و لە ئاکامە هەرە گرنگەکانی ئەو شەڕە رووخانی دەولّەتی عوسمانی و پارچە پارچە بوونی هەرێمی هەراوی ئەو ئیمپراتوورییە. یانی سالّی (١٩١٨) - سالّی کۆتایی شەڕ - ولاّتە سەرکەوتووەکان، ئەو دەستەیە لە ولاّتانی ئیسلامی کە لە ژێر ئالاّی عوسمانی دابوون، بەناوی بەخشینی سەربەخۆیی پێیان، لە نێوان خۆیاندا دابەشیان کرد و لەو نێوانەدا بەشێک لە کوردستان، ناوچەی بارزان وێڕای ناوچەی عەرەبنشینەکان، بەناوی ولاّتی عێراق، کەوتە ژێر دەسەلاّتی ئینگلیزەوە.

بەبۆنەی چالّە نەوتییەکانی کەرکووک و مووسلّ، ولاّتی بەریتانیا ئەو بەشە لە کوردستانی زۆر بەلاوە گرنگ بوو، بەلاّم هیچ کاتێکیش دەسەلاّتی خۆجێیی ولاّتە سەربەخۆکانی پێ قووت نەچوو.

لەسەر ئەو بنەمایە بەسەختی لەگەلّ بزووتنەوەی شێخ مەحموودی بەرزەنجی، لە باشووری کوردستانی عێراقدا کەوتە دژایەتییەوە.

بە پێویستی دەزانی لە باکووری کوردستانیش بۆ عەشیرەتی بارزان پیلانێ دارێژێ تاکو نەبێتە کۆسپی سەر رێگای. مانگی نۆڤێمبەری (١٩١٩ز) بۆ یەکەم جار ناوی شێخ ئەحمەدی بارزانی لە دەرەوەی بارزان هاتە ئاراوە، کە لە رەوتی بزوتنەوەی بادیناندا دوو ئەفسەری ئینگلیزی بەدەست شێخ ئەحمەد کوژران. لەو کاتەوە شێخ ئەحمەد بەدوژمنی سەرەکی ئینگلیز لە ناوچە دادەنرا. شێخ ئەحمەد لە نێو بارزانییەکاندا حورمەتێکی زۆر تایبەتی هەبوو، خەلّکی ئەویان هەروەک باب و باپیرانی ئەو - رزگارکەری خۆیان دەزانی و لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە لەگەلّ غەیب لە پێوەندیدایە. ئیعتیباری دینیی شێخ ئەحمەد بوو بەهۆی ئەوەی کە رۆژ بەرۆژ دەسەلاّتی زیاتر بێ، بەتایبەت چونکە لەسەر ئەو باوەڕە بوو، کە دەبێ بیگانەکان وەدەرنێن و هەموو یەک بگرن و یەکگرتوو بن، لاوان بە دلّ و بە گیانەوە گوێ لە مستی قسەکانی شێخ بوون.

یەکەم جار لە سالّی (١٩٢٧م)، ستوونێکی



عەسکەری بە سەرکردایەتیی یەکێک لە سەرکردەکانی عێراق و لە ژێر چاودێریی ئەفسەرەکانی ئینگلیزی بەرەو بارزان وەرێ کەوتن هەتا کاری شێخ یەک لا کەنەوە.

لەو رێکەوتەوە تا (سالّی ١٩٣١) ئاگادارییەکی روونمان لە رووداوەکانی ئەو سەردەمە نییە، هەرچەند دیارە کە لەو بارودۆخە پڕ ئاژاوەیەدا باکووری کوردستانی عێراقیش لە هێمنیدا تێپەڕ نەبووە، بەلاّم هیچ نووسراوەیەکمان لەدەستمدا نییە. شێخ ئەحمەد لەو سالاّنەدا چووبوو بۆ پشتیوانی لە کوردەکانی ئارارات کە کەوتبوونە ژێر گوشاری هەمەلایەنەی تورکەکانەوە - سەدان تفەنگداری رەوانەی ئەوێ کرد. بەلاّم ئاکامی شەڕەکە روون نییە و کەس نازانی ئەنجامەکەی بە کوێ گەیی.

هەر لەو سالّەدا دەولّەتی تورکیا ئاشوورییەکانی لە ولاّتەکەی وەدەر نا و ئەوانیش پەنایان برد بۆ حکوومەتی عێراق، دەولّەتی بەریتانیا مەسیحیبوونی ئەو عەشیرەتەی بەکەشوهەوایەکی لەبار بۆ ئاژاوەنانەوە لە ناوچەی بارزان زانی، بڕیاری دا کە ئاشوورییە پەناهێنەکان لە بارزان نیشتەجێی کەن، تاکو: یەکەم، توانایی مالّی بارزانییەکان بەرەو کەمی و هەژاری بەرێت: دووەم، تۆوی دوژمنایەتی لە نێوان ئەوان و ئاشوورییەکاندا بچێنێ و، پاشان وەک بەرگری لە مافی مەسیحییانی ستەملێکراوی ئاشووری بێتە مەیدانەوە، بەلاّم وای لێ نەهات، چونکە میواندار ئەخلاقی میوانداری دەزانێت و خانەخوێش لە نەریتی نان و نمەک تێ دەگەیشت. ئەو دوو عەشیرەتە لە موحیببەت و خۆشەویستیدا رۆژگاریان بردە سەر. کاتێک ئەو ئاواتانەی ئینگلیز سەرنەکەوت، کەوتە بیری داڕشتنی پیلانێکی دیکەوە، کە گوایا شێخ ئەحمەد و موریدەکانی لە دین وەرگەڕاون و بوونەتە مەسیحی، تا ئەو جێگایەی بلاویان کردەوە کە شێخ ئەحمەد خواردنی گۆشتی بەرازی حەلاّل کردووە. هەر لەو کاتەدا، یەکێک لە رێبەرەکانی ئایینی

بەناوی رەشید لۆلان - کە بەروالەت ساویلکە- و کوردزمان بوو، شێخ ئەحمەدی بەمولحید ناساند و بە دژی ئەو فەرمانی جیهادی دا. بەمجۆرە لە ڕێکەوتی (٢٦ نۆڤێمبەر ١٩٣١م)، شێخ رەشید لایەنگرانی خۆی بۆ گەمارۆدانی بارزان بەناوی جیهاد نارده ناوچەوە.

شێخ ئەحمەد پەیامی بۆ دەوڵەتی عێراق نارد کە بەرگری لە شەڕی شێخ رەشید بکەن. تاکو شەڕی ناوخۆیی هەڵنەگیرسێ. بەڵام حکوومەتی عێراق کە تازە لە دەست بزووتنەوەی شێخ مەحموود ئاسوودە ببوو، بەدنەدانی سیاسەتوانانی ئینگلیزی و بەبیانووی ناردنی تفەنگدارانی بارزانی لە لایان شێخ ئەحمەدەوە بەرەو تورکیا و هاوکات لەگەڵ ئەودشدا بەهێزکردنی شێخ رەشید، بۆ خۆشی هاتە مەیدانەوە و (لە ٩ دیسێمبەری ١٩٣١) بارزان بەتەواوی گەمارۆ درا.

شێخ ئەحمەد بەدیتنی ئەو بارودۆخە، خوازراو یان نەخوازراو، خۆی بۆ شەڕ ئامادە کرد. خەباتکارانی بارزانی بە سەرکردایەتیی برا گچکەکەی (مەلا مستەفا) نارده شەڕ لەگەڵ دوژمنان. لەو شەڕەدا لەشکری شێخ رەشید بەماوەیەکی زۆر کەم شکستیان خوارد و بڵاوەیان پێ کردن. شەڕوانەکانی سوپای حکوومەتیش بە زیانێکی زۆری گیانی و ماڵی بەرەو بنکەکانیان گەڕانەوە. بە تۆڵەی ئەو شکستە بەرەبەیانیی رۆژی دوایی، هێزەکانی ئاسمانی شاهەنشایی ئینگلیز، گوندەکانی بارزانیان تۆپباران کرد. شێخ ئەحمەد بێ راوەستان پەیکێکی نارده لایان، کە ئەگەر بۆردمانەکە راگرن ئەسیرەکانیان ئازاد دەکەن. بەو شێوەیە بۆ ماوەیەک شەڕ ڕاگیرا، بەڵام ئەو شەڕە، دەوڵەتی عێراقی ناچار کرد کە بڕیاری لەناوبردنی شێخ ئەحمەد بدا.

لە ژانوییەی (ساڵی ١٩٣٢) حکوومەتی عێراق داوای لە کۆمیسێری واڵای بەریتانیا کرد فڕۆکەکانی خۆی لە ئاسمانی ئەو وڵاتەدا، لەسەر ناوچەی "زێبار" وەحەوا خات. تا هاوکات لەگەڵ هێزەکانی عێراقدا هێرشی خۆی بۆ سەر ئەو ناوچەیە دەست پێبکا. بێئەوەی حکوومەت بایەخێک بەسەرمای زستان و و کوێستانیبوونی ناوچەکە بدات، لە (٩ فێبریوەری ١٩٣٢م) هێرشی خۆی بۆ ناوچەکە دەست پێ کرد. ئاکامەکەشی تێکشکانی دووبارەی هێزەکانی دەوڵەتی عێراق بوو. هەر بۆیە ڕێگاچارەیان لەوەدا دیت، تاکو داهاتنی وەرزی بەهار سەبر بگرن.

لە سەرەتاکانی (ساڵی١٩٣٣م)، حکوومەتی عێراق رای گەیاند دەیەوێ لە ناوچەی "بێڵە" پێگەیەکی حکوومی دامەزرێنێت. دوو رۆژیان ماوە دا بە شێخ ئەحمەد تاکو رەزامەندی دەربڕێت، شێخ پەسندی نەکرد. لەناکاو لە (١١)ی ئەو مانگەدا هێزێکی زۆر قورس کە لە عەسکەری سوارە و تۆپخانە و هێزی پۆلیس - کە پێشتر - پێکهاتبوو هێرشیان بردە سەر (شێروان).

بەشێکی زۆر لەو لەشکرە، دووجاران لە (١٩ مارس و ٣ ئەپریل) کەوتنە گەمارۆی بارزانییەکانەوە. بەڵام هەر دووجارەکە بە پشتیوانیی هێزە ئاسمانییەکانی بەریتانیا رزگاریان بوو. لە ئاکامدا بە یارمەتیی بێ پسانەوەی بەریتانیا دەوڵەتی عێراق توانی ناوچەی بارزان بێنێتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە.

· شێخ ئەحمەد کە لەو قۆناخەدا - توانای شەڕ و بەربەرەکانی لەگەڵ هێزەکانی عێراقدا نەمابوو- جار جار لە تەنیشتەوە لێی دەدان و رای دەکرد و، بە پشتبەستن بەم شێوازە بۆ ماوەیەک تەنگی بەو هێزە بەرفراوانە، بەڵام خەسارهەڵگرەی دەوڵەتی هەڵچنی.

دوایین شەڕی بەنەزمی عێراق لەگەڵ شێخ ئەحمەد، لە مانگی (ژوئینی ١٩٣٣) دابوو. لەو ڕێکەوتەدا هێزەکانی عێراقی بە پشتیوانیی هێزە سەلتەنەتیی بەریتانی لە ئەرز و ئاسمان گوشاریان خستە سەر پێشمەرگەکان و، زۆریان لێ شەهید کردن. شێخ ئەحمەد بەناچار وێڕای (٤٠٠) کەس لە پێشمەرگەکانی لە سنووری باشووری بارزانەوە چوونە خاکی تورکیاوە و داوای پەنابەرییان لەو وڵاتە کرد. شێخ و دۆستەکانیان بۆ "قوستەنتەنییە"و پاشان بۆ "ئەدرین" رەوانە کرد و هەر لە کۆتاییی ئەو ساڵەدا هەموویانیان بە دەست بەسراوی پێشکەشی حکوومەتی عێراق کردەوە. ئەوان بۆ ماوەیەک "حیللە" زیندانی کران و پاشان ناردیاننە سلێمانی. بەوجۆرە شۆڕشی شێخ ئەحمەد، سەرەڕای ئازایەتی و لەخۆبردوویی خۆی و هاوڕێکانی ئەنجامێکی وا ناسەرکەوتووی هەبوو.

شێخ ئەحمەد تا ساڵی (١٩٦٩م) ژیا، بەڵام لەو ڕێکەوتە بەملاوە بەشدارییەکی سیاسی و عەسکەریی چالاکانەی نەبووە.

**مەلا مستەفا بارزانی**

ڕۆژی لەدایکبوونی مەلا مستەفا بارزانیان (ساڵی ١٩٠٣م) (١٢٨٠ک.ه) نووسیوە. بەوجۆرەی کە باسی لێ کرا، بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی لەو ساڵانە و ساڵانی پاش ئەویش هێندە نالەبار و ئاڵۆز بوو کە ئەو لە سەرەدکی منداڵییەوە شەڕ و زیندان و دوورخستنەوەی تاقی کردەوە و زۆر زووش شانی دا بەر ئەرکی زۆر دژوار. هەر لە سەرەتای لاوەتییەوە، توانایی و جەوهەریبوونی خۆی نیشان دا. ئەو هەموو ئەو سەردەمەی برا گەورەکەی (شێخ ئەحمەد) سەرۆکایەتیی بارزانییەکانی لە ئەستۆ بوو، وەک ڕاوێژکارێکی جێگەی متمانە لە باس و بڕیارەکاندا وەک سەرکردەیێکی بەتوانا لە شەڕەکاندا بەشدار بوو.



لە ساڵی (١٩٣٢ز)، حکوومەتی تورکیا شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفا و، کۆمەڵێکی دیکە لە بارزانییەکان کە پەنابەری ئەو بوون بەدەستبەسراوی پێشکەشی حکوومەتی عێراق کردەوە. ئەوان بۆ ماوەیەک لە "حیللە" زیندانی کران و پاشان ناردیانە سلێمانی و لەوێ وەک دوورخراوەیەک دەژیان، تا کاتێک کە لە ڕێکەوتی (١٣مانگی ژووئیەی ١٩٤٣)، مەلا مستەفا، لە شوێنەکەی ڕای کرد و خۆی گەیاندەوە بارزان. پۆلێک عەسکەری سلێمانی مەئموور کران بەگرتنی مەلا مستەفا. بەڵام هەموویانی چەک کرد. بەو شێوەیە دیسان شۆڕشی بارزان گیرسایەوە.

لە مانگی سێپتامبری (١٩٣٢ز)، لە نێوان مەلا مستەفا و پۆلێک لە عەسکەری عێراق شەڕێک دەستی پێ کرد. مەلا مستەفا هێرشی بردە سەر قەرارگایێکی پۆلیس لەسەر سنووری تورکیا و داگیری کرد. هەروەها لە مانگی ئوکتۆبر ١٥٠ پۆلیسی عێراقی چەک کرد. هەر لە کۆتایی ئەو مانگەدا، حکوومەتی عێراق پۆلێکی پێکهاتووە لە پیادە و سوارە، پۆلیس و عەسکەر، کە تەیاربوون بەکەلوپەلی تۆپخانە و مەکینەکانی شەڕ، بە چاوەدێریی ژەنەراڵ برۆمیلوی ئینگلیزی ناردە بارزان. شەڕەکە بۆ ماوەی بیست ڕۆژ درێژەی کێشا. لە ئاکامدا لە یازدەی نوامبر هێزەکانی عێراقی، بەزیانی شەست کەس کوژراو و بریندار زۆر پاشەکشەیان کرد. سەرەتای دەستپێکردنی ئەم ڕووداوە (١٩٤٣ز)، هاوکات بوو لەگەڵ شەڕی دووەمی جیهانی، لەو کاتەدا حکوومەتی بەریتانیا بەتوندی سەرقاڵ بوو، بە مەسلەحەتی نەدەزانی - لە پاڵ سەرچاوە گرنگەکانی کەرکووک و مووسڵ - شەڕێکی نوێ لە پاڵ شەڕەکانی دیکەدا دامەزرێنێ: هەر بۆیە بە دەوڵەتی عێراقی ڕاگەیاند کە زۆر بەخێرایی لەگەڵ بارزانییەکاندا بکەوێتە موداراکردن و بیانهێنێتە سەر مێزی وتووێژ. لەو کاتەوە پاش دانیشتن و موسالەحە بەوە گەیشتن کە خوێندن و نووسین بەزمانی کوردی لە هەموو شارە کوردنشینەکان ئازاد بکرێ. مەکتەب و خەستەخانەیان لێ دابمەزرێ، زیندانییەکان و دوورخراوەکان بگەڕێنەوە کوردستان و لە کۆتاییدا کورد بۆ خۆی پاسەوانی ئاسایشی ناوچەکانی خۆی بێت.

بەسەرکەوتنی موتەفیقین لە شەڕی (١٩٤٤ز)، پەیمانشکێنی و دژایەتیی عێراق دەستی پێ کردەوە. سەرۆک حکوومەتی بەدەسەڵاتی عێراق -(نووری سەعید) وەلانرا، ئەو هەڵوێستە بە واتای بێ ئیعتیبارکردنی ئەو گرێبەستە بوو کە نووری سەعید لەگەڵ بارزانیدا ئیمزای کردبوو.

لە ساڵی (١٩٤٥دا کاتێک ئاکامی شەڕی دووەمی جیهانی ڕوون بووەوە - سەرلەنوێ کەوتنەوە تەدارەک بۆ هێرشێکی دیکە بۆ سەر کوردستان. مەلا مستەفا زۆر تێکۆشا تاکو دەتوانێ نەهێڵێ شەڕ داگیرسێتەوە. هەر لەبەر ئەوە نامەیێکی بۆ باڵوێزەکانی ئینگلیز، ئەمریکا، شۆرەوی و، فەرانسە و چین نارد و تکای کرد کە ببنە ناوبژیوان و پێش بەشەڕ بگرن. هەروەها پێشنیاری وتووێژی بەسەرۆکی حکوومەتی عێراق دا تا بۆ خۆیان لەسەر مەسەلەکە پێک بێن، بەڵام هیچ کام لەوانە کاریگەریی نەبوو و، لە مانگی ئووتی ئەو ساڵەدا، چل و دوو هەزار عەسکەر و پۆلیسی عێراق وێرای هەزاران کوردی پشت ئەستوور بە حکوومەت، تەیار بەچەکی پێشکەوتوو و بە پشتیوانیی فڕۆکەکانی عێراقی و

ئینگلیز، هێرشی هەمەلایەنەیان بۆ سەر کوردستان دەست پێ کرد. لەولاشەوە مەلا مستەفا توانیبووی نزیکەی پێنج هەزار پیاوی چەکدار، تێکەڵاو لە بارزانییەکان و دۆستانی عەشایری دەوری خۆی ئامادەی شەڕ بکا. شەڕێکی یەکجار قورس دەستی پێ کرد. هێزەکانی عێراقی لە مەیدانی شەڕی "بارزان"، "مێرگە سوور"، "ئاکرێ"و "زاخۆ"، تووشی شکستێکی سەخت هاتن و زیانێکی زۆریان پێ گەییی. هەروەها لە مەیدانی شەڕی "رەواندز" دواکەوتووەکان لە ریزی هێزە عێراقییەکان، خۆیان رادەستی پێشمەرگەکان کرد.

شکستی عێراق لەو شەڕەدا تووڕەیی زۆری بەریتانیای بەدواوە بوو. رۆژی یازدەی سێپتامبر وەک یەکەم هەڵوێستی جەنەراڵ رانتۆن، لە وتەکانیدا زۆر بەتوندی سەرزەنشتی سەرۆکی حکومەتی عێراقی کرد و پێی راگەیاند کە سەرکردەیی هێزەکانی عێراق لە دژی کوردەکان، زۆر بە پەلە و پڕ هەڵە بووە و نابێ لەگەڵ دوژمندا تەنیا لە مەیدانی شەڕدا شەڕ بکەی!

شەڕ هەروا بەردەوام بوو. پێشمەرگەکان هەر رۆژەو سەرکەوتنێکی تازەیان بەدەست دێنا، بەڵام هێزی ئاسمانیی شاهەنشایی ئینگلیز دیسان هاتە هانای هێزە ئاسمانییەکانی عێراقییەوە و بۆردمانێکی بێ ئەمانیان لەسەر سەنگەری پێشمەرگەکان دەست پێ کرد. هەرچەند ئەو بۆردمانە زیانێکی زۆری بەپێشمەرگەکان گەیاند، بەڵام بەربلاوی ئەوان و نەبوونیان لە شوێنێکی دیاریکراو، هەر ئەو جۆرەی کە چاودروانی دەکرا، دەورێکی کاریگەری نەبوو و بەردەوام بەرەوپێش چوون و سەرکەوتن هی ئەوان بوو. بۆ وێنە لە مەیدانی شەڕی "نەهلە" هەشت هەزار کەس لە هێزەکانی لەشکری عێراق گەمارۆ دران و خەریکی خۆبەدەستەوەدان بوون. لەم بارودۆخە ناسکەدا، لەپڕ دوو کەس لە سەربازە عەشایرییەکان بە ناوەکانی: مەحموود ئاغای " زێبار " و مەحمود خەلیفەی "برادۆست"- کە لەگەڵ پیاوەکانیاندا لە ریزی بارزانییەکاندا دەجەنگان، دەستیان لە شەڕ کێشایەوە و رێگایان بۆ بەرەوپێشچوونی دوژمن خۆش کرد. (مانگی سیپتامبری ساڵی ١٩٤٥).

دەوڵەتی عێراق چۆن لەو بارودۆخە هەستیارەدا توانی سەرکەوتن بە دەست بێنێ؟ زۆر بەجوانی روون نییە، بەڵام دوایە دەرکەوت کە دەوڵەتی عێراق بەناوبژیکردنی بەریتانیا ئەو سەرکردانەی بەوادەی، پلە و پایە، پارە و چەکی زۆر فریو داوە و لە شەڕ دڵساردی کردوونەتەوە. سەرلەنوێ شۆڕشی بارزان بەهۆی خەیانەتی ناوخۆوە، ناکام مایەوە. گەورە پیاوانی بارزانی بڕیاریان دا، رێگەی ئێران بگرنە بەر و تێکەڵ بە شۆڕشی قازی محەمەد لە کوردستان بێن.

لە رێکەوتی (١١ئۆکتۆبەری ١٩٤٥) سی و پێنج هەزار کەس بارزانی، تێکەڵاو لە ژن و پیاو پیر و منداڵ و لاو، لە ژێر ئاورباریانی دوژمن، لە رێگەی "کێلە شین"ەوە لە سنوور تێپەڕ بوون و گەیشتنە کوردستانی ئێران. ئەوکات باکوور و رۆژئاوای ئێران - لە ژێر دەسەڵاتی ئەرتەشی سوور دابوو. رووسەکان لە سەرەتادا بارزانییەکانیان بە سیخوڕی ئینگلیز دانا و لەوپەڕی بێ رەحمیدا لەگەڵیان مامەڵەیان کرد. تەنانەت نەیانهێشت ژن و منداڵیش بێتە ناو شار و گوندەکانەوە، بەڵام کاتێک لە هەڵەکەی خۆیان تێگەیشتن، کە (٤٥٠٠) کەس لە سەرما و لەنەخۆشیدا گیانیان لەدەست دا. جا ئەو جار شوێنیان بۆ حەسانەوە پێ دان، پاشان پیاوانی شەڕکەر تێکەڵاوی شۆڕشی مەهاباد بوون و ئەوانی دیکەش لە شار و لادێکاندا نیشتەجێ بوون.

بەشداریکردنی پێشمەرگەکانی بارزان لە نێوان هێزەکانی دەوڵەتی و کوردەکان، بۆ ماوەیەک هاوسەنگی جارانی تێک دا و سەرکەوتنێکی زۆری بە نسیب کوردەکان کرد و نموونەیەک لەو شەڕانە :"مامەشە" و "قارەوا" بوون.

نواندنی ئازایەتیی بارزانییەکان تا رادەیەک بوو کە "سپەهبود رەزم ئارا"، لە یەکێک لە وتەکانی خۆیدا گوتبووی:"ئەگەر پەنجا هەزار کەس وەک پیاوانی بارزانیم بووایە، هەموو رۆژهەڵاتی ناڤینم داگیر دەکرد".

لە ساڵی (١٩٤٦/١٣٢٥ک.هـ). ئەو کاتەی شۆڕشی مەهاباد شکستی هێنا و قازی محەمەد رازی بە درێژەدانی شەڕەکە نەبوو، بارزانی لەو جیا بووەوە و لەگەڵ پیاوەکانی خۆیدا بەرەو کوێستان گەڕایەوە. شای ئێران حەزی لە راگرتنی بارزانییەکان بوو، بۆ ئەوەی وەک ئامرازێکی گوشار لە ناوچەدا بۆ کاتەکانی پێویستی خۆی بەکاریان بێنێ. هەر بۆ ئەو مەبەستە مەلا مستەفای بۆ تاران دەعوەت کرد و رێگای دۆستانەی گرتە بەر و پێشنیاری پێ کردن کە چەک و ئەسلەحەکانیان دابنێن و لە ناوچەی

ئەلوەندی هەمەدان نیشتەجێ بن و خەریكی كشتوكاڵ و ئاژەڵداری بن. بەڵام مەلا مستەفا لەسەر ئەو باوەڕە بوو كە نابێ ئەسیری وڵاتێك بێ كە هی خۆت نییە. ئەو تەنیا ڕێگاچارەیەكی لەبەردەم خۆی و هاوڕێیانیدا دەدیت و بیری لێ دەكردەوە. كە هەر چۆنێك بێت زستانێكی ئارام ببەنە سەر و بە داهاتنی بەهار و هەواخۆشی، ژنان و منداڵان و پیرە پیاوەكان بۆ عێراق بگەڕێنەوە و بۆ خۆی و پێشمەرگەكانیشی بچنە سۆڤیەت و كاتێكی هەڵكەوتوودا بگەڕێنەوە بۆ عێراق. ئەو بەو بیانووەوە كە بڕیاری ئاخر شێخ ئەحمەد دەیدا، توانی لە تاران بەرەو كوردستان بگەڕێتەوە نێو عەشیرەتەكەی. بارزانییەكان هەتا مانگێك پاش گەڕانەوەی مەلا مستەفا لە خۆشیدا ژیان، بەڵام كاتێك كە ئێران لە تەسلیمبوونی ئەوان نائومێد بوون، كەوتنە بیری شەڕەوە. بارزانییەكانیش بۆ خۆپاراستن لەبەرامبەریاندا هەڵویستیان گرت و لە ناوچەكانی"دشتەوێڵ"، "شنۆ"، "نەغەدە" و "مەرگەوەڕ" نیشتەجێی بوون.

هێرشی ئەرتەش لە بەرەبەیانیی (٢٤ ڕەشەمەی ١٣٢٥ش) (١٥ مارس ١٩٤٧م) دەستی پێكرد.

كەژ و چیاكان پڕ لە بەفر و سەرما بوو. لەو بارودۆخەدا مەلا مستەفا كەوتە شەڕ و كشانەوەیەكی زۆر ژیرانە. ئەو بێ ئەوەی خۆی تووشی دەرگیری بكا بەرەو باكوور وەڕێ كەوت، خەڵكەكە تووشی سەرما و برسێتی و نەخۆشی بوون، ئەوەش مەلا مستەفای ناچار كرد زۆر خێرا و سەركەوتووانە شەڕ بكا و، لە شوێنی شەڕەكەش رابكا. "ئەبولحەسەن تەفریشیان"، یەكێك لەو شەش ئەفسەرە ئێرانییە كە لەو شەڕ و پێكدادانانە هاوڕێی مەلا مستەفا بووە، دەڵێ:"لە بیرمە كاتێك چاوم پێی كەوت، وەك پێغەمبەرێك لە نێوان پێشمەرگەكاندا ڕاوەستا بوو و فیشەكی بەسەردا دابەش دەكردن. كاتێك ئەمنی دیی بەرامبەرم هات و گوتی: من پیشەوەری نیم، پەناهیانیش نیم كە لە كاتی ئاشتیدا سەرۆكی ئەرتەشەكەم بم و لە كاتی شەڕدا سەر لە باكوور دەربێنم. ئەمنم و ئەو تفەنگەم. نۆكەری هیچ دەسەڵاتێك نیم. من تەنیا نۆكەری عەشیرەتی بارزانم، نۆكەری نەتەوەكەمم.

لەگەڵ نەتەوەكەی لەسەر یەك سفرە دادەنیشت بۆ نانخواردن و پێشڕەویان بوو بۆ مەیدانی شەڕ و هەر وێڕای ئەوانیش لە سەنگەرەكاندا دەخەوت. ئەو ڕەوشتێكی بوو كە میللەتی بارزان خۆشیان دەویست. هەر لەو كاتەدا كە مەلا مستەفا سواری ئەسپ بووایە یەكجێ پێنج سەد سواری چەكدار بەدوایەوە بوون و وەڕێ دەكەوتن.

زەوی زۆر بەجوانی دەناسی و بۆ مەبەستی خۆی چاكی بەكار دێنا. زۆر باش و قووڵ كاری دەكرد. ئێمە ئەگەرچی بە ڕواڵەت پیاوێكی پسپۆر و تاكتیكی و خوێندەوار بووین، دوای توێژینەوەیەكی زۆر و ڕاوێژ پێكەوە ئەوجار بەو بڕیارە دەگەیشتین كە ئەو دابووی.

پاش گرتنی قازی محەمەد، سەرهەنگ غەفاری، لە یەكێك لە هاتوچۆیەكانیدا بۆ شنۆ، لەگەڵ ئێمەدا دوا، گوتی وا باشترە خۆتان تەسلیم كەن و لەو سەرگەردانییە رزگارتان بێت.

ئێمە بۆ تەسلیمبوونی خۆمان زەمانەتمان ویست، وەك: ئەوەی ئێمە بەتەواوی ببەخشن و لە رادیۆ تاران بڵاوی بكەنەوە. ئەو وتووێژە لە خزمەت مەلا مستەفا دابوو. سەرهەنگ غەفاری لە وەڵامی ئێمەدا گوتی:" دەیباشە ئەوەی دیكەی لە ئەستۆی مەلا مستەفایە كە لە تاران بڕیاری داوە ئێوە تەسلیم كات. مەلا مستەفا زۆر بە توورەییەوە گوتی:"بۆچی درۆ دەكەی؟ من بە شای ئێوەم گوتووە لە جێگای ئەو شەش لاوە، هەژدە لاوی خۆمان دەدەین، ئەوە بۆ عەشیرەتی بارزان ڕووڕەشییە كە شەش لاو بگرێت و تەسلیمی ئێوە بێت."شەڕ و هەڵاتنی ئەمجارە نزیكەی بیست و شەش ڕۆژی خایاند. لە هەموو ئەو ڕۆژانەدا بارزانییەكان لە ژێر بۆردمانی ئاسمانی و هێرشی زەوی دابوون. سەرەڕای زیان و خەساری زۆر گەمارۆكانیان شكاند، هەتا خۆیان گەیاندە سنووری بارزان. شێخ ئەحمەد كە دەستی لە خۆی بەردابوو، لەگەڵ عەشیرەتەكەی گەڕایەوە بۆ خاكی عێراق و مەلا مستەفا و پێنج سەد سوارەكەی ڕێگای باكووریان گرتە بەر.

ئەوان لە كاتی تێپەڕبوون لە سنوورەكانی عێراق و توركیا دیسان هاتنە خاكی ئێرانەوە و زۆرجار تووشی شەڕ لەگەڵ سنوورەوانان و هێزە نیزامییەكانی ئەو سێ وڵاتە بوونەوە. شای ئێران - كە لەو كاتەدا لە ورمێ بوو- دەستووری دابوو كە نابێت بارزانی و پیاوەكانی بچنە خاكی شۆڕەوییەوە، بەئەفسەرەكانی ڕاگەیاندبوو كە ئەگەر نەتوانن پێشیان بگرن لە دادگای نیزامیدا موحاكمە

دەکرێن، بەڵام ئەوان بەهۆشیاری و زیرەکییەکی تەواوەوە بە بڕینی (٣٥٠ کیلۆمەتر) ڕێگەی دژوار خۆیان گەیاندە کێوەکان ئارارات و لە ئاکامدا پاش سێ مانگ ڕێپێوان و شەڕ و دەربازبوون لە دەست هێزەکانی سێ دەوڵەت، لە نێوان سەرسوورمان لە مەرزەکانی باکووری ئێران تێپەڕ بوون و لە ڕۆژی حەڤدەی مانگی ژوئیەی ساڵی ١٩٤٧ چوونە خاکی شۆڕەوییەوە.

لەوێ سەرەتا پێشوازییەکی گەرمیان لێ کرا، بەڵام دوای ماوەیەکی زۆر کەم بەهۆی دووزمانی کوردێکی دەست ڕۆیشتوو، ئیستالین ئەمری جیاکردنەوەی ئەوانی دەرکرد.

بەمەرگی ئیستالین بارزانییەکان گیانیان گرتەوە. مەلا مستەفا بۆ خۆی ڕۆیشتە مسکۆ و تکای لێ کردن کار بدرێ بە هاوڕێکانی و لاوەکانیشیان بتوانن بخوێنن.

لە چاردەی ژووئیەی ساڵی (١٩٥٨م) عەبدولکەریم قاسم، دوای کودەتای نیزامی، کۆتایی بە دەسەڵاتی پادشایی عێراق هێنا و خۆی دەسەڵاتی گرتە دەست و لە یەکەم ڕاگەیانراوی خۆیدا بڕیاری لەسەر یەکسانیی کورد و عەرەب دا. لە هەفتی ئوکتۆبەری (١٩٥٨م) مەلا مستەفا پاش دوازدە ساڵان، بۆ عێراق گەڕایەوە و لە فرۆکەخانەی بەغدا وەک قارەمانێک کە ساڵهایە دژ بەحکوومەتی ئینگلیز و دەسەڵاتی پادشایی عێراق شەڕی کردووە، گەلی عێراق بە کورد و عەرەبەوە پێشوازییەکی گەرمیان لێ کرد.

لە سەرەتادا پێوەندیی نێوان عەبدولکەریم و بارزانی زۆر دۆستانە بوو، وا بەدی دەکرا کە سەردەمی شەڕی ماڵوێرانکەر لە کوردستان کۆتایی پێ هاتووە، بەڵام چەند خاڵێکی وەک: گوشاری نەتەوەخوازی بۆ سەر حکوومەتی تازە کاری عێراق و ڕەخنەی کۆمونیستەکان - کە هەردووکیان دژبەری سەرسەختی خستنە رووی مافی نەتەوەی کورد بوون- بەتایبەت چەند دەستەییی کوردەکان تەنانەت خیانەتی بەشێک لەوان، بوو بەهۆی لێڵی و ساردبوونەوەی پێوەندیی نێوانیان. ئەو وادانەی وەک بەخشینی مافی نەتەوەیی بەرامبەر بەکورد و عەرەب لە بیر کرا. لە بری ئەو پروپاگەندەیەکی بەربڵاو بە دژی پارتی دیموکرات و سەرۆک بارزانی لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆندا کرا. بەکورتی دیسان هەوڵەکانی ئاشتیخوازی مەلا مستەفا کە زۆر جار تووشی شەڕی نەخوازراو ببوو - ناکام مایەوە و بە هیچ کوێ نەگەیی - پاش ڕێکخستنی خۆپێشاندانێک کە لەلایان پارتی و بەهاندانی کۆمونیستەکان بۆ گەیشتن بە زەوی کشتوکاڵ وەرێیان خست. ئەو ڕێپێوانە لەلایەن حکوومەتەوە زۆر بەتوندی سەرکوت کرا. بەرەبەیانیی شازدەی ئاگوستی (ساڵی ١٩٦١م)، ناوچەی بارزان لەلایان فرۆکەکانی عێراقەوە بۆردمان کرا. دوای ماوەیەکی زۆر کەم، عەشیرەتی کوردی "زێبار" و چەند گرووپێکی دیکە - کە پێشتر لەلایان حکوومەتەوە چەک کرابوون ــ هێرشیان کردە سەر بارزانی.

ئەگەرچی شەڕوانانی بارزانی خاوەن چەک و تەقەمەنییەکی بەهێز نەبوون، توانییان لە ماوەیەکی زۆر کورتدا هێرشکەرەکان تێک بشکێنن و تا نزیکەی سنوورەکانی تورکیا وسوریا پاشەکشێیان پێ بکەن و باکوور و ڕۆژهەڵاتی ناوچەی بارزان لە دوژمن پاکەنەوە. بەکەڵک وەرگرتن لەو چەک و تەقەمەنییانەی لە دوژمنیان گرتبوو، زۆر زوو گەیشتنە باشووری عێراق،"سلێمانی" و "هەولێر".

ئەو سەرکەوتنە بوو بەهۆی ئەوەی بێجگە لەلاوەکانی پارتی دیموکرات، تاقمێکی زۆری عەسکەرەکانی کوردی ئەرتەشی عێراق بێنە ڕیزی پێشمەرگەکانی بارزانەوە. بەم شێوەیە لە ماوەیەکی زۆر کەمدا هێزێکی وا کۆبۆوە کە دەوڵەتی عێراقی تووشی ترس و خۆفێکی زۆر کرد. ئەوجار عێراق هەموو هێزی عەسکەری خۆی بۆ کوردستان وەگەڕ خست. زۆر جار بەئاشکرا داوای یارمەتیی لە سۆڤیەت کرد. ئیعتیبار و خۆشەویستی مەلا مستەفا بارزانی لەم قۆناخە لە زەماندا لە ناوچەی بارزان تێپەڕی و سەرۆکایەتیی هەموو کوردستانی کەوتە سەرشان. بەتێپەڕبوونی زەمان کوردەکان بەرەو یەکبوون و یەکپارچەیی دەڕۆیشتن و دەسەڵاتی عێراقیش بەرەو لاوازی.

لە (٨ فورییەی ١٩٦٣م)، یانی هەژدە مانگ پاش دوایین شەڕ، حیزبی بەعس بە پشتیوانیی ئینگلیز کودەتای کرد و حکوومەتی عەبدولکەریم قاسمی لە کار وەلانا.

ڕووادنی کودەتا و پاکسازیی خوێناوی حیزبی بەعس لە

هەمـوو ئۆرگـانەکـانی ئیـداری و عـەسکەریدا، بنەمـای ئەرتەشی تووشی لاوازی و لەرزۆکی حکوومی کرد، ئەوە لە حاڵێکدا بوو کە کوردەکان لە چاڵە نەوتەکانی کەرکووک - کە لە گەورەترین دەمارەکانی ژیان بەخشی وڵاتی عێراقە - زۆر نزیک ببوونەوە. بۆ کوردەکان دەرفەتێکی زۆر دەگمەن هەڵکەوتبوو دەیانتوانی ئەوەی ساڵهایە خەباتی بۆ دەکەن زۆر بەئاسانی بەدەستی بێنن، بەڵام مەلا مستەفا ئەگەرچی لەگـــەڵ رووبەرووبوونەوەی دژایەتی ســەرکـــردەکـــان و دڵشکاندنی دۆستانیدا بوو، پاشان زانی ئاگربەستی پەسند کرد و پێشنیاری وتووێژی دا. تووشی هەڵەیەکی زۆر گەورە بۆوە و باشترین دەرفەتیان لە چنگ چوو.

وتووێژی کوردەکان لەگەڵ حیزبی بەعسدا نزیکەی چوار مانگی خایاند. لە سەرەتادا بەعسییەکان لە یەکسانیی کورد و عەرەب و مافی بەرامبەر لە نێوانیاندا قسەیان دەکرد. هەر لەو کاتەشدا مەسەلەی یەکپارچە بوونی میسر و عێراق و سوریا هاتە ئاراوە. ئەوجار سەرۆکەکانی سێ وڵات چەندین دانیشتنیان هەبوو. لەو دانیشتنانەدا جەمال عەبدولناسر بە ئاشکرا خوازیاری ناسینی مافی کوردەکان بوو. بەپێچەوانەوە سوورییەکان لە ترسی سەرهەڵدانەوەی ئاژاوە لە کـوردسـتـانی سـووریە، دژبەری دانی هەر جـۆرە ئیمتیازێک بە کوردەکان بوون و بەردەوام هانی عێراقیان دەدا بۆ ســەرکــوتکردنی ئەوان و بەڵێنی هەمــوو جــۆرە هاوکارییەکیان پێ دەدان.

پاش ئەو وتووێژانە و بیـــانوو گـــرتنێکی زۆر لەلایەن حکوومـەتی عێـراقـەوە، ئاخـری لە بەرەبەیانی نۆی ژوئین، رادیۆی بەغـدا بە وتارێکی رایگەیاند کـە ئەنجـومـەنی شۆرشی عێـراق بریاری دەرکـردووە هەرچی زووتر کـۆتایی بەکاری بارزانی بێنن.

تاکـتیکی بارزانی لەو شەرەدا پاشەکشێیکی خێـرا ودەستبەسەر داگرتنی بەرزاییەکان بوو. کە لەئەنجامی ئەوەدا هێـزە رێکوپێکەکـانی دوژمن زۆر خــێـــرا بڵاو دەبوونەوە. بەم شـێـوەیە زەمـانێکی زۆری پێ نەچوو کـە ئەرتەشی عێـراق توانی تەواوی ناوچەکانی کـوردسـتـانی داگیر بکا و لە ١٤ ژووئییەی ئەو ساڵەدا، عەبدوسەلام عارف لە وتەکانی خۆیدا کە بەبۆنەی پێنجەمین ساڵیادی شۆرشی عێراق رای گەیاند، کە کوردستان لە بوونی هێزی چەکداری دژەدەوڵەتیی پاک بۆتەوە، بەڵام زۆر زوو ئاشکرا بوو کە وتەکانی لە رووی ساویلکەییەوە بووە و لە راستیدا تازە خەریک بوو شەر دەستی پێ دەکرد.

هێزی یەکپارچەی کوردستان بە سەرۆکایەتیی بارزانی لە مـاوەی مـانگێکدا هێندیان تەنگ پێـهـەڵچنین کـە دەوڵەتی عـێـراقـیـان ناچار کرد پەنا بەرێتـە بەر سـووریا بۆ یارمەتیدان. بەو شێوەیە لە ٢٢ ئوکتۆبر سوورییـەکانیش هاتنە مەیدانی شەرەوە، بەڵام ئاشکرا بوو کە هیچیان لە دەست نایەت.

سەرکەوتنی پێشمەرگە کوردەکان و ناکۆکی ناوخۆیی نێوان رێبەرانی حیزبی بەعس، ئەوانی رازی کرد کە پاش پێنج مانگ شەر، پێشنیاری ئاگربەست و وتووێژ بدەن.

مـاوەیەک پاش ئاگـربەسـتـەکـە و لە کـاتی وتووێژی ئاشتـیـدا، لە رێکەوتی (١٨ نواڤێمبەری ١٩٦٣)، پاش مـاوەیەکی زۆر کـەم عـەبدوسـەلام عـارف سەرکـۆمـاری ئەو کـاتەی عـێـراق، حـیـزبی بەعـسی وەلانا و بۆ خـۆی وەک دەسەڵاتێکی بەهێز هەموو کارەکانی عێراقی گرتە ئەستۆ و لەگەڵ کوردەکاندا کەوتە گفتوگۆ.

ئەو شێوە ئاگربەستە بوو بەهۆی ئەوەی لە نێوان بارزانی و سەرۆکی حیزبی پارتی دیموکرات، دوژمنایەتییەکی قووڵ بەدی بێ، تا ئەو جێیەی کە تاقمێکی زۆر لەوان پەنایان بۆ ئێـران برد. ئەو ناکـــۆکـــیـــیـــە ناوخـــۆییـــانە بوو بەهۆی ساردبوونەوەی گەل لە شۆرشی داهاتووی کورد. حکوومەتی عـێـراق بەدەرفـەتی زانی و لە فـێـوریـیـەی سـاڵی ١٩٦٥ هێرشێکی هەمەلایەنەی بۆ سەر کوردەکان دەست پێ کرد و دونیـا دیسـان شایەدی کوشتنی وەحشییانە و برسێتی و ئاوارەییی نەتەوەی کـوردی بێـتـاوان بووەوە. چل تا پەنجا هەزار عـەسکەری عـێـراقی کـە لە هێـلی ئاسـمـانییـەوە پشـتـیوانییـان لێ دەکرا بە شەرێکی تەواو کلاسیکی رەوانە کـرابوون تاکـو کـاری کـوردەکـان یەکسـەرە کـەن و لەناویان بەرن.

لە ژانویەی ١٩٦٦ تاقمێک لە گەورەکانی کورد دژی بـارزانی، وێرای شـــەرکـــەرانی خـــۆی کـــە زۆربەیان خویندەوارەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق بوون

ــ وێڕای هێزەکانی عێراق، دژی بارزانی و پێشمەرگەکانی هاتنە مەیدانی شەڕەوە. بە وتەی کاربەدەستانی عێراق ئەو تاقمە لەلایەن ئێرانەوە یارمەتی دەدران و دەوڵەتی عێراق زۆر جار لەو بوارەدا نارەزایەتیی خۆی لە ئێران دەردەبڕی. کەمترینیان ئەوەیە، کە سنوورەوانانی ئێرانی پێشیان بە ناردنی یارمەتی لەلایەن کوردەکانی ئێرانەوە نەدەگرت و هاتنی پێشمەرگە کوردەکان لە سنوورەوە بۆ ئەمدیوی عێراق ئاسایی بوو.

کەوتنە خوارەوەی فڕۆکەی هەڵگری عەبدوسەلام عارف لە ڕێکەوتی سێزدەی ئاوریلی ١٩٦٦ و مەرگی ئەو نەبووە هۆی راوەستانی شەڕەکە، بەپێچەوانەوە براکەی بە ناوی عەبدورحمان عارف - کە بووە جێگری ئەو - شەڕەکەی توندتر کرد.

زیاتر لە ساڵێک لەو شەڕە تێپەری بوو کە شەڕی "هەندرێن" رووی دا. هەندرێن ناوی چیایەکە کە نزیکەی ٢٨٧٦ مەتر بەرزاییەتی و بەسەر هەموو ناوچەکەدا زاڵە. دوو لەشکری مەکانیزەی عێراق بە هاوڕێیەتی نزیکەی ٢٠٠٠ کەس لە جاشەکان - کە بە تۆپخانە و فڕۆکەکانەوە پشتیوانییان لێ دەکرا - پاش تێپەربوونی مانگێک توانییان لووتکەی چیاکە داگیر بکەن. لە دوازدەی مانگی مەی، ١٧٠٠ کەس لە پێشمەرگەکان بۆ گرتنەوەی دووبارەی چیاکە بۆ شەڕێکی نابەرامبەر هاتنە مەیدانەوە. شەڕەکە دە ڕۆژ درێژەی کێشا. لەو شەڕەدا هێزەکانی عێراقی تێکشکان. ڕێنەموریە - پەیامنێری فەرەنسی - کە بۆ خۆی شایەدی شەڕەکە ببوو دەنووسێ: لەو شەڕەدا ئەرتەشی عێراق زۆر شپرزە بوو، زۆریان هەڵاتن، بەشێکیان بەدیل گیران. ژماری کوژراوەکانی کوردەکان تەنیا شەست کەس بوو. ئەنجامی ئەو شەڕە، ئەوە بوو دەوڵەتی عێراق داوای ئاگربەستی کرد، لە ئاکامدا لە ٢٩ ژوئێنی ساڵی ١٩٦٦ لە راگەیەنراوێکی دوازدە مادەییدا، بەشێک لە مافی کوردەکان بە رەسمی ناسرا.

لە گرنگترین رووداوەکانی ئەو قۆناغە شەڕی شەش رۆژەی عەرەب و ئیسرائیل بوو. تاقمێک لە کوردەکان، لەسەر ئەو باوەڕە بوون لەو دەرفەتەدا کە هاتۆتە پێشێ و ترسێک بەسەر عەرەبەکاندا زاڵە، کاری عێراق یەکسەرە کەن و دوایین زەبریان لێ دەن. گۆیا بەوەش دڵخۆش بوون کە تەنانەت لەلایەن ئیسرائیلیشەوە یارمەتی بدرێن. لەولاشەوە عەبدورەحمان عارف چاوەڕوانی لە بارزانی دەکرد کە بەبۆنەی بەرگری لە ئیسلام، پێشمەرگەکانی کورد بۆ شەڕ لە دژی ئیسرائیل بنێرێت.

مەلا مستەفا بە ئاشکرا رای گەیاند کە هیچ وەختێک ئامادە نین دەستمان بۆ یارمەتی لە ئیسرائیل درێژ بکەین. لە وەڵامی عارفدا گوتی: ئێوە ساڵیانێکی زۆرە کە بەناوی ناسیونالیزمی عەرەب، گەلی کوردی ئێمە بە ناجوامێرانەترین شێواز دەکوژن. ئێستا چۆن چاوەڕوان دەکەی خۆمان بۆ ئەو ناسیۆنالیزمە عەرەبە قوربانی بکەین؟! ئەگەرچی بۆ خۆتان باشتر دەزانن، کە لە تەواوی کادری رێبەرایەتیی وڵاتانی عەرەبیدا شتێک بەناوی ئیسلام نییە.

لە حەڤدەی ژوئییەی ساڵی ١٩٨٦ لەکۆدەتایەکی بێ خوێن ڕشتن، عەبدورەحمان عارف لە کار لادەدرێ و ژەنەراڵ حەسەن بەکر دەبێتە سەرۆک کوماری عێراق. پاشان لە ٣٠ هەر ئەو مانگەدا، بە دەستێوەردانێکی دیکە لە کادری رێبەرایەتیدا، حەسەن بەکر دەسەڵاتی پاوان کرد. بەو شێوەیە حیزبی بەعس پاش پێنج ساڵ، دیسان دەستی بەسەر هەموو کاروباری وڵاتی عێراقدا گرت.

مەلا مستەفا بەعسییەکانی زۆر باش دەناسی و لە نییەتی ئەوان بەرامبەر بە کوردەکان باش تێگەیشتبوو. رێگەچارەی لەوەدادیت لە ناکۆکی نێوان ئێران و عێراق کەڵک وەربگرێت و یارمەتییەکی زۆر وەک چەک و دەرمان وەربگرێت. شای ئێرانیش توانایی ئەو کارەی بوو و کوردەکانی عێراقی بە باشترین ئامراز بۆ لاوازکردنی ئەو وڵاتە و تەسلیمی ئەوان لە بەرامبەر خواستەکانی خۆیدا دەزانی.

بەهەرحاڵ، ماوەی دوو مانگ پاش بەدەسەڵات گەیشتنی بەعسییەکان لە عێراق، ئەرتەش بە دەستدرێژییەکی تازەی بۆ سەر خاکی کوردوستان، نیشانی دا کە بە هیوای هیچ جۆرە سازان و ئاشتییەک لەگەڵ کوردەکان نییە و فەرمانڕەواکانیان جگە لە شەڕ بیر لە هیچی تازە بۆ کوردەکان ناکەنەوە. بەم شێوەیە کوردەکان

شەڕێکی نەخوازراویان تووش بووەوە، کە نزیکەی چاردە مانگی خایاند. سەرلەنوێ بە سەرکەوتنی پێشمەرگەکان و ناکامی ئەرتەشی عێراق کۆتایی پێ هات و ناگریەست و وتووێژیان بۆ بەدەستهێنانی ئاشتییەکی دایمی لە کوردەکان داوا کرد.

لە یازدەی مانگی مارسی ساڵی ١٩٧٠، مەلا مستەفا و سەدام حوسێن - پاش سێ مانگ گفتوگۆ لەگەڵ پسپۆرانی هەردوو لایەن -پەیماننامەیەکی پازدە مادەییان ئیمزا کرد. کە لەودا هەموو خواستەکانی کوردی تێدا هاتبوو. دەوڵەتی عێراق دوای چوار ساڵ مۆڵەتی کرد، هەتا لەو ماوەیەدا نییەتی خۆی بەباشی بنوێنێ و هەوڵی خۆی لە ئاوەدانکردنەوەی کوردستاندا بدات. ئەو کۆسپ و تەگەرانەی کە ساڵهایە نێوانی لەیەک تێگەیشتن و خۆشەویستی کورد و عەرەبی گرتووە وەلانێن. پاش تەواوبوونی ماوەی بەڵێنی پێدراو، ئەو خاڵە دیاریکراوانە بەیاسای بنچینەیی زیاد بکەن.

بەهۆی ئەو گرێبەستەوە تا بەهاری ١٩٧٤، بۆ ماوەی چوار ساڵ پێکدادانێکی گرنگ لە نێوانیاندا رووی نەدا، هێورییەک بەسەر ناوچەکەدا زاڵ بوو. بەڵام دەوڵەتی بەعسی عێراق شتێکی دیکەی لە مێشکی خۆیدا پەروەردە دەکرد. هەتا لە هەشتی مانگی ئاوریلی ساڵی (١٩٧٢م) لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەت گرێبەستێکیان ئیمزا کرد، کە بەپێی ئەو بڕیارە وێڕای دانی ئیمتیازی زۆر بە رووسەکان، پێکەوە پەیمانیان بەست بۆ ماوی پازدە ساڵ لە بواری سیاسی، ئابووری و نیزامی هاوکاری زۆر نزیکی یەکتر بکەن. بەهۆی ئەو گرێبەستەوە ئەوەی سۆڤیەتییەکان بەلەناوبردنی عەبدولکەریم قاسم لە دەستیان چووبوو، دیسان وەگیریان دەکەوتەوە و تەنیا کۆسپی سەرەڕێیان ئەو کوردانە بوون کە خۆیان بە خاوەنی کانزا نەوتەکانی باکووری عێراق دەزانی. دەوڵەتی عێراق دەیزانی ئیمزای ئەو گرێبەستە بەنرخێکی چەند گران بۆی تەواو بووە. بەو هیوایەوە کە بتوانی کێشەی کوردەکان لە رێگەی نیزامییەوە چارەسەر بکا.

ئەو کەینوبەینە سیاسییانەی دەوڵەتی عێراق لەگەڵ رۆژهەڵاتدا، رێگاچارەیەکی بۆ بارزانی جگە لە یارمەتیدانی شای ئێران - کە ئەو کات نوێنەری رۆژئاوا لە ناوچەکەدا بوو- نەهێشتەوە. ئەو شای زۆر بەباشی دەناسی و کینەی ئەوی سەبارەت بەکوردەکان بە جوانی لە بیر بوو. بەڵام لە هەمان کاتدا بە پێی هەلومەرجی سیاسیی ئەو کاتە دەیزانی هەندێ بەڵگەی باوەڕ پێکراوی وا لە ئارادا هەیە کە رۆژئاوا و حکوومەتی ئێران بۆ بەهێزکردنی کوردەکان هەنگاو بنێن. بەپێی کاتی دیاریکراو، دەوڵەتی عێراق دەستی کرد بە دروستکردنی پێگەی نیزامی لە زۆربەی ناوچەکانی جۆراوجۆر بەناوی پڕۆژەی ئاوەدانکردنەوە، رێگەوبانی ژێئۆپولیتیکی ساز دا و لە هەموو لایەنێکەوە خۆی ئامادەی شەڕ کرد. هەر لەو رۆژانەشدا دیسان پیلانی تیرۆری مەلا مستەفا سەرنەکەوت. ئەم هەوڵ و رووداوانە نیشانی دەدا کە ئەم ئاسۆیانە تاریکن و داهاتووش موژدەی سوڵح و ئاشتیی پێ نییە.

لە ساڵی (١٩٧٣)، پاش ئەوەی حیزبی بەعس، حیزبی کۆمۆنیستی عێراقی بە فەرمی ناساند، ئەو دوو حیزبە بوونە هاوپەیمانی و بەمجۆرە هێزەکانی حیزبی کۆمۆنیستی ئەو وڵاتە - کە پێشتر دژی دەوڵەتی بەعسی شەڕی چەکدارانەیان هەبوو - بە ئاماژەی رووسەکان بوونە هاوکاری ئەوان.

لە ئەنجامدا ساڵی (١٩٧٤م) داهات، دەوڵەتی بەعسی عێراق بە کەڵک وەرگرتن لەو چوار ساڵ ئارامی و ئاسایشی تەواو و نوێکردنەوەی هێزەکان و فرۆشتنی نەوت و پشتیوانیی بێ پسانەوەی رووسەکان، هێزی تەواوی لە خۆیدا دەدیت، بۆ لەناوبردنی کوردەکان بۆ هەمیشە.

هەر بۆیە بە روونی بەدوای بیانوویەک دادەگەڕا، دیسان شەڕێک هەڵگیرسێنێتەوە. لە ئەنجامدا پاش دانیشتنێکی بێ نەتیجە: یەک لایەنە رای گەیاند کە پارێزگاکانی "کەرکووک"، "خانەقین"، "سەنجار"، و ناوچەی "شێخان"، و چەند ناوچەی دیکەی کوردستان لەمەودوا بەشێک لە کوردستان نین و بڕیاری یازدەی مارسی ١٩٧٠ ئەو ناوچانە ناگرێتەوە. بەم شێوەیە بەعسییەکان بەگەیشتنی دووبارەیان بە دەسەڵات، دەستیان بە پەیمانشکێنی و شەڕ هەڵگیرساندن کردەوە و بە راگەیاندنی ئەوەی کە مەلا

مستەفا دژی ئەو پلانە بووە، کوردستان لە زەوی و ئاسمانەوە کەوتە ژێر دەستدرێژی بەعسییەکان.

لە ڕۆژەکانی سەرەتایی شەڕەکەدا ئێران رای گەیاند کە سنوورەکانی بۆ یارمەتیی ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکانی وەک مانگی سوور و... ئاوالەیە و بەناوی ڕێزگرتن لە مافی مرۆڤ، بۆ خۆشی هێندێکی پۆشاک و خۆراک و دەرمان بۆ ناردن.

ئەرتەشی عێراق لەو شەڕەدا چەکی زۆر پێشکەوتوو و وێرانکەری لەدەست دابوو و لە بەرامبەریشدا پێشمەرگەکان چەکی زۆر ئاساییان پێ بوو. درێژەدانی شەڕ وێڕای نواندنی ئازایەتیی زۆری پێشمەرگەکان، بوو بە هۆی لاوازبوون و کەم هێزیی ئەوان. بەناچار دەستی یارمەتییان بەرەو ئێران درێژ کردەوە. سیاسەتی ئێران لەو شەڕەدا، بەدەستەوە گرتنی سەرەداوی کارەکان بوو: بەشێوەیەک هاتە نێو شەڕەکەوە. کە لەسەرەخۆ وای لێ هات هەموو کاروباری تەداروکات و لۆجستیکی شەڕەکە لەلایان ئێرانەوە جێبەجێ دەکرا. و دوای ماوەیەک پێشمەرگەکان تەنیا شەڕیان دەکرد و بەس تەنانەت چەک و خۆراکەکەشیان ئێران بۆی ساز دەدان.

ئەو شەڕە لەبەر دەستێوەردانی ناڕاستەوخۆی ئێران، بەنسبەت شەڕەکانی پێشتر خێرایی و بەربلاوی زیاتری هەبوو و هەواڵەکانیشی لە بەرایی هەواڵی هوالنێرییەکاندا بوو. پاش تێپەڕبوونی چەند مانگێک، هەواڵەکان باسیان لە ڕەشیدی و سەرکەوتنی پێشمەرگەکان و نزم بوونی مەعنەوییاتی سەربازەکانی عێراقی دەکرد و، زۆربەی زانایان تێپەڕبوونی زەمانیان بە زەرەری عێراق دەزانی. لەو شەڕ و پێکدادان و بارودۆخەی کە پێشبینی دەکرا ئەو ئاورەی کە بەعسییەکان هەڵیان گیرساندبوو خۆیان بگرێتەوە، شای ئێران بە گۆڕینی لە نەکاوی ڕوانگەیان، ڕۆیشتە جەزائیر و لەگەڵ دیدارێکی سەدام حوسێن و پاش وتوویژ لە پشت دەرکە داخراوەکاندا، هەردووک لە (٦ مانگی مارس ساڵی ١٩٧٥) بڕیارێکیان ئیمزا کرد کە لەودا هەردوولا لەسەر کورد پێکهاتن بەقسەی خۆیان ـ بە تێگەیشتنێکی بنەڕەتی گەیشتن.

پاش ماوەیەکی زۆر روون بۆوە کە شا و سەدام شانۆگەری دەسەڵاتێک بوون کە وڵاتە زلهێزەکان لەسەری بڕیاریان دەدا و لە بەرامبەردا دەبوایە شۆڕشی بارزانی وا سەرکوت کرابایە کە ئیدی قەت هەست بەبوون نەکاتەوە. بەڵام بۆچی شۆڕشی چل ساڵەی کوردستان بەرێبەری مەلا مستەفا بارزانی، وێڕای ئەو هەموو لەخۆبردوویی و ئازایەتییەی خۆی و دۆستانی، ئاوا ناکام ماوە، ئەو وتارە یەکێک لە هۆیە گرنگەکانیەتی و، هۆیە ناوخۆییەکان وەک: خەیانەتی بەشێک لە سەرۆکەکان، نەبوونی پێشکەوتن و نائاگایی کۆمەڵ، ڕەخنەی فەساد لە دەزگای ئیداری و نیزامی شۆڕش و بەتایبەت پارتی دیموکرات و ساویلکەیی و خووی عەشیرەتی مەلا مستەفا و کۆمەڵێک کێشەی دیکە بوون، کە ڕێگایان بۆ ڕەخنەکردنی دوژمن لە نێو شۆڕشدا خۆش دەکرد و شۆڕشی تێکشکاند.

بەهەرحاڵ دوای ڕێککەوتنی جەزائیر، مەلا مستەفا بارزانی کە تازە لەو رووداوە دڵتەزێنە باش تێگەیشتبوو، زانی کە تازە شەڕ و درێژەدانی جیا لە نابوودی و مردن هیچی بەدواوە نییە. بەناچار دەستووری دا شەڕەکە ڕاگرن و وێڕای کۆمەڵێک لە دۆستانی پەنایان بۆ ئێران برد و لە (عەزیمییەی کەرەج) نیشتەجێ بوون. ئەو لەم دواییانەدا تووشی شێرپەنجەی خوێن دەبێت و لە ئەنجامدا لە مانگی مارسی ساڵی ١٩٧٩م (١٣٥٨هـ). کۆچی دوایی کرد.

مەلا مستەفا پیاوێکی بەئیمان، مەتین و ئازا و نەترس بوو، ژیانێکی زۆر سادە و ساکاری بووە و دایە خۆی لە ژیانی ئەشرافی و پڕ لە زەرق و بەرق پاراستووە. ئەو کەسانەی کە زۆر لە نزیکەوە ناسیارییان لەسەری هەبوو لە مەدح و وەسفی ئازایەتی و بوێری ئەو هەست بەعاجزی دەکەن. لەگەڵ ئەو تایبەتمەندییانەدا، ئەخلاق و مرۆڤایەتییەکی زۆر بەرز و واڵای هەبوو. لەگەڵ هەرکەسێک پەیمانێکی بەستبێ یاخود وادەیەکی دابێ، تا ڕێژەی گیان پێی وەفادار بووە. دۆست و دوژمن لەسەر قسەکانی حیسابیان کردووە، نەفرەتی بووە لە تەمەللوق و ڕیا و ڕێگەی بە کەسانی موتەمەللیق و ڕیاکار نەداوە. زۆر جار لە وەختی شەڕدا، دوژمنێک کە شکستی هێناوە، ئەگەر داوای بەخشینی لێ کردبێ بەخشیوێتی و ئازادی کردووە. دڵێکی بەڕەحمی بووە و زۆر ئاسان دوژمنی

سوێندخۆری تەخسیرباری خۆی، بەخشیوە. لە هەموو قۆناخەکانی ژیانی پڕ لە ماجەرای سیاسی خۆی، کەس درۆیەکی لێ نەبیست و مەکرێکی لێ نەدیت، و دەبێ بڵێین زۆرترین هۆی ناکامییەکانی سادەیی و یەکرەنگی ئەو بووە. بەداخەوە کە گەلا گەلای مێژووی ئەو جیهانە بێ بونیادە، باس لە قوربانی بوونی ئەو نەوەیە دەکات.

* سەرچاوە: کورد لە سەدەی ١٩ و ٢٠، نووسراوەی کریس کۆچیرا، تەرجەمەی محەممەدی ریانی بە کوردی، لە ص٢١٣ و ٢٢١ و تا ٥١١. تەواوکەری شەرەفنامەی بەدلیسی، نووسراوەی هەژار بە کوردی، چاپی دووەم، لە ص٩٢ تاکو ٩٥ و ١٣٥ هەتا ١٣٦. شۆڕشی ئەفسەرانی خوراسان، نووسراوەی ئەبولحەسەنی تەفریشیان، لە ص ١١٠ تا ١٥٤، الاکراد في بهدینان، لە ص١٩٢.

## * خاندانی سۆران

دەڵێن سەرۆکی سۆران کەسێک بووە ناسراو بە کەڵۆس، کەڵۆس لە کوردیدا بەواتای کەسێک کە ددانی پێشەوەی نەبێ. روون نییە کە ناوی ئەو کەسەش هەرکە کۆس بووە یان ناوێکی تری هەبووە و بە هۆیەک بەم ناوە ناوبانگی رۆیشتووە. نووسەری شەرەفنامە و کەسانی تری کتێبەکەی ئەوەیان وەک سەرچاوە لەم پێناوەدا بەکار هێناوە، دەنووسن: کەڵۆس لەبەر هەژاری و نەداری، (مس الراس)ی خۆی بەجێ هێشتووە و لە ئاوایی "هەودیان" لە ناوچەیەک کە دواتر بە ناوی "سۆران" ناوبانگی دەرکردووە، نیشتەجێ بووە و پیشەی شوانێتیی ئەو گوندیان وەئەستۆ گرتووە بەڵام هەندێ کەسی دیکە لەسەر ئەو باوەڕەن کە رەچەڵەکی خاندانی سۆران دەگەرێتەوە بۆ "بەهرام بەگ کوڕی پێنجەمی "سورخاب بەگ" والی ئەردەڵان، کە لەلایەن باوکییەوە بووەتە میری ئامێدی (عمادیە) و رەواندز و تاکو ساڵی (١٢٤٩ک) و نەوەکانی ئەم بەهەرام بەگە فەرمانڕەوای رواندز و کۆیە و هەریر بوون: و محەمەد بەگ ناوێک - کە بە بەمیری رەواندز ناویان بردوون- نەوەی گوندێک بووە لە دە کیلۆمەتری باکووری رۆژئاوای رەواندز، کە لە پاڵی داوە بە شاخەکانی باڵەکانەوە، کە پێشتر بە خەفتان/ هەفتخان ناوبراوە.

بڕوانە (مسالک الابصار)

ئەم بەهرام بەگە بووە. بە کورتی کەڵۆس سێ کوڕی هەبووە بە ناوەکانی، عیسا، ئیبراهیم و شێخ وەین یان ئیدریس.

## میر عیسای سۆران

عیسا گەنجێکی زیرەک، شایان، بڵیند هیمەت، دڵاوا، ئازا و خۆش رەفتار بووە و لە سایەی ئەم سیفاتانەوە، زۆر خۆشەویست بووە و بەردەوام گەنجان لە دەرەوەی کۆبوونەتەوە و حەزیان بەو سیما و سیفاتە جوامێرانەیەی کردووە. ئەویش هەرچی هەیبووە بۆ دۆستانی خۆی درێغی نەکردووە و هەوڵی داوە ئەوانە بانگهێشتن بکا بۆ سەر سفرەی خۆی و بیانکاتە لایەنگری خۆی.

ئەزقەزا پاش ماوەیەک کە چەند کەسێک بە تەمای ئەو ئاو و خاکە هێزێک لەگەڵ خۆی دێنی. فەرمانڕەوای ئەوێش کە ئاگاداری هێرشی دوژمنان، خۆی بۆ بەرگری ئامادە دەکات. ئەو لاوانەی لایانگری عیسا بوون وەک میری خۆیان داناوە و هانی دەدەن و دەڵێن ئێمە هەموومان ئامادەین لە ژێر فەرمانی تۆدا بچینە شەری ئەم دوژمنە. عیساش رازی دەبێ و ئەم گرووپە تازە پێگەیشتووە بە گۆیاڵ - قۆچەقانی (فەلاخەن) بە دوایدا بەرەو"باڵەکان" بەرێ دەکەون. خەڵکی ئەوێش کە ئەم دەستە ئازا و بەجەرگە دەبینن، رەگەڵیان دەکەون و ئامادەی جەنگ دەبن. بەمجۆرە هێزێکی بەرچاو پێ کدێت کە بە تیکڕایی دەنگ عیسا وەک فەرماندە هەڵدەبژێرن.سوپاکە بەرەو قەڵایەک بەناوی "رەوان"، بەرێ دەکەوێ و گەمارۆی دەدەن. دەوراندەوری ئەو قەڵایە هەڵدێر و رەوەزە بەرد بووە کە بەردی سووری زۆر بووە: عیسا و هێزەکەشی لە نێوان ئەو بەردە سوورانەدا کەمین دەکەن، بەجۆرێک ئامادەی جەنگ دەبن دانیشتوانی قەڵاکە تووشی ترس و سەرسوورمان دەکەن.

لەم رێکەوتە بەدواوە بە دەستەی "بەردە سۆران" واتە بەردە سوورەکان ناو دەردەکەن کە پاشان بەتێپەڕینی کات و کورت کراوەتەوە و بووە بە سۆران. سەرەنجام عیسا قەڵاکە داگیر دەکات و بەخت و سەروەری رووی تێ دەکات، هەموو

رووی تێ دەکەن و خەڵکی ئەو ناوچەیە جڵەوی دەسەڵات بە دەستی بە توانای دەسپێرن و ناوچەی رەوان کە هەمان رەواندزی ئێستایە و لە بەشی باکووری کوردستانی عێراقە، دەکەوێتە دەست عیسا و ئەو لە شوانییە دەگا بە سەرۆکایەتی و میرایەتی و مەزندەبێ.

میر عیسا کورێکی بە ناوی شاعەلی بەگ لە پاش بەجێ دەمێنێ.

پاش میر عیسا شاعەلی بەگی سۆران، تەنیا کورەکەی (شاعەلی بەگ) دەگا بەدەسەڵات. ئەویش تا ئەو جێی پێی کرا بۆ ئاوەدانکردنەوەی هەرێمی دەسەڵاتی خۆی هەوڵی دا و خەڵکەکەش لە سەردەمی ئەودا لە ئاسایش و ئاسوودەییدا ژیان.

شاعەلی بەگ، چوار کوری بەناوەکانی، عیسا، میربوداغ، میرحسێن و میر سەیدی هەبوو: کە لە سەردەمی ژیانی خۆیدا میرنشینەکەی لە نێوانیاندا دابەش کرد تاکو دواتر دەستدرێژیی بۆ سەر ملکی یەکتر نەکەن. لەوانە بە ناوچەی هەریر کە پێگەی دەسەڵاتی خۆی بوو - دا بە کورە گەورەکەی میر عیسا و رەواندزی بە میر حوسێن و شەقڵاوەش بە میر سەیدی سپارد.

### پاشا میر عیسا دووەمی سۆران

میر عیسا کوری شاعەلی بەگ بەپێی وەسیەتی باوکی و بەپێی شایستەیی و براگەورەیی فەرمانڕەوایەتی و هەریری وەرگرت و پاش ماوەیەک سەرۆکایەتی و فەرمانڕەوایەتی لە جەنگ لەگەڵ پیربوداغ فەرمانڕەوای باباندا کوژرا.

### میر بوداغی سۆران

میر بوداغ کوری شاعەلی بەگ لە پاش مەرگی باوکی بەسەر ناوچەی پێسپێردراوی خۆیدا هەروا زاڵ بوو و بەرەبەرە توانی فەرمانڕەوایەتییەکەی فراوان بکات و "سوماقلو" لە تیرەی نیلخاسی قزلباش - کە لە خاکی ئێراندا و سەر بە ورمێ بوو - بخاتە سەر هەرێمەکەی خۆی.

میر سەیفەدین لە پاش میر حوسێنی برای دەسەڵاتی بە دەستەوە گرت و پاش ماوەیەک ناوچەی سوماقلوی خستەوە سەر فەرمانڕوایەتییەکەی و دای بە کورە گەورەکەی میر سەیفەدینی دووەم، کە دواتر باسی دەکەین.

### میر سەید سۆران

میر سەید سۆران کورە گچکەی شاعەلی بەگ بووە، بەڵام کەسایەتییەکی هەڵکەوتوو و بەناوبانگ بوو، دڵاوا و نان بدە ناسرابوو و ناوبانگی مرۆڤدۆستی بڵاو بووەوە. لە مەیدانی جەنگ و خەباتیشدا قارەمانێکی لێهاتوو بوو. لە پاش مەرگی باوکی لە شەقڵاوە دەسەڵاتی گرتە دەست و لە دەرفەتێکدا تۆڵەی میر عیسای برای لە پیر بوداغی بابان سەندەوە و کوشتی و پاش ماوەیەکیش ناوچەی ژێر دەسەڵاتی براکانیشی خستە ژێر رکێفی خۆی و لە ویلایەتی سۆران و دەوروبەری بەرێز و سەرفرازییەوە فەرمانڕەوایی کرد.

میر سەید قەڵای هەولێریشی دەورە دا و ئەم گەمارۆیەشی شەش مانگی خایاند و سەرەنجام سەرکەوت و لە داوێنی ئەو قەڵایەدا مزگەوتێکی گەورەی دروست کرد و ژیانیان تێدا بەسەر دەبرد.بەرە بەرە شاری کەرکوک و مووسڵیش داگیر کرد و لەگەڵ خەڵکی ئەو ناوچەیەدا بە میهرەبانی رەفتاری دەکرد.

میر سەیدی لە ساڵی ٩٢٣ کۆچی مانگی - کە دەسەڵاتێکی بەرچاوی بەدەست هێنابوو- سەر بەخۆیی حکوومەتەکەی خۆی راگەیاند و حکوومەتی ئێرانیش پیرۆزبایی لێ کرد. ئەویش بەڵێنی دا دەستدرێژی نەکاتە سەر ئێران. بەمجۆرە تا کۆتایی ژیانی بە رێز و دەسەڵاتەوە فەرمانڕەوایی کرد. میر سەیدی سێ کوری لە پاش بەجێما، میر سەیفەدین، لە هەرەتی لاوەتیدا لەسەر ئەسپ کەوتە خوارەوە و کۆچی دوایی کرد.

### میر عیزەدین شێری سۆران

عیزەدین شێر کوری میر سەیدی، میرێکی پاکداوێن و پارێزکار بوو. کۆمەڵێکی لە مەلا و پیاوماقووڵانی فەرمانڕەوایەتییەکەی پێک هێنا و لە کارەکانیدا پرس و راوێژی پێ دەکردن بۆ ئاوەدانکردنیی ناوچەی ژێر دەسەڵاتی

خۆی زۆر هەوڵی دا و بەرهەمی بە پیت و بەرەکەتی زۆری لە پاش خۆی بەجێ هێشت.

گومبەتی، مەرقەدی یونس پێغەمبەری (د.خ) لە موس نۆژەن کردەوە و لە رۆژهەڵاتی هەولێریش دوو مزگەوت و میوانخانەی دروست کرد. شاری کەرکوکیش فراوان و پەرە پێ دا و سێ مزگەوت و قوتابخانەیەیی تێدا بینا کرد.

بەبێ نووسینی (حوسێن حوزنی)، سوڵتانی سلێمانی قانونی، لە گەڕانەوەی لە رێگەی تر و رێزەوە - کە زستان و هەوا زۆر سارد بوو - هاتووەتە هەولێر کە لە دڕی سەرما لە ئەماندا بێ، عیزەدین شێر دەچێتە پێشوازی و زۆری رێز لێ دەگری و هەموو وەرزی زستان زۆری خزمەت دەکا، بەڵام سوڵتان سلێمان - کە پیاوێکی ستەمکار و خوێنڕێژ بووە - پاداشتێکی (سنمار) دایەوە لە بنەوە سەرۆک عەشیرەتی ئەوێ لێ هان دا و فەرمانی دا بەدەست و پێوەندەکانی خۆی کە فیتنە و ئاژاوە لە ناو خەڵکدا بنێنەوە و سەرەنجام بە شێوەیەکی کوشتیان (٩٤١ک). پاش ئەوە دەستدرێژییان کردە سەر هەڤاڵ و برادەرانیشی و ژمارەیەکی زۆری سەرۆک عەشیرەت و مەلا و پیاوماقوولانی ئەو ناوچەیەیان لەناو برد و خەزێنەی فەرمانڕەوایەتییەکەشیان تاڵان کرد و ئەوەی بەهادار بوو بردیان. پاشان هەولێریان بە هەموو هەرێمی سۆرانەوە دا بە حوسێن بەگی داسنی - کە میرێکی ئێزدی بوو - پاش کوژرانی عیزەیدین شێر، براکەی سلێمان بەگیش بە ناکامی سەری نایەوە و سێ کوڕی بەناوەکانی قولی بەگ، میر عیسا و سەیفەدینی لە پاش بەجێ ما.

**میر سەیفەدین دووەمی سۆران**

هەروەک پێشتر ئاماژەی پێ کرا، میر حوسێن کوڕی میر بوداغ، ناوچەی سوماقلوی دا بە کوڕەکەی، میر سەیفەدین: بەڵام لە دوای ئەوەی کە هەموو ویلایەتی سۆران بەپێی فرمانی سوڵتان سلێمان خان کەوتە ژێر رکێفی حەسەن بەگی داسنی، لە نێوان ئەو و میر سەیفەدین ناچار بوو، پەنا بەرێتە بەر (بەگەبەگ) فەرمانڕەوای ئەردەڵان: بەڵام نەگەیشتە ئاکامێک و بەناهومێدییەوە گەڕاوە بۆ سۆران و کاتی دیتی خەڵکەکە کەیفیان پێی دێ، هێزی کۆ کردەوە. خەڵک بە گیان وماڵەوە، خۆیان دا دەست ئەو: چونکە ئەوانە لە ئیزەدی و ئایینی و رێبازی داسنییەکان بێزار بوون.

سەرەنجام میر سەیفەدین توانی قەڵای هەولێر بگەڕێتەوە و هەموو هۆزەکانی سۆران لەگەڵی رێککەوتن و هاوپەیمان بوون. حەسەن بەگ بە هێزێکەوە رووی کردە هەولێر و پێنج سەد کەس لە خەباتکارانی ئیزەدی گیانیان لەدەست دا. میر سەیفەدین سەرکەوت و ماڵ و سامانێکی زۆری بە تاڵان برد و هەرێمی بە میرات گەیشتووی خۆی بەدەست هێنایەوە. چونکە هەواڵی ئەم شکستە گەیشتە گوێی سوڵتانی عوسمانی، داوای کرد حەسەن بەگ بچێ بۆ ئەستەنبول و فەرمانی کوشتنی دا. و سوڵتان حوسێن بەگ فەرمانڕەوای ئامێدی (عمادیە) چەند کەسێکی دیکەی لە میرانی کوردستان مەئموور کرد بۆ لەناوبردنی میر سەیفەدین و داگیرکردنی ویلایەتی سۆران، بەڵام ئەمان نەیانتوانی و یان نەیانویست کە میر سەیفەدین و داگیرکردنی و یلایەتی سۆران بەڵام ئەمان نەیانتوانی و یان نەیانویست کارێکی ئەوتۆ بکەن و بەبێ ئاکام گەڕانەوە.

میر سەیفەدین لە پاش ئەم رووداوانە بەبێ هیچ جۆرە ملۆزمێک بۆ سەر دەسەڵاتەکەی، لە فەرمانڕەوایەتییەکەی بەردەوام بوو. تا ئەو کاتەی لە ساڵی (٩٦٦ک) بە هاندانی یوسف بەگی برادۆست ناسراو بە (غازی قران) چوو بۆ دەرباری سوڵتانی عوسمانی، بەڵام کە گەیشتە ئەوێ، گیرا و کوژرا.

**میر قوله بەگ سۆران**

میر قوله بەگ کوڕی میر سلێمان کوڕی میر سەیدی، کاتی کە هۆزی داسنی (ئیزەدیان) بەسەر هەرێمی سۆراندا زاڵ بوون، لە دەرباری شا تەهماسبدا دەژیا و بۆ سۆران بگەڕێتەوە، خەڵکی سۆران زاتی نەدەکرد لە دەستدرێژی ئیزەدییەکان وەزاڵە هاتبوون و گیان وماڵوئایینەکەیان کەوتبووە بەر پەلاماری ئەوان کەس نەبوو بێتە هانایان.

سەرەنجام کەسێکیان نارد بۆ ئێران، داوایان کرد قولی بەگ بگەڕێتەوە ناویان تاکو لە ژێر چاوەدێری ئەودا پلان دانێن و بۆ رزگاربوونیان لە دەست دوژمنەکانیان

رێگاچارەیەک بدۆزنەوە، قـولی بەگ گـەڕاوە و خـۆی دا دەست ئیـرادەی جـەمـاوەری ئەو نـاوچەیە، کە هەرچی ئەوان بڕیار بدەن ئەویش لەگـەڵیـان بێت. خـەڵکی سـۆران وایان بەباش زانی کـە ئەو خـۆی راسـتـەوخـۆ بچـێـتـە دەرباری عـوسـمـانی، سکاڵای غـەدر لێکراوی خـۆی رابگەیەنێ و پلەوپایەی بە میراتماوی باو و باپیرانی خۆی داوا بکاتەوە. بابی عـالی گـازندەکـەی ئەوی بە هێند وەرنەگـرت و لە جیاتی حکوومەتی سۆران، ناوچەی (سەماوەی) بەسرەی، دایە کـەچی بۆ وەی و ئەرکی فـەرمـانڕەوایەتیی خـۆی بەجێ بێنێ و بنەماکەشی بیووژێنێتەوە.

پاش کوژرانی میر سەیفەدین و حەسەن بەگی داسنی و ئەو رووداوانەی پێـشـتـر باس کـران، لەسـەر داوای حەسـەن بەگ - فـەرمانڕەوای ئامێدی (عـیـماد) - قـولی بەگیان لە سەماواتەوە بانگهێشتن کرد و ناوچەی هەریر لە هەرێمی سۆرانیـان پێ ئەسـپارد. قـولی بەگ بۆ ماوەی بیـست سـاڵ لەوێ فەرمـانڕەوایی کرد و کاتێک کۆچی کرد دوو کوڕی لە پاش بەجێ ما: بوداغ بەگ و سلێمان بەگ.

### بوداغ بەگی سۆران

بوداغ بەگ کـوڕی قـولی بەگ پاش بابی لە شـەقـڵاوە فـەرمـانڕەوایی دەکـرد. پاش دوو سـاڵ براکـەی بە تـەمـاحی گـەیشتن بە حکوومـەت دەسـتی کـرد بەهاندانی خەڵکی لە بەرامـبەر براکـەی و هێرشی کردە سـەر، کار کەوتە شەڕ و خوێنڕشتن و هەردوو لایەن تووشی خەسارەی ماڵ و گیانی هاتن. سەرەنجام بوداغ بەگ راسپاردەی لەلایەن خۆیەوە بۆ لای براکـەی نارد کـە هەرچی تا ئەلان بەدەسـتی هێناوە، دەیداتێ: بەڵام وای چاوەڕوان دەکـەم شـەقـڵاوە و هەریر و ئەربیل بۆ من بهێڵێتەوە. بەڵام سلێمان بەگ بڕیارەکەی رەت کـردەوە. ناچار بوداغ بەگ تەرکی ئەوی کـرد و لە سـاڵی (٩٨٥ک) دا کۆچی دوایی کرد.

### میر سلێمان بەگی سۆران

میـر سلێمان بەگ کوڕی قولی بەگ پاش مەرگی بابی و براکەی بووە فەرمـانڕەوای سۆران. ئەو ئینسانێکی لایەنی زانست و زەعـیـفـان و دادگـەر بوو، لە سـیـاسـەت و بەڕێوەبردنی وڵاتـەکـەیدا هۆشـیـارییەکی بەرزتری بەنسـبەت هەموو میردکانی سۆرانەوە هەبوو.

خـاندانی سـۆران هەر لە کـۆنەوە لەگـەڵ عـەشـیـرەتی "زەرزا" دوژمنایەتییان هەبوو و زۆرجار لەنێوانیاندا شەڕ و پێکدادان دروست دەبوو. کـاتێک کـە سلێـمـان بەگ فـەرمـانڕەوایی سـۆرانی گـرتە دەست هێزەکـانی خـۆی کـە نزیکەی سێـزدە هەزار پیـادە و سـوارە بوون ئامـادە کـرد و هێرشی بردە سەر زەرزاییەکان و سێسەد و پەنجا کەسی لە شەڕکەران و مـیـرەکانیـان کوشت دەسـتـەیەکی زۆریشی لێ یەخسیر کردن و بەتەواوی ئەوانەوە کە لەو شەڕە کەوتبووە دەستی بەرەو سۆران گەڕایەوە.

بەباوەڕی حوزنی موکریانی: دامەزرێنەری شەڕەکە میر سلێمان نەبووە، بەڵکو بە هاندانی دەرباری سەفەوی بووە - ئەوان کـە لە توانایەکـانی دەسـەڵاتداری سلێـمـان بەگ ئاگـادار بوون - مـیـر زەرزا - کـە لەگـەڵ شـای ئێـراندا دۆستایەتیی دێرینەی هەبوو - هێرشی بەرەو رووی سۆران دەست پێ کرد، بەڵام شەڕەکەی دۆڕاند و سپـاکـەی تێک شکاند. سلێمان بەگ پاش مانگێک حەسانەوە، لە ناکاو هێرشی کردە سەر ئیلی (نیلخاس) قزل باش و زۆری لێ کوشتن. بەم شێوەیە لە ناوچەی سەندووس و نەغەدە کەس نەما بتوانی لە بەرامبەر سلێمان بەگدا راوەستی، نوێنەری خـۆی لە تەواوی ئەو ناوچانەی تەسـەرووفی کـردبوو دامـەزراند. سـوڵتـان مـوراد خـان سـێـیـەم (جلوس ٩٨٢،فـەوتی ١٠٠٣ک) کـاتێک دیتی کـە زەرزا نەیانتـوانیـوە لە دژی سلیـمـان بەگ سەرکـەوتوو بن، قـوباد بەگ، میری "تەرگەوەڕ"١ ی بەرامبەر ئەو هورووژاند و پێی راسپـارد کە دەبێ بە دژی سلێـمـان بەگ شەڕ بکا. قـوباد بەگ چوار هەزار پیـاوی شـەڕکـەری لەگـەڵ بوو. هەروەها چاوەڕێ بوو لەلایەن دەوڵـەتی عـوسـمـانیـیـەوە هێـزی بۆ بنێردرێ. سلێمان بەگ ئاگاداری رووداوەکە ببۆوە. پێش ئەوەی شەڕ لەلایەن قوباد بەگەوە دەست پێ بکا، بەرەو ئەو دیارە وەرێ کەوت و شەڕ هەڵگیرسا. دوو لەشکر تێکبەر بوون. لە کـۆتـاییـدا قـوباد بەگ داوای ئاشـتی کـرد، بەڵام سلێـمـان بەگ کـەوتە دووی تا نزیک قـەڵای تەرگـەوەڕ راوەدووی نان لەو شـەڕەدا هەر کـام لە دوو لایەن ٤٠٠

کەسیان لێ کوژرا. پاش ئەم شکستە قوباد بەگ هەژدە کەس لە پیاوماقوولانی خۆی هەڵبژارد و بەرەو "وان" وەرێ کەوت. و لەوێ چیرۆکی خۆی بۆ واڵی وان گێڕاوە. والی وان لەوەی کە قوباد بەگ نەیتوانیوە قوباد بەگ کارێک بکات زۆر توورە بوو و سەری قوباد بەگ و هاورێکانی هەڵبڕی و پیاوەکانی دیکەشی زیندانی کرد (٩٩٤ک). لەم رێکەوتە بەدواوە دەسەڵات و شکۆی سلێمان بەگ زیادی کرد و هەموو میرە کوردەکان رێزیان لێ دەگرت.

سلێمان بەگ پیاوێکی زاهید و داوێنپاک بوو رێزی زۆری بۆ مەلاکان دادەنا. یەکێک لە مەلا زانا گەورە و ناسراوەکانی کوردستان بەناوی (عەلامە حەیدەر باپیرە) گەورەی خاندانی (حەیدەرێکانی ماوەران) لە سنەوە بۆ سۆران بانگهێشتن کرد و لە هەریر پلەی مامۆستا و موفتی و شێخ ئیسلامی و ولایەتی سۆرانی پێ بەخشێ. بۆ خۆشی پیاوێکی دیندار بوو کە کاتەکانی بێکاری و حەسانەوەی بە پەرستن و زیکر و فکرەوە تێپەڕ دەکرد و ئاسەوارێکی زۆری لە ناوچە جۆراوجۆرەکانی سۆران بەجێ هێشت.

**خانزادە خاتوونی سۆران**

خانزادە خاتوون خێزانی میر سلێمان بەگ خاتوونێکی ژیر و وریا و لێهاتوو و خاوەنی بیر و تەکبیر بوو و، بۆ ئاوەدانی ناوچەی سۆران و خەڵکی ئەوێ بە تایبەتی هەریر شان بەشانی مێردەکەی حەولی داوە.

ئەو هێندە رۆشنبیر و خێرخواز و لێهاتوو بوو کە مێردەکەی لە کارەکانی دیکەشدا پرسی پێ دەکرد. بەراشکاوێتی بیری دروستی ئەو دڵنیا بوو. خەڵکی سۆران ملکەچی فەرمانەکانی ئەو بوو. شاعیرانی کورد بۆ وەرگرتنی خەڵات و پاداش روویان لە دەرباری ئەو دەکرد و وەسفی خزمەتە بایەخدارەکانی ئەویان دەکرد. خانزادە ژنێکی خێرومەند دەست و دڵاوا بوو و لەسەر رێی سۆران و هەریر رێگاوبان و مزگەوت و قوتابخانەیەکی زۆر بە فەرمانی ئەو دروست کران. ئەو خەڵکی بۆ خوێندەواری و خوێندەوار بوون هان دەداو کەلوپەلی خوێندنی بۆ دەستەبەر دەکرد. خوالێخۆشبوو ئەمین زەکی بەگ لە مێژووکەی خۆیدا خانزادە خاتوونی وەک کچی حەسەن بەگ و خێزانی سلێمان بەگ ناو بردووە. هەندێک مێژوونووسی دیکەش بە خوشکی سلیمان بەگیان ناو بردووە.

* تاریخ الدول، ج٢ ص٤٠٥، شرفنامە بە قلم هەژار، مجلە گەلاوێژ، ساڵ ١٩٤٢ شمارە ٧و ٨.

**میر عەلی بەگی سۆران**

میر عەلی بەگی سۆران کوری میر سلێمان بەگ پاش مەرگی بابی بە فەرمانی سوڵتان موڕادی سێیەم بوو بە فەرمانڕەوای سۆران ئەو لە سەردەمی بابیدا بەڕێوەبەری جۆڵەمێرگ بوو، پاش ئەوەی بوو بەفەرمانڕەوا هەریری کردە پێتەختی خۆی. لە ساڵی (١٠١٠ک) پردێکی بەردینی لەسەر رووباری لە نێوان باڵکان و رواندز هەڵبەست و قەڵا و سەنگەری قایمی دروست کرد.

عەلی بەگ پیاوێکی ئارام مەتین و ئاشتیخواز و بێزار لە جەنگ بوو، بەڵام فەرمانڕەوایانی بابان هێرشیان دەکردە سەر و تووشی شەڕیان دەکرد. نێوانی لەگەڵ دەوڵەتی ئێران و عوسمانی خۆش بوو لەگەڵ میر حەیدەری کوڕی میر پاشای موکری دۆستایەتییەکی گەرمی هەبوو. ئەو کاتەی کە جەعفەر پاشای عوسمانی و میر حەیدەر پێکەوە لە شەڕ دابوون عەلی بەگ چوو بە هانای میر حەیدەرەوە زانایانی خۆش دەویست و دەگێڕنەوە کە علامە حەیدەر ماوەرانی ئەو بۆ سۆران بانگهێشتنی کرد.

عەلی بەگ لە ساڵی (١٠٤٤ک) کۆچی دوایی کرد و دوو کوڕی لە پاش بەجێما: ئۆغوز بەگ و میرە بەگ.

**میر ئۆغوز بەگی سۆران**

میر ئۆغوز بەگ نۆبەرەی میر بەگ لە پاش بابی دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت ماوەیەک لەوە پێش عەشیرەتێکی بەیانی دەستی بەسەر رواندز داگرتبوو. میر ئۆغوز بەگ،نامەی بۆ پیاوماقوولانی ئەوێ نارد کە ئەگەر یارمەتیم بدەن رواندز لەژێر چنگی بێگانان دەردێنم. ئەوانیش وەڵامیان داوە ئێوە هێرش بێنن ئێمەش بەهەموو توانای خۆمان یارمەتیتان دەدەین. میر غۆز لەگەڵ تاقمێک لە پیاوانی ئازا و شەرکەری هێرشی کرد و رواندزی گرتەوە

و کـردی بەپایەتەختـی خـۆی و نـاوچەکـانی سـیـدەکـان و هاودیانی خـسـتـە ژێر ڕکـێـفی خـۆی. ئەو لە سـاڵی (١١٠٧ک) کۆچی دوایی کرد.

### میرە بەگی سۆران

ئەمین زەکی بەگ لە کتێبی مێژووی نەعیمە دەگێڕێتەوە کە ئەمین زەکی بەگ جێنشینی براکەی ئۆغوز بەگ بووە، لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەحمەد خاندا سۆران هێرشی کردە سەر سۆران.

### میر ئەحمەد بەگی سۆران

مـیـر ئەحـمـەد بەگ کـوڕی ئۆغـز بەگ لە دوای مـەرگی مـامی بوو بە فـەرمانڕەوای سۆران ئەو مـیـرێکی شـایـسـتـە دادپەروەر مـتـمـانە بە خۆ خۆشەویستی هۆزەکەی خۆی و خەڵکی سۆران بوو. پاشماوەیەک فەرمانڕەوایی ڕۆژێک لە کاتی ڕاودا جەڵدە لێی دا و مرد.

### میر ئۆغز بەگی سۆران

مـیـر ئۆغـز بەگی دووەم کـوڕی مـیـر ئەحـمـەدی سـۆران پیـاوێکی هێدی و هێمن و ئاشتیـخواز بوو. زۆری حەز لە وەرزێری و نەمـام چەقـاندن و بـاخـەوانی. جـووتیـار و ئاژەڵدارەکانی خەڵات دەکرد و کەلوپەل و کار و ئاسایشی بۆ دابین دەکردن. لە ساڵی (١١٨٢ک) کۆچی دوایی کرد و پێنج کوڕی لە پاش بەجێما: ئەحمەد بەگ، تەیموور بەگ، یەحیا بەگ و مستەفا بەگی لە پاش بەجێما.

### میر مستەفا بەگی سۆران

میر مستەفا بەگ لە پاش مەرگی بابی دەسەڵاتی گرتە دەست براکـانی لە ڕانیـە و کـۆیە و هەریر و هاودیان دانا، بەڵام ئەوان ئۆقرەیان نەگرت و بوون بە مـایەی دەردیسـەر، مـیـر مـسـتـەفـا چەندین جـار بانگی کـردنە لای خـۆی و دەیویست ئەوان هێـور کـاتەوە، بەڵام بە ئاکـام نەگەیشت. ئەوان لە سـاڵی (١١٩٨ک) لە دژی ئەو لەگـەڵ مـیـرانی بابان دەستیان بەپیلانگێری کرد و میرنشـینی بابانیان هان دا بۆ شەڕ لەگەڵ مستەفا بەگ. بابانێکان داواکەیان پەسند کرد و هێرشـیـان کردە سەر خاکی سۆران و لە شـەڕێکدا دەستـیـان بەسـەر ڕانیـە، کـۆیە و هەریردا گـرت. لەلایەکی دیکەشـەوە تەیموور بەگ هاودیان و شـەمـزینانی بۆ خـۆی پاوان کـرد و تا نزیـک زرزا و مـوکـریان چووە پێشێ. بایز بەگـیـش دەوروبەری ڕواندز و ناوچەی (ڕۆرست)ی داگـیـر کرد و تەنیا شاری ڕواندز و جۆڵە مێرگ بۆ مستەفا بەگ مـایەوە. مـیـری بابانیش تا نزیک ئاوایی (ئەران)- کـە لە کۆندا شـارۆچکەیەک بووە- هاتە پێشێ میر مستەفا ناچار بۆ خۆی چووە لای مـیر سلێمـان پاشا فـەرمانڕەوای بابان و داوای ئاشتی کرد و کچەکەی خۆیدا بەحەسەن بەگی کوڕی مەحموود پاشا. مسـتـەفـا بەگ چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد لە دوای ئەو خزمـایەتییە ناوچەکە ڕووی ئاسایش بە خۆیەوە ببـینێ و بـۆ مـاوەیەک ژیانی خـۆی ڕێک خـاتەوە: بەڵام براکـانی - تەیموور بەگ و یەحـیـا بەگ- بـۆ جـاری دووەم پاشای سۆرانی بە دژی ئەو ڕاپەراند.

سلێمـان پاشا لە سـاڵی (١٢٠١ک) بە لەشکرێکی زۆرەوە لە ڕێگای بـالیسـان و ئاکـۆوە هێرشێکی دەست پێ کـرد. مـسـتـەفـا بەگ کـە خـۆی ئامـادە کـردبوو ئازایانە پاشـەکـشـەی بە هێـزی سلێـمـان پاشـا کـرد. لەلایەکی دیکەشەوە چەند کەس لە جەنگاوەرەکانی پێشتـر ناردبووە سـەر ڕێگەی گـەڕانەوەیان و کـەمـینی بۆ نابوونەوە. کـاتی بابـانـێکان لە حـــاڵی هـەڵاتـندا گـــەیشــــتـنە ئەوێ کـەمـیـننشـینەکـان لێـیـان ڕاپەڕین و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و چەک و چۆڵەکانیشـیـان بە دەستکەوت هێنایەوە. مـسـتـەفـا بەگ لە دوای ئەم ڕووداوانە سی سـاڵی دیکەشی فـەرمـانڕەوایی کـرد بەڵام براکـانی دەسـتـبـەرداری نەبوون و ئاسایشیان لێ هەڵگرتبوو. تا ئەو جێیەی کە مستەفا بەگ ماندوو بوو لە ساڵی (١٢٢٣- ١٢٢٥ک) میر محەمەدی کـوڕی کـە بە (پاشـا کـۆرە) بەناوبانگە کردە فـەرمـانڕەوای سۆران و بۆ خۆی دەستی لە دەسەڵات کێشایەوە. بە وتەی هەندی لە مـێـژوونووسـان لە سـاڵی (١٢٤١ک) کـۆچی دوایی کرد و چوار کوڕی لە پاش بەجێماوە: محەمەد بەگ، ڕەسووڵ بەگ، سلێمان بەگ و ئەحمەد بەگ.

**میر محەمەد بەگ سۆران (پاشا کۆرە)**

میر محەمەدە کۆرە کوری میر مستەفا بەگ لە ساڵی (١١٨٨-١١٨٩) کۆچی لە رواندز چاوی بە دنیا هەڵێناوە. دایکێکی شایستە و کارزانی هەبوو، بەناوی بوک شازەمان. میر محەمەد لە گوندێک دێلزی لە ناوچەی باڵەک لە خزمەت عەلامە مەلا ئەحمەد کوری ئادەم خوێندی و هاوکات لەگەڵ خوێندن و فێربوونی عیلم و زانست، فەننی تیرهاوێژی و بەربەرەکانێ دژی دوژمن و سیاسەتی بەرێوەبردنیش ئاشنا بوو. پاشان خەجیجەی ئامۆزای هێنا. بابی ناوچەی جۆلەمێرگ و دۆلی گەوەران و دۆلی هەروتیان و یەک دوو ناوچەی دیکەشی پێ ئەسپارد بۆ بەرێوەبردنیان. لە ساڵی ١٢٢٣یان ١٢٢٥-ک هەروەک پێشتریش باسمان لێ کرد- ئەوی وێرای براکانی رەسووڵ بەگ و سلێمان بەگ و ئەحمەد بەگ بانگهێشتن کرد و، محەمەد بەگی بە جێگری خۆی هەڵبژارد و بۆ خۆی دەستی لە کار کێشایەوە.

میر محەمەد پاشاییکی هۆشیار، زیرەک، شایستە و خاوەنی تێگەیشتنی سیاسی بوو. توانای سیاسەتی لە نێو خەڵکدا بەپاشا کۆرە (میری گەورە) ناسرا. ئەو پاش ئەوەی گەیشت بە فەرمانرەوا دوو مامی خۆی بەناوی تەیموور بەگ و یحیا بەگ کە تێکدەری کاروباری سیاسی ئەو بوون، لە ناوی بردن و عەشایری سیلوانا، برادۆست و سوورچی هێنا ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە و دەستی فەرمانرەواکانی بابانی لەسەر هەریر کورت کردەوە و دەستی بەسەر ئەربیلی داگرت عەشیرەتی دزەییشی ملکەچیخۆی کرد. پاشان بەسەر ناوچەکانی ئاڵتوون کوبری و کۆیسنجق و رانیەدا زاڵ بوو. رووباری "زاب"ی گچکەی کردە سنووری نێوان خاکی خۆی و بابانەکان، عەلی رەزا پاشا والی بەغدا کە دەیزانی ناتوانی بە شەڕ دژایەتی لەگەڵدا بکا، وای خۆی پێشان دا کە حەزی لە دۆستایەتییە و دەسەڵاتەکەی بە فەرمی ناسای و پلەی پاشایەتی و میری میرانی بۆ ئەو لە بابی عالی داوا کرد.

محەمەد پاشا کۆرە لە ساڵی ١٢٤٩ ک وێرای بە شکرێکی زۆر هێرشی کردە سەر ناوچەی بادنیان و، دەستی بەسەر ئامێد و ئاکرێ (عەقرە)دا داگرت، سەعید پاشا میری بادینانی بەدیل گرت. لە ساڵی ١٢٥٠ هێرشی کردە سەر یەزیدێکان و زۆری لێ کوشتن و هەرەشەی لە فەرمانرەوای ماردین و نەسین و مووسڵ کرد. پاش تێپەربوونی ساڵێک هێرشی بردە سەر دورگەی ئیبنی عومەر

ئەوێ وێران کرد "قەڵاتی ئارۆخ"ی گەمارۆ دا و شەرێکی خوێناوی هەڵگیرساند. پاش ئەوەش سەرلەنوێ شەبەیخوونی ئیزەدێکانی١ دا و زۆری لێ کوشتن. پاش ساڵێک بەرەو ئاگری رۆیشت و ئیسماعیل پاشای لەوی وەدەر نا: پاشان لەشکری بەرەو زێبار وەرێ خست و سەعید پاشای تێک شکاند - و مووسا پاشای کە لە خزمانی سەعید پاشا بوو جێنشینی ئەو کرد. پاش وەدەستهێنانی ئامێد و دهۆک، "زاخۆ"شی گرتەوە. ئەوجار دەستی کرد رێکخستنی هەرێمی ژێر دەسەڵاتی خۆی.

ئەحکامی قورئانی پیرۆزی کردە یاسای ژێر دەسەڵاتی خۆی. پاش ماوەیەکی کەم رۆیشتە جەزیرە و حەسنی کیف و چەند شوێنی دیکەی خستە ژێر رکێفی خۆی. لە کاتی گەرانەوەیدا بیستی کە خەڵکی ئامێد مووسا پاشا (دانراوی) ئەویان وەلا ناوە و دیسان سەعید پاشایان وەک فەرمانرەوای خۆیان داناوە.. هێزەکانی خۆی لە مووسڵ کشاندەوە و ئامێدی گەمارۆ دا پاش سێ مانگ ئەوێشی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. ئەو گرووپەی کە پیلانەکەیان دارشتبوو لە کاری کێشانەوە و "رەسووڵ بەگ" یەکێک لە براکانی خۆی کردە فەرمانرەوای ئەوێ و پاشان ئامێدیشی خستە سەر رواندز.

پاش ئەو رووداوانە دەوڵەتی عوسمانی فەرمانی بە رەشید پاشا والی سیواس دا، کە پێشتر سەرۆکی وەزیرانی عوسمانی بوو - رێگەچارەیێک ببینێتەوە، هەتا پێش بە هەڵگیرسانی ئاژاوە بگرن کە مەبادا رۆژ بە رۆژ پەرە بستێنێ. دەستوور بۆ والی بەغدا و فەرمانرەوای "مووسڵ"یش هات کە بە یارمەتیی رەشید پاشاوە بچن. رەشید پاشا خۆی ئامادە کرد و لە رێگەی جزیرە و زاخۆوە بەرەو رواندز وەرێکەوتن. هێزی بەغدا و چەند شوێنێکی دیکەش تێکەڵ سوپای ئەو بوون. بەڵام پێشتر محەمەد پاشا خۆی گەیاندبووە شوێنی دەسەڵاتی خۆی و هەموو

ڕێگاکانی لە دوژمنان بەستبوو. هەر بۆیە نەیانتوانی هێرش بەرن. ڕەشید پاشانامەیەکی تێروتەسەلی بۆ محەمەد پاشا نووسی و داوای ئاشتیی کرد و سوێندی بە قورئان بۆ خوارد و قەولی پێ دا کە دەوڵەتی عوسمانی لێی خۆش دەبێ و بە باوەشێکی ئاوالەوە پێشوازیی لێ دەکا ئەگەر خۆی بەدەستەوە بدا. مەلای ناودار، مەلا محەممەدی خەتیش لە ڕێی پەند و ئامۆژگاری و خێرخوازییەوە پێی گوت شەڕ لەگەڵ سوڵتانی ئیسلام ڕەوا نەبووە و خوێن ڕشتنی بەناحەق ڕەوشتی مووسڵمانەتی نییە. محەممەد پاشا - کە سروشتێکی مروڤانە و نیازپاکی هەبوو قسەکانی کاری تێ کرد و لەسەر بانگهێشتنی ڕەسووڵ پاشا چوو بۆ لای. ڕەشید پاشا زۆری ڕێزلێگرت و بە ڕێز و حورمەتێکی زۆرەوە ناردی بۆ دەرباری عوسمانی. سوڵتانی عوسمانی دڵداری دایەوە و بە حورمەتەوە گەڕایەوە بۆ هەرێمەکەی خۆی. لەو سەروبەندەدا ڕەسووڵ پاشا کۆچی دوایی کرد. عەلی ڕەزا پاشا والی بەغدا کە نێوانی لەگەڵ ڕەشید پاشا خۆش نەبوو و بێجگە لەوەش بە خوێنی محەممەد پاشا تینوو بوو پەیکێکی نارده دەرباری سوڵتانی عوسمانی کە ئەگەر میر محەممەد پاشا دووبارە بگەڕێتەوە ڕواندز، ناحاوێتەوە و لە هەموو جێ ئاژاوە دەنێتەوە فەرمان دەرچوو کە دەبێ میر محەممەد پاشا بەهەر شێوەیەک بێ بکوژرێ. محەممەد پاشا لە کاتی گەڕانەوەی دا لە سیواس لایدا بە پیلانی والی بەغدا لەپڕ چەند کەسێک هەڵیان کوتایە سەریان و کوشتیان ساڵی(١٢٥٣ک).

میر محەممەد پاشا کوڕە لە میرانی گەورەی کورد بوو کە بەڕاستی شایانی ئەوەیە کە لە ڕیزی سوڵتانە بەناوبانگەکانی کورددا دابنرێ ئەگەر بە ڕادەی ڕچاوکردنی کاروباری ئایینی گرنگی بەکاروباری سیاسیش بدایە حکوومەتێکی چەسپاوی لە کوردستانی عێراق دادەمەزراند.

**میر ئەحمەد سۆران**

میر ئەحمەد کوڕی مستەفا بەگ بووە و برای محەممەد پاشا. لە ماوەی حکوومەتی باوکیدا چەن ناوچەیەکی بەڕێوە دەبرد، کاتێک کە محەممەد پاشا بوو بە فەرمانڕەوا، هەرێمی دەسەڵاتی خۆی پاوان کرد و میر ئەحمەدی کردە والی هەولێر. لە پاش میر محەممەد پاشا بوو بە میری سۆران و پاش دوو ساڵ بە هۆی فیتنەیی کوژرا.

**میر سلێمان بەگی دووەم سۆران**

میر سلیمان بەگ کوڕی مستەفا بەگ لە سەردەمی بابیدا چەند ناوچەیەکی بەڕێوە دەبرد. کاتێک محەممەد پاشا بووە والی، ئەو ناوچانەی هەروا لە ژێر دەسەڵاتیدا هێشتەوە، بەڵام پاش ماوەیەک لەگەڵ براکەی (تەمور بەگ) کە کۆسپی سەر ڕێگەیان بوون گیران و لە قەڵایەک لە نزیکی ڕواندز سجن کران. سلێمان بەگ پاش کوژرانی براکەی (میر ئەحمەد)، بوو بە میری سۆران، بەڵام هەر شەش مانگی توانی کاروباری حکوومی بەڕێوە بەرێ و پاشان دەستی لەکار کێشایەوە و براکەی ڕەسووڵ پاشا بوو بە فەرمانڕەوای سۆران.

**ڕەسووڵ پاشای سۆران**

ڕەسووڵ پاشا لە سەردەمی دەسەڵاتی پاشایەتی بابی (مستەفا بەگ) هەرچەند وەخت کاتێک شوێنێکی ئیدارە دەکرد. پاش ئەوەی محەممەد پاشا دەسەڵاتی گرتە دەست ئەوی وەک وەزیری خۆی دیاری کرد و پاش ماوەیەک ئامێدی پێ سپارد. ڕەسووڵ پاشا پاش سلیمان بەگ گەڕاوە بۆ ڕواندز. بۆ ماوەی چوار ساڵان فەرمانڕەوایتیی سۆرانی گرتە دەست و پاش ئەوە یاغی بوو. دەوڵەتی عوسمانی هێزێکی بۆ لەناوبردنی ڕەوانە کرد. پاشان لە خەلیفان و هەریر شەڕ دەستی پێ کرد. تاقەتی شەڕەکەی نەهێنا و گەڕایەوە بۆ ڕەواندز. بەڵام هاوکات لەگەڵ ئەوە حکوومەتی سۆران بە عوسمانییەکان سپاردرا و ئەویش بێ دەسەڵات مایەوە، پاش ئەوە ماوەیەک لە بەغدا ژیانی بردە سەر و بە هۆی خزمەتێکی زۆر کە لە شەڕی عوسمانی و ڕووس لە خۆی پیشان دا، لە ساڵی (١٢٥٣ه.ق) بوو بە والی وان. لە ساڵی ١٣٠١بوو بە والی ئەرەزەڕووم و هەر لەو ساڵەشدا کۆچی دوایی کرد.

* تاریخ الدول والامارات الكردية، ج٢، لە ص٣٩٩ تا٤٢٢. شرفنامەی بدلیسی، ص٣٥٢ -٣٦٢.

# غەریبە کوێر
# ١٧٥٤- ١٨١٦

تەحسین شێخ ئۆغلۆ

گومان لەوەدا نییە مێژوو یادەوەرێکی قووڵ و هەمەچەشنی هەیە. زۆر شتی لەنێو خۆیدا خەفە کردووە، کە بە راستگۆیی رووداوەکانی میللەتان و سەرجەم سەربوردەکان دەخاتە بەردەست، جا ئەم رووداوانە نەبەردی بن یاخود پاڵەوانیەتی و رووداوی خوێناوی بن یاخود رووداوی دڵخۆشکەر یاخود نسکۆ و نەهامەتی بێت. ئەمانە هەمووی لەنێو ناخی مێژوودا، بە سەرجەم وردەکارییەکانییەوە هەریەکە و بەپێی گرنگی خۆی دەمێنێتەوە، پسپۆران و شارەزایانی ئەم بوارانە لاپەڕەکانی هەڵدەدەنەوە و لە دووتوێی نووسینەکانیدا بە ئارەزووی خۆیان بابەت دیاری دەکەن و هەندێکیان ئیزافاتی خۆیانی دەخەنە سەر و هەندێکی دیکەش شتی لێ لادەدەن.

غەریبە کوێر (یوسف کوڕی خەلیلی چەبوقچی): (١١٦٨-١٢٣٢ک) (١٧٥٤-١٨١٦ز)، (غەریبە کوێر)ی شاعیر لە شاری هەولێر لەدایک بووە. چاوی بینایی نەبووە و رووناکی دنیای نەدیوە، لە خێزانێکی هەژار پەروەردە بووە، خەلیلی باوکی بە فرۆشتنی (شەتوب-چەبوق) بەخێوی کردووە.

باوکی لەم پیشەیەدا دەست رەنگین بووە، بۆیە لە شاری هەولێر بە (خەلیل چەبوقچی) ناسرابوو. غەریب بەهۆی کەمدەرامەتیەوە نەیتوانیوە بچێتە قوتابخانە، تەنها لەرێگەی بیستن لە رۆشنبیران و شاعیرانی سەردەمی خۆی فێرە خوێندەواری بووە. دۆستی زانست بووە و بەزدیی بە هەژاراندا هاتۆتەوە. لە تەکیە و مزگەوتەکانی شاری هەولێر لە گەڵیاندا دۆستایەتی کردووە و گوێی لە گرفتەکانیان گرتووە و لە ئازارەکانیانی کەم کردۆتەوە. بە گوتە خۆشەکانی داوای لێ کردوون، کە دان بەخۆیاندا بگرن.

شاعیرێکی خۆرسک بووە. هەر لە هەرەتی منداڵییەوە بەهرەی شاعیریتی پێوە دیاربووە. بەهۆی لەدەستدانی چاوەکانی، جگە لە باری کۆمەڵایەتی و دۆستایەتی کردنی لەگەڵ هەژاراندا زیاتر ئەم بەهرەی لەلای گەشەی سەندووە. ئەم دۆخە خودی و بابەتییەی کاریگەری لەسەر پارچە شیعرێکی کردووە کە کاریگەر بووە بە شاعیری گەورە (ئەبو عەلاء ئەلمعەری). ئەم دەقە رەشبینی و ئەوپەڕی غەمگینی تێدایە، کە تیایدا ئاخ هەڵدەکێشێ لەوەی کە بەهاکان و پێوەرەکان گۆڕاون و روو لە دەسەڵات و سامان و لەخۆبایی بوون دەکەن، کە بەمەش لایەنی گیانی و مەعنەوی فەرامۆش دەکەن. شاعیری ناوبراو شیعرێکی لەژێر ناوی (چ نەماوە) لە دیوانە شیعریەکەی خۆیدا نووسیوە.

بەدرەدین هەولێری و ئەرگۆزەی

(قەرەقۆزی) ئاوازەكان، ئەرگۆزە شیعرێكی درێژی خەتیب هەولێری یاخود بەدرەدین هەولێرییە. ناوی تەواوی (بەدرەدین ئەبولمەعالی محەمەد كوڕی عەلی خەتیب كوڕی ئەحمەد ئەربیلی) یەكێك بووە لە ناوە دیارەكانی بواری ئەدەب و مۆسیقا. لە شاری هەولێر لە ساڵی ١٢٥٦ لەدایك بووە، واتە دوای داگیركردنی هەولێر لەلایەن مەغۆلەكانەوە. لە ئاسەوارە ئەدەبییەكانیدا رووبەرووی نالەباری ژیان بۆتەوە لەژێر ستەم و جەوری مەغۆلەكاندا و پارێزگاری لە مۆسیقا و كەلەپووری میللی خۆی كردووە، كە ئەوكات ئەدەب و هونەر بەرەو دارمان دەڕۆیی. بەدرەدین هەولێری هەردەم ئاوازەكانی خۆی لەسەر شیعری درێژ داناوە، كە لە (١٠١) بەیت پێكهاتبوو، كە تێیدا سەرجەم نەزم و ئاوازەكانی مەقامی بەرجەستە دەكرد. لەژێر ناوی (ئەرگۆزەی ئاوازەكان) بووە. ناوبراو ئەم كارە هونەرییەی خۆی دابەشی سەر پانزە بەش كردووە. هەوڵ و ماندووبوونێكی زۆری داوە لە ناولێنان و كۆكردنەوەی مەقاماتەكان و ئاوازەكان.

هەندێك حاڵەت لە زاری مەقام بێژەكانەوە وەری دەگرت و هەندێك جار لە دانەری مەقامات (سەفیەدین ئەرمەوی) وەری دەگرت، كە لە ساڵانی (١٢١٤-١٢٩٤)دا ژیاوە. لەوانە (مەقامات لە كتێبی ئەدوار) و (نامە رۆژهەڵاتییەكان) كە لەدوای گرتنی بەغدا دایناوە.

شاعیری ناوبراو زۆر پشتی بە زانیارییە تایبەتییەكانی خۆی بەستووە، تاوەكو توانی ئەرگۆزەكانی خۆی كۆبكاتەوە، كە لە مەقامات پێكهاتبوو. ئەم مەقاماتە عیراقییەی ئێستا هەیە، ئەوكاتەش هەبووە. بەهای هونەری ئەم كارانەی ناوبراو لەوەدایە، كە پێناسەی جۆراوجۆری بۆ كردووە و لەوانە كتێبی: (برء الأسقام في شرح قصيدة الانغام) بەرهەمەكانی نووسەر. هەروەها لەژێر ناوی (جواهر النظام في معرفة الانغام) دایە، هەروەها بەدرەدین ئەربیلی وەك نوێنەری میسر لەلایەن فەرمانڕەوای ئەوكاتی شاری موسڵەوە نێردراوەتە ئەوێ، پاشان گەڕاوەتەوە و لە گەشتی بەنێو مەقامات و ئاوازدا بەردەوام بووە.

زۆر لە زانایانی ئەوكات وەك (أبو المعالي، إبن رافع) سوودیان لەو وەرگرتووە و شتیان لێی وەرگرتووە. بەدرەدین ئەدیب و زانا و شارەزا بووە لە بوارەكانی ئەدەب، جگە لە بواری ئاواز و مۆسیقادا، لە ئەرگۆزەكانی ئەم هونەرمەندەدا دەردەكەوێت، كە مەقاماتی عیراقی لە سەردەمی عوسمانی پەیدا نەبووە و لە فارسییەوە وەرنەگیراوە. بەڵكو بنەما سەرەكییەكانی لە سەردەمی عەباسییەوە سەری هەڵداوە، پاشان چەندین بەشی لێ پەیدابووە لەسەردەستی هونەرمەندە بەهرەمەندەكان و گۆرانیبێژ و مۆسیقازانەكان بەدرێژایی مێژوویەكی دوور و تا وەكو ئێستاش بەردەوامە و نوێكاری و ئافراندنی تێدا دەكرێت. ئەم دەستنووسە مێژووییە وەك دەقێكی بەڵگەنامەیی پرەنسیپەكانی گۆرانی و كێش و جۆری مەقاماتی دیاری كردووە، كە لەو كاتەدا باو بووە.

كێشی جۆری مەقامەكانی سەردەمی عەباسی دوانزە جۆر مەقام بووە، ئەمەش لەلایەن (محەمەد كوڕی عەبدولحەمید لازقی) كە لە ساڵی (١٤٩٤)دا كۆچی دوایی كردووە، جەختی لەسەر كراوەتەوە، لە نامەكەی بە نێوی (الرسالة الفتحية) هەروەها (صفي الدين الارموي) لە نامەكەی خۆیدا بەنێوی (الرسالة الشرقية)دا دەڵێت: ژمارەی مەقامات لە دوانزە مەقام تێپەڕی نەكردووە، كە ئێمە باس لە (أرجوزة الانغام) دەكەین، كە زۆربەی مەقاماتی عیراقی لەخۆ گرتووە.

# مەلا جەرجیسی ئەربیللی
# (١٢٠٦ک)/(١٧٩١ز)[١]

**سۆران عیزەدین فەیزی**

ئەم زانا و شاعیرە هەولێرییە، هەر لەسەرەتای ژیانییەوە ڕێگای زانست نوشینی بۆ خۆی هەڵبژاردووە. سەرەتا لەخزمەت چەند زانایەکی دیاری سەردەمی خۆی خوێندوویەتی، لەمانەش شێخ عەبدوڵڵای ئەصەم[٢] ئینجا چووەتە ماوەران، لەوێشدا لەلای شێخ فەتحوڵڵا و شێخ ئیسماعیلی حەیدەری، لەجیهانی زانستەکانی عەقلی و نەقلی قووڵ بووەتەوە. ئیجازەنامەکەشی لەسەر دەستی زانای ناودار صەبغەتوڵڵای حەیدەری وەرگرتووە[٣]. لە ئیجازەنامەکە نازناوی (الراشدی) بۆ تۆمار کراوە، جگە لەمەش (الرشاد)یشی پێ گوتراوە.[٤]

ئەم زاتە تەریقەتی قادری لەسەید ئیسماعیلی بەرزنجی و تەریقەتی نەقشبەندیشی لەسەید ئەحمەدی بەغدادی وەرگرتووە. وەک زاهیدێکیش ژیانی خۆی بۆ زانست و فێربوون و فێرکردن تەرخان کردووە، هەر بۆ ئەم مەبەستە پیرۆزەش لەشارەکەی خۆیدا جێگیر نەبووەو هانای بۆ شارەکانی دیکەوە بردووە. سەرەتای کۆشش کردنەکەی لەهەولێر و ماوەران بووە، ئینجا چووەتە بەغدا و دیسان گەڕاوەتەوە هەولێر، پاشان ڕووی لە موسڵ کردووە و لەوێشەوە بۆ ئاکرێ، دوا نشینگەشی شاری مووسڵ بووە کە لەسەر داوای والی مووسڵ (سلێمان پاشای جەلیلی)، چووەتە ئەوێ بۆ وانە گوتنەوە لە قوتابخانەی تایبەت بە بنەماڵەکەیانەوە، واتە بنەماڵەی جەلیلییەکان[٥] چونکە زۆربەی زانایانی ئەوکاتی مووسڵ بەپەتای تاعوون لەناوچووبوون و پێویستیان بە زانایانی شارەکانی دیکەوە هەبوو. وا دیارە شاعیری مووسڵاوی هاوچەرخ ئەکرەم عەبدولوەهاب ئەم بانگهێشت کردنەی مەلا جەرجیسی بەشیعر تۆمار کردووە و دەڵێت:[٦]

**ولاذت الموصل لوذ الصادي**
**حتى دعت جرجيسا الرشادي**
**من بعد ما أمسى جناها قفرا**
**من العلوم ويداها صفرا**
**عن اثر طاعون دهي الحدباءا**
**وباء فتك فيهم وقد باءا**
**فازمع الجرجيس للرحيل**
**وشد عزم الحزم من اربيل**

ئەم زاتە وەک زانایەکی بەتوانا، وەک وتار خوێنێکی هەڵکەوتوو، وەک شاعیرێک و پەخشان نووسێکی لێهاتوو پایە و شوێنی خۆی لە مووسڵ دەچەسپێنێت، چونکە دەڵێن، لە بەکارهێنانی حوبر و قەڵەمدا لەو ڕەوانبێژتر نەبووە و کەسیش لەتێگەیاندن و مێشک ئاوداندا لەو سەرکەوتووتر نەبووە.[٧] بەڵگەش بۆ ئەم بۆچوونە، ئەم ستایش و پێداهەڵگوتنانەیە کە ئەدیب و شاعیرانی ئەو سەردەمی سەبارەت بەم زانایە دەریانبڕیوە، لەمانەش ئەم دوو بەیتە شیعرەی (شیخ یاسین ابن خیرالله) وەردەگرین کە دەڵێت:[٨]

**احیا معالم النحو فهو اذا**
**القاه قلت ابو حیان احیانا**
**بمنطق هو فیه القطب اوضح لي**
**علی مطابقة التصدیق برهانا**

هەروەها (عصام الدين عثمان بن علي) دەڵێت[٩]:

ادیب تسلّق هام السماك
فحاز الفخار بنیل الملا
واجري العنان بذلك الفضاء
فكان هلالاً لكل الملا
وها هو للناس ذاك الهلال
لكل الكمالات قد حصلا

لەلایەکی دیکەوە بەوردبوونەوە لە ئیجازەنامە زانستییەکانی زۆربەی زانایانی مووسڵ دەردەکەوێت، کە بە زنجیرە بۆ مەلا جەرجیسی ئەربیللی دەگەڕێنەوە و ئەویش وەک ئاماژەم پێ کردووە لە شێخ سەبغەتوڵڵای حەیدەری وەرگرتووە. لەمانەش ئیجازەنامەکانی بنەماڵەی ڕەضوانی، بنەماڵەی دیوەچی، بنەماڵەی خەطیب، بنەماڵەی رەمضانی، بنەماڵەی مەحضەرباشی و هەندێک لە عومەرییەکان.[١٠] هەر بەم بۆنەیەشەوە (شێخ یاسین الخگیب) دەڵێت (ئیجازە نامەکانی زانایانی مووسڵ بەڕێگەی خوالێخۆشبوو مەلا جەرجیسەوە لەلای سەبغەتوڵڵا تەواو دەبێت. بەمەدا دەزانین کە وڵاتی عەرەب لەوڵاتی کوردەوە زانستی وەردەگرت).[١١]

شایانی ئاماژە پێکردنە کە لە سەدەی هەژدەمی زایینی و لە سەرەتای سەدەی سێزدەمی کۆچیدا، بووژانەوەیەکی زانست و زانین لە شارەکانی عیراق سەری هەڵدا و بەردەوامیش بوو. لە ئەنجامی ئەمەشدا نەریتێک لەلایەن قوتابیانی کوردەوە پەیدا بوو، کە ڕوو لە شارە عەرەبییەکان بکەن و تییاندا وەک (پشت کردنێک لە دنیا) خۆیان بۆ خوێندن تەرخان بکەن، بۆ نموونە ئیبراهیم فەسیح ئەلحەیدەری کەلەساڵی (١٢٩٩)ی کۆچی وەفاتی کردووە، لە کتێبەکەیدا (عنوان المجد) ناوی ژمارەیەک لەزانا کوردەکانی سەردەمی خۆی تۆمار کردووە، لەوانەی لەناو عەرەبدا ناوبانگیان دەرکردبوو: لەمانەش شێخ سولەیمانی ئەردەڵانی، مەلا عەلی سوستی، شێخ جەرجیسی ئەربیللی، مەلا جەلال ئەلدەوانی، مەلا دەروێش ئەلعەقراوی، شێخ مەحموودی کوردی خووری....[١٢].

بێگومان مەلا جەرجیس ئەو ڕێگەیەی نەگرتبوو بەر بۆ ئەوەی پایە و پلەیەک بۆخۆی وەدەست بێنێت، یا لە کەسێکەوە نزیک بێتەوە، بەڵکو هەردەم لە هەوڵ و کۆششدا بووە بۆ گرتنەبەری ڕێگەی خوای تاک و تەنیا.[١٣] هەروەک یەکێک لە هاوڕێگەکانی خۆی لە وەسف کردنیدا دەڵێت[١٤]: (ڕابەری سۆفییە بەڕێزەکانەو ئیمامی ئەم کۆمەڵە هەڵبژاردەیە، پەخشانەکەی وەک مەرجانە، شیعریشی دەکەوێتە سەر هەموو زمانێک، ئێستا مامۆستای وڵاتەکەی ئێمەیە و لەسەر فەرشی سوود بەخشین دانیشتووە، ئەدیبی هەوارگە بەرزڕۆیەکەمانە بەرەو چاکە و سەروەریدا،....)

ئەگەرچی ئەم هاوزەمانەی خۆی بەم شێوەیە باس لە شیعر و پەخشانی مەلا جەرجیس دەکات، بەڵام ئەوەی لە بەرهەمەکانی پێمان گەیشتووە: چەند پارچە شیعرێکی ئەملاو ئەولایە و کتێبێکی دەستنووسە کە کۆمەڵێک شیعر و پەخشان لەخۆ دەگرێت و لە لاپەڕەی یەکەمیدا ئاماژە بەوە دەکات، کە لەلایەن مەلا جەرجیسەوە کۆکراونەتەوە.

لەم دوو بەیتەی خوارەوەی ئەم شاعیرەوە کە سەدر و عەجزی بۆ کردوون، بەهرەی شیعری و هەست ناسکی و توانای دەربڕینی مۆزیکی لەلایەن خاوەنەکەی بەدی دەکرێن و شاعیریەتی دەسەلمێنن کە دەڵێت :[١٥]

ورب حمامة في الدوح باتت
باشجان وحزن مستكن
على ايام وصل حيث فاتت
تعيد النوح فنا بعد فن
اقاسمها الهموم اذا اجتمعنا
وتروي قصة الاشواق عني
على حكم الهوي فيها اقتسمنا
فمنها النوح و العبرات مني

لە شیعریشدا پەند و خواپەرستی و پەنابەرێتی بۆ یەزدان و پشتلێکردن لە دنیادا بەدی دەکرێ، وەک لەم چەند دێرەدا دەڵێت:[١٦]

كن معافا وبالسعادة دائم
وعمود السعود بالعز قائم
انت سعد الزمان في كل حال
كيف ترضى بان تري السعد نائم
ارتجي ربنا الكريم شفاء
عاجلا سيدي رفيع الدعائم
بارك الله صومكم بهناء
وثناء وعز مجد ملائم

ئاشکرایە کە زانایان و شاعیران ئارەزووی ئەوەیان دەکرد، ڕووداوو بۆنەکان بە شیعر تۆمار بکەن. بۆ ئەمەش دەستەواژەی ئەوتۆیان بەکاردەهێنا ، کە لەگەڵ ڕووداوەکان بگونجێن. لەوانەیە ئایەتێکی پیرۆز یا فەرموودەیەک یا پەندێکی پێشینانیان بەکاردەهێنا بۆ ئەوەی لەگەڵ ڕووداوەکەدا ڕێککەوێت. مەلای ئەربیللیش لەم بواردەدا

سەرکەوتوو بووە، ئەمانەی خوارەوەش چەند نموونەیەکن لەم جۆرە بەرهەمانە، لەگەڵ دیارکردنی ئەو مێژووانەی بەشیعر دەریان دەبڕیت.[17]

کە جەلیلییەکان مزگەوتی (باب البیض) یان دروست کرد، لەدوا دێڕی پارچە شیعرێکی، کە بەم بۆنەیەوە داینا بوو دەڵێت:

**اذ تم بنيـــانه ارخت مــوقـعـــه**
**نعم الثـواب ونعم السـعي في الله**

واتە (١١٩٣ ی کۆچی).

بە بۆنەی لەدایک بوونی حوسێن بەگی کوری سلێمان پاشای جەلیلیدا دەڵێت :

**اشعـشـة البـدر المنيـر ام الفـجـر**
**ام الشـمس ام برق اضـاء ام القـدر**
**فـقلت اذن بالبـهج و الحسن ارخـوا**
**يرقى علينـا الحــمـــد لله والشكر**

واتە (١١٨٦ی کۆچی)

لە پیرۆزبایی کردنی نوعمان بەگی کوری سلێمان پاشای جەلیلی بە بۆنەی زەواجیەوە دەڵێت:

**بشـارة اتت لــــنا فـايحة بنشر ري الدولة اللايحة**
**اعـيـذهم من شر كل الورى مورخا: بسـورة الفاتحة**

واتە(١١٩٢ی. کۆچی)

هەروەها لە پیرۆزبایی کردنی محەمەد پاشای جەلیلی بە بۆنەی لەدایکبوونی کوڕەکەی (مەحمود) دەڵێت :

**اتي الخــيـــــر اولاه الاله ودود**
**وزال العنـا عن قـلبنا وصـــــدود**
**اتوا بعــلاه الناس غـوثا وارخـوا**
**فـقـالت لهم شـبل الاسـود اسـود**

واتە (١١٩٢ ی کۆچی)

لە لایەکی دیکەوە لەمزگەوتی حوسێن پاشای جەلیلی کە لەناو بازاری مووسڵە، چەند دێڕە شیعرێکی مەلا جەرجیس، لەسەر پەنجەرەی حوجرەکەی خۆیدا تۆمار کراوە، کە وەک قەدرزانینێک بۆ دامەزرێنەری قوتابخانەی ناو مزگەوتەکە گوتوویەتی:[18]

**انشــــأ سـلـيـــــمـــــان الوزيـر**
**دارا لـلـعـلـم تـســــــــتـــــبـين**

**يـا مـن اتي يـبـــــغي الـعـــــلا**
**( والارتـقــــــــا ) فـي الـمـرتـقـين**
**الزم مواقف كتبنا (يزدك ذا) العلم اليقين**
**ســعــد المؤرخ بالبنا فلنعم دار المتــقين**

جگە لەو هەڵبژاردەیەی لە شیعرەکانی مەلا جەرجیسی ئەربیللی پیشانماندان، دەستنووسێکی (١٦٥) لاپەڕەییشی ماوە، کە لەسەر بەرگەکەیدا نووسراوە (دیوان الوصاف الکامل الاوصاف - جمع الامام الفاضل والي الفريد الكامل مولينا بل مولى الموالي جرجيس افندي الاربلي المحقق رحمة الله). شایانی باسە لەساڵی ١٩٨٨ من و بەڕێز د. عەزیز گەردی، سەردانی مێژوونووسی ناسراو مامۆستا (سعيد الديوەچي)[19] مان کرد لە مووسڵ و سەبارەت بەمەلا جەرجیسەوە گفتوگۆیەکی تێروتەسەلمان لەگەڵ کرد. هەر بە هاوکاری و یارمەتی ئەم مێژوونووسە توانیم ئەم دەستنووسە کۆپی بکەم و لەلای خۆمدا بیپارێزم. ئەم دەستنووسە ژمارەیەکی زۆر لەهۆنراوەی هەمە جۆر و چەند لاپەڕەیەک لە پەخشانی بەخۆوە گرتووە. لەوانەیە مەلا جەرجیس کۆیانی کردووەتەوە یا بەشێکی هی خۆی بن، ئەمە وردبوونەوەو ساغ کردنەوەی دەوێت.

هەر لە کۆتایی ساڵانی هەشتایەکانی سەدەی ڕابردوو، مامۆستا (سعيد الديوەچي) شەش پارچە شیعری دیکەی مەلا جەرجیسی بۆ ناردم، کە بەزمانی تورکی بوون؟ وا دیار بوو لە دەستنووسێکەوە کۆپی کردبوون، بەڵام ناوی ئەو سەرچاوەی بۆ نەنووسیبووم، کە لێیەوە کۆپی کردبوون. بەداخەوەش ئەم چەند لاپەڕەیەم لێ ون بووە، جارێکی دیکە دەرفەتێکم بۆ بڕەخسێت بەدوای دەستنووسەکەدا دەگەڕێم و شیعرەکان کۆپی دەکەمەوە.

مەلا جەرجیس ئەفەندی لەساڵی (١٢٠٦)ی کۆچی - ڕێکەوتی ساڵی (١٧٩١)ی زایینی، لە دیوەخانەی والی مووسڵ بەکتوپڕی گیانی پاکی بەخودا[20] دەسپێرێت و لەگۆڕستانی نەبی جەرجیس دەنێژرێت. (عەبدوڵڵا بەگ ئال یاسین ئەلموفتی) بەشیعر مێژووی ئەم ڕووداوەی تۆمارکردووە، کە دەڵێت:[21]

**يـا أيهـــا المولي الذي الطافـــه**
**عمت، ادم في الخلد نحريرا عليـما**
**فــابعث له لطفـا يقـول مــؤرخـا**
**بجوار جرجيس لقد وهبت نعيـما**

واتە (ساڵی ١٢٠٦ی کۆچی)

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەم، کە بنەماڵەکەمان سەر بەم زانایایە و لە سەرچەلەکەماندا، چوار پشت لەپێش ئەویشدا تۆمارکراون، کە دەگەنە حاجی عومەرە ئەفەندی قازی هەولێر. بەم بۆنەیەشەوە تەنیا هێڵێک لە سەرچەلەکەمان دەخەمە بەرچاو کە لە حاجی عومەرە ئەفەندییەوە دەست پێدەکات، ئینجا مەلا ئیبراهیم - مەلا خەلیل - مەلا محەممەد[22] - مەلا جەرجیس ئەفەندی - خەلیل ئەفەندی - عەبدولباقییە ئەفەندی - عەبدوڵڵا ئەفەندی - فەیزی ئەفەندی - عیزەدین - لەدواییدا خۆم کە نووسەری ئەم چەند دێڕەم.[23]

شایانی باسە ئەم زانایە دوا ساڵانی ژیانی لە مووسڵ بەتەنیایی بەسەر بردووە، بۆیە نووسەری هاوسەردەمی خۆی (عیمان بک الجلیلی) سەبارەت بە (جرجیس افندی الاربیلی) دەڵێت : ( ئەگەرچی لەپشتی خۆیدا چ کوڕێکی نەبوو، بەڵام زاناکانی ئەو سەردەمە کوڕی ئەون و پەروەردەی دەستی ئەون)[24] مامۆستا سەعید دیوەچیش هەمان بۆچوونی دووبارە کردووەتەوە، بەڵام بێ پشت بەستن بە هیچ سەرچاوەیەک، لەمەش زێتر دەڕوات و دەڵێت (ژنی نەهێناوەو منداڵیشی لەپاش بەجێ نەماوە)[2][25] کە ئەم بابەتەشم لەگەڵ بەڕێزیان باس کرد (لەو چاوپێکەوتنەی پێشتر ئاماژەم پێ کردووە) بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی (من رای عوسمانی بەکی جەلیلیم دووبارە کردووەتەوە). من ڕاستی مەسەلەکەم تێگەیاند و ئاگاداریشم کردەوە کە لەو ماوەی مەلا جەرجیس لە مووسڵ جێنیش بوو، کوڕێکی هەبووە بەناوی (خەلیل)، ئەم کوڕەی لەهەولێر بەجێ هێشتووە. خەلیلیش وەک لە بەساڵاچووەکانی خۆمانم بیستووە، بێگومان ئەوانیش بۆیان گێڕدراوەتەوە، جار بەجار سەردانی باوکی کردووە، لە مووسڵ.[26] لەلایەکی دیکەوە جگە لە ئێمە، وا دیارە لە ئاکرێش بنەماڵەیەک خۆیان بەنەوەی ئەم زانایە دەزانن.[27]

لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بەوە بکەم کە لە سەدەی دوازدەمینی کۆچی، سێ زانای ناسراو لەمووسڵ ناویان (جەرجیس) بووە، (جرجیس الاربلی، جرجیس العقراوی[28] جرجیس بن درویش الموصلی[29]). جا بۆ ئەوەی هیچ تێکەڵییەک لە ژیاننامە و بەرهەمی ئەم سێ زانایەدا نەکرێت، وام بەباش زانی ناوەکانیان بخەمە بەرچاوی خەمخۆرانی ئەم بوارە.

لەکۆتاییدا دەڵێم، بێگومان بۆ وردبونەوە لەدەوری زانستی مەلا جەرجیسی ئەربیللی لەسەدەی هەژدەهەم لە مووسڵ و گەڕان بەدوای بەرهەمە پەرش و بڵاوەکانی و توێژینەوە لەو دیوانە دەستنووسەی کۆی کردووەتەوە، کارێکی گەورەو لێکۆڵینەوەیەکی فراوانی دەوێت. بەڵام بەهەرحاڵێک هیوادارم توانیبێتم بەم هەوڵە بچووکەوە تیشکێک بخەمە سەر چەند لایەنێک لە ژیان و شیعرەکانی. وابزانم تا ئێستاش جگە لەم نووسینە هیچ لەسەر ئەم زانا و ئەدیبە کوردە بەزمانی کوردی نەنووسراوە، بۆیە گەر هیچیشم نەکردبێت، ئەوەندەم بەسە پێی دڵشادم بم و شانازیشی پێوە بکەم.

**پەراوێزەکان:**

١- د. محسن جمال الدين- العالم الصوفي الشيخ جرجيس الاربيلي، جريدة العراق- العدد "٥٧١٧" في ١٨ حزيران ١٩٨٧.

٢- بە مەزەندەی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای فەرهادی، ئەم شێخ عەبدوڵڵای ئەصەمە، شێخ عەبدوڵڵای قوتبولمەدارە، کە لەناو خەڵک لە هەولێر بە "شێخەڵڵا" ناسراوە. "لاپەڕە ٢٣٣- لە کتێبی الاكليل فى محاسن اربيل- عەبدوڵڵا فەرهادی".

٣- دەقی ئەصلی ئیجازەنامەکەی مەلا جەرجیسی ئەربیللی، لە کتێبخانەی خوالێخۆشبوو ڕەشادەفەندی قازی پارێزراوە.

٤- زبير بلال اسماعيل- علماء ومدارس في اربيل "لاپەڕە ٧٩".

٥- الشيخ ياسين ابن خيرالله الخطيب العمري- غاية المرام في تاريخ محاسن بغداد- لاپەڕە ٣٧٤.

٦- فائق ابو زيد سليم عقراوي- العلامة جرجيس العقراوي- جريدة العراق- ٢٣ تموز ١٩٩٣.

٧- محمد خليل افندي المرادي/ سلك الدرر في اعيان القرن الثاني عشر. لاپەڕە ٩.

٨- غاية المرام "لاپەڕە ٣٧٤".

٩- عصام الدين عثمان بن علي بن مراد العمري- لاپەڕە ٤٤٠. کتاب "الروض النضر في ترجمة ادباء العصر".

١٠- سعيد الديوەچي- الشيخ جرجيس الاربلي- مجلة المجمع العلمي الكردي- المجلد الثالث- العدد الثاني- ١٩٧٥- لاپەڕە ٦٠٠.

١١- غاية المرام- لاپەڕە ٣٧٤.

١٢- د. محسن جمال الدين- جريدة العراق "٥٧١٧" في

١٩٨٧/٦/١٨.
١٣- سعيد الديوەچي- مجلة المجمع الانفة الذكر- لاپەڕە ٦٠٤.
١٤- الروض النضر- لاپەڕە ٤٤١.
١٥- غاية المرام- لاپەڕە ٣٧٤ و چەند سەرچاوەیەکی دیکەش.
١٦- سعيد الديوەچي- مجلة المجمع العلمي الكردي/ المجلد الثالث العدد الثاني/ لاپەڕە ٦٠٤.
١٧- هەمان سەرچاوە- لاپەڕە ٦٠٦- ٦٠٩
١٨- نقولا سيوفي/ مجموعة الكتابات المحررة في ابنية مدينة الموصل تحقيق/ سعيد الديوەچي لاپەڕە ١٣٤.
١٩- ئەوکاتەی لە مووسڵ سەردانی ئەم مێژوونووسەمان کرد، وا دیاربوو خانەنشین بوو و لە ماڵەوە لە ژووری کتێبخانەکەی خۆیدا خەریکی نووسین و خوێندنەوە بوو. لە گفتوگۆکردن لەگەڵیدا وەک دۆستێکی دڵسۆزی کورد هاتە بەرچاومان، تا ئەو رادەیەی خۆی گوتی: " چەند جار لێیان پرسیوم ئایا تۆ کوردی؟".
٢٠- غاية المرام- لاپەڕە ٣٧٤.
٢١- سعيد الديوەچي- مجلة المجمع العلمي- لاپەڕە ٦١٠.
٢٢- سەرجەلەی بنەماڵەکەمان.
٢٣- الاكليل في محاسن اربيل- لاپەڕە ٢٣١ مامۆستا مەلا عەبدوڵلای فەرهادی زنجیرەی سەرجەلەی بنەماڵەکەمان لە مەلا جەرجیسەوە تاوەکو سۆران لەم کتێبەدا بڵاو کردووەتەوە.
هەر بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە لاپەڕە ٧٩ لە کتێبی علماء ومدارس في اربيل- زبير بلال اسماعيل.
٢٤- الحاج عثمان بك الجليلي- الحجة علي من زاد علي ابن حجة- لاپەڕە ٩٤.
٢٥- سعيد الديوەچي- مجلة المجمع- لاپەڕە ٦٠٢.
٢٦- سوران عزالدين فيضي- تعقيب على مقال حول العلامة جرجيس الاربلي- جريدة خەبات "بالعربية" العدد ٧٠٠ في ١٩٩٣/١١/١٠.
٢٧- فائق ابوزيد سليم عقراوي- العلامة جرجيس العقراوي- جريدة العراق في ٢٣/تموز/١٩٩٣.
٢٨- محمد امين بن خيرالله الخطيب العمري- منهل الاولياء ومشرب الاصفياء من سادات الموصل الحدباء- لاپەڕە ١٨.
٢٩- الاكليل في محاسن اربيل- لاپەڕە ٢٢٧.

سەرچاوە:

١- الشيخ ياسين ابن خيرالله العمري - غاية المرام في محاسن بغداد دار منشورات البصري - بغداد ١٩٦٨.
٢- محمد خليل افندي المرادي - سلك الدرر في اعيان القرن الثاني عشر، الجزء الثاني.
٣- عصام الدين عثمان بن علي بن مراد العمري - الروض النضر في ترجمة ادباء العصر - الجزء الثاني - تحقيق الدكتور سليم النعيمي ١٩٧٥ ميلادية.
٤-نقولا سيوفي - مجموعة الكتابات المحررة في ابنية مدينة الموصل تحقيق سعيد الديوەچي ١٩٥٦ ميلادية.
٥- الحاج عثمان بك الجليلي - الحجة علي من زاد علي ابن حجة الموصل ١٩٧٣.
٦- عبدالله الفرهادي - الاكليل في محاسن اربيل - وزارة الاوقاف والشؤون الاسلامية- اربيل ٢٠٠١.
٧- زبير بلال اسماعيل - علماء ومدارس في اربيل - مطبعة الزهراء الموصل ١٩٨٤.
٨- سعيد الديوەچي/ الشيخ جرجيس الاربلي - مجلة المجمع العلمي الكردي - المجلد الثالث - العددالثاني ١٩٧٥.
٩- محمد امين بن خيرالله الخطيب العمري - منهل الاولياء ومشرب الاصفياء من سادات الموصل الحدباء - تحقيق سعيد الديوەچي - الموصل ١٩٧٦.
١٠- د. محسن جمال الدين - الشيخ جرجيس الاربلي الرشادي. جريدة العراق - العدد (٥٧١٧) في ١٨ حزيران ١٩٨٧.
١١- الاجازة العلمية للشيخ جرجيس الاربلي - الاجازة محررة من قبل العلامة صبغة الله الحيدري - والنسخة الاصلية منها محفوظة في مكتبة المرحوم محمد رشاد المفتي في اربيل.
١٢- فائق ابوزيد سليم العقراوي - العلامة جرجيس العقراوي - جريدة العراق ٢٣ تموز - ١٩٨٧.
١٣- سوران عزالدين فيضي - تعقيب علي مقال حول العلامة جرجيس الاربلي. جريدة خەبات (بالعربية) العدد (٧٠٠) في ١٩٩٣/١١/١٠.

# بنەماڵەی ئیبن مونعە و کەمالەدین مووسا

دکتۆر موحسین محەمەد حوسێن
ئەندامی کارای ئەکادیمیای کوردستان

پێشەکی

لەم بوارەدا پرسیارێک دەورووژێ: چ پێویست دەکات بایەخ بەو زانایانە بدرێت کە هیچ ئاسەوارێکیان بەسەر کۆمەڵگاکانیانەوە بەجێ نەهێشتووە، بەتایبەتیش بۆ ئەو قۆناخانەی کە دێن ؟، یان..... ئایا لەم جیهانەی کە بەخێراییەکی لە رادەبەدەر لە گۆڕاندایە، دەبێ کەلەپووری پێشینیان چ بەهایەکی هەبێت....؟

وەڵامی ئەو جۆرە پرسیارانە بریتییە لەوەی کە ئەو کەلەپوورەی باپیران جێیان هێشتووە و ئەو کودەتا زانستییانەی بەدوایاندا هاتووە و بەشەرییەتی گەیاندۆتە ئەم رۆژەی ئێستا و چالاکیی زانستییانەی هەر تاکێک، لە هەر بوارێکی زانیاریدا ئەنجامی دابێت، رێخۆشکەر بووە بۆ سەرهەڵدانی کۆششی نوێتر.

ئەگەر ئەوان نەبوونایە مرۆڤایەتی پێش نەدەکەوت و شارستانییەتەکان وا گەشەیان نەدەکرد، چونکە پێویستە بە شێوەیەک سەیری هزری مرۆیی بکەین، کە بوونەوەرێکە گەشە دەکات و پێش دەکەوێت، لە کات و ساتی تایبەتیدا رۆڵی بەرچاوی بینیوە تا لە کات و شوێنێکی دی، رێ بۆ کار و چالاکیی دیکە خۆش بکات. گریکەکان بۆ پێشکەوتنی زانست و فەلسەفە رۆڵێکی بەرچاویان بینیوە و لە ماوەی بووژانەوەی شارستانییەتەکەشیاندا موسڵمانەکان کەوتنە ژێر کاریگەری ئەو شارستانییەتە و توانیشیان شتێکی دی بخەنە سەر ئەوەی وەریانگرتبوو. ئەوانیش (واتە موسڵمانەکان) بەهەر شێوەیەک بووبێ، توانییان رێ بۆ هاتنە کایەی چاخێکی نوێ لە ئەورووپای خۆرئاوا خۆش بکەن و پاشان تەواوی ئەورووپا و جیهانی نوێ. هەموو زانایەک لەوەی پێش خۆی وەرگرتووە و هێندەش لە توانای دابووە خستوویەتییە سەری. بۆ نموونە بوونی ئیبن هەیسەم و خەوارزمی سەرەتایەک بوو بۆ سەرهەڵدانی گالیلۆ و نیوتن. ئەگەر پێشینان نەبوونایە، ئەوانەی دوای ئەوان دەبوو وەک ئەوان لە سەرەتاوە دەست پێ دەکەن، نەک لەو شوێنەوە، کە پێشینان لێی بە کۆتا هاتبوون. نیوتن لەو شوێنەوە دەستی پێ کرد، کە ئیبن هەیسەم پێی گەیشتبوو.

بۆیە...ئەوەی لە زانیاری، یان لە جۆرە تیۆرێک، یاخود لە زانستێکی دیاریکراودا گەیشتوتە پلە و پایەیەکی باڵا، ئەوکاتە ئەوەی بەدەستی هێناوە، کە هەندێکی دیکەی رێگەیان بۆ خۆش کردووە و وایان کردووە تا ئاسانتر سەربکەوێ، نەک لەو شوێنەوە دەست پێ بکات کە پێشینەکانی ئەو دەستیان پێ کردبوو...واتە لە سفرەوە دەست پێ ناکات.

لەگەڵ ئەوەی لە مەسەلەی زانستەکاندا هەمیشە نوێ دێت کۆن بسڕێتەوە، چونکە کۆن و نوێ لە یەک سەردەمدا پێکەوە هەڵناکەن و ناژین، کە ئەمەش کاری زانستە رووتەکانە (الصرفە)، بەڵام دەبێت (نوێ) دان بە چاکەی (کۆن) دابنێ و لە بیری نەکات، پێشینان هەردەم لە پایەی رێز و ستایشدا دەمێننەوە. لەسەر ئەوانە پێویست کراوە، کە لە مێژووی ژیانی رێبەرەکان دەکۆڵنەوە، شانازییان پێوە بکەن، بەتایبەتی کاتێ هزر و تیۆرەکانیان چۆتە نێو لاپەڕەکانی مێژووەوە. بەو بۆنەیەوەش ئەم قسانەم کرد، دەمەوێ یادی یەکێک لە گەورەپیاوانی کوردی موسڵمان بکەمەوە، کە جێ پەنجەی خۆی بەقووڵی لە نێو هزری زانستی جێ هێشتووە، ئەویش کەمالەدین مووسا کوڕی محەمەد کوڕی مونعەی هەولێرییە.

## ڕەچەڵەکی بنەماڵە

ڕەنگە زێدەگۆیی نەکەین ئەگەر بڵێین بەناوبانگترین بنەماڵەی زانستی، کە لە سەدەکانی شەشەم و حەوتەمی کۆچی لە هەولێر و مووسڵ سەری هەڵدابێ، ئەوا بنەماڵەی (مونعە) بووە، ئیبن خەلەکانی مێژوونووس (شەمسەدین ئەحمەدی کوڕی محەمەد ئەربیللی - ساڵی ٦٨١ی کۆچی، ١٢٨٢ی زایینی کۆچی دوایی کردووە) باسی بنەماڵەی ئیبن مونعە دەکات، کە تاکە ماڵی سەرەکی و پیاوەتی بووە بۆ ئەو کەس و ڕێبەرانەی، کە سەردانی شاری هەولێریان کردووە.[١] ئەو بنەماڵەیەش بەهەڵکەوتنی فەقیهی گەورە ڕەزییەدین یونس ئەربیللی ناوبانگی دەرکرد کە لە ساڵی ٥٨ی کۆچی، ١١١٤ ز لەدایک بووە و لەو شارەش گەورە بووە. ئەو کاتیش هەولێر لە کوردستان گرنگترین مەڵبەندی شارستانی ئیسلامی بووە.

پاشان ڕەزییەدین یونس هەولێر جێ دەهێڵێ و دەچێتە مووسڵ، لەوێ زانستەکانی سەردەم دەخوێنێ و لەسەر دەستی تاجی ئیسلام ئەلحوسێن بن نەسری ناسراو بە ئیبن خومەیسی کەعبی جوهنی پێگەییوە و کتێبەکانی خوێندۆتەوە و گوێی لە گوتەکانی گرتووە. کاتێکیش ویستوویەتی خوێندن تەواو بکات، لە مووسڵەوە چۆتە بەغدا و لای شێخ سەعیدی کوڕی محەمەدی کوڕی عومەری ناسراو بە ئیبن ولرەزاز خوێندوویەتی، کە لە قوتابخانەی بەناوبانگی نیزامی دەرسی دەگوتەوە. پاش ئەوەی لە بەغدا خوێندن تەواو دەکات گەڕاوەتەوە مووسڵ و لە قوتابخانەکانی ئەوێ دەستی بە دەرس گوتنەوە کردووە. ئەویش وەک زۆر لە هزرڤان و فەقیهەکان و شاعیر و زمانزان و زانایانی دی نەگەڕاوەتەوە هەولێری شوێنی لەدایکبوونی خۆی بەو نیازەی ئاسۆی بیرکردنەوەی فراوانتر بکات و، بەراستیش شاری هەولێر لەو کاتەدا بەو توانا کەمەی کە هەیبووە نەیتوانیوە بەپێی پێویست حەز و ئارەزووەکانی بۆ زانست دابین بکات و لەگەڵ ئەو ڕەوتەدا بڕوات، کە لە جیهانیی ئیسلامی ئەوسادا هەبوو. زەینەدین عەلی کوڕی بەکتەگین، ناسراو بە کچک عەلی واتە (عەلییە بچکۆل)، کە دامەزرێنەری میرنشینی ئەتابەکیی هەولێرە (باوکی پاشا موزەفەرەدین گۆگبۆری خودانی بەناوبانگی هەولێر)، ئەو کات لە جیاتی خودانی مووسڵ کاروباری مووسڵی بەڕێوە دەبرد و لەوێ بوو، بەگەرمی پێشوازیی لەو زانایە هەولێرییە کرد، (کە لە بەغدا گەڕابۆوە) و دەرسی دەگوتنەوە و کاری بەڕێوەبردنی ئەو مزگەوتەشی پێ سپارد، کە هەر بەناوی ئەو زانایە ناسراوە و پێی دەڵێن (مزگەوتی زەینی)، (دەرسی تێدا دەگوتەوە و فەتوای لێ دەدا و بەڕێوەشی دەبرد)،[٢] کە قوتابییان ڕوویان تێ دەکرد تا زانست و زانیاریی لێ وەرگرن، هەردوو کوڕەکەی خۆشی شێخ عیمادەدین محەمەد و کەمالەدین مووسا لە نێو ئەو قوتابییانە بوون، کە لەوێ دەستیان بە خوێندن کرد.

شێخ زەینەدین یونس نەیتوانی ئەرکەکانی خۆی لە دەزگا فێرکاری و ئایینییەکانی مووسڵ درێژە پێ بدات، چونکە لە ٦ی موحەڕەمی ساڵی ٥٧٦ کۆچی، ٢ی نیسانی ١١٨٠ ز، کۆچی دوایی کرد و لە تەنیشت (مزگەوتی زەینی)یش بەخاک سپێردرا.[٣] ئیبن خەلەکان گەلێ ئاکاری چاکی شێخ زەینەدینی باسکردووە و ڕۆشنبیرییە فرەلایەنییەکەشی لە زۆر بواردا خستۆتە ڕوو لە نێوانیاندا ئەم دوو دێڕە شیعرەیە

**لها زوره في كل عام وتاره**
**تمر شهور الحول لانتجمع**
**وصيال وصد لالشيئ سوى انها**
**على خلق الدنيا تجود وتمنع**

ئەمەو لەم بوارەشدا ناتوانین بیرۆکەیەکی فرەلایەن لەمەڕ هەموو ڕۆڵەکانی ئەو بنەماڵە زانستپەروەرە بخەینە ڕوو، چونکە زۆرن و گرنگیشیان بە زانستی هەمەجۆر داوە و بەسەر ڕووبەرێکی بەرفراوانی جیهانیی ئیسلامیدا بڵاو بوونەتەوە، بە تایبەتی لە هەولێر و مووسڵ و بەغدا و وڵاتی عەجەمان و شوێنی دی خزمەتیان کردووە، وەک ئیبن خەلەکان باسی کردووە، بۆیە ئەم لێکۆڵینەوەمان لەسەر یەکێک لە ڕۆڵەکانی ئەو بنەماڵەیە چڕ دەکەینەوە، کە بە گوتەی ئەو پایەبەرزییە بێ هاوتایەی لەسەر ئاستی جیهانیی ئیسلامی و غەیرە ئیسلامیشدا بەدەستی هێناوە، ڕەنگە بەناوبانگترین کەسی ئەو بنەماڵەیە بێت، ئەویش کەمالەدین مووسایە.

## کەمالەدین مووسا

لە مانگی سەفەری ساڵی ٥٥١ی کۆچی، ئاداری ١١٥٦ ز کەمالەدین مووسا لە ماڵێکی سەنتەری زانست و تۆژینەوە و فەتوا لەدایک بووە. یەکەمین کەسێک کە فێری زانستەکانی کردبێ باوکی خۆی بووە، هەروەها زمان و ئوسوڵ و ئەدەبی عەرەبی لەسەردەستی یەحیای کوڕی

سەعید قورتوبی خوێندووە. کاتێک تەمەنیشی گەیشتۆتە بیست ساڵان بڕیاری داوە مووسڵ جێ بهێڵێ و بچێتە بەغدا تا لە قوتابخانەی نیزامی بخوێنێ، کە لەوێ ئوسووڵ و هونەری فقیهی لەسەر دەستی یەکێک لە ئیمامەکانی سەردەم محەمەد کوڕی هیبەتوڵلا کوڕی عەبدوڵلای سەلماسی خوێندووە، کە لەو کاتەدا ئەرکی موعیدی لە ئەستۆدا بوو کە لە (٥٧٢ ک، ١١٧٨ ز کۆچی دوایی کردووە). هەروەها دواتر دەرسی لەلای شێخ زەینەدینی ئەبوخەیری ئەحمەدی کوڕی ئیسماعیل کوڕی یووسفی قەزوینی (لە ٥٩٠ک، ١١٩٣ز کۆچی دوایی کردووە) خوێندووە. هەروەها لەسەر دەستی عەبدوڕەحمان کوڕی محەمەد ئەنباری (لە ٦٤١ک، ١٢٤٣ز کۆچی دوایی کردووە) ئەدەبی خوێندووە، ئەو مامۆستایە لە سەردەمی خۆیدا بەیەکێک لە گەورەترین ئیمامەکانی عەرەبی ژمێردراوە زۆر لە ئەدیب و فەقیهەکان لەسەر دەستی ئەو پێگەیین. جگە لەمانە سەرچاوەکان ئاماژە بەناوی هیچ کەسێکی دیکە لە زانایانی بەغدا و لە پێش ئەوانیشدا زانایانی مووسڵ ناکەن، کە کەمالەدین مووسا لەسەر دەستی ئەوان فێری زانستەکانی دیکە بووبێ، وەک بیرکاری و فەلەکناسی و لۆژیک و فەلسەفە....ڕەنگە ئەو زانستانەی لە زانایانی بەغدا یان مووسڵ، یان هەولێر لە دەرەوەی خوێندنی نیزامی وەرگرتبێ، بەڵام مێژوونووسان ناوی هیچ کەسێک نابەن.

دوای ئەوەی خوێندنی لە بەغدا تەواو کرد گەڕایەوە مووسڵ تا خۆشترین و باشترین گەشتی پڕ لە بەخششی ژیانی زانایەک. لە پێناوی زانایانی سەردەم دەست پێ بکات و قوتابییانیش لە هەموو لایەکەوە ڕووی تێ بکەن تا سوودی لێ ببینن. پاش مردنی باوکیشی لە مزگەوتی زەینی جێگای گرتەوە. ئیبن خەلەکان نووسیویەتی : ئەو مزگەوتە وەک قوتابخانە دەهاتە بەرچاو، لەبەرئەوەش ماوەیەکی زۆری لێ ماوەتەوە، لەسەر ناوی ئەو مزگەوتە کە بە قوتابخانەی کەمالییە ناوبانگی دەرکردووە. هەروەها ئەو مێژوونووسە هەولێرییە کە لە ساڵی (٦٢٦ک) زۆرجاران چۆتە ئەوێ ئاماژە بەوە دەکات، کە دۆستایەتی و پەیوەندییەکی توندوتۆڵ لە نێوان باوکی و کەمالەدین مووسا هەبووە، هەر لەبەرئەمەش کوڕە نۆبەرەکەی بەناوی کەمالەدین مووسا ناوناوە.[٤] کەمالەدین مووسا ئاگادارییەکی تەواویشی لە (٢٤) جۆرە هونەر هەبوو، بۆیە بەتاقە زانای سەردەمی خۆی ناسراوە (بەپێی گوتەی ئیبن خەلەکان).

زانستخوازان دەچوونە لای تا دەرسی حیکمەت و لۆژیک و پزیشکی و زانستە سروشتییەکان و بیرکاری و جەبر و مۆسیقای لا بخوێنن. لە عەرەبیشدا زانستی سەرفی لەبەر کردبوو، لەوانە گوتنەوەشدا پشتی بەو کتێبە گرنگ و ڕەسەنانە دەبەست، کە لەو بوارەدا دانرابوون، وەک کتێبی (سیبەوەیهی) و کتێبی (التكملە)ی ئەبی عەلی فارسی و کتێبی (المفصل)ی زەمەخشەری، ئیبن خەلەکان سەبارەت بە زانست و ڕۆشنبیری ئەو زانایە مەزنە لەسەری دەڕوا و ڕای دەگەیەنێ، کە هیچ کەسێک لە زانایانی سەردەمی پێش ئەو نەیانتوانیبوو لەم هەموو جۆرە زانست و هونەردی سەردەمدا سەر دەربکەن.

لە ئەسیرەدین ئەلموفەزەلی ئەلئەبهەری خاوەنی کتێبی (التعليقە) لە فیقە و هی دی دەگێڕنەوە (کە لە ٦٦١ ک کۆچی دوایی کردووە)، کە لە ساڵی ٦٢٥ ک، ١٢٢٧ ز سەردانی هەولێری کردووە، تا لە قوتابخانەکانیدا وانە بڵێتەوە و ئیبن خەلەکانیش لەسەر دەستی ئەو خوێندوویەتی. دەگێڕنەوە ئەسیرەدین لە هەولێر لە یەکێ لە فەقیهەکانی بەغدای (کە ئەو کات لە سەردانی هەولێر بووە) پرسیوە ئایا پێشوازیی دیوانی خەلیفایەتی عەبباسی بۆ کەمالەدین مووسای زانا چۆن بووە؟ کاتێ لە ڕێی چوونە حەجدا هاتۆتە بەغدا؟ فەقیهی بەغدایی لە وەڵامدا گوتوویەتی پیاوانی دیوانی ناوبراو مافی خۆیان پێ نەداوە، بەو شێوەیە پێشوازییان نەکرد، کە شایانی ئەو زاتە بێت. ئەسیرەدین ئەبهەری گوتوویەتی ئەمە ئەگەر کارێکی پڕ لە سەرسوڕمان نەبێت چیدی نییە، وەڵلاهی پیاوی وەک ئەو زانایە نەچۆتە بەغدا، ئیبن خەلەکان دەڵێ کاتێ ئەم قسەیەم لە ئەسیرەدین بیست، بینیم زێدەڕۆیی وەسفکردنەی کەمالەدین دەکات، پێم گوت گەورەمان چۆن قسەی وا دەکەی؟ وەڵامی دایەوە کوڕەکەم ئەگەر پیاوێکی وەک حوجەتول ئیسلام ئیمام محەممەد غەزالی[٥] بچێتە بەغدا وەڵلاهی لە نێوان ئەو و کەمالەدین مووسادا نیسبەتێک نییە.[٦]

لەگەڵ ئەوەی لەم گێڕانەوەیدا دەبینین هەندێ زێدەڕۆیی لە پێداهەڵگوتندا هەیە، بەڵام گومانی تێدا نییە، کە کەمالەدین مووسا توانایەکی باڵای هەبووە بۆ دۆزینەوەی بەسەر بۆ زۆر لە کێشە و ئاڵۆزییەکانی بیرکاری، هونەری، ئەمەشی لە ڕێگەی (ئەقلیدس) و دەستە (الهيئة) و (قوچەک - مخروط) و (المجسطی) و جۆرەکانی ژمارەی کراوە و جەبر و دیمانە و (ئەرسماتیکی) و ڕووبەر و

مۆسیقاوە. کەمالەدین مووسا هەموو ئەو زانستانەی باش دەزانی، بێ ئەوەی کەسێک هەبێت وەک ئەو بە وردەکارەکانیان بزانێ و، لەسەر هەقیقەتەکان هەڵوەستە بکات. ئەوەی لەبارەی بیروباوەڕەوە لێی دەگێڕنەوە، ئەوەیە کە سەرەڕای قووڵبوونەوە لە بیروباوەڕی ئایینی ئیسلام، بەنێو بیروباوەڕی جوولەکە و مەسیحییەکانیشدا رۆچوو بوو، (تەورات) و (ئینجیل)یان بۆ دەخوێندەوە، ئەویش بۆی شی دەکردنەوە و لێکی دەدایەوە، دانیان بەوە دادەنا ئەوەی کەمالەدین مووسا بۆیان روون دەکاتەوە و سەرەدەری لێ دەردەکات ئەوان نایزانن.[7]

لەبەرئەوەی لە زۆربەی کۆششەکانی لە (خوێندن و دەرس گوتنەوەدا) لە زانستە رووتەکان (البحتە)دا بووە وەک بیرکاری و زانستە سروشتییەکان و فەلسەفە و لۆژیک، بۆیە هەندێ لە زانایانی سەردەمی خۆی بەوە گوناهباریان دەکرد، کە گوایە بیروباوەڕی ئایینی لاوازە.[8]

بەقسەی ئیبن خەلەکان لەبارەی ئەوەوە گوتوویانە، کە بەهۆی زاڵبوونی بیروڕای زانستی بەسەریدا هەندێ جار تووشی غەفڵەتگیری بووە. ئەوەش خەسڵەتی زۆر لەو زانایانەیە کە ویستوویانە ئەقڵ و هۆشی خۆیان بخەنەگەڕ بۆ گەیشتن بەراستییەکان، نەک بەوە بوەستن، یان هەر پشت بەوە ببەستن، کە لە دەوروبەری خۆیان گوێیان لێ دەبێ. زانای گەورە ئیبن باجەی ئەندەلووسی، کە لە بوارەکانی پزیشکی و بیرکاری و فەلەکناسی و فەلسەفەدا کاری دەکرد بە خوانەناس و بێ بڕوا تاوانباریان کرد و لە ساڵی (٥٣٣ک، ١١٣٩ز) کوشتیان،[9] وا بزانم پێویستمان بەوە هەیە، کەوا نموونەی پتریش بهێنینەوە.

## بەشدارییەکانی لە حەلکردنی کێشە ئاڵۆزەکانی بیرکاری

موبارەک ئەبوبەرەکاتی مێژوونووسی هەولێری ناسراو بە (ئیبن مستەوفی) لە کتێبەکەیدا (نباهة البلد الخامل، بمن ورده من الاماثل في تاريخ اربيل) ئاماژەی بەپلە و پایەی کەمالەدین مووسا لە نێو زانایانی سەردەمی خۆیدا کردووە، کە لە بەغداوە زۆر پرسیاری لەمەڕ گرفتەکانی بیرکاری و فەلەک بۆ هاتووە و حەلی کردوون و سەلماندوونی. هەروەها بۆ حەلکردنی پرسیارە قورسەکانی بیرکاری زانایانی دیمەشق پشتیان بەو بەستاوە. ئیبن خەلەکان نوسیوویەتی لە ساڵی (٦٣٣ ک / ١٢٣٥ز) کە لە دیمەشق بووە، چەند بابەتێکی بیرکاری و ژمێرکاری و جەبر و دیمانە و رووپێوی ئەقلیدس لە زانایانی ئەوێ ئاڵۆزکابوو، ئەوانیش تەنیا کەمالەدین مووسایان شک دەدیت چارەیان بکات، بۆیە پرسیارەکانیان بۆ نارده مووسڵ و چەند مانگێک چاوەڕوانی وەڵام بوون، کەمالەدین مووسا هەمووی حەلکردن و ئاڵۆزییەکانیشی بەشێوەیەک بۆ روونکردنەوە وەسف ناکرێت، ئەوەش لەو کاتەدا بوو کە کەمالەدین تەمەنی لە (٧٠) ساڵ بەسەرکەوتبوو. لەبەرئەوەش لە پەراوێزی ئەو پرسیارانەی حەل کردبوون، داوای لێبووردنی لە کەموکورتییەکان کردووە و نوسیوویەتی (لەبیرکردن دەستی بەسەرداگرتوون و رووداوەکانی زەمان مژوڵی کردوون، زۆر لەوەی بەدەستمان هێنا و زانیمان لەبیرمان چۆوە، بەشێوەیەک وامان لێ هاتووە کە هەرگیز ئەمەمان نەزانیوە).[11]

کوڕی (ئەبی ئەسەیبیعەی خەزرەجی، مودەفەقەدین ئەحمەد بن قاسم، کە یەکێکە لە زانایانی ئەو سەردەم و لە ساڵی (٦٦٨ک، ١٢٦٩ ز مردووە)، هەواڵەکانی پەیوەندیی زانایانی ئەو دەڤەرەی بەو زانایە گەورەیە (کەمالەدین) باس کردووە و بەتایبەتی بەردەوامی زانایانی بەغدا، نووسیوویەتی کە نەجمەدین قەمراوی و شەرەفەدین مەتانی (لە زانایە ناسراوەکانن) سەردانی کەمالەدین مووسایان کردووە تا لێی فێرە زانست بن و سوودیان لێی وەرگرتووە.[12] پاش ئەوەش کە رەشیدەدین بن خەلیفە پلە و پایەی بەرزی زانستی ئەو زانایەی بیست سەردانی مووسڵی کرد و لەگەڵ کەمالەدین مووسا کۆبۆوە. هەروەها یەکێ لە مێژوونووسانیش ئاماژە بەوە دەکات کە عیلمەدین قەیسەری زانای بیرکاری لەسەر دەستی ئەو زانایەدا خوێندوویەتی.[13] ئەسیرەدین ئەلموفەزەل ئەبوعومەر کوڕی موفەزەل ئەلئەبهەری ناوبراو، کە دانەری چەندین کتێبە، لە بن دەستی کەمالەدین مووسا دادەنیشت، کتێبەکەی هەڵدەگرت و بۆی دەخوێندەوە، چۆن قوتابی بۆ مامۆستاکەی دەخوێنێتەوە. ئیبن خەلەکان ئەوەی بەچاوی خۆی بینیوە وەک دەڵێ ئەسیرەدین کتێبی (الكجسطى) دەخوێندەوە و دەیگوت، هەر بۆ ئەوە وڵاتی خۆم بەجێ هێشتووە و هاتوومەتە مووسڵ تا لەلای شێخ کەمالەدین مووسا فێر بم. ئەوە لەو کاتەدا بووە، کە خەڵک زانیارییان لە ئەسیرەدین وەردەگرت، کە پاشان هەر لەلای کەمالەدین بە مامۆستای قوتابخانەی بەدریە لە مووسڵ دامەزرا.

پادشایەکانی خۆرئاواش (فەرەنگییەکان) هەر پرسیارێکیان سەبارەت بە ئەستێرەناس و ئاسماناسی ئاڵۆزکابووایە پشتیان بە کەمالەدین مووسا دەبەستا. ئیمپراتۆر فریدریکی دووەم نوێنەری خۆی ناردۆتە لای

فەرمانڕەوای مووسڵ (پادشای خودان بەزەیی بەدرەدین لوئلوو چەندین پرسیاری سەبارەت بە ئەستێرەکانی پێ بووە، داوایان لە فەرمانڕەوای مووسڵ کردووە ئەم پرسیارانە بداتە کەمالەدین مووسا وەڵامیان بداتەوە. بەمە بەدیار دەکەوێ هەواڵی پایە و زانایی ئەو زانایەمان بەبیانییە غەیرە مووسڵمانەکانیش گەیشتووە. کەمالەدین مووسا لەلای بەدرەدین لوئلووئەوە ڕێزێکی زۆری هەبوو، هەموو جارێکیش سەبارەت بە پێویستییەکانی لێی دەپرسی و بۆی جێبەجێ دەکرد.[١٤] ئەو پادشایە کە بەوە ناسرابوو هاندەرێکی باشی زانست و زانایان بوو، لە سەردەمی ئەودا زۆر دەزگای زانستی لە مووسڵ دامەزرا.[١٥]

بەدرەدین شا ناردییە دوای کەمالەدین مووسا و داواکەی ئیمپراتۆری پێ ڕاگەیاند و پێشی گوت، کە پەیامهێنەکەی حەزی لێیە بتانبینێ، رای سپارد جلکێکی وا لەبەر بکات، کە شایان بە پلە و پایەی ئەو بێ، چونکە کەمالەدین مووسا وەک زۆر لە زانایان گوێی بەرێکوپێکی خۆی نەدەدا و جلکی ئاسایی دەپۆشی. کەمالەدین مووسا داواکەی حاکمی مووسڵی جێبەجێ کرد و خۆی بۆ دیداری نوێنەرەکەی ئیمپراتۆر ئامادە کرد، نوێنەرەکەی چووە لای و بەڕێزەوە پێشوازیی لێ کرد، پرسیارەکانی لێ وەرگرت و خوێندییەوە و هەموو وەڵامەکانی بۆ نووسییەوە. فردریکی دووەم کە لە ساڵی (٦١٣ک / ١٢١٥ز) مردووە، ئیمپراتۆری ڕۆما بووە، پێشتریش لەسەر دەستی زانا مووسڵمانەکان دەرسی خوێندووە و لە کاتی شەڕی خاچپەرستان پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بە مووسڵمانانی سەقلیە و وڵاتی شامەوە هەبووە و کەوتبووە ژێر کاریگەری ڕۆشنبیری مووسڵمانان، حەزی لە حیکمەت و لۆژیک و نوژداری بوو.[١٦]

بەداخەوە کتێبەکانی ئەو زانایەمان کەمێکیان نەبێ نەگەیشتۆتە دەست، چونکە زۆربەیان وەک مامۆستا قەدری حافیز تۆقان دەڵێ بەهۆی ئەو کودەتا و شەڕ و ئاژاوانەی لە عێراق روویان داوە بزر بوون. ئێستاش دەبینن کتێبەکانی کەمالەدین مووسا و زانایانی دیکەش نەگەیشتوونەتە ئێمە، چونکە بەپێی زەمان لەناوچوون و لەلایەن کۆمەڵگەکەمانەوە کە لەوە ڕاهاتووە بیرۆکەی ئاسان و ساوادی گواستراوە وەربگرێ. کە هیچ سوودێکی بۆ پێشکەوتن نییە و ڕەواجی نەبووە، ئەو کۆمەڵگەیەی پێویستی بە کتێبی وەک کتێبەکانی ئەو زانایە نەبێت، شارستانییەکەی وەک عەقڵی ڕۆڵەکانی لاواز دەبێت، ئەوەش دەبێتە سەرەتایەک بۆ هێرشی ئەو گرووپانەی، کە هاتن لاوازییەکە پتر بکەن، یان بۆچی هەندێ لە زانایانەی سەردەمی خۆی لە ئایینپەروەری تاوانباری دەکەن ؟ کە ئەمە تاوانێکە و هاوتای نییە، بۆ ئەوەیان بووە کتێبەکانی وەک مین بن و کەسانێکی سەرکێش نەبێ، کەسی دیکە تخوونی نەکەون لە سەرچاوەکاندا بەتایبەتی لە کتێبی (عیون الانباء )دا ناوی هەندێ لە ئەدرێسی کتێبەکانی نووسراون و هەندێکیشیان لە کەلەپووری عەرەبی ئیسلامیدا هاوتایان نییە، وەک لە ئەدرێسەکانیان رادیارە و هەموویان سەبارەت بە فیقهن، کە ئەمانەن :

١- كتاب كشف المشكلات وايضاح المعضلات في تفسير القرآن.
٢- شرح كتاب التنبيه.
٣- كتاب مفردات في الفاظ القرآن.
٤- كتاب في الاصول.
٥- كتاب عيون في المنطق.
٦- كتاب لغز في الحكمة.
٧- كتاب الاسرار السلطانية في النجوم.

دەستکەوتێک لە دەستکەوتە زانستییەکانی ئەو پیاوە، کە بووەتە مایەی دانپێدانانی مێژووناسانی جیهان ئەوەیە، کە لە پێش گالیلۆی ئیتاڵی بە هەندێ یاسای پەیوەندیدا بە (الرقاص)ی زانیوە، کە لە کاتژمێردا بەکار دێت. (سمیس)ی زانای ئەمریکی لەمبارەیەوە گوتوویەتی لەگەڵ ئەوەی، کە یاسای (الرقاص) گالیلۆ دایناوە، بەڵام بەر لەوەیش کەمالەدین مووسا بەشێکی لێزانیوە، واتە ئەو زانا هەولێرییە لە بەرایی ئەوانەدا بووە، کە ڕێگەیان بۆ ئەو دۆزینەوە زانستییە خۆش کردووە. ئەو دۆزینەوەیەی پتر لە بوارێکدا بایەخی خۆی هەیە و فەلەکناسەکانیش دوای ئەوە بۆ حسێبکردنی ماوەی زەمەنی لە کاتی ڕوانین لە ئاسماندا بەندۆلیان بەکار هێنا. هەر ئەوەش بوو ڕێگەی بۆ گالیلۆ خۆش کرد تا ئەو یاسایانە دابهێنێ، کە پەیوەندییان بە (الرقاص)ەوە هەیە. واتە کەمالەدین مووسا توانی ئەو ڕاستییە بدۆزێتەوە، کە ماوەی نێوان (لەرەلەر - الذبذبە) بەکورتی و درێژی بەندۆ لو گرگرەی قورساییەوە بەستراوە. ئەمەشی خستە نێو قالبی بیرکاری و بووە هاندەرێک بۆ بەکارهێنانی بەرفرە بێت و زۆر سوودی لێ وەربگیرێ.[١٧] هەوڵ و تەقەلا زانستییەکانی کەمالەدین مووسا کاریگەرییەکی زۆری بەسەر بزاڤی زانستی و ڕۆشنبیری سەردەمی خۆیەوە هەبوو، وەنەبێ ئەو کۆششانەش هەر لە

چوارچێوەی دەرس گوتنەوە و خستنە رووی دید و بۆچوونەکانەوە بێت، بەڵکو ژمارەیەک کتێبی وای دانا لەلای زاناکانی ئەو وەخت نرخ و بەهایەکی زۆری هەبوو، زۆربەی بایەخ پێدانەکەشی تایبەت بوو بە زانیارییەکانی هۆشمەندی و بە قووڵی دەچووە نێو وردەکارییەکانییەوە.[18]

هەرچەندە ناتوانین لێرەدا ناوی هەموویان ریز بکەین، بەڵام لەسەر دەستی کەمالەدین موسادا هەندێ گەورە زانای ئەو سەردەمە فێری زانست و زانیاری بوون. وێڕای ئەو زانایانەی پێشتر ناومان هێنان و ئەوانەش، کە بەردەوام لە موسڵ دەچوونە لای تا وای لێ هاتبوو ئەو شارە ببووە قیبلەی زانایان، عیلمەدین قەیسەری کوڕی عەبدولغەنی کوڕی موسافیریش دەچووە لای، ئەو عیلمەدینەی کە بەرابەرێکی زانستەکانی بیرکاری و فەلەکناسی و ئەندازەیی دادەنرێ، تەنانەت لەبەرئەوەی زۆر بەئەندازەی زانستی خۆی خەریک دەکرد، ناویان لێ نابوو ئەندازیار.[19] لەم بارەوە ئیبن خەلەکان ئاماژە بەوە دەکات، کە ئەو (ئەندازیار)ە زۆربەی زانستەکانی لە کەمالەدین موسای مامۆستای وەرگرت ئەمەو عیلمەدین قەیسەر تۆپێکی فەلەکی (ئاسمانی) دروست کردبوو (Celestial Globe)، رەنگە بۆ لە ئەستێرە روانینی بووبێ، ئەو تۆپەش هێشتا لە مۆزەخانەی ناپۆلی لە ئیتالیا پارێزراوە، هەروەها ئەو زانایە نامەیەکی سەبارەت بە سەرەتاکانی (بدیهیات) بۆ ئەقلیدیس نووسیوە و پێشکەش بە نەسیرەدین تۆسی کردووە.[20]

ئەو (نەسیرەدینتۆسی)یەش هەر لەسەر دەستی کەمالەدین موسا فێر بووە و بە یەکێک لەو چەند زانا بەهرەدارانەی، کە لە سەدەی شەشەمی کۆچیدا (سەدەی دوازدەمی زایینی) و یەکێک لە حیکمەتدارانی ئیسلام دادەنرێ بەنازناوی (عەلامە) ناوبانگی دەرکردبوو، تا ئەو رادەیە مامۆستا قەدری حافیزتۆقان لە کتێبەکەیدا لە کەلەپووری زانستییانەی عەرەب لە بیرکاری و فەلەکناسی)دا[21] گەیشتۆتە ئەوەی ئەو ماوەیەی کە تۆسی تیایدا ژیاوە بە (سەردەمی تۆسی) لە زانستدا ناو بنێ هەروەها زانراوە، کە تۆسی لەمەڕ سێ گۆشەکان و دەستەو جەبر نووسیویەتی و ئیستەرلابی دامەزراندووە و چۆنیەتیی بەکارهێنانی باس کردووە. سەبارەت بەو ئاسەوارە زانستییانەش کە لە دوای بەجێماوە سارتۆن گوتوویەتی (گەورەترین زانای ئیسلام و گەورەترین بیرکاری زانە.[22]

سەرەڕای ئەوانەش، ژمارەیەکی زۆر لە زانایانی سەردەم لە زۆر لاوە روویان لە کەمالەدین موسا کردووە و لەسەر دەستی ئەو جۆرەها زانست فێربوونە لەوانە :

قازی.....یووسف کوڕی یاسین داقوقی،[23] جەلالەدین بەغدادی، سویریۆس یەعقوب کوڕی عیسا کوڕی مەرقس شەپۆ،[24] قازی....بیلال کوڕی رەمەزان کوڕی حەسەن هەولێری، کە بۆتە فەرمانداری قەزای کەرخینی[25] (کەرکووکی ئێستا)، تەقیەدین عوسمان کوڕی عەبدولڕەحمان، کە بە (ئیبن سەلاح) ناسراوە.[26]

## شایەتنامەی مێژوونووسان

سەرەڕای ئەوانەی باسمان کردن، ژمارەیەک لە زانایانی سەردەمی خۆی باس لە کەمالەدین موسا و کارکردنی لە زانستە جۆراوجۆرەکانی باس دەکەن. هەروەها زۆر لە شاعیرانی سەردەمی خۆی قەسیدەیان لەمەڕ چاکی و پایەی بڵندی ئەو زانایە داناوە، موبارەک ئیبن مستەوفی ئەربلی وا وەسفی دەکات، کە کەمالەدین موسا خۆی لە قەرەی هەموو زانستە بەراییەکان داوە وەک ئەندازە و لۆژیک و هی دیش، ئەقلیدیس و مەجسەفی هاوڕێ لەگەڵ شێخ شەرەفەدین موزەفەر کوڕی محەمەد کوڕی موزەفەر تۆسی حەل کردووە و لە فیقەو زانستە ئیسلامییەکان هاوتای نەبووە.[27]

ئیبن خەلەکان لە هەموان پتر لەمەڕ رۆڵەکانی بنەماڵەی کەمالەدین موسا (بنەماڵەی ئیبن مونعە)ی نووسیوە، چونکە پەیوەندییەکی بەتین لە نێوان بنەماڵەی خۆی و بنەماڵەی ئەو زانایەدا هەبووە، بەتایبەتی لە کاتی سەرەتای سەرهەڵدانی ئەو بنەماڵەیە لە هەولێر. لەمەڕ کەمالەدین موساوە گوتوویەتی، لە هەموو هونەرێک مەلەی کردووە، ئەو هەموو زانستەی ئەو کۆی کردبۆوە، کەس کۆی نەکردۆتەوە، بێ هاوتای سەردەم بوو. ئیبن خەلەکان گرێانەی تاوانبار کردن بە زێدەڕۆیی لە باسکردنی چاکمەندییەکانی ئەو شێخە لە خۆی دوور دەخاتەوە و گوتوویەتی: کێ لە خەڵکی وڵات - وەک ئەو - وەک کەمالەدین موسا لە زانستەکانی - لە هەموو جۆرێکدا - زانیوە، کە گەیشتۆتە ئەوەی بەتەواوی و بە رەوانی لە (٢٤) هونەر بزانێ، دەشزانرێ من شتێک باس ناکەم لەوودا پەیدا نەبێ،[28] واتە ئیبن خەلەکان باسی شتێکی کردووە کە هەقیقەت بووە.

عەبدوللەتیف موەفەقەدین بەغدادی (٦٢٩ک،

١٢٣١ز) مردووە، یەکێک بوو لە گەورە زانایانی موسڵمانان و لە سەردەمی کەمالەدین مووسا ژیاوە، لە ناوچەکە سوڕاوەتەوە و دیدەنییەکانی لە کتێبێکدا بەناوی (الافادة والاعتبار في الامور المشاهدة)دا نووسیوەتەوە. هەروەها زۆر کتێبی لەبارەی بیرکاری، زانستە سروشتییەکان و کیمیا و پێوانەکان و نۆژداری و حیکمەت و یاسا و لۆژیک و خواوەندی و زمان و ئەدەب داناوە[٢٩] عەبدوللەتیف گوتوویەتی کاتێک سەردانی بەغدای کردووە کەسێکی نەدۆزیوەتەوە سوودی لێ وەربگرێ چاوی تێر بکات و ئەوەی بۆ شی بکاتەوە، کە لێی بۆتە گرفت. هەر بۆیە سەردانی مووسڵی کردووە و لەوێ کەمالەدین مووسای دۆزیوەتەوە. چۆتە نێو قووڵایی بیرکاری و فیقە، بە بەشەکانی دیکەی حیکمەت زانا بووە و لەو کات خۆشەویستی زانستی کیمیا دەستی بەسەر هۆشیدا گرتووە.[٣٠]

یاقوت حەمەوی، شەهابەدین ئەبوعەبدوڵڵای رۆمی هاوسەردەمێکی دیکەی کەمالەدین مووسایە و (لە ٦٢٦ک، ١٢٢٨ ز) مردووە، شایەتی بەزانایی ئەو دەدات و چەند دێرە شیعرێکی شاعیرێکیش بە نموونە دێنێتەوە، کە پیایدا هەڵدەڵێ و تیشک دەخاتە سەر پایەی زانستی بێ هاوتای کەمالەدین، کە ئەم دێرەیان دەخەینە روو:

یا افضل الناس في علم و ادب... وارجح الخلق عندالله میزانا.[٣١]

هەروەها زەکەریای کوڕی محەمەد کوڕی مەحموودی قەزوینی، کە ئەویش یەکێک بووە لە زانایانی سەردەمی کەمالەدین مووسا (لە ساڵی ٦٨٢ک، ١٢٨٣ز) کۆچی دوایی کردووە، بەتایبەتی لە مێژووی سروشتی و فەلەکناسی و جوگرافیادا دەستێکی باڵای هەبووە و زانیارییەکی گرنگی لە کتێبەکەی (عجائب المخلوقات و غرائب الموجودات) باس کردووە و سەبارەت بە ئاسمان و پێکهاتەکەی دەدوێ و وەسفی ئەستێرە و کەلوەکان و جوولەیان و کەژ و مانگەکانی کردووە، هەروەها سەبارەت بە زەوی ئەوەی لەسەریەتی، وەک با و دەریا و دوورگە و گیاندار و رووەکەکان، هەروەها بە پێویستی دەزانێ بە راستییەکان و چۆنیەتیی بیرکردنەوەدا بچنەوە و سەبارەت بە هەستەکان و لێکۆڵینەوە لە هەقیقەت تا بگەنە دەستکەوتی ئەوەی نوێیە، نەک هەر بەردەوام لەسەر ئەوەی باوەو ئەو زانستانەی بە میرات ماونەتەوە.[٣٢]

هەروەها کتێبێکی جوگرافی بەناوبانگی هەیە ناوی ناوە (آثار البلاد واخبار العباد) لە نێویدا باس لە شارەکانی ناوچە جیاجیاکانی زەمین دەکات و دەبینین کاتێک دێتە سەر شاری مووسڵ لەبارەی زانایانی ئەو کاتە دەدوێ، بەڵام کەس نابینێ شایانی ئەوە بێت پێیدا هەڵبڵێ کەمالەدین مووسا نەبێت و لەمەڕ ئەودا دەڵێ : هەموو هونەرەکانی زانستی لە خۆ کۆ کردبۆوە، لە سەردەمی خۆیدا هاوتای نەبوو، لە هەر هونەرێک بدوایە وەک ئەوە بوو خۆی خودانی ئەو هونەرە بێ، بەڵام لە بیرکاریدا دەڵێ تاکەکەس بوو سەری لێ دەردەکرد، هەروەها قەزوینی لەسەری دەڕوا و دەڵێ: ئەوەی مایەی سەرسوڕمان بوو، کە لە کەمالەدین حووسام بینی ئەوە بوو لە سەردەمی شا محەمەدی کوڕی شای عادیل سەیفەدین ئەبوبەکری کوڕی ئەیوب (واتە لە سەردەمی کوڕە برای سەلاحەدینی ئەیوبی) فەرەنگییەکان پرسیارێکی زۆریان نارده شام بۆ ئەوەی زانا موسڵمانەکان وەڵامیان بۆ بدەنەوە، لەمیانیاندا پرسیار سەبارەت بە نۆژداری و حیکمەت، زانایانی شام توانییان ئەم پرسیارانە حەل بکەن، بەڵام دەسەڵاتیان بەسەر پرسیارە ئەندازەییەکاندا نەشکا، کەچی شا محەمەد دەیویست هەموو پرسیارەکان حەل بکەن، بۆیە پرسیارە ئەندازەییەکانی نارده مووسڵ بۆ لای ئەسیرەدین ئەلموفەزەل ئەلئیبهەری، کە زانایەکی گەورە بوو لە ئەندازەو، زەکەریا قەزوینی دەڵێ، وەڵامی دروستی پێ نەدرایەوە، بردییە لای مامۆستاکەی کە کەمالەدین مووسا بوو، بیری لێ کردەوە و وەڵامی دایەوە، ئەوەی لە پرسیارەکە داوا دەکرا روونکردنەوەی ئەوە بوو کە کەوانێک تیرێکی لێ دەرهێنرا، تیرەکە لە بازنەدا دەرچوو، چوارگۆشەیەکمان لەسەر دروست کرد، رووبەری کەوانەکە هێندەی رووبەری چوارگۆشەکە دەبێ.... وەڵامەکەی بۆ زانایانی شام نێردرایەوە و کاتێک ئەو سەلماندنەیان بینی کە کەمالەدین مووسا ئەنجامی داوە، بەرێگەچارەی حەلکردنەکە سەرسام بوون (کەوتنە پیاهەڵدانی ئەو سەلماندنەی کە لەو زەمانەدا کەم بوو).[٣٣]

کوڕی ئەبی ئوسەیبیعەی خەزرەجیش کە بە بەناوبانگترین کەسێک دادەنرێ لە کتێبەکەیدا (عیون الانباء في طبقات الاطباء) یادی نۆژداری موسڵمان و غەیرە موسڵمانی بە زیندوویی هێشتۆتەوە، لەمەڕ کەمالەدین مووساوە گوتوویەتی: (عەلامەی سەردەمی خۆی بوو، بێ هاوتای ئەوکات بوو، رێبەری زانایان بوو، حیکمەتی ئەزبەر بوو، هەموو زانستەکانی دەزانی، لە

زانستەكانی شەرعی و فیقهیشدا مەزن بوو).

بەڵام ئیبن فوتی كەمالەدین عەبدولڕەزاق بەغدادی، كە (لە ساڵی ٧٢٣ك، ١٣٢٣ز) كۆچی دوایی كردووە، نووسیویەتی، كە كەمالەدین مووسا شێخی كاتی خۆی بوو لە زانستی ئوسوول و حیكمەتدا. لە زۆر قوتابخانە لە مووسڵ دەرسی دەگوتەوە و لە خۆرهەڵات و خۆرئاوا دەهاتن تا لای ئەو زانایە بخوێنن و سوودی لێ وەربگرن.[٣٤]

ئەلسەیكی تاجەدین عەبدولوەهاب كوڕی تەقییەدین، كە لە (ساڵی ٧٧١ك، ١٣٧٠ز) كۆچی دوایی كردووە، لە كتێبەكەیدا (طبقات الشافعية الكبري)دا ئاماژە بەوە دەكات، كە كەمالەدین مووسا بە زەبرێكی لە رادەبەدەر ناسرابوو، مەرجەعی خەڵكی مووسڵ بووە شیعرێكیشی گوتووە :

وكان من العلوم بحيث يقضي..... له في كل علم علم بالجميع[٣٥]ئەم قسانەش بەوە كۆتایی دێنین، كە سارتۆن لە كتێبەكەیدا رۆشنبیری خۆرئاوا لە ژێر چاودێری خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا) سەبارەت بەو زانایە هێناویەتەوە، دەڵێ: (كەمالەدین مووسا زاناترین زانای سەردەمی خۆی بوو، لە گەورە مامۆستایان بوو - یان مامۆستایەكی گەورە بوو - خودان بەرهەمێكی قەبە بوو، كە كۆمەڵێك زانیارین لەمەڕ زانست و هونەرەكاندا).[٣٦]

### كۆچی دوایی كەمالەدین مووسا

لە ١٤ی شەعبانی ساڵی ٦٣٩ك، سەرەتای ساڵی ١٢٤٢ی زایینی، لە تەمەنی ٨٦ ساڵیدا كەمالەدین مووسا لە مووسڵ كۆچی دوایی كرد، لەسەر خاكی بنەماڵە بەناوبانگەكەی لەلای (خاكی غەسان لە مووسڵ) لە دەروازەی عێراق نێژراوە. كەمالەدین مووسا بە رەچەڵەك سەر بە (بنەماڵەی ئیبن مونعە)ی هەولێرییە، كە رۆڵەی بنەماڵەی قازین و لە گوندێك دادەنیشن بەناوی ئەوانەوە ناسراوە (گوندی قازییە)، رەنگە ئەو گوندەی لێرەدا مەبەستە (قازیخانە) بێ، كە هەر ئەو شك دەبەین (س. ب) كە دەگەڕێتەوە بۆ قازی یونس كوڕی محەمەد باوكی كەمالەدین مووسا، لەبەرئەوەی هەر ئەو بنەماڵەیەش دەیان قازی هەبوو، كە لە هەولێر و مووسڵ و شارەكانی دیكەی دەڤەرەكە خزمەتیان كردووە. گوندی قازییە (یان قازییەكان) دەكەوێتە خۆرهەڵاتی رێڕەوی زێی دیجلە، گوندەكە كە بەدووریی ٣ كم لە خۆرئاوای كەوتۆتە لای ئەوبەر (خۆرئاوای زێی دیجلە).

ئێستاش رۆڵەكانی ئەو بنەماڵەیە لە گوندەكەدا نیشتەجێن و هەندێكیشیان چوونەتە مووسڵ و بەناوی (ماڵی قازەلی)، واتە نەوەكانی قازی ناسراون.

### پەراوێزەكان

١- وفيات الاعيان، طبعة القاهرة ١٩٤٨، ١/ ١٠٨.
٢- هەمان سەرچاوە، ٦/ ٢٥٢.
٣- هەمان سەرچاوە و لاپەڕە و هەروەها الاسنوبي، طبقات الشافعية، تحقيق د. عبدالله الجبوري، مطبعة الارشاد، بغداد ١٩٧٠- ١٩٧١، ج٢ ص ٥٦٩.
٤- كەمالەدین مووسا كوڕی شەمسەدین ئەحمەد (كوڕی ئیبن خەلەكان) لە ساڵی ( ٦٥٣ ك، ١٢٥٣ ز) لە دایك بووە و كتێبەكەی باوكی كورت كردۆتەوە و ناوی ناوە (المختار من وفيات الاعيان)، لە ساڵی ٧١٧ ك، ١٣١٧ ز، كۆچی دوایی كردووە، وەك ئیبن حەجەری عەسقەلانی بە (الدرر الكامنة في اعيان المائة الثامنة، طبعة القاهرة، ١٩٦٢، ٥/ ١٤٣)دا نووسیویەتی.
٥- ئەلغەزالی لە شارەكەی خۆی (تابەران) لەدایك بووە و هەر لەوێش مردووە، كە ئەو شارە مەڵبەندی (تووس) بووە لە خوراسانی ئێران. سەردانی زۆر شوێنی كردووە وەك نیشاپوور و بەغدا و حیجاز و شام و میسر، لە بەغدا پەیوەندی بە نیزام ئەلمەلیك، وەزیری بەناوبانگی سەلجوقی كردووە و لە قوتابخانەی نیزامییە خوێندوویەتی، لە رێگەی گەیشتن بە خوادا پشتی بە زانست و ئیلهام و باوەڕەوە بەستووە. (چاپكراوەكانی. (احياء علوم الدين)، (تهافت الفلاسفة)، (المنقذ من الضلال)، (المصطفى من علم الاصول)، (القبر المسبوك في نصيحة الملوك) و زۆری دی لە ساڵی ٥٠٥ ك، ذ ز، كۆچی دوایی كردووە.
٦- ئیبن خەلەكان، ٤/ ٣٩٨.
* ئەقلیدس : زانستی رووپێوی ئەندازەیی، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ناوی زانا (ئەسكەندەری كوڕی میسری)، كە بەو ناوە ناسراوە (سەدەی چوارەمی پێش زایین).
٧- هەمان سەرچاوە، ٤/ ٣٩٧.
٨- الاسنوي، سەرچاوەی پێشتر ٢/ ٥٧١.

٩- محەممەد کوری یەحیا کوری بابەی ئەندەلوسی، وا باس کراوە کە عەللامەی کاتی خۆی بووە و لە گەورە فەیلەسووفەکانی ئیسلام بووە. مایەی ئیعجابی (ئیبن روشد) و (ئیبن توفەیل) بووە. فەلسەفەی هۆشمەندی خۆی کانت (Kant) ئاسا لەسەر بنەمای بیرکاری و لۆژیک داناوە. هەندێ لە نووسینەکانی دۆزراونەتەوە، کە (٤٤٠) لاپەڕەیە، لە کتێبخانەی بەرلین دانراوە، (تدبیر المتوحد) و (رسالة الوداع) لە بەرهەمەکانی ئەون.
١٠- ئیبن خەلەکان، سەرچاوەکەی پێشتر ٣٩٩/٤، لە ئیبن مستەوفی وەرگیراوە.
١١- هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.
١٢- کتێبەکەی : عیون الانباء في طبقات الاطباء، اصدار دار الفكر بيروت ١٩٥٦، ج٢ ص ٣٣٨.
١٣- ابن الفوطي، كمال الدين عبدالرزاق البغدادي تلخيص في مجمع الاداب في معجم الالقاب. مجلة (O.C.M) الهند. ج٥ العدد ٨٦ ص ٢٩٣.
١٤- السبكي، تاج الدين عبدالوهاب ابن تقي الدين. طبقات الشامغية الكبري، طبعة الحسينية، القاهرة ١٣٢٤ د، ج٥ ص ١٥٨.
١٥- د. سوادي عبد محمد الرويشدي. امارة الموصل في عهد بدرالدين لؤلؤ، مطبعة الارشاد، بغداد ١٩٧١، ص١٨٢.
١٦- بڕوانە کتێبی (المكتبة العربية الصقيلة) تحقيق ميخائيل اماري ليبسك، ١٨٥٧، ص ٥١١، هەروەها الدومبيلي. العلم عند العرب واثره في تطور العلم الواعي، ترجمة عبدالحليم النجار و د. محمد يوسف موسى، ط ١٩٦٢، ص ٤٤٥.
١٧- سيمث : تاريخ الرياضيات، مجلد ٢، ص ٦٧٣، نقلا عن عبدالله بن العباس الجراري، تقدم العرب في العلوم و الصناعات واساتذتهم لاروبا، طبعة دارالفكر العربي، القاهرة ١٩٦١، ص٢٤.
١٨- د. سوادی، سەرچاوەکەی پێشتر ص ١٨٨- ١٨٩.
١٩- الدومبيلی، سەرچاوەکەی پێشتر ص ٣٠٥- ٣٠٦.
٢٠- سارتۆن:
Science Sorton. Introduction to the history a Washington.Vol .11,1931, P 25
٢١- هەمان کتێبی سەروو لاپەڕە ٤٠١ - ٤٣٢.
٢٢- قەدری حافیز ص ٤٥١، نامەکانی تۆسی گردکرانەوە و لە هیندستان لە چاپخانەی مەعاریفی عوسمانی لە حەیدەر ئابادی پایتەخت چاپ کراوە. بۆ زانیاریی پتر لەمەڕ توسی بڕوانە کتێبی قەدری حافیز ص ٤٠٧ - ٤١٥.
٢٣ - ابن المستوفي، المبارك ابو بركات بن احمد الاربلي، تاريخ اربل، تحقيق د. سامي السيد خميس الصفار، بغداد ١٩٨٠، ص ٢٢٧.
٢٤- يعقوب اغناطيوس الناس، فقات الطيب، رحلة لبنانيه ١٩٦١، ص١٠٥.
٢٥- ابن المستوفی، هەمان سەرچاوە.
٢٦- السبكي، طبقات الشافعية ٥/ ٣١٥.
٢٧- ابن خلكان / سەرچاوەی پێشوو، ٣٩٩/٤.
٢٨- هەمان سەرچاوە ٣٩٨/٤.
٢٩- پێشەکی کتێبی (المجرد للغة الحديث)، عبداللطيف البغدادي، دراسة و تحقيق د. فاطمة حمزة الراضي، مطبعة الشعب، بغداد ١٩٧٧ ص ٤٤- ٥٨.
٣٠- ابن ابي اصيبعة، عيون الانباء، ترجمة كمال الدين موسى ابن يوسف.
٣١- ياقوت الحموى، معجم البلدان، ماده الموصل.
٣٢- بڕوانە د. عبدالحليم منتصر، تاريخ العلم، مطبعه دار المعارف القاهره، ١٩٨٠، ص ٢٠٣- ٢٠٦.
٣٣- القزويني، آثار البلاد واخبار العياد، طبعة دار صادر، دار بيروت، بيروت ١٩٦٠ ص ٤٦٣.
٣٤- القزويني مجمع الاداب، الهند ج٥ ص ٢٩٣.
٣٥- السبكي، طبقات الشافعية الكبرى.
٣٦- قدري حافظ طوقان، تراث العرب العلمي، ص ٣٩٨.
٣٧- بڕوانە سەعید دیوەچی، الموصل في العهد الاتابكي.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر / ژمارە ١٥ ی هاوینی ساڵی ٢٠٠٢ وەرگیراوە.

# سەید حەسەنی رەشوانی

هوشیار عەبدوڵلا

له دەشتی زرارەتیدا "٢" گوند بەناوی "رەشوان" هەیە، ئاقاریان لەسەر یەکە، کەوتۆتە ئەوبەری رووباری بەستۆرە، یەکێکیان "رەشوان ئەسعەد"ە، ئەوی دیکەیان "رەشوان نورۆ"یە، کاتی خۆی "نورۆی قورشیداغای هەرکی" کە دەکاتە برای خوالێخۆشبوو"فەتاح ئاغای هەرکی" لە زرارییەکانی کڕیبوو، هی زرارییەکان بوو، هەنووکە هەرکییەکان تێیدا نیشتەجێنە، بۆتە موڵکی ئەوان. هەردوو رەشوان سەر بەناحیەی سەلاحەدین بوون، بەڵام دوای ئەوەی گوندی "قەرەقاجین" کرا ناحیە بەناوی "ناحیەی دارا شەکران" هەنووکە سەر بەو ناحیەن، "رەشوان ئەسعەد" گوندێکی زۆر کۆنە، ئاقارەکەی لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی"مام خاران"، " گردی ماوان و سومەریان و رەشوان نورۆ" لەسەر یەکە و لایەکیشی رووباری بەستۆرەیە، هەر لە کۆنەوە بنەماڵەیەکی سەیدی تێدا بووە، لەوانە بنەماڵەی"سەید حەسەنی رەشوانی"یە، کە یەکێک بووە لە سەرکردە هەرە ئازا و چاونەترس و بەتوانا و لێهاتوو و چالاکەکانی لەشکری سەید محەمەدی رواندزی پاشای گەورەی میرنشینی سۆران "١٧٨٣ - ١٨٣٧"، ئەم سەید حەسەنە سەرکردایەتیی لەشکری دەڤەرەکەی دەکرد لە زەمانی میری سۆران، بەشداریی لە گەلێک شەڕ و شۆڕی پاشای کۆرەی رواندزی کردووە، وەک گرتنی شاری هەولێر لە ساڵی ١٨٢٢ز، گرتنی دەشتی هەولێری دەڤەری دزەییاتی لە ساڵی ١٨٢٣ز لەگەڵ رەسووڵ بەگی برای پاشای گەورەدا، بەدیل گرتنی ژمارەیەکی زۆر لە سەرۆک هۆز و تیرەکانی دەشتی هەولێر، یەکێک لەو دیلانە "حەموود الهاوار"بووە، شێخی عەشیرەتی تەی کە دەکاتە باپیری"شێخ حەنەش"ی گوندی"هەوێرە"ی دەشتی شەمامکێ، چونکە "شێخ حەموود" لە کاتی ئەو شەڕەدا یارمەتیی تیرە و هۆزەکانی دەشتی هەولێری دابوو، تەنانەت خۆشی بەشداریی تێدا کردبوو، بەڵام دەستەی خوالێخۆشبوو"کاوێس مەلا"ی بەخۆ و بەپیاوە قارەمانەکانی توانییان خۆیان لە شەڕەکەدا دەرباز بکەن و خۆ بگەیەننە دۆڵەکانی چیای قەرەچوغ، خۆ ئەگەر لەبەر قارەمانی"سەید حەسەنی رەشوانی" نەبووایە، ئەوا لەو شەڕی کە لە ساڵی ١٨٢٢ز لە دەشتی هەولێردا کرا، ئەوا "رەسووڵ بەگ"ی، برای پاشای گەورە بەدیل دەگیرا و بەخسیر دەبوو، بەڵام هەرچۆنێک بوو سەید حەسەن توانی"رەسووڵ بەگ"رزگار بکات و بەپرەپڕ خۆ لە شاری هەولێر بنێنەوە.

ئەو سەرکردە قارەمانە بەشداریی لە گەلێک شەڕ و شۆڕ و

ئەو پێکدادانانەی کە لە دەڤەری"سنجار" و "دۆڵی دینارتە"ی، ناوچەی زێبار و"ئاکرێ" و"ئامێدی"دا کردووە. ئا ئەوەتا "جۆستن پێرکنس" لە گەشتەکەیدا کە لە شاری"ورمێ"ی، کوردستانی رۆژهەلاتەوە "ئێران" لە ساڵی ١٨٤٩ز دەستی پێ کردووە، بەکوردستانی خوارووی "عێراق" تێپەریوە تا گەیشتۆتە شاری"مووسڵ" ناوی ئەو گوند و رووبار و شار و شارۆچکانەی هێناوە و بۆی تۆمار کردووین کە لەگەڵ کاروانەکەیدا پێیدا تێپەریون. جۆستن لە کتێبەکەیدا بەم شێوەیەی خوارەوە باسی گوندی"رەشوان" و "سەید حەسەن"مان بۆ دەکات، دەڵێت: "دواتر کاروانەکە گەیشتە گوندی"رەشوان" بێرکنس و هاوەڵەکانی شەو لە گوندی رەشوان دەمێننەوە" دەڵێت:"ئەو گوندە پێکهاتبوو لە "١٠٠"سەد ماڵی کورد و "٢" ماڵە جوولەکەشی تێدا بوو، رووبارە بچووکەکەی بەستۆرەش لە نزیک گوندەکە تێدەپەری، ئەم رووبارە لە رۆژهەلاتەوە دەهات و هەردوو هەرێمی رواندز و هەولێری لە یەکتری جودا دەکردەوە، گوندی رەشوان هەر تەنیا"١٥"میل لە شاری هەولێرەوە دوورە". بێرکنس باسی ئەو سەرکردە کوردە دەکات کە لە گوندی"رەشوان"نیشتەجێ بوو، ناوی"سەید حەسەن"بوو.

بێرکنس دەڵێت:"کاتێک بەگوندەکەیاندا تێپەرین، ئەو چووبووە سەردانێک بۆ رواندز، بەلام کورەکەی لە جێگەی ئەو بوو"ناوی کورەکەی نەهێناوە- نووسەر"، کورەکەی"٢" دوو لە پیاوەکانی دەستنیشان کرد تاوەکو پاسەوانی لە کاروانەکە بکەن، بەم کارە بۆمان دەرکەوت، ئەوەیان زیاتر حەز لە یارمەتی دەکات لەوەی کە دوێنێ لەلای راوەستاین"پاش ئەوەی پاشای گەورە میری سۆران لە ساڵی ١٨٦٣ز خۆیدا بەدەستەوە، هەندێک دەڵێن هێناویانەتە شاری هەولێر و لەوێوە رەوانەی"ئەستەمبوڵ"یان کردووە، سوڵتانی ئەو سەردەمی عوسمانی"مەحموودی دووەم" بووە "١٨٠٨ - ١٨٣٩" دەڵێن رێزێکی زۆری لێ ناوە، لە گەرانەوەیدا بۆ کوردستان لە شاری"تەرابزۆن" لە پلانێکی دارێژراودا لەناویان بردووە، پاش ئەوەی کۆتایی بەژیانی میر هات لە ساڵی ١٨٣٧ز لەشکرەکەی بلاوەیان لێک ردووە، بنەماڵەکەیان لە ناوەخۆیاندا پێک نەهاتوون و تووشی شەر و ئاژاوە بوونە، کەسیان بۆ کەسی دیکەیان بەجێ نەهێشتووە و دایاننەناوە، لە پاش میر محەممەد پاشا، "میر ئەحمەدی لاڵ"ی، برای بۆتە میری سۆران، ئەویش "٣" سێ ساڵ میرێتیی کرد، پاشان بەدەستی خزمەکانی خۆیان کوژرا "میر ئەحمەدی لاڵ" لە ساڵی ١٨٣٣ز فەرمانرەوای شاری هەولێر بووە، کچێکی هەولێری لە قەلا بەرز و سەرکەشەکەی هەولێرێی هێناوە ناوی "فاتیمە" بووە، کچی "مەلا سالح مستەفا" ناوێک بووە، لەو ژنەی تەنیا کورێکی بووە ناوی "یونس بەگ" بووە، کاتێک کە باوکی لە دەوروبەری ساڵی ١٨٤٠ - ١٨٤١ز کوژراوە، ئەو لەلای دایکی ماوەتەوە لە هەولێر، هەر لە هەولێریش پەروەردە و گەورە بووە، لەلای خاڵوانەکانی نەچۆتەوە رواندزێ، لە هەولێر ژنی هێناوە "٢" دوو کوری هەبووە بەناوەکانی "هیدایەت و عەبدوڵلا"، "هیدایەت"یش "٤"چوار کوری هەبووە بەناوەکانی"حەسەن، عەباس، وەلی، عەلی". "حەسەن"یان، بە"حاجی حەسەن هێدۆش" ناسرا بوو، گەورە بازرگانێکی هەولێر بووە، لە ساڵی ١٩٦٤ز کۆچی دوایی کردووە، مزگەوتێکی لە

نزیک چایخانەی بایز دروست کردووە، "مزگەوتی حاجی حەسەن بەزاز"ی، پێ دەڵێن، هەنووکە نەوە و نەوەزاکانی زۆرن لە ناو شاری هەولێر، حاجی قادری کۆیی لە باسی، لە پاشای گەورە و لە میر ئەحمەدی لاڵ گوتوویەتی:

**تا تەعیناتی"کوێر" و "لاڵ" بوو**
**لە گەلی دێیەکان مەلای چا بوو**

"سەید حەسەنی رەشوانی" یەکێک بووە لەو سەرکردە ئازا و شۆڕەسوارانەی پاشای گەورە جا حکومەتی عوسمانی عەفووی کردبێت و ئەو چووبێتەوە لە ماڵی خۆی لە گوندی رەشوانی ناوچەی زرارەتی دانشتبێت ئێمە هیچ زانیارییەک و هەواڵێکمان بەدەستەوە نییە، چونکە هیچ سەرچاوەیەک نییە، ئەگەر هەشبووبێ ئەوە نەماوە و لەناوچووە، تەنیا ئەو نووسینەی جوستێ نەبێت. چونکە "١٢" دوانزە ساڵان لە پاش لەناوچوونی پاشای گەورە ١٨٣٧ز، جوستێ بەگوندی "رەشوان"دا تێپەڕیوە و باسی"سەید حەسەنی رەشوانی"دەکات و ئەوکاتی لە ژیاندا بووە و سەفەری رواندزی کردووە، لە هەندێک لە پیرە بەساڵاچووەکانی دەشتی زرارەتیم بیستووە دەڵێن: گوندی "خاڵوان - خاروان"یش لە زەمانی پاشای کۆرەی رواندزیدا لە ژێر دەستی"سەید حەسەنی رەشوانی" بووە، یەکێک بووە لە سەرکردەکانی لەشکری سۆران، پاشان زرارییەکان لە نەوەی سەیدیان کڕیوەتەوە، دانیشتوانی گوندی "خاروان" لە تیرەی"گەرووس" بوونە، کە تیرەیەکە لە عەشیرەتی زراری، رەسەنن و خەڵکی ئەو گوندە بوونە، بنەماڵەی"مامەراغا"و هەندێ خەڵکی دیکەی تێدایە کە بەرەسەن خەڵکی ناوچەی بادینانن و واتا لەبەری بادینانەوە پەڕیونەتەوە و هاتوونەتە بەری سۆران، "زراری"یەکانی ئەو گوندەش لە دوو بەرەباب پێکهاتوون:

١- بەرەبابی مامەراغا.
٢- بەرەبابی رەسووڵ ئاغا.

ئەو گوندە دووجار رووخێنراوە و خەڵکەکەی دەربەدەر و ئاوارە بووە، هەنووکە ئەو گوندە نزیکەی"٥٠"ماڵێک دەبن، ئاوی زۆر کەمە و مزگەوتێکی بچووک و قوتابخانەیەکی خراپی هەیە.

دەگێڕنەوە پاشای گەورەی سۆران "میر محەمەدی رواندزی" کە بە پاشای کۆرە لەو دەڤەرە بەناوبانگ بووە، جارێکیان کە لە شەڕی داسنییان واتە برا ئێزیدییەکانمان گەڕاوەتەوە لە ساڵی ١٨٣٣- ١٨٣٤ز لە زێی گەورەدا "زێی بادینان" لە کەرخی گوندی"گردمامک" لەوبەری زێیێ لەبەری بادینان پەڕیوەتەوە بۆ ئەوبەرەی زێیێ واتا بۆ بەری سۆران، هاتۆتە گوندی"سەرکەور" لەوێ لەلای "رەسووڵ ئاغا"میوان بووە، دار توویەکی گەورەی لێیە، لە بن ئەو دار تووە پاشا دانیشتووە و نانیان خواردووە، دەڵێن پاشای گەورە زۆر کەیفی بەناوچەی زرارەتی نەدەهات، چونکە دانیشتوانەکەی زۆر لەگەڵ پاشادا رێک نەبوونە، ئەمەش دەگەڕێتەوە سەر ئەوەی کە پاشای گەورە یەکێک لە ئاغاکانی زرارەتی بەناوی"ئاموراغای باوە خەلان"ی، لەسێدارە داوە، بەرەباب و تیرەیەکی زۆریش هەبوونە کە لەگەڵ سەید حەسەنی رەشەوانی لە ناوچەکەدا پاڵپشتی میرنشینی سۆرانیان دەکرد.

**سەرچاوەکان:**

١- کوردستانی عێراق لە گەشتەکەی"جۆستێ بێرکنس" لە ساڵی ١٨٤٩ز، گۆڤاری هەولێر، ژمارە"٧" لە نووسینی د. باڵدار باڵەکی ل ٩٣.

٢- مێژووی میرانی سۆران، حوسێن حوزنی موکریانی، ١٩٦٢، هەولێر.

# حاجی صادقی خەزنە

فاروق جەمیل صادق*

بنەماڵەی (حاجی صادقی خەزنە) کە لەبنەڕەتدا دانیشتووی ناوچەی (چامەن) و گوندێکیان هەبووە بەناوی خەزنە، لەناوەڕاستی سەدەی هەژدەم واتە لەدوای (١٨٥٠) و لەئەنجامی دوژمنداریییەک کە کوشتنی لێکەوتبووە باپیرە گەورەمان کەناوی (هەمزە) بووە، وادیارە پیاوێکی دەوڵەمەند بووە و خاوەن زەوی و مەڕ و ماڵات بووە و بۆ سەلامەتی و دوورکەوتنەوە ئەوەی هەیبووە، فرۆشتوویەتی و کۆچیان کردووە و هاتوونەتە ناوچەی شەمامکی دەشتی هەولێر (ناوچەی شەمامک کەوتۆتە نێوان هەولێر و ناحیەی گوێر)، سەرەتا لەشوێنێک نیشتەجێ بوون بەناوی (دەل و گوڵ) و خەریکی پیشەی کشتوکاڵی بوون و پاش ماوەیەکی کەم هەندێ زەوی کشتوکاڵی تر دەکڕن هەر



بەتەنیشت ئەم شوێنە و ئاوەدانی دەکەنەوە و گوندێک دروست دەکەن بە ناوی (خەزنە) واتە بەهەمان ناوی دێیەکەی پێشووی خۆیان کە کۆچیان لێی کردبوو.

هەمزە کوڕێکی هەبوود بەناوی مستەفا و ئەویش چەندین کوڕی تری هەبووە، بەڵام ئەوەی کەزۆر دیار بووە ناوی (صادق) بووە و دوایش چو تە حەج. هەر بۆیەش ناوی ئەو گوندە لەبەڵگە مێژوویەکان بە (خەزنەی حاجی صادق) ناسراوە. لەدواییشدا چەندین دێهاتی تریان کڕیوە، بەتایبەت لەساڵانی (١٩٤٠) بەدواوە وەک هەردوو گوندی چالوکی گەورەو چالوکی بچووک کە لەنێوان هەولێر و ناحیەی خەبات، هەروەها گوندی شیوەڕەش لەسەر زێی گەورەو گوندی دوزتەپە کە نزیک هەولێرە. وادیارە ئەو بنەماڵەیە هەر لەسەرەتاوە عاشقی کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردن بوون و سەرکەوتنێکی بێ وێنەیان هەبوود، لەم ڕووەوە و باو باپیرانمان ناوبانگێکی زۆریان هەبووە لەڕووی کشتوکاڵی. هەروەها مەڕ و بەرانی ئێمە زۆر ناوبانگیان دەرکردووە لەڕووی چۆنیەتییەوە. من خۆم بەبیرمە لەساڵی پەنجاکان لەسەرتاسەری کوردستان دەهاتنە دێیەکەی ئێمە بۆ کڕینی بەران، کە بەنرخێکی

زۆر گران دەفرۆشران. هەر ئەو گرنگی دانە و بەم شێوەیە بەکشتوکاڵ و ئاژەڵ داری وای کرد بنەماڵەی ئێمە بەبنەماڵەی دەوڵەمەندەکان بناسرێن. لەشەستەکان چەندین جار خوالێخۆشبوو مەلا مستەفای بارزانی نوێنەری تایبەتی خۆی ڕەوانەی خەزنە کردووە و مەڕ و بەرانی بۆ ڕەوان کراوە. لەکاتی گفتو گۆیەکی نێوان یەکێتی و حکومەت ڕۆژێکیان عیزەت دووری دەچێتە خەزنەو چەندین ئاژەڵ دەبات، ئیتر زۆر خەڵکی تریش، هەروەها وڵاغی زۆر چاکمان هەبووەو هەر لەساڵانی شێستەکان وابزانم بەڕێز موحسین دزەیی لەگەڵ حەمە و باوەی ڕەحمەتی دەچنە گوندی دوزتەپە لای حاجی مستەفای ئامۆزامان جوانەماینێکی زۆر باشی هەبووە بۆ جەنابی مەلا مستەفا دەبەن. باپیری ئێمە کە ناوی حاجی صادق بووە، وەک باسم کرد، چەندین کوڕی هەبووە. یەکیان بەناوی حاجی عەزیز کەساڵی ١٩٤٦ لەحەج ئەمرێ. هەروەها باوکی ئێمە بەناوی (جەمیل حاجی صادق) و موسا و مەلا کەریم و حاجی محەمەد. لەدوای باپیرم وادیارە باوکمان کەدوایی بۆ (حاجی جەمیلی خەزنە) شوێنی ئەو دەگرێتەوەو دەبێتە گەورەی بنەماڵەکە. ئەویش پیاوێک بووە ناوبانگی دەرکردووەو پیاوێکی هەتا بڵێی ڕەوشت پاک و ڕاستگۆ و بەشەخسییەت بووە. وادیارە ئەویش زۆر ئارەزووی لەکشت و کاڵ بووە و زۆریش تێیدا سەرکەوتوو بووە و ئەو دێهاتانەی کە ئاماژەم پێدا، بەشی زۆری لەساڵانی ١٩٤٠ بەدواوەیە ئەو کڕیوەتی لەماڵی مەلافەندی. خۆی شەخسیی سەرپەرشتی کشتوکاڵەکەی دەکرد و هەروەها گرنگییەکی زۆریشی بەمەڕ و ماڵات دەدا. دەتوانم بڵێم ئەو کاتە بەدایمی زیاتر لە دوو هەزار سەر مەڕی هەبووە. باوکم لەژیانی خۆی چەندین ژنی هێناوە و مناڵەکانی لەبەرەی سێ ژنن. ئێمە برای گەورەمان کە ناوی (دهام) بووە و ناسراوە بە (دهام ئاغا)، باوکم هەر زوو ژنی بۆ هێناوە، گوندی چاڵوکی گەورە و لەدواییشدا گوندی چاڵوکی گچکەی بۆ کڕیوە و ڕەوانەی چاڵوکی گەورەی کردوەو خانوو و دیوەخانەی بۆ دروست کردووەو وای کردووە کە زیاتر باوەڕ بەخۆی بینیت. هەربۆیەش ئەو برایە گەورەمان واتە (دهام ئاغا) ناوبانگێکی زۆری دەرکردووەو هەموو خەڵک ناسیویەتی. پیاوێکی زۆر بەشەخسییەت بووە پەیوەندی لەگەڵ هەموو گەورە پیاوانی ئەو کاتەی هەولێر دروست کردووەو ڕێزی تایبەتیان لێناوە. هەروەها گەورە پیاوانی میری ئەو کاتە حیسابی تایبەتیان بۆ کردووە، هەمیشە سەردانیان کردووە لەدێیەکەی خۆی و نەک لەسەر ئاستی هەولێر، بەڵکو لەسەر ئاستی پایتەخت و هەندێ گەورە پیاوانی میری و خەڵکی بەغدا پەیوەندی باشی هەبووە. هەروەها لەگەڵ سەرەک عەشیرەتەکانی(شاری موسڵ) بەتایبەت (شەممەرەکان)پەیوەندی باشی هەبووە، بۆیە لەگوندەکەی خۆی کۆشک و دیوەخانەی مۆدێرنی دروست کردبوو و هەر لە نیهایەتی چلەکانەوە ئۆتۆمبیلی تایبەتی خۆی هەبووە. ناوبراو بەڕەحمەت بێ لەساڵی ١٩٩٨ کۆچی دوایی کردووە و خەسارەتێکی گەورە بووە لەبنەماڵەکەی ئێمە.

* وەزیری داد
لە حکومەتی هەرێمی کوردستان

# مەلا عەبدوڕەحمانی کاکی جەلی ١٨٠٢-١٧٣٠

کەریم شارەزا

زانای ئاینی ناوداری کورد، مامۆستا مەلا عەبدوڕەحمانی کاکی جەلی، کوڕی مەلا عەبدوڵڵای جەلی کوڕی مەلا محەمەدی کوڕی مەلا ئیبراهیمی کوڕی مەلا حەسەنە و ڕەچەڵەکی بنەماڵەکەیان دەچێتەوە سەر شێخ ئیبراهیمی جزیری کە ئەو باپیرە گەورەیان گۆڕەکەی لە جزیرەی بۆتانە و، ئەو زاتە، یەکێک بووە لە زانا هەرە مەزنەکانی کورد لە سەردەمی خۆیدا.

لە ساڵی ١٢١٧ی کۆچی بەرامبەر بە ١٨٠٢ی زایینی لە شاری کۆیە کۆچی دوایی کردووە و مەلا عەبدوڵڵای ناودار بە (واسیق بیللا)، جێی گرتۆتەوە کە ئەمەشیان دەبێتە باوکی باپیری (مەلای گەورە).

مامۆستا مەسعوود محەمەد، لەبارەی مەلا عەبدوڕەحمانی باپیری باپیری باوکییەوە و بەربەرەکانی میرنشینییەکانی سۆران و بابان لەسەر هەبوونی مەلای چاک لە قەڵەمڕەوی هەر یەکێکیاندا دەڵێ:

"بوونی مەلای چاک لە وڵاتی ژێر دەستەڵاتی هەر لایەکیان مایەی شانازییان بوو، هەر ئەو شانازییەش بەزانای باش و ناودار وای لە "ئاوڕەحمان پاشای بابان" کردووە جێگە و ڕێگە و موڵک و ماڵ و، مزگەوت و مەدرەسە لە کۆیە ئامادە بکات بۆ مەلا عەبدوڕەحمانی کاکی جەلی و لە دێی جەلییەوە رایگوێزێ بۆ کۆیە".

ئینجا دوای ئەوەش هۆی راستەوخۆی ئەو هێنانەی بۆ کۆیە دەردەخات و دەڵێ: "بێگومان نزیکی دێی (جەلی) لە قەڵەمڕەوی ڕەواندز و مەترسی ڕاگوێزتنی کاکی جەلی بۆ ئەولا خێرایی کردووە بە ئەوڕەحمان پاشا لە هێنانی کاکی جەلی بۆ کۆیە".

ناو و ناوبانگی مەلا عەبدوڕەحمانی کاکی جەلی هەموو کوردستانیان گرتبۆوە و، زۆر لە فەقێ و موستەعیدی زیرەک و بەتوانا لە هەموو لایەک روویان تێ دەکرد بۆ وەرگرتنی زانستی تەواو لەم زانا بلیمەتە، یەکێک لەوانە مەولانا خالیدی نەقشبەندیی شارەزووری بووە، لە ڕێگای گەڕانی بەدوای خوێندندا رووی کردۆتە شاری کۆیە، تاکو کاکی جەلی دەرسی پێ بدات، کەچی لەو کاتەدا ئەو مەلا زانایەی کورد لەسەرەمەرگیدا دەبێ و لە ساڵی ١٨٠٢ی زایینی وەک ئاماژەمان بۆ کرد کۆچی دوایی دەکات. بۆیە

مەولانا ناهید بادەداتەوە بۆ لای مەلا محەمەدی ئیبن و ئادەم لە ناوچەی باڵەک. ئەو ئیبنو ئادەمەکەی کە دۆستێکی گیانی کاکی جەلی بووە و گەلێک نامەیان لە نێواندا هاتوو چووە".

لەبارەی زانست و زانیاریی فراوانی ئەم بلیمەتەی کورد، هەندێ سەرچاوەی دیکە ئەوەمان بۆ دەردەخەن و دەڵێن: "مەلا عەبدورەحمان جێی پشت پێ بەستن بوو لە زانستی ئەقڵی و نەقلی، گەلێک بەرهەمی ئیمامی شافیعی ژیاندەوە".

مەلا عەبدورەحمانی کاکی جەلی پەیوەندییەکی پتەوی دۆستایەتی و زانیاریی لەگەڵ گەلێک مەلای زانای بەناوبانگی ئەو سەردەمەی کوردستان هەبوو، یەکێک لەوانە مەلا ئەبوبەکری میر رۆستەمی زانای بلیمەتی کورد بوو، ئەو پەیوەندییەشیان وەکو پەیوەندیی نێوان مامۆستا و شاگرد بووە. مەلا ئەبوبەکر، گەلێک پەراوێز و لێکدانەوەی بە دەست و خامەی خۆی لەسەر کتێبە بەنرخەکانی مەلا عەبدورەحمانی کاکی جەلی نووسیوە.

مێژوونووسی لێهاتووی عێراق، خوالێخۆشبوو، عەبباس ئەلعەزاوی لەبارەی پایەی زانایی کاکی جەلییەوە لە کتێبەکەی (مێژووی زانستی فەلەک)دا نووسیویەتی و دەڵێ:

"مەلا عەبدورەحمانی جەلی، گەلێک شەرح و لێکدانەوەی باش و بەکەڵکی بۆ کتێبەکەی "خلاصة الحساب" داناوە و ئێستا دانەیەک لەو کتێبە بەنرخە لە دۆڵابی کتێبخانەکەی ئەوقافی گشتی لە بەغدا پارێزراوە".

بۆ مێژوو و حەقیقەت دەبێ ئەوەش ساغ بکەینەوە کە هاتنی عەبدورەحمان پاشای بابان بۆ کۆیە و هێنانی مەلا عەبدورەحمانی کاکی جەلی بۆ ئەم شارە لە ساڵی ١٢١١ی کۆچی بەرامبەر بە ١٧٩٦ی زایینیدا بووە و هەر لەو ساڵەشدا کتێبێکی بەنرخی وەکو (صحيح البخاري) کە بریتییە لە حەدیسە راستەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پێشکەش بەمەلا عەبدورەحمانی کردووە و کردوویەتییە وەقفی خۆی و نەوەکانی دوای خۆی بەئیمزا و تورەی شاهانەی خۆی مۆری کردووە و لە کتێبخانەی بنەماڵەی جەلی زادە پارێزراوە.

لە کۆتاییشدا دەبێ ئەوەش ساغ بکەینەوە بۆ بەمەلا عەبدورەحمان گوتراوە (کاکی جەلی)؟ لە وەڵامدا دەڵێین: وشەی کاک لە کۆنەوە بۆ برا گەورەی خێرخواز گوتراوە کە هەمیشە بۆ چاکە و خێری مووسڵمانان تێکۆشا بێت و لە کوردستاندا لە سێ شوێن بەپیاوی ئایینی ناودار گوتراوە (کاک) لە گوندی (هیران)ی نزیک گوندی جەلی بۆ شێخەکانی رێبازی تەریقەتی قادری بەکار هاتووە و گوتوویانە (کاکی هیران) و هەروەها لە گوندی زێوەی نزیکیشی، بەشێخی ئیرشادیان گوتووە کاک و ناوبانگیان بە (کاکی زێوە) رۆیشتووە و لە گوندی جەلیش بەو مەلا ناودارانەی کە لەشیواشانی مەلایانەوە هاتوونەتە ئەو گوندەوە و رێگەی خواپەرستی و چاکەیان پیشانی خەڵکەکە داوە، پێیان گوتوون (کاکی جەلی)، بەڵام دوای هاتنیان بۆ کۆیە لە مەلا عەبدوڵڵای کوری مەلا عەبدورەحمانەوە نازناوی (کاکی جەلی)یان بەسەرەوە نەماوە و تەنیا پێیان گوتوون (جەلی زادە) و ئێستاش نەوەکانی ئەو مەلا ناودارانە نازناوی جەلی زادە بەکار دێنن.

# کاوێسی مەلای

هۆشیار عەبدوڵڵا

کاوێسی مەلای یەکێک بووە لە لاوچاک و عەگیدسوارانی دەشتی هەولێر، لە گوندی"تەندوورە" کە یەکێکە لە گوندەکانی"دەشتی شەمامک" لەدایک بووە، پیاوێکی ئازا و بەجەرگ و نەبەرد و عەگیدسوار و چاونەترس بووە، لە زەمانی پاشای گەورەی رواندز میری سۆران "میر محەمەدی کوڕی مستەفا بەگی رواندزی "١٧٨٣- ١٨٣٧" لە ژیاندا بووە، سەرلەشکر و فەرماندەی تیرە و هۆزەکانی دەڤەری دزەییاتی بووە، لەگەڵ پیاوە ئازاکانی دیکەدا وەک"تەماو" و "برایمە لەک"ە و "شەمزین" هەردەم ئەو دەشتە گەورە و فراوانە و پان و پۆڕەیان لە دوژمنان پاراستووە بەتایبەتی لەشکری سفووکی عەرەب کە ناوە ناوە دەهاتن سنووری باشووری کوردستانیان دەبەزاند و لە "زێی دیجلە" و"پێکاو"ێوە دەپەڕینەوە و دەهاتن لەودیوی"ناوچەی کەندیناوە" و "زوورگە زراو"دا مەڕوماڵاتیان بەتاڵان دەبرد، ناچار خەڵکەکە هاواریان بۆ کاوێس و لەشکرەکەی دەبرد کە بەهانایانەوە بێت. کاوێسی مەلای لەبەرئەوەی پیاوێکی ئازا و بەجەرگ بووە هەنووکەشی لەگەڵدا بێت لە دەشتی هەولێردا زۆر شتی لێ دەگێڕنەوە، دەڵێن: جارێکیان لەشکری عەرەب هاتن و سنووری دەڤەرەکەیان بەزاند و دەستیان کرد بەتاڵانکردنی مەڕوماڵاتی گوندەکانی"بناری زورگە زراو" وەکو"قورشاغلو - سۆربەش - باقرتە- دووگردکان - منارە" و چەند گوندێکی دیکەش، بووە هەرا و هاوار و خەبەر گەیشتە"کاوێس"ی، بەخۆی و یەک دوو سوار بەهەرەداوان هاتن، کاوێس لە شوانێکی پرسی مەڕوماڵاتەکەیان کێوە برد بەکێندەریان ئاوا کرد؟ شوانەکە گوتی بە کەرخی"کانی چارداغ"یدا ئاوا بوون، ئەوجا"کاوێس" لەگەڵ سوارەکان لە ڕکێبیاندا و بەرەو"چارداغ"، شوانەکە کاوێسی مەلای نەناسیبوو، شوانەکە گوتبووی:"هەی دایکت..........م" لێم بوویتە کاوێسی مەلای بەخۆی و تاقەسوارێکی دەیەوێ تاڵانی بگێڕێتەوە!

بەبێ ئەوەی بزانێت کە ئەمە"کاوێس"ە، کاوێس گوێی لێ بوو شوانەکە ئەو جنێوەی پێ دابوو. کاوێس کاتێ کە تووشی عارەبەکان بوو لە دوورەوە بانگی کردن"شێخ"ی عارەبان گوتی بزانن "٢"مەڕی بدەنێ، عارەبەکان پێیان گوت: ها ئەوە ئەو دوو مەڕە لۆ خۆت، کاوێس گوتبووی من نەهاتوومە مەڕم بدەنێ، من بۆ شەڕێ هاتوومە و هەموو تاڵانەکەشتان لێ دەستێنمەوە، بەشێخیان گوت: شەڕێ دەکات، شێخەکە گوتی: لێی بپرسن بزانن کێیە؟! لێیان پرسی تۆ کێی؟! گوتی: کاوێسی مەلام، شێخ گوتی تازە خەلاس وازی لێ بێنن کار لەکار ترازا، تاڵانەکەیان بەجێ هێشت، ئینجا مەڕوماڵاتەکەیان بەرەو ئاقاری گوندەکانی هێناوە و هەرکەسە مەڕی خۆی بردەوە و لە دواییدا کاوێس شوانەکەی ناسیبووەوە و گوتبووی ها هەرچەندە جونیشت پێ دام ئەمە نموونەیەک بوو لە ئازایەتی و جوامێری ئەو کەڵەپیاوە نەمرە.

لە بەیت و بەند و فۆلکلۆری دەشتی هەولێریدا ناوی ئەو قارەمانە هاتووە بۆ نموونە:

**پێکەک گاس دەکا هۆ"برایمە لەک"ە**
**تۆزی مێگەلان وا لە"خەندەک"ە**
**مەڕ بەتاران چوو نێریمێ بەرەکە**

لە شوێنێکی دیکەدا وا هاتووە:

**شێخی عارەبی هەر ئەتووم لاوی**
**یاخوا لێت نەشکێ دەستی لغاوی**
**هەستە سوار ببە لەگەر"تەماو"ی**
**مەڕ بەتاران چوو لە "زوورگە زراو"ی**
**شێخی عارەبی هەر ئەتوم دینی**

**یاخوا لێت نەشکێ ناو پەردەی زینی**
**هەستە سوار ببە لەگەڕ"شەمزین"ی**
**مـــــــــەڕ بـەتـاران چـوو لـە**
**بـــــنـــــەی"رەشـــــکـــــێن"ی**
**گـــدیۆ رەشـــۆیان هێلی بەهێلی**
**بەتارانیـــان برد بەران و نێـــری**
**لەدوو دەگـــریان شـــوان و بیـــرێ**
**گـــدیۆ رەشـــۆیان تاوێ تەزرۆکێ**
**گـــدیۆ رەشـــۆیان قـــازی قـــەلاندی**
**پەســـتەک رەشـــۆکـان دۆتمام دۆراندی**

**پاشای گەورەی میرنشینی سۆران و "میر محەممەدی کوڕی مستەفا بەگی ڕەواندزی ١٧٨٣-١٨٣٧"و کاوێسی مەلای.**

گوتمان کاوێس سەرلەشکری هۆز و تیرەکانی دەڤەری دزەییـانی بووە و لەگـەڵ فـەرمـاندەکـانی دیکەیدا وەکو"شەمدین- تەماو- برایمە لەک"ە و، ئەوانی دیکە کە هەمیشـە ئەم دەڤەرەیان لە هێرشەکانی عەرەب و هۆزەکانی دیکەی کـورد پاراسـتووە وەکـو هەمـەوەندەکـان، هەروەها هێرشی بابانەکـان کە جارجارە دەهاتنە دەڤەرەکە و داوای باجیان دەکرد و سەرانەیان دەستاند. ئەمجارەیان هێرشە گەورەکەی پاشای گەورەی رواندزی بوو بۆ سەر دەڤەرەکە داگیرکردنی شاری هەولێر و هێرشەکانی پاشای کوێرە میری محـەمـەد مـەنسـوور مـیری سۆران بۆ دەڤەری دزەییـاتی بەسەرکردایەتیی رەسووڵ بەگی برای لە سالّی ١٨٢٢ز - ١٨٢٣ز.

لە پاش ئەوەی پاشـای گـەورە فـەرمـانڕەوایی میرنشینەکەی گرتە ئەستۆ و خۆی رێکخستەوە و ویستی ئەو ناوچانەی کە لە کاتی حوکمڕانی باوک و باپیرانی لە دەستـیـان دابوو وەربیگرێتـەوە و ئارەزووی فـراوانکردنی مـیرنشـینەکـەشی لە کەللەی دابوو. جا لە سالّی ١٨٢١ز دەستی کرد بەنامە گۆڕینەوە لەگەڵ سەرۆک هۆزە کوردەکانی دەووروبەری هەولێـر و کۆیە و هەریر و شـەقـلاوە. لە سالّی ١٨٢١ز هێـرشـەکـانی دەستی پێ کـرد و شـاری هەریری گرت، "بابان"ییەکان بەبێ شەڕ پاشەکشەیان کرد و بەرەو کـۆیە گـەڕانەوە، کـە مـاوەیەکی زۆر بوو هەریریان داگـیـر کردبوو، ئەوجا پاشای گەورە هێرشی هێنایە سەر"ناوچەی خۆشناوەتی" و شەقلاوەشی گرت، پاش شەڕێکی خوێناوی ئینجا لەگەڵ میری خۆشناوان کە ئەو سەردەم" عوسـمـان بەگی کوڕی ئەحمەد خان"بووە، رێککەوتننامەیەکیان مۆر کـردووە، بەڵام کـاتێ "عـوسـمـان بەگ"خۆی دا بەدەستـەوە یەکسەر گرتی و رەوانەی هەریری کرد و لە سەری دا. پاش گـیـرانی شـەقـلاوە بابانەکـان "قـەلای دێرە"شـیـان بەجێ هێـشت. پاش پاککردنەوەی ئەو ناوچانە مـیـر لەشکرێکی گەورەی ئامادە کرد کە پێکهاتبوو لە هۆزەکانی سورچی و خۆشناو و خەیلانی، پێش ئەوەی هێرشەکەی بەرەو هەولێر دەست پێ بکات نامەی بۆ زانایان و گەورەپیـاوانی شاری هەولێـر ناردبوو داوای ئەوەی لێ کـردبوون کـە بەبێ شـەڕ خۆبەدەستەوە بدەن و با خوێن نەرژێت، بەڵام فەرمانڕەوای ئەو کـاتی شـارەکـە خـوالێـخـۆشـبـوو "یەعـقـوب ئاغـا - ١٨٧٤"بوو نەیسـەلماندبوو، میر کە بەخۆی هات و دەوروەی شـارەکەی دا پاش شـەڕێکی توند قەلای گرت و"یەعقوب ئاغا"ش، خۆی بەدەستەوە دا و میر گرتی و حەپسی کرد، بەڵام پاش ئەوەی زانایان و پیـاومـاقـوولانی شـار لێی پاڕانەوە مـیـر "یەعـقـوب ئاغـا"ی عـەفـو کرد و لەسەر کـار لایبرد ئەمەش لە"٢٠"ی مانگی رەمەزانی پیـرۆزی سـالّی ١٢٣٨کۆچی، بەرامبەر بەسالّی ١٨٢٢ز بووە.

**لێرەدا با بزانین "یەعقوب ئاغا" کێیە؟**

یەعقوب ئاغـا کوڕی قاسماغای کوڕی عەبدوڵلا ئاغایە بە رەسـەن دەچنەوە سـەر عـەشـیـرەتی بەیات، لە زەمـانێکی زۆر زووەوە لە دەوروبەری شـاری"دووز"ی، سـەر بەشـاری کـەرکـووک کـەوتوونەتە ئەو شـارە دێرینە، هەنووکـەش ئەو بنەمـاڵەیە بە بنەمـاڵەی"یەعقوبی" لە ناو شـاری هەولێردا ناسـراون و بەناوبانگن، پیـاوی ژیر و زانا و گـەورە و لێهاتوویان زۆرە، هەردەم خزمەتێکی گەورەی ئەو شارە و کـوردسـتـانیـان کـردووە، گوتمان پاش ئەوەی پاشـای گـەورە هەولێری گرت و یەعقوب ئاغـای لابرد، "خدر بەگی کوڕی بایز بەگی"خەزووری کردە فەرمانڕەوای شارەکە و یەعقوب ئاغاش شـاری بەجێ هێشت و چوو لە گوندێکی نزیک شار کـە نـاوی "عـەرەبکەند" بوو لێی دانیـشـت، بەڵام لە دەرفەتێکدا بەرێی "کەلەکی یاسین ئاغا" رای کرد و پەنای بردە بەر والی مووسڵ لەوێوە چووەتە بەغدا و هەتا حوکمی پاشای گەورە لە ئارادابوو نەگەڕاوەتەوە کوردستـان و شاری هەولێـر. پاش ئەوەی پاشـای سۆران کـاروباری نـاو شـاری هەولێری رێکخست، ئینجا بیری لەوە کـردەوە کـە دەست بەسـەر دەشـتی هەولێـرێ دابگرێت، نامـەی تایبـەتی بۆ

زۆربەی سەرۆک هۆز و گەورەپیاوانی دزەییاتی و هەندێ لە عەشیرەتی عەرەب نارد، بەڵام هەندێک لە سەرۆک هۆز و تیرەکانی دزەییاتی و عەرەبەکان سەریان بۆ پادشا دانەنواند و بەڵکو هەڕەشەشیان لێ دەکرد. ئەوجا پاشای گەورە لەشکرێکی گەورەی بە سەرۆکایەتیی "رەسووڵ بەگ"ی برای و جێگرەکەشی کە"سەید حەسەنی رەشوانی" بوو، نارده سەریان کە بیانخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی و باج و سەرانەیان لێ بستێنێ، یەکەم جار لەشکری رەسووڵ بەگ توانی بەئاسانی دەست بەسەر ناوچەکەدا بگرێت هەتا گەیشتە "کەندێناوە" ئەوجا لەوێوە لەشکر لای سۆران تووشی شەڕێکی قورس و گران هاتن لەگەڵ لەشکری دەشتی هەولێر لە ئەنجامدا لەشکری پاشای کوێرە شکا و بەرەو دواوە گەڕایەوە بەپەرپەر رەسووڵ بەگ توانی لە مەیدانی شەڕەکەدا خۆی دەرباز بکات. هۆی سەرنەکەوتنی رەسووڵ بەگ لەم شەڕەدا ئەوە بوو کە لەشکرەکەی پاش ئەوەی توانییان بەشێکی گرنگی دەڤەرەکە بگرن، دەستیان کرد بەتاڵانکردنی ناوچەکە، بەمەوە ژمارەیەکی زۆر لە سەربازانی سۆران ئاگایان لە شەڕ نەما و بە تاڵان و کۆکردنەوە خەریک بوون، لەلایەکی تریشەوە خێڵەکانی دیکەی دزەییاتی لەلایەن چەند هۆزێکی عەرەبی بەتایبەتی "طی - جبور" پاڵپشتی دەکران و یارمەتی دەدران، ئەوەش بووە هۆی سەرکەوتنیان بەسەر لەشکری رەسووڵ بەگ، پاش ئەوەی"رەسووڵ بەگ" بەدڵساردییەوە گەڕایەوە هەولێر، پاشای گەورە بەم کارەساتە زۆر دڵتەنگ بوو، دووبارە هەوڵی ئەوەی دا لەشکرێکی گەورەتر رێک بخا و هێرشێکی مەزنتر بۆ ئەم مەبەستە بکات چونکە شکانی "رەسووڵ بەگ"زۆر کاری تێ کردبوو، ئینجا لەشکرەکەی دووبارە رێکخستەوە و رووی کردەوە ناوچەکە و ئەوجارە رەسووڵ بەگ نەک هەر نەیتوانی دەڤەرەکە بەتەواوی داگیر بکات، بەڵکو چەند کەسانێکی لە گەورەپیاوان و مەزنانی ناوچەکە بەدیل بگرێت و رەوانەی شاری هەولێریان بکات، یەکێک لەوانە کە سەرۆکی عەشیرەتی"طی- الطائی" شێخ مەحموود ئەهاوار بوو. رەسووڵ بەگ توانی کەندێناوە و قەراج بگرێت، ئەمەش لە "١٠"ی رەجەبی ساڵی ١٢٣٩کۆچی. بەرامبەر بە ساڵی ١٨٢٣زایینی بوو، هەر لە هەمان ساڵ رەسووڵ بەگ هێرشێکی کردە سەر"پردێ - ئاڵتوون کۆپری" گرتی و"عەودی کاکە رەش"ی کردە فەرمانڕەوا، بەمە بەتەواوی دەڤەری هەردوو زێیان واتا ئەو ناوچەیەی کە دەکەوێتە نێوان زێی کەلەک و زێی پردێ کەوتە ژێر حوکمی سۆران، والی ئەو سەردەمی بەغدا ناچار ما ئیعترافی پێ بکات. ئەوجا ناکۆکی و سەردانەنواندن لە دەڤەرەکەدا نەبڕایەوە، یەکێک لەوانەی کە سەری بۆ میری سۆران دانەنواند"کاوێسی مەلای" بوو. هەرچەندە پاشای گەورە بەنەرمی لەگەڵ تیرە و هۆزەکانی دەڤەرەکە جووڵایەوە و بگرە هەندێکیشیانی خەڵات کردبوو، بەڵام کاوێس سەری بۆ پاشای گەورە هەر دانەنواند و لەگەڵ دەستەیەک لە هەرە کوڕە ئازاکانی دەڤەرەکە لەو دەشتە پان و پۆڕەدا دەسووڕانەوە، لە کاتی تەنگانەشدا خۆیان لە دۆڵ و شیو و گەلییەکانی چیای قەرەچوغ حەشار دەدا.

گەلێک جاران لەگەڵ مەفرەزەکانی لەشکری پاشای سۆران تێک دەگیران و دەبووە شەڕیان و خۆیان دەرباز دەکرد، تا وای لێ هات میری سۆران بڕیاری ئەوەی دا کە سەری کاوێسی بۆ بێنن، ئەوە بوو لە ١٢-١٣ قوڵان لەشکری پاشا کەوتە ئەو دەشتە تا توانییان لە دەشتی"شەمامک" لە ناوچەی گوێڕدا لە پاش شەڕێکی قورس و توند بیگرن و سەری ببڕن و سەرەکەشیان بۆ رواندز برد، پاشا کە تەماشای دەکرد و سەرەکەی هەرگێڕ و وەرگێڕ دەکرد و دەیگوت: هەی کوفرە باوینە ئەم پیاوە مەردەتان بۆ کوشت، ئەم پیاوە لایەکی ولاتی بۆ من گرتبوو، هەر دەیگوت و دەیگۆتەوە: حەیف، حەیف"کاوێس" بۆ تۆ! ئەمن چ خراپییەکی تۆم هەبوو؟ لۆ سەرت دانەنواند؟! تۆ هەقی کوشتنت نەبوو، حەیفە پیاوی وەکو تۆ بکوژرێت! ئەو کەسانەی کە لە دەوروبەری پاشا بوون گەورەم خۆت ئەمرت فەرموو، پاشای سۆران کەمێک داما و بێدەنگ بوو ئەوجا سەرەکەیان لە بەردەمی لابرد.

سەرچاوەکان:

١- مێژووی میرانی سۆران، دانانی حوسێن حوزنی موکریانی.
٢- داستان و گۆرانی لە فۆلکلۆری کوردیدا، عومەر شێخەڵڵا، هەولێر، ١٩٩٨.
٣- خوالێخۆشبوو حاجی رەسووڵ عەلی کە لە حەمەد لەدایکبووی ساڵی ١٩٢٠ "گوندی سۆربەش"ە، ئەم بەسەرهاتەی لە باوک و باپیرانییەوە گوێ لێ بووە، کە لە حەمەدی باپیری لە زەمانی پاشای کوێرە ژیاوە و تەمەنی لە"١٠٠"ساڵ زیاتر بووە و لە ساڵی ١٩١٩ کۆچی دوایی کردووە.

# شێخ هیدایەتوڵڵای ئەربیللی
# ١٧٦٣-١٨٣٦

**کەریم شارەزا**

زانای مەزنی ئایینی ئیسلام و خەلیفەی ناوداری مەولانا خالیدی نەقشبەندی لە شاری هەولێر، شێخ هیدایەتوڵڵای ئەربیللی لە دەوروبەری ١٧٦٣ شەستەکانی سەدەی هەژدەم لەدایک بووە و لەم شارە دێرینەی هەولێر سەری هەڵداوە و بووەتە مەلایەکی گەورە لە هەموو زانستەکانی نەقلی و عەقلی.

کاتێک کە ڕێبازی نەقشبەندی لەسەر دەستی مەولانا خالیدی نەقشبەندیی نوێ کرایەوە و بەکوردستان و دەوروبەریدا بڵاو بووەوە مەولانا هاتە هەولێر و چاوی بەهیدایەتوڵڵا کەوت و ڕایسپارد تا پێی دەکرێ زانست وەرگرێ. چونکە ڕۆژێک دادێ پێویستیان بەدەرس گوتنەوەی زانستی ئایینی و فیقە و مەنتیق و کەلام دەبێ و گەر دەرس بەچاکی نەڵێتەوە لە نیشتمانەکەی دەردەکرێ. بۆیە داوای لێ کردووە لە هەر کتێبەی کە دەرسی لێ دەڵێتەوە لاپەڕەی یەکەمی بۆ بخوێنێتەوە. تاکو بزانێ ئاستی زانستی چۆنە، ئەویش بەڕەوانی و تێگەیشتنەوە بۆ مەولانای دەخوێنێتەوە. مەولاناش ئیجازەی گوتنەوەی هەموو زانستێکی نەقلی و عەقلی پێ دەدات و دەیکاتە خەلیفەی خۆی لە هەولێر و دەوروبەری بۆ ڕێبەریکردنی خەڵکەکە.

دوای کۆچی دوایی مەولانا لە



ساڵی ١٢٤٢ی کۆچی بەرامبەر بە ١٨٢٦ی زایینی نهێنی ئەو کەرامەت نواندنەی بۆ شێخ هیدایەتوڵڵا دەردەکەوێ. بەتایبەتی لەو کاتەی محەمەد پاشای ڕەواندزی، هەولێر و ناوچەکەی دەخاتە ژێر حوکمی خۆی و دێتە شارەکە. چونکە پاشا حەزی بەزانست و مەلای زانا دەکرد و پێویستی بە پیاوی زانست بوو، نەک بەپیاوی تەسەوف و تەریقەت، لە بارەگای خۆی لە قەڵات دادەنیشێ بەدوای پیاوانی ئایینیدا دەنێری بچنە بارەگا. ئەوەی یەکسەر چوویایە لای دەیزانی پیاوی زانست و دەرس گوتنەوە نییە هەر خەریکی تەسەوفە، یەکسەر لە شاری هەولێری وەدەر دەنا و ئەوەی زانیباشی مەلای چاک و زانایە و دەرس دەڵێتەوە ڕێزێکی زۆری لێ دەنا.

لەو کاتەی پاشا بەدوای شێخ هیدایەتوڵڵادا دەنێرێ، شێخ بەقاسیدەکەی دەڵێ بەجەنابی پاشا بڵێ: "کەی دەرسم بەفەقێ و موستەعیدەکان گوت و لێ بوومەوە دێمە خزمەتی!".

کە پاشا ئەو وەڵامە بوێرەی پێ دەگات، دەڵێ: "با ئەو نەیەت و خۆم دەچمە سەردانی، چونکە دەرس دەڵێتەوە، ئەمەش ئیسپاتە کە مەلایەکی زانا و بەتوانایە. کاتێک پاشا دەچێتە سەردانی لە مزگەوتەکەی خانەقا، کە کاتی خۆی مەولانا خالید بەردی بناغەی ئەم مزگەوتەی داناوە. شێخ هیدایەتوڵڵا پێشوازییەکی گەرمی دەکات و پاشاش ڕێزێکی زۆر لە کەسایەتیی خۆی و زانیارییە بەسوودەکانی دەگرێ و چەند سەد ڕیاڵێکی زێڕ پێشکەش بەخانەقاکەی دەکات.

مێژوونووسی عێراق عەبباس ئەلعەزاوی لەبارەی ئەم زاتەوە دەڵێ: "هیدایەتوڵڵا لە ساڵی ١٨٣٦ی زایینی لە شاری بەغدا کۆچی دوایی کردووە و لە مزگەوتی گەورەی (عەدلیە) لە تەنیشت گۆڕی مەلا یەحیای مزووری نێژراوە".

تاکو ئێستاکەش مزگەوتی خانەقای سەردەمی شێخ هیدایەتوڵڵا لە شاری هەولێر ئاوەدانە و کەوتووەتە باشووری ڕۆژهەڵاتی قەڵاوە و نەوەکانی ئەو زاتە سەرپەرشتی دەکەن.

# ئیبن ئادەم
# ١٨٣٦-١٧٤٧

**کەریم شارەزا**

محەمەد کوڕی ئادەم کوڕی عەبدوڵڵا و ناسراو بە "ئیبن ئادەم"، لە ساڵی١٧٤٧ی زایینی لە گوندی (روست)ی سەر بەناحیەی باڵەک لە پارێزگای هەولێر هاتۆتە دنیاوە. لە سەردەمی منداڵیدا لەلای باوکی خوێندوویەتی و لە دواییدا لەلای زانای بەناوبانگ (مەلا عەبدوڵڵای بایەزیدی)ی سوختەی زانای مەزنی کورد (سیبغەتوڵڵا حەیدەری) درێژەی بەخوێندنەکەی داوە. پاشان بۆ تەواوکردنی خوێندنەکەی لە ساڵی ١٧٧٨دا چووەتە شاری مەهاباد لە رۆژهەڵاتی کوردستان بۆ فێربوونی زمانی فارسی، دیسان گەڕاوەتەوە باشووری کوردستان و لە رواندز نیشتەجێ بووە و محەمەد پاشای رەواندز رێزێکی زۆری لێ ناوە و ئەویش دەستی داوەتە دەرس گوتنەوە و کتێب دانان.

ئەم زانا بلیمەتە، ناوبانگی زانایی بەهەموو لایەکی کوردستان و جیهانی ئیسلامیدا بڵاو بۆتەوە و گەلێک زانای ناوداری وەک مەولانا خالیدی نەقشبەندی و مەلا محەمەدی خەتێ و مەلا عەلی وەسانی لەلایان خوێندووە. دوای ماوەیەک ناکۆکی دەکەوێتە نێوان ئەو و محەمەد پاشا، بۆیە شاری رەواندزی جێ هێشتووە و چووەتەوە گوندی روست و لێی دانیشتووە و هەر خەریکی دەرس گوتنەوە و کتێب دانان بووە، تاکو لە ساڵی ١٢٥٢ی کۆچی بەرامبەر بە ١٨٣٦ی زایینی لە گوندی (دێلزە)دا کۆچی دوایی کردووە.

**بەرهەمە بەنرخەکانی ئیبن ئادەم:**

مەلا محەمەدی ناسراو بەئیبن ئادەم، لە ماوەی ژیانیدا زنجیرەیەک کتێبی بەنرخی بەزمانی عەرەبی داناوە، چونکە ئەو سەردەمە زمانی خوێندنی مەلایەتی یان عەرەبی بووە یان فارسی. تاکو ئێستاکە ٢٧ کتێبی بەنرخی لە بوارەکانی (زانست و فیقهی ئیسلامی و رەوانبێژی و مەنتیق و زمانەوانی و جوگرافیا و فەلەک) تۆمار کراون.

ئیبن ئادەم زانایەکی بلیمەت بووە، پایەی زانستی سەرنجی زانا و مێژوونووسانی راکێشاوە. لەوانە مێژوونووسی کورد ئیبراهیم فەسیح حەیدەری بووە کە لە کتێبەکەی (عنوان المجد)دا لەبارەیەوە دەڵێ: "گەورەمان محەمەد کوڕی ئادەمی کوردی" زاتێکی گەورەی وەک مەولانا خالیدی نەقشبەندی دەرسی لەسەر دەستی خوێندووە، پایەی بەقەدەر پایەی ئیمامی فەخری ڕازی بووە، پتر لە سەد کتێبی بەنرخی لە زانستەکانی عەقڵی و نەقڵی داناوە.

مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ لە کتێبەکەی (الشیخ معروف النودهي البرزنجي)دا لەبارەیەوە ناوی ٢٧ کتێبی لەو سەد کتێبە دێنێ، کە بیست و حەوتەمینیان ناوی (سلسلة الذهب)ە واتە زنجیرەی زێڕ و لە ساڵی ١٨١٩دا دایناوە.

**ئیبن ئادەم و ئەدەبیات:**

ئیبن ئادەم هەروەک زانایەکی بلیمەت بووە، لە هەمان کاتیشدا دەستی شیعر دانانیشی هەبوو و لەوساوە هەست و سۆزی نەتەوەیی خۆی وەک مەلایەکی زانا دەربڕیوە، با سەرنج بدەینە ئەم چەند دێرە شیعرەی تا بزانین چ هەستێکی نەتەوەیی هەبووە:

**هەوران کردە گۆڵە گۆڵ، میکائیلا ئەتۆش دەی**
**تووتن و ماشان بڕشێنە، دەبا نۆش بێتە سەر دەی**
**رۆمی ئەوا پەیابوون، کوتبخانان دەکەن تەی**
**میری سۆران و بابان لەناوچوون بەدەسیسەی**
**کوردستانمان چی لێ هات، کوردان ماتن هەتا کەی؟**

ئیبن ئادەم ئەم هۆنراوەیەی وەختێک داناوە، کە دەوڵەتی عوسمانی خەریکی تێکدانی میرنشینەکانی کورد بووە، هەرچی کولتووری کورد بووە لە ناویان دەبرد، لێرەدا ناوی کاربەدەستانی عوسمانی بە (رۆمی) دێنێ و لە شیعردانانیشدا نازناوی (واجم)ی بەکار دەهێنا.

لە کۆتاییدا دەبێ ئاماژەش بۆ ئەوە بکەین کە ئیبن ئادەم دوازدە کوڕی بووە و هەندێکیان لە رۆڵە و نەوەکانی بوونەتە مەلای زانا و ئێستاکە نەوەکانی لە گوندی روست و قەزای سۆران بڵاو بوونەتەوە.

# حاجی مەلا ئەسعەدی جەلی
# ١٨٠٠-١٨٧٢

حاجی مەلا ئەسعەدی کوڕی شێخ عەبدوڵڵای کوڕی مەلا عەبدوڕەحمانی کاکی جەلی، لە دەوروبەری ساڵی ١٨٠٠ی زایینی لە شاری کۆیە لە دایکبووە، لە سەرەتادا لەلای شێخ عەبدوڵڵای جەلیزادەی باوکی خوێندوویەتی و ماوەیەکیش چووە لای مەلای خەتێ و گەلێک زانستی ئایینی لێیەوە فێر بووە و بووەتە مەلایەکی مەزنی شافیعی سەر بەڕایەڵی نەقشبەندی، چونکە خۆی هەموو جارێ لە داوێنی نووسینەکانی دەینووسی (شافیعی مەزەب و نەقشبەندی مەشرەب). نووسەری ناوداری کورد "ئیبراهیم فەسیح" حەیدەری لە کتێبەکەی (المجد التالد)دا لەبارەی ئەو زاتەوە نووسیویەتی و دەڵێ: "ئەو زانایانەی، کە چوونەتە پاڵ ڕێبازی نەقشبەندی زۆرن، یەکێک لەوانە حاجی مەلا ئەسعەدە لە شاری کۆیە و دوو مەدرەسەی دینی لەدەستدا بووە، تاکو دەرسی تێدا بڵێتەوە و فەقێ و موستەعیدیشی زۆر بوون. ئەو دوو مەدرەسەش، (مزگەوتی گەورە) و مزگەوتی بنەماڵەکەی خۆی (مزگەوتی مەلا ئەسعەد) بوون.

هەروەها کتێبخانەیەکی پڕ (کتێب و سەرچاوەی فیقە و حدیث و مەنتیق و فەلەک) بووە. ژووری مەدرەسە و کتێبخانەکەی جێی کۆڕ و کۆبوونەوەکانی شاعیر و زانایان بوون و جێی ئامۆژگاری کردنی خەڵک و خوا بوون.

حاجی مەلا ئەسعەد بۆ خوێندن تەواوکردن لە سەردەمی لاوی و لەسەر کیسەی چاکەخواز و شاعیری کورد حاجی بەکرئاغای حەویزی، ناردراوە بۆ دیمەشق و لەسەر دەستی مەلای زانای ناوداری شام (شێخ عەبدوڕەحمان کوزبەری) دەرسی (حەدیس)ی خوێندووە و بووەتە مەلایەکی زانای لێهاتوو. کە گەڕاوەتەوە کۆیە، حاجی بەکراغا پێشوازیی لێ کردووە و خوشکێکی خۆی داوەتێ، کە ناوی (فاتم) بووە و بووەتە دایکی هەرسێ کوڕی حاجی مەلا ئەسعەد، کە (حاجی مەلا عەبدوڵلا) و (مەلا حەبیب) و (مەلا ئەحمەد) بوون.

ناوبانگی زانایی حاجی مەلا ئەسعەد بەهەموو لایەکی کوردستاندا بلاو بۆتەوە و گەلێک فەقێ و موستەعید لە شارەکانی باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان هاتوونەتە لای، تاکو زانست و بنچینەکانی ئایینی ئیسلامی لێوە فێر بن. گەلێکی وەکو حاجی قادری کۆیی و حاجی مەلا عەبدوڵلای جەلی کوڕی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی، لەسەر دەستی ئەو زاتە زانایە فێری زانستی ئایینی بوون و بوونەتە مەلای چاک و ناودار.

حاجی مەلا ئەسعەد لە ساڵی ١٨٧٢ی زایینی لە شارەکەی کۆیە کۆچی دوایی کردووە و هەر لەو شارەشدا بە ڕێزێکی زۆرەوە نێژراوە و سێ کوڕی لە پاش بەجێماوە:

١- حاجی مەلا عەبدوڵلا: مەلایەکی زانای ناودار بووە و نازناوی (مەلای گەورە)ی هەڵگرتووە و کە لە ساڵی ١٩٠٨دا کۆچی دوایی کردووە و مەلا محەممەدی کوڕی جێی گرتەوە و نازناوی (مەلای گەورە)ی وەرگرتووە.

٢- مەلا حەبیب.

٣- مەلا ئەحمەد و هەردووکیان مەلای چاک بوون و ڕۆڵە و نەوەیان زۆرن.

**کەریم شارەزا**

# شێخ محەمەد عەلی مەلا گچکە زادە (١٨٣٩ - ١٩٠٢ز)

دکتۆر عەبدوڵڵا حەداد

**١- سەرلجی گشتی**

شێخ محەمەد عەلی کوڕی مەلا ئەبوبەکری (کوچک موڵڵا/ مەلای گچکە) کوڕی مەلا عوسمان کوڕی مەلا ئەبوبەکر کوڕی مەلا عومەر کوڕی مەلا ئەبوبەکری (یەکەم) کوڕی شێخ شەمسەدین کوڕی شەهابەدین کوڕی مەلا خدر کوڕی مەلا ئەلیاسە[1].

(جیهەتی) ئیمامەت خوتبەبێژی و دەرس وتنەوەی مەدرەسە و مزگەوتی گەورەی قەڵای هەولێر، لە ماوەی نزیکەی سێ سەد ساڵدا، پشت بەپشت ئاراستەی زاناکانی ئەو خانەوادەیە کراوە[2].

هەندێ کەسایەتیی خانەوادەکە لە پاڵ خەریکبوونیان بەزانستە ئایینیەکانەوە، ڕووی دەمیان کردۆتە بواری تەریقەت و تەسەوف، بەڵام تەکیەیان پێکەوە نەناوە. ئەگەر حەلقەی زیکریشیان ساز دابێ، ڕەنگە لە کونجێکی ماڵەکەیان، یا لە حوجرەیەکی مزگەوتەکەیاندا ئەنجامیان دابێ. شێخ محەمەد عەلی کوڕی مەلا ئەبوبەکری (کچک موڵلا) لە ساڵی (١٣٠٨)هـ (کە دەکاتە: ١٨٩٠ز) لە قاڵبی پەخشاندا مەولوودنامەیەکی کوردی داناوە[3] کە تا ئەمڕۆ ئاوڕی لێ نەدراوەتەوە و بەپێی پێویست لێی نەکۆڵراوەتەوە.

لەم دەرفەتەدا، هەوڵ دەدەین. لە چوارچێوەی بارودۆخی ئەو ڕۆژگارەدا مەولوودنامەکە هەڵبسەنگێنین.. چونکە لە مێژووی شیعر و ئەدەبیاتی کوردیی شاری هەولێردا، نرخێکی مێژوویی واتاداری هەیە. بۆی هەیە بڕیاری ئەوە بدرێ کە شێخ محەمەد عەلی یەکێکە لە پێشەنگەکانی نووسین بەزمانی شیرینی کوردی. هەر لەو سۆنگەوە بەپێویست زانرا لەم لێکۆڵینەوەیەدا جێگەی شیاوی خۆی بکاتەوە.

ئەم دەرفەتە بەهەل دەزانین، بەگەرمی سوپاسی کاک (عوسمان ڕەشاد مفتی) بکەین کە هەم نوسخەیەکی کۆپیکراوی مەلوودنامەی شێخ محەمەد عەلی مامی باپیری-و هەم کتێبی ((سبائك الاملا في أسرة کچک مەلا)) ی باوکی خستە بەردەستمانەوە. بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ سوودیان لێ ببینین. کەواتە ئەو دوو بەرهەمە دەسنووسە سەرچاوەی بنچینەیی ئەم لێکۆڵینەوەن.

ئەسڵی ((مەولوودنامەی)) شێخ محەمەد عەلی ئەفەندی حوسامی لە شاری بەغدا، لە ئەرشیفخانەی (المخطوطات)دا پارێزراوە. مامۆستا مەلا محەمەد عەلی قەرەداغی - کە لە بواری دەسنووسی کوردیدا پسپۆڕە - نوسخەیەکی کۆپیکراوی دەسنووسەکەی لە ڕۆژی ٥/٤/١٩٩٩ بە کاک عوسمانی مفتی پێشکەش کردووە..

بەپێی ئاگاداری ئێمە، دەسنووسێکی تاکانە و دەگمەنە، وەڵداشی نییە، لە ساڵی (١٣٠٨هـ/ ١٨٩٠ز) بەخەتی دانەرەکەی نووسراوە، (٩٣) لاپەڕەیە، لە زۆر شوێندا نووسەر هەندێ وشە و ڕستەی ڕەش کردۆتەوە، هەندێ جار وشە، یا ڕستەیەکی تری لەباتیدا نووسیوەتەوە، ئەو نوختەیە ئەوە

دەگەیەنێ دەرفەتی بۆ نەرەخساوە دووبارە پاکنووس بکاتەوە.

**ب- ژیاننامەی شێخ محەمەد عەلی حوسامی:**

شێخ محەمەد عەلی، کوڕی هەرە بچووکی مەلا ئەبوبەکری کچک مەلا (مەلای گچکە)ی هەولێری زادەیە. برای بچووکی مەلا عوسمان ئەفەندی و حاجی مەلا عومەر ئەفەندییە[٤]. بەشێخ محەمەد ئەفەندی حوسامی نەقشبەندی ناسراوە.

ساڵی هاتنە دنیای بەوردی دەسنیشان نەکراوە، بەڵام لەبەر تیشکی ئەو سەرنج و تێبینییانەی بەخەتی خۆی لە کەشکۆڵەکەیدا[٥] تۆماری کردوون، دەتوانرێ کۆمەڵێک سەرەنجامی سوودبەخش وەدەست بهێنرێ، بەیاریدەی هەندێ سەرچاوەی تریش، بەشێوەیەکی لەبار ساڵی هاتنە دنیای دیاری بکرێ.

شێخ محەمەد عەلی لە کۆشکۆڵەکەیدا ئەم مێژووانەی خوارەوەی نووسیوە کە پەیوەندییان بەلایەنێکی گرنگی ژیانییەوە بووە:

١- لە مانگی موحەڕەمی ساڵی (١٢٧٨هـ) کە دەکاتە (١٨٦١ز)، دەستی بەخوێندنی (سعدالله الکبیر) کردووە.

٢- لە مانگی موحەڕەمی س/ ١٢٨٠هـ (١٨٦٣ز): دەستی بەخوێندنی (جامی) کردووە.

٣- لە مانگی ڕەبیعولئەوەل/ ١٢٨١هـ (١٨٦٤ز): دەستی بەخوێندنی (کافیە) کردووە.

٤- لە مانگی ڕەبیعول ئاخەری/ (١٢٨١هـ) (١٨٦٤ز): لە ڕەواندز لە خزمەتی مەلا عومەری خەیلانیدا دەستی بەخوێندنی (چارپردە) کردووە.

٥- لە مانگی ڕەبیعولئەووەلی (١٢٨٥هـ/ ١٨٦٨ز) لە خزمەتی جەنابی عومەر ئەفەندی خەیلانیدا (لە ڕەواندز) دەستی بەخوێندنی (مغني اللبیب) کردووە.

٦- لە ٩/ موحەڕەمی ساڵی (١٢٩٠هـ / ١٨٧٣ز) دایکی کۆچی دوایی کردووە.

٧- لە ٩/جەمادیل ئاخیرەی (١٢٩١هـ / ١٨٧٤ز): لە (شارەکەمان) شاری هەولێر لە پۆستی ((مفتی))دا دامەزراوە.

٨- لە مانگی ڕەبیعول ئەوەلی ساڵی (١٢٩٧هـ / ١٨٧٩ز)دا دەڵێ ((مني فەقیر محەمەد عەلی حوسامی کوڕێ (کوچک مەلا) لە پۆستی (مفتی) هەولێر ئیستیعفا کرام))..

٩- ڕۆژی پێنجشەممە (٢ شەعبانی/ ١٢٩٨هـ) (١٨٨٠هـ) جەنابی عومەر ئەفەندی دوای نوێژی نیوەڕۆ چووە بۆ حەجی شەریف.

١٠- لە ٢٩ (ذو الحجة الشریفة) (١٢٩٤هـ/ ١٨٧٧ز)دا دەڵێ: ((تەمەنی خەدیجەی کچمان بووە ساڵێک و کۆچی دوایی کرد، نۆ بەردمان بوو)).

١١- لە ٢١/ شەعبانی/ (١٢٩٦هـ/ ١٨٧٨ز) بەرەی بەیان دەڵێ: محەمەد جەمیلی کوڕم لەدایک بوو. لە پێناوی تەقوا و زانستدا، خوا تەمەنی درێژ بکات))[٦].

١٢- لە ساڵی (١٣٠١هـ / ١٨٨٣ز) شێخ محەمەد عەلی ئیجازەی (موتلەق)ی ئیرشادی (ڕێبەرایەتی) لە شێخ عەلی حوسامەدینی (لە تەوێڵە) وەرگرتووە.

١٣- لە ساڵی (١٣٠٣هـ/ ١٨٨٥ز) ئیجازەی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز لە شاری کەرکوک لە شێخ عەلی کوڕی شێخ عەبدوڕەحمان تاڵەبانی وەرگرتووە[٧].

ئەوەی پێویستە لەم شوێنەدا ڕوون بکرێتەوە، عوسمان ئەفەندی برا گەورەی شێخ محەمەد عەلی هەروەکو لە کتێبی (سبائک الاملا)دا نووسراوە: لە ساڵی (١٢٤٢هـ/١٨٢٦ز) هاتۆتە دنیاوە(٨) پێویستە ئەوەش بوترێ مەلا ئەبوبەکری مەلا گچکەی باوکیان لە ساڵی (١٢٧٢هـ/ ١٨٥٥ز) وەفاتی کردووە(٩).

کەواتە: ئەگەر شێخ محەمەد عەلی لە نێوان ساڵانی (١٨٦١ز) تا (١٨٦٨ز)دا (موستەعید) بووبێ. هەروا بچووکترین کوڕەکانی مەلای گچکە بووبێ. دەبێ لە ساڵی (١٢٧٨هـ/ ١٨٦١ز)دا، تەمەنی لە دەوروبەری (٢٣) بیست و سێ ساڵاندا بووبێ، بەم پێیە دەکرێ بگوترێ لە دەوروبەری ساڵی ١٢٥٥ هیجری (واتە: ١٨٣٩زاییینیدا) لەدایک بووە. کە لە ساڵی (١٢٩١هـ/ ١٨٧٤ز)دا بۆتە (مفتی) شاری هەولێر لە تەمەنی (٣٥) سی و پێنج ساڵاندا بووە ئەم بۆچوونە پتر لەگەڵ واقیع و لۆژێکدا دەگونجێ.

هەروەکو بینیمان، لە ساڵی (١٢٩٧هـ/١٨٧٩ز) کە لە پۆستی ((مفتی))ی شار دوور کەوتۆتەوە،

لەقەبی (حوسامی) بەناوی خۆیەوە لکاندووە. ئەم نوختەیەش بەڵگەی ئەوەیە کە ئەوساکە ئاشنایەتیی لەگەڵ تەریقەتی نەقشبەندی لە ڕێگەی شێخ عەلی حوسامودینەوە پەیدا کردووە کە لە ساڵی (١٨٨٣)ز ئیجازەی موتەلەقی تەریقەتی نەقشبەندی پێی، داوە تەمەنی شێخ محەمەد عەلی، نزیکەی (٤٤) ساڵان بووە، کەچی شێخەکەی لە تەمەنی بیست و دوو ساڵاندا بووە[١٠]:

سەبارەت بەمێژووی کۆچی دوایی شێخ محەمەد عەلی ئەفەندییەوە، لە هەندێ سەرچاوەدا نووسراوەکە گۆیا لە ساڵی (١٣٠٧)دا کۆچی دوایی کردووە(١١). ئەم مێژووە پێویست بەپێداچوونەوە دەکات. چونکە لە ساڵی (١٣٠٨) هیجرەتدا (واتە -١٨٩٠ز) لە ژیاندا بووە. بەڵگەش بۆ ئەو قسەیە ئەوەیە کە بەخەتی خۆی لە کۆتایی کتێبی مەولوودنامەکەیدا نووسیویە: (جمعت هذا القدر اليسير من كتب معتبرة وأنا الفقير الذليل محمد علي الحسامي ابن ابي بكر المدرس باربل رحمهما الله الملك الجليل سنة ثمانية وثلثمائة وألف))[١٢].

واتە لە ساڵی (١٣٠٨ھ) مەلوودنامەکەی نووسیوە. بەم پێیە دەبێ دوای ئەوساڵە وەفاتی کردبێ. جا لەبەرئەوەی تەرمەکەی لە (تەوێڵە)ی سەر بەهەڵەبجەدا بەخاک سپێردراوە، هەروەها شاهیدە و کێلی قەبریشی لە هەولێردا نییە بۆ ئەوەی بزانرێ لە چ ساڵێکدا کۆچی دوایی کردووە، پێویستە پشت بە سەرچاوەی تر ببەسترێ. خۆشبەختانە بەم دواییانە تەرجەمەی کتێبی ((سراج الطالبين) بۆ عەرەبی بڵاو کرایەوە، ئەم تەرجەمەیە بەشی دووەمی کتێبەکەشی لەخۆ گرتووە، (شێخ محەمەد جەمیل) لە کۆتایی کتێبەکەدا بە وردی مێژووی وەفاتی باوکی دەستنیشان کردووە گوتوویە ((لە شەوی پێنجشەممەی ڕێکەوتی ١٥ی ڕەبیعی یەکەم لە ساڵی ١٣١٨ی ھ لە گوندی تەوێڵەی پیرۆز کۆچی دوایی کردووە، واتە لە ساڵی ١٩٠٢ لە تەمەنی (٦٣) ساڵیدا وەفاتی کردووە)).

## ج- بەرهەمەکانی

شێخ محەمەد عەلی ئەفەندی زانایەکی ئایینی سەردەمی خۆی بووە، لە بواری شەریعەتدا شارەزا و پسپۆر بووە. ئەم سیفەتەش بۆتە هۆی ئەوەی بۆ ماوەی پێنج ساڵ (١٨٧٤-١٨٧٩ز) پۆستی ((مفتی))ی شاری هەولێری پێ بسپێردرێ. زمانەکانی کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی زۆر باش زانیوە، بەو چوار زمانە نووسەرێکی چاک بووە. ئەوەی تا ئێستا زانراوە خاوەنی ئەم بەرهەمانەی خوارەوەیە:

**١- کەشکۆڵ:** وەکو ئاژاندەیەک وایە تیایدا زۆر شتی تایبەتی بەخۆی وخوێندن و ئیجازەکانی تۆمار کردووە، هەروا باسی چەندین ڕووداوی سروشتی وسیاسی و کۆمەڵایەتی کردووە. لە نووسینی ژیاننامەیدا لە دێرەکانی پێشوودا سوودی لێ بینراوە. پێ دەچێ تا ساڵی ١٣٠٣ھ (١٨٨٥ز). هەر شتێکی لەلادا گرنگ بووبێ، لەو کەشکۆڵەدا ئاماژەی پێ داوە..

**٢- کتێبی ((سراج الطالبين))**
واتە (چرای فێرخوازان)، وشەی (سیراج) بەدوو واتا بەکار هاتووە، یەکەم: (چرا)یە، دووەم: مەبەستی شێخ عوسمان سیراجوددینی نەقشبەندیی باپیری شێخەکەیەتی. لەمانگی (ذو الحجة/ ١٣٠٥ھ) (١٨٨٧ز) خەریکی نووسینی بووە.

کتێبەکە بەزمانی (فارسی) نووسراوە، دوای کۆچی دوایی شێخ محەمەد عەلی ئەفەندی، بەسەرپەرشتی (شێخ محەمەد جەمیلی) کوڕەکەی لە ساڵی ١٣٣١ (هجری رۆمی) (١٣٣٢ هیجری قەمەری) (١٩١٣ز) لە چاپخانەی (مەکتەبی سەنایع) لە شاری کەرکووک لە چاپ دراوە[١٣]. تیایدا لە سیفات و کەرامات و مورید و خەلیفەکانی شێخەکەی وەکو یەکێ لە دڵسۆزان دواوە. ناوی دەیان مورید و مەنسووبی شێخی ناوبراو لە کتێبەکەدا بەرچاو دەکەوێ، لە پاڵ کۆمەڵێک هۆنراوە کە لە ستایشی شێخدا هۆنراونەتەوە.

**٣- مەولوودنامە:** لە ساڵی (١٣٠٨ھ/ ١٨٩٠ز) نووسراوە، دانەر لە سەرچاوەی جۆراوجۆر سوودی بینیوە، تێکستەکانی بەعەرەبی نووسیوەتەوە. ئینجا بەکوردییەکی ڕەوان، پوختەی ماناکانی روون کردۆتەوە، بۆ خوێندنەوە لە ئاهەنگی مەولوودی پێغەمبەر لە کوردستاندا ئامادە کراوە..

ئەم مەولوودنامەیە هەروەکو

پێشتریش گوترا، نرخێکی مێژوویی واتاداری هەیە (بەتایبەتی لە شاری هەولێردا) چونکە ئەو کاتە مەولوودی پێغەمبەر بەعەرەبی، ناو ناو بەناویش بەتورکی دەخوێنراوەیەوە. جا بۆ ئەوەی خەڵکی هەولێر بەجوانی لە سیرەی پێغەمبەر (د.خ) حاڵیێ بن، شێخ محەمەد عەلی ئەو دەستپێشخەرییەکەی کردووە. لە دێرەکانی داهاتوودا، تیشکێک ئاراستەی مەولوودنامەکە دەکەین.

## ج- مەولوودنامەی شێخ محەممەد عەلی ئەفەندی:

رەنگە بوترێ شێخ محەمەد عەلی هەموو ئەو سەرچاوانەی لەمەڕ سیرەی پێغەمبەر (د.خ) بەرچاوی کەوتبێ، کتومت متمانەیانی پێ کردووە و سوودیان لێ بینوە و نووسیویانەتەوە. ئەم رەفتارەش مێتۆدێکی باوی سەردەمەکەی بووە. ئاشکرایە بۆ مەبەستێکی پەروەردەیی، بۆ خەڵکی سادە - کە ئەوساکە پتر لە ٩٠٪ یان بێ سەواد و نەخوێندەوار بوون- نووسراوە. واتە بۆ توێژی بەرزی خوێنەران ئاراستە نەکراوە، بەڵکو بۆ بیستن و گوێ لێ راگرتن لە ئاهەنگی مەلوودی پێغەمبەردا ئامادە کراوە.. چونکە سازدانی ئاهەنگی مەولوودی پێغەمبەر، نەک هەر بەتەنها لە مانگی مەولوود و، لە ساڵرۆژی لە دایکبوونی پێغەمبەردا نەریتێکی باو بووە، بەڵکو لە دەیان بۆنە و موناسەبەی تریشدا ساز دراوە.

ئەوەی بەلای ئێمەدا گرنگە، تێکستە کوردییەکانی مەلوودنامەکەیە، کە هەوڵ دەدەین بەکورتی هەندێ نموونەی لێ هەڵبهێنجین:

لە لاپەڕە(٢)دا، بۆ هاندانی خەڵک، نووسەر بەم شێوەیە لە گرنگیتی مەولوودی پێغەمبەر دواوە:

((ئیبن جوزی فەرمووە: موجەڕەبە، هەرکەسێ مەولوود بکا. ئەو ساڵ لە موسیبەت ئەمین و، مەقسوورد و مەتلووبی زوو حاسڵ دەبێ)). لە هەمان لاپەڕەدا دەڵێ:

((حەسەن بەسری فەرمووە: کاشکی بەقەدەر کێوی ئوحود زێرم بووایە، سەرفی مەلوودی شەریفم بکردابایە)).

هەروا دەڵێ:

((هەولێر کە لە قوربی (مووسل)ە نێوی شارەکە، حاکمەکی بووە (موزەفەر) ناو، زاتێکی عادیل و شەجیع و تەنها بووە، هەولێر و شەهرەزووری بەدەست بووە. هەموو ساڵ سێ سەد هەزار دیناری سەرفی مەلوودی دەکرد بەحیسابی ئێستا قەریبی سێسەد هەزار (لیرا) دەکا.

((لە تەئریخی شەش سەدیدا بەرەحمەتی خودا شاد بووە)). لە لاپەڕە (٣) بەردەوام دەبێ لە وەسفکردنی ئاهەنگی مەلوودی پێغەمبەر (د.خ) لە سەردەمی سوڵتان موزەفەردا:

لەمەولوودی مەلیک موزەفەر (دەفعەیێ حەسەب بەیان کراوە) پێنج هەزار مەڕ و دە هەزار مریشکی سەر بڕیبوو، سەد هەزار فەغفووری (وەکو) نوقڵی و نەبات و، سێ هەزار سینی حەلوا دروست کردبوو..)(ل-٣).

شێخ عەلی درێژە بەنووسینەکەی دەدا:

((مەعرووفی کەرخی فەرموویەتی: هەرکەسێ تەعزیمی مەولید بکا، برادەرانی موسلیم جەمع بکا، تەعام دروست بکا، چرا داگیرسێنی، لیباسی تازە بپۆشێ، مەجلیسی موعەتتەر بکا، خودای تەعالا ئەو کەسەی لەگەڵ سەفی پێغەمبەران حەشر دەکا...

((باز شێخ سەیبوگی فەرموەوە: لە خانی موسلمانێ: مەولیدی نەبی (صلی الله علیه وسلم) بخوێنرێ، خودای تەبارەک و تەعالا لە ئەهلی ئەو خانییی، قەحتو (وەبا) و حەرق و ئافات و بەلییات و بوغز و حەسەد دەفع دەکا و، چاوی خەراب و دز مەنع دەکا، ئەگەر وەفات بکا، جەوابی سوئالی مونکەر و نەکیر لە بۆیان سەهل دەکا.. )) (ل-٤).

لە هەمان لاپەڕەدا (ل-٤) دەڵێ:

((ئیبن حەجەری عەسقەلانی فەرموەوە: لە عەمەلی مەولوود، لازمە چشتی حەرام یامەکرووە نەکرێ، هەرچی خێر بێ وەکو دوعا و سەلەوات (ئەو) بخوێنرێ..)

لە لاپەڕە (٥)دا دەڵێ:

(( ئیبن حەجەری مەککی فەرموەوە: بۆ ئیزهاری فەرح و سروور، ئەوەندە کیفایەیە پیاوی چاک و قورا جەمع بکرێ، ئیتعامی تەعام و تەسەدوق بۆ ئەوان بکەن، ئەگەر زیادە (ناخوێنرێتەوە) مەدحی (صلی الله علیه وسلم) بخوێنرێ، ئێستا لە زۆر جێیان مەلوود دەکەن ژن و پیاو تێکەڵ دەبێ، (لەهو) و (لیعب) و (غەیبەت) دەکەن.

(مع هذا) سەلاتی صوبح لەبەر نوستن ناکەن، ئەو نەوعە مەولوودە حەرامە، پارەیان بێهوودە دەچێ، گوناهی هەمووشیان دەنووسرێ)).
هتد

**راڤەکردن**

- فەرموۆە: فەرموویەتی
- موجەرەبە (مجرب): بەتاقیکردنەوە سەلمێنراوە.
- مەقسوود (مقصود): مەبەست
- مەتلووب (مطلوب): داواکراو: هیوا و ئاوات.
- حاسل دەبێ (حاصل دەبێ): جێبەجێ دەکرێ.
- کێوی ئوحد: (جبل أحد) چیایەکە لە حیجازدا.
- قوربی (موصل)ە: نزیکی شاری مووسڵە.
- عادیل و شەجیع و تەنها بووە: دادپەروەر ئازا و تاکانە بووە.
- قەریبی سێ سەد هەزار (لیرا): نزیکەی سێ سەد هەزار لیرەی (زێڕی) پارەی ئەوساکە.
- سولتان موزەفەرەدین گوگبری لە ساڵی (٦٣٠هـ/ ١٢٣٢ز) کۆچی دوایی کردووە، داهێنەری ئاهەنگی مەلوودی پێغەمبەرە.
- جەمع بکا: کۆیان کاتەوە.
- لیباس: جل و بەرگ
- موعەتتەر (معطر) بکا: بەگوڵاو وبۆنی خۆش بۆنی شوێنەکە خۆش بکاتەوە.
- تەعام دروست بکا: خواردن ئامادە بکات.
- خانی: خانوو، ماڵ.
- بخوێنرێ: بخوێنرێتەوە.
- (قەحت) و (وەبا) و (حەرق): قاتوقڕی و نەخۆشی و ئاگر و (سووتان).
- بەلییات (البلایا): کۆی (بەلا)یە نەخۆشی.
- بوغز و حەسەد: رق و کینە و ئێرەیی و حەسوودی.
- عەمەلی مەولوود: لە کاتی ئاهەنگی مەولوودی پێغەمبەردا
- چشتی حەرام: شتی حەرام و رەفتاری ناشرین.
- ئیزهاری فەرح و سروور: نیشاندانی کەیف و خۆشی.
- پیاوی چاک و قوراجەمع بکرێ: مرۆڤی باش و خەڵکی گوندان کۆ بکرێنەوە.
- (ئیطعامی عام): خواردن پێشکەش کردن.
- (لەهو) و (لیعب) و (غەیبەت): (لهو ولعب وغیبە): رابوردان و یاری و گەمە و پاشملە باسی خەڵک کردن.
- سەلاتی سوبح (صلوتی صبح): نوێژی بەیانی.

مەولوودنامەکە بەرێنووسی کۆنی کوردی فارسی ئامێز نووسراوە، تیایدا، کۆمەڵێک و شەو تەعبیری عەرەبی بەکار هاتووە، ئەو زمانە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا، زمانی قسەکردنی مەلایان بووە. بەشێوەیەکی گشتی شێوەی ئاخافتنی ئەوساکەی هەولێری بەسەریدا زاڵە..

هەروەکو گوتمان، ئەگەرچی کۆمەڵێک وشە و تەعبیری عەرەبی تیایدا بەدی دەکرێ، بەڵام زمانێکی ئاسانە، خەڵک کە گوێبیستی دەبوون، بەسووک و ئاسانایی لێی حاڵی دەبوون.

دووبارە پێویستە بوترێتەوە، ئەم مەولوودنامەیە کە بە پەخشان نووسراوە، نرخێکی مێژوویی تایبەتی هەیە.

**سەرچاوە و پەراوێز:**

١- رشاد محمد المفتي: (سبائك الاملا في اسرة كجك ملا) جمعه وحققه وأضاف اليه (عثمان رشاد المفتي) الجزء الثاني (مخطوط)- ص؟ شجرة الاسرة (بدون ترقيم).

سەرنج: لەمەودوا ئەو سەرچاوەیە بە (سبائک الاملا)) ئاماژەی بۆ دەکرێ.

٢- بەپێی فەرمانێکی رەسمی کە لە کتێبخانەی بەهەشتی (رەشاد مفتی)دا پارێزراوە، لە ساڵی (١١٢٨هـ (١٧١٦ز) جیهەتی دەرزوتنەوە لە مەدرسەی مزگەوتی گەورەی قەڵا بەباپیرە گەورەی ئەو خانەوادەیە (مەلا ئەبوبەبکر) ئاراستە کراوە.

٣- مەولوودنامەی شێخ محەمەد عەلی حوسامی کوڕی ئەبوبەکر، (دەسنووس) ل (٦٣).

٤- (سبائک الاملا): ل(؟).

سەرنج: لەبەرئەوەی لەسەر لاپەرەکاندا یەک لە دوای یەک (ژمارە) دانەنراوە، بۆیە ئەو ژمارانەی لەسەر هەندێ لاپەڕەدا دانراون، لەگەڵ زنجیرەی لاپەڕەکانی دەسنووسەکەدا گونجاو نین. هەروەها هیچ ژمارەیەک لەسەر بەشێکی زۆریدا دانەنراوە، بۆیە ناکرێ بەوردی

ئامـاژە بۆ لاپەڕەکـانی بکرێ داوای لێبووردن دەکەین.
٥- (کـەشکۆڵی شـێخ عـەلی ئەفەندی) لە کتێبخانەی مامۆستا (ڕەشـاد مـفـتی)دا پارێزراوە. مامۆستا عوسمان مفتی لە کتێبی ((سبائک الاملا))دا کۆپی چەند لاپەڕەیەکی بڵاو کـردۆتەوە، هەروەها هەندێ سـەرنجـیشی دەربارەی تۆمار کردووە.
٦- کەشکۆڵی شێخ محەمەد عەلی ئەفەندی: ((سبائک الاملا) لە ل(؟).
٧- هەردوو سەرچاوەی پێشوو.
٨- (سبـائک الامـلا) ل (تمهـیـد) پێـمـان وایە ئەو مـێـژووە بەشێوەیەکی مەزەندەیی دانراوە.
٩- ((سبـائک الامـلا)) شـیـاوی ئامـاژەیە شـاعـیـری هەولێـری (یعقوب ئاغای کوڕی قاسم) کە هاوچەرخی مـەلا گـچکە بووە، هۆنراوەیەکی بەبۆنەی کـۆچی دوایی مـەلا گـچکە نووسـیـوە تیـایدا سـاڵی وەفـاتی لە دوا بەیتیدا نیشان داوە: (١٢٧٢هـ) کە دەکاتە (١٨٥٥ز).
١٠- شێخ عەلی (حوسامەددین) کـوڕی شـێخ مـحـەمـەد (بەهائوددین) کـوڕی شـێخ عـوسمـان (سـیـراجوددین)ە، لە سـاڵی (١٢٧٨هـ /١٨٦١ز) لە (تەوێڵە) لەدایک بووە. لە ساڵی (١٣٥٨ هـ/ ١٩٣٩ ز) کـۆچی دوایی کـردووە. شـێخ عـەلی حوسامەددین ئیجازەی خەلافەتی تەریقـەتی نەقشـبەندی لە شێخ محەمەد بەهائوددینی (١٨٣٩-١٨٨٠) باوکی وەرگـرتووە، ئەمـیش لە باوکی خـۆی شـێخ عوسمان سیراجوددینی (١٧٨٠-١٨٦٦ ز) وەرگـرتووە. شـێخ عـوسـمـان سـیـراجـوددینش لە حەزرەتی مەولانا خالید (ضیاء الدین)ی وەرگرتووە.
(بڕوانە: مـەلا عـەبدلکەریمی مـودەرس: یادی مـەردان، (بەرگی دووهەم)- چاپخانەی کۆڕی زانیاری عـیـراق- بەغـدا -١٩٨٣ ل: (٧)و(٣١)و(٣٥)و(٨٣).
١١- زبیر بیلال اسماعیل: علماء ومـدارس اربیل/ الموصل- ١٩٨٤ ص(٣١-٣٢).
١٢- مـەولوودنامەی شێخ محەمەد عەلی حوسامی: (دەسنووس)، ل(٦٣)
(*) بڕوانە: سراج الطالبین، تالیف العالم العامل شیخ محمد علي افندي الحسامي الاربیلي، ترجمة من الفارسیة الاستاذ حیدر رشید احمد، (مطبوعات وزارة الاوقاف والشؤون الاسلامیة)- مطبعة وزارة التربیة - اربیل - ٢٠٠٢، ص٢٩٠.
تێبـینی: ئەگەرچی وەرگـێڕ تا ڕادەیەکی باش لە تەرجەمـەکـەیدا سەرکـەوتنی بەدەست هێناوە، بەڵام مـایەی داخە لە لاپەڕە (١٣٣)دا بە وردی حـیکایەتی ژمـارە (٢٣٦)ی تەرجەمە نەکردووە، لەوانەیە لە چاپدا دێرێک پەڕیوەتەوە، بەتایبەتی ناوی مـزگـەوتی گـەورەی بازاڕ (واتە مزگەوتی حاجی داودی لابردووە).
بۆ بەراوردکـردن بڕوانە چاپی (١٣٣١) هـ کـەرکـووک (بە فارسیە)، ل ١٩٦-١٩٧.
١٣- لەسەر بەرگیدا ئەم ڕستانە نووسراون:
((هذا کتاب (سراج الطالبین) في مناقب غوث الواصلین، مـربي الطالبین: الشیخ علي الملقب بحسام الدین النقشبندي الخالدي طریقة والعثماني نسبا والطویلة الشریفة موطنا قدس سره المبدأ المعین، متعنا الله بطول حـیاته واولاده الی یوم الدین)).
للشیخ الفاضل، العالم العامل، حدقة عین الشریعة وغواص بحرالطریقة (علي افندي الحسامي النقشبندي الخالدي) ابن قدوة العلماء والصلحاء ردیف ابائه الکرام ابي بکر افندي المشهور ب کـجك ملا الاربلي روح الله روحهم وقدس الله اسرارهم ونفعنا بهم امین.
الطابع: الشیخ محمد جمیل الاربلي ابن علي الحسامي طبع في مطبعة المکتب (کذا؟) الصنایع الکرکوك (کذا) ١٣٣١.
ئەوساڵە ساڵی هیجری ڕۆمیە، چونکە لە پاشکۆی کـتێـبەکـەدا بەحـیسـابی ئەبجەد هۆنراوەیەک نووسـراوە، تیـایدا ئامـاژە بۆ سـاڵی (١٣٣٢) هیـجری قـەمـەری دراوە) بڕوانە- ل (٢٧٧) کتێبەکە بریتییە لە (٢٧٧) لاپەڕەی قەوارە ناوەنجی، نوسـخـەیەکی لە کـتێـبـخـانەی ئامادەکەری ئەم باسەدا هەیە.

# مەلا ئەبوبەکری نەقشبەندی هەرشەمی

کەریم شارەزا

مەلا ئەبوبەکری کوڕی محەمەدی کوڕی عەبدوڵڵا، ناسراو بە (غیاسەددین) لە گوندی (هەرشەم)ی داوێنی چیای پیرمەم لەدایک بووە و تێیدا ژیاوە تاکو گەورە بووە. خوێندنی مەلایەتی لەلای باوکی دەست پێ کردووە، پاشان چووەتە لای (مەلای خەتێ) و ماوەیەکیش هەر لە رواندز لەلای زانای گەورە مەلا عومەری خەیلانی خوێندوویەتی. پاشان گەڕاوەتەوە گوندی (هەرشەم) و ئیجازەی مەلایەتی لە باوکی وەرگرتووە و بووەتە مەلایەکی دوازدە عیلم.

مەلا ئەبوبەکر بەنیازی وەرگرتنی داب و دەستووری رێبازی تەسەوفی نەقشبەندی، چووەتە گوندی (تەوێڵە) لە ناوچەی هەورامان بۆ لای شێخ عوسمان "سیراجوددین" (١١٨٩-١٢٨٤ک)، کە یەکێک بووە لە خەلیفە ناودارەکانی مەولانا خالیدی نەقشبەندی و ماوەیەکی زۆری لەلا ماوەتەوە و حیکمەتی گیانی و عیرفانی لێ وەرگرتووە. کاتێک ئیجازەی رابەریی پێ دەدات، دەگەڕێتەوە گوندەکەی خۆی و دەست دەکات بەبەستنی کۆڕ و حەڵقەی زیکری نهێنی لە تەنیشت مزگەوتەکەی باوکیدا.

دوای ماوەیەک شێخ ئەبوبەکر هەر لە سەردەمی باوکیدا لە (هەرشەم)ەوە روو دەکاتە شاری هەولێر و مزگەوتێکی بچووک لە دەرەوەی شار بەلای رۆژهەڵاتەوە دەکاتە جێگای دەرس گوتنەوە و ئیرشاد و، لە دواییدا ئەو مزگەوتە بچووکە رووخاوە و لەلایەن (فاتمەخان)ی پووری عەبدورەق ئاغای عوزێرییەوە بینا کراوەتەوە. لە پاشان شێخ ئەبوبەکر لەمەلا و ئەولا زەوی دیکەی دەخاتە سەر و دەیکاتە مزگەوتێکی گەورە و پێی دەگوترێ (مزگەوتی شێخ ئەبوبەکری نەقشبەندی). بنەماڵەی هەرشەمی هەموویان بەیەکجاری دێنە هەولێر و لێی نیشتەجێ دەبن.

لە دیمانەیەکی مامۆستا (زوبێر بیلال ئیسماعیل)ی مێژوونووسدا لەگەڵ بەڕێز شێخ مستەفای نەقشبەندی کوڕیدا، شێخ مستەفا دەڵێ: "شێخ ئەبوبەکر دوای ئیرشاد وەرگرتن لە شێخ عوسمان سەردانی میسر و شام و حیجازی کردووە و پەیوەندیی بەگەلێک لە زانایانی ئیسلام کردووە، لە ماوەی ژیانیدا ٩ جار حەجی کردووە، چووەتە ئەستەمبوڵ و لەو شارەدا بەر لە هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا گەلێک لە گەورە پیاوانی عوسمانی چوونەتە لای و لەسەر دەستی ئەم چوونەتە سلکی رێبازی نەقشبەندییەوە. هەروەها دەستەیەک لە شاری مەدینە و دیمەشق و بەغدا و بەسرا لەسەر دەستی پەیوەندییان بەرێبازی نەقشبەندییەوە کردووە و بوونەتە موریدی و گەلێک زانای گەورە لەبەر دەستی پێگەیشتوون. لەوانە: شێخ ئیبراهیمی دۆغرەمەچی و شێخ عەبدولقادری بیارەیی بوون.

ئەم زاتە هاوچەرخی زانایان حاجی مەلا عومەر ئەفەندی هەولێری و شێخ عەبدورەحمانی کوڕی شێخ محەمەد سەعیدی نەقشبەندی بووە. لە ساڵی ١٣٢٩ی کۆچی بەرامبەر بە ١٩١١ی زایینی لە شاری هەولێر کۆچی دوایی کردووە و لە ناو مزگەوتەکەی خۆی بەخاک سپێردراوە. شێخ محەمەد ئەمینی کوڕە گەورەی ٣ ساڵ لە جێی دانیشتووە و کە کۆچی دوایی کردووە، شێخ مستەفای نەقشبەندی کوڕی سێیەمی جێی گرتۆتەوە.

# شێخ محەمەدئەمین کوردی هەولێری

شاخەوان عومەر قادر

**ناو و نازناوی**

سەرجەم ئەو کتێبانەی ژیاننامەی "شێخ محەمەدئەمین"یان تێدا باس کراوە، بە (محەمەدئەمین) ناویان بردووە. بەڵام نازناوەکەی بۆ باوکی فەتحوڵڵا زادە دەگەڕێتەوە کە ئەوەش راستییەکیەتی.

یەکێ لە لێکۆڵەرەوەکان دەڵێ ناوی باوکی محەمەدئەمین، "سلێمان کوڕی فەتاح"ە و نازناوی (فەتحوڵڵا)یە. وا دیارە خاوەنی ئەو بۆچوونە لە قسەکەی ورد نەبۆتەوە، چونکە شێخ (محەمەدئەمین) لە سەرجەم کتێبەکانی وەک (تنویر القلوب- فتح المسالک- سعادة المبتدئین) و هی تر جەخت دەکرێتەوە، کە ناوی باوکی (فەتحوڵڵا زادە)یە.

**نازناوەکانی**

"محەمەدئەمین" بە کۆمەڵێ نازناو ناسراوە و هەر نازناوێکیش شتێکی دیاریکراو هەڵدەگرێت، لەوانە: شێخ، کوردی، ئەربیلی،شافیعی، نەقشبەندی.

**شوێن و کاتی لەدایکبوونی:**

لە شاری (هەولێر) لەدایک بووە. زۆربەی لێکۆڵەرەوەکان لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون. هەولێری لە گوندی سەعداوە چاوی بەژیان هەڵێناوە کە سەر بەشاری هەولێرە. بەڵام سەبارەت بەساڵی لەدایکبوونی قسەکان یەکتر ناگرنەوە، لەوانە هەندێک دەڵێن:

١- ساڵی (١٢٤٦ک) لەدایک بووە.

٢- هەندێکی تر لایان وایە کە، ساڵی (١٢٦١ک) لەدایک بووە.

٣- بەتەواوی ساڵی لەدایکبوونی "هەولێری" نەزانراوە. تەنیا ئەوە نەبێت لە نیوەی دووەمی سەدەی سێزدەی کۆچی لەدایک بووە.

پێ دەچێ بۆچوونی سێیەم لە راستییەوە نزیک بێ، چونکە، ڕێککەوتنی لەدایکبوونی"هەولێری"ی دیار نەکردووە. بەهەمان شێوە "سەلامەی عەزامی" ش کە نزیک بووە لە هەولێری و لە دوای ئەو جێنشینی بووە.

**بنەماڵەکەی**

کاتێ هەولێری لە شاری (مەدینەی پیرۆز) نیشتەجێ دەبێ ئافرەتێکی تورک دێنێ و لە خۆی مارە دەکات. هەولێری زۆر باس لە رەوشت بەرزی و باشی بەیەکەوە ژیان و ئایینپەروەرییەکەی دەکات، بەڵام خوای گەورە هیچ منداڵێکی پێ نابەخشی.

کاتێ سەردانی (قاهیرە)ی کرد لە گوندێکی نزیک ئەو شارە نیشتەجێ بوو. لەوێ بۆ جارێکی دیکە ژنی هێناوەتەوە لەو ژنەیان منداڵی بووە. هەموویان مردوون تەنیا کوڕێکی نەبێت، کە ناوی (ئەحمەد) بوو. نازناوی "حەبیبوڵڵا" بووە. لە ساڵی (١٩١٩ز) لە کاتی شۆڕشی میسر لەگەڵ ئینگلیزدا کوژرا.

لەلایەکی دیکە، "شێخ عەبدولکەریم مودەریس" جەخت دەکاتەوە، کە هەولێری ژنێکی تریشی هێناوە و کوڕێکی لێ بووە بەناوی نەجمەدین و گوتوویەتی: (لە ساڵی ١٣٢٤) ژنێکی تری هێناوە و کوڕێکی لێ بووە بەناوی نەجمەدین و لە پاش مردنی، پێگەیشتووە و لەلایەن خەلیفەکانی پەروەردە کراوە.

شێخ نەجمەدین لە ساڵی (١٣٢٩ک) لە قاهیرە لە دایکبووە. لە ساڵی (١٤٠٦ک) مردووە. کاتێ باوکی مردووە ئەو بچووک بووە. لەلایەن شێخ سەلامە عوزامی پەروەردە و چاودێری کراوە. لای هەندێ لە شێخەکان فێری زانستەکانی شەرع بووە. شیچ پلە و پایەکی وەرنەگرتووە. بەڵکو لەسەر ڕێڕەوی باوکی ماوەتەوە. ڕێچکەی

بانگەشە و ئیرشادی گرتۆتە بەر. خۆی ڤالایی کردووە بۆ وانە وتنەوە لە ماڵەکەی. چاودێریی بڵاوبوونەوەی کتێبەکانی باوکی دەکرد. لێکۆڵینەوەی لەسەر کتێبی (النهایة في الفتن والملاحم لابن کثیر) کرد. شایانی ئاماژە پێکردنە بۆ ماوەیەک نەخوازراوی بەسەردا سەپێنرا، لەبەرئەوەی هەڵوێستی لە دژی جەمال عەبدولناسر نواند.

## ڕەوشت و ئاکارەکانی

عوزامی باس لە هەندێ ڕەوشت و ئاکارەکانی هەولێری دەکات و دەڵێت: "نیشانەی ئازایەتی و فریاکەوتن و ساکاری و لێبووردەیی بەسەریەوە دیار بوو، لە بەخشین و سەخاوەت وێنەی نەبووە... ئەوەی لە کۆڕی دانیشتبا خەم و پەژارەی بەلاوە دەنا، هەستی دەکرد، دڵەکەی بەتەواوی ئارامی گرتووە. گەر ڕێنمایی یاوەرەکانی یان کەسانی دیکەی بکردبا وەکو ئەوە وابوو کە دەیانبینی. گەر ئەمری کردبا بەچاکە و نەهی کردبا لە خراپە زۆر نەرمونیان بوو، هەمیشە هانی یاوەرەکانی لەسەر ئەو ڕێچکەیە دەدا، کە نەرمونیان بن. خۆی زۆر بەرفراوان کردبوو بۆ تەواوی ڕێنماییبەرەکان بەجیاوازی چینەکانیشیانەوە".

هاوکاریی خێزانەکەی دەکرد، ماڵەکەی گەسک دەدا، خزمەتی میوانەکانی دەکرد، گەر بچووکیش بووایە.... هەرگیز ڕای نەدەسپارد، ئەوەی لای بووایە پێشکەشی دەکرد". لە ڕەوشتە بەرزەکانی هەولێری هەمیشە بۆ بانگهێشتکردن و بەجێگەیاندنی ئەو ئەمانەتە تەنیا پشت بەستوو بوو بەخوای گەورە.

هەرچەندە کەسێکی نامۆ بوو لەو وڵاتە. چونکە ئەو ئاسا وا بوو مرۆڤ گەر پشت و پەنای نەبووایە یاخود زەنگین نەبووایە، یان پلە و پایەیەکی کی دنیایی بەرزی بەدەست نەبووایە، یاخود هۆزێکی یان حزبێکی بەهێز کۆمەکی نەکردبا ناوبانگی دەرنەدەکرد.

لە پێناو وەدەستهێنانی زانست و فێربوون و زانینی ڕێگەی دروست ماندوو نەدەبوو.

## هەوڵدان و گەڕانی بەدوای زانستدا

هەولێری زانستە شەرعییەکانی لەسەر دەستی زۆر لە زانایانی (هەولێر) وەرگرتووە و پێگەیشتووە. سەرەتا دەستی بەخوێندنی قورئانی پیرۆز کردووە و خەتمی کردۆوە، لەگەڵ کتێبە بچووکەکان کە ئەوسا دەخوێندران وەک "ئەحمەدی" لە زمان و "فەتحولقەریب" لە فیقە و"عەوامیلی جورجانی" لە نەحو و.... پاشان زانستەکانی عەرەبی خوێندووە، وەک : سەرف و نەحو، ڕەوانبێژی، فیقهیشی وەرگرتووە و زۆر بەباشی تێیان گەیشتووە.

دواتر ئیجازەی زانستی وەدەست هێناوە و چووەتە (سلێمانی). لەوێش لەلای زۆر لە زانایان خوێندوویەتی. پاشان لەسەر دەستی شێخ عومەر زیائودین تەریقەی نەقشبەندی وەرگرتووە و بووە بەیەکێ لە خەلیفە گەورەکانی. هەولێری گەیشتە پلەی خەلیفایەتی. شێخ عومەر زیائودین، کە شێخی بوو دەستنیشانی کرد، کە ڕێنمایی و بانگەشەی ئیسلامەتی بکات پاشان گەڕایەوە شارەکەی (هەولێر) و زۆر بەکەمی دەمێنێتەوە. بەمەبەستی زیارەتی ماڵی خودا (حەج) و خۆ ڤالاییکردن بۆ خواپەرستی و پاککردنەوەی دەروون (نەفس)، دەچی بۆ مەککەی پیرۆز.

پابەند بوو بەوەی کە بەشەو نەخەوێ و بەرۆژ فتار نەکاتەوە. لە هەموو کاتێکدا چاودێریی زیکرەکانی بێت، لەسەر ئەو بارەی ماوەی ساڵێک مایەوە. پاشان لە ساڵی (١٣٠٠ک) سەردانی پێغەمبەری کرد (د.خ) و بۆ ماوەی چەند ساڵێک لەوێ مایەوە. دواتر پەیوەندی کرد بەقوتابخانەی مەحموودییە لە (مەدینەی پیرۆز). مەرجی پەیوەندیکردن بەو قوتابخانەیە ئەوە بوو، کە دەبووا زمانی تورکی زانیبووایە. لە ماوەیەکی زۆر کەم فێری بوو، لە تاقیکردنەوەکان سەرکەوتوو بوو.

هەولێری لە هەردوو شاری (مەککەی پیرۆز) و (مەدینەی پیرۆز) دە ساڵ مایەوە. هەروەکو هەولێری خۆی دەڵێت (ماوەی دە ساڵ لەسەر ئەو خاکە پاکە مامەوە، ساڵێک لەمەککەی پیرۆزو نۆ ساڵ لەمەدینەی پیرۆز).

هەولێری پاش ئەوەی لە مەککە و مەدینەی پیرۆز نیشتەجێ بووە. سەفەری کرد بۆ قاهیرە و، پەیوەندیی بە ئەزهەرەوە کرد و بوو بەقوتابی. فیقە و حەدیس و تەفسیری زۆر بە بایەخەوە خوێند، لە ساڵی (١٣٢٣ک) هەولێری ئارەزووی حەجی ماڵی خودا و زیارەتی پێغەمبەر (د.خ) کردەوە د.خ، بۆ جاری تر سەردانەکەی کرد و، گەڕایەوە قاهیرە.

## شێخ و مامۆستاکانی

سەرەتا هەولێری لە شارەکەی

(هەولێر) لەسەر دەستی ژمارەیەک لە زانایان فێری زۆر لە زانستەکان بوو لەوانە:

**١- "شێخ فەتحوڵڵا زادە"ی باوکی**

شێخ فەتحوڵڵا زادە شێخێکی بەناوبانگ بوو، لە تەریقەی قادری پێشنوێژی مزگەوتی (حاجی داود) بوو لە شاری هەولێر. هەولێری لە حوجرەی باوکی پێگەیشت و لەوێ فێری قورئان و زانست بوو. ئەو باوکە رابەرێکی شیاو و ناسراو و دڵئاوا و رێزگر بووە.

**٢- شێخ ئەبوبەکر هەرشەمی**

(هەولێری) بۆ ماوەیەک لای شێخ ئەبوبەکر هەرشەمی، لە شاری هەولێر خوێندوویەتی. ناوی شێخ غەیاسەدین ئەبوبەکر هەولێری کوڕی مەلا محەمەد هەرشەمی بوو. شێخ ئەبوبەکر لە گوندی (هەرشەم) لەدایک بووە. لای باوکی کە زانا بوو لە نێو زانستە ئەقلی و نەقلی کان پێگەیشتبوو. پلەی شیاوی پێ درابوو، تەریقەی نەقشبەندی لەسەر دەستی شێخ عوسمان سیراجەدین وەرگرتبوو. هەرشەمی لە ساڵی (١٣٢٥ک) یان لە ساڵی (١٣٢٦ک) کۆچی دوایی کردووە.

**٣- مەلا عومەر ئەفەندی**

هەولێری، ئیجازەی زانستی لە عەللامە ("حاجی عومەر ئەفەندیی هەولێری کوڕی ئەبی بەکر کە نازناوی "کوچک مەلا") وەرگرتووە. لە ساڵی ١٢٣٠ک لە هەولێر لەدایک بووە. لە ساڵی (١٢٩٨ک) حەجی ماڵی خودای کردووە، وەرگێڕ و زانایەکی بەناوبانگ و بەتەقوا بووە. رۆژانە دەرسی وتووەتەوە لە (مزگەوتی گەورەی قەڵات) تا لە ساڵی (١٣٠٩ک) لە قەڵاتی هەولێر کۆچی دوایی کردووە.

**٤- شێخ عومەر زیائودین**

هەولێری، تەریقەی نەقشبەندی لەسەر دەستی شێخ عومەر زیائودین وەرگرتووە. ناوی شێخ عومەر زیائودین کوڕی شێخ عوسمان سیراجەدین نەقشبەندییە و لە گوندی "بیارە" لە ٢٦ی جەمادی یەکەم لە ساڵی (١٢٥٥ک) لەدایک بووە. قورئانی پیرۆز و چەند کتێبێکی دیکەی ئایینیی خوێندووە. پاشان باوکی ناردوویەتی بۆ لای شێخ عەبدولڕەحمان خالیسی. ماوەیەک لای ئەو دەمێنێتەوە دواتر باوکی دەیهێنێتەوە لای خۆی، لەلای مەلا "حامیدی کاتیب" و لە ژێر چاودێریی برا گەورەکەی شێخ (محەمەد بەهائەدین) لە خوێندن بەردەوام دەبێت. شێخ عومەر لە ساڵی (١٣١٨ک) کۆچی دوایی کردووە.

**٥- شێخ محەمەد ئەشموتی**

هەولێری، "سەحیح بوخاری" لای مامۆستا شێخ محەمەد ئەشموتی خوێندووە کە لە سەرەتای دەیەی سێیەم لە سەدەی سیانزەی کۆچی ماڵئاوایی لە دنیا کردووە.

**٦- شێخ مستەفا عز شافیعی**

هەولێری، "فیقە"-ی لەلای شێخ مستەفا عز شافیعی خوێندووە، کە ناوی "مستەفا عز کوڕی موحسینەدین کوڕی محەمەد"ە و لە ساڵی (١٣١٧ک) کۆچی دوایی کردووە. یەکێ لە کتێبەکانی (طریق الارشاد في البحث علی الجهاد) کە لە میسر چاپ کراوە.

**٧- شێخی جامیعەی ئەزهەر سەلیم بەشری**

هەولێری زۆر ئارەزووی خوێندنی هەردوو زانستی حەدیس و تەفسیر بووە، بۆیە لە دوا ساڵەکانی تەمەنی لای شێخی ئیسلام شێخی جامیعەی ئەزهەر سەلیم بەشری خوێندووە. کە ناوی (سەلیم کوڕی ئەبی فەراج کوڕی سەلیم کوڕی ئەبی فەراج بەشرییە و لە میسر لە ساڵی (١٢٤٨ک) لەدایک بووە و لە مانگی زیلحەجەی ساڵی (١٣٣٥ک) کۆچی دوایی کردووە. لە کتێبەکانی (حاشية تحفة الطلاب بشرح رسالة الاداب، وضع المنهج، شرح نهج البردة لاحمد شوقي و...).

**قوتابییەکانی**

ئەو کتێبانەی لەسەر ژیان و بەسەرهاتی هەولێرییان نووسیوە، بەهیچ شێوەیەک ناوی قوتابی و موریدەکانی نەهێناون. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لە لایەک قوتابی زۆری هەبووە، لەلایەکی دیکە لەبەرئەوەی تەنیا لە شوێنێک جێگیر نەبووە. چونکە هەمیشە هەوڵی داوە لێرە و لەوێدا درێژە بەخوێندنی بدات.

کاتێ هەولێری لە "مەدینەی مونەوەرە" دەبێت پەیوەندی بەقوتابخانەی "مەحموودیە" دەکات و بەنمرەی باش سەرکەوتوو دەبێت و لە زانست و تێگەیشتن زۆر باڵا دەبێت. پاش چەند ساڵێک لە مزگەوتی پێغەمبەر (د.خ) وانە بەقوتابییان دەڵێتەوە.

بەوانە گوتنەوە و ئیرشاد سەرقاڵ دەبێ و دوای ئەوەی لە "میسر"خوێندنی تەواو دەکات.

"تەریقەی نەقشبەندی لە سەرتاسەری وڵاتی میسر بڵاو

دەکاتەوە و لە زانایان و گەورە پیاوان و قوتابییان و بازرگانان و جووتیار و خاوەن پیشە جۆراوجۆرەکانی دیکە، زۆر خەڵک دێنە لای "..

هەروەکو عەزامی باسی لێوە دەکات، مامەڵەکردنیشی لەگەڵ قوتابییان و موریدەکانی خۆش بووە.

**کۆچی دوایی**

دانەری کتێبەکان کە باسیان لە ژیاننامەی شێخ محەمەدئەمین هەولێری کردووە لەسەر ئەوە کۆکن، کە لە شەوی یەکشەممە دوانزەی رەبیعی یەکەم لە ساڵی (١٣٣٢ک) لە میسر کۆچی دوایی کردووە، کە ئەوەیان دروستە. بەڵام خاوەنی کتێبی (الإلكيل في محاسن أربيل) دەڵێت هەولێری لە ساڵی (١٣٤٨ک) کۆچی دوایی کردووە.

عەزامی دەربارەی کۆچی دوایی هەولێری دەڵێت: پاش ئەوەی تووشی گرانەتا دەبێت، سات بەسات کاری تێ دەکات تا گیانی دەسپێرێت. خەڵک پۆل پۆل کۆبوونەوە و ئامادەی رێورەسمی ناشتنی بوون، ئەوە بوو خوالێخۆشبوو لە نزیک مەزاری هەردوو ئیمام (جەلال مەحەلی و تاج سەبکی) لە (قەزافە مجاورین) بەخاک سپێردرا.

**مەزهەب**

١- سەبارەت بەمەزهەبەکەی لە میانەی ئەو کتێبانەی لەبارەی فیقە و شەرع دایناون دیار نییە لەسەر چ مەزهەبێک بووە، چونکە زۆر بابەتی فیقهی لەسەر هەر چوار مەزهەبەکان نووسیوە. بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە یەکێ لە نازناوەکانی شافیعی بووە، کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ مەزهەبی ئیمامی شافیعی. بەمەوە دەشێ بڵێین هەولێری لە فیقهدا مەزهەبی شافیعی بووە.

٢- رێبازی لە سۆفیگەرێتی

هەولێری لە تافی لاویەتیدا لەسەر رێبازی (قادری) بووە. هەروەک باوکیشی لەسەر هەمان رێباز بووە. بەڵام دوای ئەوەی سەردانی (بیارە)ی کردووە، چووەتە سەر رێبازی (نەقشبەندی) لەسەر دەستی شێخ عومەر زیائودین. سەبارەت بەو کتێبانەی لەسەر رێبازی نەقشبەندی دایناون زۆرن. لەوانە: (الاجابة الربانية) کە بریتییە لە چەند نزا و پاڕانەوەیەک لەسەر رێبازی نەقشبەندی. هەروەها (تنوير القلوب) بەشی سێیەمی ئەو کتێبە بەدرێژی باس لە سۆفیگەرێتی لەسەر رێبازی نەقشبەندی دەکات.

**بەرهەمەکانی**

هەولێری لە پاڵ سەرقاڵبوونی بەوانە وتنەوە و بڵاوکردنەوەی ئایین و ئیرشاد و رێنماییکردن، خامەیەکی رەنگینی هەبووە کەڵا بەرهەمی بەنرخی ماوەتەوە.

ناوی کتێبەکانی لە زۆر لە سەرچاوەکان هاتووە کە باس لە ژیاننامەی هەولێری دەکەن. لەوانە:

١- الاجابة الربانية: لە میسر لە ساڵی ١٣٢٧ک چاپ کراوە.

٢- ارشاد المحتاج الى حقوق الزواج: فیقهە لەسەر مەزهەبی پێشەوا مالیک. لە میسر لە ساڵی ١٣٣٢ک چاپ کراوە.

٣- تنوير القلوب في معاملة علام الغيوب: لەسەر باوەڕ و فیقە و عیرفان. لە میسر لە ساڵی ١٣٢٢ک چاپی یەکەمی کراوە.

٤- خلاصة التصانيف لابي حامد الغزالي: هەولێری لە زمانی عەرەبی وەریگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی، عیرفانی و لە میسر لە چاپخانەی سەعادە لە ساڵی ١٣٢٧ک چاپ کراوە.

٥- ديوان خطب لنصيحة البرية في الخطب المتبرية: ئامۆژگارین لە ساڵی ١٣٣٠ک لە میسر چاپ کراوە.

٦- سعادة المبتدئين في علم الدين: باوەڕ و فیقە لەسەر مەزهەبی شافیعی. سۆفیگەرێتی لە خۆ دەگرێت لە ساڵی ١٣٣٠ک لە چاپخانەی سەعادەت لە میسر چاپ کراوە.

٧- ضوء الراج في فضل رجب وقصه معراج: سۆفیگەرێتییە لە چاپخانەی سەعادەت لە میسر لە ساڵی ١٣٢٧ک چاپکراوە.

٨- العهود الوثيقة في التمسك بالشريعة والحقيقة: باوەڕە فیقە و عیرفانی. لە ساڵی ١٣٢٠ک لە میسر چاپ کراوە.

٩- فتح المسالك من ايضاح المناسك: فیقە لەسەر هەر چوار مەزهەب. عیرفانی.. لە میسر لە ساڵی ١٣٢٤ک چاپ کراوە.

١٠- مرشد العوام لاحكام الصيام: فیقە لەسەر هەر چوار مەزهەب، لە میسر لە ساڵی ١٣٣٢ک چاپ کراوە.

١١- هداية الطالبين لاحكام الدين: فیقە لەسەر مەزهەبی پێشەوا مالیک. لە چاپخانەی سەعادەت لە ساڵی ١٣٣٠ک لە میسر چاپ کراوە.

# شێخ عەبدولسەلام بارزانی

د. عەبدوڵلا عەلیاوەیی*

بنەماڵەی شێخ عەبدولسەلام بارزانی پایەی ئایینی دیاری خۆیان هەبوو. ناوی ئەم بنەماڵەیە لە ناوی ئەو گوندەوە هاتووە کە تێیدا ژیاون، واتە گوندی بارزان[1] کە کەوتۆتە نێوان رواندز لە رۆژهەلاتدا و ئامێدی لە رۆژئاوادا و نێوان زێی گەورە لە باشووردا و سنووری تورکیا لە باکووردا[2]. شێخ عەبدولسەلام پاش کۆچی دوایی، شێخ محەممەدی باوکی، لە ساڵی ١٩٠٣دا سەرۆکایەتیی بنەماڵەکەی لە ئەستۆ گرت و لە ناوچەی بادیناندا نفوزێکی زۆری پەیدا کرد. سدیق دەمەللوجی[3] کە کاتی خۆی چاوی بە شێخ عەبدولسەلام کەوتبوو، وتوویەتی (کابرایەکی بیرتیژە. تەنها کەموکوڕی ئەوەیە کە خوێندەوار نییە و لای من باسی ئەوەی دەکرد کە زۆر پێی ناخۆشە لە زانست بێبەش بوود، لە کاتێکدا باوک و باپیری زانا و خوێندەوار بوون).

شێخ لەو ناوچەی کە هەڵی دەسووڕاند زۆر ریفۆرمی دەکرد، لەوانە دابەشکردنی زەویوزار بەسەر جووتیارەکاندا، رێکخستنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و نەهێشتنی پارەی مارەیی و بەزۆر بە شوودانی کچ. لە هەر گوندێکیش کە



لایەنگرەکانی هەبوو، مزگەوتێکی دروست کرد و ئەنجوومەنێکیش بۆ مشورخواردنی کاروباری گوندەکە و لە هەر عەشیرەتێکیش هێزێکی چەکداری پێک هێنا[4]. شێخ پێی وا بوو نەزانی، یەکێکە لە هۆیە گرنگەکانی بەجێمانی کورد، لەبەرئەوە بایەخی بەکردنەوەی خوێندنگە دا[5]. بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی تەعاون و تەرەقی کورد و کۆمەڵەی هێڤی لە یەکەم دەیەی سەدەی بیستەمەوە دەگەیشتنە ناوچەی بارزان. شێخ هاوسۆزیی کۆمەڵە کوردییەکان و پشتیوانیی پرۆگرامەکانیان بوو[6]. بەمجۆرە بزووتنەوە بارزانییەکان رەهەندێکی نەتەوەییان وەرگرت و ئەم رووخسارەش دەچێتە سەر ساڵانی پێش کودەتای ساڵی ١٩٠٨و لەم رووەوە شێخ عەبدولسەلام و چەند رابەرێکی تر لە ساڵی ١٩٠٧دا گەشتێکیان بەناوچەی بادیناندا کرد[7] و روویان کردە تەکیەی شێخ نوور محەممەد بریفکانی رابەری تەکیەی قادری لە گوندی بریفکانی سەر بەدهۆک، لەوێ کۆبوونەوەیەکیان بۆ هەڵبژاردنی سەرۆکێک بۆ گرووپەکەیان گرێ دا تاکو لە گفتوگۆکاندا لەگەڵ فەرمانگە حکوومییەکاندا نوێنەرایەتییان بکا و بەناوی خێڵەکانەوە قسە بکات، لەم سەروبەندەشدا شێخ نوور محەممەدییان هەڵبژارد، بەڵام ئەو لەبەر خراپیی باری تەندروستی داوای لێبووردنی کرد کە کاردکەی پێ ئەنجام نادرێ و پێشنیاری کرد شێخ عەبدولسەلام ئەم ئەرکە بگرێتە ئەستۆ، لەو کۆبوونەوەیەدا ئامادەبووان یاداشتێکیان بۆ حکوومەتی عوسمانی بەرز کردەوە و چەند کۆپییەکیان لێ نارد بۆ ئەنجوومەنی پیران و مەبعوسان و شێخ عەبدولقادر نەهری و جەنەراڵ شەریف پاشا و ئەمین عالی بەدرخان[8].

یاداشتەکە ئەم داوایانەی لە خۆ گرتبوو:

یەکەم: زمانی کوردی رەسمی بێ لە ناوچەی بادیناندا.

دووەم: خوێندن بە زمانی کوردی بێ لە خوێندنگاکاندا.

سێیەم: کاربەدەستە گەورەکانی قائیمقامەکان و بەڕێوەبەرەکانی ناحییەکان لەو کەسانە بن کە زمانی کوردی دەزانن تاکو راستەوخۆ لە دانیشتوانە خۆماڵییەکان بگەن.

چوارەم: ئەحکام بەپێی شەریعەتی ئیسلام بێ.

پێنجەم: قازییەکانی ناوچەکە لە مەزهەبی شافیعی بن.

شەشەم: باج بەپێی شەریعەتی ئیسلام لە دانیشتوان وەربگیرێ.

حەوتەم: باجی بەدەلی خزمەتی سوپایی وەکو خۆی بمێنێتەوە بەمەرجێک پارەکە بۆ چاککردنی رێوبانی ناوچەکە تەرخان بکرێ[9].

ئەم دیکۆمێنتە بە دیکۆمێنتێکی ریفۆرمخواز دەژمێردرێ، کە داخوازییەکانی ناوچەیەکی دیایکراوی کوردستانی لەخۆ گرتووە و بایەخێکی مێژوویی تایبەتی هەیە، بەو مانایە دێ، کە کورد بەتایبەتی پاش کودەتای ساڵی ١٩٠٨ دەستیان بەباسکردنی داخوازییە نەتەوەییەکانی خۆیان کرد و لەم رووەشەوە زۆر هۆشیار بوون و زۆر درکیان بەو زوڵم و زۆرە کردبوو، کە لە سەردەمی حوکمڕانی عەبدولحەمیددا دووچاری بووبوون.

جگە لەوە دیکۆمێنتەکە کە بانگەوازێکی ئاشتییانە بوو بۆ ریفۆرم، بەڵام حکوومەتی ئیتیحادییەکان تەنها بەوە دانەکەوت کە وەڵامی یاداشتەکە نەداتەوە، بەڵکو بە هەنگاوێکی مەترسیداریشی دایە قەڵەم رووە و سەربەخۆیی، بۆیە هەر لە سەرەتاوە بڕیاری دا سنوورێک بۆ جموجۆڵەکانی شێخ عەبدولسەلام دابنێ، والی مووسڵ محەمەد فازڵ داغستانی هێزێکی پشت بەستوو بە تۆپخانەی بۆ گرتنی شێخ عەبدولسەلام نارد و باری نائاساییشی راگەیاند[10]. ئەو هێزەش پێشوەخت بۆ سەرکوتکردنی جموجۆڵەکانی خێلی هەمەوەند ئامادە کرابوو، بەڵام ئەمجارە بۆ دژایەتیکردنی شێخ عەبدولسەلام سوودی لێ وەرگیرا[11]. سوپا لە رەوتی ئۆپەراسیۆنەکیدا چەندەها گوندی وێران کرد، لەوانە گوندی بارزان و لە ئاکامدا شێخ کشایەوە و داوای وتووێژی کرد، بەڵام داغستانی داواکەی رەت کردەوە و پاش ماوەیەک شێخ عەبدولسەلام گەڕایەوە و هێرشی سەختی کردە سەر ئەو هێزەی لە بارزان مۆڵ درابوو و زیانێکی کاریگەری پێ گەیاند[12]. دواتر هێرشی کردە سەر ئۆردوگای ئاکرێ و لەو کاتەدا نازم پاشا کرایە والی بەغدا، ئەویش سیاسەتێکی نەرمی لەگەڵ کورددا پیادە کرد و لێبووردنی بۆ شێخ عەبدولسەلام دەرکرد و بڕی هەزار لیرەی وەک قەرەبووی زیان پێ دا. پاشان شێخ عەبدولسەلام لە بارزان نیشتەجێ بووەوە و پاش ئەوەی ئەسعەد پاشا بووە والی مووسڵ بەوەکالەت لە ٢٤ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٢دا، پێشنیاری بۆ حکوومەتی عوسمانی کرد، کە مەدالیای پلەی سێی جۆری مەجیدی پێشکەش بەشێخ بکرێت، حکوومەتیش رەزامەندیی نیشان دا[13]. بەڵام کاتێک سلێمان نەزیف کرایە والی مووسڵ، دژی پێشکەشکردنی مەدالیاکە بەشێخ وەستا[14]. لێرەدا بەدواوە پەیوەندیی نێوان والی تازە و شێخ گرژییەکی زۆری بەخۆوە بینی، بەتایبەتی پاش کوژرانی وەزیری جەنگ نازم پاشا و گەڕانەوەی ئیتحادییەکان بۆ سەر دەسەڵات، پاش لابردنی گرووپی پارتی ئازادی و ئیئتیلاف. لەم رووەوە سەفوەت بەگ بەوە گوناهبار کرا کە سەدری ئەعزەم محەمەد شەوکەتی کوشتووە، لەم سەروبەندەشدا سەفوەت هانای بۆ شێخ عەبدولسەلام برد و شێخیش داڵدەی دا. کاتێک سلێمان نەزیف داوای سەفوەتی کرد، شێخ رازی نەبوو بیداتەوە، چونکە نەریتی خێڵەکی رێ بە دانەوەی لێقەوماوان نادا[15]. ئیدی هەر لەو کاتەدا حکوومەت بەرێژەی ٢٥٪ باجی زیاد کرد و رای گەیاند کە نیازیەتی رووپێوییەکی گوندەکانی ناوچەکانی بارزان بکا و ئامارێک سەبارەت بە گا و گۆتاڵەکانی ئامادە بکات[16].

لە ناوەڕاستی ئازاری ساڵی ١٩١٤دا عوسمانییەکان سوپایان بۆ ناوچەکانی شێخ لە رواندوز، ئاکرێ و ئامێدی نارد[17]، ئیدی شێخ خۆی لە بەردەم ئەو هێزە گەورەیەدا رانەگرت و پەنای بۆ ئێران برد، لە گوندی راژانی نزیک ورمێ بووە میوانی سەید تەها نەهری[18].

لەوێ ئیسماعیل ئاغای شکاکی، ناسراو بەسمکۆی ناسی. لەم سەروبەندەدا حکوومەتی عوسمانی پاداشتی بۆ ئەو کەسە دانا

**کە شێخ عەبدولسەلام بە زیندوویی یان مردوویی دەگرێ. شێخ لە ئێرانەوە پەیوەندیی بە رووسەوە کرد و پێ دەچێ ئەو پەیوەندییە بە نهێنی بووبێ، بەڵام پەیوەندییەکە هیچی لێ سەوز نەبوو[١٩].**

**جێی سەرنجە کە کورد بە درێژایی مێژوو بە دەگمەن خێری لە رووسەکان دیوە، چونکە کورد زۆرجار پەیوەندیی پێوە کردوون و داوای کۆمەک و یارمەتیی لێ کردوون، کەچی هەڵوێستی رووسەکان سەرەڕای ململانێی رووسیا - دەوڵەتی عوسمانی هەموو جار نێگەتیڤانە بووە.**

**کاتێک شێخ عەبدولسەلام لە سەردانی سمکۆ گەڕایەوە، سۆفی عەبدوڵڵا تکای لێ کرد لای بمێنێتەوە، شێخیش رازی بوو و پاشان سۆفی خیانەتی لێ کرد و بۆ وەرگرتنی پاداشتەکە تەسلیم بەکاربەدەستانی عوسمانی کرد[٢٠]. لەم سەروبەندەدا شێخ ئامادەیی خۆی دەربڕی، کە چی تر گرفت بۆ دەوڵەتی عوسمانی نەنێتەوە و هەزار ئێستر بە بارەوە بدا بە دەوڵەت، بەڵام سلێمان نەزیف ئەمەی رەت کردەوە و داوای لە پیاوەکانی کرد تەقە لە شێخ بکەن، گوایە لایەنگرانی شێخ گێچەڵیان ناوەتەوە و هاتوون ئازادی بکەن، ئیدی بەمجۆرە سلێمان نەزیف بەبێ ئەوەی رەزامەندیی کاربەدەستانی باڵای ئیستانبولیشی پێ بگات، شێخ عەبدولسەلامی شەهید کرد[٢١].**

**ئەو بزووتنەوەیەی کە شێخ عەبدولسەلام رابەرایەتیی کرد، بەڵگەی پەیدابوونی ئاستێکی بەرێژە دیاریکراوی هۆشیاریی کوردایەتییە و ئاماژە بۆ پەرەسەندنی ئەو هۆشیارییە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا دەکات.**

**پەراوێزەکان:**

١- البارزاني، مسعود البارزاني والحركة التحررية الكردية،ج١، ١٩٨٦ ص١٦/ هۆزەکانی کورد، بەشی دووەم، وەرگێڕان و ئامادەکردن حوسێن جاف، بەغدا، ١٩٩٢، ل٣٤.
٢- البارزاني، مسعود، المصدر السابق، ص١٧/ مصطفى حسن، البارزانيون وحركة بارزان ١٩٣٢ - ١٩٤٧، بيروت، ١٩٦٣، ص٢٠.
٣- الدملوجي، صديق، امارة بهدينان، ص٩٠.
٤- البارزاني، مسعود، نفس المصدر، ص١٨.
٥-البارزاني، عبدالمصور، حماية الأكراد، ص٩٠.
٦- الدملوجي، صديق، امارة بهدينان، ص٩٥ / الضابط، شاكر، تاريخ الصداقة بين العراق وتركيا، ص٩٢.
٧- البارزاني، مسعود، نفس المصدر، ص١٩.
٨- زیاتر بیر بۆ ئەوە دەچێ کە ئەم یاداشتە پاش کودەتای ساڵی ١٩٠٨ نووسرابێ نەک لە ساڵی ١٩٠٧دا، چونکە یاداشتەکە ناوی ئەنجوومەنی پیران و مەبعوسانی تێدا هاتووە، ئەم دوو ئەنجوومەنەش لە ساڵی ١٩٠٧دا لە ئارادا نەبوون.
٩- الدملوجي، صديق، امارة بهدينان، هامش ص٩٦/ البارزاني، مسعود، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج١، ص١٩/ پێ رەش، بارزان، ص٩٩/ احمد، ابراهيم، ولاية الموصل، ص٩٦/ عبدالمصور، حماية الأكراد، ص٩.
١٠- الدملوجي، صديق، المصدر السابق، ص٩٧.
١١- العراق في الوثائق البريطانية، ص٧١.
١٢- رۆژنامەی (صدى بابل) ژمارەی رۆژی ١٠/٩/١٩٠٩. وەرگیراوە لە: احمد، ابراهيم، ولاية الموصل، ص٩٩.
١٣- الدملوجي، صديق، امارة بهدينان، ص٩٨/ احمد، ابراهيم، ولاية الموصل، ص١٠٠.
١٤- الدملوجي، صديق، المصدر السابق، ص٩٨. لێرەدا دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە سلێمان نەزیف کوردی دیاربەکر بوو دایکیشی ئیزدی بوو، کەچی یەکێ بوو لە توندڕەوترین لایەنگرانی بیروباوەڕی تۆرانی. لەو رووەوە بچووە بۆ سەر: الدملوجي، صديق، امارة بهدينان، ص٩٨-٩٩/ هەروەها: الغلامي، عبدالمنعم، الضحايا الثلاث، ص٣٩.
١٥- الغلامي، المصدر السابق، ص٤٣.
١٦- هەمان سەرچاوە، ل١٠٠.
١٧- البارزاني، عبدالمصور، حماية الأكراد، ص٩.
١٨- الغلامي، الضحايا الثلاث، ص٤٥/ البارزاني، مسعود، البارزاني والحركة التحررية، ج١، ص٢٠ - ٢١.
١٩- بۆ زانیاریی پتر دەربارەی پەیوەندییەکانی شێخ لەگەڵ رووسدا، بڕوانە: جیاووک، مەعروف، مأساة بارزان المظلومة، بغداد، ١٩٥٤، ص٥٥/ البارزاني، مسعود، البارزاني والحركة التحررية، ج١، ص٢٠/ پێ رەش، بارزان، ص١٣٦/ لازاریف، کێشە، ل٣٧٩.
٢٠- بۆ زانیاریی پتر، بڕوانە: الغلامي، الضحايا الثلاث، ص٤٧، البارزاني، مسعود، المصدر السابق، ص٢١/ پێ رەش، بارزان، ص١٣٨.
٢١- بۆ زانیاریی زیاتر، بڕوانە: الغلامي، الضحايا الثلاث، ص٤٩، الدملوجي، صديق، امارة بهدينان، ص١٠٢/ البارزاني، مسعود، المصدر السابق، ص٢١.

* ئەندامی پەرلەمانی عێراق

# حەماغای غەفووری
# ١٨٣٩-١٩٢٠

کەریم شارەزا



پیاوی خێرومەند و ئانبدە لە رۆژانی گرانی و برسییەتی و یەکەمین حاکمی ئیداری شاری کۆیە و ناوچەکەی و خانی دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵی ١٩١٨دا، حەماغای کوڕی مەحموداغای کوڕی حەمەد ئاغای غەفووری، ناسراو بە (حەماغای کۆیە) لە ساڵی ١٨٣٩ی زاینی لە شارەکەی کۆیە لەدایک بووە. هاوتەمەن و هاونشینی ئەمین ئاغای حەوێزی ئەدیب و هونەرپەروەری ناسراو بە (ئەختەر) بووە. ئەو دوو کەسایەتییە خێرخوازترین کەس بوون لە دەڤەری کۆیە، بۆیە حاجی قادری کۆیی لە هۆنراوەیەکیدا ناوی ئەو دوو زاتەی بەچاکی هێناون و گوتوویەتی:

**دوو ئاغا ماون وەک بیستوومە ئەخبار**
**ئەمیناغا و حەماغای ساحیبی کار**
**ئەمین و پشتیوانی قەسری میللەت،**
**نیگەهبانی خەزینەی دین و دەوڵەت!**

حەماغا پتر بە بەخشندەیی و ئانبدەیی ناوبانگی دەرکردبوو، بۆیە حاجی قادر لە شوێنێکی دیکەی شیعرەکەی دەگەڕێتەوە سەری و لەو بەخشندەیی و ئانبدەییەی دەدوێ و دەڵێ:

**کەسێ پیاوە کە دانێ وەک حەماغا**
**لە بۆ ئەهنایی جنسی نان و خوانی!**

گەورەیی حەماغا و دەوری خزمەتگوزاری لە ناوچەی کۆیەدا، هەر لەوەدا نەبووە کە، حاکمی ئیداریی کۆیە بوو لە سەردەمێکی ناسکی مێژووی کوردستاندا، کە بۆشاییەکی سیاسی لە ناوچەکە پەیدا ببوو، ئەم پڕی کردبۆوە. بەڵکو گەورەییەکەی لەو ئانبدەییەی بوو، کە لە گرانییەکەی پاییزی ١٩١٧ تا بەهاری ١٩١٨ دای بەهەژار و برسییان و لە مردنی رزگارکردن، بۆیە کە ئینگلیزەکان لە رۆژی ١٥/١٢/١٩١٨دا گەیشتنە کۆیە و سەرکردەکەیان کاپتن (های) بوو، پێش هەموو شتێک حەماغایان کردە حاکمی شار و جەمیل ئاغای حەوێزی بەجێگری و مەلای گەورەش بەقازی شەرع لە شار و ناوچەکەیدا، ئەو سێ کەسە توانییان باری ناوچەکە سەقامگیر بکەن و نەیەڵن هیچ پشێوییەک بکەوێتە ناو خەڵکەکەوە. ئەم پیاوە گەورە خێرومەند و ئانبدە و پیاوی ئاشتەوایی و ئیداری لە شەوی ٢ لەسەر ٣ی مانگی ئابی ١٩٢٠دا کۆچی دوایی کرد و جەمیل ئاغای حەوێزی جێگری لە جێی ئەو کرا بەحاکمی شار.

حەماغا تەنیا یەک کوڕی لە پاش بەجێما ئەویش کاکە زیاداغای تاقانەی بوو لە ساڵی ١٩١٤دا لەدایک بووە و بووەتە کەسایەتییەکی نیشتمانپەروەر و لە ناو بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد جێگای دیار بووە. ئەویش دوای ژیانێکی پڕ خۆشی و ناخۆشی لە رۆژی ١٢ی نیسانی ١٩٩١دا کۆچی دوایی کرد.

# حەسەنە شەل
# ١٨٨٣ - ١٩٢١

جەلال خدر

لە شاری هەولێر کۆنە هەوار و مەنزلگەی زێدی باب و باپیراندا رووداو و بەسەرهات گەلێک زۆرن پیاو نازانێ لە کوێوە دەست پێ بکات و باسی چی بکات.

لە سەرەتای سالانی شێستەکاندا بەبیرم دێ منداڵ بووم ماڵمان لە گەڕەکی (سەعدووناوە) و کۆلانی کوورەچییان بوو، خانووەکی ترمان هەبوو ئەویش لە گەڕەکی سەیداوە بوو، باوکم بە کرێی نەدەدا، هەموو رۆژێک خەڵک دەهاتن دەرگایان پێ دەگرت. ئەو کاتەی پێیان دەگوت (قاپی باغلەمە). خانووەکە پیرەژنێک بە خۆڕایی تیایدا دادەنیشت کە ناوی (پلە گوڵێ) بوو، ئەو ئافرەتە دایکی (مام حاجی جەمیلی چاوەش) بوو، کە دۆستی نزیکی باوکم بوو، لە وێستگەی شەمەندەفەری هەولێر بەیەکەوە کاریان دەکرد. هەموو رۆژێک ئەو ئافرەتە هاتوچۆی ماڵمانی دەکرد و زۆر جاریش بۆ ماوەی چەند رۆژێک لامان دەمایەوە. ئەو کاتەی کە من باسی دەکەم تەمەنی ئەو پیرەژنە لە هەشتا ساڵ رەتی دابوو. باوکم دەیگوت لە ساڵی گرانی گەورە خاوەن ماڵ و منداڵ بووە. شەڕەکانی دەوڵەتی عوسمانی و داگیرکردنی ئینگلیزی بۆ شاری هەولێری باش لەبیر بوو. ئەو ئافرەتە دنیا دیتە بوو، گەلێک تاڵ و سوێری ژیانی چێشتبوو. برسییەتی و نەبوونی زۆر دیبوو، باسی ئەوەی دەکرد چۆن جەندرمەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە برسان بەناو شار و گوندەکانی ئەم کوردستانەدا دەگەڕان و ئەوەی بە دەستیان بکەوتایە تالانیان دەکرد. لە ئەنجامدا خەڵکێکی بێ گوناحی ئەو شارەیان زیندەبەچاڵ کرد، خەڵک لە برسان گۆشتی گوێدرێژ و هێستر و پشیلەیان دەخوارد. نەخۆشیش لە ناو خەڵک بلاو بووبووەوە و داوودەرمانیش نەبوو. ئەمە لەلایەک و لەلایەکی تریشەوە رەشبگیر دەگەڕا، گەنجی ئەو ولاتەیان رەوانەی ناو ئاگری شەڕی سەفەر بەلگ دەکرد. ئەوەی بچووبایە گەڕانەوەی نەبوو.

پلکە گوڵێ حیکایەت و شەوچەرەی خۆشی بۆمان دەگێڕایەوە، وەک بەسەرهاتی حەزرەتی یوسف و زولەیخا و شەڕی ئەسحابان و ئەحمەد پاڵەوان و شەڕی حەوت برا و دێو و درنج و حەسەنە شەل و شتی تر، ئەو کاتەش منداڵ بووین، نەماندەزانی وەک پێویست ئەم بەسەرهات و رووداوانە بۆ رۆژگارێکی وەک ئەمڕۆ بنووسینەوە.

لەو نووسینەماندا پێمان خۆش بوو بەسەرهاتی چەند کەسانێکی خەڵکی ئەو شارەتان بۆ باس بکەین کە سەرەتای سالانی بیستەکانی سەدەی پێشوو لەسێدارە دراون، ئەویش بەسەرهاتی (مام حەسەنە شەل) و (سلێمان کلاودروو) و جەماعەتەکەی بوون، کە لەسەر دەستی حاکمی ئینگلیزی ئەو کاتە پەتی قەنارەیان بۆ ساز دراوە بەبێ ئەوەی خەڵکی ئەو شارە بەرگرییان لێ بکات.

### ژیاننامەی حەسەنە شەل

ناوی تەواوی "حەسەنی کوڕی مام ئەحمەدە" لە

دەوروبەری ساڵی (١٨٨٣) لە دەشتی قەراج و کەندیناوە لە بنەماڵەیەکی هەژار و دەستکورت چاوی بە دنیا رووناک کردووەتەوە. ئەو کاتەی ماڵیان لە گوندی (کەنداره قەل) بووە، ناکۆکی پەیدا دەبێت لە نێوان باوکی مام حەسەن لەگەڵ خزمەکانی لەسەر زەویوزار و میرات. ئاغای ئەو کاتی پشتگیری لە دوژمنەکانی باوکی مام حەسەن دەکات، ئەویش ناچار دەبێ ئەو گوندە بەجێ بهێڵێ و روو لە شاری هەولێر بکات و دەچێتە ماڵی عەلی پاشای دۆغرەمەچی و دەبێتە سەرکار و لە گەرەکی تەعجیلی جوولەکان لە کۆنە خانووەک نیشتەجێ دەبێ لە پاشان باوکی مام حەسەن بە نەخۆشیی رشانەوە لە ساڵی (١٩١٢) کۆچی دوایی دەکات و مام حەسەن جێگای دەگرێتەوە.

لە ساڵی (١٩١٤) کاتێک جەنگی یەکەمی جیهانی دەست پێ دەکات، کۆمەڵێ گەنجی ئەو شارە دەستگیر دەکرێن، یەکێک لەوانە مام حەسەن بوو. خەبەر دەگاتە عەلی پاشا، ئەویش هەوڵی بۆ دەدات و پاش بەرتیلدانێکی زۆر لەو رۆژگارە رەشە رزگاری دەکات و لەلای خۆی گلی دەداتەوە.

چاکە و پیاوەتیی عەلی پاشا لە چاوی مام حەسەن دەمێنێ و لە بیری ناکات و بۆ ماوەی چوار ساڵ لە ماڵی عەلی پاشا لە قەڵاتی هەولێر دەمێنێتەوە.

عەلی پاشا پیاوێکی زەنگین و چاوتێر و دەسترۆیشتووی ئەو شارە بووە، لە سەردەمی حکوومەتی مەلەکیشدا بۆ ماوەیەکی زۆر (نائیب)ی هەولێر بووە لە پەرلەمانی عێراق، لە هەمان کاتیشدا مەرومالاتێکی یەکجار زۆری هەبووە، کاتێ جەندرمەکانی عوسمانی هێرشیان کردووەتە سەر خەڵکی بێگوناحی ئەو شارە ئەوی بە دەستیان بکەوتبایە لە خواردن و ئازووقە بەتاڵانیان دەبرد، بۆ ئەوەی چی تر غەدر لەو خەڵکە لێقەوماوە نەکرێت، عەلی پاشا بریاری دا، بۆ ماوەیەکی زۆر ئازووقە و خواردەمەنی بۆ سەربازەکان دابین بکات بۆ ئەوەی چی تر ئەو خەڵکە لە برسان نەمرن.

لە ساڵی (١٩١٨) کاتێ جەنگی یەکەمی جیهانی کۆتایی پێ هات دەوڵەتی عوسمانی دەرووخێ و پاشەکشەی لێ دەکات، ئینگلیز دەست بەسەر وڵاتدا دەگرێ، بەشێکی کەم لە خەڵکی ئەو شارە، هەندێکیان رقیان لە ئینگلیز دەبووەوە و پشتگیریی دەوڵەتی عوسمانییان دەکرد، بەشێکی زۆریش پشتگیریی ئینگلیزیان دەکرد، چونکە لە دوای هاتنی ئەوان دنیا بەرەو خۆشی رۆیشت و شەڕوشۆڕ و گرانی گەورە نەما.

مام حەسەن یەکێک بووە لەو کەسانەی زۆر رقی لە ئینگلیزی داگیرکەر دەبووەوە و لە دیوەخانی عەلی پاشا هەر باس لە خراپەکاری سەربازی ئینگلیزەکان بوو، لە بەرانبەر خەڵکی ئەو شارە. عەلی پاشاش لەبەرئەوەی پیاوی تورک بوو هانی خەڵکی دەدا بۆ ئەوەی زەردر و زیانیان پێ بگەیەنن، بۆ ئەو مەبەستە کۆمەڵێک پیاوی ئازا و چاونەترسی لە دەوری خۆی کۆ کردبووەوە. رۆژێکیان بە دوای (حوسێن حەتکی زێد بەگی) ناسراو بە (عارەب ئاغای کۆزە پانکەیی) (١٨٨٠ - ١٩٤٩)دا دەنێرێ بۆ ئەوەی پیلانێک دژی ئینگلیزی داگیرکەر دابنێ، چونکە ئەو پیاوە چاونەترسە لە ساڵی (١٩١٨) لەگەڵ عەلی کۆرەی کوری خاڵی لە دەشتی قەراج و کەندێناوە بەرەنگاری سوپای ئینگلیز ببوونەوە و بۆ ماوەی چەند سەعاتێک نەیانهێشتووە سەربازەکانیان لە زوورگە زراو بپەرێننەوە بەری ئەو بەرە. لە ئەنجامی ئەو شەرەدا (عەلی کۆرە) دەستگیر دەکرێت و دەدرێتە دادگای عەسکەری و بۆ ماوەی حەوت ساڵ زیندانی دەکرێت و حوسێنیش رزگاری دەبێت بۆ ماوەیەک لە گوندی کۆزە پانکە لە ماڵی عەولا ئاغای دزەیی خۆی دەشارێتەوە، لە پاشان روو لە شاری سلێمانی دەکات، بۆ ئەوەی بەشداری لە شۆرشی شێخ مەحموودی نەمر بکات و بەشداری لە شەری دەربەندی بازیان دەکات و لە ساڵی (١٩٢٠) فەرمانی عەفو بە یارمەتیی مەلا فەندی (مەلای گچکە) بۆی دەردەچێت، بەمەرجێک چی تر چالاکی دژی ئینگلیز نەکات. ئینجا دەگەرێتەوە شاری هەولێر، با بگەرێینەوە سەر باسی خۆمان: وەک باسمان کرد مام حوسێن پیلانێکی رێکوپێک دادەرێژێ بۆ مام حەسەن و جەماعەتەکەی بەمەبەستی رووتکردنەوەی پۆستەی ئینگلیزەکان، کە لە شاری مووسڵ

بەرەو هەولێر دەهات، بەمەرجێک مام حوسێن بەشداری لەگەڵیان نەکات.

شەوێک لە شەوانی مانگی بەهار لە پشت ئۆردووگای رەشکێن بۆسەیەک دادەنێنەوە، کاتێک قافلەی ئینگلیزەکان لە مابەینی رەشکێن و چالووک لێیان نزیک دەبنەوە، مام حەسەن و جەماعەتەکەی دەسڕێژیان لێ دەکەن. لە ئەنجامدا چەند سەربازێکی هیندی، کە پاسەوانی قافلەکە بوون و پێیان دەگوترا (سیکە و گورگە) دەکوژرێن، مام حەسەن و جەماعەتەکەی پۆستە و قاسەی پارە بەتالان دەبەن، بۆ بەیانی دەبێتە هەڵلا لەو شارە.

باس هەر باسی ئەو تالانە دەبێت، حاکمی ئینگلیز تەنگاو دەبێ و فەرمان دەردەکات و سوپای ئینگلیز تەنگاو دەبێ و بەکۆڵان و گوندەکانی دەوروبەری ئەو شارە بلاوەی لێ دەکەن، لە ئەنجامدا خەڵکێکی یەکجار زۆر دەستگیر دەکرێت.

(مەحموود عارەب) ناوێک کە خەڵکی ئەو شارە بووە ئیعتیرافیان لەسەر دەکات، بەمەرجێک هیچی لێ نەکەن. حاکمی عەسکەریش بەڵێنی ئەوەی پێ دەدات.

لە ئەنجامدا مام حەسەن و جەماعەتەکەی دەستگیر دەکرێن و دەدرێنە دادگای عەسکەری و فەرمانی لەسێدارەدانیان بۆ دەردەچێت.

مام حەسەن لە ماوەی ژیانی تاوەکو مردنی تاقە کچێکی هەبووە، کە ناوی (خانێ) بووە. سەبارەت بە دەستگیرکردنی، خێزانەکەی بەم شێوەیە دەیلاوێنێتەوە.

**ئەستێرەک هەلات لە هەورەمانی**
**ماینی (حەسەنی) شینکەی قەزوانی**
**سەرزین خاسە رەنگ رکێب رۆمیانی**

***   *   ***

**عەسکەر راوەستابوون لە سەری مەیدانێ**
**حەسەنیان راکێشا لە دیوەخانێ**
**بە سەری کۆتی لۆ حەپسخانێ**

لە گۆڕەپانی بن قەلاتێ لە شوێنی نزیک باڵەخانەی کە (پاڕێزگای هەولێری ئێستای لەسەر دروست کراوە) ئەو کاتە چۆلەوانی بوو. قەنارەخانەیان بۆ ساز دەدرێ و جاڕ دەدرێ، لە شاری هەولێر، گەورە و بچووک و ژن و پیاو لەو شوێنە ئامادە دەبن. فرمێسکی خەم و خەفەت دەڕێژن بۆ مام حەسەن و جەماعەتەکەی. خێزانەکەی بە دەنگێکی بەرز هاوار دەکات و دەڵێ:

**چەندم گۆت حەسەن وا نیـیە وا مەکە**
**لە رێی رەشکێنی پۆستەی رووت مەکە**
**(خانێ) منداڵە بێ بابی مەکە**

ئەوە بوو لە رۆژی ٣ی مانگی نیسانی ساڵی ١٩٢١ مام حەسەن و سلێمان کلاودروو و جەماعەتەکەی لەسێدارە دەدرێن، بەبێ ئەوەی کەسێک لە خەڵکی ئەو شارە بەرگرییان لێ بکات. مام حەسەن ماڵئاوایی لە خزم و کەسوکاری دەکات، وەسیەتیشی هەر ئەوەندە بوو، کەوا کەسوکاری زۆر ئاگایان لە تاقە کچەکەی بێت، کە ئەو کاتە تەمەنی چوار ساڵان بووە.

مام نوورەددین خدر نەجاری هەولێری (١٩١٦ - ١٩٨٨)، کە یەکێک بووە لە هونەردۆستانی ئەو شارە و زانیارییەکی چاکی لەسەر ژیاننامەی هونەرمەندانی ئەو شارەدا هەبووە و یەکێک بوو لەو قوتابییانەی کە لەگەڵ هونەرمەندی خوالێخۆشبوو (حاجی فایقی محەمەد سولتانی بازرگان) و جەماعەتەکەی کە کاتێ مەلیک فەیسەلی یەکەم لە ساڵی (١٩٢٤) رووی لە هەولێر کردووە، ئەوانیش بەو دەنگە خۆشەیان سروودی نیشتمانییان لە بەرامبەر مەلیک فەیسەڵ خوێندووە. لە دانیشتنێکی تایبەتدا خدر نەجاری باوکی بۆی گێڕامەوە و گوتی:

ئەو رۆژەی کە مام حەسەن و جەماعەتەکەی لەسێدارە دەدران، خەڵکێکی زۆر لە گۆڕەپانی پێش قشلەی سواری، لە بن قەلاتێ راوەستا بوون و چاوەڕوانیان دەکرد کە مام حەسەن و جەماعەتەکەی بێن، ئەو کاتەش فەسڵی بەهار دەبێت و گژوگۆڵ و سەوزایی دنیای رازاندبووە، کۆمەڵێک گەنجی ئەو شارە بۆ سەیران و رابواردن چووبوونە باخی سەعید ئاغا، کە کەوتۆتە بەشی رۆژئاوای شاری هەولێر، نزیک مەعەسکەری ئێستا. ئاهەنگی بەزم و گۆرانی و

مەقامات و قۆریاتیان گەرم کردبوو، کاتێک خەبەریان دەدەنێ، کەوا مام حەسەن و جەماعەتەکەی لەسێدارە دەدرێن، ئەوانیش زەوقی خواردنەوەیان نامێنێ. کاتێک نزیک شار دەبنەوە، تەماشا دەکەن خەڵکی ئەو شارە بە ژن و پیاو و گەورە و بچووک چاوەڕوانی لەسێدارەدانی مام حەسەن و جەماعەتەکەی بوون. تنۆک تنۆک فرمێسک لە چاوی ئەو خەڵکە حازر بووە، دەهاتە خوارێ. کۆمەڵێکی زۆریش لە بەدەنی قەڵاتێ تەماشایان دەکرد. یەکێک لەو گەنجانە مەقامزان و دەنگخۆشی شاری هەولێر (شەهابەی هەولێری بووە) لە ناکاو بەو دەنگە خۆش و زوڵاڵەی خۆی بە زمانی تورکی بۆی هەڵدەستێ و دەڵێ:

**گەنە گالدی فسلی بهار**
**چوللاردە لالە واختد**
**گوز و کوراولسن (حسن)**
**بوگون قەنارە واختد**

مانای ئەم قۆریاتەش بەزمانی کوردی ئەوەیە:

**ئەوا هات کەژی بەهار**
**لە چۆڵی وەختی گوڵ و لالەیە**
**چاوت کوێرە بێ حەسەن**
**ئەورۆ وەختی قەنارەیە**

مام حەسەن و جەماعەتەکەی لە قەنارە دەدەن و لە دوای خۆیان ماڵ و منداڵ بەجێ دەهێڵن، بەمجۆرە ژیانی مام حەسەن و جەماعەتەکەی کۆتایی پێ هات.

ئەمە لەلایەک و لەلایەکی تریشەوە مامۆستای زێدە ئازیز دکتۆر (عەبدوڵڵا حەداد) خوا تەمەنی درێژ بکات، لە پەراوێزی کتێبی ((ژیاننامە و شیعرەکانی میهری))دا ١٩٠٣ - ١٩٤٢ لە لاپەڕە ٣٤ لەسەر زمانی (حاجی محەمەدی کوڕی مەلا ئەحمەدی) باوکی بەم شێوەیە باسی لەسێدارەدانی مام حەسەن و جەماعەتەکەی دەکات و دەڵێ:

(حەسەنە شەل) و هاوڕێکانی گەرچی بە رواڵەت خۆیان وا نیشان داوە کە دۆستی ئینگلیزن، بەڵام لە ژێرەوە دژیان بوون، گوایە سەر بە عەلی پاشای دۆغرەمەچی بوون. کاتێ لە نزیک چالووگ لە نێوان هەولێر و کەلەکی یاسین ئاغا هێرش دەبەنە سەر کاروانی ئینگلیز و قاسەکەیان بەتالان دەبەن، حەسەنە شەل و تاقمەکەی دەگیرێن. مەحموود عارەب ئیعتیرافیان لەسەر دەکات، ئیتر لەسێدارە دەدرێن بەبێ ئەوەی کەس بەرگرییان لێ بکات، ئەم رووداوە لە دەوروبەری ساڵانی (١٩٢٠ - ١٩٢١)دا رووی داوە. دکتۆر عەبدوڵڵا لەسەر قسەکانی بەردەوام دەبێ و دەڵێ:

ئەو زانیارییانەی کە لە پەراوێزی سەرەوەدا هاتووە لە بەهەشتی (حاجی محەمەدی مەلا ئەحمەدی حاجی مەلا هیدایەتی حاجی مەلا داوود زادەیی) باوکم ١٩٠٠/ ١٩٧٩ بیستووە. ئەو زۆر بەوردی رۆژ و ساڵەکانی دەستنیشان کرد، بەڵام بە داخەوە لەبەرئەوەی لە کاتی خۆیدا بە وردی تۆمارم نەکردبوو نەمتوانی بەو وردییەی رەحمەتی باوکم بیانگێڕمەوە.

سەرچاوەکان:

* ژیاننامە و شیعرەکانی میهری/ د. عەبدوڵڵا حەداد/ هەولێر/ ١٩٩٧.
* ژیاننامەی شەهابەی هەولێری/ جەلال خدر حوسێن/ هەولێر/ ٢٠٠٢.
* مەقامناس و دەنگخۆشەکانی شاری هەولێر/ جەلال خدر حوسێن، بەرگی یەکەم/ دەستنووس.
* پیرە هەولێر لە گەشتێکی سەرپێیدا/ جەلال خدر حوسێن/ دەستنووس/ چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەم بەڕێزانەی خوارەوە:

١- خوالێخۆشبوو مام نوورەدین خدر نەجار.
٢- خوالێخۆشبوو خدر حوسێنی باوکم/ (١٩٠٨ - ١٩٩١).
٣- خوالێخۆشبوو سەید قادر سەید محەمەدی سەید مەعرووفی باداوەیی/ (١٩٢٢ - ١٩٩٩).

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە ٧، ٢٠٠٥ بڵاو بۆتەوە.

# شێخ ئیبراهیم عاسم حەیدەری
# ١٨٦٤-١٩٣١

## کەریم شارەزا

زانای ئایینی کورد و شەیخولئیسلامی دەوڵەتی عوسمانی شێخ ئیبراهیم کوڕی عاسم کوڕی ئیبراهیم کوڕی (سبغەتوڵلا حەیدەری) و ناسراوە بە (شێخ ئیبراهیم حەیدەری) لە ساڵی١٨٦٤دا لە شاری هەولێر هاتۆتە دنیاوە، خوێندنی ئایینی و فیقهی لەسەر دەستی مەلا ناودارەکانی سەردەمی خۆی فێر بووە و ئیجازەی دەرس گوتنەوەی وەرگرتووە و کراوە بەقازیی زاخۆ و دوای دوو ساڵ چۆتە ئەستەمبوڵ و لە قوتابخانەی حقووق خوێندوویەتی و بڕوانامەی دەرچوونی وەرگرتووە و کراوە بەسەرۆکی دادگای بازرگانی لە شاری (جەددە)ی وڵاتی حیجاز و لە دواییدا کراوە بەداواکاری گشتی لە مووسڵ. ئینجا گەڕاوەتەوە ئەستەمبوڵی پایتەخت و کراوە بەئەندامی ئەنجومەنی باڵای زانیاری و گەلێک پایەی لەدادگای عوسمانی وەرگرتووە. تاکو لە ساڵی ١٨٩٨دا کراوە بەسەرۆکی لیژنەی (دارولخەیر). کە ئەنجومەنی زانیاری هەڵوەشایەوە لە ١٩٠٦دا کرا بەقازی دیاربەکر، ئینجا بەسەرۆکی کاروباری شەرعی لە بەڕێوەبەرایەتیی نووسینگەی خاقانی لە پایتەختی خیلافەت دامەزراوە. لەگەڵ دامەزراندنی (خانەی حیکمەی ئیسلامی) لە ساڵی ١٩١٥دا کراوە بە ئەندام لەو دەزگایەدا.

**ئیبراهیم حەیدەریی شەیخولئیسلام:**

لە دوای کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی و جاڕدانی ئاگربەست لە ١٩١٨/١١/١١دا لە سەدارەت (وەزارەت)ی ئەحمەد تۆفیق پاشا، بۆ یەکەم جار ئیبراهیم ئەفەندی حەیدەری کرا بە (شەیخولئیسلام)ی دەوڵەتی عوسمانی. ئەو پایەش لە ئاست پایەی سەرۆک وەزیران بوو. کە هەمان "سەدری ئەعزەم": "سەرۆک وەزیران"ە. بۆ جاری دووەم لە ١٣ی کانوونی دووەمی ١٩١٩دا وەزارەتی دامەزراندەوە، شێخ ئیبراهیم حەیدەری لە شەیخولئیسلامی هێشتەوە، بەڵام بەلادانی ئەو وەزارەتە لە حوکم شێخ ئیبراهیمیش لە پایەکەی لادرا تاکو (داماد فەرید پاشا) وەزارەتێکی پێک هێنا. ئینجا شێخ ئیبراهیم کرا بەفەرمانبەرێکی گەورە لە دەوڵەت، بەڵام کە ڕەزا پاشا لە ڕۆژی ١٩١٩/١٠/٢دا کرا بە (سەدری ئەعزەم) شێخ ئیبراهیمی کردەوە شەیخولئیسلام، کە لە ١٩٢٠/٣/٨یشدا سالح خلووسی پاشا وەزارەتی دامەزراند ئەویش شێخ ئیبراهیمی لە پایەکەی خۆی هێشتەوە.

**ئیبراهیم حەیدەری و حکوومەتی عێراق:**

کاتێک کە حکوومەتی عێراق لە ١٩٢١/٨/٢٣دا دامەزرا و مەلیک فەیسەلی کوڕی مەلیک حوسێنی حیجاز کرا بەمەلیکی عێراق، شێخ ئیبراهیم لە ساڵی ١٩٢٣دا گەڕایەوە بەغدا و لە ساڵی ١٩٢٤دا بەئەندامی ئەنجومەنی دامەزراندنی عێراق هەڵبژێردراو لە وەزارەتەکەی یاسین هاشیمی لە ٤ی ئابی ١٩٢٤ تاکو ١٩٢٥/٦/٢٠ وەزارەتی ئەوقافی پێ سپێردراو دوای ئەمە کرا بەئەندام لە ئەنجومەنی پیاوماقووڵان تاکو لە ڕۆژی ١٩٣١/١/١ لە شاری بەغدا کۆچی دوایی کرد و لەوێش نێژرا.

**شێخ ئیبراهیم حەقی حەیدەری نووسەر:**

شێخ ئیبراهیم نووسەرێکی لێهاتوو بوو بەزمانی عەرەبی و تورکی، کتێبی بەنرخی دانا و لە ئەدەبیاتدا نازناوی (حەقی) بەکار دەهێنا و لە کتێبە چاپکراوەکانی ئەم نووسەرە، کتێبی (تأريخ التصوف لدى العراق الأسلامية) کە کاتی خۆی لە ئەستەمبوڵ چاپ کراوە و هەندێ دەسنووسی لە بابەت فەلسەفەی ئیسلام و فەلسەفەی ئاینەکانی دیکە لە پاش بەجێ ماوە و چامەیەکی دوورودرێژی لەسەر لەدەستچوونی عێراق هەیە و کتێبێکی (لامارتینی فەرەنسی)شی بەشیعر کردووە بەتورکی.

# شێخ ئەسعەدی نەقشبەندی ئەربیلی
# (١٨٤٨-١٩٣١)

دکتۆر عەبدوڵڵا حەداد

**١- خانەوادەی شێخ ئەسعەد**

(شێخ ئەسعەد) کوڕی (شێخ محەمەد سەعید) کوڕی (شێخ هیدایەتوڵڵای) نەقشبەندی هەولێری کوڕی (عەبدولغەنی) هیندییە[١].

بەشی هەرە زۆری سەرچاوەکان لەسەر ئەوە کۆکن، لە ساڵی ١٢٦٤ھ (کە دەکاتە ١٨٤٨ز) لە شاری پیرۆزی هەولێر، لە ئامێزی خانەوادەیەکی ئایینپەروەر و سۆفی مەشرەب و خاوەن پلە و پایەدا چاوی بە ژیان هەڵهێناوە[٢].

شێخ هیدایەتوڵڵای باپیری شێخ ئەسعەد، ئیجازەی ئیرشاد و تەدریسی لە مەولانا خالید (ضیاء الدین) (١٧٧٧- ١٨٢٧ز) وەرگرتووە[٣].

مەولانا خالید لە دەوروبەری ساڵی (١٢٣٣ھ-١٨١٧ز) سەر لە شاری هەولێر دەدا، تەکیەی خانەقای نەقشبەندی (خالیدی) لە گەڕەکی خانەقا دەکاتەوە، شێخ هیدایەتوڵڵای دەکاتە خەلیفەی خۆی لە هەولێر[٤].

هاتنی مەولانا خالید بۆ هەولێر، ڕووداوێکی مێژووی واتادار بووە. خەڵکی هەولێر بە هەموو چین وتوێژەکانیانەوە، زۆر بەگەرمی و بەوپەڕی ڕێز و حورمەتەوە پێشوازیی لێی دەکەن و ئاهەنگێکی گەورە بەبۆنەی کردنەوەی مزگەوتی خانەقای نەقشی ساز دەکەن.. پاکی بەهرەمەند و دەنگخۆش و قورئان خوێن و دەفژەن و عەلەم هەڵگرەکان بەشداری لەو ئاهەنگەدا دەکەن. بەسەلوات و تەهلیلیە و تەسبیحات شاری هەولێر دەخرۆشێنن..

بەپێی هەندێ ژێدەر، شاعیری گەورەی کورد مە لا خدری شارەزوری (نالی) (١٨٠٠- ١٨٧٣ز) کە ئەوساکە لە مەدرەسەی حەیدەر یان لە (ماوەرانێ) موستەعید بووە، لە ئاهەنگەکەدا ئامادە دەبێ، دەفژەنێکی دەست ڕەنگینی هەولێری سەرنجی ڕادەکێشی، بەو بۆنەیەوە، ئەم هۆنراوە بەرزە دەنووسێ:

**حەلقە دەرگوشی کەفی ڕەنگینی تویە ئەم دەفە**
**با نە ناڵێ لێی مەدە (عن لطمە کف الکف)**[٥]

پاشی کۆچی دوایی مەولانا خالیدیش، ناو بەناو خێزان و کوڕەکەی (شێخ نەجمەدین) بە یاوەریی یەک دوو خەلیفە، وەکو (شێخ عەبدوڵڵای هەراتی) سەریان لە هەولێر داوە[٦]. پێ دەچێ لە ماڵی شێخ هیدایەتوڵڵا میوان بووبن. کەواتە پەیوەندیی نێوان هەردوو خێزان بەردەوام بووە.

لە دەوروبەری ساڵی (١٢٥٢ ھ / ١٨٣٨ ز) شێخ هیدایەتوڵڵای هەولێری ماڵئاوایی لەم دنیایە دەکات. شێخ محەمەد سەعیدی کوڕی کە یەکێ لە زانا هەرە دیارەکانی هەولێر بووە، دەبێتە پۆستنشینی تەکیەی خانەقا و لە جێگەیدا دادەنیشێ، ئەو زاتە ئیجازەی ئیرشادی (تەریقەتی نەقشبەندی) لە سەید عەبدولغەفووری خەلیفەی مەولانا خالید[٧] وەرگرتووە[٨].

لە سەردەمی (شێخ محەمەد سەعید)دا، مزگەوتی خانەقا دەبێتە مەڵبەندێکی زانستی و ئایینی و خواپەرستی، هەم مزگەوت و هەم مەدرەسە و هەمیش تەکیە

بووە. تیایدا مورید و مەنسووبانی تەریقەت کۆڕ و حەلقەی زیکری تایبەتیان ئەنجام داوە. چەندین مەلا و زانای لێهاتووش لە مەدرەسەکەیدا خوێندوویانە و پێگەیشتوون[٩].

لە رۆژی ١/موحەرەمی/١٣٠٢ هـ (١٨٨٤ ز) شێخ محەمەد سەعید لە تەمەنی (٦٧) ساڵیدا کۆچی دوای دەکات، گوایا هەشت کوڕی هەبووە، لەوانە: شێخ عەبدولڕەحمان، شێخ ئەمین، شێخ ئەسعەد (ئەربیلی)، شێخ شاکر و هی تر[١٠].

شێخ عەبدولرەحمان لە شوێنی باوکیا دادەنیشێ، کاروباری دەرز وتنەوە و ڕێبەرایەتیی تەریقەت و تەکیە بەڕێوە دەبات، تا لە مانگی (جمادي الاخرة) ی ساڵی (١٣٣١ هـ) واتە (١٩١٢ز) وەفات دەکات..

شێخ ئەمینی کوری شێخ محەمەد سەعیدیش، زانا و شاعیرێکی لێهاتوو بووە. ماوەیەک سەرۆکی دادگای جەزای کەرکووک بووە. چونکە لە (دیوانی) شێخ رەزای تاڵەبانیدا (١٨٣٥ - ١٩١٠) پارچە شیعرێکی فارسی بەناونیشانی " در ستایش شێخ ئەمین اربیلی : رئیس محکمە جزای کرکوک" بڵاو کراوەتەوە، کە بەم بەیتە دەست پێ دەکات:

**گفتم ملک روی زمین شیخ امین است**
**نه نه غلطم صد ملکش ملک یمین است[١١].**

واتە:
گوتم شێخ ئەمین فریشتەی سەر زەوییە..
نەخێر.. نەخێر من بە هەڵەدا چووم!..سەد فریشتەش لە ژێر فەرمانی ئەودان..

**ب- شێخ ئەسعەد ئەربیلی:**

هەروەکو لە دێرەکانی پێشوودا ئاماژەمان بو دا، شێخ ئەسعەد کوڕی شێخ محەمەد سەعیدی شێخ هیدایەتوڵلای هەولێری زادەیە، لە ساڵی (١٨٤٨) ز پێی ناوەتە کوڕی ژیانەوە، لە ژینگەیەکی زانستی و خواناسیدا پەروەردە بووە، لەسەر ڕێوشوێنی باووباپیرانی ڕویشتوە.

شێخ ئەسعەد "خوێندنی زانستی هەر لە هەولێر لە خزمەت باوکی خوی لە خانەقای خالیدیدا تەواو کردووە"[١٢]، هەروا لە مزگەفت و مەدرەسەکانی ئەم دەڤەرە خوێندوویەتی، لە زانستە شەرعییەکاندا شارەزاییەکی تەواوی پەیدا کردووە. لە تەمەنی بیست ساڵاندا، لە خزمەتی (شێخ تەهای حەریری) ئیجازەی ڕێبەرایەتیی تەریقەتی نەقشبەندی) وەرگرتووە. لەم بارەیەوە لە بەیتە شیعرێکی تورکیدا فەرموویەتی:

**سید عالی نسب طه الحکار یدن صوکره**
**پیرمز طه الحریری اولدی قطب اولیا**

واتە:

**لە پاش سەید تەهای هەکاری بالانژاد**
**پیری ئێمە (تەها حەریری) بوو بە قوتبی ئەولیاکان**

لەلایەکی تریشەوە ئیجازەی"تەریقەتی قادری" و خەلافەتی لە "شێخ عەبدولمەجید" وەرگرتووە[١٣].

بەم پێیە هەروەکو پێشینان دەیانگوت، هەم لە بواری زانستی "زاهیر"، هەم لە بواری زانستی "باتین"دا شارەزا و پسپور بووە. بێجگە لەوەش، لە ئەدەبیاتی کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکیشدا - بەتایبەتی ئەدەبیاتی عیرفانی - مەلەوانێکی کەم وێنە بووە. لەگەڵ شاعیرانی سەردەمی خویشیدا ئاشنایەتیی پەیدا کردووە، بە تایبەتی شێخ رەزای تاڵەبانی، کە بینیمان شیعرێکی ستایش ئامێزی بە شێخ ئەمینی برای شێخ ئەسعەد پێشکەش کردبوو.

دوای بەجێگەیاندنی فەریزەی حەج و لە سەردەمی سەڵتەنەتی سوڵتان عەبدولحەمید خانی دووەمدا (١٨٧٦ - ١٩٠٩) شێخ ئەسعەد بۆ پەسندکردنی ئیجازەکانی ساڵی (١٨٨٨ز) بەرەو (ئەستەمبوول)ی پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی بەڕێ دەکەوێ، لەوێ بۆ یەکەمین جار لە مێوانخانەی (دەرگاهی) بەشیر ئاغادا دادەنیشێ، پاشان لە جیواری (پارمەق قپو)ی مزگەوتی (مقسەجیلەر) دەمێنێتەوە، دواتر لە (عیمارەی بایەزید) دادەگیرسێتەوە... لەو بەینەدا لە (جامعی فاتیح)دا دەبێتە مامۆستا. کتێبی (لجنة الاسرار)ی مەولانا جامی و (دیوانی حافزی شیرازی) بۆ شاگردان شی دەکاتەوە.. بەو بۆنەیەوە ناميلكەیەک بۆ راڤەکردنی کتێبی (لجنة الاسرار) بە تورکی ئامادە دەکات.. ماوەیەکیش لە گەڕەکی مستەفا

پاشادا دەبێتە پۆستنشین و پیری تەکیەی (کلامی دەرگاه)[14].

رەنگە رەفتار و چالاکییەکانی شێخ ئەسعەد گومانی لە ناو دامودەزگا رەسمییەکانی حکومەتی ئەستەمبوڵدا پەیدا کردبێ، چونکە کە کتێبی (کنز العرفان في احاديث نبي الرحمان) لە ساڵی (١٣١٧هـ/ ١٨٩٨ز) بۆ یەکەمین جار بە چاپ دەگەیێنێ، هەڵلایەک بەرپێ دەبێ. لەسەر لاپەڕەی رۆژنامەکانیشدا هێرشی دەکرێتە سەر، بە هەنجەتی ئەوەی کە هەندێ فەرموودەی زیانبەخش و موتمانە پێ نەکراوی پێغەمبەر - د.خ- لە دوو توێی کتێبەکەیدا بلاو کردۆتەوە. ئیتر راپۆرت بۆ سوڵتان بەرز دەکرێتەوە، لە دەوروبەری ساڵی (١٩٠٠ز) سوڵتان عەبدولحەمید فەرمانی دوورخستنەوەی بۆ شاری هەولێر دەردەکات و[15] رەوانەی هەولێر دەکرێ.

شێخ ئەسعەد لە شاری هەولێر خەریکی دەرز وتنەوە و ئیرشاد دەبێ. ماوەیەکیش لە مزگەوتی (حاجی مەولوود) کە ئێستا بە مزگەوتی (شێخە رەشکە)[*] مەشهوورە دادەنیشێ، دەیان موستەعید و قوتابی زیرەکی کوردستان رووی تێ دەکەن و سوود لە زانستەکانی وەردەگرن. ماموستا مەلا حوسێن شێخ سەعدی (فانی) (١٨٨٣ - ١٩٨٣) یەکێ بووە لەو قوتابییانەی کە لە خزمەتیدا "صحیحی بخاری" دەخوێنێ.[16].

دوای کودەتای تاقمی (ئیتحاد و تەرەقی) (١٩٠٨) و لە رۆژی ١٢ی مانگی ذی القعدەی ١٣٢٦هـ - ١٩٠٨ز لەسەر داواکاری دۆست و برادەرەکانی بۆ جاری دووەم روو لە شاری ئەستەمبوڵ دەکات. ماوەیەک بە سیفەتی سەرۆکی کۆمەڵەی ئەنجوومەنی پیران (مجلس مشایخ جمعیتی) دادەمەزرێ. پاشان دەکرێ بە پۆستنشینی (مەسجید و زاوییەی قەرجە ئەحمەد چیچکلی) لە ناوچەی (ئەسکودار)[17].

ناوبانگی شێخ ئەسعەد ئەربیلی لە ئەستەمبوڵ و ناوچەکانی تری دەوڵەتی عوسمانیدا بلاو دەبێتەوە، خانەوادەی سوڵتان و زور لە گەورە پیاوانی ئەستەمبۆلیش دەبنە مورید و مەنسووبی[18].

دوای جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٨) و دروستبوونی دەوڵەتی تورکیای نوێ (١٩٢٣)، کاربەدەستانی تازە بو چەسپاندنی دەسەلاتی سیاسییان، بەتاکتیک خویان لە شێخ ئەسعەد نزیک دەکەنەوە، چونکە پیری یەکەمی تەریقەتی نەقشبەندی و ماجدی بووە، خاوەنی هەزاران مورید و مەنسووب بووە، بەپێی هەندێ سەرچاوە، هەندێک لە نوێنەرانی دەوڵەتە ئەوروپییەکان، ئاموژگاری بەرپرسی یەکەمی ئەو دەوڵەتە دەکەن، چەند حیزبێکی ئوپوزسیون دابمەزرێنێ. چونکە پەرلەمانتارەکان، لەبەر خاتری مووچە و پاداشتەکانیان هیچ جورە رەخنەیەکیان ئاراستەی حکومەت نەدەکرد، بویە چەندین نامە بو پیاوماقووڵ و دیارەکانی تورکیا رەوانە دەکرێ، یەکێک لەوانە شێخ ئەسعەدی ئەربیلی بووە، ناوەرۆکی نامەکە پەسند دەکات و وەلامی دەداتەوە[19]، واتە رازی دەبێ لە چوارچێوەی رژێمی تازەی تورکیادا وەکو ئوپوزسیون (معارضة) کار بکات. هەر بۆیەش وتراوە، شێخ ئەسعەد ترووسکاییەک لە ئاسودا بەدی دەکات و (هیوا پەیدا دەکات)[20].

بەلام کە سیستەمی خەلافەت لابردرا لە ١٩٢٤/٤/٤ (دەست لە شوێنەواری موسڵمانێتی هەڵگیرا. لەگەڵ کورددا هەڵوێستیان ناتەواو بوو، ئەسعەد ئەربیلی بەدزی کۆمەڵەیەکی لە چەند سەد هەزار نەفەرێک لە کورد و تورکە بەدینەکان رێکخست.)[21].

لە ناوەڕاستی ساڵی (١٩٢٤) کە راپەڕینی شێخ سەعیدی پیران دەستی پێ کرد دیارە شێخ ئەسعەد لە ژێرەوە، پەیوەندیی بە شێخ سەعیدەوە هەبووە[22].

لە ساڵی (١٩٢٥)دا بەشێوەیەکی رەسمی تێکرای تەکیە و خانەقاکانی تورکیا دادەخرێن و دەستیان بەسەردا دەگیرێ. تەکیەکەی شێخ ئەسعەدیش بەر ئەو شالاوە دەکەوێ. ناچار دەبێ لە دەڤەری (ئارانکۆی) لە ماڵێکدا بە گۆشەگیری ژیان بەسەر ببات[23].

لە ساڵی (١٩٣٠ز) راپەڕینێکی گەورە دژی رژێمی سیاسی بەرپا دەبێ کە بە (راپەڕینی مەنەمەن) بەناوبانگە. ئەسعەد ئەربیلی بە تۆمەتی هەڵگیرسانەوە بڵێسەی راپەڕینەکە تۆمەتبار دەکرێ. بە خۆی و کوڕەکەی (شێخ عەلی)و دەیان مورید و مەنسووبی دەدرێنە دادگای

(دیوانی عورفی)و حوکمی لەسێدارەنیان بۆ دەردەچێ[٢٤].

لە رۆژی ١١/ی رەمەزانی ساڵی ١٣٤٩ هیجری (١٩٣١/١/٣٠). دڵی شێخ ئەسعەد، لەسەر بەرماڵی نوێژدا لە لێدان دەوەستێ، لە گۆڕستانی (مەنمەن)[*] تەرمەکەی بەخاک دەسپێردرێ. هەندێک دەڵێن لە رێگەی دەرزییەکی ژەهراوییەوە شەهید کراوە[٢٥].

رۆژی دواتر، واتە لە (١٢/رەمەزانی/ساڵی ١٣٤٩ هـ) کە دەکاتە (١٩٣١/١/٣١) شێخ عەلی کوڕی شێخ ئەسعەد و هەڤاڵەکانی لەسێدارە دەدرێن[٢٦].

شێخ ئەسعەد ژمارەیەکی زۆر خەلیفە و زاناو قوتابی پێ راگەیاندووە، گەلێ کەرامەتی (خاریقەی) لێ دەگێڕنەوە، نووسەرێکی تورکیا بەناوی (دیوەلی ئۆغلی) لە کتێبی (صوش دورش مظلوملری) (ستەم لێکراوەکانی چەرخی دوایی) نموونەیەکی زۆر لە کەرامەتەکانی پێشکەش کردووە[٢٦].

## ج- بەرهەمە چاپکراوەکان

شێخ ئەسعەدی ئەربیلی لە زمانەکانی کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکیدا نووسەر و شاعیرێکی دەسترەنگین و لێهاتوو بووە، بەرهەمێکی زۆری بەو زمانانە هەیە. لە رووی ناوەرۆکەوە شیعرەکانی مۆرکێکی سۆفیانەیان هەیە، لە مولەمەعەکانیدا لەگەڵ شیعرەکانی حافزی شیرازی، شێخ غالیب، فزولی، نیازی، عوسمان نەوردس، زیا پاشاو موعەلیم ناجیدا مامەڵەی کردووە. لە بواری پەخشانیشدا هەموو جۆرە هونەرکانی جوانکاری بەکار هێناوە[٢٧].

خۆشبەختانە، بەشێکی بەرهەمەکانی شێخ ئەسعەد و ئەربیلی لە چاپ دراون. بەپێی ئاگاداری ئێمە بەرهەمە چاپکراوەکانی بریتین لەمانەی خوارەوە:

١- ((کنز العرفان في أحاديث نبي الرحمان))[٣١]. بریتییە لە (١٠٠١) هەزار و یەک فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) لەگەڵ ڕاڤەکردن و شەرح لێدانی بەزمانی تورکی و فارسی. بە (١٣٩) بەش بە پێی بابەت دابەش کراوە.

بۆ یەکەمین جار لە ساڵی (١٣١٧هـ/ ١٨٩٨ز) لە دوو توێی (١٨٢) لاپەڕەدا لە چاپخانەی (مەحموود بەگ) لە ئەستەمبووڵ لە چاپ دراوە. (لە چاپدانی ئەو کتێبە هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێ دا، بووە هۆی دوورخستنەوەی نووسەرەکەی لە ئەستەمبۆڵەوە بۆ هەولێر) لە هەمان ساڵدا چەند جارێک بە قاچاغ لە چاپ دراوەتەوە. چاپی سێیەمی هەمدیسان بە قاچاغ لە ساڵی (١٣٢٧هـ/ ١٩١١م) لە دوو توێی (١٦٠) لاپەڕەدا بڵاو کراوەتەوە، چاپی چوارەم و پێنجەمیشی بە هەمان شێوە لە چاپ دراوەتەوە. لە ساڵی (١٩٨٦) بە حەرفی لاتینی لە ئەستەمبۆڵ سەرلەنوێ بڵاو کراوەتەوە.[٢٩]

٢- (فاتیحە و شریفە ترجمەسی) بریتییە لە (٨) لاپەڕە لە چاپخانەی (مەحموود بەگ) لە ساڵی (١٣٣٧هـ/ ١٩١٨م) لە چاپخانەی ئەوقاف لە ئەستەمبۆڵ لە چاپ دراوەتەوە.

٣- ((دیوان شعر)): بریتییە لە شیعرەکانی بە زمانە رۆژهەڵاتییەکان تیایدا غەزەل و تەخمیس و تەرجیع بەند و نەزیرە و روباعی لە ساڵی (١٣٣٧هـ/١٩١٨ز) لە چاپخانەی ئەوقاف لە ئەستەمبووڵ لە چاپ دراوە، لە ساڵی (١٩٩١)دا دووبارە لە ئەستەمبۆڵ لە چاپ دراوتەوە[٣٠].

٤- ((الرسالة الاسعدية في الطريقة العلية))، لە ساڵی (١٣٣٦هـ/١٩١٧ز) هەروەها (١٣٤١هـ/ ١٩٢٢ز) لە ئەستەمبوڵ لە چاپ دراوە، لە ساڵی (١٩٨٦) بە حەرفی لاتینی سەرلەنوێ لە ئەستەنبووڵ لە چاپ دراوەتەوە[٣١].

٥- ((مکتوبات)): بریتییە لە (١٨٤) لاپەڕە لە ساڵی (١٣٣٨هـ/ ١٣٨٠هـ - ١٩١٩-١٩٢١) لە چاپخانەی ئەوقاف لە ئەستەمبووڵ لە چاپ دراوە، لە ساڵی (١٩٨٣ز) بە حەرفی لاتینی سەرلەنوێ لە هەمان شاردا لە چاپ دراوەتەوە[٣٢].

کتێبەکە ئەو نامانەی لە خۆگرتووە کە بۆ خەلیفە و موریدەکانی ناردبوون.

٦- هۆنراوەیەکی فارسی سەبارەت بە لەدایکبوونی (حەزرەتی فاتمە)ی کچی پێغەمبەر، ئەم هۆنراوەیە بە شیعر لەلایەن (شێخ عەلی)ی کوڕی شێخ ئەسعەدەوە کراوە بە تورکی[٣٣]

٧- رسالەی توحید (رسالة التوحيد)

٨- شرح (لجنة الاسرار)

٩- لجنە الاسرار: شەرحی کتێبی لجنە الاسراری مەولانا نوورەدین جامییە. لە چاپ نەدراوە.

١٠- وێڕای کۆمەڵێک هۆنراوەی کوردی و تورکی و فارسی، کە بەشێکیان بڵاو نەکراوەتەوە.

شێخ ئەسعەد شیعرێکی شێخ عەبدولڕەحمان تاڵەبانی (خالص)یشی کردووە بە پێنج خشتەکی[٣٤].

**د- شیعرەکانی:**

شیعرەکانی شێخ ئەسعەد نەقشبەندی، ئاوێنەیەکی بێ گەردی کەسایەتییەکەیەتی، لە هزر و بوچوونی بەرامبەر بە گەردوون و پەروەردگار و جیهانی روحی تەعبیر دەکەن، مورکێکی عیرفانی و سوفیانەیان پێوەیە.. لە قالبی کلاسیکدا داڕێژراون.

لە غەزەلێکی سوفیانەدا کە لە حەوت بەیت پێکهاتووە (شێخ ئەسعەد) دەڵێ:

**شاهی کە روحی غبطە یی خورشیدی سەما بێ**
**عاشق دەبێ فەریادرەسی لوتفی خودا بێ**
**ئەی شەمعی شەبستانی من، ئەی نووری درەخشان**
**پەروانە سیفەت، جان بە جەمالی تو فیدا بێ**
**مومکین نییە ئەسلەن نە لە شاهی، نە لە شادی**
**زەوقی کە لە دەرگاهی لە راهی تو پەیابێ**
**مەجنونم ئەگەر مەیلی بەقای نام و نیشان کەم**
**نەخچیری دڵ ئەر بەستە بە زنجیری فەنابێ**
**باکی نییە قوربان ! نە لە کوفر و نە لە ئیمان**
**دێوانەیی زولفی تو کە سەر مەستی لیقابێ**
**ناکا بە دەوایی حیکمەتی لوقمان تەنەزول**
**نا خوش (دەبوو) چاوت ئەگەر ئەربابی زەکابێ**
**سوفی بەتەمای باغ و بەری جەننەتی (ئەسعەد)**
**حاشا کە بە بێ ڕەنج و جەفا، زەوقی سەفا بێ[٣٥] .**

راڤەکردن

١- شاهی کە گیانی شادی خوری ئاسمان بێ مەبەستی ئەوە بێ کە بگاتە قوناغی (فەنائی موتلەق) و بەدیداری پەروەردگار شاد بێ، عاشق (واتە سوفی، یا سالیکی شێواو کە تامەزرۆی بینینی جوانی و بەرزی یەزدانی تاک و بێ هاوتایە) پێویستە بەردەوام خەریکی زیکر بی، نابێ چرکەیەکیش غافڵ بێ، ئینجا بیر لە لوتف و میهرەبانی و بەزەیی پەروەردگار بکاتەوە، بەشکو بەهانای دێت و پاداشتی ماندووبوونی دەداتەوە.

٢- ئەی چرای ڕوشنکەرەوەی شەوی تاریک و نوتەکی من (واتە ئەی ڕووناکی خوای گەورە). ئەو نوورەی لە ساتەکانی شپرزەیی و حەپەسان ودوودڵیدا فریام دەکەوێت و لەو تەنگژە دەروونییە رزگارم دەکات و، بڕوا و متمانەم بەتینتر و موحکەمتر دەکات، دڵم پڕ دەکا لە رووناکی..).. من پەروانە ئاسا، هوگری ئەو رووناکییەم، بەدەوریدا دەخولێمەوە و دەخولێمەوە. تا ئاگرم تێ بەردەبێ و دەسووتێم و دەبم بەخۆڵەمێش، گیانم بەجوانی تو دەبەخشم و (فانی) دەبم..

٣- نە لە شایی و نە لە شادیدا، واتە (لە کاتی موجەهەداتدا) نابێ سالێک، هەست بەماندووبوون بکات، یا بحەسێتەوە، چونکە ئەو چێژ و خوشییەی لە پێناوی گەیشتن بە دەرگای بالای تودا لە دڵیدا بەنگ دەخواتەوە، لە هەموو شتێک خوشتر و شیرینترە.

٤- نەفام و بێ ئاگایە ئەو کەسەی عەودالی ناودەرکردن و خودەرخستنە، چونکە مروڤی خواناس (عارف) وەکو نێچیر وایە، دڵی بەزنجیری فەنا (نەمان/تیاچوون) گیرودە بووە، لە ڕێگەی گەیشتن بە پلەی "فەنا"دا نهێنی بو دەردەکەوێ، مەعریفەت پەیدا دەکات، لە هەموو جورە ژەنگێک دڵی خاوێن دەبێتەوە، بە هیچ کلوجێک بیر لە خوشی و پلە و پایەی دنیا ناکاتەوە.

٥- ئەو کەسەی دێوانەی زولفی تۆن (واتە ئەو سالیکانەی لە ناو هێزی غەیب و زاتی ئەحەدییەتدا تواونەتەوە) بە رواڵەتی شتەکان فریو ناخون و لە خشتە نابرێن، قسەی بێ ناوەڕوکی خەڵکی سادە و ساویلکە هیچ نرخێکی نییە لەلایان.. چونکە ئەوان مەستی لیقاو گەیشتنەوەن بە پەروەردگار.

٦- ئەگەر تو ژیر و هۆشمەندی، لە ڕێگەی ڕاستی خواناسین لانادەیت، هیچ پێویستییەکت بە داوودەرمان و حیکمەتی لوقمان نییە.

٧- ئەگەر دڵی سالیک (سوفی) بە زانست پڕ بووبێ، هیوا و ئاواتی ئەوە بێ کە بگاتە باغ و بەری بەهەشت. پێویستە تێ بکوشێ، ڕەنج بدات و تەحەمولی ئێش و ئەشکەنجە و جەفا و دەردی یاری ڕاستەقینە بکات. چونکە بەبێ خوماندوو کردن و، بە بێ خوێبێەش کردن لە ئارەزووی بەد و، بەبێ زاڵبوون بەسەر هەموو کوسپ و تەگەرەیەکدا، ناکرێ، بەو بەهەشتە شاد بیت.

سەرچاوە و پەراوێزەکان

١- ئەو زانیارییە لە ئەندازیار نەجات شێخ مەزهەر شێخ هیدایەتوڵلا زادەی نەقشبەندی وەرگیراوە.

2- INAL (BNULEMIN M. KEMAL), SON ASIR ZEME ED, ISTANBUL, 1969,) TURK SAIRLERI, VOL 2, S. 2103- 2104;

هەروا بڕوانە:

تەحسین ئیبراهیم دوسکی: هەلبەست ڤان و نڤیسەرێ کورد شێخ ئەسعەدێ ئەربیلی (١٨٤٨ - ١٩٣١ز)، ڕوژنامەی (برایەتی) ژمارە (٢٥٧٠)، چوارشەمە ١٩٩٨/٤/٢٢. ل(١٠)، ئەویش واتە تەحسینی دوسکی لە وتارێکی موفید یوکسەل Mufid Yuksel بەناونیشانی: ژیانناما شێخ ئەسعەدێ ئەربیلی و غەزەلەکە وێ کوردی، کە لە گوڤارا (نوبهار)، ٢٦ چریا پێشینی ساڵ ١٩٩٤. ستەمبول، سوودی وەرگرتووە.

سەرنج:

تەنیا لە (کەشکوڵی گیو)دا نووسراوە کە لە ساڵی (١٨٣٤) لەدایک بووە. (بڕوانە کەشکوڵی گیو، پێداچوونەوە و ئامادەکردنی د. کوردستان موکریانی - بەرگی یەکەم - بەغدا - ١٩٨٦. ل(١٠٩)).

٣- إبراهيم فصيح أفندي حيدري زادة: المجد التالد في مناقب مولانا خالد، أسطنبول (١٣١٦هـ) (١٨٩٨ ز)، ص(٦٣)

ئیبراهیم فەسیح لەو کتێبە دەگمەنەدا دەفەرمووێ:

(ومن خلفاء مولانا خالد قدس سره) (العالم الفاضل العامل والمرشد الهمام الكامل ذو الهمم العلية والعلوم الربانية شيخنا: الشيخ هداية الله الأربيلي قدس سره، وجاهد في السلوك على يده ثم خلفه خلافة مطلقة، وأذن له بالإرشاد، وكان الشيخ هداية الله المشار إليه حين سلوكه من طلبة العلم، فقال له حضرة مولانا خالد قدس سره بعد أن خلفه، سيأتي عليك زمانٌ تحتاج فيه إلى تدريس العلوم النقلية والعقلية، وإن لم تدرس فأنهم يخرجونك من وطنك. فأمره بقراءة الورقة الأولى من كل كتاب معد للتدريس، فقرأ ذلك على حضرة مولانا خالد قدس سره. ثم أجازه بجميع العلوم النقلية والعقلية وتدريس كتبها الدقيقة. وبعد وفاة حضرة مولانا خالد قدس سره بمدة طويلة وزمان بعيد ظهر سر هذه القضية، وهو أن محمد باشا الكردي متصرف رواندز أستولى (بجوره -كذا؟) على أربيل ونواحيها وكانت له محبةٌ عظيمة بالعلم والعلماء. ولما تمكن في أربيل مدة طويلة، قال: إن كُل من جلس في مسجد أو زاوية من أهالي العلم ولم يدرس فليخرج من هذه البلدة، لأني أريد العلم و لا حاجة لي بالطريقة. فشرع الشيخ هداية الله ... بتدريس العلوم للاستفادة، وأتوه أفواجا أفواجا، لأنهم رأوا عنده من التحقيق والتدقيق ما لَم يشاهدوه عند العلماء الراسخين في العلوم والتدريس. فتعجب الناس منه ذلك، لأنه لم يدرس مدة عمره، ولم يقرأ من العلوم إلاّ شيئاً يسيرا جدا، وإنما كان إشتغاله بالأرشاد، فسمع الباشا المذكورَ وأتَى إلى خدمته وطلب الدعاء منه والعفو عنه. وبقي الشيخ المشار اليه قدس سره يرشد ويدرس إلى أن توفي في بغداد، ودفن في جنة سلطان العلماء الولي الكبير شيخنا وقدوتنا ومولانا الشيخ يحيى المزوري العمادي الخالدي قدس سره. وأني ولله الحمد قد تشرفت بخدمة الشيخ هداية الله الأربيلي قدس سره في بغداد وأربيل، وفزت بأنظاره ودعائه..)

بڕوانە: (المجد التالد في مناقب مولانا خالد، ص(٦٣ - ٦٤).

٤- سەرچاوەی پێشوو، ل(٦٣ - ٦٤)

٥- ئەو زانیارییە لە ڕۆژی ٦ /٧/ ١٩٧٥ لە خوالێخۆشبوو، شاعیر و ڕەچەڵەکناس مامۆستا ناسیح حەیدەری (١٨٩٨-١٩٨٦) وەرگیراوە. هەروا لەم

بارەیەوە بڕوانە: کەریم مستەفا شارەزا: هەندێ لە بیرەوەری و زانیارییەکانی ناصح حەیدەری، گۆڤاری ((ڕوشنبیری نوێ)) ژمارە (١٠٨) بەغدا - کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٥، ل(٢١٨ - ٢١٩).

ئەمەش تێکستی تەواوی هونراوەکەی نالییە:

**حەلقە دەرگوشی کەفی ڕەنگینی تویە ئەم دەفە**
**با نە ناڵی لێی مەدە (عن لطمە کف الکف)ە.**
**نەی، کە صاحیب سیرە، سەرتاپا بەئەمری (کن) کونە**
**باگینی (قف، قف علی سری)، بە زاهر قەف قەفە**
**خوشترە عوذری گوناهکاران لە سەد زیکری ریـا**
**ئەم نەرمی عەفوە عەفوە، ئەو بەتوندی عەف عەفە**
**شێخی یوسەر لنگە دستاری بەدەستاری بو زورگ**
**ڕەندم و، دەستاری کەڵلەی من دەفە، نەک میندەفە**
**خادیمی مەخدومیە، ماقوڵی ناماقولیە**
**لەم دەر ئاسەف سولەیمانە، سولەیمان ئاسەفە**
**ساحیبی (علم الکتاب)ە موتریبی هود هود نەفەس**
**یا لە سولەیمانە لە (إخوان الصفا)، ئاسەف سەفە**
**جامی تاقی مەیکدە میشکاتی قەندیلی دڵە**
**شیشە پڕ قەرقەف لە ڕەفرەف شاهی عالی ڕەفرەفە**
**تەبعی "نالی" توندە ئەمرو، یابە نەشئەی نیم نیگاه**
**مەستی ڕەحراح و مەی و راح و قەراح و قەرقەفە!!**

بڕوانە: دیوانی نالی، لێکوڵینەوە و لێکدانەوەی (مەلا عەبدولکریمی مدرس و فاتح عەبدولکریم) بەغدا - ١٩٧٦ ص(٤٥٠ - ٤٥٤).

٦- المجد التالد في مناقب مولانا خالد، ص(٥٨)

٧- سەیید عەبدولغەفوور یەکێ بووە لە خەلیفە هەڵکەوتووەکانی مەولانا خالید و زاوییەیەکەی لە کەرتی ڕۆژهەڵاتی بەغدا بووە، لە دەوروبەری ساڵی (١٢٧٣ھ/١٨٥٥ز) کوچی دوایی کردووە.

٨- المجد التالد في مناقب مولانا خالد، ص(٥٦).

تێبینی: ئالووسی زادە، لە هەردوو سەفەرنامەکەیدا، بەوپەڕی حورمەتەوە باسی شێخ محەمەد سەعیدی کوڕی شێخ هیدایەتوڵلای کردووە. لە هی یەکەم کە لە ساڵی (١٢٦٧ھ/ ١٨٥٠ز) بەهەولێردا ڕەت بووە. نووسیویە: "وكان من أجل الاخلاء في أربيل الشيخ محمد سعيد افندي ابن المرحوم الشيخ هداية الله النقشبندي.."

بڕوانە: أبو الثناء شهاب الدين السيد محمود أفندي الشهير بالوسي زادة: نشوة الشمول في السفر الى اسلامبول، بغداد - ربيع الثاني / ١٢٩١ھ (١٨٧٤ز) ص(٧).

لە سەفەری دووەمیدا واتە لە گەڕانەوە لە ئەستەمبووڵەوە بۆ بەغدا (لە ساڵی ١٨٥٠ز) کە گەیشتوتە شاری هەولێر بە تێروتەسەلی باسی میوانداری و بەخشندەیی (شيخ محمد سعيد افندي الشيخ هداية الله زادە)ی کردووە.

(بڕوانە: ابوالثناء شهاب الدين ألوسي زادة: نشوة المدام في العود الى مدينة السلام، مطبعة الولاية - بغداد - ٢٧ جمادي الآخرة ١٢٩٣ھ (١٨٧٦ز) ص(٩٩).

شایانی باسە، لە پاڵ شێخ محەمەد سەعید ئالووسی زادە باسی زاتێکی تری شاری هەولێری کردووە. ئەویش (مەلا داوود)ە. لەم بارەیەوە نووسیویەتی:

"وأرسل لدعوتنا على نحو فرسخ ذا الخلق المحمود، المتذرع بسابغات الفضائل الملا داود، وكنا وعدناه بالحلول عنده والنزول يوم واجهناه أثناء ذهابنا الى إسلامبول."

بڕوانە: نشوة المدام - المصدر السابق - ص٩٩.

٩- ئەو کەشوهەوا لەبارەی لە (لە خانەقای خالدیە)ی هەولێر ڕەخسا بوو بۆ تەریقەتی نەقشبەندی، بووە مایەی ئەوەی چەندین خەلیفەی تر پێ بگەن، یەکێ لەوانە شێخ محەمەدی چولی هەولێری بووە (١٨١٧ - ١٨٩١)ز کە بە شێخ محەمەد پهنائودین عوسمانی ناوزەد کرابوو.

ئەم زاتە کوڕی پووری شێخ محەمەد سەعیدی کوڕی شێخ هیدایەتوڵڵایە. لە سەرەتادا، بەهوی شێخ محەمەد سەعیدەوە، بە تەریقەتی نەقشبەندی ئاشنا دەبێ.. پاشان لەگەڵ زانای موسڵمانی گەورە شێخ ئەبوبەکری هەرشەمی (غیاثودین) ئیجازەی ئیرشاد لە شێخ عوسمان سیراجودین (١٧٧٥ - ١٨٦٧)ز لە گوندی تەوێڵە وەردەگرن.

بۆ زانیاریی پتر، بڕوانە: زبير بلال اسماعيل : الشيخ چولی، أربيل - ١٩٨٨، ص(٣٠-٣١).

١٠- عبدالله فرهادي: الاكيل في محاسن أربيل، (منشورات وزارة الاوقاف والشؤون الاسلامية)، أربيل

(١٤٢٢ه / ٢٠٠١م). ص(٢٣٧).

١١- دیوانی شێخ رەزای تالەبانی (کۆکەر و چاپکەری) عەلی تالەبانی چاپخانەی مەعارف - بەغدا - ١٩٤٦ ل(١٠٨ - ١٠٩).

١٢- کەشکۆلی گیو، - بەرگی یەکەم - ل(١٠٩).

١٣- اوقات، عطا ترزی باشی، اربیل شاعر لری، ج٢، کرکوک ٢٠٠٤، ص٤

١٤و ١٥- سەرچاوەی پێشوو، ل٤-٥

(*) شێخە رەشکە: ناوی شێخ محەممەدە کوڕی شێخ ئەسعەد ئەربیلییە، کە باوکی بۆ دووەمین جار دەچێتە ئەستەمبوڵ ئەو لەو مزگەوتە لە جێگای دادەنیشێ و خەریکی دەرز وتنەوە دەبێ، پاشان دەبێ بە قازی دادگای شەرعیەی هەولێر، لە ساڵی ١٩٥١ز کۆچی دوایی دەکات، ئەو حیکایەتەی مامۆستا فەرهادی گێراویەتییەوە کە گۆیا لە دوای لەسێدارەدانی شێخ ئەسعەد ئەم کوڕەی (شێخ محەمەد) رادەکەوێتەوە هەولێر دوورە لە راستی چونکە ئەم هەر لە هەولێر بووە و نەچۆتە ئەستەمبوڵ.

١٦- دیداری لەگەڵ خوالێخۆشبوو مەلا حوسێنی (فانی) لە ماڵی خوی لە گەڕەکی ئازادی، رۆژی (١٩٨١/٣/٢) بەئامادەبوونی (کاک موحسین ئاوارە)ی شاعیر.

١٧- عطا ترزی باشی: سەرچاوەی ئاماژە پێدراو، ل٥

١٨- کەشکۆلی گیو، بەرگی یەکەم، ل(١١٠)

١٩- دیدار لەگەڵ مامۆستا شوکر مستەفا لە ماڵی خۆی لە گەڕەکی زانیاری سەر لە ئێوارەی رۆژی ٢٠٠٢/١٠/١٥ بە ئامادەبوونی مامۆستا مەسعوود محەممەد، کاک حاکم ئازاد عیزەدین مەلا ئەفەندی.

٢٠ و ٢١- کەشکۆلی گیو، بەرگی دووەم، ل(١١٠).

٢٢-

٢٣و ٢٤- عطا ترزی باشی: سەرچاوەی ئاماژە پێدراو، ل٥

(*) مەنەمەن: محەممەد صائب نەقشبەندی: هەروەکو مامۆستای پارێزەر و متەولی تەکیەی خالیدیە روونی کردەوە: دەڤەرێکە لە نزیک شاری ئەزمیر دوای وەفاتی شێخ ئەسعەد بە نهێنی تەرمەکەی لەو شوێنە دەنێژن، یەکێ لە موریدەکانی ئاگادار دەبێتەوە، پاشان مزگەوتێک لەسەر قەبرەکەی خۆی و کورەکەی بنیات دەنێن، مزگەوتەکە بە مزگەوتی کوردان، کوردلر جامعی، مەشهوورە.

٢٥- تەحسینی دوسکی، ژێدەری ئاماژە پێکراو. سەبارەت بە دەستنیشانکردنی وەفاتی بروانە (INAL) سەرچاوەی ئاماژە بۆکراو. هەروەها بڕوانە: ترزی باشی، ل٥.

٢٦ و ٢٧- عطا ترزی باشی: سەرچاوەی ئاماژە پێدراو، ل٣-٥-٦

٢٨- نوسخەیەک لەم کتێبە دەگمەنە، لە کتێبخانەی خوالێخۆشبوو (رەشاد موفتی) لە هەولێر پارێزراوە، لەسەر بەرگیدا نووسراوە: "كنز العرفان في أحاديث الرحمن". پوستنشینی دەرگای شەریف لە (داری عەلیە/ واتە: ئەستەمبوڵ) فەضلیهتی حاجی محەممەد ئەسعەد ئەفەندی ئەربیلی"یە..

کتێبەکە (١٤٢) لاپەڕەیە، بە (١٣٩) بەش پولێن کراوە، لە لاپەڕە (١٤٠)دا (مختار بگ) ئەفەندی بە هونراوە (تەقریزێکی) بو نووسیوە. ساڵی لە چاپدانی دیار نییە.

٢٩و ٣٠و ٣١و ٣٢و ٣٣و ٣٤- عطا ترزی باشی، ل٧-٩.

٣٥- کەشکۆلی گیو.

**سەرنج:**

مامۆستا مەلا حسین (فانی)، بەخەتە خوشەکەی لە رۆژی ١٩٦٤/٥/٤ (١٣٨٤هـ) نوسخەیەکی دیوانی شێخ ئەسعەدی نووسیوەتەوە. بە ناونیشانی ((ديوان حضرت الشيخ اسعد أفندي الاربيلي وكان أحد الاكابر من خلفاء الشيخ طه السور سوري النقشبندي قدست اسرارهم العلية)). لە دوالائەرەدا نووسیویەتی: ((تمت كتابة هذه المنظومة الاسعدية المباركة المحتوية على الحقائق الملكية والملكوتية علي يد حسين الفاني الكئيب في (١٣٨٤)ه يوم السبت اليوم الثاني من مايس (عام ١٩٦٤) الميلادي. نرجو من الرب الرحيم ان ينفعنا بها بفضله واحسانه العميم".

# ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی
# ١٨٩٥-١٩٣٣



پەرلەمانتار و یەکەم حاکمی ڕەواندز لە دوای جەنگی یەکەمی جیهان و کەسایەتیی ناوداری کورد لە سێ یەکی سەدەی بیستەمدا، ئیسماعیل بەگ کوڕی سەعید بەگ کوڕی عەبدوڵلا موخلیس و ناودار بە (ئیسماعیل بەگی سۆران) لە ساڵی ١٨٩٥دا لە شاری ڕەواندز چاوی ژیانی هەڵێناوە، ڕەچەڵەکی دەچێتەوە سەر بنەماڵەی ڕەسووڵ پاشای برای محەمەد پاشای ڕەواندزی.

لە دوای نەمانی دەسەڵاتی حکوومەتی عوسمانی لە باشووری کوردستان و هاتنی بەریتانیا بۆ ناوچەکە، ئیسماعیل بەگ لە ساڵی ١٩٢٠دا کرا بەحوکمڕانی ناوچەی ڕەواندز. کە حکوومەتی عێراقیش دامەزرا و پەرلەمان دانرا، سەبارەت بەخوێندەواری و لێهاتوویی و ناوبانگی بنەماڵەکەیان، کە بنەماڵەی میری سۆران بوو، لە مانگی حوزەیرانی ١٩٢٥دا بەنوێنەری ڕەواندز لە پەرلەمانی عێراقی هەڵبژێردرا و لە ئایاری ١٩٢٨یشدا ئەندامێتییەکەی پەرلەمانی بۆ دەورەیەکی دیکە نوێ کرایەوە. ئەو زاتە لە ناو پەرلەماندا گەلێک داوای بەجێی لەبارەی مافی نەتەوەیی کورد پێشکەش کرد.

لەگەڵ دەستەیەک لە پەرلەمانتارانی کورد لە بەغدا، لە ڕۆژی ١٩٢٨/٦/١دا داوایەکیان داوە بەپەرلەمانی عێراق و یادداشتێکیشیان پێشکەش بەوەزارەتی مەعاریفی ئەوسا کردووە بۆ خزمەتکردنی کوردستان لە ڕووی پەروەردە و فێرکردنەوە تاکو نەوەی نوێی خەڵکی کوردستان بەچاکی پێ بگەیەنرێن، ئەمەش دەقی داخوازییەکانیان بووە:

**(بۆ وەزارەتی مەعاریفی جەلیلە)**

لە گەورەییتان ناشاردرێتەوە کە گەورەترین چتێکی بەئەهەمییەت لە کوردستان، بڵاوکردنەوەی عیلم و زانستە و پێویستە هەموو کۆسپێک لابرێت لە رێگەی لابردنی جەهالەت و گەورەترین هۆ، کە لەو ناوچەیە علیم و مەعریفەت وەپاش بخات ئەمانەی خوارەوەن:

١- نەبوونی کتێبی وەرگێڕدراو بۆ سەر زمانی کوردی لە قوتابخانەکاندا لەو ناوچەیەدا، کە بریتییە لە لیوای کەرکووک و سلێمانی و هەولێر و قەزای گرنگی وەک زاخۆ هەتا دەگاتە خانەقین و مەندەلی و بەدرە بەپانی و درێژییەوە.
٢- کەمیی ژمارەی مامۆستایان.
٣- نەبوونی بەڕێوەبەرایەتییەکی تایبەت بەناوچەی کوردستان.
٤- نەبوونی قوتابخانەی دواناوەندی و ئامادەیی بۆ تەواوکردنی خوێندن.
٥- نەبوونی قوتابخانەی (دارولموعەلیمین) بۆ پێگەیاندنی مامۆستایان تا بتوانن بەزمانی کوردی دەرس بڵێنەوە.
٦- کردنەوەی قوتابخانە بۆ مێیینان.

ئیدی هیواداربن وەزارەتی مەعاریف هیمەتێکی تەواو بکات بۆ جێبەجێکردنی ئەم داخوازییانەی سەرەوە.

ئیسماعیل بەگ و ئەو کەسایەتییە خزمەتگوزارانە سەبارەت بەهەڵوێستەکەیان، هەموو دڵسۆزانی میللەتی کورد خۆشی دەویستن و شاعیران بەشیعر ستایشیان دەکردن، یەکێک لەو شاعیرانە (ئەسیری) بووە و گوتوویەتی:

**(سوپاسنامە)**

**شەش مەردی نیشتمانی لە شەش گۆشەی وەتەن**
**هێشک گرن بەگیان و بەدڵ هەوڵ و رەنج ئەدەن**
**بۆ سەرفیرازی و دوارۆژی روونی گەل،**
**کۆشش ئەکەن بەپەلە و نووسین و چۆن و چەن**

ئینجا شاعیر ناوی ئەو خزمەتگوزارانەی میللەتی کورد لە هۆنراوەکەی دێنی و ئیسماعیل بەگ بەسەردەستەی ئەو کەسایەتییە کوردانە دادەنێ و دەڵێ:

**سەردەستەیان (سمایلی سۆران)ە، جەمالی بەبان**
**نەوزادی پشدەرە، سالح بەگی نەوجەوەن!!**
**حازم کە ناوی حازمە، کردەیشی حەزمییە،**
**سەیفی خودایە کەللەی پڕ هۆش و عەقڵ و فەن**
**بێت و کەسێ بڵێ چلۆنە (حەمەد بەگ) دەڵێم**
**سەرداری جافە نایەوێ گوفتار و ناوونیشەن**

کاتێک سمایل بەگ لە هەموو لایەک ناوبانگی خزمەتگوزاریی بۆ میللەتەکەی دەنگی دایەوە، هەندێ لە ناحەزانی کەوتنە پیلان و داودانانەوە بۆ لەناوبردنی تاکو لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٣دا لە پیلانە گڵاوەکەیان لە شوێنێکی نزیک نیشاوی لە رێی گەرانەوەی لە هەولێرەوە بۆ رەواندز سەرکەوتن و ئەو پیاوە خزمەتگوزارە مەزنەی کوردیان شەهید کرد.

**کەریم شارەزا**

# ئەمین پاشای رەواندزی
# ١٨٦٥-١٩٤٣

ئەفسەری پایە بەرزی کورد، میر لیوا روکن ئەمین پاشای رەواندزی لە ساڵی ١٨٦٥دا لە شاری رەواندزی (کۆنە پایتەختی میرنشینی سۆران) هاتۆتە دنیا و چاوی بەدیمەنی شاخەکانی هەندرێن و زۆزک و کۆرەک کراوەتەوە. لە بنەماڵەیەکی ئایین و زانیاریپەروەر سەری هەڵداوە. دوای تەواوکردنی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی چووەتە شاری ئەستەمبووڵی پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی، لەو شارە بەهات و باتەدا چاوی کراوەتەوە و چووەتە قوتابخانەی عەسکەری، کە دەرچووە چووەتە کۆلێجی ئەرکانی جەنگ و پاش تەواوکردنی خوێندن لەو کۆلێجەش، بەئەفسەری روکن لە تۆپخانەی سوپای عوسمانی دامەزراوە. لە سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانیدا لە بەرەکانی جەنگدا لە دژی دوژمنی دەوڵەتەکەی جەنگاوە و ئازایەتییەکی زۆری نواندووە.

لە دوای جەنگ و تێکچوونی دەوڵەتی عوسمانی، ئەمین پاشا گەڕایەوە رەواندز و لەوێشەوە رووی کردە بەغدا و، کرا بەسەرپەرشتیاری سوپای عێراق. ئەو سوپایەی لەسەر



شێوەیەکی پێشکەوتوو رێک خست و لە ساڵی ١٩٣٥دا بەنوێنەری پارێزگای هەولێر بۆ پەرلەمانی عێراق هەڵبژێردرا. لە دواییدا بەسەرۆکی لیژنەی کاروباری سەربازی لە سوپای عێراق دامەزرا و لەگەڵ بەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهانی لە ساڵی ١٩٣٩دا کرا بەراوێژکار لە وەزارەتی بەرگریی عێراق و زۆر بەوردی رووداوەکانی ئەو جەنگەی شی دەکردەوە.

نووسەری کتێبی (أعلام الکرد) (میر بصری) لە کتێبەکەیدا ئەوەی خوارەوەی بۆ تۆمار کردووین و دەڵێ: "سامی خۆندە، بۆی گێڕامەوە و گوتی: "بۆ پشکنینی کاروباری کارگێری لە سەرەتای ساڵی ١٩٣٥دا چوومە شاری رومادی، لەو کاتەی کە لە هۆڵی ئوتێل دانیشتبووم، بینیم لیوا بەکر سدقی عەسکەری سەرکردەی تیپی دووەمی سوپای عێراق دانیشتووە. لەپڕ پیاوێکی بەشان و شەکەوت بەژوور کەوت، بەکر سدقی لەبەری هەستا و پێی گوتم: "ئەمە میر لیوا روکن پاشای رەواندزی"یە و لێی چووە پێش ئەو پێی گوت: "پاشای گەورەم نامناسییەوە؟ من (بەکر سدقی)م، تۆ سەرکردەی تیپەکەمان بووی لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا و ئەو کاتە من رائید بووم؟" ئەمین پاشا گوتی: "بەداخەوە نایەتەوە یادم، چونکە ئەفسەر سەرکردەی خۆی دەناسێتەوە، بەڵام سەرکردە هەموو ئەفسەرەکانی بەردەستی ناناسێتەوە.

ئەمین پاشا لە ساڵی ١٩٤٣دا کۆچی دوایی کرد و ئەم کەسایەتییەش جیایە لەگەڵ عەقید ئەمین رەواندزی، کە لە شوێنێکی تر باسمان لێوە کردووە.

سەرچاوە:
* میر بصری- أعلام الکرد- لندن ١٩٩١، ط(١).

**کەریم شارەزا**

# جەمیل ئاغای حەوێزی
# ١٨٦٩-١٩٤٦



جەمیل ئاغای حاجی ئەسعەد ئاغای حاجی بەکر ئاغای حەویزی، لە ساڵی ١٨٦٩دا لە شاری کۆیە هاتۆتە دنیاوە و لە بنەماڵەی خانەدانی حەویزی پەروەردە بووە و پلەیەکی باشی لە خوێندنی مزگەوت و قوتابخانەی رەسمیی بڕیوە و بووەتە رۆشنبیرێکی هۆشیار و زانا.

کاتێک حاجی ئەسعەد ئاغای حەویزی باوکی، (سەرۆکی بنەماڵەی حەویزییان) لە ١٨٩٥دا کۆچی دوایی دەکات، سەرۆکایەتیی حەویزییان دەکەوێتە ئەستۆی رەشید ئاغای حەویزی برای و وەختێکیش ئەم زاتە لە ١٩٠٨دا کۆچی دوایی دەکات سەرۆکایەتیی ئەم بنەماڵە گەورە و گرانە دەکەوێتە ئەستۆی جەمیل ئاغای حەویزی.

لە ساڵی ١٩٠٨دا دەکرێت بەسەرۆکی شارەوانیی کۆیە و کاتێکیش کە سوپای ئینگلیزەکان لە ١٥/١٢/١٩١٨دا بەسەرکردایەتیی (کاپتن های) دەگەنە کۆیە و ناوچەکەی، پێش هەموو شتێک کاروباری حکوومەت لە کۆیە دادەمەزرێننەوە و بەمجۆرە فرمانە گرنگەکانی حکوومەت بەسەر هەردوو بنەماڵە ناسراوەکەی حەویزی و غەفووری و کەسایەتیی دیکەی بنەماڵەی جەلیزادە دابەش دەکەن:

١- حەمەئاغای غەفووری- حاکمی شار و ناوچەی کۆیە.
٢- جەمیل ئاغای حەویزی- جێگری حاکمی شار و ناوچەکەی.
٣- مەلا محەممەدی جەلیزادە (مەلای گەورە): قازی شەرع.
٤- مەلا ئەحمەد ئاغای سمایل ئاغای غەفووری: حاکمی سولح.
٥- مەلا سدیقی نازەنینی- بەڕێوەبەری تاپۆ.
٦- حاجی عەبدوڵلا بەگ- بەڕێوەبەری ئەوقاف.
٧- حاجی جەلیل ئاغای حەویزی- بەڕێوەبەری پۆلیسی سوارە.
٨- مەلا حەویز ئاغای غەفووری- بەڕێوەبەری پۆلیسی پیادە.

کاتێکیش حەمە ئاغای حاکمی شار، لە بەردەبەیانیی ٣/٨/١٩٢٠دا کۆچی دوایی کرد، جەمیل ئاغای جێگری بووە حاکمی شار و ناوچەی کۆیە. کاتێکیش حکوومەتی یەکەمی عەبدوڕەحمان ئەلنەقیب دامەزرا، بۆ رۆژی ٢٦/٣/١٩٢١ کرا بەکەمین قائیمقامی حکوومەتی عێراق لە کۆیە کە تازە کرابووە قەزای پارێزگای هەولێری تازە دروستکراو.

لە سەردەمی حکوومەتەکەی شێخ مەحموودا لەگەڵ مەلای گەورە پشتگیریی حوکمڕانییەکەی ئەو مەلیکەی کوردستان دەکەن و لە دوای نەهێشتنی حکوومەتی کوردستانیش کاتێک ئەفسەری تەوجیهی سیاسیی ئینگلیز لەم و لە مەلای گەورە دەپرسن: "چ دەڵێن گەر بەریتانیا حەمدی بەگی بابان بکات بەمەلیکی کوردستان؟" ئەوانیش لە وەڵامدا دەڵێن: "ئێمەی کورد کیانی سیاسیمان دەوێ جا ئەو کەسەی دەکرێتە سەرۆک یا مەلیک شێخ مەحموود بێ یا حەمدی بەگ یا هەر کەسێکی دیکە بێت ئێمە قبووڵمانە و با جارێ هەر بەریتانیا سەرپەرشتیی ئەو کیانە بکات تاکو بەسەرپێ دەکەوێ".

جەمیل ئاغا تاکو ساڵی ١٩٣٢ قائیمقامی کۆیە بووە، ئینجا گوێزراوەتەوە بۆ قەزای رانیە، لەوێش زۆر نەماوەتەوە و دەستی لە فەرمانەکەی هەڵگرتووە و هاتۆتەوە کۆیە و کەوتووەتەوە سەر خزمەتگوزاریی میللەت و میوانداری و ئانبدەیی و خزمەتی خوێندن لە شارەکەدا.

ئەم کەسایەتییە کۆمەڵایەتییە ناسراوە، لە ساڵانی ١٩٣٩-١٩٤٣ دەوردەیەک و لە ساڵانی ١٩٤٣-١٩٤٦ بۆ دەوردیەکی دیکەی پەرلەمانی عێراق هەڵبژێردراوە. لە ماوەی ئەو ٧ ساڵەی ئەندامیەتی لە پەرلەمان گەلێک داواکاری بەنرخی بۆ خزمەتکردنی شارەکە و ناوچەکەی پێشکەش کردووە. تاکو لە رۆژی ٢٤/٣/١٩٤٦دا لە شاری کۆیە لە تەمەنی ٧٧ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

**کەریم شارەزا**

# زانای بەناوبانگ "مەلا ئەفەندی"

عەباس هۆرمزیار/ شوان سەرابی



کورد دەڵێت: (داری مەزن نابێتە گۆپاڵ)، واتە مرۆڤی مەزن نابێتە داردەست و واز لە بیروڕا و ڕێبازەکەی ناهێنێ.. ترس و ماڵی دنیا کاری لێ ناکات، ئامادەیە لە پێناو ڕێبازەکەی، زێدی خۆی بەجێ بهێڵێ و ڕوو بکاتە ئەو شوێنەی کە بواری درێژەدان بەڕێباز و بیروڕاکەی هەبێت.

کاتێک وڵاتی ئێران دەکەوێتە ژێر دەستی قزڵباشە شیعەکان، بەتایبەتی لە سەردەمی شا ئیسماعیلی یەکەمی شای دەوڵەتی سەفەوی، کە توانییان بەزۆر و بەخورتی ژمارەیێکی زۆر لە تیرە و هۆزانی ئێران لە (سوننە)ەوە بگۆڕن بۆ شیعە تا وای لێهات ڕێبازی شیعەگەرێتی زاڵ بوو بەسەر هەموو دانیشتوانی ئێران، بەڵام شا ئیسماعیلی سەفەوی دوای کوشتارێکی زۆر لە تیرە و بنەماڵە و کەسایەتیی ئایینی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، نەیتوانی ڕێبازی شیعەگەرێتی بەسەریاندا بسەپێنێ، جا لە ئەنجامی زوڵم و ستەمداری سەفەوییەکان ژمارەیەک لە تیرە و بنەماڵەی کورد لە لوڕستانەوە تا دەگاتە ئەرمینیا ئاوارەی کوردستانی بن دەستی عوسمانی بوون واتە، باکوور و باشووری کوردستان، زۆر کەسایەتی و بنەماڵەی فەیلیش کە لە ئێران رایان کردووە بۆ باشووری کوردستان و ناوچەکانی باشووری زنجیرە چیای حەمرین وەک دیالە، بەغدا، کوت، عەمارە جێوار بوون و بەدرێژایی ڕۆژگار هەندێکیان لە سوننە بوونەتە شیعە.

جا دوو کەسی ناسراو و پیاوی ئایینی بەناوی (مەلا ئەلیاس و محەمەد کوڕی حەیدەر پیرەدین)، کە خزمی یەکتری بووینە، لە ناوچەی ئەردەلان لە سەردەمی سوڵتان سولەیمان قانوونی (١٥٢٠-١٥٦٦) سوڵتانی عوسمانی، دێنە ناو خاکی عوسمانییان، چونکە سولەیمان قانوونی خۆی بە بەرپرسی هەموو سوننە داناوە، بۆیە هەر کەسێکی لە وڵاتی سەفەوی رای بکردایە لە مەلا و کەسایەتیی ئایینی زۆر ڕێزی دەگرت و دەیکردە مەلا و خەتیبی مزگەوتێک، جا مەلا محەمەد هاتە هەریر، لەوێ بەمەلایەتی دامەزرا و ژنێکی لە هۆزی باشوورییەکانی قەندیل هێناوە، سەرەتا حکوومەتی عوسمانی گوندی (ماوەران)ی دایێ و پاشان (١٦) شازدە گوند درا بەنەوەکانی.

بەڵام مەلا ئەلیاس کاتێ شارۆچکەی سەوڵەت ئابادی ئەردەلانی بەجێ هێشت "هاتە هەولێر و لە هەولێر بوو بە مەلای مزگەوتی قەڵا".

مەلا ئەلیاس ژنی لە هەولێر هێنا و ڕێزێکی تایبەتی لەلای کاربەدەستانی عوسمانی هەبوو، جا بەدرێژایی ڕۆژگار نەوەکانی مەلا ئەلیاس، مەلای مزگەوتی قەڵا بوون و ئیجازەیان دەدایە مەلایان و مەلایان لە گوندان دادەمەزراند، لە سەردەمی عوسمانییان شێخ و ئاغا و کارمەندی بەرزی میری گوند و زەوی و زاریان لەلایەن حکوومەتەوە پێ دەبەخشرا، بۆیە گوندەکانی دەوروبەری

هەولێر هەمووی موڵکی شێخ و ئاغەکانی ناوشاری هەولێر بوون، جا بنەماڵەی مەلا ئەلیاسیش ژمارەیەک گوندیان پێ بەخشرا، کە ئەمانەن:

(باداوە، کونەگورگ، گردەڕەشەی گچکە، تەندوورە، بەردێنە، بەشێک لە گوندی دارەتوو، چارووک، منارە، جدیدە، مەلاقەرە، کەپەنک ڕەش، حەسەن بەگ، شێخەلاس، بەشێک لە گوندی پۆریجە).

دوای ئەوەی مەلا ئەبوبەکری چوارەم (مەلا ئەفەندی) خانووەکەی لە ساڵی (١٩١٣) لە باداوان تەواو بوو ماڵی لە قەڵاوە گواستەوە بۆ باداوان، ئینجا زیاتر لە جاران ئاگاداری زەوی و زارەکانی دەبوو و، بۆ هەر گوندێک یا (٢- ٣) گوند، سەرکارێکی دادەنا و هەر گوندێکیش کوێخایەک. هەر جووتیارێک بهاتبایە گوندێک لەم گوندانە کوێخای گوندی پارچە زەوییەکی دەدایێ بۆ خۆی بیچێنێت، دوای ئەوەی دەدورایەوە و دەکوترا و دەهاتە بەرهەم، شەقڵچی گەنمەکەی شەقڵ دەکرد تا کەس دەستکاری نەکات، (شەقڵ)یش زیاتر ئێواران دەکرا، نەوەک بەشەو لێی کەم بکەنەوە.

ئینجا شەقڵچی دەغڵەکەی دەکردە پێنج بەش، سێ بەش بۆ جووتیارەکە دادەنرا، بەشەک بۆ خاوەن زەوییەکە بەشێکیش بۆ سەپان و تێلەگەکێش و ئەو کەسانەی، کە بەبەرهەمهێنانی ماندوو بوون. یەک لەو شەقڵچییانە ناوی مەلا مەعرووف بوو، کە خزمی مەلا ئەفەندی بوو، یەکێکی دیکەش ناوی مەلا عەزیز بوو، کە ئامۆزای شێخ محەممەدی چۆلی بوو.

#### مزگەوتی قەڵا

مزگەوتی قەڵا کۆنترین مزگەوتی شاری هەولێرە، بەقسەی مێژوونووسەکان لە سەردەمی ئەمەوییەکاندا دروست کراوە و چەند جارێکیش چاک کراوەتەوە، بەڕێز مامۆستا عەبدوڵڵا فەرهادی دەڵێ: لە زەمانی ڕەشاد ئەفەندی جارێک مزگەوت چاک کرایەوە، بە ماوەی دوو کاتژمێر سێ هەزار لیرە زیاتر کۆکرایەوە، تەنها ئافرەتێک (٢١) لیرەی هێنا، بەم پارەیە مزگەوتەکە بەباشی چاک کرایەوە، بەڵام منارەکەی لە سەردەمی عومەرە ئەفەندی بابی مەلا ئەفەندی چاک کراوەتەوە.

ئەوکاتی نەجیب پاشا والی بووە لە مووسڵ، میوانی عومەر ئەفەندی دەبێت و دەزانێت منارەکە پێویستی بەچاککردنەوە هەیە، بۆیە لەسەر ئەرکی خۆی منارەکە چاک دەکاتەوە. جا مزگەوتی قەڵا بریتی بوو لە چەند بەشێک: (بەشی نوێژکردن، حوجرەی فەقێیان، حوجرەی خەوتنی میوان و فەقێیان)، جا بەردەوام دەوروبەری (١٢) فەقێ لەم مزگەوتە دەرسیان دەخوێند و هەرسێ جەمە لە باداوان نانیان بۆ دەهات، سەرەڕای فەقێیان، نان بۆ میوانانیش دەهات.

هەر مەلایەکیش ئیجازەی وەربگرتایە، دەبووایە بەم قۆناغانەدا تێپەڕێت: (شاگرد، فەقێ، موستەعید، مەلا). کاتێکیش کە یەکێک ئیجازەی مەلایەتیی وەردەگرت، ئاهەنگێک دەگێڕدرا و خواردن دەخورا و کەسانی ناودار بانگ دەکران، ئیجازەکەش بەخەتی (سەید مەردان) دەنووسرا، چونکە ئەو خەتی زۆر خۆش بوو، ئینجا مەلا ئەفەندی جوبە و عەمامەکی دەدایێ و ڕەوانی گوندەکی دەکرد، کە لەوێ مەلایەتی بکات.

زۆر جاریش وا دەبوو بەر لەوەی مەلایەک ئیجازە وەربگرێت ئاغا و کوێخای گوندان بەمەلا ئەفەندیان دەگوت، کە ئەو مەلایە بۆ گوندەکەیان ڕەوان بکات و ئەم ئاغا و کوێخایانەش لە ئاهەنگی ئیجازەدان ئامادە دەبوون.

بۆ نموونە لە ئیجازەدانی مەلا ئەحمەدی بانەیی، مشیر ئاغای دزەیی ئامادە دەبێت، مەلا ئەحمەد لە گوندی خۆیان بەمەلا دادەمەزرێنێ، کوێخای قەپرانیش مەلا محەممەد شێروانی کردە مەلای گوندی.

#### کەسایەتیی مەلا ئەفەندی:

ناوی تەواوی مەلا ئەفەندی، مەلا ئەبوبەکری چارەمی، کوڕی مەلا عومەر ئەفەندییە. لە ساڵی (١٨٦٤) لە قەڵای هەولێر لەدایک بووە و لە ساڵی (١٩٤٢) لە گوندی باداوە کۆچی دوایی کردووە و هەر لە باداوەش نێژراوە.

مەلا ئەفەندی، ئیجازەی مەلایەتیی لە عومەر ئەفەندی باوکی وەرگرتووە، بەدرێژایی ژیان خەریکی ئایینداری بووە و دوای ئەوەی ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرێ و باوکی کۆچی دوایی دەکات. خەریکی دەرس وتنەوە و ئیجازە پێدانی مەلایان بووە و پاشان لە گوندان دایمەزراندوون.

مەلا ئەفەندی پسپۆڕ بوو لە ئەستێرەناسی، کتێبێکی زۆری لەبارەی ئەم زانستە هەبوو.

جار جار مەلا ئەفەندی وتاری دوورودرێژی دەدا لە بوارەکانی ئایینی ئیسلام و ئەستێرەناسی و مەلایەکی زۆریش لەم وتارە یان وەعزدانە ئامادە دەبوون. مەلا ئەفەندی زمانی کوردی، تورکی، عەرەبیشی بەباشی دەزانی و زمانی ماڵەوەشی تورکی بوو.

مەلا ئەفەندی لەسەر هیچ تەریقەتێک نەبوو، تەنها پەیوەندیی بەنەقشبەندییەتەوە هەبوو، لەگەڵ هەموو دەورێک و رۆژگارێک و تەریقەت و حکوومەتێک هەڵوێستی باشی هەبووە. لە سەردەمی عوسمانییان لە هەموو کەسێک زیاتر رێزی دەگیرا و بەردەوام بەرپرسیارانی حکوومەتی عوسمانی پەیوەندییان پێوە دەکرد.

دوای ئەوەی لە ساڵی (١٩١٨) حکوومەتی عوسمانی شکست دەخوات و هەولێر بەجێ دێڵێ، شاری هەولێر دەکەوێتە بەردەست سوپای ئینگلیز، مەلا ئەفەندی بەهەمان شێوەی رێزی تایبەتی هەبوو لەلای ئینگلیز بۆ نموونە کاپتن، های هاملتن بەپیاوێکی چاک و رێزدار ناویان هێناوە، لە کێشەی مووسڵیش مەلا ئەفەندی لەگەڵ ئەوە بوو، کە ویلایەتی مووسڵ بخرێتە سەر وڵاتی عێراقی عەرەبی تازە دروستکراو و بەیعەتی بەمەلیک فەیسەڵدا کە ببێتە شای عێراق، بەڵام دانیشتوانی کەرکووک و سلێمانی دەیانویست سەربەخۆ بن و سەر بە عێراق و عوسمانی نەبن و دەنگیان بۆ فەیسەڵ نەدا، کە ببێتە شای عێراق، جا لە چاکەی ئەم دەنگدانە مەلیک فەیسەڵ بۆ جاری یەکەم لە ساڵی (١٩٢٥) هاتە شاری هەولێر، مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا فەرهادی دەڵێ: منداڵ بووم لە بن قەڵا راوەستابووم، کە مەلیک فەیسەڵم بینی لە دواوەی ئۆتومبێلەکە سوار ببوو تەنها شوفێری لەگەڵ بوو یەک قەمەرەشی لەگەڵ بوو، چەند کەسێکی تێیدا بوو، خەڵک زۆر بەرێزەوە پێشوازییان لێ کرد دوای ئەوەی چووە سەرای حکوومەت، ئینجا بەرەو باداوە بەرێ کەوت، مەلا ئەفەندی (٣٠- ٤٠) مافووری لەبەرپێی مەلیک راخست و پێشوازییەکی گەرمی فەیسەڵی کرد. بۆ جاری دووەمیش مەلیک فەیسەڵ دوای ئەوەی لە پیرمام دەگەڕێتەوە، لە ساڵی (١٩٣٠) سەردانی مەلا ئەفەندی کردووە، لە سەردانی جاری یەکەم، زستان دەبێ و کاتێ مەلیک بەرەو ماڵی مەلا ئەفەندی دێت، بەفر و باران دەبارێت، هەندێک لە دانیشتوانی باداوانیش پێشوازییان لە مەلیک نەکردووە و بەمجۆرە هەستی خۆیان بەرامبەر مەلیک دەربڕیوە، کە لەم پارچە شیعرە، کە نازانرێت هی کێیە رەنگی داوەتەوە:

| | |
|---|---|
| **مەلیک هاتە ناو کوردان** | **لە بۆ کەیف و سەفایێ** |
| **لێی کردە بەفر و باران** | **عالەم رووی خۆی نەدایێ** |
| **خدر و مەعرووف و حوسێن** | **لەگەڵ حەسەنی بایێ** |
| **هەرچار دەچوونە کنی** | **یێک و عەبای دەدانیێ** |
| **عەبای خدری پاشای** | **بنۆکی بزنە زایێ** |

جا دوای دروستبوونی وڵاتی عێراق، هەستی نەتەوایەتی لە باشووری کوردستان سەری هەڵدا، جموجۆڵی کوردایەتی شاری هەولێریشی گرتەوە، جا بۆ هەر داخوازییەکی گەلی کورد لە ئەنجومەنی ئەعیانی عێراق، هەموو داواکارییەکی لەم جۆرەش بەئاگاداری و رەزامەندیی مەلا ئەفەندی بوون.

کەریم شارەزا دەڵێت: لە دوا دوای حوکمی عوسمانی و سەرەتای هاتنی ئینگلیز بۆ هەولێر، هەندێک لە تورکخوازەکان ویستوویانە بەناوی ئایینی ئیسلامەوە لە داخی ئینگلیز هێرش ببەنە سەر دیانەکانی عەنکاوە و بەناوی غەزا کوشتارێکی زۆریان لێ بکەن، بەڵام خەڵکەکە بەر لەوەی هێرش بەرن، روو دەکەنە باداوە و، ئەو رۆژەش هەینی دەبێ، کاتێک مەلا ئەفەندی لە خوتبەی هەینی مزگەوتی قەڵا دەگەڕێتەوە لە مەسەلەکە دەگات و بەهەموو جۆرێک خەڵکەکە سارد دەکاتەوە و پێیان دەڵێ: ئەو دیانانەی لەگەڵماندا دەژین، ئایینی ئیسلام ئەمرمان پێ دەکات بیانپارێزین و دەبێ پارێزگارییان لێ بکەین، بۆ ئێوارەش لەگەڵ هەموو سەرۆک عەشیرەت و دەمڕاستی بنەماڵەکانی هەولێر و دەوروبەریدا کۆ دەبێتەوە و، گەلێک ئامۆژگارییان دەکات و لەو جۆرە شەڕ و کارەساتانە دووریان دەخاتەوە.

خوالێخۆشبوو مەلا ئەفەندی لە سەرەتای بزووتنەوەکانی شێخ مەحموودی حەفیدەوە دۆستایەتییەکی بەهێزی لەگەڵ شێخی نەمردا هەبووە، بەڵام هەڵوێستە سیاسییەکەی لە چوارچێوەی هەڵوێستە ئایینەکەی نەدەچووە دەرەوە.

مەلا ئەفەندی مرۆڤێکی هێمن و لەسەرخۆ بوو، هەمیشە حەزی لە دانیشتنی گەورە پیاوان لە شێخ و ئاغا و کاربەدەستانی میری بوو، بەڵام هەرگیز حەزی نەدەکرد تێکەڵاوی خێزانی هەبێت لەگەڵ هیچ کەسێک، بۆ نموونە لە دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی مایس (١٩٤١) دژ بە ئینگلیز بەسەرۆکایەتیی رەشید عالی گەیلانی، مەلیکە عالیە و مەلیک فەیسەڵی دووەمی کوڕی، کە تەمەنی (٦) ساڵان بوو، لە شاری بەغدا رایانکرد و هاتنە باداوە و لە کۆشکەکەی مەلا ئەفەندی مانەوە تاکو نەمانی حکوومەتی رەشید عالی گەیلانی ئینجا گەڕانەوە شاری بەغدا، جا لەم ماوەیە مەلا ئەفەندی ژن و منداڵەکانی لەباداوە گواستنەوە بۆ قەڵای، مەلا ئەفەندی چەند ساڵێک بەعارەبانە لە باداوان دەهاتە مزگەوتی قەڵا و دەگەڕایەوە پاشان ئۆتۆمبێلێکی کڕی و هاتوچۆی مزگەوتی قەڵای پێ دەکرد.

مەلا ئەفەندی دوای ئەوەی، کە باوکی لە ساڵی (١٨٩١) کۆچی دوایی دەکات، تەمەنی (٣٠) ساڵ بووە، کە دەبێتە مەلای مزگەوتی قەڵا و لە شوێنی باوکی ئیجازە بەمەلایان دەدا، نزیکەی (١٠٠) مەلا ئیجازەیان لە مەلا ئەفەندی وەرگرتووە، مەلا ئەفەندی لە ماوەی ژیانی (٤) ژنی هێناوە، کوڕی گەورەی کە ناوی عزەدین بوو، تا ساڵی (١٩٥٨) لە ناو خانووەکەی لە باداوان جێوار بوو، دوای شۆڕشی (١٩٥٨) ماڵی دەهێنێتە ناو شاری هەولێر و لە سەرەتای شەستەکان قەسرەکەی مەلا ئەفەندی لە باداوە ژمارەیەک ماڵە بارزانی بە رەزامەندیی عیزەدینی کوڕی مەلا ئەفەندی هاتنە ناوییەوە، جا دوای ئەوەی شۆڕش دەستی پێ کردەوە، بارزانییەکان قەسرەکەیان بەجێ هێشت، پاشان ماڵی شێخ رەشیدی لۆلان لەگەڵ بنەماڵەکەی و سۆفی و موریدەکانیان هاتنە ناو قەسری باداوە، ئەم بنەماڵەیەش لە ناوەڕاستی شەستەکان باداوەیان بەجێ هێشت. دوا بەدوای ئەمانە چینە ماڵێکی دیکەی سەر بەبنەماڵەی شێخ رەشیدی لۆلان، کە خەڵکی خواکورک و دەوروبەری بوون، لە قەسرەکە جێوار بوون و قەسرەکەیان بێ ناز راگرت. لە ئەنجامدا قەسر ئاگری تێبەر بوو، ئینجا ئەو کەرەستەیەی لە خانووەکەدا مابۆوە، لەناوچوو بەجارێک قەسرەکە تەخت بوو.

**گوندی باداوە**

گوندی باداوە بەقسەی مام خدر لە (٣٠٠) ساڵ زیاترە ئاوەدانە و کاتی خۆی لەلایەن بنەماڵەیەک لە هۆزی زەنگەنە ئاوەدان کراوەتەوە و یەکپارچە شینایی بووە، بەهۆی جۆگەی بنەسڵاوە ئاقاری باداوان ئاو دراوە تا ساڵەکانی حەفتاکانیش باداوە بریتی بووە لە دوو گەڕەکی سەروو و خواروو ئاوی بنەسڵاوەش بەنێوان هەردوو گەڕەکەکەدا دەهات و بەرزاییەکیش لە نێوان هەردوو گەڕەکەکە هەبوو، بەبەرزاییی گەمبۆران دەناسرا، ئەم گوندە لە کۆتایی پەنجاکانی ئەم سەدەیە دەوروبەری (١٦٠) سەد و شەست ماڵ بوو.

ناوی باداوە لە رووی زمانەوە تا ئێستا روون نەبۆتەوە لە چییەوە هاتووە، واتە لە باداوە بەولاوە ئاوەدانی نەماوە، یا لە باد (ئاوایی)ی گوند + اوا (ئاوەدانی) گوند ئاوەدان کردنەوە هاتووە، یا لە (با) هاتووە، هەمیشە ئەم شوێنە (با)ی لێ هاتووە.

دووریش نییە یەکێک بەناوی (باد) ئەم گوندەی دروست کردبێت و پاشان بەناوی ئەو کەسە ناسرابێت بە (باداوە)، چونکە باد ناوێکی کوردییە، بەڵام ئەمڕۆ رۆڵی نەماوە لەناو لێنان، بۆ نموونە دامەزرێنەری دەوڵەتی دۆستەکی (باد کوڕی دۆستەک) بووە. بۆ ئاگاداری گوندێکیش نزیک قادر کەرەم بەناوی باداوە هەیە.

جا دوای ئەوەی زۆربەی زەوییەکانی ئاقاری باداوە دەدرێتە بنەماڵەی مەلا ئەفەندی، کە هەموو زەوییەکانی نێوان ئیسکان و باداوە و دەوروبەری باداوە، گرتۆتەوە. مەلا ئەفەندی لە ناو زەوی خۆی لە گوندی باداوە خانوویێکی گەورەی دوو چین دروست دەکات و هەر چوار دەورەی دەکاتە رەز و بێستان.

**کۆشک و قەسرەکەی باداوە...!**

کۆشکی باداوە، لە سەرەتای سەدەی بیستەم بەدەستی ودستا (ناعوم)، کە کابرایەکی مەسیحی خەڵکی شاری مووسڵە دروست کراوە. هەروەک ناوبراو گوتی: (کە دەچوویە ناو کۆشکەکە دەرگایەکی گەورە، کە تاقێکی لەسەر بوو، باوەشی پێدا دەکردی و لە ژوورەوە لە دەستە چەپدا پارکێکی گەورە هەبوو، ئینجا رەز و باخێکی گەورە

بەداری (زی) دەور درابوو، (جـۆرە دارێکە درک و داڵی زۆرە) ئەوجـا حـەوزێک بەرامبـەر دیوەخـان دێت و دوو ژووری دیکەی میوانانی بەدوادا دەهات و لە هەردوو چیندا تارمـەییـەکی گـەورەی هەبوو و بەدەرگـایەکی داری گـەورە دەرۆیشـتـیـە ژووریّ و لەلایەکەی دیکە چوار ژوور هەبوو، بۆ پاسـەوان و قاوەچی و شـوفێر و قـاوەڵێنان، کە تەرخان کرابوون، لە ناوەڕاستیشدا پێبلقەیەک هەبوو، کە بۆ چینی یەکـەم پێی بەسـەر دەکـەوتن و لەلای راسـتـدا ژوورێکی گـەورەی هەبوو، بۆ پێـشـوازیی مـیـوانان و ژوورێک بۆ نانخـواردن، هۆڵێک لە دوای ئەو ژوورانە هەبوو لەگـەڵ ژوورێکی دیکەی گـەورە، ئەم ژوورە رووی لەلای مـاڵێ بوو، کە لای (حەرەم) شوێنی ئافرەتانی پێ دەگوترێ و بە مەمەرێک دەرۆیشتییە ئەو بەشە، کە ژوورێکی پێشوازیی هەبوو، لە تارمەکە رووی لە گومەت و ناو شاری هەولێر بوو، پێش ئەوەی بڕۆینە ناو کـۆشـکەکـە هێندە داروباری وەک لیـمـۆ و پرتەقاڵ دەورەی حەوزێکی ئاوی دەدا، کە لە مەرمەڕی دروست کرابوو، تارمەیەکیش وەک پشتێنێک لە ناوەوەدا بەرامـبـەر ئەویش حـەوزێکی دیکەی ئاوی لە مــەرمــەڕ دروست کــرابوو، نافــورەیەکی تێــدا بوو و حەوشەیەکی لێ بوو، چێشتخانەیەکی گەورەی هەبوو، کە لە بینایەکی سەربەخۆ پێک دەهات، ئەویش (٥) ژووری تێدا بوو، کە ئاشپەز و کارەکەرەکان کاریان تێدا دەکرد.

**لای ئافرەتان:**

لای ئافـرەتان چینی سـەر زەوی بوو، کـە بریتی بوو لە هۆڵێکی گـەورە و دوو ژوور و لە ناوەڕاسـتی هۆڵەکـەدا نەردیوانێک هەبوو، پێش ئەوەی بگەیتـە چینی یەکـەم ژوورێک هەبوو، گـەرمـاوێکی تێدا بوو، لەوێوە پەیژەکە دەبوو بەدوو بەش و لەسـەرەوە لە پێش هۆڵێکی گـەورە یەکـیـان دەگـرتەوە و بەو ژوورە دەچوویە سـەر تارمـە و بەلایەکەی دیکەی دەرۆیشتییە ژوورەکانی ناوەوە و لەلای چەپدا دوو ژوور هەبوو، بەرامـبـەریش هەروا دوو ژووری دیکەی لێ بوو، دوای ئەوانەش سالەیەکی گەورەی بەناو (عـــروس) هەبوو و دوای ئەمـــەش دوو ژووری دیکە و گەرماوێک هەبوو، کۆشکەکە کە لە دار و ئاوێنە دروست کرابوو و رەز و بێستـانێکی گەورە، کە زەیتـوون و ترێ و لیـمـۆ و زەردەلوو و جـۆرەها داری دیکەی تێدا بوو و ترێ بەشێکی زۆری رەز و باغەکەی داگیر کردبوو، لەگەڵ گوڵ و گــوڵەباخــدا لە دەرەوەی کــۆشــکەکــە کــۆدەبوونەوە و ژوورەکانیش هەموویان بەنەخش و نیگار رازابوونەوە.

**بینەرانی کۆشکەکە دەڵێن..!**

هەروەکـو گـوتمان باسکردن و پێناسـەکردنی کۆشکەکە تەواو نابێت، دیارە زێدەڕۆییـمـان سـەبارەت بەو گـوتەیە نەکـردووە. بەڕێز عـوسمـان موفـتی گـوتی: کۆشکی باداوە گـێـتـیـیـەکی زۆر سەیروسەمەرە بوو لەلایەنی بیناسازی و نەخش و نیگارییـەوە.. تاد، سـەبارەت بەبیناکـەوە دەبووە دوو بەش، بەشـێک لە (حـەرەم)یان پێ دەگـوت ئەوە لە دواوە سـەربەخۆ بوو، بەشی پێشەوەش دیوەخـانی میـوانان بوو، هەر بەشێکیشی پتر لە (٥٠- ٦٠) ژووری گەورە و بچووکی تێدا بوو، رەزێکی گەورەش چەندان جۆرە میوەی لێ چاندرابوو و باشـتـرین وەسـتـاش لە ئێـران و عـێـراق و تورکیا بەشداریيان کردبوو لە دروستکردنی کۆشکی باداوە، کە دەرۆیشـتـیـیـە ژووریّ هۆڵێکی گەورە هەبوو، لەو هۆڵە ژوورێک هەبوو، تەلەفـۆنێکی تیادا بوو، تەلەفۆنەکە دوو پارچە بوو، بە پارچەیەک گـوێت لێ دەگـرت و پارچەکـەی دیکەش قسـەت دەکرد. کە دەچوویە سەرەوە دیواری پەیژەکە نەخش و نیگاری سـەیروسـەمـەرەی لەسـەر کـێـشـرابوو، شـووشـەی پەنجـەرەکـان رەنگاورەنگ بوون و تارمـەکـەش دەیڕوانییە رەز و باغـەکـان و مـوەلیـدەیەکی کارەباش هەبوو لە دەرەوەی دوو کـۆشـکەکـەدا، من مـوەلیـدەکـەم دیتـبـوو، ئینگلیـزی بوو، دەنگی زۆر خـۆش بوو، کـە هەڵدەکـرا دەیگوت:

چک.....چک.....چک.....چک و گــــڵــــۆپی کۆشکەکان پێ دەبوون- وەک ئەوانەی ئەمڕۆ، کە مولیدەی کارەبا هەیە و کارەبا بەماڵان دەدات.

هەروەها ناوبراو لە قسـەکـانی بەردەوام بوو، گـوتی: بۆ خــۆم لە ســاڵی (١٩٥٦- ١٩٥٧) پێش شــۆڕشی عەبدولکەریم قاسم لەو کۆشکە خەوتوومە، کاپتن (های)، کـە هاتۆتە هەولێـر حـاکـمی سیـاسـیی ئینگلیـزی بوو لە کـتێـبـەکـەی (سنتـان فی کردسـتـان)، باسی ئەم کـۆشـکەی کردووە.

بەڕێز مەلا عەبدوڵلا فەرهادی لە وەسفی کۆشکەکەی باداوە گوتی: کۆشکەکە، دوو باخچەی هەبوو، باخچەیەکی تایبەتی لە ناو کۆشکەکەی هەبوو، ئەوەی چواردەوردش رەز و باخێکی گەورەی هەبوو، هێندەی جێی گوندەکەی زەویی داگیر کردبوو، جۆرەها میوەجاتی تێدا بوو، چواردەوریشی دیواری لێ کرابوو، داری زیشیان لێ چاندبوو. لە بەهاراندا هەر گوڵ و گوڵەباخ هەبوو، کۆشکەکانیش دوو کۆشک بوون، یەکێک هی ماڵێی بووە، کە رۆژهەڵات و رۆژئاوا بوو، خانەوادەکەی تێدا بوو. دیوەخانیش لەلای سەرەوە بوو، کە لە باشوورەوە بۆ باکوور درێژ دەبۆوە.

هەروەها بەڕێز (سابیر عومەر) کە لەدایکبووی ساڵی (١٩٢٥)ی دانیشتووی گوندی باداوەیە دەڵێ: لە ساڵی (١٩٤٤) لەگەڵ عزەدینی مەلا ئەفەندیدا بووم، هەتا ساڵی (١٩٥٩) و رۆژگاری مەلا ئەفەندیشم بەبیر دێ. لە باسی کۆشکەکەدا گوتی: کۆشکەکە چوارگۆشە بوو، دارودرەخت دەورەی ئەم چوارگۆشەیەی دابوو، کە لە پرتەقال و گوێز و ترێ.. تاد پێک دەهات. لە دواییدا دیوارێکی زۆر بڵند هەبوو، دەرگایەکی گەورەشی هەبوو، لەولایە دیوەخان بوو، ئەویش دوو چین بوو، ئەمەیش هەر لە ناو رەزی بوو، هەرچی ئەو سەڵتەنەتەی ئەتۆ تەماشات دەکرد ساڵێ (٥٠٠) بارەترێی لێ دەفرۆشرا. نزیکەی (٥٠٠)یش بۆ دیاری دەرۆیشت. کۆشکەکەش لە کەرپووچ و گێچ دروست کرابوو، تەنها سەری داربوو، نەخش و نیگاری وای لێ هەڵکەنرابوو و کاریتەی وای تیا بوو سپی دەتگوت کاغەزە، مەلا ئەفەندی دیوەخانەکەی گەورە کرد، کە کاتێ ترێ دادەهات دەیگوت: "کوا ئەو جۆرە ترێیە بۆ بۆم نەهات.. هەمووی بۆ خۆی دەیزانی چ رۆژێک پێ دەگات".

دەیگوت:"ئەگەر بمزانیبایە ئەم ترێیە بەبەر دیوەخانێ دەکەوێت، دیوەخانەکەم گەورە نەدەکرد" هەروەها گوتی: کۆشکەکە تەلەفۆن و کارەبای خۆی هەبوو.

**تەریقەت و ئیجازەی مەلایەتی..!**

بەڕێز (مەلا عەبدوڵلا فەرهادی) گوتی: وەسفی ئیجازەی مەلا ئەفەندی ناکرێ، دەبایە قوتابیی ئەو شارەی لەسەر نان و شیوی مەلا ئەفەندی بێت. بەرگی بۆ دەکردن و جبە و کورتەک و شەرواڵ و پێڵاوی بۆ دەکردن. بەڕێز (عوسمان موفتی) گوتی: مەلا (عەبدولکەریم مودەریس) خوا تەمەنی درێژ کا، کاسێتەکم هەیە بەدەنگی خۆی دەڵێت: قوتابی لە (میسر) دەهاتن پارەی تەیارەی هاتن و چوون و خەرجی و جلوبەرگی هەمووی لەسەر مەلا ئەفەندی خوالێخۆشبوو بوو.

هەروەها بەڕێز (سابیر عومەر) گوتی: مەلا ئەفەندی پیاوەکی زۆر گەورە بوو، خانەدانەکی زۆر رێکوپێک بووە و ئەو کابرایە هەر رۆژێ کە دەیانگوت: فلانە مەلا ئیجازە وەردەگرێ، ئاهەنگ دەگێڕدرا لە مزگەوتی قەڵای لە ناو فەقێیان لە سەر مەسرەفی ئەو، ئینجا کە مۆڵەتەکەی دەدا، جلوبەرگ و پێڵاوی بۆ دەکرد و دەینارده گوندێک و دەبووە مەلا.

هەروەها سەبارەت بە مەلا ئەفەندی بەڕێز (عوسمان موفتی) گوتی: مەلا ئەفەندی (وسام الرافدین) و (وسام خادم الحرمین)ی هی سوڵتانی عوسمانی وەرگرتووە و ئەوانەش بەهۆی ئەو خزمەتە زۆرەی، کە پێشکەشی بە خەڵکی کردووە.

**(قەسری باداوە لە رۆژگاری بەڕێز عزەدین ئەفەندی)**

بەڕێز سابیر عومەر لەبارەی قەسری باداوە لە رۆژگاری عزەدین ئەفەندی گوتی: کاتێک عزەدین بووە نائیب لە بەغدا، ئەو کاتی شێخ ئەحمەدی بارزانی بۆ شاری بەسرە دوور خرابۆوە، کاتێکیش کە لە ساڵی (١٩٤٤) رێکەوتن (مفاوزات) دەستی پێ کرد، شێخ ئەحمەد بەخۆیی و ماڵ و منداڵ و دەوروبەری (٣٠- ٤٠) لە پیاوەکانی هاتنە کۆشکی باداوە و (٤- ٥) رۆژ لە کۆشک مانەوە، لەم ماوەیەدا جارێک بارزانی نەمر لە بارزانەوە هات سەردانی کرد، هەر لەم ماوەیەدا چوار ئەفسەری کورد لە سوپای عێراقی پەیوەندییان بەشێخ ئەحمەد کرد لە باداوە، کە عزەت عەبدولعەزیز و برادەرەکانی بوون، ئینجا دوای ئەو چەند رۆژە شێخ ئەحمەدی بارزانی و ئەفسەرەکان چوونەوە بارزان.

بەڕێز عوسمان موفتی گوتی: لە ساڵی ١٩٤٥ جارێکی دیکە بارزانی نەمر هاتەوە هەولێر و لەوێوە بۆ رێککەوتن (مفاوەزات) چووە شاری مووسڵ و بۆ ئێوارە گەڕایەوە هەولێر، جا دوای ئەوەی شەو لە هەولێر دەمێنێتەوە بەیانی

دەگەڕێتەوە بارزان، هەروەها بەڕێز سابیر عومەر وتی لە هەمان ساڵ جارێکیان بارزانی بۆ ڕێککەوتن هاتبووە بەغدا، ئەوکاتی منیش لە بەغدا بووم، بۆ مەبەستی ڕێککەوتنەکە بارزانی نەمر لەگەڵ عزەدین ئەفەندی بۆ ماوەی کاتژمێر و نیوێک لە میوانخانەی (زەیبە) خاوەنەکەی دیانێک بوو لە شەقامی ڕەشید گفتوگۆیان کرد، منیش لە دەرەوە راوەستابووم، پاشان لێک دابڕاین و بارزانیی نەمریش گەڕاوە بارزان و ڕێککەوتن سەری نەگرت.

پاشان عزەدین ئەفەندی بانگی کردم و وتی سابیر بەخۆت و ئەحمەد وسوو و عەدۆ غەفوور بەیانی ئامادە دەبن دەچینە لای شێخ مەحموود لە داری کەلی لە سلێمانی، جا کە گەیشتینە ئەوێ لای حەپسەخانی نەقیب میوان بووین، ئێوارە شێخ لەتیف لەگەڵ (مەلا سەدیق)ی پارێزگاری سلێمانی هاتنە لامان، بەڕێز پارێزگار بە عزەدین ئەفەندی وت: چوونە لای شێخ مەحموود ترسناکی مەترسی تێدایە و ئاگادار بە کەوتوویە ژێر چاودێری.

ئینجا عزەدین ئەفەندی نامەیەکی نووسی و دایە دەست مەلا خالیدی، کە خەڵکی گوندی مورتکە بوو پیاوێکی زانا بوو، کە ئاشنایەتییەکیان لەگەڵ شێخ مەحموود هەبوو و کاغەزەکەی برد بۆ شێخی نەمر. ، عزەدین ئەفەندیش چووە هەڵەبجە و لەگەڵ بەڕێوەبەری ناحیە چوونە باغە کۆن و پاشان چوونە سەر گۆڕی شێخ عیسا و شێخ عوسمانی تەوێڵە.

کاتێکیش ڕێککەوتن لەگەڵ بارزانی نەمر و لەشکرەکەی بەرەو سنووری ئێران ڕۆیشتن، حکوومەتی عێراقیش ماڵ و منداڵی ئەو بارزانییانەی، کە مابوونەوە لە گوندەکان گواستەوە بۆ دەشتی دیانە و لەوێ تەلبەندی کردن، کە دەگمەن پیاویان تێدا مابوو، ئەوکاتی عزەدین ئەفەندی هێشتا نەببووە وەزیر، عزەدین ئەفەندی و (جەمال عومەر نەزمی)ی پارێزگاری هەولێر و بەهائەدین نووری کۆنە وەزیریان کردنە لیژنەی سەرپەرشتی ماڵ و منداڵی بارزانییان، لیژنەکەش بەسەرۆکایەتیی عزەدین ئەفەندی بوو، سەرەتا بانگی پیاوەکانیان کردن، کە تەنها چەند پیاوێکی پیریان تیا مابوو، هەندێکیان موختاری گوندەکان بوون، دیار بوو باریان زۆر نالەبار و بێ خواردن و برسی بوون، ئینجا ناونووس کران و بۆ ماوەی دەورووبەری پێنج مانگ لەم تەلبەندەدا خۆراکیان بەسەر دابەش دەکرا.

سێ بارەگاشمان هەبوو کە جوندیان و شانەدەر و مەسیف بوو. دوای ئەم ماوەیە بڕیاری گەڕانەوەیان بۆ گوندەکانیان درا، تەنها دانیشتوانی گوندی بارزان و چەند گوندێکی دەورووبەری نەبێت، کە گواستنیانەوە بۆ دەشتی هەولێر و دابەشیان کردنە سەر گوندەکان و تا ساڵی (١٩٥٩) مانەوە، دوای ئەوەی بارزانییەکان لە ڕووسیا گەڕانەوە کوردستان، ئەوانیشیان لە دەشتی هەولێر گەڕاندەوە بارزان.

جا بەڕێز مام سابیر گوتی: دوای گەڕانەوەی بارزانییەکان لە ڕووسیا ، من لە هەولێر بووم، کە عزەدین ئەفەندی لە بەغداوە تەلەفۆنی بۆ کردم و گوتی: سابیر کۆشکەکەم بەبارزانییەکان داوە کەی هاتن زۆر بەڕێزەوە پێشنوازییان لێ بکەن، جا کاتێک بارزانییەکان گەیشتنە قەسری باداوە، دەرگامان بۆ کردنەوە و بەدۆڵ و زوڕنا لێدان پێشوازیمان لێکردن، سەرەتا (١٨) هەژدە ماڵ لەو بارزانییانەی لە ڕووسیا گەڕابوونەوە، کە زۆربەیان ژنەکانیان ڕووس بوون هاتنە ناو قەسری باداوە، دوای ئەوەی هەریەک بەکاری خۆی و بە پسپۆڕی خۆی دامەزرا لە بەڕێوەبەراتییەکانی هەولێر و سلێمانی چوار کۆمەڵە ماڵی لەم جۆرە یەک لە دوای یەک هاتنە قەسری باداوەوە لە بەڕێوەبەراتییەکان دامەزران، ئەمەش دەورووبەری سێ مانگی خایاند، هەر کۆمەڵە ماڵێک لەمانە (١٥- ٢٠) ڕۆژ لە قەسرەکە دەمایەوە ئینجا مام سابیر وتی بەدرێژایی ئەم ماوەیە ئێمە چوار پاسەوان پاسەوانیی ماڵە بارزانییەکانمان دەکرد و مانگانە (٣٥) دینارمان لەلایەن میرییەوە بۆ بڕایەوە، بەڵام لەبەرئەوەی من سەرکاری قەسرەکە بووم و پێویستم بەپارە نەبوو، وەرم نەگرت.

هەروەها عوسمان موفتی وتی: لە ساڵی (١٩٥٩) جارێک بارزانی نەمر هاتە هەولێر و لە میوانخانەی (محطة) دابەزی و پیاوماقوڵانی هەولێر و خەڵکێکی زۆر چوونە لای، هەر هەندەمان زانی ئەو شەوی بارزانی نەمر و دوو بارزانی دیکە هاتنە ماڵی ئێمە لە قەڵای و شەو لە ماڵی ئێمە مانەوە، بەیانی دوای نانخواردن هاتنە دەرەوە، سەیرمان کرد خەڵکێکی زۆر راوەستاون بۆ دیتنی بارزانی

نەمر و یەکسەر، کە چاویان بە بەرێزی کەوت بەشیعر خوێندنەوە خەڵکەکە جۆشی کوردایەتیی سەند.

جا دوای ئەوەی شۆڕشی ئەیلوول دەستی پێ کردەوە، حکوومەتی عێراقی (شێخ رەشیدی لۆلان) و خزم و کەسوکاری هێنایە ناو قەسرەکە و ئەوانیش دەوروبەری چەند ساڵێک لە ناو قەسرەکە مانەوە، دوای ئەوانیش هەندێکی دیکە لە خزمانی برادۆستەکان و خواکورکییەکان هاتنە ناو قەسرەکە و بەهۆی هێشتنەوەی قەسرەکە بەبێ خزمەت بووە هۆی ئاگر تێ بەربوونی و پاشان لەلایەن هەندێک لە خەڵک تالان کرا و کتێبخانەکەش سووتا، کە بەسەدان کتێب و دەستنووسی دەگمەنی بەزمانانی فارسی، تورکی، عەرەبی تێدا بوو.

عوسمان موفتی وتی: عزەدین ئەفەندی بەتەما بوو قەسری باداوە بۆ نەخۆشخانەی وەرەم تەبەروع بکات و بەخۆڕایی بیدات بە حکوومەت، بەڵام بەبێ پرسی عزەدین قەسری باداوەی دا بەهەندێک لە هۆزەکانی سەر سنوور.

## پێشوازی لە مەلیک فەیسەڵ..!

ساڵی (١٩٤١) لە شۆڕشی (رەشید عالی) شاژن (عالیة) هاتە هەولێر، مەلیک فەیسەڵ تەمەنی (٤- ٥) ساڵ دەبوو، لە کۆشکی بوو، (مەلا عەبدوڵلا). فەرهادی گوتی: من لە ناو ئۆتۆمبیلی دیتم بۆ باداوان دەچوو، هەروەها گوتی: ئەوەی من ئاگادار بم شا فەیسەڵی دووەم لەگەڵ دایکی هاتنە باداوەی.

(عوسمان موفتی): لە پێشوازیی شا (فەیسەڵی) یەکەم، لە قوشتەپەی هەتا هەولێرێ ئەوبەر و ئەمبەر خەڵک راوەستابوون. شا (فەیسەڵ) بە ئۆتۆمۆبێلێکی سەر واڵا هات. بۆ رۆژی دوایی چووە لای مەلا ئەفەندی لە کۆشکی باداوەدا.

## ئەو کاتە هەولێر چۆن بوو؟!

(عوسمان موفتی): ئێستا کۆشکی مەلا ئەفەندی لە نزیک ئەو گومەتە بووە کە لە باداوان دایە و هەر (٥٠٠) مەتر لێی دوور بووە. لەوێرا هەتا ژێر قەڵای چۆڵ بووە بە (١٠- ١٥) دەقیقەی دەگەیشتینە باداوەی و زۆر دوور بوو هەندێک سەری دەسووڕا لە رێگادا، گەڕەکەکانی هەولێریش تەیراوە و تەعجیل و خانەقا بوون، دوای ساڵی (١٩٥٥) هەولێر گەورە بوو، ئەو گەڕەکانەی کە دانرا ئازادی و ئیسکان بوو..!

## شێوەی نانخواردن و جلوبەرگ لە ناو کۆشک..!

بەرێز (عوسمان موفتی) سەبارەت بەشێوەی نانخواردن گوتی: شێوەی نانخواردنیش دوا ئەتەکێتی ئەورووپا بوو، کورسی و مێز، مڵاک و چەنگاڵ و چەقۆ. تاد هەریەکەی لە شوێنی خۆی بوو، هەروەک کوتاڵیش هەبوو، ئاشپەزی تایبەتیشی هەبوو، دوایین ترازی خواردن و خواردنەوەی ئەورووپی لە باداوە پەیڕەو دەکرا هەموو ئەتەکێت، ئەتەکێتی ئێستا چۆنە لە باڵیۆزخانەکان ئەو کاتە لە باداوە ئەوها بوو.

هەروەها بەرێزی گوتی: عزەدین ئەفەندی دەگێڕێتەوە دەڵێ: تەمەنم (١٥) ساڵ بوو، قاتێکی شینم لەبەردا بوو، گۆرەوییەکی قاوەییشم لە پێدا بوو، کە باوکم دیتی گۆچانێکی لێ دام و گوتی: (بڕۆ گۆرەوییەکەت بگۆڕە لە قاتەکەت ناوەشێتەوە).

## کرێکارەکانی مەلا ئەفەندی

(شەقڵچی): گوایە مەلا رەئووف ئەفەندی خاڵی وی بووە. شەقڵچی، کە جۆخینەکان لە هەر گوندەکی بایە دەچوو ئاگای لێبێ و شەقڵی بکا بۆ خاتری کە دەستێکی لێ نەدرێ تا دابەش دەکرێ نەخورێ.

مامۆستا (مەلا عەبدوڵلا فەرهادی) گوتی: مەلا عەزیزێک هەبوو، ئامۆزای ئەو شێخی چۆلییەی بوو، لەگەڵ ئەو مەلا رەئووفەی ئەوانە شەقڵچی بوون لەسەر هەموو گوندەکانی کەندێناوە و ئەو دەوروبەرەی هەولێرێ.

(ئاشچی): هیدایەت دیان بوو، دوایێ بوو بە ئیسلام کوڕێکی هەبوو.

ئۆتۆمبێلی میوانانیش کە وەکی ئەم ماسلیسانە بوو، ئەوا ئیبراهیم باداوەیی لێیدەخوڕی. لە هەولێرێ سێ ئۆتۆمبیل هەبوو، سێیەمین ژمارە ئەتۆمبیلی مەلا ئەفەندی بوو.

(باخچەچی): حاجی زرار باخچەچی مەلا ئەفەندی بوو.

(قاوەچی): قادر خۆشناو بوو.

(مەدرەسە): بەبەردەوام لە قوتابخانەی (١٢) فەقێی هەبوو، (٦) (موستەعید) و (٦) (سوختەی) لێ هەبوو.

**چەند تێبینییەک و زانیارییەکی خۆم دەربارەی ئەم زانایە بەڕێزە:**

١- ئەم زاتە لە کاتی پشوودانیدا لە ڕۆژانی سێشەممە کە (وانە گوتنەوەی تێدا نەدەکرا،خەڵکی شار بەگەورە و گچکەیانەوە دەهاتنە خزمەتی. ئەویش بەڕوویێکی خۆش بۆ خوێندنی قورئانی پیرۆز و قەسیدەی بوردیەی (البوصیری)، ئەوانیش چەند کەسێکیان هەڵبژارد وەک خوالێخۆشبوو (سەید مەردان و عەبدولڕەزاق و شەهابە) و چەندانی دی.

٢- لە مزگەوتی قەڵا خوتبەی ڕۆژانی جومعە بەخۆی دەیخوێندەوە، دانیشتوانی مزگەوت دەستیان بەگریان دەکرد، چونکە خۆی دەگریا، ئەگەر لە خوتبەکە باسی پڕ سۆزی ئایینی تێدا بکرابایە، هەندێ جاریش مەلا محەممەد ئەفەندی

موفتی- یش خوتبەی دەخوێندەوە خوا پاداشتیان بە بەهەشتی بەرین بداتەوە.

سەرچاوە و پەراوێزەکان

**أ) پەراوێزەکان**

١- سەوڵەت ئاباد: شارۆچکەیەکە نزیک بەشاری سنە، لەبەرئەوەی تاکە سۆڵە (نەعلە)یەکی پێغەمبەری (د.خ) لێ هەڵگیراوە، بۆیە ناوی ئەم شارۆچکەیە بەم ناوە ناسراوە.

٢- حکوومەتی عوسمانی لە ساڵی (١١٢٨) کۆچی گوندی باداوەیان دا بە بنەماڵەی مەلا ئەلیاسی و پاشان گوندی تەندوورە، ئینجا فەرمانی پێدەرچوو، کە ئەم دوو گوندە زەکاتی لەسەر نەبێ، بۆ ئەوەی پارەکەی لە زانستی ئایینی خەرج بکرێت.

٣- مەلا ئەبوبەکری سێیەم و مەلا ئەبوبەکری چوارەم (مەلا ئەفەندی). بەکچک مەلا (مەلا گچکە) ناسراون.

٤- سەرجەڵەی بنەماڵەی مەلا ئەلیاس، مەلا خدر، شەهابەدین، شەمسەدین، مەلا ئەیوب، مەلا عومەر، مەلا ئەبوبەکر، مەلا ئەلیاسی کوڕی بەهائەدین لە ساڵانی نێوان (١٤٣٩- ١٥٣١ز) دا ژیاوە.

٥- جارێک والی بەغدا دێتە ماڵی ئەبوبەکری سێیەم، مەلا ئەبوبەکر شێوی ساواری بۆ لێ دەنێ و عوسمانی کوڕیشی سفرەیەکی لە جۆرەها چێشت بۆ ئامادە دەکات، کاتێ سفرە داخرا. مەلا ئەبوبەکر بەوالی دەڵێت، ئەو ساوارەی هی منە و ئەو سفرەیەش هی (عوسمانی کوڕم)ە، والی دەڵێت لە ساوارەکە دەخۆم..

٦- مەلا ئەفەندی لەگەڵ مەلیک فەیسەڵ بەزمانی تورکی قسەیان کردووە، مەلیک فەیسەڵ کاتی خۆی لە ئەستەمبوڵ تورکی فێر ببوو.

٧- مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا فەرهادی دەڵێ: جارێک لەسەر نوێژکردنی ڕۆژی هەینی مەلا هیدایەت لەگەڵ مەلا ئەفەندی نێوانیان تێک دەچێت، مەلا ئەفەندی دەڵێت نابێ بێجگە لە مزگەوتی قەڵا و مزگەوتی شێخی چۆلی لە هیچ مزگەوتێکی دیکە نوێژی هەینی بکرێت، مەلا هیدایەتیش چووە لای مەلیک لە بەغدا و شکایەت بکات، یەکسەر مەلیک پێی وت لە کوێوە هاتووی..؟ قوربان لە هەولێر.. ئینجا یەکسەر هەواڵی مەلا ئەفەندی لێ پرسی، مەلا هیدایەتیش زانی نێوانی مەلیک و مەلا ئەفەندی خۆشە، بۆیە سکاڵاکەی نەکرد و گەڕایەوە بەبێ ئەمری مەلا ئەفەندی نەجوولایەوە.

٨- ئەحمەد عوسمان خزمی مەلا ئەفەندی بوو، مەلا ئەفەندی، ئەحمەد عوسمانی کردووە بە موتەسەریفی شاری هەولێر، جا دوای ئەوەی بەینی مەلا ئەفەندی و ئەحمەد عوسمان ناخۆش دەبێت، مەلا ئەفەندی کاغەزێک لە بۆ بەغداد دەنووسێ بەعەبدولڕەزاقدا ڕەوانەی دەکات و پاش چەند ڕۆژێک ئەحمەد عوسمان دەگواسترێتەوە سلێمانی و لەوێ دەبێت بە موتەسەریف.

٩- شەقڵ: بریتی بوو لە پارچەدارێک بەقەد دەست ئەستوورە و ڕووبەرەکەشی بەقەد کتێبێک دەبوو دەسکێکی پێوە بوو لە شێوەی مالنج، هەر شەقڵێک نەخشی تایبەتی خۆی هەبوو، کە لە ڕووی دارەکە هەڵکەنرابوو، کە گەنمەکە شەقڵ دەکرا نەخشەکەی لەسەری دەردەچوو، کەس نەیدەتوانی دەستکاری بکات. هەر خاوەن گوندێکیش

شەقڵی تایبەتی خۆی هەبوو، وەکو (مۆر) وا بوو، جیا بوو لە شەقڵی خاوەن گوندی دیکە، دوور نییە شەقڵ لە شەکڵ هاتبێت، چونکە شکڵی نەخشەکە لەسەر رەوسەی گەنمی دەردەچێت، لە کەرکووک بە شەقڵ دەڵێن (جیس)، زۆر جار لە دەشتی هەولێر بەشەقڵچی دەگوترا خەملچی.

ئەم وشەیەش لە خەملاندن هاتووە.

* مامۆستا فارس دەڵێت: تەنها دوو کەس خاوەن زەوی بوون لە باداوە، کە ئەمانەن (رەحمان شێخ سمایل و عەبدولقادر ناوێک)، ئەگینا هەموو زەویی باداوان موڵکی مەلا ئەفەندی بوو.

پاشان مامۆستا فارس دەڵێت: بنەماڵەی گاوانان کاتی خۆی لە بالیسان هاتوون لە سەردەمی عەبدوڵڵای باپیرە گەورەم، کە دەکاتە پێنج پشت بەمجۆرە: فارس عەباس مەولوود سلێمان عەبدوڵڵا، ئەمڕۆکەش ئەم بنەماڵەیە دەوروبەری (١٠٠) سەد ماڵ دەبن.

بەڕێز سابیر عومەر لەدایکبووی ساڵی (١٩٢٥)ە و لە بەرەی گاوانانە و دانیشتووی گوندی باداوەیە.

لە ساڵی ١٩٤٣ تا ساڵی ١٩٥٩ سەرکاری قەسری باداوە بووە و سەرپەرشتی فرۆشتنی دەغڵ و دانی گوندەکانی بنەماڵەی مەلا ئەفەندی کردووە.

مام سابیر دەڵێت: هەر گوندێک سەرکارێکی هەبوو لەگەڵ شەقڵچییەک، یەکێک هەبوو (نازیل)یان پێ دەگوت، کە کاری حسابکردن دەغڵ و دانی جۆخین بووە، هەر جۆخینەی چەند عەلبەی بکردبا حیسابی دەکرد و دەینووسی، جا کە کڕیار بهاتبایە سەر جۆخینێ سەرەتا جۆخین نەدەپێورا، بەڵکو لە گوشان دەکرا، من کە سەرپەرشتی فرۆشتنم دەکرد دوو گوش (تەلیس)ی گەورەم هەڵدەبژارد و کڕیاریش تەلیسێکی گچکەی هەڵدەبژارد. گەنمی هەرسێ تەلیسمان تێکەڵ دەکرد و حیسابمان دەکرد، ئینجا هەموو دەغڵەکەمان لەسەر ئەم کێش و حیسابە دەفرۆشت، لەم فرۆشتنەدا دەبووایە مزی (حەق)ی سەعیە، کە من بووم لە هەر عەلبە گەنمێک سێ درهەم لە کڕیار وەربگرم، بەڵام من وەرم نەدەگرت.

* بەڕێز مام سابیر دەڵێت: کاتێک لە ساڵی (١٩٤١) بنەماڵەی مەلەکی رایان کرد و هاتنە قەسری باداوان مەلا ئەفەندی (٧- ٨) چەکداری راسپارد کە شەوانە پاسەوانییان لێ بکەن و ئاگاداریان بکەن هیچ کەسێک بەشەو لە قەسرەکە نزیک نەبنەوە.

هەروەها لە باسی مەلا ئەفەندیدا دەیوت: مەلا ئەفەندی هەموو ساڵ ماست، پەنیر، هەنگوین، رونی مەڕی بۆ مەلیک و وەزیرەکان بە ئۆتۆمێلی خۆی رەوانە دەکرد.

* شێخ ئەحمەد بارزان لە ساڵی ١٩٣٣ بۆ خوارووی عێراق دوور خرایەوە و لە ١٩٤٣/٧/١٢ گەڕاندیانەوە سلێمانی.

* لە رۆژی ١٧/ ١٠/ ١٩٤٤ مفاوەزاتی حکوومەت و شۆڕشی کرد و تا ١٠/ ٨/ ١٩٤٥ی خایاندووە دوای ئەوەی رێککەوتن سەری نەگرت شەڕ دەستی پێ کردەوە، دوای ماوەیەک بارزانی نەمر و پێشمەرگەکان بەرەو ئێران رۆیشتن.

**سەرچاوەکان:**

١- سلسلة جدي كجك ملا/ تأليف رشاد محمد المفتي الي كجك ملا، جمع وتحقيق عثمان رشاد محمد المفتي ١٤١٣ه -١٩٩٢م.

٢- زانای گەورە و ناوداری کورد / مەلا ئەفەندی/ کەریم شارەزا گۆڤاری هەولێر ژمارە (٣) ١٩٩٩.

٣- دیمانەیەک لەگەڵ بەڕێز ئازاد عززەدین. (مەلا ئەفەندی) لەبارەی کۆشک و قەسرەکەی مەلا ئەفەندی.

٤- دیمانەیەک لەگەڵ مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا فەرهادی لە رۆژی ١٩/ ١/ ٢٠٠١.

٥- چەند زانیارییەک لەبارەی موڵکایەتی لە (حاجی سلێمان سمایل)ی باوکم وەرگرتووە.

٦- دیمانەیەک لەگەڵ خدر عەبدوڵڵا دانیشتووی گوندی باداوەیە و لە هۆزی زەنگەنەیە. تەمەنی لە (١٠٠) ساڵ زیاترە.

٧- دیمانەیەک لەبارەی گوندی باداوە لەگەڵ بەڕێز مامۆستا فارس عەباس.

٨- دیمانەیەک لەگەڵ بەڕێز (سابیر عومەر)، کە نۆبەتدار و سەرکاری ماڵی مەلا ئەفەندی بووە.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر ژمارە (٤)ی ساڵی ٢٠٠١ وەرگیراوە.

# مەلای گەورە
# ١٨٧٦-١٩٤٣

**کەریم شارەزا**



مەلای گەورە نازناو و شۆرەتی زانای ناوداری ئایینی و شاعیری کوردپەروەر مەلا محەمەدی کوڕی مەلا عەبدوڵڵای کوڕی حاجی مەلا ئەسعەدی جەلی زادەیە. لە ساڵی ١٨٧٦دا لە شاری کۆیە چاوی ژیانی هەڵێناوە. ئەم زاتە هەر لە منداڵییەوە نیشانەی زیرەکی و بلیمەتی پێوە دیار بووە، بۆیە لە تەمەنی (٥) ساڵییەوە چۆتە بەر خوێندنی ئایینی و دەوری فەقێیەتی زوو بڕیوە. لە تەمەنی ١٤ ساڵیدا لەلای باوکی دوا قۆناغی خوێندنی وەرگرتووە، لەبەر زیرەکی لە ١٨ ساڵیدا خوێندنی تەواو کردووە و ئیجازەی عیلمی لە حاجی مەلا عەبدوڵڵای باوکی وەرگرتووە و بووەتە مەلایەکی دوازدە عیلم.

کە باوکی لە ساڵی ١٩٠٨دا کۆچی دوایی کردووە، نازناوی (سەرۆکی زانایان)ی بۆ ماوەتەوە و لەو کاتەوە لە کوردستان بە (مەلای گەورە) ناوبراوە و لە جێگای باوکی دەستی کردووە بەدەرس گوتنەوە وەکو ئەو سبەینان لە مزگەوتی گەورەی کۆیە و پاش نیوەڕۆیانیش لە مزگەوتی (حاجی مەلا ئەسعەد) دەرسی گوتۆتەوە، لە هەموو لایەکی کوردستانی گەورەوە، قوتابی و موستەعیدی وریا و زیرەک روویان تێ کردووە. لە هاوینیشدا لە هاوینەهەواری چنارۆک دەرسی گوتۆتەوە و هەموو خەرجییەکی جلوبەرگ و خۆراکی فەقێ و موستەعیدەکانی لەسەر کیسەی خۆی بووە.

## پایەی کارگێڕی و هەڵوێستی سیاسی:

مەلای گەورە لە ساڵی ١٩١٢دا کراوە بەموفتی کۆیە و لە ساڵی ١٩١٤شدا کراوە بەئەندامی ئەنجومەنی ویلایەتی مووسڵ و لەلای سولەیمان نەزیفی والی، پایە و رێزێکی زۆری لێ نراوە. لەگەڵ بڕانەوەی جەنگی یەکەمی جیهانی و داگیرکردنی کوردستان لەلایەن ئینگلیزەکانەوە و هاتنیان بۆ کۆیە لە دوا دوای ساڵی ١٩١٨دا کراوە بەقازیی کۆیە. کاتێکیش کە حکوومەتی عێراق دامەزراوە، لە ساڵی ١٩٢٤دا بەئەندامی ئەنجوومەنی دامەزراندنی عێراق هەڵبژێردراوە، کە لە رۆژی ١٩٢٤/٣/٢٧دا لەلایەن مەلیک فەیسەڵی یەکەم کراوەتەوە و چوار مانگی خایاندووە. لە رۆژی ١٩٢٤/٨/٢دا کۆتایی هاتووە.

مەلای گەورە گەلێک وتاری بەنرخی بەزمانی عەرەبی لە ناو ئەو ئەنجومەنە داوە و داوای مافی نەتەوەیی کوردی کردووە. لە دواییدا گەڕاوەتەوە سەر فەرمانەکەی (قازییەتی کۆیە) تاکو لە ساڵی ١٩٢٨دا دەستی لە هەموو کار و فەرمانێکی میری هەڵگرتووە و کەوتووەتە سەر دەرس گوتنەوە و شیعر نووسین و کتێب دانان.

مەلای گەورە هەروەک زانایەکی ئایینی گەورە و کارگێڕێکی لێهاتوو بووە، لە هەمان کاتیشدا پیاوێکی سیاسی و کوردپەروەرێکی بەجەرگی خاوەن هەڵوێست بووە. لەگەڵ بڕانەوەی جەنگی یەکەمی جیهانیدا دەستی لە تورکی عوسمانلی شووشتووە. چونکە بۆی دەرکەوتووە، کە تەنیا خزمەتی خۆیان نەبێ، خزمەتی هیچ نەتەوەیەکی تریان نەکردووە. لەگەڵ سیاسەتی چەوتی ئینگلیزیش نەبووە، کە لەگەڵ کوردی بەکاری دەهێنا و دەیزانی هەر بۆ بەرژەوەندیی خۆیان کار دەکەن. ئەم هەڵوێستەی لە دێرە شیعرێکیدا دەربڕیوە و گوتوویەتی:

**سوورەی موو زەردی چاوشین نەکەی بەئومێدی بێ**
**ئەوومل بەقووەتی خۆت، دووەم بەعەونی رەببی!**

لە راستیدا مەلای گەورە لەگەڵ ئەوەدا بوو، کە کورد خۆی حوکمڕانیی خۆی بکات. جا ئەو کەسەی حوکمی دەکات شێخ مەحمودی حەفید بێت یان حەمدی بەگی بابان، کە ئینگلیزەکان دوای دوورخستنەوەی شێخ مەحمود بۆ هیندستان لە دوای ١٩١٩دا، دەیانویست ئەو بکەن بەمەلیکی کوردستان. بەڵام میللەتی کورد پتر چاوی لە شێخ مەحمود بوو، بۆیە لە ١٩٢٢/٩/٣٠دا دوای ئازادکردنی لە نەفیکردنی بۆ هیند گەیشتەوە سلێمانی و کابینەی دووەمی حکومەتەکەی دانا و بووەوە مەلیکی کوردستان. بەڵام ئینگلیزەکان دیسان کەوتنەوە دژی و لە شوێنی وەکو هەولێر و کۆیە و ڕەواندز لە دژی دەدوان. بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٢٣دا سەرکردەیەکی سوپای ئینگلیز دێتە کۆیە و لە ماڵی جەمیلئاغای حەویزی قایقام، لە مەلای گەورە دەپرسێ و دەڵێ: "تێ ناگەین شێخ مەحمود لەبەرچی ئەو هەرا و ئاژاوەیە بەخۆڕایی بەرپا دەکات؟". مەلای گەورەش لەو پرسیارەی پەست دەبێ و لە وەڵامدا پێی دەڵێ: "ئەگەر شێخ مەحمود وڵاتی ئێوەی داگیر کردبایە، ئێوە رازی دەبوون و شۆڕشتان نەدەکرد؟" ئیتر کاربەدەستەکەی ئینگلیز بەو وەڵامەی مەلای گەورە بێدەنگ دەبێت.

مەلای گەورە هەردەم لەگەڵ ئەوەدا بووە، کە کورد مافی چارەنووسی خۆی بەدەستی خۆی دیاری بکات و ببێتە دەوڵەت. هەمیشە ئامۆژگاری خەڵکەکەی کردووە بۆ یەکگرتن و زانست. فێر بوون تاکو بگەنە ئامانجی نەتەوەیی خۆیان، تاکو لە ڕۆژی ١٩٤٣/١٠/١٢دا لە تەمەنی ٦٧ ساڵیدا هەر لە شاری کۆیە کۆچی دوایی کرد، میللەتی کورد مەلایەکی زانا و مەزن و شاعیرێکی شیعری کۆمەڵایەتی و نیشتمانی لە کیس چوو.

**مەلای گەورەی شاعیر:**

مەلای گەورە لە پاڵ زانایی لە هەموو زانستێکی ئایینی نەقلی و عەقلی و فیقە و مەنتیقەوە، شاعیرێکی شیعری کۆمەڵایەتی و نیشتمانیش بوو و دیوانێکی پتەوی لە شیعری بەهێزی لە پاش بەجێما و لە دوای کۆچی دواییش لە بەرگێکی ڕێکوپێکدا لە چاپخانەی کوردستان خوالێخۆشبوو گیوی موکریانی چاپ یکرد.

ئەم شاعیرە مەزنە هەموو مەبەستێکی لە شیعر نووسینەکەیدا ئامۆژگاریکردنی ڕۆڵەکانی میللەتەکەی بوو، بۆ ئەوەی بەعیلم و هونەر بێنە مەیدانی ژیان، نەک بەنەزانین و دواکەوتوویی لەم بارەیەوە دەڵێ:

**بەریشی پان و پرچی پڕ لە ئەسپێ**
**بناغەی نیشی کوردان چۆن دەچەسپێ**

**بەکەشکۆڵ و سواڵ و فەقر و زیللەت**
**مەحاڵە کاکی خۆم تەشکیلی دەوڵەت**

شاعیری سیاسەتزانمان لەوە گەیشتووە، کە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی بەدواکەوتن و جەهالەت نابێ، بەڵکو دەبێ بنەمایەکی مەعریفی و زانیاریی هەبێ ئینجا ئەو کارە سیاسییە بکات.

مەلای گەورە وەک سیاسییەکی سەردەم لە ڕووداوە پڕ کارەساتەکانی نەتەوەکەی خۆی دواوە و بەتەواوی هەڵوێستی نەتەوەیی خۆی دەرخستووە، هەروەک لە هۆنراوەیەکیدا کە بەبۆنەی ئەو کوشتارەی، کە حکومەتی عێراق لە شۆڕشی یەکەمی بارزان لە ساڵانی ١٩٣١-١٩٣٢ لە خەڵکی ناوچەی بارزانی کردووە، دایناوە و لە بەشێکیدا دەڵێ:

**لە مانگێ زیاترە جەیشی عێراقی**
**بەئەسبابی جیدال و تەمتوراقی**

**هجوومی کردە سەر بارزانی مسکین**
**بەتەییارە و بەشەستیر و بەزێلین**

**لە جێی لالە و گوڵی سووری نیسان**
**لەسەر کێوان ڕژاندی خوێنی کوردان**

دوای ئەو هەنگاوەش شاعیرمان دەکەوێتە سەر وەسفی ئەو ئەنفالکردنەی، کە دەرحەق بەکەسی بێ تاوان و ژن و منداڵی کورد کراوە و دەڵێ:

**ئەوی دەستیان کەوێ منداڵە یا ژن**
**لە خاکی دا سەرە و بنیان دەنێژن!!**

**هەزار منداڵ و ژنیان سەر بڕیوە،**
**هەزار کیژی عەفیفیان زگ دڕیوە!**

ئایا چ شاعیرێکی گەورەی ئەمڕۆکەمان لەمە باشتر وەسفی یەکەمین ئەنفالی خەڵکی کوردستانی کردووە، کە حکومەتی عێراق بەیارمەتیی هێزی ئاسمانی بەریتانیا بەرامبەر بەکوردیان کردووە و ئەو کوشتارە دڕندانەیان لەم میللەتە کردووە.

مەلای گەورە بەپێچەوانەی ئەوانەی دەڵێن ژیانی دنیا هیچە و هەر دین و قیامەت بەنرخ و بەهادارە، لە هۆنراوەیەکیدا دەڵێ پێویستە مرۆڤ دنیا و دینی بەیەکەوە هەبێ و دەڵێ:

**ئەوی دنیای نەبێ دینی زەعیفە**
**مەلا بێ یانە شێخ بێ یا خەلیفە!**

# محەمەد عوسمان موفتی
# ١٨٧٣-١٩٤٥



محەمەد ئەفەندی موفتی كوڕی مەلا عوسمان كوڕی مەلا ئەبوبەكری، ناسراو بە (كچوك مەلا)، لە بنەماڵەیەكی زۆر كۆنی ئایینی لە ساڵی ١٢٩٠ی كۆچی بەرامبەر بە ١٨٧٣ی زایینی لە شاری هەولێری دێرین هاتۆتە دنیاوە. لە مزگەوتی قەڵاتی هەولێر، كە مزگەوتی بنەماڵەكەیان بووە، خوێندنی ئایینی و هەموو زانستەكانی فیقهی زمانی عەرەبی و فارسی وەرگرتووە و گەیشتۆتە پایەیەكی بەرز لە خوێندنی مەلایەتی و ئیجازەی عیلمی لە (حاجی عومەر ئەفەندی)ی مامی وەرگرتووە و هەر لە مزگەوتی قەڵاتدا دەستی بەدەرس گوتنەوە كردووە.

لە سەردەمی حوكمڕانیی سوڵتان عەبدولحەمیدی عوسمانی فەرمانی دەرس گوتنەوەی لە هەولێر بۆ دەرچووە و هەر لەو دەمەدا پەیوەندیی لەگەڵ ڕێبازی تەسەوفی نەقشبەندی پەیدا دەكات و لە ئەنجامدا دەبێتە خەلیفەی شێخ حیسامەددینی نەقشبەندی هەورامانی. بەفەرمانی سوڵتانیش بەموفتی هەولێر دادەمەزرێ و نازناوی (موفتی) بۆ خۆی و رۆڵە و نەوەكانی بەدەست دێنێ.

كە لە ساڵی ١٩١٨دا ئینگلیزەكان دەگەنە هەولێر، (كاپتن هێی) سەركردەی هێزەكەیان دەبێ. كە دەزانێ محەمەد ئەفەندی كەسێكی زانایە، هاتوچۆی دەكات و دەرسی فارسی لەلا دەخوێنێ. بەڵام دەبێ ئەو راستییەش بڵێین كە سەركردەكانی سوپای بەریتانیا كەم و زۆر فارسییان زانیوە، بۆیە دەبێ هاتوچۆی محەمەد موفتی كردووە تاكو زانیاریی زێدە و نوێ لەبارەی زمانی فارسییەوە وەربگرێ.

محەمەد ئەفەندی موفتی لە تەمەنی ٧٢ ساڵیدا لە پاییزی ١٩٤٥دا لە هەولێر كۆچی دوایی كرد و هەر لەو شارەشدا لە گۆڕستانی بنەماڵەكەیان بەخاك سپێردرا.

**محەمەد موفتی و ئەدەبیات:**

محەمەد ئەفەندی لە سەرەتای لاوییەوە ئارەزووی شیعر و ئەدەبیاتی كوردی و فارسی و عەرەبی و توركی بووە. هەموو دەم هەر خەریكی خوێندنەوەی بەرهەمی شاعیرە مەزنەكانی ئەو نەتەوانە بووە.

لە كوردیدا بەزۆری هەر خەریكی خوێندنەوەی شیعرە بەرزەكانی نالی و حاجی قادری كۆیی بووە و لە فارسیدا دیوانی حافزی شیرازی و لە عەرەبیدا شیعرەكانی (إبن الفارض) و (عبدالباقي العمري الموصلي) و لە توركیشدا شیعرەكانی (فزوولی) زۆر بەدڵ بووە. كە دەستی داوەتە شیعر دانان، بەهەر چوار زمان شیعری نووسیوە. لە شیعرە كوردییەكانی ئەم چوارینەمان چنگ كەوتووە و دەڵێ:

**بەینی دوو شاخی ستەم، (رۆم و عەجەم) داماوە كورد**
**هەم لە دەریای جەهالەت نووستووە، خنكاوە كورد**
**ناگرن بۆ یەكتری بۆیە وەها سووتاوە كورد**
**چاوی قەلبی كوێر بووە بۆیە وەها خولقاوە كورد!**

كاتێك سەرنج دەدەینە داڕشتنی ئەم چوارینەی هەست دەكەین شیعرێكی پتەو و سەركەوتووە و هەموو شیعرناسێك خاوەنەكەی بەشاعیرێكی چاك دەزانێ.

**بەرهەمەكانی محەمەد موفتی:**

محەمەد ئەفەندی موفتی وەك زانایەكی ئایینی و شێخێكی ڕێبازی نەقشبەندی چەند نووسینێكی بەزمانی عەرەبی نووسیوە و ئێستاكە لە كتێبخانە مەزنەكەی بنەماڵەی موفتی لە شاری هەولێر پارێزراون، كە ئەمانەی خوارەوەن:

١- رسالة في الطريقة النقشبندية.
٢- تفسير القرآن الكريم.
٣- شرح بعض الأحاديث النبوية الشريفة.
٤- شرح قصيده البردة والمنفرجة.

**كەریم شارەزا**

# خەیروڵڵا عەبدولکەریم
# ١٩٤٧-١٩١٢

ئەفسەری نیشتمانپەروەری کورد و خەباتگێڕی فیداکار، شەهید خەیروڵڵا کوڕی عەبدولکەریم ئەفەندی کوڕی عەبدوڵڵا ئاغای گورجیزادە، لە ساڵی ١٩١٢دا لە گەڕەکی تۆپخانە لە قەڵاتی هەولێر لەدایک بووە. باوکی لە دوا دوای حوکمی عوسمانی و سەرەتاکانی حکومەتی عێراق لە هەولێر و گەلێ شار و شارۆچکەی باشووری کوردستان بەڕێوەبەری دارایی بووە. خەیروڵڵای منداڵ ئەو دەوروبەر و شوێنانەی بینی و چاوی کرایەوە. کاتێک کە ماڵیان لە دوای برانەوەی جەنگی یەکەمی جیهانی لە شاری هەولێر جێگیر بوو، چووە قوتابخانەی سەرەتایی هەولێر. قوتابییەکی گەلێک زیرەک بوو. کاتێک لەو قۆناغەی خوێندنی بووەوە چووە بەغدا لە



(خانەی مامۆستایان) وەرگیرا، لەوساوە بەهرەی هونەریی لە شانۆ و مۆسیقا و پەیکەردارشتن چەکەرەی دا و کاتێک کە بووە مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی لە (کۆیە) و (چەمچەماڵ) و (شەقلاوە)، گەلێک چالاکی هونەری لەسەر شانۆی قوتابخانەی ئەو شار و شارۆچکانە لەگەڵ مامۆستا و قوتابییان نواند و سەرنجی هونەردۆستانی راکێشا و دەریخست، کە ئەکتەرێکی شانۆیی لێهاتووە. بەتایبەتی ئەو دەورە سەرکەوتووەی کە لە ساڵی ١٩٣١دا لە شاری کۆیە لە شانۆگەری (کچی کوردستان) لەسەر شانۆی قوتابخانەی یەکەمی سەرەتایی لە دەوری (مامۆستا) نواندی و سەرنجی هەموو تەماشاکارانی راکێشا.

دوای ئەوەی کە بۆ ماوەی پێنج ساڵ خزمەتی پەروەردەکردنی نەوەی نوێی گەلەکەی خۆی کرد، چووە بەغدا و لە خوێندنگای عەسکەری وەرگیرا و لە ماوەی خوێندنەکەی ناردرا بۆ میسر بۆ فێربوونی هەندێ کاروباری هونەری عەسکەری. کە خوێندنی تەواو کرد، بەپلەی مولازمی دووەمی کارگێڕی دامەزرا. لە کۆتایی

سییەکانی سەدەی رابردووەوە ئەم تێکۆشەرە کەوتە مەیدانی خەباتی نەتەوەیی و چووە ریزەکانی حزبی هیوا، کە لە ساڵی ۱۹۳۹دا لەسەر هەیکەلی (کۆمەڵەی دارکەر) بەسەرۆکایەتیی رەفیق حیلمی دامەزرا بوو. ئەم تێکۆشەرە چالاکییەکی سیاسیی تەواوی نواند، بۆیە حکوومەت کەوتە چاودێریکردنی هەڵسوکەوتی، ئەویش کە زانی مەترسیی گرتنی هاتۆتە سەر، لە ساڵی ۱۹٤٥دا چووە پاڵ شۆڕشی بارزان و لەوێوەش خۆی گەیاندە بزووتنەوە رزگاریخوازییەکەی کوردستانی ئێران و ئەو کاتە مولازمی یەکەم بوو.

کاتێک کۆماری دیموکراتیی کوردستان لە ۱۹٤٦/۱/۲۲دا بەسەرۆکایەتیی پێشەوا قازی محەمەد دامەزرا، بووە یەکێک لە ئەفسەرە خەباتگێڕەکان، کە لە ژێر سەرکردایەتیی بارزانی مستەفا پارێزگاریان لە کیانی کۆماری کوردستان دەکرد و ئەم زاتە لەگەڵ هاوڕێیانی عیزەت عەبدولعەزیز و میرحاج ئەحمەد و مستەفا خۆشناو و عەزیز شەمزینی و نووری ئەحمەدی تەها و محەمەد قودسی.. دەورێکی باشیان لە پارێزگاریکردن لە کۆماری دیموکراتیی کوردستان بینی.

ئەو گۆڕانکارییەی لە رۆژهەڵاتی کوردستان رووی دا، هانی بارزانی دا بۆ دامەزراندنی حزبێکی دیموکراتیی جەماوەری لەسەر شێوەی حزبی دیموکراتی رۆژهەڵاتی کوردستان و لەگەڵ هاوڕێیان و ئەندامانی لیژنەی ئازادی، (حەمزە عەبدوڵلا و میرحاج ئەحمەد و عیزەت عەبدولعەزیز و خەیروڵلا عەبدولکەریم و مستەفا خۆشناو و محەمەد قودسی و نووری ئەحمەدی تەها) بەردی بناغەی حزبەکەیان دانا و لە کۆنگرەی دامەزراندنیدا، کە لە بەغدا لە ۱۹٤٦/۸/۱٦ بەناوی (پارتی دیموکراتی کورد) دامەزرا و لە کۆنگرەی سێیەمیدا کە لە ۱۹٥۳/۱/۲٦ بەسترا ناوەکەی بووە (پارتی دیموکراتی کوردستان). دەریش کەوت، کە خەیروڵلا عەبدولکەریم یەکێک بووە لە دانەرانی پەیڕەو و پرۆگرامی حزبەکە. شەهید خەیروڵلا نزیکەی ساڵ و نیوێک لە هێزی بەرگریی کۆماری کوردستان، بەرامبەر بەئەرتەشی شاهەنشاهی ئێران و لەسەر ئەو ئازایەتییەی، محەمەد حوسێن سەیفی قازی وەزیری جەنگ بەفەرمانی قازیی محەمەد پلەی (مایۆر) واتە (رائید)ی پێ دا.

کاتێکیش کە ئەو کۆمارە ساوایەی کوردستان لە ۱۹٤٦/۱۲/۱۷دا رووخێنرا و پێشەوا قازی محەمەد و هەڤاڵانی لەسێدارە دران، رائید خەیروڵلا لەگەڵ هاوڕێیانی عیزەت عەبدولعەزیز و مستەفا خۆشناو و محەمەد قودسی گەڕانەوە بۆ عێراق و دەستبەسەر کران و حوکمە کۆنەکەیان کە لە کاتی چوونە پاڵ شۆڕشی بارزان و کۆماری دیموکراتیی کوردستان بە لەسێدارەدان حوکم درابوون بەسەریاندا سەپاندن و لەبەرەبەیانیی ۱۹٤۷/٦/۱۹ لە بەندیخانەی مەرکەزی بەغدا لەسێدارە دران و تەرمەکەی شەهید خەیروڵلا عەبدولکەریم ناردرایەوە شاری هەولێر و بەرێزێکی زۆرەوە و بەئامادەبوونی دەستەیەک لە تێکۆشەرانی شارەکە بەخاک سپێردرا و چووە ریزی شەهیدانی کورد و کوردستان، حکوومەتی هەرێمی کوردستان دوای دامەزراندنی، پەیکەرێکی شیاوی بۆ دارشت و لە مەیدانێکی گەورە و سەرەکیی شارەکەی هەولێری پایتەختی کوردستانی دانا تاکو هەر کەسێکی ئەو پەیکەرە شکۆدارە ببینێ خەبات و بەرخۆدانی ئەو شەهیدە مەزنەی بێتەوە یاد.

**کەریم شارەزا**

# مستەفا خۆشناو

## ١٩٤٧-١٩١٢



مستەفا عەبدولکەریم ناسراو بە "مستەفا خۆشناو"، لە ساڵی ١٩١٢دا لە گوندی بێتواتەی خۆشناوەتی لەدایک بووە، هەر منداڵی ساوا دەبێ باوکی دەمرێ و دایکی کڵۆڵی دەیهێنێتە شاری کۆیە، بە کەریم ئاغای واحید ئاغای حەوێزی دەسپێرێ بۆی بەخێو بکات، ئەویش لەگەڵ بەکر عەبدولکەریمی کوڕی پەروەردەی دەکات و بەکوڕی خۆی تۆمار دەکات و بە (مستەفا عەبدولکەریم) ناو دەبرێ، دایکیشی شوو بەکابرایەکی خۆشناو دەکاتەوە.

مستەفا و بەکر لە پایزی ١٩٢٠دا لەگەڵ کردنەوەی قوتابخانەی سەرەتایی کۆیە دەچنە بەر خوێندن و مستەفا عەبدولکەریم لە ساڵی ١٩٢٨دا خوێندنی سەرەتایی.تەواو دەکات و دەچێتە بەغدا و لە خانەی مامۆستایان وەردەگیرێ. نازناوی خۆشناو بۆ خۆی دادەنێ. لە ١٩٣٠دا خوێندن تەواو دەکات و دەبێتە مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی و چەند ساڵێک خزمەتی پەروەردەکردنی نەوەی نوێی کورد دەکات، ئینجا دەچێتە کۆلێجی عەسکەری، کە دەردەچێ بەپلەی مولازمی دووەم لە سوپای عێراق دادەمەزرێ.

مستەفا خۆشناو لە ساڵی ١٩٣٩دا دەچێتە پاڵ حزبی هیوا و دەبێتە ئەندامێکی هەرە چالاکی ئەو حزبە نەتەوەییەی کورد و لە ساڵی ١٩٤٢دا ئەو حزبە شاندێک دەنێرێ بۆ رۆژهەڵاتی کوردستان بۆ پەیوەندیکردن بەبزووتنەوەی رزگاریخوازیی کورد لەو بەشەی کوردستان و بریتی دەبێت لە (میر حاج ئەحمەد) و (مستەفا خۆشناو) لەوێ پەیوەندی بەکۆمەڵەی (ژ.ک)ەوە دەکەن.

کاتێک کە شۆڕشی ١٩٤٣-١٩٤٥ی بارزان هەڵگیرسا و حکوومەتی عێراق خۆی تاقی کردەوە بۆ دامرکاندنەوەی و چەند هێرشێکی سەربازیی کردە سەر شۆڕشگێڕان، بەڵام لە ئەنجامدا لە خۆی گەیشت کە بەشەڕ کێشەی کوردی پێ چارەسەر ناکرێ، بۆیە پەنای بردە بەر گفتوگۆ لەگەڵ سەرکردەی شۆڕش مەلا مستەفای بارزانی، نووری سەعید وەزارەتێکی نوێی لە ١٣/١٢/١٩٤٣دا دامەزراند و "ماجد مستەفا"ی کردە وەزیری دەوڵەت بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد، ئەویش لەگەڵ بارزانی کۆبوونەوە و بڕیاری ئاگربەست درا دەستەیەک لە ئەفسەرە دڵسۆزەکانی کورد کران بەئەفسەری پەیوەندی لە نێوان شۆڕشی کورد و حکوومەتی عێراق و مستەفا خۆشناو کرا بەئەفسەری پەیوەندی لە بارزان.

کاتێک حکوومەتی نووری سەعید هەڵوەشایەوە، حکوومەتی عێراق لە بەڵێنەکانی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد پاشگەز بووەوە و ئەفسەرە خەباتگێڕەکانی وەک (مستەفا خۆشناو و عیززەت عەبدولعەزیز و خەیروڵڵا عەبدولکەریم و محەمەد قودسی و بەکر عەبدولکەریم حەوێزی و نووری ئەحمەدی تەها) و چەندانی تر چوونە پاڵ شۆڕشەکەی بارزان و فیداکارانە لە دژی هێزەکانی حکوومەتی بەغدا جەنگان. لەبەر ناهاوسەنگی لە چەک و تفاق و هێزی شەڕکەر لەگەڵ حکوومەتدا، بارزانیی نەمر و پێشمەرگە و ئەفسەرە تێکۆشەرەکان و خاووخێزانیان ئاودیوی رۆژهەڵاتی کوردستان بوون و چوونە پاڵ بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد لەو بەشەی کوردستاندا و بەشدارییان لە دامەزراندن و پارێزگاریکردن لە کۆماری دیموکراتیی کوردستان کرد. کاتێک بەراسپاردەی بارزانی پارتی دیموکراتی کوردستان لە کوردستانی عێراق لە ١٦/٨/١٩٤٦دا دامەزرا، مستەفا خۆشناو هەرچەندە لەمەهاباد بوو، بەڵام بەئەندامی یەکەمین لیژنەی پارتی دیموکراتی هەڵبژێردرا.

کاتێکیش کۆماری دیموکراتیی کوردستان لە ١٧/١٢/١٩٤٦دا رووخێنرا، مستەفا خۆشناو و ئەفسەرە خەباتگێڕەکانی هەڤاڵی گەڕانەوە عێراق و حکوومەتی بەغداش حوکمی لەسێدارەدانیانی دەرکرد، لە بەردبەیانی رۆژی ١٩/٦/١٩٤٧دا مستەفا خۆشناو و عیززەت عەبدولعەزیز و خەیروڵڵا عەبدولکەریم و محەمەد قودسی لە بەندیخانەی مەرکەزیی بەغدا لەسێدارە دران و گیانی پاکیان چووە دنیای شەهیدانی کورد و کوردستان.

**کەریم شارەزا**

# ڕەمزی نافیع
# ڕۆڵەیەکی هەولێر
# فیداکاری سەربەخۆیی کوردستان

**محەمەد گۆران**

" لە ساڵی ١٩٤٣دا ئەگەر کورد ئاوێکی روونی شک بردبایە بۆ نەتوانەوە و حەسانەوە نەدەشیا ڕۆڵەی وەها بەناز پەروەردەکراوی خۆی، لە باوەشی گەرموگوڕی باوک و دایکییەوە هەڵدات بۆ گاڵتە بەگیان کردن، بۆ ڕێی هاتێک و دە جاران نەهات، ئەوەندەی بیستبێتم و زانیبێتم ڕەمزی یەکەم کورد بووە بۆ کوردایەتی یان بۆ هەر نیاز و تەما و مەبەستێک بێ بەپێلیژەی هەوادا، لە شەوی تاریک سەر و ژێر بووبێتەوە بۆ مەجهولێکی پڕ لە ترسی شەکەتبوون و مل شکاندن و مەرگ".

ئەوە بەشێکی دیکەی وەسفکردنی ڕەمزی نافیعە لە زمانی مامۆستا مەسعوود محەمەدەوە، بەپێوانەی ئەو ڕۆژگارە، ڕەمزی گەنجێکی خۆپێداوی حەسایەوەی شەنگی بەرچاوی دەسکە گوڵی هیوای لە دەست دابوو. لەلایەنی پێداویستیی ژیانی کامەرانییەوە ئەگەر تەماعیشی تێدا بەکاربێت ڕەمزی بەولای تیری و تەسەلییەوە بوو، نیازێک نەبووە لەوانەی دڵی گەنجێکی خورتی کوردی ئەوسای بۆ بچێ، ڕەمزی پێی نەگات هەتا خەیاڵی چرووک بەدڵی کرمێدا هاتوچۆی پلانگێڕی بکات، بۆ هەڵبەستنی نیازێکی قرپۆک لە ویژدانی ڕەمزیدا لەوە پتر بەدەستەوە نادات کە پیاوەتی وەها مەزن لە ڕەمزییەوە وەک زەهر بێ وەهایە بۆ ناو زار و گەرووی بێگەن.

سەرسامبوونی مەسعوود محەمەد بە ڕەمزی نافیع دەگا بەوەی کە بڵێ " ڕەمزی ڕۆڵەی بەشەرەفی کورد و هەولێر، نامەوێ لە بیرەوەریتدا چەتری فیز و ناز بەقەڵەمەکەم لێ بدەم و بڵێم، پێی ناوێت بۆ شەهیدان شیوەن و گرین: بەهەموو ماناوە شاگوڵێک بووی لە باخی کوردایەتیدا، بەر لە پشکوتن هەڵوەرین. ئاواتێک بەناکامی نیشتمانت چوویت، بزەیەک بوویت لە شەبەقی بەیانیدا، بەر لە خۆر هەڵات لەسەر لێوانەوە وشک بوویتەوە. وای لە ڕەنجی بەفیڕۆ ڕۆیشتووت وای لە ژیانی بێ ئامان و سامانی میللەتەکەت بەکوژانەوەت، وای لە بێ ڕەحمی ڕۆژگار بەتەنینەوەی فەرامۆشی لە دەورەی پرشنگی ناو و خەباتت. هەزاران هەزار فرمێسکی بەکوڵ بۆ سەر خاکی قەبرە پیرۆزەکەت نازداری هەولێر ڕەمزی گیان ".

**ڕێککەوتنی ڕەمزی و ئەڵمانەکان:**

ڕەمزی نافیع ڕەشید ئاغا لە ناوەڕاستی جەنگی جیهانیی دووەمەوە، ئەو دەمەی کە لە شاری ئەستەنبوڵ دەیخوێند بەهۆی بیروباوەڕی پتەوی کوردایەتی و دەستڕۆیشتوویی بنەماڵەکەی لە کوردستان، ڕێکخراوی هەواڵگریی ئەڵمانیا پەیوەندی لەگەڵ دەبەستن،

لەوێوە بەڵێنی ناڕاستەوخۆ، دواتریش کە دەیبەن بۆ ئەڵمانیا، ڕێک کەوتن کە ڕەمزی بکرێت بەسەرۆکی کوردستان و لە بەرامبەریشدا تا ماوەیەک وڵاتی ئەڵمانیا سوود لە نەوتی کەرکووک ببینێت، چونکە ئەو ماوەیە ئەڵمانیا بەدەست کەمیی سووتەمەنییەوە دەیناڵاند، پێش خۆئامادەکردنیش ڕەمزی نافیع "ئاڵای کوردستان" بەدەستی خۆی دەنەخشێنێ و لەگەڵ خۆیاندا چەندان جۆری گەورە و بچووک لەو ئاڵایە دەهێننەوە بۆ کوردستان لە پاشان کە ئەو نەخشەیەی ڕەمزی لەگەڵ ئەڵمانەکاندا دایدەڕێژێ شکست دێنێ و ڕەمزی بۆ ماوەی چەند ساڵێک لە بەندینخانە دەمێنێتەوە تا ئەو کاتەی عەقڵی تێک دەچێت و تووشی نەخۆشیی دەروونی دەبێت.

ئەو کارەی کە ڕەمزی لەم ماوەیەدا کردوویەتی ناکرێ مرۆڤ خۆی لێ نەبان بکات و باسی لێوە نەکات، چونکە پەیوەندیی بەڕووداوێکی گەورەی کوردی و جیهانییەوە هەیە و وەک کوردیش بەدنەکی و شێواندنی مێژووی خۆمانە، کە هەر کەسێک لەم وڵاتە لە جانفیداکاری و مەردایەتیی ڕەمزی نافیع بێ ئاگا بێت، بەڵام ئێمە بۆ تا ئێستا بێ ئاگاین و حەقی تەواومان نەداوەتە ڕەمزی؟ لە وەڵامی ئەمەدا دکتۆر (ئەرسەن مووسا ڕەشید) مامۆستای مێژوو گووتی: " ئێمەی خەڵکی هەولێر تەبیعەتێکی زۆر سەیرمان هەیە و هەستی نەتەوایەتیمان لاوازە، سلێمانی بۆ خۆیان زۆر باشن و هێندێ کەسیان هیچیشیان نەکردووە، بەڵام ئەوان باسی دەکەن، لەوانەشە هێندێ کەس حەز بکەن باسی ڕەمزی بکەن، بەڵام لە ترسی ئەمەریکا و بەریتانیا نایانەوێت ئەم بابەتە زەق بکەنەوە ". دکتۆر ئەرسەن ئەوەشی گوت کە دەزگاکانی راگەیاندن زۆریان بۆ هەندێ کەس کردووە و لە بەرامبەر ڕەمزیشدا کەمتەرخەم بوونە و ئەوان وەکو بنەماڵە نایانەوێت ڕەمزی لە خۆی زیاتر گرنگی پێ بدرێت، تەنیا ئەوە دەخوازن کە حەقی خۆی بدرێتێ، چونکە لە کۆتاییدا مێژوو کەس بزر ناکات. هەر لەو بارەیەوە (قەرەنی ئەسوەد) کەسایەتیی شاری هەولێر گوتی " ئێمەی خەڵکی هەولێر خۆپەرستیمان تێدا نەبووە وەکو شارەکانی دیکەی کوردستان، منیش زۆر جار ئەو قسەیە بەبرادەرانی هەولێر دەڵێم کە ئەو مەسەلەیە کەمترخەمییەکە لەوانەی خۆیان بەخاوەنی هەولێر زانیوە". قەرەنی ئەسوەد گوتیشی کە لە هەموو جووڵانەوە کوردییەکاندا هیچ شارێک بەقەدەر هەولێر زەرەرمەند نەبووە و شار هەبووە دوو تەقەی لێ نەکرایە و هەمووی هەر لەسەر زگی خەڵکی هەولێر بووە." ئێمەی هەولێری شانازی بەڕەمزی نافیع دەکەین کە مرۆڤێکی نیشتمانپەروەر بووە و تەنیا مەبەستی ئەوە بووە خزمەتی کورد بکرێت جا بەهەر شێوەیەک بێت".

### ژیانی ڕەمزی

ڕەمزی بەپێی درەختی خانەوادەییەوە کوڕی نافیع ئاغای حاجی ڕەشید ئاغای یەحیا ئاغای عەبدولوەهاب ئاغای کوڕی حارس ئاغایە، لە عەشیرەتی مەموندی ناوچەی مەموندی بناری چیای سپیلکە، نزیک دێی سیساوا لەسەر ڕێی نێوان شەقڵاوە و ڕواندز، لە سەردەمی حارس ئاغا بنەماڵەکەیان دێتە هەولێر و دەبن بەخاوەنی موڵک و دیوەخان، هەروەک کە لە شوێنی خۆیاندا خاوەنی موڵک و ماڵ و دیوەخان بووینە. ڕەمزی لەلای دایکییەوە دەچێتەوە سەر میرەکانی شەقڵاوە، کە خوارزای میرانی قادر بەگ و نەوەی میرانی مستەفا بەگ بووە. بەوەدا دیارە کە ڕەمزی بە ڕیشە و دەمار لە جەرگەی کوردەوارییەوە سەری هەڵداوە.

ڕەمزی نافیع ڕەشید لە ساڵی ١٩١٧دا لە قەڵای هەولێر لە دایک بووە، لە کۆشی دایک و باوکێکی دەوڵەمەند و دەستڕۆیشتوو و تێر پەروەردە کراوە. قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی لە هەولێر تەواو کردووە. لەبەر نەبوونی قوتابخانەی ئامادەیی لە هەولێر، رووی کردووەتە کەرکووک و ساڵێکی خوێندنی لەوێ بردووەتە سەر. لە کەرکووکەوە بۆ تەواوکردنی خوێندن دەچێتە بەغدا و ساڵی خوێندنی ١٩٣٧ - ١٩٣٨ لە پۆلی پێنجەمی زانستی (علمی) بووە لە قوتابخانەی ئامادەیی ناوەندی (الاعدادیة المرکزیة)ی بەغدا، ڕەمزی لە بەغدا تا کۆتایی ساڵ دەخوێنێ و لە وانەکان دەردەچێ و داخیل بە تاقیکردنەوەکانی بەکالۆریای سەری ساڵ دەبێت، بەڵام بە بڕیارێکی کتوپڕ لە ساڵی ١٩٣٩دا بەغدا بەجێ دەهێڵێ و روو دەکاتە بەیرووت و لەوێ لە زانکۆی ئەمەریکی دەست دەکاتەوە

بەخوێندن، دوو ساڵی خوێندن لەوێ تەواو دەکا و پلەی (فریشمان ) وەردەگرێ، لە پاشان بۆ تەواوکردنی خوێندن دەچێتە ئەستەنبۆڵ و دەبێت بەقوتابیی کۆلێژی رووبەرت (رۆبەرت کۆلێژ ). لە ساڵی ١٩٤٢ کە رەمزی لە ئەستەنبوڵ دەبێ لە ناوەڕاستی ئەو ساڵەدا میوللەر و پیاوەکانی پەیوەندیی پێوە دەکەن، لە پێناو هێنانە دی کردەوەی مامۆت..

### کردەوەی مامۆت

کردەوەی مامۆت وەکو بەناوەکەیەوە دیارە کردەوەیەکی گەورە و بەرچاو بووە، وشەی مامۆت لە ئینگلیزیدا بەواتای جۆرە فیلێکی لەناوچوو و لە زمانی کوردیدا (فیلەتەن) بۆ هەمان مەبەست بەکار دەهێنرێت، لەوانە بوو ساڵی ١٩٤٣ لە سۆنگەی سەرکەوتنی کردەوەی مامۆت گەلی کورد پێی بنابایە سەردەمێکی دیکەی مێژووەوە، رەنگە چارەنووسی ئەڵمانیاش لە شەڕدا بەبارێکی دیکە بکەوتابایەوە. تیمی ئەنجامدانی کردەوەی مامۆت لە چوار کەس پێکهاتبوون، سەرۆک و بەڕێوەبەریان (میوللەر ) بوو، دوو کەسی دیکەشیان لەگەڵدا بوو، (هۆفمان ) کە نازی بوو ئاگاداری رۆژهەلاتی ناوەڕاست بوو بەو پێیەی مامۆستا بووە لە زانکۆی تاران، دووەم کەسی تیمەکە (کانیچین ) بەنەژاد پۆڵۆنی بوو. چوارەمین کەسیش رەمزی بوو کە دەمڕاست و رێبەریان بوو، چونکە کوری هەرێمەکە بووە و بەبێ ئەو کار و کردەوەیان نەدەچووە سەر، میوولەر کە سەرکردایەتیی کردەوەکەی دەکرد پێشووتر ناوچەکانی باشووری کوردستان گەڕابوو، پەیوەندیی لەگەڵ شێخ مەحموود پەیدا کردبوو، خۆشەویستی دێرینی بەرامبەر بەکورد و لە نزیکەوە ناسینی کورد و وڵاتەکەیان، بووە هۆی ئەوەی ببێتە پسپۆری راوێژکاری مەسەلەی کورد لەلای دەسەڵاتی ئەڵمان، بۆیە لە ماوەی جەنگی جیهانیی دووەمەوە کرابووە بەڕێوەبەری یەکێک لە شانەکانی هەواڵگری ئەڵمان لە شاری ئەستەنبۆڵ. لەساڵی ١٩٤٢ دوای ئەوەی دەگەڕێتەوە ئەڵمانیا هەست بەوە دەکات کەکەمیی سووتەمەنی تەنگوچەڵەمە بۆ سوپای ئەڵمانیا دروست دەکات. لەبەرئەوە پێشنیازی بۆ (فیلد مارشال کایتل) فەرمانبەری سوپای ئەو سەردەمە و سەرۆکی هێزە چەکدارەکانی ئەڵمانیا کردبوو کە هەوڵ بدرێ بیرەکانی نەوتی عێراق داگیر بکرێ و ئینگلیزی لێ دەربکرێ. بۆ هێنانە دی ئەو ئامانجەش پێویستی بەکوردێک دەبێت کە لەگەڵ ئەودا ئەم ئاواتە بەئەنجام بگەیەنێ. لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٢ دەزگای هەواڵگریی ئەڵمان لە شاری ئەستەنبوڵەوە رەمزی دەگەیەنێتە ئەڵمانیا، میوللەری بەڕێوەبەری کردەوەی مامۆت دەڵێ کە رەمزی گەیشتە لای ئێمە نەیدەزانی چیمان لێی دەوێ، پیاوانی ئەستەنبۆڵمان ئەرکی خۆیان بەچاکی راپەڕاندبوو، بیری ئەویان خوێندبۆوە بەبێ ئەوەی بە ئاشکرا باسی هیچ شتێکی لەگەڵدا بکەن. راپۆرتی هێندێک نوێنەری ئەستەنبۆڵمان لەو بڕوایەدا بوون کە رەمزی کوردێکی دەمارگرژە و زۆر تامەزرۆی ئازادی و سەرفرازیی کوردستانە. لە رێگای برادەرێکەوە کە رەمزی لە رۆژانی خوێندکارییەوە لە تورکیا ناسیبووی، بۆرە ئاماژەیەکی بۆ کرابوو کەوا شتێکی چاکە ئەگەر بێتو خۆی هەندێک لە دارودەستەی ئەڵمانی نزیک بکاتەوە، هەروەها ئەو برادەرە کاغەزی بەدرۆی بۆ رێکخستبوو بۆ ئەوەی پەساپۆرتەکەی خۆی، مۆری لە تورکیا دەرچوون یان چوونە ناو ئەڵمانیای پێوە نەنرێ. لە بارێکدا ئەگەر هاتوو کەڵکی ئێمەی نەدا یان خۆی حەزی نەکرد لە کارەکەی ئێمە بەشدار ببێت. ئەوا بتوانێ بچێتەوە تورکیا بەبێ ئەوەی کەس پێی بزانێ. لە راستیدا رەمزی دەیتوانی بەزەویشدا بچێتەوە وڵات و هەموو شتێک بۆخۆ بەچەترهەڵدانی چاوەڕوانکراوی ئێمە ئامادە بکات، ئەوە بوو رەمزی لێرە لەگەڵ ئێمەدا بوو بەبێ ئەوەی هیچ شتێک دەربارەی نەخشەکانی ئێمە بزانی. میوللەر بەردەوام دەبێ و دەڵێ: بیرم کردەوە چەند گرنگە ئەگەر بۆ کارەکەی خۆمانی راکێشین" کورد جەنگاوەری گیان لەسەر دەست و جەربەزەن چەندە ئەرک ئاڵۆز و بەمەترسیتر بێت، هێندەی تر رێزت لێ دەنێن و شەیدای خۆ بەگەڵدانی ئەو کارە دەبن". منیش تەواو لەوە دڵنیا بووم ئەگەر رەمزی ماوەیەک لەگەڵ ئێمە بژیایە هێندەی نەدەبرد دۆستایەتیمان لە نێواندا دروست دەبوو، وەکو شتێکی چاوەڕوانکراویش بە گەڵمان کەوت. چۆنم دانابوو ئاوەها دەرچوو. هەر زوو هاتینە سەر ئەوەی رێزی لێ بگرین وەک چۆن ئەویش رێزی لێ دەگرتین. ئەوە بوو لە ماوەیەکی زۆر کەمدا بڕوا

و متمانەیەکی هاوبەشمان لە نێواندا پەیدا بوو". میوللەر دەڵێ: رەمزی پاش ئەوەی گەیشتە لامان دەسبەجێ لەگەڵ ئێمە بە (سینگەر بێرگ )دا هەڵگەڕا و بەچاوی خۆی زیانەکەی بینی. کاتێک سووک و بزێو وەک بزن لە چیاکەوە دابەزین هێشتا ئەو سووکتر و چاپووکتر بوو، لە کاتی هەرە پڕ مەترسی و تەنگانەدا وەک ورچ بەهێز و خۆڕاگر بوو، کە فەرمانی بڵاوەکردنیشمان دا رەمزی وەک مامز گورج و لەش سووک بوو، ئێستا بارێکی گرانم لەسەر مێشک لاچوو. ئەو کاتەی لە کوردستان دابەزین هەموو شت زۆر ئاسانتر دەبوو. رەمزی گوتی باوکم ئاغایە و لە هەولێر دادەنیشێت، لە چیاکان دەژین " چووە نزیک نەخشە گەورەکەی کوردستان کە بە دیوارەوە هەڵواسرا بوو، پەنجەی راکێشا و گوتی "ها لێرە "پرسیم " رەمزی خێزانەکەتان لە کوێوە هاتووە؟ " گوتی" دایکم لە خێڵێکی ترە، بەداخەوە ئێستاکە مردووە، خێڵەکەی دایکم لە بەری رۆژهەڵاتی خێڵەکەی ئێمەوە دەژین هەمیشە لەوێش رێزم لێ دەگرن. هەموو ئەو شتانەی رەمزی بۆی باس کردم بەوردی تاوتوێم کردن. ئەو شتانەی بۆ ئەو کاتەی دەهاتینە سەر نەخشە کێشانی، خۆ هەڵدان و کاری داهاتوومان زۆر گرنگ دەبوو. رەمزی کە هەستی کرد من پێوەندیی خێڵەکیانەی ئەوم زۆر بەدڵە، کەیفی هات و درێژەی دایێ و گوتی: بڕۆنێ چاکترین برادەرم لەو گوندە بچووکە دەژی، ئامۆزامە بە (خوێنبرا) بانگی یەکتر دەکەین. باوکی سەرۆک خێڵێکی بچووکە و زەویوزارێکی کەمی لە ژێر دەستە، بەڵام لەبەرئەوەی کەوتوونەتە بناری چیا دەرامەتێکی چاکی لە چاندنی دانەوێلە پێ دەبڕێ، بۆیە دەیتوانی خەرجیی خوێندنی کوڕە گەورەکەی لە زانکۆی بەرز لە بەغدا دابین بکات، من و ئامۆزاکەم چەندان ساڵ لە بەغدا پێکەوە بووین و گەلێک جار نەخشەمان بۆ ئازادیی کوردستان دەکێشا. بێگومان زۆرم پێ خۆشبوو کە دەمبیست رەمزی بەم شێوەیە دەدوا. وا پێ دەچوو هەموو شتێک روو لە باشە بێت. دەرفەتێکی لەبارم بەهەل زانی، بانگی رەمزیم کرد بۆ ئەوەی پیاسەیەک بەیەکەوە بکەین، دیمەنێکی دڵرفێنی کەژ و کێوان کەوتبووە دەورویشتمانەوە، گوتم: رەمزی من وڵاتی خۆم خۆش دەوێت؟ گوتی: بڕوات پێ دەکەم، گوتم رەمزی من کوردستانیشم خۆش دەوێت، گوتی تۆ کەژ و کێوە سەختەکانت خۆش دەوێت؟ بێگومان رەمزی وڵاتی تۆ وڵاتی منە؟ گوتی: خوا بکا وا بێ، کاپتن. رەمزی تۆ لێرە لە ئەڵمانیا دڵخۆشی؟. بەڵێ چونکە دەتوانم لەگەڵ تۆ بم. پێم گوت: نەخێر رەمزی ئەگەر خوا بکا دەبی بەم نزیکانە بچم لە خوێندنگاکەی تۆ فێری زانست ببم؟ گوتی من لەگەڵ زانستدا تەبا نیم بەڵام تۆ حەزی لێ دەکەی. گوتم: زانست بەلای منەوە تاکە شتێکە، کارە. ؟ وەڵامی دایەوە، کاتێک پیاو شتێکی راست دەکات ئەوا زانستە. تاوێک بێدەنگ بووین. من دەستم پێ کرد: جارێکیان دوو هەڵۆ هەبوون، رەمزی تەواوی کرد خوێنبرای یەکتر بوون. درێژەم دایێ پێکەوە بەرەو بەرزفڕین و شێرێکیان بینی. وەڵامی دامەوە لەسەر رووباری دیجلە و فوراتەوە، بەردەوام بووم پێکەوە دابەزینە سەر شێرەکە، رەمزی چیرۆکەکەی تەواو کرد، نێچیرەکیان لە بن دەستی دەرهێنا. تۆزێکی تر بەسەر چوو. لە یەکترمان نۆڕی، رەمزی گوتی زۆر باشە کاپتن من قایلم. بەپیاوەکانم گوت رەمزی لەگەڵمان دێت. رەمزی زیرەکترین وتووێژکەر بوو، کە تا ئێستا بینیبێتم، بۆ لە یەکتر جوداکردنەوەی دۆست و دوژمن رەمزی شەش هەستی هەبوو. زانیاریی چاکی دەربارەی ئەو شێخانەی کە بەپارە و پوول دەگیران و، ئەوانەشی کە هەرگیز نەدەبوو خۆمانیان لێ بدەین. رەمزی بەپایەی باوکی لە ناو وڵاتدا و گەشت و گەڕانی خۆی بەناو خێڵەکاندا تێکڕای سەرۆک خێڵە کوردەکانی دەناسی، رێگای لەبارەی بۆ خۆ لێ نزیککردنەوەی هەموویانی دەزانی، سەرەڕای ئەمەش زیت و وریا و، فێڵباز و، لە چەواشەبوون بەدوور بوو. ئێستا هەڵی تەمەنی بۆ هەڵکەوتبوو، بۆ ئەوەی ببێتە سەرۆکی کورد و ئازادی و سەرفرازی بۆ وڵاتەکەی بێنێتە دی. دڵنیا بووم رەمزی خۆی لە هەموو ئەو شتانە دەبوارد کە خۆی و نەخشەکەیان دەخستە بەر مەترسییەوە. وەک یاریکەری بەتوانای شەترەنج دەیتوانی سارد لە سەرەخۆ یەک لەدوای یەکیان بگێڕی، شتێک نەبوو ترسی وەبەر بنێ، دەمزانی رەمزی هەموو شتێک بەوپەڕی وریایی دەخاتە جوولەوە. رەمزی لێوەشاوەترین کەس بوو بۆ ئەم کردەوەیە هەڵکەوتبێ، جێی بڕوا و

جێی متمانەم بوو. گەورەترین ڕێز و دۆستایەتیم بۆی هەبوو. هەستم دەکرد ئەویش هەمان هەڵوێستی هەیە و تەواو بڕوای پێمە. ڕەمزی گیان ئومێدبڕاوت ناکەم، تۆڵەی دڵسۆز بەدڵسۆزی دەدەمەوە، تۆ دەبێت بەفەرمانڕەوایی کێوەکانی کوردستان، کە کاتی هات چ بەڵێن و دیاری، چ بەزەبری کوتەک شێخە کوردەکان لە ژێر دەسەڵات و فەرمانڕەوایی تۆدا یەکدەخەم، پێویستە کوردستان سەرفراز و خۆشگوزەران بێت. بەلای منەوە هیچ شتێک هێندەی ئەوەم خۆشحاڵ ناکا لە تەکتدا بووەستم و بەهەر شتێک کە لە وزە و توانام دابێ پشتیوانیت لێ بکەم. میوللەر دوای ئەوەی تەواو وەسفی ڕەمزی دەکات. ئینجا دێتەوە سەر کردەوەی مامۆت و دەڵێ: وامان دانابوو خۆهەڵدانمان لە کوردستان دوو مانگ یان سێ مانگ بکەوێتە پێش ئەوەی کوردەکان بۆ باری ڕاپەڕین ئامادە بکەین. لەو ماوەیەدا گردێکی بەرزی کەس نەزان وەک شوێنێک بۆ نیشتنەوەی فڕۆکەکەمان ئامادە و خۆش بکەین. دەبێ شوێنێکی هێندە ڕێک و پان بێ، بەچاکی بەشی نیشتنەوەی فڕۆکە بکا، لە نێو ئەو ئامێرانەی دامانابوو لەگەڵ خۆمانی ببەین، دەزگایەکی نوێباوی بچکۆلەی بەپێل ئیشکەر بوو کە دەیتوانی نیشانەکەمان بۆ فڕۆکەیەکی نزیک بنێرێ. فڕۆکەکەمان، فڕۆکەیەکی دوو مەکینە بوو لە فڕۆکەخانەیەکی دەرەوەی بەرلین ئامادە و حازر کرابوو، گەورە نەبوو، دەیتوانی لە بەرزایی ٥٠٠٠ مەتر بفڕێ، قۆناغی بەرێ کەوتنی (قرم) بوو. لە ئامادەکردنی ڕاپەڕین دەبوو کورد بەباشی بە چەک و تەقەمەنی چەکدار بکرێن. دەبوو لە ناوچەیەکی چۆڵەوانی و تەپانی بنە چیاکاندا بێت. هەروەها هەڵبژاردەی تایبەتی خێڵەکییەکان لەلایان ئەندامی تیپەکەمانەوە مەشق بدرابوون، پیاوانی خۆمان لە هەموو شوێن جێگیر بوون و لە خەباتی ژێرزەمیندا ئامادەکاری ئەو ڕاپەڕینە بکات، بەتایبەتی لە ئێران بەڵام گرەکە لە کوردستان کڵپەی دەکرد، کاتێک سەربازی ئێمە دەگەیشتنە سەر زەوی و دەسەڵاتیان دەگرتە دەست، من و تیمەکەم لەگەڵ ڕەمزی لە کاری سەربازی دەکشاینەوە و خۆمان بۆ پەرەپێدانی ئاشتییانەی کوردستان تەرخان دەکرد، یەکەمین کارمان ئەوە بوو کوردستان ئاوەدان بکەینەوە، ئەمەش بەدامەزراندنی ڕێگاوبانی هێڵی شەمەندەفەر و نۆکەند هەڵکەندن. مەڵبەندی پۆلیسمان دادەمەزراند بۆ دابینکردنی ئاشتی و هێمنی لە سەرتاسەری وڵات و لەو شوێنانەی سەرچاوەی پشێوی و ئاژاوەی کوردانن، دەخستە کار. لەو ماوەیەدا کە لە ئەڵمانیا دەبن میوللەر خۆی و تاقمەکەی بە چڕوپڕی خەریکی مەشقی خۆهەڵدان بەپەڕەشووت و کۆیی دەبن. هەر لەو ماوەیەدا کابرایەک دەستنیشان دەکرێت لە تورکیا، بە وەکالەتی ڕەمزی ئەو پوولەی لە عێراقەوە بۆی دەچێت، وەری دەگرێت و بەناوی کوردستاندا بەخاچی سووری دەبەخشێت. ڕەمزی لەو ماوەیەدا کە لە ئەڵمانیا دەبێت دەزانێت کە ئەڵمانیا بەنهێنی دۆستایەتییان لەگەڵ سوار ئاغای سەرەک عەشیرەت لە بیتوێنی سەر بەقەزای ڕانیە هەیە. ڕەمزی مەشقی بەکارهێنانی نوێی لە چۆڵی و شاردنەوەی ئەو شتانەی لە فڕۆکەوە هەڵدەدرێن. ئەوجا ڕەمزی، لە مارشاڵ بەڵێن وەردەگرێت بەهێنانە دی ئامانجەکانی ئازادیخوازانی کورد بەرامبەر بە نەوت. هەر لە بنکەی سەرکردایەتیی ئەویشدا ڕەمزی خۆی و هاوڕێیە ئەڵمانەکانی کە بریتیبوون لە میوللەر و هۆفمان و کۆنێج بەئەسڵ پۆلێنی، سوێند دەخۆن. ڕەمزی بەئاڵای کوردستان ئەوانیش بەسوێندی ڕەسمی خۆیان کە خیانەت لەگەڵ یەکدیدا نەکەن و هەردوولا بەڵێن بگەیەنە جێ، ئەو کارەش بە بەرپاکردنی شۆڕشەکەی کورد و هاتنی یارمەتیی پێویست لەئەڵمانیاوە مەیسەر دەبێت. لە هەمان کاتدا ڕێگەی یارمەتیی چەک و ئازووقەی سوێندخۆرەکان کە لە ڕۆژئاواوە بۆ رووسەکان دەچێت، دەبەسترێت.

## سوێند خواردنی ڕەمزی بەئاڵای کوردستان

ڕەمزی و میوللەر لە هاوینی ساڵی ١٩٤٣دا لە ئەڵمانیا پێش ئەوەی بەرەو کوردستان بفڕن، هەریەکەیان سوێندی دڵسۆزی بۆ ئەم کردەوەیە و ناپاکی لەگەڵ یەکتردا نەکردن دەخۆن، واتا سوێند بەئاڵای ئەڵمانیا و ئاڵای کوردستان، بەڵام کوا خۆ کوردستان ئەو کاتە ئاڵای نەبوو، ئایا ئاڵایەکی کوردستان هەبوو بەر لە کۆماری کوردستان لە مەهاباد، چونکە هەموو ئەوانەی کە لەبارەی ئاڵای کوردستانەوە دواون ( ولیام ئیلگتن، د. عەبدوڕەحمان قاسملۆ،

عەلائەدین سوجادی، مەحموود مەلا عیزەت) کەسیان بەسەرچاوەی راستی پەیدابوونەکەی نەکەوتن و نەیانزانیوە رەنگەکانی ئەم ئالآیە بۆ یەکەم جار لە بیری کێوە چەکەرەی کردووە، یان یەکەم دەست کێ بووە کە نەخشاندوویەتی، تەنیا ئەوە نەبێ کە ولیام ئیلگتن لە کتێبەکەی (کۆماری مەهاباد )دا دەڵێ " کۆمەڵەی (ژ.ک) بە هاوکاری لەگەڵ هاوپەیمانەکانی عێراقدا ئالآیەکی نەتەوەیی لە ئایاری ١٩٤٤دا دەرکرد، ئالآیەکی سێ رەنگی بوو: لە سەرەوە سوور لە پاشان سپی، لە ژێرەوەش کەسک. لە پێناو مافی ئۆتۆنۆمی چی لەوە ئاسانترە ئالآی ئێران بەراواژ بکەیتەوە و هەلآوگێری بکەیت، بەلآم لەبارەی دروشمی نەتەوەی کوردەوە، ئەوا وێنەی هەتاوێکیان دروست کرد کە لەمدیو و لەودیوییەوە دوو گوڵەگەنم و لە پشتییەوە چیا و قەڵەمێک هەبوون". تێرامانی هەموو سەرچاوەکانی دیکەش ئەوە بوو کە بیری رەنگ دارشتنی ئالآی کوردستان لە هەڵگێرانەوەی ئالآی ئەو کاتەی ئێرانەوە هاتووە، لەبارەی روونکردنەوەی ئەوەی کە ئاخۆ سێ ساڵ بەر لە دروستبوونی کۆماری کوردستان لە مەهاباددا ئالآی کوردستان هەبووە، تاوەکو رەمزی نافیع سوێندی پێ بخوات. لە یەکێک لە دانیشتنەکانمان لە ماڵی (سروود سوعاد نافیع) کە دەکاتە برازای رەمزی نافیع، سروود سوعاد موفەکەرەیەکی رەمزی نافیعی هێنا و چەند پەرەیەکی ئاودیو کرد و لە یەکێ لە پەرەکانیدا کە بەرواری ساڵی ١٩٤٢ بەسەرەوە بوو، ئەو کاتەی کە رەمزی نافیع لە بەیرووت دەیخوێند. سروود گوتی"ها ئەوەیە من خۆم بینیمەوە و کەسی دیکە نەیدۆزیتەوە، لێرە بازنەیەکی رەسم کردییە و نووسیتی سپی، کەسک، سۆر، کەسکەکەشی بەشێوەی هەولێری نووسیووە و نەینووسیوە سەوز، بازنەکەی بەش بەش کردووە، رەنگەکانی لێ نووسیوە، ئالآکەش بەئاسۆیی وەکو خۆی دروست کردووە، سەبارەت بەمەش کە دەڵێن میوللەر ئالآی کوردستانی دروست کردووە و ئەو نامەیەی کە لە بەرواری ١٢/١١/١٩٩١ لە ئەڵمانییەوە بۆ بنەماڵەی ئەوانی ناردووە لە هەولێر و لەو نامەیەشدا دەڵێت: هیوادارم خوای گەورە ئاشتی و سەربەخۆیی بدا بەگەلی کورد. سوپاسی نامەکەی (١/١١/١٩٩١ )تان دەکەم. دەڵێ: وا دیارە ئێوە لە بنەماڵەی رەمزی هاورێ و دۆستی منن، کە ژیانی خۆی کردە گەردەنی کوردستانی نیشتمانتان. ئێستا لە سەرتاسەری دنیادا دەرفەتی کرانەوەی زیندانەکان دێتە بەرچاومان و منیش هیوادارم ولآتی کوردستانی خۆشەویستم لە پاشەرۆژێکی نزیکدا سەرفراز ببێت. چەند هەفتەیەک لەمەوبەر لە (بەرلین) بووم و، خۆپیشاندانێکی لاوانی کوردم بینی، ئالآی کوردستانیان هەڵدابوو، رەنگەکانی کەسک، سپی، سوور و لە ناوەندیشیدا خۆرێکی تیشکدار هەبوو، سەرسام بووم لەبەرئەوەی هەمان ئەو ئالآیە لەلایان منەوە دروست کرابوو پێش ئەوەی لەگەڵ دوو هاوەڵەکەمدا بەرەو کوردستان بێین و یاریدەی گەلی کورد بدەین بۆ ئەوەی سەربەخۆ بێت. خۆتان دەزانن ئێمە کارەکەمان پێ بە ئەنجام نەگەیشت، بەلآم ئێستاش هەست بەگەرمی دڵم دەکەم لە بەرامبەر ئێوە و سەرجەم گەلی کورددا، هەمیشەش ئامادەی یارمەتیدانم. چاوەنواڕی نامەی داهاتووتانم. دڵسۆزتان گۆتفرید میوللەر". لەبارەی ناوەڕۆکی نامەکە و ئەو قسەیەی میوللەر کە دەڵێ ئالآی کوردستان لەلایەن منەوە دروست کرابوو، سروود سوعاد نافیعی برازای رەمزی گوتی: " ساڵی ١٩٩٢ کە میوللەر هاتە ماڵمان منیش ئەوەم لێی پرسی کە چۆن ئەو ئالآیەتان دروست کرد، گوتی: لە ئەڵمانیا لە ماڵی ئێمە دانیشتبووین و ئەو چوار رەنگەمان لەگەڵ رەمزی بەیەکەوە موناقەشە کرد، رەمزی چوار رەنگەکەی دانابوو میوللەریش وتبووی دەبێ شتێک هەبێت کە رەنگەکان لە یەکتر جیا بکاتەوە، میوللەر گوتی من وتم: دەبێ رۆژێک لە ناوەڕاست هەبێ، پاشان خێزانی خۆم ناردەبازارو داوی زەردی کڕی و هەر خۆشی لەسەر ئالآیەکانی دووری ". سروود سوعاد دەڵێ: کاتێک رەمزی و ئەڵمانەکان هاتوون بۆ کوردستان ئالآیەکی زۆریان بەقەبارە گەورە و بچووک و مامناوەندی لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو، لە قەسری (عەتاوڵلا ئاغا ) ماڵی باپیرم دایاننابوو. لە سەرەتای پەنجەکانیشدا بەشێک لەو ئالآیانە مابوو، بەلآم دواتر لەبەر گەڕان و پشکنینەکانی حکومەتی عێراقی ئەوانیشیان نەهێشتبوو، لەبارەی گەیشتنی ئالآکەش بۆ کۆمارەکەی

قازی محەمەد کۆماری کوردستان لە مەهاباد، سروود سوعاد گوتی " لەوانەیە ئەو ئالایە تەسەڕوبێ کردبێ و گەیشتبێتە کۆماری مەهاباد، چونکە ئامانجی پلانەکە ئەوە بوو کە بگەنە پشدەر و بێتواتە، لەوێوە بێنە خوارێ. ئەوەش نازانین کە ئایا پەیوەندیی دیکە هەبووە یان نا، چونکە سیخوڕی ئەڵمانەکان ئەو کاتە لە ئێرانیش بەجموجۆڵ بوون ".

**لە ئەڵمانیاوە بەرەو کوردستان:**

لە هاوینی ساڵی ١٩٤٣دا تیمە چوار کەسییەکەی (کردەوەی مامۆت) بە شەو خۆیان بەپەڕەشووت لە فڕۆکە دەهاوێنە خوارێ، لە ناوچەیەکی سێ گۆشەی سنووری عێراق، تورکیا، سووریا لای ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە دەکەونە سەر زەوی، لەوێوە بە قاچاخی و بەسواری پاسە تەختەکانی ئەو سەردەمە و ولاخ و کاروان دەگەنە مووسڵ، ئینجا گوێڕ و لە پاشان هەولێر، لەوێوە بەرەو ژوور لە گوندی (بیوکە) دەنیشنەوە. ئەڵمانەکان دەگیرێن، ڕەمزیش لە هەولێر خۆی دەدا بەدەستەوە. ڕەمزی لە گرتووخانەی هەولێرەوە دەبرێ بۆ مووسڵ و لەوێشەوە بۆ بەغدا ئینجا قاهیرە و دووبارە دەیهێننەوە بەغدا. لە ساڵی ١٩٤٥ کە جەنگ کۆتایی پێ دێت، دادگای عورفی بڕیاری لەسێدارەدانی بۆ دەردەکات، لە پاشان بڕیارەکە دەکرێ بەهەتا هەتایە لە بەندیخانەی ناوەندی بەغدا و لە قاعەی دووەم بەند دەکرێ، پاشان بەهۆی ڕاپۆرتی پزیشکی و لەبەر تووشبوونی بەنەخۆشییەکی کوشندە، زۆری پێ ناچێ بڕیاری ئازادکردنی دەردەچێت. ڕەمزی لە ژێر زەبری ئەشکەنجە و دەرد و پاڵەپەستۆی دەروونی، مێشکی سووک دەبێت و لە ڕووی عەقڵییەوە تێک دەچێت. هەر بەو هۆیەش پاش دەرچوونی لە بەندیخانە لە ساڵی ١٩٤٨ لە هەولێر سەری نایەوە و ئەفسانەیەکی بۆ هەتا هەتایە لە دوای خۆیەوە بۆ نەتەوەکەی جێ هێشت. تاقمی کردەوەی مامۆت لە پاش مەشقی خۆ فڕێدان بە پەڕەشووت و فێربوونی دەستوورە بنچینەییەکانی هەواڵگری، لە شاری بەرلین و هەرێمەکانی سینگەر بێرگو بۆ دینتەلو وینەر یونشتادت ئامادەی جێبەجێکردنی کارەکەیان دەبن. پێویستە ئەوەش بوترێت کە پلانەکەیان لە بنچینەدا بەوجۆرە ڕێک دەخەن کە لە وەرزی بەهاردا دەست پێ بکەن، بەڵام دوا دەکەوێت بۆ هاوین، کاتژمێری سفریان لەو کاتەدا دەست پێ دەکات، کە یەکێک لە فڕۆکەکانی گۆندوز دەکەوێتە ئاسمانەوە بەسەر قرم و زەریای ڕەش، دەکەوێتە ناوچەکانی سەرووی کوردستانەوە و مەنزڵی خۆ فڕێدان بە پەڕەشووت، دەشتی بیتوێن دەبێت، بەڵام فڕۆکەوانەکە لە جێگەیەکی دیکەیان دەخاتە سەر زەوی. ئەو ناوچەیەی کە لێی کەوتوونەتە سەر زەوی فلێ فلی پێ دەڵێن و دەکەوێتە ناو سێ گۆشەی سنووری عێراق، تورکیا، سووریا لای ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە، بەپێی جلوبەرگی دەشتەکیانەیان خەڵکەکەی ئەوێ دەیانناسنەوە، دواتر بە پاسە تەختەکەی دەوروبەری ئەوێ خۆیان دەگەیەننە مووسڵ، دەشبوا ڕەمزی لە ڕووبار بپەڕێتەوە ناو شار و هانا بەرێتە بەر یەکێک لە خزمەکانی باوکی لە مووسڵ، لەبەرئەوەی پشکنینێکی زۆر لەسەر پردی مووسڵ هەبوو، ڕەمزی ئەڵمانەکان لە چایەخانەیەک جێ دێڵێ و دەچێتە ماڵی جەلال یاوەر، کە دەکاتە کوڕە خەزووری باوکی، بەڵام دواتر ڕەمزی بەنائومێدی دەگەڕێتەوە، خزمەکانی هیچی بۆ ناکەن و لەوانیشەوە پێی ڕادەگەیەنرێت کە مەسەلەکەیان لە ناو شاری مووسڵ ئاشکرا بووە و، حکوومەتی عێراقی و هێزەکانی ئینگلیز بەدوایاندا دەگەڕێت و دەبێ بەزووترین کات ئەوێ بەجێ بهێڵن. ڕووەو هەولێر بەرێگەی وادی شۆڕ کە ناوچەیەکی قامیشەڵان و پڕ لە دار و دەوەن دەبێت دەچنە گوندی بازیوە کە گوندێکی شەبەکەکانە، لەوێ پیرەمێردێک بەهۆی ناوبانگی باوکییەوە ڕەمزی دەناسێتەوە، ڕێزیان لێ دەگرێ و میوانداریان دەکات. بەمجۆرە بەمەبەستی ڕزگارکردنیان لەسەر داوای تیپەکە و لەسەر کیسەی ئەوان چەند ئێسترێک بەکرێ دەگرێ و پیرەمێردیش ماوەیەک لەگەڵیاندا دەڕوا و پاشان لەبەر ماندوویێتیی کە دەگەنە لای کەندەڵانێک لەوێ دەحەسێنەوە و خەویان لێ دەکەوێت. ئیتر کابرای شەبەک کە خاوەنی ئێسترەکان دەبێت ئەمە بە فرسەت دەزانێ و لە خەودا بەجێیان دێڵێ، ڕەمزی و ئەڵمانەکان بەتەنیا دەکەونە ڕێ و لە نزیک کەلەکی یاسین ئاغا لە ڕێی لادەدەن و بەرەو گوێڕ دێن، بەبەلەم لە زێی گەورە دەپەڕنەوە دیوی هەولێر و ئێوارەیەکی درەنگ دەگەنە گوندی تەرجان کە گوندی ماڵی ڕەمزی بوو، ئەگەرچی تا دەهات

مەترسییان زیاتر دەبوو، بەڵام بەهۆی خەڵكی ئەو ناوچانە كە ناسیاو بوون جووڵانەوە و كاری خۆ رزگاركردنیان ئاسان بووە، هەر بەهۆی ئەو ناسیاوانەش بەسواری وڵاخ دەگەنە هەولێر و روو دەكەنە ماڵی عەتاوڵڵا ئاغا كە ماڵی باپیری رەمزی بوو. لەوێ میوللەر و تیپەكەی چاویان بەنافیع ئاغای باوكی ناكەوێت و لە جیاتی ئەو قەرەنی نافیع برا گەورەی رەمزی پێشوازیی لە میوللەر دەكا و هەموو شتێكی تێدەگەیەنێت و بە ناوی باوكییەوە پێی دەڵێت ئێمە هیچمان پێ ناكرێت بۆ ئێوە، باب و باپیرانمان بەناحەزی ئینگلیز لە قەڵەم دراون و گەلێ زیانمان لەم رووەوە لێ كەوتووە، ئیتر ئێوە خۆتان چارەسەری خۆتان بكەن، چونكە ئێمە هیچمان بۆ ئێوە پێ ناكرێ، بەڵام رەمزی پشتیان تێ ناكا و چارەنووسی خۆی بەچارەنووسی ئەوانەوە دەبەستێتەوە. ئیتر لەبەرئەوەی ئەو ئامانجەی كە بۆی هاتبوون زیندەبەچاڵ دەكرێت، میوللەر پلانی ئەوە دادەڕێژێت كە یەكێ لە ئەندامانی تیپەكە بگەیەنێتە سەر سنووری توركیا، لەوێ خۆی بدا بەدەستەوە و بخرێتە گرتووخانەوە، بەو رێگەیە دەتوانن بەهۆی دەسەڵاتی توركەوە قونسڵی ئەڵمانیا لەوێ ئاگادار بكەنەوە و بەمە پەیوەندیی لەگەڵ دەوڵەتەكەیان پەیدا دەكەنەوە، بۆ هێنانە دی ئەم ئامانجەش بەهۆی رەمزییەوە لە هەولێر دەردەچن بۆ گوندی (بیوكە)ی نوورەدین ئاغای مامی رەمزی، لەوێ خورشید نوورەدین ئامۆزا و هاورێی رەمزی یارمەتییان دەدا.

خورشید نوورەدین خۆشەویستترین كەسی رەمزی بوو، لە یەكەم دیدانەی رەمزیدا كە لە ئەڵمانیا بەمیوللەر دەگا، رەمزی دەڵێ من و ئامۆزایەكم چەند ساڵێك لە بەغدا بەیەكەوە بووین و گەلێ جاریش نەخشەمان بۆ ئازادیی كوردستان دەكێشا. میوللەر خۆشی كە لە گوندی (بیوكە) خورشید نوورەدین دەبینێ، لێوەشاوەیی و پیاوەتی ئەوی دەچێتە دڵەوە، لەبارەی ئەوەوە، میوللەر دەڵێت: ئەو كەسەی دەرفەتی دیدانەی كوردێكی رەسەنی لەم شێوەیەی بۆ هەڵدەكەوێت ناتوانێت خۆی لە هەستی بەهێزی خۆشەویستی لە بەرامبەر ئەو گەلە و وڵاتەكەیاندا بپوێرێت، كورد گەلێكی بەرچاو روون و ژیر و وریان و وزەیەكی بەرزەوتنەكراوی لە بڕان نەهاتوویان هەیە، مرۆگەلێكن لەرێ و رەچەڵەكیان لە گوندیان لە دابونەریتیان نەشۆراون، هەر كوردێكی تۆ دەیگری رەسەنزادەیەكە شیری دایكی خۆی مژیوە. تاقمەكەی كردەوەی مامۆت لە گوندی بیوكە و لەلای خورشید نوورەدین بەمەبەستی گەیشتنە سەر سنووری توركیا لەگەڵ قاچاخچییان رێك دەكەون كە بیانگەیێنێتە سەر سنوور، بەمجۆرە قاچاخچییەكان لە پاش سەفەری هەولێریان دەگەڕێنەوە گوندی بیوكە و چاوساغیان بۆ دەكەن تا سنووری توركیا.

### دەستگیركردنی گرووپەكە

رەنگە هەڵەی گەورەش كە میوللەر و تاقمەكەی كردبێتیان، ئەوە بووبێ كە لە پێشەوە هەموو كرێكەیان دابووە قاچاخچییەكان. ئیتر ئەوان كرێكەی میوللەر دەخەنە گیرفانەوە و یەكێ لە قاچاخچییەكان بەناوی (سەمیع) كە خەڵكی گوندی بیوكە دەبێت لە هەولێر جێگەی خۆ حەشاردانی ئەڵمانەكان بۆ بنكەی پۆلیسی هەولێر ئاشكرا دەكات، بەو هیوایەی هەزار دینار (بۆ هەر یەكێك ٢٥٠ دینار) پاداشتی حكوومەتی عێراقی بۆ گرتنی تاقمەكەی (كردەوەی مامۆت ) دەستنیشان كرابوو، وەربگرێت. ئەوە بوو لە دوای خەبەر لێدانییان ئەفسەری پۆلیس (بەدیع محەمەد نەزهەت) لە بنكەی پۆلیسی هەولێر خۆی و پیاوەكانی دێنە گوندی بیوكە و گەمارۆی ئەو شوێنە پڕ لە دار و دەوەنە دەدەن و هەرسێ ئەڵمانەكە دەستگیر دەكەن، بەڵام ئەو كاتە رەمزی لەوێ نابێت، دواتر بە ئامانجی گرتنی رەمزی حكوومەتی عێراقی هەموو كەسوكارو مامەكانی و ئەوانەی كە لە رەمزییەوە نزیكن دەستگیر دەكات. لە پاشان نوورەدین ئاغا، ئازاد دەكرێت بۆ ئەوەی بەدوای رەمزیدا بچێت و پێی بڵێت كە خۆی بدا بەدەستەوە. لەو كاتەش رەمزی دەچێتە لای نوورەدین ئاغا و بۆی ئاشكرا دەبێت كە ئەڵمانەكان گیراون و هەموو كەسوكاری خۆشی خراونەتە گرتووخانە و لە پێناو بەردانی كەسوكاریشدا رەمزی خۆی بەدەستەوە دەدا و لە گرتووخانەی هەولێر دەگاتەوە ئەڵمانەكان.

### چۆنیەتیی دەستگیركردن و تێكچوونی باری دەروونیی رەمزی

رۆژێك بەر لە گیرانی رەمزی، ئەڵمانەكان دەستگیر دەكرێن و بەنێو بازار و بە بەردەم قەڵای هەولێریاندا

دەهێن و حەشاماتی زۆری خەڵک لە دەوریان کۆ دەبنەوە و هەواڵی هاتنی رەمزی و ئەڵمانەکان لە شاردا بڵاو دەبێتەوە. دکتۆر ( عەبدورەحمان عەبدوڵا ) سەبارەت بەو رۆژە دەڵێت: ئەو ساڵە من لە هەولێر دکتۆری حامیە بووم، ئەو رۆژەی ئەڵمانەکان دەستگیر کران شاری هەولێر بەتەواوی خرۆشا بوو، خەڵکەکە پێکدا دەهاتن و دەچوون. لە چەند کەسێکی لەوانەی کە دەمناسین پرسیم بۆ چ ئاوا شپرزەن و پێک دادێن و دەچن، تەنیا وەڵامیان ئەوە بوو ئەڵمان هاتوون، ئەڵمان هاتوونە کوێ؟ لە پاشا ئامیر حامیەم بینی کە ناوی (سەید حەسەن) بوو، جگە لەوەی ئامیر حامیە بوو دۆستایەتییەکی باشیشمان هەبوو، لێم پرسی چ هەیە؟ وتی چەند ئەفسەرێکی ئەڵمان هاتوونەتە ئەم هەرێمە و خۆیان شاردۆتەوە، ئەوا خەریکن بەهەموو لایەکدا دەگەرێن تا جێگەیان بدۆزینەوە. هەر ئەو رۆژە ئێسترسوارەکان بەسەرکردایەتیی (مولازم سەید حوسێن)ی برای سەید حەسەن بەناو شاردا تێپەرین و بەدوای ئەڵمانەکاندا چوون. هەر ئەو رۆژە لە دێیەکی نزیک هەولێر کە دێی ماڵی (نافیع ئاغا) بوو. ئەڵمانەکان کە لە ناو دار و درەختی دێیەکدا خۆیان شاردبۆوە، گرتیانن و هێنایانە شاری هەولێر بۆ سەراو لە ژووری بەرێوەبەری پۆلیس سەبری عەبدوڵا دایانن و نەیانهێشت کەس بەلای ئەو ژوورەدا تێپەر ببێت، کارەکەیان ئەوەندە بەنهێنی گرتبوو نەیانهێشت کەس بیانبینێ و قسەیان لەگەڵدا بکات. تەنانەت کە من زۆر ئاشنا و دۆستی (سەبری و سەید حەسەن) بووم نەیانهێشت بچمە ژوورەوە. لە هەموو هەولێردا دەنگ بڵاو بۆوە کە ئەم ئەڵمانانە لەگەڵ دلاوەری نەمری کورددا، رەمزی نافیع ئاغا هاتوون بۆ کوردستان و سەرکردەکانی کورد بەتایبەتی شێخ مەحموود ببینن و بە یارمەتیی ئەڵمان، کوردەکان شۆرشێک هەڵبگیرسێنن. بۆ ئەوەی راستیی مەسەلەکە بزانم وام بەباشزانی راستەوخۆ لە بەرێوەبەری پۆلیس بپرسم. بۆیە چوومە لای و لێم پرسی، کەچی لە ئەڵمانەکان تێگەیشتووە پێم بڵێت؟ وتی سێ ئەفسەر بوون یەکێکیان رائد بوو، یەکێکی دیکەش مولازمی دوکتۆر بوو، ئەوەکەی دیکەشیان مولازمی ئەندازیار بوو. وتی هەر پرسیارێکمان لێ دەکردن، دوو مولازمەکە دەستیان بۆ رائدەکە درێژ دەکرد و مەبەستیان ئەوە بوو ئەوان مافی قسەکردنیان نییە، تەنیا رائدەکە بەبۆنەی ئەوەی سەرکردەیانە مافی قسەکردن و وەڵامدانەوەی هەیە، ئەویش بەجۆرێک دەمی نابوو بەیەکدا هەرچییەکمان لێ دەپرسی ورتەی نەدەکرد و هیچ وەڵامێکی نەدەدایەوە. دوای گەلێک تەقەلادان دەمی کردەوە وتی: یەک شتتان پێ بڵێم هەر پرسیارێک بکەن و بەهەر جۆرێکی بکەن من وەڵامتان نادەمەوە. بەڵام بۆ مێژوو دەمەوێت یەک شتتان تێبگەیێنم و دوای ئەوە هیچ خۆتان ماندوو مەکەن، چونکە هیچ هێزێک نییە لە جیهاندا بتوانێت قسە لە ئێمە دەربهێنێت. ئێمەش پێمان وت فەرموو چیت هەیە بڵێ، گوێمان گرتووە. لە ئێمەش وابوو کە دان بەهەندێک لە نهێنییەکاندا دەنێت. کابرای ئەڵمان خۆی قنج کردەوە و وتی وەکو بیستووتانە کە دەڵێن گەلی ئەڵمانی لە هەموو گەلانی جیهان ئازاتر و جەنگاوەرترن، بەڵام لەم کارەماندا بۆمان دەرکەوت کە گەلی کورد لە ئەڵمان ئازاتر و بەجەرگترن. ئێمە لە ئەڵمانیاوە ماوەی سێ چوار مانگ زیاترە مەشق دەکەین، تا فێر بین چۆن بە پەرەشووت خۆمان لە فرۆکە بهاوێژینە خوارێ، بەڵام ئەو کوردەی لەگەڵمان هات چەندە هەوڵی لەگەڵ درا هەر ملی نەدا و دەیوت: من بەبێ مەشقکردن خۆم دەهاوێمە خوارەوە. ئێمەش کەوتینە گومانی ئەوەی کە ئایا بروای پێ بکەین یان نا، یاخود دواتر دەبێت نەترسێت؟! چونکە ئەگەر ترسا و خۆی نەهاوێشتە خوارەوە بەرنامەکەمان سەر ناگرێت و دەبێت بەتەریقی بگەرێینەوە، گەلێک جاری دیکەش تەقەلای لەگەڵ درا هەر بێ سوود بوو. ئاخری وتی: چیتان لە من دەوێت، ناتانەوێت بەچەتر خۆم فرێدەمە خوارێ. باشە ئەوا بریارم دا کە گەیشتینە کوردستان، من یەکەم کەس بم لە پێش ئێوەدا خۆم بهاوێمە سەر زەوی. کاک رەمزی چەند وێنەیەکی هەبوو بەجلوبەرگی کوردی گیرا بوو لەسەر ئەم وێنانە بەرگدروویەک لە ئەڵمانیا چەند دەستە جلێکی کوردییان بۆ دروویین. ئینجا دوای ئەوەی چی پێویست بوو ئامادەمان کرد و فەرمانمان بۆ هات سواری فرۆکە بین و بکەوینە رێ بۆ رووسیا، پاش پشوودان لەوێوە کەوتینە رێ بەرەو کوردستان، بریارمان دا خۆمان

بەهاوێینە خواردەوە، سەیرمان کرد رەمزی وەک پڵنگ راپەری و هەستایە سەرپێ و وتی: ئەوە من خۆم دەهاوێژمە خواردەوە و هیوادارم لەسەر زەوی یەکتر بدۆزینەوە، هەرکە دەرگای فڕۆکەی بۆ کرایەوە بەدوو چاوی گەشی پڕ خۆشەویستی وتی: بۆ سەر زەوی و خۆی هاوێشتە خوارەوە، دوای ئەوە ئێمەش یەکە یەکە خۆمان فڕێدایە خوارێ کە گەیشتینە سەر زەوی هێشتا تاریک و روون بوو ئاگامان لە یەکتر نەبوو، بەڵام هەریەکە وەکو لە پێشدا بڕیاری لەسەر درابوو چەترەکەی لە ژێر خاکدا شاردەوە و بەدوای یەکتردا دەگەڕاین، کە رەمزیمان دۆزییەوە لێمان پرسی لە کوێین؟ وتی: نازانم با بڕۆین رۆژ هەڵاتبوو خۆر لایەکی زەویی رووناک کردبۆوە، رەمزی لەگەڵ چەند جووتیارێکدا بەعەرەبی قسەی کرد تێگەیشت کە نزیکی شاری مووسڵین، بەپەلە کەوتینە رێ و هاتینە سەر زێی کەلەکی یاسین ئاغا، لەوێوە بەهەر جۆرێک بێ گەیشتینە نزیک هەولێر. رەمزی ئێمەی بردە دێیەکەی خۆیان لەوێ ئێمەی لە ناو درەختەکاندا شاردەوە، هەرچییەکمان پێویست بوو لە خواردن و نوێن بۆی هێناین، دوای ئەوە رۆیشت. ئیتر نەماندیتەوە هەتا ئێوە هاتنە سەرمان. ئەمە قسەکانی بەڕێوەبەری پۆلیسی هەولێر سەبری عەبدوڵا بوو، دوای گرتنی ئەڵمانەکان پۆلیس کەوتنە سۆراغی رەمزییەوە، هەرچۆنێک بێت رۆژی دواتر ئەویش گیرا، بەڵام چۆن گیرا؟ لە دوای دەستگیرکردنی ئەڵمانەکان بۆ رۆژی دواتر حکوومەتی عێراقی سەرجەم کەسوکار و بنەماڵەکەی و هەموو ئەوانەیشی کە لە رەمزییەوە نزیک بوون دەستگیر دەکا. نیهاد نووردین کوڕە مامی رەمزی و تاکە کەسی نێو بنەماڵەکە کە رەمزی بینیوە و تا ئێستاش لە ژیاندا مابێت، لەبارەی ئەو رۆژەوە دەڵێت: ئێمە لە پرسەی باوکی ئەحمەد چەلەبی مەحموود دەباغ بووین و رۆژی چوارەمی پرسە بوو کە پۆلیس هاتن داوای باوکمانیان کرد، ئەویش یەکسەر داوای عەباکەی کرد و دەیزانی مەسەلەکە چییە، چونکە ئەگەر بۆ شوێنێکی دوور یا بۆ ماوەیەک بڕۆیشتبا عەباکەشی دەبرد، مستەفا یەعقوب پارێزگاری هەولێر، باوکم و مامەکانمی هەموو بانگ کرد و پێی گوتن کە مەوزووعەکە زۆر لەوە گرنگترە کە ئێمە دەستکاری بکەین، بۆیە ئەگەر رەمزی تەسلیم نەکرێت بنەماڵەکەتان هەمووی تێدەچێت، ئەوە بوو هەر لەوێ، جگە لە نووردین رەشیدی باوکم بنەماڵەکەمان هەموویان دەستبەسەر کران و باوکیشم نووردین کە دەکاتە مامی رەمزی رەوانە کرا بۆ ئەوەی بچێت رەمزی بهێنێ و تەسلیم بەحکوومەتی بکاتەوە. ئەویش دەچێت لە سەرکارەکان دەپرسێ و دەڵێ: ئێمە نە لەگەڵ ئینگلیز هیچمان پێ دەکرێ و نە لەگەڵ حکوومەتی عێراقیش، ئەوانیش شوێنی رەمزی پێ دەڵێن. باوکم دەچێت لە بنەسڵاوە دەیبینێتەوە و پێی دەڵێت کە حکوومەتی عێراقی هەموویانی گرتووە و دەبێ خۆی تەسلیم بکات، رەمزی ئەو کات دەیەوێ خۆی بکوژێت، ئەویش دەستی دەگرێت و پێی دەڵێت: ئێمە ئەگەر هەموو سامان و سەروەتی خۆمان لەسەر دانابێ نایەڵین حکوومەت هیچ بکات، بەڵام ئێستا ئەوان دەڵێن یا ئێوە یا ئەو، رەمزی رازی دەبێت و خۆی تەسلیم دەکاتەوە، ئەو رۆژی هێنایان و بردنیان بۆ مەخفەری پۆلیس، ئێوارێ لە ماڵی ئێمە نانیان بۆ رەمزی نارد لە گرتووخانە، منیش لەگەڵ سەرکارەکەی چووم فەحسێکی نانەکەیان کرد و چووینە ژوورەوە، رەمزییان لە ژوورێکی بچووک دانابوو، لەسەر دەم و زگ لەسەر قەرەوێڵەکەی خۆی راکشابوو، کە تەقەی دەرگا هات هەستاوە و گوتی نیهاد ئەوە تۆی، منیش دەستم بەگریان کرد و پاشان هاتمەوە، دوای دوو رۆژ لە تەنیایی رەمزی لە گرتووخانەی هەولێردا دەگاتەوە ئەڵمانەکان، بەمشێوەیە میوللەر وەسفی ئەو رۆژەی رەمزی دەکات: بەیانییەک لە ناکاو دەرگە کرایەوە و یەکێک هەڵدرایە ناو ژوورە تاریکەکەمانەوە، ئەوە رەمزی بوو بەوێنەی داماوێک هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە، رەمزی کوڕی سەرۆک خێڵ، مرۆڤێکی سەرئاسوودە و سەربڵند و بڕوابەخۆ بوو بەتێکشکایی و نیوە مردوویی، پیس و بەرگ دڕاو، بەچاوی پڕ لە خوێنەوە هاوارم کرد رەمزی ئەوە چییان لێ کردی، بەپەلە و سام گرتوویی یەک لە دوای یەک سەیری کردین، سەرەتا ناڵەناڵێکی کرد و پاشان نقوومی بێدەنگی بوو، کاتێک بەخۆ هاتەوە کەیفشاد بوو، جارێکی دیکە لەگەڵ ئێمەدا تەنانەت لە تاڵترین و بێ هیواترین شوێن، جا بەڕاستی لە

بێ هیواترین بارودۆخدا یەک بگرینەوە، گوتمان ڕەمزی تۆ دۆستی بەراستیمانی، خۆزی بەخۆزیداران تۆ لەم چارەنووسە دەرباز دەبووی، زۆرت لە پێناو ئێمەدا بەخت کرد و ئێستاش هیچی دیکەت لە دەست نایێت، پاشان خێرا خێرا بەسەرهاتی خۆی بۆمان گێڕایەوە، وەکو بڵێی ئەو شتەی ئەو دەیگێڕێتەوە تینێکی بەپەلەی بوویێ. دەتگوت: ئێستا نائێستا سەری لەدوو دەنێنەوە لەم کونەوە بۆ ئەم کون شوێنی هەڵدەگرنەوە. گوتی: تازە گەیشتبوومە هەولێر کتوپڕ نەخۆش کەوتم، دڵم پێی گوتم مەترسییەکی گەوردم هاتۆتە پێش، هەرچەندە شتێکی ئەوتۆم بەچاو نەدیتبوو کە گومان پەیدا بکا، بەڵام هەستم دەکرد وا چاوی بەدکرداری لە هەموو لاوە سەرنجم لێ دەدا، شەوم لە پەنای دەوەنێکدا بەسەر برد، توولە ڕێیەک لەو نزیکانە هەبوو بەدرێژایی شەو ژمارەیەکی زۆر مشەی هاتوچۆکەرانی بەسەرەوە بوو، بەرێگایەکی ناراستەوخۆ بەسەر بەرد و تاوێراندا خۆم گەیاندە ئەو ئامۆزایەم کە ئێوە بینیتان، پێی گوتم پشکنینێکی توند بەدوای تۆدا دەستی پێ کردووە و بەهیچ جۆرێک ناتوانم لەلای بمێنیمەوە، چونکە پۆلیس هەستی پێ دەکەن، گوتی: پێم خۆشە گیانی خۆم لە پێناو تۆدا بنێم بەڵام بۆ ئەو کاتانە ژیرانەترین شت بۆ من ئەوەیە بچمە لای مامم و خۆم لەوێ بشارمەوە، ئەوە بوو بەدزییەوە خۆم گەیاندە ئەو مامەی هەمیشە خۆشی ویستم گوتم: یا بمشارەوە یان ئەوەتا سەرەدەرێکم بۆ بدۆزەرەوە، پێتان وایە چی پێ گوتبم باشە؟! بچمە نزکترین مەڵبەندی پۆلیس و خۆم بەدەستەوە بدەم لەبەرئەوەی باوکم و برای گەورەم لەوێ گیراون لەلایەن ئەو پۆلیسانەی لەبەردەستی ئینگلیز کار دەکەن، دەستبەسەرن هەر دەستبەسەریش دەبن هەتا ئەو کاتەی من دەستگیر دەکرێم. برادەرینە ئێوە دەزانن باوک بۆ ئێمەی ڕۆژهەلاتی چییە، ئیدی ئێوە دەتوانن تێ ڕابمێنێن ئەو هەواڵەی مامم چەند جەرگبڕ بوو بۆ من، باوکم ئاغا لە گرتووخانەیە یەکسەر بەڕاکردن چوومە مەڵبەندی پۆلیس، ڕەمزی لەوێ لە بەردەمان وەستابوو، لەش تێک شکا و هیچمان لە دەست نەدەهات دڵی ئەوی پێ بدەینەوە، پاشان ئێمەیان بردە مووسڵ و لە زیندانی ئینفرادیان دانایین، ئەو دەستە جلکەی لە کاتی ڕاکردن لەبەرمان بوو لەلایەن ئینگلیزەوە لێمان سەندرا (سەرۆک هەرێمی عێراق) کە جەنەڕاڵێک بوو یەک لە دوای یەک ئێمەیان بردە لای، دەیویست بەسەروبەری هەموو شتێک بکەوێت، بۆ بەیانی چوار ماشێنی بەریتانی پڕ لە پۆلیس و سوپاوە هاتن ئێمەیان بەرەو بەغدا برد، شێوەی گیران و ئەو پاسەوانییەی لە ئێمە گیرابوو وای دەگەیاند کە بەچاوێکی پڕ لە مەترسی سەیری ئێمە دەکرێت، ئەمەش وای دەردەخست کە پاشەڕۆژێکی ناهەموارمان لە پێشە. لە بەغدا سەرەتا ئێمەیان بردە زیندانی جودا جودا لە گرتووخانەی پۆلیس و پاشان لە دوای چەند ڕۆژێک بۆ خانووێکی بەغدایان گواستنیەوە، پاشان بۆ لێکۆڵینەوە ئەڵمانەکانیان بردە قاهیرە و ڕەمزیش هەر لە بەغدا مایەوە، بەو پێیەی ئەو بەندییەکی عێراقییە و نابێ لە عێراق دەربچێت، بەڵام دواتر بەهۆی پاڵەپەستۆی حکوومەتی بەریتانی بۆ سەر حکوومەتی عێراقی توانییان ئەویش ببەنە قاهیرە و هەمان جۆری لێپرسینەوە و ئەو هەڵسوکەوتەی کە لەگەڵ ئەڵمانەکانیان پەیڕەو دەکرد لە بەرامبەر ڕەمزیش دەکرا، بۆ نموونە یەکێک لەو شەڕە دەروونییانەی کە لە زیندان پەیڕەو دەکرا لە بەرامبەر ڕەمزیش دەکرا، شەوێک کتوپڕ دەرگای زیندان بەڕاتەکاندنێک دەکرایەوە و بەندکراو لە ناو نوێن و بەنووستوویی ڕامالی بۆ دەبردرێ و ملی دەگیرێ و بەبەرجوێن و تێهەڵدان دەدرێ و بەبێدەنگی بەرەو شوێنێکی چۆڵی دەبەن. کەس ورتەی لە دەم نایەت پاشان فەرمانی دەدەنێ بێتە دەرەوە، لە بەرامبەریان بووەستێ کۆمەڵێک سەربازی چەک بەدەست ریز دەبن، فەرمان دەدرێ ئەفسەرێکیش لەوێ دەوەستێ و کاتژمێرێکی لە نێو دەستە و دەڵێ، پاشی دوو خولەک هەمووتان گوللەباران دەکرێن، ماوەیەک بێدەنگی، ئەگەر شتێکتان هەیە بیڵێن وا خولەکێکی دیکەش بەسەر دەچێ، چل چرکە سی بیست، چەک بەرز دەکرێتەوە، هیچی دیکەتان نییە بیڵێن، من تەنیا بەرژەوەندیی ئێوەم دەوێ دەتوانن ژیانی خۆتان بگەڕێننەوە، ئێ باشە دە چرکە پێنج وریایی ئا گ ر، هەی بەرازینە پێتان وابوو مردنێکی قارەمانانە دەمرن، نا نا برادەرینە ئەمە تەنیا ئەزموونێک بوو بۆ ئەوەی بزانن چیمان بۆتان داناوەتەوە، پاشان بەلێدان و کوتان و نەفرەت و جوێنەوە دەیانبەنەوە هەمان

شوێنی جارانی.

جارێکی دیکە بۆ زیندان، سەرەنجام لەسەر بازگەی لێتوێژینەوەی مەعادی شاری قاهیرە، رەمزی و دوو لە ئەڵمانەکان بەیەکجاری عەقڵیان دەشێوێت و تووشی تێکچوونی دەروونی دەبن، دواتر حکومەتی بەریتانی دووبارە رەمزی و ئەڵمانەکان بۆ لێتوێژینەوە دەهێنێتەوە شاری بەغدا و لەوێ زیندانی دەکرێنەوە، میوللەر دەڵێ: هەستی ئەوەی کە ئۆباڵی ئەو چارەرەشییەی رەمزی لە ئەستۆی مندایە، زۆر بەگرانی لەسەرم وەستا، چونکە من هاتنی ئەوم بۆ ئەڵمانیا سەروبەر کرد و لەگەڵی دوام تا هاتە سەر ئەوەی بەگەڵمان بکەوێت و چەندان جار گفتی سەربەخۆیی وڵاتەکەیم پێ دا؟ ئەو کاتەی لە بەغدا تووشی یەکتر بووینەوە زۆرم ترس هاتێ و لە دڵی خۆمدا گوتم ئەگەر بێو وەکو پڵنگ راماڵت بدات و ئەوکت بگرێ و فەراقی رەشت لێ برێ، مافی خۆیەتی، کەس ناتوانێ بڵێ کابرا بۆ وات کرد. من شایەنی ئەوە بووم ئەو کاتە، هەر هێندەم بۆ گوترا رەمزی من زۆر بەداخەوەم، بەوپەڕی خۆشەویستی و دۆستایەتی وەڵامی دامەوە و گوتی گوێ مەدێ کاپتن، گوێ مەدێ چی تر بیر لەوە مەکەوە، چاوم پڕ بوو لە فرمێسک، زمانم بەجۆرێک گیرا نەمتوانی وەڵامی بدەمەوە، بۆ ئەوەی بەخۆدا نەشکێمەوە وای پیشان دا چاوی لێم نەبووە، رەمزی لەو ماوەیەی کە باری دەروونی شێوا چەند جارێک ئاسایی دەبووە و دواتر وەکو جارانی لێ دەهاتەوە.

## دوا دیداری میوللەر و رەمزی

سەبارەت بەدوا دیداری نێوانیان میوللەر دەڵێ: رۆژێکیان رەمزی لە کاتی نانی نیوەڕۆ بەڕاکردن هاتە ژوورەکەم و ماڵئاوایی لێ کردم، دەیانبردە گرتووخانەیەکی دیکەی عێراقی، تەنیا کاتی ئەوەم هەبوو دەستی بگرم و بەقوولی لە چاوانی رابمێنم، خوا دەست بەباڵتەوە بگرێ، خوا بەفریاتەوە بێ، خوات لەگەڵ بی رەمزی، بەدرەنگەوە پێم زانی کە رەمزی بەتۆمەتی ناپاکی لە نیشتمان بیست ساڵی خشت بەندیی لەلایەن "دادگایەکی سوپای عێراقەوە" بۆ براوەتەوە، کاتێک زانیم ئەو دۆستە لە دڵ شیرینەمان جارێکی دیکەش تووشی ئەقڵ شێوان بۆتەوە زۆر پێی خەمبار بووم. میوللەر و دوو ئەڵمانەکەی دیکە جارێکی دیکە لە رەمزی جودا دەکرێنەوە بەڵام ئەمجارە دەیانبەن بۆ فەلەستین و لە پاشان دەیانگەڕێننەوە میسر، رەمزیش هەر لە بەغدا دەمێنێتەوە.

## ئازادبوون و کۆچی دوایی رەمزی

دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر لەلایەن بنەماڵەی رەمزییەوە هەروەکو (ئەرسەن موسا رەشید)ی مامۆستای مێژوو لە زانکۆی سەلاحەدین (ئامۆزای رەمزی ) دەڵێت: زۆر جار باوکم لەگەڵ باوکی رەمزی بەگوش پارەیان دەبرد بۆ بەغدا تا رەمزی بڕیاری لەسێدارەدانی بۆ دەکرێ بەبیست ساڵ و دواتریش لە بڕیارێکی دیکەدا لە ساڵی (١٩٤٦)دا دوای ساڵێک لەکۆتاییهاتنی جەنگی جیهانیی دووەم ئازاد دەکرێت، هەر لەو بارەیەوە (سروود سوعاد نافیع)ی کوڕە برای رەمزی دەڵێ "مام رەمزی " لە بەندیخانەی ژمارە یەک گیرا بوو کە زۆربەی گەورە پیاوانی سیاسیی عێراق لەوێ دەگیران و هەر لەوێش لەسێدارە دەدران. ئەو کات (مستەفا راغب) کە پیاوێکی بەئەسڵ تورک بوو، سەرۆکایەتیی ئەنجوومەنی سەربازیی دەکرد و بڕیارەکانیش لەلای ئەوەوە دەردەچوون. سەرەتا بڕیار درا رەمزی لەسێدارە بدرێت. بنەماڵەی ئێمەش دەچنە لای و بەعائیلیش دەمانناسی. مام موسا بەمستەفا راغب دەڵێ: ئەویش (فەهمی سەعید) و ئەوانەی دیکە نییە لەسێدارە بدرێت و پێی دەڵێ: رەمزی لێرە ئیعدام بکرێت، ئێمە تۆ دەناسین. دوای ئەوە مستەفا راغب دەست لەکار دەکشێتەوە و یەکێکی دیکە بۆ شوێنی ئەو دێت. ئەو کات پاڵەپەستۆکەش کەمتر دەبێتەوە، چونکە بەریتانیا بەرەو سەرکەوتن دەچوو. لە ئەنجامدا رەمزی دوای سێ ساڵ لە زیندانیکردن ئازاد دەکرێت. بەڵام لەم ماوەیەدا باری دەروونی هەروەک چۆن لە زینداندا لە ژێر پاڵەپەستۆی دەروونی و لێتوێژینەوەی توندا تێک دەچێت، لە دەرەوەی زیندان و دوای بەربوونیشی هەر بەوجۆرە دەمێنێتەوە و هەموو جارێک لەگەڵ ناوهێنانی کاپتن میوللەر لەلایەن کەسوکارییەوە زەردەخەنە دەیگرێ و دەڵێ ئەو کاتەی کە چاک بوومەوە هەموو شتێکتان بۆ دەگێڕمەوە. (عیزەدین فەیزی) کەسایەتیی ناسراوی شاری هەولێر کە یەکێک بووە لەدۆستە هەرە

نزیکەکانی ڕەمزی، کەوا هەم لە حزبی هیــوا بەیەکـــەوە بوون و هەم لە قوتابخانەی ئەربیل ئولاش قۆناغی سـەرەتایی و ناوەندییـان بەیەکـەوە خوێندووە. ئەویش لەبارەی ڕەمـزی دەڵێ: لە کاتی نەخۆشیدا چەند جار چاوم پێ دەکـــەوت و لەگــــەڵی دادەنیشتم، بەڵام لەوەدا نەما بوو کە سـوودی لێ وەربگیـرێ. ( نیـهـاد نوورەدین)ی ئامـــۆزای، ئەویش ئەو کـاتانەی ڕەمــزی بەو جــۆرە وەسف دەکـــات و دەڵێ: ڕەمـــزی خـــۆی بەتەبیعـەت و پێشـتریش عـەسـەبی بوو، زوو تووڕە دەبوو، مـوناقـەشـەی قـــەبووڵ نەدەکــرد، کـــە هاتەوەش گۆشـەگیـر بوو لەگەڵ کەسدا قسەی نەدەکرد و زەوقی جارانی نەمـا بوو، وەکو جاران سوعبەتی نەدەکرد و زۆر گۆڕا بوو تووشی نەخۆشیی ئەعساب ببـــوو، جـــاری وابـوو دەیگـرت و هێندەک جار بەری دەدا، یا دەڕۆیی و دەچووە دەشتێ، دوو سێ چوار ڕۆژ لە گـوندی خـۆیان، لە تەرجـان دەبوو، دوایی سـەربەخۆ بەپێیـان دەهاتەوە. سروود سوعادیش دەڵێت: لای ئێمە ئەگـەر یەکـێک بەغـەیری تەبیـعـەتی خۆی هەڵسوکەوت بکات دەڵێن شێت بووە، بەڵام ئەو تووشی سـەدمـەیەکی دەروونی و عـاتفی ببـوو، بەئاواتی شـتـێک بووە و عـەمـەلیـیـەکی وا گـەورەی کـردووە، دواتریش تووشی ئەو فـەشـەلە بێت، ئینجا لەبەر هۆی خـیـانەت و بێ شـانسی بێت یاخـود هەر هۆیـەکی دیـکە بێـگومـــــان کـاریگەرییـەکی زۆری لێ کـردووە، لەوانەشە جۆرە شیزۆ فرینیایەکیشی تووش بووبێت، چونکە مـرۆڤ کــە تووشی دابڕانی کـەسـێـتی دەبێت

هەندەک جار هەڵسوکـەوتی دێتـەوە جـێگەی خــۆی و هێنده جـاریش دەچێـتـەوە دنیـایەکی دیکە. باوکم دەیوت ڕۆژێک شێخێکیان بۆ هێنا لە کـەرکـــوک تا دوعـــای بۆ بکات، شێخەکە دەستی بۆ نێوچەوانی دەبا وا دەزانێ جنی هەیە، گـــــوتی هـەر هێـندەمــــان زانی ڕەمـــــزی ملی شـێخـەکـەی گرت و ویستی لێیی بدا دەڵێ: ئەمن شـێت ببم بەتۆ چاک دەبم. مانای وایە ئەو کاتی هاتۆتەوە سـەر وەحیی خۆی. سروود بەردەوام دەبێ و دەڵێ: نۆبەتدارەکـمـان هەبوو ئەو بەردەوام لەگەڵیدا بوو، دەیوت چ قـسـەی نەدەکرد بەردەوام کـتـێبی ئەڵمـانی و ئینگلیـزی دەخوێندەوە و حەقی بەسـەر کەسەوەش نەبوو. دوای ئەوە ڕەمـزی نافـیع لە یەکـێک لە نەخـــۆشــــخـــانەکـــانی بەغـــدا نەشتـەرگەرییەکی دەمـاغی بۆ دەکرێ لەلایەن دکـتـۆرێکی بەئەسڵ جوولەکە بەناوی (جاک عـبود) لەو بارەیەوەش (سرووود سوعاد) گوتی ئەوە شتێکی غــــەریبــــە کــــە بـۆچی ئـەو نەشتـەرگەرییەیان بۆ کردووە و ئێـمە نازانین چۆن بووە و چۆنیش کــراوە، چونکە ئەگـەر نەخـۆشـیی دەروونی بووبێت چ پەیوەندییەکی بەنەخۆشی و نەشتـەرگەریی دەمـاغەوە هەیە، بۆیە نەشتـەرگەرییـەکە فاشل بووە و بزانە دسـتکاری چی کـردووە، چونکە ئەو جۆرە نەشتەرگەرییانە ئێستا ناکرێن ئینجـا چۆن ئەو کـات و لە سـاڵی چلەکـــان کــراوە، بۆیە من پێم وایە نەشتەرگەرییەکە کوشتوویەتی چونکە ئەگـەر نەخۆشیی دەروونی بووبێت بۆ گــەنجـێکی وا بەهێــز دەمــرێت، سەرەنجام دوای نەشتـەرگەرییـەکە لە

ســاڵی ١٩٤٨دا هەروەک چۆن لەو ساڵەدا شاعیـران، (دڵدار، بێکەس، بەختـیـار زێوەر و مـێـژوونووسی بەناوبانگی کورد (ئەمین زەکی بەگ) کـۆچی دواییـان کـرد، ڕەمـزی نیشتـمانپەروەر و ئەندامی چالاکی حزبی هیوا و دانەری ئالای کوردستان کۆچی دوایی دەکات و لە گۆڕستانی (شێخی چۆلی) دەنێژرێت.

## حزبی هیوا و
## کوردایەتیی ڕەمزی نافیع

" ڕەمـزی بەنسـبـەت ئێـمـە قوتابخـانەی کوردایەتی بووە و ئێمە هەمـوومـان کـوردایەتی لەوەوە فـێـر بووین". (نیـهاد نوورەدین) بەردەوام دەبێ و دەڵێ: ڕەمزی نەتەوەیەکی زۆ توندڕەو بوو هەموو ئامانجی ئەوە بوو شتـێک بۆ کورد بکات، هەر بۆیەش ئەڵمـانەکـان کە بینیـیـان ئەو ڕۆحـە قـەومـیـیـەی هەیە قـۆستـبـوویانەوە. بەردەوامیش لەگەڵ خزمەکاندا کێشە و گرفـتی هەبوو لەسـەر کـوردایەتی و قـبـوولی نەدەکـرد ئەگـەر یەکـێک ئینکاری کوردبوون یا تانە و تەشەری لە کـورد بدابووایە، هەر لە بنەمـاڵەی ڕەمـزیشـەوە دکـتـۆر ئەرسـەن مـووسا ڕەشـیـد دەڵا: لە دەرەوە کـە گـوتیـان خـەڵکی کـوێی؟ دەبێ ناوی وڵاتی خۆت بڵـێی، بەڵام ئێـمـە دەبێ بڵـێن عـــێــــراقین، باشـــە عـــێـــراق چ پەیوەندییەکی هەیە لەگەڵ کوردستان، بۆیە شانازی بەڕەمزی دەکەم بەهەموو جـــۆرێکەوە لەبەرئەوەی کـــوردی بەمـــەزڵـووم بینیـــوە و هەوڵی داوە شـــتـێک بۆ کــورد بکات، بۆ ئەو کاتیش ئەڵمانیا باشترین پاڵپشت بووە بۆ کــــورد و ڕەمـــزیش بۆیە

پشتگیریی لە ئەڵمانەکان کرد تا شتێکیان بۆ کورد بکردابووایە، ئەگینا ڕەمزی نە باوەڕی بەنازییەت هەبوو نە بیریشی لەوە دەکردەوە ببێ بەسەرۆکی کوردستان، ئەگەر ئەڵمانیا شتێکی بۆ کورد بکردبووایە، چونکە ڕەمزی لەو کەسانە نەبوو حەز بەپۆست و ناو بکا، دکتۆر ئەرسەن ئەوەشی گوت کە ڕەمزی بەر لەوەی کوردستانیش بەجێ بێڵێ لەگەڵ قەرەنی و سوعادی برای لە حزبی هیوا بووە و کە چۆتە بەیرووتیش لەگەڵ نوورەدین زازا و کورەکانی بنەماڵەی بەدرخان بەبەردەوامی بۆ حزب کاری کردووە و ڕۆحی کوردایەتیی گەشە پێ داوە. (سروود سوعاد) ئەویش بەمجۆرە وەسفی ڕەمزی دەکات و دەڵێ: ڕەمزی زۆر بەپێش سەردەمەکەی خۆی کەوتبوو، هەرسێ زمانی ئەڵمانی و تورکی و ئینگلیزی بەباشی زانیوە و یەکێک بوو لەو کەسانەی کەوا لە سەرەتای بزوتنەوەی کوردایەتی چۆتە نێو حزبی هیوا و دەستی بەکوردایەتی کردووە، کە چووەتە بەیرووتیش لەوێش لەگەڵ کۆمەڵێکی دیکە وەکو نوورەدین زازا و کامەران بەدرخان پەرەیان بەبیری کوردایەتی داوە و بەیەکەوە کاریان کردووە و لە موفەکیرەکەی بەرباغەڵی کە هێندێک ناوی بیانیی تێدایە بەدەردەکەوێت، کە هەندێک لەوانە سەربازن و ڕەمزی ویستوویەتی پەیوەندییان پێوە بکات لە بەیرووت، هەروەها ڕەمزی کە لە بەیرووتیش بووە پەیوەندیی بەکوردستانەوە نەپچڕاوە، لە ناو موفەکیرەکەیدا هەندێک لەناوی لاوەکانی هەولێری تێدایە و هەموویان لە حزبی هیوا بووینە و ڕەمزی ئابوونەی مانگانە و ناوەکەیانی لە بەرامبەر یەکتر نووسیبوو. عیزەدین فەیزی کە خۆی یەکێک بووە لە ئەندامە چالاکەکانی حزبی هیوا و بەرپرسی حزب بووە لە هەولێر، لەبارەی ڕەمزییەوە دەڵێت: لە ساڵی "١٩٣٩"دا بەرپرسیاریەتیی پارتی هیوا لە هەولێر بەمن سپێردرا و لەو کاتە زانیم کە ڕەمزیش ئەندامە تیایدا. فەیزی دەڵێت: لە ساڵی ١٩٤٠ بوو کە جارێکیان لە خزمەت مامۆستا ڕەفیق حیلمی دانیشتبووین لە ماڵی یونس قادر لە هەولێر، کە ئەویش ئەندام بوو لە هیوا و لەو کاتەدا ڕەمزی و هەڤاڵێکی هاتنە ژوورەوە سڵاوێکی سەربازانەی زۆر بەتوندی بۆ مامۆستا ڕەفیق حیلمی کرد وا هاتە بەرچاوم هەموو گیانی پڕ لە چالاکی و دڵسۆزی و دەروونپاکی بوو، هەروەها عیزەدین فەیزی لەبارەی ڕەمزی دەڵێت: لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند بوو لە هەولێر، خۆشی بوویستبایە چ لە عێراق و چ لە دەرەوەی وڵات دەیتوانی زۆر بەخۆشی و ئاسانی ژیان بباتە سەر، بەڵام دڵسۆزییەکەی وای لێ کرد قوربانی بەهەموو شتێکی خۆی بدا و ئەم کارە بەرزە جێبەجێ بکا، لەبەرئەوە پێویستە خزمەتەکەی بەکردەوەیەکی پیرۆز دابنرێت. پرۆفیسۆر د. مارف خەزنەدار لە وەسفی ڕەمزیدا دەڵێت: ڕەمزی شۆڕشێک بوو، شۆڕشەکەی لە پێناسی خۆیەوە دەست پێ دەکات. شانازی بەوشەی ئاغاوە نەکردووە، بەڕەمزی نافیع ڕەشید خۆی بەخەڵک ناساندووە، ئەگەرچی لە شار گەورە بووە، بەڵام خووڕەوشتی دەشتیشی پاراستووە، شارێکی دێرینی وەکو هەولێر کۆنە، بەتەمەن سێ چوار هەزار ساڵ دەبێ، چەند جار تەخت کراوە و قەڵای رووخێنراوە، بەسەرهاتی مێژوو پەروەردەیەکی تایبەتی خەڵکی شارەکەی کردووە، بەڵام ڕەمزی ئەم بوونەی رووخاند چونکە نیشتمانپەروەرییەکەی تەنیا بەقسە و لە رووی تیۆرییەوە نەبوو، بەڵکو بەکردەوە و پراکتیکەوە چووە مەیدانی بەرلین و مەشقی پەڕەشووت و سیلاح شۆری، بەبێ فیزە و بە پەڕەشووت دابەزی لە وڵاتی خۆی.

سەرچاوەکان:

* دیدارێک لەگەڵ چەند کەسوکارێکی ڕەمزی نافیع.

١- گۆتفرید یوهانس میوللەر، لە رۆژهەڵاتی گرگرتوودا، وەرگێرانی لە ئینگلیزییەوە بەدران ئەحمەد حەبیب.

٢- مەسعوود محەمەد، ڕەمزی نافیع قوربانییە زلەکی هەولێر، گۆڤاری کاروان، ژمارە (٣٣).

٣- دکتۆر عەبدوڕەحمان عەبدوڵا، هەندی زانیاریی تر دەربارەی ڕەمزی نافیع، گۆڤاری کاروان، ژمارە (٣٨).

٤- بەدران ئەحمەد حبیب، ڕەمزی نافیع ڕەشید ئەوکوردەی ئاڵای کوردستانی داهێنا، رۆژنامەی (ئاڵای ئازادی)، ژمارە ( ٢١).

٥- عیزەدین فەیزی، ڕەمزی نافیع و بۆچوونەکانی کاک مەسعوود محەمەد و کاک محەمەدی مەلاکەریم، گۆڤاری کاروان، ژمارە (٣٨).

٦- دکتۆر مارف خەزنەدار، رۆژی مەرد و نەبەرد، گۆڤاری کاروان، ژمارە (٨٩).

# مووسا سولەیمان
# ١٩٢٦-١٩٥٣

شەهید مووسا سولەیمان خدر، لە ساڵی ١٩٢٦دا لە بنەماڵەیەکی رەنجدەر لە قەڵای دێرینی هەولێر لەدایک بووە. لە ساڵی ١٩٣٣دا خراوەتە بەر خوێندنی سەرەتایی و قۆناغەکانی خوێندنی ناوەندی و ئامادەییشی هەر لە هەولێر تەواو کردووە. لە هاوینی ١٩٤٦دا بروانامەی دەرچوونی لە تاقیکردنەوەی گشتی ئامادەیی وەرگرتووە. هەر لەو ماوەیەدا لە رێگای خوێندنەوەی سەرچاوەی بیری سۆسیالیزمی زانستییەوە بەچاکی لە خەباتی چینایەتی گەیشتووە. لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٦دا رێکخراوی مارکسی (شۆڕش) لە هەولێر و لە کوردستاندا پەرەی سەندووە. ئەو رێکخراوە مارکسییە (حزبی شیوعی کوردستانی عێراق) بووە، بەڵام چونکە زمانحاڵیان پەخشنامەیەک بووە بەناوی (شۆڕش) بۆیە ئەم ناوەیان وەرگرتووە. شەهید مووسا سولەیمان بووەتە ئەندامێکی چالاکی ئەو حزبەی (شۆڕش)، کاتێکیش ئەو رێکخراوە مارکسییە هەڵدەوەشێتەوە و زۆربەی ئەندامانی دەچنە ناو حزبی شیوعی عێراق، هاوڕێ مووسا یەکێک دەبێ لەو ئەندامانە و دەچنە پاڵ جەماعەتی (القاعدة) بەرێبەرایەتیی یوسف سەلمان (فەهد).

لە پاییزی ١٩٤٦دا هاوڕێ مووسا لەگەڵ هاشم عەبدوڵڵای هەڤاڵی دڵسۆزی دەچێتە بەغدا و لە کۆلێجی ئەندازە- بەشی شارستانی وەردەگیرێن و مەیدانی خەباتی سیاسییان دەکەوێتە بەغدا، لەبارەی خوێندنیشەوە زۆر بەزیرەکی پۆلەکانی ئەو کۆلێجە دەبڕن، تاکو لە ساڵی ١٩٤٩دا شەپۆلی گرتنی ئەندام و لایەنگرانی حزبی شیوعی لە سەردەمی حکومەتەکەی نووری سەعید دەست پێ دەکات، هاوڕێ مووسا سولەیمان دەگیرێ و دەدرێتە دادگای عورفی عەسکەری و لەسەر چالاکیی سیاسی لە مەیدانی خەباتی (یەکێتیی گشتیی قوتابییان) و (لیژنەی باڵای راپەڕاندنی ئەو یەکێتییە)، کە حکومەت ئەوسا بەرێکخراوێکی شیوعی دادەنا بە ١٠ ساڵ حوکمی گران و ٣ ساڵ دوور خستنەوە مەحکووم دەکرێ، لە ١٨/٦/١٩٥٣دا لەسەر مەسەلەی گواستنەوەی بەندییە سیاسییەکانی بەندیخانەی ناوەندیی بەغدا بۆ بەندیخانەی باقووبە و یاخیبوونیان لە رەوانەکردنیان، پۆلیس تەقەیان لێ دەکات، لەو دەمە هاوڕێ مووسا سولەیمان شەهید دەکرێ و لەگەڵ شەهیدانی دیکەی ئەو قەسابخانەیەی نووری سەعید دەبێتە قوربانییەکی گەورەی رێبازی خەباتی چینایەتی، گیانیان دەچێتە جیهانی نەمرانی خەباتی نیشتمانی و چینایەتی لە پێناوی (نیشتمانێکی ئازاد و گەلێکی بەختیار)دا.

هاوڕێ مووسا سولەیمان لە تەمەنی ٢٧ ساڵیدا لە تافی لاویدا شەهید کرا و بووە قوربانی لە دوای خۆی خاتوو ساکینە سولەیمان بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی برای تێکۆشەری مەیدانی خەباتی چینایەتی و نیشتمانی چۆڵ نەکرد و توانی یەکەمین شانەی ئافرەتان لەهەولێر بۆ پارێزگاریی لەمافی ئافرەتان دابمەزرێنێ.

**کەریم شارەزا**

# عەقید ئەمین ڕەواندزی
# ١٨٩٨-١٩٥٥

عەقید ئەمین کوڕی مەلا حەسەنی ڕەواندزی، ناسراو بە (ئەمین ڕەواندزی) لە ساڵی ١٨٩٨دا لە شاری ڕەواندز لەدایک بووە. خوێندنی بەرایی لە شارەکەی خۆی تەواو کردووە، ئینجا قوتابخانەی سەربازی و کۆلیجی عەسکەری تەواو کردووە و بووەتە ئەفسەر. لە ساڵی ١٩٢٢دا بەپلەی مولازمی دووەم لە سوپای عێراق دامەزراوە. بەڵام لە ٢٥ی ئەیلولی ١٩٢٢دا بەبۆنەی گەڕانەوەی شێخ مەحموودی مەلیکی کوردستان لە هیندستانەوە بۆ کوردستان، لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی دیکەی کورد لە بەغداوە چوونەتە سلێمانی و تێکەڵی حکومەتەکەی دووەمی شێخ مەحموود بوون. لەو سەردەمەدا چوار قوتابخانە لە سلێمانی دەکرێنەوە، مولازم ئەمین ڕەواندزی دەکرێتە مامۆستای مەشقی عەسکەری لەو قوتابخانانەدا. تاکو ناوەڕاستی ساڵی ١٩٢٣ درێژەی بەو خزمەتەی داوە و دڵسۆزیی خۆی بۆ حوکمڕانیی شێخ مەحموودی مەلیکی کوردستان دەربڕیوە. دوای لەناوبردنی حوکمی شێخی نەمر، لەلایەن سوپای بەریتانیاوە، بێ کار و فرمان ماوەتەوە تاکو لە ساڵی ١٩٢٦دا بەپلەی مولازمی یەکەم دەکرێتەوە ئەفسەر لە سوپای عێراق و تاکو ڕۆژی ١٦ی تەمووزی ١٩٤٦ وەک ئەفسەرێکی بەتوانا و شارەزا کاری کردووە و پلەی ئەفسەریی گەیشتۆتە پلەی (عەقید) و خانەنشین کراوە و دوای ئەو مێژووەش ماوەیەک کراوە بەسەرۆکی شارەوانیی ڕەواندز.

عەقید ئەمین ڕەواندزی هەر لە بیستەکانی سەدەی ڕابردووەوە هەستی نەتەوەیی و خۆشەویستی بۆ کوردستانی نیشتمانی ئازیزی لەلا گەشەی کردووە و لە ساڵانی ١٩٢٤-١٩٢٦دا هەندێ وتاری نەتەوەیی بەنرخی لە ڕۆژنامەی (ژیانەوە)، کە لە سلێمانی دەردەچوو بڵاو کردەوە، کە کەوتە شاری بەغداش بەشدارییەکی چالاکانەی لە دامەزراندنی (یانەی سەرکەوتن)ی کوردان لە ٣٠ی مایسی ١٩٣٠دا کرد و یارمەتیدەری باوەڕپێکراوی یانەکە مامۆستا (مەعرووف جیاووک) بوو. لە ساڵی ١٩٣١یشدا ئەو زاتە نەتەوەپەروەرەی کورد بووەتە ئەندامێکی چالاکی (کۆمەڵەی پشتیوان)، کە ڕێکخراوێکی سیاسی بووە، لە پێناوی

پشتگیریکردنی کێشەی کورد و بزووتنەوە رزگاریخوازییەکەیدا خەباتی کردووە.

لەگەڵ دامەزراندنی (حزبی هیوا) لەسەر هەیکەلی (کۆمەڵەی دارکەر) بەسەرۆکایەتیی مامۆستا رەفیق حیلمی لە ساڵی ١٩٣٩دا، ئەم تێکۆشەرە بووەتە ئەندامێکی چالاک و بەدەرەوەی ئەو حزبە نەتەوەییە جەماوەرییەی کورد و دەورێکی دیاری بینیوە لە ناو ئەفسەر و دەرەجەدارەکانی کورد لە سوپادا بۆ چوونە ناو رێکخستنی حزبی (هیوا) و لەو کاتەی، کە کادیرێکی گەورەی ئەو حزبە بووە، لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆڕشەکەی ساڵی ١٩٤١ی رەشید عالی گەیلانیدا لە دژی بەریتانیا ئەم، فەرماندەی حامیەی عەسکەری هەولێر بووە، کە هەرایەک لە دژی پارێزگاری چاکەخوازی ئەوسای هەولێر (ساڵح زەکی ساحێبقران) قەوما، ئەگەر سنگ فراوانی ئەم و پارێزگار نەبوایە تەقە لە خۆپیشاندەران و هێرشبەرانی سەر بارەگای پارێزگا بکرایە کارەساتێکی گەورە رووی دەدا.

لەو کاتەی کە لە ساڵی ١٩٤٣دا ئەفسەرێکی سەر بەتیپی سوپای عێراق بوو لە کەرکووک، هەموو ئەو ئەفسەرە کوردانەی کە سەر بەو تیپە بوون، ئەندامی حزبی هیوا بوون. لە دوا دوای ئەو ساڵەی ١٩٤٣دا لە ماڵەکەی کۆدەبوونەوە و تەنانەت لەو کاتەی کە ماجید مستەفای وەزیری دەوڵەتی عێراق بۆ کاروباری کوردستان بەر لەوەی بگاتە کەرکووک ئەفسەرە کوردەکان ئاگاداری (مامۆستا رەفیق حیلمی)ی سەرۆکی حزبیان کرد تاکو لە بەغداوە بێتە کەرکووک و لەگەڵ ئەفسەرەکانی وەک ئەمین رەواندزی و دەستەیەک ئەفسەری لێهاتووی دیکە لەگەڵ ماجید مستەفا کۆببنەوە، تاکو داخوازییەکانی کوردی پێ بڵێن. ئینجا بچێتە لای مەلا مستەفای بارزانی سەرکردەی شۆڕشەکەی (١٩٤٣-١٩٤٥) بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشە نەتەوەییە مەزنەی کورد.

کاتێک کە ماجید بەمەلا مستەفا دەگات و ئەویش پێشنیازەکانی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد پێشکەش دەکات، یەکێک لە بەندەکانی رێککەوتنەکەیان دانانی دەستەیەک بوو لە ئەفسەرە دڵسۆزەکانی کورد بەئەفسەری پەیوەندیی نێوانی شۆڕشی بارزان و سوپای عێراق. ئەمین رەواندزی دەکرێتە ئەفسەری پەیوەندی لە ئۆردووگای رەواندز، بۆ چاودێریکردنی ئاگربەست لە نێوان پێشمەرگە و سوپا.

کە لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٥دا بارزانی مستەفا (لیژنەی ئازادی) دامەزراند بۆ زرگارکردنی هەموو باشووری کوردستان، خۆی بەسەرۆکی لیژنەکە و موقەددەم ئەمین رەواندزی و دەستەیەک لە ئەفسەری خەباتگێڕی دیکەی کورد بوونە ئەندامی چالاک لەو لیژنە سیاسییە گرنگەدا.

ئەم ئەفسەرە پایە بەرزە لە سەردەمی ژیانی خانەنشینیدا لە پاییزی ١٩٤٨دا یەکەم رۆژنامەی کوردی لە پارێزگای هەولێر بەناوی (هەتاو)، دەرچوواند و ژمارەی یەکەمی لە رۆژی ١٩٤٨/٩/١١دا بڵاو کرایەوە و لەسەری نووسرا بوو (خاوەنی: ئەمین رەواندزی) و بەڕێوەبەر و بەرپرسی پارێزەر (ناجی)یە و نووسراویشە (رۆژنامەیەکی کوردی ئەدەبی و کۆمەڵییە).

عەقید ئەمین رەواندزی دوا دوای ژیانی لە بەغدا نیشتەجێ بوو، تاکو بەنەخۆشییەکی کوشندە لە رۆژی ١٩٥٥/١١/٦دا لەو شارەدا کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی (باب المعظم) هەر لە بەغدا نێژرا.

**کەریم شارەزا**

# مەلا سدیقی نازەنینی
# ١٨٩٠-١٩٥٦

دادوەری یاساناسی ناوداری کورد، مەلا سدیقی ئەفەندی نازەنینی، کوڕی مەلا عەبدوڵلای خەڵکی گوندی (نازەنین)ی سەر بەقەزای کۆیە، لە ساڵی ١٨٩٠دا لە شاری کۆیە لەدایک بووە. مەلا عەبدوڵلای باوکی لە مەلا گەورەکانی ناوچەی کۆیە بووە و لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا لە مزگەوتی بایزاغای شاری کۆیە مودەریسێکی زانا و لێهاتوو بووە و مەلا سدیق و مەلا عەبدولڕەحمان شەرەفی برا بچووکی لەو مزگەوتەدا دەستیان بەخوێندنی ئایینی و زانستی لەلای باوکیان کردووە.

مەلا سدیقی ئەفەندی بەزۆری لەلای باوکی هەموو زانستێکی ئایینی و فیقهی عەرەبی و فارسیی خوێندووە، کە بووەتە خوێندەوارێکی هۆشیار، لە دوا دوای حوکمی عوسمانی دەکرێتە (نائیب زابتی ئیعاشە) بۆ چاودێریکردنی عەمباری ئازووقەی سوپای دەوڵەت و لە قوشتەپە دادەنرێ. کە ئینگلیزەکان دەگەنە قوشتەپە و دەست بەسەر عەمبارەکەدا دەگرن، ئەم رادەکات و خۆی لە گوندی (هەڵەجە) لەلای شێخ مارفی بەرزنجی کۆیی دەشارێتەوە و لە دواییدا روو دەکاتەوە ناوچەی کۆیە کە جارێ حکوومەتی عوسمانی تێدا مابوو، لە ترسی سەرباز و زەپتییەکانی عوسمانی خۆی لە ناو باخەکانی دەرەوەی شار حەشار دەدات تاکو هێزەکانی بەریتانیا بەسەرکردایەتیی کاپتن (های) لە رۆژی ١٥/١٢/١٩١٨دا دەگەنە کۆیە و ئەو سەرکردەیە حکوومەت لە شارەکە دادەمەزرێنێتەوە و مەلا سدیق چونکە خوێندەوارێکی زیرەک و ناسراو بووە دەیکاتە فەرمانبەری تاپۆی کۆیە و کە حکوومەتی عێراقیش لە ٢٣/٨/١٩٢١دا دادەمەزرێ، جاڕنامەیەک بڵاو دەکاتەوە کە هەر کەسێک خوێندەوارێکی چاک بێ و لە خۆی راببینێ لە خوێندنگای حقووق لە بەغدا بخوێنێ با بێ و بەشداری لە تاقیکردنەوەی قابیلییەت بکات، ئەویش دەچێتە بەغدا و بەشداری لەو تاقیکردنەوەیەدا دەکات و بەپلەیەکی بەرز دەردەچێ و لەو خوێندنگایە وەردەگیرێ و بۆ ماوەی ساڵێک یاسا دەخوێنێ و بڕوانامەی دەرچوون وەردەگرێ و دەبێتە دادوەر لە شاری ئاکرێ و لە ساڵی ١٩٢٨دا دەگوێزرێتەوە بۆ کۆیە و لە جێی مەلای گەورە دەبێتە (قازی شەرع)، لە ساڵی ١٩٣٠ دەگوێزرێتەوە بۆ سلێمانی لە دواییدا فرمانی دادوەریی لە گەلێک شاری کوردستان و عێراق دەبینێ وەکو هەولێر و کەرکووک و مووسڵ و بەسرا. لە ساڵی ١٩٤٠-١٩٤١دا لە هەولێر دادوەر دەبێ و لە سەردەمی شەڕەکەی رەشید عالی لە دژی بەریتانیا دەستەیەک لە هەوادارانی نازی دەیانەوێ ئازاری بدەن، بەو ناوەی دادوەری حکوومەتە، بەڵام بەچەک پارێزگاری لە خۆی دەکات و لەو تەنگانەیە رزگاری دەبێت، دوا کاری لە دادگاکان، سەرۆکی دادگای ئیستیناف دەبێ لە کەرکووک و زۆر جاریش دەکرێتە سەرۆکی دادگای کوبرا بۆ دەعوا و کێشەی گەورە و ئاڵۆز. ئەم دادوەرە یاساناسەی کورد لە ساڵی ١٩٥١دا خانەنشین دەکرێ و چەند ساڵێک دوای ئەو مێژووە لە شاری سلێمانی دەژی تاکو لە مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٥٦دا لە تەمەنی ٦٦ ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات.

**سەرچاوە:**

راپۆرتێکی تایبەتی مامۆستای کۆچکردوو (شەفیق سابیر)ی خوشکەزایەوە لەبارەی خاڵی جەنابی (مەلا سدیق)ەوە لە رۆژی ٤/٩/١٩٩٦دا نووسراوە.

**کەریم شارەزا**

# سەربردەی ژیان و کەسایەتی مەعروف جیاووک

دکتۆر ئازاد عوبێد ساڵح
کۆلێژی ئاداب-زانکۆی سەلاحەددین

**سەربردەی ژیان و**
**کەسایەتی مەعروف جیاووک**



## ڕێوڕەچەڵەک و ژیانی:

مەعروف کوڕی عەلی ئەسغەر ئەفەندی کوڕی حاجی مەولوود ئەسعەد بەدیعو ئەلزەمانە[١]، بەپێی زۆربەی سەرچاوەکان لەساڵی (۱۳۰۲ک / ۱۸۸۵ز)، لە بەغدا لەدایک بووە[٢]، بەڵام بەپێی ناسنامەی تایبەت بەمەعروف جیاووک کە لە(خانەی هونەری عوسمانی بەشی ماف- ئەستەنبوڵ/ دار الفنون عثمان حقوق شعبه سی - استانبول) دەرچووە لەساڵی ۱۲۹٤ ڕۆمی[٣] (۱۸۷۸- ۱۸۷۹ز)[٤] لەدایک بووە، دیارە ئەمەش جیاوازی لای کەم[٦] ساڵە. سەرچاوەیەکیش ساڵی لەدایکبوونەکەی بە ساڵی ۱۸۸٤ داناوە[٥]، کە ئەمەش بەڕای ئێمە بەهۆی لێکدانەوەی ساڵی زایینی و کۆچی هاتووە، چونکە هەرساڵێکی زایینی بەرامبەر دوو ساڵی کۆچییە. بەڵام د. ئیسماعیل شوکور دەڵێت: بەپێی ڕەگەزنامەکەی ساڵی ۱۸۸۵ز بەساڵی لەدایکبوونی تۆمار کراوە[٦]. هەروەها لەسەر کێلی گۆڕەکەشی ساڵی بوون و مردنی بە (۱۸۸۵ -۱۹۵۸ز) دیاری کراوە. دەبێ ئاماژە بەوەش بکەین کە عەلائەددین سەجادی ساڵی بوون و مردنی دروست نووسیوە، بەڵام لەشوێنەکان بەهەڵەداچووە، کاتێک دەڵێت: «لەباڵەک هاتۆتە دنیاوەو لەبەغدا نێژراوە»[٧].

بەپێی درەختی بنەماڵەی جیاووک، بەر لە هەشت سەد ساڵ، چوار برا لەهۆزی باڵەکی[٨]، کە هۆزێکن لەناوچەی ڕەواندزو دەوروبەرییەوە تا ناوچەی هەکاری دەژین، لەقەدپاڵی ئەو چیایەی نزیک گەلی عەلی بەگ، لەسەر ئەو ڕێگایەی بۆ ڕێزان- شانەدەر -بارزان دەچێت، لەشوێنێک بەناوی (سریشمە) گوندێکیان ئاوا کردۆتەوە ئەمەش ناوەکانیانن:

١- ماڵە باس (عەباس). ٢- ماڵە لاس (ئەلیاس). ٣- ماڵە مووس (موسا). ٤- ماڵە حەسەن کەبە پاشناوی (جیاووک) واتە (المعتزل) بە عەرەبی، ناسراون، دواتر خەڵکی دیکەی غەوارەیان تێکەڵ بوونە بەناوی (ماڵە خوباسک) و (ماڵە موریک) و ژن و ژنخوازییان لە نێواندا بووەو بەشێکیان لەگوندی سریشمە باریان کردووەو لە گوندەکانی نزیک هەولێر وەک گوندی بەرحوشتر نیشتەجێ بوونە[٩].

لەبارەی وشەی جیاووکەوە ئەوە لە (جیا- جودا- جیاواز- جیابوونەوە) هاتووە، هەروەک لەدرەختی بنەماڵەشدا بەعەرەبیش مەعروف جیاووک (المعتزل)ی عەرەبی بۆ بەکارهێناوە[١٠]. هەروەها مەلا جەمیل ڕۆژبەیانیش (۱۹۱۲-۲۰۰۱) لە وتاری چلەی مەعروف

جیاووکدا نووسیویە: " وان تفارق هذە الدنیا الدنیئقوانت الملقب بالمفارق (جیاووك)" واتە: "ئەتۆ وا لەو دنیا هیچەدا جیا دەبییەوە، پاشناویشت جیاووک"ە[١١].

ئەم وشەیە بەچەند شێوەیەک بەکارهاتووە عەلا ئەدین سەجادی، بەجیاووگ[١٢]، گیومۆکریانی بەجیاووگ و جیاووک[١٣]، مەسعود محەمەد (جیاوۆک)[١٤]، عومەر عەلی شەریف[١٥] و چاپی دووەمی دەزگای ئاراسی کتێبی (مأساة بارزان المظلومة)[١٦] و رەفعەت عەبدولرەزاق[١٧] و مەولوود بێخاڵی[١٨] و (ئیسماعیل شوکر)[١٩] بە(چیاووک)، بێجگەلەمان خەڵکانی دیکە هەموویان (جیاووک) یان بەکارهێناوەو لەهەمووشی گرنگتر مەعروف جیاووک لەژیانی خۆیدا هەر (جیاووک)ی بەو شێوەیە بەکارهێناوە. وەک دەزانین، ئەو زۆر پەرۆشی بەکارهێنانی رێنووس و ناوی کوردی بووە، کە لەشوێنی خۆی باسیان دەکەین، خۆ ئەو سەردەمەش پیتەکانی (چ. پ. ژ. ڤ) دارێژرابوون، ئەگەر وشەکە بە (چ) با، بێ گومان بەکاری دەهێناو ئاماژەی پێدەکرد.

بەڵام ئەوەی لەهەموویان پتر جێی سەرنجە راو بۆچوونی (ئیسماعیل شوکر)ە، کە لەپەراوێزی (A)ی توێژینەوەکەیدا لەسەر زاری ئەحمەد جەمال جیاووک و شوکریە عەلی ئەکبەر، نووسیوویە: "چیاووک دێیەکە لەنزیک سرێشمەی سەر بە ناوچەی خەلیفان، چیاووک بچوککراوەی وشەی (چیا)یە، ئەم دێیە لەقەد پاڵی رەوەزە شاخێک دروستکراوە، لەشاخەکانی دەوروبەری نزمترە و دانیشتوانی ناوچەکە بە(چیایۆکە)ی ناو دەبەن و دێیەکەش بەم ناوە ناونراوە"[٢٠].

سەبارەت بەهەبوونی دێیەک بەناوی (چیاووک)، لەرۆژی ٢٣ی تەمموزی ٢٠٠٦ توێژەر سەردانی دێی (سرێشمە)ی کردو لەگەڵ مەلا عەبدولفەتاح تاهیر محەمەد ئەمین دانیشتووە کە مرۆڤێکی خوێندەوارەو بەئاگاورییەو ئاگاداری هەواڵ و رووداوەکانی ناوچەکەشە، گوتی: لێرە هیچ دێیەک و هیچ شوێنێکیش بەو ناوەوە نییە، بەڵام بۆ ناوی (جیاووک) دوو بۆچوون هەیە:

أ- حوسێن قادر پیرباڵ خەڵکی سرێشمە بوو، بەر لە حەفتاکان کۆچی دوایی کردووەو باپیری خۆی (پیرباڵ)ی دیتبوو قسەکانی لەو وەرگرتوون، کەوا لەو گوندەدا (سرێشمە) چوار تایفە بران: ١- موسا، ٢- لاس. ٣-



بڕوانامەی گواستنەوەی مەعروف عەلی ئەسغەر لەخوێندنگای ماف لەئەستەنبوڵ بۆ خوێندنگای ماف لەبەغدا (لای جیهان جیاووک هەڵگیراوە)

باس، ٤-جیا، ئەو جیایە لەهەموویان بچووکتر بووەو ژنی هێناوە ماڵی خۆی کردووەو (جیا) بۆتەوە. نەوەکانی ئەوانە واتە: موساو لاس و باس و جیا، ماون لەگوندی (سرێشمە) و ئەو وشەیە تورکییەو بەواتای (کەرو لاڵ) دێت و دێیەکی خۆشەو شوێنێکی بڵندو دڵگیری هەیە.

ب- گوندی جاوکە لە ناوچەی روست هەیە، گوایە حاجی مەولوود چۆتە کوێستان لەو ناوچەیە کە وەک هاوینەهەوار وایەو تەنانەت (سرێشمە)ش لەوێ هەیە، کە سەر بەقەزای چۆمانە، هەر لەدرێژەی قسەکانی (مەلا عەبدولفەتاح)، باسی ئەوەی کرد (حاجی مەولوود)ی باپیری مەعروف جیاووک خوشکێکی بەناوی (گوڵە کۆر) هەبووە، لە مازووکردندا زێڕی دۆزیوەتەوە لەشوێنێک ئێستاکەش پێی دەڵێن (چەقەری خەزێنە)، دوای دۆزینەوەی ئەو خەزێنەیە، چۆتە هەولێر و لە مزگەوتی خانەقا گیرساوەتەوە[٢١]. کەچی یەکێکی دیکە دەڵێت: ئەوە لەکاتی جووت کردندا بووە، بۆ چاندنی بەیار (رەزی

میتو)، کووپە لیرەیان دۆزیوەتەوە[٢٢].

هەر لەپەیوەندی بەبابەتی دۆزینەوەی خەزێنەوە، خەڵکی گوندەکە، دیتنەوەی ئەو خەزێنەیان لا ئاساییە. بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٩٢، هەندێک لەدانیشتوانی گوند لەشوێنێک کە ئێستا (بەردی خەزێنە)ی پێدەڵێن، لەکاتی دروستکردنی خانوودا زێڕیان دۆزیوەتەوە. تەنانەت ئەو ماڵەی ئێمە لەو سەردانەدا لێی میوان بووین، ماڵی تەقییەدین عومەر ئەحمەد شابازی ناو بوو، خۆی هەندێ لەو زێڕانەی دۆزیبۆوە[٢٣].

هەمان ئەو زانیاریانەی مەلا عەبدولفەتاح، حەمەدەمین حاجی عەبدوڵلاش پشتڕاستی کردەوە، ئەو پتریش گوتی: دوای چوونە هەولێر ژنی لە بنەماڵەی چیچۆ هێناوە، پاشان چۆتە موسڵ. لە بارەی دێی (جاوک) ی لای گوندی (روست)یش گوتی: هیچ پەیوەندی بەو (جیاووک)ەی بەرەبابی جیاووکەوە نییە[٢٤].



لەبارەی ئەو دێ بچووکەی لای گوندی روست بەناوی (جاوکە)، ئەوا بێگومان ئەگەر ئەویا، مەعروف جیاووک، چۆنە وەک خۆی ئاوای بەکاردەهێنا واتە (جاوکە) نەک (جیاووک)، چونکە ئێمە سەرنجمان داوە مەعروف جیاووک لە هەموو نووسینەکانیدا وشەی (جیاووک)ی بەیەک شێوە بەکارهێناوە، بۆیە بێ دوودڵی (جیاووک) راست و دروستەو تەواو بەمانای جیابوونەوەیە[٢٥].

بەپێی درەختی بنەماڵەی جیاووک، ماڵی حەسەن جیاووک بەوە ناسراون کە ژمارەیەک زاناو داناو وێژەوانیان لێ هەڵکەوتوون بەو شێوەیە:

ماڵە حەسەن جیاووک: فەقێ داود- مەلا مەولوود- مەلا وەلی - زانای گەورە مەلا عەبدوڵلا- فەقێ سولێمان - فەقێ ئیمام- فەقێ وەلی و حاجی مەولوود ئەسعەد، لە هەندێ شوێن (سەعدی)، کەبە (بديع الزمان) بەناوبانگ بووە. (حاجی مەولوود) لە ساڵی ١٢٢٦ ک (١٨١١ز) لەدایک بووەو لە ساڵی ١٣٠٦ک (١٨٨٨ز) لە موسڵ کۆچی دوایی کردووە[٢٦] و یەکێ لە زانا ناودارەکانی باشووری کوردستان بووە، لەریزی زانایانی ناوداری سەردەمی خۆی بوو وەک قانانی[٢٧] و زەهاوی[٢٨]و ئالووسی[٢٩] حاجی مەولوود کە دوو جاران چۆتە شەڕ لەدژی رووس[٣٠]. کتێبی دەستنووسی هەبووە بەزمانی عەرەبی لەبارەی رێزمانی عەرەبییەوە[٣١].

حاجی مەولوود بەڕێوەبەری قوتابخانەی روشدییە بووە لە مووسڵ[٣٢]، لە بەغدا ژنی هێناوە[٣٣].

وەک مەعروف جیاووک خۆی دەڵێت: باپیری فەقێ وەلی[٣٤] جیاووک لەگەڵ منداڵەکانی لەساڵی ١٢٥٢ک (١٨٣٦ز) هاتۆتە هەولێر[٣٥]، پاش ئەوەی دەسەڵاتدارانی عوسمانی محەمەد پاشای (١٧٨٨-١٨٣٧ز) میری سۆرانیان لەناوبردووە. لە هەولێرو دەوروبەری بوونەتە خاوەن خانوو و زەوی و زارو گوندو حەسار، وەک گوندی دارەتوو[٣٦] و کاریزی تەیمور بەگ و خانووی کورتەک[٣٧] هەندێکیان ئێ نەوەکانیانە، ئەو حەسارەی نزیک مەزاری عوزێر پێغەمبەر، کە نەخۆشخانە بووە، موڵکی حاجی داود جیاووک بووە[٣٨].

**حاجی مەولوود ئەم منداڵانەی هەبووە:**

١- زانای ناودار عەلی ئەسغەر ئەفەندی[٣٩]، کە

لەسەردەمی عوسمانییەکاندا بە (خزمەتکاری شەریعەت و هەژاران) ناوی دەرکردبوو[٤٠]، وانەبێژو پێشنوێژ لەسوپای عوسمانی و وەکیلی ئۆردوو بووە لەهەموو دادگاکاندا[٤١]، لەئامادەیی روشدییەی سەربازی و پاشایەتی مامۆستای زمانەکانی عەرەبی و تورکی و فارسی بووە،، لەسالّی ١٩٢٦ز لەموسل مردووە[٤٢].

عەلی ئەسغەر دانراویشی هەبووە، بەبەلگەی ئەو دەستنووسەی کەبەناوی (الفوائد المعروفیة في علم النحو واللغة العربیة)، لە ١٨٩٥ لەبەغدا نووسراوە. دەستنووسەکە (١٢٢) لاپەڕەیەو لەلاپەڕە (١)دا ئاماژە بەوە دەکات ئەو نامەیە پوختەو هەموو شتی تێدایەو لە خۆشەویستی (مەعروف)ی کوڕی ناوی لێناوە (الفوائد المعروفیة)[٤٣] بۆ ئەوەی خودا بیکاتە زانایەکی خاوەن کردار(٤٤).

٢- عەلی ئەکبەر[٤٥]: ئەفسەر بووە لە سوپای عوسمانی.

٣- حوسێن: چۆتە حیجاز و نەگەڕاوەتەوە.

٤- زانای ناودار مەلا محەمەد ئەمین.

**ئەمە وێڕای ئەم کچانە:**

١- نەسیمە هاوسەری یوسف پاشای عەلەوی.

٢- سەفییە هاوسەری یەکێک لە پاشاکانی ئەلبانیا بوو.

٣- خەدیجە.

٤-حوسنییە.

٥- ئامینەڕەش[٤٦].

بەهۆی کاری (ئیمام تابووری) لە سوپای عوسمانی، لە سەردەمی سولتان عەبدولحەمیدی دووەم (١٨٧٦-١٩٠٩ز) بەپێی یەکە سەربازییەکان شوێنیان دەگوازرایەوە. لەوکاتەی کە عەلی ئەسغەر لەسلێمانی بووە، لەبنەماڵەی بابانەکان ژنی هێناوە[٤٧]و ژنەکە ناوی (رەحمە خانی بابان) بووە، لەو ژنە دوو کوڕی بووە (مەعروف و عارف)، مەعروفیان نۆبەرە بووەو بەناوی (شێخ مەعروفی کەرخی)[٤٨] کراوە[٤٩]. بەپێی درەختی بنەماڵەش کوڕێکی دیکەشیان بەناوی (عرفان) هەبوو بەلاّم بەبچووکی مردووە[٥٠]. مەعروف جیاووک حەوت خوشکی هەبووە (زەینەب، عەنبەر، دورسن، نەزیرە، سەعدییە، ئەمینە، مونیرە[٥١]، دایکیشیان (رەحمە بابان) لەسالّی ١٩٣٣ کۆچی دوایی کردووە[٥٢]. مەعروف عەلی



وێنەی گوندی سریشمە 2008 / بە کامێرای ئۆژار

ئەسغەر لەسەردەمی عوسمانییەکاندا، لەتەک خوێندنی ئایینی لەسەر دەستی باوکی و چەند زانایەکی ئایینی، باوکی مامۆستای فارسی و تورکی بۆ گرتووە، خوێندنی سەرەتایی و روشدییەی[٥٣] لە بەغدا، لەسالّی ١٩٠٢دا، بەسەرکەوتوویی بڕیوە[٥٤]. بە پێی ناسنامەی ژمارە (٤٦٨٣) لە رۆژی ٧/کانوونی دووەمی/١٣٢٥ رۆمی (٢٠/کانونی دووەمی /١٩٠٩ز) خوێندکاری کۆلێژی ماف بووە[٥٥] سەرچاوەی دیکەش ئەمە دووپات دەکەنەوە کە مەعروف جیاووک و رەشید عالی گەیلانی (١٨٩٨-١٩٦٥)و نوری سەعید (١٨٨٨-١٩٥٨)، هەرسێکیان پێکەوە بەسواری ولاّغ چوونەتە ئەستەنبوّل بۆ تەواوکردنی خوێندن، رەشید عالی گەیلانی و مەعروف جیاووک لەکۆلیژی ماف[٥٦] وەرگیراون و نوری سەعیدیش لە کۆلیژی سەربازی[٥٧].

ئەگەرچی زۆربەی هەرە زۆری سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە مەعروف جیاووک لەئەستەنبوّل خوێندنی تەواوکردووە،[٥٨]، بەلاّم وادیارە زۆربەی ئەوانەی لەبارەی مەعروف جیاووکیان نووسیوە، زانیاری پێش خۆیان نووسیودتەوە، بەمەش هەموویان هەڵەی یەکدیان دووبارە کردۆتەوە، بەلاّم راستییەکەی ئەوەیە کە لەئەستەنبوّل بۆی تەواو نەکراوە، ئەویش لەبەر بارودۆخی دوای کودەتای ئیتحادییەکان (٢٣ی تەمموزی ١٩٠٨)، مەعروف جیاووک لەکۆتایی سالّی ١٣٢٤ رۆمی (١٩٠٨) چۆتە ئەستەنبوّل، کە ئەو سەردەمە ئەو شارە "بۆنی خوێنی لێ هاتووە"[٥٩].

بەهۆی هەڵوێستی دژ بەئیتحادییەکان، لەئاکامی ڕووداوی ٣١ی مارتی ١٣٢٥ ڕۆمی (١٣ی نیسانی ١٩٠٩ز)[٦٠]، زۆر بەزەحمەت توانیویەتی خۆی لەدەستیان ڕزگار بکات[٦١]، دوای ئەوەی ڕایان کێشاوەتە بەر دادگا، لەدوای یەکەم دانیشتنی دادگا خۆی ون کردووەو لەماڵی یوسف پاشای عەلەوی میری (زەفار) خۆی شاردۆتەوەو لەمردن ڕزگاری کردووە، ناوبراو مێردی نەسیمەی پووری مەعروف جیاووک بووەو دوای سێ مانگ و دە ڕۆژ، واتە لە ١٠ی تەمموزی ١٣٢٥ی ڕۆمی بەرانبەر (٢٣ی تەمموزی ١٩٠٩ز)، کە ڕۆژی دەرکردنی لێبوردنی گشتی بووە، بۆ ئەوانەی لەناو ئەستەنبۆڵ مابوون، مەعروف جیاووک گەڕاوەتەوە بەغدا[٦٢]. بۆ پتر دڵنیابوون لە مەسەلەی گەڕانەوەی لەئەستەنبۆڵ و تەواونەکردنی خوێندن، خۆی دەڵێت: «...خوێنەر تێدەگات من لەو کاتەدا هەستی دانیشتن لەسەر کورسی نوێنەرایەتیم بۆ پەیدا بوو، بەڵام ڕووداوێکم لێ قەوما، کە لەخەیاڵمدا نەبوو، ناچار بووم ئەستانە جێ بهێڵم...»[٦٣]. لە ١٦ کانوونی یەکەمی (١٣٢٦) ڕۆمی (٢٩/کانوونی یەکەمی/١٩١٠ز) بۆ بەغدا گواستراوەتەوە، بەڵام ئاماژەی بەڕووداوەکە نەکردووە. هەردوو ساڵی خوێندنی (١٣٢٦-١٣٢٧) ڕۆمی (١٩١٠-١٩١١ز)، (١٣٢٧-١٣٢٨) ڕۆمی (١٩١١-١٩١٢ز)، بڕیوەو بووەتە خوێندکاری پۆلی سێیەم لەساڵی خوێندنی (١٣٢٨-١٣٢٩) ڕۆمی (١٩١٢-١٩١٣ز)، بەڵام تەواوی نەکردووە[٦٤].

ماوەیەک کراوەتە بەڕێوەبەری ناحیەی (تەدمر - دیر الزور) لە سوریەو لەوێ ژنی یەکەمی هێناوەو کچێکی بەناوی پاکیزە لەو ژنە هەیە[٦٥]. لە١٨ی کانوونی دووەمی ١٩١٢ لەبەغدا ڕۆژنامەی (الحقوق)ی بەهەردوو زمانی عەرەبی و تورکی دەرکردووە[٦٦]. بەهۆی لێهاتوویی، لەساڵی١٩١٣ وەزارەتی مەعاریف دەیکاتە یاریدەدەری بەڕێوەبەری خانەی مامۆستایان لە بەسرە[٦٧].

لەدوای بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهان، لە ٢٦ ی تشرینی یەکەمی ١٩١٤، لە بەسرە بووەو دوای شەڕی (کوت الزین)[٦٨] و گرتنی بەسرە لەلایەن ئینگلیزەوە، بەدیلی بردوویانەتە (تات میو)ی سەر بە ڕانگون لە بورما[٦٩] تا بەهاری ساڵی ١٩١٩[٧٠] پێنج[٧١] ساڵ لەوێ ماوەتەوەو لەوێ دووچاری نەخۆشی (الحمى الدماغية)



مەلا مستەفا بارزانی و مەعروف جیاووک

بووەو دوو ساڵ لەنێو جێگادا لەنێوان ژیان و مردندا بووە، پاشان چاک دەبێتەوەو بەلاشەیەکی لەڕو لاواز دەگەڕێتەوە بەغدا، لە سەربازگەی هنێدی (ڕەشیدی ئێستا) دەدرێتەوە کەس و کاری، بەڵام دایک و باوکی سەرەتا نایناسنەوە، تەنانەت خەریک بووە بگەڕێنەوەو بەجێی بێڵن، ئەگەر خۆی ئەوانی نەبینیبا و بە زمانی کوردی هاواری لێ نەکردبان، ئیدی بەرەبەرە تەندروستی بەرەو باشی دەچێت[٧٢]. ئەوەش نزیکەی ساڵێکی خایاندووە[٧٣].

دوای ئەوەی تەندروستی دێتەوە سەرەخۆی دەست دەکاتەوە بەخوێندن، لەو سەروبەندەدا، کە بەغدا لەبن دەستی بەریتانیادا بوو، دەسەڵاتی سەربازی بەریتانیا بۆ بەڕێوەبردنی وڵات و ڕێکخستنەوەی دام و دەزگاکانی، پێویستی بەدادوەرو ژمارەیەکی زۆر یاساناس هەبووە، بۆیە دەبوا، (خوێندنگای ماف) سەرلەنوێ لەسەر بنەمایەکی تازە دابمەزرێتەوە. دوای ڕاوێژو پرسکردن بە شارەزایانی ئەو بوارە، ئاگادارییەک بۆکردنەوەی خوێندنگای ماف لە بەغدا لە ٣١ی تەمموزی ١٩١٩، لەلایەن مێجەر (هێ. ئەی. بۆمن)، بەرپرسی مەعارفی گشتی بەکردنەوەی دوو پۆل ڕاگەیاندراوە. پۆلێک بۆ ئەوانەی لەکاتی هەڵگیرسانی شەڕی یەکەمی جیهان بەلایەنی کەم ساڵێک یان دوو ساڵیان لە خوێندنگای ماف لە بەغداو ئەستەنبۆڵ خوێندووەو بەهۆی شەڕەوە بۆیان تەواو نەکراوە، دەیانتوانی بەڵگەنامەکانیان پێشکەش بکەن بۆ تەواوکردنی



وێنەی جیاووک بەجلی کوردی لەگەڵ حمە بەگی جاف

خوێندنەکەیان. دیارە مەعروف جیاووکیش یەکێک لەوانە بووە، بۆیە دوای چاوپێکەوتن و تاقیکردنەوە، (٤٥) چل وپێنج خوێندکار کە (٢٥) بیست و پێنجیان لە (پۆلی بەرز) وەرگیراون، لەبەر ئەوەی دوو ساڵیان لە خوێندنگای مافی پێشوو خوێندووە. لە لیستی ناوەکاندا، کە ناوی (٢٠) بیست خوێندکار لەو سەرچاوەیەدا تۆمار کراوەو بە(عبدالجبار ال الجمیل) دەست پێدەکات و بە(صالح مراد) کۆتایی هاتووە، ناوی (معروف علی اصغر) یش یەکێکە لەوانە و زنجیرەی (١١) یازدەمینە. لە ١ی تشرینی دووەمی ١٩١٩ خوێندن بەرێکوپێکی دەست پێدەکات و خوێندنەکە ئێواران بووەو تا مانگی تەممووزی ساڵی ١٩٢٠ بەردەوام بووەو تاقیکردنەوەش زارەکی (شفهی) بووە. ئیدی لەئێوارەی رۆژی ١٨ی تەممووزی ١٩٢٠ ئاهەنگی دەرچووان بەڕێوەچووەو (٢٠) بیست خوێندکار دەرچوونەو بڕوانامەی خوێندکاری مافیان پێ بەخشراوە، کە (مەعروف عەلی ئەسغەر)یش یەکێکە لەوان[٧٤]. هەروەها مەعروف جیاووک وەک خۆی دەڵێت: لەگەڵ رەشید عالی گەیلانی هاوڕێی خوێندن بوونە، کاتێ لە خوێندنگای ماف لەیەک پۆل بوونە، کە «لە ئەستانەوە هاتمەوە لایان و چوومە پۆلی دووەم»[٧٥].

لەدوای تەواوکردنی خوێندنی ماف لە ١٨ی تەممووزی ١٩٢٠ بۆ ماوەیەکی کورت خەریکی پارێزەری بووە[٧٦]، لەکۆتایی ساڵی ١٩٢٣ چۆتە ناو فەرمانی میرییەوە[٧٧]، کراوەتە دادوەری دادگای پێکهاتن (صلح)ی کەرکووک، لەتشرینی دووەمی ١٩٢٣ دەست بەکار بووە[٧٨].

پاشان دەبێتە دادوەری بەرایی هەولێر لە ساڵی ١٩٢٤و دادوەری پێکهاتنی دیوانییە لەساڵی ١٩٢٥ و پاشان بەپێی سەرچاوەکان لە ئابی ١٩٢٦ دادوەری سزای موسڵ بووە، گوازراوەتەوە دادوەری پێکهاتنی دەلتاوەو[٧٩] لەکانوونی یەکەمی ١٩٢٦یش کراوەتەوە دادوەری پێکهاتنی ئەلحەی[٨٠] لە لیوای کوت[٨١]. وەک دادوەرێکی دیاریش، هاتن و چوونی لە رۆژنامەکاندا بلاوکراوەتەوە[٨٢]. لەساڵی ١٩٢٧ کراوەتە دادوەر لە موسەیب و لە ساڵی ١٩٢٨ بەنوێنەری هەولێر هەڵدەبژێردرێ و دەبێتە جێگری یەکەمی سەرۆکی پەرلەمان لە ١٩ی مایسی ١٩٢٨[٨٣]. ئەوە تاکو ٢١ی مارتی ١٩٣٠ ماوەتەوە[٨٤] دوو جاری دیکەش خەڵکی هەولێرو کەرکووک داوایان لێ کردووە خۆی بپاڵێوێ، یەکەمیان لە سەردەمی وەزارەتی ناجی شەوکەت (٣ی تشرینی دووەمی ١٩٣٢-١٨ی ئاداری ١٩٣٣) و دووەمیشیان لە سەردەمی وەزارەتەکەی حیکمەت سلێمان (٢٩ تشرینی یەکەمی ١٩٣٦- ١٧ی ئابی ١٩٣٧)، لەبەر ئەوەی پاڵێوراوی خەڵک بووەو پاڵێوراوی حکومەت نەبووە بۆیە دەرنەچووە[٨٥].

لەکاتێکدا خەریکی مامەڵەی خانەنشینی بووە[٨٦]، جارێکی دیکە مەعروف جیاووک دەگەڕێتەوە ناو کاری میری بەپێی فەرمانی شاهانەی ژمارە (٢٧٠) لە ١٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٣١ بەدادوەری شارستانی لەعێراق دامەزراوەو بەفەرمانی شاهانەی ژمارە (٢٩٣)ی رۆژی ٢١ی تشرینی یەکەمی ١٩٣١ بەدادوەری تاک (حاکم منفرد)ی پلە یەکی کەربەلا دامەزراوە[٨٧]، کە ئەمەیان لەسەر داوا و پێداگری مەلیک فەیسەڵ (١٩٢١ - ١٩٣٣) بووە[٨٨].

لەساڵی ١٩٣٣ بەدادوەری بەرایی کەرکووک و پاشان لەساڵی ١٩٣٤ بەجێگری یەکەمی سەرۆکی دادگای بەرایی

کەرکووک دامەزراوە[٨٩] و لەساڵی ١٩٣٦ یش بەپشکنەری دادوەری و جێگری سەرۆکی دادگای بەرایی حیللە هەر لەو ساڵەدا. لەساڵی ١٩٣٨ بەپشکنەری داواکاری گشتی و لە ساڵی ١٩٤١یش بە داڕێژەری یاسایی (مدون قانونی) و دواتریش بەئەندامی دادگای پێداچوونەوە لە ساڵی ١٩٤٢[٩٠]. لەئابی ساڵی ١٩٤٤ دەکرێتە موتەسەریفی سلێمانی و لەمارتی ١٩٤٦ خۆی دەست لەکار دەکێشێتەوە[٩١]. بەڵام مستەفا نەریمان نووسیویە: "میری دوابراو لە بزێوی و چالاکی جیاووک نارەزا بوو تەقاعودیان کرد"[٩٢].

لە ئابی ساڵی ١٩٤٦، جارێکی دیکە دەیگەڕێننەوە بۆ فەرمانی میری و دەکرێتە بەڕێوەبەری گشتی ئینحساری توتن، تا لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٧ بەیەکجاری واز لەکاری میری دەهێنێ و خەریکی پارێزەری دەبێت[٩٣].

مەعروف جیاووک لەساڵی ١٩٥٣، هێزو توانای لاشەی بەرەو کزی چووە، تەندروستی باش نەبووە، بۆیە بۆ چارەسەری لەگەڵ بۆتانی کوڕی چۆتە لەندەن و (٢٤) بیست و چوار رۆژ لەوێ ماونەتەوەو نەشتەرگەری بۆ کراوەو جارێکی دیکە جەستەی بەگوڕ هاتۆتەوەو گەڕاوەتەوە بەغدا، دوای ماوەیەکی دیکە نەخۆشییەکەی سەری هەڵداوەتەوەو لە دوا مانگی ساڵی ١٩٥٧، ژیانی کوڕی بردوویەتییەوە (لەندەن)، لای دکتۆر (مۆرگان)، بەپێی وتەی مستەفا نەریمان ئەو پزیشکە پێی گوتووە: (باوکت سێ مانگ و دە رۆژی لەژیاندا ماوە) ئەویش یەکسەر هێناویەتەوە بەغدا[٩٤]. لەکاتژمێر چوارو نیوی رۆژی سێشەمەی ٢١ی کانوونی دووەمی ١٩٥٨، لە شاری بەغدا کۆچی دوایی کردووەو هەواڵەکە لە ئێستگەو رۆژنامەکانی ئەو سەردەمە راگەیاندراوە[٩٥]. لەسەر راسپاردەی خۆی تەرمەکەیان هێناوەتەوە هەولێر، هەر لەبەغداوە ژمارەیەکی زۆر ئۆتۆمبێلی لەگەڵ هاتووە تا جەلەولا و لە کەرکووکیش هەروا تا پردێ و لە هەولێریشەوە بەو جۆرەو تا لەنیوە شەودا گەیاندوویانەتەوە هەولێرو لە بەیانی رۆژی پێنجەشەممە ٢٣ی کانوونی دووەمی ١٩٥٨ بەئامادەبوونی سەدان کەس لە خەڵکی هەولێرو موتەسەریفی ئەوکاتەی هەولێر[٩٦]و سەرۆکی فەرمانگەکان لە گۆڕستانی شێخی چۆلی بەخاک سپێردراوە[٩٧].

رۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو سەردەمە بەبۆنەی کۆچی دوایی مەعروف جیاووکەوە وتارو شیعری شاعیرانیان بڵاوکردۆتەوە، لەوانە گۆڤاری (هەتاو) لە شاری هەولێر، وێڕای بڵاوکردنەوەی هەواڵی کۆچی دوایی، دوو وتاریشی بڵاو کردۆتەوە، گیوی موکریانی (١٩٠٢-١٩٧٧): (بەهەشتی مەعروف بەگ جیاووگ) (٩٨) و (چلەی بەهەشتی مەعروف جیاووک). بشیر موشیر (١٨٩٣-١٩٦٣): (چلەی بەهەشتی معروف جیاووک)[٩٩].

ئەوەی زانراوە مەعروف جیاووک (١١) ژنی هێناوەو دواهەمینیان (سەبیحە عەبدولعەزیز)ە کە لەساڵی ١٩٣١وە لەگەڵی ژیاوەو لە ساڵی ٢٠٠٦ کۆچی دوایی کردووە. دوای ئەو هیچ ژنی دیکەی بەسەر ئەمدا نەهێناوە[١٠٠].

سەرچاوەکان سەبارەت بەژمارەی هاوسەرەکانی مەعروف جیاووک جیاوازن، بەلای د. ئیسماعیل شوکرەوە (١٢) دوازدە ژنی هێناوە، دووی یەکەمی خەڵکی شاری ماردین و یەکێکی ئەلبانی و چواری عەرەب و چواریشیان کوردی باشووری کوردستان و خەڵکی هەولێر بوونەو دوانزە کوڕو شەش کچی هەبووە[١٠١]. هەرچی مستەفا نەریمانە، دەڵێت: گوایە (١٠) ژنی هێناوە، بەڵام ئاماژە بە هەشت ژن و دە کوڕو چوار کچ دەکات بەڵام ژمارەو ناوی ژن و منداڵەکانی بەم شێوەیە کە لە خشتەی خواردوە خراوەتە روو:

**خشتەی ناوی ژن و منداڵەکانی مەعروف جیاووک:**

ئیدی بەو جۆرە مەعروف جیاووک، ژیانی خۆی بەسەربردووەو لەهەموو هەوارەکانی ژیاندا هەر بەسادەو ساکاری ژیاوەو هیچ پلەو پایەک خۆی لێ نەگۆڕیوە، نوێنەرایەتی، موتەسەریفی، بەڕێوەبەری گشتی، سەرۆکی دادگا، دادوەر، نە ناسیاوی لەگەڵ گەورە بەرپرسانی ئەو رۆژگارە، وەک نوری سەعیدو رەشید عالی گەیلانی و بنەماڵەی سویدی، ئەوانی دیکە.

کە مردووە، تەنیا خانوویەکی لەدوا بەجێ ماوە، کە لەکاتی خۆی زەوییەکەی لە شاعیری میللی عێراق مەلا عەبودی کەرخی کڕیبوو و تا سەرەتای پەنجاکان نەیتوانیبوو بیکاتە خانوو، ئەویش بە قەرد حەسەن رەفعەت (١٩٢٧-١٩٩٩)ی ئەندازیار بۆی دروست کردووە[١٠٣].

سەبارەت بەئەداری مەعروف جیاووک، لەدوا

| ز | ناوی دایك | زێدی | منداڵەکانی |
|---|---|---|---|
| ١ | خێریە | تەمر – دیر نەلزور | ١-بدیع الزمان<br>٢- پاکیزە ١٩١٠- ١٩٨٢ |
| ٢ | حۆرییە | - | نەزیهە ١٩١٤ |
| ٣ | کەیفییە | شێخلییەکانی بەغدا | ١- نەریمان ١٩٢٥- ١٩٧٧<br>هەتاو |
| ٤ | عائشە لوتفی | رواندز | سامان ١٩٢٣ |
| ٥ | زەکییە | حیللە | سۆران ١٩٢٥ |
| ٦ | وەسفییە | لە تکریتییەکانی کەرکووکە | بۆتان ١٩٢٥-١٩٩٢ |
| ٧ | ماهیە لەتیف | کەرکووك | ژیان ١٩٢٩ - ١٩٦٥ |
| ٨ | جیهان | - | - |
| ٩ | هەمین | هەولێر | زاغرۆس ١٩٣٥ |
| ١٠ | | | |
| ١١ | سەبیحە عەبدولعەزیز | سلێمانی | جوامێر (١٩٣٢) پەیمان (١٩٣٥)<br>بەختیار (١٩٣٧) جیهان (١٩٤٠)<br>کامەران – هوشیار (١٩٤٢-١٩٧٦)<br>سروود (١٩٤٧)[١٠٣] |

ساڵەکانی ژیانی، مەلا جەمیل رۆژبەیانی (١٩١٢-٢٠٠١) دەڵێت، پارەی سەفەرکردنی نەبوو بۆ چارەسەری بچێت[١٠٤]. هەروا عەبدولمەجید لوتفیش (١٩٠٤-١٩٩٢) بەراشکاوانە دەڵێت: تەنیا خانوێکی هەبوو کە بۆ چارەسەری فرۆشتی و قەرزیش بەرۆکی گرتبوو و مووچەی خانەنشینەکەشی بەشی پێویستی کەسێکی نەخۆشی نەدەکرد، بۆیە داوا دەکات کە یارمەتی خێزانەکەی بدرێت بۆ ئەوەی بتوانن قەرزەکان بدەنەوە، چونکە مافی جیاووک بەسەر ئەو نیشتمانەوەیە یارمەتی بدرێت[١٠٥].

### کەسایەتی و پەیوەندییەکانی مەعروف جیاووک

هەموو ئەوانەی باسی مەعروف جیاووکیان کردووە، چ ئەوانەی بەنووسین لەبارەیانەوە نووسیوە، یان ئەوانەی ئێمە دیدارمان لەگەڵ کردوون، ئەو پیاوەیان بەمرۆڤێکی راستگۆو دڵسۆزو دەستپاک و پاک و بوێرو قسە لەروو و کوردپەروەرو مەردو دەروون بەرز و قسەکەرو لاگیری هەژارو لێقەوماو لەقەڵەم داوە[١٠٦].

ئەمە سەرەڕای نووسینی وتار و شیعری تایبەتی بۆ مەعروف جیاووک، چ لەکاتی دامەزراندنی یانەی سەرکەوتن و چ لەکاتی دیکەو دوای کۆچی دوایی و یادکردنەوەی لە گۆڤارو رۆژنامەکان و کاغەزە ئەلیکترۆنییەکان، بەکوردی و عەرەبی و تا ئێستاکە ئەو نووسینانە بەردەوامن و زۆربەیان لەبارەی ژیان و هەڵوێست و بەرزنرخاندنی کارو کردەوەکانییەتی و بەپیاوێکی مەزن و پاک و ئازاو بوێرو رەندو دەستپاک و بەرِوومەت و جوامێر و دڵسۆزی کوردو کوردستان و دۆستی لێقەوماوان و راستگۆو دادپەروەرو.. هتد ناویان بردووە[١٠٧].

کار و کردەوە و هەڵوێست و دڵسۆزی و بوێری جیاووک بۆتە جێی سەرنجی خەڵکی کوردستان، ئەوە وای کردووە، ئەگەرچی نوێنەری هەندێ ناوچەش نەبووە، کەچی خەڵکی ناوچەی جیا جیا هانایان بۆی بردووە، بۆ ئەوەی داواکارییەکانیان بگەیێنێتە لای بەرپرسان و لایەنی پەیوەندیدار، یان خەڵک بۆ هێنانە دی پێویستییەکانیان روو لە و بکەن، کە ئەمەش جێی بڕ وای خەڵک و بەراستی نوێنەرایەتی کردنی خەڵکە. ئەوەتا دانیشتوانی شاری ئامێدی، پایتەختی دێرینی میرنشینی بادینان، لە رۆژی ٢٦ی مارتی ١٩٣٠ سکاڵایەکیان بە ئیمزای کۆمەڵێک پیا وماقوولی ئەو شارە، بە و ناوانە: (محەمەد ئەمین تاهیر ئەفەندی، سدیق بەکر ئەفەندی، ئەمین ئەفەندی، رەشید ئەفەندی، سەید مستەفا ئەفەندی، حاجی عەبد ولقادر) بۆ نارد ووە تێیدا دەڵێن کە ئەوان ئەو سکاڵایەیان دا وەتە مەلیک و مەند وبی سامی و را وێژکاری لیوای موسڵ و سەرۆکی وەزیران و سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەران و موتەسەریفی موسڵ و قایمقامیەتی ئامێدی و تێدا نووسیویانە، ئەو شارۆچکەیە (ئامێدی) شارێکی کۆنی ئیسلامییە و شوێنە واری مێژوویی تێدایە و پایتەختی میرنشینی بادینان بووە، زۆر پاشاش حوکمیان تێدا کرد ووە و ئێستا ئا وەدانە و پێنج سەد ماڵ پترە، ئەوە جگە لە دام و دەزگای رەسمی و مزگە وت و خوێندنگا، کەچی حکومەت ئەمرۆ فەرامۆشی کرد ووە، مەڵبەندی قەزای گواستۆتە وە گوندی بێباد کە بیست ماڵی فەلەی (نەستووری) تێدان و ئا ووهە وا و حە وانە وەی تێدا زۆر ناخۆشە، کە لەگەڵ ئامێدی بەرا ورد ناکرێت. لە کۆتاییدا، دا وا لەجیاووک دەکەن، بە و ناوەی کە کابرایەکی بە ناوو چالاکە و زۆر لە پەرۆش و هە وڵی پێشکە وتنی وڵاتی کوردە واریدایە، بەڵکو لە شوێنە پەیوەندیدارەکان هە وڵیان بۆ بدات و بە دوای کێشەکەیاندا بچێت و ئەو کارەی حکومەت سەرنەگرێت. وا دیارە جیاووکیش هە وڵی بۆ دا ون و بە دەنگیانە وە چووە[١٠٨].

مەعروف جیاووک وەک کەسایەتییەکی سیاسی و

رۆشنبیری و کارگێڕی و دارایی دیار سەیر کراوەو پرس و راوێژی پێ کراوە. بۆ نموونە لەوکاتەی کە شێخ مەحموود (١٨٨١ - ١٩٥٦) ناچار کرا لە دێی (پیران) ی دیوی رۆژهەڵاتی کوردستان دابنیشێ، دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٢٧ بزووتنەوەکەی شکستی خوارد لە باشووری کوردستان، عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی ئاماژە بەوە دەکات کە شێخ، بۆ یەکێک لە ئاسیاوەکانی لە بەغدا نووسیوە دەیەوێت سنوور ببەزێنێ و بێتەوە عێراق، تەنانەت ئەگەر ئەوە ببێتە هۆی لەسێدارەدانیشی، بەڵام وەک ئەلحەسەنی نووسیویە ئەو (المعروف)ە، کە دیارە مەعروف جیاووکە، چونکە ناوی نەهێناوە ئاموژگاری شێخی کردووە، کە ئەوە یەکسەر چوونە لای مەلیکی دەوێت ئەگەر ناخوازێت پەیوەندی بەشوێنە رەسمییەکانی دیکەوە بکات(١٠٩).

کەچی محەمەد رەسوڵ هاوار (١٩٢٤ - ٢٠٠٦) لەو بارەیەوە ئاوای نووسیوە: «عبدالرزاق الحسنی لە کتێبەکەیدا {تاریخ الوزارات العراقیة}، باسی نامەیەکی شێخ مەحموودی کردووە کە لەساڵی ١٩٢٨دا ناردوویەتی بۆ معروف جیاووک و لەنامەکەیدا بۆی نووسیوە کە لەژیانی دوور لە شارستانیەتی بێزار بووەو بڕیاری داوە بگەڕێتەوە ئەگەر سەریشی تیادا بچێت و معروف جیاووکیش لەوەرامدا پێی دەڵێ: جارێ وەختی ئەوە نییەو پەلە نەکاو لەوەش دەچێ معروف جیاووک هەر خۆی ناوەرۆکی نامەکەی گەیاندبێ بەمەلیک فەیسەل»(١١٠).

مەبەست لە نیشاندانی هەردوو دەق بۆ ئەوەیە کە مەعروف جیاووک نەیگوتووە "جارێ وەختی ئەوە نییە و پەلە نەکا......."، بەڵکو تەنیا ئاموژگاری کردووە کە ئەگەر بیەوێت کاربەدەستانی رەسمی دیکە نەبینێ ئەوا یەکسەر سەردانی مەلیکی دەوێت، دیارە ئەوە کارێکی ئەوەندە ئاسان نەبووە، هەر بۆیە وەک د. کەمال مەزهەر نووسیویە، دواتر مەلیک، فەهمی سەعید بەنهێنی دەنێرێتە لای شێخ مەحموود بۆ گفتوگۆ(١١١).

مەعروف جیاووک سەر وکاری لەگەڵ شێخ مەحموود زۆر خۆش و تەبا بووە(١١٢) هەمیشە چۆتە لای و هەر کار و فرمانێکی هەبوبێت، یەکەو راست بۆی راپەڕاند ووە، ئەم نامەیە نموونەیەکە کە شێخ بۆ مەعروف جیاووکی نارد ووە لە رۆژگارەی کە موتەسەریفی سلێمانی بووە، نامەکە لەرۆژی ٧ی مارتی ١٩٤٥ نێردراوە، ئەمەش دەقەکەیەتی:

**بۆ سەعادەتی متصرف مەعروف بەگ**

بە واسطەی بەعضی نامەردە وە مەحجوبم ئیستە لطیف عەرضی کرد وون کە چە وابم عەرض نەکرد وون. من بۆ هەر نە وعە کارێک سەعادەتی ئێوەی تێدابێ حاضرم. هەڵگرتووی کاغەز سەید نوری ئنسانێکی فەقیر و رەعیەتە لە طەرەف شێخ سەلامە وە مەغد ور کرا وە ئەو ظالمە کە ئیسمەن سەلامە خۆتان مەعلومتان هەیە کە خوا سەلامەتی نەکا زۆر ظالمە، مشار الیە ئەلبەتە مەغد وریت خویتان عەرض نەکا، ئومیدم بە خوا هەیە کە رەفع مەغد وریت بفەرموون، باقی حورمەت.

**برای مخلصتان**

**مەحموود**"(١١٣)

پەیوەندی نێوان شێخ مەحموود و مەعروف جیاووک دیارە بەردە وام بووە، بۆ نموونە لە و ساڵانەی کە شێخ مەحموود لە بەغدا دەستبەسەر بووە، عەبد ولرەزاق ئەلحەسەنی لەگەڵ مەعروف جیاووک هەموو رۆژانی هەینی لە گەڕەکی سلێخ سەردانی شێخ مەحموودیان کرد ووە(١١٤).

بەپێچەوانەشەوە شێخ مەحموودیش لەبەهاری ١٩٥٦سەردانی ماڵی جیاووکی کردووە، ئەوانیش زۆر




کتێبی کارەساتی بارزانی ستەملیکراو چاپی یەکەم

بەشکۆمەندییەوە پێشوازییان لێ کردووەو تەنانەت کۆڵانەکەیان هەموو شووشتووەو خەڵک تا (باب المعظم)[115] لەپێشوازیدا بوونە[116].

هەر لە پەیوەندی بە بنەماڵەی شێخ مەحموودەوە، لە و کاتەی کە پارێزگاری سلێمانی بووە، سڵی لە چەسپاندنی یاسا نەکردۆتەوە وەک کاربەدەستێکی میری.

ئەوەتا لە مەسەلەی شێخ قادر (١٨٩٥- ١٩٥٩)ی برای شێخ مەحموودا، کاتێ کە زێدەڕۆیی کردبووە سەر زەوی و زاری شارەوانی و شوورەیەکی بە دەوری زەوییەکەدا کێشابوو، هەرچەند جیاووکیشی لی ئاگادار کردبۆوە، بەڵام جیاووک فەرمانی داوە هەر بە شەو شوورەکەیان ڕووخاندووەو شێخ قادریشی دەستبەسەر کردووە، بەڵام کە شێخ مەحموودیش کاغەزی بۆ دەنووسێت یەکسەر بەری دەدات[117]. ئەمەش لەبەر ڕێزو پلەو پایەی شێخ بووە لای جیاووک، هەر چەندە وەک کاربەدەستی دەوڵەت ئەو کارە دروست نییە.

شێخ قادرش لە یادداشتەکانیدا ئاماژەی بەو مەسەلەیە کردووە. لە خستنەڕوویەکی کورتی یادداشتەکەدا لەلایەن (درەخشان جەلال)ەوەدا هاتووە، کە لە ساڵی ١٩٤٥ مەعروف جیاووک، شێخ قادری بەند کردووە و ویستوویەتی خانووەکەشیان بڕووخێنێ، بەڵام کرێکارەکان مانیان گرتووە و نەیان ڕووخاندووە. بەرهەڵستی ژنان لە دژی مەعروف جیاووک بۆ خاتری



ناسنامەی مەعروف جیاووک لە پەرلەمانی عێراق 1928 (لای جیهان جیاووک هەڵگیراوە)

حەپسە خان، لەبەر ئەو ئاهەنگەی قوتابخانەی ناوەندی سلێمانی کچان و پشتگیری بەڕێوەبەر و مامۆستایانی قوتابخانەکە و وەک ئاهەنگێکی سەرکەوتوو و دابەشکردنی خەڵاتەکان لە لایەن حەپسە خانەوە[118]، ئەم ڕق و کینەی موتەسەریف لەسەر ساڵانی هەڵوێستە نیشتمانییەکانیان بووە لە چلەکاندا و پشتگیری کردنی شێخ قادر لە هەڵوێستی بێکەسی شاعیر بەرانبەر ئەدمۆندس و خۆپیشاندانەکەی قوتابیان و جەماوەری سلێمانی دژی موتەسەریفی سلێمانی مەعروف جیاووک و کاربەدەستان و.. لە ژێر هەڕەشەی حەپسە خان بۆ کاربەدەستانی میری و لە ترسی هەڵچوونی جەماوەر شێخ قادر ئازاد کراوە[119].

بە هەرحاڵ جیاووک وەک کاربەدەستی دەوڵەت ئەرکی خۆی بەجێهێناوە، ئەم کارە پەیوەندی بە مەسەلەی نیشتمانی و نەتەوایەتییەوە نەبووە، ئێمە دەبێ ئەوە لە بیر نەکەین، مەعروف جیاووک لە ئەنجوومەنی نوێنەران ڕەخنەی لە نزیکترین بنەماڵەی شارەکەی (بنەماڵەی موفتی)،. گرت سەبارەت بە زەوی دامێنی قەڵای هەولێر، کە موڵکی گشتییە، بۆیە بۆ مەعروف جیاووک ئاسایی بووە، لە سەر دەستدرێژی کردنە سەر موڵکی دەوڵەت بە دەنگ بێت.

لە سەردەمی وەزارەتی یازدەیەمی نوری سەعید (١٥ی ئەیلوولی ١٩٥٠- ١٠ی تەمموزی ١٩٥٢)، شێخ مەحموود لە ڕۆژی ٢٥ی ئەیلوولی ١٩٥١، نامەیەکی بۆ مەعروف جیاووک نووسیوە تێدا هاتووە، کەوا دیارە: مەعروف جیاووک بە نوێنەرایەتی سەرۆکی وەزیران سەبارەت بە موڵک و زەوی و زارەکانی شێخ ڕاگەیاندنێکی داوە کە بۆتە جێی دڵنیایی شێخ، بەڵام سەرباری ئەو پێڕاگەیاندنە کەچی کارەکە پێچەوانە بۆتەوەو پتر خراپ بووەو بڕیارەکان بەپێچەوانەی یاسا بووەو زەوی و زارو موڵکەکانی داگیرکردووە، بۆیە شێخ داوای لە جیاووک کردووە کە زوڵم و ستەم لابرێت[120].

هەر لە ڕووی ئەوەی مەعروف جیاووک پەنای لێقەوماوان بووە، ئاماژە بە نامەیەکی شێخ ئەحمەدی بارزانی (١٨٩٢- ١٩٦٩) دەکەین لە ٢١ی ئابی ١٩٥٠ کە ماوەیەکی درێژبوو لە بەندیخانەی بەسرە ئەچەوسایەوە، داوای لێ کردووە بەڵکو یارمەتی جەماڵی کوڕی بدات، کە

نێردرا وەتە نەخۆشخانە لە بەغدا، نامەكەی ئا وا كۆتا پێهێناوە: "من ئەمرۆ كەسم شك نەبرد جگە لە جەنابتان كە شتێكمان بۆ بكات..."(١٢١).

مەعروف جیاووك لەگەڵ ر ووناكبیران و زانایانی كورد سەر وكاری بووە و نامە و نامەكارییان لە نێواندا هەبووە.

شێخ محەمەدی خاڵ (١٩٠٤-١٩٨٩)(١٢٢) لە نامەیەكی رۆژی ١ی ئەیلوولی ١٩٤٦ لە سلێمانییە وە ئا وای ناو برد ووە: "بۆ عالمێكی داناوەموصلحێكی زانا سەعادەتی مەعروف جیاووك بەگ تەقدیمە.... تا ئەمرم لوطف و میهرەبانی بێ پایانتان فەرامۆش ناكەم. نازانم بە چ زمانێ ئیخلاصم بەیان و بە چ قەڵەمێ ئیرادەتم بنووسم هەر ئەمەندەتان عەرض ئەكەم..."(١٢٣) دوای ئەوەی دوو دێر شیعری فارسی و دووی عەرەبی دەنووسێ، ئینجا شێخی خاڵ نووسیویە "بیستم كە كوردێكی حەلال زادە داوێتی بەگوێچكەتانا كە گویا.. خوانە خواستە.. من ناوم بە خراپ برد وون، سبحانك هذا بهتان عظیم. هەر وەقت مصلحێكی میصری وەك نحاس پاشا(١٢٤) ناوی سەعد زەغلولی(١٢٥) بە خراپە برد، منیش ئەو حەلە ئەتوانم ناوی ئێوە بە خراپە ببەم..."، نامەكەی بە "میرم"(١٢٦)بە كۆتا هێناوە(١٢٧).

مەعروف جیاووك پەیوەندییەكانی فرا وان بووە، محەمەد عەلی عە ونی (١٨٩٧- ١٩٥٢)(١٢٨) وەرگێڕو مێژووزانی ناودار لە دەرباری پاشای میسر، نامەیەكی ناوازەی بە زمانی عەرەبی لە ٢٩ی نیسانی ١٩٤٩ بۆ نووسیوە. لە نامەكەدا وا دەردەكەوێت كە محەمەد عەلی عەونی، مەعروف جیاووكی زۆر بەدڵدا چووە و بیر وبۆچوونیان تێك دەكاتە وە و زۆر لە یەكە وە نزیكە لە پێناو بەرزكردنە وەی ئاستی نەتەوە بە هێنانە كایەی ر ووناكبیرییەكی نەتەوەیی گشتی كە لای هەموو گەل پەسند بێت، بەتایبەتیش لا وان، بۆ ئەوەی بە هۆی ئەوە وە ئاگاداری رە وشی ر ووداو و پەرەسەندنەكانی دە ور وبەر ووڵات بن.

د وای ئەوە محەمەد عەلی عە ونی دێتە سەر ئەوەی كە هەر لەو دەمەی لە بەغدا گەڕاوەتەوە میسر، نووسین و كتێبەكانی جیاووكی خوێندوونەتەوەو زۆری پێ پەسند بوونەو وایان كردووە بروای پێ پتەوبێت، پێی وایە دوای كۆچی دوایی پایە بەرز ئەمین زەكی، جیاووك تاكە كەسە



ناسنامەی قوتابخانەی مەلی مەعروف عەلی ئەسغەر لە ئەستەمبوڵ 1325
(لای جیهان جیاووك هەڵگیراوە)

كە دەبێ لە بواری ر ووناكبیری نیشتمانیدا هاوكاری لەگەڵدا بكرێت بۆ گەشەپێدانی سۆزو هەستی نەتەوایەتی راست و دروست، ئەویش بە كاركردن بۆ یەكێتی زمان و زارەكان و بلاوكردنەوەی راستییەكان، سەبارەت بە مێژوو و جوگرافیای نیشتمانی پارچە پارچە كرا و. بە و گیانە وەك عە ونی نووسیویە، شە وی خستۆتە سەر رۆژ تا وەرگێڕان و پاكنوسكردنی كتێبی - شەرەفنامە-ی تە وا و كردووە، كە مەعروف جیاووك بەرگی یەكەمی چاپی ئەورووپی بە دیاری دا وەتێ و ئەویش زانستانە بە سەریدا چۆتە وە و لەبەر سەرچا وە ئیسلامی و جیهانییەكاندا ناوی كەس و شوێنەكانی لە هەموو چاخە ئیسلامییەكاندا در وست كردووەو بۆتە كارێكی ناوازەی دەگمەن و بۆتە ئینسیكلۆپیدیایەكی مەزنی كورد و كوردستان و ر ووداوەكانی هەرد و و ئیمپراتۆریەتی ئێرانی و عوسمانی هەر لە سەدەی حە وتەمی كۆچییە وە تا سەرەتای سەدەی یازدەیەمی كۆچی، هەر وا بەرگی د و وەمی چاپی ئەور وپایی دەسكە وتووە كە تایبەتە بە مێژووی گشتی و ئەویشی وەرگێڕا وە. د وای ئەو ر وونكردنە وانە دێتە سەر ئەوەی كە هەنووكە تەنیا پێویستی بە فەرمانی (جیاووك) و ئەندامانی (یانەی سەركە وتن)ە، بۆ ئەوەی دەست بە چاپكردنی بكرێت. دا وای كردووە بەر لە وەی كۆچی د وایی بكات ئەو ئینسیكلۆپیدیایە نەتەوەییە چاپ بكرێت(١٢٩). ئەوە پوختەی ناوەڕۆكی نامەكەیە كە پەرۆشی و دڵسۆزی و شە ونخوونی ئەو زانایە بۆ نەتەوەكەی دەردەخات و بەئاواتەوە بووە بەچا وی خۆی بەری رەنجی

ماند و وبوونی خۆی بە چاپکرا وی ببینی.

بەهۆی هەڵوێستی کوردانەو دڵسۆزانەی مەعروف جیاووک، ژمارەیەکی زۆر شاعیرانی کورد، بەتایبەتی شیعریان لە ژیانی خۆیدا بۆ نووسیوەو لە شیعرەکانیاندا پەسنی جیاووکیان داوە، وا لێرەدا هەندێ لەو نموونانە دەخەینە بەرچاو:

عەبدولخالیق ئەسیری (١٨٩٥-١٩٦٢) یەکێک لەو شاعیرانەیە زۆرترین شیعری بۆ مەعروف جیاووک و یانەی سەرکەوتن نووسیوە، هەر بەیارمەتی و کۆششی مەعروف جیاووک، کە ئەو کاتەجێگری سەرۆکی دادگای تێهەڵچوونەوە (ئیستئناف) بووە، ئەسیری لە دادگای شەرعیەی کەرکووک، بەنووسەری یەکەم دامەزراوە[١٣٠]. شیعرەکانی بۆ جیاووک و نەریمانی کوڕی، نموونەی هەستی دەروونی دڵسۆزانەی شاعیرە بەرانبەریان و شیعرێکی تایبەتیشی هەر بەناوی (مەعروف جیاووک) خۆیەوە نووسیوە[١٣١].

هەروەها موفتی پێنجوینی (١٨٩٣- ١٩٥٢) لە ساڵی ١٩٤٥ شیعرێکی بەناوی (بۆ مەعروف جیاووک) نووسیوە ئەمە دێڕێکییەتی:

**سوپاسی خوا ئەکەین و شوکری عیززەت**
**کچی پێنجوین بە مەکتەب گەییە عیززەت**

ئەم شیعرە بە بۆنەی کردنەوەی قوتابخانە لە پێنجوێن گوتراوە، کە ئەو سەردەمە مەعروف جیاووک موتەسەریفی سلێمانی بووە (١٩٤٤- ١٩٤٦) و لە زۆر شوێنی دیکەش قوتابخانەی کردۆتەوە، هەروەک ئامادەکاری دیوانەکەی موفتی لە پەراوێزدا نووسیویانە، جیاووک" کاربەدەستێکی کوردی دڵسۆزو ئەدیبێکی لێهاتوو بووە لە زۆر جێگای وەک پێنجوین قوتابخانەی کردۆتەوە"[١٣٢].

قانع (١٨٩٩-١٩٦٥)ی شاعیری چەوساوەکانی کوردستانیش، چەندین شیعری جوان و بەسۆز و پڕماناو درێژی بۆ مەعروف جیاووک نووسیوە. یەکێک لەو شیعرانە بەناوی (دەورەی ژیانم)، دوای ئەوەی باسی دەورەی ژیانی خۆی دەکات، هەر لەمنداڵییەوە تا ئەو سەردەمەی شیعرەکەی تێدا گوتووە، کە چەند ژیانی بەکوڵەمەرگی و چەرمەسەری و نەداری بەسەربردووەو بەو پیرییە بەکۆشێ منداڵەوە بۆ نانی شەوێ داماوە، لە بڕگەیەکدا دەڵێت:

**شازدە سەرخێزان دەورەیان داوم**
**منیش بۆنانی شەوی داماوم**
**ئێستا جیاووک هیمەت ئەنوێنێ**
**هەژار و فەقیری وڵات ئەژێنێ**
**چونکو بەڕاستی میللەت پەروەرە**
**بۆ لیواکەمان وەک تاجی سەرە**
**ئیتر هەربژی سێبەری خاکمان**
**موتەسەریفی تەواو دڵ پاکمان[١٣٣]**

لە (زاری کرمانجی)یش شیعرێک بە ناوی (هەر بژی جیاووک)، بلاوکراوەتەوە لە کوردپەروەری و دڵسۆزی کەم وێنەی جیاووک دواوەو پەسنی داوە:

**سزایە بۆ بەقای ناوتان بکەن ئابیدەی کوردان**
**لەبۆ تیمسالی ملیەت ئەتۆی خێوی شەرەف و ویجدان**
**بژی هەر تۆ بژی ئەی فەخری کوردان فەخری کوردستان**
**بە بوونتان سەربڵندین ئەی (جیاووک) هەر بژی بۆمان[١٣٤].**

تەنانەت ئەوەندە ڕێزی لای خەڵک هەبووە، خەڵکی گەڕەکی خۆیان لە شاری بەغدا پێیان گوتووە (بابە)، هەروەها هەتا لە نەخۆشخانەش بووە، شەوانە تۆفیق وەهبی و ئەحمەد موختار بابان سەردانیان کردووە[١٣٥].

لەدوای مردنیشی شاعیران و نووسەران هەستی خۆیان بەرانبەر مەعروف جیاووک دەربڕیوەو پەسنیان داوەو هەموویان گەورەیی ئەو پیاوەیان خستۆتە ڕوو.

نەجمەددین مەلا (١٨٨٩-١٩٦٢)ی نووسەرو ئەدیبی کورد، بەناوی (شین و شەپۆڕ)، چەردەیەکی زۆر چڕی لەبارەیەوە نووسیوەو بەشیعریش مێژووی کۆچی دوایی مەعروف جیاووکی دیار کردووەو دەڵێت:

**کێ بی بپرسی دادی مەزلوومین**
**مەحکەمەی تەمیز زویر، بووەو، غەمگین**
**٥٨٥+٢٤٨+١١٢٥=١٩٥٨ز[١٣٦].**

مەلا ساڵحی کۆزەپانکەیی (١٨٩٠-١٩٧٤) یش لەبابەت کۆچی دوایی مەعروف جیاووکەوە پارچە شیعرێکی بەزمانی عەرەبی نووسیوە:

**نقلت الي منزل قيل فيه مخفووف {مخفوف}**
**ولخلقك الكريم بين الحوري محفوف**
**وانت ضيف الله والناس مأسوف**

**كلا فانه [فان] ضيفها المعروف ملطوف**
**فلا يمنع الحجاب عن باب رحمته**
**إلا من انكروه وهو ثم معروف[137].**

دەقی شیعرەكە بەكوردی:
**گوازرایەوە هەوارێک دەڵێن بەترسە**
**بەناكاری بەرزتەوە لەنێو پەریان دەورە دراوی**
**تۆی میوانی خوداو خەڵكیش بەداخن**
**نەخێر ئەومیوانەی ناسراوە لەگەڵی گفت شیرنن**
**پەردەدار دەركەی بەزەیی لێ ناگری**
**بەتەنێ ئەوە نەبێت كە بوونی ئەو ناسەلمێنن كەچی ئەو ناسراوە**

بۆ چلەی مەعروف جیاووک، رۆژنامەی "ژین" بانگەوازێكی بلاوكردۆتەوەو تیایدا هاتووە كەوا یانەی سەركەوتن لەبەغدا بەنیازە بەبۆنەی "چلەی مەعروف جیاووک" كۆڕێكی ماتەمینی رێک بخات، بۆ ئەم مەبەستەش داوای لە هەركەسێ كردووە كە نووسراو یان شیعری هەبێت بۆ یانەی بنێری تا بخرێتە بەرنامەی كۆڕەكەوە[138].

لەرۆژی (١٤)ی مارتی سالی ١٩٥٨، لەیانەی سەركەوتن لەبەغدا چلەی ماتەمینی مەعروف جیاووک بەئامادەبوونی سەدان كەس بەڕێوەچووە، سەرەتا بەقورئانی پیرۆزو دوو دەقیقە وەستان، دەستی پێكردووەو پاشان رەشید عارف (١٩٠٤- ١٩٨٢)(١٣٩)، لەجیاتی یانەی سەركەوتن وتارێكی لەمەڕ چاكەو خزمەت و نیشتمانپەروەری مەعروف جیاووک خوێندۆتەوە، ئینجا وتاری زاناو قازی بەناوبانگ شێخ محەمەدی خاڵ خوێندراوەتەوە، لە وتارێكی پڕ ماناو راستگۆیانەدا شێخی خاڵ كرۆكی ناخی ئەو گەورە پیاوەی كوردی دەرخستووە، هەر لە گەورەیی و موسڵمانێكی راست و بەدادی و خاوەن تێروانینی تایبەت بەخۆی لە هەڵسەنگاندنی خەڵک و بەگەورە سەیركردنی خەڵكی سادەو بەرێزو بەپێچەوانەشەوە، لە رێی نیشتماندا بەهەڵوێست، كە بەمردنی ئەم جۆرە پیاوانە شوێنیان زۆر بەزەحمەت پڕ دەبێتەوە، دەڵێت: «.. مەعروف جیاووک وەک نوسخەی كتێبێكی بەنرخی نایابی دەستنووس وابوو كە بەدەست خەتی نووسەر "المؤلف" نوسرابی، وە وێنەی لەجیهانا نەبێ"[140]، ئینجا شیعرێكی شێخ سەلامی گردعازەبانی (١٨٩٢-١٩٥٩)، بەناوی (شیوەنی جیاووک)، لەلایەن یەكێک بەناوی فەرەج عەلی[141] خوێندراوەتەوەو شیوەنێكی یەكجار پڕ سۆزو هەستی بۆ مەعروف جیاووک نووسیوەو جیاووكی بە "بنچینەی قەڵای كوردو درەختی هیوای كورد وەسف كردووەو كارو كردەوەو هەڵوێستەكانی و دەرخستنی دۆزی كوردو داكۆكی لێكردنی دارشتووەو دەڵێت:

**میرم تۆ نامری ناسارت دیارە**
**زۆر پایەدارە**
**قەومی كورد یەكسەر بۆ تۆ خەمبارە**
**لەژین بێزارە**
**میری شیرینم مەعرووف جیاووک**
**بۆ كورد بووی باووک**
**كورد بۆ تۆ ئەڵێ چەند بەندی لاووک**
**دڵ ئەسووتێنێ وەک چراووک[142].**

مەلا جەمیل بەندی رۆژبەیانیش بەزمانێكی پاراو بەدوو وتاری كوردی و عەرەبی و پڕ لەهەست و سۆزی نیشتمانی زۆر بەرز لەبارەی راستی و بوێری و لەرووییی و دادپەروەری و بەبڕوایی و دڵسۆزی بۆ دۆزی كوردو دەستپاكی و دەروون بەرزی و لاگیری لێقەوماو و دژی زۆردار، لەو كۆچە دواوەو لە وتارە كوردییەكەدا دەڵێت: " ئەو جیاووكەی كە لەتافی جوانییەوە تا دوا هەناسەی ژیانی بەندیخانەو رەهەنەیی هیندستان چاوی نەشكاندو مووچەو پارەو پایە هەڵی نەخەڵەتاند، بۆ سەركەوتنی كورد (یانە)ی لەماڵی خۆیدا دروست كردو لەئەنجومەنی نوێنەراندا بەرگری لەمافی گەل و نەتەوە كرد، بۆ نووسینی (ئەلقضیەت لكوردیە) و (مەئسات بارزان) دەردی دڵی نەتەوەكەی هەڵڕژان و لەدادگاوە لە سەرپەرشتیدا لای كوردی بەرنەداو بەزمان و خامەو كردەوە خزمەتی وڵاتی كردو لە بەرنگاری [بەرەنگاری] نەكەوت هەتا مرد، ئەو جیاووكە نەمردووە، نامرێ، یادی كۆشش و خەباتی لەبیر ناكرێ، هەزاران سڵاو سڵاوی كوردستان، بۆ جیاووک، جیاووكی قارەمان"[143]. لە وتارە عەرەبییەكەشیدا، لەكوردییەكە قووڵترو پڕ ماناتر وەسفی مەعروف جیاووكی كردووەو بە(پاڵەوانی گەل خوالێخۆشبوو مەعروف جیاووک) دەستی پێكردووەو زۆر بەگەورەیی و بەرزی و

بەدانایی جیاووكدا هەڵدەڵێ و كتێبەكانی بەشاهێد دەگرێ وەك نیشانەی خەباتی درێژخایەنی ئەو پیاوە، وەك دەڵێت مێـژووی نزیك جیـاووكی وەك دادوەرێكی بەدادو كارگێڕێكی بەزیبك و زاكون مل نەدان بۆ ملهوڕان ناسیوە. ئەو پیـاوەی سامـانی دەوڵەتی نەدزی و سامـانی دارایی خەڵكی چەپاو نەداو خاوەنی كۆشك و زەوی و زار نەبوو، كە كەوتە سەرجێگاش پارەی سەفەری چارەسەركردنی نەبوو شـانازییـەكـەی ئەوە بوو بەدرێژایی ژیانی تاجی مـیللەتی لەسـەر كـرد، كـە ئەویش بریتی بوو لە (كـلاوی لـباد- السـدارة الوبرية) ئەمــە جگە لەدامــەزراندنی یانەی سـەركـەوتنی كـوردان ئەو جـیـاووكـەی درێغی لەیارمـەتی هەژارو لێقەوماوان نەكرد [١٤٤].

عەبدولمەجید لوتفیی نووسەرو چیرۆكنووسی بەرەگەز كـوردو عـەرەبی نووس، وتارێكی تێرو تەسەل و پڕ مـانای بەزمـانی عـەرەبی نووسـیـوەو لە خـەسـڵـەت و ئاكـارو هەڵوێسـتـەكـانی دواوە، كـە پارەو پوول و پلەو پایە لە خشـتـەی نەبردووە لە ڕێی ڕاست و حـەقـدا لای نەداوەو بەڵكو باجی ئەو ئاكـارو هەڵوێسـتـانەی داوە. وتارەكـە درێژەو دەقەكەی لەو چلەیەدا خوێندۆتەوەو لە بەشێكیدا دەڵێت: «یەكەمجار كۆچكردووم لە سەرەتایساڵی ١٩٣٤ ناسی، جـێگری سـەرۆكی دادگـاكـان بوو لەكـەركـووك، سـەرۆكـیش ئینگلیـزێك بوو، بەخودا پیـاوێكم نەدیتـووە، ئەوەندە لەئاست هەق توندو بەهێـز بێت، لەكـۆشش كـردن بۆچەسپاندنی هەق و ڕێزگرتن لەیاساو داد، ئەوە لەتەك ئەو پێشەوایەتییەی كە بەڕاستی تێیدا خولقا بوو و لەگەڵیشیا ژیا، تەنانەت لەئەوپەڕی چركـەكـانی ئەو نەخـۆشـیـیـە كوشندەیەی ژیانی هێژای، تێداچوو... دیارترین خەسڵەتی ئازایی و بوێری بووە، هەرچەندە خـەسـڵـەتی دیكەشی هەبوو، پێیەوە ناسرابوو، كە لە سەرمە یەكەم جار ئەو پێش بخەم، ئەویش دەستپاكییە، ئەو دەستپاكییەی بەدرێژایی ژیـانـی بەنموونە بـاس دەكـــرا، بەڵام مـن بـەردەوام ئازایەتییەكەیم پێ گەورەتر بوو...» [١٤٥] تا لە كۆتاییدا دەڵێت: «بەڕێزان ئێـوە مـەعـروف جـیـاووكـتـان وەك پاڵەوانێك لە پاڵەوانانی نەتەوەی كورد ناسیبوو كە خۆی لەسەری نووسیـبوو و گـەشـەی پێداو كـتـێبی لەبارەیەوە نـووسـی و وەڵامـی داخ لـەدڵ و ئـاوەژووكـــــەرانـی ڕاستـیـەكـانیانی دەدایەوە، ئێـوە مـەعـروف جـیـاووكـتـان ناسیبوو لەتێكۆشانی و ژیانی و نەتەوەی كوردی ڕەسەن و پێی سـەرسـام بوون و برێ جـاریش لەبەر لەڕوویی و چەسپـاوی و پێـداگـری، لێی لەرك رادەچوون، ئێـوە ئەی برایان، جیاووكتان زیندوو كردەوە ئەوا جیاووك بەهەژاری مـرد، بەقـەرزداری مـرد، بەدەروون مـاندوو و شـەكـەتی و تەنیایی مرد....» [١٤٦].

هەر لەدرێژەی ئەو كـۆڕە مـاتەمـیـنەدا عـەبدولسـەلام حـیلمی (١٩١٣-١٩٦٩)یش بەشـیـعـرێك بەشـداری كردووەو هەستی خۆی دەربڕیوە:

**قضي جياووكنا النسر		قضي معروفنا الحر**
**به يبتسم الزهر[١٤٧].		حكى الروض وكم لاح**

بەكوردی واتە:

مەعرووفی ئازاد وا ڕۆیشت جیاووكی هەڵۆمان ڕۆیشت
چیـمـەنەكـان بۆمـان دەگـێـڕنەوە چەندی دەركـەوتن كـە گوڵیان پێ دەم بەخەندەیە

مـحـەمـەد عـەلی مـەدهۆش (١٩١٩- ١٩٩٤)ی شـاعـیـریش، شـیـعـرێكی لە سلێـمـانییـەوە، بەم بۆنەیەوە ناردووە[١٤٨]. كـۆچی دوایی ئەو پیـاوە لای كـوردپەروەرانی پارچەكانی دیكەی كوردستانیش دەنگی داوەتەوە، ئەوەتا د. مـحـەمـەد نوری دەرسـیـمـی (١٨٩٣-١٩٧٣)یش، لەڕۆژی ٢ی مـارتی ١٩٥٨ لە حـەلەبەوە نامـەیەكی بەعەرەبی بەو بۆنەوە بۆ ڕۆژی ماتەمی جیاووك نووسیوەو دەڵێت: (ئەز ئەو بۆنە داخدارە بە هەل دەزانم ڕوو لە هەموو برایان و لاوانی ڕۆڵەكـانی نەتەوەكـەم بكەم و بیـریان بێنمەوە، كەوا پێویستە شوێن پێی ئەو جۆرە مەزنە پیاوانە بكەوین و هەمـیـشـە ڕێگای ئەو بكەینە سـەرمـەشق كـە كـۆچكردووی هێـژاش بەدرێژایی ژیانی پڕ مـەردایەتی و بوێری گرتبوویە بەر....) [١٤٩].

لە شـامـیـشـەوە برووسكەیەكی بەكـۆمـەڵی شـاعـیـرو كـوردپەروەرو ناودارانی وەك: قـەدری جـان (١٩١٦-١٩٧٢)، قـەدری جـەمـیـل پاشـا (١٨٩٢-١٩٧٣)، مـەمدوح سەلیم (١٨٨٠-١٩٧٦)، حەسەن حاجـو، بۆ یانەی سەركەوتن هاتووە، هاوخەمی خۆیان بۆ لەدەستدانی ئەو ناودارەی كورد دەربڕیوە[١٥٠].

گۆڤاری هیواش نووسیویە، لە(بیرەوەری خوالێخۆشبوو مامۆستای مەزن مەعروف بەگ جیاووك)دا كە كاتژمێر

(٥)ی پاش نیوەڕۆی ڕۆژی هەینی ١٤ی مانگی خاکەلێوە لە یانەی سەرکەوتن لە بەغدا، کۆڕێکی ماتەمینی بەئامادەبوونی زۆر لە گەورە پیاوان و زانایان و ڕۆشنبیران و کەس و کاری خوالێخۆشبوو بۆ بەڕێوە چووە[١٥١].

تەنانەت لەسەر بەرگی ناوەوەی کتێبی (هزار بێژ و پەند)، دانەی کتێبخانەی گشتی هەولێر، کە لەئەسڵدا هادی ڕەشید چاوشلی (١٩١٩-١٩٩٤) پارێزەرو کارگێڕو ڕووناکبیرو کەسایەتی دیاری شاری هەولێر لە ١٥ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٥، پێشکەشی کتێبخانەی ناوبراوی کردووە، لەسەر وێنەو بەرگی کتێبەکەدا بەدەستخەت چەند دێرە شیعرێک بەناوی (ع. م کوردستانی) و (م. ح. مەندمی) لە ٧ی مارتی ١٩٦٣، بۆ جیاووک[١٥٢]، نووسراوە.

### هزر و بیروباوەڕی مەعروف جیاووک

أ- مەعروف جیاووک و بیروباوەڕی ئایینی:

مەعروف جیاووک لە بنەماڵەیەکی ئایینی لە دایک بووە و پەر وەردە بووە. باپیری واتە (حاجی مەولوود ئەسعەد) بەناوبانگ بە (بدیع الزمان)، زانایەکی گە ورەی سەردەمی خۆی بووە و لە زنجیرەی دردختی بنەماڵەکەیان دەردەکە وێت، کە هەموویان مەلا و فەقێ و زانا بوونە و (عەلی ئەسغەر)ی با وکیشی زاناو پێشە وای ئایینی بووە و بە (خادم الشریعة والفقراء) بەناوبانگ بووە و مامۆستای زمانەکانی عەرەبی و تورکی و فارسی بووە لە ئامادەیی ڕ وشدییەی سەربازی[١٥٣] هەروەک لەپێشتر ئاماژەی پێکراوە.

عەلی ئەسغەری باوکی مەعروف جیاووک بە مەبەستی فێربوونی زمان و ڕێزمانی عەرەبی کتێبێکی داناوە و لەسەر ناوی مەعروف بە ناوی (الفوائد المعروفیة في علم النحو واللغة العربیة) وەک پێشتر ئاماژەمان پێکرد، مەعروف جیاووک خوێندنی ئایینی لەسەر دەستی با وکی و چەند زانایەکی ئایینی خوێند و وە(١٥٤). ئەوەی ئەو سەردەمە با و بووە بەر لەدەست پێکردنی خوێندنی سەرەتایی لە خوێندنگای دە وڵەتی، منداڵ دەنارد رایە مزگە وت بۆ فێربوونی قورئانی پیرۆز، نەخوازە ئەگەر بنەماڵەکەش ئایینی بن، ئەوە هەر دەبوا قورئان بخوێنێ. تەنانەت مەعروف جیاووک خۆشی منداڵەکانی فێری




ڕۆژنامەی (میزان) ژمارە (100، 104، 107، 113) (کتێبخانەی بایەزید - ئەستەنبوڵ)

قورئان کردووە[١٥٥].

مەعروف جیاووک، بەشێکی گرنگی پەر وەردەی لە ڕێی ئایینە وە بووە، ئەمەش لە ئاکارەکانی ڕەنگی داوەتە وە. ڕاستگۆیی و دڵسۆزی و دەستپاکی و دادپەر وەری و بوێری و ڕێزگرتنی هەژاران و لایەنگیری لێقە وما وان. خەسڵەت و ئاکاری دیاری مەعروف جیاووک بوونە. ئەمەش لە بڕوابوون بە ئایینی ئیسلامەوە سەری هەڵداوە، بەتایبەتی خۆی لە چەندین بواری جیاوازدا، لەو سەرچاوانەی بەردەستی ئێمە ئاماژەی پێداوە.

لەو زنجیرە وتارانەی کە مەعروف جیاووک لە ڕۆژنامەکانی بەغدا نووسیونی، باس لەدیموکراسی دەکات، زۆر بەزەقی جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە هەموو ئایینە ئاسمانییەکانی پێ پەسەند بووە، کە مافی ئازادی تاک و یەکسانی لەنێوان شا و گەدا و لە ئیسلامیشدا (وامرهم

شوری)دا هه‌یه‌. هه‌روا نموونه به‌ره‌فتاری خه‌لیفه‌کانی راشیدین دێنێته‌وه‌، تا له‌ سه‌ره‌نجامدا دێته‌ سه‌ر ئه‌وه‌ی دیموکراتیه‌ت شارستانیه‌ته‌ و[١٥٦] مه‌عروف جیاووک خۆی به‌ ئاشکرا ده‌ڵێت: «... من پیا وێکی موسڵمانم بۆیه‌ هه‌ر شتێک زیان له‌ ئایینم بدات من نایکه‌م»[١٥٧].

له‌ یه‌که‌م چاپکرا وی کوردیدا به‌ ناوی (په‌رکی "املای" کوردی) که‌ له‌ ساڵی ١٩٣٠ چاپی کردووه‌، له‌ پێشه‌کی نامیلکه‌که‌یدا نووسیویه‌: «به‌ ناوی خوای گه‌ وره‌ هه‌ر ز و ، ئه‌م چه‌ند دێره‌م نووسی و له‌ چاپم دا...»[١٥٨].

له‌ (القضية الكردية)شدا له‌ وه‌ڵامی ره‌واندزییه‌کدا، نووسیویه‌: «لای هه‌مووان شارا وه‌ نییه‌، که‌وا ئه‌رکی هه‌ر که‌سێک ئه‌وه‌دیه‌ که‌ سنووری گه‌لی خۆی نه‌به‌زێنێ، به‌ڵکو له‌ سه‌ری پێویسته‌ که‌ به‌ هه‌موو توانایه‌کییه‌ وه‌ به‌رگری له‌ پاراستنی نه‌ته‌وه‌که‌ی بکات و ئایینی ئێمه‌ فه‌رمانمان پێ ده‌کات که‌ پێویسته‌ ره‌چه‌ڵه‌ک و ره‌سه‌ن فه‌رامۆش نه‌که‌ین و لایه‌نگیری له‌ یه‌کێتی ئیسلام بکه‌ین له‌سه‌ر ئه‌و بنه‌مایه‌ باش نییه‌ نه‌ته‌وه‌یه‌ک شانازی به‌سه‌ر نه‌ته‌وه‌یه‌کی دیکه‌ وه‌ بکات که‌ ئه‌وانیش موسڵمانن»[١٥٩].




دره‌ختی بنه‌ماڵه‌ی جیاووک لای بنه‌ماڵه‌که‌یانه

کاتێ مه‌عروف جیاووک دێته‌ سه‌ر ریسواکردنی سته‌می تورکه‌ که‌مالییه‌کان دژی کورد له‌ باکووری کوردستان، هه‌ندێ که‌س پێیان وا بووه‌ بۆ ورو وژاندنی هه‌ستی موسڵمانان بووه‌، بۆیه‌ له‌ وه‌ڵامی ئه‌وانه‌دا جیاووک، به‌ زمانێکی ره‌ وان ده‌ڵێت، ئه‌وه‌ بۆ من شانازی نییه‌ که‌ من موسڵمانێکی راسته‌قینه‌م و به‌ پشتیوانی خودای گه‌وره‌ به‌ موسڵمانی ده‌مرم و حه‌شر ده‌کرێم و من یه‌که‌مین که‌س بووم له‌ساڵی (١٣١٤ رۆمی) (١٨٩٨-١٨٩٩ز) له‌ به‌غدا پشتگیریم بۆ (یه‌کێتی موسڵمانان)[١٦٠] ده‌ربڕیوه‌و له‌مه‌دا دوو هاورێشم ئاگادارن، یه‌کیان له‌شۆڕشی ئه‌رمه‌نییه‌کان له‌ساڵی ١٣٢٥ (١٩٠٩-١٩١٠)·کوژراو ئه‌وی دیکه‌شیان تا ئێستاکه‌ له‌ ده‌ ور وبه‌ری به‌غدا فه‌رمانبه‌ره‌[١٦١].

مه‌عروف جیاووک له‌ نووسین و وتاره‌کانیدا به‌پێی پێویست و داخوازی جێگه‌ ئایه‌تی قورئانی به‌کارهێناوه‌، بۆ نموونه‌ له‌ کۆتایی وتاری (ثورة الاكراد، مظالم الاتراك في نظر الحقوق الاممية)دا نووسیویه‌: «وسيعلم الذين ظلموا أي منقلب ينقلبون» [١٦٢].

مه‌عروف جیاووک زۆر به‌راشکاوه‌یی دژی کرده‌ وه‌ نارِه‌واکانی مسته‌فا که‌مال (١٨٨١-١٩٣٨) ئه‌تاتورک بووه‌ ده‌رهه‌ق به‌ گه‌لی کورد و دژایه‌تیکردنی ئایینی ئیسلام، زۆر جێی سه‌رزه‌نشت و لێد وانی جیاووک بووه‌[١٦٣].

وه‌ک ده‌زانین یه‌کێک له‌و شتانه‌ی له‌ ئایینی ئیسلامدا حه‌رام کراوه‌، خواردنه‌وه‌ی سه‌رخۆشکه‌ره‌ (مشروبات كحولية). له‌سه‌روبه‌ندی تاووتوێکردنی گه‌ڵاڵه‌نامه‌ی یاسای خواردنه‌وه‌دا که‌ له‌ کۆبوونه‌وه‌ی رۆژی ١٤ی نیسانی ١٩٢٩دا خراوه‌ته‌ به‌ر باس، جیاووک ئاماژه‌ به‌وه‌ ده‌کات که‌ ئه‌و خواردنه‌وانه‌ به‌کار ناهێنێ و براده‌ره‌کانیشی له‌وێ ده‌کاته‌ شایه‌ت و هه‌ر له‌ وێشدا گوتوویه‌: کورد دیندارن و ئه‌وانه‌ی که‌ ده‌خۆنه‌وه‌ که‌من[١٦٤].

له‌ گفتوگۆکردن سه‌باره‌ت به‌ ناوه‌رۆکی کارنامه‌ی وه‌زاره‌تی تۆفیق سویدی ٢٨ی نیسانی ١٩٢٨- ٢٥ی

ئابی ١٩٢٩ لە ساڵی ١٩٢٩، د وانەکەی بە وە دەست پێدەکات: «بە ناوی خودای بەرز دەد وێم و هەر پشت بە و دەبەستم و جگە لە و کەسی دیکەم نییە...»[١٦٥].

لە دوا قسەی کتێبی (هەزار بێژ و پەند)دا بە کوردییەکی ڕەوان و چاک، سوپاسی خودای گەورە دەکات کە ئەو جیهانەی دامەزراندووە بە هەموو پێکهاتەکانی ناوییەوە. پاشان درووود بۆ گیانی پێغەمبەری ئیسلام محەمەد (درووودی خوای لەسەر بێت) ناردوەو ئەمە دوو لاپەڕەی گرتۆتە خۆ[١٦٦].

مەعروف جیاووک زۆر بە بەرزی باسی هاتنی ئیسلام دەکات، هەر وا موسڵمان بوونی کوردو خزمەتی گەورەی بە ئیسلام و مێژووەکەی بە پوختی بەسەر کردۆتەوە[١٦٧]. هەر لەو ڕووەوە لە ڕۆژی ٢٤ی مارتی ١٩٤٤ لە یانەی سەرکەوتنی کوردان لە بەغدا بیرە وەری مە ولوودی پێغەمبەر کرا وە، مەعروف جیاووک وتارێکی بەو بۆنەیەوە دا وە، تێیدا باسی گە ورەیی پێغەمبەری ئیسلام و موسڵمانبوونی خۆی د و وپات کردۆتە وە(١٦٨).

لە سیپارەی (اقرأ الحقائق الثابتة في كراسة فخامة السيد نوري السعيد وبعض مقالات خصومه)دا، نووسیویە: «... ئەوەی وەک من ٦٣ ساڵی تەمەنی بەسەر بردبێت و پتر لە چل ساڵیشی بە کارکردن لە مەعارف و داد و کارگێڕی بردبێتە سەر، گوێ بە قسەی ئەم و ئەو نادات و گوێ بە دژایەتی ئەو و ڕەزامەندی کەسی ناوێ جگە لە ڕەزامەندی خودا و ویژدانی خۆی نەبێت، بۆیە هەرچی من نووسیبێتم ئەوە هەر بە ناوی پەر وەردگار بووە کە فێری خەتی کردین و قسەکردنی پێ بەخشین بۆ ئەوەی بە ئەمانەت و ڕاستگۆییە وە خزمەتی مرۆڤایەتی بکەین هەر ئەو مایەی سەرفرازی و پشت و پەنایە»[١٦٩].

هەر لەپەیوەندی بەو بابەتە ئاماژەکردن بە ئایەتی قورئانی پیرۆز «وان الله لا يغيروا ما بقوم حتي يغير ما بانفسهم»[١٧٠]. گەلێ جاریش نووسینەکانی بە و دەستە واژانە د وایی پێ دەهێنێ: «هەر خوا پشت و پەنایە و هەر ئەو ئاگای لە هەموو شتێکە»[١٧١].

لە پێشەکی کتێبی (مأساة بارزان المظلومة)دا نیو لاپەڕەی بۆ پەسن و ناوهێنانی خودای گەورەو پێغەمبەری موسڵمانان و دوعا و پاڕانەوە، تەرخان کردووە[١٧٢].

لە ناساندنی خۆشیدا نووسیویە: «ئەز کوردم لە


البكباشي جمال عبد الناصر
القاهرة

معروف جياووك

نامەی مەعروف جیاووک بۆ جەمال عەبدولناسر 1954 (لای جیهان جیاووک هەڵگیراوە)

عەشیرەتی (باڵەکی)م و بە کوردی لە دایک و باوکێکی کورد لە دایک بوومە، دایکم شانازی بە کوردبوونی خۆی دەکرد، زمانی باوک و دایکم فێر بووم و سەروەری باو و باپیری خۆم ناسی لەو چیرۆک و سەرگوزەشتە سەرنج ڕاکێشانەی دایکم و لە ژێر پەروەردەی باوکێکی زانای پیاوچاک پێگەیشتم بە بڕواوە پەروەردە بووم و قسەی فەیلەسوف و (دەهرییە)کان بڕوایان پێ لەق نەکردم و هەر بەندیواری ئایینی پیرۆز بووم لەسەر ئایینزای پێشەوا محەمەد کوڕی ئیدریسی ناسراو بە شافیعی...»[١٧٣] هەر وا بەکارهێنانی کۆمەڵێک ئایەت و فەرموودەی پێغەمبەر لە بارەی یەکتر ناسین و خۆشەویستی و خوا ئەو هەموو خەڵکەی در وست کردووە بێ جیاوازی و داوای خۆشویستن و تەبایی و برایەتی و چاکە و ڕاستی و... هتد دەکات[١٧٤].

لە بابەتی (السياسة وما ادراك ما السياسة)دا، باس لە سیاسەتی ئیسلامی دەکات و تێیدا بە کورتی دوو جۆری دەستنیشان کردووە:

١- مافی خودا کە بریتییە لە عیبادەتەکان.

٢- مافی بەندە.

بنەماکەیان قورئانی پیرۆز و سونەتەکان و کار و کردەوەی خەلیفە و یار و پێشە وایەکانە. ئەمانەشی بە ئایەتی

قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر مشتومالّ کرد و ون، لە باسی دانە وەی ئەمانات و حوکمکردن بە دادپەر وەری و یەکسانی و یەکێتی و هەرچی پەیوەندی و سەر وساختی بە ژیانی مرۆڤە وە هەیە لە دنیا و د وارۆژداو هەر وەها سیاسەتی دارایی لە ئیسلامدا[١٧٥].

لە کۆڕی چلەی ماتەمینی هەردوو ناوداری کورد، ئەمین زەکی (١٨٨٠-١٩٤٨) مێژوونووس و پیرەمێرد (١٨٦٧-١٩٥٠)ی شاعیر و رۆژنامەنووسی بەناوبانگ لەکۆتایی وتارەکانیدا سوورەتی (الفاتحة)ی بۆ خوێندوون[١٧٦].

لێرەدا جێی خۆیەتی ئاماژە بەگوتەیەکی مەلیک فەیسەڵی پاشای عێراق بکەین لەبارەی مەعروف جیاووکەوە کە پێم وابێ گەواهییەکی راستگۆیانەیە، کاتێ بۆ کۆشکی پاشایەتی بانگی کردووەو لەهەواڵی پرسیوە، داوای لێ کردووە بەدادوەری بچێتە کەربەلاو پێی دەڵێت:


پەرکی (املای) کوردی
نوسراوی
معروف جیاووك
ئاردراوی هەولیر
چاپی یەکەم
چاپ کردنی پەرستی خاوەندی
بغداد
له چاپ خانەی نجـــاح لەچاپ دراوە
١٣٤٩ هـ ١٩٣٠ م

"مەعروف من لێت تووڕە ببووم، بەڵام بۆم دەرکەوت تۆ پیاوێکی شەریف و موسڵمانێکی بەڕاستیی"[١٧٧]، شێخی خاڵیش هەمان ڕای هەبووە[١٧٨].

بۆیە بە دڵنیاییە وە مەعروف جیاووک بڕ وای هەبووە و شانازی بە ئیسلامبوونی خۆیە وە کردووەو تەنانەت مزگە وتێکی لای ماڵی خۆیانیش نۆژەن کردۆتە وە، بێگومان ئەوەش لە بڕوا وەیە[١٧٩].

لەبابەت بەجێهێنانی ئەرکە ئایینییەکانیش، نوێژی کردووەو تەنانەت پێش نوێژیشی بۆ منداڵەکانی کردووە[١٨٠]. بەلای ئێمەوە بڕوای هەبووەو وەک دەڵێن مرۆڤێکی بڕوادار بووە تا دوا ساتەکانی ژیانیشی ئایەتەکانی قورئانی خوێندووە[١٨١].

ب- هەڵوێستی مەعروف جیاووک بەرانبەر بە ئیستعمار (کۆلۆنیالیزم)

مەعروف جیاووک، کوردێکی نەتەوە پەر وەر لە بیر وبا وەڕدا ئازاد و لایەنگیری مرۆڤی لێقە وما و گەلانی ژێر دەستە، دژ بە ئیستعمار بووە، هەقخواز و راستگۆ و لەڕ و و ڕ بوێر و، مێچکەیی و سازشی نەبووە، زۆربەی کار و کردە وەو هەڵوێستەکانی لە بەرژە وەندی مرۆڤ دۆستی و بەرژە وەندی نەتەوەکەی بووە.

وەک لە شوێنەکانی دیکەش پەنجەمان بۆ درێژ کردووە، بە لای ئەوە وە رزگاربوونی کورد بێ پاڵپشتی دە وڵەتێکی زلهێزی وەک ئینگلیز مەحاڵە. لە و ر وانگەیەشە وە لە وتار و نووسینەکانیدا داوای لە دە وڵەتی ئینگلیز کردووە کە لەسەر کورد بکەنە وە، چونکە لە سەرەتا وە بەڵێنیان دابوو.

د وابەد وای شەڕی د و وەمی جیهان، ئەو گۆڕانانەی بەسەر نەخشەی جیهاندا هات، بۆ کورد لە کوێرە وەری و بێ مافی و چە وساندنە وە بترازێ، چیدیکەی لێ نەهاتۆتە دی، بەتایبەتیش، د وای تە وا وبوونی شەڕ، جیهان بەسەر د و و بلۆک: رۆژهەڵات کە خۆی لە یەکێتی سۆڤیەت و وڵاتانی سۆسیالیستی دەبینییە وە: رۆژئا واش ئەمریکا و وڵاتانی ئەور وپای رۆژئا وا بوون. گەلی کوردیش، وەک گەلانی دیکەی جیهان کە وتە بەر کارتێکردنی گۆڕانکارییەکانی شەڕی د و وەمی جیهان و پرۆپاگەندەی وڵاتانی شەڕکەر، بۆیە بیر وبۆچوون و ڕەوت و تە وژمی

جیا جیا لە نێو گەلی كورد سەریان هەڵدا، هەبوو ها وسۆزی ئەڵمانیای نازی بوو لە دژی ئینگلیز، هەیانبوو، ها وسۆزی یەكێتی سۆڤیەت بوو، لەمە وە تە وژمی هزری لە نێو كوردا سەریان هەڵدا، ئەمەش وای كرد پارت و رێكخرا وی جیا جیای لی بكە وێتە وە، وەك رەنگدانە وە و دەربڕی ئەو تەوژم و رە وتانە. دەتوانین ئەو رە وتانە بكەینە د و و رە وتی سەرەكی، رە وتی نەتە وایەتی و رە وتی نەتە وایەتی سۆسیالیستی. رە وتی نەتەوەیی لە باشووری كوردستان لە شەڕی د و وەمی جیهان چەندین رێكخستنی جۆرا و جۆریان هەبوو، گرنگترینیان، یانەی سەركە وتنی كوردان لە ٣٠ مایسی ١٩٣٠ لە بەغدا بارەگای خۆی كردە وە پاش وەرگرتنی مۆڵەت لە وەزیری ناوخۆ، كە دیارترین رووناكبیرانی ئەو سەردەمە بەڕێوەیان دەبرد، وەك محەمەد ئەمین زەكی و مەعروف جیاووك[١٨٢]، كۆمەڵەی برایەتی كە لە ١٠ی ئاداری ١٩٣٧ بەسەرۆكایەتی شێخ لەتیفی شێخ مەحموود (١٩١٧- ١٩٧٢) بەرزنجی دامەزرا بوو، ئامانجی رزگاركردنی كوردستان بوو. كۆمەڵەی هیوا لە نیسانی ١٩٣٩ بە سەرۆكایەتی رەفیق حیلمی (١٨٩٨-١٩٦٠) بوو.

وەك جەمال نەبەز نووسیویە: بە لای مەعروف جیاووكە وە، هەموو دەرد و كوێرە وەرییەك كە بەسەر كوردا هاتووە، گوناهی ئینگلیز بووە لە بەرانبەر ئەو هەموو چاكەی شێخ مەحموود بۆ ئینگلیز، كە بێ شەڕ هاتنە كوردستان، ئینجا نیازیان وا بووە كوردستان بكەنە "ئاشوورستان"، لەگەڵ ئەوەش دیارە كورد بە شەڕ و بەربەرەكانێ دەرەقەتی بەریتانیا نەدەهات، بۆیە دەبوو لەگەڵیان رێك بكەون، بەڵام نەبنە پیاوی ئەوان وەك هەندێ كەس، بەڵكو لە رێی در وستكردنی دۆستایەتی، نەك نۆكەری، یان وەك تۆفیق وەهبی كە وا رێك كە وتبوو كوردستان بكرێتە (ئاشوورستان)[١٨٣].

مەعروف جیاووك، كوردێكی نەتەوەخواز بوو. دژی سیاسەتی بەریتانیا بوو بەرانبەر بە كورد، بەڵام دەیگوت هەر شتێك كە ئینگلیزەكان دژی بوەستن سەر ناگرێت[١٨٤]. پیاوێكی سەر راست بووە، خاوەن هەڵوێست بووە، لایەنگیری ئینگلیز نەبووە، كوردایەتی كردووەو شانازی بە كوردایەتی كردووە، ناوی منداڵەكانی كوردین، كەسایەتی وەك ئەو لە و ماوەیەدا كەم بوون[١٨٥].

ئەگەرچی لە بلا وكرا وەكانی بەرەی چەپدا پەلاماری مەعروف جیاووكیان دا وە، بەڵام وەك سیاسەتمەداری ناوداری بەرەی چەپ عەزیز محەمەد دەڵێت: "ئێمە لەگەڵ ئەو كەسانەی وەك مەعروف جیاووك و حوزنی.. هتد... مونسیف (منصف) نەبووین..." [١٨٦].

ناودارانی ئەو سەردەمەی وەك پیرەمێرد، مەعروف جیاووك، حوزنی موكریانی و تۆفیق وەهبی و... هتد لەسەر ئەو بڕ وایە بوون كورد لەگەڵ ئینگلیز دۆستایەتی بەهێز بێت و بەهۆی ئەوانەوە دەوڵەتی كوردی دابمەزرێت[١٨٧]. هەر ئەو بڕ وایەی جیاووك وای لەبەرەی چەپ كردووە، لە چاپەمەنییەكان، بەتایبەتیش بلا وكرا وەكانی پارتی كۆمۆنیستی عێراق، پەلاماری مەعروف جیاووك بدەن، لە وتارێكدا بە ناوی (مللەتی كورد پێ خۆشحالە لە موقفی حزبی شیوعی عێراق بەرامبەر مسئلەی كورد، لە نووسینی (پۆلا) ناوێك، مەعروف جیاووكیان لەگەڵ كۆمەڵێكی دیكەی وەك بورهان حامد جاف و تۆفیق وەهبی و نوری با ویل ئاغا بە (كلكی استعماریكانی ئاشكرا بوو) ناو هێناوە[١٨٨].

لە وتارێكی دیكەدا بە ناوی (ثورەی اكتوبر و مسئلەی قە ومیمان) و بە ئیمزای (ئازادی)، باس لە زیانی جیابوونە وەی كورد لە عێراق دەكات كە ئەمە بۆ خزمەتی ئینگلیزە. "كە وابێ شەرت نییەو ئینفصالی هەر قە ومێك لە هەموو جێگایەك و هەر كاتێك فائدەی بۆ مللەت هەبێ، مەسەلا لە كوردستانی عێراق ئەگەر هاتوو دەرەبەگ و برجوازییەكانی وەكو شێخ رەشید و شێخ رەقیب و نوری با ویل و تۆفیق وەهبی و مەعروف جیاووك... هتد.. قسەیان یەك كرد و بە سەفیری ئینگلیزەكانیان گوت ئێمەش قە ومی كورد تەمسیل ئەكەین و دەبێ بە خێرا خۆتان ئیستقلالی بە ئێمەش بدەن و ئەو مللەتە هەژارە لە ز ولم و غەدر نەجات بدەن و ئەو وەختە ئیستعماری ئینگلیزیش گوتی سەرچا وان ئەوا من دڵی ئێوە ناشكێنم حكومەتێكتان بۆ دائەنێم ئێوەش پێویستە چاكەی من لە بیر نەكەن"[١٨٩].

هەر لە پەیوەندی بە و بابەتە وە لە ژێر ناوی (لە هەر لایێكە وە)، كۆمەڵێك هە والی جیاجیا بلا وكرا وەتە وە. یەكێك لە و هە والانە تایبەتە بە موتەسەریف كە ئەو سەردەمە (٧ی ئابی ١٩٤٤- ٣ی مارتی ١٩٤٦)

مەعروف جیاووك لە سلێمانی موتەسەریف بووە، هە والەكە دەڵێت: "موتەسەریف تا ئێستا كە خۆی وا پیشان دەدا وەتەن پەروەرە و بارزانی ئەوێت ئێستاكە ئەتوانی ناوی بارزان بێنیت بەمەدا بۆمان دەركە وت كە ئەمیش جلە وی بە دەست خۆیە وە نییە و بە قسەی ئیستعمار هەڵئەستێ و دائەنیشێ خۆ لەم جەژنەشا حەمە سەعید قەزازی ها وفیكری هاتووە بە میوان ئەمجا بزانی قوڕ بۆ چ رەئیسی عەشیرەتێكی كوردیكە ئەگرنە وە ئەمانە و ئەمسالیان نۆكەری ئیستعمارن. ئەو جیاووكەی لە برسا سكی قوڕەی ئەهاتوو حەسیرێكی نەبوو رایبخا ئەمڕۆ ماڵەكەی بە دە لۆری ناگوێزرێتە وە مللەت نابێ بڕ وا بە هاشە و هۆشەی ئەمانە بكا، ئەمانە نۆكەری ئیستعمارن، ئەمانە مللەت ئەكوژن بۆ مەساڵحی ئیستعمار، ئەمانە ئاگری بن كان"(١٩٠).

ئەوەی گرنگ و مایەی سەرنجە، پیرەمێرد، راشكاوانە و بە ئاشكرا وەڵامی حزبی شیوعی و بلاّ وكرا وەی (ئازادی) دا وەتە وە. چونكە حزبی شیوعی ئەو كاتە بەیاننامەیەكی بە زمانی كوردی و بە عەرەبی بلاّ وكردۆتە وە، (ژین)یش لە ژێر سەرناوی (بۆ حزبی شیوعی عێراقی)، وەڵامی دا وەتەوە و سەردتا پیرۆزبایی لە دامەزراندنیان دەكات و دا وای خێریان بۆ دەكات "كە ببنە وەسیلەی سەربەرزی و رەهایی ولاّتتان....". ئینجا پیرەمێرد باسی خۆی دەكات كە چەندی خزمەتی نیشتمان كردووەو دەربەدەری و زیندان و دەردەسەری دیوە بە قەڵەمێكی تیژ و ماوەیەكی درێژ لە رۆژنامەكانی ئەستەنبوڵی نووسیوە و پاشان باسی تۆفیق وەهبی دەكات كە لە پێناو داخوازی كورد مردوو زیندوو بۆ وە و ئینجا دەڵێ "جیاووكیش با وەڕ بە من بكەن كوردە و كورد پەرستە ئیتر كەیفی خۆتانە"(١٩١).

وا دیارە لە ژمارەی پێشتر باسی ئازادی كراوەو لە و رووەی كە هە ولّی یەكخستنی د و و رەگەز دەدات ستایش كرا ون، وەك ئەركی رۆژنامەش رەخنە گرتن پێویستە، پیرەمێرد دەڵێت، ئەگەر بۆ رۆژنامەكەی من بلوێ، كەم و كورتییەكان دەخاتە روو. بەلاّم پێویستە درۆ و بوختانی تێدا نەبێت، چونكە ئەوە راستییەكانیش ئەخاتە گومانە وە. "بە جیاووك ئەڵێن كە هاتووە هیچی نەبووە، ئێستا تەدارەكی ماڵی بە دە لۆری بار ناكرێ، ئاخر جیاووكی كە بەرتیل نەخوا و هیچ كەسێ نەتوانێ بڵێ ئەوەی لە فلان وەرگرت ئەشیا لە كوێ كۆ ئەكاتە وە... ئەم پیا وە پیا وە خراپەی زۆری ئەوەیە لە هەموو كاتێك و شوێنێكدا نەڕاند و ویە وتوویە كوردم وا خوا لێرە دەربازی ئەكا ئەوسا ئەگەڕێن لە شوێنی"(١٩٢)

ئەو شاهێدییەی پیرەمێرد بۆ جیاووك زۆر گرنگ و بەنرخە، هەموو قسە و گوتە بەند وبا وە هەڵبەسترا وەكان، ئا وەڵ و و دەكاتە وە و سەر راستی ئەو پیا وە زۆر بەڕ و ونی دەردەخات.

وا دیارە ئەمەش بۆ ئەو رۆژە، لە ناو گەرمەی سەرهەڵدانی رێبازی كۆمۆنیستی و دەركە وتنی یەكێتی سۆڤیەت وەك هێزێكی گە ورە و خا وەن توانا و پاڵپشتی گەلانی چە وسا وە، ئەو بۆچوونانە سەریان هەڵدابوو، ئەمەش وەك كاری ئایدیۆلۆژی و پارتایەتی، هەموو شتێكی دەقۆزتە وە بۆ لەقا ودانی سەنگەری بەرانبەری، لەگەڵ ئەو قسانەی دەكرا، شتی ناڕاست و نادر وستیش دەگوترا و دەر وێشانە و لە كونی تەسكی بەرژە وەندی ئایدیۆلۆژی و پارتایەتییەوە سەیری مەسەلەكان كراوە.


بغداد الى آرارات

مذكرات بديعة المسماة
(الصابرة) مؤلف كتاب من الخليج
الى جبال آرارات عام
١٩١٢

تحتوي هذه المذكرات على وصف لبعض
الامور وعاداتهم واخلاقهم وتاريخهم
نقلها الى العربية معروف على آغا
جياووك

هەر ئەو ناوهێنانەی مەعروف جیاووک لەدوای شۆڕشی تەمووزی ١٩٥٨ جارێکی دیکە لە ڕۆژنامەی (اتحاد الشعب)ی [١٩٣] حزبی شیوعی عێراق دووبارە بۆتەوە، بۆیە بۆتانی کوڕی کتێبی (مأساة بارزان المظلومة)ی بۆ بردوون، ئینجا عەبدولقادر بوستانی و جەمال حەیدەری پۆزشیان بەنووسین لە ڕۆژنامەکە بۆ بنەماڵەی جیاووک هێناوتەوە[١٩٤].

وێڕای ڕۆژنامەی (ئازادی)، لە ڕۆژهەلاتی کوردستانیش ڕۆژنامەی (هاواری نیشتمان)یش لە وتارێکی (وردی)دا، پەلاماری جیاووکی داوە لەگەڵ ژمارەیەک سیاسەتمەداری کوردو عەرەب وەک نووسیوە: «ئەی فاشیستەکانی کوردو عەرەب (پاچەچی، توفیق وهبی، نوری سعید، سعید قراز {قزاز}..! معروف جیاووک)! ایوە لەئەنجامدا خوتان دەکەنە نیشانەی تیری لاوانی کوردو عربی ئزادی خواە.. چاک بزانن جولانەوەی کوردی ایران تأثیری دەکاتە هەموو کوردستانی گەوە {گەورە} وبەفرو فیلی ایوەش ئەو ئیمانجە گەورەو پیروزە بەربەست ناکری!؟ توتن نەکرین برسیەتی پەیدا دەکا.. برسیەتیش دەبیتە هۆی جولانەوەی بیری ئزادی و یەکیەتی ی کوردو هەستکردن بە مغدوریەت....»[١٩٥].

کە وەک لەشوێنی خۆی باس کرا، بەهۆی نەکڕینەوەی توتن بووە لە جووتیارانی کوردستان.

ئەوەی جێی سەرنجە وەلامدانە وەی بە ئاشکرای بلا وکرا وە نهێنییەکانە لە و سەردەمەدا، بوونی جۆرێک لەدیموکراتیەت دەردەخات، وا دیارە بواری ئەو جۆرە وەلامدانە وانە هەبووە، یان بەمەبەستی ناوزڕاندنی بەرەی چەپ بووە، لی گەڕاون وەلام بدرێنەوە ئەگینا ئەوەی ئەو بلاوکراوانەی لا بگیرابایە، چارەنووسی زیندان و پتریش بووە.

مەعروف جیاووک زۆر شانازی بە کوردبوون و کوردایەتی کردووەو ئەوەی لە چەندین شوێن لە نووسینەکانیدا د و وبارە کردۆتە وە: "ئەگەر مەعروف لە کوردایەتییەکەیدا شۆرا بێ کەڵکە، سەرباری هەموو شتێک خۆی پاراست، ئەوەش نووسین و د وانەکانی و ئەمانەش منداڵەکانی (نەریمان، سامان، سۆران، بۆتان، ژیان)، جیاوازییەکە روونە لە نێوان کوردبوونی جیاووک و کوردبوونی ئەوانی دیکە، ئەوانەی دیکە کە نکۆڵی لە ڕێ و ڕەچەڵەک و توخمی خۆیان دەکەن و جارێک بە مەبەستی خۆ بردنە پێش و مێچکەیی ناوی منداڵەکانیان بە ناوی گە ورەکان دەکەن و جارێکی دیکەش خۆیان بە کورد و تورک دادەنێن...." [١٩٦].

سەبارەت بوونی بە پیاوی ئینگلیز "ئەگەر پیاوی ئینگلیز بوایە دە ولەمەند ئەبوو. موجامەلەی نەبوو، سەری بۆ کەس دانەدەنواند، پیا وێک بوو پیا و، ئینسانێکی نیشتمانپەر وەر و کوردپەر وەر بوو، پیا وێکی هار و زمان درێژ بوو"[١٩٧].

مەعروف جیاووک پیاوێکی قسەکەر بوو، مەلیک فەیسەڵ وتبووی تۆ خەتیبی ئێمەی، پیا وێکی کوردپەر وەر بوو. لای وابوو کورد لە ڕێی ئینگلیز دەگاتە مافی خۆی[١٩٨]. مەعروف جیاووک، مرۆڤێکی ساکار و نەتەوەپەر وەری کورد بوو، هیچ ڕۆژێک سەر بە ئینگلیز نەبوو، ئەگەر سازشی لەگەڵ کردبان دەبووە سەرۆکی وەزیران، کە بووە موتەسەریفی سلێمانیش بە گیانی خزمەتکردنە وە، پاک بوو، لە هەموو ئەوانەی ئەو سەردەمە سیاسیتر و بەتواناتر بوو. هیچ هەڵوێستێکی دژ بە حزبی شیوعی نەبووە، مرۆڤێکی مە وزو ون بوو، یەکێکە لە پیا وە گە ورەکانی سەرەتای بز و وتنە وەی کورد لە باشووری کوردستان، دەیانویست ملی پێ بدەن، ئەو ملی نەدا، بە داد وەر دایانمەزراند، بەلام ئەو هەر لە کوردایەتی خۆی بەردە وام بوو، نەچووە هیچ پارتێکی سیاسی، هەر بۆیە فەرامۆش کرا وە. لە ماڵە وە منداڵەکانی ڕیز دەکردن و فێری زمانی کوردی و سروودی کوردی دەکردن، وەک سروودی:

**ئەی کوردینە، ئەی مەردینە**
**یا دەست لە ناو دەست کەین هەموو**[١٩٩]

گەشتیاری کورد کەریم زەند لە بارەی جیاووکە وە، ئا وای نووسیووە:

"ئەم مرۆڤە کەللە ڕەقە، بە دەمارە، هەڵچوون و هەڵەشەیی هەبوو، بەلام دەستپاک و دا وێن پاک و خا وێن و دڵسۆز بوو، کە مرد، خا وەنی جا وی تەرمەکەی نەبوو، کە پێی بشارنە وە، سەربازی گومناو، کورد پەر وەر، خا وەنی نووسرا وی بارزانی ستەمدیدە مەزڵوومە"(٢٠٠).

دوکتۆر جەمال نەبەزیش ئا وا باس لە کۆتایی تەمەنی

مەعروف جیاووک دەکات:

"لە پەنجاکاندا کاتێک لە بەغدا دەژیام جار وبار سەرم لێدەدا، تەندر وستی تێکچوو بوو، دەستیشی زۆر کورت بوو"(۲۰۱).

تەنانەت وەک رووناکبیرێکی هەقخواز و دژ بە هەر جۆرە سەرکوتکردن و چە وساندنەوەیەک بووە، تەنانەت رەخنەی لەجەمال عەبدولناسر (۱۹۱۸ - ۱۹۷۰)ی سەرۆکی میسر گرتووە، سەبارەت بەلادانی محەمەد نەجیب (۱۹۰۱-۱۹۸٤)ی یەکەمین سەرۆکی کۆماری میسرو لێدان و زیندانیکردن و لەسێدارەدانی (ئیخوان موسلیمین)ەکانی میسر، بەتایبەتیش هەروەک جیاووک نووسیویە: کارەکە بۆتە مایەی نیگەرانی زانایان و موسڵمانانیشی توورە کردووە، کە ئەمەش خواستی گلادستون(۲۰۲) و جوولەکە بووە(۲۰۳).

ئەمەش ئەو کاتە بوو کە لەساڵی ۱۹٥٤ نێوانی محەمەد نەجیب و سەرکردایەتی شۆڕشی میسر تێک چوو، بەهۆی ئەو خۆپیشاندانانەی ئیخوان موسلمینەکان لەدژی حکومەت رێکیان خستبوو، ژمارەیەکی زۆریان گیران. هەر لە تشرینی یەکەمی ئەو ساڵەشدا ویستبوویان جەمال عەبدولناسر لەئەسکەندەرییە غافڵکوژ بکەن، ئیدی ئەوە بووەتە هۆی لادانی نەجیب و دەست بەسەرکردنی و هەروەها لێدانی ئیخوانەکانیش(۲۰٤).

جەمال عەبدولناسریش بەنامەیەکی تایبەتی وەڵامی جیاووکی داوەتەوە تێیدا داوای لەجیاووک کردووە کە بەر لەوەی ئەو سەرکۆنەی ئەوان بکات دەبوا کاروبارەکەی بەوردی هەڵبسەنگاندبایە، وەک نووسیویە محەمەد نەجیب خۆی بۆتە مایەی لادرانی، چونکە لەرێبازی شۆڕش لایداوەو سەبارەت بەئیخوان موسلیمینەکانیش وەک دەڵێت وێڕای ئاموژگاری و رێنوێنی کردنیان کەچی ئەوان هەر خەریکی خراپەو غافڵکوژی بوونە(۲۰٥).

رەنگە ئەوە وەک موسڵمانیش کاری لە مەعروف جیاووک کردبێت، بەتایبەتی کە دڵی ئینگلیزی داگیرکەری پێ خۆش دەبێت و کارەکە لە خانەی بەرژە وەندییەکانی داگیرکەران و خوێنمژان دەکاتەوە. وەڵامی عەبد ولناسریش زۆر بایەخدارە، وەک سەرۆکێکی بەناوبانگ و لەسەر زارانی ئەو رۆژە و دژ بە داگیرکەران و سەر بە بەرەی میللەت.

مەعروف جیاووک وەک سیاسەتمەدارێک و شارەزای سیاسەتی رۆژ و ئەو شێوازە حوکمانەی کە دنیا بەرێوە دەبەن، بە سەرمایەداری و کۆمۆنیستی و خەسڵەتەکانیان. د وای ئەوەی حەقیقەتی سیاسەتی دە وڵەتە گە ورەکانی بۆ دەرکە وتووە کە هیچ لە و بەڵێن و گفتانەی بە گەلانی ژێردەستەی دنیایان دابوو، بەدییان نەهێنا، لە بانگەشەی مافی مرۆڤ و مافی گەلانی بن دەست، وەک چواردە بەندەکەی ولسن (۱۹۱۳-۱۹۲۱)ی سەرۆکی ولاتە یەکگرتووەکان، کەچی ولاتانی داگیرکەری وەک ئینگلیز و فەرەنسا لە لێدان و لە ناوبردنی شۆڕشگێرانی ما و و کورد لە تورکیا و شوێنیانی دیکە، گەلان لە ناو دەبەن و ئەو قسە زلانەی سەبارەت بە رزگاری گەلانی هەژار و مافەکانی مرۆڤ هەمووی درۆ بوون و لای گەلان خێرا ئاشکرا بوون، بۆیە لە ترسی ئەو درندانە، ئەو گەلانە خۆیان خزانده با وەشی کۆمۆنیستی. ئەمریکای بانگەشەکەری ئاشتیش، ژمارەیەکی زۆری خەڵکی لە ژاپۆن لە ناوبرد بە چەکی ئەتۆمی و هەر ئەویش بوو پشتگیری فەرەنسای بە چەک دەکرد، لە دژی گەلی "ڤێتنامی قارەمان"، ئەوە لاپەڕە رەشەکانیان لە فەلەستین کە ئیسرائیلیان دروست کرد، "دەبا مێژوو لە لاپەڕەی کردەوەکانیان ئەو پەلانە تۆمار بکات و با ئەوەی دەروونی پیسیان دەیە وێت بیکەن، ئەوا گەلان تێگەیشتن رێگای ئازادی هەریەک رێیە، هەرچەندی کۆسپ و ناخۆشی تێدا بێت" هەر وەها سیاسەتی ئیستعمارییانە لە دژی حکومەتی موسەدەقی نیشتمانپەروەر و ئازادیخواز و کۆڵەگەی بەردە وامی سیاسەتیان د وبەرەکی نانە وە و بلا وکردنە وەی پشێوی و ئاژا وەیە لە نێو گەلانی دنیا. دانانی شێخ مەحموود بە حوکمدار، پاشان پاشگەز بوونە وە، هەر وا لە پەیمانی سێڤر و پرۆژەی نیشتەجێ کردنی ئاشوورییەکان. چەندین کاری ناشایستەی دژ بە کورد، هەمووی هەڵسووڕاندنی سیاسەتی رۆژ بووە بۆ بەرژە وەندی ئیستعمارییانەی خۆیان، " ئەگینا ئەگەر بەریتانیا بە نیاز با دە وڵەت بۆ کورد دابمەزرێنێ ئەوا بەبێ هیچ گرفت دەیتوانی بیکات"(۲۰٦).

یەکێک لە هەڵوێستە دیارەکانی مەعروف جیاووک، وەک نموونە لە دژایەتی ئینگلیز و پیاوەکانیان و نیشتمانپەر وەری راستەقینەی ئەو پیا وە، "مەسەلەی مستر کوپە(۲۰۷)، کە لە بەڵگەی هەژدەمی کتێبی "مأساة

بارزان المظلومة"دا بە درێژی لێی د وا وە و پوختەکەی ئەوەیە: ئەو ئەفسەرە ئینگلیزانەی کە سەرپەرشتی هێزەکانی لیڤییان دەکرد، د واتر خانەنشین بوونە و گەڕاونەتەوە بەریتانیا، هەندێ لە وانە کۆمەڵەیەکیان بە ناوی "کۆمەڵەی پاراستنی ئاسوورییەکان"(٢٠٨) دامەزراند و وە، کە بارەگای لە لەندەن بووە. ئەو کۆمەڵەیە ناوە ناوە نوێنەرانی خۆی ناردۆتە عێراق تا پەیوەندی بە ئاسوورییەکانە وە بکەن و لەگەڵ کورد و مەسیحییەکانی دیکە ها وکاری بکەن بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی. یەکێک لە وانە کە ناوی مستەر کوپ Captain Cpopa بوو، بە ناوی کۆمپانیایەکی بازرگانی هاتبووە عێراق، ماوەی شەش مانگ لە موسڵ بووە و لەگەڵ مەسیحییەکانی موسڵ و گوندەکانی دەور وبەری خەریک بووە، داوای کردووە یەک بگرن بۆ سەربەخۆیی. پاشان چۆتە بەغدا و پەیوەندی بە هەندێ کوردە وە کردووە، یەکێک لە و کوردانەش مەعروف جیاووک بووە، دا وایان لی کردووە بۆیان مۆر بکات، تۆفیق وەهبی هە ولی لەگەڵ دا وە بۆ مۆر کردنی ئەو یادداشتەی کە (کوپ) ئامادەی کردبوو. لە کۆبوونە وەیەکی تایبەتی بە ئامادەبوونی: تۆفیق وەهبی، ئەمین رە واندزی، تۆفیق قەزاز، شێخ قادری حەفید، فەتحوڵلا کوردی، مەعروف جیاووک و محەمەد عەلی عەزیز و مستەر کوپ و یوسف مەلک د وای گفتوگۆ و مشتومڕێکی زۆر، مەبەستەکەیان ئاشکرا کردووە کە پوختەکەی ئەوە بووە:

١- ئەوانەی کە لەسەر یادداشتەکە مۆر دەکەن رازین لەسەر ئەو خاکەی کە کۆمەڵەی گەلان بڕیاری لێدەدات، بیداتە ئاسوورییەکان، وەک نیشتمانی نەتەوەیی ئەوان.

٢- دانانی بە وەکالەتی هورمز رەسام(٢٠٩) بۆ ئەوەی لە کۆمەڵەی گەلان داکۆکی لە کورد بکات.

٣- ئەو کوردانەی کە دەبنە کەمینە لە ناوچەی ئاسوورییەکان تە وا وی ئازادی ئایینییان دەبێت.

د وای ئەوەی مەعروف جیاووک بە رەزامەندی ئامادە بووان، سەرنج و تێبینییەکانی خۆی سەبارەت بە و یادداشتە دەردەبڕێ، ئەویش دیارکردنی ئەو رووبەر و شوێنەی کە دەدرێتە ئاسوورییەکان، لەسەر نەخشەیە. وەڵامی (کوپ) ئەوەیە کە ئەو ناتوانێت وردەکارییەکان لەسەر نەخشە دیار بکات، بۆیە جیاووک، لە وەڵامێکی



دەستنووسی وەرگێڕانی ( گەشتنامەی لەبەغداوە بۆ ئارارات ) ( لای رزگار جیاووک هەڵگ

دەمکوتکەرانەدا، دەڵێت کە واتە کێ رێی بە ئێمە دا وە، خاکێکی نادیار بدەینە ئاسوورییەکان، خۆ ئەوان وەکیلی خەڵکی کوردستان نین، ناشتوانین هورمز رەسام بکەینە وەکیلی کورد، چونکە ئەو لە هەمان کات وەکیلی ئاسوورییەکانیشە، ئاخۆ کورد خۆی کەسی وای نییە بیێتە وەکیلی؟!.

سەبارەت بە خاڵی سێیەم، لە بارەی ئازادی ئایینی بۆ کەمینەی کورد لە حکومەتی ئاسووری، جیاووک دا وای کردووە، ژمارەی ئاسوورییەکان چەندە بۆ دیارکردنی کەمینە و زۆرینە، دیارە وەڵامی نەبووە، بەڵام جیاووک بە ژمارە بۆی روون کردۆتە وە کە ژمارەی کورد و ئاسووری چەندە. بۆ رۆژی د وایی بە تەنیا لەگەڵ مستەر (کوپ) یەکتریان بینیوە و ئەویش هەمان دا واکاری د و وبارە کردۆتە وە و بەڵێنی دا وەتە جیاووک بڕێکی زۆر پارەی بداتێ، ئەگەر بۆیان مۆر بکات. لێرەدا جیاووک لێی بەدەنگ دێت و دەڵێت: "من لە وانە نیم شەرەف و نیشتمانی خۆیان بۆ چنگێک رۆپیە دەفرۆشن"، بۆیە پێشنیاری بۆ دەکات، ئەگەر توانی ئیمزای ئەمین زەکی وەربگرێت، ئەوا ئەویش بۆی مۆر دەکات، مەبەستی جیاووک لە وە ئاگادار کردنە وەی ئەوانی دیکە بووە، دیارە دڵنیاش بووە کە ئەمین زەکی کاری وا ناکات بکەونە هەڵە وە. (کوپ) بە وە رازی بووە و لە کاتی دیاریکرا و بەیەکەوە دەچنە لای ئەمین زەکی و لە وێش مشتومڕێکی زۆر دەکەن، کە ناگەنە ئەنجام دێنە دەرە وە، جیاووک بە کوپ دەڵێت، ئەمین زەکی چۆن بوو، ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: "رأسە مثل رأسك"، (واتاکەی واتە ئەویش وەکو تۆ سەر رەقە). د واتر هەمان پرسیاریش لە ئەمین زەکی دەکات، ئەویش دەڵێت: ئەوە تەڵەکەباز و

درۆزنە، ئینجا جیاووک داوا لە ئەمین زەکی دەکات کە تۆفیق وەهبی و ئەوانی دیکەش ئاگادار بکاتە وە، نەکە ونە دا وی ئەو تەڵەکەبازە. سەرەتا ئەمین زەکیش بۆی رازی ناکرێن، بۆیە رێ بە جیاووک دەدات، ئازاد بێت چی بە باش دەزانێت بیکات. هەر وەها ئەمین زەکی دا وا لە جیاووک دەکات وا لە محەمەد شوکری سەگبان بکات ئیمزاکەی بسرێتە وە، چونکە لە سەرەتادا ئەو هانی ئەوانی دیکەی دا وە مۆر بکەن، بۆیە جیاووکیش بە تەنیا بانگی محەمەد شوکری سەگبان دەکات بۆ یانەی سەرکە وتن و لەوێ دەرگای لەسەر دادەخات و زۆر بە توندی هەڕەشەی لی دەکات کە چۆن پارەی وەرگرتووە و ئیمزای کردووە، ئەویش زۆر بە توندی ئەوە رەت دەکاتە وە کە خۆی مۆری کردبێ، بەڵکو ناوی ئەوانە دەهێنێ کە مۆریان کردووە، جیاووکیش زۆری سەرزەنشت دەکات، کە ئەو نەکوردی دەزانێت و هەمیشە قاچی لە (دار الانتداب) و دەستی لە باڵیۆزخانەی تورکیا و سەریشی لە کۆشکی پاشایەتییە!. سەرەنجام جیاووک لە رۆژنامەی (صدى العهد)(٢١٠)ی رۆژی ٨ی ئایاری ١٩٣١، روونکردنە وەیەک بە ناوی (بۆ برا کوردەکانم- الى اخواني الاكراد)، بۆ رای گشتی بڵا و دەکاتە وە، تێیدا داوای کرد ووە کە فریو نەخۆن، چونکە ئەگەر تۆزقاڵێک سوودی بۆ کورد هەبووا خۆی یەکەمین کەس دەبوو مۆری دەکرد، پاشان حکومەتیش سۆراخی جیاووکیان کردووەو بانگیان کردووە[٢١١].

بێگومان ئەگەر ئەوە بۆ کورد کەڵکی هەبووایە، ئەمین زەکی پشتگیری دەکرد، بۆیە هەر وەک عەبد ولرەزاق ئەلحەسەنی بە ناوی (پیلان لە دژی ئاسایشی وڵات- المؤامرە على سلامە الدولە)ی خستوویەتە روو. لەسەر ئاستی دە وڵەتی عیراقیش ئەو بابەتە تەشەنەی کردووەو جموجۆڵی کوپ و هورمز رەسام، ئاشکرا دەبێت و پۆلیس لە ٥ی مایسی ١٩٣١، ئەوەی سەر وکاری بە مەسەلەکە وە دەبێت دەگیرێت، گیرا وەکانیش ئەمانەن:

تۆفیق وەهبی، سەعید نامق، د. شوکری محەمەد صکبان، عەبد نەعمان، کشمش نەعمان، توما هورمز، یوسف ئەندریا، عەبد ولکەریم قەرەکلە، لەگەڵ (کوپ) خۆشی. مەعروف جیاووک بە کورتی رێڕە وی رووداوەکانی بۆ ئەلحەسەنیش گێڕا وەتە وە، رۆژنامەکانی ئەو رۆژەش بایەخێکی زۆریان پێدا وە، نوێنەری باڵاش رەخنەی لە گرتنیان گرتووە و دا وای لە مەلیک کردووە گیراوەکان بەربدرێن[٢١٢].

(١) ئەو حاجی مەولوود بەدیعوئەلزەمانە کوڕی فەقێ وەلی (١٢٢٦-١٣٠٦ک/ ١٨١١-١٨٨٨ز) خاوەنی کەشکۆڵە. بڕوانە محەمەد عەلی قەرەداغی، ئەلبوومی کەشکۆڵ، بەرگی یەکەم، لەبڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، چاپخانەی خانی، هەولێر، ٢٠٠٨، ل١٠١-١٠٢. لێرەدا دەبێ ئاماژە بەوە بکەین کە ئەو بەدیعوئەلزەمانە لەگەڵ سەعید نەورەسی بەدیعوئەلزەمان (١٨٧٣-١٩٦٠) جیایە کە ناودارێکی دیکەی کوردەو زانایەکی گەورەی جیهانی ئیسلامە لەسەردەمی نوێدا، دامەزرێنەری کۆمەڵەی (نور)ە لەتورکیا. بڕوانە: محمد علی الصويركي، معجم اعلام الكورد فى "تاريخ الاسلامي والعصر الحديث في كوردستان وخارجها، مؤسسة حمدي، مركز ژين لاحيا و التراث الوثائقي والصحفي، السليمانية، ٢٠٠٦، ص٣٢٠.

(٢) شجرة بيت آل جياووك (ئەم درەختە دوو لاپەڕەی لەبەرگیراوەیەو لەفوئاد جیاووک وەرگیراوە): عبدالمجيد فهمي، تأريخ مشاهير الالوية العراقية، ج١، مطبعة الزمان، بغداد، ١٩٤٧، ص٥٩: الحكومة العراقية، جدول كبار موظفي الدولة لسنة ١٩٤٤، ص١٣: معروف جياووك، أقرأوا الحقائق الثابتة في كراسة فخامة السيد نوري السعيد ومقالات بعض خصومه، مطبعة الجامعة، بغداد، ١٩٤٨، ص٥: د. ئیسماعیل شوکر، رۆڵی رامیاری و رۆژنامە نووسی مەعروف چیاووک، "رۆژنامەنووس" (گۆڤار)، هەولێر، ژ(٣)، ٢٠٠٥، ل٣٢: علاء الدين سجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپی دووەم، چاپخانەی مەعارف، بەغدا ١٩٧١، ل٥٩٨.

(٣) بۆ لێکدانەوەی ساڵی رۆمی و زایینی بڕوانە: ئەحمەد تاقانە، رۆژژمێری (رۆمی)و نەخشەکانی بەرامبەر کردنی لەگەڵ رۆژ ژمێری کۆچی و زایینیدا، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠١، ل٢٦.

(٤) بڕوانە: دەقی ناسنامەکە لەپاشکۆ (دەقی ئەسڵی لای جیهان مەعروف جیاووک هەڵگیراوە).

(٥) میر بصري، اعلام الكرد، دار رياض الريس للكتب والنشر، لندن- قبرص، ١٩٩١، ص١٨٥-١٨٦.
(٦) د. ئیسماعیل شوكور، س. پ، ل٣٨.
(٧) علا و الدين سجادی، س. پ، ل٥٩٨.
(٨) عەباس عەزاوی - كە دیارە بەئاگاداری (مەعروف جیاووک) خۆشی بووە- کاتێ ناوی مەعروف جیاووک دەهێنێ، دەڵێت: ئەو هۆزە لەگەڵ هۆزی باڵەک ئامۆزان، هۆزی باڵەکی هۆزێکی گەورەیە، زێدی رەسەنیان نزیک مەلاتییەیە، تا ناوچەی بۆتان لە باکووری کوردستان درێژ دەبێتەوە، بە هۆی روودانی کێشەیەک بەشێکیان هاتوونەتە دەوروبەری رەواندزو لە دەوروپشتی (گەلی عەلی بەگ) نیشتەجێ بوونە، ئەمانەش گوندەکانیانن:
١- سەرگەلی. ٢- هەودیان، شوێنی مەلا یوسفی سەرۆکی هەموویانە. ٣- بادلیان. ٤- سرێشمە، سەرۆکەکەیان کوێخا عەباسە. لەو گوندەدا چوار بنەماڵە هەن، ماڵە موسا، ماڵەباس، مام لاس، ماڵەجیاووک، مەعروف جیاووک لەو بنەماڵەیەی دواییانە. ٥- دەربەندۆک. ٦- باڵەکیان بارزان...
٧-بالکیان. ٨- دیاوزە {دێلزیان}.
گوندو بەشی دیکەشیان زۆرن لەشوێنی جیاجیای وەک:
١- بەرحوشتر. ٢- دارەتوو٣- دارەبەند {دارەبەن} کە هەر هەموویان سەر بەهەولێرن. بڕوانە: عباس العزاوي، عشائر العراق الكردية، مطبعة المعارف، بغداد، ١٩٤٧، ص١٤١-١٤٢.
(٩) بەرحوشتر: گوندێکە سەر بەناحیەی (خەبات)ە لەقەزای هەولێر. بڕوانە: د. عەبدوڵلا غەفوور، گوندەکانی کوردستان، گوندەکانی باشووری کوردستان لەسەرژمێری دانیشتوانی عێراقدا ١٩٧٧، بەرگی دووەم، بڵاوکراوەکانی دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٥، ل ٢٥٤.
(١٠) شجره بيت ال جياووک، ص١.
(١١) مستەفا نەریمان، یانەی سەرکەوتنی کوردان (١٩٣٠-١٩٦٢)، ئامادەکردن و پێداچوونەوەی: ئازاد هیدایەت دەلۆ، ١٩٩٤، دەستنووس، ل٧٨.
(١٢) یادی کۆچی امین زکی، لەسەر ئەرکی عەلائەدین سەجادی لەچاپ دراوە، چاپخانەی مەعارف، بەغدا، ١٩٤٨، ل١٦.
(١٣) گیو موکریانی، بەهەشتی معروف بەگ جیاووگ، "هەتاو" (گۆڤار)، هەولێر، ژ ١٢١، ٣١ کانوونی دووەمی ١٩٥٨، ل٤.
(١٤) مەسعوود محەمەد، گەشتی ژیانم، چ١، ستوکهۆڵم، ١٩٩٣، ل٢٨٠.
(١٥) عمر علي شريف، احداث ومواقف في حياة معروف چياووک ١٨٨٤-١٩٥٨، "خەبات" (جريده)، هەولێر، العدد ١٩٨٥، ٢١تموز ٢٠٠٠.
(١٦) معروف جياووك، مأساة بارزان المظلومة، ط٢، مؤسسة اراس للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠١.
(١٧) رفعة عبدالرزاق محمد، معروف چياووك، " العراق" (جريدة)، بغداد، ٣١ تموز، ٢٠٠١.
(١٨) مەولوود قادر بێخاڵی، هەولێرم وا دیوەو.. بیستووە، هەولێر، ١٩٩٧، ل٣٣.
(١٩) ئیسماعیل شوکر، رۆڵی رامیاری و رۆژنامەنووسی...، ل٣٢.
(٢٠) مستەفا نەریمان، یانەی سەرکەوتنی کوردان...، ل٣٨پ.
(٢١) دیدار لەگەڵ مەلا عەبدولفەتاح تاهیر محەمەد ئەمین، سرێشمە رۆژی ٢٣ی تەمووزی ٢٠٠٦، لەدایکبووی ساڵی ١٩٣٦، گوندی سرێشمەیە، لەتایفەی (باس)ەو خوشکی باپیری بەناوی (خەدیجە) خێزانی حاجی مەولوودی باپیری (مەعروف جیاووک)ە.
(٢٢) دیدار لەگەڵ خالیدە ئیبراهیم چیچۆ، هەولێر لەرۆژی ٥/ شوباتی/ ٢٠٠٧. (لەدایکبووی بەغدا-١٩٣٤، مەعروف جیاووک کوڕی خاڵی باوکییەتی).
(٢٣) وەک دەڵێن پارەکە وێنەی پیاوێکی بەسەرەوە بووەو تیروکەوانی بەدەستەوە بووە. هەروەها لەکاتی نۆژەنکردنەوەی مزگەوتی گوندیش لە نەوەدەکاندا کوویەی بچووک دۆزراوەتەوەو نووسینی بەسەرەوە بووە با ئەوەی هیچی تێدا بێت. دیدار لەگەڵ تەقییەدین عومەر ئەحمەد شاباز، لە سرێشمە لەرۆژی ١٧ی حوزەیرانی ٢٠٠٧
(٢٤) دیدار لەگەڵ حەمەدەمین حاجی عەبدوڵلا، سرێشمە لەرۆژی ٢٣ی تەمووزی ٢٠٠٦، (لەدایکبووی

١٩٢٨ سرێشمەیەو باپیری ئامۆزای حاجی مەولوودی باپیری مەعروف جیاووکەو زۆریش لەگەڵ مەعروف جیاووک بووەو زۆر لێی نزیک بووە، بەڵام بەهۆی نەخۆشی و لەسەرجێگا کەوتنی نەمانتوانی، وەک پێویست بیدوێنین؛ پاش ماوەیەکیش کۆچی دوایی کرد).

(٢٥) هەر لە بارەی(جیاووک)ەوە، جەمال بابان دەڵێت: جیاووک ناوی داپیری مەعروف جیاووک بووە و زۆری مارف خۆشویستووە: بڕوانە: جمال بابان، اعلام کرد العراق، مطبعة شڤان، سلیمانیة، ٢٠٠٦، ص٨٢٠.

(٢٦) شجرة بیت آل جیاووك، ص١-٢: جیاووك الكردي، القضیة الكردیة، ط٢، مطبعة النجاح، بغداد ١٩٣٩، ص١٠١. (لەو سەرچاوەیەدا لەجیاتی "ماڵەموس، ماڵەیوس" نووسراوە، کە پێم وایە هەڵەی چاپ بێت، هەرچەندە چاپی دووەمیشە، بەڵام راست نەکراوەتەوە): عباس العزاوي، م.س،ص١٤١-١٤٢. لێرەش لەباتی ماڵە لاس، (مام لاسە) و (ماڵەجیاووک) بەتەنیا نووسراوە بێ ناوی (حەسەن)، وەک نووسەر نووسیویە "زانیارییەکانی لەمامۆستای بەڕێز مەعروف جیاووک وەرگرتووە کە خۆی لەبنەماڵەی (جیاووک)ە".

(٢٧) قائانی (میرزا حەبیب الله زەنگەنە) لەساڵی ١٨٠٨ لەشیراز لەدایک بووەشاعیرێکی دیارو خاوەن دیوانێکی شیعری و کتێبێکی پەخشانە بەناوی (پەرێشان)، لەساڵی ١٨٥٤ کۆچی دوایی کردووە. صدیق صفی زادە بورەکەیی، دایر دالمعارف کردی/ فرهنگ اعلام، انتشارات پلیکان، چ. ماهرنگ فجر، تهران، ١٣٨٠، ص ٨١٨.

(٢٨) زەهاوی: محەمەد ئەمین فەیزی (موفتی زەهاوی) لە ١٧٩٧ لە (زەهاو) لەدایک بووە، خوێندنی ئایینی لەسابلاخ لەتەمەنی بیست ساڵی تەواوکردووەو لەساڵی ١٨٥٠ چۆتە بەغداو لەساڵی ١٨٥٤ بۆتە موفتی، پتر لە شەش هەزار قوتابی لای ئەو خوێندوویانە، زانایەکی گەورەی سەردەمەکەی بووە، لە ١٩ی کانوونی یەکەمی ١٨٩٠ لەبەغدا کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: الدکتور محمد علي الصویرکي، م.س،ص٥٨٧.

(٢٩) ئالووسی: عەبدوڵڵا کوڕی مەحموود ئەلئالووسی، لەساڵی (١٨٣٢) لەبەغدا لەدایک بووە، زانایەکی ئایینی بەغدایییە، لەسەر دەستی باوکی خوێندوویەتی، خۆی تەرخان کردووەبۆ وانە وتنەوە، چەندین بەرهەمی هەیە. لە ساڵی (١٨٨٤) لەبەغدا کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: خیرالدین الزرکلي، الاعلام قاموس وتراجم، مج ٤، ط ٤، دار العلم للملایین، بیروت، ١٩٧٩. ص١٣٦.

(٣٠) بۆزانیاری پتر بڕوانە: شجرە بیت ال جیاووک، ص٢: عبدالمجید فهمي، م. س، ص٥٩. لەو ماوەیەدا ئەم شەڕانە لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی و رووسیادا هەڵگیرساون ١٨٢٨-١٨٢٩و ١٨٥٣-١٨٥٦و ١٨٧٧-١٨٧٨. بڕوانە: د. کمال مظهر احمد، کردستان في سنوات الحرب العالمیة الاولی، ترجمة: محمد الملا عبدالکریم، مطبعة المجمع العلمي الکردي، بغداد، ١٩٧٧، ص٤٣ هامش.

(٣١) دیدار لەگەڵ تەیب حەسەن حوسێن جیاووک، خەلیفان لەرۆژی١٧ی حوزەیرانی ٢٠٠٧. ناوبراو هەر لەساڵی ١٩٥٧ەوە چۆتە بەغدا بۆخوێندن و لەماڵی مەعروف جیاووک ژیاوەو ئاگاداری لەوبارەیەوە زۆرەو خۆی کتێبی دەستنووسی ئەوی بینیوە: دیدار لەگەڵ خالیدە ئیبراهیم چیچۆ لەرۆژی ٥ی شوباتی ٢٠٠٦.

(٣٢) د. ئیسماعیل شوکر رەسول، رۆڵی رامیاری و رۆژنامەنووسی...، ل٣٨.

(٣٣) مستەفا نەریمان، یانەی سەرکەوتنی کوردان...، ل٣٥.

(٣٤) فەقێ وەلی باوکی باپیری (مەعروف جیاووک)ە.

(٣٥) مستەفا نەریمان (١٩٢٥- ١٩٩٥)، دەڵێت: لەدوا ساڵەکانی سەدەی رابوردوو (حاجی مەلوود)ی باپیری مەعروف لەئاوایی سرێشمەوە هاتۆتە بەغدا. یانەی سەرکەوتنی کوردان...، ل٣٥. ئەمە نەختێک هەڵوەستەی دەوێت، چونکە پێشتر گوتمان حاجی مەولوود هاتۆتە هەولێر، لێرەش مەعروف جیاووک دەڵێت، فەقێ وەلی واتە باوکی باپیری، ئێمە زانیاری پترمان نییە.

(٣٦) دێیەک بوو لەنزیک هەولێر، ئێستا بۆتە شارۆچکە.

(٣٧) کورتەک، بەگەڕەکەکانی خوارەوەی هەولێر گوتراوە کە ئەمانەن: عەرەب، تەعجیلی جولەکە، تەعجیلی موسلمانان، خانەقا. بڕوانە: د. اسماعیل شکر رسول، اربیل دراسة تأریخیة في دورها الفکري والسیاسي ١٩٣٩-١٩٥٨، ط٢، السلیمانیة، ٢٠٠٥، ص٢٥.
(٣٨) جیاووك الکردي، القضیة الکردیة، ص١٠١.
(٣٩) عەلی ئەسغەر قەدو باڵای بچووک بووە، بۆیە بەرانبەر بە عەلی ئەکبەر وا ناونراوە. دیدار لەگەڵ جیهان مەعروف جیاووک (لەدایکبووی ١٩٤٠ بەغدایە ئێستا لەئەمەریکا دەژی). هەولێر رۆژی ١١/ئەیلوولی ٢٠٠٨
(٤٠) شجرە بیت ال جیاووک، ص٢.
(٤١) عبدالمجید فهمي حسن، م. س، ص٥٩.
(٤٢) د. ئیسماعیل شوکر، رۆڵی رامیاری و رۆژنامەنووسی... ل٣٢، ٣٨، د. ئیسماعیل شوکر بەپشت بەستن بەقسەی شوکرییە عەلی ئەکبەرو ئەحمەد جەمیل جیاووک دەڵێت: لەموسڵ (ئیمام تابوور) بووە، پاشتر گوێزراوەتەوە بەغداو لەوێ ماوەتەوەو هەمان وەزیفەی بینیوە تاکو بەر لە هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی کۆچی دوایی کردووە. کەبەلای ئێمەوە ئەوەی درەختی بنەماڵە راستترە، بەتایبەتی کە لەبەر بیرەوەرییەکانی مەعروف جیاووک خۆی ئامادەکراوە. بڕوانە: شجرة بیت آل جیاووك، ص٢.
(٤٣) الامام علي اصغر جیاووك، الفوائد المعروفیة في علم النحو واللغة العربیة، حرر في بغداد ١٨٩٥، (دەستنووس)، ص١: ئێمە فۆتۆیەکەمان بینیووەو لەئەسڵدا بەئامێری سکانەر وێنەی تەواوی لاپەڕەکان گیراوە لای رزگار جیاووک پارێزراوەو ئێمەش دانەیەکمان لەبەر گرتۆتەوە.
(٤٤) ئەم ناونانەش لەمێژووی رووناکبیری کوردیدا پێشینەی هەیە، لەرۆژگاری خۆیدا شێخ مەعروفی نۆدەیی (١٧٥٣-١٨٣٨ز) سپارەیەکی بەناوی (ئەحمەدی) بەعەرەبی و کوردی لەساڵی ١٧٩٥ز بۆ کاک ئەحمەدی شێخی (١٧٩٣-١٨٨٧) کوڕی بەهۆنراوە هۆنیوەتەوە، کە تەمەنی سێ ساڵ بووە، بۆ فێربوونی زمانی عەرەبی و لەساڵی ١٩٣٦ لەبەغدا چاپکراوە. بڕوانە: محمد الخال، الشیخ معروف النودهي البرزنجي، دار مطبعة التمدن، بغداد، ١٩٦١، ص٧٨، ٨٧، ٩٨، ٩٩.
(٤٥) دایکی عەلی ئەکبەر جیاواز بووە. دیدار لەگەڵ جیهان مەعروف جیاووک لەرۆژی ١١/ئەیلوولی/ ٢٠٠٨.
(٤٦) شجرە بیت آل جیاووک، ص٢.
(٤٧) بشیر اسماعیل چیچو، معروف جیاووک، حیاە حافله بالعطا و خدمه لقضیه شعبه، "خەبات" العدد (٨٠٢)، ٩تشرین الثاني ١٩٩٦.
(٤٨) شێخ مەعروفی کەرخی: لە(٨١٥ز) کۆچی دوایی کردووە، سۆفییەکی گەورەو لەخواترس بووە، لە بەری کەرخ لەبەغدا نیشتەجێ بووەو هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: الموسوعة العربیة المیسرة، المجلد الثاني، دار النهضة للطباعة والنشر، ١٩٨٠، ص١٤٥٠.
(٤٩) مستەفا نەریمان، یانەی سەرکەوتنی کوردان...، ل٣٥: عبدالمجید فهمي حسن،م. س، ص٥٩.
(٥٠) شجرە بیت آل جیاووک، ص٢.
(٥١) مونیرە بەر لەشەڕی یەکەمی جیهان مامۆستا بووە..
(٥٢) ئیمێلی جیهان مەعروف جیاووک لەرۆژی ٨/تشرینی یەکەمی/ ٢٠٠٨: دیدار لەگەڵ خالیدە ئیبراهیم چیچۆ لەرۆژی ٥/ شوباتی/٢٠٠٧: هەروەها لەگەڵ تەیب حەسەن حوسێن جیاووک، لەرۆژی١٧/حوزەیرانی/٢٠٠٧.
(٥٣) دەوڵەتی عوسمانی لە ٢٠ی ئەیلوولی ١٨٦٩، یاسای مەعارفی گشتی بۆ پێشخستنی خوێندن دەرکردو خوێندنی کردە سێ هەوار (مرحلە)، سەرەتایی ماوەکەی چوار ساڵ و ناوەندی (روشدیە) ماوەکەی سێ ساڵ و ئامادەییش ماوەکەی چوار ساڵ بووە. بڕوانە: د. ابراهیم خلیل احمد، م. س، ص٢٤.
(٥٤) میر بصری، اعلام الکرد، ص١٨٥: د.ئیسماعیل شوکر، رۆڵی رامیاری و رۆژنامەنووسی...، ل٣٢.
(٥٥) بڕوانە: پاشکۆ.
(٥٦) کە چۆتە ئەستەنبوڵ سەرەتا ئارەزووی لەخوێندنی

پزیشکی بووە، بەڵام لەبەر ئەوەی مـــزی (کــرێی) خــوێندنی پزیشکی زۆر بووەو بۆی دابین نەکــراوە، ناچار چۆتە کـۆلێـژی مـاف. دیدار لەگـەڵ جـیـهـان مەعروف جیاووک لەرۆژی ١١/ئەیلوولی /٢٠٠٨.

(٥٧) طارق جـامـبـاز، حـزبی هیـوا لەلیـوای هەولێـر، لەچاپکراوەکانی گۆڤاری یاساپارێزی (١٤)، هەولێر، ٢٠٠٥، ل١٠٣.

(٥٨) بڕوانە: عـبـدالمجـيـد فـهـمي، م.س، ص٥٩: مـير بصـري، م. س، ص١٨٥: مـسـتـەفـا نەریمان، یانەی سەرکەوتنی کوردان...، ل٣٥: طارق جامباز، س.پ، ل٧٤: د. ئیـسـمـاعـیـل شـوکـر، رۆڵی رامـیـاری و رۆژنامەنووسی...، ل٣٢.

(٥٩) مـعـروف جـیـاووک، نـيـابتي في ١٩٢٨-١٩٣٠، مطبعه الزمان، بغداد، ١٩٣٧، ص٦.

(٦٠) لە١٣ی نیـسـانی ١٩٠٩ز، سـوپای عـوسـمـانی رووداوێکیــان رێکخـسـت و دایانە پاڵ سـوڵـتـان عەبدولحەمید بەو مانایەی کەوا سوڵتان ویستوویەتی شۆڕش لەدژی ئیـتـحـادو تەرەقی بەرپا بکات، بۆیە سوپا ئەمەی کردە بیانوو بۆ ئەوەی سوڵتان لابدرێت. بۆ ئەم مـەبەسـتـە شاندێکی چوارکەسـیـان ناردە لای سوڵتـان و بڕیاری لادانیان لە ٢٧ی نیسانی ١٩٠٩ پێ راگەیاند، ئەویش بۆ سـوڵـتـان مـحـەمـەد رەشـادی پێنجەم لەتەخت هاتەخوار. بۆ زانیاری پتر بڕوانە: د. مـحـمـود علی عـامـر، تاريخ الدولة العـثـمـانيـة، منشـورات جـامـعـة دمشق- كلية الاداب، مطبعـة الداوودي، دمـــشق، ١٤٢٤-١٤٢٥هـ/٢٠٠٣-٢٠٠٤، ص٣٦٨-٣٦٩.

(٦١) عبدالمجيد فهمي، م.س، ص ٦٠.

(٦٢) مـسـتـەفـا نەریمان، یانەی سـەرکـەوتنی کـوردان...، ل٣٦: عبدالمجيد فهمي، م.س، ص٦٠. جێی گوتنە عـەبدولمەجـیـد فـەهمی دەڵێت: لەمـاڵی بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی عـەلی غـالب بەگ بووە، بەڵام دیارە راستییەکەی ئەوەیە کە ئێمە نووسیومانە. بۆ دڵنیایی بڕوانە: شـجـره بيت آل جـيـاووک، ص٢. هەروەها لەســەرچاوەیەکی دیکـەشـدا دەڵێت: شـەش مـانگ ناچاری خۆشاردنەوە بووە و ئەو کەسەشیان بەنوێنەری حـیـجـاز داناوە. بڕوانە: فرج مـحـمـد بكر، في ذكرى المرحوم معروف جياووك، "التآخي" (جريده)، بغداد، العدد٧٦٦، ٢٣/ حزيران/ ١٩٧١.

(٦٣) معروف جياووك، نيابتي...، ص٨.

(٦٤) بڕوانە: بڕوانامـەی گـواسـتـنەوەی لەپاشکۆ. (دەقی ئەسڵی ئەو بڕوانامەیە بەتورکی لای جیهان جیاووک پارێزراوە).

(٦٥) فرج محمد بكر، م.س. هەندێ سەرچاوە ساڵەکەیان بە ١٩١٢ داناوە بڕوانە: رفعـه عـبـدالرزاق مـحـمـد، م.س: دیدار لەگەڵ جیهان مەعروف جیاووک لەرۆژی ١١/ئەیلوولی/ ٢٠٠٨. هەرچی مـسـتـەفـا نەریمانە دەڵێت بەڕێوەبەری ناحیەی (دێر زوور) بووە. مستەفا نەریمان، یانەی سەرکەوتنی کوردان...، ل٣٥، ١٣٢.

(٦٦) "لغه العرب"، مجله شهريه ادبيه علميه تأريخيه، بغداد، المجلد الاول- الجز و (٨)، عن صفر١٣٣٠- شباط ١٩١٢، ص٣٢٥.

(٦٧) خـــالص عـــزمي، ادب القـــضـــاة: (٨) www.elaph.com، الحـوار المتـمـدن، العـدد: ١٥٨٨-٢١/حزيران/٢٠٠٦ (معروف جياووک).

(٦٨) كوت الزين: ناوچەیەکە سەر بە بەسرەو سەربازگەی عـوسـمـانیـیـەکـانی لێ بووە، لەسـەردەمی جـەنگی یەکەمی جـیـهـان لەنێوان ئینگلیزو عوسمانییەکان، شەڕی تێدا روودا، عـوسـمـانیـیـەکـان شکان و ئەمەش سـەرەتای داگیـرکـردنی میـسـۆپۆتامـیـا بوو. سـتـيـفن همسلي لونكريك، العـراق الحديث، من سنة ١٩٠٠ الـي ١٩٥٠، ج١، ت: سـلـيـم طـه الـتـكـريـتـي، منشـورات الـفـجـر، مطبـعـة حـسـام، بغداد، ١٩٨٨، ص١٣٥هامش.

(٦٩) ئەو کات (بورما) یەکێک لە موستەعمەراتەکانی بەریتانیا بووە.

(٧٠) مـعـروف جـيـاووك، اقـرأوا الحـقـائق الثـابتـة...، ص٥٥-٥٧: د. ئیسماعیل شوکر، رۆڵی رامیاری و رۆژنامـەنووسی....، ل٣٢: ئیـــسـمـــاعـيـل حـەقی شـاوەیس (١٨٩٦ - ١٩٧٦)، کـە هاوڕێی دیلێـتی مەعروف جیاووک بووە، لەشوباتی ١٩١٩ هاتۆتەوە، کەواتە وادیارە جیاووکیش هەر لەو ماوەیە هاتۆتەوە. بڕوانە: دیاری کـــوردســـتـــان (١٩٢٥-١٩٢٦)، ئامادەکردنی: رەفیق ساڵح، لێکۆڵینەوەی نەوشیروان

مستەفا ئەمین و سدیق سالح، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ۲۰۰۱، ل۸۱.
(۷۱) سەرچاوەی دیکە چوار ساڵیان نووسیوە. بڕوانە: گیو موکریانی، بەهەشتی معروف بەگ جیاووگ، "هەتاو"، ژ ۱۲۱، ۳۱/ کانوونی دووەمی/ ۱۹۵۸: خالص عزمی، م.س.
(۷۲) معروف جیاووک، نیابتی...، ص۸: فرج محمد بکر، م.س
(۷۳) معروف جیاووك، أقراوا الحقائق الثابتة...، ص ٥٧.
(۷٤) عبدالرزاق الهلالي، تاريخ التعليم في العراق في عهد الاحتلال البريطاني ۱۹۱٤-۱۹۲۱، مطبعة المعارف، بغداد، ۱۹۷٥، ص ۱۸۹-۱۹۱، ۱۹۳-۱۹٦. لێرەدا هەموو ئەوانەی لایان وابووە لە ئەستەنبۆڵ تەواوی کردووە بەهەڵەداچوون کە زۆربەن، ئەمەش ئەو راستییە دەسەلمێنێ کە زانیارییەکانیان لەیەکدی وەرگرتووەو دووبارەیان کردۆتەوە. تەنانەت ئەوانەی د. ئیسماعیل شوکریش دیداری لەگەڵ کردوون و نزیکی معروف جیاووک بوونە، وەک شوکرییە عەلی ئەکبەر ۱۹۱۸- و ئەوانی دیکە: عبدالمجید فهمی حسن، م.س، ص ٥۹: مستەفا نەریمان، یانەی سەرکەوتنی کوردان...، ل۳٥،... هتد، بەلام ئەوانەی راستی بۆ چوون، فرج محمد بکر، م.س: بشیر اسماعیل چیچو، م.س، بەلام ئەوەی دووەمیان وای زانیوە بەر لەجەنگی یەکەمی جیهان بووە: رفعه عبدالرزاق محمد، م.س.
(۷٥) معروف جیاووک، نیابتی...، ص۱۲. جێی ئاماژە پێکردنە رەشید عالی گەیلانی لەو خوێندنگای کە لەبەغدا کراوەتەوە، ماوەیەکی کورت مامۆستا بووە. بڕوانە: نجم الدين السهروردي، التاريخ لم يبدأ غدا، ط۲، مطابع دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ۱۹۸۹، ص۲.
(۷٦) خالص عزمی، م.س، ص۱.
(۷۷) معروف جیاووک، نیابتی...، ص۸. لەسەرچاوەیەکی دیکەدا، نووسراوە لە ساڵی ۱۹۲۱ چۆتە نێوکاری میرییەوە. بڕوانە: د. ئیسماعیل شوکر، رۆڵی رامیاری و رۆژنامەنووسی...، ل۳۲.
(۷۸) "نجمه" (جریده)، کرکوك، العدد ۸٦٦، ۲٦/ تشرينی الثانی/ ۱۹۲۳.
(۷۹) "العراق" (جريدة)، بغداد، العدد ۱۹۲۸، ۳۱ /اب /۱۹۲٦. دەلتاوە: قەزای خالسی ئێستایە سەر بەپارێزگای دیالەیە.
(۸۰) ئەلحەی: شارۆچکەیەکە سەربە کوت.
(۸۱) "العراق"، العدد ۲۰۳۰، ۲۹/ كانون الاول/ ۱۹۲٦.
(۸۲) "العراق"، العدد ۲۰۳۲، ۳۱/ كانون الاول/ ۱۹۲٦.
(۸۳) معروف جیاووک، نیابتی...، ل۹، ۱۹، ۲۷: میر بصری، م.س، ص۱۸٥: میر بەسری (۹ی حوزەیرانی) نووسیوەو نووسەرانی دیکەش دوای ئەو دووبارەیان کردۆتەوە، بۆ نموونە عومەر عەلی شەریف: بڕوانە: احداث ومواقف فی حیاه معروف چیاووک ۱۸۸٤-۱۹٥۸)، "خەبات" (جریدە)، العدد (۹۸٥، ۲۱ ،تموز- ۲۰۰۰.
(۸٤) معروف جیاووک، نیابتی...، ص۲۳٦.
(۸٥) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: م.ن، ص ۲۳۹- ۲٤۰.
(۸٦) معروف جیاووک، مأساه بارزان المظلومه، ص۱٤۱.
(۸۷) "الوقائع العراقية" (جريدة)، بغداد، العدد(۱۰٤٥)، ۱٥/ تشريني الاول/۱۹۳۱: العدد(۱۰٥٦)، ۳/تشرين الثاني/ ۱۹۳۱: العدد (۱۰٦۲)، ۷/كانون الاول/ ۱۹۳۱. بەلام خۆی نووسیویە: "۱٤ی تشرینی یەکەمی ساڵی ۱۹۳۱ فەرمانی دامەزراندنم دەرچووە و خۆم هۆکاری راستەقینەی دامەزراندنەکەم دەزانم"، بڕوانە: معروف جیاووک، مأساه بارزان المظلومه، ص۱٤۲. وادیارە مەبەستیان دوورخستنەوەو بێ دەنگ کردنی بووە.
(۸۸) معروف جیاووك، مأساة بارزان المظلومة، ص۱٤۲.
(۸۹) "القضاء" (مجلة)، بغداد، (وزارة العدل)، العدد٤، ايلول١٩٣٤، ص٢٧.
(۹۰) عبالمجيد فهمي، م.س، ص ٦١: مير بصري، م.س، ص ۱۸٦.
(۹۱) عبدالمجید فهمی، م.س، ص ٦۱: د. ئیسماعیل

شوكر ئەو كارەی بەدوا وەزیفەی زانیوە. بڕوانە د. ئیسماعیل شوكر، ڕۆڵی رامیاری و ڕۆژنامەنووسی...، ل٣٢.
(٩٢) مستەفا نەریمان، یانەی سەركەوتنی كوردان...، ل٤٨.
(٩٣) میر بصری، م.س، ص١٨٦: گیو موكریانی، بەهەشتی معروف بەگ جیاووگ، "هەتاو"، ژ ١٢١، ٣١/كانوونی دووەمی/ ١٩٥٨، ل٢.
(٩٤) مستەفا نەریمان، یانەی سەركەوتنی كوردان...، ل٦١.
(٩٥) "ژین" (ڕۆژنامە)، سلێمانی، ژ ١٣٧٩، ٣٠ كانوونی دووەمی ١٩٥٨، "هەتاو"، ژ١٢١، ٣١ كانوونی دووەمی ١٩٥٨، لە وتارەكەی گیو موكریانی (١/١٢) نووسراو، كەدیارە هەڵەی چاپە، مستەفا نەریمان، ه.س.
(٩٦) موتەسەریفی ئەو سەردەمە خالید نەقشبەندی (١٩١٥-١٩٦١)، بووە.
(٩٧) گیو موكریانی، ه.س، ل٢-٣. لە دیدارەكانی د. ئیسماعیل شوكر لەگەڵ نزیكەكانی مەعروف جیاووك، وادیارە ناوبراو بەر لەمردنی، دەستنیشانی شوێنێكی تایبەتی كردبوو لەسەر ڕێگای هەولێر-شەقڵاوە، بۆ ئەوەی بكرێتە گۆڕستانی تایبەتی بنەماڵەكەی بەناوی گۆڕستانی جیاووك و خۆشی لەوێ بنێژرێ، بەڵام ڕاسپاردەكەی جێبەجێ نەكراوە. بڕوانە: د. ئیسماعیل شوكر، ڕۆڵی رامیاری و ڕۆژنامەنووسی...، ل٣٨پ. توێژەر لە كاتژمێر٣ی ڕۆژی ٩/نیسانی/٢٠٠٧ بۆ جاری دووەم سەردانی گۆڕستانی شێخ چۆلی كردەوە لەجاری یەكەم وێرای ماندووبوونێكی زۆر بۆی نەدۆزرابۆوە، لەسەر گۆڕەكەی بەچیمەنتۆ بنمیچێك كراوە لەسەر بەردێكی مەرمەڕ چەند دێرێك هەڵكەندراوە، هەروەك كچەكەی دەڵێت: شێوەی دەستخەتی مەعروف جیاووك خۆیەتی. دیدار لەگەڵ جیهان مەعروف جیاووك لەڕۆژی ١١/ئەیلوولی/ ٢٠٠٨. گۆڕەكە بەچیمەنتۆ هەڵنراوە، شوێنەواری دووكەڵی ئاگر بەبنمیچەكەیەوە دیاربوو، ئەمەش دەقی نووسینە هەڵكەندراوەكەیە: "الفاتحە معروف جیاووك لێرە نێژراوەو ئەڵی ئەی كورد بەخووی چاك و زانستی و یەكیەتی كامەران ئەبی و بەكاروان ئەگەیی. لەساڵی ١٨٨٥ لە دایك بووە و لەساڵی ١٩٥٨ لەڕۆژی سێ شەممە كە ٢١ مانگی كانوونی دووەم ئەكا گیانی بەخاك سپاردووە".
(٩٨) "هەتاو"، ژ١٢١، ٣١ كانوونی دووەمی ١٩٥٨.
(٩٩) "هەتاو"، ژ ١٢٧، ٣١ی مارتی ١٩٥٨.
(١٠٠) ئیمێلی جیهان مەعروف جیاووك لەڕۆژی ٨/تشرینی یەكەمی / ٢٠٠٨.
(١٠١) ئیسماعیل شوكر ڕەسول، ڕۆڵی رامیاری و ڕۆژنامەنووسی...، ل٣٢.
(١٠٢) شجرە بیت ال جیاووك: ئیمێلی جیهان مەعروف جیاووك لە ٨/تشرینی یەكەمی/ ٢٠٠٨: مستەفا نەریمان، یانەی سەركەوتنی كوردان...، ل٦٤-٦٥: دیدار لەگەڵ جیهان مەعروف جیاووك لەڕۆژی ١١/ئەیلوولی ٢٠٠٨: دیدار لەگەڵ خالیدە ئیبراهیم چیچۆ لەڕۆژی ٥/شوباتی/٢٠٠٧: دیدار لەگەڵ نەوال عارف جیاووك، هەولێر لەڕۆژی ٢/تەمووزی/٢٠٠٦ (لەدایكبووی ١٩٤٢): دیدار لەگەڵ تەیب حەسەن حوسێن جیاووك لە ١٧/ حوزەیرانی /٢٠٠٧. زانیارییەكانی مستەفا نەریمان بەتایبەتی ساڵەكان هەڵەیان تێ كەوتووەو بەیارمەتی جیهان جیاووك ڕاست كرانەوە.
(١٠٣) سەبیحە عەزیزی دواخێزانی جیاووك، پلكی حەسەن ڕەفعەت بووە. حەسەن ڕەفعەتیش خەڵكی سلێمانییە، ماستەری لە ئەندازیاری هەبووە، چەندین پلەو پایەی لەدەوڵەتی عێراق وەرگرتووە دواهەمینیان وەزیری ئەشغال و ئیسكان بووە لەحكومەتی عەبدولكەریم قاسم ١٩٦٠. لەئەمریكا كۆچی دوایی كردووە. بڕوانە: مذكرات علي كمال عبدالرحمن، تقدیم: جمال بابان، بغداد، ٢٠٠١، ص١٥٧.
(١٠٤) مستەفا نەریمان، یانەی سەركەوتنی كوردان، ل٦٤.
(١٠٥) ه. س، ل٧٩، ٨٣.
(١٠٦) دیدار لەگەڵ فوئاد عارف، سلێمانی لە ١٠/ مارتی/٢٠٠٦: كەریم ئەحمەد، هەولێر لەڕۆژی ١١/حوزەیرانی /٢٠٠٦: د. مارف خەزنەدار،

هەولێر لەرۆژی ١٤/حوزەیرانی/٢٠٠٦.

(١٠٧) وا بۆ نموونە هەندێ لەوکارانە تۆمار دەکەین، بۆ سەلماندنی ئەو بۆچوونە:

- حمید المطبعي، موسوعة اعلام العراق في القرن العشرين، الجزء الثاني، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٩٦.
- گیوی موکریانی، بەهەشتی معروف بەگ جیاووگ، "هەتاو"، ژ١٢١، ٣١/ کانوونی دووەمی/ ١٩٥٨.
- فرج محمد بكر، في ذكرى المرحوم معروف جياووك، "التاخي"، العدد ٧٦٦، ٢٣/ حزيران/ ١٩٧١.
- هۆگر کەمال ئەحمەد، ئەفسەری بزووتنەوەی رووناکبیری کورد، "رەنگین" (گۆڤار)، بەغدا، ژ٤/ شوباتی/ ١٩٨٨.
- طارق جمباز، امين الرواندزي ومعروف جياووك ودورهما في جمعية استقلال كوردستان ١٩٢٢-١٩٢٦، "گولان العربي" (مجلة)، اربيل، العدد٦، ٢٥/ تشرين الثاني/ ١٩٩٦.
- نەژاد بەرزنجی، مەعروف جیاووک، "رامان" (گۆڤار)، هەولێر، ژ١٧، تشرینی دووەمی/ ١٩٩٧.
- کەریم شارەزا، لەکەسایەتییە ناودارەکانی هەولێر، مافپەروەرو کارگێرو نووسەرو کوردپەروەر مەعروف جیاووک ١٨٨٥-١٩٥٨، "هەولێر" (گۆڤار)، هەولێر، ژ(٢)، بەهاری ١٩٩٩.
- عمر علي شريف، احداث ومواقف في حياة معروف چياووك ١٨٨٤-١٩٥٨، "ختبات"، العدد ١٩٨٥، ٢١/تموز/٢٠٠٠.
- فؤاد جياووك، معروف جياووك، سيرة رجل قانون وسياسة، "المشرق" (جريدة)، العدد١٩، ١٩/ اب/ ٢٠٠٤.
- سوسن الزبيدي، شخصية مضيئة، معروف جياووك، رجل القانون والفكر والسياسة، "التاخي"، العدد ٤٦٤١، ٧/ كانون الاول/ ٢٠٠٥.

(١٠٨) بۆ دەقی نامەکە بڕوانە: مستەفا نەریمان، یانەی سەرکە وتنی کوردان...، ل٤١- ٤٢. جێی ئاماژەیە نامەکە بە زمانی عەرەبییە و ئەو دەقەی لای مستەفا نەریمان پارێزراوە.

(١٠٩) عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ج٣، ط٧، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٨٨، ص١٣٢.

(١١٠) م. ر. هاوار، شێخ مەحموودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، بەرگی دووەم، لەندەن، ١٩٩١، ل٧٠٧، ٨١١- ٨١٢.

(١١١) بۆ زانیاری پتر و ئاشکرا کردنی ناوی جیاووک، بڕوانە: د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد، بەرگی دووەم، ئامادەکردنی عەبدوللا زەنگەنە، دەزگای بلاوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١، ل ١٧٢-١٧٣.

(١١٢) کەریم زەند، سووری ژیان، تۆماری تەمەن، ئەرشیف/٤، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل٣٢٢.

(١١٣) مستەفا نەریمان، یانەی سەرکە وتنی کوردان...، ل٤٠- ٤١.

(١١٤) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد، ب٢، ل١٥٠. لێرەدا دەبێ ئەوە راست بکەینە وە کە ئەو قسەیە دیدارێکی د. کەمال مەزهەرە لەگەڵ (عبدالرزاق الحسني) لە ٢٩ی کانوونی د ووەمی ١٩٨٩، نەک وتاری محەمەد جەمیل رۆژبەیانی بە ناوی مێژ ووی خەباتی شێخ مەحموود، رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٢١)، ١٩٨٩، هەر وەک مستەفا نەریمان نووسیویە. بڕوانە: د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، ه. س، ل١٥٠، د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، لاپەڕەیەکی ون لە مێژ ووی خەباتی شێخ مەحموود، "رۆشنبیری نوێ "(گۆڤار)، بەغدا، ژمارە ١٢١، ئاداری ١٩٨٩، ل١٦٢- ١٨٨: مستەفا نەریمان، یانەی سەرکەوتنی کوردان... ل٥٩، ١٣٦.

(١١٥) باب المعظم: گەڕەکێکی ناوداری شاری بەغدایە.

(١١٦) دیدار لەگەڵ جیهان مەعروف جیاووک لەرۆژی ١١/ئەیلوولی/٢٠٠٨.

(١١٧) دیداری مستەفا نەریمان لەگەڵ هەرد وو برا (سۆران و سامان) جیاووک لە رۆژی ١٩ی تەمموزی ١٩٩٣، لە دەزگای رۆشنبیری کوردی لە بەغدا، لە: مستەفا نەریمان، یانەی سەرکە وتنی کوردان...، ل ٤٧، ١٣٥.

(١١٨) دیدار لەگەڵ د.کەمال فوئاد، سلێمانی، ڕۆژی ٢٦/مارتی/٢٠٠٦. دەبوا سەبیحە خانی خێزانی مەعروف جیاووک خەڵاتەکانی دابەش کردبا.
(١١٩) درەخشان جەلال، یادداشتنامە دەستخەت و چاپنەکرا وەکەی خوالێخۆشبوو شێخ قادری حەفید زادە، "سلێمانی" (گۆڤار)، سلێمانی، ژمارە (٧٩)، شوبات و ئاداری ٢٠٠٧، ل٦- ٧: کەریم زەند، گەشتی زەند، ب١،ل٢٠١.
(١٢٠) بڕوانە: دەقی نامەی شێخ مەحموود بۆ مەعروف جیاووک لە: مستەفا نەریمان، یانەی سەرکەوتنی کوردان...، ل٥٩.
(١٢١) هـ. س، ل٥٧- ٥٨.
(١٢٢) شێخ محەمەدی خاڵ کوڕی شێخ عەلی کوڕی حاجی شێخ ئەمینی خاڵە لەبنەماڵەی شێخ ئەبوبەکری موسنیفە، زانایەکی ئایینی و قازی شەرع و نووسەرێکی بەبڕشت بووە لەبوارەکانی ئایینی، زمانەوانی و کەلتووری. بڕوانە: جمال بابان، اعلام کرد العراق، ص٦٩٨- ٧٠٠.
(١٢٣) هـ. س، ل٥٣- ٥٤.
(١٢٤) مستەفا نەحاس پاشا سەرکردەیەکی میسرییە لەساڵی ١٨٧٩ لەپارێزگای غەربیە لەدایک بووە، خوێندنگای مافی لەساڵی ١٩٠٠ تەواو کردووە، پیاوێکی دیندارو پاک بووە. قازی و وەزیرو سەرۆکی ئەنجومەنی نوێنەران و سەرۆکی پارتی وەفد بووە، پێنج جارانیش بۆتە سەرۆکی وەزیران لە ٢٣ی ئابی ١٩٦٥ کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: الجمهورية العربية السورية، رئاسة الجمهورية، هيئة الموسوعة العربية، الموسوعة العربية، مج٢٠، (مادة النحاس)، (مصطفى احمد هواش)، ص٥٠٢- ٥٠٣.
(١٢٥) سەعد زەغلول (١٨٥٧ - ١٩٢٧) سەرکردەیەکی شۆڕشی ساڵی ١٩١٩ بوو بەشداری شۆڕشی عەرابی کردووەو لە ئەزهەر خوێندوویەو دواتر بڕوانامەی مافی لەپاریس وەرگرتووەو بۆتە وەزیر و ئەندامی ئەنجومەنی یاسا دانان. بڕوانە: الموسوعه العربيه، مج١٠، (ماده زغلول سعد)، (مصطفى الخطيب)، ص٣٦٥-٣٦٦.
(١٢٦) وادیارە جیاووک ئەو وشەی (میرم)ی زۆر پێخۆش بووە، بۆیە لە نامەو شیعرەکاندا بەکار هاتووە. بڕوانە: نامەکەی مەلا ئەسعەدی مەحوی، ڕەشید صدقی، شێخی خاڵ، شیعرەکەی شێخ سەلام بەبۆنەی کۆچی دوایی جیاووکەوەو.. هتد.. بڕوانە: مستەفا نەریمان، یانەی سەرکەوتنی کوردان. بەڵام هەندێکیش بەتانووتەوە وشەکەیان بەکارهێناوە، بۆ نموونە ئەوە لەشیعرێکی مەدهۆشی شاعیر هاتووە (میرم سەرۆکی یانەیە)، کە تانووتە لەمەعروف جیاووک و لە گۆڤاری گەلاوێژ بڵاوبۆتەوە. بڕوانە: د. عیزەدین مستەفا ڕەسول، بەشێک لەیاداشتەکانم، بەرگی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل١٢٩. کەچی هەر مەدهۆشی شاعیر، شیعری بۆکۆچی دوایی مەعروف جیاووک نووسیوەو لەچلەکەی خوێندراوەتەوە. بڕوانە: مستەفا نەریمان، یانەی سەرکەوتنی کوردان...، ل٨٥-٨٦.
(١٢٧) هـ. س، ل٥٤- ٥٥.
(١٢٨) محەمەد عەلی عەونی شارەزاییەکی زۆری لە مێژووی نەتەوەکەی و ژیانی کۆمەڵایەتی و جوگرافیای وڵاتەکەی هەیە، خۆی خەڵکی سێوەرکی سەر بە ئامەد (دیاربەکر)ی باکووری کوردستانە و دەرچووی ئەزهەرە و زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی و فەرەنسی و کوردی زانیوە، یەکەمین کەسە «شەرەفنامە»ی شەرەفخانی بەدلیسی (١٤٥٣-١٦٠٣ یا ١٦٠٤) بۆ زمانی عەرەبی، وەرگێڕاوە، کە لە ساڵی ١٩٥٨ بەرگی یەکەمی چاپ کرا و بەرگی دووەمیشی لە ساڵی ١٩٦٢ دەرچووە، یەکەمیان تایبەتە بە مێژووی کورد و کوردستان و دووەمیشی لە مێژووی سوڵتانەکانی عوسمانی و فەرمانڕەوایانی ئێران و ئاسیای ناوەڕاستە. بە داخە وە نا واتی چاپکردنی لەژیانی خۆی نەهاتە دی.

محەمەد عەلی عەونی «خلاصة تأريخ الكرد وكردستان من اقدم العصور التاريخية حتى الآن»، ئەحمەد ئەمین زەکی وەرگێراوە، کە لەساڵی ١٩٣٩ بەزانیاری پتر و ڕوونکردنەوە و پەراوێزەوە لەقاهیرە چاپ کرا وە، هەروەها بەشی دووەمی هەمان کتێب بە ناوی «تأريخ الدول والامارات الكردية في العهد الاسلامي» وەرگێڕاوەو لە ساڵی ١٩٤٥ لە قاهیرە چاپ کراوە، هەر وەها بەرگی

دووەمی (مشاهیر الكرد وكردستان» <-- <--كردۆتە عەرەبی و چاپی کرد ووە. ئەمە سەرباری وەرگێڕانی ئەو بەشەی تایبەتە بە میسر لە بەرگی دەیەمی کتێبی (سیاحتنامە)ی گەڕیدەی بەناوبانگی تورک ئەولیا چەلەبی و لە ساڵی ٢٠٠٣ لە قاهیرە چاپکرا وە، لەگەڵ چەندین لێکۆڵینە وەی دیکە. بڕوانە: د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، مێژ وو، کورتە باسێکی زانستی مێژووو کوردو مێژوو، بەغداد، ١٩٨٣، ل١٩١: محمد امين زكي، خلاصة تأريخ الكرد وكردستان، القسم الاول، نقله الي العربية وعلق عليه الاستاذ محمد علي عوني، تقديم: العلامة ا. د. كمال مظهر احمد، دار الشؤون الثقافية العامة، الطبعة الثانية، بغداد، ٢٠٠٥، ص١٩- ٢٠.

(١٢٩) مستەفا نەریمان، یانەی سەرکە وتنی کوردان...، ل٥٥- ٥٧. جێی ئاماژەیە لە پێشەکی شەرەفنامەی کوردی محەممەد عەلی عەونی ئەو داوایەی کردووە: "بەئاواتەوەم زاناو نووسەرە وریاو دیارەکانی ڕۆژهەڵاتیش تێ بگەن! کە زیندووکردنەوەی ئاسەواری با وباپیری هاونیشتمانە کوردەکانم بەهرەی زۆری هەیە!. بەتایبەتی رو ئەکەمە ئەندامانی کۆمەڵی (یانەی سەرکەوتن!) لەبەغدا.. کەشنگلێک لەخوێدەن و بۆ پاراستنی ئاسەواری گەلی کوردی چارەڕەش کۆششێک بکەن!!" پاشانیش لەبارەی وەرگێڕانی بۆ عەرەبی ئامادەیی دەربڕیوە کە هاوکاری بکات و نووسیویە " خۆ ئەگەر ئەندامانی بەڕێزی (یانەی سەرکەوتن!) خۆیان بیانەوێ بیکەن بەعەرەبی؟ ئێمە کە لەپێداچوونەوەو لەبەریەک رانان و دۆزینەوەی ناوی راستی جوغرافی و تاریخیدا ئەزموونمان هەیەو لەکڵ دەرهاتوین ئامادەین بەپێی توانا هەموو جۆرە کۆمەکێکی زانستی و ئەدەبی بەو برایانە بکەین..". بڕوانە: شرفخانی بدلیسی، شرفنامە، هەژار کردوویە بەکوردی، لە بڵاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، چاپخانەی نەعمان، نەجەف، ١٩٧٣، ل حەفتاو هەشت و حەفتاو نۆ.

(١٣٠) دیوانی ئەسیری، ئامادەکردن و پێشکەشکردنی د. کوردستان موکریانی، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٦، ل٢٩.

(١٣١) بۆ تەواوی شیعرەکە بڕوانە: هـ.س، ل١٩٩.

(١٣٢) دیوانی موفتی پێنجوێنی، مەلا عەبدوڵلای توتنچی، لێکۆڵینەوەو ئامادەکردنی ئومێد ئاشناو عەبدولکەریم موفتی، چاپخانەی الشركة العراقية للطباعة والنشر، بغدا، ١٩٩٠، ل ١٢٠.

(١٣٣) بۆ تەواوی شیعرەکە بڕوانە: "ژین"، ژ ٧٩٠، ١٤ی حوزیرانی ١٩٤٥.

(١٣٤) جێی ئاماژەیە لە(زاری کرمانجی) ناوی (حوزنی) لەلای راستی شیعرەکە بەدەست نووسراوەو وشەی (ئایندەی) هەڵەی چاپەو (ئابیدەی) تەواوە، بڕوانە: "زاری کرمانجی" (گۆڤار)، ڕەواندز، ژ(٥) ساڵی دووەم، ١١ی/ تشرینی دووەم/ ١٩٢٨، ل ٢٠. ئەم شیعرە بەنەختێ جیاوازی لەدەستنووسەکەی مستەفا نەریمان ل٣٩- ٤٠، بەناوی مامەند کەرکووکییەو نووسیویە لە ٢٠ی تەمووزی ١٩٢٨ لەسلێمانییەوە هاتووە. لەپەیوەندییەکی تەلەفۆنی لەگەڵ مامۆستا کەریم شارەزا، لەرۆژی ٣٠ی تەمووزی ٢٠٠٧، بەلای ئەوەوە ئەو (مامەند کەرکووکی)، (ڕەمزی ڕەحیم جاوفرۆش)ە و شاعیرێکی نوێخوازو کەم بەرهەمە، مستەفا نەریمانیش ناوەکەی دووپات کردۆتەوە. بڕوانە: مستەفا نەریمان، یانەی سەرکەوتنی کوردان...، ل١٣٣ پەراوێز.

(١٣٥) دیدار لەگەڵ جیهان مەعروف جیاووک لەرۆژی ١١/ئەیلوولی/٢٠٠٨.

(١٣٦) نجم الدين ملا، شین و شەپۆر، "ژین" (ڕۆژنامە)، سلێمانی، ژ ١٣٧٩، ٣٠/ کانوونی دووەمی/١٩٥٨.

(١٣٧) گیوی موکریانی، چلەی بەهەشتی مەعروف جیاووک، "هەتاو"، ژ١٢٤، ٢٠ی/ شوباتی/ ١٩٥٨، ل٤.

(١٣٨) "ژین"، ژ ١٣٨٢، ٢٠ی/ شوباتی/ ١٩٥٨.

(١٣٩) ئەو سەردەمە ڕەشید عارف باوەڕپێکراوی یانەی سەرکەوتن بووە.

(١٤٠) محەمدی خاڵ، ناڵەی دەروون، جزمی دووهەم، چ١، چاپخانەی ارشاد، بغداد، ١٩٥٨، ل١٩-٢٠: مستەفا نەریمان، یانەی سەرکەوتنی کوردان...، ل٦٩-٧٢، دیدار لەگەڵ خالیدە ئیبراهیم چیچۆ لەرۆژی ٥/شوباتی /٢٠٠٧: دیدار لەگەڵ نەوال

عـــــارف جـــــیـــــاووک، هەولێـــــر لەرۆژی ٢/تەمـــووزی/٢٠٠٦، دیدار لەگەڵ تەیب حەسـەن حوسێن جیاووک لەرۆژی ١٧/ حوزەیرانی/ ٢٠٠٧.

(١٤١) مستەفا نەریمان، یانەی سەرکەوتنی کوردان...، ل٧٢.

(١٤٢) بۆ تەواوی شیـعـرەکـە بڕوانە: "ژین"، ژ ١٣٨٧، ٢٧ی ئاداری ١٩٥٨: دیوانی سەلام، ئامـادەکـردن و پێداچوونەوەو پێشەکی بۆنووسینی ئومێد کاکە ڕەش، چ٢، چاپخانەی الحوداث، بەغدا، ١٩٩١، ل٢١٢-٢١٣.

(١٤٣) مستەفا نەریمان، یانەی سەرکەوتنی کوردان...، ل٧٤-٧٧.

(١٤٤) بۆ دەقی هەردوو وتارەکـە: بڕوانە: مـسـتـەفـا نەریمان، یانەی سەرکەوتنی کوردان...، ل٧٤-٧٩. (تەها بابان وتارەکانی خوێندۆتەوە).

(١٤٥) مستەفا نەریمان، یانەی سەرکەوتنی کوردان...، ل٨١.

(١٤٦) بۆ تەواوی وتارەکە بڕوانە: هـ. س، ل٨٢.

(١٤٧) هـ. س، ل٨٣.

(١٤٨) هـ.س، ل٨٥-٨٦.

(١٤٩) هـ. س، ل٨٦-٨٧.

(١٥٠) هـ. س، ص٨٧.

(١٥١) بۆ درێژەی بڕوانە: بیـرەوەری خـوالێـخـۆشـبـوو مـامـۆسـتـای مـەزن مـعـروف بەگ جیـاووک، "هیـوا" (گـۆڤـار)، بەغـدا، ژ(٩) سـاڵی (١) خـاکـەلێـوە / مارت/١٩٥٨، ل٨٨.

(١٥٢) وێڕای کۆشش بۆ ناسینی ئەم دوو شاعیـرە، بەڵام هیچ زانیارییەکمان دەست نەکەوت.

(١٥٣) شجره بيت آل جياووك.

(١٥٤) د. ئیـسـمـاعـیـل شـوکـر، ڕۆڵی ڕامـیـاری و ڕۆژنامەنووسی...، ل٣٢.

(١٥٥) دیدار لەگەڵ جیـهـان مەعـروف جیـاووک لەرۆژی ١١/ئەیلوولی / ٢٠٠٨.

(١٥٦) جیاووك، ديمقراطي خاصه ي طبيعي انسانيته، "ژین"، ژ٧٨٨، ٣١/مایس/١٩٤٥.

(١٥٧) معروف جياووك، مأساة بارزان المظلومة، ط٢، ص٧٥.

(١٥٨) مـعـروف جـیـاووک، پەرگی (املای) کـوردی، بەغدا، ١٩٣٠، ل٢.

(١٥٩) جـيـاووك الـكردي، القـضـيـة الكردية، ط٢، ص١٦- ١٧.

(١٦٠) بیرۆکەی یەکێتی موسلمانان (الجامعة الاسلامية) لەلایەن چاکەخوازی ئیسلام سەید جەمالەدینی ئەسەد ئەبادی ئەفغانیـەوە (١٨٣٩-١٨٩٧) سەری هەڵدا کە داوای یەکخستنی هەموو حکومەتەکانی ئیسلامی دەکرد. بۆ زانیـاری پتر بڕوانە: محـمد خاڵ، ناڵەی دەروون، جزمی دووهەم، ل١٤٧-٢١٩

(١٦١) جـيـاووك الـكردي، القـضـيـة الكردية، ط٢، ص٢٦.

(١٦٢) م. ن، ص٧٥.

(١٦٣) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: م.ن، ص ٦٧- ٦٩.

(١٦٤) معروف جیاووک، نیابتی...، ل١٨٤- ١٨٦.

(١٦٥) م.ن، ص ١٩١.

(١٦٦) مـعـروف جـیـاووک، هزار بی ژو پەند، بەغـدا، ١٩٣٨، ل٨٦- ٨٧.

(١٦٧) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: باربو، ل٢٢- ٢٥.

(١٦٨) باربو، ل٨٦.

(١٦٩) معروف جياووك، اقرأوا الحقائق الثابتة...، ص٥.

(١٧٠) م.ن، ص ٢١.

(١٧١) م.ن، ص ٦٢.

(١٧٢) معروف جياووك، مأساه بارزان المظلومه، ص٥.

(١٧٣) م.ن، ص ٩.

(١٧٤) مـعـروف جـيـاووك، مـأساة بارزان المظلومـة، ص ١٣- ١٢.

(١٧٥) م.ن، ص ٣٦- ٤١.

(١٧٦) یادی کـۆچی امين زكي ل١٨: یادی پیـرەمێـرد، چاپخانەی معارف، بەغدا، ١٩٥١، ل٥٩.

(١٧٧) مـعـروف جـيـاووك، مـأسـاة بارزان المظلومـة، ص١٤٢.

(١٧٨) مستەفا نەریمان، یانەی سەرکەوتنی کوردان...، ل٦٩.

(١٧٩) دیدار لەگەڵ خـالیـدە ئیـبـراهیم چیـچـۆ لە ڕۆژی ٥/شوباتی/٢٠٠٧. ئەمەش ئەو ڕایە ڕەت دەکاتەوە

کە پێی وایە مەعروف جیاووک، کەسێکی عەلمانی بووە. دیدار لەگەڵ کەریم ئەحمەد، لەرۆژی١١/حوزەیرانی/ ٢٠٠٦.

(١٨٠) دیدار لەگەڵ جیهان مەعروف جیاووک لەرۆژی ١١/ ئەیلوولی/ ٢٠٠٨: دیدار لەگەڵ خالیدە ئیبراهیم چیچۆ لەرۆژی ٥/ شوباتی/٢٠٠٧: دیدار لەگەڵ تەیب مەلا حەسەن لەرۆژی ١٧/ حوزەیرانی/ ٢٠٠٧..

(١٨١) دیدار لەگەڵ جیهان مەعروف جیاووک لەرۆژی ١١/ ئەیلوولی/ ٢٠٠٨

(١٨٢) عبدالفتاح علي البوتاني، الحياة الحزبية في الموصل ١٩٢٦- ١٩٥٨، مطبعة التربية، أربيل، ٢٠٠٣، ص٣٠٥- ٣٠٦.

(١٨٣) فاکسی دوکتۆر جەمال نەبەز لە ١٤ی ئابی ٢٠٠٦. سەبارەت بە "ئاشوورستان"، کە جەمال نەبەز ئاماژەی پێکردووە، ئەو رۆژگارە هەوڵی ئینگلیز لەئارادا بوو بۆ ئەوەی لەباشووری کوردستان، نیشتمانی نەتەوەیی بۆ ئاسووری پێک بێنن، کە راسپاردەکانی لیژنەی لێکۆڵینەوەی نێودەوڵەتی لەچارەنووسی ولایەتی موسلیش جەختی لەسەر ئەوە کردبۆوە، مەبەست پێکهێنانی حوکمی زاتی بوو بۆیان لەپارێزگای موسڵ و وەرگرتنەوەی ناوچەکانی خۆیان لە هەکاری. بڕوانە: عزيز الحاج، القضية الكردية في العشرينات، ط٢، مطبعة الانتصار، بغداد، ١٩٨٥، ص١٢٠، ٢١٩.

(١٨٤) جەمال نەبەز، گۆڤاری نیشتمان تەمووزی ١٩٤٣- مایس ١٩٤٤، بنکەی چاپەمەنی ئازاد، سوید، ١٩٨٥، ل٦٨ پەرا ویز.

(١٨٥) دیدار لەگەڵ د. مارف خەزنەدار، لە ١٤ی حوزەیرانی ٢٠٠٦ (لەساڵی ١٩٣٠ لەهەولێر لەدایک بووە).

(١٨٦) دیدار لەگەڵ عەزیز محەمەد، هەولێر لە رۆژی ٢٥ی مارتی ٢٠٠٦. (لەساڵی ١٩٢٤ لەهەولێر لەدایک بووە لەنێوان (١٩٦٤-١٩٩٣) سکرتێری لیژنەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی عێراق بووە.

(١٨٧) دیدار لەگەڵ کەریم شارەزا، هەولێر لەرۆژی٢٦ی شوباتی ٢٠٠٦.

(١٨٨) پۆلا، مللەتی کورد پێ خۆشحاڵە لە موقفی حزبی شیوعی عێراق بەرامبەر مەسەلەی کورد، "ازادی"، ژ ٥، تشرين الثاني ١٩٤٥، لە "رۆژنامەنووس" (گۆڤار)، هەولێر، ژ ٦، ٥، ٢٠٠٥، ل٩) وەرگیرا وە.

(١٨٩) هـ. س، ل١٢- ١٣.

(١٩٠) هـ.س.

(١٩١) "ژین"، ژ ٨٠٤، ٢٧ی ئەیلوولی ١٩٤٥.

(١٩٢) "ژین"، ژ ٨١٤، ٢٠ ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥.

(١٩٣) اتحاد الشعب: رۆژنامەیەکی سیاسی رۆژانەی زمانحاڵی حزبی شیوعی عێراق بووە، خاوەنی ئیمتیازی عەبدولقادر بوستانی بووە. ژمارەی یەکەمی لە ١٠/کانوونی دووەمی/ ١٩٥٩ لەبەغدا دەرچووە. لە ٢٧/ ئابی/ ١٩٦١ وەستاوە. بڕوانە: زاهدە ابراهیم، م.س، ص١٦ .

(١٩٤) دیدار لەگەڵ جیهان مەعروف جیاووک لە رۆژی ١١/ ئەیلوولی/٢٠٠٨.

(١٩٥) وردی، توتنیش بۆ کوردان بەڵایە!، "هاواری نیشتمان" (رۆژنامە)، مەهاباد، ژ١، ساڵی یەک، ٩ مە ١٩٤٦، ل٢.

(١٩٦) جیاووك الكردي، القضية الكردية، الطبعة الثانية، ص١٠١- ١٠٢.

(١٩٧) دیدار لەگەڵ فوئاد عارف، لە رۆژی ١٠ی مارتی ٢٠٠٦.

(١٩٨) دیدار لەگەڵ موکەرەم تاڵەبانی، سلێمانی لە رۆژی ٩ی مارتی ٢٠٠٦.

(١٩٩) دیدار لەگەڵ کەریم ئەحمەد لە رۆژی ١١ی حوزەیرانی ٢٠٠٦.

(٢٠٠) کەریم زەند، گەشتی زەند، بەرگی یەکەم، دەزگای سپیریز یا چاپ و وەشانێ، دهۆک، ٢٠٠٤، ل٢٠١.

(٢٠١) د. جەمال نەبەز، گۆڤاری نیشتمان، ل٦٧ پەراویز.

(٢٠٢) گلادستۆن (ولیم ئیوارت) (١٨٠٩- ١٨٩٨): سیاسەتمەدارێکی بەریتانیاییە، لە لیڤەرپول لەدایک بووە، چۆتە ریزی پارتی پارێزگاران و بۆتە نوێنەرو وەزیرو چوار جار بۆتە سەرۆکی وەزیران (١٨٦٨ و

کە پێی وایە مەعروف جیاووک، کەسێکی عەلمانی بووە. دیدار لەگەڵ کەریم ئەحمەد، لەرۆژی١١/حوزەیرانی/ ٢٠٠٦.

(١٨٠) دیدار لەگەڵ جیهان مەعروف جیاووک لەرۆژی ١١/ ئەیلوولی/ ٢٠٠٨: دیدار لەگەڵ خالیدە ئیبراهیم چیچۆ لەرۆژی ٥/ شوباتی/٢٠٠٧: دیدار لەگەڵ تەیب مەلا حەسەن لەرۆژی ١٧/ حوزەیرانی/ ٢٠٠٧..

(١٨١) دیدار لەگەڵ جیهان مەعروف جیاووک لەرۆژی ١١/ ئەیلوولی/ ٢٠٠٨

(١٨٢) عبدالفتاح علي البوتاني، الحياة الحزبية في الموصل ١٩٢٦- ١٩٥٨، مطبعة التربية، أربيل، ٢٠٠٣، ص٣٠٥- ٣٠٦.

(١٨٣) فاکسی دوکتۆر جەمال نەبەز لە ١٤ی ئابی ٢٠٠٦. سەبارەت بە "ئاشوورستان"، کە جەمال نەبەز ئاماژەی پێکردووە، ئەو رۆژگارە هەوڵی ئینگلیز لەئارادا بوو بۆ ئەوەی لەباشووری کوردستان، نیشتمانی نەتەوەیی بۆ ئاسووری پێک بێنن، کە راسپاردەکانی لیژنەی لێکۆڵینەوەی نێودەوڵەتی لەچارەنووسی ولایەتی موسلیش جەختی لەسەر ئەوە کردبۆوە، مەبەست پێکهێنانی حوکمی زاتی بوو بۆیان لەپارێزگای موسڵ و وەرگرتنەوەی ناوچەکانی خۆیان لە هەکاری. بڕوانە: عزيز الحاج، القضية الكردية في العشرينات، ط٢، مطبعة الانتصار، بغداد، ١٩٨٥، ص١٢٠، ٢١٩.

(١٨٤) جەمال نەبەز، گۆڤاری نیشتمان تەمووزی ١٩٤٣- مایس ١٩٤٤، بنکەی چاپەمەنی ئازاد، سوید، ١٩٨٥، ل٦٨ پەرا ویز.

(١٨٥) دیدار لەگەڵ د. مارف خەزنەدار، لە ١٤ی حوزەیرانی ٢٠٠٦ (لەساڵی ١٩٣٠ لەهەولێر لەدایک بووە).

(١٨٦) دیدار لەگەڵ عەزیز محەمەد، هەولێر لە رۆژی ٢٥ی مارتی ٢٠٠٦. (لەساڵی ١٩٢٤ لەهەولێر لەدایک بووە لەنێوان (١٩٦٤-١٩٩٣) سکرتێری لیژنەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی عێراق بووە.

(١٨٧) دیدار لەگەڵ کەریم شارەزا، هەولێر لەرۆژی٢٦ی شوباتی ٢٠٠٦.

(١٨٨) پۆلا، میللەتی کورد پێ خۆشحاڵە لە موقفی حزبی شیوعی عێراق بەرامبەر مەسەلەی کورد، "ازادی"، ژ ٥، تشرين الثاني ١٩٤٥، لە "رۆژنامەنووس" (گۆڤار)، هەولێر، ژ ٦، ٢٠٠٥، ل٩) وەرگیرا وە.

(١٨٩) هـ. س، ل١٢- ١٣.

(١٩٠) هـ.س.

(١٩١) "ژین"، ژ ٨٠٤، ٢٧ی ئەیلوولی ١٩٤٥.

(١٩٢) "ژین"، ژ ٨١٤، ٢٠ ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥.

(١٩٣) اتحاد الشعب: رۆژنامەیەکی سیاسی رۆژانەی زمانحاڵی حزبی شیوعی عێراق بووە، خاوەنی ئیمتیازی عەبدولقادر بوستانی بووە. ژمارەی یەکەمی لە١٠/کانوونی دووەمی/ ١٩٥٩ لەبەغدا دەرچووە. لە ٢٧/ ئابی/ ١٩٦١ وەستاوە. بڕوانە: زاهدە ابراهيم، م.س، ص١٦.

(١٩٤) دیدار لەگەڵ جیهان مەعروف جیاووک لە رۆژی ١١/ ئەیلوولی/٢٠٠٨.

(١٩٥) وردی، توتنیش بۆ کوردان بەڵایە!، "هاواری نیشتمان" (رۆژنامە)، مەهاباد، ژ١، ساڵی یەک، ٩ مە ١٩٤٦، ل٢.

(١٩٦) جياووك الكردي، القضية الكردية، الطبعة الثانية، ص١٠١- ١٠٢.

(١٩٧) دیدار لەگەڵ فوئاد عارف، لە رۆژی ١٠ی مارتی ٢٠٠٦.

(١٩٨) دیدار لەگەڵ موکەرەم تاڵەبانی، سلێمانی لە رۆژی ٩ی مارتی ٢٠٠٦.

(١٩٩) دیدار لەگەڵ کەریم ئەحمەد لە رۆژی ١١ی حوزەیرانی ٢٠٠٦.

(٢٠٠) کەریم زەند، گەشتی زەند، بەرگی یەکەم، دەزگای سپیریز یا چاپ و وەشانێ، دهۆک، ٢٠٠٤، ل٢٠١.

(٢٠١) د. جەمال نەبەز، گۆڤاری نیشتمان، ل٦٧ پەرا ویز.

(٢٠٢) گلادستۆن (ولیم ئیوارت) (١٨٠٩- ١٨٩٨): سیاسەتمەدارێکی بەریتانیاییە، لە لیڤەرپول لەدایک بووە، چۆتە ریزی پارتی پارێزگاران و بۆتە نوێنەرو وەزیرو چوار جار بۆتە سەرۆکی وەزیران (١٨٦٨ و

١٨٩٤). بڕوانە: الموسوعة العربية مج١٣ (مادة غلادستون)، (محمد مصطفى الشيخ)، ص٨٩٩-٩٠٠. ئەگەر چی ئەمە ها وسەردەمی روودا وەکە نییە، بەڵام رەنگە مەبەست ئیمپریالیزمی ئینگلیز بێت.

(٢٠٣) رساله معروف جياووک الى البيكباش جمال عبدالناصر. بڕوانە: دەقی نامەکە لە پاشکۆ، کە مێژووی بەسەرەوە نییە. (دەقەکەی لای جیهان مەعروف جیاووک پارێزراوە).

(٢٠٤) د. محمد علي القوزي، دراسات في تاريخ العرب المعاصر، دار النهضة العربية للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٩٩، ص٢٥٦.

(٢٠٥) رساله جمال عبدالناصر رئيس مجلس الوزراء الى معروف جياووک. بڕوانە: دەقی نووسراوەکە لەپاشکۆ. ئەمەش مێژووی بەسەرەوە نییە. (دەقی ئەسڵی لای جیهان مەعروف جیاووک پارێزراوە). هەر لەو بارەیەوە مستەفا نەریمانیش ئاماژەی بەو رووداوە کردووە، بەڵام زانیارییەکانی هەڵەی زەقیان تێدایە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مستەفا نەریمان، یانەی سەرکەوتنی کوردان...، ل٦٠.

(٢٠٦) بۆ زانیاری پتر لە بارەی را وبۆچوونی مەعروف جیاووک سەبارەت بەسیاسەتی ئەو رۆژگارە و هەڵوێست و بیر و بۆچوونەکانی بڕوانە: معروف جياووک، مأساة بارزان المظلومة، ص٤٣- ٥٠.

(٢٠٧) کاپتن مایپوم کوپ **Captain Cpopa** ئەفسەرێکی دەریاوانی ئینگلیز بووە. بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقيه، ج٣، ط٧، ص١٣٣.

(٢٠٨) لای عەبد ولرەزاق ئەلحەسەنی ناوی (لیژنەی رزگارکردنی کەمینە عیراقییە ناموسڵمانەکان)ە و ئەمانە ئەندامی لیژنەکە بوون: د. ولیەم جۆسی ئیمهات، کاپتن جۆرج کرسی، ئەمیرال هـ. سیمون هول، هیز و دبلیو لین، سایس. ویگرام، مارجلیۆس، مستەر هولاندر، بە سەرۆکایەتی هورمز رەسام بوو. بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، م.ن، ص١٣٣ هـ.

(٢٠٩) هورمز رەسام لە بنەماڵەیەکی ناسراوی مەسیحییەکانی موسڵە، ماوەیەکی درێژ لە کاری پشکنینی شوێنە وارداو لە نەینە وا لەگەڵ ئینگلیزەکان کاری کردووە. بەڵام ئەوەیان هورمز رەسامی نەوەیەتی کە هەمان ناوی هەبووە، ئەفسەر بووە لە سوپای ئینگلیز و ساڵی ١٩٣٠ هاتۆتە عێراق بە و ناوەی لە نەستووریيەکانی موسڵە. بڕوانە: ستيفن همسلي لونكريک، ج١، ص٣٢٤.

(٢١٠) صدى العهد: رۆژنامەیەکی سیاسی ئەدەبی زانستی رۆژانە بووە، خاوەن و بەڕێوەبەری بەرپرسی عەبدولرەزاق ئەلحەسان بووەو لە ١٧ی ئابی ١٩٣٠ لەبەغدا دەرچووەو دواتر وەستێنراوەو رۆژنامەی (الطريق) لەشوێنی دەرچووە. بڕوانە: زاهدة ابراهيم، دليل الجرائد و المجلات العراقية ١٨٦٩-١٩٧٨، ط٢، الكويت، ١٩٨٢، ص١٥٧.

(٢١١) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: معروف جياووك، مأساة بارزان المظلومة، ص١١٤- ١٢٧، ٢١١- ٢١٢.

(٢١٢) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقيه، ج٣، ط٧، ص١٣٣- ١٣٧. محەمەد رەسول هاوار بەئاماژە کردن بەمەحموود دورە، قسەکانی جیاووکی پێ "زۆر جێی گومانە" وتەو قسە گێرانەوەکانی مەعروف جیاووکی بە خۆ نزیککردنەوە لەکاربەدەستان داوەتە قەڵەم. بڕوانە: م. ر. هاوار، س. پ، ل٧١٥. بەڵام ئەوەی ئێمە لێی ئاگادار بین جیاووک ئەوەندە پابەندی پلەو پایە نەبووە، چونکە لەشوێنی دیکە ئەوەمان روون کردۆتەوە. سەبارەت بە(مستەر کوپ) یش وەک لەسەرەوە ئاماژەی پێکرا، هەر جیاووک نەبووە، کە خۆی لەناو جەرگەی رووداوەکاندا بووە، بەڵکو ئەلحەسەنیش ئاماژەی پێکردووەو پاشان لەوکاتەی ئەو زانیارییانەی گێڕاوەتەوەو نووسیویە پیر بووە. بۆ نموونە: (ماساة بارزان المظلومة) لە١٩٥٤ چاپ کراوە و چاپی یەکەمی (تاريخ الوزارات العراقية، ج٣) لە ساڵی ١٩٥٢ دەرچووە.

# ئەحمەد ناجی
# ١٨٩٦-١٩٥٨

ئەحمەد حاجی سۆفی بەقالی، ناسراو بە (ئەحمەد ناجی)، لە ساڵی ١٨٩٦دا لە شاری هەولێری دێرین هاتۆتە دنیاوە، لە باوەشی خێزانێکی دیار و لە سایەی قەڵا و منارەی مێژوویی ئەو شارە کۆنەدا پەروەردە بووە، لە تەمەنی ٧ ساڵیدا خراوەتە بەر خوێندنی ئایینی، تاکو بنچینەیەکی باش لە خوێندنی مەلایەتی فێر بووە. ئینجا، کە تەمەنی بووەتە ١٨ ساڵی، بۆتە خوێندەوارێکی باش.

حاجی سۆفی باوکی بەقاڵێکی حاڵ ناوەنجی بووە لە بازاڕی هەولێردا، ناردوویەتییە شاری مووسڵ، کە ئەوسا مەڵبەندی ویلایەتی مووسڵ بووە لە سەردەمی (سولەیمان نەزیفی) دیاربەکریی والی، لە خانەی مامۆستایانی عوسمانی وەرگیراوە. یەکێک لە مامۆستاکانی (مەولوود موخلیس)ی تکریتی بووە، کە لە



دوایی لە سەردەمی عێراقدا زۆرجار دەکرا بەئەندامی (مەجلیسی ئەعیان). لە قوتابییە کوردەکانی هەولێر سەید حەسەن سەید ئەمینی لەگەڵدا دەبێ، کە خوێندن تەواو دەکەن، داوایان لێ دەکەن بەشداریی لە دەورەیەکی عەسکەریدا بکەن تاکو ببن بەئەفسەر. سەید حەسەن ئەفەندی دەچێتە دەورەکە و دەبێتە ئەفسەر لە سوپای عوسمانی، بەڵام باوک و

کەسوکاری مامۆستا ئەحمەد ناجی، چونکە سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانی بووە، قایل نابن بچێتە ئەو دەورەیە. کە دەردەچێ لە ڕۆژی ١٩١٩/٢/١دا دەکرێ بەمامۆستای قوتابخانە سەرەتاییە تازە دامەزراوەکەی شاری زاخۆ و لە هەمان کاتیشدا بەڕێوەبردنی قوتابخانەکەیشی لە ئەستۆدا دەبێ.

مامۆستا ئەحمەد ناجی لەو شارەدا دۆستایەتیی لەگەڵ سەید عەلی حیجازی پەیدا دەکات. لە دوای رووخانی دەوڵەتی عوسمانی و سەرەتای حوکمی عێراق ئەویش لە زاخۆ بەناونیشانی مەئمووری مەخزەن دادەمەزرێ. دوای چەند ساڵێک خزمەتکردنی نەوەی نوێی کورد لەو شارەی کوردستان، مامۆستا ئەحمەد ناجی دەگوێزرێتەوە بۆ شاری هەولێر و لەو شارەدا- ئەوسا بینایەی

قوتابخانەی هەولێر لە نێوان مزگەوتی خانەقا و چێشتخانەی (تاجریان)ی ئێستا بووە- لەو قوتابخانەیە دەکرێتە بەڕێوەبەر و دوو مامۆستای کۆن و لێهاتووی لەگەڵدا دەبێ:

١- مەلا سەعید ئەفەندی.
٢- مەلا عەبدولکەریم ئەفەندی.

مامۆستا ئەحمەد ناجی یەک دوو ساڵان لەو قوتابخانەیەدا بەڕێوەبەر بووە. بەڵام لە دواییدا ژمارەی قوتابییەکانی زۆر دەبێ و لەو بینایە کۆن و بچووکەدا جێیان نابێتەوە، بۆیە حکومەتی عێراق لە سەردەمی مەلیک فەیسەڵی یەکەم، کە چەند ساڵێک بوو کرابووە مەلیکی عێراق هەندێک پارە تەرخان دەکات بۆ دروستکردنی بینایەکی باش بۆ قوتابخانەکە و مامۆستا ئەحمەد ناجی دەکرێ بەسەرپەرشتیی دروستکردنی. کاتێک پارەی تەرخانکراو دەبڕێ، هەڵمەتێکی پیتاک کۆکردنەوەی بۆ دەکات و بینایەکە بەچاکی تەواو دەکات و قوتابییەکان دەگوێزرێنەوە ناوی، چونکە سەرپەرشتیی دروستکردنی کردووە، هەر خۆی دەکەن بە بەڕێوەبەری قوتابخانەکە و ئەو بینایەش هەروا ماوە و کەوتووەتە تەنیشت (بانقی رەشید) و قوتابخانەی (خەلەکان) دەوامی لێ دەکات.

مامۆستا ئەحمەد ناجی لە ماوەی فرمانی مامۆستایییدا هەر بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەرەتایی یەکەمی هەولێر نەبووە. بەڵکو لەم قوتابخانانەی خوارەوەش بەڕێوەبەری سەرکەوتوو و لێهاتوو بووە:

١- قوتابخانەی سەرەتایی دووەمی هەولێر.
٢- قوتابخانەی سەرەتایی سێیەمی هەولێر.
٣- قوتابخانەی سەرەتایی جوولەکەکان لە گەڕەکی تەعجیل. کە قوتابی جوولەکە و موسڵمان لەو قوتابخانەیە دەیانخوێند.

مامۆستا ئەحمەد ناجی لە ماوەی خزمەتی لە بواری پەروەردە و فێرکردندا تەنیا ٣ ساڵ لە شەقلاوە بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەرەتایی بووە، دەنا بەزۆری هەر لە هەولێر ئەرکی بەڕێوەبردنی قوتابخانەی لە ئەستۆ بووە و گەلێک قوتابیی زیرەک و لێهاتوو لەسەر دەستی پێ گەیشتوون، لە دواییدا دەورێکی تەواویان بووە لە بواری زانست و سیاسەت و خزمەتی میللەتدا. لەوانە ئەم زاتانە بوون: (ئیحسان شێرزاد، عەونی یوسف، دوکتۆر هاشم دوغرەمەچی، مستەفا عوزێری، دوکتۆر عوسمان ئەحمەد عوزێری، دوکتۆر قەرەنی دۆغرەمەچی، زەید ئەحمەد عوسمان، عەقید کافی محەمەد نەبەوی) و گەلێکی دیکەش.

مامۆستا ئەحمەد ناجی دوای ٣٢ ساڵ خزمەتی پەروەردەکردنی نەوەی نوێی کورد لە ساڵی ١٩٥٢دا، خانەنشین کراوە و لە رۆژی ١٨ی تەمووزی ١٩٥٨دا و لە تەمەنی ٦٢ ساڵیدا لە هەولێر کۆچی دوایی کردووە.

ئەو زاتە زانایە زمانەکانی کوردی و تورکی عوسمانی و عەرەبی و فارسی بەخوێندنەوە و نووسین و ئاخاوتن و ئەدەبیاتەوە بەباشی دەزانی و دەیتوانی دەرسیان پێ بڵێتەوە و لە ژیانی تایبەتی خۆیدا زۆر ئارەزووی لە گەشتوگوزار بوون، هەموو پارێزگاکانی عێراق گەڕابوو، گەشتێکی دوورودرێژیشی بۆ ئێران کرد و ماوەیەک لە تاران و زۆزانی شەمیرانەکانیدا مایەوە تاکو مرد یادی ئەو گەشتە خۆشەی بۆ برادەرانی دەگێڕایەوە. جگە لە گەشتوگوزاریش ئەو زاتە زۆر حەزی بەخوێندنەوەی سەرچاوەی مێژوویی دەکرد، بەتایبەتی مێژووی کورد و کوردستان و مێژووی شۆڕشی فەرەنسا و مێژووی یەکێتیی ئەڵمانیا لە سەردەمی بیسمارکدا.

**کەریم شارەزا**

# محەمەدئەمین میرخان مێرگەسۆری
# ١٩١٩-١٩٦٢

خەباتگێڕی کورد محەمەد ئەمین میرخان، لە ساڵی ١٩١٩دا لە شارۆچکەی مێرگەسۆری سەر بەپارێزگای هەولێر لەدایک بووە و لە خێزانێکی کوردپەروەر پەروەردە، بووە. لە منداڵییەوە مێشکی بەبیروباوەڕی نەتەوایەتیی کورد لە پێناوی ئازادی و سەرفیرازی کوردستان ئاو دراوە و لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا پەیوەندیی بەبزووتنەوەی خەلیل خۆشەوی شۆڕشگێڕەوە کردووە، کاتێکیش بارزانی مستەفا لە ساڵی ١٩٤٣دا لە سلێمانی، لە ژیانی دەستبەسەری دەرباز بوو و گەیشتەوە بارزان و شۆڕشێکی بەرپا کرد، محەمەد ئەمین میرخان چووە پاڵ ئەو بزووتنەوە نەتەوەییەی کوردو بووە یەکێک لە بەرپرسانی پەلەکانی پێشمەرگەکانی ئەو شۆڕشە و



بەشدارییەکی کاریگەری لە شەڕەکاندا نواند... هەروەها بەشداریی لە هەڵمەتە ناودارەکەی پێشمەرگەی کورد بۆ سەر بارەگای لیوای یەکی سوپای حکومەتی عێراق کردووە و کاتێکیش لەبەر ناهاوکوفکی لە نێوانی هێزی پێشمەرگەی کورد و هێزەکانی سوپای حکومەتی عێراق، بارزانی

مستەفا بڕیاری دا شەڕ بووەستێنێ و بەهەموو هێزەکانییەوە بچێتە پاڵ بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد رۆژهەڵاتی کوردستان، لە ١١/١٠/١٩٤٥دا ئاودیو بوو و بەرەو مەهاباد بەڕێ کەوت، هەڤاڵ محەمەد ئەمین میرخانی شۆڕشگێڕ یەکێک بوو لەو فیداکارە جەنگاوەرانەی کورد و لەگەڵ بارزانیدا گەیشتە مەهاباد، دوای دامەزراندنی کۆماری دیموکراتی کوردستان لە ٢٢/١/١٩٤٦دا بەسەرۆکایەتیی پێشەوا قازی محەمەد، ئەم جەنگاوەرە فیداکارەی کورد شان بەشانی جەنگاوەرەکانی دیکەی سەر بەهێزی بارزان بەرگریی لە کیانی ئەو کۆمارە دیموکراتییە ساوایەی کورد کرد و لەسەر ئەو قارەمانییەتییەی کە پێشمەرگە و ئەفسەرە کوردەکانی کوردستانی

عێراق کە محەمەدئەمین میرخان یەکێک بوو لەوانە و لە شەڕی (قاراوا) نواندیان و ماوەیان نەدا هێزەکانی شاهەنشای ئێران لە ١٩٤٦/٤/٢٩دا سنووری کۆمارە ساواکەی کوردستان ببەزێنن و کۆمارەکە تێک بدەن، پێشەوا قازی محەمەد پلەی عەسکەری ٢١ ئەفسەری ئەو هێزەی بارزانی بەرز کردەوە و محەمەد ئەمین میرخان پلەی (کاپتن) واتە (رائید)ی پێ درا.

کاتێکیش کۆماری دیموکراتی کوردستان بەپیلانی دەوڵەتە زلهێزەکانی ئەوسا لە ١٩٤٦/١٢/١٧دا رووخێنراو، بۆ رۆژی ٢١ی ئەو مانگە بارزانیی نەمر بەفەرمانی شا محەمەد رەزا پەهلەوی داوای لێ کرا بچێتە تاران بۆ لێدوان لە چارەنووسی کوردەکانی کوردستانی عێراق، کە چووبوونە پاڵ بزووتنەوە نەتەوەییەکەی کورد لە کۆماری کوردستان، لەو گەشتەیدا محەمەدئەمین میرخان یاوەری بوو.

دوای گەڕانەوەی بارزانی لەو سەفەرە ترسناکەی بۆ مەهاباد و بڕیاردانی بۆ چوونی بۆ وڵاتی سۆڤیەت، کاکە محەمەد ئەمین میرخان یەکێک بوو لەو فیداکارە بەجەرگانەی بوونە یاوەری لە کۆڕەوە مێژووییەکەی بۆ یەکێتیی سۆڤیەتی جاران و پەڕینەودیان لە ئاوی ئاراس لە رۆژی ١٩٤٧/٦/١٨داو بوونیان بەپەناهەندە لەو وڵاتەدا. کاتێکیش کە هێزی بارزانییەکان لە شاری باکۆی پایتەختی ئازەربایجان لە رۆژی ١٩٤٧/١٢/١٢دا رێکخرایەوە، کاکە محەمەد ئەمین میرخان کرا بە سەرکردەی بەشێک لە پێشمەرگە بۆ ماوەی دوو ساڵ، بەڵام کە حکوومەتی سۆڤیەت هەستی بەو جموجوڵەی هێزەکەی کوردی کرد، لە ساڵی ١٩٤٩دا لەگەڵ ١٥ هەڤاڵی دیکەی بۆ سەر دەریاچەی (ئۆرال) دوور خرانەوە.

ئەم زاتە لە ساڵی ١٩٥٤دا لەگەڵ بارزانی رێگایان پێ درا بچنە مۆسکۆ و توانی لە (ئەکادیمیای سیاسی) بخوێنێ و بەپلەیەکی باش دەربچێت، لە دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی عێراق و گەڕانەوەی بارزانی بۆ عێراق و کوردستان، محەمەد ئەمین میرخان لەگەڵ بارزانییەکان و خاوخێزانیان بەپاپۆڕێکی رووسی لە رۆژی ١٩٥٩/٤/١٦دا هاتنەوە عێراق و گەیشتنە بەندەری بەسرا و لەوێوەش بەرەو کوردستان گەڕانەوە. محەمەدئەمین میرخان دوای گەڕانەوەی بۆ کوردستان ماوەیەک لە شاری هەولێر مایەوە ئینجا لە پایزی هەمان ساڵی ١٩٥٩دا کرا بەمامۆستا و لە رەواندز دامەزرا. لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوول لە ١٩٦١/٩/١١دا چووەتە پاڵ شۆڕشگێڕان و لە یەکەمین هەنگاوی شۆڕشەکەدا بەفەرمانی بارزانیی نەمر ناوچەی قەزای مێرگەسۆری رزگار کرد، پاشان بەرەو دەڤەری بادینان پێشڕەوی کردووە و لە زۆربەی شەڕەکانی ئەو دەڤەرەش، وەک لە شەڕەکانی (گەلی زاویتە) و (سەری ئامێدی) و (سەر زێرێ) و (گەرماوەکەی حاجی ئاغا) بەشدارییەکی تەواوی کردووە. بەڵام بەداخەوە لە شەڕێکی سەختدا لە ناو گوندی (مرێبا)ی سەر بەشێخان لە دژی هێزەکانی حکوومەتی بەغدا لە رۆژی ١٩٦٢/٣/١دا بەسەختی بریندار دەبێ و لەبەر نەبوونی پزیشک و پێداویستییەکانی چارەکردن لە ٨ی ئاداری ئەو ساڵە رەوانەی نەخۆشخانەی کۆماری مووسڵ دەکرێت و بەپێی پیلانێکی چەپەڵی رژێمی بەغدا لەو نەخۆشخانەیە لە شەوی ١٩ لەسەر ٢٠ی ئاداری ١٩٦٢دا تیرۆر دەکرێ، لە رۆژی ١٩٦٢/٣/٢١دا لە گۆڕستانی شەهیدان لە مێرگەسۆر دەنێژرێ.

**کەریم شارەزا**

# عەبدوڵڵا عەزیزی هەولێری
# ١٩٠٢-١٩٦٢

کەریم شارەزا

عەبدوڵڵا عەزیزی هەولێری، لە رۆژی ١٢ی مایسی ١٩٠٢دا چاوی بەژیان هەڵێناوە، لە شاری هەولێر پەروەردە بووە. بنەماڵەکەیان لە سەردەمی باپیرییەوە لە مەهابادەوە هاتوونەتە هەولێر و لێی نیشتەجێ بوون. ئەو زاتە تا پۆلی سێیەمی سەرەتایی لە شاری هەولێر خوێندوویەتی، ئینجا چووەتە کەرکووک و خوێندنی سەرەتایی تەواو کردووە و لەو شارەی کوردستاندا بەرووناکبیرانی کوردی وەک رەفیق حیلمی و عەبدولخالیق قوتب دەگات و بەیەکەوە لە دوارۆژی کوردەوە دەدوێن و دەست بەخەباتی کوردایەتی دەکەن. لە ساڵی ١٩٢٥دا دەچێتە بەغدا و لە (قوتابخانەی مامۆستایان- بەشی راقی) وەردەگیرێ و دوای سێ ساڵان دەبێتە مامۆستا لە پارێزگای عەمارە و لە شاری (مەجەر ئەلکەبیر) دادەمەزرێ. لەوێ لەگەڵ مامۆستا رەفیق حیلمی دۆستی دا بەیەکەوە دەژین. بەڵام پەیوەندییان بەکوردستانەوە ناپچڕێت، پەیوەندیی سیاسی بەگەلێک نیشتمانپەروەری وەک نووری شێخ ساڵح و فایق بێکەس و گۆران و



کەریم زانستی لە سلێمانی و عەبدولخالیق ئەسیری لە کەرکووکدا دەکات و پەیوەندیش بەکۆمەڵەی زانستی کوردانیش لە سلێمانی دەکات.

کاتێک کە دەگوێزرێتەوە بۆ کوردستان و لە سلێمانی دادەنرێت، دۆستایەتییەکی بەهێز لەگەڵ نیشتمانپەروەری وەک ساڵح قەفتان و عەبدولواحید نووری و کەسایەتیی وەک ئەمین زەکی بەگی مێژوونووسی کورد دەبێت. کاتێکیش، کە دەگوێزرێتەوە بۆ قوتابخانەی سەرەتایی کۆیە، لەگەڵ مامۆستایان عەبدولخالیق قوتب و رەمزی رەحیمی ناسراو بە (مامەند کەرکووکی) لەو شارەدا تۆوی کوردایەتی و هەستی نەتەوایەتی لە ناو قوتابییان و خەڵکی شارەکەدا بڵاو دەکەنەوە.

مامۆستا عەبدوڵڵا عەزیز ماوەیەک دەکرێتە بەڕێوەبەری ناحیە و، هەموو دەمێکیش هەڵوێستی سیاسیی نەگۆڕی بووە و لە ڕێبازی کوردایەتی لای نەداوە. لە (ساڵی ١٩٣٩)ەوە ئەندامێکی چالاکی حزبی هیوا بووە و جێگای متمانەی زەعیمی حزب مامۆستا رەفیق حیلمی بووە و ناردوویەتی بۆ شام تاکو پەیوەندیی بەمیر جەلادەت بەدرخانەوە بکات تاکو خەباتی کورد لە هەموو لایەک یەک بخەن.

مامۆستا عەبدوڵڵا لە بواری نووسین و کتێب دانانیش بۆ قوتابییانی کورد دەورێکی باشی گێڕاوە، ٣ کتێبی بۆ قوتابییانی قۆناغی سەرەتایی چاپ کردووە و ٣ کتێبی بەنرخیشی بەدەسنووسی لە پاش بەجێماوە و ئەم مامۆستا خزمەتگوزار و تێکۆشەرەی کورد، لە رۆژی ٥ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٢دا، لە تەمەنی ٥٨ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

# مەئموون دەباغ: ژیان و خەباتی سیاسی ١٩٣٦ - ١٩٦٣

**دکتۆر ئازاد عوبێد ساڵح**
**کۆلێژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین**

**پێشەکی**

هێشتا زۆر لایەنی مێژوویی نەتەوەی کورد وەک پێویست لێی نەکۆڵدراوەتەوە، مێژوونووسی کورد، ئەرکێکی زۆری لە ئەستۆدایە بۆ نووسینەوەی ئەو مێژووە. وەک دەزانین، بزوێنەری مێژوو مرۆڤە، بۆیە لێکۆڵینەوە لە مێژووی مرۆڤ هەمیشە رووبەرێکی زۆری لە لاپەڕەکانی مێژوودا پڕکردۆتەوە.

لە خەباتی رزگاریخوازی گەلی کوردستان، زۆر گومناوی وا هەن کە بەخەبات و قوربانیدان لاپەڕە زێڕینەکانی نەتەوەکەیان نووسیوەتەوە.

پشکی شاری هەولێر لەو خەبات و قوربانیدانە، گەلێ زۆرە، بەڵام وەک پێویست مافی شایەنی خۆی نەدراوەتێ. یەکێک لەوانە، (مەئموون دەباغ)ی لاوی هەولێری خەباتگێڕو شۆڕشگێڕە.

ئەو لێکۆڵینەوە باس لە ژیان و تێکۆشانی سیاسی و پێشمەرگانە و شەهیدبوونی مەئموون دەباغ دەکات.

بایەخی ئەم لێکۆڵینەوە لەوەدایە، تۆمارکردنی لاپەڕەیەکی بایەخداری ونی مێژوویی رۆڵە خەباتگێڕەکانی نەتەوەی کوردە، بە تایبەتیش شاری هەولێر، کە وەک پێویست باسی نەکراوە. ئەمە جگە لە



تایبەتمەندی کەسایەتی مەئموون دەباغ وەک رۆڵەی بنەماڵەیەکی هەولێری دیارو دەوڵەمەند و ئەو دەورە گەورەیەی لە کاری سیاسی هەیبووە لەو رۆژگارەدا.

شاری هەولێر وەک شارێکی دێرینی جیهان و کوردستان، پشکێکی بەرچاوی لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستاندا هەیەو رۆڵەکانی وەکو رۆڵەی هەر شارێکی دیکەی کوردستان بەهەموو چین و توێژەکانییەوە، نەخشێکی دیارو جێکەوتەیان لەو بزاوەدا هەبووە. نکۆڵی لەو راستییە ناکرێ کە بەشی هەرە زۆری قورسایی باری چەوسانەوەی نەتەوایەتی و چینایەتی، دەکەوێتە ئەستۆی چینی چەوساوەو هەژار، کە ئەمەش بە نۆرەی خۆی، هۆی سەرەکی چەکەرەکردنی هەست و ئامادەیی شۆڕشگێڕانەیە لەناو ئەم چینەدا، تەنانەت لەو بارودۆخانەشدا کە هەواری خەباتی گەلێکی وەک کورد، خەباتی چینایەتی بە پلەی دووەم هاتووە، ئەویش لەبەر حەشارکردنە لەناسنامە نەتەوەییەکەی، ئەوا خەباتی رزگاری نەتەوەیی بە پلەی یەکەم دێت، بۆیە ئەمە شتێکی ئاساییە کە بەشی هەرەزۆری سووتەمەنی شۆڕش و خەباتی رامیاری لە چینی هەژار بن، کە لەو سەردەمەی ئێمە لێرەدا باسی لێوەدەکەین، لەکوردستاندا چینی هەژارو بەرهەمهێنی لادێنشینی پێک دەهێنا. بەڵام نابێ ئەوەش فەرامۆش

بکرێت، کە هەرەشەو نکۆڵی کردن لەمافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد لەلایەن دەسەلاتدارانی عێراقەوە بەرۆکی سەرجەم توێژە کۆمەلایەتییەکانی دەگرتەوە، بۆیە رۆڵەکانی توێژە سامانداره شارنشینەکانیش دەوری زۆر چاکیان هەبووە لەو بوارەداو لەتەک کورانی شۆرشگێری لادێ و گوندەکاندا لەیەک سەنگەردا گیانی خۆیان لەپێناو کوردایەتیدا بەخت کردووە،، نەخوازە ئەو چینە زووتر هەست بەچەوسانەوە نەتەوەییەکە دەکات. نموونەی وەک رەمزی نافیع[1] و بەچکەشێرانی هیوا[2]، تێکۆشەرانی ئازادی و یەکێتی تێکۆشین، شۆرش و رزگاری دواتر هەڤالانی پارتی دیموکراتی کوردستان وهاورێیانی حزبی شیوعی[3]، کە بە دەیان سەرکردەی بەتواناو ناوداریان لێ هەڵکەوت و لە خەباتی بێ پسانەوەی نەتەوایەتی و چینایەتی سەرمەشقیان نواند و بوونە رابەرو چەندانیان چوونە بەریەتی سێدارە یان لەگۆرەپانی رووبەرووبوونەوەی دوژمن بوونە قوربانی و رەمزی کوردایەتی. خەبات و ماندووبوون و شەونخوونی و ترس و لەرزو کونجی زیندان و بن گەوەرە شاخ و دۆڵ و ئەشکەوتەکانی کوردستان، داستانی قارەمانییەتی ئەوانی تۆمار کردووە، کە جگە لە دڵسۆزی بۆ کوردو کوردستان، چاوەروانی چ پاداشتی ماددی نەبوون، بەڵکو خوێنی ئەوان و ماندوویی و شکەتی ئەوان، بناغەی حکومەتی کوردستانی ئەمرۆی دارشت، کە بێگومان جێی شانازی و سەروەری کوردستانن و هیچ پاداشت و خەلاتێک قەرەبووی ئەوانە ناکاتەوە، جگە لە وەفاداری بۆیان و فەرامۆش نەکردنیان. هەر لەو رۆژانەی کە لە ریزی یەکێتی قوتابیانی کوردستان بووین لەساڵی ١٩٧١ بەداوە و دوای هاتنە نێو بواری خوێندنەوەو رووناکبیری، بەناوی شەهید مەئموون ئاشنا بووین، وەک شەهیدێکی سەرکردەی ریزی قوتابیان و بەتایبەتیش ئەو شیعرەی سامی شۆرش[4] بەناوی (چەند وانەیەکی سوور)[5] کە وەلامی شیعرە بەناوبانگەکەی ((دوانزە نامە بۆ مندالانی کوردستان))[6]ی شاعیری ناودار عەبدوڵلا پەشێو[7] بوو، تێیدا ناوی شەهید (مەئموون دەباغ)ی تێدا هاتبوو بۆ ئێمەی تازەهەڵچوو وتازە کورە، ئەو جۆرە شیعرانە مایەی هاندان بوو.

**رێورەچەڵەکی بنەماڵەی مەئموون دەباغ:**

بنەماڵەی دەباغەکان لەهەولێرلە بنەماڵە ناودارەکانی شاری هەولێرن و بەرەچەڵەک لە بەگزادەکانی گوندی تووتمەی دۆڵی بالیسانی ناوچەی خۆشناوەتین. سەرەتای زانراویان لە (پیرەبەگ) ناوێکەوە دەست پێدەکات، کە خەڵکی ئەو گوندە بووەو لە دوا سالانی سەردەمی دەسەلاتی دەوڵەتی عەباسیدا[8] لە بەر هەندێ کێشەی کۆمەلایەتییەوە (پیرە بەگ) بەخۆی و یازدە کورییەوە روو لە شاری هەولێر دەکەن، ئیدی لەناو ئەو شارەدا دادەمەزرێن و خەریکی کاری بازرگانی دەبن لەنێوان هەولێرو سلێمانی[9].

**ئەمەش درەختی بنەماڵەی دەباغەکانە:**




لەبەر ئەوەی خەریکی پیشەسازی پێستەو خوری دەبن و بازرگانی پێوە دەکەن، ئەوا نازناوی (دەباغ)یان پێوە دەلکێت[10].

ئەوەی زانراویشە سەرجەلەی بنەماڵەی دەباغ لە

(حاجی محەمەد سەعید)ەوە، دەست پێدەکات، پاشان حاجی عەبدولقادر دەباغ، کەئەویش (٩) منداڵی هەبووە[١١].

ئەو بنەماڵەیە مولکدارو بازرگان و فەرمانبەرو خەڵکی خوێندەوارو خاوەن بڕوانامەو پسپۆڕی جیا جیایان لێ هەڵکەوتووە، بەگشتی خەڵکی مرۆڤدۆست و یارمەتی خەڵکی لێقەوماویان داوە، دەوریان لەڕووناککردنەوەی شاری هەولێردا هەبووە، بۆ یەکەم جار ئامێری کارەباو کارگەی سەهۆڵ و ئاردی سپی لە سییەکانی سەدەی ڕابردوو لەسەر دەستی ئەحمەد چەلەبی، سامانداری بەناوبانگی هەولێری ڕۆڵەی ئەم بنەماڵەیە بووە[١٢].

مەئموون کوڕی هاشم چەلەبی کوڕی وەلی چەلەبی کوڕی حاجی عەبدولقادر دەباغ کوڕی حاجی محەمەد سەعیدی کوڕی مەحموود ئاغای کوڕی حارس ئاغا کوڕی مەحموود ئاغایە، کە وەکو گوتمان دەچنەوە سەر (پیرەبەگ) بەگزادەی گوندی تووتمەی دۆڵی بالیسانی ناوچەی خۆشناوەتی[١٣].

مەئموون دەباغ لە ساڵی ١٩٣٦[١٤] لە قەڵای دێرینی هەولێر لەدایک بووە، باوکی محەمەد هاشم دەباغ و دایکیشی ناوی کاملەخان شەهابەدین دەباغەو عەبدولباقی برای بووەو نەزهەت و فیکرەتیش خوشکی بوون. هەروەک تاهیر سلێمان کە ئامۆزایەتی لەدایکشەوە برای بووەو دوای ئەوەی دایکی کۆچی دوایی دەکات، باوکی ئامۆزایەکی دیکەی خۆی دەخوازێت بەناوی فەوزییە ساڵح دەباغ لەم ژنەش، عەبدولقادر، فانی و جەوەدەت و سیامەند و فائیزە و ئاوازو خەبات و دیمەن، براو خوشکی بوون[١٥].

### ژیانی مەئموون دەباغ:

سەردەمی منداڵی لەژیانی کەسێک بەتەنیا یارمەتیدەر نییە بۆ پەی بردن بە کەسایەتییەکەی، بەڵکو سەرو سیما وەرگرتنی کەسایەتی خۆیشی ڕەوەندێکە کە سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ژینگەیەی کەسەکە لە منداڵییەوە ژیانی خۆی تێدا بەسەر دەبات.

ئەوەی سەبارەت بە ژیانی مەئموون زانراوە ئەوەیە، کە لەخێزانێکی دەوڵەمەندی شاری هەولێرە، ئەو خێزانەی ئەندامەکانی لەباوک و دایک و دواتر زڕ دایک و خوشک



گردی عەبدولعەزیز- عەزەو قونیان
١/نیسانی/ ١٩٣٩ لەڕاستەوە: ١- محەمەد شەهاب دەباغ ٢- عەبدولباقی محەمەد هاشم. ٣- عەبدولرەزاق شەهاب ٤- شەهید مەئموون ٥- حەمەی کاکەللای پاوەری.

و براو زڕ خوشک و زڕ برا جگە لەکارەکەرانیش، کەئەمە پێویستی بە باوکێکی توندو تیژ هەبووە بۆ ئەوەی بتوانێ پارێزگاری لەشیرازەی خێزانەکەی بکات، کە ئەو هێمنی و گوێڕایەڵی و نهێنی پارێزەرییەی شەهید مەئموونی پێ دەناسرایەوە لەمنداڵیدا زادەی ئەمەو گیانی ناڕەزایەتی بەرانبەر سەرکوتکردنی ئازادی تاکەکەس لەناخیدا چاندووە، هەروەک ڕەنگە رقێکی شاراوەشی بەرانبەر باوکی لەناخیدا چاندبێت، وەک لەدواتردا ئەمە دەردەکەوێت. هێمنی و گوێڕایەڵی منداڵ ئەگەرچی لەگەوهەردا خۆ خواردنەوەو ئارەزووی منداڵانەی خۆی تێدا زیندەبەچاڵ کراوە، بەڵام بەپێی تێگەیشتنی ئەو ڕۆژگارە شتێکی ستایشکراو بووە، هەر ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کە باوکی بەجۆرێکی تایبەت خۆشی بوێت، بەڵام ئەمە وای لە مەئموون نەکردووە، کە هەستی مرۆڤدۆستی لا بێ هێز بێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە، هەرگیز حەزی بەناهاوتایی نێوان خەڵک نەکردووە، ئەمەش بەچاکی لەوەدا ڕەنگ دەداتەوە. خۆشەویستی خوشک و براکانی هێندە بەجۆرێکی وا لەناخیدا ڕیشەی داکوتابوو کەهەرچی بۆ خۆی کڕیبا بەرۆژانەی خۆی لە قوتابخانە، ئەوا بۆ ئەوانیشی دەکڕی و تەنانەت ئەو هەستە خۆنەویستنەو مرۆڤدۆستییە باشتر لەوەدا دەردەکەوت، کاتێ داوای لەماڵەوە دەکرد، کە بەچاوی ئەندامەکانی ماڵەوە بڕوانە خزمەتکارەکانیان[١٦].

لێرەدا دەبێ ئاماژە بەوە بکرێت کە نەزهەتی خوشکی

جێگاو ڕێگایەکی تایبەتی هەبووە لای مەئموون و بە پەروەردەکردنێکی دروست زاخاوی مێشک و هەستی داوەو قەرەبووی بێ بەشی لە سۆزی دایکی کردۆتەوە، بەجۆرێ دەوری دایک و خوشک و هاوڕێی دیوە بۆی، کە مەئموون هەموو شتێک لەوانەی لا بدرکێنێ کە لای کەسی دیکە نەیدەدرکاند و لەهەموو شتێک پرسی پێ بکات[17].

سالی ١٩٤٣- ١٩٤٤ خراوەتەبەر خوێندن لەقوتابخانەی دووەمی هەولێری سەرەتایی و لەسالی ١٩٤٩ سەرەتایی تەواو دەکات.



شەهید لەگەل سمەی کاکەللای یاوەری

ئەو دەمەی کە قوتابی بووە لە ناوەندیدا خۆی و برایەکەی لەگەل باوکیاندا کاریان کردووە، چونکە باوکیان بریکاری کۆمپانیای نەوت و بریکاری کۆمپانیای فڕۆکەوانی تایبەت بە گەشت و گوزار بووە، نووسینگەی هەبووە، شوێنی ئەم نووسینگەیە لەناو بازاڕ بووە لەلای چێشتخانەی تاجریان، کە ئێستا ڕووخێندراوە[18]. ئەمانە کارەکانیان بە شێوەیەکی زۆر سەرکەوتووانە ئەنجام دەدا، کە ئەمە لەلایەکەوە باوەڕ بەخۆ هەبوونەکەی پتەو کردووە، لەلایەکی دیکەشەوە ڕێگەی بۆ خۆش کردووە، کە ناسیاوی لەگەل کەسانێکدا پەیدا بکات کە شانبەشانی هاوڕێیەکانی قوتابخانەی بێ بەهۆی تێگەیشتن لەڕاستییەکانی بارودۆخی کۆمەلگەو سەرەنجامیش دەست و پەنجە نەرم کردن لە گەل دۆزی کورد. بۆیە ئەم هەوارە لە تەمەنی مەئموونودا بایەخێکی زۆری هەیە، چونکە ئەم هەوارە بە سەرەتای چەکەرەکردنی هەستی کوردایەتی دانراوە لەژیانی مەئمووندا.

گەرچی چەکەرەکردنی هەستی نیشتمانی و نەتەوەیی لای هەر کوردێکی ئابڕوومەندی وەک مەئموون زادەی ئەو



شەهید لەگەل نەزهەت-ی خوشکی

هەڵ و مەرجە سیاسییەیە کە دەسەڵاتە چەوسێنەرەکانی عێراق بەسەر گەلی کوردیاندا سەپاندوون، بەڵام هۆکارە ڕێخۆشکەرەکانیش نەخشی خۆیان لەم ڕەوەندەدا هەیە. ئەو هۆکارانەی کاریگەرییان لەسەر خەملینی هەستی نیشتمانی و نەتەوەیی شەهید مەئموون دەباغ، لەلایەکەوە هاوڕێ قوتابییەکانی بوون، ئەو دەمەی کە قوتابی پۆلی یەکەمی ناوەندی بووە، لەلایەکی دیکەشەوە ئەو هاموشۆی ئەو خەڵکانەی کە بۆ نووسینگەکەی کاری باوکی دەهاتن، بەتایبەتی ئەو کەسایەتییانەی سەردانیان دەکردن. ئەوە سەرەڕای نووسەرەکەی باوکی کە ناوی (لەتیف) بووەو کەسێکی خوێندەواربووە، ئەو پیاوەیان بە دۆزی کورد و خەباتی کوردایەتی ئاشنا کردووە. ئەمە وێرای خەڵکی گوندەکان، جوتیارانی لادێ


محەمەد هاشم دەباغ ی باوکی شەهید مەئموون

کە هاموشۆی باوکیان دەکردو لەهەمان بابەت دەدوان. بەگوێگرتن لەوانە هەستی نیشتمانی و کوردانەی مەئموون دەباغ بەرەو هەڵکشان دەچوو[19]. سەرەتاکانی ڕەنگدانەوەی کاریگەرییەکانی ئەم باس و خواستانەی لەسەر کوردایەتی و پێشمەرگایەتی دەکران لەوەدا دەردەکەوێ کە مەئموون لەیاریکردن لەگەڵ خوشک و براکانیدا ڕۆڵی پێشمەرگەی دەبینی و ڕۆڵی دوژمنی دەدایە خوشکە بچووکەکەی[20].

ئەوەی زۆر گرنگە ئاماژەی پێبکرێت ئەوەیە، کە بەپێی ئەو شتانەی لەبارەی باوکییەوە نووسراون ئەوە پیشان دەدات، کە باوکی هیچ هەستێکی کوردایەتی نەبووە، بەڵام ئەمە نابێت بۆچوونێکی دروست بێت، چونکە ئەگەر کەسێک ئەم هەستەی نەبێت وا بەسانایی نووسینگەی کارەکەی نابێتە ناوەندێکی ئەم بابەتەو ئەمەی زیاتریش پشتگیری ئەوە دەکات، کە ئەو بەهەستێکی کوردانە یەکەمجار لەناو ماڵی خۆیان بە کاریگەری باوکیشی فرچک دراوە، ناونرانی خوشک و برایەکانیەتی بەناوی کوردی ڕێک لەو کاتەی خەباتی گەلی کوردو دژایەتی کرانی کوردبوون، لەلایەن دەسەڵاتەوە توندو تیژی بەخۆیەوە بینیووە، کە ئەمە زۆر بەڕوونی گوزارشت لە دڵ لێدانی باوکی دەکات بۆ کوردایەتی و لەڕاستیشدا هەر ئەم کارە خۆی لە خۆیدا جۆرێک پووچەڵکردنەوەی خەونەکانی دوژمنانی کوردە بە کوێرکردنەوەی سیمای نەتەوەییان با، ئەم جۆرە ڕووبەڕووبوونەوەیە لە ئاستێکی بەرزی وەک چوونە ناو سەنگەرو قەبوولکردنی گرفتە پاشهاتەکانیدا نەبێت، کە دواتر دەگەڕێینەوە سەر ئەمە.

یەکێکی دیکەی کە کاریگەری بەسەر شەهید مەئموونەوە هەبوبێت، گیوی موکریانی (١٩٠٢-١٩٧٧)[21] کەسایەتی ڕۆشنبیری شاری هەولێر بوو، کە بەدابینکردنی کتێبی ناوەڕۆک جۆراو جۆر کوردایەتییەکەی مشت و ماڵ کردووە[22].

مەئموون دەباغ زۆر دۆستی کتێب بووەو ئارەزووی خوێندنەوەی زۆر بووە و هەر کتێبێکی بەدەست گەیشتووە


مەئموون دەباغ لەگەڵ عەبدولباقی برای


پێناسەی بەشداری کردن لەئەزموونی گشتی سێیەمی ئاوەندی ١٩٥٢

بە تامەزرۆییەوە خوێندوویەتییەوە، هەوڵی داوە ئەم کارە بە نهێنی ماڵەوە ئەنجام بدات، تەنانەت هەوڵی داوە نەزهەتی خوشکیشی بەمە نەزانێ، چونکە ئەو زیاتر پێی لەسەر ئەوە داگرتووە کە مەئموون زیاتر بەخوێندنی قوتابخانەوە خەریک بێت[٢٣].

لەناو نەتەوە دوا کەوتووەکانداو بەتایبەتیش لەناو کوردا، شیعر بۆتە ئامرازی فێرکردن و هۆشیارکردنەوەی خەڵک، تەنانەت بۆ فێربوونی ڕێورەسمە ئایینییەکان و هەروەها بۆ سیاسییەکانیش بۆتە چەکی خەبات و هاندانی خەڵک بۆیە هەمیشە سروودو شیعرە نەتەوەیی و شۆڕشگێرییەکانی شاعیرانی وەک حاجی قادری کۆیی(١٨١٥-١٨٩٧)، فائق بێکەس (١٩٠٥-١٩٤٨) بەسەر زاری خەبات گێرانەوە بووە[٢٤].

دیارە شیعری شاعیرانی کوردیش بەچاکی دەوری خۆیان هەبووە لەجۆشدان و زاخاودانی هەستی کوردایەتییەکەی، لەو شیعرانە، شیعری (داری ئازادی) شاعیر نەتەوەیی فائق بێکەس کە دەڵێت:

**داری ئازادی بەخوێن ئاونەدرێ قەت بەرناگرێ**
**سەربەخۆیی بێ فیداکاری ئەبەد سەرناگرێ**[٢٥]

هەروەها ئەو شیعرەی هەژاری موکریانی (١٩٢٠-١٩٩١)، بەناوی ((من کوردم)) دەڵێت:

**کوردم و لەڕێی کوردو کوردستان**
**سەر لەپێناوم گیان لەسەر دەستان**
**بەکوردی دەژیم بەکوردی دەمرم**
**بەکوردی دەیدەم وەڵامی قەبرم**

**بەکوردی دیسان زیندوو دەبمەوە**
**لەو دنیاش بۆ کورد تێ هەڵدەچمەوە**[٢٦]

مەئموون دەباغیش وەک قوتابییەک و لاوێکی کورد کەوتۆتە ژێر کاریگەریی ئەو شیعرانەو هەروەک نەزهەتی خوشکی دەڵێت: هەمیشە ئەم شیعرانە وێردی سەر زمانی بوون.[٢٧]

وێڕای ئەمانە حاجی هەمزەی باوکی حەیدەر هەمزە[٢٨]، یەکێک لەو کەسانەبووە کە سەروکاری یەکێک لە بەنزینخانەکانی هاشم چەلەبی باوکی مەئموونی کردووە، دیارە حەیدەری کوڕیشی زۆر هاتووچۆی ئەوێی کردووە، دۆستایەتی لەگەڵ مەئموون دامەزراندووە، چونکە حەیدەر زۆر زوو پەیوەندی بە یەکێتی قوتابیانی کوردستانەوە کردبوو[٢٩].

## خەباتی سیاسی مەئموون دەباغ


شەهید لەهەواری خوێندنی ئامادەیی

سەرەتای کاری سیاسی مەئموون دەباغ بە پەیوەندی کردن و بوون بەئەندامی یەکێتی قوتابیانی کوردستان[٣٠] دەست پێدەکات، بەڵام ئەوەی بەڕاست جێگەی سەرسوڕمان بێت ئەوەیە، کە ئەو زانیاریانەی لەلایەن دۆستە نزیک و ئاگادارەکان بەژیانی مەئموون پێمان گەیشتوون، تارادەیەک ناکۆکن و جیاوازیان لەگەڵ یەکدا هەیە، لەبارەی ڕێککەوتی پەیوەندی کردن و چۆنیەتی پەیوەندی کردنی مەئموون بەم ڕێکخراوەوە. هەرچەندە ئەو کەسایەتییانەی ئەم زانیارییانەی بە ئێمە گەیاندووە لە دۆستە نزیک و ئاگادارەکانی ژیانی مەئموون دەباغن و کەسانێکی سەر ڕاست و زانستی پارێزن، کە یەکێ لەمانە (شەمسەدین موفتی)[٣١] یە کە لەساڵی ١٩٥٣ کە لەناوەندی بووە ئاشنایەتی لەگەڵ مەئموون پەیدا کردووە، بەپێی وتەکانی ئەو دەمەی کە تازە یەکێتی قوتابیانی کوردستان لەبەغدا دامەزرا بوو، دەبوایە بناخەیەکیش لە هەولێر بۆ ئەم ڕێکخراوە دابنرێت،

ئەمەش پێویستی بە قوتابیانی ڕێک و پێک و ڕەوشت بەرز هەبووە، کە مەئموون نموونەیەکی کەم وێنە بووە، بۆ ئەم مەبەستە، بۆیە شەمسەدین موفتی ئەو دەم لێپرسراوی هەولێر بوو، لەڕێگەی (حسام)ی ئامۆزای مەئموون دۆستایەتی لەگەڵ مەئموون پەیدا دەکات، ساڵی ١٩٥٤ کە کۆمیتەی ڕەسمی لێژنەی یەکێتی قوتابیانی کوردستان لقی هەولێر دادەمەزرێنێ، مەئموون دەباغ دەکرێتە لێپرسراوی[٣٢]، کەچی بەپێی وتەکانی شێخ ئەحمەد تاهیر نەقشبەندی هاوڕێی: ((مەئموون دەباغ لە هاوینی ساڵی ١٩٥٥ لەڕێگای جەنابی مام جەلال[٣٣]دوە هاتۆتە ناو ڕیزی یەکێتی قوتابیانی کوردستان))[٣٤]. هەر وەک (جەوهەر غەمگین)[٣٥]یش پاڵپشتی ئەم ڕایە دەکات کاتێ باسی ئەوە دەکات کە لەهاوینی ١٩٥٥ دا ئابوونەی[٣٦] مەئموون دەباغ و حسام ئەمین دەباغیان بۆ هێناوە، دەڵێت: ئەمانە لەڕێگەی مام جەلالەوە هاتوونە ڕیزی قوتابیان.[٣٧] ئەمەش لەگەڵ ڕای مەلا عەولای حاجی سمایل ڕێک دێتەوە کاتێک دەڵێ لەهاوینی ١٩٥٥ شەمسەدین موفتی و مەئموون هاشم چەلەبی و حسام ئەمین بەنووسراوێکی مەکتەبی سیاسی هاتنەوە هەولێر بۆ ئەوەی قوتابیانی پارتی لەناو یەکێتی قوتابیانی کوردستاندا ڕێکبخەن.[٣٨]

هەرچی عەدنان نەقشبەندی هاوڕێی مەئموون دەڵێت:



لەراستەوە: ١-بابەتاهیری شێخ جەلالی حەفید. ٢- شەمسەدین موفتی ٣-هەمزەعەبدوللا ٤- شەهید مەئموون) شوێن بەغدا، خانووی ئەیلی حزبی ١٩٥٦

"من وای بۆ دەچم و لەڕاستیشدا هەروایە، شەهید مەئموون دەباغ لەڕێی حەیدەر هەمزەوە هاتۆتە ڕیزی قوتابیانەوە"[٣٩] هەروەک پێشتر ئاماژەی پێکراوە بەهۆی کاری باوکی حەیدەر لای باوکی مەئموون پەیوەندی لەنێوان حەیدەرو مەئمووندا دروست بووە، بەڵام لەبەر ئەوەی حەیدەر حەمزە بەتەمەن بچووکتر بووەو (لەدایکبووی ١٩٣٩) لەهاوینی ١٩٥٥ شەش سەردتایی تەواو کردووە، بۆیە ڕای یەکەم دروستترە.[٤٠]

لەهەواری خوێندنی ئامادەیی چالاکی پارتایەتی مەئموون زێدە دەبێت و بەجۆرێ دام و دەزگاکانی دەوڵەتیش هەستی پێ دەکەن، هەر ئەمە بۆتە هۆکاری ئەوەی دووساڵ لەسەریەک لەئەزموونەکانی کۆتایی ساڵی پێنجەمی زانستی (١٩٥٣- ١٩٥٤ و ١٩٥٤ - ١٩٥٥)، دەرنەچوێندرێت، ئەوە لە کاتێکدا کە مەئموون هەر لەمنداڵییەوە بەکەسێکی زیرەک و بەتواناو هەمیشە لەیەکەمەکان بووە[٤١].

لەکاتێکدا ئەمە چالاکییەکی گرنگ و مەترسیداریش بووە لەبەرانبەر بە دەسەلاتێک کە بۆ کۆێرکردنەوەی کلتوورو شێواندنی سیمای گەلی کورد ئەمەی وەکو کارێکی سیاسی قەدەغە کرد بوو.

بۆیە بوون بە ئەندام لەم ڕێکخراوەیە ڕاستییەکەی بوون بەئەندامی حیزبیش بوو، واتا پارتی دیموکراتی کوردستان. مەئموون دەباغ دوای دەست و پەنجە نەرمکردن بەم ڕێکخراوەیە کەسێکی لێوەشاوەو جیدی بووەو هێچ درێغی نەکردووە لەوتوێژکردن لەناو هاوڕێ قوتابییەکانی ئەم ڕۆژگارەیدا، کە لەبارەی خۆشەویستی نیشتمان و خۆبەخت کردن لەپێناویدا لەگەڵیان دواوە، هەوڵی داوە بۆ ڕاکێشیانیان بۆ هەڵسوڕان لە پێناو دۆزی کورد، بەجۆرێ کە هەموو ئەوانەی هەڤاڵ و دۆستی بووینە بەمرۆڤێکی دڵسۆزو بەوەفاو دەست و داوێن پاک و ڕاستگۆو هێمن ناویان بردووە[٤٢]، بۆیە توانیویەتی وەک کەسێکی ژیرو چالاک و شۆڕشگێڕو چاونەترس و کوردپەروەر ڕۆڵێکی باڵای هەبێ لە ڕێکخستن و بووژاندنەوەی لقی هەولێر. دەبێ ئەوەش بگوترێ کەهەڵسووڕان لەناو یەکێتی قوتابیانی ئەو ڕۆژگارە کارێکی سەخت و دژوار بووە، بڵاوۆکەکانی بەدەست دەنووسرانەوە، کە یەکێ لەوانەی ئەم کاردیان ئەنجام دەدا شەهید مەئموون دەباغ بوو و دەبوایە

لەپاشان بەشوێنی مەبەستیان بگەیەنێ.

بۆ ئەوەی لە کەشو هەوای سیاسی دووری بخاتەوە باوکی لەساڵی ١٩٥٥دا رەوانەی بەغدا کردووە، تەنانەت خەرجیشی لێ بڕیوە، تاکو بەردەوام نەبێت، بەڵام دەبینین ئەو پتر لەخەبات شلگیرتربووە[٤٣]. لەوێش مەئموون لە جموجۆڵ نەکەوتووە بەچالاکی و لێهاتوویی خۆی دەرکەتووەو بۆتە ئەندامی لیژنەی بەغدا، ئەوکاتە شەمسەدین موفتی سەرۆکی یەکێتی قوتابیانی کوردستان بووەو مام جەلال تاڵەباتی سکرتێر بووە لەگەڵ (٧) ئەندام، لەو سەروبەندەدا مەئموون لەچاو تەمەنی خۆی زۆر پێشکەوتوو بووە[٤٤].

پارتی دیموکراتی کوردستان هەر لە کۆنگرەی دووەمی ١٩٥١وە دووچاری ئاڵۆزی و پەشێوی بوو، بەتایبەتی هەڵپەساردنی سکرتێری پارتی هەمزە عەبدوڵڵا (١٩٠٤-١٩٩٨)[٤٥]، ئەمەش سەری بۆ سەرهەڵدانی دەستەبەندی (تکتلات) بردووەو پارتی کردە دوولەت، ئەوەبوو لەکۆنگرەی سێیەمی پارتی کە لە ٢٦ی کانوونی دووەمی ١٩٥٣ لەکەرکوک بەسترا، چەند بڕیارێکی گرنگ دران، یەکێک لەوانە دەرکردنی یەکجاری هەمزە عەبدوڵلای سکرتێری پارتی بوو[٤٦].

ئەو بارودۆخە وای کردبوو، کە هەمزە عەبدوڵڵا باڵێک پێک بهێنێ بەناوی باڵی پێشکەوتووی پارتی دیموکراتی کوردستان، لەو کاتەدا پارتی بە هەموو باڵەکانییەوە شوێنێکی نەبوو بۆ دالدەدانی سکرتێری پارتی هەروەک شەمسەدین موفتی دەڵێت، بۆ ئەو مەبەستە لەبەغدا خانووێکیان لە گەڕەکی ئەعزەمییە گرتووە بە (١٨) هەژدە دینار، مەئموون دەباغ ئامادەبووە لەهەموویان زیاتر پارەی کرێی خانووەکە بدات، لەوەش گرنگتر دەوری مەئموون لە یەکخستنەوەی هەردوو باڵی حزب، کە ئیدی مەئموون ببووە کادرێکی تەواو و شارەزا، هەر لەو ساڵەدا (١٩٥٥) لەگەڵ مام جەلال و هەمزە عەبدوڵڵا و شەمسەدین موفتی لە بەغدا لەیەک ژووری حزب بەیەکەوە بوونە[٤٧].

هەر چۆنێکی بێت گرنگ ئەوەیە کە بزاندرێ کە ئەجمو جۆڵەکانی ئەم ڕێکخراوەیە هەر تەنیا لەچوارچێوەی ئەو کاروبارانەدا قەتیس بوود، کە پەیوەستن بەپرسەکانی قوتابیانەوە، نە ڕێکخراوەکەش خۆی شتێکی دابڕاو بووە



شەهید لەنووسینگەی کاری باوکی

لەحیزبی سیاسی، بەڵکو هەروەک چۆن ڕێکخراوەکە خۆی ڕەهەندێکی رامیاری هەبووە، چالاکییەکانی ئەم ڕەهەندەیان هەبووە. بۆ نموونە یەکێ لەو چالاکیانەی ئەم ڕێکخراوە ئەنجامی داوە سازدانی ئاهەنگی نەورۆزی ساڵی (١٩٥٦)ە لەسەرچاوەی ئاوی کەسنەزان[٤٨]، مەئموون دەباغ لەگەڵ شەمسەدین موفتی، حەیدەر هەمزە، شێخ لەتیف بەرزنجی، حسام ئەمین دەباغ، ساڵح شێرە، عەبدولڕەحمان گۆمەشینی، فازڵ سەعید ئاغا، شاخەوان تامیق، رەمزی سەعید ئاغا، حەسەن مستەفا، ئەحمەد تاهیر نەقشبەندی کە ژمارەیەک تێکۆشەری شاری هەولێرن بەشداری ئەم ئاهەنگەیان کردووە[٤٩].

مەئموون هەمیشە دەوری بەرچاوی لە پتەوکردنی ڕیزەکانی پارتی و یەکێتی قوتابیاندا هەبووە. لەساڵی ١٩٥٧، کەماڵ محێدین بەهاوکاری عەدنان نەقشبەندی و سەلامی شێخ ڕەئووف و شێخ فەتحی نامیلکەیەکیان بە دەستنووس دەرکردووە بەناوی "دەنگی قوتابیانی کوردستان" و مۆرێکی لێ دراوە کە لەسەر شێلم هەڵکەندراوە، چەندا دانەیەک لەو نامیلکەیە تا ئێستاش لای کەمال محێدین پارێزراوە[٥٠].

دوای ئەوەی مەئموون دەباغ لە پۆلی پێنجەمی زانستیدا دوو ساڵ لەسەر یەک دەرنەچوێندرا، باوکی لەزستانی ١٩٥٧دا بەزۆری ڕەوانەی تورکیای دەکات بۆ تەواوکردنی خوێندن هەروەک پێش ئەویش عەبدولباقی براشی بۆ هەمان مەبەست ڕەوان کرابوو، بەڵام ئەو بە زۆر

ناردنەی مەئموون دەباغ هۆکارێکی دیکەشی هەیە، ئەویش ئاشکرابوونی ناوی مەئموون دەباغ لەلایەن دەزگاکانی پۆلیسی حکومەت لەتەمموزی ساڵی ١٩٥٧، ئەویش لەئاکامی دروستبوونی ناکۆکی لەنێوان حەسەن مستەفای بەرپرسی پارتی دیموکراتی کوردستان لەهەولێر، لەگەڵ هاوسەرەکەی، کە ئەویش ئاگاداری دایکی دەکاتەوە کەوا حەسەنی مێردی شوعیەو لیستی ناوی شیوعیەکانی لەناو دوو شووشە لەباخچەی ماڵەکەی شاردۆتەوە، خەسووی حەسەنیش بە نەفامی پۆلیسی ئاگادار کردۆتەوە، ئەوە دەبێتە هۆی ئاشکرابوونی هەندێ کەسی ئەندامانی پارتی کەناویان لە لیستەکەدا هاتووە،



لەراستەوە: شەهید مەئموون لەگەڵ هاورێیەکی نەناسراو

لەوانەش مەئموون دەباغ، لەگەڵ گیرانی حەسەن خۆشی، بەڵام لەکاتی بردنی بۆ بنکەی پۆلیس حەسەن خۆی دەرباز دەکات[٥١]. بەڵام سەبارەت بە مەئموون راستییەکەی ئەوەیە مەئموون دەباغ نەگیراوە، بەڵکو باوکی شاردوویەتییەوە و پاشان ناردوویە بۆ تورکیا[٥٢].

هەروەها ناوی حیسام ئەمینی ئامۆزای مەئموون دەباغیش لەم لیستە دادەبێت، بەڵام پێش ئەوەی مەئموون دەستگیر بکرێت و ماڵیان بپشکندرێ لەلایەن دام و دەزگای دەوڵەتەوە بۆ بەدەست هێنانی بەڵگەی تەواو لەسەری، بە یارمەتی نەزهەتی خوشکی فریای ئەوە دەکەوێ ئەو کتێب و بڵاوکراوانەی جێی مەترسی بوونە لەناوبیبات و بیانخاتە ناو کولخانەی گەرماوی ماڵەوەیان و بەناچاری بیکانکاتە خۆراکی ئاگر، زۆربەی کتێبەکانیش دەربارەی کوردو کوردستان و شیعری کوردی و کتێبەکانی جەلادەت بەدرخان و نووسەرانی کوردی دیکە بوونە. وەکو خوشکی دەڵێت: هەموویانیان لەناوبردووە، جگە لەمەدالیایەک ئالای کوردستانی لەسەربووە، لەگەڵ وێنەی رەمزی نافیع رەشیدی تێکۆشەری ناوداری هەولێر[٥٣].

بەڵام لەبەر جێگەو رێگەی کۆمەڵایەتی باوکی مەئموون، ئەو پۆلیسانەی هاتبوون بۆ پشکنینی ماڵیان لەژووری مەئموون بەولاوە سەریان بەهیچ شوێنێکی دیکە دانەگرتبوو[٥٤]. ئەم نەرمی نواندنەی پۆلیس و سووتاندنی نووسراو و کتێبەکانی مەئموون، پێش هاتنی پۆلیس لەلایەن خوشکەکەی مەئموون و بەرەزامەندی خۆشی، بوون بە هۆی رزگارکردنی مەئموون لەم چوورتمە، مەئموون زیندانی نەکراو، هیچ بەڵگەیەک لە سەری نەکەوتە دەست دەوڵەت[٥٥].

سێ رۆژ دوای ئەوەی کە ماڵیان دەپشکندرێت، باوکی دەیباتە سەر گۆڕی دایکی و لەوێ بەگۆڕی دایکی سوێندی دەدات کە چیدی دەست لە کاروباری سیاسی وەرنەدات، تەنیا بایەخ بە خوێندنی خۆی بدات[٥٦]، بەڵام بایەخ و گەورەیی و بەهەندوەرگرتنی پرسی کورد لەلایەن مەئموون ئەوەندە بەتین بووە، وێرای سوێندخواردنی بەگۆڕی دایکی، کە دیارە دایک چەند پیرۆز بووە لای و باوکی لەپەرۆشیان بۆ کورەکەی پەنای بۆ بردووە، کەچی مەئموون نەیتوانیوە پابەندی سوێندەکەی بێت و دەستبەرداری خەباتی سیاسی خۆی بێت، ئەمەش



وەستاوەکان لەراستەوە: (١-د.کەمال عەزیز توتنچی. ٢- موعتەسەم سەعید بەزاز (خلە). ٣- هاشم عەبدولرەحمان (بەڕێوەبەری بانک- خانەنشین. ٤- جۆرج مەکەردیج (ئەرمەنی). ٥- محەمەد زەبلوق. ٦- شەهید مەئموون دەباغ. ٧- پزیشکێکی عارەب لە نەخۆشخانەی کۆماری. ٨- شێخ رەئووف (ئەبوباس). ٩- عیسا سەلیم.

لەچەپەوە: (١- عزەدین مەلا قوجە. ٢- هاشم زەنوون (فەرمانبەری بانک خانەنشین). ٣- رفعەت ئیسماعیل توتنچی. ٤- ئەمجەد مستەفا. ٥- فازل پیرداود (بەقسەی کاک مومتاز حەیدەری).

ناوەکان لەلایەن د. کەمال توتنچی ساغکراودتەوە شایانی سوپاسە. شوێنی وێنەکە بارەگای یەکێتی لاوان چواردەی تەمووزی ١٩٥٩.

نیشانەی بە بڕوایی و دڵسۆزی و جیدییەتی لەڕادەبەدەری مەئموون دەباغ بۆ پرسی کوردو کوردستان دەردەخات، کە لە زۆر ڕەفتاری دیکەیدا بەدەردەکەون. یەکێ لەمانە ئەوەبوو، کە نەک هەر تەنیا هەموو خۆشییەکی لەم پێناوەدا لەخۆی حەرام کردبوو، بەڵکو لەهەندێ هەڵوێستدا رەخنەی لەعەبدولباقی براشی گرتووە[٥٧]. ئەمە ئەوە دەردەخات کە مەئموون دەباغ چاوەڕوان و ئۆمێدێکی زیاتری کوردپەروەری لەئەندامەکانی ماڵەوەی خۆیان هەبووە، ڕەنگە هەر ئەم هۆیەش کە باوکیشی لەئاستی ئەم چاوەڕوانییەی ئەودا نەبووە، بووبێتە هۆی ئەوەی لای هاوڕێکانی گلەیی و گازاندەی لەباوکی هەبێت و پاشان لەڕێگەی ئەم هاوڕێیانەوە کەپەیان بەمە نەبردووە وێنای باوکی بەشێوەیەکی نەرێنی بڵاو بۆتەوە.

ڕاستە باوکی مەئموون دەباغ سەرکۆنەی مەئموون دەباغی کردووە، بەڵام ئەمە دەکرێ سۆزی باوکایەتی و دەرچوونی مەئموون بێت لە خەونی هاشم دەباغ بەداهاتووی ڕۆڵەکەی[٥٨].

وەک گوتمان باوکی بە زۆری بۆ تورکیای ناردووە، بەڵام ئەو لە تورکیا نەچووە هیچ قوتابخانەیەک، بەڵکو لەباتی تەواوکردنی خوێندن خەریکی دروستکردنی پەیوەندی بووە لەگەڵ کوردەکانی باکوور لەوانەش موسا عەنتەر[٥٩]، هەروەها گەیاندنی هەواڵی هاوڕێکانی باکوور بە

هاوڕێکانی باشوور و بەپێچەوانەشەوە[٦٠]. لە ڕێگەی ناساندنی خەباتی گەلی کورد و وەرگێڕانی کتێبی تایبەت بەمێژووی کورد[٦١] هەر بەردەوام بووە لە خزمەتکردن بەسەرو سۆراخکردنی کتێبی مێژوویی لەبارەی کوردەوە، هەروەک کتێبی محەمەد نوری دەرسیملی[٦٢] بەناونیشانی (کوردستان تاریخندە درسیم) بۆ هاوڕێکانی لەبەغدا ڕەوان کردووە، کە بەتورکی لاتینی لە سوریا چاپ کراوەو کتێبێکی نهێنی بوو[٦٣].

مەئموون دەباغ بەشداری ئاهەنگی نەورۆزی ١٩٥٨ی کردووە، کەیەکێتی قوتابیانی کوردستان لەناوچەی بەحرکە، بەڕێوەی بردووەو (٧٠) کەس بەشداربوونەو ناوی (١٧) کەسیان هێنراوە، ناوی (مەئموون دەباغ) دووەم ناوە[٦٤].

دوای ئەوەی مەئموون لە تورکیا گەڕایەوە، هێندەی نەخایاند شۆڕشی چواردەی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ بەرپار بوو، لە هەواری دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨، لێژنەیەکی ئامادەیی بەسەرپەرشتی شەمسەدین موفتی و ئەندامییەتی مەئموون دەباغ و ئەحمەد شێخ تاهیر نەقشبەندی و شێخ لەتیف بەرزنجی و فازل سەعید و حسام ئەمین دەباغ و عەدنان نەقشبەندی و کاکەڕەش نەقشبەندی پێکهاتووە، بەمەبەستی پێداچوونەوە بەو هەوارە نوێیەی ڕێکخستنەکانی یەکێتی قوتابیانی کوردستان لە شاری هەولێر، بۆ ئەو مەبەستەش لەهەردوو مانگی ئاب و ئەیلوولی ئەو ساڵەدا (١٩٥٨) لێژنەکە ئێواران لە مێوانخانەی وێستگەی شەمەندەفەری (وێست هاوس) هەولێر کۆبوونەتەوە بۆ گفتوگۆ و ئاڵوگۆڕی بیروڕا



لەراستەوە: چوارەم کەس شەهید مەئموون لەگەڵ چەند هەڤاڵێکی لەشەقڵاوە لەحوزەیرانی ١٩٥٨

سەبارەت بە گۆڕانکاری لە ڕیزەکانی یەکێتی قوتابیانی کوردستان لەناو شارو دەرەوەی شاردا، بەپێی بڕیاری لێژنەکە ئەحمەد تاهیر نەقشبەندی و مەئموون دەباغ ناوچەی شەقڵاوەیان پێسپێردراوە، دوای ئەودی سەردانی ئەوێ دەکەن و لەگەڵ قوتابیانی ناوچەکە کۆدەبنەوەو گفتوگۆ دەکەن، لێژنەیەکی سەرپەرشتی یەکێتی قوتابیانی کوردستان لە شەقڵاوە دادەمەزرێنن[٦٥].

لەدوای ڕووخانی ڕژێمی پاشایەتی و بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ز، گەلی کورد هەناسەیەکی ئازادی وەبەرهاتەوە. مەئموون دەباغ بەشداریکرد لە تاقیکردنەوەی دەرەکی ساڵی خوێندنی ١٩٥٨-١٩٥٩و توانی بەپلەیەکی بەرز هەردوو هەواری چوارەم و پێنجەمی وێژەیی ببڕێت و لەساڵی خوێندنی ١٩٥٩ - ١٩٦٠ لە کۆلێژی مافی زانکۆی بەغدا وەرگیراوە[٦٦]. لەوماوەیەدا لەپاڵ خوێندنی زانکۆ بەپیشەی نووسەر(کاتب) لە قوتابخانەی دواناوەندی

(الوشاش)[٦٧] لەبەغدا دامەزراوە، ئەمە وێرای ئەوەی لەوماوەیەدا هەر بەشێوە گەرم وگوڕییەکەی خۆی کاری سیاسی ئەنجامداوە. هۆی کارکردنیشی وەکو فەرمانبەر لەوسەردەمەدا -ئەوەبووە کەباوکی بۆ ئەوەی ناچاری بکات واز لە سیاسەت بێنی هاوکاری ماددی لێ بڕیبوو[٦٨]- ئەویش بۆ دابینکردنی ژیانی خۆی و یارمەتیدانی عەبدولباقی برای کەتازە لە ئەستەنبوڵ گەڕابۆوە بۆ ئەوەی لەبەغدا خوێندن تەواو بکات، چونکە نەیتوانیبوو لەوێ بەردەوام بێت[٦٩].

ئەو ماوەیەی مەئموون لەبەغدا بووە لەگەڵ هاوڕێ حیزبیەکانیدا بەشێوەیەکی زۆر چالاکانەو ماندوونەناسانە کاری حیزبی ئەنجام داوە، تەنانەت زۆرجار ئاسوودەیی و ژیانی تایبەتی خۆی لەبەرچاو نەگرتووە، بەڵکو ڕاپەڕاندنی کارێکی پارتایەتی و ئەرکێکی یەکێتی قوتابیانی کوردستانی لا گرنگتر و پیرۆزترو مەبەستدارتر بووە[٧٠].

مەئموون دەباغ لە نێوان ساڵانی ١٩٥٩-١٩٦٣، یەکێ بووە لە هەرە کادیرە چالاکەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی قوتابیانی کوردستان، ماوەیەک ئەندامی لێژنەی ناوچەی پارتی بووە لە بەغدا، لەگەڵ ئەمانە: د. سەروەری حەمەی دەروێش کەریم، مەحموودی

مەلا عیزەت، پرۆفیسۆر ئەسعەد خەیلانی و د. ئەحمەد شالی، لەو سەردەمەدا ژمارەیەکی زۆر قوتابیانی کوردستان لەریزەکانی پارتی و قوتابیان دابوونە(٧١).

لەچالاکییە بەرچاوەکانی دیکەی مەئموون دەباغ، بەشداری و دەوری چالاکانەی بووە لە کۆنگرەی سێیەمی یەکێتی قوتابیانی کوردستان کە لە ١٨-٢١ مارتی ١٩٦١، لە سلێمانی لەیەکێ لە هۆڵەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان لە سلێمانی بەستراوە، هەروەک ئەحمەد سەلام لە بیرەوەرییەکانیدا دەڵێت: "کوڕێکی لاوی لاوازی چاویلکە لەچاو زۆر ڕوح سووکانە و چالاکانە لەناو هۆڵەکەدا دێت و دەچێت و یەکە یەکە نوێنەری قوتابیانی شارەکانی بەسەر دەکاتەوە زۆر لەسەرخۆو هێمنانە بیروڕاکانی دەخاتە ڕوو، زۆر بەوردی بیروبۆچوونەکانی خۆی بۆ شیدەکردنەوە، هەر لەو کۆنگرەیەدا خۆشەویستی خۆی لەدڵمان چەسپاند و بووە مایەی ئەوەی لە هەڵبژاردنەکەدا شان بەشانی چەند برایەکی دیکە بۆ دەستەی سەرکردایەتی قوتابیانی کوردستان هەڵبژێردرێن"(٧٢).

چالاکی دیکەی مەئموون دەباغ گەیاندنی پەخشنامەی حزبی بوو بۆ شوێنی مەبەست و زۆر چالاکی دیکەش. کە بۆتە مایەی گرتنی.

هەر لەدرێژەی چالاکییەکانی، مەئموون ئەرکێکی حزبی بەئەحمەد سەلام دەسپێرێ بە گەیاندنی نامەیەک بۆ ڕێکخستنەکانی پارتی لە کەرکووک، دوای ئەوەی بەسەروبەر ئەرکەکەی بۆ ڕوون دەکاتەوە، وەک ئەحمەد سەلام دەڵێت: دواتر زانیم، ئەو کارە بۆ ئەوە بووە کە ئاگاداری پێشمەرگەی کوردستان بکرێت بۆ ئەوەی بتوانن هەردوو کادیری گیراوی پارتی حەبیب محەمەد کەریم و د. سەروەر محەمەد دەروێش لە بەغداوە بۆ سلێمانی دەگوازرێنەوە، لەڕێگا پێشمەرگە بتوانێت دەست بوەشێنێ بەمەبەستی دەربازکردنیان(٧٣).

دوا بەدوای نەمانی بارەگای پارتی دیموکراتی کوردستان لەبەغدا، بەر لەشۆڕشی ئەیلوول، کۆلێژی پزیشکی بەپلەی یەکەم و کۆلێژی یاسا بەپلەی دووەم، ببوونە چەقی چالاکییەکانی زانکۆ، جێ پەنجەی مەئموون دەباغ زۆر بەزەقی لەو خەباتەدا لەگەڵ هەڤاڵانی دیکەی وەک مەحمود عوسمان و ئەحمەد کەمال شالی و سەوەری



لەراستەوە: واجید شاکر، شەهید مەئموون، لەبەغدا

دروێش کەریم و نیهاد کەرکووکی و نەوزاد رەفعەت کاکەیی و باقی هەولێری و فوئاد بابان و عەبدولوەهاب باجەلان و پیرۆت و چالاک تالەبانی(٧٤).

. مەئموون دەباغ، نموونەی ئەندامی حیزبی پابەند (ملتزم) بووە، هەردەم لە خەمی هاوبیرو هاوسەنگەرەکانی دابووە، وەک نموونە ئەو کاتەی لە ناسرییە گیراوە هەندێ لەبەندکراوی بارزانیش لەوێ بوونەو ئەوانیش بەردراون و لەگەڵ ئەو هاتوونەتەوە بەغدا، تا داینەمەزراندوون، دڵی ناوی نەخواردۆتەوە(٧٥).

لە ساڵی ١٩٦٢ فەرمانی گرتنی بۆ دەردەچێت لەو کاتەی بەنهێنی خەریکی کاری حزبی دەبێت، بەر لەوەی بچێتە شاخ، شێوەو ڕووخساری خۆی گۆڕیوە بۆ ئەوەی نەناسرێتەوە، تایبەت لەکاتی سەردانی هەڤاڵ و دۆستەکانی، ئەوکاتە لە پۆلی سێیەمی کۆلێژی ماف بووە لەبەغدا(٧٦).

دواتر لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٢ بۆ ماوەی دوو مانگ دەگیرێت(٧٧)، سەرەتا کەس نەیزانیوە لە کوێیە، دواتر کە نامەکەی هاتووە زانرا، کە لە کەرخ گیراوە، دوای چەند ڕۆژێک بە پۆلیسێک نامەیەک بۆ واجید شاکر دەنووسێت، دیارە پۆلیسەکە کورد بووە و بەکوردی قسەی کردووە، لەنامەکەدا داوای کردووە کە هەندێ شت لەژوورەکەیدا هەیە پێویستە بەزووی لاببردرێت، بۆ ئەومەبەستەش ناوی ئەوانەی نووسیوە کە دەتوانن یارمەتی بدەن، لەوانە عەبدولحوسێن فەیلی و حەوێز قادر دزەیی بوونە، کەلوپەلەکانیش ئامێری چاپی دەستی کە بۆ

کاروباری حزبی بەکارهێنراوە و تۆمارەکانی ئابوونە کە یەکێکیان ناوی سالح حەیدەری تێدابووەو چەند تۆمارێکیش بەناوی ژمارەیەکی زۆر قوتابی، چونکە ڕێکخستنەکە هێلی قوتابیانی حزب بووە لەگەڵ کۆنووسی کۆبوونەوەی حزبی و هەندێ کاغەزو تۆماری جۆراو جۆر بوون، دوای ئاگادار کردنەوەی ئەو دوو کەسەی کە ناویان لەسەرەوە هاتووە، ئەوان بە ئۆتۆمبێلێک هەموویان گواستۆتەوە شوێنێکی دیکە و دوای ئەوەی سەعاتێکی نەبردووە، پۆلیس هاتوون بۆ پشکنینی ماڵەکە، بەتایبەتیش ژووری مەئموون دەباغ، بەڵام هیچیان نەدۆزیوەتەوە[٧٨].

دوای ئەوە مەئموون برداوەتە شاری ناسرییەو لەوێ گیراوە، لەوێش نامەیەکی دیکە بۆ واجید شاکر دەنووسێت و تێدا ئاگاداری دەکاتەوە لەو شارە گیراوە، بەڵام لە وێ زانیوە تاهیر چەلەبی برای هەولێری بەردانی دەدات، لەڕێگای یەکێکی هەولێری[٧٩] کە لە عەبدولکەریم قاسم و دارودەستەکەی نزیک بووە، مەئموون ڕایسپاردووە ئەگەر لەڕێی ئەوەوە بەربدرێت ئەوا لەبەندیخانە نایەتە دەرەوە، چونکە ناوبراو سەر بە حکومەت بووە، بۆیە ئەو قسەیە بە تاهیر چەلەبی دەگەیەندرێت، ئەویش واز دەهێنێت و پاش ماوەیەک مەئموون بەردەدرێت، لەبەر ئەوەی هیچی لەسەر ئیسپات نەبووە، ئیدی خانووێکی دیکە بەکرێ دەگرێت،لەگەڵ عەبدولباقی برای ونەزهەتی خوشکی لە وەزیرییە و لەکۆلێژ دەوامی کردۆتەوە[٨٠].

مەئموون لەساڵی ١٩٦٣ بەرپرسی ڕێکخراوی بەغدای یەکێتی قوتابیانی کوردستان بووە[٨١].

لە ٨ی شوباتی ١٩٦٣ کودەتایەک لەدژی عەبدولکەریم کراو بەعسییەکان و عەبدولسەلام عارف جڵەوی حوکمیان گرتە دەست وپارتی دیموکراتی کوردستان پیرۆزبایی ڕووخانی ڕژێمی عەبدولکەریم قاسمی لەکودەتاچییەکان کرد و لەڕۆژی ١٨ی شوباتی ١٩٦٣ شاندێکی کوردی بەسەرۆکایەتی جەلال تاڵەبانی وساڵح یوسفی (١٩١٨-١٩٨١)[٨٢] سەردانی بەغدایان کردووە بەمەبەستی گفتوگۆکردن لەگەڵ حکومەت، بەڵام ئاکامی نەبوو و لە حوزەیرانی ئەو ساڵە جارێکی دیکە پەلاماری کوردستان درایەوە کە هەموو شیوازێکی کوشتن و سەرکوتی دڵڕەقانەو درندانەی بێ وێنەی گرتبووەخۆ[٨٣].



لە ڕاستەوە: ١- شێخ لەتیف بەرزنجی ٢- شەهید مەئموون. ٣- نەناسراوەتەوە. ٤- محەممەد عەزیز (سەرکاری گوندی دەلوگل) ١٩٦٣

### خەباتی پێشمەرگایەتی

دوای کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣و، دەستپێکردنی گفتوگۆی نێوان حکومەتی تازەو شۆڕشی کورد کە ئەویش سەری نەگرت، بۆیە زۆر لە وانەی پارتی بوونە چوونەتە ڕیزی شۆڕش، دوای بەبنبەست گەیشتنی دانووستانی نێوانی حکومەت و پارتی دیموکراتی کوردستان لە ساڵی ١٩٦٣. وێرای هەوڵێکی زۆر لەلایەن هاوڕێکانییەوە درا بۆ ئەوەی مەئموون نەچێتە ناو شۆڕشەوە، چونکە لەلایەکەوە ئەوەی بە ئەم دەکرا، لەکاری ڕێکخستنی ناوشار بەسەد کەس ئەنجام نەدەدراو لەلایەکی دیکەشەوە چاوی کز بوو بۆ پێشمەرگایەتی نەدەگونجا(٨٤).

مەئموونیش خوێندنی لە سێی کۆلێژ جێدەهێڵێت، ئەوە دەبێتە هۆی گرتنی کەسوکاری ئەوانەی چووبوونە ڕیزی شۆڕشی کورد، کەیەکێک لەوانە هاشم چەلەبی باوکی مەئموون بوو، کە ئەوسەردەمە بەدرەدین عەلی (١٩٦٢-١٩٦٤)(٨٥) موتەسەریفی هەولێر بوو، بەهۆی محەمەد شەهابە دین دەباغەوە کە ناسیاوی لەگەڵ موتەسریف هەبووە، هاشم چەلەبی دوای چوار سەعات گیران بەکەفالەت بەردەدرێت(٨٦).

هەروەک شەمسەدین موفتی ئاماژەی پێدەکات، کاتێ لە ساڵی ١٩٦٢، بەنهێنی چۆتەوە بەغدا، یەکەم کەس کە پەیوەندی پێوە کردووە،مەئموون دەباغ بووە و ڕۆژانە پەیوەندییان هەبووە، لە هەموو کارو کۆبوونەوە حزبییەکاندا مەئموونی لەگەڵدا بووە، ئەمە بۆ ماوەی چەند مانگێک بووە، هەروەک دەڵێت: "بۆ تاریخ کە رۆیشتم ماچم کرد رەجام لێ کرد ئیلتحاق نەکات"(٨٧).

وا دیارە مەئموون زۆر پێداگربووە، هەرچەندە شەمسەدین موفتی پێی گووتووە کە تۆ چاوت کزەو بۆ یەکێکی وەک تۆ زەحمەتەو سەختە، زۆر زۆر کە دەگیرێی لە بەغدا چەند ساڵێک حوکم دەدرێت، چونکە لەبەغدا سەد کەس شوێنی تۆ ناگرێتەوە، تەنانەت پێی گووتووە منیش داوات لێ بکەم مەیێ ناو شۆڕش(٨٨).

ئەو داوایەی شەمسەدین موفتی زۆر لە شوێنی خۆی بووە، چونکە جگە لەوەی باری تەندروستی و چاوکزی و پەروەردەی مەئموون و سەختی باری ناو شۆڕش، برسیەتی و بێ بەرگی و ماندوویی و شەکەتی، سەرباری ئەوەی ئەو کادیرێکی شارەزاو پێشکەوتووی وەک مەئموون


شەهید مەئموون دەباغ بەجلی پێشمەرگایەتی ١٩٦٣

بەزەحمەت پەیدا دەبێتەوەو زیانی زۆر لە ڕێکخستنی حزبی دەدات.

لەو بارودۆخە گرژەدا، وێڕای ئامۆژگاری هەڤاڵان، بەڵام مەئموون هەر دەچێتە پاڵ شۆڕشی کوردستان و لەناوچەی چەمی ڕێزان لە دادگا کراوەتە حاکم، جەلال تاڵەبانی بەرپرسی بووە، وەک حاکمی ناوچە، چونکە قوتابی سێی کۆلێژ بووە، جەلال تاڵەبانی مەبەستی بووە، تەنیا ئیشی حاکمی ببینێ نەک سەنگەری شەڕ، بەڵام دوای ئەوەی

جەلال تاڵەبانی دەبێتە سەرۆکی شاندی کورد بۆ گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتی عێراق و دەچێتە بەغداو پاشان قاهیرە، هەروەک لەو سەروبەندەدا شەڕ دەستپێدەکاتەوە، تەنانەت وەفدەکەش لەبەغدا گیراون و رەفتاری خراپیان لەگەڵ کردوون، جگە لە جەلال تاڵەبانی کە لە قاهیرە بوو[٨٩].

وادیارە ئەو کاتەی کە جەلال تاڵەبانی بەسەرۆکایەتی شاندی کوردی چۆتە بەغدا، یوسف میران[٩٠]، لەشوێنی بووەو کارەکانی راپەڕاندووە لەچەمی ڕێزان. لەو رۆژگارەش، ئەگەر یەکێک لەناوشۆڕش بوایە چەکی نەبوایە بەچاوێکی کەم سەیر کراوە، وێڕای ئەوەی کەمەئموون خۆی حەزی لەپێشمەرگایەتی بووەو داوای چەکی کردووە[٩١].

یوسف میران کە وەک دەڵێت، جێگری مام جەلال بووە، نووسیوویە، من بەنووسەر لەدادگای دامەزراندووە و دوای ماوەیەکی کەمیش تفەنگێکی برنەوم داوەتێ دڵی پێ خۆش بووە[٩٢]. جگە لەوەش کاکەمەم بۆتانی لەبارەی مەئموونەوە دەڵێت: "چەند رۆژێ پێش ئێمە گەیشتبووە، ناو شۆڕش و کرابووە رابەری سیاسی هێزی رزگاری، تەنانەت عەلی عەسکەری وەک جێگری مام جەلال بروسکەی بەناوی هێزی رزگاری لێداوە کە "جێگەی حاکم، رابەری سیاسی هێزی رزگاری (شەهید مەئموون دەباغ) چۆڵە...ئەگەر دەکرێ، کاکە مەممان بۆ بنێرن"[٩٣].

پەلاماری درندانەی بەعس بۆ کوردستان، هانی ئەو لاوانەی داوە کە لەچەمی ڕێزان بوونە، داوای چوونە شەڕ بکەن لەدژی دوژمن، مەئموونیش یەک لەوانە بووە، وێڕای هەوڵدان بۆ هێورکردنەوەی مەئموون، کەچی ئەو هەر سوور بووە لەسەر چوونە بەرەی جەنگ[٩٤]. لەگەڵ ئامۆزایەکی یوسف میران بەناوی مەناف جەلیل لە ناوچەی شوان و شێخ بزێنی چوونەتە بنکەیەکی پێشمەرگە، هەر چەندە یوسف میران سەرکۆنەیان دەکات کە بۆچی ئەوان هاتوون، بەڵام وەڵامیان ئەوەبووە کە پێیان خۆشە بەشداری بەرەی شەڕ بکەن، لەبەر ئەوەی بێ ڕەزامەندی ئەو چووبوون وەک یوسف میران دەڵێت: لەبەر خاتری مەئموون، ئامۆزاکەم سزا نەدا. دواتر عومەر دەبابە کە ئەو کاتە بەرپرسی کۆیە بووە، بروسکەی بۆ بنکەکە کردووە کە بەر لەهێرشی تالانکەرەکان بگرن کە کۆیەیان تالان کردووە، بۆیە یوسف میران بەهێزێکەوە دەچێتە سەر ڕێگای کۆیە- کەرکووک و مەئموون و مەنافیش لەبنکەکە دەهێڵێتەوە، بەڵام لەنزیک شارۆچکەی دارەمان هەردووکیان بەدوایان داچوونە و تەنانەت یوسف میران خۆی لێ توورە کردوون و قسەشی پێ گووتوون. لەدوای تەواوبوونی ئەرکەکەیان هێزەکە، دەکشێتەوە، مەناف و مەئموون بریندار دەبن، چونکە هەریەکەو کولەباڵێکی سپیان لەبەردابووەو بوونەتە نیشانە بۆ دوژمن، لەدوای ڕاگرتنی هێزەکەو بە سەرکردنەوەی دەردەکەوێ سێ کەس[٩٥] دیار نەبوونە، مەئموون و مەناف و حەمەشەریف ناوێک، یوسف میران خەڵکیان بەدوادا دەنێرێت، بەڵام تەنیا حەمەشەریفیان بە بریندار هێناوەتەوەو ناوبراو پێی ڕاگەیاندوون کە مەئموون و مەناف بەجێ ماون، چونکە بریندار کراون، بۆیە وەک میران دەڵێت:"مەفرەزەیەکم نارد لەگەڵ وڵاخێک، چونکە قەناعەتم هات کە نەماون، ئەبێ جەنازەکانیان هەر بهێننەوە"، پاش ماوەیەک هەردوو جەنازەیان هێناوەو گوندی کارێزەو لەوێ شاردرانەوەو ئێستاش گۆڕەکەیان لەوێیە[٩٦]. بەڵام هەر یوسف میران لەشوێنی دیکە دەڵێت: دوای بەسەرکردنەوەی هێزەکە چوار کەس دواکەوتوون و دیارنەمان و شەهید مەئموون و شەهید مەناف و دوو پێشمەرگەی دیکە، یەکیان بەناوی عەلی کە بریندار بووە، هەواڵی شەهید بوونی مەئموون و مەناف و بریندار بوونی خۆی هێناوە[٩٧].

هەر لەو بارەیەوە شەمسەدین موفتیش دەڵێت، ئەگەر مام جەلال لە چەمی ڕێزان با هەرگیز لێنەدەگەڕا مەئموون بچێت بۆ شەڕ، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر دڵتەنگ و بەداخ بووم، بەدواداچوونم بۆ ڕووداوەکە کردو ڕووداوەکە لەناوچەی شێوەسوور لەنێوان کۆیەو تەق تەق بووە، کە دەچنە شەڕ، سوپای حکومەت دێت ئەو دووانە مەئموون و مەناف، لەیەک سەنگەر بوونە و هێزەکەی پێشمەرگە پاشەکشە دەکەن، کەس ئاگاداری ئەوان ناکاتەوە کە بکشێنەوە، کاتێ سوپا دەگاتە ناوچەکە تەنیا ئەو دووانە ماون، لێرەدا دوو بۆچوون هەیە: یەکەمیان تەقەیان کردووە تا شەهید کراون، ئەوی دیکەش مەئموون بریندار دەبێت و بە برینداری دەگەنە سەری و ئەویش دوا گوللە لەخۆی دەدات، تەنانەتە مەکتەبی سیاسی ویستویە سزای کەمتەرخەم بدرێت[٩٨]، کە یوسف میرانە لەبەر ئەوەی بەرپرسی هێزەکە بووە، بەڵام چونکە ئامۆزایەکەی ئەویش

شەهید بووە، وازی لێ هێنراوە.

لە٢٧ی تەمووزی ١٩٦٣ مەئموون دەباغ شەهید بووەو هەواڵەکە لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ئەو ڕۆژەی حکومەتی عێراق وەک مژدەیەک ڕاگەیاندراوە، لەئێستگەی بەغداو ڕۆژنامەی (الجماهیر)[99]. تەمەنی پێشمەرگایەتی مەئموون دەباغ زۆر کورت بووە، وەک دەڵێن دوو مانگ بووە[100]، وەک چۆن تەمەنی خۆشی کورت بووەو لە هەرەتی لاوی جوانەمەرگ بووە، لەسەرچاوەی دیکە بەجۆرێکی دیکە، ئاماژە بەشەهیدبوونی مەئموون دەباغ کراوە لەبەر ئەوەی چاوی کزبوو، بە عەینەکەوە ساتمەی دەکرد... ڕۆژێ، پێشمەرگەیەکی بەرەی شەڕ دڵی دەشکێنێ، بۆیە بڕیار دەدا کە ئەویش بچێتە سەنگەرەوە... لێپرسراوانی حیزب و شۆڕش زۆری لەگەڵ دەکەن، بەقسەیان ناکاو لەنزیک چەمچەماڵ تووشی هێرشی چەکدارانی بەعس دەبن و مەئموون دەپێکرێ و شەهید دەبێ[101]. بەڵام شەمسەدین موفتی مەسەلەی دەمارگرتنی (استفزاز) کردن ڕەت دەکاتەوە[102]. لەشەرێکدا لەناوچەی (ئاغجەلەر)[103] شەهید بووە[104].

بۆ ڕێزگرتن لەخەبات و قوربانیدانی شەهید مەئموون دەباغ، ئەو بنکەیەی کە مەئموون دەباغی لێ شەهید دەکرێ یەکسەر بەناوی ئەوەوە دەکرێ و بەشەهیدبوونیشی، پێشمەرگەکان زۆر بۆی بەداخ بوونە، داخی ئەوەیان خواردووە کە زۆر تکایان لێ کردووە لەگەڵیان نەچێتە شەڕەکە، بەڵام ئەو هەر خۆی سووربووە هاوبەشیان بکات[105]، ئەو بنکەیە سێ چوار کیلۆمەتر لە دێی خلەگەورە دوور بوو. ئەشکەوتێکی بچووک بووە، گەورە کراوە، ڕێکخراو، جێگای بیست کەسی لێ بۆتەوە و چەند ژوورێکی بچووکیشی لە تەنیشتەوە دروست کراوە و کەوتۆتە دۆڵێک بەزستان و هاوین ئاوی لێ نەبڕاوە و شوێنەکەی نەدیوبووە، تا نەچیتە سەر ئەشکەوتەکە، بنکەکە دەرناکەوێت، شوێنەکەشی وابووە، دەتوانرا لەگەڵ هێزێکی چەکدار شەڕی لێ بکرێت، بنکەی شەهید مەئموون دەباغ نزیکترین بارەگای سەربازی شۆڕشی کوردستان بووە لەشاری کەرکووک، پێشمەرگە بەچەند سەعاتێک دەیتوانی خۆیان بگەیەننە سەر زورگەکانی دەورووپشتی ڕێی کەرکووک و دەستی خۆیان بوەشێنن یان ڕێگا لەکاروانی سەربازی حکومەت بگرن، لەسەر ڕێگای کەرکووک - قەرەهەنجیر-چەمچەماڵ- سلێمانی، چەند جاریش پێشمەرگە لەساڵی ١٩٦٣ ئەو ڕێگایەیان بەستووەو لەکاروانی سەربازی سوپای عێراقیان داوە، واش بووە بەمانگ ئەو ڕێیەیان بڕیوە و ترومبێلی میری و سوپای دوژمن نەیاتوانیوە تێپەڕن[106].

وەک بەڵگەیەکی ڕەسمی ئەو کورتە نووسینەی ڕۆژنامەی (خەبات)ی زمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان لێرە وەک خۆی وەردەگێڕین، کە بەناوی (مەئموون دەباغ چۆن شەهید کرا، کیف استشهد مأمون دباغ)، کە دیارە ئەمەش گەورەیی ڕووداوەکە دەردەخات.

"بەڕێوەبەرایەتی جموجوڵی سەربازی دوای دەرۆژ لەشەهیدبوونی مەئموون دەباغ بەدڵخۆشی مژدەبەخشینێکی زۆرەوە هەواڵی کوژرانی بڵاوکردۆتەوە ئیدی بەو جۆرە هەموو خەڵک بەشەهیدبوونی مەئموون دەباغی قارەمانی زانی ئەوەش تەواوی بابەتەکە لەدەمی یەکێک کەخۆی لەوێ بووە".

لەو کاتەی کە جاش عارف پەلاماری ناوچەکانی شوانی دەدا گوندەکانی تالان دەکردن لقێکی پێشمەرگەی شۆڕشگێری ڕابوو بۆ ئەوەی دەرسێکی جاشەکان بدات و ئەو کەلوپەلانەی چەپاویان دابوو لێیان بستێننەوە، مەئموون دەباغ وەک ئەرکی پێشمەرگانەی خۆی کاتی زانیبوویەتی لقەکەی لەئامادەباشی دابووە بۆ ئەوەی بچێتە شەڕ، ئەویش پێداگربووە بۆ بەشداریکردن لەگەڵیان بۆ شکاندنی جاشەکان، بەڵام ئەو و سێ لە هەڤاڵەکانی زیاد لەئەندازەی پێویست ڕۆیشتوون، ئیدی کەوتوونەتە دوای دوژمنی بەزیو و لەناکاو دەکەونە نێو گەمارۆی ژمارەیەکی زۆری دوژمن و شەڕێکی ناهاوتای توند بەرپا دەبێت لە نێوانیان، خۆی و مەناف میرانی هاوڕێی بریندار دەبن لەگەڵ ئەوەش توانیویانە گەمارۆکە لەسەر خۆیان بشکێنن، بەڵام هەردوو بریندار توانایان نەبووە، پێویستییان بە یەکێک هەبووە هەڵیان بگرن، ئەوەش لەتوانای ئەوان دانەبوو، لەیەک کاتدا وەک پێویستی پاکشەکردن، بۆیە مەئموون بڕیار دەدات کە ئەو لە شوێنی خۆی بمێنێتەوە لەبەر ئەوەی برینی مەناف مەترسیدارتر بووە پێویستی بەچارەسەرکردنی خێرا هەبووە ئەوە لەلایەک، لەلایەکی دیکەشەوە بەو پێیەی مەئموون ئەندامێکی پێشکەوتووی حزبەو ئەو پێشکەوتوویە وای لێ دەکات کە ئەرکی گران

لە ئەستۆی خۆی بگرێت لە هەڵوێستەکاندا، ئەو ئەستۆی گرانەتر بێت، هەرچەندە هاورێکانی داوایان کردووە کە لەگەڵیان بچێت یان لەگەڵی بمێننەوە تا لەکۆتایی ئەو فەرمانی پێکردوون زوو برون و مەناف هەڵبگرن و تفەنگەکەی ئەویش لەگەڵ خۆیان ببەن، چونکە فیشەکی نەمابوو و نابێ چەکەکە بکەوێتە دەستی دوژمن و پێیانی گوتووە- من دەمێنمەوە دوژمن خەریک دەکەم و بە دەمانچەکەم بەرگری لەخۆم دەکەم و هەولیش دەدەم خۆم بکێشم و بگەمەوە ئێوە، ئەگەر توانیم، بەهەر حاڵ من بەزیندووی خۆم نادەمە دەست دوژمن، ئەگەر بەمردوویش لاشەکەم کەوتە دەستیان ئەوا پێشەکی من نرخی خۆم وەرگرتووە خێرا برۆن، خودا ئاگادارتان بێت و سڵاوم بگەیەنە هەموو ئەندامانی پارتی پێشڕەومان و هێزەقارەمانەکانمان، سەرفرازی بۆ کوردو کوردستان، مردن بۆ داگیرکەرە فاشستەکان.

دوای پاشەکشەی هەڤاڵانی مەئموون مەفرەزەیەکی سوپا و جاش بەسەری دادەن و ئەویش قارەمانانە بەرگری کردووە، کە بۆتە هۆی کوشتنی چوار لەوان، بەڵام فیشەکی نامێنی کە سەیری لاشەی ئەو ئادەمیزادە درندانەی لەدەوروبەری پەرش و بڵاوبوونەتەوەو سەیری دەم و چاوی زیندووەکانیان دەکات کە بەرەو رووی دێن و دەگەنە سەری دەم و چاویان شەڕیان لێ دەباری و نەیخواست بەدیلی بکەوێتە بن دەستیان و شێوازەکانی ئەشکەنجەدانی لەسەر تاقی بکەنەوە کە( هملر)ی گەورەیان پێ خەڵات کراوە بۆیە دوا فیشەکی لە سەری پڕ خۆشەویستی بۆ نیشتمان و گەلەکەی و نیازە پاکە مرۆدۆستانەکەی دەدات، لەو کاتەدا دوای ئەوە پێشمەرگەکان بەهانای دەچن و لاشەی مەئموون رزگار دەکەن بۆ ئەوەی دەستی بەعسییە فاشستەکانی نەگاتێ ولاشەکەیان لە شوێنێکی ئەمین لەدڵی کوردستان سپارد.

ئیدی ناوی، ناوی مەئموون و گیانی مەئموون بووە سروودێک نەوەکان دەیڵێنەوەو دڵسۆزانی و رۆڵەکانی گەلی کورد و هەموو خەباتکاران، شوێن هەنگاوەکانی ئەو دەکەون و لە پێناو هەق و ئازادی و ژیانێکی سەرفرازی بۆ مرۆڤ[١٠٧].

دیارە وەک شەهیدێکی گەورەی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان، ناوی لەو بەیاننامەو بڵاوکراوانەی دواتر دەرکراون هاتووە[١٠٨]. لە ساڵانی حەفتا دوای رێککەوتنامەی یازدەی ئاداری ١٩٧٠، لەو شیعرەی سامی شۆڕشدا ناوی شەهید مەئموون دەباغ هاتووە، دەڵێت:

**منداڵەکان...**
**هێشتا زامی سنگی زەردەشت.. ئاگردانە..**
**هێشتا چاوی چوارچرا پڕ لە گریانە..**
**هێشتا دڵی ئاگری داخی لە هەڵچوونە..**
**هێشتا هەرەتی بەهارمان..حوزەیرانە.**
**منداڵەکان..**
**ئێستاش رووبار..بناری چیا..**
**گەڵای تینووی ناو چاوی باغ..**
**کە بەفراوی نەورۆزی ساڵ..ئەخۆنەوە..**
**هاوار ئەکەن: مەئموون دەباغ..مەئموون دەباغ..**
**مەئموون دەباغ..!**
**کەواتە.. بۆ لەوەتی هەین..**
**بێ فەلسەفەین..**
**درۆ لەگەڵ خۆمان ئەکەین؟**[١٠٩]

تاریق.جاماز لە ئۆردووگای قوتابیانی کوردستان لە ساڵی ١٩٧٣، تیپێکی ئۆردوگای (سەفین)ی بەناوی مەئموون دەباغەوە کردووە، هەر ئەویش لەدوای راپەڕین وتارێکی نووسیووە بەناوی (دەبا چیتر شەهید "مەئموون دەباغ" لەبیر نەکەین)، وەک وەبیرهێناوەو وەفایەک بۆ ئەو قوربانییانەی شاری هەولێر، کە جێی شانازی کوردو قوتابیانی کوردستان و شاری هەولێریشە، داوای کردووە هەموو ساڵێک یادی بکرێتەوە و پتریش لەبارەیەوە بنووسرێ[١١٠].

مومتاز حەیدەریش بەسەرناوی "شەهیدی نەمر مەئموون دەباغ، رۆشنبیرێکی شۆڕشگێر...تێکۆشەرێکی نەتەوەپەروەر، پێشمەرگەیەکی قارەمان"، وتارێکی نووسیوە، وەک سەرناوێکی پڕ واتاو پڕ بەپێست، کە تێدا جگە لە بیرەوەری خۆی دەنووسێت، کە یەکەمجار لەیادکردنەوەی نەورۆزدا، کە بەنهێنی یەکێتی قوتابیانی کوردستان بەر لە شۆڕشی تەمووزی ١٩٥٨، لە بەستۆرە بەرێوەچووە، شەهیدی ناسیووە، پاشان زانیارییەکانی عەدنان نەقشبەندی نووسیوە کە پێشتر ئاماژە بەبۆچوونەکانی کراوەو تێیدا ئەوە ئاواتەی شەهید مەئموون دەباغ دەخاتە روو کە لەهەواری سێیەمدا کۆلێژی

بەجێـهـێشت بۆ ئەوەی بچێـتـە پاڵ شۆڕش، شـەهـیـد گووتبووی کە لە ژێر سێبەری حکومەتی کوردستان کۆلێژە تەواو دەکات و "بە مـەرسوومێکی جمهوری کوردستانی" دادەمەزرێت[١١١].

دواتریش ئەسـعـەد عـەدۆ لە وتارێکدا بەناوی (یادی سـاڵرۆژی شـەهـیـدێکی بێ ناز) کـە وەک ئەو بۆی چووە لەمانگی ئابی ١٩٦٣ شەهید بووبێ، کە دیارە هەڵەیە، سـەرباری گێـڕانەوەی کـورتە بیـرەوەرییـەک لەناسـینی شەهید، هەندێ پێشنیـاری خستۆتەڕوو بۆ بەرزڕاگرتنی یادی ئەو شـەهیـدە، وەک بەناوکـردنی گـۆڕەپانێـک و ناونانی کـۆنفـرانسی یەکـێـتی قـوتابیـان و لاوانی کوردستانی بەناویەوە، جگە لەوە ئاماژەی بەوە کردووە کە مام جەلال لە وتارێکیدا لە شاری هەولێر لەبەردەم ئاپۆرەی خەڵکدا گووتوویەتی: (هەولێری شەهید مەئموون دەباغ و...)[١١٢].

لە بەدواداچوونی وتاری پێشوودا عەدنان نەقشبەندی وتارێکی بەناوی "دیسان لەیادی شەهید مەئمون دباغ" دا نووسیووەو تێیدا ئاماژەی بە وتارەکەی ئەسعەد عەدۆ و مومتاز حەیدەری کردووەو هەندێ لە زانیارییەکانی ڕاست کردۆتەوەو داوای کردووە هەموو ساڵێک یادی بکرێتەوەو چەند هەوڵێکیشی داوە بۆ ئەوەی یەکێتی قوتابیانی کوردستان ئەو شەهیدە فەرامۆش نەکات، چونکە شەهید خۆشی ڕایسپاردبوو گەر شەهید بوو قوتابخانەیەکی بەناو بکرێت، دووپاتکردنەوەی ئەو داوایەی کـە لە وتـارەکـەی مومتاز حەیدەریدا ئاماژەی پێکرا[١١٣].

بەپێی ئاگـادارە ئێـمـەش لە بیـرەوەریی ٣٣ سـاڵەی شەهید بوونیدا (خەباتی قـوتابیـان)ی ئۆرگانی یەکێتی قـوتابیـانی کـوردسـتـان کـورتەیەک لە ژیانی شـەهیـد بڵاوکراوەتەوە[١١٤].

ئەوەی ئاگاداربین، قوتابخانەیەکی ناوەندییـەکی کچان لەناو شاری هەولێر[١١٥]، بەناوی شەهید مەئموون کراوە، هەروەها بنکەیەکی تەندورستی بۆ پشکنینی هاوسەری سەربەفەرمانگەی تەندروستی هەولێر[١١٦]، لەکۆلێژی مافی زانکۆی سـەلاحـەددینیش هۆڵێکی بەناوکـراوە. لەناو بارەگـای مـەکـتـەبی سکرتاریەتی یەکـێـتی قـوتابیـانی کـوردسـتـانیش هۆڵێکی بەناو کـراوە، هەروەها خـوولی بەردەوامی پێگەیاندنی کـادیرانی قـوتابیـانیش هەر بەناوییەوە کراوە.

یەکێک لەهاوسەنگەرانی لەبیرەوەرییەکانیدا ئاوای نووسـیـووە: (لەئەشکەوت دەنووسـتین، تابەیانی مـشـک چلیـتـانێی دەکرد، بەسـەرو گـوێلاکـمـان هاتووچۆی بوو. لەگەڵ خوالێـخـشـبـوو شەهید مەئموون دەبباغ بەیەکەوە بووین، بەداخەوە دوای ماوەیەکی کەم لەشەڕێکدا لەگەڵ سوپای ڕژێم لەڕێدار شەهید بوو، ڕاستی نموونەی ڕەوشت و پاکی و گیان لەسەردەستی کوردایەتی بوو(١١٧).

### پەراوێزەکان

(١) ڕەمـزی نافـیـع ڕەشـیـد لەسـاڵی ١٩١٧ لەهەولێـر لەبنەماڵەیەکی نیشتمانپەروەری ناسراوی ئەم شارە لەدایک بووە، لەساڵی ١٩٣٩ لەزانکۆی ئەمریکی دووساڵ خوێندوویەتی، پاشان چۆتە ئەستەنبۆڵ بۆ تەواوکردنی خوێندن. ئەندامێکی چالاکی حزبی هیـوا بووە، لەحـوزەیرانی سـاڵی ١٩٤٣ هەولێـدا لەگەڵ ئەڵەمانەکان بەفڕۆکە لەکوردستـان دابەزن بەناوی کردەوەی (مامونت)، بۆ ئەوەی ئەڵەمانەکان بتوانن دەست بەسەر بیرە نەوتەکانی کوردستاندا بگرن، بەڵام کـارەکـە سـەری نەگـرتووەو هەمـوویان گـیـراون، لەئەنجـامـدا لەسـاڵی ١٩٤٧، ڕەمـزی تێداچوو. بۆ زانیـاری پتر بڕوانە: گۆتفرید یۆهانز مـیـوولەر، لەڕۆژهەڵاتی گـرگـرتوودا، نێـردەی بەمـەتـرسـیی ڕۆژهەڵاتی نـاوەڕاست ١٩٤٣، وەرگێـڕانی: بەدران ئەحـمـەد حـەبیب، پێـشـەکی د. مـارف خـەزنەدار، هەولێـر، ١٩٩٢، ل٨: عبدالفتاح علي البوتاني، دراسات و مباحث في تاريخ الكورد والعراق المعاصر، دار سپيريز، اربيل، ٢٠٠٧، ص٢٢١.

(٢) حزبی هیوا لە ساڵی ١٩٣٧ دامەزراوە: بۆ زانیاری پتر بڕوانە: فەیسەڵ دەباغ، حزبی هیوا و شۆڕشی (١٩٤٣ -١٩٤٥)ی بارزان،چ١، هەولێـر، ١٩٩٧، ل ٧: د. مكرم الطالباني، حزب هيوا، مطبعة خاك، سليمانية، ٢٠٠٢.

(٣) ئەمانە ئەو ڕێکخستنانە بوون کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم لە باشووری کوردستان سەریان هەڵداوە و بڵاوکراوەیان بەو ناوانە هەبوو و پێیان دەناسرانەوە و خەڵکێکی زۆری هەولێرو دەوروبەری

لە نێو ئەو ڕێکخراوەدا هەبوو. بۆ زانیاری پتر بڕوانە: د. عبدالستار طاهر شريف، الجمعيات و المنظمات والاحزاب الكوردية في نصف قرن ١٩١٨ -١٩٥٨، ط٢، السليمانية، ٢٠٠٧.

(٤) سامی شۆڕش، شاعیرو نووسەرو ڕۆژنامەنووس،لەکابینەی پێنجەمی حوکمەتی هەرێمی کوردستان وەزیری ڕۆشنبیری بوو.

(٥) "هاوکاری" (ڕۆژنامە) ،بەغدا، ژمارەی تایبەتی، ساڵی سێیەم، ١/١/١٩٧٢،ل٣٥. وام دەزانی شیعری شێرکۆ بێکەسی شاعیری ناودارە.

(٦) بۆ تەواوی شیعرەکە بڕوانە: عەبدوڵلا پەشێو، پشت لە نەواو ڕوو لەکرێوە شیعری ١٩٦٥-١٩٧٩، چاپی سێیەم، چاپخانەی هێڤی، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٢١٧-٢٤١.

(٧) - عەبدوڵلا پەشێو، شاعیرێکی ناوداری کوردە لە ساڵی ١٩٤٦ لە گوندی بێرکۆتی سەرووی هەولێر لە دایک بووە، لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٣ بۆ خوێندن چۆتە دەرەوە و دکتۆرای وەرگرتووە و بە شاعیرێکی نوێگەر دادەنرێت. بڕوانە: شەرمین ئیبراهیم عەزیز، پەشێو و تازەکردنەوە لە شیعری کوردیدا، هەولێر، ٢٠٠٦، ل ١٧.

(٨) ڕەنگە ڕووداوەکە لەسەردەمی عوسمانییەکان بێت.

(٩) مەولود قادر بێخاڵی، هەولێرم وادیوەو....بیستووە، بەرگی دووەم، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٧، ل ٢٤٥-٢٤٦.

(١٠) هەمان سەرچاوە، ل ٢٤٦.

(١١) هەمان سەرچاوە، ل ٢٤٦-٢٤٧. بڕوانە: درەختی بنەماڵە.

(١٢) هەمان سەرچاوە، ل ٢٤٧-٢٤٨.

(١٣) سەید مەولوود بێخاڵی، هەولێرم وادیوەو بیستووە، بەرگی سێیەم، لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی (سۆران) لەهەولێر، زنجیرەی ژمارە(٣٣) ، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥، ل٢٢٦- ٢٣٠.

(١٤) جێی ئاماژەیە لەکتێبەکەی سەید مەلوود بێخاڵی ساڵەکە (١٩٣٤) نووسراوە، بەڵام ئەوەی ئێرە ڕاسترە.

(١٥) دیدار لەگەڵ نەزهەت محەممەد هاشم دەباغ) خوشکی گەورەی مەئموون دەباغ)ە. هەولێر ٥/ئادار/٢٠٠٨

(١٦) دیدار لەگەڵ نەزهەت محەممەد هاشم دەباغ، لە ٥/ئادار/٢٠٠٨: ناسنامەی بەشداربوون لە تاقی کردنەوەی پۆلی شەشەمی سەرەتایی.

(١٧) دیدار لەگەڵ نەزهەت محەممەد هاشم دەباغ، لە ٥/ئادار/٢٠٠٨.

(١٨) دیدار لەگەڵ نەزهەت محەممەد هاشم دەباغ لە ٥/ئادار/٢٠٠٨: دیدار لەگەڵ شەمسەدین موفتی، دوو کاسێتی تۆمارکراو لە بەهاری ٢٠٠٥.

(١٩) دیدار لەگەڵ نەزهەت محەممەد هاشم دەباغ لە ٨/ئادار/٢٠٠٨: دیدار لەگەڵ شەمسەدین موفتی.

(٢٠) دیدار لەگەڵ نەزهەت محەممەد هاشم دەباغ لە ٨/ئادار/٢٠٠٨.

(٢١) عەبدولڕەحمان گیوی موکریانی لەساڵی ١٩٠٣ لە سابڵاخ لەدایک بووە و نووسەر و پەخشەر و چاپکەر و زمانەوان و ڕۆژنامەنووس و وێنەگر و فەرهەنگنووس بووە، خاوەنی چاپخانەی کوردستان بووە لەساڵی ١٩٧٧ لە هەولێر کۆچی دوایی کردووە و نێژراوە. بڕوانە: جمال بابان، أعلام كرد العراق، من مطبوعات وزارة الثقافة، مطبعة شڤان، سليمانية، ٢٠٠٦، ص٦٤٣ ـ ٦٤٥.

(٢٢) دیدار لەگەڵ نەزهەت محەممەد هاشم دەباغ لە ٨/ئادار/٢٠٠٨.

(٢٣) هەمان سەرچاوە.

(٢٤) دیوانی بێ کەس، محەمەدی مەلا کەریم ڕێکی خستووەو سەرەتای بۆ نووسیوە، چ٢، کتێبخانەی (الطليعة) لەکەرکووک، چاپخانەی الاديب، بەغدا، ١٩٨٠، ل١٣-١٤.

(٢٥) بۆ تەواوی شیعرەکە بڕوانە: دیوانی بێ کەس، محەمەدی مەلا کەریم ڕێکی خستووەو سەرەتای بۆ نووسیوە، چ٢، ل٨٢-٨٣.

(٢٦) ئەمەش دەقی شیعرەکەیە:

**بە دەربەدەری یان لە ماڵی خۆم**
**لە خاکی عەرەب، لە ئێران و ڕۆم**
**کۆک و پۆشتەبم، ڕووت و ڕەجاڵ بم**

**کـــۆشکم دەقـــات بێ، وێرانە مـــاڵ بم**
**ئازاو رزگـــاریم شـــادان و خـــەندان**
**یان زنجـیـــر لە مل لە ســووچی زیندان**
**ســاغ بم جـحـێڵ بم بکرم گـوێ سـوانان**
**یان زارو نزار لە نەخـــۆشـــخـــانان**
**دانیـــشم لەســەر تەخـتی خـونکاری**
**یـان لـە کـــــــۆلانـان بـکـەم هەژاری**
**کـــوردم و لە رێی کـــوردو کـــوردســـتـــان**
**ســەر لەپێناوم گـیـان لەسـەر دەسـتـــان**
**بەکـــــوردی دەژیم بەکـــــوردی دەمـــــرم**
**بەکـــــوردی دەیدەم وەڵامی قـــــەبرم**
**بەکـــــوردی دیســـــان زیندوو دەبمەوە**
**لەو دنیـــاش بۆ کـــورد تێ هەڵدەچمـــەوە**

بڕوانە: هەژار، بۆ کـــوردســـتـــان، دەزگـــای چاپ و بڵاوکـــردنەوەی ئاراس، چاپخـــانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١، ل٢٠- ٢١.

(٢٧) دیدار لەگـــەڵ نەزهەت مـــحـــەمەد هاشم دەباغ، ٨/ئادار/٢٠٠٨.

(٢٨) لەساڵی ١٩٣٩ لە هەولێر لەدایک بووە. دەرچووی کـــۆلیـــژی پەروەردەی بەشی مـــێـــژوو بووە، مـــامـۆســـتـــایەکی شـــارەزاو تێکۆشـەرێکی دیاری کـــوردایەتی بووە، لەســاڵی ٢٠٠٦ کـــۆچی دوایی کـــــردووە. بروانـە: دۆســـــیـــــەی تایبـــــەتی لە بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی هەولێر.

(٢٩) دیدار لەگـەڵ عـدنان نەقـشـبـەندی، "بەدرخـان"، ژمـارە، (١١٠)، ٢٢ی کـانووی دووەمی ٢٠٠٩، ل٣: عەدنان نەقشبەندی لەساڵی ١٩٣٩ لەهەڵەبجە لەدایک بووە

(٣٠) دامـەزراندنی یەکـێتی قـوتابیـانی کـوردسـتـان لە بڕیارەکـانی کـۆنگرەی سـێـیـەمی پارتی دیموکـراتی کـــوردســـتـــان بوو، کـــە لە ٢٦ کـــانوونی دووەمی ١٩٥٣ لە شـــاری کـــەرکـــوک بەســـتـــرا، بڕوانە: د. عـــبـدالســـتـــار طاهر شـــريف، المصــدر الســـابق، ص ٢٥٨- ٢٥٩.

(٣١) لەبنەمـاڵەیەکی ئایینی ناوداری هەولێرن، لەسـاڵی ١٩٣٣ لەهەولێـــر لەدایک بووە، ســـەرەتایی و ناوەندی لەهەولێـــر و ئامـــادەیی لەبەغـــدا تەواو کردووەو ساڵی ١٩٥٣چۆتە کولیجیماف لەبەغداو لە سـاڵی ١٩٥٧ تەواوی کـردووە. تێکۆشـەرێکی ناوداری پارتی دیموکـــراتی کـــوردســـتـــان بووەو لەدامـەزرێنەرانی یەکـیـەتی قـوتابیـانی کوردسـتـان بووەو لەژیاندا مـاوە. بڕوانە: مـاجـد حـسـن علي، الحـركـة الطلابيــة الكوردية في العــراق ١٩٢٦- ١٩٧٠ رسالة مـاجـسـتـيـر (غـيـر منشـورة)، كلية الاداب،- جـامـعـة صـلاح الدين اربـيل، ٢٠٠٨، ص٧٦.

(٣٢) دیدار لەگەڵ شەمسەدین موفتی.

(٣٣)جەلال حیسـامـەدین تاڵەبانی لە سـاڵی ١٩٣٣ لە گوندی کەڵەکان لە دایک بووە، کۆلیجی مـافی لە بەغـــدا تەواو کـــردووە و ســـەرکـــردەیەکی دیاری بزووتنەوە رزگـاریخـوازی کـوردسـتـانە و ئێـسـتـا سەرۆک کۆمـاری عێـراقە. بۆ زانیـاری پتر بڕوانە: د.مـحـمـد الصـويركي، مـعـجم اعـلام الكرد في التاريخ الاسلامي والعصر الحديث في كردستان و خارجها، بنکەی ژین لاحياء الوثائقي والصحفي الكردي، مطبعة مـؤسـسـة حـمدي، السليمانيـة، ٢٠٠٥، ص ١٨٤.

(٣٤) نامـەی ئەحـمـەد شـێخ تاهیـر نەقـشـبـەندی بۆ بنەمـاڵەکەی لە ٢٥ی ئەیلوولی ٢٠٠٢، (لەسـاڵی ١٩٣٦ لەهەولێر لەدایک بووە).

(٣٥) جـەوهەر غـەمگین، لە سـاڵی ١٩٣٤ لە گـوندی تۆبزاوەی بناری سـەفین لە دایک بووەو خـوێندنی مـافی لە بەغـدا تەواو کـردووە، خـەباتکارێکی پێشـەنگی کوردایەتی و پارتی و قـوتابیـان بووە لە هەولێـر و شـاعـیـرو نووسـەرە وئێـسـتـا لە هەولێـر دادەنیشێ.

(٣٦) ئابوونەی ئەو سـەردەمـە (٧٥) فلس بووە، بەڵام ئەمـان هەریەکەو (٢٥٠) فلسـیـان داوە، کە دیارە پارەیەکی زۆر بووە ئەو سـەردەمـە. بڕوانە: نامـەی جـەوهەر غـەمگین بۆ نووسـەر لەڕۆژی ٢١ ئاداری ٢٠٠٨ (لای نووسەر پارێزراوە).

(٣٧) هەمان سەرچاوە.

(٣٨) مـەلا عـەولای حـاجی سـمـایل، سـەربردەی ژیانی سیاسیم، بەرگی یەکەم، چاپخانەی ئەرشاد، بەغدا، ١٩٩٠، ل ١٥٥.

(٣٩) دیدار لەگەڵ عەدنان نەقشبەندی، س. پ، ل٣.

(٤٠) دیدار لەگەڵ نەزهەت محەممەد هاشم دەباغ ٥/ئادار/٢٠٠٨. بەلای ئێمەوە ڕەنگە خەریک بوونی زۆری بەکاروباری ڕێکخراوەیی و سیاسییەوە، هۆیەکی دیکەی دەرنەچوونی بێت.
(٤١) جەوهەر غەمگین، نامەی ١/٨/٩/٢٠٠٩، ل ٤.
(٤٢) نامەی ئەحمەد تاهیر نەقشبەندی لە ٢٥ی ئەیلوولی ٢٠٠٢: نامەی عەدنان نەقشبەندی لە ١٦ی ئابی ٢٠٠١: دیدار لەگەڵ شەمسەدین موفتی.
(٤٣) دیدار لەگەڵ نەزهەت محەممەد هاشم دەباغ لە ٨/ئادار/٢٠٠٨.
(٤٤) دیداری شەمسەدین مفتی.
(٤٥) بەهۆی بەرگریکردنی لەبارزانییەکان ڕەگەزنامەی عێراقی لێ سەندراوەتەوە. دامەزرێنەرانی پارتی دیموکراتی کورد بووە و پتر بیروباوەڕی چەپی هەبووە و یەکەمین سکرتێری پارتی بووە لە ساڵی ١٩٤٦دوە، لەساڵی ١٩٩٨ کۆچی دوایی کردووە.بڕوانە: د. عبدالفتاح بوتاني، الحياة الحزبية في الموصل، اربيل، ٢٠٠٣، ص٣٨١.
(٤٦) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: علي عبدالله، تاريخ الحزب الديمقراطي الكردستاني العراق حتي انعقاد المؤتمر الثالث، ايلول ١٩٦٨، ص ٧٠-٧١.
(٤٧) دیدار لەگەڵ شەمسەدین موفتی: دیدار لەگەڵ عەدنان نەقشبەندی "بەدرخان"، ژمارە (٤٨)، ٨ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٩، ل.٦ وێنەیەکی مێژوویی لە بەردەستە کە تێیدا ١ - بابا تاهیر جەلالی حەفید (قوتابی کۆلێژی حقوق بووە)
(٤٩) شەمسەدین موفتی (قوتابی کۆلیژی حقوق بووە) ٣- هەمزە عەبدوڵڵا یەکێک لە دامەزرێنەرانی پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکەمین سکرتێری پارتی ٤- مەئموون دەباغ دیارن، وێنەکە لە بەهاری ١٩٥٧ هەر لە خانووی حزب وێنەی گیراوە، بۆ زانیاری پتر بڕوانە: عبدالخالد صابر، وێنەکان لە خۆیان دەدوێن، بەرگی سێیەم،ج١، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل ١٣٩: هەروەها بەدرخان، ژمارە (٨٨)، ٢٢ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٨، ل٤. (لەئەرشیفی ئیحسان موفتی وەرگیراوە). جێی ئاماژەیە لێرەدا مێژووی وێنەکە ساڵی (١٩٥٦)ە، کە بەلای ئێمە ئەوەیان دروست ترە، چونکە ئەو کاتە هێشتا مەئموون نەچووبووە کۆلیجی ماف.
(٥٠) ئەو سەرچاوەیە کەوتۆتە سەرووی شاری هەولێر، لەسەر ڕێگای سەرەکی نێوان هەولێر - کۆیە.
(٥١) نامەی ئەحمەد شێخ تاهیر نەقشبەندی لە ٢٥ی ئەیلوولی٢٠٠٢.
(٥٢) فوئاد بابان، شەهید مەئموون دەباغ و چەند بیرەوەرییەک، "بەدرخان"، ژمارە (١٠٦)، ٨ تشرینی دووەم، ٢٠٠٨،ل ١٠. (لەساڵی ١٩٤٠ لەسلێمانی لەدایک بووە).
(٥٣) بیرەوەرییەکانی حەسەن مستەفا، ئامادەکردنی بەدرخان، بەشی دووەم، "بەدرخان"، ژمارە (٩٧)، ٨ی حوزەیرانی ٢٠٠٨، ل١٩: مەلا عەولای حاجی سمایل، سەربردەی ژیانی سیاسیم، ل١٩٧: بیرەوەرییەکانی عەریف سلێمان، لە دەنکەوە بۆ گوڵە گەنمەکان، بەرگی یەکەم، چ٢، چاپخانەی هاوسەر، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٥٦. ئەوەی جێی سەرنجە تەنیا شەمسەدین موفتی دەڵێت: ڕووداوەکە لەکۆتایی ساڵی ١٩٥٤ بووە، بڕوانە: دیداری شەمسەدین موفتی.
(٥٤) بڕوانە: بیرەوەری فازل پیرداود، "بەدرخان"، ژمارە (٩٤)،٢٢ی نیسانی ٢٠٠٨، ل ٦.
(٥٥) دیدار لەگەڵ نەزهەت محەمەد هاشم دەباغ لە ٥/ئادار/٢٠٠٨.
(٥٦) هەمان سەرچاوە.
(٥٧) هەمان سەرچاوە.
(٥٨) هەمان سەرچاوە.
(٥٩) دیدار لەگەڵ شەمسەدین موفتی.
(٦٠) نامەی عەدنان نەقشبەندی لە ٦ی ئابی ٢٠٠١.
(٦١) موسا عەنتەر ساڵی ١٩١٧ لەدیاربەکر لەدایک بووە، پارێزەرو ڕۆشنبیرێکی ناوداری کوردستانی باکوورە، لە ٢٠ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٩٢ لەلایەن دەزگا سەرکوتکەرەکانی تورکیا غافڵکوژ کرا. بڕوانە: عبدالفتاح علي البوتاني، دراسات ومباحث في تاريخ الكورد والعراق المعاصر، ص١٦٧هوامش.
(٦٢) دیدار لەگەڵ شەمسەدین موفتی.
(٦٣) دیدار لەگەڵ نەزهەت محەممەد هاشم دەباغ لە ٥/ئادار/٢٠٠٨ ،بەداخەوە هیچ بەرهەمێکی

نەماوەو ناشزانرا چی وەرگێراوە.
(٦٤) محەمەد نوری دەرسیمی (٣/١٨٩٢-١٩٧٣/٨/٢٢) پزیشکی دروستی ئاژەل، شۆرشگێرو مێژوونووس، ئەم کتێبەی بەکوردی نووسیوەوە هەر خۆی کردوویە بە تورکی و لەساڵی ١٩٥٢ لەچاپخانەی (العانی) لە حەلەب چاپی کردووە. ئەم کتێبە لەلایەن د. ئەحمەد فەتاح دزەیی لەتورکییەوە بۆ کوردی وەرگێراوە، لەهەولێر چاپکراوە، بڕوانە: د. نوری دەرسیمی، دەرسیم لەمێژووی کوردستاندا، وەرگێرانی د. ئەحمەد فەتاح دزەیی، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەدە، هەولێر، ٢٠٠١.

ئەحمەد فەتاح دزەیی وەرگێریش، پزیشکی مرۆیی لە ساڵی ١٩٣٣ لە گوندی (دووسەرە فەتاح) ی خوارووی هەولێر لەدایک بووە، لەساڵی ١٩٥٩-١٩٦٠ بڕوانامەی بەکالۆریوسی لە پزیشکی وەرگرتووەو لە ٢٠-٢١/ ئاداری ٢٠٠١، کۆچی دوایی کردووە. جێی سەرنجە لە پێشەکی وەرگێڕ بەناوی (چۆن ئەو کتێبەم دەستکەوت)، وەرگێر دەڵێت: عەلی فەتاح دزەیی (١٩٢٦-١٩٨٦) کاکی کاتێ لەشام خەریکی خوێندنی یاسا بووە، ئەو کتێبەی هێناوەو لەساڵی ١٩٦٠بەدیاری داویەتە دکتۆر عەبدلرەزاق شەهاب دەباغی نەشتەگەر لە هەولێر.

(٦٤) دیدار لەگەڵ شەمسەدین موفتی.

(٦٥) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: جەمشید حەیدەری، چەند لاپەرەیەک لەبیرەوەرییەکانم ١٩٤٩- ١٩٦٦، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٣، ل٦١-٦٣.

(٦٦) نامەی ئەحمەد تاهیر نەقشبەندی لە ٢٥ی ئەیلوول٢٠٠٢، هەروەها بڕوانە: جەمشید حەیدەری، س. پ، ل٦٣.

(٦٧) دیدار لەگەڵ نەزهەت محەممەد هاشم دەباغ لە ٨/ئادار/٢٠٠٨. ئەمەش بەڵگەی زیرەکی و توانای مەئموون دەردەخات.

(٦٨) لەسەرچاوەی دیکە قوتابخانەکە دواناوەندی (اعظمیة)ی کوڕانە. بڕوانە: نامەی ئەحمەد تاهیر نەقشبەندی لە ٢٥ی ئەیلوولی٢٠٠٢.

(٦٩) نامەی عەدنان نەقشبەندی لە ١٦ی ئابی ٢٠٠١.

(٧٠) طارق جمباز، خفايا تنشر لاول مرة عن مداهمة غرفة مأمون دباغ و سجنه وثم التحاقه بالثورة الكردية، الاتحاد (جريدة)، السليمانية، العدد ٨١٠، ٢ اب، ٢٠٠٤: نامەی ئەحمەد تاهیر نەقشبەندی، لە٢٥ی ئەیلوولی ٢٠٠٢..

(٧١) نامەی عەدنان نەقشبەندی لە ١٦ی ئابی ٢٠٠١.

(٧٢) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: فوئاد بابان، س.پ، ل ١٠.

(٧٣) بڕوانە: ئەحمەد سەلام، منیش بڕێ بیرەوەری تاڵ و شیرینم لەگەڵ شەهید "مەئموون دەباغ" دا، هەبووە، "بەدرخان"، ژمارە(١٠٥)، ٢٢ی تشرینی یەکەمی٢٠٠٨، ل ١٧: هەروەها بڕوانە: نامەی ئەحمەد تاهیر نەقشبەندی لە٢٥ی، ئەیلوولی، ٢٠٠٢.

(٧٤) ئەحمەد سەلام، س.پ، ل ١٧.

(٧٥) بڕوانە: کاکەمەم بۆتانی (کاکەمەم)ێکی تر، بیرەوەرەیی، بەرگی یەکەم، لەبلاوکراوەکانی بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیری گەلاوێژ، ژمارە (٦٨)، چاپخانەی سیما، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل ١٩٢.

(٧٦) بڕوانە: عەدنان نەقشبەندی، "بەدرخان"، ژمارە (١٠٩)، ٨ ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٩، ل ٦.

(٧٧) مومتاز حەیدەری، شەهیدی نەمر مەئموون دەباغ، رۆشنبیرێکی شۆڕشگێر، تێکۆشەرێکی نەتەوە پەروەر، پێشمەرگەیەکی قارەمان، "پێشکەوتن" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (٢٧)، شوباتی ١٩٩٣، ل٢٤، بیرەوەری عەدنان نەقشبەندی، "بەدرخان"، ژمارە (١٠٩)،٨ ی کانوونی دووەمی، ٢٠٠٩، ل٦، ص١١، هەروەها نامەی عەدنان نەقشبەندی لە ١٦ی ئابی ٢٠٠١.

(٧٨) دیدار لەگەڵ نەزهەت محەممەد هاشم دەباغ لە ٥/ئادار/٢٠٠٨.

(٧٩) واجید شاکر بیرەوەرییەکانی خۆی لەگەڵ شەهید مەئموون دەباغ دەگێڕێتەوە، ئامادەکردنی: بەدرخان، "بەدرخان"، ژمارە (١٠٨)، ٢٢ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٨،ل٦. (ساڵی ١٩٣٦ لەکۆیە لەدایک بووە).

(٨٠) ئەو کەسە هەولێرییە ناوی کەمال عوسمان ئاغای گوندی ساتووری سەربە خەبات بووە، ئەو پیاوە توانیویەتی بگاتە عەبدولکەریم قاسم، گوایە چەند

بەڵگەیەکی وەکو پارەی بێگانەو دروشمی سەربە سیاسەتی نیشانداوە، بەومانایەی کە دەوڵەتێکی بێگانە ئەوشتانەی داوەتێ بۆ نانەوەی ئاژاوەو (شۆڕش)، بەهۆی ئەمەوە بۆتە چاوساغی عەبدولکەریم لەکاروباری کوردەواری، دواتر شۆڕش لەناوی بردووە. بڕوانە: مەسعود محەمەد، گەشتی ژیانم، چ۱، ستۆکهۆڵم، ۱۹۹۲، جەمشید حەیدەری، س. پ،ل۷۰.

(۸۱) واجید شاکر، س.پ، ل٦.

(۸۲) علي سنجاري، من نبع الذاكرة، صفحات بطولية من نضال اتحاد طلبة كردستان "التآخي" (جريدة)، (بغداد)، العدد ٥٢٥٣)، ۱۰/اذار/۲۰۰۸.

(۸۳) ساڵح یوسفی لە ساڵی ۱۹۱۸ لە گوندی بامەڕنی سەر بە قەزای ئامێدی لە بنەماڵەیەکی خوێندەوار و ئایینپەروەر لەدایک بووە. لە کۆلێجی شەریعە لەساڵی ۱۹٤۲-۱۹٤۳ دەرچووە. هەر لەسەرەتای ژیانییەوە کاری سیاسی کردووە. دوای ڕێککەوتننامەی ۱۱ی ئاداری ۱۹۷۰ وەزیری دەوڵەت و هەروەها سەرۆکی کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کوردی بووە لە بەغدا. لە ۲٥ی حوزەیرانی ۱۹۸۱ لە بەغدا غافڵکوژ کرا. بڕوانە: عبدالفتاح علي البوتاني، الحياة الحزبية في الموصل ۱۹۲٦ ـ ۱۹٥۸، مطبعة وزارة التربية، أربيل، ۲۰۰۳، ص۳۸۱، بە وەرگرتن لە (عبدالسلام علي، صفحات من نضال الشهيد صالح يوسفي، أربيل ۱۹۹۲)

(۸٤) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: د. شێرکۆ فتح الله عمر، الحزب الديمقراطي الكوردستاني وحركة التحرر القومي الكوردية في العراق ۱۹٤٦ -۱۹۷٥، مطبعة رون، السليمانية، ۲۰۰٤، ص۱٥۱-۱٦٤.

(۸٥) دیدار لەگەڵ شەمسەدین موفتی.

(۸٦) بەدرەددین عەلی: عەقیدی سەربازی بووە، دووەم موتەسەڕیفی سەردەمی کۆماری بووە لە هەولێر لە نیسانی ۱۹٦۱. مرۆڤێکی توند و جدی دژ بە ئاژاوە و حەز بە سەروەری یاسا بووە، زۆر مەغرور و شانازی بەخۆی کردووە. بە هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول زۆر دژایەتی ئەو شۆڕشە و پارتی دیموکراتی کوردستانی کردووە. لە نیسانی ۱۹٦٤ لە هەولێر گوازراوەتەوە بۆ شاری عەمارە لە خوارووی عێراق و لەوێش توند بووە، پاش ماوەیەک حکومەت خانەنشینی کردووە، لە بەغدا نیشتەجێ بووە پاشان شۆڕشی کورد لەناوماڵی خۆی تۆڵەی لێکردۆتەوە و غافڵکوژ کراوە، بڕوانە: محسن دزةيي، أحداث عاصرتها، ج۱، حاوره طارق أبراهيم شريف، دار أراس للطباعة والنشر، مطبعة التربية، أربيل، ۲۰۰۱، ص۱۸٤-۲۰٥.

(۸۷) دیدار لەگەڵ نەزهەت محەممەد هاشم دەباغ، لە ۸/ئادار/۲۰۰۸..

(۸۸) دیدار لەگەڵ شەمسەدین موفتی.

(۸۹) هەمان سەرچاوە.

(۹۰) دیدار لەگەڵ شەمسەدین موفتی. سەبارەت بەچوونی وەفدەکە بۆ بەغدا. بڕوانە: جەمال نەبەز، کوردستان و شۆڕشەکەی، کوردۆ لەئاڵەمانیەوە کردوویە بە کوردی، ستۆکهۆڵم، ۱۹۸٥، ل۲۱۹- بەدواوە.

(۹۱) یوسف جەمیل میران، پلەی ڕەئیس بووە لەسوپای عێراق، بەشداری شۆڕشی ئەیلولی کردووە، ئەندامی پەرلەمانی کوردستان بووە لە۲۳/۷/۲۰۰۷ کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: طارق جامباز و نیعمەت عەبدوڵڵا پیرداود، پەرلەمەنتارانی خولی یەکەمی پەرلەمانی کوردستان- عێراق ۱۹۹۲- ۲۰۰٥، هەولێر، ۲۰۰۸، ل١٦٥.

(۹۲) دەستخەتێکی بڵاونەکراوە لەبارەی شەهید، مەئموون دەباغەوە، (K21) (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (۲، ۳)، ۲۰۰۸، ل٤٥٦. جێی ئاماژەیە ئەوە دەستخەتی یوسف جەمیل میرانە لە ۲۷/۱۰/۲۰۰۳ بۆ تاریق جامبازی نووسیوە، زۆربەی زانیارییەکان وەک دەستنووسەکەی لای ئێمەیە.

(۹۳) دەستنووسێکی یوسف میران (۸) لاپەڕەیە، مێژووی بەسەرەوە نییە..

(۹٤) بڕوانە: کاکەمەم بۆتانی (کاکەمەم)ێکی تر، سەرچاوەی پێشوو، ل ۲۳٦.

(۹٥) دیدار لەگەڵ شەمسەدین موفتی.

(٩٦) بڕوانە: تاریق جـامـبــاز، دەســتــخــەتێکی بڵاونەکراوە...، ل٤٥٧.
(٩٧) یوسف میران، س.پ.
(٩٨) تاریق جامباز، دەستخەتێکی بڵاونەکراوە...، ل٤٥٧.
(٩٩) دیداری شەمسەدین موفتی.
(١٠٠) دیدار لەگەڵ عدنان نەقشبەندی، "بەدرخان"، ژمـارە،(١٠٩)، ٨ ی کـانوونی دووەمی٢٠٠٩، ل٦: واجید شاکر، س.پ، ل٩. هەولێ زۆرماندا ئەو رۆژنامەیە دەست بخەین، بەڵام بێ ئاکام بوو.
(٩٩) بڕوانە: علي سنجاري، مصدر سابق،، ص٣.
(١٠١) کاکە مەم بۆتانی، ل ٢٣٦.
(١٠٢) دیدار لەگەڵ شەمسەدین موفتی.
(١٠٣) ئاغجەلەر: ناحیەیەکە سەر بەقەزای چەمچەماڵ لەمەڵبەندی کەرکووک. بڕوانە: د. عەبدوڵڵا غەفوور، گوندەکانی کوردستان، باشووری کوردستان لەسەرژمێری دانیشتوانی عێراقدا- ١٩٥٧، بەرگی دووەم، چاپی هەولێر، ٢٠٠٥، ل١٨٧.
(١٠٤) علي سنجاري، مصدر سابق.
(١٠٥) بڕوانە: ئەحمەد سەلام، ل ١٧.
(١٠٦) بڕوانە: د. عبدالستار تاهیر شەریف، ململانێ لەگەڵ ژیاندا، (یادداشت) ١٩٣٥-١٩٧١، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئارابخا، کەرکووک، ٢٠٠٥، ل ٨٤.
(١٠٧) بڕوانە: "خەبات" العدد، ٤٧٠، ایلول ١٩٦٣، ص٨.
(١٠٨) بۆ نموونە لەیادی شەهیدانی کوردستاندا، بەیاننامەی هاوبەشی رێکخراوە جەماوەرییەکانی کوردستان، ئافرەتان و قوتابیان و لاوان و مامۆستایانی ناوی شەهید مەئموون هاتووە. بڕوانە: (التآخي) (الجريدة)، بغداد، العدد (١٣٦٢)، ١٩٧٣/٦/١٩، ص٧٣.
(١٠٩) "هاوکاری" هەمان سەرچاوەی پێشوو.
(١١٠) بڕوانە: تاریق جامباز، "پێشکەوتن"، ژمارە (٢٧)، شوباتی ١٩٩٣.
(١١١) مومتاز حەیدەری، شەهیدی نەمر مەئموون دەباغ، رۆشنبیرێکی...پێشکەوتن، ژمارە (٢٧)، شوباتی ١٩٩٣، ل ٢٤
(١١٢) بڕوانە: ئەسعەد عەدۆ، لەیادی ساڵرۆژی شەهیدێکی بێ ناز، "برایەتی" (رۆژنامە)، هەولێر، ژمارە (١٧١٢)، ١٩٩٣/٨/٧.
(١١٣) عەدنان نەقشبەندی، دیسان لەیادی شەهید مـأمـون دباغ، "برایەتی"، ژمارە (١٧١٥)، ١٠/٨/ ١٩٩٣.
(١١٤) شەهیدی نەمر (مەئموون دەباغ، یەکەم شەهیدی یەکێتی قوتابیانی کوردستان، خەباتی قوتابیان (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (١٣)، خولی سێیەم، تەمووزی ١٩٩٦، ل ٢.
(١١٥) ناوەندی شەهید مەئموون دەباغ کەوتۆتە سەر شەقامی گوڵان.
(١١٦) ئەو بنکەیە کەوتۆتە بەرانبەر بارەگای یەکێتی نووسەرانی کورد- لقی هەولێر.
(١١٧) رائد خدر دەبباغ، بیرەوەرییەکانم و تۆپخانەی شـۆڕشی ئەیلوولی مـەزن، دەزگـای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، ژمارە (٩٥)، هەولێر، ٢٠٠٢، ل ٣٧-٣٨.

**سەرچاوەکان**

- نامەی زانکۆیی
- ماجد حسن علي، الحركة الطلابية الكوردية في العراق ١٩٢٦- ١٩٧٠ رسالة ماجستير (غير منشورة)، كلية الاداب- جامعة صلاح الدين اربيل، ٢٠٠٨.

**یادداشت بە زمانی کوردی**

- بیرەوەرییەکانی عەریف سلیمان، لەدەنکەوە بۆ گوڵەگەنمەکان، بەرگی یەکەم، چ٢، چاپخانەی هاوسەر، هەولێر، ٢٠٠٧.
- جەمشید حەیدەری، چەند لاپەڕەیەک لەبیرەوەرییەکانم ١٩٤٩-١٩٦٦، ستۆکهۆڵم.
- رائد خدر دەبباغ، بیرەوەرییەکانم و تۆپخانەی شۆڕشی ئەیلوولی مـەزن، دەزگـای چاپ و بڵاوکـردنەوەی موکریانی، ژمارە (٩٥)، هەولێر،٢٠٠٢.
- عبدالستار تاهیر شەریف (د.)، ململانێ لەگەڵ ژیاندا، (یادداشت) ١٩٣٥-١٩٧١، بەرگی یەکەم، چاپخانەی ئارابخا، کەرکوک، ٢٠٠٥.

- کاکە مەم بۆتانی، کاکە (مەم)ێکی تر، بیرەوەریی، بەرگی یەکەم، لەبلاوکراوەکانی بنکەی ئەدەبی و رووناکبیری گەلاوێژ، ژمارە(٦٨)، چاپخانەی سیما، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- گۆتفرید یۆهانز میوولەر، لەرۆژهەلاتی گرگرتوودا، نێردەی بەمەترسیی رۆژهەلاتی ناوەراست ١٩٤٣، وەرگێرانی: بەدران ئەحمەد حەبیب، پێشەکی د. مارف خەزنەدار، هەولێر، ١٩٩٢.
- مەسعود محەمەد، گەشتی ژیانم، چ١، ستۆکهۆلم، ١٩٩٢.
- مەلا عەولای حاجی سمایل، سەربردەی ژیانی سیاسیم، بەرگی یەکەم، چاپخانەی ئەرشاد، بەغدا، ١٩٩٠.

**کتێب بەزمانی کوردی**

- جەمال نەبەز، کوردستان و شۆرشەکەی، کوردۆ لە ئەلەمانییەوە کردەیە بەکوردی، ستۆکهۆلم، ١٩٨٥.
- طارق جامباز و نیعمەت عەبدوللا پیرداود، پەرلەمەنتارانی خولی یەکەمی پەرلەمانی کوردستان-عێراق ١٩٩٢- ٢٠٠٥، هەولێر، ٢٠٠٨.
- د. عەبدوللا غەفوور، گوندەکانی کوردستان، باشووری کوردستان لەسەرژمێری دانیشتواتی عێراقدا- ١٩٥٧، بەرگی دووەم، چاپی هەولێر، ٢٠٠٥.
- فائیق بێکەس، دیوانی بێ کەس، محەمەدی مەلا کەریم رێکی خستووەو سەرەتای بۆ نووسیوە، چ٢، کتێبخانەی (الطليعة) لەکەرکوک، چاپخانەی الاديب، بەغدا، ١٩٨٠.
- فەیسەل دەباغ، حزبی هیوا و شۆرشی (١٩٤٣ - ١٩٤٥)ی بارزان،چ١، دەزگای راگەیاندنی گولان، چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٧
- مەولوود قادر بێخالی، هەولێرم وادیوە و بیستووە، بەرگی دووەم، چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر ١٩٩٧.
- مەولوود قادر بێخالی، هەولێرم وادیوە و بیستوو، بەرگی سێیەم، لەبلاوکراوەکانی کتێبخانەی (سۆران) لەهەولێر، زنجیرەی ژمارە (٣٣) چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر،٢٠٠٥.
- نوری دەرسیمی(د.) دەرسیم لەمێژووی کوردستاندا، وەرگێرانی د. ئەحمەد فەتاح دزەیی، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.
- هەژار، بۆ کوردستان، دەزگای چاپ وبلاوکردنەوەی ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.

**کتێب بەزمانی عەرەبی**

- جمال بابان، أعلام كرد العراق، من مطبوعات وزارة الثقافة، مطبعة شڤان، سليمانية، ٢٠٠٦.
- شيركو فتح الله عمر(د.)، الحزب الديمقراطي الكردستاني وحركة التحرر القومي الكوردية في العراق ١٩٤٦-١٩٧٥، مطبعة رون، السليمانية، ٢٠٠٤.
- عبدالستار طاهر شريف، الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكوردية في نصف قرن، ط٢، السليمانية، ٢٠٠٧.
- عبدالسلام علي، صفحات من نضال الشهيد صالح اليوسفي، أربيل، ١٩٩٢.
- عبدالفتاح علي البوتاني(أ. د)، دراسات ومباحث في تأريخ الكورد و العراق المعاصر، دار سپيريز، مطبعة حاجي هاشم، ٢٠٠٧ اربيل.
- عبدالفتاح علي البوتاني(أ. د)ـ الحياة الحزبية في الموصل، اربيل، ٢٠٠٣،
- علي عبدالله، تاريخ الحزب الديمقراطي الكوردستاني في العراق حتى انعقاد المؤتمر الثالث، ايلول ١٩٦٨، طبعة ١٩٩٢.
- محسن دزەيي، أحداث عاصرتها، ج١، حاوره طارق أبراهيم شريف، دار اراس للطباعة والنشر، مطبعة التربية، أربيل، ٢٠٠١.
- د.محمد الصويركي، معجم اعلام الكرد في التاريخ الاسلامي والعصر الحديث في كردستان وخارجها، بنكەی ژين لاحياء الوثائقي والصحفي الكردي، مطبعة مؤسسة حمدي، السليمانية، ٢٠٠٥، ص ١٨٤.
- مكرم الطالباني (د)، حزب هيوا، منشورات مركز خاك، مطبعة خاك، سليمانية، ٢٠٠٢

**یادداشتە وتار بە کوردی**

- ئەحمەد سەلام، منیش بری بیرەوەری تاڵ و شیرینم

لەگەڵ شەهید " مەئموون دەباغ" دا هەبووە " بەدرخان"، ژمارە (١٠٥)، ٢٢ی تشرینی یەکەمی٢٠٠٨.
- بیرەوەرییەکانی حەسەن مستەفا، ئامادەکردنی بەدرخان، بەشی دووەم، " بەدرخان"، ژمارە (٩٧)، ٨ی حوزەیرانی ٢٠٠٨.
- بیرەوەریی فازل پیرداود، "بەدرخان"، ژمارە (٩٤)، ٢٢ی نیسانی ٢٠٠٨.
- عەدنان نەقشبەندی، "بەدرخان"، ژمارە (١١٠)، ٢٢ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٩.
- فوئاد بابان، شەهید مەئموون دەباغ و چەند بیرەوەرییەک، "بەدرخان"، ژمارە (١٠٦)، ٨ی تشرینی دووەمی٢٠٠٨.
- واجید شاکر، بیرەوەرییەکانی خۆی لەگەڵ شەهید مەئموون دەباغ، دەگێڕێتەوە، ئامادەکردنی بەدرخان، "بەدرخان"، ژمارە (١٠٨)، ٢٢ی کانونی یەکەمی ٢٠٠٩.

**وتارەکان بەزمانی کوردی**

-ئازاد عوبێد ساڵح، گوزەرێک بەژیانی شەهید مەئموون دەباغ، " بەدرخان" (هەفتەنامە)، هەولێر، ژمارە (١٠٤)، ٢٢ی ئەیلوولی ٢٠٠٨.
- ئەسعەد عەدۆ، لەیادی ساڵرۆژی شەهیدێکی بێناز، "برایەتی" (رۆژنامە)، هەولێر، ژمارە (١٧١٢)، ٧ی ئابی ١٩٩٣.
تاریق جامباز، دەستخەتێکی بڵاوکراوە لەبارەی شەهید مەئموون دەباغەوە ((K21)) (گۆڤار)،هەولێر، ژمارە(٢-٣)، ٢٠٠٨.
- تاریق جامباز، دەبا چیتر شەهید"مەئموون دەباغ" لەبیر نەکەین، "پێشکەوتن"، ژمارە (٢٧)ی شوباتی ١٩٩٣.
- شەهیدی نەمر (مەئموون دەباغ)، یەکەم شەهیدی یەکێتی قوتابیانی کوردستان، " خەباتی قوتابیان"، (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (١٣)، خولی سێیەم، تەمموزی ١٩٩٦.
- عەدنان نەقشبەندی، دیسان لەیادی شەهید مەئموون دەباغ دا، "برایەتی" ژمارە (١٧١٥)، ١٠ی ئابی ١٩٩٣.
- مومتاز حەیدەری، شەهیدی نەمر مەئموون دەباغ، رۆشنبیرێکی شۆڕشگێر، تێکۆشەرێکی نەتەوە پەروەر، پێشمەرگەیەکی قارەمان، "پێشکەوتن"، ژمارە(٢٧)، شوباتی١٩٩٣.

**وتار بەزمانی عەرەبی:**

- سفين الجبل الاشهم.. وجموع طلابية جاءت لتبني وتعلم وتتعلم، اعداد وتقديم، عبدالوهاب الطالباني، (التآخي) (جريدة)، بغداد، العدد ١٣٨٣، ١٤تموز ١٩٧٣.
- طارق جمباز، خفايا تنشر لأول مرة عن مداهمة غرفة مأمون دباغ وسجنه وثم التحاقه بالثورة الكردية،" الاتحاد" (جريدة)، السليمانية، العدد (٨١٠)، ١٢ اب٢٠٠٤.
- علي سنجاري، من عيون الذكراة، صفحات من نضال اتحاد طلبة كردستان "التآخي" (جريدة)، (بغداد)، العدد ٥٢٥٣)، ١٠/اذار/٢٠٠٨
- كيف استشهد مأمون دباغ، "خقبات" (جريدة)، العدد ٤٧٠، ايلول ١٩٦٣.

**دەستنووس و نامە بەزمانی کوردی**

- دەستنووسێکی یوسف میران، (٨) لاپەڕەیە (لای بنەماڵەکەی هەڵگیراوە).
- نامەی ئەحمەد تاهیر نەقشبەندی لە ٢٥ی ئەیلوولی ٢٠٠٢. (لای بنەماڵەکەی هەڵگیراوە)
- نامەی جەوهەر غەمگین ٢١ی ئاداری٢٠٠٨ (لای توێژەرە).
- نامەی عەدنان نەقشبەندی لە ١٦ی ئابی ٢٠٠١(لای بنەماڵەکەی هەڵگیراوە).
- دۆسیەی تایبەتی لە بەرێوەبەرایەتی پەروەردەی هەولێر.

**دیدارەکان**

- شەمسەدین موفتی (دوو کاسێتە لەئاداری ٢٠٠٥ تۆمار کراوە). (لای بنەماڵەکەی هەڵگیراوە).
- عەدنان نەقشبەندی "بەدرخان"، ژمارە (١٠٩)، ٨ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٩.
- نەزهەت محەمەد هاشم دەباغ لە٥-٨/ئاداری ٢٠٠٨ هەولێر.

# مونیرە مەلا تاهیر جەلیزادە

## کازم عومەر دەباغ

ئێمە بەدرێژایی شۆڕش زۆر ژنمان هەیە کە لە ڕێگای کوردایەتیدا گیانی خۆیان بەخشیوە. ئەوەی لێرەدا پێویستە باسی بکەین ئەوەیە کە یەکەم ژنە شەهیدی شۆڕشی ئەیلوول لە شاری کۆیە بوو بەناوی (مونیرە مەلا تاهیر جەلیزادە) ئەم شێرەژنە لە ڕۆژی ١٩٦٣/٧/٤ دا لەلایەن پیاوە دڕندەکانی ڕژێمی ئەو کاتەی عێراق لە ناو ماڵەکەی خۆی درایە بەر ڕێژنەی گوللە و شەهیدیان کرد. ئەم ژنە شەهیدە شەهیدێکی دووگیانی بوو شەهیدێک بوو دەبوو پێشی (عومەر خاوەر) پەیکەری بۆ دروست بکرابایە چونکە ئەم شێرەژنە کوڕە کۆرپەلەکەی کە تاقانەی حەوت خوشک بوو بەناوی (شوان سابیر مەلا رەئووف جەلیزادە) کە تەمەنی ساڵێک بوو بە بەرسینگییەوە بوو خەڵتانی خوێنیان کردن و خوێنی دایک و کۆرپەلە تێکەڵ بەیەکدی بوون.

من لێرەدا وەک شاهێدحاڵێک ئەو کات تەمەنم سێزدە ساڵان بوو بەرەو ڕووداوەکە رامان کرد چونکە ئەو ڕۆژە هاتوچۆ قەدەغە بوو لە هەموو خەڵکی شار. رەشبگیر بوو، پیاوی شار هەموو گیران بۆیە ماوەیەک تەرمی ئەم شەهیدە لەم گۆڕە مابۆوە تا چەند ژنێک هاتن لەگەڵ چەند هەرزەکارێکی هاوتەمەنی من تەرمەکیان خستە سەر قادرمەیەکی دار و بەرزیان کردەوە تا گەیاندییانە نەخۆشخانەی کۆیە. بەڵام هەر ئەوکات دایک و کۆرپەکە گیانیان لەدەست دابوو. کەچی هەر بردنیان بەراستی ڕۆژێکی زۆر تاڵ و ناخۆش بوو. چەند پیرەمێردێکی گەڕەک دوایی چوون بۆ گۆڕستانی دەروێش خدر و قەبریان ئامادە کرد و دوایی جەنازەکەیان هێنایەوە و بەخێرایی بەخاکیان سپاردن.

پیاوە گیراوەکانیش کە بەسەدەها کەس دەبوون رەوانەی بەندیخانەی موسەیەب کران. بەڵام ڕۆژی ١٩٦٣/٧/٧دا جارێکی دیکە هاتوچۆیان قەدەغە کرد و کردیان بەتەقە. لە ئەنجامی ئەم تەقەیە چەندین کەس کەوتنە بەر گوللەی وێڵ و شەهید بوون لەوانە.

مەلای شێخ تاهیر و حەمیدی فەقێ سمایلی دارتاش و جەلال سمایل ئەحەسوور بەڵام ئەوەی گرنگە لە هەمان ڕۆژدا واتە لە ١٩٦٣/٧/٧ دا بە فەرمانی جەلادی گەورەی ڕژێم (تاهیر شەکرچی) کە ئەفسەرێکی پایە بڵندی ڕژێم بوو. هەموو ئەو کەسانەی کە لە ڕۆژی ١٩٦٣/٧/٤ دا دەستگیر کرابوون. بەبەندکراوی رەوانەی شاری موسەیب کران و ماوەی پێنج مانگ لە بەندیخانە مانەوە دوایی ئازاد کران. بەڵام شەش کەس لەم کەسانەی کە لە ١٩٦٣/٧/٤دا گیرابوون لەگەڵ خەڵکەکە رەوانی موسەیب نەکران ڕۆژی ١٩٦٣/٧/٧بەیانییەکەی لە

دینگەیان پێچان و گوللەباران کران هەر شەش شەهیدەکە موسڵمان و دیانی شاری کۆیە بوون پاش شەو و ڕۆژێک کە تەرمەکانیان بە پێچراوی بەدینگەکانەوە مایەوە مەلای مزگەوتی گەورەی کۆیە مامۆستا مەلا عەلی حاجی تۆفیق و قەشەی کەنیسەی کۆیە بەخۆیان و قورئان و ئینجیلەوە چوونە لای جەلاد (تاهیر شەکرچی) بۆ ئەوەی ڕێگایان پێ بدات بۆ ئەمەی تەرمی ئەم شەش شەهیدە بەخاک بسپێرن.

شەهیدەکانیش ئەوانەن:

١- شەهید شەفیق ئۆمەر حەمەد چایەچی لە گۆڕستانی شەهیدان نێژراوە.

٢- شەهید حەمەدئەمین ئەحمەد ئاغا حەویزی لە گۆڕستانی شەهیدان نێژراوە.

٣- شەهید سولەیمان حەمە قاوەچی لە گۆڕستانی دەرویش خدر نێژراوە.

٤- شەهید محەمەد وەهاب ئاغای حەویزی لە گۆڕستانی دەرویش خدر نێژراوە

٥- شەهید یوسف حەنا بەرگدروو لە گۆڕستانی هەرمۆتە نێژراوە

٦- شەهید حەنا یوسف هەرمۆتەیی لە گۆڕستانی هەرمۆتە نێژراوە

ئەم ڕۆژە ڕەشەی١٩٦٣/٧/٧ کە ڕۆژێکی پڕ لە ڕووداوی تراجیدییایە لە مێژووی کوردایەتی و خەباتی شاری حاجی کە پێویستە هەرگیز لە یاد نەکرێن.

ئەوەی گرنگە دەبوو لایەنە پەیوەندداره‌کان بەدواداچوونیان بکردبایە و لەدەرگای هەموو خانوادەیەکی خاوەن شەهیدیان بدابایە بۆ ئەوەی زانیارییان لەسەر ئەم شەهیدانە کۆبکردبایەوە و هیوا و ئومێدیان پێ ببەخشیبانایە. بەڵام مەسەلەکە پێچەوانەی ئەم خواست و داواکارییانەیە کە ئێمە خوازیاری بووین. چونکە لە کاتی پەیوەندیکردنم بە هەندێک لە کەسوکاری ئەم شەهیدانە لە قسەکانیان وا دەردەکەوێت کە لێپرسراوانی لایەنە پەیوەندداره‌کانی وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوەکان تا ئێستا بەوشەیەکیش ئەوانەیان بەسەر نەکردۆتەوە.

بۆیە لێرەدا هەقمە بڵێم ئێمە ئەمڕۆ لە هەر پایە و مەقامێک بین بەرهەمی خوێنی ئەم شەهیدانەیە بۆیە پێویستە وەفادار بین و لە ئاستی لێپرسراوەتی دابین بەرانبەر خانەوادەکانیان و جگە لەمە ساڵانە یادی شەهیدە سەربەرزەکانمان بکەینەوە. لێپرسراوانی شاری کۆیەش دەبوو تا ئێستا ناوی قوتابخانەیەک یا شوێنێکی گشتییان بەناوی ئەم شێرەژنە شەهیدەوە ناوبنابایە بۆ ئەوەی خەبات و تێکۆشانی ژنانی کوردیش لە مێژووی کوردایەتیدا دیاربێت. دوابەدوای ئەم هەموو ڕووداوە تراجیدییایەی کە بەسەر ئەم شارە شەهیدپەروەرە داهات و بیست و چوار ڕۆژ دوای کارەساتەکەی گوللەبارانەکەی ئەم شەش کەسەی کە باسمان کردن ڕۆژی١٩٦٣/٧/٣١ ڕژێمی خوێنڕێژی ئەم کاتە جارێکی دیکە چوار کەسی دیکەیان لە دینگە پێچا و گوللەبارانیان کردن ئەمەش ناوی شەهیدەکانە کە سێیان لەم شەهیدانە برا بوون. ئەم کارەش بەهەمان شێوەی ڕووداوەکەی ١٩٦٣/٧/٧بەفەرمانی تاهیر شەکرچی بوو شەهیدەکانیش ئەمانەن:

١- شەهید حوسێن شەریف ئیبراهیم

٢- شەهید حەسەن شەریف ئیبراهیم

٣- شەهید عومەر شەریف ئیبراهیم

٤- شەهید قولی کێخوا عەلی کێلەسپی

ڕژێمی ئەوسای عێراق بۆیە ئەوجارەش ئەم کارەی ئەنجام دا بۆ ئەوەی شکستییەکانی خۆی بشارێتەوە لە بەرەکانی شەڕی نێوان هێزی لەشکری کوردستان و ڕژێم.

بەڵام هەرچۆنێ بێت هیچ کاتێک ترس و تۆقاندن ناتوانێت ئیرادەی بەهێزی گەلێکی ستەمدیدەی وەک کورد لە بن بێنێت. هەر بۆیەش ئەم ڕووداوە تراجیدییانە وای لە (کامەرانی شاعیر) کردووە بڵێت:

**چاوم هەڵهێنا دیم ئەم میللەتە**
**دیمەنی ژینی قەنارە و پەتە**

**لە هەفتەنامەی بەدرخان بڵاوکراوەتەوە**

# کەمال رەشید حەوێزی
# ۱۹۲۷-۱۹٦۳



پەروەردەکار و تێکۆشەری خۆبەختکەر، شەهید کەمال رەشید حەوێزی، لە ساڵی ۱۹۲۷دا لە شاری کۆیە، شاری ئەدەب و هونەر و خەباتی کوردایەتی لەدایک بووە و لە ساڵی ۱۹۳٤دا چۆتە بەر خوێندن لە قوتابخانەی سەرەتایی یەکەمی کۆیە و لە ساڵی ۱۹٤۳دا ئەو قۆناغەی خوێندنی بریوە و چۆتە قوتابخانەی ناوەندیی کۆیە و لە ۱۹٤۷دا بروانامەی دەرچوونی وەدەست هێناوە و چووەتە بەغدا و لە خانەی مامۆستایانی سەرەتایی لە ئەعزەمییە وەرگیراوە و لە پایزی ۱۱۹٥۰دا کراوە بەمامۆستا لە قوتابخانە سەرەتاییەکان و ماوەیەکیش بەڕێوەبەری قوتابخانە بووە و زۆر سەرکەوتووانە کاروباری قوتابخانەی هەڵسووڕاندووە.

ئەم کەسایەتییە، لە پایزی (۱۹٤٥)ەوە پەیوەندیی بەرێکخراوی سیاسیی کوردەوە کردووە و بووەتە ئەندامێکی دڵسۆز و چالاکی حزبی رزگاری کورد و هۆشیاری سیاسی و بیروباوەڕی نەتەوایەتیی کوردی لە ناو قوتابییەکانی قۆناغی ناوەندیی بلاو کردۆتەوە جگە لە بلاوکردنەوەی هەفتەنامەی (رزگاری)ی زمانحاڵی حزبەکەی (رزگاری)، بەناو ئەندام و لایەنگرانی ئەو رێکخراوە سیاسییەدا.

لە دوای دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ۱۹٤٦/۸/۱٦دا، بووەتە ئەندامێکی چالاکی پارتی و کە چووەتە بەغدا بووەتە یەکێک لە کادیرەکانی ئەم حزبە لە خانەی مامۆستایان و لەخۆپیشاندانەکانی راپەڕینە نیشتمانییەکەی کانوونی دووەمی ۱۹٤۸دا بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی (پۆرتسمۆس)ی نێوان عێراق و بەریتانیا لە رێکخستنی قوتابییە کوردەکان و لەو خۆپیشاندانانەدا دەورێکی چالاکانەی هەبووە.

لە دوای راپەڕینە نیشتمانییەکەش دەورێکی باشی بووە لە پارێزگاریکردن لە خوێندکارانی کۆلێجی مەلیک فەیسەل لەو کاتەی نەتەوەپەرستە عەرەبەکانی سەر بەحزبی ئیستیقلال هێرشیان کردە سەر ئەو کۆلێجە، چونکە زۆربەی هەرە زۆریان پێشکەوتنخواز بوون و لەگەڵ نەتەوەپەرستەکاندا نەبوون، لەو شەڕە بریندار بوو و لەگەڵ بریندارەکانی ئەو بەیەکدادانە ناوی بلاو کرایەوە و لە رۆژنامەکانی ئەوسای بەغدا دەنگی دایەوە.

کەمال حەوێزی لە ناوەڕاستی پەنجاکانی سەدەی رابوردوودا هەڵوێستێکی چەپڕەوی لە رێبازی خەباتی نیشتمانی هەڵبژارد و بووە ئەندامێکی لێهاتووی حزبی شیوعی و زۆر بەدڵسۆزی لە ناو ئەو رێکخراوە سیاسییەشدا خەباتی کرد و لە دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ۱۹٥۸ی گەلی عێراق، بۆ ئەندامیەتیی کۆنگرەی سێیەمی سەندیکای مامۆستایانی کۆماری عێراق هەڵبژاردرا، وەک نوێنەری مامۆستایانی کۆیە لەسەر لیستی مامۆستایانی پیشەیی کە سەر بەحزبی شیوعی و بەرەی دیموکراتی بوو و لەو کۆنگرەیەدا گەلێک پێشنیاز و داواکاری باشی بۆ چاککردنی باری ژیانی مامۆستایان پێشکەش بەکۆنگرەکە کرد.

لە دوای کودەتا شوومەکەی ۸ی شوباتی ۱۹٦۳دا ماوەیەک خۆی شاردەوە، بەڵام لە دواییدا لە ترسی ئەشکەنجەدانی خێزانەکەی خۆی بەدەستەوە دا و زۆری پێ نەچوو، رژێمی بەعسی فاشی قاروقینی رەشی خۆی پێ رشت و بەتاوانی حەشاردان و دەربازکردنی ئەفسەری تەجنیدی قەزای کۆیە بۆ ناو پێشمەرگەی کوردستان، دوای دادگاییکردنێکی رواڵەتی بەپەلە حوکمی ئیعدامی بۆ دەرچوو و لە رۆژی ۱۹٦۳/۷/۱۷دا لە ناو ئۆردووگای رەشی هێزی سەربازیی کۆیە، لە دامێنی چیای هەیبەتسوڵتان گوللەباران کرا و گیانی پاکی چووە دنیای شەهیدانی رێبازی خەباتی نیشتمانی.

**کەریم شارەزا**

# نافیع یونس
# ١٩٢٦ - ١٩٦٣



نافیع یونس، لە سالّی ١٩٢٦دا لە شاری هەولێری دێرین لەدایک بووە. کوڕی (مەلا یونس)ی کاتبی یەکەمی دادگای شەرعیی هەولێر بووە. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە شارەکەی خۆی خوێندووە و لە سالّی ١٩٤٤دا چووەتە بەغدا و لە کۆلێجی حقووق وەرگیراوە و لە سالّی ١٩٤٨دا خوێندنی تەواو کردووە و بووەتە پارێزەرێکی یاساناس.

شەهید نافیع، لە سالّی ١٩٤٠دا بووەتە ئەندامێکی چالاکی حزبی هیوا و لە دواییدا چووەتە ریزی بزووتنەوەی پێشکەوتنخوازی مارکسی و کەوتووەتە پالّ ڕێکخراوی (کۆمەڵی میللەت) و دوای ڕێککەوتنی ئەو ڕێکخراوە سیاسییە لەگەلّ ڕێکخراوێکی دیکەی مارکسی بەناوی (یەکێتیی تێکۆشین) بووەتە ئەندانی کۆمیتەی ناوەندیی ئەو حزبە و لەگەلّ دروستبوونی هەردوو ڕێکخراوی (شۆڕش) و (ڕزگاری)یش بووەتە ئەندامی سەرکردایەتی لە هەردوو حزبدا.

دوای هەلّوەشانەوەی "شۆڕش" و "ڕزگاری" و دروستبوونی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ١٩٤٦/٨/١٦دا هەندێک لە ئەندامانی (شۆڕش) چوونە پالّ پارتی دیموکراتی کوردستان و هەندێکیشیان چوونە ناو حزبی شیوعی عێراق. شەهید نافیع، یەکێک بوو لەوانەی چوونە ناو حزبی شیوعی سالّی ١٩٤٨ لەبەر چالاکیی سیاسیی دلّسۆزانەی بۆ حزبەکەی بووە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حزبەکە. بەلاّم لە دوای خیانەتەکەی (مالیک سێف)ی سەرکردەیەکی ئەوسای حزبی شیوعی و درکاندنی ناوی سەرکردەکانی حزب، گیراوە و بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ حوکم دراوە و لە بەندیخانەکانی بەغدا و "نوگرە سەلمان" و "باقووبە" ماوەی بەندکردنەکەی بەسەر بردووە و لە ڕۆژی تەقە لێکردنی بەندییەکانی بەندیخانەی بەغدا لەلایەن وەردییانەکانەوە بریندار کراوە، کە ڕووداوەکە لە ڕۆژی ١٩٥٣/٦/١٨ قەوماوە و گەلێک لە بەند کراوە سیاسییەکانی دیکەش زامدار دەکرێن.

لە دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی گەلی عێراق، لە بەندیخانە ئازاد دەکرێ و بەردەوام دەبێ لەسەر خەباتی سیاسی و دەرچوواندنی ڕۆژنامەی (ئازادی)ی ئۆرگانی حزبی شیوعی- هەرێمی کوردستانی پێ دەسپێردرێ و وا بوو ژمارە (یەکی) ئازادی لە ١٩٥٩/٥/١ لە شاری کەرکووک دەرچوواند و دوای ئەوە ئەو ئۆرگانەی حزب گوێزرایەوە بۆ بەغدا و وەک سەرنووسەر شەهید نافیع بەردەوام بوو لەسەر دەرچوواندنی بەرێکوپێکی تاکو دوا دوای سالّی ١٩٦٠ ئینجا حکوومەتەکەی عەبدولکەریم قاسم دایخست.

لە پاش کودەتا شوومەکەی ٨ی شوباتی سالّی ١٩٦٣ی ڕژێمی بەعسی فاشی، گیراوە و دوای ئەشکەنجەدانێکی بەزەبروزەنگ شەهید کراوە و هەرچەندە ڕۆژی شەهیدکردنەکەی نازانرێ، بەلاّم ئەوەی زانراوە لە مانگی ئاداری ١٩٦٣دا شەهید کراوە.

شەهید نافیع یونس خەباتگێڕێکی دلّسۆزی میللەتەکەی بوو، هەموو دەم ئامادە بوو خۆی لە پێناوی ئاوات و ئامانجەکانی حزبی شیوعی و میللەتەکەی بەخت بکات و لە ڕاستیشدا خۆی لە پێناوی بیروبڕوا ڕووناکەکەی بەخت کرد و ناوی پاکی و کردەوەی چاکی تا هەتایە لە ناو تێکۆشەرانی کورد و کوردستان و هەموو عێراقیش بەنەمری دەمێننەوە.

نافیع یونس، بەشداریکردنی لە ڕۆژنامەگەریدا هەر لە ڕۆژنامەی (ئازادی) نەبوو، کە بەئاشکرا لە کەرکووک و بەغدا دەرچوو، بەلّکو لە ڕۆژنامەگەریی نهێنیدا دەستێکی بالاّی لە دەرکردنی ڕۆژنامەکانی "یەکێتیی تێکۆشین" و "شۆڕش" و "ڕزگاری" و "ئازادی" بەنهێنی هەبوو.

**کەریم شارەزا**

# جەمال حەیدەری
# ١٩٢٦-١٩٦٣

شەهید جەمال حەیدەری لە ساڵی ١٩٢٦دا، لە شاری هەولێر لە بنەماڵەیەکی نیشتمانپەروەر و ڕووناکبیر هاتۆتە دنیاوە. لە تەمەنی ٧ ساڵیدا لەبەر خوێندنی رەسمی دانراوە و قۆناغی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە شارەکەی خۆی تەواو کردووە، پاشان چووەتە بەغدا و لە کۆلێجی (خانەی باڵای مامۆستایان) وەرگیراوە و دەستی بەخوێندن کردووە. بەڵام کاتێک کە لە ساڵی ١٩٤٦دا لەخۆپیشاندانێکی حزبی شیوعی لەدژی حکوومەتی عێراق بەشداریی کردووە، سآ مانگ بەند کراوە و لە کۆلێجەکەشی دەرکراوە، ئیدی گەڕاوەتەوە هەولێر و لەگەڵ (ئەنوەر فەیزی)ی هاوڕێی بەیەکەوە دوکانێکیان داناوە.

ئەگەر بمانەوێ جەمال حەیدەری وەک سیاسییەکی مارکسی بناسین، وا چاکە بگەڕێینەوە بۆ ساڵی ١٩٤١ کە هێشتا خوێندکاری قۆناغی خوێندنی ناوەندی بووە، بۆ یەکەم جار بەو بیروباوەڕە گەیشتووە. لە ماوەی چەند مانگێکدا هۆشیارییەکی سیاسی و شارەزاییەکی باشی لە فەلسەفەی مارکسی و ڕێبازەکەی



پەیدا کردووە. لە ساڵی ١٩٤٤دا لەگەڵ دامەزراندنی (حزبی شۆڕش) کە بەحزبی شیوعی کوردستان دادەنرا، بووەتە ئەندام لەو ڕێکخراوە مارکسییە و لە ماوەیەکی کەمدا دەورێکی سەرکردایەتی وەردەگرێ و دەبێتە لێپرسراوی یەکەمی لیژنەی محەلی هەولێری حزبەکە.

لەگەڵ دروستبوونی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ١٩٤٦/٨/١٦، چووەتە پاڵ حزبی شیوعی عێراق.

جەمال حەیدەری لە حزبی شیوعی عێراقدا دەورێکی سەرکردەیی دەبێ و کاتێک لە مانگی مایسی ١٩٤٨دا حوکمی عورفی لە عێراق ڕادەگەیەنرێ، لەگەڵ دەستەیەکی چالاک لە شیوعییە کوردەکانی پارێزگای هەولێر دەگیرێ. لەوانە: (عاسم حەیدەری و عەلی عەبدوڵڵای ڕەواندزی و عادیل سەلیم و شێخە شەل و جەوهەر و ڕەقیبی حوسێنی مەلا) و چەندانی دی لە کۆیەش خەباتگێڕان (ئەحمەد دڵزار و ڕۆستەم حەوێزی و سادقی جەمیل ئاغای حەوێزی و مەجیدی کاکەی حاجی مەحموود و عەبدولڕەحمان مەحموود و مەلا مەجیدی موفتی و فایق جەلیل حەوێزی)یان لە بەندیخانەی هەولێر دەخەنە پاڵ. ئەو گیراوانە دەدرێنە دادگای عورفی و حوکم دەدرێن، بەڵام هاوڕآ جەمال چی لەسەر ئیسپات نابێ و بەردەدرێ و دەگەڕێتەوە هەولێر و دەبێتەوە لێپرسراوی یەکەمی لیژنەی محەلی حزبی شیوعی، لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٨دا دەگوێزرێتەوە بۆ کەرکووک و لەگەڵ هاوڕێیان (نافیع یونس و ئەحمەد غەفوور) کاروباری لقی

کوردی حزبی شیوعی بەڕێوە دەبەن.
بەڵام کاتێک جێگری سکرتێری گشتیی حزب، (مالیک سەیف) دەگیرێ و گەلێک نهێنی حزب و ناوی ئەندامانی دەدرکێنێ. لە شەوێکی مانگی کانوونی یەکەمی ١٩٤٨دا لەگەڵ دوو هاوڕێکەی تری، (نافیع یونس و ئەحمەد عەفوور) دەگیرێن و دەدرێنە دادگای عورفیی عەسکەری و بە ٧ ساڵ حوکمی توند و ٣ ساڵ خستنە ژێر چاودێریی پۆلیس حوکم دەدرێن. شەهید جەمال لە ناو بەندیخانەشدا کەسایەتییەکی سەرکردە بووە.

کاتێک هاوڕێ بەهائەدین نووری لە ساڵی ١٩٥٣دا دەبێتە سکرتێری حزبی شیوعی عێراق، دەستەیەک لە ئەندامە سەرکردەکان لە حزب دوور دەخاتەوە. یەکێک لەوانە هاوڕێ جەمال دەبێ و ئەویش لەگەڵ هاوڕێیانی ناو بەندیخانە و دەرەوەی هەر بەناوی حزبی شیوعی عێراقەوە بەجیاکار دەکەن و ڕۆژنامەیەک بەناوی (راية الشغيلة) دەردەچوێنن، بۆیە پێیان دەگوتن جەماعەتی (راية الشغيلة: ئاڵای کارگەران).

شەهید جەمال حەیدەری بەناوی نەخۆشی لە بەندیخانەوە دەیبەنە (نەخۆشخانەی مەجیدییە) و لەوێوەش دەرفەتی بۆ دەرەخسێ و ڕادەکات. کە ئازاد دەبێ لە دەرەوە لەگەڵ هاوڕێیانی، (حەمزە سەلمان و عەزیز محەمەد و عەبدولڕەزاق سافی) (رایەی شەغیلە) بەڕێوە دەبەن و هاوڕێ حەیدەری، لێپرسراوی یەکەمی ئەو باڵەی حزبی شیوعی دەبێ و بەزمانی کوردیش ڕۆژنامەیەک بەناوی (ڕێگا) دەردەکەن.

لە دوای یەکگرتنەوەی حزبی شیوعیی عێراقی لە حوزەیرانی ١٩٥٦دا، هاوڕێ جەمال حەیدەری دەبێتە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی حزب و پێش بەرپابوونی شۆڕشی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ دووجار سەردانی یەکێتیی سۆڤیەتی کردووە. لە دوای ئەو ساڵەش دەورێکی سەرکردەیی بووە و بووەتە بەرپرسی ڕێکخستنی خەتی کرێکارانی عێراق.

هاوڕێ جەمال لە ١٩٥٩/٩/١دا بۆ خوێندن چووەتە مۆسکۆ و لە خوێندگای لینینی عالەمی- بەشی فەلسەفە تاکو مانگی دوازدەی ١٩٦١ لەوێ ماوەتەوە و بەپلەی (زۆر باشە) دەرچووە. کە گەڕاوەتەوە دەورێکی گەورەی لە ڕەسمکردنی سیاسەتی حزبی بەرامبەر شۆڕشی ئەیلوول گێڕاوە، تەنانەت ڕەشنووسی ڕاپۆرتەکەی مانگی ئاداری ١٩٦٢ی حزبی شیوعی عێراق بەدەستی ئەو سەرکردەیە نووسراوە و تەنیا چەند ڕتووشێکی لە کاتی موناقەشەکردنیدا کراوە.

کودەتا شوومەکەی ٨ی شوباتی ١٩٦٣ کارەساتێکی گەورەی بۆ حزبی شیوعی خوڵقاند و لە مانگی ئاداری ئەو ساڵەدا هاوڕێ (سەلام عادیل)ی سکرتێری حزبی شیوعی شەهید کرا. دوای ئەو حەیدەری بووە لێپرسراوی یەکەمی حزبی شیوعی و لەگەڵ هاوڕێی (محەمەد سالح عەبەللی) دووبارە کاروباری حزبیان ڕێکخستەوە و کەوتنە خەباتی ژێرزەمینی و یەکەم بەیانی حزبییان نووسی و بڵاو کردەوە، ئەو کودەتا شوومەی ٨ی شوباتیان مەحکووم کرد.

کە لە ١٠ی حوزەیرانی ١٩٦٣دا حکوومەتی بەعسی فاشی شەڕی لە کوردستان دەست پێ کردەوە، هاوڕێ جەمال بۆ ڕۆژی ١١ی حوزەیران بەیانێکی گرنگی حزبی شیوعی بۆ پشتگیریی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد دەرچوواند و لە دژی دەست پێکردنەوەی شەڕەکە وەستان، لە دوای جوولانەوەکەی ٣ی تەمووزی ١٩٦٣ی ئوردوگای ڕەشید لە بەغدا لە ڕۆژی ١٩٦٣/٧/١٩دا هاوڕێ جەمال حەیدەری سەرکردەی حزب گیرا و لە ئەنجامی ئەشکەنجە و ئازاردانێکی لە ڕادەبەدەر لە ڕۆژی ١٩٦٣/٧/٢٠ شەهید کرا، بۆ ڕۆژی ١٩٦٣/٧/٢١ لە دەنگوباسی کاتژمێر دوو و نیوی نیوەڕۆدا بە بەیانێکی حاکمی عەسکەری گشتی، هەواڵی لەسێدارەدانی ئەو سەرکردەیە بڵاو کرایەوە و میللەتی کورد و سەرتاپای گەلی عێراق نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆز و پێشەوایەکی مارکسی لەدەست چوو.

ئەوەی شیاوی باسە شەهید جەمال حەیدەری لە ساڵی ١٩٦٠دا ژنی هێناوە، ناوی (نەرجس ڕەزا سەففار) بووە و تەنیا ٣ ساڵ ژیانی هاوسەری لە ناو ئەو کەشوهەوا ترسناکەدا بەسەر بردووە و لە ساڵانی ١٩٦١ و ١٩٦٣ دوو کچی بووە. ئێستا هەردووکیان (دوکتۆر لەیلا جەمال حەیدەری و خاتوو نادیە جەمال حەیدەری) ماون، بەڵام دایکیان لە کۆڕی خەباتدا کۆچی دوایی کردووە.

**کەریم شارەزا**

# حاجی عەبدولباقی کۆیی
# ١٩٢٤-١٩٦٣

مامۆستای زانای بیرکاری و نیشتمانپەروەری کورد، حاجی عەبدولباقی حاجی ساڵحی مەنگوڕ لە ساڵی ١٩٢٤دا لە گەڕەکی بەفریقەندی لە شاری کۆیە، چاوی بەژیان هەڵێناوە. لە پایزی ١٩٣١دا خراوەتە بەر خوێندنی رەسمی لە قوتابخانەی سەرەتایی کۆیە و هەموو پۆلەکانی ئەو قۆناغەی خوێندنی بەزیرەکی بڕیوە و بڕوانامەی دەرچوونی وەرگرتووە و چووەتە بەغدا لەبەر زیرەکی لە کۆلێجی مەلیک فەیسەڵ وەرگیراوە کە دواناوەندییەکی تایبەتی بووە، هەموو وانەکانی بەزمانی ئینگلیزی دەخوێنران و دوای پێنج ساڵ بەپلەی شەرەف دەرچووە و لە ساڵی خوێندنی ١٩٤٤-١٩٤٥دا چووەتە کۆلێجی (خانەی باڵای مامۆستایان) کە بەرامبەر بەکۆلێجی پەروەردەی ئێستا بوو و چەندە خەریکی خوێندنەکەی بووە، دوو ئەوەندەش خەریکی خەباتی سیاسی بووە و ڕێبازێکی چەپی گرتووە و لەسەر ئەو چالاکییەی چەند جار گیراوە، بەڵام هەر چۆنێک بێت خوێندنەکەی لەو کۆلێجە تەواو کردووە و لە ساڵی ١٩٤٨دا بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە بەشی بیرکاری وەرگرتووە و لە پایزی ئەو ساڵەدا لە دواناوەندیی هەولێر بەمامۆستای بیرکاری دامەزراوە، بەڵام دوای نیوەی ساڵ گیراوە و کە بەربووە دوور خراوەتەوە بۆ شاری فەللوجە لە پارێزگای روومادی و لە دواناوەندیی ئەو شارە وانەی بیرکاری گوتۆتەوە و دوای ساڵێک لە فرمانەکەی دەرکراوە و ئەویش ماوەیەک لە کۆمپانیای نەوتی عێراق (I.P.C) بەفەرمانبەر دامەزراوە و لە دواییدا گەڕاوەتەوە سەر میلاکی وەزارەتی پەروەردە و لە هەولێر دانراوەتەوە.

پاش ماوەیەک لەسەر هەڵوێستی نیشتمانی گوێزراوەتەوە بۆ پارێزگای سلێمانی و کراوە بەمامۆستای بیرکاری لە دواناوەندیی سلێمانی و سوودێکی زۆر لە زانیارییە فراوانەکەی وەرگیراوە، لە ناو مامۆستایان کەسایەتییەکی بەهەڵوێست بووە، بۆیە لە ساڵی ١٩٦٢دا بەنوێنەری سەندیکای مامۆستایانی عێراق - لقی سلێمانی هەڵبژێردراوە بۆ کۆنگرەی چوارەمی سەندیکای مامۆستایان و، دەورێکی زۆری بووە لە چەسپاندنی داواکارییەکانی مامۆستایانی کورد بۆ پێشخستنی خوێندنی کوردی لە کوردستاندا.

مامۆستا حاجی لە ٤/٧/١٩٦٢دا، بەشداریی لە دەورەیەکی هاوینەی فیزیای لە شاری بەغدا کردووە و لە ١٠/١/١٩٦٣دا لەسەر چالاکیی سیاسی لە سلێمانی گیراوە و لە رۆژی ١٥/٥/١٩٦٣ بەر بووە و لەو کاتەدا ناوی لە وەزارەتی پەروەردە لە بەغدا دەرچوو بوو بۆ بەعسە تاکو خوێندنی باڵا لە دەرەوەی عێراق تەواو بکات، کەچی لەگەڵ دەست پێکردنەوەی شەڕ لە کوردستان لە رۆژی ٩/٦/١٩٦٣دا بەفەرمانی زەعیم سدیق مستەفا لەگەڵ کەسایەتییەکی زۆر دەگیرێ و لە سەربازگەی سلێمانی لەگەڵ ٨٢ کەسی تر شەهید دەکرێ و گیانی پاکی دەچێتە ریزی شەهیدانی کورد و کوردستان.

سەرچاوە:

١- گۆڤاری دەنگی مامۆستا- ژمارە (١) ساڵی دووەم- سلێمانی حوزەیران و تەمووزی ١٩٧٢.
٢- نامەیەکی مامۆستا حەسەن شەعبان لە ١/٥/٢٠٠٥.

**کەریم شارەزا**

# مەلا مەعسوم هەورامی
# ١٩٠٠-١٩٦٤

## دکتۆر عەبدوڵڵا عەلیاوەیی



مەلا مەعسوم کوڕی مەلا خزری هەورامییە. مەلا خزر خەڵکی گوندی خەرپانی، لە ناوچەی هەورامان بووە و لە کۆیە خوێندنی مەلایەتیی لەلای "حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادە" تەواو کردووە و هەر لە کۆیەش نیشتەجێ بووە و ژنی هێناوە.

دوای ماوەیەکی کەم، پێشبڕکەیەک دێتە پێش بۆ هەڵبژاردنی چەند مەلایەکی باش و زانا وەک مامۆستا (مدرس) دابمەزرێن. مەلا خدر لەو تاقیکردنەوەیەدا پلەی بەرز وەدەست دەهێنێ و فەرمانی سوڵتانی بۆ دەردەچێ و دەبێ بە مامۆستای مزگەوتی "نائیب ئوغلی" لە کەرکووک.

ساڵی ١٩٠٠ مەعسوم لە کەرکووک لەدایک دەبێ، کە منداڵی هەرە بچووکی مەلا خزر بووە. پێش ئەو، دوو کوڕ و دوو کچیان هەبووە. دوای ماوەیەک دەرفەت دەدۆزێتەوە داوای گواستنەوە دەکا بۆ کۆیێ و ڕەزامەندی بۆ دەردەبڕن و دەبێ بە یەکەم مامۆستای فەرمی کە بە فەرمانی سوڵتان دامەزراوە، لە کۆیە مەعسوم دەنێرنە قوتابخانەی فەرمی کە ئەو کات لە کۆیەدا هەبوو، هاوڕێیانی دەگێڕنەوە کە بچووکترین قوتابی بوو لە قوتابخانە، تەمەنی لە هەمووان کەمتر بوو، تێیاندا هەبوو خاوەن ژن و منداڵ بوون، وەک مامۆستا تاهیر حەویزی کە مێژووی کۆیێ ئەو نووسیویەتی: "دەستی نەدەگەیشتە تەختەڕەش بە تەباشیر لەسەری بنووسێ مامۆستا بڵندی دەکرد یا یەکێ لە قوتابییانی هاوپۆلی".

مەعسوم ساڵی ١٩١٢ باوکی وەفات دەکات. دوای هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهانی لە ئەنجامی ئەوەی برا گەورەی هەڵاتووی سەربازی بووە و حوکمی ئیعدامی دەرچوو، ناچار دەبن کۆیی بەجێ بهێڵن و دەچنە کەرکووک.

لە کەرکووک مەعسوم لە خوێندن بەردەوام دەبێ لە قوتابخانەی "دار الخلافە" تا تەواوی دەکا. دواجار لە کەرکووکیش بار دەکەن، دیسان لە ئەنجامی کێشەی جەمالی برای کە حکوومەت دەزانێ لە کەرکووکە، ڕوو دەکەنە خانەقین کە ئەوسا کەوتۆتە ژێر ئیدارەی ئینگلیز، مەعسوم بەهۆی خوێندن و شەهادەکەی ئیشێکی دەست دەکەوێ، دوای ماوەیەک لە ژێر زەختی دایکی کە تازە حکوومەتی عێراق دروست بووە و حوکمی عوسمانییەکان نەماوە، دەگەڕێنەوە کۆیێ.

ئیتر ڕوو دەکاتە کاری بازرگانی، بەڵام لە ئەنجامدا زیانێکی زۆر دەکات و دەکەوێتە بیرکردنەوە، ئایا ببێ بە کارمەندی حکوومەت یا وەک هێندێ لە دۆستەکانی باوکی هانی دەدەن دەست بکا بە خوێندنی مەلایەتی. دیارە ئەویش قەناعەتی لا دروست دەبێ و ڕوو دەکاتە خوێندن، سەرەتا لە گوندی دووگردە (دەشتی دزەیی) لەلای "مەلا محەمەد نووری"ی پورزای دەست پێ دەکا. دوای ساڵێک دەچێتەوە کۆیێ، بۆ ماوەی ساڵ و نیوێک لەلای "مەلا بەهائەدین" لە مزگەوتی بایز ئاغا و لەلای "مەلا سادقی دایە خەجی" لە مزگەوتی مەلا حاجی دەخوێنێ. دوای ئەوە دەچێتەوە لای مەلا محەمەدی جەلیزادەی ناسراو بە "مەلای گەورە". نزیکەی دوو ساڵ و نیو لای دەخوێنێ و ئیجازەی مەلایەتی پێ دەدا. تەنانەت لە ئیجازەنامەکەی هاتووە دەڵێ: "شایانی ئەوەیە ئیجازە بدا نەک ئیجازە وەربگرێت".

مەلا مەعسوم پیاوێکی گەلێ زیرەک و بیرێکی تیژی هەبوو، زۆرجار گوێی لە پارچە هەڵبەستێک یا وتارێک یا پەخشانێک بووە، بە یەکجار خوێندنەوە لەبەری کردووە.

لە زمانی عەرەبی وەک "مەسعوود محەممەد"ی عەرەبیزان

و نووسەری بەناوبانگ، باسی عەرەبی زانی و فەساحەتی مەلا مەعسوم دەکا، لە بیرەوەرییەکانی جگە لە عەرەبی تورکییەکی زۆر باشی دەزانی کە خوێندن لە قوتابخانە بە تورکی بوو، کوردیش زمانی دایک بوو، فارسیشی باش دەزانی و شیعرێکی زۆری فارسیشی لەبەر بوو. جگە لەو زمانانە کە بەبێ گرێ و وەستان قسەی پێ دەکردن، تا وەفاتیشی کرد، ئەو فەرەنسییەی لە قوتابخانە خوێندبووی لەگەڵ ئەو بڕە ئینگلیزییەی لە خانەقین فێر ببووبوو هەر لە بیری مابوو.

مەلا مەعسوم دوای وەفاتی "مەلای گەورە" و "شێخ نووردەدینی جەلیزادە"، لە شوێنەکەی دانرا. لەسەر ئاستی وانە گوتنەوە فەقێیەکی زۆر روویان تێ دەکرد و هەمیشە هەردوو مزگەوتەکەی، مزگەوتی گەورە و مزگەوتی حاجی مەلا عەلی پڕ فەقێ بوون، لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی کەسایەتییەکی ناسراوی کوردستان بوو. دووجار داوای لێ کرد بکرێ بە قازی بەغدا، یەکەمیان لەلایەن سەعید قەزازی برادەری کە وەزیری ناوخۆی عێراق بوو. دواجار لەلای نەقشبەندی ئەندامی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی لە (ساڵی ١٩٥٩) مەلا هەمیشە دەیگوت: "من لە کۆیە پێگەیشتووم، کۆیی بەجێ ناهێڵم".

لەسەر ئاستی سیاسی لە سەرەتای دەستپێکی شۆڕش ١٩٦١ پارێزگای هەولێر (بەدرەدین عەلی) داوای لێ کرد برووسکەیەکی پشتیوانی بۆ (عەبدولکەریم قاسم)لێ بدا دژ بە شۆڕشی کوردستان لە وەڵامدا گوتی: "برووسکەی من فەتوایە من فەتوا نادەم لە دژی ئەو حەرەکەیە، حکوومەت دەبێ بە سیاسەتی خۆیدا بچێتەوە، ئەوە بوو دەستگیر کرا بۆ ماوەی ساڵێک لە بەندیخانەی"فضیلیە"ی نزیک بەغدا هێشترایەوە مەلا مەعسوم یەکەم مەلا بوو دەستگیر بکرێ لەسەر شۆڕشی کورستان لە عێراقدا، ئەو هەڵوێستەی ئەو بوو زۆر مەلای دیکەشی هان دا هەمان هەڵوێست وەربگرن، دوای ساڵێک بەردرا لە ئەنجامی هەوڵی زۆری خالد نەقشبەندی و چەند کەسانێکی تر.

لە کۆنگرەی کۆیە لە ساڵی ١٩٦٢ کە عەبدولکەریم عارف و حکوومەتەکەی رووخێنرا و مەلا مستەفا بارزانی لەو کۆنگرەیەدا ئامادە بوو، یەکەم وتار هی مەلا مەعسوم بوو.

دوای ماوەیەک بەعسییەکان سیاسەتی زەبروزەنگیان بەکار هێنا مەلا مەعسوم چووە پاڵ شۆڕش ئەوە بوو بەعسییەکان کە هاتنە کۆیێ کە بنەماڵەکەی ئەو و کاک



**مەلا مەعسومی هەورامی لەگەڵ مەلا مستەفای بارزانی ئازاری ١٩٦٤ رانیە**

زیاد ئاغای غەفووریان سووتاند و باردگاکەی لە گوندی بێتواتە بوو، کە ئەوسا عەلی شەعبان لێپرسراوی ناوچەکە بوو. کە عەبدولسەلام عارف کودەتای کرد سەر بە بەعسییەکان و دەسەڵاتی گرتە دەست لەسەر بڕیاری مەلا مستەفا سەرۆکایەتیی وەفدێکی مەلاکانی کرد بۆ پیرۆزبایی لە عەبدوسەلام و بەناوی مەلایان داوای کرد مەسەلەی کورد بە شێوەییێکی ئاشتییانە چارەسەر بکرێ کە ئەم خزمەت بە ئیسلام و برایەتی کورد و عەرەب و عێراق دەکات. عەبدوسەلام عارف قورئانێکی بەیادگار دایە. مەلا مەعسوم کە بەخەتی خۆی لەسەری نووسی: "مەلا مەعسوم ماوەیەک بوو هەستی بە ئاوارەیی دەکرد، هەر لەو سەفەرەیدا دوکتورەکان تەماشایان کرد دەرکەوت کە تووشی شێرپەنجەی کۆڵۆن هاتووە. دوای ماوەیەک عەمەلیات کرا، بەڵام کار لە کار ترازا بوو زۆر شوێنی دیکەی داگرتبوو. ئەوە بوو لە ١٨/١٢/١٩٦٤ لە شاری کۆیێ گیانی پاکی لەدەست دا و ئێستاش دەگێڕنەوە کە ئەو بەرێخستنەی بۆ سەر گۆڕستان بۆ ئەو کراوە لە کۆیێ تا ئێستا بۆ کەس نەکراوە، هەموو دووکانداران دووکانیان داخست بۆ بەشداری لە مەراسیمی بە خاکسپاردنی ئەم زاتە پیرۆزە.

# سەمەد بەننا
# ١٩١٣ - ١٩٦٨



نیشتمانپەروەری تێکۆشەر، کاک سەمەد حاجی محەمەد بەننا، لە ساڵی ١٩١٣دا، لە شاری کۆیە چاوی بەژیان هەڵێناوە. لە قوتابخانەی سەرەتایی کۆیە خوێندوویەتی. دوا پلەی خوێندەواری پۆلی سێیەمی ناوەندی بووە لە ساڵی ١٩٣٤دا بووەتە فەرمانبەر لە وەزارەتی داد و لە دواییدا گوێزراوەتەوە بۆ وەزارەتی کشتوکاڵ دواجاریش کراوە بەسەرپەشتیار لە وەزارەتی کاروباری باکوور لە بەغدا.

کاک سەمەد بەننا هەر لە سەردەمی خوێندنی لە خوێندنگای ناوەندییەوە خەریکی ڕێکخستنی قوتابی و لاوانی کورد بووە. لە ساڵی ١٩٣٣دا لە شاری بەغدا لەگەڵ دەستەیەک لە ڕووناکبیرانی کوردی وەک حەسەن تاڵەبانی و هەمزە عەبدوڵڵا و ڕەشید عارف سەقا و ئیبراهیم ئەحمەد (کۆمەڵەی یادگاری لاوان)یان دامەزراندووە و ئەو کۆمەڵەیەش پەیوەندیدار بووە بەکۆمەڵەی (الاهالي) لە بەغدا.

کاتێک ئەم تێکۆشەرە ماوەیەک کەوتە بەغدا زوو بەبیروباوەڕی سۆسیالیزم و دیموکراسی گەیشت. لە ساڵی ١٩٤٤دا لەگەڵ دامەزراندنی (حزبی شۆڕش) کە (حزبی شیوعی کوردستان) بوو، چونکە ڕۆژنامەکەی زمانحاڵیان بەناوی (شۆڕش) دەردەچوو، بۆیە پێیان دەگوترا (حزبی شۆڕش) و ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتییان ئەم زاتانەی خوارەوە بوون:

١- ساڵح حەیدەری- سکرتێری مەکتەبی سیاسی.
٢- نافیع یونس.
٣- سەمەد بەننا.
٤- عەلی عەبدوڵڵا.
٥- عەبدولکەریم تۆفیق.
٦- ڕەشید عەبدولقادر.
٧- نووری محەمەد ئەمین- ئەندامی سەرکردایەتی بوون.

کاک سەمەد چالاکییەکی زۆری لەو ڕێکخستنە مارکسییەدا بینی تاکو ئەو حزبە لەگەڵ حزبی (ڕزگاری) لە هاوینی ١٩٤٦دا هەڵوەشانەوە و لە جێیان (پارتی دیموکراتی کورد) بەسەرۆکایەتیی مەلا مستەفای بارزانی لە ١٩٤٦/٨/١٦دا دامەزرا و کاک سەمەد بەئەندامی یەدەگی کۆمیتەی ناوەندی پارتی دەرچوو.

ئەو زاتە خاوەن کەسایەتییەکی کۆمەڵایەتیی ڕووەتدار بوو، زۆر لەکاربەدەستانی حکوومەتی عێراقی دەناسی و ڕێزیان لێ دەنا. هەر ئەو بوو توانی بەهۆی دۆستێکی خۆی، کە خزمی نووری سەعید بوو، قەڵەم و کاغەز و کەلوپەلی پێویست بۆ چوار ئەفسەرە شەهیدەکەی کورد (عیززەت عەبدولعەزیز و مستەفا خۆشناو و خەیروڵڵا عەبدولکەریم و محەمەد قودسی) بنێرێتە ناو ژووری ئیعدام لە بەندیخانەی ناوەندیی بەغدا، ئەوانیش چەند سەعاتێک بەر لەسێدارەدانیان وەسیەتنامەی خۆیان نووسی و ناردیانە دەرەوە بۆ کاک سەمەد و بۆ بەرەبەیانیی ڕۆژی ١٩ی حوزەیرانی ١٩٤٧ هەر چوار ئەفسەرە نیشتمانپەروەرەکەی کورد لەسێدارە دران و گیانیان چووە دنیای شەهیدانی کورد و کوردستان.

هەر کاک سەمەدیش بوو لەگەڵ خواڵێخۆشبوو کاک عومەر دەبابە تەرمی پیرۆزی ئەو شەهیدانەیان وەرگرتەوە و تەرمی (مستەفا خۆشناو) و (محەمەد قودسی) بەرەو سلێمانی و تەرمی (خەیروڵڵا عەبدولکەریم) بەرەو هەولێر و تەرمی (عیززەت عەبدولعەزیز)یش بەرەو ئامێدیان بەرێ کردن.

کاک سەمەد کارێکی سیاسیی دیکەیشی دەکرد ئەویش ئەوە بوو هەر پارتییەک گرتنی لەسەر بووبا بەر لە گرتنی، شوێنی خۆحەشاردانی لە شارێکی وەکو بەغدا بۆ دابین دەکرد و زۆر جاریش بەقسەی خۆش کێشەی گرتن و تەنگاوکردنی ئەندامانی پارتی لەگەڵ هەندێ لە پیاوانی حکوومەت چارەسەر دەکرد، بەمجۆرە کاک سەمەد ٥٥ ساڵی پڕ لە خەباتی بەسەربرد و لە ڕۆژی ١٩٦٨/٢/١١دا لە شاری بەغدا دڵە گەورەکەی لە لێدان کەوت.

**کەریم شارەزا**

# مەجید ئەفەندی
# ١٩١١ - ١٩٦٨

نەجات یاسین خورشید

چاوپێکەوتن لەگەڵ (ساڵح حەیدەری) لە یادی (٧٥) حەفتا و پێنج ساڵەی لەدایکبوونیدا لە گۆڤاری گوڵانی عەرەبیدا لە ژمارە (٨) لە (٢٥) ی نیسانی ١٩٩٧ دا سەرنجی ڕاکێشام، مامۆستا لەو کاتەی باسی هەندێ لە لاپەڕەکانی مێژووی سیاسیی شاری هەولێر و خەباتی گەنجەکان لە ژێر ئاڵای ڕێکخراوە سیاسییە جۆراوجۆرەکان لە ساڵانی سییەکان و چلەکان لەم سەدەیەدا کردووە. لەوانیش ئەندامە چالاکەکان و کادیرەکانی حزبی هیوا، کە مامۆستا حەیدەری لەو چاوپێکەوتنەدا ئاماژەی بەناوی هەندێکیان کردبوو و ناوی هەندێکیشیانی لە یاد چووبوو یان لە یاد خۆی چواندبوو[١]. لەو ئەندامانەی کە ڕۆڵێکی کاریگەریان هەبوو لە ژیانی سیاسی لەو ماوەیەدا. ئەمەش وای لێ کردم کە پەیوەندی بە هەندێ لەو کەسانەوە کە هێشتا لە ژیان ماون بکەم[٢]، کە پەیوەندییان بە حزبەوە کردبوو هەر لە دامەزراندنییەوە تا هەڵوەشانەوەی حزب لە ناوەڕاستی چلەکاندا، هەروەها ئەو کەسانەش، کە ڕۆڵێکی گەورەیان لە گۆڕەپانی خەبات و کۆششی نەتەوەیی و سیاسیدا هەبوو.

ئامانجیشم لە نووسینی ئەو چەند دێرەدا تیشک خستنە سەر هەندێ لە لاپەڕە ڕۆشنەکانی پڕ لە خەبات و قوربانیدانی گەنجە دڵسۆزەکانە بۆ بنەما نەتەوایەتییەکان لە هەولێر. ئەو هەلەش دەقۆزمەوە بۆ ئاماژەکردن بۆ هەندێ لە لایەنە شاراوەکانی ژیانی یەکێک لە ئەندامە هەرە چالاکەکان لە حزبی هیوا[٣]، کە بە یەکێک لە دامەزرێنەرەکانی حزبی ناوبراو دەژمێردێ لە هەولێر، ئەویش (مەجید ئەفەندی)یە.

ناوی تەواوی (مەجید حاجی ئەمین قادر)ە، لە ساڵی (١٩١١) لە گەڕەکی (تەکیە) لەدایک بووە، کە دەکەوێتە قەڵای هەولێر.

لە قوتابخانەکانی هەولێر خوێندوویەتی، بەڵام بەهۆی سەرقاڵبوونی بە چالاکییەکانی لە ئەنجامی تێکەڵبوونی بە ژیانی سیاسی نەیتوانیوە خوێندن تەواو بکات.

بەشێوەیەکی کاتی بە مامۆستا لە شوێنی، لەدایکبوونی دادەمەزرا[٤]، مەجید ئەفەندی مرۆڤێکی بێ فیز و هێمن و کەمدوو بوو، پیاوێکی نەفس بەرز و دڵسۆز بوو بۆ ئامانج و بیروڕاکانی و بە درێژایی هەموو ساڵەکانی خەبات و تێکۆشانی لە ڕیزی حزبی هیوادا و پاش ئەوەش لە کاتی چوونە ریزی بۆ حزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق هیچ کاتێ لە ڕێبازەکەی خۆی لای نەداوە.

لە ساڵانی کۆتایی لە ژیانیدا ژنی

هێنا و هیچ منداڵی لە پاش بەجێ نەما، بەڵام کۆمەڵێک لە بنەماى گرانبەها و رەوشتی بەرزی لە بۆ خزم و کەسوکارەکانی لە دوای خۆی جێ هێشت.

مەجید ئەفەندی لە ژیانیدا لەلایەن دەزگای پۆلیس و ئاسایشەوە تووشی خستنە ژێر چاودێری و راوەدوونانێکی زۆر بوو، بەهۆی چالاکییە سیاسییەکانییەوە و چەند جارێکیش دەستگیر کرا لە بەندیخانەکانی هەولێر و مووسڵ و کەرکووک و بەغدادا. بۆ یەکەم جار لە ئەنجامی بەشداریکردن و سەرکردایەتیکردنی خۆپیشاندانێک، کە لە هەولێر لە ساڵی ١٩٤١ لە دژی دەسەڵات ساز درا، دەستگیر کرا. بەشداربووانیشی لە گشت چین و توێژێکی کۆمەڵ بوو لە قوتابییان و دانیشتوانی هەولێر و کاسبکاران، ژمارەیەک لە شاهیدحاڵەکانی خۆپیشاندانەکە[٥] رووداوەکان بەم شێوەیە دەگێڕنەوە:

لە کاتێکدا کە خۆپیشاندەران لە شوێنی دیاریکراودا بۆ خۆپیشاندان کۆبوونەوە، کە بریتی بوو لە سەرەتای ئەو شەقامەی بۆ باڵاخانەی موتەسەریف (بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی ئێستا)، مەجید ئەفەندی دارێکی پتەوی لە جۆری خەیزەرانی لە دەستدا بوو و فەرمان و رێنمایی خۆی پێشکەش بە قوتابییان و گەنجانی خۆپیشاندەر دەکرد هەتا کاسبکارانیش رێنماییان لێ وەردەگرت، دەگێڕنەوە دەڵێن، کە یەکێک لە کاسبکاران کە ناڵبەند بوو بەناوی (حوسێن ناڵبەند)، لە ناو جەماوەرەکەدا بە مەجید ئەفەندی وت ئایا چ رۆڵێک ببینم ئەفەندی؟ مەجید ئەفەندی یەکسەر پێی وت: تۆ بەرگری لە خۆپیشاندەران بکە کاتێک پیاوانی پۆلیس هێرش دەکەنە سەریان. ئەمەش رووی دا کاتێک یەکێک لە پیاوانی پۆلیس لێی نزیک کەوتەوە، ئەویش دەستی کرد بە بەرگریکردن تا چەکەکەی لێ ستاند و دەستی کرد بەگوللەباران بە ئاراستەی ئاسماندا لە دواییدا بە ئاراستەی باڵاخانەی موتەسەریفیەت[٦]. ئەمەش خەڵکەکەی هەژاند و هانیانی دا. لە سەربانی باڵاخانەی ناوبراویش ژمارەیەک گوللەهاوێژ هەبوو بە ئاراستەی خەڵکەکە گوللەیان دەهاوێشت، بەڵام خۆپیشاندەران ئارامیی خۆیان پاراست و ترس دای نەگرتن، بەڵکو زیاتر تووڕە بوون و هێرشیان برد تا پیاوانی پۆلیس توانای بەرگریکردنیان نەما بەرامبەر بە خۆپیشاندەران، کە لە بەردەم باڵاخانەی موتەسەریفیەت جێگیر بوون، لەو کاتەشدا (شێخ حەسەن کوڕی شێخ نیعمەتوڵڵا)[٧]، کە یەکێک بوو لەو کەسانەی کە سەرکردایەتیی خۆپیشاندانەکەی دەکرد بەرز کرایەوە بۆ سەرشانی گەنجەکان و وتارێکی هەستجوڵێنی بۆ خۆپیشاندەران دا، کە ژمارەیان نزیکەی (١٠-٢٠) هەزار کەس دەبوو، وتەکانیشی کاریگەریی زۆریان بۆ زیاتر هاندانی خەڵک و تووڕەتربوونیان هەبوو و دواتر سووتاندنی ئۆتۆمبێلی موتەسەریف، کە بەوە ناسرابوو رای سەلبی دژی هاووڵاتییان هەبوو و لەگەڵ خەڵکی شارەکە راستگۆ نەبوو[٨]، هەروەها خۆپیشاندەران هێرشیان بردە سەر فەرمانگەکانی پۆلیس و دامودەزگاکانی دیکەی حکومەت بەجۆرێ، کە هێزی ئاسایش نەیانتوانی وەزعەکە ئارام بکەنەوە، بۆیە داوا لە سوپا کرا[٩] کە کۆتایی بەوەزعە شڵەژاوەکە بهێنن، بۆیە هێزەکانی سوپا بڵاوبوونەوە بەهەموو دەروازەکانی شار و شارۆچکەکان و سەرباز سەرکەوتنە سەر باڵاخانە حکوومییەکان بۆ پاراستنیان و بەرگری لێکردنیان. پاش ئارامبوونەوەی بارودۆخەکەش لە شاردا، پۆلیس کەوتنە راونانی ئەو کەسانەی، سەرکردایەتیی خۆپیشاندانەکەیان دەکرد، دەستگیریان کردن و رەوانەی بەندیخانەی مووسڵیان کردن[١٠]، لەوێوەش بۆ بەندیخانەی کەرکووک، مەجید ئەفەندیش لە سەرووی هەموویانەوە بوو، پاش ماوەیەکی زۆریش بەهەوڵ و تەقەلای پیاوماقووڵانی شاری هەولێر[١١] بە

تایبەتی زانای گەورە (مەلا ئەفەندی)[12] کە هەوڵێکی زۆری دا بۆ ئازادکردنیان: واسیتەی لای پیاوە گەورەکانی رژێم بۆ کردن.

مەجید ئەفەندی پێش ئەمە داوایەکی پێشکەش کردبوو بۆ دامەزراندنی بە بەڕێوەبەری ئیستهلاک لە قەزای کۆیە یان هەڵبژێدرابوو بۆ ئەم پۆستە، بەڵام داواکەی هەر وا لە نووسینگەی موتەسەریف مایەوە. دەڵێن[13] یەکەم دۆسیە کە داوا کرا لەلایەن موتەسەریفەوە کە (ساڵح زەکی) دایناوو بۆ خوێندنەوەی دۆسیەی (مەجید تۆفیق)[14] بوو، لە پاشانیشدا موتەسەریفێکی دیکە دانرا و ئەویش زۆری نەمابوو، کە فەرمانی کارگێڕی بە دامەزراندنی (مەجید ئەفەندی) بە بەڕێوەبەری ئیستهلاک لە قەزای کۆیە دەربکات، بەڵام هەندێ لە پیاوخراپان مێژووی سیاسیی مەجید ئەفەندییان بە موتەسەریفی نوێ راگەیاند، ئەویش لەو ماوەیەدا لە بەندیخانەی کەرکووک بوو.

مەجید ئەفەندی سەرباری ئەو هەموو رووداوانەی، کە بەسەریدا هات لەسەر ڕێبازی خۆی بەردەوام بوو، هەمیشە پابەند بوو بەو ڕێچکە نەتەوایەتییەی، کە پێشتر گرتبوویە بەر. هەردەم سووریش بوو لەسەر ویستەکانی و باوەڕی بە کێشەی گەلەکەی، لەقانە بوو و لە هەوڵ و کۆششی لە نێو ڕێکخراوەکانی حزبی هیوا بەردەوام بوو و هەموو هەلێکی لە بۆنە گشتی و تایبەتییەکانەوە، لە ئاهەنگەکان و پرسەکان دەقۆزتەوە بۆ کۆبوونەوە و چاوپێکەوتنە نهێنییەکان بۆ پرس و ڕا گۆڕینەوە و فەرمان و ڕێنمایی بەخشین بە حزبییەکان، لەو بۆنانەشدا هەر بۆ نموونە داوەتی ژنهێنانی کوڕی برای لە هەولێر لە یەکێک لە خانووە بچووکەکان، کە دەکەوێتە گەڕەکی تەعجیل[15]، هەلی لەو بۆنەیە وەرگرت بۆ بەستنی کۆبوونەوەیەکی حزبی. جارێکی دیکە لە شەقلاوە[16] کە داوەتێکی نانخواردنی کرد بەچاوپێکەوتنی حزبی.

مەجید ئەفەندی لە پاش دامەزراندنی لە ١٦ی ئابی ١٩٤٦ چووە ریزی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە، لە ڕێکخراوەکانی ئەم حزبەدا بە هەموو چالاکییەکییەوە کاری دەکرد، بێ ئەوەی بایەخ بەو پۆستە بدات، کە لە حزبەوە وەری گرتووە، هەرچەندە بچووکیش بێت و هەردەم دڵسۆز بوو بۆ حزب تا کۆتایی ژیانی.

دەگێڕنەوە کە لە ماوەی شێستەکاندا، کە شۆڕشی ئەیلوولی مەزن بەرپا بوو، لەو کاتیشدا (بەدرەدین عەلی) موتەسەریفی هەولێر بوو، هێرشەکانی ترساندن و تۆقاندن دژی هاوولاتییان بە توندترین شێوە بەتایبەت لە دژی حزبییەکاندا دەستی پێ کرد، بەڵام خوالێخۆشبوو مەجید ئەفەندی گوێی لەمانە نەبوو و هەرگیز لە جێبەجێکردنی ڕێنماییەکانی حزب و سەرکردایەتییەکەی دوا نەکەوت و بۆ ماوەیەکی زۆر یەکێک لە ژێرزەمینەکانی ماڵی یەکێک لە سەرۆک عەشیرەتە هەرکییەکانی شاری هەولێری کردبوو بە حەشارگە، کە ئەویش ماڵی (سەید فەتاح ئاغا) هەرکی بوو[17] لە هەولێر، کە دەکەوێتە شەقامی هیلالی. مەجید ئەفەندی لەم ژێرزەمینەدا بە چەندین کاتژمێر کاری دەکرد و لە زۆربەی ڕۆژانی هەفتەشدا، بەتایبەتی لەو کاتانەدا، کە تاریک دەبوو تا وەکو دوور بێت لە چاوی پیاوانی پۆلیس و دەسیسەکانەوە، لەو ماوەیەشدا بڵاوکراوەی حزبی و هەواڵی پێشمەرگە لەلایەنی چەکداریدا لەسەر ئامێری چاپ تایپ دەکرد و بە ئامێری (رۆنیۆ ) رای دەکێشا، لە پاشانیشدا بڵاوکردنەوەیان و گەیاندنیان بۆ شوێنی تایبەت.

پاش کوژرانی (بەدرەدین عەلی)یش، کە موتەسەریفی پێشووی لیوای هەولێر بوو لە بەغدا، حکوومەت زۆر لە هاوولاتییانی دەستگیر کرد و لە سەرووی هەمووشیانەوە (مەجید ئەفەندی)، بە تۆمەتی بەشداریکردنی کوشتنی موتەسەریف، بەهۆی ئەو تۆمەتەوە ماوەیەکی زۆر لە بەندیخانە ئەمنییە

گشتییەکان مایەوە و لە ئەنجامدا دووچاری ئازاردانێکی زۆر بوو، هەرچەندە تەمەنیشی گەورە بوو، پاش هەوڵدانێکی زۆری کەسوکار و هاورێکانی لە بەغدا و هەولێر ئازاد کرا[١٨].

مەجید ئەفەندی لەگەڵ وەستانی تریەکانی دڵی کۆتایی بە کاری سیاسی و حزبی هات و بەویژدانێکی پاک و ئارامەوە لە ١٤/ ٩ / ١٩٦٨ پاش خۆ تەرخانکردن و قوربانیدانێکی زۆرەوە.

پەراوێز و تێبینییەکان:

١- کاتێک کە لە (شێخ محەمەد محەمەد) ی ناسراو بە (شێخە شەل)م پرسی سەبارەت بەم چاوپێکەوتنە، لە وەڵامدا وتی زۆربەی زانیارییەکانی کە لەو چاوپێکەوتنەدا هاتوون هەڵەیە بەهۆی دوورکەوتنەوەی مامۆستا (ساڵح حەیدەری) لە هەولێر لەو ماوەیەدا و نیشتەجێبوونی لە بەغدا!

٢- چوار چاوپێکەوتنمان لەگەڵ (شێخە شەل)دا کرد، کە کەسایەتییەکی ناوداری سیاسی و نیشتمانپەروەرە لە هەولێردا و ناوی ژمارەیەک لە نیشتمانپەروەرانی هێنا، کە لە سەرەتاوە لە حزبی هیوادا بوون. منیش ئەو زانیارییانەم بە راستگۆیی پێشکەش کرد بە کاکی نووسەر (تاریق جامباز) کرد بۆ بڵاوکردنەوەی لەگەڵ وتارەکانیدا، کە لەبارەی مێژووی حزبی هیوایە لە هەولێر پاش رێککەوتنم لەگەڵیدا.

٣- (عیززەدین فەیزی) لە یادەوەرییەکانیدا ئاماژەی بەوە کردووە: کاتێک (مەجید ئەفەندی) موعتەمەد بوو، واتا بەرپرسی یەکەمی حزبی بوو لە هەولێر. منیش گشت دۆسیە و تۆمار و بەڵگەنامەکانی حزبم لێ وەرگرت و بۆم دەرکەوت، کە (مەجید ئەفەندی) لە هەولێر لە ماوەی ساڵانی ١٩٣٧ و ١٩٣٨ و لە دواتریشدا بەرپرسی حزبی بوو.

٤- هەروەکو کوڕە برای بچووکی (ئیبراهیم عەبدولسەمەد) دەگێڕێتەوە، کە (شێخ بیلال) ی بەڕێوەبەری پێشووی فەرمانگەی دارایی بوو لە هەولێر و یەکێک بوو لە قوتابییەکانی مەجید ئەفەندی کاتێک مەجید ئەفەندی مامۆستا بوو.

٥- هەروەکو (تەڵعەت عەبدولسەمەد نەجار) کوڕە برای گەورەی دەگێڕێتەوە کە لە ساڵی ١٩٢٥ لەدایک بووە.

٦- (ساڵح زەکی ساحێبقران) لەو ماوەیەدا موتەسەریفی لیوا بوو لە هەولێر.

٧- خوالێخۆشبوو (شێخ حەسەن) مامۆستا بوو، لە پاشان بەڕێوەبەر بوو لە یەکێک لە قوتابخانەکان لە ئەنجامی بەشداریکردن لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتیی قوتابخانەکەیدا لە خۆپیشاندان و بەهۆی چالاکییە سیاسییەکانیشەوە بەند کرا.

٨- ئەمە بەگوێرەی وتەی (رەئووف سەلیم قۆجە)، کە یەکێک بوو لە ئەندامەکانی حزبی هیوا و یەکێکیش بوو لە بەشداربووانی خۆپیشاندانەکە.

٩- خوالێخۆشبوو (ئەمین بەگ رەواندزی) فەرماندەی پارێزگای هەولێر بوو لەو کاتەدا و داوای لێ کرا، کە بەشداری لە کپکردنی خۆپیشاندانەکە بکات و زەخیرەی زیندوو بەکار بهێنێ دژی خۆپیشاندەران، بەڵام رازی نەبوو و وتی: "ئەوانە هەموو رۆڵە و برای منن، چۆن چەک لە دژیان بەکار بهێنم؟"

١٠- زانا و کەسایەتیی کۆمەڵایەتیی ناودار خوالێخۆشبوو (مەلا ئەفەندی) نامەیەکی بۆ بازرگانی هەولێری ناسراو بە (بەکر چەلەبی) نارد، کە لەو ماوەیەدا لە مووسڵدا دەژیا و تێیدا داوای هەموو پێداویستی زیندانییانی لێ کرد لە خواردن و جلوبەرگ و پارە و پووڵەوە. "هەروەکو حاجی یاسین خورشید دەگێڕێتەوە کە لە ساڵی ١٩١٠ لەدایک بووە".

١١- لە بەندیخانەدا برای گەورەی (عەبدولسەمەد حاجی ئەمین و کوڕی خاڵی حاجی یاسین خورشید نەجار) سەردانیان کرد، پاش ئەوەی

کە یەکێک لە ناسیارانیان لە هەولێردا ڕێی بۆ خۆش کردن، ئەویش خوالێخۆشبوو (ڕەشید محەمەد موفتی) بوو، کە فەرمانبەر بوو لەوێدا، لە کاتی سەردانەکەدا مەجید ئەفەندی و هاوەڵەکانی دڵنیا کرانەوە، کە مەرجەعی ئایینی لە هەولێر بایەخ بە کێشەکەیان دەدات و کێشەکەش لە بەرژەوەندیی ئەوان کۆتایی دێت.

١٢- وا پێ دەچێ کە مەلا ئەفەندی و موتەسەریفی هەولێر ناکۆکی لە نێوانیاندا هەبووبێ، هەروەکو وای گۆوێ لێ بوو لە هەریەکە لە عەبدولسەمەد ئەمین و کوڕی خالی کاتێ کە سەردانی شێخ جەمیل تاڵەبانی لە کەرکووک کرد، موتەسەریف سەید سالح زەکی ساحێبقران لەوێ ئامادە بوو و بەشێخی وت: "من لە خەڵکی هەولێر زوێر و دڵشکاو نیم، بەڵام هەڵوێستی مەلا ئەفەندی ئازاری داوم، چونکە ئەگەر بیویستبایە ئەوەی رووی دا هەرگیز رووی نەدەدا"، هەروەکو حاجی یاسین خورشید نەجار بۆی گێڕاینەوە.

١٣- ئیبراهیم عەبدولسەمەدی کوڕی برای خوالێخۆشبوو مەجید ئەفەندی بۆی گێڕاینەوە.

١٤- هەروەها بە (مەجید کۆفیت)یش ناسرا بوو، بەڵام نەمزانی مانای ئەو ناوە چی بوو و بە چ بۆنەیەکەوە بەو ناوە ناسرا بوو!

١٥- خانووەکە موڵکی (حەیدەر شرفان) بوو، کە مامۆستا بوو، لە بەشداربووانی ئەو داوەتەش هەریەکە لە (عەونی یوسف و مووسا عەبدولسەمەد)، کە داوەتەکە گۆڕا بۆ کۆبوونەوەیەکی حزبی و زاواش یەکێک نەبوو لەوان.

١٦- زیافەتەکە لە یەکێک لە باخچەکانی شەقلاوە بوو، کە موڵکی سەید حەسەن ئەشغال بوو، کە لە بەڕێوەبەرایەتیی ئەشغال چاودێر بوو. ئامادەبووانی زیافەتەکەش (مووسا عەبدولسەمەد و ڕەفعەت ئیسماعیل تووتنچی و عەونی یوسف) بوون. هەروەها سەید مەلا عەبدوڵڵا ئیسماعیل (مەلا ماتۆڕ)یش بە پایسکیلە بوخارییەکەی هات بۆ داوەتەکە، بەڵام بەهۆی راسپاردنی بەجێبەجێکردنی هەندێ کاروباری حزبی زۆر لەوێ نەمایەوە و ماندووبوونیشی بە ئاشکرا پێوە دیار بوو. پاشان ئەوانی دیکە کۆبوونەوە حزبییەکەیان ئەنجام دا. (هەروەکو تەڵعەت عەبدولسەمەد بۆمانی گێڕایەوە).

١٧- خوالێخۆشبوو (فەتاح ئاغا هەرکی) سەرۆکی یەکێک لە فەوجەکانی فورسان بوو، پەیوەندیی نهێنیشی هەبوو لەگەڵ سەرکردایەتیی بارزانی و ئاسانکاری و یارمەتیی جۆراوجۆری پێشکەش بە شۆڕشی ئەیلوول دەکرد و زۆر سەردانی دووکانی باوکیشمی دەکرد. هەروەها هاوڕێیەتییەکی پتەویشی لەگەڵ سەید عەلی ئاغا حاجی ئەحمەد ئاغا هەبوو و ئەمەی دوایش ڕۆژانە سەردانی دووکانی باوکمی دەکرد و پەیوەندیی نێوان فەتاح ئاغا هەرکی و بەدرەدین عەلی موتەسەریفی هەولێری بەهەل زانیبوو بۆ ئەوەی داوای لێ بکات، کە زۆر لە گیراوەکان ئازاد بکات، کە بە تۆمەتی بەشداریکردنیان لە شۆڕشی ئەیلوولدا دەستگیر کرابوون.

١٨- کەسوکار و هاوڕێیانی خوالێخۆشبوو (مەجید ئەفەندی) توانییان، کە خوالێخۆشبوو یاریدەدەری بەڕێوەبەر کاک ستار رازی بکەن، کە لە بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنی هەولێر کاری دەکرد تاوەکو راپۆرتێک پۆزەتیڤی (ئیجابی) لە بەرژەوەندیی مەجید ئەفەندی بنووسێ و بۆ ئەمنی گشتی لە بەغدا ڕەوانی بکات و تێیدا بنووسێ، کە هیچ تێبینییەکی لەسەر مەجید ئەفەندی تۆمار نەکردووە لە ماوەی سالی رابردوودا جگە لە چوونی بۆ فەرمانگە لە کاتێکدا، کە مەجید ئەفەندی لە دوا ساڵەکانی ژیانیدا لە بەڕێوەبەرایەتیی ئەشغال لە هەولێر فەرمانبەر بوو.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری (گوڵان العربی) ژمارە ١٧، ساڵی ١٩٩٧ بڵاو بۆتەوە.

# شێخ ئەحمەدی بارزانی
# ١٨٩٢-١٩٦٩



شێخ ئەحمەدی بارزانی کوڕی شێخ محەمەدی کوڕی شێخ عەبدوسەلامی کوڕی شێخ عەبدوڵلای ناسراو بەشێخ (تاجەدین)ی نەقشبەندی دامەزرێنەری خانەقای نەقشبەندییە لە بارزان. ئەو زاتە لە ساڵی ١٨٩٢دا چاوی بەژیان هەڵێناوە. شێخ محەمەدی باوکی دەسەڵاتی ئایینی و دنیایی گرتۆتە دەست و لە ناوچەکەیدا گەلێک دەستڕۆیشتوو بووە. هەندێ کێشەی لەگەڵ هۆزەکانی دەوروپشتی بارزان پەیدا کردبوو، بۆیە حکوومەتی عوسمانی هێرشێکی گەورەی بردە سەر و دەست بەسەری کرد و لە بەندیخانەدا توندی کرد. بەڵام دوای ماوەیەک ئازادی کرد و گەڕایەوە بارزان و لە ساڵی ١٩٠٣دا کۆچی دوایی کرد.

شێخ ئەحمەد دووەمین کوڕی گەورەی شێخ محەمەدی باوکی بوو، لە دوای شۆڕشی شێخ عەبدوسەلامی برا گەورەی و لەسێدارەدانی لە ساڵی ١٩١٤دا، بووە سەرۆکی دینی و دنیایی عەشیرەتی بارزان و ناوچەکەی، چەند جار لە تۆڵەی شەهیدکردنی برا گەورەی لە هێزی سوپای دوژمن و حکوومەت ڕاپەڕی.

لەگەڵ هاتنی سوپای ئینگلیز بۆ کوردستان، کەوتە خۆ بۆ بەرگریکردن، لە ساڵی ١٩١٩دا، لەگەڵ زێبارییەکانی لە سوپای داگیرکەریی ئینگلیزەکان ڕاپەڕین و توانییان بارزان و زێبار و شاری ئاکرێ بەناوچەکەیەوە لە هێزەکانی بەریتانیا پاک بکەنەوە. شێخ ئەحمەد لە ساڵی ١٩٢٧یشدا جارێکی دی لە دژی حکوومەت ڕاپەڕی. بەڵام دیارترین ڕاپەڕینەکەی ساڵانی ١٩٣١ و ١٩٣٢ بوو، لە دژی حکوومەتی عێراق چەند شەڕێکی گەورەی تێدا قەوما وەکو ئەمانە:

١- لە ڕۆژی ١٩ی کانوونی یەکەمی ١٩٣١دا، لە شەڕی (بەرقی بەگ)دا بەهەشتا بارزانی جەنگاوە، هێزێکی گەورەی سوپای عێراق شکێنرا و، بەرامبەر بە ٥ شەهیدی پێشمەرگە، ١٢٦ کوژراوی دوژمن لە مەیدانی جەنگ بەجێمان.

٢- لە شەڕی (دۆڵی قاژێ) کە شەوی ٣ لەسەر ٤ی نیسانی ١٩٣٢دا هێزی پێشمەرگەکانی شێخ ئەحمەد بەسەرکردایەتیی بارزانی هێزێکی سوپای عێراقییان شکاند و بەرامبەر ١٢ شەهیدی

پێشمەرگە، ٢٥٣ کوژراوی دوژمن لە مەیدانی شەڕ بەجێمان.

کە شێخ ئەحمەد زانی هێزێکی یەکجار زۆری حکوومەت بەرامبەری ڕاگیراوە، خۆی و مەلا مستەفای بارزانی برای و خاوخێزانی بارزانییەکان پەنایان بردە بەر تورکیا. بەڵام کاتێک حکوومەتی عێراق بەپشتیوانیی حکوومەتی بەریتانیا، کار لە حکوومەتی تورکیا دەکەن، بۆ بەدەستەوەدانی شێخ ئەحمەد و لە ئەنجامدا ئەو زاتە دەگیرێ و دەدرێتەوە بەحکوومەتی عێراق، بەڵام مەلا مستەفا خۆی و خاوخێزانی بارزانییەکان رزگار دەکات و دێنەوە ناوچەی بارزان و حکوومەتی عێراقیش ناچار دەکەن شێخ ئەحمەد لە ئابی ١٩٣٣دا ئازاد بکەن و بیگەڕێننەوە بارزان. بەڵام حکوومەتی عێراق مەترسیی شێخ ئەحمەدی بارزانی لە دڵ دەرنەچوو. بۆیە لە ساڵی ١٩٣٦دا شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفای بەفێڵ گرت و بەخاوخێزانەوە ڕەوانەی بەغدا و شارەکانی خوارووی عێراقی کردن.

شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفا لە سلێمانی پێوەندییان بۆ دروست دەبێ لەگەڵ ڕۆشنبیرانی سەر بە حزبی هیوا. هەروەها لەگەڵ بنەماڵەی شێخ مەحموودی نەمر. ئەم پێوەندییانە دواتر لە ڕاپەڕینی بارزان ١٩٤٥ ڕەنگ دەدەنەوە. هەر بە هاوەڵی حزبی هیواش بارزانی سلێمانی بەجێ دەهێڵێ و دەگەڕێتەوە ناوچەی خۆیان بۆ شۆڕش.



لە ساڵانی ١٩٤٣-١٩٤٥ شۆڕشی دووەمی بارزان گەرمتر و فراوانتر هەڵگیرسایەوە و ئەمجارەیان بەسەرکردایەتیی مەلا مستەفا بارزانی بوو، بۆیە لە دوا دوای ساڵی ١٩٤٥دا بەخۆ و جەنگاوەر و خاوخێزانی بارزانییانەوە ئاودیوی کوردستانی ئێران بوون و چوونە پاڵ ڕاپەڕینەکەی میللەتی کوردی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و بەشدارییان لە دامەزراندنی کۆماری دیموکراتی کوردستان کە لە ڕۆژی ١٩٤٦/١/٢٢دا قازی محەمەدی پێشەوای کورد ڕایگەیاند و ئاڵای کوردستانی بەرز کردەوە. بەڵام کاتێک ئەو کۆمارە ساوایەی کوردستان لە ڕۆژی ١٩٤٦/١٢/١٧ بەپیلانی دەوڵەتە زلهێزەکان زیندەبەچاڵ کرا، شێخ ئەحمەد و خێزانە بارزانییەکان بەرەو عێراق هاتنەوە و مەلا مستەفا بارزانی بەرەو سنووری سۆڤیەت بەخۆی و پتر لە ٥٠٠ جەنگاوەری ڕۆیشتن، لە ١٩٤٧/٦/١٩دا لە ئاوی ئاراسی سەر سنووری ئێران و سۆڤیەت پەڕینەوە و بوونە پەناهەندە لەو وڵاتەدا، شێخ ئەحمەدیش لە عێراق دادگایی کرا و حوکمی لەسێدارەدانی درا، لە دواییدا حوکمەکەی سووک کرا و خرایە بەندیخانە لە خوارووی عێراق، تاکو لە دوای بەرپابوونی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨دا ئازاد کرا و لە ڕۆژی ٢١ی تەمووزی ١٩٥٨دا بەرەو بارزان گەڕایەوە، تاکو دوا ساڵەکانی ژیانی تێدا بەسەر بەرێت و لە ڕۆژی ١٩٦٩/١/١١دا لە تەمەنی ٧٧ ساڵی کۆچی دوایی کرد.

**کەریم شارەزا**

# عەلی شۆن هەڵگر

نەژاد بەرزنجی

### چەند ڕێگایەک لە لێکۆڵینەوەکانی کۆندا

لە کۆمەڵگەکانی پێشوودا بۆ دۆزینەوەی تاوان و تاوانباران چەندین ڕێگای هونەرییان بەکارهێناوە، بۆ ئاشکراکردنی جۆری تاوانەکان لەسەر بنچینەیەکی زانستی و فیزیۆلۆژی و سایکۆلۆژیی سەرکەوتووانە لە تاوانەکانیان کۆڵیوەتەوە. (ئارستۆ)ی بلیمەت و زانای یۆنانی کە لەسەدەی سێیەمی بەر لەزایین ژیاوە، (لێدانی دڵی کردووە بە پێوەر بۆ دۆزینەوە و ئاشکراکردنی تاوانبار). بابلییەکانیش لە لێکۆڵینەوەی تاوانەکاندا زانستی دەروونییان بەکارهێناوە. چین و ڕۆمان و ژاپۆنییەکانیش مۆری پەنجەیان زانیوە، (دکتۆر هنری فۆڵدس) لەساڵی(١٨٨٠ز) هەندێ قاپ و قاچاغی ژاپۆنی دۆزیوەتەوە، کە بەر لەمێژوویەکی زۆر کۆن نووسراون و وێنەی مۆری ئەنگوست و پەنجەیان بەسەرەوە بووە[1]، زۆر هۆکار و ڕێگای دیکەش.

### عەلی شۆن هەڵگر:

- ناوی راستەقینەی- عەلی عەبدوڵلا قوربانییە، دایکیشی - ناوی - بەلقیسا بووە، لە ساڵی (١٩٠٣ز) لەگوندی (گردیش) لەدایک بووە، لە ساڵی(١٩٦٩ز) کۆچی دوایی کردووە.

### شاکارەکانی شۆن هەڵگر!!

(ڕووداوی یەکەم)م لە گۆڤاری هەولێری ژمارە (٧)ی ساڵی(٢٠٠٠ز) بڵاوی کردۆتەوە ، لێرەدا باس لە چەند ڕووداوێکی ئەم پسپۆڕە دەکەین لە کەرکوک و مووسڵ ڕوویداوە، لەبەر ئەوەی سەروبنی ڕووداوەکەیان لا ساغ نەبۆتەوە، لەلای پۆلیسەوە عەلی بانگ کراوە، ئەم ڕووداوەش لە سەردەمی حوکمی پاشایی ڕووخاوی عێراق ڕوویداوە، لەشاری کەرکوک، ئێمەش بەوردی ڕووداوەکە دەگێڕینەوە.

کابرایەکی کەرکوکی و سێ کوڕی لەوێ دادەنیشن، شوانکارەکیان لەدەوروبەری ناوچەی (چەمچەماڵ) دەبێت و.. ڕۆژێکیان کابرا بەمەبەستی سەردانی مەڕو ماڵاتەکەی بەرەو هەواری ڕەشماڵەکەی خۆیان دەچێت و دوای تێپەڕبوونی چەند ڕۆژێک بێ سەروشوێن دەبێت، دڵی کوڕەکانی دەکەوێتە مەترسی و تەنگاودەبن، شوانکارەکە ئاگادار دەکەنەوە، کەچی ئەویان دڵێ هەر نەمدیوە، بەمە نائومێد دەبن، دەڵێن کارەساتێکی بەسەرهاتووە.

ئەوجار: لەرێگای پۆلیسەوە حاجی عەلی بانگ دەکرێت، ئەویش، کە دەچێت، لە سەرەتاوە لە (ئەوەلیاتی) بەسەرهاتەکە دەکۆڵێتەوە.. ئەوانیش بەرێکی سەروبنی مەسەلەکەی تێدەگەیەنن، حاجی پێیان دەڵێت: ئێوە ئەو شوفێرە دەناسن، کە باوکتانی بردووە؟! پێی دەڵێن بەڵێ: ئاشنای خۆمانە، پێیان رادەگەیەنێ، کە بۆی بێنن، بەوردی لە ئیفادەی شوفێرەکەش دەتۆژێتەوە و لەگەڵ (مەفرەزەی تەحەریات) و هەندێ خەڵکی دیکە و شوفێرەکە دەچنە ئەو شوێنەی کابرای لێ دابەزیوە، کە ڕێچکۆڵەیەکی سەڵتە زەلامی دەبێت، واتە (کوێرەڕێ) شوفێرەکە دەست نیشانیان بۆ دەکات و لەوێوە دەوروبەرەکە دەپشکنن هەتا شوێنی کابرا دەدۆزنەوە. ئەنجا شوێن هەڵگر بە (ئوسلوبی خۆی) ئەندازە و شکلی شوێنەوارەکە وەردەگرێ، بۆی دەردەکەوێ کابرا شەلە بووە، ئەنجا: مەسەلەکە لە کوڕەکانی دەپرسێ و دەڵێ باوکتان شەلە بووە، ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ.. باوکمان لەرۆیشتندا وابووە، ئەمجارەش لە شوێنی پێیەکانی ورد دەبێتەوە، بۆی روون دەبێتەوە کابرا سووکەزەلام (زەلامێکی بچکۆڵە) بووە و کەڵاشی لەپێ بووە لە وەڵامی ئەم پرسیارەش

کوڕەکانی دەڵێن: کە ڕاستە وابووە، بەو چەند بەڵگەو شوێن ناسییە بۆ خەڵکەکە ئیسبات دەکات، کە توانای سۆراخکردنی نهێنییەکەی هەیە، بەر ئیچکۆڵەکەدا پێ بەپێ شوێنەکان هەڵدەگرن و هێندەی نابات دەگەنە کۆنە هەوارێک لەوە دەچوو، کە چەند ڕۆژێک لەمەوبەر شوانکارەکەی لێ بوو بێت، لە دەوروبەری هەوارەکە دەخولێنەوە و دەگەڕێن، عەرد و بەردەکە دەنۆڕن، لەئەنجامی وردەبینی و سەرنجی تیژی شوێنی سمەکەرێک دەدۆزێتەوە، لەوە دەچێت قورسایی (بار)ێکی گرانی لێ بوو بێت و لە تەنیشتییەوەش کابرایەک پێ بەپێ (قەرە بە قەرە) لەگەڵی ڕۆیشتووە و دەبێت دەستی بە باری سەرپشتی کەرەکە وە گرتبێ و سەنگایەتی ڕاگرتبێت، .. نرخی پسپۆڕی لەوەبووە، کە بە ئاسانی توانیویەتی شوێنە سمی کەری ئاسایی و باردار لێک بکاتەوە، ئەمە تەنها بایەخێکی ڕەسەنی شوێن هەڵگری پسپۆڕە، ئەوجا: دەگەنە (قەناعەتێکی) تەواوە و زیاتر (سۆراغی) شوێنی کەر و زەلامەکە دەکەن، زۆر بەردەڵان و نەرمان و دۆڵ و بانی گردو کەند و لەندی ئاقارەکەی پێ دەکەن، تا لەنزیکی کەندەڵانێک قورتێکی پڕکراوە دەدۆزنەوە، خۆڵ و گڵەکەی لێ دەردەکەن، لەژێر چاڵەکەوە دەبینن خەروا (خرارێک) دەرکی بەستراوەو دانراوە، کە دەیکەنەوە لاشەی ڕیش سپییەکی تێدا دەردەکەوێت. کوڕەکان هاوار دەکەن: ئەوە باوکمانە!! شوانکارەکەیان بانگ دەکەن و دوای سەلماندنی گوێزانەوەی هەوارەکەی لەبەر دەمی (واقیعە)کە دان بەتاوانەکەی خۆی دادەنێت و لەگەڵ هاوکارەکانی بەسزای خۆیان دەگەیەنرێن[٢].

ئەم ڕووداوە بە پلەی یەکەم شوێن هەڵگر پشتی بەدیوی شوێنەوارەکانی بەستووە، ئەوجار هاتووە سروشت و باری جوگرافی و جیۆلۆجی ئاقارەکەشی هەڵسەنگاندووە... شوێنی ڕێگای سەخت و بەراورد کردن و جۆری پێ و هەنگاونان و شێوازو ڕۆیشتنی کابراو شوێنی سمەکەرو ئەم وردبوونەوەیە جۆرە شارەزاییێ، کە لەرادە بەدەر ئەنجام دراوە، بەڕاستی ئەم کەڵەمێردە پسپۆڕێکی بلیمەت و دەگمەن و بێ هاوتا بووەو لەکورد - یش هەڵکەوتووە.

جارێکیان لەشاری (ڕانیە) کۆمەڵە دزێک دوکانی زێڕینگەرێک لەشارەکە دەدزن، حاجی عەلی- ش لەرێگای (ڕەسمیاتەوە) بۆ هەڵگرتنی شوێن و دۆزینەوەی تاوانکارەکان بانگ دەکرێت، هەرکە دەچێت.. ڕاستەوخۆ لەبنکەی پۆلیسی قەزاکەوە- دەچێتە شوێنی ڕووداوەکە، کە لەنزیکی سێ کەوانی بازاڕۆچکەکە دەبێت، لەوێوە تەماشای باری دەوروبەرەکە و سەرنجی چۆنیەتی برینی دوکانەکە دەدات و لێی ورد دەبێتەوە.

ئەوەی بۆ ساغ دەبێتەوە تەنانەت ئاکارو شوێنەواری ڕووداوەکەیە، لەپاش چوونە ژوورەوەو هەڵسوکەوتی ناو دوکانەکەیە، بەڵام سەروبنی ڕووداوەکەی لێ ئاڵۆز دەبێت و شتێکی ئەوتۆ لەم ڕووداوە تێناگا، لەئەنجامدا وای بەباش زانی، کە پەرتە بە حەشامەتی بازاڕەکە بکەن.. بەڵکو بەرچاوی نەختێک ڕۆنتربێتەوە.. لەپاش بڵاوەپێکردنی خەڵکەکە.. شەقامەکە چۆڵ دەکەن، ئینجا بەشۆن ڕاستپێوی دزەکان و چۆنییەتی شکاندنی (قاسە)و جامخانەکە وەردەگرێت و لەمانەو باری هاتنەژوورەوەی تاوانبارەکان و شوێنەواری مەڵبەندەکە شتێکی ڕاستەوخۆی بەرچاوی چنگ دەکەوێت! لەوەوە بۆی دەردەکەوێت- کە تنەکە بەئاشکرایی کراوە.. بەتایبەتی کە شوێنەکەی چەقەرێی بازاڕەکەیە و لە هەموو وەختێک ئێشگری شەوی لێ هەیە، حاجی وای بۆ دەچێت، کە (ئیشگرەکان/ پاسەوانی شەو) دەستیان لەو تاوانە دابێت، یان کەم تەرخەمیان لەم کارە کردبێت، مەودایان بۆ دزەکان خۆش کردووە، کورد گوتەنی: ئادزو خانەخۆیی یەک بن گای لەکولانکە ئاوا دەکەن !!"

لەسووچێکی دوکانەکە حاجی ناوبراو تەماشای قورنەیەکی شەقامەکە دەکات، ڕاستەوخۆ دەنوارێتە ناو دوکانەکە، بۆ سەروبن کردنی دوکانەکەو شوێنەوارەکەو دەوروبەرەکە دەگەڕێت..! تا شوێنی دووکەس دەدۆزێتەوە لەوە دەچێت بە مەبەستی چاودێری لەوێ مابنەوە چونکە ناوەکەیان گێرەکردووە، پێ پەستییان دیارە و چیلکەدارو پەڕۆکیان سوتاندووەو شوێنەوارەکەی دیارە و ڕێک بۆ ئەوە دەچێت، کە ستارگەی شەوی ئیشگرەکان بێت.

ڕاستەوخۆ دەگەڕێتەوە مەڵبەندی پۆلیس و داوای ناوی ئەو ئیشگرانە

دەکات، کە شەوی رووداوەکە لەشەقامە/ (قورنەکە) بوون، قومیسەر دەبێت یان باشچاووش ناوەکانی دەداتێ، پاش ئەوەی پێوان و راستپێوی پێیەکانیان وەردەگرن..! سەیر دەکەن تەواو (موتابیقی) پێیەکانە.. ئینجا حاجی عەلی شۆن هەڵگر هەردوو ئێشگرەکە لەژوورێکی تەنها دادەنێ و لێیان دەکۆڵێتەوە و بێ سێ و دوو دەڵێت:- دیارە ئێوە ئەو دزییەتان کردووە.. ئەوانیش دەڵێن:.. "ئەوەندە سوێندو قورعانە ئێمە عیلم و خەبەرمان لێ نییە؟" ئەمجارە روویان تێدەکاتەوە و دەڵێت: کەوابوو ئەو شەوەی، کە دیوتانە دزەکان دوکانەکە دەشکێنن بۆ لێیان نەهاتنە دەنگ؟! ئەدی ئەرکی ئێوە چییە؟! ئەوانیش دەپرسن: ئەو شەوەی تاوانەکە تۆ چۆن ئێمەت دی؟، حاجی وتی: من ئێوەم نەدیوە، بەڵام دزەکان گیراون و وایان پێ لێناوە، ئیتر هەردوو ئێشگرەکە لەبەر وردەکاری و رێک و پێکی کارەکەی حاجی دەڵێن: بابە وەڵڵا ئێمە دزەکانمان دیت، بەڵام هەرەشەی کوشتنیان لە ئێمە کرد ناچار بێ دەنگ بووین!! کۆمەڵێک ماڵ و منداڵی وردکەمان هەیە، خوا هەڵناگرێ بێ باب بمێنن!! دزەکانیش (فلان و فلان.. تد).. بەم جۆرە ئەم کارە ئاڵۆزە ئاشکرا دەبێت و تاوانبارەکانیش دان بەتاوانەکەی خۆیاندا دەنێن!.. بۆ پاڵپشتی و رۆشن کردنەوەی پسپۆرییەکەی شۆن هەڵگر! نموونەی رووداوێکی لەم تەرزە دێنینەوە کە دادوەری لێکۆڵینەوەی تازەی عێراقی بەشێوەیەکی زانستیانە لێی کۆڵیوەتەوەو گەیشتۆتە ئەنجامی رەچاوکراو.. بۆ ئەم مەبەستە ئەگەر بمانەوێ بەرووداوێکی توانای شۆن هەڵگرو شێوە تازەکە بکەین، گومان لەوەدا نییە کە بایەخی راستەقینەی بۆچوونەکەمان بەری دەبێت.. بەم شکڵەی خوارەوە رووداوەکەی دەزگای لێکۆڵینەوەی تازە دەگێڕینەوە، رووداوێک لەبەغدا دەقەومێت و هەندێ زێرو زەبەند و گوهەری کابرایەک دەدزرێت، دەسەڵاتی لێکۆڵەرەوەش بەپێی ئەو زانیارییانەی خۆی کە هەیەتی مەزەندە و گومان لە کابرایەکی، یان باشترە بگوترێ دزێکی بەناوبانگ دەدات و دەیگرن! کە پشکنین دەگاتە دوادوایی ماڵی دزەکە.. کابرای لێکۆڵەرو پسپۆڕ، کە لەتەنیشت دزەکەوە دەخولێتەوە دەبینێ بەرەنگ و رووی هەڵبزرکاو رادەجفرێت، حاجی عەلی- بەڵگەی مادی و نەفسی کردووە بەهۆ و چەک بۆ هێنانەوە و تەواوکردنی بەڵگەی مەعنەوی و سەراوبن کردنی مەسەلەکەو شکاندنی تەسلیمی تاوانکارییەکە، بەڵام پسپۆڕی دووەم گۆڕانە فیزیۆلۆژییەکانی کردۆتە سەرەتا ئینجا بەڵگە (مادییەکانی) بۆ وەدەست خستنی بەڵگەی (مەعنەوی) و دۆزینەوەی شتە دزراوەکان هێناوەتەوە.

جارێکی دیکەش حاجی عەلی لە رێگای بەڕێوەبەری مووسڵەوە بانگ دەکرێت، بۆ ئەوەی (دزییەک) ساغ بکاتەوە، کە لە (کۆمپانیا)ی نەوتی (عەینزالە) کرابوو، وەک شۆن هەڵگر خۆی لای زۆرکەسی گێڕاوەتەوە، کاربەدەستانی کۆمپانییەکە بێگانە دەبن و شەوێکیان کۆمەڵێک (جەردە) دەچنە ناو کەمپەکەیانەوە و زۆر کەلوپەلی بەسوود دەبەن و گەف لەپاسەوانەکەش دەکەن لێیان نەیەتە دەنگ، کە دەگاتە شوێنی رووداوەکە..هەست بەوە دەکات، کە کاربەدەستانی کەمپەکە گاڵتەیان بەوەدێت، پیرەمێردێکی رووتەڵەی پەنجا شەست ساڵەی کورد! ئەم تواناو (ئیدراکە) بەرزەی هەبێت و گرێ کۆرەیەکی وا ئاڵۆز بکاتەوە و تەلەسمی ئەو کردەوە نهێنی و شوومە بشکێنێ! وایان رانەدیوە تاوانبار بدۆزێتەوە و لەجەرگەی کەتنەکە بگات،.. ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە، لەبەر گرنگی مەڵبەندی شەریکەکەو مەترسی رووداوەکە خۆی و کاربەدەستێکی زۆری شاری مووسڵ، خەریکی مەسەلەکە دەبن!، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ، کە شۆن هەڵگر پسپۆڕێکی ناسراو بووە، بەهەمان حاڵیش هەرچۆنێ بێت سەرنجی بێگانەکانیشی راکێشاوە، لەهەوەڵ جارەوە، وەکو هەمووجارێ عادەتەکەی خۆی، گوێی لە (ئیفادەو مەعلوماتی) پاسەوانەکە دەگرێت، تاوەکو سەرەگرێی رووداوەکە بکاتەوە، کابراش سەروبنی هاتنە ژوورەوە و ژمارەی دزەکانی بۆ باس دەکات، کە چۆن هاتوونەتە سەری و خۆیان دەمامک دابوو دوای پشکنین و گەران و سورانیان بەناو ژوورەکە ئەوەی بەباشیان زانی گردیان کردەوە و کردیانە کۆڵەبار، ئینجا چوونە دەرەوە، لەبەر تیشکی ئەم سەرەتایە

بەناو ژوورەکە دەخولێتەوە تا شوێنەواری دزەکان دەبینێتەوە و شوێنی پێیەکانیان لەژوورەوە دەباتە دەرەوە، لەدەوروبەری خانووەکەش زیاتر قیاس و شێوەی شوێنەکانی بۆ روون دەبێتەوە، لە کەمپەکەیان دەردەکات و خەڵکەکەش قەربەقەرە و هەنگاو بەهەنگاو لەگەڵی دەڕۆن.. چەند گوندێک دەبڕن، کەچی دزەکان دیاربوو لەهیچ گوندێکیان لانەداوە، ماوەی رۆیشتنەکە زۆر دەبێت، بەڵام حاجی عەلی نەفەس درێژو خۆگر تاکە کەس دەبێت کە فێری پیادەیی و ئەم جۆرە رۆیینەیە، زەلامەکانی دیکە بەتایبەتی بێگانەکان سەریان لەمە سوڕ دەمێنێ، کە ئەوان وەکو حاجی شۆنەکەیان بەچاو بۆ ساغ نابێتەوە، دیارە سەلیقەداری و راهاتنی شۆن هەڵگرتنیش پیاوی خۆی هەیە!! وەک لەگێڕانەوەی باس و رووداوەکانی دیکە پەنجەمان خستەسەر ئەوەی کە حاجی عەلی شۆن هەڵگر لەکارەکەیدا سەرەڕای پێوانەو شکڵی شوێنەکان پشتی بە (زرووفی) دۆزینەوەو پشکنین و رووی تاوانەکان و شێوازی تاوانبارو بەڵگە (مادی)یەکانیش بەستووە. زۆر شتی لەبارو چۆنیەتی (واقیعە)کەوە هەڵێنجاوە.. هەرلەم رووداوەدا وا رێ دەکەوێت ئەو گوندەی شۆنەکەی لێ نزیک دەبێتەوە لەدوورەوە دەبینن کەوا ژنێک لەسەر بانێکەوە بە نائاسایی وەستاوە و بەوردی سایەدی و چاوەدێری شۆن هەڵگرو (خەڵکەکە) دەکات، لەوەوە حاجی گومان لە هەڵسوکەوتەکەی دەکات و دەگاتە ئەو باوەڕەی کە ئەم ئافرەتە!! پەیوەندی بەرووداوەکە هەیە.. لەبەر رووناکی ئەم سەرنجەوە شۆنەکە هەڵدەچنێ تا دەیباتە بەر قەمتەرەی ئەو خانووەی ژنەکەی بەسەرەوەیە.. لە هەمان کاتدا سەیردەکەن وا لەدەرگای دیوی پشتی ماڵەکەوە ژن و منداڵ شتومەک بەپەلەو پرتاوی بۆ ماڵێکی دیکە دەگوازنەوە.. کە ماڵەکان دەپشکنن رێک کەل و پەلە دزراوەکان دەدۆزنەوە.. دزەکان دەگیرێن، پێی لێ دەنێن و دەدرێنە دادگا.

برادەرێکی شەقڵاوەیی ئەو رووداوەی خوارەوەی بە وردی بۆ گێڕامەوەو سەبارەت بەوەی، خۆی گەنجێکی نرخدارەو بەڕاستگۆ ناوی داوە، بەپێویستم زانی ئەو پەڕە دەسخەتە شڕەی لەسەر داوای خۆم بۆی نووسیبووم وەکو بەڵگەیەکی گرنگە با لەدەستی نەدەم!

شەوێکیان چەند زەلامێکی ئەو هەرێمە لاوێکی بێ گوناه دەکوژن.. رووداوەکەش لەهەوەڵەوە نیازو مەبەستی روون نابێت، پاش یەکدو رۆژ تەرمەکەی لەسەر گردی زیوری شەقڵاوە فرێ دەدەن و پۆلیس پێی دەزانێتەوە، بەڵام وای بە بەرژەوەند دەبینن، کە دەستی نەدەنێ و لەشوێنی خۆی نەجولێنن، هەتا پسپۆڕ (نەی پشکنی)، دەمودەست بە دوای حاجی عەلی دەنێرن، کە دەچێتە سەری بەوردی ئەودیوو ئەم دیوی لاشەکە دەکات و لەش و ئەندامەکانی دەنۆڕێت.. تا شوێنەواری گوللەیەک لەسەری تەرمە کوژراوەکە دەدۆزێتەوە، بەڵام وشکەو خوێنی لێ نەهاتووە، برین نییە بەڵکو لەدوای مردن لێی دراوە. لەوە دەگات کە بەگوللە نەکوژراوە، ئینجا زیاتر لێی ورد دەبێتەوە، بۆی دەردەکەوێت زۆر شوێنی جەستەی وردوخاش کراوە، ئەزیەت دراوە، لەهەمان کاتیشدا بۆی ئاشکرا دەبێت، کە لاشەکە بە گوریس شەتەکدراوە، سەبارەت بەوەی شوێنەواری پەتەکە جێی دیاربوو بەسەر لاشەکە، دەبێت ئەم پێچانەش بۆ ئەوە بووبێت، (لەسەر رای ئەو وەختەی شۆن هەڵگر) بەوڵاغێک گوێزرابێتەوە، لەپاش ئەوەوە دەست دەکات بە هەڵگرتنی شوێنەکان، لەشوێنی تەرمەکەوە، بۆ ئەو مەڵبەندەی تەرمەکەی لێوەهاتووە. دیاربوو چەند پیاوێک بەهێسترێک لاشەکەیان گواستۆتەوە، تا دەیباتە ناو چایخانەکەی رووداوەکەی لێ قەوماوە، دارو عەردو دیواری چایخانەکە دەپشکنێت.. چەند (شوێنەوارێک) لەسەر دیوارو زەوییەکە دەبینێتەوە، کە کوڕە کوژراوەکە لەتاوی مەرگی خۆیەوە پڕی پیاکردووەو کەستەک و خۆڵی لێکردۆتەوە هەروەها هەندێ مووی پرچی جێماوی کوژراوەکە بەسەر دیوارەکەوە دەدۆزنەوە! کە لەکاتی ئەزیەتدان و بەولاو بەم لای دیوارادانی بەپێستەوە بەسەر تاقەکانەوە نووسابوو[٤] ئیفادەی چایچییەکەش وەردەگرن.. بەڵام حاجی هێشتا بەدوای شوێنەوارە (مادی)یەکەی دەکەوێت، چەند جار شوێنەکان بەناو جۆگەو ئاوەکانی شەقڵاوە دێنێت، بۆ گوێزرانەوەی تەرمەکە گوریسەکە لەژێر زەوی دەردێنێ هێسترەکەش بەسەر

دەکاتەوە.

ئەگەر سەیرێکی ساکارانەی ئەم رووداوە بکەین، بەئاسانی بۆمان ئاشکرا دەبێت، کە حاجی عەلی ئەم بەڵگەو تێبینیانەی رەچاو کردووە.

١- گۆرانە فیزیۆلۆژی و جەستەییەکانی تەرمەکە.
٢- شوێنەواری کەتنکەرەکان و ولاغەکە.
٣- بەکارهێنانی گوریسەکە.
٤- شوێنەواری شکاندن و ئەزیەتدانی کوژراوەکە.
٥- پاشماوەی تاوان لێ کراو لەناو چایخانەکەدا، کە لەهەژمەت ئازارو تاوی مردن چرنووکی لەخاک و دیوارەکە گیرکردبوو! هەروەها پێست و مووی سەری شکاوی، کە بەسەر لادیوارەکاندا مابۆوە!
٦- ئیفادەی چایچییەکە.

پسپۆرێکی جوامێرانە بووە لەرێگای بەڵگەی (مادی و مەعنەوی) و گۆرانەکانی جەستەیی کوژراوەکە، ئەنجامی شتەکانی هێناوەتەوە، بەهۆی چاوتیژی و زەین قوڵییەوە مەسەلەکەی ساغ کردۆتەوە!

ئەگەر بمانەوێ بەراوردێکی یەک لایەنی چکۆلانەی ئەم رووداوە و رووداوێکی دیکە میدانی لێکۆڵینەوەی تازەی ولات بکەین، ئینجا بە (حەقیقەت) لە (توانا) و بیرفرەوانی حاجی دەگەین، لەزۆر رووداوی (کەتندا) پشت بەمووی پرچی تاوانبار یا تاوان لێ کراو دەبەسترێت و لەشوێنی تایبەتی (دەپشکنرێ) و تاقی دەکرێتەوە.. لەم رووداوەی سەرەوەش پرچی کورە کوژراوەکە دەورێکی بینی لەتەک دیاردەکانی تر، شۆن هەڵگری لەباری گومانەوە خستە باری (بەڵگە و یەقینەوە)!..

(جارێکیان پۆلیس لاشەی منالێک دەدۆزێتەوە، کە ئۆتۆمبیل پانی کردبۆوە، گومان لە ئۆتۆمبیلی ئاوکێشان دەکرێت.. کە بەو ناوەدا رابردبوو! کاتێک شوفێرەکەی دێنن و لێی دەکۆڵنەوە- حاشا لە کردەوەکەی دەکات، لێکۆڵەرەوەش دەست بەجێ ئۆتۆمۆبیلەکە بۆ دائیرەی تۆژینەوە دەنێرێت تاوەکو بەهۆی (تاقیگە)ی تایبەتیەوە بپشکنرێت، بەلام لەسەرەتاوە ئەنجامێکی نابێت، دوای ئەوەی (پسپۆر)ێکیان زۆر خۆی ماندوو دەکات لەسەر پێچکەی ئۆتۆمۆبیلەکە چەند داوە مووەک دەدۆزێتەوە، یەکسەر بۆ بەشی (سیریۆلۆژ)ی دەنێرن، کە لەگەڵ مووی پرچی منالەکە بۆ بەراورد کردن دەیخەنە ژێر میکرۆسکۆب و وێنەیان (٥٠٠) جار لە قەوارەی خۆیان گەورەتر دەکرێت.. راستەوخۆ مووی پرچی کورەکە دەردەچێت و یەکسەر دووبارە ئەم بەڵگە سەلمێنەرە دەخرێتەوە بەردەمی لێکۆڵینەوەو بەرەو رووی تاوانباری دەکەنەوە! ناچار پێی لەکردەوەکەی دەنێت، شانازی ئەو بەراوردکردنە زیاتر وردبینی و کارناسی و سەلیقەبەرزی و لێکدانەوەی شۆنهەڵگر دەگەیەنێت!

### بەڵگەو سەرچاوەکان

(١) بڕوانامە کتێبی (اصول التحقيقات الجنائية)ی دکتۆر سوڵتان ئەلشاوی، چاپی بەغدا ١٩٧٢.

(٢) قوتابی سەرەتایی بووم کە جارێکیان دایکم ئەو مەسەلەیەی بۆ گێرامەوە، سەبارەت بەوەی حاجی ناوبراو خوارزای باوکی دایکمە.. دیاربوو لەو وەختەدا رووداوەکە قەومابوو.. کاک شەریف- ی هاورێم بێ زیادو کەم بەهەمان شێوە بۆی گێرامەوە، بەلام ئەم رووداوەیان لەوانی دیکە باوترو ئاشکراترە، سەبارەت بەوەی خەڵک زۆر دەیزانێت.

(٣) نوری چاوش، لە قەلات لە سالانی سییەکان دراوسێیەکی کۆنم بوو.

(٤) نامیلکەیەکی پارێزەری شەهید (کاردۆ گەلالی) لە سالی ١٩٧٦ز لە سەدەی رابردوودا نووسیویەتی.

(٥) مام جەمیل ناوێکی بازرگان کردەوەو پسپۆرییەکانی حاجی عەلی بۆ دەگێراینەوە، ئەوانم هەموو پاراستووە هەر لە سالانی هەشتاکانەوە تا ئێستا.

هەر خوێنەرێکی بەرێز لەم باسەی کە نووسیومە دەربارەی ئەم شۆن هەڵگرە بەرێزەی خوالێخۆشبوو وا دەزانێ کە دەقی نامیلکەکەی خوالێخۆشبوو کاردۆ گەلالییە. نەخێر ئەگەر بەشێکی تێکەڵ دارشتنەکەی خۆم کرابێ. ئەوەش بەسەرچاوە دەژمێردرێ. لە نووسینەکەمدا ئاماژەم بۆ کردووە.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری (ئاسۆی فۆلکلۆر) ژمارە (٨) سالی ٢٠٠٥ بلاوبۆتەوە.

# عەلی مەحموودی کاکەخان
# ١٨٩٨- ١٩٧٠

ئەم زاتە کوڕی مەحموود ئاغای کوڕی کاکەخانی کوڕی سمایل ئاغای کوڕی کاکەخانی گەوردی دزەییە. لە ساڵی ١٨٩٨دا لە گوندی (گرد مەلا)ی سەر بەناحیەی قوشتەپەی پارێزگای هەولێر لەدایک بووە.

لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆڕشەکەی شێخ مەحموودی مەلیکی کوردستان، لە مایسی ١٩١٩دا خۆی گەیاندۆتە سلێمانی و بەخۆیی و چەکدارەکانییەوە بەشداریی لەو شۆڕشەدا کردووە. کە شۆڕشەکەش لە حوزەیرانی ئەو ساڵەدا تێکچووە، گەڕاوەتەوە دەشتی هەولێر و خۆی لە ناوچەی دێدەوان عاسی کردووە



و دوور لە دەستەڵاتی حکوومەتی عێراق خۆی حەشار داوە. بەڵام کە بڕیاری لێبووردنی گشتی دەرچووە، گەڕاوەتەوە ناوچەی قوشتەپە و خەریکی کشتوکاڵ بووە و بەنهێنیش پەیوەندیی بەشێخ مەحموودەوە کردووە و نامە و نوێنەریان لە نێوانیاندا هاتوچۆ دەکات و "مەلا خالیدی مورتکە" ئەو دەوردی بۆ بینیوە، کاتێک شێخ مەحموود ئاگری شۆڕشی ڕزگاریخوازی کوردی هەڵگیرساندۆتەوە، دووبارە عەلی ئاغا بەگەرمی پەیمانی کوردایەتیی لەگەڵدا نوێ کردۆتەوە و بەخۆی و کۆمەڵێک چەکدار چووەتە پاڵ شۆڕشەکەی و ڕووەو چیای سووورداش چووە، کە ئەوساکە شێخ مەحموود خۆی لەوێ قایم کردبوو، دوای لەناوبردنی ئەو شۆڕشەی کوردیش ڕوو دەکاتە ناو عەشیرەتی جاف لە ناوچەی دووکان بۆ لای "کوێخا حەسەن" و "کوێخا حەمەدئەمین" و ڕێزێکی زۆری لێ دەگیرێ، بەڵام کە حکوومەت پێی دەزانێ تەنگەتاویان دەکات، ئەویش

بەخۆی و چەکدارەکانییەوە بەرەو دەشتی کۆیە دەچن و لە دواییدا روو دەکەنەوە ناوچەی دێدەوان و لەوێوەش سەر لە ناوچەی کەندێناوە دەدەن. لەو کاتەدا حکوومەت چەند مەفرەزەیەک پۆلیس دەنێرێ بۆ گرتنی عەلی ئاغا و تاقمەکەی، گەلێک جار لێیان دەبێ بەشەڕ و کوشتار و زیانێکی زۆر بەو مەفرەزانە دەگەیەنن.

دوای ئەو شەڕانە عەلی ئاغا روو دەکاتەوە دەشتی کۆیە و زۆرجار لەگەڵ مەفرەزەی پۆلیس لێیان دەبێ بەشەڕ و چەند موفەوەز و پۆلیس دەکوژرێن، دوای ئەو بەیەکدانانە حکوومەت زیاتر دەکەوێتە دووی، ئەویش بۆ ماندووکردنیان زوو زوو ناوچەکەی خۆی دەگۆڕێ و سەردەمێک بەرەو دەشتی مەرگە دەڕۆن و حکوومەت داوا لە ئاغاکانی مەرگە و پشدەر دەکات بۆ گرتنی عەلی ئاغا و چەکدارەکانی، ئەوانیش دەیاننێرن بۆ (گوندی سوونێ) بۆ لای (حاجی حوسێنی مامەش) و ماوەی سالێک لەوێ دەمێننەوە.

لەو کاتەدا شێخ مەحموود لە بەغدا دەستبەسەر دەبێ، کە دەزانێ باری ژیانی عەلی ئاغا و هاوەڵانی وا ناخۆشە، داوا لە حکوومەت دەکات ئەمری عەفوویان بۆ دەربکات، جگە لە شێخ مەحموودیش ئاغاکانی دزەییش زۆریان هەوڵدا بۆ لێبووردنی عەلی ئاغا و تاقمەکەی، لەوانە (عەلی خورشید ئاغا)ی قەپلان و (حوسێنی مەلا)ی قازیخانە، کە ئەوسا نوێنەری پەرلەمانی عێراق بوو. لە ئەنجامدا حکوومەت عەفووی دەکات و دەگەڕێتەوە گوندی مورتکە لە ناوچەی قوشتەپە.

عەلی ئاغا دوای گەڕانەوەشی واز لە کوردایەتی ناهێنێ و بەردەوام پەیوەندیی بەنیشتمانپەروەرانی وەک "شێخ لەتیفی شێخ مەحموود"و پارێزەر "عەونی یووسف" و "کاکە زیاد ئاغای کۆیە"و "عەباسی مامەند ئاغای ئاکۆ"وە دەکات و ئامادەیی خۆی بۆ بەشداریکردن لە هەر بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی سوودی کوردی تێدا بێ، دەردەبڕێ.

لە ساڵی ١٩٤٥دا مەلا مستەفای بارزانی سەردانێکی ناوچەی هەولێر و دەشتی دزەیی کرد بەنیازی بەشداریکردنی سەرۆک عەشیرەتەکانی کورد لە شۆڕشی بارزاندا شەوێک لای عەلی ئاغا لە دێی (مورتکە) دەمێنێتەوە و لەگەڵ ئاغەکان کۆ دەبێتەوە لەو پیاوانەی کە وادەیان بەبارزانی بەشداری لە شۆڕشەکەدا بکەن عەلی ئاغا بوو. کە شەڕ لە ساڵی دوایی شۆڕشەکەی بارزان دەستی پێ کردەوە عەلی ئاغا لەسەر بەڵێنی خۆی مایەوە و گوندی مورتکەی جێ هێشت و چوو بۆ دێی سەرمەزار و خۆی ئامادە کرد بۆ چوونە بارزان، کەچی هەموو رێگایەکی لێ گیرابوو، زۆریشی نەبرد بارزانی و شۆڕشگێڕەکانی کورد ئاودیوی رۆژهەڵاتی کوردستان بوون و چوونە پاڵ بزووتنەوەی رزگاریخوازیی کورد لەو پارچەیەی کوردستان، عەلی ئاغا وەک دڵسۆزێکی کوردایەتی مایەوە تاکو لە ساڵی ١٩٧٠دا لە تەمەنی ٧٢ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

**کەریم شارەزا**

# مەلا محەمەدی دلاوەر
# ١٩٠٩-١٩٧٠



مەلای زانا و شاعیری لێهاتوو و نیشتمانپەروەری کورد مەلا محەمەدی کوڕی مەلا برایمی عەودالآنی و ناسراو بە مەلا محەمەدی دلاوەر لە ساڵی ١٩٠٩دا لە شاری کۆیە هاتۆتە دنیاوە. بنەماڵەکەیان کاتی خۆی لە گوندی عەودالآنی سەر بەسلێمانی هاتۆتە کۆیە و لێی نیشتەجێ بووە. لە تەمەنی ٧ ساڵیدا خوێندنی ئایینی لەلای باوکی دەست پێ کردووە و زۆری پێ نەچووە باوکی کۆچی دوایی کردووە و بۆ تەواوکردنی خوێندنەکەی چووەتە لای (مەلا عەلی باداوەیی)ی ئیمام و مامۆستای مزگەوتی (منارە)ی کۆیە و ماوەیەکیش لەلای مامۆستا مەلا سادقی مەلا ئەحمەد (١٨٧٩-١٩٥١) هەر لە کۆیە خوێندوویەتی. لە دواییدا لەلای مەلا فەتحوڵلای هەرتەلی و مامۆستا (مەلا بەهائەدین شێخ تەیب) زانستی مەنتیقی خوێندووە. کە ئەمیش کۆچی دوایی کردووە چووەتە لای مەلا محەمەدی جەلی زادە کە ناودار بووە بە (مەلای گەورە) و دەبێتە دوا فەقێی، چونکە لە ماوەی شەش ساڵی دوایی و تەمەنی سێ ساڵەکەی دوایی بەتەنیا هەر خۆی بەفەقێیەتی لەلای دەمێنێتەوە. کە مەلای گەورە لە ١٢/١٠/١٩٤٣دا کۆچی دوایی دەکات، ئیجازە وەرگرتنەکەی مەلایەتی دوا دەکەوێ تاکو لە ١٩٥٩/٩/٢٥دا لەلای مەلا عومەری ئۆمەر گونبەتی، وەری دەگرێ. هەرچەندە لە پێشتریش ئیمامی مزگەوتی حەتک بووە، بەڵام لە (ساڵی ١٩٥٩)وە بەرەسمی دەبێتە مودەریس و زانایەکی لێهاتووی ئایینی و ئەو زانا و ئەدیبە مەزنەی کورد دەورێکی زۆری بووە لە روونکردنەوەی مێشکی خەڵکەکە لە خورافات و تەڵەکەبازیی هەندێ لەوانەی بەبێ زانست و رۆشنبیریی خۆیان کردبوو بەشێخ، کەچی لە کاکڵی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەدوور بوون.

دلاوەر لە ساڵی (١٩٣٢)ەوە دەستی بەشیعر نووسین کردووە و لە نۆبەرەی شیعرەکانی لە دژی خورافات دەدوێ کە جاران خەڵک بۆ منداڵ بوون دەچوونە سەر (بابەگوڕگوڕ)ی کەرکووک کەچی کە نەوت لە کانگاکانی بابەگوڕگوڕ دەرچوو ئەو خورافەیە پووچەڵ بووەوە و پێی ناوێ تەکیەی هەندێ شێخی بەناو شێخ بمێنێ هەروەک دەڵێ:

**سەد داغ بەجەرگم کوردی عێراقی**
**کوشتەی خورافات مردەی نیفاقی**

**بابەگوڕگوڕت کە مەعلووم کرا**
**بۆچی بمێنێ تەکیەی شێخ باقی؟!**

دلاوەر بەبۆنەی جەژنی نەورۆزی (ساڵی ١٩٣٤)ەوە هۆنراوەیەکی ناسکی داناوە و داویە بەقوتابییەکانی قوتابخانەی سەرەتایی کۆیە تاکو بەو بۆنە پیرۆزەوە وەک سروود بیڵێن:

**ئەم جەژنە کە نەورۆزە**
**دنیا وەکو پیرۆزە،**
**نەشئەی بەجۆبەی سەوزە**
**نۆ نەخشە و پیرۆزە!**

دوای وەسفکردنی دیمەنە سروشتییەکانی کوردستان لە نەورۆزدا، دێتە سەر باسی ژیانی کورد و بەچپە هەواڵی نزیکبوونەوەی کاتی، لە خەو هەستان و ڕاپەڕینی ڕۆڵەکانی پێ ڕادەگەیەنێ و دەڵێ:

**نزیکە لە خەو هەستان**
**دەست کەینە کەمەر بەستان،**
**بۆ ئێمە چلەی زستان،**
**لام وایە لە پاڵوزە!!**

دلاوەر بەزۆری شیعرەکانی ئامۆژگارین بۆ ڕۆڵەکانی میللەتەکەی و هاندەرن بۆ هوشیارکردنەوەیان، هەروەک لە هۆنراودیەکیدا بەناوی (ئەی میللەتی کورد) ئەمەی کردووە و دەڵێ:

**ئەی میللەتی کورد قوڕ بەسەرت هەستە نەماوی!**
**غەیرە هەموو وەک گورگ و ئەتۆش لای خوراوی**
**بەم لوتفە شەکەر زاهیرە، ژەهرینەیە ناوی**
**ئەی داخی گرانم بەخودا هەڵخەڵەتاوی**

**غەیرە هەموو بۆ خاکی وەتەن بوونە سکەندەر**
**تۆش رووت و رەجاڵ، بێ بەش و مەغدوور و قەلەندەر**
**ئەم خاکە خسوسی نییە بۆ سڵق و جەوەندەر**
**ئەی داخی گرانم بەخودا هەڵخەڵەتاوی!!**

دلاوەر لەم پارچە شیعرەی خوارەوەی لە یەکێک لە ژمارەکانی گۆڤاری گەلاوێژدا لە سەرەتای چلەکانی سەدەی رابردوودا بلاوی کردۆتەوە و ئاواتەخواز بووە خودای پەروەردگار ئاوێکی پاک و روون، یان لاوی پێگەیشتوو، یاخود پیاوی پیری دانا و تێگەیشتوومان بۆ بنێرێ بەڵکو بەهۆی ئەو جۆرە کەسانە و بەهۆی ئەو ئاوە پاکە کە مەبەستی لە زانستی پاکی نەشێوێنراوە، ئەم میللەتەی کورد بکاتە ئامانجی خۆی و دەڵێ:

**خوایە بۆمان بنێری ئاوی لە قوڕ نەنیشتوو**
**یا گەنجی پێگەیشتوو، یا پیری تێگەیشتوو**

**ئەم میللەتە هەژارە، چەند قەرنە چاوەنوارە**
**بەچاوی خۆی ببینێ، بەردی بەبیر قەڵشتوو**
**هیوام لەم هۆزە گشتی، دوورە چونکە سەد پشتی**
**کەسێکی تێدا نییە، دیلی و ستەم نەچێشتوو!**

دلاوەر کە دەکرێت بەئیمام و مودەریسی مزگەوتی حەتک لە کۆیە، فەرمانگەی ئەوقاف مووچەیەکی کەمی بۆ دەبڕێتەوە و دوای چەند ساڵ دێتە سەر زیادکردنی مووچەکەی و شەش مانگیشی بەسەر وادەکەی تەرفیعیدا دەڕوات و ئەمرەکەشی بۆ دێ دەبینێ تەنیا پێنج سەد فلس ئەویش لەسەر ئەو بارە دەروونییەی خۆی ئەم هۆنراوە گاڵتەئامێزە دادەنێ:

**ئەوە شەش مانگە چاوە چڕێمە**
**تەمای تەرفیعی ئەوقافە شڕێمە**

**وەکو زەربولەسەل مەمرە بەهار دێ**
**تەمای کورتان و گوپ کەنگر دڕێمە!**

**وەکو سیسارکی برسیمە لەسەر لاک**
**لە ترسی سەگ دەوام باڵە فڕێمە!**

**هەموو تەرفیعەکەم پێنج سەد فلس بوو**
**وەکو جاران لەبن جۆرە شڕێمە**

**ئەگەر راستیت دەوێ راستی کە ناڵێم**
**لەبەر ناراستیی هاوڕێی راستە ڕێمە!**

**وەئیلا کەی ئەمە حاڵە کە تێدام؟**
**وەکو ئاوارەکەی قاتی قڕێمە!!**

دلاوەر، لە ناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی رابردووەوە تەندروستیی تێک دەچێ و تەواو نابێ و هەست بەپیری و بێ تاقەتی دەکات و رۆژێکیان لە ناو باخچەکەی مزگەوتەکەی حەتک لە نێوان خونچە گوڵێک و نارنجێکی زەرد رادەوەستێ و لەو کاتەدا ئەم دێرە شیعرەی بۆ دێت:

**تاکو وەک ئەم خونچە بووم قەدری ژیانم لا نەبوو**
**ئێستا ئەم نارنجەمە تازە ژیانم بۆ چییە؟!**

دلاوەری مەلای زانا و شاعیری کوردپەروەر لە ١٣ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٠دا لە شارەکەی کۆیە کۆچی دوایی کرد.

**کەریم شارەزا**

# عاسم حەیدەری
# ١٩٢١-١٩٧١



تێکۆشەری پێشکەوتنخوازی کورد، عاسم کوڕی حەیدەر کوڕی عاسم، لە هەولێر لە بنەماڵەیەکی ئەدەب و ئایین و زانستپەروەر هاتۆتە دنیاوە. لە باوەشی بنەماڵەی ناوداری حەیدەرییان پەروەردە بووە و چاوی بە دیمەنە دڵگرەکانی قەڵا و منارەی مێژوویی شارەکەی کراوەتەوە.

خوێندنی سەرەتایی و قۆناغی ناوەندیی هەر لە شارەکەی هەولێر تەواو کردووە و چووەتە شاری بەغدا و لە قوتابخانەی (دار العلوم) لە ئەعزەمییە وەرگیراوە، بەڵام لەبەر نەخۆشیی خوێندنی پێ تەواو نەکراوە، چونکە هەر لە تەمەنی هەرزەکارییەوە تووشی نەخۆشیی تەنگەنەفەسی (ڕەبوو) بووە. لە ساڵانی ١٩٤٤ تاکو ١٩٤٦ بەفەرمانبەر لە فەرمانگەی تەموین لە شاری هەولێر دامەزراوە.

لەگەڵ سەرهەڵدانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی و پەیدابوونی ڕێکخراوی پێشکەوتنخواز لە عێراق و کوردستان، بووەتە خەباتگێڕێکی دڵسۆز لە ڕێکخراوی پێشکەوتنخوازی (شۆڕش). لە یەکەم نەورۆزی ئاشکرای شاری هەولێر لە ساڵی ١٩٤٦دا وتاری ئەو ڕێکخراوە سیاسییەی کوردی پێشکەش کردووە، کە لە نزیک شوێنی (سینەمای سەلاحەدین)ی ئێستا، جەماوەرێکی یەکجار زۆری شارەکە و دەوروبەری بەشدارییان تێدا کردبوو، لە نزیکەوە لە مێژووی نەورۆز گەیشتن.

عاسم حەیدەری لە دوای هەڵوەشانەوەی حزبی شۆڕش لە سەرەتای هاوینی ١٩٤٦دا، چووە پاڵ حزبی ڕزگاریی نیشتمان و وەک ئەندامێکی دڵسۆز لەو حزبە پێشکەوتنخوازەدا چالاکیی نواند، کە ڕاپەڕینی نیشتمانیی گەلی عێراق بەکورد و عەرەبییەوە لە کانوونی دووەمی ١٩٤٨دا بەرپا بوو، لە خۆپیشاندان و کۆبوونەوەکانی جەماوەری شاری هەولێر ڕێبەر و وتاربێژی ئەو ڕاپەڕینە بوو، کە لە دژی بەستنی پەیمانی پورتسمۆژی نێوان عێراق و بەریتانیا هەڵگیرسا بوو. هەرچەندە جەماوەری ڕاپەڕیو پەیمانەکەیان زیندەبەچاڵ کرد و بۆ ماوەی چەند مانگێک ئازادییان بەدەست هێنا، بەڵام حکوومەتی

پاشایەتی لەگەڵ دامەزراندنی حکوومەتی ئیسرائیل لە رۆژی ١٩٤٨/٥/١٥دا ئەحکامی عورفی لە سەرتاسەری عێراق جار دا، بەو ناوەی پارێزگاری و پاراستنی پشتی سوپای عێراق دەکا، کە بەشێکی زۆری بەرەو مەیدانی شەڕی فەلەستین لە دژی ئیسرائیل بەڕێ کرابوو. جاڕدانی عورفی دۆخێکی لەباری خوڵقاند بۆ حکوومەتی کۆنەپەرستی عێراق بۆ گرتنی دەستەیەکی چالاک و دڵسۆز لە نیشتمانپەروەران و دوورخستنەوەیان لە مەیدانی تێکۆشانی جەماوەری. لە شاری هەولێر دەستەیەکیان لە تێکۆشەرە بەجەرگەکانی وەکو عاسم حەیدەری جەمال حەیدەری و هاشم عەبدوڵلا و عادیل سەلیم و شێخەشەل و چەندان تێکۆشەری دیکە دەگیرێن و دەدرێن بەدادگای عورفی عەسکەری لە بەغدا. لە ئەنجامی دادگاییکردنیان عاسم حەیدەری وتاریێژ و رابەری خۆپیشاندانەکانی شاری هەولێر لە رۆژانی راپەڕینی کانووندا، بۆ ماوەی ٧ ساڵ حوکم و ٣ ساڵ دوورخستنەوە و خستنە ژێر چاودێریی پۆلیس مەحکووم دەکرێ. وەک تێکۆشەرێکی ورە بەرز، خۆی لەبەر ئەو حوکمە سەختە رادەگرێ، تاکو بەر لە بەرپابوونی شۆڕشی تەمووزی ١٩٥٨ ئازاد دەکرێ و دەگەڕێتەوە شاری هەولێر بۆ بەردەوامبوون لە کاروانی خەباتی چینایەتی.

کە شۆڕشی ١٤ی تەمووزی دیموکراتیی ساڵی ١٩٥٨ بەرپا دەبێ، بیر لە پێکەوەنانی شاندێکی نیشتمانی دەکاتەوە تاکو بچن بۆ پیرۆزبایی پێشکەشکردن بەسەرانی شۆڕش بەناوی پارێزگای هەولێر، بۆیە لەگەڵ بەرێزان پارێزەر عەونی یووسف و شەمسەددین موفتی و چەند نیشتمانپەروەرێکی دیکە بەرەو بەغدا دەڕۆن و لەوێ لەگەڵ شاندەکانی شارەکانی تری کوردستان یەکدەگرن و داخوازییەکانیان دەکەن بەیەک و لە رۆژی ٢٧ی تەمووز دەچنە وەزارەتی بەرگری و سەرکردەی شۆڕش زەعیم عەبدولکەریم قاسم پێشوازییان دەکات، ئەوانیش داخوازییە نەتەوەیی و میللییەکانی خۆیانی پێشکەش دەکەن.

عاسم دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووز رێبازێکی نەتەوەیی دەگرێ و دەچێتە پاڵ پارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرۆکایەتیی بارزانی. لە شاری هەولێر دەبێتە ئەندامی لیژنەی مەحەلی پارتی و چالاکانە کاروباری حزبەکەی جێبەجێ دەکات. لە کۆتایی ساڵی ١٩٥٩ و سەرەتای ١٩٦٠ بووەتە یەکێک لەو کەسانەی داوای دامەزراندنی (حزبی جمهوری)یان دەکرد.

عاسم حەیدەری لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٣ تاکو ساڵی ١٩٧٠ کرا بەفەرمانبەر لە بەغدا و دوای رێککەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ی نێوان سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلوولی رزگاریخواز و حکوومەتی عێراق گوێزرایەوە بۆ شاری هەولێر و لە مستەوەدەعی نەوت دەستبەکار بوو. تاکو رۆژی کۆچی دوایی لە ٢٠ی تەمووزی ١٩٧١ و لە تەمەنی ٥٠ ساڵیدا ماڵئاوایی لە کورد و کوردستان کرد.

عاسم حەیدەری هەر خەباتگێرێکی دڵسۆز نەبوو، بەڵکو لە هەمان کاتیشدا نووسەرێکی خامە رەنگینی کوردیش بوو. یەکێک بوو لە نووسەرانی "گۆڤاری گەلاوێژ" و بابەتی وەرگێڕدراوی تێدا بڵاو دەکردەوە. تەنانەت جارێکیان لەسەر نووسینێکی لەبارەی دەوری گەلی کورد لە شۆڕشی ١٩٢٠ی عێراقدا دەدرێت بەدادگا و سێ مانگ لەسەر ئەو وتارەی بەند دەکرێ. بۆیە دەڵێین: بەمردنی تێکۆشەر و نووسەرێکی کوردی وەکو عاسم حەیدەری، نەتەوەی کورد لەو رۆژگارەدا زیانێکی گەورەی لێ کەوت.

**کەریم شارەزا**

# نافیز جەلال حەوێزی
# ١٩٢١-١٩٧٢

**کەریم شارەزا**

نافیز جەلال حەوێزی لە ساڵی ١٩٢١دا لە شاری کۆیە. چاوی ژیانی هەڵێناوە، لە ساڵی ١٩٢٩دا چووەتە قوتابخانەی سەرەتایی کۆیە. لە ساڵی ١٩٣٧دا چووەتە قوتابخانەی ناوەندی، کە ئەو ساڵە بۆ یەکەم جار لە شارەکەیدا کرابووەوە. لە ساڵی ١٩٤١دا لەو قوتابخانە دەرچووە و چووەتە بەغدا و لە خوێندنگای ئامادەیی عەسکەری وەرگیراوە. لە ساڵی ١٩٤٣دا دەرچووە. لە هەمان ساڵدا چووەتە کۆلێجی عەسکەری و لە ١٩٤٦/٦/٢٩دا خوێندنی تەواو کردووە. بڕوانامەی دەرچوونی وەرگرتووە و بەپلەی مولازمی دووەم لە لقی تۆپخانە



دامەزراوە. لە دواییدا لە (دەورەی بەرگری دەبابە) لە بەریتانیا بەشداریی کردووە و پلە و پایەی بەرز بۆتەوە تاکو گەیشتووەتە پلەی (موقەددەم) و فەرمانی عەسکەریی خۆی لە ئۆردوگای رەشید و وەشاش و لە تیپی یەکەم لە دیوانیە و بەسرە دیوە، ماوەیەکیش لە تیپی (٣) لە جەلەولا ئەفسەرێکی پایەدار بووە.

لە دوای کودەتا شومەکەی ٨ی شوباتی ١٩٦٣ بەغدای جێ هێشتووە و لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی نیشتمانپەروەری کورد خۆیان دەگەیەننە ناوچەی ئازادکراوی قەڵادزێ، کە ئەوساکە بارزانی مستەفا لەوێ بوو، ئەمیش دەچێتە لای و خۆی پێ دەناسێنێ. ئەویش هەندێ کاری عەسکەری پێ دەسپێرێ و لە ساڵی ١٩٦٤دا دەیکاتە سەرکردەی کەرتی پێنجەمی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە پشدەر و رانیە و کۆیە و، کار و ئەرکەکەی بەچاکی جێبەجێ دەکات. بۆیە ئەرکی

چاودێریکردنی هێـــزەکـــانی پێشـمـەرگە لە (دۆڵە رەقـە) تا دەگـــاتە ناوچەی (باڵەک)یشی پێ دەسـپـێـردرێ تاکـو دەکـرێتـە بەرپرسی نووسینگەی عەسکەری لە مـــەکـــتـــەبی تەنفــیـــزی سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلوول.

نافیز جەلال، لە رۆژی چوونە پاڵ شــۆڕشی رزگـــاریخـــوازی کـــوردەوە تـاکـــو دەرچـوونی بەیاننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ زۆر بەدڵسۆزی خزمەتی کێشەی کوردی کرد، لە سەردەمی حوکمی عەبدولڕەحمان محەمەد عارف و وەزارەتەکـەی عـەبدولڕەحـمـان بەزاز ئەندامـــێک بوو لە ناو شاندێکی کورد بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ کاربەدەستانی عێراق بۆ چارەسـەرکـردنی کـێشـەی کـورد بەرێگایەکی ئاشتییانە و بریتی بوون لە: (حـەبیب مـحـەمـەد کـەریم) و (عـەلی عـەبدوڵڵا) و (ســاڵح یووسـفی) و (نافـیـز جەلال) و (موحسین دزەیی) لە ئەنجـامی ئەو گـفـتـوگـۆیانە بەیاننـامـــەی ١٩٦٦/٦/٢٩ دەرچوو بۆ چارەســـەرکـــردنی کێشەی کورد.

لە دوای هاتنەوەی حـزبی بەعس بۆ حـــوکـــمی عــێـــراق لە ١٩٦٨/٧/١٧دا ئەو رژێمــــە هەوڵی دا بەرێگایەکی ئاشتییانە کـێشـەی کـورد چارەسـەر بکات، بۆیە کـەوتە گـفـتـوگـۆ لەگـەڵ ســەرکــردایەتیی ئەیلوول و بۆ تەواوکـردنی ئەو گـفـتـوگـۆیانە بارزانی وەفـدێکی نـاردە بەغـدا کـە پێکهــاتبـوو لەم بەرێزانەی خوارەوە:

(ئیدریس بارزانی، مەسعوود بـارزانی، دکـتـۆر مـەحـمـوود عوسمان، سامی عەبدولڕەحمان، نافـیـز جـەلال حـەوێزی، نووری شــاوەیس، ســاڵح یووسـفی، مـوحـسین دزەیی و دارا تۆفـیق) لەسـەر خـاڵە سـەرەکـیـەکـانی بەیاننامـەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ رێک کـــەوتن، کـــاتێکیش بەیاننامـەکـە مـۆر کـرا، پێنج وەزیری کـورد بەناوی شـۆڕشی کورد بەشدارییان لە وەزارەتێکی عـێـراقی کـرد بەسـەرۆکـایەتیی سەرۆک کـۆمار ئەحمەد حەسەن بەکـر و بریتی بوون لەمـــانەی خوارەوە:

١- نافـیز جـەلال حـەوێزی - وەزیری کشتوکاڵ.

٢- نـووری شـــــاوەیس- وەزیری ئەشغال.

٣- ئیـحـســان شـێـرزاد- وەزیری شارەوانییەکان.

٤- سـامی عـەبدولڕەحـمـان- وەزیری کاروباری باکوور.

٥- سـاڵح یووسفی- وەزیری دەوڵەت.

نافیز جەلال، جگە لە پایەی وەزاری، ئەندامێکی کاراش بوو لە لیـــژنەی ئاشـتـی و هەر لەو رێـگـایـەش کـــــاتـێـک بـۆ چارەسـەرکـردنی کـێشـەی نێـوان حکوومـــەتی عـــێــراق و پێـشـمـەرگەی کـوردسـتـان، لە بەغـداوە بەرێگای کـەرکـووک- هەولێـــردا بەرەو (شـــەنگال) دەچوو، لە باکـووری کـەرکـووک، لە نزیک گـوندی (دارەمـان) لە تـەمـــــووزی ١٩٧٢دا تـووشی کـارەسـاتی ئۆتۆمـبـێل هات و بەسەختی بریندار بوو. بۆ رۆژی ١٩٧٢/٧/١٠ لە نەخۆشخانەی عەسکەری بەغدا گیانی سپارد، تەرمەکەی گوێزرایەوە بۆ کۆیە لە گۆڕستانی بنەماڵەی حەوێزییان بەخاک سپێردرا.

# وەهاب ئاغای ڕەواندزی
# ١٩٠٩-١٩٧٢

**هەڵگورد عەبدولوەهاب**

وەهاب ئاغای ڕەواندزی ناوی تەواوی عەبدولوەهاب کوڕی محەمەد عەلی ئاغاو لە گەڕەکی کاولۆکان لە ڕەواندز لەدایک بووە، ڕەچەڵەکیان بۆ ناوچەی ئاکۆیانی سەر بە ڕەواندز دەگەڕێتەوەو، دایکی ناوی عائیشە خانەو خوشکی میر (محەمەدئەمین)ی دەرگەڵەیەو، ناوبراو بە وەهاب ئاغای ڕەواندزی یا کاک وەهاب ناوی دەرکردووە.



وەهاب ئاغا خوێندنی سەرەتایی لە ڕەواندز تەواو کردووە، دواتریش بە مەبەستی تەواوکردنی خوێندن ڕووی کردۆتە شاری هەولێر، بەڵام لەبەر خراپی بارودۆخی ئەو کاتەو تێکەڵاوبوونی بە کاروباری سیاسی نەیتوانیوە خوێندن تەواو بکات. وەهاب ئاغا بە بەرێکردنی تەمەنی لاویەتیو گەیشتنی بە تەمەنێک، کە لە ناو کۆمەڵگای کوردەواری پێیدەوترێ قەیرەیی، ئینجا ژیانی هاوسەرگیری لە سەرەتای چلەکانی سەدەی بیستەم پێک هێناوە، ژنی یەکەمی بە ناوی حەبیبەخان کچی میر محەمەدی دەرگەڵە بووە، دواتریش ژنێکی دیکەی بە ناوی زولێخاخان هێناوە، بەڵام کاتێک دوای نسکۆهێنانی شۆڕشی بارزان (١٩٤٣-١٩٤٥) و، ئاوارە بوونی بۆ ڕۆژهەڵاتی کوردستان و بەشداریکردنی لە کۆماری کوردستان، لەوێشدا ژنێکی دیکەی بە ناوی دوڕییەخان هێناوە، کە بە ڕەچەڵەک لە کوردەکانی باکووری کوردستان بووە. بەمەش وەچەی ناوبراو پێکدێت لە: (گەلاوێژ، هیوا، لاجان، موکریان، ئازاد، پشتیوان، بێریوان، فەیلی، هەڵگورد، ئاری).







ملمــــلانێکردن لەگـــەڵ ژیان و تووشبوونی بە نەخۆشی دڵ لە ٦ی شـــــوباتی ١٩٧٢ لە ڕۆژێکی بەفراوی و سەرما و سۆڵی زستان کـــۆچی دوایی دەکـــات و لە دێی ئۆمـــەراوەی ســـەر بە ناوچەی باڵەکایەتی بە خاک دەسپێردرێ.

وەهاب ئاغا لە کاتی ئاوارەبوونی بۆ دیوی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، کە ئەو کاتە سەروبەندی دامەزراندنی کـــۆمـــاری کـــوردســـتـــان لە وێدا ڕۆڵێکی بەرچاو دەگێڕێت و وەکو کەسایەتییەکی سەربازی خزمەت لە لەشکری کوردستان دەکات. بە نسکۆ هێنانی کـــۆمـــار بە هۆی خراپی باری تەندروستی وەهاب ئاغا بڕیاری گەڕانەوەی باشووری کوردســـتـان دەدات و، ئەنجامیش لەلایەن حکومەتی عیراقییەوە بە سزای لە سێدارەدان بەند دەکرێت، بەڵام دوای ماوەیەک لە بەندیخانە بە هەوڵ و کۆششی بنەماڵەکەی و چەند کەسانێکی دیکە حوکمەکەی بۆ هەتاهەتایی دەگۆڕێت، کەچی ئەویش تەواو ناکات، و لە ساڵی ١٩٥٣ ئازاد دەکرێت.

وەهاب ئاغا دوای ئازادبوونی بە کاری تایبەتی خۆیەوە خەریک دەبێت تا هاتنەوەی مـــســـتـــەفـــا بارزانی و هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول، ئیتر لە وێوە بەشداربیەکی کارا لە شۆڕش دەکات و ڕۆڵێکی بەرچاوی دەبێت لە ناوچەکـەدا، تا ناوبراو دەبێتە ئەندامی مەکتەبی تەنفیزی و لە گەڵاڵە دەست بەکار دەبێت. ماوەی کارکردنی وەهاب ئاغا لەو کاردا تا ساڵی ١٩٧٠ دەبێت دواتریش بە ڕەسمی دەست لەکار کێشانەوەی خۆی پێشکەش بە بارزانی دەکات، بەڵام بارزانی قبوڵی ناکات.

وەهاب ئاغا بە بەردەوامبوونی



# سابیر ئیسماعیل محەمەد
# ١٩١٠-١٩٧٢

مامۆستای پەروەردەکار و نیشتمانپەروەری تێکۆشەری کورد، سابیر ئیسماعیل محەمەد لە ساڵی ١٩١٠دا لە گەڕەکی بەفریقەندی لە شاری کۆیە لەدایک بووە. لە تەمەنی حەوت ساڵیدا چۆتە سوختەخانە و قورئان و بنچینەی خوێندنەوە فێر بووە. لە ساڵی ١٩٢٠دا چووەتە قوتابخانەی سەرەتایی کۆیە و چونکە بنچینەی خوێندنەوەی زانیوە، لە پۆلی دووەم دانراوە و لە ساڵی ١٩٢٥دا خوێندنی قۆناغی سەرەتایی تەواو کردووە و چەند ساڵێک لە خوێندن دابڕاوە تاکو لە ساڵی ١٩٣٠دا چووەتە بەغدا لە خانەی مامۆستایان وەرگیراوە. لە ساڵی ١٩٣٢دا بووەتە مامۆستای قوتابخانەی



سەرەتایی و بەپێی دەستوورێکی نوێ قوتابییەکانی پەروەردە کردووە.

مامۆستا سابیر لە سەرەتای سییەکانی سەدەی رابردووەوە چووەتە پاڵ (رێکخراوی مەنەوەرانی کورد) لە کۆیە کە بەشێک بووە لە کۆمەڵەی لاوانی کورد و لە ساڵی ١٩٣٢دا لە بەغدا دروست بووبوو. کاتێکیش کە (حزبی هیوا) لەسەر هەیکەلی (کۆمەڵەی دارکەر) بەسەرۆکایەتیی مامۆستا رەفیق حیلمی دامەزرا، مامۆستا سابیر بووە ئەندامێکی چالاک لەو حزبە نەتەوەییە جەماوەرییەی کورد، بەتایبەتی لە سەردەمی هەڵگیرسانی شۆڕشی ١٩٤٣-١٩٤٥ی بارزان بەسەرۆکایەتیی بارزانیی نەمر.

مامۆستا سابیر یەکێک بوو لەو کەسایەتییانەی کە لە کۆیە بەنهێنی لەگەڵ مەهدی حەمید و بەکر عەبدولکەریم حەویزی لە ساڵی ١٩٤٤دا کۆبووەوە بۆ دانانی نەخشەیەک بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕشێکی

دیکەی کورد لە ناوچەکانی بیتوێن و کۆیە تاکو بەشێکی زۆری سوپای عێراق بێنە ئەو ناوچانە و هێزیان لە بەرەی بارزان کەم کەنەوە. لەو کاتەشدا شۆڕشگێرانی بارزان دەتوانن تاکو هەریر و باتاس ئازاد بکەن و حکوومەتێکی کوردی دابمەزرێنن.

ئەم نەخشەیە بەر لە جێبەجێکردنی ئاشکرا بوو، حکوومەت مەهدی حەمید و بەشداربوونی دیکەی جگە لە رەئیس بەکر عەبدولکەریم حەوێزی گرت چونکە پێشتریش خۆی شاردبۆوە و مامۆستا سابیر یەکێک بوو لەو گیراوانە و رەوانەی هەولێر کران و دران بەدادگای عورفی عەسکەری، بەڵام بەهەوڵ و کۆششی سەعید قەزاز و قاسمی مەلافەندی ئازاد کران، تەنیا مەهدی حەمیدی ئەفسەری کەرکووکی ٣ ساڵ حوکم درا.

کە بەربوون، لە ١٩٤٥دا مامۆستا سابیر دوور خرایەوە بۆ پارێزگای حیللە- ناحیەی محاویل تاکو ببێت بە بەڕێوەبەری بەشی ناوەخۆیی (خانەی مامۆستایانی لادێ). بەڵام لە دوای راپەرینە نیشتمانییەکەی کانوونی دووەمی ١٩٤٨ی گەلانی عێراق، گەڕێنرایەوە بۆ کۆیە و بووە رەمزێکی خەباتی نیشتمانیی مامۆستایان، بۆیە لە دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨دا بەئەندامی کۆنگرەی مامۆستایانی کۆماری عێراق هەڵبژێردرا و لە ساڵانی ١٩٥٩ و ١٩٦٠ لە هەردوو کۆنگرەکانی مامۆستایانی کورد لە شەقڵاوە، بەشداریی کرد و گەلێک پێشنیازی بەنرخی بۆ پەرەپێدانی خوێندنی زمان و ئەدەب و مێژووی کورد لە قوتابخانەکانی کوردستان پێشکەش بەدەستەی گشتی کۆنگرەکان کرد و پەسند کران.

مامۆستا سابیر ئەندامێکی بەدەرەوەی بزووتنەوەی ئاشتیخوازان بوو لە شاری کۆیە، هەموو دەم لە ژێر چاودێریی حکوومەت بوو، بۆیە دوای کودەتا شوومەکەی ٨ی شوباتی ١٩٦٣دا لەسەر هەڵوێستی نیشتمانی، لەگەڵ دەستەیەک لە فەرمانبەرانی کۆیە گیرا و تۆمەتی پشتگیریکردنی شۆڕشگێرانی کوردیان خستە پاڵ و دوای نەمانی حوکمی بەعس و ئازادبوونی لە تشرینی دووەمی ١٩٦٣دا کرایەوە بەڕێوەبەری قوتابخانەی زانست لە کۆیە و لە ساڵی ١٩٦٦دا دوای ئەوەی ٣٤ ساڵ خزمەتی پرۆسەی پەروەردە و فێرکردنی لە کوردستاندا کرد، خانەنشین کرا. لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی رابردووەوە تووشی نەخۆشیی شێرپەنجە بوو و هەر بەو دەردە کوشندەیەی لە مانگی تەمووزی ١٩٧٢دا لە بەغدا کۆچی دوایی کرد. تەرمەکەی برایەوە شاری کۆیە و بەرێزێکی زۆرەوە لە گۆڕستانی بنەماڵەکەیان بەخاک سپێردرا.

سەرچاوە:
١- حەننا ئەنتوان- گۆڤاری رۆژی کوردستان- ژمارە (٢١-٢٢)ی ساڵی ١٩٧٤- وتارێکی بەناونیشانی (با مامۆستا سابیر ئیسماعیل لە بیر نەکەین).
٢- ئاگاداری نووسەری ئەم بابەتە لە ژیاننامەی ئەم کەسایەتییە لە نزیکەوە.
٣- رۆژنامەی هاوکاری- ژمارە (١٣٣)ی رۆژی ١٩٧٢/٩/٩. وتارێک لەبارەی ژیاننامەی ئەم کەسایەتییە کۆچکردووە.

**کەریم شارەزا**

# کاکەی حاجی مەحموود
# ١٩٠٠-١٩٧٣

کەسایەتیی کۆمەڵایەتی و نیشتمانپەروەری کورد (کاکەی حاجی مەحموودی کوڕی حاجی حەمەدەمینی مەهابادی) لە ساڵی ١٩٠٠دا لەشاری کۆیە لەدایک بووە، باپیرە گەورەی لە موکریانەوە هاتۆتە کۆیە و لێی نیشتەجێ بووە. بەمنداڵی لە حوجرەی مزگەوتەکان خوێندوویەتی و ماوەیەکیش چۆتە قوتابخانەی رەسمی تاکو بووەتە خوێندەوارێکی هۆشیار. ئینجا لە جێی حاجی مەحموودی باوکی، دەستی داوەتە کاسبی.

لە سەرەتای سییەکانی سەدەی بیستەمەوە پەیوەندیی بەکۆمەڵەکانی (پشتیوان) و (خۆبیبوون)ەوە کردووە و کەوتووەتە سەر خەباتی کوردایەتی. عوسمان عەونی، شاعیری نەتەوەیی کورد، لە هاوینی ساڵی ١٩٧٥دا بەنووسەری ئەم بابەتەی راگەیاند و گوتی: "چەند رۆژێک بەر لە شەڕەکەی بەر دەرکی سەرای سلێمانی، کاکە ئاگادار کرایەوە کە لە ٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠دا بەبۆنەی هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق لە سلێمانی مانگرتن و خۆپیشاندان دەکرێ. بۆیە هەستا و چەند لاوێکی خوێنگەرمی کۆیەی لەگەڵ خۆیدا برد و بەپێیان چوونە سلێمانی و ئەو کاتی کە لەبەر کێشەی تایبەتی خۆم، پێم نەکرا لەگەڵیاندا بچم. کە گەیشتن لە رۆژی دیاریکراودا بەشدارییان لەو راپەڕینەدا کرد و لە ئەنجامی تەقەکردنی سەربازەکانی سوپای عێراق، کاکە بریندار بوو و لە سلێمانی خۆی حەشار دا تاکو برینەکەی سارێژ بوو، ئینجا هاتەوە کۆیە و بەدوورودرێژی ئەو رووداوە خوێناوییەی بۆ نیشتمانپەروەرانی کۆیە دەگێڕایەوە".

ماڵەکەی کاکە چ لە کۆیە و چ لە شاری کەرکووک، دەبووە سەکۆی سەربەست بۆ نیشتمانپەروەران و زۆر تێکۆشەری وەکو (عومەر دەبابە)ی ئامۆزای لەو کۆڕ و کۆبوونەوانەی ماڵەکەی لەباری ژیانی کوردی چەوسێنراوە بیروڕایان ئاڵوگۆڕ دەکرد. هەر چەند زۆربەی شەوان چ لە شاری کۆیەو چ لە شاری کەرکووک، بۆ رابواردن قومار دەکرا، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ماڵەکەی داڵدە بوو بۆ نیشتمانپەروەران.

کاکە تاکو ساڵی ١٩٤٥ لە کۆیە بوو، بەڵام لە بەهاری ئەو ساڵەدا دەدرێتە دادگای عورفی عەسکەری بەو ناوەی ماڵەکەی داڵدەی دوژمنانی حکوومەت بووە، بەڵام هیچ لەسەر ئیسپات نابێ و بەردەدرێ و کە دەزانی لە کۆیە لەبەر چاودێریی پیاوانی حکوومەت ناحەوێتەوە، بۆیە ناچار بوو ماڵەکەی لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٨دا بباتە شاری کەرکووک و لە گەڕەکی ئیمام قاسم نیشتەجێ دەبێ. دیسان ماڵەکەی دەکاتە یانەی نیشتمانپەروەر و رووناکبیرانی کورد و گەلێک کەسایەتیی ناسراوی وەک مامۆستایان (ئیبراهیم ئەحمەد، شێخ قادری بەرزنجی، عومەر دەبابە و.تاهیر سادق، شێخ مارفی بەرزنجی، محەمەد ئەحمەد قەرەداغی) لە دیوەخانەکەی کۆ دەبوونەوە و باسیان لە باری سیاسیی کورد و عێراق و دوارۆژی کوردستان دەکرد.

لە ماڵی ئەو پیاوە خزمەتگوزارە پیتاک و یارمەتی بۆ لێقەوماوانی لافاوی ساڵی ١٩٥٧ی سلێمانی کۆ دەکرایەوە و یارمەتیی هەژاران دەدرا و هەر لە ماڵەکەی ئەودا بیر لە دەرکردنی گۆڤاری (شەفەق) لە شاری کەرکووک کرایەوە و شێخ قادر بەرزنجی بۆ دەستنیشان کرا بۆ دەرچوواندنی، وابوو ئەو خەونە لە رۆژی ١٥/١/١٩٥٨دا هاتە دی و یەکەم ژمارەی (شەفەق) دەرچوو.

کاکەی حاجی مەحموود خۆی کەسایەتییەکی کۆمەڵایەتی بوو و خەباتی نەتەوەیی دەکرد و کاک مەجیدی کوڕە گەورەشی خەباتی چینایەتیی دەکرد و شیوعی بوو. کەچی کاکە ئەوەندە سینگ فراوان بوو، رۆژێک لە رۆژان رووی خۆی لەو کوڕەی گرژ نەکرد و دژایەتیی کەسی نەدەکرد، بۆیە بووبووە کەسایەتییەک هەموو کورد و غەیری کورد رێزیان لێ دەنا، تاکو لە رۆژی ٢٢ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٣دا بەنەخۆشیی پاڵەپەستۆی خوێن لە کەرکووک کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەی لە کۆیە نێژرا.

**تێبینی:**

* سوود لە وتارێکی مامۆستا مستەفا نەریمان- لە گۆڤاری (رەنگین)ی ژمارە ٥٨ی ساڵی ١٩٦٢ و تۆماری ژمارە (١٧)ی کەسایەتییە خزمەتگوزارەکانی کورد (دەستنووس) وەرگیراوە کە لە نووسینی نووسەری ئەم بابەتەیە.

**کەریم شارەزا**

# شیت مستەفا عومەر
# ١٩١٤-١٩٧٣

پاریزەری یاساناس و رۆژنامەنووس و دادوەری خزمەتگوزاری کورد، مامۆستا "شیت مستەفا عومەر چەلەبی" لە ساڵی ١٩١٤دا لە شاری هەولێری دێرین هاتۆتە دنیاوە. خوێندنی سەرەتایی لە هەولێر و کەرکوک تەواو کردووە و قۆناغی خوێندنی ناوەندیی لە هەولێر و ئامادەییشی لە دواناوەندیی مەرکەزیی بەغدا تەواو کردووە و لە پایزی ١٩٣١دا چۆتە کۆلێجی حقووق و لە کۆتایی ساڵی خوێندنی ١٩٣٤-١٩٣٥دا دەرچووە و بروانامەی وەرگرتووە و بووەتە پاریزەرێکی یاساناس، لە هەولێردا پاریزەری کردووە.

لە پایزی ئەو ساڵەی ١٩٣٥دا مافی ئیمتیازی دەرچوواندنی گۆڤارێکی کوردی بەناوی (رووناکی) وەردەگرێ، بەڵام تەنیا کاری بەرێوەبەری بەرپرسی گۆڤارەکە دەگرێتە ئەستۆ، دەنا کاروباری نووسین و چاپ و بڵاوکردنەوە هەمووی لە ئەستۆی مێژوونووس و رۆژنامەگەر حوسێن حوزنی موکریانی دەبێ.



مامۆستا شیت گەلێک وتاری کۆمەڵایەتیی بەنرخی لە ژمارەکانی ئەو گۆڤارەدا بڵاو دەکردەوە، کە یەکەم ژمارەی لە ٢٤/١٠/١٩٣٥دا دەرچووە و تاکو رۆژی ١٦/٥/١٩٣٦ توانییان ١١ ژمارەی رێکوپێکی لێ دەربچووێنن و مامۆستا شیت لە هەموو وتارەکانی نێو ئەم گۆڤارەدا بۆچوونێکی چاکسازیی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتیی بووە، هەروەک: لە وتارە بەنرخەکانی (موشکیلەی بێ ئیشی) و (بۆ کوڕ و کچی خۆمان) و (ژیانی رووەند و کرمانج) و (روحی قەومییەت و تەجەددودی ئیجتماعی)دا دەردەکەوێ.

لە دوای داخستنی گۆڤارەکەی (رووناکی)، لە پایزی ١٩٣٦دا مامۆستا شیت کراوە بەدادوەر لە کفری و لە زۆر شاری دیکەی وەک ئامێدی و سلێمانی و هەولێر. ماوەیەکی زۆر لە سلێمانی ژیاوە. لە رۆژی ٩ی حوزەیرانی ١٩٦٣دا لە سەردەمی حوکمی بەعسی فاشی بەفەرمانی زەعیم (سەدیق مستەفا) لەگەڵ خەڵکێکی زۆر دەگیرێ، بەڵام کە لە لێتۆژینەوە دەزانن دادوەرێکی خانەنشینە بەری دەدەن.- گەلێک لەو گیراوانە بەناحەق لە ناو ئۆردوگای سلێمانی شەهید دەکرێن.-

مامۆستا شیت دوا قۆناغی ژیانی لە شاری مووسڵ بەسەر دەبات و تووشی نەخۆشیی شێرپەنجە دەبێ، بەو دەردە کوشندەیەوە لە رۆژی ١٩٧٣/٨/٢٨دا لە نەخۆشخانەی مووسڵ کۆچی دوایی دەکات.

**کەریم شارەزا**

# مەلا ساڵحی کۆزەپانکەیی
# ١٨٩٠-١٩٧٤



مەلای خاوەن هەڵوێستی کوردایەتی و شاعیر، مەلا ساڵحی کۆزەپانکەیی لە ساڵی ١٨٩٠دا لە گوندی کۆزەپانکەی سەر بەناحیەی دیبەگە لە پارێزگای هەولێر لەدایک بووە و دوای تەواوکردنی خوێندنی بنچینەیی لە مزگەوتی گوندەکەی خۆی چووە شاری هەولێر و لەلای مەلای زانا خوێندوویەتی و دوا قۆناغی خوێندنەکەشی لەلای زانای ناوداری کورد (مەلا فەندی) بووە و ئیجازەی زانستی لێ وەرگرتووە.

مەلا ساڵح بەدرێژایی ژیانی مەلایەتی هەر خەریکی دەرس گوتنەوە بووە و گەلێک فەقێ و موستەعیدی زیرەکی لەسەر دەستی پێگەیشتوون و لە مزگەوتی شێخ نوورەدین لە هەولێر دەرسی بەموستەعیدی هۆشیاری وەک مەلا عوسمانی کوڕی، کە دوای ئیجازە پێدانی چووەتە میسر و لە ئەزهەر خوێندوویەتی (بڕوانامەی ماستەر)ی لە (شەریعەت و قانون) وەرگرتووە.

هەروەها دەرسی بەمەلا شەریفی ڕەنگەڕێژانی و محەمەدی کوڕی سەید ئیسماعیلی بەرزنجی و شاعیری ناودار مەلا خەلیلی موخلیس گوتووە.

مامۆستا مەلا ساڵح مەلایەکی زانای خاوەن هەڵوێستی نەتەوەیی بوو، کوردپەروەر بووە و ئەو هەڵوێستە بەرزەی لە (کۆنگرەی زانا ئاینییەکانی عێراقدا) نواند، لەو کاتەی کە لە سەردەمی سەرۆکایەتیی (عەبدولسەلام محەمەد عاریف) لە ساڵی ١٩٦٤دا وەزارەتی ئەوقاف لە بەغدا هەموو مەلا ناودارەکانی کورد و عەرەبی بۆ بەستنی کۆنگرەیەکی گشتی ئیسلامی بانگهێشت کرد، لەو کۆنگرەیەدا، داوای لە مەلاکان کرد فتوایەک لە دژی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد و شۆڕشی ڕزگاریخوازی ئەیلوول دەربکەن، کە ئەو بزووتنەوە چەکدارە دژی حکوومەتی شەرعی عێراقە و لە دین دەرچوون و لێدانیان مەشرووعە!

مەلا ساڵح یەکێک بوو لەو مەلا بەجەرگانەی کە وەکو شێر لە ڕووی ئەو داواکارییە چەپەڵە وەستا و هەستا سەرپێ و بەئامادەبووانی کۆنگرەکەی گوت: "کورد میللەتێکی مووسڵمانە و فتوا لە دژی مووسڵمانان دەرناکرێت، ئێوە پڕ بەزار دەڵێن (عروبە) کەواتە کوردیش دەڵێ (من کوردم) و کوردایەتی دەکەم، ئەمەش نابێتە لە ئایین لادان".

هەروەها ڕاستەوخۆ بەعەبدولسەلام عارفی گوت: "ئەگەر بێتو قەترەیەک خوێنی کورد بەناهەق بڕژێ ئۆباڵی ئەم کارە نابەجێیە لە ڕۆژی قیامەت لە ئەستۆی تۆیە". بەمجۆرە داواکەی حکوومەت پووچەڵ بووەوە.

مەلا ساڵح جگە لە دوو کتێبی بەنرخی، پەڕاوێزێکی زۆریشی لەسەر کتێبی (شەرع و فتوا) نووسیوە، بەڵام دیارترینیان حاشیەی (ادراک المدارک) بووە لەسەر تەفسیری "نەسەفی" کە ١٦ بەرگە و بەدەسنووسی ماونەتەوە دوو کتێبە دانراوەکەشی ئەمانەن:

١- الرسالة الجامعة للأحكام والدلائل النافعة- الموصل ١٩٨٤.

٢- تحفة الطالبين في قسم المعاملات في فقه الامام الشافعي- الموصل ١٩٨٥.

هەردوو کتێبیش لە ئامادەکردن و چاپ و بڵاوکردنەوەی نەوەی مامۆستای زانامان (عەبدولحەکیم عوسمان ساڵح)ن.

لە کۆتاییدا دەبێ ئەوەش بڵێین کە مامۆستا مەلا ساڵح شاعیرێکی لێ هاتوو بووە، شیعری بەهەر چوار زمانی کوردی و فارسی و عەرەبی و تورکی داناوە و دیوانێکی شیعری کلاسیکی لە پاش بەجێماوە و لەلای نەوەکەی پارێزراوە. ئەم مەلا زانا بلیمەت و شاعیرە، لە ڕۆژی ٢٠ی حوزەیرانی ١٩٧٤دا لە شاری هەولێر کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی شێخی چۆلی بەخاک سپێردرا.

**کەریم شارەزا**

# مەلا محەمەدی شێروانی

جەواد محەمەد شێروانی



ناوی تەواوی (محەمەد عەبدوڵڵا محەمەد شێروانی)یە لە ناوەندی قەزای مەخموور لە ساڵی (١٨٩٤ز) چاوی هەڵێناوە، لە تەمەنی (٧) ساڵی خرایتە بەر خوێندنی ئایینی لە مزگەوتی گەورە.

لە تەمەنی هەرزەکاری وەکو فەقێیانی کوردستان بە گوند و شارۆچکەکانی شاردا گەڕاوە تا لە مەدرەسەکانیان پەرە بە خوێندن بدات تا گەیشتە پلەی (موستەعد) و ڕووی کردە شاری کۆیە و لای جەنابی (مەلای گەورە) ماوەیەکی زۆر دەمێنێتەوە لە خزمەت ئەو زاتە سوودێکی زۆری لێ دەبینی و لەئاخر مادده ڕوو دەکاتە شاری هەولێر کە ئاخر مادده لەخزمەت جەنابی (مەلافەندی) بخوێنێ و تەواو بکات. لە ساڵی ١٩٢٨- ١٩٢٩ز ئیجازەی (عیلمی و شەرعی) وەردەگرێت و لە پاشان دەگەڕێتەوە مەخموور دەبێتە مەلاو خاوەن مەدرەسەی فەقێیان دوایی ڕوو دەکاتە گوندی (کۆزەپانکە) ماوەیەک دەمێنێتەوە و دەچێتە گوندی (شێخانانی خدری ئەحمەد پاشا) تا ساڵی ١٩٤٣ لە شێخانان لەم ساڵەدا چاوی بە جەنابی (مەلا مستەفا بارزانی) دەکەوێت. کە بارزانی دەگەڕاو سەری لە عەشیرەتەکان دەدا بۆ ئەوەی هانیان بدات بۆ هەڵگیرسانی شۆڕشی بارزانی دووەم بەلای کەمەوە پشتگیری بکەن و نەبن بەجاش و ڕێگر لە بزووتنەوەکە.

لە ساڵی ١٩٤٤ز شێخانان بەجێدێڵێ و دەچێتە گوندی (مێلان)ی عەلی خورشید دزەیی تا ساڵی (١٩٥٣) لە ڕاپەڕینی جووتیاران جەنابی مامۆستا لە ڕاپەڕینەکە خۆی خستە ڕیزی جووتیاران دەستیان بەراپەڕین کرد دژی

ستەمکاری بەو ناوەی (خێرمان خێر و شەڕمان شەڕ) بۆیە لەم ساڵە (نەفی کرا بۆ ناوچەی پێنجوین لە پاشان بۆ کەرکووک بۆ ماوەی (٣ساڵ) لە پاشان ئازادکراو گەڕایەوە بۆ هەولێر بە مەرجێک نەگەیتە میلان! لە مزگەوتی شێخەڵلا کرا بە (مودەڕیس) لە پاشان کرا بە بەڕێوەبەری قوتابخانەی ئایینی لە قوتابخانەی ئایینی سەرەتایی لە قەڵات هەتا لە ساڵی ١٩٦٩خانەنشین کرا.

لە ١٩٧٦/٦/٨ز کۆچی دوایی کرد و گۆڕەکەشی لە گۆڕستانی پیرداوەدە لەسەر ڕێگای هەولێر- مەخموور.

مامۆستا مەلا محەمەدی عەلیاوەیی کە یەکێک بووە لە فەقێیەکانی مامۆستا شێروانی هەندێک دەربارەی ژیانی نووسیوە کە وەختی ئەمری خوا دەکات پارچە هۆنراوەیەک لەسەر گۆڕەکەی دەخوێنێتەوە.

مامۆستا عەلیاوەیی دەڵێ: (مامۆستا شێروانی سەرەڕای مەلا چاک و شەرعزانێکی بێ هاوتا بووە و تەدریسی هەندێک لەم کتێبانەی کردووە کە کەم کەس خۆی لێدەدا وەکو: (عصام الدین الوضع. ٢- عبدالحکیم ترح لە عیلمی منطق. ٣- میر ابو الفتح لە عیلمی ئاداب)....

وابن الحجری کە بە پەنجە پیرۆزەکانی لەسەر کتێبی جەلیزادەی خۆش کردبوو و بەخۆشی لەگەڵ تەدریسا ئاشکرای کردبوو.

مامۆستای ناوبراو زێدە لەزۆربەی مەلاچاکەکان سەخاوەتی پیشە بووە، چونکە مەلاو سەخاوەت زۆر کەم بووە، بەڵام ئەم زاتە هەم مەلاچاک بووە، هەم عاقڵ بووە، هەم سەخی هەمەفر بووە و چەند ئیجازەیەکی عیلمی داوە وەکو مەلا ئیسماعیل قەتەوی، مەلا کانی وسمانی یەکێکی تریش.

**ئەمەش هۆنراوەکەی*:**

ابن الحجر هاتە سەرینگانی مامۆستا ئەم قسانەی لەگەڵ کرد و ئەوجا دوعاخوازی لێ کرد و گەردەنی یەکتریان ئازاکرد، جێگای ژوانیان کردە بەهەشت و خزمەت پێغەمبەر.

ئیبن حەجەر بەزوبانی حاڵ گوتی:

**لە قەڕنی چواردەم لە ناوچەی هەولێر**
**چەندکەس دەزانم مەلایانی شێر**
**عەبدولکەریمی خەیلانی زادە**
**مەلا ئەفەندیشی هەردەم لەیادە**
**کونە فلوسەیی و مامۆستا بەکر**
**لەعەرشی فەلەک دانراینە نەمر**
**هەم کۆزەپانکی و شێخ کەمالەدین**
**چرای قودرەت بوون بۆ ڕۆناکردن**
**مەلای شێروانی ئەتۆش ڕۆیشتی**
**تۆ کەشتیەوان بووی ئەمنیشت کەشتی**
**بەجێتان هێشتم من کەوتمە بەڵا**
**دەبمە مەلعەبەی دەست کوڵکە مەلا**
**هەر ئەنگۆ هەبوون منتان دەزانی**
**داخەکەم بۆ تۆ و ئەحمەد ئەلبانی**
**کەیفم پێت دەهات مەلای شێروانی**
**بەتۆش دەگوترا وەک من شێروانی**
**ئەبمە دوعا و ئەتۆش بەخێرچی**
**هەردووک یەکترمان لە فیکر ناچی**

* بە پێنووسی یەک لە فەقێیەکانی مامۆستا شێروانی محەمەد عەلیاوەیی

لە هەفتەنامەی بەدرخان بڵاوکراوەتەوە

# دکتۆر عەبدوڕەحمان نورجان
# ١٩٠٧-١٩٧٦



مامۆستای پەروەردەکار و یاساناس و نووسەری لێهاتووی کورد، دکتۆر عەبدوڕەحمان محەمەد نورجان لە ١٩٠٧/٤/١٧دا لە شاری کۆیە، هاتۆتە دنیاوە. خوێندنی قۆناغی سەرەتایی لە شارەکەی خۆیدا تەواو کردووە و لە پایزی ساڵی ١٩٢٤دا چۆتە بەغدا و لە قوتابخانەی (دار المعلمین)ی راقی وەرگیراوە. دوای سێ ساڵ خوێندن بووەتە مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی و لە پایزی ساڵی ١٩٢٧دا بەمامۆستای قوتابخانە سەرەتاییەکەی شاری کۆیە دامەزراوە. یەکەمین مامۆستای قوتابخانەی رەسمی بووە لەو شارە دامەزرێ، چونکە پێشتر هەر مەلای مزگەوتان دەکران بەمامۆستای قوتابخانەکەی کۆیە.

مامۆستا عەبدوڕەحمان نورجان، مرۆڤێکی گەلێک زیرەک و زانا بوو، پەروەردەکارێکی لێهاتووی کورد بوو، لە پاڵ وانە زانستییەکان و پەروەردەی نیشتمانی و کۆمەڵایەتیدا، وانەی وەرزش و دیدەوانی (کشافە)شی بەقوتابییەکانی دەگوت و یەک لەو قوتابییانەی شەهید (مستەفا خۆشناو)ی ئەفسەری نیشتمانپەروەری کورد بوو. تا ئەم شەهیدە خەباتگێڕە مابوو هەر دەیگوت: "من دەرسی کوردایەتی و خۆشەویستی کوردستانم لە مامۆستا نورجان وەرگرتووە". هەروەها دەشیگوت: "ئەم مامۆستایە سەرمەشقی گیانی نەتەوەیی و خەباتی نیشتمانی بۆ داداوم".

مامۆستا نورجان دوای ئەوەی چەند ساڵێک خزمەتی پرۆسەی پەروەردە و فێرکردنی نەوەی نوێی نەتەوەی کوردی کرد. چووەوە بەر خوێندن و لە کۆلیجی (دار المعلمین العالیة) لە شاری بەغدا وەرگیرا و دوای چوار ساڵ لە بەشی مێژوو بەپلەیەکی بەرز دەرچوو و بڕوانامەی لیسانسی لە زانستی مێژوو وەرگرت و کرا بەمامۆستای قۆناغی خوێندنی ناوەندی. لە شارەکانی کۆیە و ئامێدی و بەغدا و سلێمانی، مامۆستایەتی کردووە. لە ساڵانی ١٩٤٠-١٩٤١یش کراوەتە بەڕێوەبەری قوتابخانەی ناوەندیی کۆیە. لەسەر هەڵوێستی سیاسی تووشی گرتن بووە.

مامۆستا نورجان ئارەزوویێکی زۆری لە خوێندنی باڵا و وەرگرتنی بڕوانامەی بەرز بووە. بۆیە دەستی بەخوێندن کردۆتەوە و بڕوانامەی لیسانسی لە کۆلیجی حقووق وەرگرتووە لەگەڵ دبلۆم لە شەریعەی ئیسلامی و لە دوا

هەنگاوی خوێندنی باڵاش دکتۆرای لە یاسا لە شاری قاهیرەی پایتەختی میسر وەرگرتووە و بووەتە یاساناسێکی شارەزا و لە وەزارەتی (داد)ی عێراق گەلێک فەرمانی وەک دادوەر و یاریدەدەری سەرۆکی تەسویەی زەویوزار بینیوە.

دکتۆر نورجان لە سەرەتای ساڵەکانی سیی سەدەی بیستەمەوە تێکەڵاوی چالاکی کۆمەڵایەتی و کوردایەتی بووە. لەو کاتەی کە لە ٣٠ی ئاياری ١٩٣٠دا (یانەی سەرکەوتن)ی کوردان لەلایەن دادوەر و پەرلەمانتاری کورد (مەعرووف جیاووک)ەوە دامەزرا، مامۆستا نورجان دەورێکی بەرچاوی تێدا بینی، بەتایبەتی لە سەرەتای چلەکانی سەدەی رابوردوودا، لەو کاتەی مەعرووف جیاووک بەسەرۆک و باوەڕپێکراوی یانەکە و (دکتۆر نورجان)یش بەسکرتێری دەستەی بەڕێوەبەری هەڵبژێردران و خزمەتێکی زۆری یانەکە و رۆشنبیرانی کوردیان کرد و بۆ کۆکردنەوەی یارمەتی و پیتاک بۆ ئەو یانەیە بەهەموو شارێکی کوردستانی باشووردا گەڕان، کە گەیشتنە شاری سلێمانی لەسەر ئەو چالاکی و خزمەتگوزارییەیان بۆ میللەتی کورد، شاعیری ناوداری کورد بێخود (١٨٧٩-١٩٥٥) هۆنراوەیەکی لە ستایشیان دانا، بەتایبەتی ستایشی ئەو کارە بەنرخەیان و لە سەرەتاکەیدا گوتوویەتی:

**بانی ئەم (یانە) مەعرووف جیاوکە**
**کە بۆ قەومی کورد ئەلحەق باوکە**

**لەگەڵ سکرتێر کە ئەوڕەحمانە،**
**ئەو ئەوڕەحمانەی کە نوری جانە!**

**وەتەن پەرستە و خادیمی کوردە**
**لە هەموو عیلما شارەزا و وردە**

**ئەمجا یارمەتی و ژینی ئەم (یانە)**
**لە میللەتی کورد زۆر هیوامانە!**

**چونکە پێویستە بکرێ سەرفی ماڵ،**
**چ بۆ ئیستیقبال، چ بۆ ئیستیقلال!**

دکتۆر نورجان بەگیانی کوردپەروەرییەوە ئیشی لە بەڕێوەبردنی یانەی سەرکەوتنی کورداندا دەکرد، بۆ ئەوەی بیێتە مەڵبەندێکی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیریی کوردی، لە شاری بەغدای پایتەختدا. لە هەمان کاتیشدا شوێنی بەیەکگەیشتنی پیاوە سیاسییەکانی کوردیش بوو، وەزیرە کوردەکانی ئەو سەردەمە هاتوچۆیان دەکرد و یارمەتیی قوتابیی هەژاری کوردیان دەدا بۆ تەواوکردنی خوێندنیان لە بەغدا و لە دەرەوەی عێراقدا.

دکتۆر عەبدوڕەحمان نورجان، مامۆستایەکی زانا و نووسەرێکی خامە رەنگین بوو، جگە لە کوردی، کە زمانی زگماکی خۆی بوو، زمانەکانی عەرەبی و فارسی و تورکی و فەرەنسی و ئینگلیزی بەچاکی دەزانی و سەرچاوە یاساییەکانی بەو زمانانە دەخوێندەوە. چەند کتێبێکی باش و بەکەڵکی بەعەرەبی و کوردی دانا و ئەمانەی خوارەوەی لێ چاپ کردن:

١- فرسان مريوان الاثناعشر: کە وەرگێڕانی کتێبەکەی "دوازدە سوارەی مەریوان"ی پیرەمێردی شاعیری مەزنی کوردە.
٢- المساجد الاسلامية.
٣- ابن رشد وفلسفته.
٤- الكندي وفلسفته.
٥- شرح قانون الاصلاح الزراعي.

ئەم کتێبانەشی بەدەسنووسی لە پاش بەجێماوە:
١- مێژووی کۆیە.
٢- کوردستانی بادینان.
٣- وضع الشعب الكوردي في القانون الدولي.
٤- حقوق الكورد في الدستور العراقي.

لە خوێندنەوەی بەرهەمەکانی دوکتۆر نورجاندا بۆمان دەردەکەوێ، کە ئەو زاتە یاساناسێکی زانا و شارەزا بووە و لە فەلسەفەشدا گەلێک قووڵ و وردبین بووە، جگە لە ئاگاداری و شارەزایی مێژوو و ئەدەبیاتی کوردی و عەرەبی و فارسیدا.

**کەریم شارەزا**

# مەلا شەریفی رەنگەڕێژانی
# ١٩٢٥- ١٩٧٦

مەلا شەریفی رەنگەڕێژانی، ناوی تەواوی محەمەد شەریف كوڕی، مەلا عوسمان، كوڕی مەلا عەبدولكەریمی رەنگەڕێژانییە، بنەماڵەكەیان لە سەردەمی مەلا محەمەدی رەنگەڕێژانی مامی باوكییەوە لە گوندی (رەنگەڕێژان)ی نزیک شاری (سەقز)ی رۆژهەڵاتی كوردستانەوە بەدوای خوێندن و گوزەراندا هاتوونەتە شاری هەولێر و لێی نیشتەجێ بوون.

مەلا شەریف لە ساڵی ١٩٢٥دا لەو بنەماڵە ئایینییە زانستپەروەرەدا لەدایک بووە. سەرەتای خوێندنی لەلای مەلا عوسمانی باوكی لە گوندی (قزلەر)ی سەر بەهەولێر بووە،



بەڵام كە باوكی لە ساڵی ١٩٣٤دا كۆچی دوایی كردووە، گوندی (قزلەر)یان جێ هێشتووە و خۆی و دایكی ء دوو برای روویان كردۆتەوە شاری هەولێر و لێی نیشتەجێ بوونەتەوە. ئەم لەلای مەلای ناسراوی ئەم شارە خوێندوویەتی و لە دوا قۆناغی خوێندنی ئایینیدا لەگەڵ عوسمانی كوڕی مەلا ساڵحی كۆزەپانكە و شێخ عەبدوڵڵای شێخ مستەفای نەقشبەندی خوێندوویەتی و دوا قۆناغی خوێندنی موستەعیدی لەلای مەلا ساڵحی كۆزەپانكە بووە و گەیشتۆتە پایەی مەلایەتی، بەڵام ئیجازەی عیلمی وەرنەگرتووە.

مەلا شەریف كەسێكی زیرەكی بەهرەدار بوو و هەر پشتی بەزانیاری ئایینی و فیقهی نەبەستووە، بەڵكو لە رێگەی زۆر خوێندنەوەی سەرچاوەی رۆشنبیری و زانستی نوێ و ئەدەبی سیاسیی خۆی پێگەیاندووە و بووەتە رووناكبیرێكی تێگەیشتووی پێشكەوتنخواز و بەزیرەكی و

بلیمەتی خۆی و لە ڕێگای مامۆستای تایبەتییەوە فێری چەند زمانێکی بیانی وەک فەرەنسی و تورکی و عەرەبی و فارسی بووە جگە لە کوردی، کە زمانی زگماکی خۆی بووە.

مەلا شەریف لە ساڵی (١٩٤٢)ەوەوە کە جارێ لاوێکی ١٧ ساڵانە بووە، چۆتە کۆڕی خەباتی چینایەتی و بۆتە کۆمونیست، لە ئەنجامی چالاکی نواندنی سیاسی لە ساڵی ١٩٤٩دا دەگیرێ و چەند ساڵێک حوکم دەدرێت، لە پەنجاکانی سەدەی بیستەم بەردەبێت و خێزانێک پێکەوە دەنێ و کچێکی کەسایەتیی ناوداری هەولێر ئیسماعیل تووتنچی دێنێ و ژیانێکی هەژارانە دەژی. لە دوا دوای ژیانیدا چەند فرمانێکی میری وەردەگرێ، کە دواترینیان فەرمانبەر بووە لە چاپخانەی شارەوانیی هەولێر بووە تاکو لە ئێوارەی ڕۆژی ١٩٧٦/٤/٢٨ بەنەخۆشیی نۆرە دڵی، کۆچی دوایی کردووە و میللەتی کورد خەباتگێڕێکی بەجەرگ و نووسەرێکی خامە ڕەنگین و شاعیرێکی نیشتمانپەروەری لەدەست چوو.

**مەلا شەریفی ئەدیب:**

مەلا شەریف ئەدیبێکی خامە ڕەنگین بوو. شاعیرێکی نیشتمانپەروەر و نووسەرێکی بەتوانا و وەرگێڕێکی لێهاتوو بوو. لە شیعری نیشتمانی بەتوانا بوو لە هۆنراوەیەکیدا بەناوی ئەی وەتەن ئەم دێرە شیعرەی وەک نموونە لێ دێنینەوە، کە دەڵێ:

**تا لەدەست وەحشی جەهالەت دەرکەوێ قەوم و وڵات**
**سوجدە بۆ تیمسالی عیلم و فەلسەفە و عیرفان ئەبەم!**

لە بواری نووسین و وەرگێڕان و دانانیشەوە گەلێک بەتوانا بوو. تا لە ژیاندا بوو، دوو کتێبی بەزمانی عەرەبی بەچاپ گەیاند، کە ئەمانەی خوارەوەن:

١- الصداقة العربية الكردية - لە ساڵی ١٩٥٩دا بەچاپی گەیاند.
٢- لمحة عن الأكراد- دانانی "تۆما بوا" بەزمانی فەرەنسی و ئەم لە فەرەنسییەوە کردوویەتییە عەرەبی و لە ساڵی ١٩٧٣دا کۆڕی زانیاریی کورد یارمەتی لە چاپدانی داوە.

جگە لەم دوو بەرهەمەیشی پێنج بەرهەمی بەنرخی لە شیعر و چیرۆکی وەرگێڕدراو و ڕێزمان لە پاش بەجێماوە و چاوەڕوانی چاپکردنن:

١- ڕۆمیۆ جولێتی چینی، لە زمانی چینییەوە کراوە بەفەرەنسی و ئەم لە فەرەنسییەوە کردوویەتییە کوردی.
٢- دیوانێکی شیعری نیشتمانی و سیاسی بەزمانی کوردی.
٣- چەند شانۆگەرییەکی لە زمانی فەرەنسییەوە کردووەتە کوردی.
٤- هەندێ چیرۆکی نایابی لە فەرەنسی و ئینگلیزییەوە کردووەتە کوردی.
٥- ڕێزمانێکی کوردی بەفەرەنسی نووسراوی کردووەتە عەرەبی.

مەلا شەریف لەگەڵ دامەزراندنی یەکێتیی نووسەرانی کورد، بووەتە ئەندام و بەشداریی لە کۆنگرەی یەکەمیدا کردووە و بووەتە ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری یەکێتیی نووسەرانی کورد - لقی هەولێر و لە هەموو کۆڕ و کۆبوونەوە و کۆنفرانسێکی لقەکەی هەولێر بەشداریی کردووە.

**کەریم شارەزا**

# ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی
# ١٩٢٥-١٩٧٦

ئەحمەد کوڕی حەمەدەمین ئاغای کوڕی حاجی بایزی کوڕی حەویز ئاغای دزەیی، لە ساڵی ١٩٢٥دا هاتۆتە دنیاوە و چاوی بەدیمەنە دڵرفێنەکانی پەرێز و جۆخینی گەنمی دەشتی هەولێر لە گوندی (دووگردکان)ی سەر بەناحیەی قوشتەپە لە پارێزگای هەولێر هەڵێناوە و بووەتە ئەندامێکی بەوەجی کاروانی ژیانی نەپساوەی نەتەوەی تێکۆشەری کورد.

ئەم کەسە لە بنەماڵەیەکی گەورە و ناسراوی کوردستان، بنەماڵەی حاجی بایزی حەویزاغای دزەیی پەروەردە بووە. دایکی کچی شێخ مەعرووفی هەڵەجەیی بەرزنجی بووە، کە کەسایەتییەکی ناوداری ناوچەی هەولێر بووە.



جارێ تەمەنی ١٢ ساڵان بووە، کە باوکی کۆچی دوایی کردووە و لەو تەمەنە بچووکییەوە بەزیرەکی و هۆشیاریی خۆی توانیویەتی سەرپەرشتی کاروباری گوزەرانیی بنەماڵە گەورەکەی بکات و هەر چوار براکەی (ئەنوەر و موحسین و سەعدی و عومەر) پێ بگەیەنێ و خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی و تەنانەت پەیمانگا و زانکۆکانی بەغدا و ئەورووپاشیان پێ تەواو بکات و ببنە خاوەن بڕوانامە و پلە و پایەی کۆمەڵایەتی و حکوومی بەرز.

کاک ئەحمەد هەر لە تافی گەنجیەتییەوە، سەبارەت بەخەباتی کوردایەتی، بووەتە خاوەن کەسایەتییەکی کۆمەڵایەتی و نیشتمانیی خۆشەویست و روح سووک و بەڕێز لە هەموو کوردستاندا. چونکە لەو کاتەی موڵکدارێکی گەورە بووە، کەچی پەیوەندیی لەگەڵ جووتیارەکانی دێیەکەی، پەیوەندیی برا و برا بووە، نەک ئاغا و جووتیار.

ئەم کەسایەتییە دڵسۆزەی کوردایەتی و بزووتنەوەی

رزگاریخوازیی کوردستان، لەگەڵ دامەزراندنی حزبی هیوا لەسەر هەیکەلی (کۆمەڵەی دارکەر) لە ساڵی ۱۹۳۹دا، بەسەرۆکایەتیی سیاسەتمەداری کورد مامۆستا رەفیق حیلمی، بووەتە ئەندامێکی چالاکی ئەو حزبە جەماوەرییە نەتەوەییە لە مەڵبەندەکەی خۆیدا.

کاتێکیش کە شۆڕشی بارزانی ۱۹۴۳-۱۹۴۵ بەسەرکردایەتیی مەلا مستەفای بارزانی هەڵگیرسا، کاک ئەحمەد دزەیی دەورێکی باشی هەبوو لە پشتگیریکردنی شۆڕشەکە و یارمەتیدانی شۆڕشگێران بەپارە و چەک، لەسەر ئەو هەڵوێستە سیاسییەی بەرامبەر بەخەباتی شۆڕشگێریی کوردایەتی، لە ساڵی ۱۹۴۵دا ماوەیەک گیرا و گەلێک ئەشکەنجە درا، کاتێکیش پارتی دیموکراتی کوردستان دامەزرا و کۆنگرەی یەکەمی بەنهێنی لە ۱۶/۸/۱۹۴٦دا لە شاری بەغدا بەست، ئەم زاتە دڵسۆزەی کوردستان بووە ئەندامێکی چالاک و کارای ئەو حزبە نەتەوەییە دیموکراتییەی کورد و توانی خەڵکێکی زۆر بۆ ناو ریزەکانی حزبەکە رابکێشێ.

لە ماوەی خەباتی بەردەوامی لە ریزەکانی پارتیدا، لە سەردەمی حوکمی پاشایەتی عێراقدا زۆرجار گیراوە، بەڵام کۆڵی نەداوە و لە دوای دامەزراندنی کۆماری دیموکراتی کوردستان لە مەهاباد بەسەرۆکایەتیی پێشەوا قازی محەمەد لە ۲۲/۱/۱۹۴٦دا پشتگیرییەکی ماددی و مەعنەوی ئەو تاقیکردنەوە سیاسییەی کوردی کردووە، لە ساڵانی پەنجاکان و لە سەردەمی حوکمی کۆماری عێراقیش لەسەر هەڵوێستی کوردایەتیی چەند جار دەستبەسەر کراوە و لە ناوچەکەی خۆی دوور خراوەتەوە. بەتایبەتی دوای بەرپابوونی شۆڕشی ئەیلوولی کورد لە ساڵی ۱۹٦۱دا، بەڵام هەرگیز کۆڵی نەداوە و سوورتر بووە لەسەر خەباتی نەتەوەیی خۆی.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ دواوە بۆ دوای رووخانی کۆماری دیموکراتی کوردستان لە مەهاباد و گەڕانەوەی خێزانە بارزانییەکان بۆ کوردستانی عێراق و دابەشکردنیان بەسەر گوندەکانی دەشتی مولکیە و کەندێناوە و قەراجدا، کاک ئەحمەد دزەیی لە ساڵی (۱۹۴۸)ەوە تاکو گەڕاندنەوەیان بۆ بارزان، ۳۰ ماڵە بارزانی لە گوندەکەی داڵەدا و ژیاندنی و ئەو ماڵانەی، کە لە گوندەکانی خزمە دزەییەکانیشی بوون، لەسەر راسپاردەی ئەو زۆر رێزیان لێ گیرا و خزمەت کران. ئەم هەڵوێستە نەتەوەییەشی بووەتە مایەی پێزانینی شێخ ئەحمەدی بارزانی، بۆیە لەوساوە قەدر و رێزێکی زۆری لەلای شێخ ئەحمەد بووە.

لە دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوولی رزگاریخوازی کوردستان، کاک ئەحمەدی خەباتگێڕی بەجەرگ چەند جار بەتۆمەتی پشتگیریکردنی شۆڕش تووشی گرتن و دوور خستنەوە بووە. بەڵام کە لە بەندیخانە ئازاد کراوە، لە رووی دڵسۆزی و گیانی شۆڕشگێڕییەوە لە ساڵی ۱۹٦۳دا چووەتە ریزی شۆڕشگێڕانی کوردستان و گەلێک پایە و پلەی سیاسی و عەسکەری پێ دراوە. لەوانە ئامیر هێزی پێشمەرگە لە گوندی حاجی قەڵای کۆیە، کە شوێنێکی گەلێک قایم و ستراتیجی بووە بۆ پێشمەرگە و خەباتی چەکداری.

خەباتگێڕی بەجەرگ کاک ئەحمەد حەمەدەمینی دزەیی لە تەمەنی ۵۱ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

**کەریم شارەزا**

# عومەر حەبیب
# ١٩٧٦-١٩٢٣

تێکۆشەری نیشتمانپەروەری دڵسۆز و یەکەمین سەرۆکی دادگای باڵای شۆڕشی ئەیلوولی کوردستان (عومەر حەبیب)ی ناسراو بە (عومەرە سوور) لە ساڵی ١٩٢٣دا، لە گەڕەکی بەفریقەندیی شاری کۆیە لەدایک بووە. لە ساڵی ١٩٣٠دا لە قوتابخانەی سەرەتایی کۆیە خراوەتە بەر خوێندن و لە ساڵی خوێندنی ١٩٣٦-١٩٣٧ لە تاقیکردنەوەی گشتیی پۆلی شەشەم دەرچووە و بۆ پایزی ئەو ساڵە لە ١٩٣٧/١١/٦دا بۆ یەکەم جار قوتابخانەی ناوەندیی لە کۆیە دەکرێتەوە و لەو قوتابخانەیە وەردەگیرێ و هەموو ساڵێک بەزیرەکی لە پۆلەکانی دەرچووە و لە ساڵی ١٩٤٠دا چووەتە قۆناغی ئامادەیی و کە ئەم خوێندنەشی تەواو کردووە لە پایزی ١٩٤٣دا چووەتە بەغدا و لە کۆلێجی حقوق وەرگیراوە، لە ساڵی ١٩٤٧دا بڕوانامەی دەرچوونی وەرگرتووە و بووەتە پارێزەرێکی یاساناس و لە دادگای کۆیە پارێزەریی کردووە.

مامۆستا عومەر لە سەرەتای چلەکانی سەدەی رابردووەوە، تێکەڵی رێکخراوە نیشتمانییەکانی کورد بووە و ئەندامێکی چالاکی حزبی هیوا و دواتریش حزبی رزگاری و کە پارتی دیموکراتی کوردستانیش لە ١٩٤٦/٨/١٦دا دامەزراوە، بووەتە ئەندامێکی چالاکی ئەو حزبە و لە کۆیە بەرپرسی رێکخراوی شارەکە بووە.

کاتێک کە شۆڕشی ئەیلوول هەڵگیرسا و پەرەی سەند، لە ١٩٦٣/٧/١١دا کاک عومەری یاساناس و کوردپەروەری بەجەرگ کرا بەسەرۆکی دادگای باڵای شۆڕشی کورد لەو ناوچە ئازادکراوانەی ژێر دەستی شۆڕشگێڕانی کوردستان و دادگاکەش لەم زاتانەی خوارەوە پێک هات و بارەگاکەشی لە (ماوەت) بوو:

١- بەڕێز عومەر حەبیب عەبدوڵڵا- سەرۆکی دادگای باڵا.
٢- بەڕێز موحسین محەمەد ئەمین دزەیی- ئەندامی یەکەمی دەستەی دادگا.
٣- بەڕێز روبیستان ئەمین عەلی جاف- ئەندامی دووەمی دەستەی دادگا.
٤- بەڕێز حەسەن سەید ئەحمەد- ئەندامی سێیەمی دەستەی دادگا.

مامۆستا عومەر حەبیب پارتییەکی دڵسۆز و خۆبەختکەر بوو. مامۆستا مەسعوود محەمەد لە کتێبەکەی (گەشتی ژیانم)دا لەبارەیەوە نووسیویەتی:

"عومەر حەبیب لە ناخەوە پارتییەکی دڵسۆز بوو".

مامۆستا عومەر لە ماوەی ژیانی دادوەریدا گەلێک کار و فرمانی دیوە و یەکەم جار بەمعاون تەسویەی زەویوزار لە کەرکووک ئینجا سلێمانی، دامەزراوە و لە ساڵی ١٩٥٧دا کراوە بەدادوەر لە دادگای پێنجوێن و لە حەفتاکانیش کراوە بەدادوەر لە دادگای دهۆک و هەولێر و کراویشە بەجێگری سەرۆکی دادگای کوێرا لە هەولێر و لە تەمەنی ٥٣ ساڵیدا لە ١٩٧٦/٤/٩دا کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە:

١- فەرهاد عەونی- مجلة گولان العربي- العدد ١٤ في ١٩٩٧/٧/٢٥. ص: ٦١-٦٥.

**کەریم شارەزا**

# حەمەی پیاوچاک

بەهرام محەمەد

ئەگەر تۆزێک بەرەو دواوە بگەڕێینەوە، لەوانەیە زۆر کەس لە نەوەی رابردوو پیاوێکی سادەی ساکاریان بێتەوە یاد، کە کووچە و کۆڵان و شەقامەکانی هەولێر پێی ئاشنا ببوون و بازاڕەکانی لە باوەشی خۆیان دەگرت. پیاوێکی تووکنی سەر و ردێن و سمێڵی چڕ و ئاڵۆسکاو بوو. بەژن مامناوەندی و سینگ پان و تۆکمە بوو، چەند پارچە جلێکی شڕ و وڕ و پینە و پەڕۆیی لەبەر دەکرد و پشتێنێکی بۆری لە تەنگەی خۆی شەتەک دەدا و چیتێکی رەنگاورەنگی لە چلک هەڵاتووی بە نارێکی لەسەری خۆی دەبەستا زۆر جاریش جەمەدانییەکی چڵکنی لەگەڵ ئەو چیتە لوول دەدا و هەردووکیانی پێکەوە بەسەر و ملی خۆیدا شۆڕ دەکردەوە، ئەو پیاوەش (حەمە) بوو، ناوی تەواوی (ئەحمەد محەمەد مستەفا) بوو. لە بنەڕەتەوە دانیشتووی گوندی (قەشقە)ی سەر بە ناحیەی قوشتەپەی پارێزگای هەولێر بووە و دوای ئەوەی دووچاری رووداوی پێ شکان دەبێت بۆ چارەکردن دەیهێنن بۆ هەولێر و لەبەر بێ پارەییش، یا هەر هۆیەک بێ، دەچێتە تەکیەی خانەوادەی خوالێخۆشبوو (شێخ مستەفا نەقشبەندی) و لەسەر دەستی شێخ تەوبە دەکات و دەبێتە موریدێکی ئەو رێگایە. لێرەدا، بازنە بەردەوامەکانی زیکر و خۆئاخنینی لە گۆشەیەکی ئەو تەکیەدا، کار دەکاتە سەر باری دەروونی (حەمە) و هەندێک دووری دەخاتەوە لە کۆمەڵ و ژیانی ئاسایی رۆژانە. بەڵام دوای ماوەیەک، تەکیەی خوالێخۆشبوو (شێخ مستەفا) بەجێ دەهێڵێ و روو دەکاتە مزگەوتی (شێخی چۆلی) و گۆشەیەک لە گۆشە خراپبووەکانی تێتکە دەگرێ و شێوە ژیانێکی تایبەتی و نوێ هەڵدەبژێری و بەرەبەرە دەردەچێ و دەچێتە ناو بازاڕ و شەقامەکانی هەولێر و بیروڕاکانی خۆی بە شێوازێکی سەیر و سەرنجڕاکێش دەخاتە روو. سەرنجی خەڵکی دەوروژێنێ و بۆ لای خۆی رایدەکێشی. بەوەش دید و بۆچوونی خەڵک بەرامبەری دەگۆڕی و بەچاوێکی پڕ لە خۆشەویستی و بەزەیی و بایەخ پێدانەوە سەیری دەکەن، تا وای لێ دێت ئەو بیروڕایانەی دەریدەبڕین خەڵک گوێی بۆ شل دەکردن و قسەکانی دەبوونە مادەی گفتوگۆی ناو چایخانە و دووکان و ماڵان.

دوای ماوەیەک (حەمە) لای هەموو دانیشتوانی هەولێر دەناسرێ و خەڵک بەپەرۆشەوە لای دادەنیشتن و گوێیان لە قسەکانی دەگرت، قسەکانی (حەمە) تام و چێژێکی خۆشیان هەبوو، بە تایبەتی لەو کاتی و لای ئەوانەی (حەمە) یان خۆش دەویست و پایەیەکی تایبەتیان بۆ دانابوو، ئەو

ڕێزگرتنەی (حەمە)ش لەلایەن خەڵکی هەولێرەوە هەروا بە خۆڕایی نەبوو، بەڵکو چەند ڕەفتارێکی تایبەتی ئەو پیاوە زیاتر سەرنجی خەڵکەکەی ڕاکێشاوە لەوانەش: پیاوێکی زۆربلێ نەبووە و تا بڵێی کڕ و بێدەنگ و گران بووە، زۆر کەم وەڵامی پرسیارانی داوەتەوە و پرسیارەکانی خۆشی هەمیشە بەرەو ئاسمان بووە و ئاراستەی خودای گەورەی کردوون و زۆر ڕوون و ئاشکراش نەبوون، سواڵی نەدەکرد و دەستی بۆ کەسێک پان نەدەکردەوە ئەگەر نەیناسیبا، پارەشی تەنها لەو کەسانە وەردەگرت کە لای ئەو ناسرابوون و بە پەنجەی دەست دەژمێردران. تەنها ئەو پارە ئاسنانەشی وەردەگرت کە ئەوکات باو بوون و پارەی کاغەزی لا پارە نەبوو. (حەمە) بەجەم و دەم نانی نەدەخوارد و بەرێکوپێکیش نوێژەکانی نەدەکرد، شەو نوێژی زۆر دەکرد و هەر جارەی (٥٠-٦٠) ڕکعەتێکی نوێژی دەکرد و نوێژەکانیش لەسەر ئەو سەکۆیەی لە ناوەندی حەوشەی مزگەوت هەبوو، دەکرد و زۆر گوێی نەدەدایە سەرمای زستان و دەستنوێژی بە ئاوی سارد هەڵدەگرت و ماوەیەکی زۆریش لە کڕنۆش بردن دەمایەوە[٣]. ژەمەکانی خواردنیشی بریتی بوون لە تێکەڵاوییەک مەگەر هەر خوا بیزانیبایە چەند جۆرن، مەنجەڵێکی دەهێنا و پڕی دەکرد لە باینجان و کودی و تەماتە و وردتکە نان و تۆچای وشک و ئاو، دەیخستە سەر ئاگری ئەو ڕەژییە خۆمانەی ئەوکات باوبوو و پاشان دەچووە دەرەوە و بەجێی دەهێشت، کاتێ کە دەگەڕایەوە لەسەر ئاگرەکە دەیهێنایە خوارەوە و چەند ڕۆژێک لەو خواردنەی دەخوارد. هەروەها (حەمە) زۆر حەزی لە پارچە ئاسنی کۆن و ژەنگاوی بوو، بەیانییان کە لە مزگەوت دەهاتە دەرەوە، ڕووی دەکردە بازاڕی گەورە و ئەو پارچە ئاسنانەی لای بوون هەڵی دەگرتن و دەیبردن لە بازاڕ دەیگۆڕینەوە و هەندێ جاریش پارچەی دی دەکڕی و هەمووی لە ناو کیسەیەک دەکرد و بەکۆڵی خۆی دادەدا و دەهاتە سەر شۆستەیەک دادەنیشت و پارچە ئاسنەکانی لە بەردەم خۆی ڕیز دەکردن و حەزیشی لێ نەبوو کەس دەستیان لێ بدا و هەریەکەی بەقەد منداڵێک خۆش دەویست.

حەمە ئەو پارچە ئاسنانەی بەو پارەیە دەکڕی کە خێرەمەندە ناسیاوەکانی دەیاندایێ و ڕازیش نەبوو شتێک بێ پارە وەربگرێ.

سەرەڕای ئەو جلوبەرگە چڵکن و قرێژاوییەی لەبەری دەکرد و ئەو خواردنە تێکەڵاو و پێکەڵاوە مەگەزاوەی دەیخوارد، نەمانبیست (حەمە) لە ژیانیدا ڕۆژێک لە ڕۆژان نەخۆش کەوتبێ، بەڵکو تا ئەو کاتەی خودای گەورە لە ڕۆژی ١٩٧٧/١/٣١[٤]، بۆ لای خۆی بردەوە، تەنێکی پڕ جووڵە و بەهێز و چالاکی هەبووە. لە دوای تەرمەکەشی خەڵکێکی زۆر و بەڕێزی شاری هەولێر و هەندێ شێخ و مرید و دەروێشە دەفەزەنەکانیان ڕۆیشتن و بەرەو دوا ئارامگایان برد و لە گۆڕستانی شێخی چۆلی ناشتیان.

ئەگەرچی (حەمە) لەلایەن هەندێ کەسەوە بە چاوێکی کەم سەیر کراوە و لەبەر چەند هۆیەکی وەک بێکەسی و هەژاری و چڵکنی و لانەوازەیی و گازندەکردنی بەشێوەی بۆڵەبۆڵ و ترمەترمی پێشە خۆی، بە (دەلوو- شێت) ناسراوە، بەڵام لەبەر چەند پێشبینییەکی و هەندێ ڕووداوی سەر سوڕهێنەری خەڵکانێکی دی بەپیاوچاکیان داناوە. هەر بۆیەش لەمەودوا چەند پێشبینییەکی (حەمە) وەک ئەوەی بۆمان باس کراوە دەخەینە بەرچاو:

- دەگێڕنەوە، ڕۆژێک لە ڕۆژان (حەمە) لەسەر شۆستەی شەقامی کۆماری[٥] ئەوکات و لە پشت مزگەوتی بازاڕ، دادەنیشێ و هاوار دەکات و ئامۆژگاریی خەڵکەکە دەکات و دەڵێ: "خەڵکینە قەسپ و خورما بۆ زستان داکەن"، کاتی ئامۆژگاریکردنەکەشی پایز دەبێ،

دەڵێن وا ڕێکەوت کەژی زستانی ئەو ساڵە بارانێکی یەکجار زۆر باری و لافاو هەستا و جۆگا و کەند و شیوەکان پڕ بوون لە ئاو و چەند ماڵێکی شار ئاو بردی و زستانەکەشی زۆر سارد بوو[٦].

- لە سەرەتای شەستەکان بە هەموو دەنگییەوە، کە لە بارێکی دەمارگیری و تووڕەیی دابوو، هاواری دەکرد و دەیگوت: "ئەگەر ناتوانی شوانی بکەی، بۆچی دەبییە شوان؟".

هەروەها بەر لە ماوەیەک لە بەرپابوونی شۆڕشی ئەیلوولی ڕزگاریخوازی گەلی کورد، هەمان وتەی پێشووی دووبارە دەکردەوە و ئەوەشی لەسەر زیاد دەکرد "خوێنێکی زۆر دەڕژێ و خاک بەخوێن سوور دەبێ".

بەڵێ شۆڕشی کورد لە ڕۆژی (١١)ی ئەیلوولی ١٩٦١ بەرپا بوو و خوێنێکی بێ تاوانی یەکجار زۆر، بەهۆی سیاسەتی چەوتی فەرمانڕەواکانی ئەوکات، لە جەستەی ڕۆڵەکانی گەلی عێراق بەکورد و عەرەبییەوە ڕژا.

- ڕۆژێک لە ڕۆژان کە هەینی بوو مەلای مزگەوتی شێخی چۆلی وتاری ڕۆژی هەینی بۆ خەڵکە دەخوێندەوە کە لەوێ کۆببوونەوە بۆ نوێژی هەینی. (حەمە)ش لە بەردەمی ئەو هۆدە خراپۆچکەیەی تێیدا حەوابووەوە، دانیشتبوو گوێی لە مەلا گرتبوو، کاتێ کە نوێژی هەینی تەواو بوو، مەلا لە بەردەمی (حەمە) دەیویست تێپەڕێ و بڕوا. بەڵام (حەمە) بینی، بۆیە بە شێوازی سادە و بێ تاوانی خۆی لەمەلای پرسی و گوتی (مەلا کێ ئێمەی دروست کردووە؟) مەلا وەڵامی دایەوە و گوتی: "خودای گەورە"، پاشان دیسان لە مەلای پرسی و گوتی: "ئەدی کێ شەیتانی دروست کردووە؟" مەلا هەروەها هەمان وەڵامی دایە دەست و گوتی: "خودای گەورە" بەڵام (حەمە) بەوەندە وازی نەهێنا، دیسان پرسی و گوتی: "ئەدی بۆچی بەو جۆرە لە ئێمەی بەرداوە و بە کەیفی خۆی چی بکا بیکا؟"، مەلا تۆزێ داماو پاشان، دوای سەرسوڕمانی لەو پرسیارە سەیرە، وەڵامی دایەوە و گوتی: "من نازانم تەنها خودای گەورە زانیاریی دەربارەی ئەو کارە هەیە"[٧].

(حەمە)[٨] گەلێ شتی دیکەی لەو بارەوە هەبووە و خەڵک باسی دەکەن. هەندێک دەڵێن پیاوچاک بووە و، هەندێکی دیش لەمە زیاتر دەڕۆن و دەڵێن (وەلی) بووە. بەڵام (حەمە) هەرچی بێ، کابرایەک بووە زۆر شتی بۆ ڕێککەوتووە.

**پەراوێز و سەرچاوەکان:**

١- کێلی گۆڕەکەی لە گۆڕستانی شێخی چۆلی، کە ناوی تەواوی و ڕۆژی کۆچی دوایی لەسەر نووسراوە.

٢- بە گوێرەی قسەکانی مام (عەبدوڵڵا ساڵح) کە خەڵکی گوندی قەشقەیە.

٣- بە گوێرەی قسەکانی مامۆستای بەڕێز (مەلا عەلی) پێش نوێژ و دوانبێژی مزگەوتی شێخی چۆلی.

٤- بە گوێرەی قسەکانی بەڕێز (مەلا ئەمیر) بانگدەری مزگەوتی شێخی چۆلی. هەروەها ڕۆژی مردنەکەشی لەسەر کێلی گۆڕەکەی نووسراوە.

٥- ئەو شەقامەیە کە بە بەردەم (ئەسواق سیروان)دا دەڕوا تا دەگاتە ڕێگای مەحەتە.

٦- بەگوێرەی قسەکانی بەڕێز (مەلا عەلی) و بەڕێز (مەلا ئەمیر).

٧- مەلای مزگەوتەکە بەڕێز (مەلا عەلی) شێخی چۆلی بووە و باسەکەش خۆی گێڕایەوە.

٨- بۆ هەندێ زانیاری سوودم لە بەڕێز (عەبدوڵڵا مەحموود) بەڕێوەبەری قوتابخانەی (شنە) کە یەکێکە لە خزمەکانی (حەمە) وەرگرتووە.

هەروەها سوودم لە هەندێ کەسی بە تەمەنی گوندی قەشقە و هەندێ دووکانداری ئەوکات کە لە بازاڕی گەورە و شەقامی کۆماری دووکانیان هەبووە.

# شێخ فەتاحی موفتی
# ١٩١٩- ١٩٧٩

جەلال خدر

قورئان خوێن و مجوەد و مقامزانی دەنگخۆشی شاری هەولێر، شێخ فەتاحی کوڕی مەلا محەمەدی موفتی کوڕی مەلا عوسمانی کوڕی مەلا ئەبوبەکر ئەفەندییە.. باپیرە گەورەیان مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی بە (مەلای گچکە) ناسراوە زانایەکی بەرزی سەردەمی خۆی بووە. تەریقەتی نەقشبەندی لەسەر دەستی حەزرەتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی لە شاری بەغدا وەرگرتووە.

یەکێک لە خەلیفە بەناوبانگەکانی بووە و مەلا محەمەدی موفتی تەریقەتی لەسەر دەستی شێخ حیسامەدینی تەوێلەیی وەرگرتووە.. ئەو بنەماڵەیە لە باوک و باپیرانەوە لەسەر ئەم ڕێبازە ڕۆیشتوون، شێخ فەتاح لە ساڵی ١٩١٩ لە گەڕەکی تەکیەی قەڵای هەولێر چاوی بەدنیای گەورە روون کردۆتەوە. لەبەرئەوەی لە بنەماڵەیەکی ئاییندار و بەرچاوی ئەو شارە بووە، دەبوو لە منالییەوە وەکو برایەکانی روو لە خوێندن و زانست بکات.

لە ساڵی ١٩٢٦ دەخرێتە بەر خوێندنی قورئانی پیرۆز و لە مزگەوتی قەڵاتێ دەست پێ دەکات دوای خوێندنی جزوعەمە و تەبارەک چەندین کتێبی بچووک دەخوێنێ لە ساڵی ١٩٢٧ بۆ یەکەمین جار دەخرێتە بەر خوێندنی قوتابخانە و لە (اربیل الاولی) دەخوێنێ تاوەکو پۆلی چوارەمی سەرەتایی تەواو دەکات. ئەو کاتەش بەڕێوەبەری قوتابخانە (مامۆستا عەبدولخالقی قوتبی) کەرکووکی بووە.. لە پۆلی چوارەمی سەرەتایی دەگوازرێتەوە بۆ قوتابخانەی (ئەربیلی پانیە). ئەو کاتەش بەڕێوەبەری قوتابخانە (مامۆستا کەمال حەسووف) بووە. دەبووایە قوتابی سیدارە لەسەر بکات، ئەویش بەسەری کۆتەوە دەچێتە قوتابخانە و بەڕێوەبەر قەبووڵ ناکات، ئەویش بەچاوی گریانەوە دەچێتە ماڵەوە.. باوکیشی کۆنە سیدارەیەکی ڕەشیدی برا گەورەی لەسەر دەنێ و بەخزمەت کارەکەیان دووبارە ڕەوانەی قوتابخانەی دەکات، خۆشییەکەی لەوەدا بووە سیدارەکە لەبەر گەورەیی لەسەری ختم دەبێت.. قوتابییەکانی قوتابخانە لەسەری کۆ دەبنەوە سیدارەکەی لێ وەردەگرن و تۆپ تۆپێنی پێ دەکەن. لە پۆلی شەشەم دەخوێنێ.. لە پاشان واز لە خوێندن دەهێنێ...

سەبارەت بەنەخوێندنی لە قوتابخانە (شێخ فەتاح) بۆی

گێڕامەوە گوتی: "لە ساڵی (١٩٣٣-١٩٣٤) ئەو کاتە ڕەشاد ئەفەندی برا گەورەم بۆ خوێندن بەرەو کۆلیجی ئەزهەری قاهیرە دەچوو (یەکەمین کەسیش بووە لەو شارە رووی لەو شوێنە کردبێ) بۆ تەواوکردنی خوێندن، منیش دەستم بەگریان کرد و گوتم: دەبێ منیش بۆ شاری قاهیرە بچم، باوکیشم گوتی: تۆش قوتابخانە تەواو بکە ئەوجا ڕەوانەت دەکەم". شێخ فەتاح ئەو ساڵە واز لە خوێندن دەهێنێ و لە شوێنی خۆیدا دەمێنێتەوە و لە مزگەوت دەخوێنێ. بۆ ساڵی ئایندە باوکی ڕەوانەی شاری سولەیمانی دەکات و دەچێتە ماڵی ئیبراهیم یوسف ئەفەندی ئامۆزای و لە قوتابخانەی فەیسەلییەی سلێمانی دەوام دەکات. پۆلی شەشەمی لەوێ تەواو کردووە ئەو مامۆستایانەی کەوانەیان پێ گوتووە. شێخ فەتاح ناوی دوو کەسی لە بیر مابوو، وەکو: (عەلی ئاغا و مامۆستا حەمە پاشا). لە ساڵی ١٩٣٦ گەڕاوەتەوە هەولێر قوتابخانەی ناوەندی تەواو دەکات. لە ساڵی ١٩٤٠ دەچێتە (دار العلوم العالیة) ئەو کاتە لە بەغدا لە ئەعزەمیە بووە. ئەو ماوەیەش دەکەوێتە ناو هەوایەکی خۆش، چونکە ئەو کاتە شاری بەغدا لەوپەڕی پێشکەوتندا بووە قەوانی محەمەدی گوبانچی و رەشید قوندەرچی و حەسەن خێوکە و حاجی نەجمی شێلی سەلیمە پاشا، باو بووە.. خەڵک بەپەرۆشەوە گوێبیستی دەبوون.. ئەویش دەچووە مزگەوتی ئەعزەمیە بانگی دەدا و سەلای دەکێشا و قورئانی دەخوێند بەشداریی لە مەولوودی پێغەمبەر دەکرد... دۆستە نزیکەکانی، وەکو: (مامۆستا سەمەد و مامۆستا نەشئەت محەمەد سەفوەت) بە بەردەوامی لای میوان دەبوون.

مامۆستا جابیر پیرداودی هونەرمەند و نیگارکێش بۆی گێڕامەوە گوتی: "لە ساڵی ١٩٤١ لە قوتابخانەی (دار موعەلمین ریفی) دەمخوێند، ئێوارەش لەگەڵ شێخ فەتاح دەچووینە مزگەوتی ئەعزەمیە.. جارێکیان شێخ فەتاح هەندێک مۆمی داگیرساند و لە سەحنی مزگەوت دەستی بەخوێندنەوەی قەسیدە کرد لە ستایشی پێغەمبەردا، کاتێک سەرم بەرز کردەوە، مزگەوت وا قەرەباڵغ بووە، جێگا دانیشتنی تیا نەماوە. خەڵک گوێیان بۆ دەنگی شێخ فەتاح شل کردووە".

مامۆستایەکانی شێخ فەتاحیش ئەو کاتە: (کەمالەدین تائی و شێخ قەیسی و مامۆستا جەمیل ئەفەندی و عەبدولڕەحمان خەتیب) بوون و ژمارەی قوتابییان چل کەس بوون لە ژوورێکدا جبە و عەمامەیان لەبەر دەکرد و شێخ فەتاح پێشنوێژی بۆ دەکردن. ماوەی خوێندنی تەرتیل و تەجویدی قورئان بۆ قوتابی لە دوو چرکە، ڕەتی نەدەدا بەڵام هی شێخ فەتاح بێ حیساب بوو، لە تاقیکردنەوەدش هەموو جارێک پلەی (١٠٠)ی وەردەگرت بەبێ تاقیکردنەوە.

لە ساڵی١٩٤١ شۆڕشی ڕەشید عالی گەیلانی دەست پێ دەکات بۆ ماوەی (١٥) ڕۆژ لە شاری بەغدا دەمێنێتەوە لە پاشان قوتابخانە بەجێ دەهێڵێ. روو لە شاری هەولێر دەکات.

شێخ فەتاح بۆی گێڕامەوە گوتی: لەو ماوەیەدا باوکم تووشی نەخۆشی هات. لەبەرئەوەی (کۆچکردنی شێخ حیسامەدین تەوێڵە) زۆر کاری تێ کردبوو. منیش بەراستی نەمتوانی لەسەر خوێندنم بەردەوام بم و بۆ ماوەی چوار ساڵی ڕەبەق لە خزمەتی باوکم بووم. هەر ئەو هۆیەش بوو نەمتوانی خوێندن تەواو بکەم. باوکم بۆ ماوەیەک لە نەخۆشخانەی بەغدا مایەوە لە پاشان چووینە شاری سلێمانی و بەرەو تەوێڵە و بیارە بەڕێ کەوتین بۆ ماوەی مانگ و نیوێک لە باغەکۆن ماینەوە. لە پاشان گەڕاینەوە بۆ شاری هەولێر، باوکم لە ڕێکەوتی

١٧ی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٥ کۆچی دوایی کرد لە پاش مردنی شەش کوڕی لە دوای خۆی جێ هێشت:

١- سەعید ئەفەندی موفتی (١٩٦٣/٢/١٩) باوکی سابیر و مەدحت و نەشئەت.

٢- رەشید ئەفەندی موفتی (١٩١٠-١٩٩٢) باوکی شوان و گاوان و سەپان و گەیلان و پشتیوان.

٣- محەمەد رەشاد ئەفەندی موفتی (١٩١٥-١٩٩٢) باوکی عوسمان و کەنعان و عەدنان و ئیحسان.

٤- شێخ فەتاحی موفتی (١٩١٩-....) باوکی سەرۆ و سەناح.

٥- نەجمەدین موفتی (١٩٣٤-١٩٩٨) باوکی کاوە.

٦- شەمسەدین موفتی (١٩٣٦-....) تاقە کچێکی هەیە.

شێخ فەتاح لە ساڵی ١٩٤٦ بۆتە فەرمانبەری (مامور تەموین) رەوانەی قەزای کۆیێ کراوە لەو ماوەیەدا دۆستایەتیی لەگەڵ منالەکانی (مەلای گەورەی کۆیێ و کاکە زیاد و حەویز ئاغا و رەفیق عەولاغا) پەیدا دەکات و هەروەها دۆستایەتیی لەگەڵ هونەرمەند و دەنگخۆشەکانی ئەو شارە، وەکو: (مەلا ئەسعەد و مەلا ئەحمەدی کۆر و سێوەی) هونەرمەند پەیدا دەکات، شەوانە لەلای میوان بوون و مقاماتی رەسەنی کوردیان بۆی چراندووە. لێرەدا سەبارەت بەپیاوەتی و چاوتێری پێم خۆش بوو شتێک لە حەقی شێخ فەتاح بگێڕمەوە: لە یەکەم مانگی دەوامکردنی کاتێک کە بەریدی رۆژانە دەکاتەوە، فەرمانی فەسڵکردنی "رەفیق ئاغای" بەردەست (فراش)ی تیا بووە، ئەویش خۆی لێ بێدەنگ دەکات بۆ ماوەی سێ ساڵ ئەو پیاوە لەلای خۆی گل دەداتەوە. مانگانەی لە گیرفانی خۆی بۆ سەرف دەکات، رەفیق ئاغاش ئاگای لەو کەین و بەینە نەبووە، تاوەکو شێخ فەتاح دەستی لە کار دەکێشێتەوە ئەوجا ئەو پیاوەتییەیان بۆ دەردەکەوێ.. لە زەمانی تەموینیدا چەند بیتاقەیەکی زیادی دروست کردبوو و دەستی هەژاران و لێقەوماوانی پێ دەگرت. وا دیارە چاکە و پیاوەتی شێخ فەتاح بەمیرات لە باوک و باپیرانەوە بۆیان ماوەتەوە، چونکە ئەو بنەماڵەیە لەو مەیدانەدا هیچ کاتێک درێغییان نەکردووە. کاک فارووقی کوڕی مەلای گەورەی کۆیێ بۆی گێڕامەوەو گوتی: "لە ناوەڕاستی چلەکاندا شێخ فەتاح بەمەئموری تەموین هاتە کۆیێ، بۆ یەکەمین جار لە ماڵی ئێمە میوان بوو، وەکو خانەخوێ و لە هەمان کاتیشدا خۆی بەخزم و دۆست دەزانی، چونکە باوکی شێخ فەتاح ئامۆزای مەلا ئەفەندی بوو و دۆستایەتییان لەگەڵ باوکم هەر لە کۆنەوە هەبوو. لە پاشان لە گەڕەکی بایزاغا خانوودکی بەکرێ گرت. ئەوجارە ئێمە هاتوچۆی ماڵی فەتاحمان دەکرد، چونکە ئامێری گرامەفونی هەبوود. هەموو جارێک (قەوانی کەلسووم و عەبدولوەهابی) لێ دەدا و ئێمەش گوێمان بۆ قەوانەکان شل دەکرد."

لە ساڵی ١٩٤٩ دەگەڕێتەوە بۆ شاری هەولێر، لە نزیک ماڵی "مەلا مەسعوودی بێبەشی شاعیر" و دەنگخۆش خانوویێک بەکرێ دەگرێ و شەوانە بەیەکەوە رادەبوێرن.. لەسەر زمانی مەلا مەسعوودی بێ بەشی شاعیر دەگێڕنەوە، کە دەڵێ: "لەسەرەتای ساڵانی پەنجاکاندا ماڵمان لە گەڕەکی تەعجیل بووە، ماڵی شێخ فەتاحی موفتیش جیرانمان بوون. شەوان بەیەکەوە رامان دەبوارد. لە هەمان کاتیشدا بەدوای حاجی عەبدولڵا دەفژەنماندا دەنارد. ئەو کاتە (مەحموود زامدار) منال بوو، بەدوای حاجیدا دەچوو. ئەویش دەهات و دەستی پێ دەکرد، ئێمەش لەگەڵیدا مقامات و قۆریاتی تورکیمان دەچراند. لە ساڵی ١٩٥١ بەکاتبی لێژنەی

کشتوکاڵی دادەمەزرێ. ئەو کاتەش لێژنەکە پێکهاتووە، لە ئیبراهیم یوسف و شەهاب چەلەبی و رەشاد ئەفەندی، مانگانە مووچەی (١٠) دیناری بۆ دەبڕدرێتەوە. لە ساڵی ١٩٥٢ لە رانیە بەکاتبی تەحریر دادەمەزرێ. ماوەک لەلای (خالید نەقشبەندی)- ئەو کاتە قائمقام بوو- کار دەکات. لە ساڵی ١٩٥٤ دەگوازرێتەوە بۆ ناحیەی کەندێناوە، لە ساڵی ١٩٥٥ راژەی دەگوازرێتەوە بۆ دائیرەی نفوسی هەولێر، تاوەکو شۆڕشی ١٤ گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨. لە هەمان ساڵدا دەچێتە قەزای مەخموور دەبێتە (مأمور نفوس)..

لە ساڵی ١٩٥٩ بەمەبەستی خۆڕزگارکردن لە دائیرەی نفوس، روو لە شاری بەغدا دەکات، لە رێکەوتی ١٩٥٩/٧/١٣ راژەی دەگوازرێتەوە بۆ دادگای هەولێر و دەبێتە (مأمور ئیجرای مەحکەمەی هەولێر). لە ساڵی ١٩٦٢ دەبێتە باشکاتبی دادگای رەواندز. ماوەیەک لەلای جەوهەری حوسێنی مەلا ئەو کاتە حاکم بووە، دەمێنێتەوە. لە ساڵی ١٩٦٥ دەبێتە مأموری تەنفیزی لە دادگای هەولێر، لە ساڵی ١٩٦٧ راژەی دەگوازرێتەوە بۆ دایرەی مەعاریفی هەولێر و دەبێتە سەرۆکی پۆلی بڕوانامەکان (رئیس شعبة الشهادات)ی ئەم فەرمانگەیە دوا قۆناغی بووە.

مام حاجی ئەنوەری حەلاق بۆی گێڕامەوە گوتی: "لە ساڵی ١٩٨٨ رێگای حەجمان گرتە بەر، یەکێک لەوانەی لەو قافڵەیەدا لەگەڵمان بوو، شێخ فەتاحی موفتی بوو. نەمان دەزانی چۆن ئەو رێگایە دوورەمان بڕی، چونکە شێخ فەتاح بەو دەنگە خۆشەی و بەدەم رێگا قەسیدەی لە ستایشی پێغەمبەر دەخوێند و کاتێک کە گەیشتینە شاری مەکە، دەمەو ئێوارە بوو. لە نزیک مزگەوتێک بارمان خست، کاتی نوێژی ئێوارە (مەغریب) داهات، شێخ فەتاح خۆی گەیاندە لای موئەزنی مزگەوت بۆ ئەوەی رێگای پێ بدات بانگی ئەو ئێوارە بدات. کابرای سعوودی رازی بوو ئەویش چوو.. مەحفەڵ و بانگێکی دا، ئەو خەڵکە حازر بووەی بەجارێ مەست و سەرسام کرد، چونکە خەڵکی ئەو شارە پێشتر گوێبیستی ئەو دەنگە خۆشە نەببوون." هەروەها مامۆستا ئەسعەد ماودرانی (خەڵکی قەڵای هەولێرە) بۆی گێڕامەوە گوتی: "لە کۆتایی شەستەکان ماڵمان لە قەڵای بوو، ماڵی شێخ فەتاحیش لە تەک مزگەوت بوو، لە قەڵای سەرەوە ژوورێکیان هەبوو. هەر جارێک بەبەردەرگای ماڵیان رەت دەبووم گوێم لە دەنگی شێخ دەبوو. بەو دەنگە خۆش و زوڵاڵەیەوە قورئانی پیرۆزی دەخوێند. زۆر جاریش مەقامات و قەسیدەی لە ستایشی پێغەمبەردا دەخوێند. لە مزگەوت بانگی دەدا و شەوانی دووشەممە و هەینی سەلای دەکێشا. ئەو بلیمەتە مرۆڤێکی چاوتێر و نانەدر بووە لە سەخاوەت باسی ناکرێ، بە بەردەوامی یارمەتیی هەژار و لێقەوماوانی دەدا، بەتایبەتی ئەوانەی لە مزگەوتی قەڵات نیشتەجێ بوو بوون".

شێخ فەتاح موفتی لە ساڵی ١٩٧٩ خۆی خانەنشین دەکات. ئەو دەنگخۆشە خوێندنی تەرتیل و تەجویدی قورئانی پیرۆزی لەلایەن سەید مەردان خوێندووە و عاشقی دەنگی شەهابەی هونەرمەند و دەنگخۆش بووە. لە گۆرانی و بەستەی کوردیش هونەرمەندانی شاری سلێمانی (عەلی کاکە) زۆر کاری تێ کردووە.

شێخ فەتاح لەوانەیە دەنگی لەسەر (تێپ) تۆمار کردبێ. بەڵام ئێمە تاوەکو ئێستا، هیچ شتێکی تۆمارکراوی ئەومان دەست نەکەوتووە، تاوەکو لە ئەرشیفی تایبەتی خۆمان بیپارێزین. شارەزایی لە ئوسوولی مقاماتیشدا هەیە. بەزمانی (کوردی و تورکی و عەرەبی و فارسی) دەنگی هەڵێناوە..

■

# سەید گوڵ شێخ جەلال مەعروف
# ١٩٠٢ - ١٩٨٠

**رەزا سەید گوڵ بەرزنجی**

سەیدگوڵ کوڕی شێخ جەلال کوڕی شێخ مەعروف بەرزنجی، لەساڵی "١٩٠٢"ی ز. لەگوندی "ئەحمەد لەوەند"ی سەر بە قەزای "چەمچەماڵ" لەخێزانێکی ئایینپەروەر لەدایک بووە. لە سەیدەکانی "کانی کەوە"یە، باپیرە گەورەشی "شێخ ئیسماعیل"ی "ولیانی"یە کە کوڕی "شێخ محەمەدی نۆدییە".

"سەید گوڵ" کە تەمەنی دەبێتە حەوت - هەشت ساڵان"شێخ جەلال"ی باکی زێدی باب و باپیری "ئەحمەد لەوەند" جێ دەهێڵێ و دێتە دەشتی"دزەییاتی"و لە گوندی"سەید ئەمین"ی سەربە قەزای "مەخمور" دادەنیشێ و پاشان دەگوازرێتەوە گوندی"عەوێنە". لەپاش مردنی باوکی لەگەڵ براگەورەکەی لەگوندی"عەوێنە"خەریکی کشتوکاڵکردن و



بەڕێوەبردنی"تەکیە"و خزمەتکردنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەبن.

لەوساڵەی کە لەدەشتی "دزەییاتی "بەساڵی سوێندخواردنەکە ناسراوە "سەید گوڵ" گوزەرانی لەگوندی "عەوێنە"پێ قبوڵ ناکرێ و بەخاوو خێزانیەوە روو لەشاری هەولێر دەکات،"سەید گوڵ شێخ جەلال بەرزنجی" مرۆڤێکی هێمن و لەسەرخۆبوو.. هەڵچوون و تووڕەبوون لە هەڵسوکەوتیدا نەبووە.. مرۆیەکی ئایین پەروەربووە، لەسیاسەت دوور بووە، بیروباوەڕی تەواوی بە کوردایەتی، هەبوو، بە گەواهی چەند سیاسییەکی گوندی"عەوێنە"کە ئەمری خوایان کردووە، دەیانگوت: ئەوەی ئێمەی فێرە کوردایەتی کرد لەگوندی"سەیدگوڵ"بوو.

لەشاری هەولێردا دوکانی ئەم پیشانەی هەبووە "نانەواخانە- مۆبلیات- چایخانە- دوکانی فرۆشتنی رادیۆو سەعات- وەکیلی سەمونی ئیعاشە".

لەیادێکی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ ئەو لەناو دەستەی پیاوماقوڵان و لەگەڵ هەندێ لە سیاسەتمەدارەکانی شاری هەولێر بە وەفدی شارەکە چوونەتە بەغداو سەردانی زەعیم "عەبدولکەریم

قاسم"یان کردووە.

لەژیانیدا زۆر حەزی بە دووشت کردووە"جگەرە و قاوە"هەردەم لە"تەکیە"کەی کە ژوورێکیانی لەماڵەکەیدا تەرخان کردبوو، ئەم دووانەی بەبەردەوامی هەبووەو دەیگوت حەزدەکەم ئەم دووانە لەپاشە خۆشمدا لە بنەماڵەکەمدا بەبەردەوامی هەبێت.

لەساڵی "١٩٧٩"حەجی کردووەو لەبەرواری ١٩٨٠/٣/٢ بەنەخۆشی لەهەولێر کۆچی کردووەو لەگۆڕستانی گوندی"سەید ئەمین" لەلای باوکی و مامی"شێخ جەلال و شێخ سەمەد"نێژراوە. لەپاشەخۆی سێ کچ و سێ کوڕی جێ هێشتووە، کچ و کوڕێکی مردوون، دوو کوڕو کچێکی ماون.

هەروەکو لەپێشدا باسم کرد شێخ بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی نێو کۆمەڵ جاری وابووە "٥" رۆژو پازدەرۆژ بۆی نەکراوە بگەڕێتەوە ماڵەکەی خەڵکی رووبان لێناوەو ئەویش بەهاواریانەوە چووە، لەبەرئەوەش کە لەناو خەڵکەکە ناسراوو خۆشەویست بووە هەر کێشەیەک قسەی لێ کردبێ سەدا نەوەدی جێبەجێ بووە، هەر ئەو خۆشەویستییەی بووە خەڵکەکە نازناوی"کاکە گور"یان دابوو بەتایبەتیش لەدەشتی دزەییاتی، ئەو کێشانەش کە بۆی دەچوو کێشەی کوشتن و سولحی میرات و کێشەکانی دیکە لەپای ژن بەژندا دەهاتە ئاراوەو کێشەی گەورە بە گچکەکە لەکوردەواریدا زۆربوو، سولح پێکردن لەناو دووبرا.. دوو خێزان.. دووتیرە، قسەکردن لەسەر کێشەکانی زەوی کشتوکاڵی و چارەکردنی.. وەرگرتنەوەی قەرزو قۆڵ بۆ ساحێب پارە.. تەڵاق و ژن زیزبوون و لەو کێشانەی کە لەناو کوردەواریدا دەقەوما، ئەم کێشانەش وەنەبێ هەر لەهەولێر بێت، وادەبوو دەچووە کەرکووک، سلێمانی... گوندەکانی دەشتی دزەییاتی بەزۆری.

بۆ نموونە شەوێکیان پاش نوێژی ئێواری "ئەفسەر"ێکی خەڵکی هەولێر هاتەلای زۆر مشەوەش و هیلاک دیاربوو، هەر دانیشت و دانەنیشت بەشێخی گوت یاشێخ زابتم لە"بەسرە"حەوتەیەک مادوونیم وەرگرتووە کە ئەڵڵا قۆیەن سبەی ژن بگوازمەوە، دەعوەت نامەم بەدۆست و خزم گەیاندووە، تەدارەکم هەمووی کڕییە، ئێستا خەزوورم لەبەرئەوەی کە بەیانی"جەژن"ە، دەڵێ نابێ بیگوازیتەوەو دەبێ بیخەینە پاش جەژن، منیش نازانم چی بکەم..شێخ گوتی چیت دەوێ، گوتی دەبێ وابکەی بەیانی کە جەژنە ژنەکە بگوازمەوە، بەگەڵی کەوت و قسەیەک لەشێخ و زۆر لەخەزوورو، خەزوورەکەی هەنجەتی ئەوەبوو دەیگوت من عەشایرم بەیانی کچ بەبووک ببەن، دەبێ ماڵ جێ بێڵم خەڵکیش بۆ جەژنانە دێنەلام، لەبەرئەوە لەجەژندا نابێ بیگوازتەوە، شێخیش پێی دەگوت: کاکە ئەوکوڕە مادوونی کەمەو دەعوەتنامەی بلاوکردۆتەوە ناکرێ تازە بەم شەوە ئەم خەڵکە چۆن تێدەگەیەندرێن، تۆ یەک دوو سەعاتێک ماڵ بەجێ بێڵە پاشان وەرەوە، ئیقناع بوو، پاش یەک دوو قسان دەیگوت: نابێت، شێخ.. نابێت، شتی وا چۆن دەبێ.. لەو دانیشتنەدا چەندجار گفتی داو پاشان پەشیمان دەبۆوە، وەختێک سەعات گەیشتە یەکی شەو شێخ هەر ئەوەندەی پێماو گوتی: فلان ئێوە لەچ ژوورێک یا لەکوێ دەخەون، خەزووری ئەفسەرەکە واقی وڕما، گوتی بۆ یاشێخ، گوتی: چونکە ناچمەوە جێگەکەی منیش بهێننە ئەو ژوورەو لێرە دەخەوم.. کابرا داما هیچی بەدەستەوە نەماو گوتی: یاشێخ تەواو با بەیانی سەعات ئەوەندەبێت و ژنەکەی خۆی بگوازێتەوەو دەسەڵاتی تۆم نییە، ئێستا کۆمەڵێک منداڵیان هەیە.

ئابەم شێوانە چونکە کارەکان بۆ خەڵک و خزمەتکردن و بارکەسران بوو، خودا قسەیەکی بۆدەهێناو بەرامبەرەکەی رازی دەکردو، خوداش لەگەڵ ئەوکەسانەدایە کە قسەیەکی خێر دەکەن.

# عادیل سەلیم
# ۱۹۷۸-۱۹۲۷

کەریم شارەزا



عـادیل سـەلیم مـسـتـەفـا، لە ۱۵/۱۰/۱۹۲۷دا لە گـەڕەکی خـانەقـای شاری هەولێر لەدایک بووە. حاجی سەلیمی باوکی بازرگـانێکی باش و پسـپـۆڕێکی شارەزای تووتن و جۆرەکانی بووە.

لە پایزی ۱۹۳٤دا چۆتە قـوتابخـانەی سەرەتایی لە هەولێر و خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی تا پۆلی پێنجەم بەزیرەکی تەواو کردووە و لە ساڵی ۱۹٤۷دا بەچاکی لە مـارکسـییەت گەیشـتووە و بووەتە ئەندام لە حزبی شیوعی- ڕێکخراوی کوردستان، لەسەر چالاکـیی سـیـاسی، بەر لە تاقـیکردنەوەی گشـتیی ئامادەیی دەگیرێ و ئەزموونەکەی لەدەست دەچێ، بەڵام لە دوای دەرچوونی لە بەندیخـانە روو دەکاتە بەغدا، چونکە پەیوەندیی لەگەڵ باوکیدا باش نابێ، لەسەر چوونە ناو حزبی شیوعی و لەو شارەدا دەبێتە چاودێریی کـرێکاری پڕۆژەی تەلارێکی حکوومی و کـرێکارەکـان ڕێک دەخات. حکوومەت هەست بەچالاکی دەکـات، بۆیە مـاوەیەک پاش ڕاپەڕینەکەی کـانوونی دووەمی سـاڵی ۱۹٤۸ی گـەلانی عێراق دەگەڕێتەوە هەولێر، بەڵام دوای جاڕدانی حوکمی عورفی لە ۱۵/۵/۱۹٤۸دا ماوەیەک دەگیرێ. کە بەردەبێ دەچێتەوە بەغدا و لەگەڵ دەستپێکردنی هەڵمەتی گرتنی شیوعییەکان لە ساڵی ۱۹٤۹دا دەگیرێ و بۆ ماوەی ۷ ساڵ حوکمی قورس و ۳ سـاڵیش چاودێریی پۆلیس حـوکم دەدرێ و دەنێـردرێتـە بەندیخـانەی (نوگـرە سـەلمان) لەوێ بۆ مـاوەی ۲۷ ڕۆژ لە مـانگرتنی بەندییە سیاسییەکاندا بەشداریی دەکات، تاکو دەسەڵاتدارانی حکوومەتی پاشایەتی داخوازییەکانیان جێبەجێ دەکات و باری ژیانی ناو بەندیخانەیان چاک دەکات.

دوای تەواوکردنی ماوەی حوکمەکەی، دوور دەخرێتەوە بۆ (بەدرە) و پاش تەواوکردنی ئەو چاودێرییە ۳ ساڵەشی لەگەڵ بەرپابوونی شـۆڕشی ١٤ی تەمـووزی ۱۹۵۸دا دەگـەڕێتـەوە هەولێـر و لەگەڵ هاوڕێ نافـیع یونس و کـەریم ئەحـمەد شـانە حزبییەکانی ئەو شارە و پارێزگای هەولێر ڕێک دەخەنەوە، بەڵام دوای لادانی عـەبدولکەریم قـاسم لە ڕێبـازە دیموکراتییەکەی کاک عادل لە ساڵی ۱۹٦۲دا لە کەرکووک تا چەند مانگێک دەگیرێ.

کـاتێک ڕژێمی بەعـسی فـاشی بەکـودەتا شوومـەکەی ۸ی شوباتی ۱۹٦۳ دەست بەسەر عێـراقدا دەگرێ، ڕەوشی شـیـوعـییەکـان ئاڵۆز دەبێ و دەچنە چیـاکـانی کـوردسـتـان لەگـەڵ شۆڕشگێڕانی ئەیلوول خەباتی چەکداری دەکەن. کـاتێک هاوڕێ عـادیل لە سـاڵی ۱۹٦۵دا لە بەندیخانە ئازاد دەبێ یەکسەر خۆی دەگەیەنێتە پێـشـمـەرگـەکـانی حـزبەکـەی لە چیـاکـانی کوردستـان.

لە دوای ڕێککەوتننامـەی ۱۱ی ئاداری ۱۹۷۰دا، چالاکـییەکانی حزبی شیوعی لە کوردستـان بەئاشکرا جێبەجێ دەکران و عـادیل سەلیم و ئەحمەد دڵزار دەبنە نوێنەری حزب لە لیژنەی پەیوەندییە نیـشـتـمـانیـیەکـان لەگەڵ هێـزە کوردستانییەکاندا.

کـاتێک کـە ئەنجـوومـەنی یاسـا دانان لە کـوردسـتـان دادەمەزرێ، بەو ناوەی حزبی شـیوعی عـێراق ئەوسـاکە لەگەڵ حزبی بەعس بەرەی نیشـتمانی و نەتەوەیی پێشکەوتنخوازیان پێکەوە نابوو عـادیل سـەلیم و ۹ هاوڕێی تری دەکـرێنە ئەندام لەو ئەنجـوومـەنە و لە سـاڵی ۱۹۷٤دا کـاک عـادیل لەگـەڵ نوێنەرێکی دیکەی حزبی شـیوعی دەبنە ئەندام لە ئەنجوومـەنی ڕاپەڕاندنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی کـوردسـتـان و کـرا بەئەمـینداری گشتیی گواستنەوە و گەیاندن لە کوردستاندا.

هاوڕێ عادیل لە کۆنگرەی سێیەمی حزبی شیوعی عێراق، کـە لە مـانگی ئایاری ۱۹۷٦ لە بەغـدا بەسـتـرا بەئەندامی یەدەگی کۆمیتەی ناوەندیی حزب هەڵبژێردراو چالاکترین ئەندام و کادیری حزبی شیوعی بوو لە کوردسـتان کاتێک لە کارێکی حزبی لە شاری کەرکووک دەگەڕایەوە هەولێر لە نزیک قوشتەپە لە ناو ئۆتۆمبێلەکەی دڵە گەورەکەی لە ڕۆژی ۱۲/۹/۱۹۷۸دا لە لێدان کەوت و تۆماری ژیانی شیوعییەکی ناوداری ناوچەی هەولێر تا هەتایە پێچرایەوە.

# سەعدی گچکە
# ١٩٤٣ -١٩٧٨

**ئازاد هەینی**

سەعدی گچکە لە ساڵی (١٩٤٣) لە گوندی سێبیرانی نزیک قوشتەپەی سەر بەپارێزگای هەولێر لە خێزانێکی جووتیار و هەژار لەدایک بووە، سەر بەهۆزی (مەمان)ە، هەر لە گوندی سێبیران دەخرێتە بەر خوێندنی ئاینی لە حوجرەکان دەخوێنێ تا دەگاتە قۆناغی فەقێیەتی، منداڵێکی زیرەک و چاوکراوە دەبێت، دوای ئەوەی لە گوندی (دووگردکان) قوتابخانە دەکرێتەوە واز لە خوێندنی حوجرە دەهێنێ روو لە قوتابخانە دەکات درێژە بەخوێندنی دەدات، بەو پێیەی سەرەتایەکی باشی هەبووە لە خوێندنی حوجرە یەکسەر لە پۆلی سێی سەرەتایی دایدەنێن، پاش ساڵێک خوێندن، پێداویستی ژیانی ئەو سەردەمە خەڵکی گوندنشینەکان لەبەر سەختی ژیانیان ئەوسا بەناچاری واز لە خوێندن دەهێنێ بەکارکردن خەریک دەبێ، ئیدی ئەمە دەبێتە



سەرەتای بیرکردنەوەیەکی زۆر تیژ و بوێرانە بۆ سەرتاپای ژیانی خۆی و بەوردیش سەیری رووداوەکانی دەوروبەری دەکات، تا ساڵی (١٩٦٠) لەگەڵ (سابیر)ی برای روو لە شاری هەولێر دەکەن لە گەرەکی (سەیداوە) نیشتەجێ دەبن، لەوێدا خەریکی کرێکاری دەبێت و تێکەڵ بە خەڵکی شار دەبێت بەچاوکراوەتر دەڕوانێتە دەوروبەری و زەمینەی زیاتری بۆ دەڕەخسێت تابیر لە دوارۆژی خۆی و لەوێشەوە بۆ گەلەکەی و خاکەکەی بکاتەوە بەمەش وردە وردە تێکەڵ بەژیانی سیاسەت دەبێ، لە ساڵی (١٩٦٣) دەبێتە پێشمەرگە و پەیوەندی بەشۆڕشی ئەیلوولی مەزن دەکات بەرابەرایەتیی بارزانیی نەمر، لە چەمی ڕێزان بۆ یەکەمین جار چەکی پێشمەرگایەتی دەکاتە شانی لە دوایدا دەگەڕێتەوە دەشتی هەولێر و کۆیە بەردەوام دەبێ لە خەبات و تێکۆشان، بەشداریی چەندین شەڕی قارەمانانەی دەشتی هەولێر و کۆیە و خۆشناوەتی و باڵەکایەتی دەکات دژ بە هێزە داگیرکەرەکانی کوردستان، قۆناغ بەقۆناغ پلەکانی پێشمەرگایەتیی بڕیوە لە شۆڕشی ئەیلوول (سەردەستە، سەرپەل، سەرلق، ئامیر بەتالیۆن)، جێی باسە بڕینی ئەم پلانە بۆ سەردەمی ئەوسا وا ئاسان نەبوو، بەڵام

چونکە ئەم کەڵەپیاوە خاوەن هێز و ئیرادەیەکی لەخۆبووردانە بوو بۆیەش شۆڕش بەشانازییەوە ئەم پلانەی بەشایەنی زانیوە، لە داستانە بەناوبانگەکەی شەڕی (ماکۆک و شیشار) کە (سێ) مانگی خایاند، کە ناسراوە بەشەڕە هەرە سەختەکانی شۆڕشی ئەیلوول وەک فەرماندەیەکی قارەمان سەنگەری جێ نەهێشت تا دوژمن تێکشکا و دواتر ئەویش بەبرینداری دابەزی، هەموو کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان تا ئێستا بەشانازییەوە باسی ئەم داستانە دەکەن کە ئەم قارەمانە دەوری سەرەکیی هەبوو لە سەرکەوتنەکان، لە کۆتایی ساڵی (١٩٧٤)یش بەسەرپەرشتیی راستەوخۆی شەهید (عەلی عەسکەری) هێزی قەندیل دادەمەزرێ بۆ بەرگریکردن لە بارەگاکانی سەرکردایەتی، ئەویش بەپلەی (ئامیر بەتالیۆن) دادەنێن لەم هێزە، تا هەرەسی شۆڕشی ئەیلول، وێرای هەڵوێستی روون و ئاشکرا و پێداگرتن بۆ بەردەوامبوونی شۆڕش بەناچاری روو لە شاری (مەهاباد) دەکات لەوێ نیشتەجێ دەبێ، بەڵام وەکو کەسێکی نارازی لە بارودۆخی رووخانی شۆڕش و نسکۆی ١٩٧٥ کە باڵێکی تاریکی بەسەر کوردستان کێشا دەناسرێ، بێ ئەوەی نائومێد بێ دەکەوێتە جموجۆڵ پەیوەندیکردن بەو سەرکردانەی کە وەک خۆی ئومێدی جۆشدانەوەی شۆڕشیان لێ دەکرا، جارێکی تر لە ئەنجامدا پەیوەندی دروست دەکاتەوە لەگەڵ هەریەک لە (عەلی عەسکەری، د. خالید، رەسووڵ مامەند، عومەر دەبابە و چەندین کەسایەتی تر)، لە کۆبوونەوەکانی شاری ورمێ کە لە نیسانی ١٩٧٥ بەشدار دەبێ، دواتر لەوەی (مەهاباد)یش بەهەمان شێوە بەشداری کاریگەری کردووە سەبارەت بەتاوتوێکردنی هەلومەرج و رێوشوێن و سازدانەوەی شۆڕش جارێکی تر، پاشان بەکۆ بریارێک دەگەڕێتەوە ناو عێراق، رژێمیش لە بەغدا جێگیری دەکات و لە ژێر چاودێریی توندا دەبێ، دووبارە دەکەوێتە جموجۆڵ تا لە ساڵی (١٩٧٦) بزووتنەوەی سۆسیالیست دادەمەزرێن لەسەر دەستی هەریەک لە (سەیدا ساڵح یوسفی، عەلی عەسکەری، د. خالید، مولازم تاهیر عەلی والی، سەعدی گچکە، عومەر دەبابە، رەسووڵ مامەند، عەلی هەژار کاردۆ گەلاڵی، مەلا ناسیح) ئەمەش وەلامدانەوەیەکی بوێرانە بوو بۆ هەلومەرجی ئەوسای شۆڕش، تا جارێکی تر و بەشێوەیەکی تر بزووتنەوەی کوردایەتی بتوانێ بەرەنگاری بەعس ببێتەوە و بەرگری لە مافە رەواکانی گەلی کورد بکات.

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە١/٦/١٩٧٥ لە سووریا دادەمەزرێت پەیوەندی دەکەن بە سەرکردایەتیی بزووتنەوە، لەو کاتەوە بزووتنەوەش بریار دەدات وەکو باڵێک بچێتە ناو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و بریاری خەباتی چەکداری دەدەن، ئەویش لەو کەسانە بوو لە٨/٨/١٩٧٦ بریاری چوونە شاخ دەدات، ئەندامانی خێزانەکەی کە پێکهاتبوو لە (هاوسەرەکەی و هێرش هێمن و لەنجە و ماکۆک) لە بەغدا جێ دەهێڵێ لەگەل هەڤاڵان روو دەکەنە شاخ چەکی شەرەف هەڵدەگرن، یەکەم چالاکی پێشمەرگانەی لە شۆڕشی نوێ لە٤/١/١٩٧٧بووە لەسەر رێگای پیرمام ـ مەلائۆمەر بەسەرپەرشتیی راستەوخۆی سەعدی گچکە، لەم چالاکییەش بریندار دەبێ، لە یەکەم کۆبوونەوەی کە لە کوردستان ئەنجام درا بۆ دیاریکردنی سەرکردایەتیی (یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان) لە (دۆڵی گۆستە) لە ٨/٣١ تا ١٢/٩/١٩٧٧ سەعدی گچکە وەک ئەندامی سەرکردایەتیی (ی.ن.ک) دەستنیشان دەکرێت، دیارە پێشتریش وەک ئەندامی سەرکردایەتیی بزووتنەوەش دەستنیشان کراوە، دوای تەواوبوونی کۆبوونەوەکانی

سەركردایەتی و دابەشكردنی كارەكان ئەو دەكرێتە بەرپرسی هەرێمی (٨)ی دەشتی هەولێر، دەستنیشانكردنی بۆ ئەم پۆستە بریارێكی سەرپێی و بێ بەرنامە نەبوو، ئەم هەرێمە كە دەشتی هەولێر و كۆیە و خۆشناوەتی لەسەر بوو، ئەم دەڤەرە شوێنێكی هەستیار و گرنگ بوو كە رژێمی بەعس زۆر گرنگی پێ دەدا بەتایبەتیش لە رووی عەسكەرییەوە، بەڵام سەعدی گچكە لە بواری شەری پارتیزانی پێشمەرگایەتی فەرماندەیەكی مەیدانی و بەئەزموون بوو، كە گەرایەوە ئەم هەرێمە وەك ئەندامی سەركردایەتی و فەرماندەی هەرێمەكە چەندین چالاكی پیشمەرگانە و سیاسییانە و رێكخراوەیی بەسەركەوتویی ئەنجام دا، ئەگەر بێتو باسی خەسڵەت و سیفاتەكانی ئەم پیاوە بكرێت بێگومان خاوەن خەسڵەت و تایبەتمەندی خۆیەتی، هەر لە بنەرەتدا ئەم سیفاتانە كاریگەرییان لەسەر دروستبوونی ئەو كەسە هەبووە، كاتێك باس لە كەسایەتیی ئەم پیاوە دەكرێت وەك كەسایەتییەكی شۆرشگێر و سەركردەیەكی مەیدانی باسی لێوە دەكرێ، لە بواری پێشمەرگایەتیدا سەرجەم ژیانی بۆ خەباتكردن لە پێناو نەتەوە و نیشتمانەكەیدا تەرخان كردبوو.

ئەگەر بێتو باسی قارەمانێتیی شەرەكان و داستانەكانی شۆرشی نوێ باس بكەین كە ئەو تیادا فەرماندەیی بووە، دەبێ بڵێین لە ژمارە نایەت، بەڵام لەوانەش شەری سەفین لە ١٩/١٠/١٩٧٧، شەری هەورێ لە ٢٩/١٠/١٩٧٧، شەری گوندی حەسەن موتریب لە ٢١/١٢/١٩٧٧، شەری شێوەشان و قازبەگیان لە ١٠/١٢/١٩٧٧، بۆ دواجار لەسەر داوای سەركردایەتیی (ی.ن.ك) لە ١٩٧٨/٣/٤ سنووری هەرێمەكە جێ دەهێڵێ بەرەو سەركردایەتی لە (نۆكان) دەكەوێتە رێ بۆ بەشداریكردن لە كۆبوونەوەكانی كۆمیتەی سەركردایەتیی (ی.ن.ك) دوای رێپێوانێكی زۆر و نەشارەزایی لە ناوچەكە رۆژی ١٩٧٨/٣/٨ لەگەڵ تاریك و لێڵی بەرەبەیاندا دەكەونە داوی شەرێكی نابەرامبەر و نەخشە بۆ كێشراوكە رژێم پێش وەخت خۆی بۆ ئامادە كردبوو، سوپایەكی گەورەی بەسەرپەرشتیی راستەوخۆی فەرماندەی فەیلەقی یەك (ئیسماعیل تەها نەعێمی) بە بەشداریی چەندین ئەفسەری پلەدار و بەهاوكاری دەیان (كۆێتەری جەنگی) و (بارهەڵگر) شەر دەستی پێ كرد و لە بەیانییەوە تا ئێوارە، لە ئەنجامدا سەعدی گچكە و١٢ پێشمەرگەی تر شەهید دەبن، ٥ پێشمەرگی تریش بە برینداری دەكەونە دەست رژێم، دواتر ٤یان لە ١٩٧٨/٦/١٢ لە زیندانی مووسڵ لە سێدارە دەدرێن و ئەوەكەی تر لەبەر بچووكی تەمەنی ٢٠ ساڵ زیندانی دەكرێت، ئەوانی تریش بە برینداری و پەرتەوازەیی رزگاریان دەبێ، بەم شێوەیە دوای چەندین داستان و قارەمانیەتی شەهید سەعدی دەچێتە كاروانی سەركردە نەمرەكانی و داستانی پڕ سەروەری بۆ خۆی نەوە و گەلەكەی جێ دەهێڵێ، گەیشتن بەپلەی نەمری بۆ سەركردەیەكی كەم تەمەن دەوڵەمەند بە ئەزموون شەرەفێكی گرنگ و گەورە بوو، كاتێك ئەو نەمرییە بەكەسێكی وەك سەعدی دەبرێت مایەی ئەوپەری شانازییە بۆ رۆڵە و گەل و نیشتمان، داستانی (دەشتێو) كە ئەم سەركردەیەی تیا شەهید بوو، بەدانپێدانانی دۆست و دوژمن بەگەورەترین داستانی میللەتەكەمان دەناسرێت لە سەدەی رابردوودا، ئەم داستانە بوو دووبارە پێشمەرگەی بەخەڵك ناساند و بەدوژمنی كوردی وت شۆرش بەردەوامە، هەر بۆیەش دوای شەهیدبوونی هەزاران سەعدی گچكەی تر چوونە شاخ و بەپیر شۆرشەوە چوون، تاكو راپەرینە مەزنەكەی بەهاری ١٩٩١ و دامەزراندنی پەرلەمان حكومەتی هەرێمی لێ هاتە بەرهەم.

# میرزا عەبدولکەریم
## ١٩٧٩-١٩١٤



فەرمانبەری نموونەیی و خەباتگێڕی بەجەرگی کورد، میرزا کوڕی حاجی کەریمی ئاسنگەر کوڕی مستەفا ناسراو بە (میرزا عەبدولکەریم) لە ساڵی ١٩١٤دا لە گەڕەکی هواو لە شاری کۆیە لەدایک بووە، لە تەمەنی شەش ساڵیدا خراوەتە بەر خوێندنی ئایینی لە یەکێک لە سوختەخانەکانی کۆیە و دوای فێربوونی قورئان و چەند سپارەیەکی فارسی و عەرەبی، لە ساڵی ١٩٢٣دا چووەتە قوتابخانەی سەرەتایی کۆیە و لە ساڵی ١٩٣١دا لە تاقیکردنەوەی گشتی قۆناغی سەرەتایی دەرچووە و بۆ پاییزی ئەو ساڵە چووەتە قوتابخانەی (دارولعولوم) لە بەغدا و پاش تەواوکردنی خوێندنەکەی، بەنووسەری دادگا دامەزراوە و نموونەیەکی سەرکەوتوو بووە لە ژیانی فەرمانبەریدا و پیاوێکی رەند و مەشرەبخۆش و روح سووک بووە لە ناو خەڵکیدا.

کاک میرزا چەندە لە کاری فەرمانبەری لێهاتوو بوو، ئەوەندەش لە کاروانی خەباتی نەتەوەیی میللەتەکەی دڵسۆز و خۆبەختکەر بوو. کە ساڵی ١٩٤٢ گوێزرایەوە بۆ دادگای قەڵادزێ، ئەم زاتە لەگەڵ فەرمانبەرێکی شارەوانی کە ناوی حوسێن بازیانی و بەڕێوەبەری قوتابخانە سەرەتاییەکەی ئەو شارە، مامۆستا تایەر ئەحمەد حەوێزی پەیوەندییەکی پتەو بەکۆمەڵەی (ژ.ک) دەکەن کە تازە لە ١٩٤٢/٩/١٦دا دامەزرا بوو و خەباتی سیاسی لە رۆژهەڵاتی کوردستاندا دەکرد. بەهەرسێکیان بڵاوکراوەیەکی سیاسیی کوردییان بەناوی (بڵێسە) دەرکرد و بەدەست دەیاننووسی و هەواڵی بزووتنەوە رزگاریخوازییەکەی کوردیان بەخەڵکی رادەگەیاند و چەند دانەیەکیشیان بۆ باڵیۆزخانەی بەریتانیاش لە بەغدا دەنارد.

تا ماوەیەک حکوومەت بۆی دەرناکەوێ ئەوانە کێن ئەو بڵاوکرایەوە دەردەکەن و هەرچەندە حکوومەتی عێراق لە سەردەمی جەنگی دووەمی جیهانیدا نەیدەویست کاری سیاسی وا بەهەند هەڵگرێ. بەڵام لە ئەنجامدا گومانی لەو سێ کەسە کرد هەریەکەیانی بۆ لایەک دوور خستەوە. کەچی ئەو زاتانە بەتایبەتی کاک میرزا عەبدولکەریم هەر لەسەر رێبازەکەی خۆی مایەوە و، لە خەباتی کوردایەتی هەر بەردەوام بوو.

کاک میرزا لەگەڵ دروستبوونی حزبی هیوا لە ساڵی ١٩٣٩ لەسەر هەیکەلی کۆمەڵەی (دارکەر)، بووە ئەندامێکی چالاکی ئەو حزبە نەتەوەییەی کورد کاتێکیش کە لە ١٩٤٦/٨/١٦دا پارتی دیموکراتی کوردستان دامەزرا، ئەم زاتە تێکۆشەرە بووە ئەندامێکی چالاکی ئەم حزبە نوێیە پێشکەوتنخوازە و لە کۆنگرەی سێیەمی پارتی کە لە ١٩٥٣/١/٢٦دا لە شاری کەرکووک بەسترا کاک میرزا دەورێکی باشی گێڕا لە چاپکردنی بەیاننامە و رووداوەکانی ئەو کۆنگرەیەدا چونکە لەو دەمەدا نووسەری یەکەمی دادگای کەرکووک بوو و لە چاپکردنی دەستی زۆر بەتوانا بوو، شەوان بەنهێنی چاپەکەی دادگای دەبردەوە ماڵ و ئەو بەڵگەنامانەی کۆنگرەکەی بە گورجی چاپ دەکرد.

کاتێکیش کە لە پاش شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی عێراق بارزانی گەڕایەوە وڵات و لە شوباتی ١٩٦٠ پارتی مۆڵەتی رەسمی ئیشکردنی حزبی وەرگرت و لە رۆژانی ٥ تا ٨ی مایسی ١٩٦٠ کۆنگرەی پێنجەمی لە شاری بەغدا بەست و لە دوا دانیشتنی کۆنگرەکە، لە ئێوارەی ١٩٦٠/٥/٨دا هەڵبژاردنی سەرۆک و ئەندامانی لیژنەی ناوەندی حزب کرا، کاک میرزا عەبدولکەریمی تێکۆشەر بەئەندامی یەدەگی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردرا.

ئەم تێکۆشەرە تا دوا هەناسەی ژیانی وەک خەباتگێڕێکی کوردپەروەر مایەوە و رۆژێک لە رۆژان لە رێبازی کوردایەتی لاینەدا تاکو سەرەتای هاوینی ساڵی ١٩٧٩دا بە نەخۆشییەکی کوشندە لە شاری هەولێر کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەی برایەوە شاری کۆیە و لە گۆڕستانی دەروێش خدر بەخاک سپێردرا.

سەرچاوە:

* تایەر ئەحمەد حەوێزی- گۆڤاری هاموون- کۆیە- کانوونی دووەمی ١٩٩٩ ژمارە (١٥).
* شارەزایی نووسەر لە ژیان و خەباتی ئەو تێکۆشەرە.

**کەریم شارەزا**

# هاشم عەبدوڵڵا
# ١٩٢٨-١٩٨٤

هاشم عەبدوڵڵا ئەربیللی لە رۆژی ١/١٢/١٩٢٨دا لە قەڵای شاری هەولێری دێرین لە بنەماڵەی چەلەبی لەدایک بووە. عەبدوڵڵا قادر چەلەبی باوکی فەرمانبەری تاپۆ بووە و لە ساڵی ١٩٣٤دا کۆچی دوایی کردووە.

هاشم لە پایزی ١٩٣٥دا لە قوتابخانەی سەرەتایی یەکەمی هەولێر خراوەتە بەر خوێندن و قۆناغی خوێندنی ناوەندی و ئامادەییشی هەر لە شارەکەی خۆیدا لە ساڵی ١٩٤٦دا تەواو کردووە و بەپلەیەکی بەرز لە تاقیکردنەوەی وەزاری قۆناغی ئامادەیی دەرچووە. بۆ پایزی ئەو ساڵەش چووەتە بەغدا و لە کۆلێجی ئەندازیاری بەغدا-بەشی مەدەنی وەرگیراوە. لە ساڵی ١٩٤٩دا لە دوا پۆلی خوێندنەکەی لە سەردەمی وەزارەتەکەی نووری سەعید گیراوە و دراوە بەدادگای عورفی عەسکەری و لەسەر هەڵوێستی سیاسیی پێشکەوتنخوازی بە ٧



ساڵ حوکم و یەک ساڵ دوورخستنەوە و خستنە ژێر چاودێریی پۆلیس مەحکووم کراوە، چونکە دەورێکی باڵای بووە لە خەباتی یەکێتیی گشتیی قوتابییانی عێراق کە ئەو ساڵە ئەو رێکخراوە بەرێکخراوێکی چەپڕەوی نهێنی لەقەڵەم دەدرا و خۆیشی نوێنەری کۆلێجی ئەندازیاری بوو لە لیژنەی باڵای یەکێتیی گشتیی قوتابییاندا.

ماوەی گرتنەکەی لە زیندانەکانی بەغدا و نوگرەسەلمان بەسەر برد و نموونەی خەباتگێڕی ئازا و کۆڵنەدەر بوو.

کە لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٧دا ماوەی حوکمەکانی تەواو بوو، گەڕایەوە شاری هەولێر و دوای چەند مانگێک (خاتوو ساکینە سولەیمان)، خوشکی هاوڕێی شەهیدی (مووسا سولەیمان)ی گواستەوە و ژیانێکی ئاسایی لەگەڵ بردە سەر. لە دوای بەرپابوونی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی میللەتی عێراق، دەرگای ئازادی بۆ کاک هاشم کرایەوە و بەو ناوەی، کە جاران نوێنەری قوتابییانی کۆلێجی ئەندازیاری بووە لەگەڵ شاندێکی باڵای یەکێتیی گشتیی قوتابییانی عێراق وەک نوێنەری کورد لە شاندەکەدا لە سەرەتای مانگی ئەیلوولی ١٩٥٨دا گەشتێکیان بۆ (پەکین)ی پایتەختی چینی میللی بۆ بەشداریکردن لە کۆنگرەی گشتیی یەکێتیی قوتابییانی جیهان کرد. کە دەگەڕێتەوە

بەغدا لە کۆلێجەکەی خۆی، کۆلێجی ئەندازیاریی وەردەگیرێتەوە و دوا قۆناغی خوێندنی ئەو کۆلێجە تەواو دەکات. لە سەرەتای هاوینی ساڵی ۱۹٥۹دا بڕوانامەی بەکالۆریۆس لە ئەندازیاریی مەدەنی بەپلەی (شەرەف) وەردەگرێ و دەکەوێتە سەر ئیش و کاری سەربەست و قۆنتەرات گرتن. بەڵام ئەو ئازادییەی ئەندازیاری لێهاتوو هاشم عەبدوڵڵا زۆری نەخایاند و لە شوباتی ۱۹٦۳ و لە دوای کودەتا شوومەکەی ۸ شوباتی حزبی بەعسی فاشی خۆی و خاتوو (ساکینە)ی هاوسەری دەگیرێن. بەڵام دوای ماوەیەک بەردەدرێن و دەخرێنە ژێر چاودێریی پۆلیس تاکو مۆرکردنی رێککەوتننامەی ۱۱ی ئاداری ۱۹۷۰ی نێوان سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلوول و حکوومەتی بەغدا. ئینجا لە دوای کاک سەعدی محەمەد ئەمین دزەیی، لە رۆژی ۱۹۷۰/۸/۳دا دەکرێتە سەرۆکی شارەوانیی هەولێر و خزمەتێکی زۆری شارەکەی خۆی دەکات، گەلێک شەقامی تازە دروست دەکات و شەقامی تەسک فراوان دەکات، یەک لەوانە ئەو شەقامە سەرەکییە بوو کە لە فولکەی نیشتمان، نزیک بانکی رەشید بەبەردەم کۆنە یانەی فەرمانبەران (کە ئێستا تێکدراوە) لەلایەک و باخی شاریش لەلایەکی تر درێژ دەبێتەوە تاکو سەرەتای شەقامی شێخەڵڵا. گرنگییەکی تەواویشی بەباخچەی گڵکەند دا.

لەلایەکی تریش بووە خاوەن ئیمتیازی گۆڤاری هەولێر، کە خوالێخۆشبوو محەمەد مەولوود (مەم) سەرنووسەری بوو و زمانحاڵی شارەوانیی هەولێر بوو، بەزمانی کوردی و عەرەبی لە ساڵی ۱۹۷۰ تاکو ۱۹۷۲ دەردەچوو. جگە لە دەنگوباسی پرۆژەکانی شارەوانی و پەرەپێدانی قەڵای هەولێر تاکو ببێتە شوێنێکی دیاری گەشتوگوزاری و باسی خزمەتگوزارییەکانی دیکەی شارەوانیی دەکرد.

لە ژمارە (۲)ی (ساڵی ۱۹۷۱)یشەوە خۆی بووە بەرپرسی دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە، کە بەمجۆرە بوو:

١- هاشم عەبدوڵڵا- بەڕێوەبەری شارەوانی.
٢- مەجید عومەر حەسەن- ئەندازیاری شارەوانی.
٣- بیلال عەزیز- فەرمانبەری شارەوانی.
٤- پیربال مەحموود ئیبراهیم- فەرمانبەری شارەوانی.
٥- مەغدید سۆران- فەرمانبەری شارەوانی.

ئەم دەستەیە بەسەرۆکایەتیی بەڕێوەبەری شارەوانی، کاک هاشم عەبدوڵڵا کاروباری نووسین و چاپ و بڵاوکردنەوەی گۆڤارەکەیان بەباشی بەڕێوە دەبرد و کاروانی رۆژنامەنووسی کوردییان پێشخست.

لە پاش نسکۆی شۆڕشی ئەیلوول لە ۱۹۷٥/٤/۲۰ ئەو زاتە خزمەتگوزارە، لە سەرۆکی شارەوانیی هەولێر لادرا و کرا بە بەڕێوەبەری شارەوانییەکانی پارێزگای هەولێر، کە زانی لە سایەی حکوومەتی بەعسی فاشی کارەکەی وەک خۆی دەیویست بۆ ناکرێ، لە ۱۹۸۳/۲/۲۸دا خۆی خانەنشین کرد و زۆریشی پێ نەچوو لە ۱۹۸٤/۷/۲٦دا بەنەخۆشیی دڵ کۆچی دوایی کرد.

**کەریم شارەزا**

# عەبدولخالق مەعرووف
# ١٩٣٥- ١٩٨٥

مـێـژووی هەر نەتەوەیەک کۆمەڵێک ناوی گەشاوە و دیاری تێدا دەردەکەوێت، کە هەریەکە لە بوارێکی تایبەتدا جێگەی دەستی خۆیان لە مێژووی ئەو کۆمەڵەدا دیاری دەکەن، بەگوێرەی مێژووی کوردیش ئەو ناوە دیار و درەوشاوانە گەلێکن کە سەرباری بارودۆخی ناهەمواری کوردستان لە مێژووی دوورودرێژی رابردوودا ئەمان جێگای دیاریان گرتووە و ناشێت لە یادەوەریی نەوەکانی ئێستا و داهاتووشدا ناویان لە یاد بچێتەوە. یەکێک لەو ناوە گەشاوانەی مێژووی کورد، کە بە شەهیدی قەڵەم حساب دەکرێت، شەهید (عەبدولخالق مەعرووف)ە، راستە کورد لە مێژووی خەباتی خۆیدا بۆ ئازادی گەلێک شەهیدی داوە، بەڵام شەهید عەبدولخالق سەرباری ئەوەی کە کەسێتێکی نیشتمانپەروەر و داکۆکیکارێکی جەسووری مافە رەواکانی کورد



بوو، هەروەها قەڵەمێکی زانستی و داواکارێکی مافە راستەقینەکانی مرۆڤ بوو، لەو روانگەیەوە کە وای دەبینێ دەبێ مرۆڤ پێش هەموو شتێ وەکو مرۆڤ سەیر بکرێت و ئەو ئازادییانەی، کە بەرهەمی عەقڵی خۆین و بەدەستی هێناون، نابێت بەهیچ جۆرێک لێی داگیر بکرێت.

شەهید عەبدولخالق مەعرووف لە رۆژی ١/١/١٩٣٥ لە ناحیەی کەندیناوەی سەر بە شاری هەولێر لە بنەماڵەیەکی ئایینی هاتۆتە دنیاوە. باوکی مەلایەکی دیاری ناوچەکە بوو، پیاوێکی ئازا و قسەخۆش بوو، خاوەنی بیروباوەڕی نیشتمانی بوو. شەهید قۆناغی منداڵی هەر لەوێ بەسەر بردووە و ساڵی ١٩٤٤ لە هەمان شوێن خراوەتە بەر خوێندن و تا پۆلی پێنجەمی سەرەتایی خوێندووە. قسەیەکیش هەیە کە ماوەیەک لە عەوێنە خوێندوویەتی. لە ماڵی مەلا عەبدوڵلا و ئەو کاتەی ماڵیان لە سەید ئەمینی نزیک عەوێنە بووە. هەروەکو مامۆستا مەلا محەمەد ئیسماعیل لە وتاری یادی شەهیدبوونی عەبدولخالقدا وتی: پاشان باوکی لە قوتابخانە دەریدەهێنێت و دەیخاتە بەر خوێندنی ئایینی و ئەمجارە رێگای حوجرە و لای مەلاکان دەگرێتە بەر، بەشە سەرەتاییەکانی خوێندنی ئایینی لە کەندیناوە و ناوچەکانی

دەوروبەری تەواو دەکات. پاش ماوەیەک لەگەڵ کۆمەڵێک لە فەقێکانی کەندێناوە و شاری هەولێر، شەهید عەبدولخالق نزیکەی دووسەد ئیمزایان کۆکردەوە و وەکو داواکارییەک خستیانە بەردەم خوێندنگەی ئایینی، هەتا بەشێوەیەکی رەسمی ئەو خوێندنگایەیان بۆ بکرێتەوە و لە بری گەڕان بەدوای حوجرە و مەلاکاندا، خوێندکاری بواری ئایینی روو بکاتە خوێندنگایەکی رەسمی. هەر لەو کاتەوە دەردەکەوێت کە شەهید عەبدولخالق عەقڵی بەلای کاری دامەزراوەیدا چووە و ویستوویەتی شتەکان لە سنووری بڕیار و یاسا و پرەنسیپی ئیداری دیاریکراودا رێک بخرێن.

ئەم داواکارییەی شەهید عەبدولخالق و فەقێکانی تر بووە هۆی نارەزایی زۆرێک لە مەلاکانی ئەو کاتە و ئەو داواکارییەیان وەکو هەوڵێک بۆ بێکارکردنی خۆیان لێکدەدایەوە، بۆیە دەستەیەکی هەڵبژاردەیان بۆ رێگاگرتن لە جێبەجێکردنی ئەو داوایەی فەقێکان سەردانی پارێزگاری ئەو دەمەی هەولێریان کرد و هەوڵیان دا پارێزگار رازی بکەن بۆ ئەوەی داوای فەقێکان رەت بکاتەوە، کاتێ شەهید عەبدولخالق مەعرووف ئەم هەوڵەی مەلاکانی بۆ دەرکەوت، خۆی کە هێشتا لە تەمەنی مێردمنداڵیدا بوو سەردانی پارێزگار ئیسماعیل حەقی کرد و لەبارەی داواکارییەکەیانەوە بۆی دوا و گیروگرفتی فەقێکانی بۆ روون کردەوە، کە چۆن لە رێگای حوجرەکان و گەڕان بەدوای مەلاکاندا دووچاری نارەحەتی دەبن، پارێزگار کاتێ گوێی لە شەهید عەبدولخالق گرت، داواکەیانی بە رەوا زانی و پشتگیری لێ کردن. بێگومان ئەوەش لە ئەنجامی زیرەکی و لێهاتوویی شەهید عەبدولخالقەوە بوو بۆ چۆنێتیی خستنە رووی مەسەلەکە و شێوازی قسەکردنی بۆ قەناعەتهێنان بە پارێزگار.

دوای ئەوەی کە شەهید عەبدولخالق زانستە ئایینییەکانی خوێند و گەیشتە ئاستێکی دیاری شارەزایی لەو بوارەدا. بڕیاری دا بچێت بۆ میسر بۆ ئەوەی لە زانکۆی ئەزهەر درێژە بە خوێندن بدات. لە رۆژی ٢/٤/١٩٥٤دا، کە تەمەنی نۆزدە ساڵان بوو. چوو بۆ میسر و داواکاری پێشکەش بەو زانکۆیە کرد، بەڵام بەبیانووی نەبوونی بڕوانامەی رەسمی دان پێدانراو داواکەی پشتگوێ خرا و هەلی خوێندنی لەو زانکۆیە بۆ نەرەخسا. لەبەر ئەوە بەناچاری گەڕایەوە بۆ هەولێر و پاشان چووە بەغدا و لەوێ لەلای مامۆستایان محەمەد قزڵجی و عەلادین سەجادی... دەستی کردووە بەخوێندن.

لە پاش ماوەی دوو ساڵ درێژەدان بە خوێندن لە مانگی نیسانی ١٩٥٦دا. شەهید عەبدولخالق بەشداریی تاقیکردنەوەیەکی کرد، کە بۆ ئیمام تابووری بوو، لەو تاقیکردنەوەیەدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا و بوو بەئیمام تابوور لە سوپای عێراقدا. هەر لە هەمان کاتدا هەست و هۆشیاریی نەتەوایەتیی ئەم پیاوە نەمرە بەرەو پەرەسەندن دەچوو، هەر لەو ساڵەدا بوو بە ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان و درێژەی بە خەباتی کوردایەتیی خۆی دا لە ریزی ئەو پارتەدا و گەلێک کاری گرنگ و پڕ بایەخیشی بۆ بزووتنەوەی کوردایەتیی ئەنجام داوە، ماوەیەکی زۆر شەهید ساڵح یوسفی لە ماڵی ئەواندا ژیاوە، ئەوکاتەی لێپرساوی لقی (٥) بوو لە سەردەمی خەباتی نهێنی.

شەهید عەبدولخالق هەر لە تەمەنی لاوێتییەوە ئارەزووی زانست و زانیاری هەبوو. لە ساڵی ١٩٥٧دا دەستیدایە دروستکردنی جۆرێک لە ئێزگەی رادیۆ و لەم کارەشیدا بەردەوام بوو هەتا لە

ساڵی ١٩٦٠دا، کە ئەوکاتە لە بەغدا نیشتەجێ بوو، ئێزگەیەکی دروست کردبوو، لە کاتی ئیشپێکردنی ئێزگەکەیدا لە ڕێگای بەکارهێنانی رادیۆیەکی بچووکەوە ئەو مەودایەی تاقی دەکردەوە کە رادیۆکە دەیگەیشتێ.

لە ساڵی ١٩٦٣دا، شەهید عەبدولخالق بەغدای بەجێ هێشت و گەڕایەوە هەولێر، پاشان لە کۆیە پەیوەندیی کرد بەشۆڕشی کوردەوە و لەوێش کەڵکیان لە توانا و شارەزاییەکەی وەرگرت بۆ دامەزراندنی ئێزگەی شۆڕش، کە یەکەم جار لە ئەشکەوتی (ڕەش) لە ناوچەی (ژاژەڵە) ئەو ئێزگەیە دانرا و شەهید عەبدولخالق خۆی بەرپرس و سەرپەرشتیاری کاروباری تەکنیکی و هونەریی ئەو ئێزگەیە بوو.

لە ساڵی ١٩٦٧دا، لە کاتی گفتوگۆی نێوان حکوومەت و شۆڕشی ئەیلوولدا، شەهید عەبدولخالق کرایە بەڕێوەبەری گومرگی قەزای دوکان، لە کاتی بەرەو بە بنبەست گەیشتنی گفتوگۆدا شەهید عەبدولخالق لەلایەن ڕژێمەوە دەستگیر کرا و ڕەوانەی بەندیخانەی بەغدا کرا و لەوێشەوە گواسترایەوە بۆ مووسڵ، پاشان بارزانی برووسکەیەکی توندی بۆ حکوومەت نارد و داوای ئازادکردنی کرد. هەرکە ئازاد کرا، بە زوویی پەیوەندیی کردەوە بە شۆڕش.

دوای ڕاگەیاندنی بەیاننامەی ئاداری ١٩٧٠ لە نێوان حکوومەت و شۆڕشدا، شەهید عەبدولخالق گەڕایەوە هەولێر لە ١٩٧١/٥/١ شۆڕش ناردییە دەرەوە بۆ چیکۆسکۆفاکیا بەمەبەستی خوێندن لە بواری ئامێر و ئامرازە و ئەلیکترۆنییەکاندا لە کۆمپانیای (تێسلا). نزیکەی ساڵێک لەوێ مایەوە و بڕوانامەی دیبلۆمی لەو بوارەدا وەرگرت.

کە شەڕی نێوان شۆڕشی کورد و حکوومەت دەستی پێ کردەوە شەهید عەبدولخالق چووە چیا و لە ڕاگەیاندنی شۆڕش و بە تایبەتی لە کاروباری ئێزگەی شۆڕش کاری کرد. دوای هەرەس گەڕایەوە هەولێر و پاش ماوەیەک سەفەری ئەورووپای کرد.

لە ساڵی ١٩٧٦دا لە هەولێر دوکانێکی بۆ کاروباری تەکنیکی کردەوە و وەکالەتی ئەجهیزەی دەقیقەی وەرگرت. لەلایەک خەریکی کاروباری تەکنیکی و زانستی دەبوو لە دوکانەکەیدا، لەلایەکی تریشەوە ئەم دوکانەی کردبووە جێگای کۆبوونەوەی ڕۆشنبیران و نووسەران و بەردەوام دوکانەکەی جێگای گفتوگۆی ڕۆشنبیری و ئەدەبی و سیاسی بوو.

شەهید عەبدولخالق، جگە لە بواری زانستی، ڕۆشنبیرێکی خاوەن قەڵەم بوو، جگە لە زمانی عەرەبی، بەباشی خۆی فێری زمانی ئینگلیزی کردبوو، ئەوەش یارمەتییەکی باشی دابوو لە بواری نووسینی زانستیدا. شەهید عەبدولخالق خاوەنی سامانێکی زانستی دەوڵەمەند بوو، لەو کەسە دەگمەنانەی کوردیش بوو کە دەیتوانی بە زمانی کوردی ئەو زانیارییانەی خۆی دابڕێژێت و بیانخاتە بەرچاوی خوێنەرانی کورد.

شەهید عەبدولخالق لە بواری ئەدەبیشدا شارەزاییەکی باشی هەبوو بە تایبەتی لە شیعری کلاسیکی کوردیدا، هەر لەو بوارەدا کتێبێکی لەسەر ئەو ڕاوبۆچوونانە نووسیوە کە پێشتر لەسەر دیوانی نالی نووسراون.

لە بواری کۆمەڵایەتیشدا ڕوانینێکی وردی هەبوو، بە ئاشکرا جیاوازی و نایەکسانیی نێوان چین و توێژە کۆمەڵایەتییەکان و نێوان ژن و پیاوی دەبینی، ئەم ڕوانینەی خۆی سەبارەت بە شوێنی ژن لە ڕوانگەی ئیسلامەوە لە دوو توێی کتێبێکدا کۆکردەوە، کە

شارەزاییبوونی لە بواری شەریعەتی ئیسلامدا یارمەتیی زۆری دابوو بۆ لێکدانەوە و راڤەکردنی ئەو ئایەتانەی قورئان کە پەیوەندییان بە نەوە هەیە. پێش شەهیدکردنی ئەم کتێبەی بە ناونیشانی (ئادەمیزاد لە کۆمەڵی کوردەواری)دا بە چاپ گەیاند. ئەم کتێبە بووە مایەی نیگەرانبوونی زۆرێک لە دواکەوتوان و کۆنەپەرستان و هەندێکیان بەدەرچوون لە سنووری ئیسلام لێکیان دەدایەوە و نووسەرکەیشیان بەدژی ئایین ناو دەبرد.. هەر ئەم کتێبە بووە هی سەرەکیی شەهیدکردنی ئەم قەڵەمە دیارەی کورد.

عەبدولخالق مەعرووف لە پاش نیوەڕۆی رۆژی ١٠/٤/١٩٨٥دا لە کارێکی دژ بە هەموو دابونەریتێکی مرۆڤانە و ئایینییانەدا لە نزیک ماڵەکەی خۆی لە گەڕەکی ئازادی لە شاری هەولێر شەهید کرا. شەهیدکردنی عەبدولخالق مەعرووف کارێکی هێندە دزێو و ناشیرین بوو سەرجەم کۆمەڵانی خەڵک بە گشتی و قەڵەم بەدەستانی کوردی بەتایبەتی نیگەران و خەمبار کرد و هەواڵی ئەم کارە تیرۆریستییە بە هەموو کوردستاندا بلاو بووەوە و وەکو کارێکی زۆر ناهەموار دژ بە قەڵەمێکی نیشتمانپەروەری کورد لێک دەدرایەوە. لە چلەی ماتەمینی شەهید عەبدولخالق مەعروفدا هەڤاڵ مام جەلال وتارێکی پڕ بایەخی خوێندەوە کە تیایدا باسی هەڵوێستی زانستی و نیشتمانی و نەتەوەیی شەهید عەبدولخالقی کرد و وەکو قەڵەمێکی بوێر و تێکۆشەرێکی کۆڵنەدەر و ئازادیخوازییەکی جەسووری دایە قەڵەم و دەڵێت: "عەبدولخالق مەعرووف پیاوێکی دڵسۆز بوو، خاوەنی را و هەڵوێست بوو، زیاتر لە سی ساڵ خەباتی کرد، دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلوولی چوو بۆ ئەورووپا و بەشداریی پێکهێنانی لیژنەی ئەورووپای یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی کرد. پاش گەڕانەوەشی بۆ هەولێر هەر بە دڵسۆزی مایەوە بۆ شۆڕش. ژیانی عەبدولخالق مەعرووف ژیانێکی شۆڕشگێڕانە بوو، هەمیشە دڵسۆز بوو بۆ کورد و کوردستان..." (بەمجۆرە هەڤاڵ مام جەلال شەهیدکردنی عەبدولخالق مەعرووفی وەکو زیانێکی گەورە بۆ میللەتەکەمان لێکدایەوە و بکوژانیشی ریسوا کرد).

شەهید عەبدولخالق مەعرووف لە ریزی پێشەوەی شەهیدانی قەڵەمی مێژووی ئێمەدا ناوێکی درەوشاوەیە و هەڵوێست و کار و بەرهەمەکانی ناسنامەی نەمرییان پێ بەخشیوە و لە مێژووی داهاتووی ئێمەدا ناوی شەهید عەبدولخالق و شەهیدەکانی تری قەڵەم هاوشان لەگەڵ ناوی سەرجەم شەهیدانی رێگای رزگاری کوردستاندا بە گەشاوەیی دەمێننەوە.

شەهید عەبدولخالق مەعرووف لە دوای خۆی کۆمەڵێ بەرهەمی بەنرخی بۆ کتێبخانەی کوردی بەجێ هێشتووە، کە بریتین لە:

١- ئەنتینا کە کتێبێکی زانستی تەکنیکییە لە ساڵی ١٩٧٧دا بە چاپی گەیاندووە.

٢- تەکنیکار، کتێبێکی زانستی تەکنیکییە لە ساڵی ١٩٨١دا بە چاپی گەیاندووە.

٣- دیوانی نالی و کێ راستە، کتێبێکی لێکۆڵینەوەیە لە ساڵی ١٩٨٤دا بە چاپی گەیاندووە.

٤- ئادەمیزاد لە کۆمەڵی کوردەواریدا، لێکۆڵینەوەیە لە ساڵی ١٩٨٤ بە چاپی گەیاندووە.

٥- اجهزة الارسال، زانستی تەکنیکییە بە زمانی عەرەبی لە ساڵی ١٩٧٩دا بە چاپی گەیاندووە.

**لە بلاوکراوەی (رۆڤار)ی دەزگای چاپ و بەخشی سەردەم وەرگیراوە**

# مەلا محەمەدی عەلیاوەیی
# ١٩١٩-١٩٨٥

رەئووف محەمەد سالح

لەم دواییەدا دەستی ئەجەل گەیشتە زانایەکی ئایینیی بەناوبانگ و قسە خۆش، کە لە رۆژی ٢٠/١٠/١٩٨٥دا لە نەخۆشخانەی کۆماریی هەولێر بە هۆی نەخۆشییەکی کتوپڕەوە کۆچی دوایی کرد.

ئەم زاتە، ناوی مامۆستا مەلا محەمەدی عەلیاوەییە، لە ساڵی ١٩١٩دا لە گوندی گردعازەبانی سەر بە ناوچەی قوشتەپە چاوی بە ژیانی پڕ لە ئێش و ئازاری نەتەوەکەیی هەڵهێنا، مەلا محەمەد سەر بە تیرەی سنجاوییە و لە بنەماڵەیەکی ئیمانداری کوردی هەژارە و بە جووتیاری و کشتوکاڵی ژیاون، بە رەگەز و بنەماڵە دەگەڕێنەوە سەر دێی عەلیاوە، بۆیە هەر بە مەلا محەمەدی عەلیاوەیی ناسرابوو.

مامۆستا لە شەش ساڵیدا لە گوندی عەلیاوە نراوەتە بەر خوێندنی حوجرە و لەلای مامۆستای ناودار "مەلا حەمەد



ئەمین کارەشی" قورئانی پیرۆزی خوێندووە.

دوای ماوەیەک خوالێخۆشبوو لەبەر دەستکورتی و بێ دەرامەتی وازی لە خوێندن هێناوە و وەک هەموو زەحمەتکێشێکی ئەم کوردستانە رووی کردۆتە کار و فەرمانی جووتیاری و سەپانی، لەگەڵ ئەو هەموو ماندووبوونە و ئارەقرشتنە، هەر ئارەزوومەندی خوێندن بووە، بۆیە دوای ئەوەی کە تەمەنی دەگاتە (١٥) ساڵ، رۆژ لە دوای رۆژ ئارەزووی خوێندنی زیاتر دەبێ، تا رۆژێ لە دروێنەکردن دەبێت و بیری خوێندن زاڵ دەبێ و وای لێ دەکات کە بێ ئاگاداری ماڵەوەیان بۆ گوندی شیوەبیرانی سەر بە ناوچەی شارە جوانەکەی حاجی قادری کۆیی رابکات، لەوێ دەچێتە لای فەقێ کەریم قادری برادەری، کە ئەویش خەڵکی گوندی عەلیاوە بوو و لەلای مەلای گوندەکە مامۆستا مەلا ئەحمەدی خەلیفە دەخوێنێ، دەست دەکات بە خوێندنی کتێبی (عەواملی جورجانی)، ئینجا ئیتر دەستی کرد بە خوێندن و لای چەندەها مامۆستای بەناوبانگ و ناودار دەرسی خوێندووە، نموونەیان ئەم زانایانەن: (مامۆستا مەلا حوسێنی موفەسیر، شاعیری بیرناسک و زانا مامۆستا مەلا خەلیل سنجاوی "موخلص"، مەلا شەریف زادە مەلا ئەحمەدی رەش، مەلا مەعسومی مەلا خدر هەورامی، مەلا سادق دایە خەجێ، مەلا محەمەدی شێروانی، مەلا

ئیسماعیل دیبەگە، مەلا عەبدولكەریم، مەلا ئەسعەدی خەیلانی، مەلا عومەری چێلەبەشەیی و گەلێ زانای ناوداری دیكە لە كوردستان.

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە لەگەڵ خوێندندا كاری دروێنە و جووتی هەر كردووە، بۆ ئەوەی بتوانێ لەبەر دەستكورتی و هەژارییان یارمەتیی ماڵی باوكی بدات. خوالێخۆشبوو (١٦) ساڵی بێ وچانی خوێند هەتا بە ئامانجی خۆی گەیشت و لە ١٧/١٠/١٩٤٩دا ئیجازەی مەلایەتیی لە شارە جوانە خنجیلانەكەی كوردستان شاری پاشای گەورە ڕەواندز لای ماموستای زانای ئایینی بەناوبانگ مامۆستا عەبدولكەریم مەلا ئەسعەدی خەیلانی وەرگرت، دوای ئیجازە وەرگرتنی، دەستی كردووە بە مەلایەتی لە گوندەكانی كوردستاندا و لە گوندی پەنجا عەلی سەر بە شاری كەركووك و گردعازەبان و گردە قوشنەی سەر بە ناوچەی قەراج هەمیشەش ئەو مزگەوتانەی ئەو مەلایەتی تیا كردووە بوونەتە قوتابخانە و چەندەها فەقێ دەرسیان تێدا خوێندووە.

لەبەر دەستكورتی و بێ دەرامەتی لە ساڵی (١٩٦٠) بووەتە مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی و دەرسی ئایینی و ڕێزمانی كوردی و عەرەبی لە زۆربەی گوندەكانی پارێزگای هەولێری دێرین وتۆتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەر بەردەوام دەرسی ئایینیی لە مزگەوتەكاندا بە فەقێیەكانی وتۆتەوە، لە پاش (٢٠) ساڵ هەوڵ و كۆششی دڵسۆزانە و پێگەیاندنی ڕۆڵەی ئەم میللەتە، لە ساڵی (١٩٨٠)دا خانەنشین (تەقاویت) بووە، دوای ئەوەش هەرگیز كاتی تەمەنی خۆی بە فیڕۆ نەداوە و هەر بەخزمەتكردنی ئایین پاكی ئیسلام و نەتەوەكەی خەریك بووە و چەندەها نووسینی دوای خۆی بەجێ هێشتووە، خوالێخۆشبوو بە درێژایی ژیانی دڵی كەسی نەڕەنجاندووە، هەمیشە خۆشەویست بووە و پێكەنین سەر زاری بەرنەداوە.

نەرمونیان و دەروون فراوان بووە، مەجلیس خۆش بووە، هەر كۆڕ و مەجلیسێك ئەوی تێدا بووایە، ئەوا هەردەم بە قسەی خۆش و نوكتە و قسەی نەستەق تەواو دەبوو، دوور بوو لە باس و بوختانكردنی خەڵكی... لە ڕێزی خەڵكیدا خۆشەویست بووە، خوالێخۆشبوو وەك زانای بەناوبانگ مامۆستای كۆچكردوو (عەلائەدین سجادی) دەفتەری قسەی خۆش و كەلەپووری ئەو بوارەی نەتەوەكەمان بووە، لەم ڕووەوە دەسنووسێكی لە ژێر ناوی (بەسەرهاتی ڕۆژانەی كوردەواریدا) لە (٨) بەرگدا بەجێ هێشتووە، لە بواری شیعریشدا دوانەكەوتووە و دیوانێكی شیعری دەستنووسیشی جێ هێشتووە، نووسینەكانی ئەمانەن، كە نووسینی وای تێدایە ٤٠ ساڵ زیاتر خەریكی بووە، بەو ئومێدەی بە چاپ بگەیەنرێن و كەلێنێك لە كتێبخانەی كوردی پڕ بكەنەوە. ئەمەش نموونەی نووسراوەكانیەتی:

١- ساڵنامە و فۆلكلۆری كوردی (٢) بەرگە.
٢- بەسەرهاتی ڕۆژانەی كوردەواری (٨) بەرگە.
٣- دیوانی شیعر.
٤- حەجنامەی كوردی.
٥- فەقێیاتی لە كوردستان (چاپ كراوە).
٦- بەسەرهاتی ژیانی خۆی (مذكرات).
٧- كۆكردنەوە و ڕێكخستنی غەزەواتی (رأس الغول بەهنەسا).
٨- مصباح الظلام للحجاج الكرام (٢) بەرگە بە عەرەبی.
٩- مصباح الطالب في جميع المطالب في علم النحو "بەعەرەبی".
١٠. كۆمەڵێك وتاری ڕۆژانەی هەینی بە عەرەبی و كوردی.
١١- فتاوي العلياوي في الشريعة السماوي (٢) بەرگە بە عەرەبی.
١٢- وريقات محمد بن علي العلياوي علي تعليقات القزلجي علي تصريف الأشنوي ملا علي.

# یووسف دەرگەڵەیی
# ١٩٤٣-١٩٨٥

خەباتگێڕی شەهید، پەروەردەکار و نووسەری خامە ڕەنگینی کورد یووسف حەمەد دەرگەڵەیی لە ساڵی ١٩٤٣دا لە شاری هەولێر لە خێزانێکی هەژار هاتۆتە دنیاوە. لە ساڵی ١٩٤٩دا چۆتە قوتابخانەی سەرەتایی و هەموو قۆناغەکانی تاکو خوێندنی خانەی مامۆستایانی سەرەتایی لە ساڵی ١٩٦٥دا لە شاری هەولێر تەواو کردووە و بەمامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی دامەزراوە، مامۆستایەکی پەروەردەکار و زانای لێهاتوو بوو، پیشەکەی خۆی لا پیرۆز بوو، بەخەباتێکی نیشتمانیی دادەنا، چونکە لە قۆناغی خوێندنی ناوەندییەوە مێشکی بەبیروباوەڕی پێشکەوتنخواز و کوردایەتیی ڕاستەقینە ئاودرا بوو. لە (١٩٥٦)ەوە بووبووە ئەندامێکی چالاکی ڕێکخراوی یەکێتیی قوتابییانی کوردستان. لە ساڵی ١٩٦١یشەوە چووەتە خانەی ڕێکخستنەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان و بەنهێنی خەباتی سیاسیی کردووە، کە چووەتە خانەی مامۆستایانی هەولێر، بووەتە لێپرسراوی دووەمی لیژنەی پیشەیی قوتابییانی پارتی دیموکراتی. لە دوای بوونی بەمامۆستا لە ساڵی ١٩٦٥دا وەک کادیرێکی بەتوانای پارتی کاری حزبایەتی بەجێ هێناوە. لە دوای ڕێککەوتننامەکەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ و کردنەوەی لقی هەولێری یەکێتیی نووسەرانی کورد، لە دەستەی دووەمی بەڕێوەبردنی ئەو لقە بەئەندام هەڵدەبژێردرێ و خزمەتێکی زۆری بزووتنەوەی ئەدەبی لە هەولێردا دەکات، لەگەڵ کەریم شارەزا و ئەحمەد شەریفدا کتێبی گفتوگۆیەکی ئەدەبی لەگەڵ بورهان جاهیددا لە ساڵی ١٩٧٣دا بەچاپ گەیاند.

ئەم ئەدیبە ڕووناکبیرە هۆشیارە لە کۆڕ و سیمینارەکانی یەکێتیی نووسەرانی کورد گەلێک لێکۆڵینەوەی ئەدەبی و مێژوویی پێشکەش بەجەماوەری کرد و لە بواری ڕەخنەی ئەدەبیش گەلێک سەرنج تیژ و بەتوانا بوو.

مامۆستا یووسف دەرگەڵەیی خەباتگێڕێکی دڵسۆزی کێشەی ڕەوای کورد بوو، بۆیە کە لە ساڵی ١٩٧٤دا شۆڕشی کورد دەستی پێ کردەوە، فەرمانەکەی خۆی بەجێ هێشت و چووە ریزی پێشمەرگە جەنگاوەرەکانی کوردستان و تاکو نسکۆی شۆڕشەکە بەکاریگەریی پەیمانە شوومەکەی ٦/٣/١٩٧٥ی جەزایر. ئینجا لەگەڵ دەرچوونی لێبووردنی گشتی، شۆڕشی ئەیلوول گەڕایەوە هەولێر، بەڵام دەستی لە خەباتی نهێنیی خۆی هەڵنەگرت و لە ساڵی ١٩٨٤دا بەنهێنی بەشداریی لە کۆنفرانسێکی یەکێتیی نیشتمانیدا کرد و دەورێکی باشی لە ڕێکخستنەکانی ناو شاری هەولێر، بینی تاکو پیاوانی ڕژێمی بەعسی فاشی هەستیان بەو چالاکییەی کرد و چوون لە ماڵەکەی خۆی لە گەڕەکی ڕووناکی هەولێر گرتیان و ئەشکەنجەیەکی زۆریان دا تاکو نهێنیی حزبەکەی بدرکێنێ، کەچی قارەمانانە خۆی ڕاگرت و ئەو دوژمنانەش لە ژێر دار و ئەشکەنجەدا شەهیدیان کرد، لە ڕۆژی ٢٨/٥/١٩٨٥دا شەهیدکردنەکەی ئاشکرا بوو.

**کەریم شارەزا**

# مستەفا عوزێری
# ١٩١٨-١٩٨٥

**کەریم شارەزا**

مستەفا عوزێری کوڕی محەمەد ئاغای کوڕی تەها ئاغای کوڕی فەتحوڵلا ئاغای عوزێری لە مانگی تشرینی دووەمی ١٩١٨دا لەگەڵ کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانیدا لە گەڕەکی سەرای قەڵای هەولێر لەدایک بووە. لە ساڵی ١٩٢٥دا بنچینەی خوێندنەوە و قورئانی پیرۆز فێر بووە. ئینجا لە ساڵی ١٩٢٨دا چووەتە بەر خوێندنی ڕەسمی و لە پۆلی دووەمی سەرەتایی دانراوە، هەموو ساڵێک بەزیرەکی دەرچووە، تاکو لە ساڵی ١٩٣٣دا چووەتە خوێندنگای ناوەندیی هەولێرو لە کەرکووک دوا ساڵی ئەو قۆناغەی تەواو کردووە. لە ساڵی ١٩٣٨یشدا خوێندنی ئامادەیی لە شاری بەغدا لە (ئامادەیی مەرکەزی)



تەواو کردووە. لە پایزی هەمان ساڵدا لە کۆلیجی حقووق وەرگیراوە و لە ساڵی ١٩٤٢دا بڕوانامەی دەرچوونی لە حقووق وەرگرتووە و بووەتە یاساناسێکی پسپۆر.

لە ساڵی ١٩٤٣دا دەکرێتە بەڕێوەبەری ناحیەی باتووفە لە بادینان، ئینجا گوێزراوەتەوە بۆ ناحیەی گەلاڵە. لە کاتی هەڵگیرساندنی شۆڕشی ساڵی ١٩٤٣-١٩٤٥ بارزان لە خۆراکی تەموین یارمەتییەکی باشی بارزانییەکان دەدات و لەسەر ئەو هەڵوێستەی دووری دەخەنەوە بۆ ناحیەی سەنگەسەر، دوای ماوەیەک لەسەر هەڵوێستی نیشتمانی دوور دەخرێتەوە بۆ ناحیەی (عین تەمر) لە پارێزگای (کەربەلا). بەڵام دوای چەند مانگێک دەست لە فەرمانەکەی هەڵدەگرێ و دەگەڕێتەوە هەولێر و چەند ساڵێک پارێزەری لە دادگای هەولێر دەکات. ئینجا بەیاریدەدەری سەرۆکی تەسویە دادەمەزرێ و هەموو ناوچەی خۆشناوەتی تەسویە دەکات و هەر خاوەن موڵکە مافی ڕەوای خۆی پێ دەدات.

لەگەڵ بەرپابوونی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨دا و هەڵوێستی سیاسی و نیشتمانی لە ساڵی ١٩٥٩دا دەکرێت بە بەڕێوەبەری گشتیی پاوانکردنی تووتن لە بەغدا، تا دەگاتە ساڵی ١٩٦٣ و لەگەڵ هاتنی بەعسییەکان بۆ سەر حوکمی عێراق مانگێک دەگیرێ و لە کارەکەی لادەدرێ. بەڵام لە دوای نەمانی حوکمی بەعس لە ساڵی ١٩٦٤دا دەکرێت بە (سەرۆکی تەسویە) لە پارێزگای هەولێر تاکو ساڵی ١٩٧٠ ئینجا خۆی خانەنشین دەکات و بەئازادی دەژی تاکو لە ١٢/٧/١٩٨٥دا کۆچی دوایی دەکات لە گۆڕستانی بنەماڵەکەیان لە تەنیشت مزگەوتی شێخ ئەبوبەکری نەقشبەندی دەنێژرێ.

مستەفا عوزێری، خەباتگێڕی پێشەنگی بزووتنەوەی کوردایەتی بوو. لە دوا دوای سییەکانی سەدەی بیستەم تاکو ناوەڕاستی چلەکانی ئەو سەدەیە دەورێکی کاریگەریی هەبووە لە بزووتنەوەی نیشتمانی کوردیدا، بۆ سەلماندنی ئەم رایەمان، با سەرنجێک بدەینە وتەیەکی مامۆستای کۆچکردوو ساڵح حەیدەری تا لە دەوری ئەو پێشەنگە بگەین کە دەڵێ:

(لە کۆتایی ساڵی ١٩٨١دا چاوم بەپارێزەر مستەفا عوزێری کەوت و لەبارەی دامەزراندنی رێکخراوەکانی (دارکەر) و (هیوا) گوتی: "سەرچاوەی دامەزراندنی (هیوا) شاری هەولێر بوو، کۆمەڵێ قوتابی خاوەن بیروباوەڕی نەتەوەیی بڕیاریان دا رێکخراوێکی نەتەوەیی دابمەزرێنن و لە سەرەتادا ناویان نا (دارکەر) و پاشان پەرەی سەند و ناونرا (هیوا)"

دوای ئەمە پارێزەر مستەفا عوزێری گوتی: "دامەزرێنەرانی (هیوا) ئەمانە بوون: (مستەفا عوزێری) یونس رەئووف (دڵدار)، جەلال قادر، مووسا سەمەد، ئیحسان حاجی ئەحمەد باخچەچی و هەندێ ئەندامی چالاکی دیکەی وەک رۆستەم جەبار. ئەم دامەزرێنەرانە چاویان بەرەفیق حیلمی کەوت بۆ ئەوەی بیکەن بەسەرۆکی خۆیان. واتە: سەرۆکی (حزبی هیوا)، چونکە ئەوانە هەموویان لاو بوون و لە ناو کورددا نەناسراو بوون و پێویستیان بەسەرۆکێکی ناسراوی خاوەن رابردوویەکی نەتەوەیی خاوێن هەبوو. (رەفیق حیلمی)یش بەم پێشنیازە قایل بوو، بەمەرجێ سەرکردەی حزبەکە بێ و ناوەکەشی لە (دارکەر)ەوە بکرێت بە (هیوا)".

لێرەدا بۆمان دەرکەوت کە مستەفا عوزێری دەورێکی پێشەنگی بووە لە دامەزراندنی (کۆمەڵەی دارکەر) و (حزبی هیوا)، کە حزبی (هیوا)ش لەساڵی ١٩٤٤ کز بوو. ئەم تێکۆشەرە چووە پاڵ (حزبی رزگاری کوردستان)، کاتێکیش کە لە ١٦/٨/١٩٤٦دا پارتی دیموکراتی کوردستان دامەزرا، دیسان مستەفا عوزێری وەک ئەندامێکی چالاک ئیشی تێدا کرد.

مامۆستا مستەفا عوزێری لە خەباتی نیشتمانیدا نازناوی حزبی (دلاوەر) بوو، دەیویست لەو مەیدانە پڕ شانازییە دلاوەر و قارەمانی تێکۆشان بێ. لەگەڵ دۆست و هاورێکانیدا گەلێک دڵسۆز بوو، تا دوا هەناسەی یونس دڵدار (١٩١٨-١٩٤٨)، هاورێی کاروانی خەباتی بوو، لەگەڵ جەلال قادر و رۆستەم جەباریش هاورێی کاروانی ژیانیان بوو.

# عیزەدین فەیزی
# ١٩١٧-١٩٨٥



**کەریم شارەزا**

عـــیزەدین فـــەیزی، لە ســـاڵی ١٩١٧دا چاوی بەژیان هەڵێناوە، لە شاری هەولێر پەروەردە بووە و چۆتە بەر خوێندنی قوتاغی سەرەتایی و لە پۆلەکانی پێنجەم و شەشەم. مامۆستا کوردپەروەرەکانی تۆوی کوردایەتییان لە مێشکیدا چاندووە، خوێندنی ناوەندیشی هەر لە هەولێر تەواو کردووە و چووەتە بەغدا لە خانەی مامۆستایانی سەرەتایی وەرگیراوە، دوای سێ ساڵ دەرچووە و لە پایزی ١٩٣٩دا بە مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی دامەزراوە، لە ساڵی خوێندنی ١٩٤٦-١٩٤٧ دەکرێتە بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەرەتایی یەکەمی هەولێر و هەوڵێکی زۆر دەدات کتێب بەزمانی کوردی بۆ قوتابییەکانی دابین بکات.

کاتێک کە کۆمەڵەی مامۆستایان لە هەولێر دامەزرا و هەڵبژاردن کرا مامۆستا عیزەدین بەسەرۆکی ئەو کۆمەڵەیە هەڵبژێردرا. هەوڵێکی زۆریشی دا بۆ دەرچواندنی ڕۆژنامەیەکی هەفتەیی بەزمانی کوردی و عەرەبی لە شاری هەولێر. وا بوو لە ١٦/١٢/ ١٩٥٠دا ئەو ڕۆژنامەیە بەناوی (هەولێر) یەکەم ژمارەی لێ بلاو کرایەوە و بەشێکی بەزمانی عەرەبی بوو، بەڵام کوردییەکەی زیاتر بوو و هەمووی تەرخان کرابوو بۆ پەروەردەی قوتابی و ئەدەب و زمان و ڕۆشنبیریی کوردی و ئەو سەرپەرشتی دەکرد.

کاتێکیش ئەم زاتە کرا بەسەرپەرشتیاری پەروەردەیی، لە هەموو سەردانەکانی بۆ قوتابخانە سەرەتاییەکانی پارێزگای هەولێر هەر پێی لەسەر پێشخستنی خوێندن بەزمانی کوردی دادەگرت، کە شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨یش بەرپا بوو، یەکێک بوو لە داواکارانی دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی خوێندنی کوردی. لە دوای ڕێککەوتننامە مێژووییەکەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ش دا دەورێکی باشی گێڕا لە پەرەپێدانی خوێندنی کوردی، بەتایبەتی کە بووە سەرپەرشتیاری یەکەمی پەروەردەی پارێزگای هەولێر. کاتێکیش چووە ئەمینداریتیی گشتی پەروەردەی کوردستان، وەک سەرپەرشتیاری تایبەتی ناوچەی کوردستان هەوڵێکی زۆری دا پرۆسەی خوێندنی کوردی لەبەر تەوژمی (تەعریب) نسکۆ نەهێنێ، کە زانی هەوڵەکانی ناگەنە ئەنجام خۆی خانەنشین کرد و خەریکی نووسینەوەی یادداشتەکانی خۆی بوو تاکو لە ڕۆژی ٢٢/١٢/١٩٨٥دا بەنەخۆشیی شێرپەنجە لە شاری هەولێر کۆچی دوایی کرد، هەر ئەو ڕۆژە بەڕێزێکی زۆرەوە بەئامادەبوونی ئەدیب و هونەرمەند و مامۆستایانی هەولێر بەخاک سپێردرا.

**عیزەدین فەیزی و بزووتنەوەی نووسەرانی کورد:**

مامۆستا عیزەدین فەیزی ڕۆژنامەنووس و نووسەرێکی دڵسۆزی نەتەوەکەی بوو لە پاش دامەزراندنی یەکێتیی نووسەرانی کورد لە ١٠/٢/ ١٩٧٠دا بووە ئەندام لەو ڕێکخراوە ئەدەبییەی کورد و لە کۆنگرەی دووەم و چوارەم و پێنجەمی ئەم یەکێتییەدا بەسەرۆکی دەستەی بەڕێوەبەری کاروباری کۆنگرەکان هەڵبژێردرا و بەچاکی کار و ئەرکەکانی خۆی ئەنجام دا. لەگەڵ بەستنی کۆنفرانسی دووەمی یەکێتیی نووسەرانی کورد- لقی هەولێر لە ساڵی ١٩٧١دا بەسەرۆکی دەستەی بەڕێوەبەری لق هەڵبژێردرا و دەورێکی باشی هەبوو لە دەرچواندنی گۆڤاری (نووسەری نوێ)ی زمانحاڵی لقی یەکێتیی نووسەران لە هەولێر. لە ساڵی (١٩٧٢)شدا دووبارە بەسەرۆکی لقی هەولێر هەڵبژێردرایەوە، لە کۆنگرەکانی پێنجەم و شەشەمی یەکێتیی نووسەرانیش، کە لە هەولێر و بەغدا بەستران بەجێگری سەرۆکی یەکێتیی نووسەرانی کورد هەڵبژێردرا.

لەگەڵ دەست پێکردنەوەی شەڕ لە کوردستان لە بەهاری ١٩٧٤دا چالاکی لقی یەکێتیی نووسەران لە هەولێر پتر لە ساڵ و نیوێک ڕاوەستا، تاکو دوای نسکۆی شۆڕش. ئینجا بەهەوڵ و کۆششی مامۆستا عیزەدین و جەلال مەدحەت خۆشناو و کەریم شارەزا لقەکە بووژایەوە. دیسان مامۆستا عیزەدین بەسەرۆک هەڵبژێردرایەوە و خزمەتێکی زۆری بزووتنەوەی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی کرد بەدەیان کۆڕ و کۆبوونەوەی ئەدەبی لە سەردەمی سەرۆکایەتیی ئەو لە هەولێر ساز دران.

مامۆستا عیزەدین فەیزی کەسایەتییەکی کۆمەڵایەتی و نیشتمانی بوو، لەگەڵ دروستبوونی حزبی هیوا لە ١٩٣٩دا بووە ئەندام لەو حزبە و لە ساڵانی ١٩٤٠-١٩٤٢ بووە بەرپرسی لقی هەولێری حزبی هیوا، کاتێکیش پارتی دیموکراتی کوردستان دامەزرا، بووە لایەنگرێکی دڵسۆزی ئەو حزبە نەتەوەییە دیموکراتییەی کورد.

مامۆستا عیزەدین کەسایەتییەکی خۆشەویست بوو لە شاری هەولێر، چونکە تێکۆشەرێکی کۆنی ڕێبازی کوردایەتی بوو، بۆیە کابینەی سێیەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان پەیکەرێکی لێوەشاوەی بۆ دارشت و لە چوارڕیانێکی سەرەکیی شارەکەی هەولێری دانا.

# شێخ مستەفای نەقشبەندی
# ١٨٨٨-١٩٨٦

کەریم شارەزا



زانای مەزنی ئایینی و شێخی ڕابەری ڕێبازی تەسەوفی نەقشبەندی شێخ مستەفای کوڕی شێخ ئەبوبەکری نەقشبەندی هەرشەمی ناسراو بە (کەمالەدین) لە ساڵی ١٣٠٥ی کۆچی بەرامبەر بە ١٨٨٨ی زایینی لە گوندی هەرشەم لە بنەماڵەیەکی زانست و ئایینپەروەر لەدایک بووە. لەسەر دەستی باوکی هەموو جۆرە زانستێکی عەقڵی و نەقڵی فێر بووە، ئیجازەیەکی گشتی زانستی لێ وەرگرتووە، لەگەڵ ئیجازەیەکی تایبەتی لە زانستی ڕۆحیدا و ڕێگەی داوە ڕابەری تەسەوفی ڕێبازی نەقشبەندی بکات.

لەو ماوەیەی کە باوکی چووەتە گەشتەکانی میسر و شام و حیجاز و حەجکردنی و مانەوەی لە مەککەدا، بەشێکی زۆری لە زانستی مەنتیق و هونەری ڕەوانبێژی لەسەر دەستی شێخ ئیبراهیم دۆغرەمەچی شاگردی زیرەکی باوکی فێر بووە. لەلای زانای بلیمەتی کوردیش مەلا عەلی حیکمەت سیا مەسنووری زانستی مەنتیقی تەواو کردووە و زانستی (کەلام) و (شەرحی عەقائید)یش فێر بووە. هەر لە سەردەمی ژیانی باوکیشیەوە ڕێگای دراوە ئیرشادی خەڵکی بکات بۆ ڕێبازی نەقشبەندی. بەڵام لە ساڵی ١٣٣٣ی ڕۆمی بەرانبەر ١٩١٧ی زایینی لە ئیرشادکردنی خەڵک بۆ ڕێبازی نەقشبەندی هەر خۆی بەرپرسیار بووە.

شێخ مستەفای زانا لە پێش ساڵی (١٩٠٨)ەوە دەستی بەدەرس گوتنەوە کردووە، لە دوای کۆچی دوایی باوکیشی لە ساڵی ١٣٢٩ی کۆچی بەرامبەر بە ١٩١١ی زایینی، هەر بەردەوام بووە لە زانست وەرگرتن و چووە دەرسی (هەیئەت و فەلەک)ی لەسەر دەستی زانای گەورەی کورد مەلا ئەبوبەکری کوڕی حاجی مەلا عومەر ئەفەندی ناسراو بەمەلافەندی (١٨٦٣-١٩٤٢) خوێندووە و بووەتە مەلایەکی زانای مەزنی کورد و شێخێکی ڕابەری گەورە و گرانی ڕێبازی نەقشبەندی.

ئەو زانایە چەند زمانێکی وەکو کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی بەئەدەبیاتەوە دەزانی. گەلێک پەراوێز و تەعلیقاتی لەسەر بابەتی کتێب و سوننەت و ڕێبازی تەسەوف نووسیوە و هەندێ سوورەت و ئایەتی قورئانی پیرۆزیشی تەفسیر کردووە. وەڵامی گەلێک پرسیاری شەرعی لە چەند نامیلکەیەکدا نووسیوە.

شێخ مستەفا لە ماوەی ژیانی مەلایەتی و شێخایەتیدا گەلێک مەلا و زانای ئایینی ئیجازە داوە بۆ ئیرشادکردنی خەڵک.

**لەو خەلیفانەی ئیجازەی داون ئیرشاد بکەن ئەمانەی خوارەوەن:**

١- سەید عەبدوڵلای نۆغەرانی. ٢- شێخ جوبرائیلی گاینجی. ٣- شێخ مەحموودی ڕەش. ٤- شێخ مستەفای خۆرانی. ٥- مەلا عەبدوڵلای تەرجانی. ٦- مەلا ئیسماعیل ناقس. ٧- مەلا محەمەدی باقرتەیی. ٨- ئەحمەدی عەلیاوەیی. ٩- ئەحمەد خەلیفە. ١٠- شێخ حاجی شەریف. ١١- مەلا خەلیلی (موخلیس)ی شاعیری ناسراو.

**لەوانەی ئیجازەی زانستی کیتاب و سوننەشی پێ داون:**

١- شێخ عەبدوڵلای تەرجانی. ٢- شێخ ئیسماعیل کۆیی. ٣- شێخ عەبدوڵلای شێخ ئیسماعیل سکتانی. ٤- شێخ عەبدوڕەحمانی لاڵ. ٥- شێخ شەریفی خانەقا. ٦- شێخ سولەیمانی سووسێ. ٧- شێخ عەبدوڵلای بەحرکەیی. ٨- دوکتۆر عەبدوڵلای نەقشبەندی کوڕی. ٩- شێخ محەمەد عەلی سەنگاوی و گەلێکی دی.

ئەم زاتە مەزنە لە شەوی ١٤ لەسەر ١٥/ی مانگی شوباتی ١٩٨٦دا لە تەمەنی ٩٨ ساڵیدا هەر لە هەولێر کۆچی دوایی کرد و لە مزگەوتی شێخ ئەبوبەکری نەقشبەندی بەڕێزێکی زۆرەوە بەخاک سپێردرا.

# شەهید سۆران
# (عبدالمسیح بولص صلیوە یلدە)
# ١٩٥٥ -١٩٨٦

**خالید جووتیار**

شەهید سۆران، ناوی: عەبدولمەسیح بولص صلیوە یلدە، لە ساڵی ١٩٥٥ لە عەنکاوە لەدایک بووە، دەرچووی ئامادەیی پیشەسازییە، لە ساڵی ١٩٨٢ پەیوەندیی کردووە بە ڕێکخستنەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، لە دۆڵی بالیسان، لەبەر چالاکی و جموجۆڵی زوو ناوبانگی دەرکرد، لەبەرئەوە ئەمنی هەولێر ماڵی باوکی و خێزانی گرتن و ڕۆژی ١٩٨٦/١٢/٢٣ بەربوون، ڕۆژی ١٩٨٦/١٢/٢٤ هەموویان گیرانەوە و دوای ماوەیەک ئەو خێزانە بەداخەوە هەموویان شەهید کران، کە ئەمانە بوون: سێبەر صلیوە، خێزانی و ژاڵەی کچی مام صلیوەی باوکی، نێرگز خانی دایکی و حەمامە و شەزا و سەبیحە و نەدای خوشکی.

شەهید سۆران ساڵی ١٩٨٢ لە بالیسان هەردەم لە بارەگای یەکێتیی نووسەرانی کوردستان لقی هەولێر بە قسە خۆشەکانی ئاوەدانی و ئارامی پێ دەبەخشین، درود بۆ ڕۆحی پاکی سۆران و شەهیدەکانیان، ئەو قەسیدەیە بەشێکە لە وەفا:



**سەحەر بوو**
**"سێوە"دەنگی دەهات و دیار نەبوو**
**سەدایەک لە دێرێرا لەبەر ماڵی - صلیوە**
**بە نەرمە کیرۆشکەی دەغلان هات**
**سوارێک لە تەمی کەنیسەی عەنکاوە**
**ڕووەو بالیسان هات**
**جووتێ پێلاو جیا لەو پێلاوانەی**
**بۆ مزگەوت و کەنیسە و دێرێ پێی دەڕۆن**
**پیرۆزتر لەسەری خائین و جوانتر**
**لە چاوی جەللاد و بە هەیبەتتر**
**لە بەژن و قامەتی ئەمن و سیخوڕەکانی عەنکاوە**
**بالیسان مەملەکەتێکی جوان بوو**
**دەمەو عەسران لەوانێرا**
**لە چوارچرا و مەهابادێ لە دەشتی پیرە هەولێرێ**
**سوارەی بەبە و گەرمیانێ**
**دەمەو عەسران لە چیای هەورێ، دەرەشیرێ**
**بە ئەسپە شێی گەردەلوولێ لە دێرێرا**
**ناقوسێک لێی دەدا، خامۆشی**

**قەشە زەنگی نوێژیان لێ دا**
**سەریان بەدیواران دادا**
**جووتێ پێلاو جیا لەو پێلاوانەی پێی دەچنە دێرێ**
**جیا لەو پێلاوانەی لەبەر تارمەی مزگەوتان دەکەون**
**جیا لەو پێلاوانەی پێی دەچینە ژوانی کچان**
**جیا لەو پێلاوانەی سوالی پێ دەکەین**
**پیاوێک لە خەونی یوسف**
**لە نووری ئیمان، لە هێمنی باسترناک**
**لە نهێنییەکانی مونالیزا، پیاوێک لە شیعر**
**هێواران شاباڵی داوێتەوە سەر عەنکاوە**
**بەیانییان زوو لەسەر دیواری کەنیسە**
**دەرگاکان دەخاتە سەرپشت**
**ماڵەکان بەسەر دەکاتەوە و دەڕوا**
**کەس نازانێ بۆ کوێ دەڕوا**
**لەزێی بادینان دێتەوە لە چیای مەقلوب**
**لە لالش سەرخەوێک دەشکێنێ**
**لە زینەتیر ئاودیو دەبێ**
**سروەیەک دێتێ لە هەورێ**
**خشپەی پێ دێ، پێی قەدەرێ**
**بەفرانباران کوتەکی رێگا دەشکێنێ**
**لەگەڵ زریان هەڵدەکاتێ کە بۆ هەولێرێ دێتەوە**
**شوێن پێی دیاربوو، هەر دێ و نزیک دەبێتەوە**
**کە دەرێشت، دیاربوو هەنگاوی دوور ناوە**
**دەستی ولاتی کۆتران**
**لە بالیسان، ئێواران ماڵە و ماڵ دەگەڕا**
**لاس بوو لە سێبەری دەغلان**
**نامەکانی سپاردە با**
**بایەک سەری لە هەورێ بوو**
**بردیانەوە لای مریەمێ**
**شەوانە بۆ ژوانی مەرگ. بەیانییان**
**لەگەڵ گزنگ دەهاتەوە**
**ئێوارەیەکیان بەگاڵتە ویستمان بزانین**
**ناوی چییە!**
**گوتی ئێوە کە تەسلیم بوونەوە ناوم دەدەن**
**دەڵێن: دیانێکی عەنکاوە لە بالیسان**
**پێشمەرگەیە**
**رۆژگارێک پێکەوە گەڕیدە و ماڵە و ماڵ**
**ئێواران لە دەرگای ماڵانمان دەدا**
**"کێ سوپامان بۆ دادەخا[1]"**
**کێ بەتانی نووستنمان دەداتێ بۆ مزگەوت**
**ماڵە و ماڵ نانی ئەو ئێوارەیەی پێشمەرگان**
**درەنگ داهات**
**سەگەکان لە ئێمە برسیتر**
**چاومان بڕیبووە یەکتر**
**دەمەو عەسرێک کۆڕێکی شیعرمان لە شێخ وەسان**
**کۆڕێک لەباری خەتێ و لە بالیسان و کانی بەرد**
**لە جێی سمی ئەسپەکان ئاومان**
**خوارد و چووین**
**جلوبەرگیان بردین بۆ دەڤەری شەیتان**
**"ئەنوەر مەسیفی" تەمبوور قوڕی خوێندەوە**
**بەژنان دایانپۆشی و**
**چەند مەتارەیەک شەرابی ترێی**
**نازەنینیان هێنا**
**پێشمەرگەکان، چەکەکانیان بەشانی ئێمە دادا**
**مەفرەزەیەک ل ەترسنۆک،**
**"سۆران" لە پشت شەواشینکی چیای هەورێ**
**- چیوە و چیوە - هاتەوە مزگەوتی بالیسان**
**ئەو رۆژانە ترووسکاییەکان کز بوون**
**کێ دەوێرا سەری دەربێنێ لە ماڵێ**
**ببێتە پێشمەرگەی، ئەجەلێ**
**جاشێک بکوژێ، موختار بیا**

تێبینی:
ئەم چامەیە بۆ گیانی پاکی شەهید سۆران نووسراوە، بۆ ئینسکلۆپیدیا بەباش زانرا ئەو بەشەی سەردوە بلاو بکرێتەوە.

**لە هەفتەنامەی بەدرخان بلاوکراوەتەوە**

# عومەر جەلال حەوێزی
# ١٩٠٨ -١٩٨٨

کەریم شارەزا

مامۆستای پەروەردەکار و ئەفسەری پۆلیس و پارێزەری یاساناس و رۆژنامەنووسی لێهاتوو، عومەر جەلال حەوێزی لە ساڵی ١٩٠٨دا لە شاری کۆیە لەدایک بووە. لەگەڵ کردنەوەی قوتابخانەی سەرەتایی کۆیە لە ساڵی ١٩٢٠دا چووەتە بەرخوێندن و لە ساڵی ١٩٢٧دا لە تاقیکردنەوەی گشتیی قۆناغی سەرەتایی دەرچووە و چووەتە بەغدا و لە (خانەی مامۆستایان) وەرگیراوە و دوای ٣ ساڵ بووەتە مامۆسای قوتابخانەی سەرەتایی کۆیە و کە لە ساڵی ١٩٣٣دا کە قوتابخانەی دووەمی سەرەتایی دەکرێتەوە دەگوێزرێتەوە بۆ ئەو قوتابخانە نوێیە و دوای ٧ ساڵ مامۆستاییکردن چۆتە کۆلێجی سەربازی و کە دەرچووە (٦) مانگ دەورەی ئەفسەری پۆلیسی دیوە و هونەری لێکۆڵینەوە بەچاکی فێر بووە و لە ساڵی ١٩٤٠دا کراوە بە ئەفسەری پۆلیس و گەلێک زیرەک بووە لە دۆزینەوەی دز و پیاوکوژان. دوای ٦ ساڵ خزمەتکردن دەچێتە کۆلێجی حقووق و لە ساڵی ١٩٥٤ خوێندن تەواو دەکات و دەبێتە پارێزەرێکی یاساناس.

**عومەر جەلالی رۆژنامەنووس:**

ئەم زاتە یاساناسە لە ساڵی ١٩٦٠دا ئیمتیازی دەرکردنی رۆژنامەیەکی سیاسیی سەربەخۆی بەناوی (دەنگی کورد) وەرگرت و لە رۆژی ٩/٢/١٩٦٠دا یەکەمین ژمارەی بەزمانی کوردی لێ دەرچواند، بەڵام وای چەند ژمارەیەکی بەشێکی بەزمانی عەرەبی بەناوی (صوت الکرد) دەرکرد.

رۆژنامەی دەنگی کورد بەڕاستی دەنگی راستەقینەی کورد بوو، سەکۆیەکی ئازاد بوو بۆ نەوەی نوێ، تاکو هەست و هیوا و ئاواتی خۆی تێدا دەربڕن و دەستەیەکی لێهاتوو لە نووسەری گەورەی وەک مەلا جەمیلی رۆژبەیانی و رۆژنامەنووسی وریای وەک بورهان قانیع و محەمەد بەدری وتاری جوانیان تێدا دەنووسی، جگە لە دەستەیەک رۆشنبیر و خوێندکاری پێشکەوتنخوازی کۆلیجەکانی زانکۆی بەغدا وەک نەوشیروان مستەفا و چەندانی تر. ئەو رۆژنامەیە بەشێوەیەکی گشتی لەسەر داواکردنی مافی رەوای نەتەوەیی کورد گەرم بوو، مامۆستا عومەر جەلال ماوەی دەدا رەخنە لە دەستەڵاتی حکومەت بگیرێ و لەسەر پاشەکشەی حکومەتەکەی عەبدولکەریم قاسم لە مافە نەتەوەییەکانی کورد بنووسن و هەر لەسەر ئەو رەخنە گرتنانەش بوو و حکوومەت لە مانگی مایسی ١٩٦١دا رۆژنامەکەی داخست.

مامۆستا عومەر جەلال کەوتەوە سەر پیشەی پارێزەری و لە دوای هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەیلوول، ماوەیەک چووە ناو شۆڕش و دوایی گەڕایەوە سەر پارێزەرییەکەی لە بەغدا تاکو لە ١٦/٦/١٩٨٨دا بەکارەساتی ئۆتۆمبێل کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەی برایەوە کۆیە و لە ٦/١٧ لە گۆڕستانی بنەماڵەی حەوێزییان نێژرا.

**سەرچاوە:**

* رۆژنامەی برایەتی - هەولێر ژمارە ٢٢٧٩ی رۆژی ٢٤/٢/١٩٩٧، نووسینێکی کەریم شارەزا.

# مامۆستا حەمەڕەش
# ١٩١٧ - ١٩٨٨

کەریم شارەزا

نووسەری خامە ڕەنگین و پەروەردەکاری پسپۆڕ، مامۆستا (محەمەد حەویز)ی ناسراو بە (حەمەڕەش) لە ساڵی ١٩١٧دا لە شاری کۆیە لەدایک بووە، بنەماڵەکەیان بەچوار پشت دەچێتەوە سەر هۆزی هەمەوەند. خوێندنی ئایینی لە مزگەوتی حەتک لە شاری کۆیە لەلای مەلا محەمەدی عەودالانی ناسراو بەمەلا محەمەدی دلاوەر دەست پێ کردووە. لە پایزی ١٩٢٩دا لە تەمەنی ١٢ ساڵیدا لە قوتابخانەی سەرەتایی کۆیە لە پۆلی دووەم وەردەگیرێ. لەبەر زیرەکی و ڕەنگ ئەسمەری (مامۆستا عەلی ئاگا)ی رابەری پۆلەکەی و مامۆستای، ناوی ناوە (حەمەڕەش). لە ساڵی ١٩٣٥دا خوێندنی سەرەتایی تەواو کردووە و چۆتە خوێندنگای ناوەندیی. لەو ساوە هەستی نەتەوایەتیی کوردی پەیدا دەکات و ماوەیەک لەسەر چالاکیی کوردایەتی دەگیرێ. لە ساڵی ١٩٤٠دا خوێندنی ئامادەیی تەواو دەکات و دەچێتە بەغدا و لە (خانەی باڵای مامۆستایان) وەردەگیرێ.

لە ماوەی خوێندنی لە بەغدا دەبێتە ئەندامێکی چالاکی حزبی هیوا و لە ساڵی ١٩٤٤دا خوێندنی ئەو کۆلێجەی تەواو دەکات و دەکرێتە مامۆستای (خانەی مامۆستایانی لادێ) لە شاری باقووبە. لە دواییدا دەگوێزرێتەوە بۆ قوتابخانەی ناوەندی هەڵەبجە و لە ساڵی ١٩٤٩ تاکو ١٩٥٢ دەکرێتە مامۆستای ناوەندیی کەرکووک و دوای ساڵێک دەگوێزرێتەوە بۆ ناوەندیی سلێمانی و لە ساڵی ١٩٥٧ تاکو ١٩٦٣ سەرپەرشتیاری پەروەردەیی بووە لە سلێمانی و زۆر فرمانی گەورەی لە بواری پەروەردە بینیوە و لە دوای ڕێککەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠دا کراوە بە بەڕێوەبەری (بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردەی پارێزگای هەولێر) و لە پایزی ١٩٧٣ بەهەمان ناونیشان گوێزراوەتەوە بۆ پارێزگای دهۆک و لە ساڵی ١٩٧٤ تاکو ١٩٧٦ ئەندامی ئەنجوومەنی یاسادانانی کوردستان بووە و دوای ٣٦ ساڵ خزمەتکردنی نەوەی نوێ و ئەدەب و ڕۆشنبیریی کوردی، لە ١٩٨٠دا خانەنشین کراوە و لە ساڵی ١٩٨٨دا لە تەمەنی ٧١ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی گردی سەیوان لە سلێمانی بەخاک سپێردراوە.

مامۆستا حەمەڕەش هەر لە بواری پەروەردەکاری و نیشتمانپەروەریی کەسایەتییەکی خزمەتگوزار نەبوو، بەڵکو لە مەیدانی بە ئەدەب و لێکۆڵینەوەی ئەدەبیشدا نووسەرێکی لێهاتوو بوو، یەکێک بوو لە نووسەرانی گۆڤاری گەلاوێژ و لێکۆڵینەوەی پتەویشی لە گۆڤاری (بڵێسە)ی زمانحاڵی سەندیکای مامۆستایان- لقی سلێمانیدا بلاو دەکردەوە، لە کۆنگرەی یەکەم و دووەمی مامۆستایانی کورد لە شەقڵاوە، لە ساڵانی ١٩٥٩ و ١٩٦٠دا و لە کۆنگرەکانی یەکێتیی نووسەرانی کوریشدا بەشدارییەکی تەواوی کردووە.

**تێبینی:**

* سوود لە نووسینێکی خوالێخۆشبوو غەفووری میرزا کەریم لە ڕۆژنامەی هاوکاری ١٠١٩ وەرگیراوە، ٢٧/١٠/١٩٨٨.

# محەمەد سەرسپی
# ١٩٤٠-١٩٨٨

مامۆستای پەروەردەکار و خەباتگێڕی فیداکاری کورد...محەمەد ئیسماعیل"ی ناسراو بە "محەمەد سەرسپی"، لە سالی ١٩٤٠دا لە گوندی (دالداغان)ی پارێزگای هەولێر لەدایک بووە لە بنەمالەیەکی ئایینی و نەتەوەپەروەر سەری هەلداوە. خوێندنی سەرەتایی لە گوندەکەی خۆی تەواو کردووە و بۆ درێژەدان بەخوێندنەکەی چووەتە شاری هەولێرو قۆناغی ناوەندی و خانەی مامۆستایانی سەرەتایی تەواو کردووە و لە پایزی ١٩٦٢دا بووەتە مامۆستایەکی پەروەردەکاری دلسۆزی کورد و کوردستان.

ئەم مامۆستا تێکۆشەرە کوردپەروەرە دەورێکی بەرچاوی هەبووە لە بزووتنەوەی کوردایەتی، بەتایبەتی لە ناو مامۆستایانی کوردستان و لە سالی ١٩٧١دا کراوە بە بەڕێوەبەری قوتابخانەی کوڕەکی سەرەتایی کوڕان لە شاری هەولێر، نموونەی بەڕێوەبەری پەروەردەکاری سەرکەوتوو بووە.

لە سەرەتای سالی ١٩٧٤دا لەگەل دەستپێکردنەوەی شەڕ لە کوردستان چووەتە پال شۆڕشگێڕانی ئەیلوول و لە پاش نسکۆی شۆڕشیش لە سالی ١٩٧٥دا گەڕاوەتەوە هەولێر و کراوە بەمامۆستا لە قوتابخانەیەکی سەرەتایی.



لەگەل هەلگیرسانی شۆڕشی نوێی کوردستان لە ١/٦/١٩٧٦دا چووەتە ریزی خەباتگێڕانی کۆمەلەی رەنجدەرانی کوردستان و لە ناو شاردا خەباتی نهێنیی کردووە و بووەتە ئەندامی سکرتارییەتیی یەکێتیی مامۆستایانی کوردستان و وەک سەربازێکی نەناسراو خەباتی شۆڕشگێڕیی بۆ کورد و کوردستان کردووە تاکو لە سالی ١٩٨٨دا رێکخراوی شانەکەیان لەلایەن رژێمی بەعسی فاشییەوە دۆزراوەتەوە و گیراوە. بۆیە خۆی و چەند هەڤالێکی تێکۆشەری گیراون و دوای ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆر لە رۆژی ٢٨ی حوزەیرانی ١٩٨٨دا لە زیندانی ئەمنی هەولێر بەدەستی فاشیستەکان لەسێدارە دراوە. هەوالی لەسێدارەدانی لە پاش راپەڕینی جەماوەری کوردستان لە بەهاری ١٩٩١دا نهێنیی لەسێدارەدانی ئەم خەباتگێڕە فیداکارە لە ناو بەلگەنامەیەکی فەرمانگەی ئەمنیی هەولێر ئاشکرا بوو، کە لەو رۆژەی سەرەوە ئاماژەمان پێ کرد لەسێدارە دراوە و لاشەکەی لەگەل لاشەی هەڤالانی دیکە لە ئاست کارگەی قیری هەولێر لە گۆڕی بەکۆمەل نێژراوە.

سەرچاوە:

گۆشەی شەهیدان- لە رۆژنامەی کوردستانی نوێ- هەولێر- ژمارە ١٣٢١ لە ٢٨/٦/١٩٩٦دا- بابەتێک بەناوی (محەمەد سەرسپی) بەپێنووسی ک. لێزان.

**کەریم شارەزا**

# تەحسین دەرگەڵەیی
# ١٩٤٧-١٩٨٨

بۆتان تەحسین دەرگەڵەیی

- تەحسین محەمەد حەمەدەمین دەرگەڵەیی لە ساڵی ١٩٤٧ لە گوندی دەرگەڵەی سەر بە قەزای رواندز لە خێزانێکی جوتیار لەدایک بووە.
- خوێندنی سەرەتایی لە گوندی دەرگەڵە تەواو کردووە، ناوەندیش لە رواندز.
- لە ساڵی ١٩٧٥ لە پەیمانگای مامۆستایانی هەولێر دەردەچێت لە دەشتی کۆیە دەبێتە مامۆستا، دواتر دەگوازرێتەوە رواندز و دەرگەڵە.
- لە قۆناخی پەیمانگای مامۆستایانی هەولێر بووەتە ئەندام لە یەکێتی قوتابیانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان، دوای دەرچوونیشی لە پەیمانگا لە یەکێتی



مامۆستایانی کوردستان بووەتە ئەندام.
- لە دوای نسکۆی شۆرشی کورد لە ساڵی ١٩٧٥ ئاوارەی ئێران بووە، دواتر دەگەڕێتەوە عێراق و بۆ ناسریە رادەگوێزرێت.
- لەساڵی ١٩٧٨ دێتەوە هەولێر.
- لەگەڵ دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان پەیوەندی بە رێکخستنە نهێنییەکانی یەکێتییەوە دەکات و دەبێتە

کادیرێکی چالاک لە سنووری هەولێر، چەند جارێک لەلایەن بەعسەوە هەوڵی دەسگیرکردنی دەدرێت، بەلام خۆی ناداتە دەست بۆ ماوەیەک خۆی دەشارێتەوە، تا لە ١٢-٦-١٩٨٨ مەفرەزەیەکی ئەمنی هەولێر هەڵدەکوتنە سەر قوتابخانەی ئامانجی سەرەتایی و راپێچی زیندانی دەکەن، دوای مانگێک لە ژێر ئەشکەنجە و ئازاردا گیان لە دەست دەدات، لەگەڵ چەند هەڤاڵێکی تر لە گۆڕێکی بەکۆمەڵ لە گۆڕستانی شەهیدان (مەعمەل قیر) دەنێژرێت، بەلام تا راپەرینی ساڵی ١٩٩١چارەنووسی بۆ کەسوکارەکەی ئاشکرا نابێ.

# عەونی یوسف
# ١٩٠٨-١٩٨٨



عەونی یوسف، لە ساڵی ١٩٠٨دا لە شاری هەولێری دێرین چاوی بەژیان هەڵێناوە. کوڕی مامۆستا یوسف ئەفەندی قازی هەولێرە. لە تەمەنی حەوت ساڵیدا دەستی بەخوێندنی دەرسی ئایینی و زمانی عەرەبی کردووە. لە ساڵی ١٩٢١دا چۆتە قوتابخانەی میری و قۆناغی سەرەتایی و ناوەندیی لە شاری هەولێر تەواو کردووە و خوێندنی ئامادەییشی لە قوتابخانەی دواناوەندیی مەرکەزی بەغدا لە ساڵی ١٩٣٤دا تەواو کردووە، چووەتە کۆلێژی حقوق و لە ساڵی ١٩٣٩دا خوێندنی تەواو کردووە و بووەتە پارێزەر. لە (ساڵی ١٩٤٠)ەوە تێکەڵ بە بزووتنەوەی کوردایەتی بووە و بووەتە ئەندامێکی چالاکی (حزبی هیوا)ی کورد. لەسەر هەڵوێستی سیاسی بەفەرمانی (مستەفا یەعقووبی)ی موتەسەریفی هەولێر گیراوە و ڕەوانەی بەغدا کراوە، لە بەندیخانەی مەرکەزی.

لە بەندیخانەدا کوردە کاربەدەستەکان سەردانی دەکەن و هەوڵی بەردانی بۆ دەدەن و جارێ هەر لە گرتووخانە دەبێت، دەکرێت بەدادوەر و لە شاری زاخۆ دادەمەزرێت، لەوێش لەسەر چالاکیی سیاسی و کوردایەتی دەگوێزرێتەوە بۆ مووسڵ و دوای شەش مانگ دەنێردرێ بۆ بەسرا و لە ڕێی چوونی بۆ ئەو شارە بەهەولێردا دێت. کە موتەسەریف واتە (مستەفا یەعقووبی) بەهاتنەکەی دەزانێت فەرمانی گرتنی دەدات و ڕەوانەی بەندیخانەی مووسڵی دەکات و ٣ ساڵ لە بەندیخانەدا دەمێنێتەوە تاکو لە ساڵی ١٩٤٦دا بەر دەبێت. ئینجا دەگەڕێتەوە هەولێر و خەریکی پیشەی پارێزەری دەبێت و لەگەڵ پێکەوەنانی پارتی دیموکراتی کوردستان دەبێتە ئەندامێکی چالاکی ئەو حزبە لە کۆنگرەی یەکەمی ئامادە دەبێت کە لە ١٦/٨/١٩٤٦ لە شاری بەغدا بەسترا و لە کۆتاییدا سەرۆک و جێگری سەرۆک و ئەندامانی لیژنەی ناوەندی هەڵبژێردرا و مامۆستا عەونی یەکێک بوو لە ئەندامانی یەکەمین کۆمیتەی ناوەندی پارتی و سەرجەمی ئەنجامی هەڵبژاردنەکەش بەمجۆرە بوو:

١- ڕێزدار مەلا مستەفا بارزانی- سەرۆکی پارتی و نەتەوەیی کورد.
٢- شێخ لەتیفی شێخ مەحموود- جێگری یەکەمی سەرۆک.
٣- کاکە زیاد ئاغای غەفووری- جێگری دووەمی سەرۆک.
٤- هەمزە عەبدوڵلا- سکرتێری لیژنەی ناوەندی.
٥- میرحاج ئەحمەد- ئەندام.
٦- د.جەعفەر محەمەد کەریم- ئەندام.
٧- عەلی عەبدوڵلا موهەندیس - ئەندام.
٨- ساڵح یووسفی - ئەندام.
٩- عەبدولکەریم تۆفیق - ئەندام.
١٠- عەونی یووسف - ئەندام.
١١- ڕەشید عەبدولقادر - ئەندام.
١٢- ڕەشید باجەلان - ئەندام.
١٣- مەلا حەکیم خانەقینی- ئەندام.
١٤- تەها محێدین مەعرووف- ئەندام.
١٥- مستەفا خۆشناو - ئەندام.

مامۆستا عەونی لە ڕێگای خەباتی کوردایەتی تووشی گەلێک کێشە و ئەشکەنجەدان بوو، تاکو لە دوای بەرپابوونی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ کرا بەسەرۆکی دادگای کەرکووک و لە ١٣/٧/١٩٥٩ش دا کرا بەوەزیری ئەشغال لە حکومەتی زەعیم عەبدولکەریم قاسم تاکو ساڵی ١٩٦٠، ئینجا دەستی لەکار کێشایەوە و کەوتەوە سەر پیشەی پارێزەری.

لە دوای بەرپابوونی کودەتاکەی ٨ی شوباتی ١٩٦٣دا، مامۆستا عەونی خۆی دەگەیەنێتە ریزەکانی پێشمەرگەی کوردستان و بەفەرمانی مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستان دەکرێت بەدادوەری شۆڕشی ئەیلوول و لە ساڵی ١٩٦٤دا دەگەڕێتەوە بەغدا و لە پایتەخت و لە شاری هەولێر خەریکی کاری پارێزەری دەبێت تاکو لە ڕۆژی ١٥/٧/١٩٨٨دا لە شاری بەغدا لە نەخۆشخانەی (ئیبن ئەلبەیتار) کۆچی دوایی دەکات و تەرمەکەی دەهێنرێتەوە هەولێر و بەڕێزلێنانێکی زۆرەوە بەخاکی نیشتمان دەسپێردرێ.

**کەریم شارەزا**

# لە یادی کوردپەروەری هەولێر (عەونی یوسف)دا

**بە پێنوسی مام جەلال**

ڕێکەوتی ١٥/٧، بیرەوەریی کۆچی دوایی کوردپەروەری دێرینی هەولێر و شەخسیەتی ناسراوی کوردستان مامۆستا عەونی یوسفی پارێزەر و حاکم و وەزیری نیشتمانییە.

کاک عەونی یوسفی خوالێخۆشبوو، هەر لە سەرەتای ژیانییەوە لە کوردایەتیدا بەشدارییەکی دیار و چالاکانەی کردووە، دەستەی یەکەمی تێکۆشەرانی ڕێگەی ڕزگاری کوردستان لە شاری هەولێر کاک عەونی یوسف و عیزەدین فەیزی و ڕەمزی نافیع ئاغا و فەیسەڵی ئەحمەد عوسمان و چەندین کوردپەروەری تر بوون، کە لەو سەردەمەدا بەددگمەن هەڵدەکەوت، خەڵک خەبات لە پێناوی ڕزگاری کوردستاندا بکات.

هەرچەندە مامۆستا عەونی کوڕی یوسف ئەفەندی قازی ناوداری هەولێر بووە و لە بنەماڵەیەکی ناسراو بووە، بەڵام وەک لاوێکی عیسامی لە سەرەتای لاوێتییەوە خۆی ژیاندووە و لە مەحکەمەدا بۆتە کاتیب تاکو بتوانێ خوێندنی کولیەی حقوق بەسەربەرزی تەواو بکات، لە کاتی خوێندنیشدا لە بەغدا لەگەڵ چەندین خوێندەواری هوشیاری عەرەبدا وەک خوالێخۆشبووان مستەفا عەلی و لوتفی بەکر سدقیدا بۆتە دۆست و ناسیاو.



هەر لە سەرەتای دامەزراندنی حزبی هیواشەوە مامۆستا عەونی بۆتە ئەندامێکی چالاکی ئەو حزبە و پاشان کە کراوە بە حاکم لە شاری زاخۆ لە سەرەتای شەڕی دووەمی جیهانیدا لەگەڵ کوردپەروەری دێرینی کورد دکتۆر جەعفەر محەمەد کەریمدا پێکەوە کوردایەتییان درێژە پێ داوە و بیروباوەڕەکەیان لە ناو خوێندەوارانی زاخۆدا بڵاو کردۆتەوە، تا ئەو ڕۆژەی پێکەوە گیران و ڕەوانەی زیندانی ئەو سیاسییانە کران، کە بە تۆمەتی دژایەتیی بەریتانیا و دۆستایەتیی ئەڵمانیا گیرا بوون، بێ گومان ئەو تۆمەتەش هەر ئەوەندە ڕاست بوو، کە کاک عەونی و کاک دکتۆر جەعفەر دوژمنی ئیمپریالیزمی بەریتانیا و دوو تێکۆشەری دیموکرات و ئازادیخوازی دوژمن بەداگیرکردن بوون، ئەگینا هەردووکیان دوژمنی سەرسەختی فاشیزم و دوو مرۆڤی دیموکرات و پێشکەوتنخواز بوون.

خوالێخۆشبوو کاک عەونی سالانی زیندانی بەسەربەرزی و خۆڕاگری و ورەی بەرزەوە بردە سەر و لەوێش هەر بەگوێرەی توانا کوردایەتیی خۆی دەکرد، کە لە زیندان ئازاد کرا خێرا دەستی دایەوە چالاکیی ڕێکوپێک لە ڕیزی حزبی ڕزگاری کورددا و بووە ئەندامێکی چالاکی ئەو حزبە و لە شاری هەولێر، کە مەڵبەندێکی چالاکی بێ وچانی ئەو ڕۆڵە کوردپەروەرەی کوردەواری بوو، هەر زووش لەگەڵ دەستەی دووەمی تێکۆشەرانی هەولێردا، کە هەرە ناسراوەکانیان مامۆستایان ساڵح حەیدەری و ڕەشید عەبدولقادر و نافیع یونس بوون، بوو بە هەڤاڵ و دۆست و ئاشنا و، بێ گوێدانە تەمەنی ژیان و خەبات لە ژێر سەرکردایەتیی ئەواندا خۆنەویستانە خەباتی کرد، تا ڕۆژێ هات، کە کۆنگریسی یەکەمی پارتی دیموکراتی کوردی - عێراق بەسترا (ئابی ١٩٤٦) کاک عەونی بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی

هەڵبژێردرا.

واتا هەر لە سەرەتای پارتییەوە کاک عەونی بە سەرکردەیەکی ئەو پارتییە هەڵبژێردرا و پاشان لە لقی هەولێریشدا بوو بە سەرۆک.

لە هەولێریش کاک عەونی هەمیشە خەریکی هۆشیارکردنەوەی خەڵک بوو، ئەوەندەی پێ کرابێت چۆتە ناو جەماوەری رەنجدەردەوە، دەردی خۆی هەمیشە دەیگوتەوە: (عەمرم رووتەڵە: عەمرم رەشورووت).

ئەوەش خۆی لە خۆیدا نیشانەیەکی ئەهەمییەتدانی بوو بە هێزی سەرەکیی خەبات، بەڵام کاک عەونی لەگەڵ هەموو توێژەکانی کۆمەڵیشدا دۆست بوو، لەگەڵ چوار جوامێرە نیشتمانپەروەرە لاوە ئاغا دزەییەکانیش زۆر نزیک و دۆست بوو، کە بریتیبوون لە بەهەشتیانی خوالێخۆشبوو کاک ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی، کاک مشیر، کاک ئیبراهیم عەلی و کاک سابیر ئاغا: هەروەک زۆر دۆستی شەخسیەتی کوردپەروەری هەولێر کاک قاسمی مەلا فەندی بوو، هەموو ئەوانە و چەندین پیاوماقووڵی هەولێری تریش دۆست و ناسیاوی کاک عەونی بوون، کە بە (جەناب) ناویان دەبرد، سەبارەت بەوەی هەمیشە دەیگوتەوە: (جەناب بەراستی کورد مەغدوورە) لە ساڵانی ١٩٤٦ و ١٩٤٧ و ١٩٤٨ کاک عەونی و تێکۆشەرانی تر خەباتێکی زۆریان بۆ بووژاندنەوەی جەژنی نەورۆز لە هەولێر کرد.

لە راپەرینی کانوونی دووەمی ١٩٤٨یشدا کاتێ تێکۆشەرانی هەولێر کەوتنە جموجۆڵ کاک عەونی هەر لە ریزی پێشەوەی خەباتەکە بوو، ئەوە بوو لە پاشەکشەکەی ساڵی ١٩٤٩دا حوکمی کۆنەپەرستی بەغدا جارێکی تر قین و تووڕەیی خۆیان لە خەباتی ئەو جوامێرەی هەولێر بەزیندانیکردنەوەی کاک عەونی دەربڕییەوە، ئەوەندەیان رق لە کاک عەونی و خەباتەکەی هەڵدەستا تا ئەو رادەیەی پریشکی کەسوکاریشی دەگرتەوە، لە کاتی مەحکەمەکردنی مامۆستا برایم ئەحمەدی سیاسەتمەدار و ئەدیبی ناوداری کورددا لەگەڵ کاک جەلیل هۆشیاری برای کاک عەونی لە کاتێکدا مامۆستا برایم گاڵتەی بە شایەدە دەستچینەکانی (تحقیقات الجنائیە) دەکرد و کاک جەلیلیش زەردەخەنەیەکی دێتێ: نەعسانی حاکمی عورفی پێی دەڵێ (هەم برای عەونی و هەمیش لە مەحکەمە پێدەکەنی... دەبڕۆ تۆش ساڵ و نیوێ حوکم بە) بێ ئەوەی هیچی لەسەر بسەلمێت.

ئەوجارەیان کە کاک عەونی لە زیندان بەرەڵا بوو، بەسەر وەزعێکی شڕی پارتی دیموکراتی کوردی عێراقدا کەوت، بەڵام لەگەڵ هەڤاڵانی تردا قۆڵ و بازووی ژیاندنەوەی پارتییان لێ هەڵکردەوە، واتە زیندان کاک عەونی یوسفی تیژتر دەکرد لە خەباتیدا و سوورتری دەکرد لەسەر رێبازی کوردایەتیدا.

من لەو سەردەمەدا لە نزیکەوە کاک عەونی یوسفم ناسی لەو کاتەدا من لەو گرووپەی ناو پارتی بووم، کە دژی ئەو تۆمەتە ناڕەوایە بووین؟ کە درا پاڵ مامۆستا حەمزە عەبدوڵڵای سکرتێری ئەو سەردەمەی پارتی، کە لەگەڵ سەرکردایەتیی کاتیش تەبا نەبوو، یەکێکیان کاک عەونی بوو، زۆر بە رووخۆشییەوە گوێی لە قسە توندوتیژەکانی ئێمە دەگرت و بەپێکەنینەوە وەرامی داینەوە، کە ئێمە (دەرزیشتین)، بەڵام پێی گوتین، کە دەروێشی دڵسۆز و تێکۆشەرین، بۆیە لێمان زویر نەبوو.

لە هاوینی ١٩٥٠دا، کە چوومە هەولێر بۆ کۆبوونەوەی لق و پاشان چووم بۆ خوێندن زۆر لە نزیکەوە کاک عەونیم باشتر ناسی، پیاوێکی رووخۆش، گەش، هێمن و دەم بە پێکەنین، هەرچەندە هەردووکمان لە دوو خەتی لێک جیاواز بووین، هەمیشە لەگەڵمان میهرەبان و دۆستانە بوو. خوالێخۆشبووان نووری شاوەیس و میرزا فەندی حەیدەر حەمەدەمین لەلایەک بووین و کاک عەونی رەحمەتیش لەلایەکی تر بوو، کەچی زۆر هەڤاڵانە و گەرمەدۆست بوو لەگەڵمان و هەمیشە وەک برایەکی گەورە لەگەڵمان رەفتاری دەکرد.

لە شوباتی ١٩٥١دا کە لە ماڵی شەهید عەلی حەمدی نەمردا کۆنگرەی دووەمی پارتیمان بەست، کاک عەونی زۆر دڵسۆزی و پەرۆشی بۆ پارتی نیشان دا، هەرچەندە ئێمە زۆربەی لە کۆنگرەیەکدا داوای لابردنی خۆی و هەموو کۆنە سەرکردەکانی پارتیمان دەکرد، لە کاتێکدا دوو لەو تازە سەرکردانە ملی کەوتە رێی جیابوونەوەیان گرت، کە کاک عەونی بە رووخۆشەکەیەوە هەڵوێستی زۆربەی سەلماند و وەک ئەندامێکی سادە ملی نایەوە خەبات، لەو کۆبوونەوەیەدا مامۆستایان برایم ئەحمەد، جەلیل هۆشیار، نووری شاوەیس، بەکر ئیسماعیل، محەمەدەمین مارف بەئەندامی

کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردران و ناوی پارتی کـرا بە پارتی دیموکـراتی کوردستان - عێراق و ڕێبازی چەپی شۆڕشگێڕانەش پەسند کرا، من خۆم یەکێک لەو پێنج هەڵبژێردراوانە بووم، بەڵام سـەبارەت بە ڕێککەوتنی پشت پەردە و لەبەر کـەمیی تەمەن و لەسـەر داوای مـامـۆسـتـا برایم ئەحـمـەدی سکرتێری نوێ هەڵبـژێردراوی هەمـوو لایەکمان، خۆم کێشایەوە و دوای من بە دەنگ مـامـۆسـتا جـەلیل هۆشـیـار، شوێنەکەی بەرکەوت.

کە گەڕاینەوە هەولێر دیسان کاک عـەونی بێ تۆران و زیزبوون و لالووتی لەگـەڵمـان بە برایانە و هەڤـاڵانە کـەوتەوە خـەباتی بێ وچانی نهـێنیی ئەو سـەردەمـە، ئەوەی ڕاست بێ کـاک عـەونی لە شـاری هەولێـر تاکـە ڕووی ناسراوی پارتی بوو، کە زۆریش لەسەر بارزانییـەکـان هەڵـیـدایەوە، لە بیـرمـە ئەوسـا کـوڕی ئولوبەگی شـێـروانی بـارزانی لەلایەن پیـاوەکـانی ئاغـا زێبارییەکانەوە کوژرا بوو، کاک عەونی تەتەوعی کـرد و چووە مـەحکەمـە لە دژیان.

لەو سـەردەمـەدا کـاک عـەونی جیـرانی خوالێخۆشبوو ئەمین ڕەواندزی بوو، بۆیە زۆر جـار لە مـاڵی کـاک عـەونی ئەویشـمـان دەدیت، ئەوسـا خوالێخۆشبووان کاکە زەیدی ئەحمەد عوسمان و قاسم ئەفەندی مەلا فەندی ناودار و کـاکـە زیاد ئاغـای کـوردپەروەری کـۆیە و کـاک ئەحـمـەد حـەمـەدەمـینی دزەیی و حـەیدەر حەمەدەمینی جوانەمەرگیش زۆر جار لە ماڵی کاک عەونی کۆدەبوونەوە و قسە و باسی کـوردایەتیـان دەکـرد، لەو سـەردەمـەدا کاک عـەونی بەنهـێنیش خەریکی ڕێکخـستنی جووتیاران بوو، بە تایبەتی کاک ساڵح شێرە و کاک حەسەن مـستـەفا و چەندانی دیکە لە ناو کرێکارانی شەمـەندەفـەریش مـەلا عەولای مەلا حاجی ئیسماعیلی ڕێک خـستـبوو لە ناو قـەساب و فـیـتـەر و شوفێرانیشدا شانەیەکی هەبوو.

لە هاوینی ١٩٥١دا کـاتێک بۆ یەکەم جار من گیـرام و نەفی مووسڵ کراین، مـامۆسـتـایانی خوالێخۆشـبوو کاکی کاکان ( عومەر دەبابە ) و عەونی یوسف و عـومـەر حەبیب و مـامـۆسـتـا عەلی عەبدوڵلا و چەندین تێکۆشەری دیکەی پارتیش نەفی کراو بوون: لەو نەفـیـیـەدا، کە لە مووسڵ بە ناخۆشی بردمانە سەر کاک عەونی وەک زۆر لەو هەڤاڵانە هەر گاڵتەی بە حکوومەت و نەفـیـیـەکـەی دەهات، کـاکـە دەبابە شاگوڵی مەجلیسـەکان و مشـورخۆری هەموومان بوو، هەمیشـەش لەگەڵ کاک عـەونی لەسـەر عـومـەر و سـاڵی لەدایکبوون گـاڵتـەیان دەکـرد! کـاک عـەونی زۆر بێ باکـانە و بەگـیـانێکی سـپـۆرتەوە تەعلیـقـاتی کـاکـمـانی وەردەگـرت. لەوێدا بۆم دەرکـەوت کـە کاک عەونی زۆر هێمن و کۆیی گوتەنی (باغـەڵ قووڵ) و قـسـە قـبـووڵکەرە لە هەڤالان.

ئەوانەی سـەرەوە کـورتەی لایەنە گەشەکانی بیرەوەریی خۆمە لەسەر ئەو پیـاوە تێکۆشـەر و گـەورەیەی هەولێر، کـە بێگومـان وەک هەمـوو ڕۆڵەیەکی دیکەی ئەو گەلەش لایەنی سـەلبیـشی هـەبـووە و بـۆتـە هـۆی هـەنـدێ گیروگرفتیش لە ناو ڕیزەکانی پارتی، لەگـەڵ هەڤـاڵەکـانی تریدا، بەڵام بێگومان خەباتی ئیـمڕۆ درێژەپێدانی خـەباتی ئەوسـا و پێش ئەوسـای گەلەکەمانە، بەر و دەسکەوتەکانیشی بەری ڕەنج و خـەباتی هەمـوو ئەو تێکۆشـەرانەی ئەو سـەردەمـە و پێش ئەو سەردەمەیە و دوای ئەو سەردەمەیە تا ئیمڕۆ، ئەم ڕاستییە زۆر گرنگە بۆ مێژووی گـەلان بۆیە نابێ فـەرامـۆشی بکـەین... ئەگـینا هەق و ئەرکی تێکۆشەرانی دێرین بەربا دەدرێن.

هەر بۆیەش کـاک (عـەونی یوسف)ی تێکۆشەر و ڕۆڵەی خۆراگری زیندانەکـان و خـەباتگێـڕی ڕیزی کۆمەڵانی خەڵک، هەمیشە لە مێژووی گەلەکەماندا زیندوو دەمێنێتەوە و لە ناو مێژووی هەولێریشدا جێگەیەکی تایبەتی دیاری بۆ خۆی گرتووە.

هەزاران سڵاو لە گیانی مامۆستا عـەونی یوسفی خـوالێخۆشـبـوو، دەبا گـیـانی پاکی لە بەهەشـتی نەمـریدا شـادبێت بەوەی کـە ئیـمـڕۆ شـارەکـەی ڕزگار و پایتەختی حکوومەتی هەرێمی کوردستـان و ئەنجوومەنی نیشـتـمانی کوردستانە، دەبا بەلەدیبیەی هەولێریش پاداشتی ئەو هەموو ئەرک و زەحمەت و ناخۆشی و زیندانییـەی مـامـۆسـتـا عـەونی یوسف بۆ کـوردایەتی بەناو دانانی لەسـەر شـەقـامـێکی گـەورەدا بدەنەوە، تا هیـچ نەبێ گـیـانی پاکی کـاک عـەونی یوسف دڵنیـا بکـەین کـە (جـەناب مـەقـایس مـاوە) و (کـورد دەفـتـەری بۆ خـۆی پەیدا کـردووە) کـە زۆر جـار خـۆی دەیگـوت کـە (جـەناب مـەقـایس نەمـاوە) و (کـورد دەفـتـەری نییە!).

* ئـەم بابـەتـە لە ڕۆژنـامـەی (کوردسـتـانی نوێ)، ژمارە (٧٣٣)ی ڕێکەوتی ١٩٩٤/٧/١٧ وەرگیراوە.

# مام وسوو دزەیی
# ١٩٢٢ - ١٩٨٩

ئەرسەلان وسوو

لە سالی ١٩٢٢ لە گوندی (قورشاغلوو) ی دەشتی شە مامک لە دایک دەبێت، باوکی ناوی (حەمەد وسوو حەمەد) بووە بە(حەمەد چاوشین) ناسراو، لە خیلی بامەند-مامە سینی، خاوەن کەسایەتی تایبەتی خۆی بووە و بەتوانا و لێهاتووبووە لە سەرپەرشتی و بەرێوەبردنی کاروباری خۆی و کەس و کارەکەی، مەردارو زەنگین بووە، پەرۆشی خەلکی رەش و رووت وهەژار بووە، هەر بۆیەش زۆرینەی خزمەکانی لەدەوری خۆی خرکردبۆوەو لەکاتی تەنگەتاوی خودانی دەکردن. ئەوەش بووە هۆی هەلنەکردنی لەگەل سیستەم و پێکهاتەی ئەو کاتی کوردستان، کە بریتی بووە لە سیستەمی ئاغایەتی و دەرەبەگی، ئەو نەسازیەش بووە هوی دروستبوونی ناکۆکی لە نێوان باوکی شەهید و ئاغای پاشا، بۆیە بریاری بارکردن و جێهیشتنی دیار دەدات و دەچێتە گوندی شانشین، دواتر بو نەبی ئاوا و دوای مانەودیان بۆ چەند سالێک ناکۆکیان لە گەل ئاغای پاشا چارەسەردەبێت و لە سەر داخوازی و پێداگری ئاغای پاشا دەگەرێنەوە بو گوندی شێراوە، مام حەمەد دو کوری ناوەکانی (مام وسو، رەسول)و دوو کچ (مامزو هەمین)ی هەبووە، دایکی مام وسوو شەریفە پیرداود لە خێلی



هۆرمزیارە، لە سالی ١٩٤٥ حەمەد چاوشین کۆچی دوایی دەکات.و لە سەر راسپاردەی خۆی لە گورستانی پردێ دەشاردرێتە وە، دوای کوچی دوایی باوکی مام وسوو گەرایەوە سۆربەش.

(مام وسوو) کەسایەتییەکی پتەو و تایبەتی دەبێت، پیاوێکی لە سەرەخۆو بە متمانە بوو، خوێندەواری نەبوو، بەلام زەکاوەتی تایبەتی هەبووە، سەرناس و قسەخۆش بوو، هێزی گونجان و رێکخستنی کاریگەری تێدا هەبووە، هەستی خۆشەویستی بەرامبەر خەلک و نیشتیمانی زۆر تێدا بە دی دەکرا و ئەم سیفاتانە و پێگەی بنەمالەکەی و باوکی وای کرد لە ناو خزمان هەر لە سەرەتاوە بە مام ناوزەد بکرێت، ئەم ئاوەلناوە بوو بە بەشێک لە ناوەکەی، کە هەر لە لاوێتییەوە پێ ناوزەد دەکرا، دوای کەمێک مانەوە لە سۆربەش رەسولی برای کۆچی دوایی دەکات و ئەرکی بەرێوەبردنی مال و سامان و بنەمالەکە، کە لەراستیدا زیدەتر لە دەیان خانەوادە دەبوون دەکەوێتە ئەستۆی مام وسوو بەلام نیشتیمانپەروەری وتێرامانی باری کۆمەلایەتی گەلەکەی پتر لە ژیانی روژانە و مال وسامان ئۆبالی مام وسووی مژول کردبوو، هەر بۆیە بەرێوەبردنی مێگەلە مەر و زەوی زارەکان دەداتە دەست برازاکانی و ئامۆزاکانی و خۆی دەست بە کاری مامەلە و کرین و فرۆشتنی گەنم و جۆ دەکات، هیوایەتیشی راوکردن بووە. چونکە دەرفەتێکی لەباری دەرەخساند تا دەوروبەرەکەی باشتر بناسێت و زانیارییە پێویستەکانی خۆی، کە ببوونە کۆمەلە پرسیارێکی بێ وەلام لە دەوروبەرەکەی خۆی سوراخ بکات لە میانەی کار و راوچییەتیدا چاوی دەکەوێت بە کەسانی وەک خۆی، کە هەلگری بیرو باوەری نیشتیمانپەروەری و کوردایەتی بوون، لە سەرەتای سالی پەنجاکاندا دوستایەتی لە گەل هەر یەکە لە (مامۆستا عەلی عەبدوللا) و خوالێخوشبووان (سالح شێرە و مەلا ماتۆر و عومەر دەبابە و عەونی یوسف و عەلی حیلمی شەریف و بورهان ئاغای دزەیی) دروست دەکات و لەم رێگەیەشەوە ئاشنای پارتی دەبێت و لە سالی ١٩٥٢ دەبێتە

ئەندامی پارتی، دواتر لە نێوان سالانی( ١٩٥٣- ١٩٥٤) دەبێت بە کادر لە دەشتی هەولێر و زۆربەی کاتەکان بە ناوی راو و کاری مامەڵە لەگەڵ خوالێخۆشبوو (ملاعەبدوڵلا)و سالح شێرە بەیەکەوە کاری رێکخستن و هوشیارکردنەوەی جەماوەریان کردووە و کوکردنەوەی ئابوونەی حزبی لە ئەستۆ بووە، لە پاڵ کاری تەراحی لە١٩٥٨ زۆرجار بۆ چەک کڕین دەچوونە ناو گوندەکانی عارەبان و لەحەسەن عەردان چەکیان دەکڕی، لەبەر نەخوێندەواری زۆرتر کاری نووسین و خوێندنەوەی بە ئاموزاکانی دەسپارد، مام وسوو بیرتیژو بە توانابوو زۆربەی بلاوکراوەکانی لەبەر دەکردو لەناو جووتیارەکان بلاوی دەکردەوە.

لە ئاکامی هەوڵدان مام وسوو براکانی تۆڕێکی بەرفراوان لە رێکخستنی پارتی لەو سنوورەدا پێکدەهێنن وەک رێزگرتن و یادکردنەوەی خەبات و تێکۆشانی ئەو بەڕێزانە بە ئەرکی خۆمان دەزانین ناویان بخەینە بەرچاو (بە داوای لێبووردنە وە لە و بەڕێزانەی ناویان نەزانراوە) کە بریتی بوون لەو بەڕێزانە: (رەسول حاجی عەبدوڵلا و عومەری حاجی سلێمان لە لهێبان، غەوسە و قادر سوفی و مەلا جەبار لە گردەسۆر، شێمحەمەد مەحموود و نوری مەحموود حەنیف و هەداو لە قازیخانە، ئەنوەر حەمەرەش و عوسمان ناسراو بە عۆجان لە دووکەڵە، کاکە سمەی کوێخا ئەحمەد و قادر فاتەکە و حاجی فەقێ عەولا لە دووگردکان، سابیر حاجی ئەمین و حەسەن مستەفا و عەزیز مەولود و حوسێن حاجی تەیراو و عومەر قادر

ریزبار و ئەحمەدی برای لە سوربەش، سمکو مەجید ئەوبەری و ئەحمەد عومەر و ئەحمەد سمایل و سەعید پیرداود و محەمەد ئومەر عەولا و شێخ محەمەد حەمەد لە قورشاغلوو، لە گردعازەبان سەید مەجید و سەید عیزەددین و سەید قادر، لە دیبەگە ئەحمەد مەحموود و مەحموود سەلمان، لە مەخمور محەمەد سەڵتە و سابیر سەڵتە، شێخەڵلا و سابیر کاکە شێن لە جاستان، هەروەها مەولەوی خدان و عەزە گورگە و عەلی شەریفی بندیان، کە لەگەڵ خۆیدابوون.

دوای دەرچوونی بڕیاری شۆڕشی ئەیلوولی مەزن کۆمەڵێک دەرکەوتەی گرنگ لە ژیانی شەهید ئەدکەونە بەرچاو، کە لە سەرەتاوە دەکرێت باس لە کومەڵێک بابەت و رووداوی گەلی گرنگ بکەین، کە یەکەم و گرنگترینیان بریتی بووە لە داخستنی رێگەی (هەولێر-کەرکوک)، کە ئاماژەیەک بووە بو دەستپێکی شۆڕش و بە وتەی هاوڕێکانی سەرپەرشتی کردنی ئەم ئەرکە لە ئەستۆی شەهید بووە، زۆرینەی ئەو بەڕێزانەی ناویان لە سەرەوە هاتووە لەو ئەرکە بەشداربوون و داخستنی رێگە تا ئێوارە بەردەوام بووە، لە سەر ئەم کردەوەیە لەناو جەماوەر بە (ئەشقیا) ناسران، دوای چەند رۆژێک فەرمانی دەستگیرکردنی (مام وسوو) لە لایەن دەسەلاتی ئەوکاتەوە دەدرێت و شەهید بڕیاری خوبەدەستەوەنەدان دەدات و روو لە ئەشکەوتی(تک تکە) لە گەلی ئەشکەوتانی قەرەچووغ دەکات و بە تفەنگێکی برنەو لە جۆری تەیارەشکێن و دەمانچەیەکی لامە لەگەڵ سالح شێرەو عومەر قادر و علی شەریف و عەزە گورگە، کە هاوڕێی

بوون، دواتر ئەو بەڕێزانەی کە ناویان برا بەرەبەرە خۆیان خزاندە پاڵ شەهید، بۆیە بڕیاردرا بە دامەزراندنی بنکەیەکی پێشمەرگەی ئاشکرا لە گوندی دارەخوورما بە سەرپەرشتی مام وسوو دزەیی. دواتر دۆستان و لایەنگرانی تر دەگەنە دارخورما و لە پال زۆرگەکانی دارەخورما لە شوێنێک، کە ئەسحابەی پێدەوترێت خویان رێک دەخەن، لە ناو جەماوەردا بە هوی نەبوونی زانیاری بە(کومەرە واتە کومەڵە) ناوزەد دەکران. لەمانگی ٢-١٩٦٢چاکی دوەمیان ئەنجامدا، کە چەندهۆکاریکی لەخو دەگرت لەلایەک بۆ ناساندن و راگەیاندنی بوونی خویان بۆ دەستکەوتنی چەک لەوان گرنگتر دانانی سنوورەک بو زێدەروییەکانی حەرەس قەومیەکانی دبز بۆیە لە نزیک چاپخانەی حسو لە شارۆچکەی دوبز کەمینیان بو دانان. لەم چالاکییە بە فەرماندەی مام وسوو پۆلێک لە هەرە ئازاکان خۆیان پالاوت لە کاتێکدا نیوەیان چەکیان نەبوو، بەلام رووبەرووی دوژمن بوونەوە و توانیان دوو کەسیان لێ بکوژن و دوانیان لێ بریندار بکەن و دو تفەنگی ئینگلیزیش دەستخەن. بەشداربووانی شەڕەکە (عەزە گورگە، مەلۆ. خەلیفە محەمەد پونگینە. سالح شێرە، محەمەد سەڵتە، مەحموود سەلمان، سابیر ئەمین،نوری حاجی ئۆمەرو رەسول حاجی عەبدوڵلا بوونە، چەکەکانیش درانە سالح شێرەو خەلیفە محەمەد.

لەدوای چالاکییەکانی چاپخانەی حەسۆوی دوبز و گرتنی رێگای کەرکوک - هەولێرو گردبوونەوەیان لە دارەخورما ئاوازەیان لەناو خەلک رۆژلەدوای رۆژ لە زێدەبووندابوو

لەگوندەکانی دەشتی هەولێر دەگوترا(کومەرە) پەیا بووینەو مەلا مستەفا بوویتە سەرۆکی کورد بەرگری لە هەژاران دەکەن (دەرێن دەبی کورد حوکمی زاتی بدرێتێ). ژمارەی پێشمەرگە لەو سنوورە بەشێکی بەرچاو بی چەک بوون بەڵام لە زێدە بووندانبوون تانزیک ٤٠کەس دەبوون. میری هەست بە مەترسی دەکات و بڕیاریدا هێرشیان بکاتە سەر، بۆیە هیزێک لە (حرس القومی)، کە بریتی بوو لە (٤٢) ئۆتۆمبێل روو لە دارەخورما دەکەن و لە کۆتایی مانگی چواری١٩٦٢ سەرلەبەیانی هێرش دەکەنە سەر هێزی پێشمەرگە. لە بەرامبەردا مام وسوو هیزەکەی خوی دەکاتە سێ پەل ولەم شوینانە دایدەمەزرێنێت: (مە لا غەریب بە پەلێک لە سەر بێژینگ بەسەر، پەلێکی تر خەلیفە محەمەدوحاجی رەسول وچەند پێشمەرگەی ترلە مهێدییەوە بە ئۆتۆمبێلی عەزیز حوسێن کەنداری دەگەیەنرێنە دەرماناوا لە دەربەندی بەرانبەر چەغەمیرە و عالڵلا دادەمەزرێن، پەلی سێیەمیش مام وسوو لەگەڵ هاوسەنگەرەکانیان لە زۆرگی ئەصحابە دادە مەزرین و مام وسو پێیان دەڵێ تا هێزی دوژمن زۆر نزیک نەبێتەوە دەست نەوەشێنن، چونکە یەکەم نەبەردی روبەڕوومانە شەرم لە دوژمن مەکەن چۆکی خۆتان ببەستن و بێ ترس شەڕ بکەن، بەڵام رەسولی حاجی عەبدوڵلا و هاووڵاتییەک بەناوی حەسەن رەسول عدێ بەر لەوەی دوژمن بگاتە شوێنی خوازراو تفەنگەکیان لە دەست دەردەچێ و دوژمن وریا دەبێتەوە بەرەو پێشتر ناڕوات ناچار مام وسوو هێرشیان بو دەکات و ئەو رۆژە شەڕ دەست پێدەکات، دوای شەڕێکی قارەمانانە، دوژمن بە شکاوی لە کاتێکدا کە دوو لاشەی کوژراوەکانی بە جێدەهێلێت، پاشەکشەی ناچاری دەکات و دوو ئوتومبێل، کە بریتی بوون لە(جیپی سەربازی و زیلەک) و هەروەها دوو تفەنگی ئینگلیزی و تەکتریوفێک و جیهازێکی لاسلکی، دەبێتە دەسکەوتی پێشمەرگە ولەو نەبەردییە بەرەی پێشمەرگە دوو برینداری سووکیان دەبێ. لەدوبزەوە هەواڵیان پێدەگات، کە حکومەت بەیانی بە هێزێکی گەورە هێرشیان دەکاتە سەر پێویستەچارەی خۆیان بکەن مام وسو بڕیاردەدات ئێوارەی ئەو رۆژە بەردو گوندی جاستان دەچێ و هەمان شەو لە گوندی جاستان کۆدەبنەوەو چەند کەسێکی تر دێنە ناو ریزی پێشمەرگە. هەمان شەو سابیر کاکە شین و شیخەڵلا و چە ند پ.م تر لە مەرکەزی سەربەشاخ دەدەن و چەند پولیسێک بریندار دەبن. درەنگانی شەو بەرێ دەکەون بەرەو بێستانە. رۆژی دوایی دوژمن بە نیازی تۆڵەسەندنەوە بۆ سەرکوتکردنیان فرقەی چواری سەربازی بە پاپشتی تانک وزرێپوش و توپخانە و کۆمەڵێک چەکداری عەرەب بەسەرپەرشتی شیخ عەواس و حەردس قەومییەکانی ئەحمەد فەحمیش دەخاتە پاڵیان لەرێگەی دوبزەوە بەرەو قەرەچووغ پەلاماری خۆی دەست پێدەکات و دەکەونە وێزەی هاووڵاتیان و لە تولەی شکستەکەیان، زۆر لە گوندەکانی ناوچەکە تاڵان دەکەن و دواتر دەیسوتێنن،یەکەم گوند پەرکانە دەسوتێندرێ دواتر گابەرەکە و دەرمانا و وتا دەگاتە ٢٠گوند، رژێم رورەشی زۆرداری خۆی بەکردەوە سەلماند. رۆژی دوای شەڕەکە ئەو پۆلە پێشمەرگە قارەمانە لە رێگەی دێدەوانەوە دەچنە گوندی قەشقەی گەورە ولە٧-٥-١٩٦٢ لەوێش لە ئەنجامی شەر و پێکدادان لە بانی قەشقە پێشمەرگەیەکی قارەمان بە ناوی (قادر سلێمان) شەهید دەبێت و ئەحمەد شەریفی قەشقە بریندار دەبێ، زیانی دوژمن، عەرەبێک دەکوژرێ و یەکیتر بە دیل دەگیریگ حکومەت بە تێکشکاوی دەکشێتەوە دوورۆژدواتر حکومەت هێرش دەکاتە گوندی سابلاغ بەڵام شەڕ روونادات. دوای ماوەی چەند روژێک دەکەونە رێکخستنی هێزەکەیان و لە چوارچێودی یەک لقدا رێکی دەخەن و (حاکم محەمەد ساڵح یابە سەعید)دەبێتە لێپرساوی سیاسی لق و (مام وسوو دزدیی) دەکرێتەوە فەرماندەی سەربازی لقەکە ومەلا غەریب و بورهان، اغاو جەوهەر قادر سیان و مەحموود بنزین دەکرێنە سەرپەل و مام سابیر و عەزە گورگە مەفاریزی باردگای لقەکەی مام وسوو پێکدەهێنن. هەر لەوکاتەدا زۆر قارەمان وچاونەترسی تر رو ئازینە و بیستانە دەکەن ودک : عەلی تکتریوف ئەحمەدحاجی عەلی و خالە سەید کاکە و.... لەماوەی ٦-١٩٦٢تا مانگی٤-١٩٦٤ زۆر چالاکی تر کرابە فەرماندەی مام وسو لەوانە: لە ٨-١٩٦٣ جاشەکانی چل هەوێزە چەک دەکەن لە ٩-١٩٦٣ جاشەکانی دولەبەکرد دوای گیرانی رەبیەکانیان چەک دەکرێن، کە زۆربەیان کەسوکاری پێشمەرگەکانی لەگەڵ مام وسو بوون، لەمانگی ١١-١٩٦٣ حکومەت هێرشدەکاتە دیدەوان و دوشیوان تاڵان دەکەن، مەلاعاصین و عەولا ئاغاو سەعید حاجی مستەفا میردکان و

پێشمەرگەیەکی تری قارەمان شەهید دەبن وحکومەت بە زیانەکی زۆر دەشکێ لە هەمان مانگ ئاگربەسیک بۆ ماوەی ١٣ رۆژ دروست دەبێ، بەڵام گفتوگو بێ ئەنجام دەبێ میری هێرش دەکات بۆ کانی بزرەو دەیوتینێ هێزی پێشمەرگە بەرنگاریان دەبنەوەو دەستیان لێدەوەشێن، لە ئەنجامدا عەلی هەینی و پێنج جاشی زیباری دەکوژرێن لە ١٩٦٤ لە میرزاغا ئاهەنگی نەورۆز یاد دەکرێتەوە هەروەها چەند شەڕێک لەسنووری دەشتی کۆیە و چیای باواجی هیبە سوڵتان لە یەکێک لەو شەڕانە ئەحمەد چەلەبی لە بەرێخستنی کچکەی دەکوژرێ و لە سنووری دیگەلە هەر دەرەنجامی ئەو شەڕانە عەلی برنۆی دێگەلە و تاقمێک پێشمەرگەی تر پەیوەندیان بەمام وسووەکرد..... لە ١٩٦٤ دووبارە لقەکە گۆڕانی تێدا کراو رێکخرایەوە و پاشماوەیەک دووبەرەکی سەریهەڵدا بەشێکی زۆر لە هێزی پێشمەرگە پەرینەوە بۆ گوندەکانی کەسنەزان وعەسکەرو بنەو بنگردو.. مام وسو و دکتۆر خالید هاورێ بوون، بەڵام نەیاتوانی هاوبیر بن، هەرچەندە بروسکەی سەرو هاتبوو، کە مام وسو نەپەرێتەوە و لە رێگەی کاک فارس باوە بوی هەناردرابوو، بەڵام پەریبوونەوە. سەرەڕای چەند رۆژێک مانەوە مام وسو ناتوانێت بیرو باوەرە هاورێیانی پەسند بکات، بۆیە بیر لە چارەیەک دەکات دوای دابڕان لەو کۆمەڵە نوێیە و مشتومڕێکی زۆری ناوخۆی بڕیار دەدات خۆی سەردانی بارزانی بکات و بەم جۆرە بۆ بینینی بارزانی بەرەو سەنگەسەر دەکەوێتەرێ بارزانی بە دیتنی مام وسوو زۆر خۆشحاڵ دەبێ دەیان تفەنگ و بڕیکی باشی یارمەتی دەداتێ، بەڵام رازی نابێ بە گەڕانەوەی بۆ دەشتی هەولێر، داوای لێدەکات لە ناو قوتابخانەی ئاکۆی رانیە هێزەکەی خۆی دامەزرێنێت دوایی دەچنە چوارقورنە. مام وسوو بڕیار دەدات لەقسەی بارزانی دەرنەچێ، چونکە هەڵگری باوەڕێکی بەرزۆ رەوشتی لەخۆبووردن بوو، زۆرجار دەیوت کادیری کوردپەروەر ئەو کەسەیە هەوڵبدات لەگەڵ خوێگەیاندن لە پێگەیاندنی کادیری تر دریغی نەکات، چونکە کوردستان هی هەموانەو هەموومانی پێدەویت لەلایەکی تر بەرپرسیارەتی لقەکەی هەولێر درا بە کاک فارس باوەی هاوسەنگەری. لێرەوە قوناغێکی نوێ بەرووی مام وسوو کرایەوە ئیتر ئەو تەنیا پێشمەرگەو شۆرشگێڕێکی ناوچەی نەبوو بەڵکو بۆ هەموکوردستان لەخەباتدابوو بۆ کورد بەگشتی بە هەموو داب ونەریتەکانییەوە بۆیە گۆڕانێکی قوولی فیکری لە شەهیددا دروست بوو، هەروەها پێکهاتەی پێشمەرگەکانیش گۆڕا لە زۆر شوێن و ناوچەی کوردستان، پێشمەرگەی بۆ دەهات لەوانە کە دواتر زۆر قارەمانیان لێ دروست بوو بگرە چەند کەسیان خۆیان بۆ کاروانی گەلەکەیان فیدا کرد، وەک: عوسمان مستەفا ناسراو بە خاڵە دێوە مستەفا سەعید، واحیدکۆیی و زاهیرکۆیی فواد و سەلاحی عەبدە خڕەو.. مەولود ئاغای قەڵادزەو عەلی هێرۆی و عەباس عەبدوڵڵا و عەلی عەزیزو عوبێد و ئەسعەد مەلاحەسەن سورچی وحاجی جحێلو پیرۆت و قادرمەولود مامەسێنی و زەردەو قادرقوتێ و.. عومەر مەلا رەفعەت و مەغدید محەمەد رەشاش و کەریم عەزیزە کۆر ؛ عەلی خورشید زۆری نەبرد بە داخەوە پەتای خۆخۆری کوردستانی گرتەوە هاوسەنگەرانی مان ونەمان لوولەی تفەنگەکانیان پترلەوەی لەدوژمن بکەن لەبراکانیان گرت. لێرەوە مام وسوو لە زۆربەی شەڕەکانی سنووری بیتوێن و پشدەر و مەرگە و سورداش بەشداربوو، زۆرجاریش رۆڵە سەرەکییەکان لەسەردەستی ئەو و پێشمەرگە فیداکارەکانی دەشتی کاکی بە کاکییەکەی هەولێر تۆماردەکرا، لە شەڕە بەناوبانگەکان دەتوانین ئاماژە بەهەندێکیان بکەین وەک: یەکەم هەنگاو مام وسوو پێکداپرژان و شەڕی نێوان عەشیرەتی بلباس (ئیسماعیل ئاغای بلباس) و عەشیرەتی ئاکۆ (عباس ئاغای سەرکەبکان) رادەگرێ وبە فەرمانی ئیدریس بارزانی ناوبژیوانیان بۆ دەکات و زیرەکی وقسەزانی مام وسوو متمانەی هەردولا رادەکێشێ، موقەدەم عەزیز عەقراوی سەردانی دەکات بۆ گەیاندنی بڕیاری بارزانی بە گواستنەوەیان بۆ سەرسیان، زۆر لە ئاغاکانی میراودەلیش لەوشوینە بارەگایان هەبوو، چەندین بارەگای دیکەش لەوێ هەبوو، لەوانە: عیزەددین قەرەو نەجمەددینی برای هەروەها مولازم تاریق کەرکوکی بارزانی دەیزانی نیازی حکومەت چییە؟ بۆیە ئەم هێزانەی لە سەرسیان کۆدەکردەوە.لە٣-٣-١٩٦٥مام وسوو هێزەکەی دەچنە سەرسیان لە مانگی ٩-١٩٦٥ حکومەت هێرش دەکاتە بەر ئاسۆس و سەرسیان لە دەربەند تابەردەکۆزو گەرمکانی گرت و لە ئاسۆس هێزی مام وسوو گەمارۆ دەدرێن و تاسێ رۆژدرێژە دەکێشێت و

پێشمەرگە چۆکدادەدات و شەڕ دەکەن، بەڵام ناتوانێ پێتاک وتەقەمەنیان بگەیەندرێتێ بۆیە بارزانی بە بروسکەیەک داوای پاشەکشەیان لێدەکات، چونکە بەری کێوەڕەش گیرابو و ئەوان. هێزی مام وسوو دەبێتە هێزێکی گورزوەشێن لەهەرشوێنێک شەڕ هەبێت بەرەو رووی دەچن وەک بەرچاو خستنەک: قشلەی سەنگەسەر، شەڕەکانی سنووری پشدەر ومەرگەتا لە ٢٧-٤-١٩٦٦ بۆ شەڕی زۆزک و هندرێن داوا دەکرێن، لەم شەڕەدا کە زۆربەی هێزەکانی سنورەکە دامابون لە بەرەنگاری وبەردەوامبوونی گەیشتنی مام وسوو، هەموو پێوەرەکان دەگۆڕێ و هیوایەکی نوێ دروست دەکاتەوە باشترین و پیروزترین نوسین لەمبارەیەوە باسەکەی سەرۆکی هەرێم مەسعود بارزانییە بە شاهیدی خودی دوژمنەوە، چونکە خۆراگری هێزە ٣٥تا ٤٠کەسییەکەی مام وسوو بە هەموو لایەنێکی سەلماند، کە ئەگەر مرۆڤ بخوازێ چۆک بە ئاسندادەدات لەم شەڕە بەناوبانگترین لیوای سوپای عێراق (لیوای سەعید عەمۆ) تەسلیمی ئیرادەی پۆڵایینی پێشمەرگە دەبێ و کڕنوشی تۆبە دەبات لەم شەڕە، دوژمن تا سەر تیزی زۆزک هات، بەڵام پێشمەرگە بە هێزێک و چەکێکی سادە چۆکی پێدادا مام وسوو برینداردەبێ بۆجاری سێیەم و سابیر ئەمین ئەحمەد و خاڵەدێوە و ئەسعەد سورچی و قادرقوتێ و عومەر عەلیاوە بەسووکی بریندار دەبن و شەهیدێک بەناوی عەلی عەلیاوەیی. حکومەت دوای شکانی لە زۆزک دەستی بە گفتوگۆ کرد لە گەڵ شۆڕش. لەدوای ساڵی ١٩٦٦ وە زۆر شەڕی دیکەی وەکو بلقامیش و پردی ژاراوە و ماکۆک و کێوەڕەش و قەرەسەرد و چیای سارا و شەڕی سورداش و دەیان سووکە شەڕی دیکە روویدا، کە مام وسوو و لقە قارەمانەکەی، کە بە قەوارە نزیک بەتالیرێک دەبوون لە هیچ کامیان روویان وەرنەگێڕا و قارەمانانە شەڕ و ئەوینی کوردستان هاوڕێی هەمیشەییان بوو، گرنگترین شەڕ تا ئەم ماوەیە لێدانی قەڵادزێ و دەیان بەرەنگار بونەوەی تری وەک شەڕی بەستەستێن بوو، کە لەو شەڕەدا ڕێگەی گشتی بەستەستێن - قەڵادزێیان داخست و لە بەیانی تا ئێوارە شەڕ بەردەوام بوو و پێشمەرگە (نوری حاجی ئۆمەر)لەم شەڕەدا گەیشتە کاروانی شەهیدان و مام وسووش تێیدا بریندار بوو، لەگەڵ لێدانی قەڵادزێ و دەیان بەرەنگاربوونەوەی تر. بەر لە ساڵی ١٩٧٠ بەرز کرایەوە بە پلەی ئامر بەتالیۆن لە دوای بەیانی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ کرایە ئامر سریە لە فەوجی پاسەوانی سنووری قەڵادزێ و ڕانیە. لە کارەساتە نەگریسەکەی ١٩٧٥ ئاوارەی ئیران بوو، لە ساڵی ١٩٧٦ گواسترانەوە بۆ شاری هەمەدان و لەدوای ساڵێک مانەوە لە ئۆردوگاکانی پەنابەران لە رەبت و جەهروم، ساڵی ١٩٧٨بە دەستپێکردنەوەی شۆڕشی گوڵان بوو بە کادیرێکی چالاک و ڕێکخستنەوەی پەنابەران بەنیازی بەشداربوونیان لە شۆڕشی نوێ و هەڵگرتنەوەی چەکی پێشمەرگایەتی، چەند سەردانێکی کاک (ئیدریس بارزانی) کرد و لەگەڵ (عەبدولڕەحمان حاجی عەلی و محەمەد مەلا تاهیر و مەلو خدان سەعدی گەورە و زۆر پەنابەری تر بڕیاریاندا بگەڕێنەوە پاڵ هێزی پێشمەرگە و بۆ ئەمەش دەبوایە بەنهێنی لە ئێران دەربچن و بگەنە سنووری تورکیا، بەڵام بە هۆی زەمان لێدانی پەنابەرێکی پیاوی ساواکی ئێران دەستگیرکراو ماوەی ٢ مانگ بێ سەر و شوێن بوو، تا بە هەوڵێکی زۆری کاک ئیدریس بارزانی بنەماڵەکەی لە دەست ساواک رزگاری بوو، بەڵام لە ژێر ئەشکنجە چاوێکی لە دەستدا، هەروەها ساواک خستییە ژێر چاودێری ناچاری و هاتوچۆی لێ قەدەغە کرد، لە ١٩٧٩ دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران گەڕایەوە کوردستانی ئێران و لە شاری نەغەدە نیشتەجێبوو و چەکی شەڕەفی لە شان کردەوە و مەقەری لە ئوردوگای زیوە دانا، دوایی گواسترایەوە بۆ ئالوتان و خدرئاوای پیرانشهر، ئەمجارەش هەروەکو جاران سەرەڕای پیری و نەخۆشییەکانی بە حەسانەوە رازی نەبوو، بە پۆلێک پێشمەرگەوە دابەزینە سنووری حاجی ئومەران و لە سەربازگەی حاجی ئۆمەرانیان توپباران کرد و لە ڕێگای گەڕانەوەش تووشی زۆر کورتە شەڕ بوون لەگەڵ جاشەکان، تا دەرئەنجام لە ساڵی ١٩٨٥ هیچ توانایەکی جەستەیی وەکو پیویستی نەما و چاوەکانی بەرەو کزی چوون و دوو جار تووشی جەڵتەی دڵ هات تا سەرئەنجام لە شەوی ٢٠لەسەر ٢١/٢/١٩٨٩ لە غەریبی و ئاوارەیی کۆچی دوایی کرد و گڵکۆکەی مام وسوو لە پاڵ مەلۆی ئامۆزای و سەلیمی برازای لە گۆڕستانی نەغەدە -پیرانشهر بە خاک سپێردرا.

**لە هەفتەنامەی بەدرخان بڵاوکراوەتەوە.**

# کاکە زیاد ئاغا
# ١٩١٤-١٩٩١

کاکە زیاد ناوی تەواوی، حەمەزیاد ئاغای کوڕی حەمەئاغای کۆیەیە. لە سەرەتای ساڵی ١٩١٤دا لە شارەکەی کۆیە لەدایک بووە و کاتێک کە حەمەئاغای باوکی لە ڕۆژی ٢/٨/ ١٩٢٠دا کۆچی دوایی دەکات. ئەم تەمەنی شەش ساڵان دەبێ و دەخرێتە بەر خوێندن لە قوتابخانە سەرەتایی شارەکەی و، تاکو پۆلی پێنجەمی سەرەتایی دەخوێنێ، لە ڕێگای خوێندنی تایبەتیشەوە بەچاکی فێری زمانی کوردی و عەرەبی بەخوێندنەوە و نووسین و ئەدەبیاتەوە بووە.

کاکە زیاد لەگەڵ پەرەسەندنی بزووتنەوەی کوردایەتی و بەرپابوونی شۆڕشی یەکەمی بارزان، بەسەرکردایەتیی شێخ ئەحمەدی بارزانی لە ساڵانی ١٩٣١ و ١٩٣٢دا تێکەڵ بەو بزووتنەوەیە بووە و لەو ساڵانەوە لەگەڵ دەستەیەک لە ڕۆشنبیرانی ئەوسای کۆیە، وەک ڕەشید عارف سەقا و مستەفا خۆشناو و سابیر ئیسماعیل حەمەد و عوسمان عەونی شاعیر و کاکەی حاجی مەحموود و عەبدولسەمەد بەننا و تاهیر سادق ئەحمەد و زەکی ئەحمەد هەناری کۆمەڵەی لاوانیان لە کۆیە پێکەوە ناوە. لە ناو خەڵکەکە پێیان گوتراوە (کۆمەڵەی منەوەران). کەچی هەر لقێک بوون لە کۆمەڵی



لاوانی کورد، کە لە شارەکانی بەغدا و کەرکوک و سلێمانی و هەولێر چالاکییان بووە و هۆشیاریی سیاسییان لە ناو لاوانی کورددا بڵاو دەکردەوە و داوای مافی نەتەوەیی کوردیان دەکرد.

لەگەڵ دامەزراندنی (حزبی هیوا)ی کورد، (کاکە زیاد) و دەستەی ڕۆشنبیرانی کۆیە لە سەرەتای ساڵی (١٩٤٠)ەوە چوونەتە ناو ئەو حزبە نەتەوەییەی کورد و چالاکییان نواندووە. لە دوای دروستبوونی کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد (ژ.ک) لە کوردستانی ئێران، کاکە زیاد و هاوبیرانی پەیوەندییان پێوە کردووە و نامەی پشتگیرییان بۆ ناردوون. ئەدەبیاتی ئەو ڕێکخراوەیان بۆ هاتۆتە کۆیە. لە ساڵی ١٩٤٤دا لە کۆیە و لە کۆڕ و دانیشتنەکانی لەگەڵ کوردپەروەرانی وەک (عەبدولسەمەد بەننا) و (عوسمان عەونی شاعیر) و (عومەر عەبدوڵڵا) و زەکی هەناری لە چۆنیەتیی یاربدەدانی شۆڕشی بارزان بەسەرۆکایەتیی مەلا مستەفای بارزانی دەدوان و بیروباوەڕی کوردایەتییان لە ناوچەی کۆیەدا بڵاو دەکردەوە.

کاکە زیاد و هاوڕێکانی لە دوا دوای ساڵی ١٩٤٥ و سەرەتای ١٩٤٦دا پەیوەندییان بەحزبی ڕزگاری کوردەوە کرد، کە لە کوردستانی عێراق لەگەڵ حزبی شۆڕش لەسەر هەیکەلی حزبی هیوا دامەزرا بوون. کە کۆماری دیموکراتیی کوردستان بەسەرۆکایەتیی پێشەوا قازی محەمەد لە ٢٢/١/١٩٤٦دا دامەزرا، کاکە زیاد پەیوەندیی بەزۆربەی سەرەک عەشیرەتەکانی کوردەوە کرد، تاکو بەهەمووان یارمەتیی ماددی و مەعنەوی بدەن و بەردەوام لە ڕێگای نەقیب بەکر عەبدولکەریم حەویزی و ڕەئیس مستەفا خۆشناوەوە یارمەتی و پیتاکی بۆ ئەو کۆمارە ساوایەی کورد دەناردە مەهاباد. کاتێکیش کە ئەو کۆمارەی کورد بەدەستی دوژمنانی ڕووخێنرا، هەندێ لەکاربەدەستانی ڕوویان کردە باشووری کوردستان، وەزیری ڕاگەیاندنی ئەو کۆمارە، بەڕێز "سدیق حەیدەری" هاتە کۆیە و کاکە

زیاد لە ماڵی خۆیدا بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ میوانداریی کرد و حەواندییەوە.

لە دوای لەباربردنی شۆڕشی (١٩٣٤-١٩٤٥)ی بارزان و دامەزراندنی کۆماری دیموکراتیی کوردستانی ئێراندا، باری سیاسیی باشووری کوردستان گۆڕا و وای دەخواست، کە حزبێکی نەتەوەیی جەماوەریی دابمەزرێ تاکو کاروباری ئەو قۆناغە نوێیەی ژیانی کورد رێک بخات و هەڵیسووڕێنێ. وابوو لەسەر ڕاسپاردەی بارزانی، خەباتگێڕی کورد "هەمزە عەبدوڵڵا" لە مەهابادەوە نێردرا بۆ کوردستانی عێراق و پەیڕەو و پرۆگرامی ئەو حزبەی پێدا ناردراو، بارزانی رای سپارد کە شێخ لەتیفی شێخ مەحموودی حەفید بۆ جێگری یەکەمی سەرۆکی حزب و کاکە زیاد بۆ جێگری دووەمی دابنرێ. وابوو کاک هەمزە هاتە باشووری کوردستان و هەوڵ و کۆششەکەی سەرکەوت و حزبەکانی شۆڕش و رزگاری خۆیان هەڵوەشاندەوە و لە ١٦/٨/١٩٤٦دا کۆنگرەی دامەزراندنی پارتی لە بەغدا بەسترا و یەکەمین کۆمیتەی ناوەندی و سەرکردایەتیی هەڵبژێردراو بەمجۆرە بوو:

١- مەلا مستەفای بارزانی- سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان
٢- شێخ لەتیفی شێخ مەحموود- جێگری یەکەمی سەرۆک.
٣- کاکە زیاد ئاغا- جێگری دووەمی سەرۆک.
٤- هەمزە عەبدوڵڵا- سکرتێری گشتیی پارتی.
٥- دوکتۆر جەعفەر محەمەد کەریم- ئەندامی مەکتەبی سیاسی.
٦- عەلی عەبدوڵڵا موهەندیس- ئەندامی مەکتەبی سیاسی.
٧- عەبدولکەریم تۆفیق- ئەندامی مەکتەبی سیاسی.
٨- رەشید عەبدولقادر- ئەندامی مەکتەبی سیاسی.

ئەمانەی خوارەوەش بەئەندامی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردران:

١- میرحاج ئەحمەد.
٢- مەلا سەید حەکیم خانەقینی.
٣- عەونی یووسف.
٤- ساڵح یووسفی.
٥- رەشید باجەلان.
٦- مستەفا خۆشناو.
٧- تەها محیەدین مەعرووف.

لەوساوە کاکە زیاد وەک ئەندامێکی کۆمیتەی ناوەندی و جێگری دووەمی سەرۆکی پارتی، خزمەتی بزووتنەوەی رزگاریخوازیی کوردی کرد، لە ساڵی ١٩٤٧دا لە دائیرەی هەڵبژاردنی کۆیە بەناوی پارتی، خۆی بۆ ئەندامێتیی پەرلەمانی عێراق پاڵاوت و لە هەڵبژاردنەکەدا دەرچوو. لە پەرلەمان دەورێکی باشی بوو بۆ داواکارییەکانی خەڵکی کوردستان و هاوکاریش بوو لەگەڵ کوتلەی نوێنەرە بەرهەڵستکارەکانی حکوومەت و لە کانوونی ١٩٤٨دا، لە کاتی راپەڕینە نیشتمانییەکەی گەلی عێراق (استیقالە)ی لە پەرلەمان کرد وەک پرۆتستۆیەک لە دژی (پەیمانی پورتسموپ). بەڵام حکوومەتی ساڵح جەبر پەیمانەکەی هەڵوەشاندەوە، ئەویش تاکو کۆتایی دەورەی پەرلەمان لە ١٩٤٩دا وەک ئەندامێکی موعارەزەی سیاسەتی حکوومەتی عێراق مایەوە.

کاکە زیاد لە ساڵی ١٩٥٢دا وەک نوێنەری پارتی چووەتە ناو بزووتنەوەی ئاشتیخوازانی عێراق لەگەڵ شێخ عەبدولکەریم ماشیفە و تۆفیق مونیر و دەستەیەک لە کەسی نیشتمانی، بەئەندامی ئەنجوومەنی نیشتمانیی ئاشتیخوازانی عێراق هەڵبژێردران. کاکە زیاد نەک هەر لە نێو ئاشتیخوازانی عێراق ناسراوە، بەڵکو لە جیهانیش وەک کەسایەتییەکی بەدەرەوەی ئاشتیخواز ناسراوە و رێزی لێ گیراوە.

**کاکە زیاد و شۆڕشی ئەیلوول:**

کە شۆڕشی ئەیلوول لە ١٩٦١دا هەڵگیرسا، زوو کاکە زیاد دەسگیر کرا و حکوومەت رەوانەی بەندیخانەی "کووت"ی کرد، وەکو لە ساڵی ١٩٦٣دا بەردرا و گەڕایەوە کۆیە. دوای دەستپێکردنەوەی شەڕ لە کوردستان لە ٩ی حوزەیرانی ١٩٦٣ چووە پاڵ شۆڕش. کاتێک کە شۆڕشی کورد لە ساڵی ١٩٦٤ ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕشی دامەزراند کاکە زیاد کرا بەئەندامی تەنفیزی ئەو ئەنجوومەنە. بەمجۆرە کاکە زیاد بەردەوام لە شۆڕشی کورد جودا نەبۆتەوە و لە دوای نسکۆهێنانی شۆڕشەکەش هەر لەسەر ئەو رێبازە دەمێنێتەوە و ژیانێکی ناخۆش لە ئاوارەیی بەسەر دەبات تاکو لە دوای راپەڕینە مێژووییەکەی گەلی تێکۆشەری کوردستان کەوتە شاری نەغەدەی کوردستانی ئێران. هەر لەوێ لە رۆژی ١٢/٤/١٩٩١دا کۆچی دوایی کرد، هەزاران سڵاو لە گیانی پاکی ئەم تێکۆشەرە کوردە.

**کەریم شارەزا**

# عەلی حەیدەر سولەیمان
# ١٩٠٥-١٩٩١

عەلی حەیدەر كوڕی سولەیمان بەگی ڕەواندزی لە ساڵی ١٩٠٥دا لە شاری دێرینی ڕەواندز چاوی بەژیان هەڵێناوە و كوڕە گەورەی سولەیمان بەگی كوڕی عەلی بەگی سیلاح شور زادەیە و لە نەوەی میری سۆرانە و دەچێتە سەر میر ئەحمەد بەگی مامی محەمەد پاشای ڕەواندزی.

خوێندنی سەرەتایی لە رواندز و ناوەندیی و ئامادەییشی لە شاری مووسڵ تەواو كردووە و لە ساڵی ١٩٢٦دا چووەتە لوبنان و لە شاری بەیرووتی پایتەخت لە زانكۆی ئەمریكی خوێندوویەتی و لە ساڵی ١٩٣٠دا خوێندنی زانكۆی تەواو كردووە و بڕوانامەی بەكالۆریۆسی لە زانستە سیاسییەكان وەرگرتووە.

كە گەڕاوەتەوە بەغدا بەمامۆستا دامەزراوە، ئینجا كراوە بەسەرپەرشتیاری پەروەردەیی لە وەزارەتی مەعاریف و لە ماوەی مامۆستایی و سەرپەرشتیاریدا دوو كتێبی مێژوویی نایابی بەزمانی عەرەبی، لەسەر ڕێبازێكی زانستی داناوە، كە ئەمانەی خوارەوەن:

١- مێژووی شارستانیەتی ئەوروپا- لە ساڵی ١٩٣٢دا چاپ كراوە.

٢- مێژووی ئەوروپای نوێ - لە ساڵی ١٩٣٧دا چاپ كراوە.



عەلی حەیدەری مێژوونووس لە ساڵی ١٩٣٣دا گوێزراوەتەوە بۆ وەزارەتی ناوەخۆ و لە نووسینگەی تایبەتی ئەو وەزارەتە كراوە بە (تێبینە) و لە ساڵی ١٩٣٥دا كراوە بەیاریدەدەری بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی وەزارەتی ناوەخۆ و لە ساڵی ١٩٣٧یشدا گوێزراوەتەوە بۆ سلكی دیپلۆماسی سەر بەوەزارەتی دەرەوەی عێراق و كراوە بەسكرتێری موفەوەزییەی عێراق لە ڕۆمای پایتەختی ئیتاڵیا، دوای ماوەیەك گوێزراوەتەوە بۆ قاهیرە.

لە ساڵی ١٩٤٨دا بەنوێنەری ڕەواندز لە پەرلەمانی عێراق هەڵبژێردراوە و لە ١٩ی ئابی ١٩٤٨دا كراوە بەوەزیری كاروباری كۆمەڵایەتی و لە ١٩٤٩/١٢/١٠دا كراوە بەوەزیری هاتوچۆ و ئەشغال و لە ساڵانی ١٩٥٠ تا ١٩٥٢ دوو جار بەنوێنەری ڕەواندز بۆ پەرلەمان هەڵبژێردراوە.

عەلی حەیدەر لە ساڵی ١٩٥٦دا كراوە بەباڵیۆزی عێراق لە (بۆن)ی پایتەختی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا و دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨یش لە ڕەوت نەكەوتووە و كراوە بەوەكیلی وەزارەتی دەرەوەی كۆماری عێراق و لە مانگی ئاداری ١٩٥٩دا دەكرێتە باڵیۆزی عێراق لە واشنتۆن. ئینجا دەگوێزرێتەوە بۆ سویسرا و لە ساڵی ١٩٦٦دا دەكرێتە باڵیۆزی عێراق لە ڕۆما و لە ساڵی ١٩٦٨دا خانەنشین دەكرێ و لە ١٩٩١/٩/٥دا كۆچی دوایی كردووە لە ١٩٩١/٩/٦دا لە بەغدا نێژراوە.

**كەریم شارەزا**

# ڕەشاد موفتی
# ١٩١٥ - ١٩٩٢



لەو پیرە هەولێرە، چەندین كەسایەتیی ناودار هەڵكەوتوون، كە شوێنێكی دیاری ئایینی و ڕۆشنبیری و كۆمەڵایەتی خۆیانیان هەبووە، ئەو كەسایەتییانە بوونەتە هێمایەک و هەمیشە مایەی ڕێز و شانازی گەلەكەیان بوون، چونكە ڕۆڵی بەرچاو و كاریگەری خۆیان هەبووە، لە هوشیاركردنەوە و ڕۆشنبیركردنی خەڵكی، بۆ ئەوەی بەرۆحێكی نیشتمانپەروەرانەی ڕەسەن خزمەت بە مێژووی گەلەكەیان و نەتەوەكەیان بكەن، یەكێک لەو زاتانە مامۆستا (ڕەشاد محەمەد موفتی)یە، كە چ لەلای توركمانەكان و چ لەلای كوردەكان پلە و پایەكی زانستی و مەعریفی و ئایینی و كۆمەڵایەتیی خۆی هەبووە، كە هەمیشە خەڵكی ئەو شارە بەهەموو نەتەوە و نەژادەكانیانەوە شانازی پێوە بكەن.

**ڕەشاد موفتی كێیە؟**

زانای ئایینی و شاعیری ناودار مامۆستا ڕەشاد موفتی، كوڕی محەمەد ئەفەندی موفتی كوڕی مەلا عوسمانی مەلا ئەبوبەكرە، كە بە (مەلا گچكە) ناسراوە. ساڵی ١٩١٥ لە بنەماڵەیەكی دێرینی زانستپەروەر و ئایینپەروەر و ئەدەبدۆست لە كوردستاندا لە قەڵای هەولێر لەدایک بووە. بەدرێژایی پتر لە ٤٠ ساڵ لە چەندین بواری جیاجیادا خزمەتی شاری هەولێری كردووە.

لە تەمەنی شەش ساڵییەوە چۆتە قوتابخانەی سەرەتایی لە شاری هەولێر، تا گەیشتۆتە پۆلی شەشەم، بەڵام لەبەرئەوەی باوكی ئارەزووی ئەوەی كردووە، كە كوڕەكەی خۆی تەرخان بكات بۆ خوێندنی ئایینی، لە قوتابخانە دەری دێنێ، بۆ ئەوەی لەسەر دەستی ئەو زانستی جیاجیای ئیسلامی بخوێنێ، لەوێشەوە فێری تەفسیری قورئانی پیرۆز و فەرموودە و زمانی عەرەبی و ڕەوانبێژی و ئەدەبی عەرەبی و زانستی لۆژیک و فەلەكناسی بوو.

ساڵی ١٩٣٤ باوكی ناردییە میسر- بۆ ئەوەی لە شاری قاهیرە، لە (ئەزهەر) بخوێنێ، لەوێ بۆ ماوەی دوو ساڵان چەندین زانستی ئایینی خوێند و بڕوانامەی ئەو زانكۆیەی وەرگرت، ئینجا ساڵی ١٩٣٦ گەڕایەوە هەولێر، لەو ماوەی خوێندنەیدا زۆر كاریگەر بوو بەزانست و شێواز و بیری چەندین لە مامۆستاكانی خۆی، لەوانە: شێخ محەمەد عەلی مەراغی، شێخی ئەوكاتی ئەزهەر و شێخ عومەر وەجدی، مێژوونووس محەمەد عەلی عەونی كوردی، وێڕای سەرسامبوونی بە شێخ محەمەد عەبدە و تێڕوانینی هاوچەرخانەی ئەو.

لە گەڕانەوەشیدا لەسەر هەمان ڕێچكەی جارانی خۆی، لەسەر دەستی باوكی (محەمەد موفتی) و ئامۆزای باوكی (مەلا فەندی) خوێندنی خۆی پەرە پێ دا، تا بوو بە یەكێک لە زانا ناودارە ئایینییەكان، لە ساڵی ١٩٤٤ بوو بەوتارخوێن و مودەریس و ئیمام لە مزگەوتی گەورەی قەڵات.

كاتێكیش ڕۆژی ٢٧/١٠/١٩٤٦ باوكی ماڵئاوایی لە دنیا كرد، لە شوێنی باوكی بوو بە وتارخوێنی مزگەوتی ناوبراو، بۆیە مێژوو ئەوە لەبیر ناكات كە (ڕەشاد موفتی) یەكەم وتارخوین بوو، كە دوای ماوەیەک وتار خوێندنەوەی بەزمانی كوردی وتاری ئایینی لەسەر مینبەری مزگەوتدا پێشكەش بكات.

ساڵی ١٩٥٦ مامۆستا ڕەشاد بوو بە قازی شەرعی لە كەركووک، پاشان ساڵی ١٩٥٧ گواسترایەوە سلێمانی، دواتریش بۆ هەولێر.

دوای ئەوەش کە بۆ ماوەی بیست و دوو ساڵان وەک قازییەک خزمەتی شارەکەی خۆی کرد، ساڵی ١٩٧٨ خانەنشین کرا. هەروەها مامۆستا (ڕەشاد موفتی) لە ژیانی خۆیدا بۆ چەندین شوێنی تایبەتی داندراوە، لەوانە:

ساڵی ١٩٥٨ ئەندامی ئەنجوومەنی زانستی ئەوقاف بوو لە هەولێر، لە پاشان بۆتە سەرۆکی ئەنجومەنی زانستی هەرێمی کوردستان. ئەندامێکی فەخری کۆمەڵەی مافپەروەران بووە لە عێراقدا، ئەندامێکی کۆڕی زانیاریی عێراقی- دەستەی کوردی- بووە، ئەندامێکی چالاکی یەکێتیی نووسەرانی کورد و کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کوردی بووە.

مامۆستا ڕەشاد موفتی- زمانی کوردی، تورکی، عەرەبی، فارسی بەچاکی زانیوە.

بەرهەمەکانی: مامۆستا ڕەشاد موفتی وێڕای ئەوەی ئەدیبێکی پایەدار و شاعیرێکی پڕ لە بەرهەم بووە، چەندین بەرهەمی کتێبی داناوە لە بواری ئایینی و ئەدەبیدا، لەوانە:

١- مەولوودی پێغەمبەر (شیعرە بەزمانی کوردی).
٢- راحة الابدان في صوم رمضان (عەرەبی).
٣- اعادة الظهر بعد الجمعة لظلمة القبر الشمعة (عەرەبی).
٤- تحفة الاصفياء في التوسل بالانبياء (عەرەبی).
٥- قصيدة البوردة (شیعری کوردی). بەهەمان کێش و قافیە.

وێڕای ئەوەی پانزدە دەستنووسی هەیە، کە زۆربەیان بەزمانی کوردین و ئێستا ئەو دەستنووسانە لەلای کوڕی گەورەی مامۆستا (عوسمان ڕەشاد موفتی) پارێزراوە و لە چاوەڕوانی چاپکردندان- دەستنووسەکانیش بریتین لە:

١- الاسراء والمعراج - بەزمانی کوردی.
٢- فلسفة الحياة والموت - بەزمانی کوردی.
٣- ئیسماعیل نامە - شیعر بەزمانی کوردی.
٤- عبا نامە - شیعر بەزمانی کوردی.
٥- سبائل الاملا في سلسلة جدي كچك ملا -بەزمانی عەرەبی.



٦- السعادة الابدية في الطريقة النقشبندية - بەزمانی عەرەبی.
٧- سيرة الشيخ عبدالقادرالگيلاني - بەزمانی کوردی.
٨- سيرة الشيخ حسام الدين النقشبندي - بەزمانی کوردی.
٩- سيرة الشيخ معروف الكرخي - بەزمانی کوردی.
١٠- سيرة الشيخ نورالدين بريفكاني - بەزمانی کوردی.
١١- سيرة الشيخ السيد احمد البدري - بەزمانی کوردی.
١٢- ديوان شعر باللغة العربية والكوردية والتركمانية والفارسية.
١٣- مجموعة كبيرة من خطب الجمعة - بەزمانی عەرەبی و کوردی.
١٤- تاريخ مساجد اربيل - بەزمانی عەرەبی.
١٥- مجموعة كبيرة من مقالات دينية.

وێڕای ئەوەی مامۆستا ڕەشاد - زانایەکی ئایینی و شاعیرێکی پایەدار بوو، کەسایەتییەکی کۆمەڵایەتیی ناسراویش بوو لە هەموو کوردستاندا، وەکو باوکی ئارەزووی لە زانست و نزیکبوونەوە لە زانایان هەبوو، پیاوێکی ڕووخۆشی (متواضع) بوو، بوێر و بەهەڵوێست بوو، لە هەڵوێستە ئایینی و نیشتمانییەکانیدا دیوەخانەکەشی لە ماڵەکەی خۆیدا، هەمیشە کۆڕی زانست و زانیاری بوو، هەمیشە پڕ بوو لە پیر و جحێڵ.

مامۆستا ڕەشاد موفتی، لە ١٩٩٢/٩/١٢ ماڵئاوایی لە دنیادا کرد، ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی ئێجگار جگەربڕ بوو لەلایەن هەموو خەڵکی شارەکەی و هەموو ئەوانەی ئەو پیاوە مەزنەیان بەگەورەیی خۆیەوە دەناسی، گۆڕستانی (باداوە)ش بووە دوا مەزاری پیرۆزی.

### ڕەشاد موفتی و شێخ محەممەدی خاڵ

پێشتر ئاماژەمان بەوە دا، کە مامۆستا ڕەشاد موفتی پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ چەندین کەسایەتیی ناودار هەبووە، بەتایبەت لەگەڵ پیاوانی ئایینی، لەوانەش لەگەڵ شێخ محەممەدی خاڵ.

شێخ محەممەدی خاڵ چەند مانگێک پێش

ماڵئاواییکردنی دووچاری کوێربوون هات لە بەرەنجامی شەونخوونی و خوێندنەوەی زۆری زانست و ئەدەبی کوردی، کە نیو سەدەیەکی خایاند.

لەو ساتانەدا مامۆستا (ڕەشاد موفتی) سەردانی کرد، بەڵام هەر لە دوورەوە، وەک ئەوەی بۆنی مامۆستا ڕەشادی کردبێت گوتی: گوێم لە دەنگی ڕەشادەفەندییە؟! زۆر بەپەرۆشەوە بەخێرهاتنی کردبوو، پاشان پێی گوتبوو دەبینی چۆن چاوەکانم لەدەست داوە!

مامۆستا (ڕەشاد)یش باوەشی پێدا کردبوو گوتبووی: چۆن قسەی وا دەکەیت مامۆستا، تۆ ئەگەرچی ڕووناکی لە چاوەکانتدا گووم بووە، بەڵام چاوی ملیۆنەها کوردت بەعیلم و ئەدەبی خۆت ڕووناک کردەوە، بۆیە چاوی هەموو خوێنەرێکی دڵسۆز چاوی تۆیە، تۆش دنیا بەچاوی خۆتەوە دەبینیت، ئەوەندەت پێشکەش بە ئایین و زانست و ئەدەب کردووە، کە ناوی تۆ نەمرێنێ.

ساڵی ١٩٩٢ -یش کە ماڵئاواییمان لە مامۆستا ڕەشاد موفتی کرد، ماڵئاوایشمان لە شێخ محەممەدی خاڵیش کرد، ئەویش لەو زاتانە بوو، کە هەموو ژیانی بۆ خزمەتی ئایین و زانست و کۆمەڵەکەی بەخشی.

**لەبارەی ڕەشاد موفتی چی گوتراوە؟**

زۆر لە زانایان و ناوداران و کەسایەتی دیار و بەرچاو لەبارەی مامۆستا ڕەشاد موفتی قسەیان کردووە و هەستی خۆیان لەبارەی ئەو زاتە دەربڕیوە، کە تەمەنی خۆی بۆ خزمەتی گەل و نیشتمانەکەی بەپایان گەیاند. لەوانە مامۆستا مەلا محەممەد مەلا قادر دەڵێت: هەموو لایەکمان دەزانین لە کوردستانی مەزندا، لە مێژووە دێرینەکەیدا بەتایبەتی لە مێژووی ئیسلامەتیدا بەهەزاران عالم و زانای گەورەی بەدنیادا هێناوە، گەورە پیاوانی وەکو مەولانا خالید نەقشبەندی و شێخ مەعرووفی نۆدەهەی عەلامەی قزڵجی، ئیبن ئادەم و سەدان و هەزارانی دیکە، نیشانەی ئەم ڕاستییەن.

لە هەولێری ئێمەشدا، هەولێری کۆنی دێرینمان، لە مێژووی پێش ئیسلامەتیدا، پاش ئیسلامەتیش، بەدەیان و بەسەدان زانای گەورە و مەزنی لە باوەشی خۆی گرتووە، ئیبن خولەکان، ئیبن مستەوفی، شێخ ئەبوبەکری هەرشەمی نەقشبەندی، شێخ مستەفا نەقشبەندی، مەلا ساڵحی کۆزەپانکە و مەلا محەممەد ئەمین سوێری و دەیان و سەدانی دیکەی ئەم شارە شاهیدی ئەم ڕاستییەمانن، جەنابی قازی ڕەشاد ئەفەندیش یەکێکە لەم گەورە پیاوانە.

د. محەممەد ئەحمەد گەزنەیی دەڵێت: من یەکێک بووم لەو کەسانەی نەمدەزانی وەفاتی ئەم زاتە ئەوەندە کاریگەرە، نەمدەزانی بارکردنی ئەو زاتە لە شاری هەولێر، ئەوها قەڵاتی هەولێر دەهەژێنێ. نەمدەزانی بوونی ئەو زاتە ئەوەندە سوودبەخشە بۆ بەرزی ئایین و زانایانی ئایین، ڕاستە دەڵێت هەندێ نیعمەت هەن وەکو تاجی سەرن ئادەمیزاد نایانبینێ تا نەکەوێ، کە کەوتیش فائیدەی نامێنێ..

خوالێخۆشبوو ئازاد قەرەداغی دەڵێت: خوالێخۆشبوو ڕەشاد ئەفەندی وەک زانایەکی گەورەی ئایینی ئیسلامی پیرۆز، شەخسیەتێکی گەورەی ئەم شارە کوردپەروەر بوو، کە بەتوانا و جورئەتەوە لە سەرانسەری کوردستان و عێراقدا، توانی تەمەنی پیرۆزی خۆی تەرخان بکات، چ لە ڕێگای وەزیفە بێ، وەک قازی شەرعی یا لە بواری خوتبە و خزمەتکردنی ئایینی پیرۆزی ئیسلامی و نووسینی کتێب و دانانی لێکۆڵینەوە، کە ڕاستەوخۆ لە خزمەتی ئایین و زمان و بیری کوردایەتی دابووە.

مامۆستا زوبێر بیلال ئیسماعیل -یش لە کتێبەکەی (علماء و مدارس فی اربیل) دەنووسێت و دەڵێت: بنەماڵەی مامۆستا ڕەشاد موفتی یەکێکە لە ناودارترین بنەماڵەکانی زانست لە کوردستاندا، کە ئاستێکی بەرزی هەبوو بۆ خزمەتی ئایین و بەدرێژایی سەدان ساڵ یان بەدرێژایی ٥٠٠ ساڵ خزمەتیان کردووە، مزگەوتەکەیان مزگەوتی گەورەی قەڵاتی هەولێر، مینبەری زانست بووە، کە لەهەموو سووچێکی کوردستاندا ناوی هەبووە.

ئەبوبەکر کە باپیرەیان بووە، پێش ٥٠٠ ساڵ هاتۆتە هەولێر، ئەو پەیڕەو و پرۆگرامەی هەبووە بۆ خزمەتکردن، هەتا گەیشتۆتە مامۆستا ڕەشاد موفتی.

د. عەبدوڵلا حەدادیش دەڵێت: ڕەنگە زۆر کەس هەن لەوە بێ ئاگا بن، کە زانا و ئەدیبی ناودار مامۆستا ڕەشاد موفتی، شەو و ڕۆژ خۆی لێک گرێ دەدا بۆ خزمەتی خەڵکی، هەموو کات و پشوودانی تەندروستیی خۆی بۆ پێشوازیکردنی ئەوان تەرخان کردبوو لە هەموو کاتێکدا، دەرگای واڵا بوو بۆ ئەوانەی دەیانەویست گوێ لە ئامۆژگارییەکانی بگرن، دیوەخانەکەی وەکو قوتابخانەیەکی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و ئایینی وا بوو، خوا توانایەکی زۆری دابووێ لە ڕووی بوونەوەی کێشە و گرفتەکان، قەتیش گلەیی و سکاڵای لە دەست ئەو

گرفتانەدا نەدەکرد، کە ڕووبەڕووی دەبوونەوە، خاوەنی سەبر و خۆگری بوو.

خوالێخۆشبوو مامۆستا هادی ڕەشید چاوشلییش دەڵێت: ڕەشاد ئەفەندی - بەبوێری و ئازایەتی دەناسرایەوە، لە ڕۆژانی تەنگەتاویدا، بەتایبەت لە ساڵانی ١٩٨٧ و ١٩٨٨ لە چەندین دیداردا، ناوە ناوە کۆمەڵێ لە پیاوانی هەولێر کۆدەکردەوە، کە نزیکەی ٤٠ کەسێک دەبوون، لەوانەی، کە دووچاری زەرەر و زیانی ماددی و مەعنەوی هاتبوون، کەس لەوانە جورئەتی قسەکردنی نەدەبوو تەنیا ڕەشادەفەندی و ژمارەیەکی کەم لە ئامادەبووان نەبێت، ئەو تێبینییەکانی خۆی بەجورئەتەوە دەدرکاند وێڕای ئەو هەلومەرجە نائاساییەی، کە ناوچەکە پێیدا تێدەپەڕی.

(حەمید مطبعی)یش لە کتێبەکەی (اعلام العراق في القرن العشرين- ١٩٩٩) باسی مامۆستا ڕەشاد دەکات کە چۆن لە بنەماڵەیەکی ئایینی و خەتیب و مودەرسی و قازی و ناوداری شاری هەولێر و کوردستان بووە.

**ڕەشاد موفتی شاعیر**

مامۆستا ڕەشاد موفتی - وێڕای ئەو زانستە ئایینییە بەرفرەوانەی هەیبوو، ئەدیبێکی زمان پاراو و شاعیرێکی بەتوانا بوو، هەمیشە هەوڵی ئەوەی دەدا لە ڕیزی نووسەر و ئەدیباندا- خەبات بکات و قەڵەمەکەی بۆ بەرژەوەندیی گشتی میللەت بەکار بێنێ، بۆیە هەر لەگەڵ پێکهێنانی یەکێتیی نووسەرانی کورد، بوو بە ئەندامی یەکێتیی نووسەرانی کورد - لقی هەولێر، لەم بوارەشدا بەرهەمی خۆی لە شێوەی کتێب و نامیلکەی جۆراوجۆر بڵاو کردۆتەوە، وێڕای ئەو چەندین دەستنووسانەی کە لە دوایدا بەجێ ماون، بێجگە لە یەکێتیی نووسەران ئەندامێکی کارای کۆڕی زانیاری کورد بوو، لەگەڵ کردنەوەی کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کوردی، لقی هەولێر، لەوێش بۆتە ئەندام و ڕۆڵێکی بەرچاوی تێدا گێڕاوە.

بەگوێرەی شیعرەکانی، مامۆستا ڕەشاد بەپێی ئەو کەشوهەوایەی تێیدا ژیاوە، زۆربەی شیعرەکانی ستایشی ئایینی بوونە، بەتایبەت لە مەولوودنامەدا تاوەکو ئێستاکەش لەو مەولوودانەی کە دەخوێندرێتەوە، پشتی پێ دەبەستن ئەوەتا دەڵێت:

**بەو زمانی کوردییەی شیرین زمان**
**بەحسی فەخری هەردوو عالەم کەم بەیان**
**با نەڵێن کوردی نییە مەدحی نەبێ**
**من وەهام نووسی کەس قسەی نەبێ**

مامۆستا کەریم شارەزا دەڵێت: مامۆستا ڕەشاد کوڕی محەمەد عوسمان موفتی، زانای ئایینی و شاعیر بووە، کە کانی شاعیریش خاڵی بووە، بۆیە هەر لە تەمەنی هەرزەکاریدا حەزی لە شیعر دانان کردووە، لە شیعرێکیدا کە بەسەر کانی هەڵداوە دەڵێت:

**(کانی) لەبەر ئەشعاری سوخەن سەنج و ئەدیبە**
**قەولی هەموو پڕ لەززەت و زۆر خۆش و لەبیبە**
**هەر شیعرێ کە دەیڵێیت و دەیخوێنیتەوە بۆ خەڵک**
**گوێ دەگرن و دەیڵێنەوە شیعرێکی غەریبە**
**ئەو سوحبەتی کردم شەوی جومعە لە حزوورت**
**عەفووم بکە زۆر مەقسەدە بۆ ڕەغمی ڕەقیبە!**
**شیعری تۆ حەشەندی نییە وەک شەکر و نەباتە**
**پڕ مەعنە و پڕ نوکتە و دڵخواهی حەبیبە!**
**خوارزایی تۆ (ڕەشاد)م مەڵێ شاعیر نییە بڕوا**
**حەددم نییە وەک تۆ بم و هەندەم بەنسیبە!**

**کتێبخانەی موفتی**

لە دیوەخانەکەی ماڵی مامۆستا (عوسمان ڕەشاد موفتی)ی کوڕی گەورەی مامۆستای خوالێخۆشبوو، کتێبخانەیەکی گەورە هەیە، کە بەهەزاران کتێبی بەنرخی هەمەجۆرە و، دەستنووسی تێدایە، دەرگای ئەو کتێبخانەیە بەبەردەوامی کراوەتەوە بۆ هەموو کەسێک، بەتایبەت قوتابییانی خوێندنی باڵا، کە سوود لە سەرچاوەکانی وەربگرن.

مامۆستا (عوسمان) لەبارەی ئەو کتێبخانەیە قسەی بۆ کردین و گوتی: بەهەوڵ و تەقەلای سەدان ساڵی ئەو بنەماڵەیە ئەو کتێبخانەیە هاتۆتە کایەوە و ئێمە لە باوک و باپیرانمانەوە بۆمان ماوەتەوە، کە هەریەکە و لەوان کۆمەڵێ کتێبی خستۆتە سەر تا بۆتە ئەم کتێبخانەیە.

جاران کە چاپەمەنی نەبوو، کتێب بەزەحمەت دەست دەکەوت، تەنیا لای زانایان نەبێت، بۆیە خەڵکی دەیانبرد و بەدەست کۆپییان دەکرد و دەیانگەڕاندەوە..

مێژووی ئەم کتێبخانەیە خۆی لە پێنج سەد ساڵێک دەدات، کە لەمەلا ئەلیاسی باپیرە گەورەمانەوە دەست پێ دەکات، ئەوان مامۆستای زانستی ئایینی بوون، بەسەدان زانا لەسەر دەستی ئەوان دەرچوون، لەم وڵاتە و وڵاتانی دەوروبەریشدا.

بەڵام لە سەردەمی باپیرە گەورەمان مەلا ئەبوبەکر (مەلا گچکە)، هەتا دەگاتە لای (مەلا فەندی) بەپۆیەی خۆی

گەیشتووە، دوای ئەویش کوڕەکەی عیزەدین مەلا، تا دەگاتە باوکم.

هەروەها گوتی: کتێبخانەکە دابەشی دوو بەشی سەرەکی ببوو:

١- بەشی هەرە زۆری لە قەسری مەلا فەندی بوو لە باداوە.

٢- بەشەکەی دیکەیان لە مزگەوتی گەورەی قەلاّت پارێزرا بوو، کە لە سێ کتێبخانەی لە دار دروستکراو پارێزرا بوو.

ئەوەی یەکەمیان لە مالّی مەلا فەندی - لە باداوەدا سالّی ١٩٥٩ دوای شۆرشی ١٤ ی تەمووز تالاّنیان کرد و دەستێکیان بە هەموو کتێب و دیکۆمێنت و کەلوپەلەکانی ناوی داهێنا، لەوانەش نامەیەکی بەدەستنووسی سەلاحەدینی ئەیوبی، کە بۆ زاواکەی مزەفەرەدین گۆکبۆری ناردبووی و کۆشکەکە بەتەواوەتی سووتا، کاتی باوکم و عیزەدین مەلا چوونە کۆشکەکە بۆ رزگارکردنی دەستنووسەکان، بێجگە لە چەند شووشەیەکی تێک شکاو و کاغەزی پەرش و بلاّو و سووتاو هیچی تریان نەبینی.

دوای ئەو تالاّنکردنە چارەنووسی کتێبەکان بەم شێوەیەی لێ هات:

١- بەشێکیان سووتان و ڕەنگە لەبەر نەزانی هەندێ کەس ئاگریان پێ کردبێتەوە.

٢- هەندێک فرۆشرایە دوکاندارەکان بۆ بەکارهێنانی وەک کیسە.

٣- هەندێک لەسەر شەقامەکان فرۆشران.

٤- هەندێکیش کەوتنە دەستی کەسانی شەرەفمەند، کە ١٠- ١٢ کتێبێک دەبوو گەڕاندیانەوە لای خۆمان.

دواتر باوکم ڕایگەیاند کە هەر کەسێ ئەو کتێبانەی لا دەست دەکەوێت ئەو لێی دەکڕێتەوە، بەهەر نرخێک بێت، دوای ساتێک ژمارەیەکی زۆر کەم لەو کتێبانە دۆزرانەوە لە مزگەوتی گەورە خرانە سەر کتێبەکانی دیکە، ئیدی باوکم کەوتە بەر ڕێک خستنەوەیان لەگەلّ کتێبەکانی خۆی کۆی کردنەوە و بەدرێژایی ژیانی، بەسەدان کتێبی نایاب مەکتەبەکەی دەولّەمەند کرد.

هەتا ئێستاکەش ئەو کتێبخانەیە لە دیوەخانی مالّی ئێمەدا ماوە و هەمیشە لە خزمەتی هەموو ڕۆشنبیر و ئەدیب و قوتابی و کەسێکە، کە پێویستی پێیان بێت.

ڕەنگە قسەکردن لەبارەی ژیان و بەخششی زانایانی هاوچەشنی مامۆستا (ڕەشاد موفتی) بە چەند لاپەرەیەک نرخی پێویستی خۆی نەدرێتێ، بەلاّم کەسانێکی وەکو



مامۆستا رەشاد موفتیش ئەوەندە لای خەلّکی ناسراون، کە ڕەنگە هەموو ئەوانەی لەگەلّیدا ژیاون پەند و زانیاری و حیکمەتیان لێ وەرگرتووە، هەموو ئەوانەی هاودەمی بوون، ئاشنا بە کەسایەتی و ئەو رۆلّە کاریگەرە بوون ئەو لە بواری کۆمەلاّیەتی و ڕۆشنبیری و ئایینیدا بەجێی هێشتن، بەچەشنێک ڕەنگە مالّێک نەبێت لە هەولێر یاد و یادگاری لەگەلّدا نەبووبێت، یا فتوا و شەرعێکی ئەوی لێ نەدرابێت، یاخود کێشەیەکی کۆمەلاّیەتیی بۆ چارەسەر نەکردبن.

هەموو لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەوان بەمالّناوایی ئەو پەناگەیەک بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان لەدەست چوو، ئێستاش کاتێ گفتوگۆ لەسەر بابەتێک دەکرێت، دەلّێن مامۆستای خوالێخۆشبوو ڕەشاد موفتی کاتی خۆی بەم شێوەیە ئەم گرفتەی چارەسەر کردووە. بۆیە قسەکانی ئەو ئاکامی گفتوگۆکانیان یەکلا دەکاتەوە. دەیان سەربوردەش هەیە لە چەندین بواری جیاجیای ئایینی و بەهای کۆمەلاّیەتیدا بلیمەتی ئەو دەسەلمێنێ.

مامۆستا (عەبدولغەنی عەلی یەحیا) چەندین لە قسە و سەربوردەکانی خوالێخۆشبووی کۆکردۆتەوە، بەهۆی ئامادەبوونی بۆ ماوەی نزیکەی دەسالاّن لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانی، سالّی ١٩٨٨ ئەو قسە و سەربوردانەی خستۆتە توێی کتێبێکی دەستنووس، کە ناوی ناوە (کۆڕی رەشاد موفتی).

وەک ڕێز لێنانێک لە زانای پایەبەرز بەهەشتی ڕەشاد موفتی، حکومەتی هەرێمی کوردستان مزگەوتێکی گەورەی بەناو کرد، کە کەوتۆتە سەر ڕێگای کەرکووک.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری بارش ژمارە (٥) بلاو بۆتەوە.

# سمایلە باشەی میرەکانی
# "١٩٠٧ز- ١٩٩٢ز"

یەکێک لە شاعیرە ناودارەکانی دەشتی پشتەرێ "ئیسماعیل عەزیز عومەر"ە، کە ناسراوە بە سمایلە باشەی میرەکانی.

لای هەموو کەسێک ئاشکرایە کە زیندووکردنەوەی کەلەپووری نەتەوایەتیمان ئەرکێکی پیرۆزە، هەرچەندە ئەمکارە هەوڵدان و گەڕان و پشکنین و شەونخونی دەوێ، بەڵام هیچ کارێکیش بەبێ هەوڵ و ماندووبوون بۆ کەس مەیسەر نەبووە، نزمی رادەی رۆشنبیری شوێن و کاتی ئەو سەردەمەی کوردستان و تەشەنەکردنی نەخوێندەواری لە نێوەندی چینە جۆربەجۆرەکانی کۆمەڵی کوردەواریدا کە بۆتە هۆی بزربوونی شوێنەواری هەرە زۆری شاعیر و خێرمەند و ناودارەکانمان.

شاعیر ناوی ئیسماعیل کوڕی عەزیز کوڕی عومەرە لە عەشیرەتی ئورمزیارە، باوکی شاعیر نیشتەجێی گوندی پۆریجەیە، بەڵام لەبەر باری ناتەواوی دەچێتە گوندی "دوو کەڵە" بۆیە لە ساڵی ١٩٠٧ شاعیر لەو گوندە لەدایک دەبێ.

دوای مردنی باوکی شاعیر خێزانێکی زۆری دەکەوێتە ئەستۆ و لەبەر باری هەژاری پەنا دەباتە گوندی "پێ بازۆک" دوایی گوندی گردەسۆر و بەردەسپی تا لەدواییدا لە گوندی میرەکانی شێخان کە بە گوندی عەلی میرەکانی بەناوبانگ بووە جێگیر دەبێ.

دوای مردنی هاوسەرەکەشی شاعیر تەنها دوو کچ لەدوای خۆی جێدەهێڵێ، بۆیە سەر ڕێرەوی ژیانی شاعیر بەرەو عەشقی خودایی دەباو دەبێتە یەکێک لە دەروێشەکانی شێخ سەعیدی دێلێژە، بەڵام قەت دەف و کەشکۆڵی هەڵنەگرتووە.

شاعیر زۆر روح سووک و قسەخۆش بووە تا بڵێی پیاوێکی باش بووە بۆیە بە سمایلەباشەی میرەکانی ناوی دەرکردووە.

شاعیر بە تەنها باخچەیەکی دروست کردبوو کە پڕبوو لە ترێ و هەنار، بۆیە دەڵێ:

**باخچەکم هەیە چوار دەوری دیوار**
**ماشاڵا جوانە هەنجیر و هەنار**
**کۆتری تێدایە تەقریبەن دوو هەزار**
**لیسم بۆ کردن قەتار بە قەتار**
**خۆم پاسەوانم بە لەیل و نەهار**
**پشیلە و کوندەبۆ بەرۆژیش مندار**
**عومرم کامیلە زوو چومە ناو سار**

هەروەها جگە لەو شیعرانە شاعیر گەلێ شیعری نەتەوایەتی هەبووە، لەوانە لە شیعرێکیدا دەڵێ:

**ئەی پێشمەرگەی قارەمان**
**خوێیان زەردکرد لە چەکان**
**بەرەشاش و بە هاوان**
**هەروەک تەیری سەر شاخان**
**سوێندیان خواردیە بە قورئان**
**بەسەری باوکی لوقمان**
**هەر وەردەگرین کوردستان**

لە دواییدا دەڵێ:

**جوون ناوەم بە کۆتەری**
**چونکە دەکا رابەری**
**هەرچی ساچمەی لێ دادەگری**
**خوایە لە پەنای خۆی بگری**

شاعیر کۆترێکی گەلێ زۆری دەبێ، بەڵام کوندەبۆ رۆژی دوو سێ کۆتری لێ دەخوارد، بۆیە دەڵێ:

**کۆترێکی زۆرم هەبوو نەدەهاتە ژمارە**
**هەتا دەهات کەم دەبوو لام وابوو چاو و زارە**
**گوتم دەبێ پشیلەبێ دوژمنی تەیر و تارە**
**نەمزانی کوندەبۆیە لێم بوویتە سۆرە مارە**
**خزمینە لۆمەم مەکەن زەرەر شتێکی تارە**
**تەکبیری چ بێ خوایە پرسم کرد بەو موختارە**
**حەمەدی رەمەزانی خۆی لێهەڵکرد مەردانی**
**تەرەکی باشی هەبوو دایناوە لەسەر خانی**
**کوندەبوو وایزانی دەعوەتە کۆتر بووم بە سندانی**
**ئەوکاتە گیرا شەو بوو ماوە هەتا بەیانی**
**عالەمی لێ خڕبۆوە پۆریجە و میرەکانی**
**کەوتە دەست مامۆستایان هەتا هەولێریش زانی**
**سوێندت دەخوارد فیلمە هەروەک فریری و عەدنانی**

شاعیر لە ساڵی ١٩٩٢ کۆچی دوایی کردووە و لەدوای خۆی چەندین شیعری جوانی جێهێشتووە.

* ئەو زانیارییانە لە کتێبی دەروازەیەک بۆ ناسینی "سمایلە باشەی میرەکانی"ی ئیسماعیل تەنیا وەرگیراوە.

# عومەر دەبابە
# ١٩٢٣-١٩٩٢



"عومەر دەبابە"ی خەباتگێڕی خزمەتگوزاری سەرکردە، ناوی تەواوی (عومەر کوڕی حاجی سۆفی مستەفای کۆییە). لە بنەچەدا بنەماڵەکەیان لە مەهابادەوە روویان کردۆتە شاری کۆیە و لێی نیشتەجێ بوون. ئەم تێکۆشەرە بەجەرگە لە رۆژی ١٦ی ئابی ساڵی ١٩٢٣ی زایینی لە گەڕەکی قەڵاتی شاری کۆیە لەدایک بووە.

خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە کۆیە تەواو کردووە و لە ساڵی ١٩٤١دا بۆ خوێندنی ئامادەیی چۆتە سلێمانی و کەرکووک، هەر لەو ساڵەشدا بووەتە ئەندامێکی چالاکی حزبی هیوا بەسەرۆکایەتیی مامۆستا رەفیق حیلمی. لە پایزی ١٩٤٣دا چووەتە بەغدا و لە (خوێندنگای ئەندازیاری) وەرگیراوە. بەڵام لەبەر چالاکیی سیاسی لە خوێندنگاکەی فەسڵ کراوە، تاکو لەساڵی خوێندنی ١٩٤٦-١٩٤٧ ئینجا گەڕاوەتەوە بەغداو ئەمجارە لەکۆلێجی حقووق وەرگیراوە.

لەگەڵ دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ١٩٤٦/٨/١٦دا بووەتە ئەندامێکی چالاکی ئەو حزبە سیاسییە دیموکراتییە و لە رۆژانی راپەڕینە نیشتمانییەکەی کانوونی دووەمی ١٩٤٨ی گەلانی عێراقدا دەورێکی سەرکردەیی لە خۆپیشاندانی خوێندکارانی کورد لە بەغدا بینیوە، رێکخەر و پێشڕەوی خۆپیشاندەران بووە، هەر لەو راپەڕینە نیشتمانییەشدا لەبەر ئازایەتی و نەبەردی بە (عومەر دەبابە) ناوبراوە و لەسەر ئەو چالاکییە شۆڕشگێڕییەی لە سەرەتای هاوینی ١٩٤٨دا ماوەیەک دەگیرێ، بەڵام هەر چۆنێک بێ لە ساڵی ١٩٥١دا خوێندنی کۆلێجی حقووق تەواو دەکات و دەبێتە پارێزەرێکی ناسراو.

لە ساڵی ١٩٥٢دا لەگەڵ مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد دەست دەکەنە کاری پارێزەری لە کەرکووک و سلێمانی و ناوبانگی راستی و کوردایەتییان بەهەموو لایەکی کوردستاندا بڵاو دەبێتەوە.

عومەری سیاسەتمەداری خۆبەختکەر لە مەیدانی کوردایەتی لە کۆنگرەکانی پارتی دیموکراتی کوردستاندا جارەها بەئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و مەکتەبی سیاسی هەڵبژێردراوە و لە دوای بەیاننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠دا هەر دوو باڵی بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی کورد دەبنەوە یەک و کاک عومەر وەک پێشمەرگەیەکی دڵسۆزی کورد و کوردستان رێگای راستی کوردایەتی دەگرێتەوە و دەوری خۆی لەو رێگایە پیرۆزەدا دەبینێ، لە شۆڕشی ئەیلوولدا چ وەک سەرکردەی هێز و چ وەک پێشمەرگەیەکی فیداکار و خەباتی شۆڕشگێڕیی کردووە، لە دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلوول لە بەهاری ١٩٧٥دا گەڕاوەتەوە عێراق و دوور خراوەتەوە بۆ شاری رومادی. بەڵام لەوساوە لەگەڵ مام جەلال و هەڤاڵانی دیکەیان بیریان لە دامەزراندنی حزبێکی نوێ کردۆتەوە تاکو شۆڕشێکی نوێ بەرپا بکات بۆ رزگارکردنی کوردستان لە چنگ داپلۆسینی حزبی بەعسی فاشی. وابوو ئەو ئامانجەیان هاتە دی ئەو حزبە نوێیە لە ١٩٧٥/٦/١دا لە وڵاتی سووریە و لە شاری دیمەشق دامەزرا و جەنابی مام جەلال و هەڤاڵانی کە لەو شارە بوون بنیاتنەری ئەم بزووتنەوە نەتەوەییەی کورد بوون. دوای ساڵێک لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆڕشی نوێی گەلی کوردستان لە ١٩٧٦/٦/١دا، کاکە عومەر دەبابە خۆی گەیاندە چیاکانی کوردستان و لە سەرەتادا لەگەڵ بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان دەبێ، پاشان بووەتە سەرکردەیەکی دیاری (یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان)، مام جەلال ناوی ناوە (کاکی کاکان) و وەک برا گەورە و مامۆستایەکی خۆی لە بزووتنەوەی کوردایەتیدا سەیری کردووە و رێزی لێ ناوە، تاکو لە رۆژی ١٩٩٢/١/٢٩دا لە شاری سلێمانی لە هۆڵی کۆنگرەی یەکەمی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بەنەخۆشیی دڵ کۆچی دوایی کرد.

**کەریم شارەزا**

# ئاوڕەحمانە رووتە
# ١٩١٧-١٩٩٣



خەباتگێڕی كورد و شاعیری میللی كاكە ئاوڕەحمانە رووتەی كوڕی سمایلی رەسوولْ كێشكەیی، لە پایزی ١٩١٧دا لە شاری كۆیە، شاری ئەدەب و خەباتی كوردایەتی لەدایک بووە و هەر لەو شارەدا خوێندوویەتی تاكو بووەتە خوێندەوارێكی هۆشیار و لەگەڵ دروستبوونی (حزبی هیوا) لەسەر هەیكەلی (كۆمەڵی داركەر) لە ساڵی ١٩٣٩دا بووەتە ئەندامێكی چالاكی ئەو حزبە نەتەوەییەی كورد و لە ساڵی ١٩٤٥دا بووەتە ئەندام لە (حزبی رزگاریی كورد). كاتێكیش كە لە ١٦/٨/١٩٤٦دا پارتی دیموكراتی كوردستان دامەزرا، چووە ناو ریزەكانی و چالاكییەكی بەرچاوی تێدا نواند و گەلێک كەسی لە لاوەكانی كۆیە راكێش كرد بۆ ناو ریزەكانی ئەو حزبە دیموكراتییە نەتەوەییە.

هەرچەندە كاكە عەبدوڕەحمان لاوێكی پۆشتە و پەرداخ بووە، بەڵام چونكە دڵی لەگەڵ هەژارانی میللەتەكەی لێی داوە و نەیویستووە لە رەش و رووتی گەلەكەی دوور كەوێتەوە، بۆیە حەزی كردووە خەڵكەكە پێی بڵێن: "ئاوڕەحمانە رووتە" و ناوی حزبیشی هەر بە (رووتە) بووە، كە بەناو ساڵانیش كەوتووە، پێی گوتراوە "مامە رووتە".

مامە رووتەی شەیدای كوردایەتی لەگەڵ بەرپابوونی شۆڕشی ئەیلوولی رزگاریخواز لە ١١ی ئەیلوولی ١٩٦١دا وەك پێشمەرگەیەكی ئازا و بەجەرگ بەشداریی لەو شۆڕشەدا كردووە و لە دوای نسكۆی ئەو شۆڕشە مەزنە لە ساڵی ١٩٧٥دا گەڕاوەتە باشووری كوردستان و گیراوە و ناردراوە بۆ شاری حیللە و خراوەتە ژێر چاودێریی پۆلیس.

جارێكیان نەخۆش دەكەوێ وەسیەتنامەیەک بەشیعر بۆ كوڕەكانی دەنووسێ و داوایان لێ دەكات: "ئەگەر مردم تەرمەكەم لە عەرەبستان مەنێژن و بیبەنەوە كوردستان" لەم بارەیەوە دەڵێ:

**دەستم دامێنی گشت خزم و دۆستان**
**گەر ئەمرۆ مردم لە عەرەبستان!**

**لە حیللە نەبێ ئارامگا و گۆڕم،**
**ببەنەوە بۆ خاكی كوردستان،**
**بەخۆشی و شادی تەرمم هەڵگرن،**
**گۆڕم بۆ لێدەن لە هەیبەسوڵتان!**

لە دوای ماوەیەک رێ دەدرێ بگەڕێتەوە شاری كۆیە و لەسەر رێبازی كوردایەتیی خۆی دەڕوات و تۆسقاڵێک سەر بۆ پیاوانی رژێمی بەعس دانانوێنێ. لە دوای راپەڕینەكەی جەماوەری خەڵكی كوردستان لە بەهاری ١٩٩١دا لەلای هەموو سەركردەكانی كورد خۆشەویست دەبێ تاكو لە ١٨/٦/١٩٩٣دا هەر لە شارەكەی كۆیە كۆچی دوایی دەكات، لە تەنیشت ئارامگای هەیبەسوڵتان بەخاک دەسپێردرێ.

**كەریم شارەزا**

# سولەیمان شێخ محەمەد سولەیمان (ئەبو سیروان) ١٩٣٦ - ١٩٩٥

خەباتگێڕی پێشكەوتنخوازی كورد هاوڕێ (سولەیمان شێخ محەمەد سولەیمان)ی ناسراو بە (ئەبوسیروان) لە ساڵی ١٩٣٦دا لە هاوینەهەواری شەقڵاوە، لە خێزانێكی ڕەنجدەری هەژار، لەدایک بووە.هەركە چاوی كردۆتەوە و فامیتی، هەستی بەچەوساندنەوەی چینایەتی كردووە لە ساڵی ١٩٥٢دا لە سەردەمی خوێندنی لە قوتابخانەی ناوەندی بووەتە ئەندامێكی دڵسۆز و چالاكی یەكێتیی گشتیی قوتابییانی عێراق و لە ساڵی ١٩٥٦دا بووەتە ئەندامێكی هۆشیاری حزبی شیوعی عێراق و بووەتە كادیرێكی ماندوونەناسی بەجەرگی حزبەكەی خۆی و وەک لێپرسراوێكی حزبی لە گەلێک شاری كوردستان وەک ڕەواندز و شەقڵاوە كاری كردووە.

چ لە سەردەمی حوكمی پاشایەتی و چ لە دوای كودەتا شومەكەی ٨ی شوباتی ١٩٦٣ی بەعسی فاشی گەلێک مەینەتی دیوە و رووی كردۆتە چیاكانی كوردستان و چووەتە پاڵ پێشمەرگە دلێرەكانی حزبەكەی و بەشداریی لە شۆڕشی ئەیلولولدا كردووە و ئەوساكە خەباتی لە پێناوی دیموكراتییەت بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ كوردستان كردووە.

لە دوای ڕێككەوتننامە مێژووییەكەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠دا گەڕاوەتەوە ناو شار و ماوەیەک لە ناوەڕاستی عێراق وەک لێپرسراوی حزبی خەباتی كردووە. لە كۆنگرەی سێیەمی حزبی شیوعیدا بەئەندامی كۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردراوە و لە كۆنگرەی چوارەم و پێنجەمیش هەر بەئەندامی كۆمیتەی ناوەندیی حزب هەڵبژێردراوەتەوە.

لە دوای هەڵگەڕانەوەی حزبی بەعسی فاشی لە حزبی شیوعی و بەرەی نیشتمانی، لە ساڵی ١٩٧٨دا رووی كردۆتەوە چیاكانی كوردستان و وەک پێشمەرگەیەک و ئەندامێكی كۆمیتەی ناوەندیی حزبی شیوعی- هەرێمی كوردستان، درێژەی بەخەباتی سیاسی و چەكداری داوە و لە كیمیابارانەكەی ساڵی ١٩٨٧ی ناوچەی بادینان، ئەبوسیروان لەو ناوچەیەدا دەبێ و بە بەردەكەوێ و ئازارێكی زۆر دەبینێ و لە دووەمین كۆنگرەی ڕێكخراوی هەرێمی كوردستانی حزبدا، بەئەندامی كۆمیتەی ناوەندی حزبی شیوعی كوردستان، هەڵدەبژێردرێ و چونكە هەر لەو كۆنگرەیەدا لە ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٩٣دا بریار دەدرێ حزبی شیوعی كوردستان دابمەزرێ و هاوڕێیانی لە ناو كۆمیتەی ناوەندی حزبدا بەئەندامی مەكتەبی سیاسی دادەنێن.

هاوڕێ ئەبوسیروان لە یەكەمین كۆنگرەی حزبی شیوعی كوردستان لە ساڵی ١٩٩٥دا، هەمدیس بەئەندامی كۆمیتەی ناوەندیی حزب هەڵدەبژێردرێتەوە، بەڵام بەداخەوە لە ڕۆژی ٢٠/١١/١٩٩٥دا لەو كاتەی كە ئەم هاوڕێ تێكۆشەرە دەچووە سەردانی هاوسەر و منداڵەكانی لە وڵاتی سوید، كە چوار ساڵ بوو لێیان دابڕابوو، لە شاری دیمەشق دڵە گەورەكەی لە لێدان كەوت.

تێبینی:
* سوود لە ڕۆژنامەی (ڕێگای كوردستان) ژمارە (١٨٣)ی ٢٨/١١/١٩٩٥ وەرگیراوە.

**كەریم شارەزا**

# سابیر کاکەشین شێخەڵڵا
## (١٩١٤- ١٩٩٥)

**موحسین ئاوارە**

سابیر کاکەشین عەبدوڵڵا لە ساڵی ١٩١٤ لە جاستان لەدایکبووە، یەکێک بووە لە کەسایەتییە دیار و ناودارەکانی دەشتی هەولێر بە تایبەتی و کوردستان بە گشتی، لەبەرئەوەی هەمیشە قوناغ بووە و دیوەخانی هەبووە و دەمڕاست و برا گەورەیەک بووە لەنێو عەشیرەتەکەی "عەشیرەتی سیان" هەرچەندە لە هەرەتی گەنجێتییەوە ژیانی بە پێشمەرگایەتی بەسەر بردووە.

لە ساڵانی ١٩٥٨- ١٩٥٩ پەیوەندی بە پارتی دیموکراتی کوردستان کردووە لە رێگای کادیرانی ناوچەی کەندێناوە



"ئەحمەد مەحمود و مەحمود سەلمان".

لە ساڵی ١٩٦٢ گیراوە و دوورخراوەتەوە بۆ شاری ناسریە.

بەر لەوەی پەیوەندی بە شۆڕشی ئەیلوول بکات لە ١٩٦٣/٤/٤ لە شاری کۆیە لە ماڵی کاکە زیادی مەحمود ئاغا دیداری لەگەڵ بارزانی نەمر کردووە، کە لەوکات خوالێخۆشبوو "ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی"یش هەمان وادەی دیداری هەبووە کە لەوێ یەکتریان بینیوە.

هەر لە ١٩٦٣/٤/٤ بە بێ پسانەوە لەنێو شۆڕشی ئەیلوول خەبات و تێکۆشانی بەردەوام بووە، سەرەتای پێشمەرگایەتی کراوە بە سەرپەل، دواتر سەرلق و کوڕ و خزم و بەشێک لە کوڕانی عەشیرەتەکەی لە دەوروبەر بووە تاکو ١٩٧٥ نسکۆی شۆڕشی ئەیلول، لەو ماوەیەدا لە زۆربەی داستان و بەرخودان و بەرگرییەکاندا بەشداری راستەوخۆی هەبووە و رۆڵی کاریگەری هەبووە کە لە زۆربەی

شەڕ و پێکدادانەکان لەگەڵدا بووە وەکو شەڕی ئاسۆس و دێدەوان و گۆمەتاڵ و بێستانە و قەرەداغ و ماکۆک...هتد، لە شەڕی ئاسۆی ١٩٦٥ کە شەڕێکی دژوار و سەخت بووە، ئەوکات سەرلق بووە خۆی و لقەکەی و لەگەڵ تێکۆشەر مام وسو و پێشمەرگەکانی ئابلوقەدراون و بەبێ فیشەک و ئازووقە تەنیا خۆ بەدەستەوەدانیان بۆ مابۆوە، سابیر کاکەشین و مام وسو بڕیار دەدەن خۆ بە ئاوی دوکان دادەن و بپەڕنەوە مردن هەڵبژێرن نەک تەسلیم بوون بە مجازەفەو موعجیزە رزگار و دەرباز دەبن، دواتر بارزانی نەمر کە لە نزیکەوە ئاگاداری شەڕەکە بووە بانگی کردووە خەڵاتی کردووە و پێی گوتووە "چۆن نەگیرای دوای ئەم هەموو ئابلووقەیەو فشارە زۆرەی بە سەرتانەوە بوو، سابیر کاکەشین لە وەڵامدا دەڵێ: "ئەزبەنی تۆ پێم بڵێ چۆن نەکوژرای چونکە من گیرانم هەڵنەبژاردبوو بەڵکو کوژران".

لەو ساڵانەی پێشمەرگایەتی فشارێکی زۆر کەوتبووە سەر براکانی لە گوندی "جاستان" کە لە لایەنی ئەمنی رژێمەوە لە کەرکووک بانگ دەکران و هەڕەشەی گوند سووتاندن و ماڵ تالان کردن و گرتنیان لێ دەکردن، ئەگەر براکەیان سابیر کاکەشین نەهێننەوە بە تایبەتی زیاتر بەدوای برا گەورەکەیان دەنار "کێخوا هەمزە کاکەشین"، بەڵام لەلای مام سابیر ئەو هەڕەشەو فشارانە کاری نەکرد و هەر لە پێشمەرگایەتی و نەبەردی خۆی بەردەوام بوو.

پاش نسکۆی ئەیلوول لە ساڵی ١٩٧٥ شەش مانگیش بە ئاوارەیی لە کرمانشاه لە ئێران مایەوە و دواتر گەڕایەوە هەولێر و لە گەڕەکی سەیداوە نیشتەجێ بوو، بەڵام تاکو راپەڕینی ١٩٩١ چەند جارێک بەدوایان دەنارد بۆ ئەوەی فەوجی جاشایەتی پێکبهێنێ، بەڵام هەر بە پاکی و هەڵوێستی کوردانە خۆی پاراست، جارێکیان لە هەشتاکان بوو بۆی گێڕامەوە گوتی: ئیمرۆ لە فەرعی حزبی بەعش "شمال" لەدوایان ناردم، لێپرسراوی فەرع لەگەڵ تەنگەستوورێکی تر کە لە بەغداوە رەوانە کرابوو پێی گوتم کاکە سابیر "خەڵکی دێن واستە دەکەن بۆ ئەوەی مەفرەزە یان فەوجیان بۆ دروست بکەین، تۆ وەرە لە جیاتی یەک فەوج سێ فەوجت بۆ موافەقەت دەکەین، هەموو جۆرە گوزەرانییەکی زۆر باش و دەوڵەمەندت دەکەین، خاوەن عەشیرەت و کەسوکاری دەڵێی چی؟"

گوتی وەڵامەکەم وا دانەوە و گوتم: " ئێوە گوندەکانی ئێمەتان نەهێشتووە، بەدەیان گوند ئێستا عەرەبی تیا نیشتەجێن، ئەو خەڵکانە ئێستا لە هەولێرن و کاسبی دەکەن، من چۆن دەتوانم داوایان لێ بکەم چەک هەڵگرن، کە ئاوا دەربەدەر کراون، من کاتێک دەتوانم داوای چەک هەڵگرتنیان لێ بکەم ئەگەر لەسەر زەوی و گوند و موڵکەکانی خۆیان بن". دوای ئەوەی ئەمجارەش لێپرسراوانی بەعس لێی بێ ئومێد دەبن ئینجا وازی لێ دەهێنن.

مام سابیر پیاوێکی ئازاو بە جەرگ و قسەخۆش و کراوە بوو، گیانی مەدەنییەت و شارستانیەتی بەرز بوو، مامەڵەی بە وشکی و عەقڵیەتی تەسک نەدەکرد، زۆر بە شان و شکۆ و هەیبەت و گران بوو، کەم قسەی دەکرد، بەڵام قسەکانی سەنگێکی هەبوو.

بەداخەوە لە ساڵی ١٩٩٥ بە یەکجاری ماڵئاوایی کرد و کۆچی دوایی کرد.

# هادی ڕەشید چاوشلی
# ١٩٢٠-١٩٩٦



کارگێڕ و یاساناس و نووسەری کورد هادی ڕەشید چاوشلی، لە ساڵی ١٩٢٠دا لە شاری هەولێر لەدایک بووە. لە ساڵی ١٩٣٧دا خوێندنی ناوەندی لە هەولێر تەواو کردووە و چۆتە بەغدا. هەر لەو ساڵەدا لە دواناوەندی مەرکەزی بەغدا وەرگیراوە و لە ساڵی ١٩٣٩دا بڕوانامەی دەرچوونی وەرگرتووە. پایزی ئەو ساڵەش لە کۆلێجی حقووق وەرگیراوە و لە ساڵی ١٩٤٣دا دەرچووە و بووەتە پارێزەرێکی یاساناس. ماوەیەک پارێزەریی کردووە تاکو لە ساڵی ١٩٤٥دا کراوە بە بەڕێوەبەری ناحیەی بازیان و خورماڵ و پێنجوێن و قەرەداغ و بەرزنجە لە پارێزگای سلێمانی. لە دوایی گوێزراوەتەوە بۆ لەیلان و حەویجە لە پارێزگای کەرکوک.

لە ساڵی ١٩٥٤دا کراوە بەقایمقامی قەڵادزێ. پاشان لە ١٩٥٦دا گوێزراوەتەوە بۆ قەزای کۆیە، لە شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ لە ڕۆژی ١٩٥٨/٨/٦دا کراوە بەسەرۆکی شارەوانیی هەولێر. لە ١٩٥٨/٩/٤دا کراوە بەپارێزگاری سلێمانی. لە ١٩٥٩/١/١٦دا گوێزراوەتەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆی عێراق و کراوە بەیاریدەدەری بەڕێوەبەری گشتیی کاروباری ناوخۆ لە دواییدا کراوە بەوەکیل وەزارەت لە کودەتا شوومەکەی ٨ی شوباتی ١٩٦٣ی حزبی بەعسی فاشی گیراوە تاکو لە ١٩٦٤دا ئازاد کراوە و خانەنشین بووە و گەڕاوەتەوە سەر پیشەی پارێزەری. لە ساڵی ١٩٦٧دا کراوە بەئەندامی دەستەی بەڕێوەبردنی سەندیکای پارێزەران لە هەولێر. لە ساڵی ١٩٧١دا لە پاش ڕێککەوتننامەکەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠دا بووەتە ئەندام لە دەستەی بەڕێوەبەری کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی کوردی لە بەغدا و لە ساڵی ١٩٧٦دا گەڕاوەتەوە هەولێر و خۆی لە کاری پارێزەری خانەنشین کردووە. کاریشی سەرۆکی دەستەی فریاکەوتنی قەڵای هەولێر بووە. تاکو لە ڕۆژی ١٩٩٦/٦/٢٩دا لە شاری هەولێر کۆچی دوایی کرد و لاپەڕەی ژیانی پڕ خزمەتگوزاری پێچرایەوە.

هادی چاوشلی نووسەرێکی کوردی بەعەرەبینووس بوو. لە ماوەی ژیانی پتر لە ٢٠ کتێبی بەکەڵکی بەزمانی عەرەبی لە بواری مێژوویی و کۆمەڵایەتی و جوگرافی و ئیداری و یاسایی دانا و چاپی کردن، لەوانە:

١- الحياة الاجتماعية في كردستان - بغداد ١٩٧٠، ١٦٠ صفحة.

٢- مشاكل العراق الداخلية - بغداد ١٩٦٧، ٣٧٦ صفحة.

٣- الجمعيات والنقابات في التشريع العراقي- بغداد ١٩٦١، ١٧٠ صفحة.

٤- اللامركزية الاقليمية في نظم الادارة العامة في الدول المختلفة - بغداد ١٩٦٧، ١٣٥ صفحة.

٥- تراث أربيل التأريخي.

٦- كتاب دول العالم.

جگە لەم کتێبانە و بەرهەمی دیکەشی، گەلێک وتار و باسی بەسوودی بەزمانی کوردی لە گۆڤاری (ڕۆژی کوردستان) لە بەغدا بڵاو کردۆتەوە.

**کەریم شارەزا**

# زوبێر بیلال ئیسماعیل
# ١٩٣٨-١٩٩٨

زوبێر بیلال ئیسماعیل، لە ساڵی ١٩٣٨دا لە شاری هەولێر چاوی بەژیان هەڵێناوە و لە بنەماڵەیەکی ئایین و ئەدەبپەروەر پێگەیشتووە.

زوبێر لە ساڵی ١٩٤٥دا لە قوتابخانەی سەرەتایی هەولێر چووەتە بەر خوێندن، هەموو ساڵێک بەزیرەکی دەرچووە و لە ١٩٥١دا چووەتە قوتابخانەی ناوەندی هەولێر و نموونەی قوتابی زیرەک و هۆشیار بووە. لە ساڵی ١٩٥٤دا چۆتە ئامادەیی و دوای دوو ساڵ کۆتایی بەخوێندنەکەی هێناوە و بۆ پایزی ١٩٥٦ چووەتە بەغدا و لە کۆلێجی ئاداب- بەشی شوێنەوار و شارستانییەت وەرگیراوە. لە سەرەتای هاوینی ١٩٦٠دا بە پلەی ئیمتیاز دەرچووە و بووەتە یەکەمین خاوەن بڕوانامەی



بەکەلۆریۆس لە مێژووی کۆن و شوێنەواری دێرین لە کورددا. (یەکەمین پسپۆڕ لە مێژووی کۆن و شوێنەوارناسیدا لەسەر ڕێگایەکی زانستی). ئەم زاتە زانایە لە پایزی ١٩٦٠دا بەمامۆستای بابەتی مێژوو لە قوتابخانەی دواناوەندی

هەولێر دامەزراوە و بەسەدان قوتابیی زیرەک و مامۆستا و ئەندازیار و گەورە پیاوی ئەم قۆناغەی کورد لەسەر دەستی ئەم مامۆستا زانا و پەروەردەکارە پێگەیشتوون. سەردەمێک کراوە بەمامۆستای پەیمانگای ئامادەکردنی مامۆستایان لە هەولێر و بەسەدان مامۆستای پەروەردەکاری لەبەردەست دەرچوو و دوای ئەوەی، کە پتر لە ٢٥ ساڵ خزمەتی پەروەردەکردن و پێگەیاندنی نەوەی نوێی کوردی کردووە، لەسەر داوای خۆی لە ساڵی ١٩٨٥دا خانەنشین کراوە. تاکو دەست بەتاڵ بێت بۆ نووسین و تەواوکردنی کتێبە بەنرخەکانی لە بواری مێژوو و شوێنەوار و بەچاپگەیاندنیان، بەتایبەتی بەرهەمە بەنرخەکانی لە بواری

مێژووی کۆنی کوردستان و شوێنەوارەکانی، کە لە دوای چاپکردنیان بوونەتە باشترین سەرچاوەی لێکۆڵینەوەی مێژوویی و شوێنەواری گرنگی وڵاتەکەمان، چونکە لێکۆڵینەوەکانی لەو مەیدانەدا باشترین نموونە و سەرچاوەی راست و دروستن لەبارەی مێژووی کۆنی کورد و کوردستانەوە.

مامۆستا زوبێر بیلال ئیسماعیل مێژوونووسی لێهاتووی کورد لە ماوەی ژیانیدا توانی (٦) کتێبی بەنرخ لەبارەی مێژوو و زمان و ژیانی زانایانی کورد بەچاپ بگەیەنێ و هەمووشیان بەزمانی عەرەبین تاکو عەرەبی رۆشنبیر لە مێژووی رابوردی کورد بگەن. ئێمە لێرەدا ناونیشانەکانیان بەزمانی کوردی دەنووسین کە ئەمانەی خوارەوەن:

١- هەولێر لە چاخە مێژووییەکانیدا- لە ساڵی ١٩٧١دا چاپی کردووە.
٢- مێژووی زمانی کوردی- لە ساڵی ١٩٧٧دا.
٣- ئیبن خەلەکان- لە ساڵی ١٩٧٩دا.
٤- زانایان و قوتابخانە ئاینییەکان لە هەولێر- لە ساڵی ١٩٨٤دا.
٥- شێخی چۆلی- لە ساڵی ١٩٨٨دا.
٦- شۆڕشەکانی بارزان- لە ساڵی ١٩٩٨دا.

لە دوای کۆچی ناوادەشی ئەم دوو کتێبە بەنرخەی خوارەوەی بۆ چاپ کراوە:

١- مێژووی هەولێر- لە ساڵی ١٩٩٩دا چاپ کراوە.
٢- کورد لە مێژووی گەریدە موسڵمانەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، لە ساڵی ٢٠٠٠دا بۆی چاپ کراوە.

جگە لەم بەرهەمە بەکەڵکانەشی، ئەم بەرهەمە بەنرخانەی بەدەسنووسی لە پاش بەجێماوە و هەمووشیان بەزمانی عەرەبین و لەسەر مێژوو و ژیاننامەی ناودارانی هەولێرن:

١- مێژووی کورد و کوردستانی کۆن.
٢- مێژووی نوێی کورد.
٣- (٣) بەرگ لە کتێبی ناودارانی کورد.
٤- میرنشینی کوردی هەزەبانی.
٥- میرنشینی رەواندز یاخود سۆران.
٦- کورد و کوردستان لە پەیمان و رێککەوتننامەکاندا.
٧- مێژووی (مەصاصیر یا برادۆست)ی کۆن.
٨- کەلەپووری میللیی هەولێر.
٩- یەکەم قوتابخانە لە هەولێردا.
١٠- مزگەوت و تەکیەکانی هەولێر.
١١- مێژووی هۆزی بلباس.

جگە لەم بەرهەمە بەنرخانەشی، مامۆستای نەمر زوبێر بیلال، پتر لە ٢٥٠ باس و لێکۆڵینەوەی دیکەی نووسیوە و لە گۆڤارە عەرەبی و کوردییەکاندا بڵاوی کردوونەتەوە بەتایبەتی لە گۆڤاری (کۆڕی زانیاریی کورد) و (شمس کوردستان) و گۆڤاری (الثقافة) و (التراث الشعبي) و (شانەدەر) و هی دیکەی وەک گۆڤاری (کاروان) و (القافلة)...

مامۆستا زوبێر ئەندامی دەستەی نووسەرانی چەندین گۆڤاری رۆشنبیریی کوردی بووە، وەک (کاروان) و (القافلة) و (شانەدەر) و دوا کاری لە بواری مێژوو و شوێنەواردا، کرابوو بەشارەزا لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی شوێنەواری کوردستان لە شاری هەولێری پایتەختدا.

ئەو زاتە زانا و خزمەتگوزارەی کورد لە رۆژی ١٩٩٨/١٢/١٥دا، بەنەخۆشیی شێرپەنجە لە شاری هەولێر دڵە گەورەکەی لە لێدان کەوت.

**کەریم شارەزا**

# عیزەدین مەلافەندی
# ١٩١٧-١٩٩٩

بە قەڵەمی عزەدین مەلافەندی
ئامادەکردنی: ئازاد مەلافەندی

**قۆناغی منداڵی- خوێندنگا- نەشونما... پەند و وانە**

من عزەدین کوڕی مەلا ئەبوبەکر ناسراو بە "مەلافەندی"ی کوڕی حاجی عومەر کوڕی مەلا ئەبوبەکری ناسراو بە "کوچک مەلا"ی کوڕی عوسمان کوڕی ئەبوبەکر. لەو گۆڕستانە تایبەتە نێژراوە کە بەرامبەر بە گۆڕستانی شێخ عەبدوڵلایە "شێخەڵلا"، لەگەڵ باپیری حەیدەرییەکان "حەیدەری یەکەم" ئەویش یەکەم کەس بووە لە باپیرانمان کە لە هەولێر نیشتەجێ بووە دوای ئەوەی کە لە "هەریر و باتاس"ەوە بۆ ئەم شارە کۆچی کردووە. وتاریێژ و وانەی گوتووتەوە لە مزگەوتی قەڵای هەولێر ئەویش بەپێی فەرمانی هومایۆنی لە سوڵتان محەمەدی چوارەمەوە. ئەو فەرمانەی کە تاوەکو ئێستا لەلای بنەماڵەکەمانەوە پارێزراوە. مێژووی بنەماڵەکەمان پێش ئەم رێککەوتەش لە چەندین پەرتووک و سەرچاوەوە تۆمار کراوە.

دایکیشم هەدیەخان کچی عەبدوڵلا موخلیس بەگ نەوەی رەسول پاشای براو خەلیفەی محەممەد پاشای رواندزی ناسراو بە پاشای گەورەیە. میری رواندز و دامەزرێنەری میرنشینی سۆرانی کوردی یاخی لەسەر دەسەڵاتی عوسمانی. مێژووەکەی و شوێنەواری و سەرکەوتنەکانی و تیرۆرکردنە زۆردارییەکەی لەلایەن عوسمانییەکان زانراوە و لە چەندین پەرتووک و سەرچاوە تۆمار کراوە.

لە باداوە لە دایک بووم لە کۆشکەکەی باوکم لە بەرەبەیانییەکەی رۆژی هەینی رێککەوتی ١٩١٧/٣/٢٣. لە سەروبەندی لەدایکبوونم دایکم نەخۆش کەوتووە و بۆ موسڵ گوازراوەتەوە، کە ئەوکاتە باوکی لەم شارە بووە، سەرەنجام هەر لەوێ کۆچی دوایی کردووە. لە گۆڕستانی خدری ئەلیاسی "سەلاوی لێ بێت" نێژراوە. باوکم پێش ئەوەی کە دایکم شووی پێ بکات دوو ژنی هێنابوو. ئەوەی دواییان خوشکی ئەو بوو، واتە پلکم بوو، ئەویش بەهەمان شێوە بەسەر منداڵەوە چووە و دوای ئەوەی کە کوڕێکی بووە دوای چەند هەفتەیەک مردووە. باوکم پێشتر کچێکی خدر ئاغای خواستبوو کە یەک لە پیاوە ناسراوەکانی هەولێر بووە. باوکم لە کچەکەی خدر ئاغا چوار کچ و دوو کوڕی بووە. کوڕەکانی مردوون و کچەکانی یەکێکیان شووی بە عەتا ئاغای کوڕی رەشید ئاغا کردووە.

کچەکەی دیکەش شووی بە "ئیبراهیم یوسف"ی ئامۆزامان کردووە و هەردووکیشیان کۆچیان کردووە و هیچ وەچەیەکیشیان لەدوا بەجێ نەماوە و دوو کچەکەی دیکەش تا کۆتایی ژیانیان شوویان نەکردووە.

باوکم هەموو سۆز و گرنگییەکی پێ بەخشیوم، هەروەها هەموو دەوروبەرەکەی من کە یەکەم کوڕی ئەو بووم کە لەژیاندا مابێت دوای ئەوەی کە ئەو تەمەنی لە سەرووی پەنجا ساڵیدا بوو. باوکم تاوەکو تەمەنم لە سێ ساڵان تێپەڕی نەکرد و هێز و پتەویم پێوە دیار نەبوو ژنی نەهێنایەوە. ئەوسا کچی خاڵی خۆی سەعید ئاغای کوڕی یەعقوب ئاغای خواست کە دایکی قاسمی برام و سێ خوشکانم بوو. ژیانێکی پڕ لە خۆشەویستی و لێکگەیشتن بووە و تاوەکو ئێستاش بەردەوامە ئەگەرچی

قاسمی برام لە تەمەنێکی زوودا کۆچی کردو هیچ گەردێک لە نێوانمان نەبوو تەنیا ئەوە نەبێت هەندێ تۆزە هەوری هاوینان نەبێت، کە هەر هەندەیە و دەڕەوێتەوە کە ئەویش لە ئەنجامی خۆشەویستیم بوو بۆی و لە پێناوی بەرژەوەندی ئەو و بەرژەوەندییەکانی خێزانەکەمان بووە خودا لە ڕەحمەتی فراوانی خۆی بێ بەشی نەکات.

تەمەنی پێنج ساڵیم تەواو نەکردبوو، کە چوومە بەر خوێندنی سەرەتایی. ئەو چوونە بەر خوێندنەم لەم تەمەنە بچووکەوە چیرۆکی خۆی هەیە. دوای داگیرکردنی بەریتانیا بۆ عێراق و دواتر دەسەڵاتداریێتی حکومەتی عێراق ساڵی ١٩٢١ لە هەولێر خوێندنگای سەرەتایی کرایەوە بەپێی بنەماو پەیڕەوی دەسەڵاتی نوێ. ڕووکردن بۆ خوێندن لەم خوێندنگایە هەروەکو بڵێیت زۆر کز بوو بە هۆکاری هەستی ئایینی بەهێزی باوی ئەو سەردەمە لە شاری هەولێر و دوورکەوتنەوەیان لە هەر شتێک ئینگلیزی بێت.

خەمخۆرانی کاروباری خوێندن لە هەولێر و لەنێویاندا بەڕێوەبەری خوێندنگا مامۆستا ئەحمەد ناجی، سەردانی باوکمیان کرد و تکای ئەوەیان لێکرد کە لە خوێندنگاکەیاندا بەشدارم بکەن بە مەبەستی ئەوەی ئەو دووربەرێزییە بشکێت و ئەم چوونە خوێندنەم ڕاگەیاندنی ئەوەبێت، کە خوێندنگا بۆ بەدەستهێنانی زانستە و هیچ پەیوەندی بە ئینگلیز و کوفرەوە نییە.

باوکیشم ڕەزامەندی خۆی نیشاندا بەهۆی ئەو سوودەی کە بە دانیشتوانی شارەکەی دەگەیەنێت و چوومە خوێندنگاکە. چوونە بەر خوێندنم بووە هۆکاری هاتنەبەر خوێندنی بە لێشاوی خوێندکاران بۆ پۆلی سەرەتایی و زۆر لەم خوێندکارانە بە چوار یان پێنج ساڵ لەمن گەورەتر بوون. هەروەکو لەم وێنەیەی کە لەلایەن هەندێ لە هاوڕێکانم بینیم. لەم هاوڕێیانەم هاوڕێی مێرمنداڵیم و لاوێتیم و گەنجیم و تەمەنی بەپیاو بوونم و پیریم ئامۆزام ڕەشاد موفتی کە تەمەنی دوو ساڵ لەمن گەورەتر بوو. پێم لەسەر ئەوە داگرت کە دەبێت لەگەڵی بەیەکەوە بچینە بەر خوێندن و مەرجی چوونە خوێندنگام بە هاوڕێیەتی خوێندنی ئەوەوە بەستبۆوە. باوکی حەزی لە چوونە بەر خوێندنی ئەوی نەدەکرد بەهۆی ئەوەی کە ئەو لە مزگەوت فێری قورئان دەبێت. پێداگرتنی باوکم لەگەڵ ئامۆزاکەی، باوکی ڕەشاد محەمەد ئەفەندی موفتی، خودا بە بەخشندەیی خۆی دەوڵەمەندی بکات وایکرد کە لەسەر ئەم بڕیارە ڕەزامەندی بفەرمووێت. بەیەکەوە چووینە پۆلی یەکەم و ئیتر بەیەکەوە ماینەوە تاوەکو جەنابی ڕەشاد ئەفەندی موفتی بەرەو قاهیرە چوو بۆ خوێندن لە ئەزهەری شەریف.

لێرەدا نامەوێت درێژە بە ماوەی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیم بدەم، تەنیا دەمەوێت لەسەر هەندێ خاڵ و ڕووداو بوەستم کە کاری هەبووە لەسەر ڕێڕەوی ژیانم و دروستبوونی کەسایەتیم لەو مامۆستایانەی کە کاریگەرییان لەسەر بیرو بۆچوونم هەبووە. هیچ مامۆستایەک بەقەد خوا لێی خۆشبێت ڕەفیق حیلمی و دوای ئەو مامۆستا مەحمود ئەلنعێمی مامۆستای زمانی عەرەبی و مێژوو لە قۆناغی ناوەندی نەبووە. بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ مامۆستای کۆچکردوو عەلی حەیدەر سلێمان لەڕێگای پەرتووکەکەی وانەکانی مێژووی شارستانییەت و ڕابوونی ئەوروپی کە لەوانەی مێژوو دەمانخوێند لە قۆناغی ناوەندی و بەشێوەی "مەلزەمە" دەستمان دەکەوت.

دەتوانم بڵێم کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر بەجێهێشتووم لە بواری هزر و شێوازی نووسین. خواڵێخۆشبوو "عەلی حەیدەر سلێمان" لە ساڵی ١٩٩٢ کۆچی دوایی کرد. ئەوسا پایەکی باڵای هەبوو لە وەزارەتی پەروەردە. هەروەها بەهۆی دایکمەوە خزمایەتی هەبوو لەگەڵیاندا، دواتر بووینە هاوڕێ و برادەری یەکتر. لەدواییدا بووە نوێنەر لە پەرلەمانی ئەوساو دواتر بووە وەزیر و ئینجا بووە باڵیۆز. لە دواییدا بەپێی هاتنە سەر باسەکان دەگەڕێمەوە و کاریگەری ئەم بەڕێزانە لەسەرم باس دەکەم.

سەرەتای خوێندنمان لە خوێندنگا بە زمانی تورکی بوو زمانی عەرەبی وەک بابەتێکی خوێندن بوو. کە گەیشتینە پۆلی چوارەمی سەرەتایی زمانی خوێندن گۆڕدرا بۆ زمانی

کـــوردی ئەویش دوای بە یاســـایی کـردنی زمـانە خـۆجـێـیـەکـان. ئەم گـۆڕانکارییـە لای هەندێ کـەس بە گەرم و گوڕی پێشوازی لێ کراو لای هەندێکی دیکە بە سارد و سڕی.

هەندێ لە مامۆستاکان هەڵسان بە وەرگێڕانی پەرتووکە تورکییەکان و ئەو بابەتانای کـە دەخـوێندران بۆ زمانی کوردی بەپێی توانای خۆمان. هەندێ لە خوێندکارەکان یارمەتییان دەدان و منیش یەک لەم خوێندکارانە بووم، چونکە شارەزاییم لە زمـانی تـورکـی زۆر زۆر بـاش بـوو. وتم مـامـۆسـتـا رەفـیـق حـیـلمی کاریگەرییەکی زۆری لەسەرم هەبوو. ئەو گیانی کوردایەتی لەناخا دەچاند و هـەروەهـا لـەسـەر زۆر لـە خوێندکارەکان. لە کاتەکانی بوار هەبوایە وانەی لەسـەر نەتەوایەتی و مێژووی کورد بۆ دەوتینەوە. لە بارەی فۆلکلۆری کوردی. چەندین چیرۆکی بۆ دەگێڕاینەوە کە مەزنیی نەتەوە و سـەربەسـتی و تێکۆشـانی بۆ باس دەکـــردین. تاوەکـــو هـەنـدێ خـۆنیـشـاندانمان سـازدا لەسـەر ئاسـتـێکی بچـووک لە بۆنە نیـشـتـمـانیـیـەکان سـەبارەت بە داواکاری خوێندنی مێژووی کـورد و داواکاری جێبەجێکردنی یاسای زمانە خـۆجـێـیـەکـان لە تەواوی فەرمانبەرایەتییە میرییەکان لە ناوچە کـوردییـەکـان. فـێـری سـروودی نیشتمانی کوردی لە دانانی خۆی و ئاوازی خـۆی دەکـردین. تاوەکـو ئێستاش ئەو سروودەم لە یادە کە ئەو فێری کردین و لە بۆنە نەتەوەییەکاندا

دەمان وت و سـەرەتاکەی بەم رستـەیە دەستی پێکرد:

لەم زەمـانی ئینتـیـباهی مـیللەتی سەر رووی زەمین

بێچووە شێری کوردەواری حەیفە نووستووی لانەبی"

کە زمانی کوردی کرایە زمانێکی فـــەرمـی بـۆ خـــوێنـدن لـە خـوێندنگەکـەمـاندا. لە بەرامـبـەر خـوێندنگایەکی دیکە لە گـەڕەکی جـوولەکـەکـان کـرایەوە بە ناوی خوێندنگای هەولێری سەرەتایی دووەم و خـوێندن تیـایدا بە زمـانی عـەرەبی بوو. خـوێندنگاکـەی ئێـمـە ناونرا بە خـوێندنگای هەولێـری سـەرەتایی یەکەم.

کە مامۆستا مەحمود ئەلنعێمی لە "موسڵ"ەوە بۆمان هات. من لە پۆلی دووەمی ناوەندی بووم. ئەو گەنجێکی قـۆز و رێکوپێک بوو. لە سـەرەتای دەرچوونی بوو لە خـانەی باڵای مامۆستایان. وتنەوەی بابەتی زمانی عەرەبی و مێژووی پێ سپێردرابوو. حـەزی لە ئەدەب و شـیـعـر بوو زۆری دەخـوێندەوە، کـە هەسـتی بەوەکـرد منیش هەمـان ئارەزووی خـوێندنەوەم هەیە جـۆرێک لە تێگەیشـتنمـان لا دروسـت بـوو. بـەڵام لـە سـنـووری خوێندکار و مامۆستا. هەموو جارێک کـە دەگـەڕایەوە بۆ مـوسڵ هەندێ پەرتووکی دەست دەکـەوت و لەگـەڵ خۆی بۆ هەولێری دەهێنایەوە و منیش سـوودم لێ وەردەگـرت و دواتر بۆم دەگەڕاندەوە و ئیتر لەسەر بابەتەکان گفتوگۆمان دەکرد. کە بابەتەکان شیعر و ئـەدەب بـوون. هـەنـدێ جـــار

گفـتـوگـۆکـانمان سـەبارەت بە بابەتی پەرتووکـەکـان بەرەو توند و گـەرمی دەچوو. بەم جـۆرە حـەزم بۆ زمـانی عـەرەبی و ئەدەبەکەی و شـیـعـرەکـانی چوو. هەر ئەم دۆخە بوو کە حەزی بۆ شـیـعـر هەڵکشـاندم و من قـەرزاری ئەوم بۆ ئەو شـیـعـر و وتار و کـورتە چیرۆکانەی لەکاتی خۆیدا لە رۆژنامە و گۆڤارە عێراقی و عەرەبییەکان لەژێر ناوی خـوازراو بڵاوم کـردۆتەوە بـەنـاوی "ع. ج. اربـیـل" لـەزۆر جاراندا.

هەروەکـو وتمان بابەتی مێژوویی پەرتووکـەکـەی "عـەلی حـەیدەر سـولەیمان"مـان دەخـوێند. رێگاو شـێـوازی نووسـینەکـە و شـێـوازی وتنەوەکـەی بۆ بابەتەکـان، لەگـەڵ ئەوەی کـە نەتەوەیی بوو هەروەکـو زۆربەی مـوسـڵاوییـەکـان، بەڵام دەمـارگـیـر و شـۆڤـێنی نەبوو، دوای تەواوکـردنی خـوێندنم لەم قـۆناغـە سـەردانم کـرد و دواتر زانیم کـە وانە وتنەوەی واز لێهێناوە و رووی لە کـۆلیـژی مـاف کـردووە و بە پلەیەکی نایاب دەرچووە و پێش چەند ساڵێک لە شـاری مـوسڵ چاوم پێی کـەوت. هیوای سەرکەوتنی بۆ دەخوازم.

خـــوالێی خـــۆش بێت باوکم پیـاوێکی زۆر رێکوپێک بوو باڵای بەرەو درێژی بوو. گـرنگی بەجل و بەرگی دەدا. لەم بارەیەوە کـاپتن های "hay" دەسەڵاتداری سـەربازی بەریتـانی لە هەولێـر لە سـاڵانی ١٩٢١- ١٩٢٢ لە پەرتووکـەکـەی "the year in Kurdistan" نووسیویەتی و دەڵێت: هەر کە چاوی

به باوکم کەوتووە لە دەستەکانی باوکم ورد دەبۆوە و دەیگوت لە ژیانمدا هیچ دەستێکی جوانی وەکو "مەلافەندیم" نەدیوە. بە پەنجە درێژ و سپی و رێک و پاک و جلوبەرگە شیاوەکە. خوا لێی خۆش بێ لەگەڵ ئەوەی کە لە هەندێ بابەت توند بوو لەگەڵمدا، بەڵام خۆشەویستییەکەی بێ ئەندازە بوو بۆم. پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە هەمیشە ئامادەی دانیشتنەکانی ببم، کە لەگەڵ ئامادەبووان ئەنجامی دەدا. ئێواران دەبناردمە دیوەخان کە سەرۆک هۆز و تیرەکان ئامادە دەبوون بۆ ئەوەی لەجیاتی ئەو لەسەر خوانی نانخواردن ئامادەبم. لە کاتێکدا هەروەکو تەمەنی ئەوسام ئەوەی دەخواست حەزم دەکرد لەگەڵ هاورێکانم یاری بکەم. ئەم ئەرکە لەلام گران و قورس بوو، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە بواری یاری و گەمەم نەبووە، بەڵام دوایی کە گەورە بووم ئینجا گرنگی و واتای ئەم هەڵوێستەم لا روون بووەوە. هەموو جار کە دەچوومە لای پێیدا دەڕوانیم لە تەوقی سەرمەوە تاوەکو قاچ و پێم. ئەگەر هەر کەموکورتییەکی لە سەر و سیمام بەدی کردبا سەرزەنشتی دەکردم و داوای ئەوەی لێ دەکردم چاکی بکەمەوە. بەم بۆنەیەوە یادێکم بەبیردا هاتەوە بۆی هەیە خوێنەر بە هۆیەوە پتر وێنەکەی لا روون بێت. لەو کاتەی کە زانستە ئایینییەکانم لای باوکم دەخوێند لە مزگەوتەکەدا. هەموو بەیانییەک بە ئۆتۆمبیلەکەمان لەگەڵی دەچوومە ئەوێ. ژوورێکی تایبەتیشم هەبوو، کە تیایدا بەخێرهاتنی میوانەکانم دەکرد. ئینجا کە ئەو لە پێشوازی میوانەکانی و وانە وتنەوەی بە خوێندکارەکانی دەبۆوە، کە زۆرجاران دوای نوێژی نیوەڕۆ بوو، من و رەشادی ئامۆزامی بانگ دەکردە ژوورەکەی خۆی و دەستمان بە خوێندنی وانەکانمان دەکرد، لە بەیانییەکدا کە لە تەنیشتی لەناو ئۆتۆمبێلەکە دانیشتبووم هەروەکو پیشەی رۆژانەی بەجل و بەرگ و باڵامی روانی، کە ئەو رۆژە جلێکی شینم لەبەردابوو دواتر سەیری پێڵاو و گۆرەوییەکانی کردم، کە ئەو رۆژە گۆرەوییەکی بۆری تۆخم لە پێ کردبوو، وتی ئەمە چییە گۆرەوی بۆر لەگەڵ جل و بەرگی نیلی. دواتر وتی دابەزە. دواتر بە شوفێرەکەی گوت کە ناوی "جەواد" بوو جوولەکە بوو. ئیتر وەستام و نەمزانی چ بکەم. ئەوسا خوێندنی ناوەندیم تەواو کردبوو خێزانداریش بووم. بەشێوەیەکی کاتی خۆم تەرخان کردبوو بۆ خوێندنی زانستە ئایینییەکان لە مزگەوتەکەدا. بە سەرگەردانی گەڕامەوە ماڵەوە. دوای ماوەیەکی کورت ئۆتۆمبێلەکە گەڕایەوە بەدوامدا و جەوادی شوفێر وتی باوکت دەڵێ گۆرەوییەکە بگۆڕەو وەرەوە مزگەوت. باوکم جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە میوانی مەزن و گەورەی هەبوایە دەبوو من لە دانیشتنەکەیان ئامادەبام. لە راستیدا ئەم دۆخە بێزاری دەکردم. رۆژێکیان لە بادواوە لەسەر خوانی نانخواردن بووین لەگەڵ چەند میوانێک کە ئێستا ناوەکانیانم لەیاد نییە، ئەوسا تەمەنم لە نێوان ١٠-١١ ساڵان بوو. شێوازی نانخواردنمان بەم جۆرە بوو. چێشتگێڕ قاپە خۆراکەکانی بەریز بۆ دەگێڕاین و ئامادەبووانی سەرخوانەکەش هەرچییەکیان حەز لێ کردبا لەم جۆرە خۆراکانە لێیان هەڵدەهێنجا بۆ سەر قاپەکانی بەردەمی خۆیان. ئەم شێوازە لە خواردن بەپێی زاراوەی تورکی "قالدرقۆ"ی پێدەگوترا. ئەوەی کە روویدا ئەوەبوو چێشتگێڕ یەک لەو خواردنانەی کە گێڕای من زۆر حەزم لێ دەکرد. بەشێکی زۆرم لە خواردنەکە هەڵێنجا. لە دواییدا بۆم تەواو نەخوراو مایەوە. لە کۆتاییدا لەگەڵ هەڵگرتنی خوانەکە قاپەکە و خۆراکە ماوەکەش هەڵگیرا. بۆ ئێوارە باوکم بانگی کردم و وتی بۆ خواردنەکەت تەواو نەکرد. وتم خواردنی دیکەشم لەگەڵ خواردو بۆم تەواو نەکرا. وتی ئەی بۆچی بەشێکی زۆرت لە خواردنەکە هەڵێنجا. وتم من ئەم خواردنەم زۆر حەز لێ دەکرد و وامدەزانی کە تەواوی دەکەم، وتی گوێ بگرە، ئەگەر خواردنێکت هەڵێنجایە ناو قاپەکەی پێش خۆت. دەبێت تەواوی بکەیت. چونکە تەواو نەکردنی خواردنەکە دوو واتا دەبەخشێت یان ئاستی خواردنی خۆت نازانیت و نەوسنیت، کە ئەمە شەرمەزارییە، یاخود خواردنەکەت لا دروست و بەتام و خۆش نییە، کە ئەوەش شەرمەزارییەکە بۆ کابانەکە دەگەڕێنێتەوە.

جارێکی دیکە ئەمە نەکەیتەوە

هەروەها شیاو نەبوو بۆ من یان بۆ قاسمی برام بە جلی ژووردوە و خەوتن، دیشداشە یان بیجامە، لە ژوورەکانی ماڵەوە دەربچین بۆ دیوەخان یان بۆ دەرەوەی ماڵ.

لە پاییزی ساڵی ١٩٢٤ کە ئەوسا تەمەنم ٧ ساڵان بوو، سونەت کراوم، قاسمی برام کە ئەوسا تەمەنی یەک ساڵان بوو لەسەر پێداگرتنی من ئەویش لەگەڵما سونەت کراو لە هەمان کاتدا داوای ئەوەم کرد کە "رەشاد"ی ئامۆزاشم لەگەڵمان بەشدار بێت و "فەتاح"ی براشی لەگەڵمان لە هەمان رۆژ سونەت کرا.

سونەتکردنەکەشمان لەسەر دەستی "ئەمین"ی سەرتاش بوو، کە سەرتاشی باوکم بوو، ئەوسا ئەو چاکترین وەستای سونەتکردن بوو لە هەولێر.

لە کۆتایی خوێندنی ساڵی ١٩٣١-١٩٣٢ تاقیکردنەوەی خوێندکارانی پۆلی سێیەمی ناوەندی لە شاری موسڵ ئەنجامدرا، دوای ئەنجامدانی تاقیکردنەوە بە سەرکەوتوویی دەرچووم. دواتر باوکم رەزامەندی نەبوو لەسەر چوونم بۆ موسڵ بۆ تەواوکردنی خوێندنی دواناوەندی، چونکە بەڕای ئەو ئەم بروانامەیە رێگا بوو بۆ چوونە کۆلیج. ئەو دەیوت لە مزگەوت خوێندنت پێویستە. وتی لێرە لە مزگەوت بخوێنە و ژنت بۆ دەهێنم کە کچی "شێخ جەمیلەفەندییە" کە دەکاتە دایکی "فائیزە و فاروق"، بەڵام من حەزی خوێندن لە دڵمدا پەنگی خواردبۆوە. دوای هێنان و بردنێکی زۆر و بە هاندانی پلکم دایکی "موحسین ئاغا" کە زۆر خۆشی دەویستم، رێککەوتم لەسەر ئەو داوایەی باوکم بەرامبەر بەو بەڵێنەی باوکم دوای ئەوەی زانستە ئاینییەکان تەواو دەکەم ئازادبم بەرامبەر بەوەی هەرچی خوێندنگاو کۆلیجێک کە بمەوێ.

لە ١٩٣٢/١٢/٢٥ کە تەمەنم شانزە ساڵی تەواو نەکردبوو خێزانم پێکهێنا. دوای هەفتەیەک لەم رێکەوتە دەستم بە خوێندنی ئایینی کرد لای باوکی بەڕێزم. زۆربەی خوێندنەکەم لە مزگەوت و بە ئامادەیی رەشادی ئامۆزام بوو. ئەگەر لە مزگەوت رێک نەوتبا بەهۆی خەریکی زۆری باوکم ئیتر لە ماڵەوە دەمخوێند ئەویش بە پێداگری خۆم، چونکە زۆر بە پەرۆش بووم کە وانەکان تەواو بکەم و دواتر داوا لە باوکم بکەم، کە بەڵێنەکەی جێبەجێ بکات بە تەواوکردنی خوێندنم ئیتر بەوپەڕی پەرۆشی و کۆششەوە دەمخوێند.

لە بەهاری ١٩٣٣ نەخۆشییەکی نەناسراو دایگرتم پزیشکەکان سەرسام بوون لە نەدۆزینەوەی، چونکە پشکنینەکان هیچ نیشانەیەکی دیاریکراویان بەدەستەوە نەدا، بەڵام خۆم بە ماندووبوونێکی زۆرەوە دەتلامەوە و هەستم بە تەمەڵی و خاوی دەکرد و حەزم بۆ نووستن دەچوو، تاوە تاوەش ژانەسەر دایدەگرتم. سەرۆکی لەشساغی هەولێر پزیشکێکی لێهاتوو و زیرەک بوو. لە ئەڵمانیا خوێندنی پزیشکی تەواو کردبوو ناسرابوو بە "سەلیم خەیات" و خەڵکی شاری موسڵ بوو. دۆستی باوکم بوو، نەخۆشییەکەمی گەڕاندەوە بۆ ئەوەی کە گەنجێکی لەشساغ و لەزووەوە ژنم هێناوە و بۆی هەیە ئەم خێزانداریە لەو تەمەنە پتر ماندووی کردبێت.

بەهۆی زێدە هیلاکی و دواتر بە باوکم پێی وت کە زانستە ئایینییەکانیش دەخوێنێت و خۆی زۆر ماندوو دەکات. دکتۆر ئامۆژگاری باوکمی کرد کە گەشتێک بۆ شاری بەغدا بکا بە مەبەستی گۆڕینی کەش و هەوا. ئیتر ماوەیەک لە بەغدا مامەوە دوور لە ژن و خوێندن. بەم جۆرە باوکم بڕیاری چوونمی بۆ بەغدا دا و لە ماڵی ئامۆزاکەی ئەحمەد عوسمان کە ئەوسا ئەندامی "ئەنجوومەنی پیران" بوو مامەوە. ئەم گەشتە زۆر سوودی پێگەیاندم و دوای سێ مانگ بە لەشێکی ساغ و دروست گەڕامەوە هەولێر و دەستم بە خوێندنە ئایینییەکەم کرد.

لە هاوینی ١٩٣٤ دکتۆر "سەلیم ئەلخەیات" ئامۆژگاری باوکمی کرد کە جارێکی دیکە بۆ کەش و هەوا گۆڕین گەشتێکی دیکە بکەم، لەگەڵ ئەوەی کە هیچ نەخۆشییەکم نەبوو، ئەمجارەیان کە باوکم باسی ئەم گەشتەی لەگەڵ کردم پێم لەسەر ئەوە داگرت کە گەشتەکەم بۆ دەرەوەی عێراق بێت. ئەو بەو مەرجە رەزامەندی نیشاندا کە گەشتەکەم لەگەڵ موحسین ئاغای ئامۆزام بێت، کە ئەوکات سەرۆکی شارەوانی هەولێر بوو.

لە رێگای شەمەندەفەری موسڵ-

حەلەب چووینە سوریا و لوبنان، لە لوبنان ماوەی مانگێک ماینەوە، ئینجا بەهۆی کەشتی "ماربیت پاشا"ی فەرەنسی بەرەو ئەستانبۆڵ بەرێ کەوتین بەرێگای پۆرسەعید و ئەسکەندەرییەو ئەسینا "بیرییە" و ئەزمیر دواتر ئەستەنبۆڵ. لە تەواوی ئەم بەندەرانە دادەبەزین و شەوێک لە ئەسکەندەرییە ماینەوە و دوای ئەوەی کە نزیکەی ١٥ رۆژ لە ئەستەنبۆڵ ماینەوە. بەرەو بەیروت گەڕاینەوە لە رێگای دەریا و لەسەر پشتی هەمان کەشتی بە مەبەستی ئەوەی کە هەفتەیەک لە میسر بمێنینەوە و سەردانی قاهیرە بکەین و دواتر بەهۆی کەشتییەکی دیکە بەرەو بەیروت گەڕاینەوە. دواتر دوو رۆژ لە بەیروت ماینەوە و بەرەو موسڵ گەڕاینەوە لە رێگای دیمەشق و حەلەب بە شەمەندەفەر.

لە ساڵی ١٩٣٥ بەدواوە لەگەڵ خێزانەکەم ساڵانە هاوینان گەشتمان دەکرد بۆ شەقڵاوە. لەوێ لە رەزو باغێک رۆژانی هاوینمان بەسەر دەبرد کە میران قادر بەگ خاوەنی بوو. دۆستێکی نزیکی باوکم بوو، چونکە خێزانەکەم لە ماڵی باپیری شێخ حیسامەددین گەورە ببوو، دوای ئەوەی کە باوکی شێخ جەمیلەفەندی کۆچی دوایی کردبوو، لە تەویڵە و باغەکۆن و خورماڵ، کە لە جوانترین هاوینەهەوارەکانی سلێمانین نزیک لە سنووری ئێران، چونکە ئەو بەو گەرمایەی هەولێر رانەهاتبوو هەموو هاوینان باوکم لە سەرەتای حوزەیران تاوەکو ناوەڕاستی ئەیلوول بۆ "شەقڵاوە"ی دەناردین. لە ساڵی ١٩٤٠ سەرەتای نەخۆشی بە خێزانەکەمەوە دیار بوو. ئەو نەخۆشییەی کە باوکی پێوەی کۆچی دوایی کردبوو، لەم کاتەدا خوێندنم بە سەرکەوتوویی لای باوکم تەواو کرد. ئیتر سەردانی پلکم کرد بە مەبەستی ئەوەی هانی باوکم بدا بۆ جێبەجێ کردنی بڕیارەکەی بۆ گەشتکردنم و تەواوکردنی خوێندنم لە زانکۆی ئەمریکی. کە زۆر پێم داگرت بۆ ئەم مەبەستە. باوکم زۆر تووڕە بوو هاواری کرد بەسەرمدا: "ئایا تۆ دڵت نییە، هەستت نییە، ژنەکەت، دایکی منداڵەکانت نەخۆشە و پێویستی بە سەرپەرشتی و ئاگاداری هەیە. سەردانی پزیشکی پێویستە لە موسڵ و بەغداو تەنانەت دەرەوە. ئایا دەتەوێت من لەم پلەو پایەو لەم تەمەنە بە ئەرکی تۆ هەڵسم و جەنابیشتان بچن بۆ تەواوکردنی خوێندنێک کە کارتان پێی نییە. ئای کە پەروەردەم بۆت بەفیڕۆ چووە..." هیچ کاتێک باوکم بەم جۆرە تووڕەییە لە ژیاندا نەدیبوو، چوومە ژوورەکەم و کەوتمە بیرکردنەوە، هەستم بەوە کرد کە بەڕاستی بەهەڵەدا چوومە و گەڕامەوە لای باوکم و داوای لێبووردنم لێ کرد و دۆخەکە بەرەو ئاسایی گەڕایەوە.

دکتۆر سەبری ئەلقەببانی لە نەخۆشخانەی هەولێر دامەزرا. ئەو دکتۆرێکی خاوەن رەگەزنامەی سووری بوو، دەرچووی زانکۆکانی فەرەنسا بوو، باوکم راوێژی پزیشکی پێدەکرد تا بووە پزیشکی خێزانەکەمان. دۆستایەتیمان زۆر بەرەو پتەوی دەڕۆیشت. هاتوچۆی ماڵەکەیم دەکرد و زۆر ئێواران تا درەنگ دەمایەنەوە و بەیەکەوە لە خواردنەوەکان بەشدار دەبووین. نازانم چۆن باوکم بەم نهێنییەی زانی، بەڵام بەڕووی دانەدام، جۆرێک لە ساردی لەنێوان ئەو و دکتۆر پەیدابوو، پێکهەڵخشانێک لە نێوان دکتۆر سەبری و سەرۆکی تەندروستی لیوا دکتۆر رەشید زەکەریا پەیدابوو، ئەوەبوو دژ بە ئەو نووسراوێکی بۆ بەڕێوەبەرایەتی تەندروستی گشتی نووسی. بڕیاری گواستنەوەی بۆ دەرچوو، ئەوەبوو سەردانی باوکمی کرد، بەڵکو کار بۆ راگرتنی گواستنەوەکە بکا. ئەویش بەڵێنی پێدا، بەڵام کاری بۆ نەکرد، چونکە دەستخەتی باوکم بە ئاسانی نەدەخوێندرایەوە من نووسینەکانیم بۆ ئەنجام دەدا. چەند جار ئەو نووسراوەم بەیاد باوکم دەهێنایەوە ئەو دەیوت جارێ بوەستە، چونکە زۆر بەپەلە بووم بۆ مانەوەی دکتۆر لە هەولێر، بیرم لەوە کردەوە "زۆر بە داخەوە" نامەیەک بنووسم و لە جیاتی باوکم خۆم واژووی بکەم. چونکە واژووی باوکم زۆر ئاسان بوو تەنها "مەلا" بوو، ئیتر ئەوەبوو نامەکەم نووسی و ناردم. ئیتر دوای چەند رۆژێک بڕیاری لادانی بڕیارەکەی پێشوو لە بەڕێوەبەرایەتی تەندروستی هاتەوە. دوای نزیکەی هەفتەیەک کە خەریکی رێکخستنی نامەو نووسراوەکانی باوکم بووم و ئامادەم کردبوو بۆ واژووکردنی ئەو، بۆم بردە پێشەوە

تاکو واژوویان بکات. باوکم بە دیدێکی تایبەتییەوە سەیری کردم و وتی خۆت واژوویان بکە. وتم: چۆن دەبێ؟ وتی هەروەکو چۆن نووسراوەکەی دکتۆرت واژوو کرد، "بەڕێوەبەری گشتی تەندروستی" لای دانیشتبوو، ناتوانم چۆن باس لەو ساتە بکەم، کە بەسەرمدا هات، حەزم دەکرد زەوی شەق بێت و قووتم بدات، نامەیەکی لە چەکمەجەکەی تەنیشتی دەرهێنا کە نووسراوی دەستی "دکتۆر خەیات" بوو. دەڵێت: نامەکەتم بەدەست گەیشت. خوا لێی خۆش بێت بەم جۆرە وانەی پێدەداین و بەرەو راستی و دروستی و باشە ئاراستەی دەکردین. باوکم زۆر ورد و بەهەند هەڵگری کات و بەڵێنەکانی بوو، ئەگەر بەڵێنی کاتێکی دابێت. دەتتوانی لەسەر بەڵێنەکەی کاتژمێرەکەت دانێیتەوە. زۆر دڵتەنگ و نیگەران دەبوو ئەگەر یەکێک لەسەر بەڵێنی خۆی دواکەوتبا یان بێ ئاگاداری و داوای لێبووردنی پێشتر بەڵێنی ئامادەبوونی بەپێی کات و شوێن جێبەجێ نەکردبا. من و قاسمی برامی لەم بوارەدا زۆر ئاگادار دەکردەوە و بە تەنگەوە بوو و چاودێری دەکردین. تاوەکو ئەم خووە بەسەرماندا دیارکەوت. بە تایبەتی بەسەر مندا. چاودێری بەسەر من وردتر بوو، چونکە خوا لێی خۆش بێ قاسم زۆر بەهەند هەڵگر نەبوو.

باوکم خوا لێی خۆش بێ لە وردەکارییەکانی ژیانی رۆژانەی زۆر بەهەند بوو، وردبوو لە بەڵێن و بڕیار و هەڵسانی بەیانی و خواردنی و چوونە مزگەوتی و گەڕانەوەی و چوونی بۆ دیوەخان و کاتی خوێندنەوە و وانە وتنەوە و... هتد. زۆر لەم خوو رەوشتانە بەسەر من رەنگی داوەتەوە. کە لە بەیرووت وانەم دەوتەوە و کە بۆ هەولێر گەڕامەوە دوای کۆچی دوایی باوکم و وانە وتنەوەم لە مزگەوت و لە سەردەمی بە ئەندام بوونم لە پەرلەمان و سەرقاڵیم بە سیاسەت لە بەغدا و خوێندنم لە لەندەن و لە ئاوارەییم لە جنێڤ و پاریس و بەیروت و تەنانەت لەم رۆژانەی ئێستامدا.

هاوڕێ و برادەرەکانم و ئەو کەسەی کە دەیەوێت ببینێت.دەزانێ بەیانی و نیوەڕۆ و عەسر و ئێوارە لە کوێم.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٣٤ و دوای ئەوەی کە لە گەشتەکەمان لەگەڵ موحسین ئاغای ئامۆزام "سەرۆکی شارەوانی" گەڕاینەوە لە دەرەوەی عێراق. ژیانی رۆژانەم گۆڕانێکی بەتامی بەسەرداهات. کە ئەویش هاتنی مەسعود محەمەد بوو بۆ هەولێر بە مەبەستی خوێندن لە ناوەندی و وەک میوانێک لە کۆشکی باداوە. مەسعود کوڕی زانای ئاینی ناسراو مەلا محەمەدی جەلی لە نەوەی بنەماڵەی جەلی زانست پەروەری ناسراوی شاری کۆیە و کوردستان بوو. کە باوکی دۆستی نزیک و بەڕێزی باوکم بوو، لە نێوانیاندا گەرم و گوڕییەکی دۆستانەی بەتین هەبوو، لە کاتە جیا جیاکاندا سەردانی باوکمی دەکرد لە باداوە بە رۆژ و بە هەفتە دەمایەوە. باوکم هەر میوانێکی هەبووایە لەسەر نانی شێوان ئامادە نەدەبوو جا هەر کەسێک بووایە، تەنیا ئەگەر مەلا محەمەدی جەلی زادەی ناسراو لە کوردستان بە مەلای گەورە لە میوانداری ئەو باین ئەوا هەندێ جار ئامادەی نانی شێوان دەبوو وەک رێزلێنان بۆ ئەم بەڕێزەی کە لە کۆیەوە هاتبوو.

باوکی مەسعود خودا لێی خۆش بێ قسە لەڕوو و نەترس و هەر شتێک و رایەکی بە راست بزانیبا بێ ئەوەی لە لۆمە و قسەو قسەلۆک خوودداری بکات هەڵوێستی خۆی دەنواند و راو بۆچوونی بوێرانەی هەبوو لە هەندێ بابەتی ئاینی و فیقهی لەگەڵ ئەو راو بۆچوونانەی کە باوبوو لە کوردستان یەکی نەدەگرتەوە، بەڵام ئەو هەر بۆی بڕەخسابا ئاشکرای دەکرد و رایدەگەیاند زۆر دژو ناجۆر و ناکۆک بوو لەگەڵ شێخەکان و لە شیعرێکیدا تەنگیان پێ هەڵدەچنێت و دەڵێت کە زۆر لە کوردستان باوەو لەسەر زارانە:

"هەتا شێخان لە کوردستان بمێنێ
ئومێدی زندەگانیت لێ نەمێنێ"

لە بیرمە لەسەردەستی باوکم زانستی بێژان "علم الكلام"م دەخوێند، کە بە میوانی سەردانی کردین لە بۆنەیەکدا شەوێک لەو شەوانەو دوای نانی شێوان بە ئامادەبوونی باوکم لێی پرسیم چی دەخوێنیت؟ وتم "شرح العقائد"، وتی: ئەم زانستە زانستێکی ئاڵۆز و وردە دەمەوێت لە بارەیەوە قسەت

لەگەڵدا بکەم لەم شەوانەی دادێت ئەویش ئەگەر باوکت رای لەسەربێت. چونکە بۆی هەیە حەز لەوە نەکات لە هەندێک لە بیروراکانی من بەئاگابێت لە هەندێ بابەتدا. دواتر کە گەرامەوە لای باوکم وتی: برۆ بۆ لای، بەڵام ئاگاداری خۆت بە، چونکە هەندێ راو بۆچوونی زۆر نەترس و راشکاوی هەیە و بەلای گرووپی "موعتەزیلە"دا دەچێت. ئەو رایانەی کە پێت دروستە وەریبگرە، بەڵام بەو رەنگەیەی کە ئاگادارم کردیەوە. ئیتر زۆربەی شەوەکان دوای گەرانەوەی باوکم بۆ ژووری تایبەتی خۆی و دوای ئەوەی کە بەردەستەکەمان هەرچی لە میوەی شەوانەی زستانەی بۆ دەهێناین وەک خورماو فستق و مێوژو وشکە هەنجیر و گوێز و لۆز "باوکی مەسعود لە شەوانی درێژی زستان حەزی لە کەمێک خواردنی ئەم جۆرانە بوو ناوی لێدەنا (شەو چەرەز) پەرتووکەکەم لەبن باڵم دادەناو دەچوومە لای ئەو. لە بابەتی بروایەکان و فەلسەفەکانیان گفتوگۆمان دەکرد. ئەو هەمیشە پێی دەگوتم: " بۆ ئەوەی دیدگایەکی دروستت هەبێ بۆ ئەم جۆرە بابەتانە دەبێ پێش هەموو شتێک لە گرێی بۆ بەجێماومان خۆت رزگار بکەیت، کە هی کۆنەکانە و لە ناختدا هەڵیکێشیت ئەوسا دەگەیتە بریار و بیرورای دروست و شیاو".

ئەم وشانەم بە وردی و دروستی لەبەر کردووە، چونکە چەندین جار لەسەری دووبارە کردوومەتەوە. ئەو فێری ئازادی رادەربرین و هەمیشە دووبارەی دەکردەوە کە واز لە بابەتێک نەهێنم تاکو بروایەکی پتەوم لا دروست نەبێت لەسەر ئەو بابەتەی کە پێم رادەگەیەنێت. باوکی مەسعود ئاسۆی زۆر فراوانی بۆ کردمەوە لە بوارەکانی ئایینی و بروایەکان و زۆر هاوکاری کردم لە بواری دارێژانی را کەسییەکانی خۆم بە تایبەتی لەم گۆشە بابەتانەی ئاماژەم بۆ کرد.

لێرەدا لە درێژەی باسی ئەم زانا مەزنە بۆنەیەکم بەیاد دێتەوە پێویستە باس بکرێت، وەک باوکم گێرایەوە و ئاماژە بۆ ئازایەتی و بەجەرگی و رەوانبێژی مەلا محەمەدی گەورەی کۆیێ دەکات. لە یەک لە سەردانەکانی مەلیک فەیسەڵی یەکەم بۆ هەولێر. ئاهەنگێک لە یانەی فەرمانبەرانی بۆ سازکرا. ئەو رۆژە مەلا محەمەدی جەلی زادەی کۆیی بە میوانی لە سەردانی باوکمدا بوو، بۆ ئەم ئاهەنگە بانگ کرابوون، کە گەیشتنە دەرگای یانەکە لە هەمان ساتدا موتەسەریف "پارێزگار"ی هەولێریش گەیشتە بەر دەرگای یانەکە. کە هاتنە خوار لە ئۆتۆمبێلەکە جەنابی موتەسەریف سلاوی لێ کردن و ئیتر پێشکەوت بۆ چوونە ژوورەوەی نادی. لێرەدا جەنابی مەلای گەورەی کۆیە قۆڵی موتەسەریفی گرت و وتی: زانایەکان جێنشینی پێغەمبەرانن مافی ئەوەت نییە بە پێشمان بکەویت تەنیا ئەو کاتەی کە داوای خودایەتی بکەیت! موتەسەریف کشاوە دواوە و وتی: ببوورە دەمویست رێگاکەتان نیشان بدەم. لە وەڵامدا جەنابی مەلای گەورە فەرمووی خۆمان رێگاکە پێدەزانین و باوکمی بەپێش خۆی دا. ئینجا موتەسەریف بەدوایاندا رۆیشت بۆ شوێنی ئاهەنگەکە. ئەم رووداوە لە سەردەمی عەبدولحەمید عەبدولمەجیدی موتەسەریف "سیسرکە" بووە. لە هەمان ئاهەنگ مەلیک فەیسەڵی یەکەم بە جێنشینی مەلیکی وتووە کە شوێنی خۆی بۆ باوکم چۆڵ بکات و ئەو لە شوێنی باوکم دابنیشێت.

ئەو پەیوەندییە توند و تۆڵانەی کە باوکم لەگەڵ کەسانی وەک مەلا محەمەدی گەورەی کۆیە هەیبوو لەگەڵ کەسانێکی کەمی بەقەد ژمارەی پەنجەکانی یەک دەست هەیبووە. یەک لەو کەسانە وەک ئاماژەمان پێدا مەلای گەورە و ئەوی دیکە "میرانی قادر بەگ" سەرۆک هۆزەکانی خۆشناوەتی بوو، کە ئەو سەردانی باوکمی دەکرد هەستم دەکرد باوکم زۆر پێی دەگەشایەوە و دڵشاد دەبوو بە سەردانەکەی. هەموو هاوکارییەکی ئەوی دەکرد لای حکومەت ئەگەر لەسەر ئاستی لیوا "پارێزگا" یان لە بەغدا بووبێت.

لە پاییزی ساڵی ۱۹۳۹ کە قادر بەگ دووچاری دوا نەخۆشی کۆتایی ژیانی بوو لە نەخۆشخانەیەکی موسڵ بوو، دوو جار باوکم بەناوی خۆیەوە ناردمییە لای بۆ پرسین و سڵاو گەیاندن، کە باوکم گوێبیستی کۆچی دوایی ئەو بوو لە چاوەکانی شوێنەواری فرمێسکم دەدیت و دەنگ لە قورگییەوە کە وتی: "ئیننا لیللا و ئیننا ئیلەیهی راجیعون" بە دەستی

راستی لەخۆیداو ئەمە یەک لە جارە کەمەکان بوو، کە فرمێسک لە چاوی باوکم ببینم. دواتر ناردمی تاوەکو بەشداری گەیاندنی تەرمی بکەم لە "موسڵ"ەوە بۆ شەقڵاوە. بۆ رۆژی دواتر خۆی چووە شەقڵاوە و لەوێ عەباکەی کۆچکردووی لەسەر شانی "سدیق"ی کوری گەورەی دانا. بەم جۆرە ئەوەی راگەیاند کە ئەو جێگرەوەی باوکیەتی واتە سەرۆکی هەموو هۆزەکانی خۆشناوەتی. لەگەڵ ئەوەی کە سدیق تازە لە تەمەنی بیست ساڵیدا بوو، لە هەمان کاتدا کەسانی دیکەی وەک مامەکانی و ئامۆزاکانی پێشبرکێی ئەوەیان دەکرد، کە ئەوان شوێنەکەی بگرنەوە. میرانی قادر بەگ نوێنەری هەولێر بوو لە پەرلەمان حکومەتیش هەڵبژاردنی راگەیاندبوو بۆ تەواوکردنی نوێنەرایەتی. "سدیق"یش تەمەنی بیست ساڵی تەواو نەکردبوو، باوکم هەوڵی چاککردنەوەی تەمەنی دا "سدیق لەهەمان لەدایک بوونی ساڵیَ من بوو لە ١٩١٧ و چل رۆژ لە من بچووکتر بوو" کرایە لەدایکبووی ساڵی ١٩٠٧. خۆم شاهیدی ئەو هەوڵدانانە بووم و لە کۆتاییدا سەری گرت.

بەدەستی خۆم نامەکانی باوکم بۆ کاربەدەستانی بەغدا لەم بارەیەوە کە باوکم دیتی ئەم هەوڵدانەی ئەوم لا شوێنی سەرنجە. رۆژێک بانگی کردمە ژوورەکەی و وتی: باوکی خوالێخۆشبووم هاورێ و دۆستێکی نزیکی والی موسڵ "سلێمان نەزیف" بوو، کە کۆچی دوایی کرد والی موسڵ نامەیەکی بۆ نووسیم سەرەخۆشی لێ کردم. لە کۆتایی نامەکە نووسیبووی ئامادەم هەرچ داوایەکت هەیە بۆت جێبەجێ بکەم. دواتر نووسیبووی هەرچی بۆ باوکتم نەکردووە بۆت جێبەجێ دەکەم، ئێستاش کە قادر بەگ مردووە هەمان هەستم لا پەیدابوو بۆ "سدیق"ی کوری. دواتر لە جانتاکەی نامەیەکی پێچراوەی دەرهێنا، کە هەندێ نووسراوی گرنگی تیابوو، کە نامەکەی "سلێمان نەزیف" بوو. خۆم خوێندمەوە " کە ئەم نامەیە لە سووتانەکە و تالانەکەی قەسری باداوە لەناوچوو".

شێخ عەلی حیسامەدین یەک لەو پیاوانە بوو کە باوکم زۆر خۆشی دەویست و رێزی لێ دەگرت. ئەو باپیری خێزانەکەم دایکی "فائیزە و فاروق"ە لەدایکیانەوە بوو پەیوەندییەکە بەم شێخە بەرێزە پایە بەرزە هاورێیەتی و رێز و پێزانین بوو بۆی جیا لە پەیوەندی لەگەڵ شێخ عەلی ئەفەندی یان محەممەد ئەفەندی ئامۆزای. کە پەیوەندییەکەیان پەیوەندییەکی سۆفیانە بوو، چونکە لە رێبازی نەقشبەندی خزابوون لەسەر دەستی شێخ حیسامەددین.

سەردانەکەیم بۆ هەولێر لەبیرە، کە میوانی باوکم بوو لە باداوە، باوکم خۆی تاوەکو قوشتەپە بە پیرییەوە چوو، ئەمجارە تاکە جارێک بوو کە باوکم بەم جۆرە پێشوازی لەهەر کەسێک بکات تەنیا ئەو تاکە سەردانەی مەلیک فەیسەڵی یەکەم نەبێت کە بە میوانی سەردانی کردین لە باداوە.

لە یادمە کە ئەوسا باداوە جمەی دەهات لە خەڵک لە هەموو چین و توێژێکەوە خەڵک ئامادە بوون. ماوەی نێوان شار و باداوە دوو میل بوو. بەدرێژایی لە مێرووستان دەچوو ئەم خەڵکە روویان لە باداوە دەکرد هاتبوون بۆ پیرۆزبوون بە سەردانیان بۆ شێخی پیرۆز ئەم دۆخە لە بەیانییەوە تاوەکو تاریکی شەوی خایاند. رۆژی هەینی کە بۆ مزگەوت هاتە خوار بۆ نوێژکردن ئەم خەڵکە زۆرەی کە دەورەی ئۆتۆمبێلەکەی داین، باوکم و منیش لەناو ئۆتۆمبێلەکە بووین، زۆر بە زەحمەت ئۆتۆمبێلەکە بەسەر قەڵا کەوت. کە لە نوێژکردنیش تەواو بووین. ئیتر قەرەباڵغی خەڵکەکە نایەتە باسکردن. لە هەموو لایەکەوە بە چەقۆ و مەقەس دەورەیان دابووین. بە مەبەستی دەستخستنی پارچە پەرۆیەک لە جل و بەرگی شێخ. ئەوەبوو تەواوی جوبەو کراس و کەوای تیلمە تیلمە ببوو بەهۆی پارچە لێکردنەوەی بە مەبەستی پیرۆزی هەڵگرتنی.

ئەو دیمەنەی ئامۆزای باوکم محەمەد ئەفەندیم هەرگیز لەیاد ناچێتەوە، باوکی قازی رەشاد، کە یەک لە خەلیفەکانی شێخ حیسامەددین بوو، کە بە درێژایی رێگاکە تا گەیشتینەوە باداوە دەگریا، گریانێکی بەکوڵ و فرمێسک بە ردێنەکەیدا دەهاتە خوارەوە. ئەو لە تەنیشت شوفێرەکە دانیشتبوو، لەگەڵ گریان و فرمێسکەکانی هەندێ وشەو

شیعری دەوتەوە، لام روون و ئاشکرا نەبوو و لەیادم نەماوە. ئەم سەردانەی شێخ حیسامەددین بۆ باوکم پێش ژن خواستنم بوو و رێکەوتەکەیم لەیاد نییە.

دوای ژنهێنانم چەندین جار بەخێزانمەوە سەردانیم کردووە و هەمیشە بە سۆز و دیدگای باوکانەوە سەیری دەکردم. سەردانیمان دەکرد لە "باغەکۆن، تەویڵە، خورماڵ" کە لە جوانترین هاوینە هەوارەکانی کوردستانن. بەهۆی ئەوەی کە رێگاکە هەمووی تەواو قیرتاو نەبوو. لەنیوەی رێگا لای قایمقامی هەڵەبجە، کە برادەرێکی خۆشەویستم بوو، ئۆتۆمبێلەکەم جێدەهێشت تاوەکو لە سەردانی شێخ دەگەڕاینەوە و ئیتر رێگاکەمان بە ولاغ دەبڕی. قایمقامی ئەوسای هەڵەبجە سەعید قەزاز بوو.

کە شێخ حیسامەددین کۆچی دوایی کرد بە رێکەوت لای باوکم وانەکانم دەخوێند، کە بەردەستەکەمان بروسکەکەی گەیاندە باوکم ئەوسا وەک هەمیشە لەگەڵ رەشادی ئامۆزام بەیەکەوە بووین، بروسکەکەی بەلاوە داناو وانەکەی بۆ تەواو کردین. دواتر کە بروسکەکەی کردەوە و خوێندییەوە سیمای دەموچاوی تێکچوو ناجۆرییەکی پێوەدیار کەوت لەگەڵ خەمبارییەک کە سەرتاپای داگرت. ئیتر بێ دەنگ بوو بۆ چرکەیەک و دواتر بە دەنگێکی کاریگەر گوتی شێخ حیسامەددین کۆچی دوایی کرد. من و رەشاد سام دایگرتین، دواتر وتی کارەساتەکە زۆر مەزنە. دواتر وتی بەڵام چۆن هەواڵەکە بە باوکت بگەیەنین، رووی لە رەشاد کرد، هەواڵەکە زۆر کوشندە دەبێت بۆ ئەو. دواتر کتابەکەی داخست و رووی لە رەشاد کرد و وتی: باوکت لەکوێیە؟ گوتی: لە ژوورەکەی خۆیەتی. وتی برۆ بانگی بکە و هیچ شتێکی بۆ باس مەکە. من چوومە خوارەوە و رەشادیش چوو باوکی بانگ بکات. کە چووە ژووری باوکی نازانم چیان وتووە، بەڵام کە لە ژوورەکە هاتە دەرەوە بە دەنگێکی بەرز دەیگوت: نا، نەخێر، نابێت، هەرگیز و لەم جۆرە وشانە. دوای کەمێک باوکم داوای ئۆتۆمبێلەکەی کرد و رووومان لە باداوە کرد. باوکم رووی لەمن کرد و وتی: ئێستا ئەرکە گەورەکە ئەوەیە چۆن بە "سەعادەت"ی خێزانم بڵێم، کە ئەوسا دووگیان بوو، چۆن ئەم هەواڵەی پێرابگەیەنم. کە گەیشتینە ماڵەوە، وتی: خێزانەکەت تۆزێ بە قسە خەریک بکە.

"حەلیمە"خانم بۆ بنێرە. "حەلیمە" دایەنی سەعادەتی خێزانم بوو، ئیتر ئەو هەندێ قسەی بۆ "حەلیمە" کرد و دواتر کە "حەلیمە" هاتەلای خێزانم بەجێم هێشتن. دوای کەمێک گوێم لە نووزەو گریانێکی هێمن بوو. زانیم کە "حەلیمە" بەرێکی بە ئەرکەکەی خۆی هەڵساوەو هەواڵەکەی بە "سەعادەت"ی خێزانم گەیاندووە.

بەڵام باوکی رەشاد لە ماڵەکەی خۆی بۆ ماوەی سێ رۆژ مایەوە. قسەی لەگەڵ کەس نەدەکردو هیچی نەدەخوارد. ئیتر منداڵەکانی سەردانی باوکمیان کرد، سەرەنجام باوکم لە مزگەوتەوە رووی لەماڵی باوکی رەشاد کرد و ئیتر نازام باسی چیان کرد، بەڵام دوای نزیکەی کاتژمێرێک باوکم لەگەڵ ئامۆزاکەی بەیەکەوە هاتنە دەرەوە و بە ئۆتۆمبێلەکە بەرەو باداوە بەرێکەوتین.

دیمەنی خەماوی بە سەروسیمای زۆر بە کاریگەری دەبینرا. باوکم لەگەڵی لەسەر سینی نانخواردن دانیشت و هانی ئەوەی دا هەرچییەک بێت کەمێک بخوات و لە ئەنجامدا هەوڵدانەکەی سەری گرت.

دوای نزیکەی دوو هەفتە باوکم بڕیاری ئەوەی دا کە بۆ "باغەکۆن" بچین، بە مەبەستی پرسە گەیاندن بۆ کورەکەی و جێگرەکەی شێخ محەمەد ئەلحیسامی. لە گەشتەکەماندا رەشیدی ئامۆزاشمان لەگەڵدابوو، کە دوو ساڵ لە رەشاد گەورەتر بوو. ئیتر هەستم بە ئارامی کرد بە تایبەتی کە دیتم مامم بۆ ماوەیەکی درێژ بەرامبەر بە قەفەزەکەی شێخی کۆچکردوو دەوەستا. دوای چەند رۆژێک گەڕاینەوە هەولێر. ئەوسا مامم گەڕایەوە بۆ سەر نەریتەکەی خۆی لە بەستنی بازنەکانی زیکرکردن کە دوای نوێژی شێوان دەگێرا لە مزگەوتەکە لەسەر رێبازی نەقشبەندی.

**تێبینی:**

ئەم نووسینە بەشێکە لە یاداشتەکانی کە بەقەلەمی خۆی پێش مردنی ١٩٩٩ نووسیویەتی لەلایەن ئازادی مەلا فەندی کوڕیەوە دراوە بە ئینسکلۆپیدیا.

# ساڵح شێرە
# ١٩٢٤-١٩٩٩

**بەقەڵەمی ساڵح شێرە**

ساڵح شێرە لە ساڵی ١٩٢٤ لە گوندی "دۆڵەبەکرە"ی سەر بە ناحیەی قوشتەپە لەدایک بووە، پاشان چوونەتە گوندی قوڵتەپە، کە دەکەوێتە نزیک دۆڵەبەکرە لە نێوان هەولێر و کەرکووک. دواتر چوونەتە .ناحیەی دیبەگەی سەر بە پارێزگای هەولێر. ساڵح شێرە لە خێزانێکی جووتیاری هەژار چاوی هەڵهێناوە و هەر لە باوەشی ئەو خێزانەشدا پەروەردە کراوە. باوکی "٣" ژنی هێناوە. ساڵح شێرە لە دایکی راستەقینەی خۆی شەش برای هەبووە. دووانیان لەخۆی گەورەترن، کە ناویان "سەلیم و کەریم"ە، ئەوانی دیکەش لە خۆی بچووکترن "حەسەن، حوسێن، عوسمان"، پێنج خوشکیشی هەیە بە ناوەکانی "بەدیعە، سەبیحە، خەدیجە، غەزال، گولیزار".

ساڵح شێرە لەبەرئەوەی لە ژینگەیەکی جووتیاریدا ژیاوە و پەروەردە کراوە، هەمیشە سیفات و خەسڵەتە پاک و بێگەردەکانی کوردەواری پەیڕەو کردووە، وەک دڵپاکی و دەستپاکی و راستگۆیی



و ... هتد".

لە ساڵی ١٩٥٤ لە گەڕەکی شۆریجە لە کەرکووک حزب خانویەکیان گرتبوو هەم بارەگا بوو هەم رۆنیۆ و چاپەمەنی لێ دانرابوو بۆ دەرکردنی بەیاننامە و نووسراوی حزب. ئەم کادیرانە لە خانووەکەدا بە نهێنی کاریان دەکرد: "هەمزە عەبدوڵلا، جەلال تاڵەبانی، عومەر دەبابە، ئیسماعیل فەلاح، ساڵح شێرە" کە بەیاننامەکان دەردەچوو بە نهێنی بەسەر هەموو شار و شارۆچکەکانی کوردستان و ناوەڕاستی عێراقدا دابەش دەکران.

ئیسماعیل فەلاح بەجلێکی شپڕێو و کۆنەوە بە شارەکاندا بڵاوی دەکردەوە، ساڵح شێرەش لە بارەگادا چاودێری دەکرد. تاکو "١٤"ی تەمووزی ١٩٥٨ لەم شوێنە مانەوە پاشان بەنهێنی گەڕانەوە بۆ هەولێر.

مەلا عەولای حاجی سمایل لە لاپەڕە "١٧"ی بیرەوەرییەکاندا "سەربردەی ژیانی سیاسیم" باسی پارتی دەکات لە ساڵانی ١٩٥١، مەلا دەنووسێ: ساڵح شێرە و کەریم عارەب و تۆفیق ناوێک، مەلا عەولا سەبارەت بە پێوەندی خۆی و شێرە لەلاپەڕە "٣٧"ی کتێبەکەیدا دەنووسێ:" لە گیران و کێشەو گیرەی دایەرەکانی پۆلیس و حەپسکردنیش هەر هاوبەش بووین هەتا وامان لێ هاتبوو هەر بەیەکەوە بە "مەلا و ساڵح یان ساڵح و مەلا" باس دەکراین.

کاکە مەم بۆتانی لە کتێبەکەیدا "کاکی کاکان... مرۆڤی رووناکبیر و شۆڕشگێڕ" کە لەسەر خەباتی سیاسیی عومەر دەبابە نووسیویەتی، لە لاپەڕە "٢١٢"دا

باس لەوە دەکات چۆن مەترسی لە گرتنی ساڵح شێرە و سمایل هەبووە. بۆیە عومەر دەبابە بە پەلە خۆی گەیاندە دائیرەی ئەشغال کە لەسەر پردی تازە بوو لە تەنیشت "خاسە" لە کەرکوک. ساڵح پشتی بە دیوار دابوو، دەمودەست بانگی کرد و خەبەرەکەی دایێ و داوای لێ کرد هەردووکیان "واتا شێرە و سمایل" خۆیان بزرکەن تا ئاگادار دەکرێنەوە. هەروەها لە لاپەڕە "٢١٥"ی هەمان کتێبداو لە گفتوگۆیەکی نێوان عومەر دەبابە و ئیسماعیل فەلاح و ساڵح شێرەدا سەبارەت بە مەترسی گرتن و خۆڕاگرتن.

ئەمانەش بەشێکن لە ئەخلاقیەتی کۆمەڵگای کوردەواری لە گوند و ناوچە کشتوکاڵییەکاندا. ناوبراو وەک هەر بنەماڵەیەکی جووتیاری کورد هەر لە منداڵییەوە بێ دەرامەتی و نەبوونی چەشتووە، بەڵام هەمیشە بە ئیرادەیەکی پۆڵایینەوە ڕووبەڕووی سەختیی ژیان بۆتەوە و بێ هیوا نەبووە لە دوارۆژ.

ساڵح شێرە لە ساڵی ١٩٤٧دا ژنی هێناوە کە ناوی خونچە بووە، لەو ژنە کچێکی بوو بەناوی "نەجیبە" ژنی یەکەمی لە ساڵی ١٩٥٠ بە نەخۆشیی "سیل" کۆچی دوایی کرد. دوای کۆچی ژنەکەی بە دوو ساڵ کچەکەشی مرد. پاشان لە



ساڵی ١٩٥٤ ژنێکی دیکەی هێنا بەناوی "عصمە" کە بە شێوازی ژن بەژن بەرامبەر خوشکێکی خۆی ژنی دووەمی مارە کرد، لەم ژنەی سێ کچ و دوو کوڕی بوو، دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٦٥ براژنەکەی خۆی مارە کردەوە، چونکە براکەی بە ڕووداوی ئۆتۆمبێل جوانەمەرگ بوو، ژنی سێیەمی ساڵح شێرە ناوی "سکینە"یە چوار کچ و پێنج کوڕی هەیە.

## خەباتی سیاسیی ساڵح شێرە

ناوبراو هەر لە سەردەمی لاوێتییەوە چۆتە مەیدانی سیاسییەوە، لە ساڵی ١٩٤٢ پەیوەندیی بە حزبی هیوا کردووە، کە تاکە حزبی کوردی ئەوکاتە بووە و جەماوەرێکی فراوانی لە ڕۆشنبیران و ئەفسەران و چین و توێژەکانی تری گەلی کوردی لەگەڵدا بوو، کاریگەری سیاسیی حزبی هیوا لەسەر حکومەتی ئەوکاتی عێراق هێندە بەهێز بوو کار گەیشتە ئەوەی بەهۆی پیلانی دەرەکییەوە حزبەکە لە ناوەوەڕا و لەسەر ئاستی سەرکردایەتیدا بێ هێز بکرێت و ڕیزەکانی لێک هەڵوەشێتەوە. یەکەمین ڕەفتاری سیاسیی ساڵح شێرە لەگەڵ ئەم حزبەدا بوو. پاشان دوابەدوای دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان ساڵح شێرە لە دەشتی هەولێر- ناحیەی دیبەگە پەیوەندیی بە پارتییەوە دەکات و دەبێتە ئەندامی ناوچەی جووتیارانی حزب. لەم بارەیەوە بەڕێز خورشید شێرە لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە "٢٣٩٥"دا دەڵێ: بەو هۆیەی کە ساڵح شێرەی مامم برا گەورەی بنەماڵەکەمانە و ئەویش بەر لە دامەزراندنی پارتی ئەندامی حزبی هیوا بوو. پاش ئەوەی لە "١٦ی ئابی ١٩٤٦" پارتی دیموکراتی کوردستان دامەزرا پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی پارتییەوە کرد.

پاشان خورشید شێرە دەڵێ: ئەوکات منداڵ بووم کە دەگەڕامەوە دیبەگە ساڵح شێرە زۆرجاران کاغەزێکی وەک نووشتە پێچراوی دەهێناو لەناو نیفۆی شەرواڵەکەی دەنام و دەیگوت: ئەمە نەکەیتەوە هەتا دەچیتە ماڵی عەونی یوسف.

ئەوکات ماڵی عەونی یوسف لە خانوویەکی بچکۆلانەی پشتی پارێزگا بوو.

ساڵح شێرە لە ساڵی ١٩٥٠ بۆتە ئەندامی لیژنەی ناوچەی پارتی و لێپرسراوی جووتیاران بووە. لە ساڵانی ١٩٥٠ تاکو ١٩٥٨ زیاتر لە "١٨" جار لەسەر پارتایەتی لەلایەن حکومەتی عێراقەوە زیندانی کراوە. لە پاش هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوولی یەکەم مەفرەزەی پێشمەرگە لە شاری هەولێردا بە سەرۆکایەتیی ساڵح شێرە دروست کراوە و چالاکی باش و دیاریبیان لە شاردا نواندووە. خەباتی سیاسی بە شێوەیەکی نەپچڕاو لە ناو شاردا بەردەوام بوو، پاشان لە ساڵی ١٩٦٣ پاش کوودەتای "٨"ی شوبات ئاشکرا دەبێت، بۆیە ناچار دەبێت بچێتە دەرەوە. لەوێش بەهەمان رۆحیەتەوە کاری سیاسی و پێشمەرگایەتی دەکات. لە هەموو شەڕەکانی قەرەچووغ و دیدەوان و دەشتی کۆیەدا بەشدار بووە، ئەوکات لەگەڵ لیژنەی ناوچەی هەولێر تێکڕا پێکەوە هاتنە دەرەوە. بارەگایان لە ناوچەی رەسوڵ بسکور بوو تا ئینشقاقی ١٩٦٤ دەستی پێکرد پاش لێک ئاشکرابوون ساڵح شێرە سەنگەری خۆی لەگەڵ مەلا مستەفا هێشتەوە و هەر لە ناوچەی دەشتی هەولێر مایەوە و درێژەی بە خەباتی سیاسی دا. ساڵح شێرە لە ساڵی ١٩٦٥ لەلایەن جاشەکانی حەمەی سابیرەوە بە برینداری دەستگیر دەکرێ و لە کاتی مفاوەزاتی "١٩٦٧"دا ئازاد دەکرێ. پاش گەڕانەوەی بۆ ناو شۆڕش کرایە ئەندامی ناوچەی کۆیە و تا رێککەوتننامەی "١١"ی ئادار لە هەمان شوێن مایەوە. پاشان لێپرسراوێتیی سەندیکای کرێکارانی هەولێری پێ سپێردرا تا هەڵگیرسانی شەڕ لە ساڵی ١٩٧٤ ئینجا لەگەڵ خەڵکی کوردستاندا ئەویش رووی کردە شاخ. دوای شکستی ١٩٧٥ گەڕایەوە بۆ عێراق. حکوومەت نەفی کرد بۆ "دیوانیە" لە باشووری عێراق.

پاش ئەم زنجیرە مێژووییە کورتە لەسەر ژیانی سیاسیی ساڵح شێرە ئێستا باس لە هەندێ هەڵوێست دەکەین لە ژیانی سیاسیی ئەم پیاوە کە هەندێکیان لە ژیاننامە و بیرەوەریی چەند کەسایەتییەکی کوردیدا تۆمار کراون. یەک لە هەڵوێستە ناخۆش و برینداركەرەکانی کە ساڵح شێرە پێی ناخۆش بوو ئەمەیە:

لە ساڵی ١٩٦٥دا ساڵح شێرە چەند کادیرێک بە ئیشی خۆی لە گوندی هێلەوە رادەسپێرێ لە ئەنجامی ئیخبارییەک دوو کادیر دەکوژرێن و مام ساڵح دەگمێ و رەحیم بارزانی کە لەگەڵیاندا دەبێ دەرباز دەبێ. لە هەمان ساڵدا چەند کەسێکی هەڵپەرست لە ناوچەی جووتیارانی هەولێر راپۆرت لەدژی مام ساڵح دەنووسن گوایە ئەو ئیخباری لێ کردوون، بەڵام بە هاتنەوەی رەحیم بارزانی کە لەگەڵیاندا بووە راستییەکان ئاشکرا دەبن و دەرکەوت کە مام ساڵح پاک و بێگەردە و دوای ساڵێک لەژێر ئازار و ئەشکەنجەی حکومەت لەکاتی مفاوەزات ئازاد دەکرێ. پاش ئازادکردن و گەڕانەوەی دەکرێتە لێپرسراوی ناوچەی جووتیاران لە بێستانە لە ساڵانی پەنجاکان مەلا عەبدوڵڵا لە لایەن حکومەتەوە گیرابوو حزب هەندێ زانیاری دەنێرێ کە دەبێ بگات لای مەلا عەبدوڵا، ساڵح شێرەش بەم کارە هەڵدەستی لە کاتێکدا کە فەرمانی گرتنی لەلایەن حکومەتەوە راگەیەنراوە. شێرە دەچێ بۆ بنکەی پۆلیسی مەخموور و دەڵێ دەمەوێ ببمە پۆلیس. بەم شێوەیە خۆی دەگەیەنێتە مەلا عەبدوڵا و کارەکەی حزبی پێ رادەگەیەنی.

**تێبینی:**

لەلایەن سەنگەری کوری ئەو نوسینەمان بەدەست گەیشت کە ناوبراو لە ساڵی ١٩٩٩ کۆچی دوایی کردووە (ئ.هـ).

# محەمەدئەمین مەعرووف
# ١٩٢٠-١٩٩٩



مامۆستای پەروەردەکار و تێکۆشەری بەجەرگ و خزمەتگوزاری کورد و کوردستان محەمەدئەمین مەعرووف کامەلا، لە ساڵی ١٩٢٠دا لە شاری ئەدەب و هونەر و زانست، لە شاری کۆیە، چاوی بەژیان هەڵێناوە و گوێچکەی بەقاسپەی کەوی قەدپاڵی چیای باواجی و هەیبەتسوڵتان گۆش بووە و چاوی بەدیمەنە جوانەکانی شیوەی رەزان و سەیرانگاکانی ئەو شارە زیندووە کراوەتەوە.

ئەم زاتە، لە خێزانێکی پیشەکاری زانست و ئایینپەروەر پەروەردە بووە. خوێندنی ئایینی لە سوختەخانەی مەلای رەش دەست پێ کردووە و خوێندنی رەسمیشی لە ساڵی ١٩٢٩دا لە قوتابخانەی سەرەتایی کۆیە دەست داوەتێ و قوتابییەکی وریا و زیرەک و زانا بووە و، قۆناغی خوێندنەکەی سەرەتایی لە ساڵی ١٩٣٦دا تەواو کردووە و بۆ پایزی ئەو ساڵە چووەتە بەغدا و لە قوتابخانەی (خانەی مامۆستایان) خوێندوویەتی. لە سەرەتای چلەکانی سەدەی رابوردوودا بەمامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی کۆیە دامەزراوە و لە گەلێ گوند و دێهات و شاری دیکەی کوردستان نەوەی نوێی میللەتەکەی پێگەیاندووە و لە دەرس گوتنەوەدا مامۆستایەکی گەلێک زانا و جیددی و دڵسۆز بووە و نموونەیەکی بەرزی مامۆستای پەروەردەکاری میللەتەکەی بووە.

مامۆستا محەمەد ئەمین مەعرووف، هەر لە سەرەتای چلەکانی سەدەی بیستەمەوە، چووەتە مەیدانی خەباتی نەتەوەیی میللەتە چەوساوە ستەمدیدەکەی خۆی و ساڵێک دوای دامەزراندنی (حزبی هیوا)ی کورد، لە شوێن رێکخراوی (دارکەر) بەسەرۆکایەتیی مامۆستای نەمر رەفیق حیلمی، ئەم کوردپەروەرە بووەتە ئەندامێکی چالاک و دڵسۆزی ئەو حزبە نەتەوەییەی کورد لەو سەردەمەدا.

کاتێکیش کە پارتی دیموکراتی کوردستان لە ١٦/٨/١٩٤٦دا بەسەرۆکایەتیی مەلا مستەفای بارزانیی نەمر دامەزرا، مامۆستا محەمەدئەمین مەعرووف بووە ئەندامێکی کارا و دڵسۆزی ئەو حزبە نوێیەی کوردستان کە بەجیددی لە پێناو رزگارکردنی کوردستان لەو سەردەمەدا تێدەکۆشا و تێدەکۆشێ.

مامۆستا محەمەدئەمین لە ناوچەی کۆیە و سەرجەم کوردستان خەباتی نەتەوەیی دەکرد، بەتایبەتی لە ناوچەکەیدا لەگەڵ بەرێزان عەلی عەبدوڵلای ئەندازیار و پارێزەر (عومەر حەبیب)ی ناسراو بەعومەرە سوور و عەبدولکەریم تۆفیق و عومەر دەبابە و پارێزەر بەکر ئیسماعیل و مامۆستا جەلال حەمەد مامەش، لە

خەباتی کوردایەتیی نێو پارتی دیموکراتی کوردستان دەورێکی گرنگیان گێڕاوە و گەلێک ئەندام و کادیری چالاکیان پێگەیاندووە. بەتایبەتی ئەم زاتە، چونکە کەسێکی رووناکبیر و بەمەنتیق بوو، لە ئەنجامی ئەو چالاکییانەی، تووشی راوەدوونان و دوورخستنەوە لە شارەکەی خۆی بووە. بەڵام ئەم کادیرە سەرکردەیەی پارتی کۆڵی نەداوە و هەر بەردەوام بووە لەسەر خەباتی کوردایەتیی خۆی و پتر چالاکیی سیاسیی نواندووە، بۆیە کە کۆنگرەی دووەمی پارتی لە مانگی ئاداری ١٩٥١دا لە شاری بەغدا بەنهێنی بەسترا، واتە دوای تێپەڕبوونی نزیکەی ٥ ساڵ بەسەر بەستنی کۆنگرەی یەکەم، مامۆستا محەممەد ئەمین ئەندامی کۆنگرەکە بوو، لە دوا دانیشتنیدا و لە هەڵبژاردنی سەرکردایەتیی پارتی لەگەڵ ئەم زاتانەی خوارەوە هەڵبژێردراوە:

١- مەلا مستەفای بارزانیی نەمر، بەسەرۆکایەتی هەڵبژێردرا و بووە بەئەندامی لیژنەی ناوەندی پارتی.
٢- ئیبراهیم ئەحمەد.
٣- نووری سدیق شاوەیس.
٤- جەلیل هۆشیار.
٥- محەممەد ئەمین مەعرووف.
٦- عومەر مستەفا (دەبابە).
٧- بەکر ئیسماعیل محەممەد.

ئەوەی شایانی باسە، ئەم لیژنە ناوەندییەی پارتی، جێگری سەرۆک و سکرتێری حزبی هەڵبژارد و دەتوانین بڵێین لیژنەی ناوەندیی کاتی بوو. مامۆستا محەممەد ئەمین مەعرووف جگە لەوەی کە بەئەندامی لیژنەی ناوەندیی هەڵنەبژێردرابوو و، لە هەمان کاتدا بەرپرسیاریەتی و ئەرکی بەڕێوەبردنی رێکخراوی (کۆیە)ی پارتیشی پێ سپێردرابوو، کە لە رێکخراوە گەورە و چالاکەکانی پارتی دیموکراتی بوو لە کوردستانی باشووردا.

ئەم مامۆستا بەڕێزە، لە چالاکیی سیاسی و پەروەردەییدا خاوەن کەسایەتییەکی بەهێز بوو. بۆیە کە کۆنگرەی سێیەمی پارتی دیموکراتی کوردستان لە رۆژی ١٩٥٣/١/٢٦دا لە شاری کەرکووکی دڵی کوردستان بە نهێنی بەسترا، لەو کۆنگرەیەدا ئامادە بوو، چەند بڕیارێکی گرنگی تێدا درا، یەکەمیان: دانانی رێکخراوی یەکێتیی قوتابییانی کوردستان و یەکێتیی لاوانی کوردستان (رێکخراوی تایبەت بەکوردستان نەک بۆ گشت عێراق) بوو. هەروەها بڕیار درا ناوی حزب لە (پارتی دیموکراتی کورد)ەوە بکرێ بە (پارتی دیموکراتی کوردستان)، ئەمجارەش مامۆستا محەممەد ئەمین مەعرووف، بەئەندامی لیژنەی ناوەندیی سەرکردایەتیی پارتی هەڵبژێردرا. بەمجۆرە سەرۆک و ئەندامانی لیژنەی ناوەندیی سێیەم پێکهات:

١- بەڕێز مەلا مستەفای بارزانیی نەمر- سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان.
٢- بەڕێز میرحاج ئەحمەد- ئەندامی لیژنەی ناوەندی.
٣- دوکتۆر جەعفەر محەممەد کەریم- ئەندام.
٤- بەڕێز عەلی عەبدوڵڵا - ئەندام.
٥- بەڕێز محەممەدئەمین مەعرووف- ئەندام.
٦- بەڕێز نووری شاوەیس - ئەندام.
٧- بەڕێز ئیبراهیم ئەحمەد - ئەندام.
٨- بەڕێز نووری ئەحمەدی تەها- ئەندام.
٩- بەڕێز جەلال تاڵەبانی - ئەندام.
١٠- بەڕێز رەشید عەبدولقادر- ئەندام.
١١- بەڕێز عەلی حەمدی - ئەندام.
١٢- بەڕێز عومەر دەبابە - ئەندام.
١٣- بەڕێز جەلیل هۆشیار - ئەندام.

مامۆستا محەممەد ئەمین مەعرووف، پارتییەکی دڵسۆزی لەخۆبوردوو بوو، لە جێبەجێکردنی کاری حزبی و لە دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨دا دەورێکی سەرەکیی هەبوو لە رێکخستنەوەی ریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ناوچەی کۆیە، لە لیژنەی بەرەی نیشتمانیی دووقۆڵی نێوان پارتی و حزبی شیوعی عێراق، دەورێکی باڵای هەبوو لە چارەسەرکردنی هەر کێشەیەک لە نێوان ئەو دوو حزبە روویدا بوایە. هەمیشە لەگەڵ تەبابی و دۆستایەتی و کێبڕکێی شەریف و هێمنانەی سیاسیدا بوو، تاکو رۆژی کۆچی دوایی، (١٩٩٩/١١/١٥)، هەمیشە دڵسۆزی رێبازی بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازیی کوردستاندا بوو.

**کەریم شارەزا**

# نەجیبە خانی جەلیزادە
# ١٩١٧ - ١٩٩٩

نەجیبە خانی جەلیزادە کچە گەورەی زانا و شاعیری ناوداری کورد مەلا محەمەدی کۆیی، ناسراو بە (مەلای گەورە)یە. لە رۆژی ١٩١٧/٩/٨دا لە گەڕەکی بایز ئاغای شاری کۆیە چاوی بەژیان کردۆتەوە. مەلای گەورەی باوکی پیاوێکی زانا و بیرفراوان بوو، لەو کاتەی کە خەڵکی شاری کۆیە کوڕەکانیان نەدەنارده قوتابخانەی رەسمی، بەتایبەتی لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی بیستەمدا، دەبینین ئەو زانا پێشکەوتنخوازە، ئەم کچەی خۆی لەگەڵ کوڕان لە ساڵی ١٩٢٤دا لە قوتابخانەی سەرەتایی کۆیە لەبەر خوێندن دانا.

ئەو هەڵوێستە بەرزەی ئەو



زاتە زانایە، باوکانی هان دا تاکو کوڕەکانیان بخەنە بەر خوێندنی قوتابخانەی رەسمی. نەجیبە خان تاکو پۆلی پێنجەم لەو قوتابخانەیەدا لەگەڵ کوڕان خوێندی و بەو پێیە قوتابخانەکەی کۆیە بووەتە یەکەمین قوتابخانەی تێکەڵاوی کوڕان و کچان لە هەموو کوردستاندا. چونکە یەکەمین قوتابخانەی سەرەتایی تایبەت بەکچان لە پایزی ١٩٣٣دا لە کۆیە کرایەوە و لە سەرەتادا نەجیبە خان بووەتە سەرپەرشتی ئەو قوتابخانەیە تاکو بەڕێوەبەر و مامۆستای ئافرەتی بۆ هاتووە و بەتەواوی رێکخراوە.

ئەم خاتوونە زیرەک و هۆشیارە لە سەرەتای چلەکانەوە تێکەڵ بەخەباتی سیاسیی میللەتەکەی بووە و لایەنگیرێکی چالاک و دڵسۆزی حزبی هیوا بووە و ئافرەتانی هۆشیار کردۆتەوە بۆ خەباتکردن لە پێناوی وەدەستهێنانی مافی خۆیان و نەتەوەکەیان.

لەگەڵ دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ١٩٤٦/٨/١٦دا بووەتە

ئەندامێكی دڵسۆزی ئەم حزبە دیموكراتییە پێشكەوتنخوازەی كورد و دەورێكی باشی بووە لە بڵاوكردنەوەی هۆشیاری سیاسی لە نێو ئافرەتانی كوردستان لە سەردەمی كۆماری دیموكراتی كوردستان بەسەرۆكایەتیی پێشەوا قازی محەمەدی نەمر.

لەگەڵ دامەزراندنی یەكێتیی ئافرەتانی كوردستان لە ١١/١٢/١٩٥٢دا دەورێكی باشی تێدا گێڕاوە و بەنهێنی خەباتی كردووە و بووەتە سەرۆكی لقی ئەو یەكێتییەی ئافرەتان لە شاری كۆیە و دەورێكی باشی بووە بۆ كۆكردنەوەی ئافرەتان لە دەوری یەكێتییەكەیان لە ساڵانی ١٩٥٨ و ١٩٥٩و ١٩٦٠دا لە دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨دا بەسەرۆكی یەكێتیی ئافرەتانی كوردستان- لقی كۆیە هەڵبژێردراوە و بەناوی ئەم رێكخراوەوە لە ئاهەنگ و بۆنەی نیشتمانی وتاری بەناو ئافرەتان خوێندۆتەوە و ئامانجەكانی یەكێتیی ئافرەتانی كوردستانی بۆ خەڵكەكە شی كردۆتەوە. جگە لە چالاكی سیاسی، ئەو ئافرەتە لە ناو كۆمەڵی ژنان دەورێكی باشی بووە بۆ بەرزكردنەوەی ئاستی هۆشیاریی كۆمەڵایەتییان و رێز لێنان لە دەوری ئافرەت لە بەرەو پێشەوەبردنی كۆمەڵی كوردەواری و دووركەوتنەوە لە دابونەریتی كۆنی لە كەڵك كەوتوو و گرتنی داب و دەستووری نوێی سوودبەخش بۆ میللەتی كورد. لە كۆڕ و كۆبوونەوەی جەماوەریدا هەموو هەوڵێكی ئەوە بوو، پیاوان رێز لە ئافرەتان بنێن و بەچاوی یەكسانی لە مافی ژیان و هەڵسوكەوتیان بنوارن و جیاوازی لە نێوانی دەوری پیاو و دەوری ژن لە پێشخستنی كۆمەڵی كوردەواری نەهێڵن.

خاتوو نەجیبە خان بەشداریی لە شۆڕشی ئەیلوولدا كرد و لە دوای نسكۆهێنانی شۆڕشەكەش تاكو ساڵی ١٩٧٧ ئاوارەی ئێران بوو. ئینجا گەڕایەوە كۆیە و لەو شارەدا دەورێكی كۆمەڵایەتی وەك (حەپسەخانی نەقیب)ی لە مەڵبەندەكەی خۆیدا بینی، تاكو لە دوا دوای ژیانی هاتە شاری هەولێر و لە ئەنجامی پیری تووشی ئێسكەنەرمەی قاچی بوو، لە شەوی ١١ لەسەر ١٢/٦/١٩٩٩دا لە تەمەنی ٨٢ ساڵیدا كۆچی دوایی كرد و تەرمەكەی برایەوە كۆیە لە گۆڕستانی دەروێش خدر لە تەنیشت باب و باپیرانی بەخاك سپێردرا.

ئەو ئافرەتە رووناكبیرە لە ماوەی ژیانیدا ٣ بەرگ لە (تەفسیری قورئان) كە مەلای گەورەی باوكی كردوویەتی، بەچاپ گەیاندووە و لە نووسینەكانی خۆشی كۆمەڵێك بابەتی بەنرخی بەدەسنووسی لە پاش بەجێ ماوە و چاوەڕوانی چاپكردنن لەوانە:

١- مێژووی كۆیە و وڵاتەكەی.

٢- مێژووی بنەماڵەی جەلیزادە.

٣- رووداوەكانی كوردستان لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلوولدا.

٤- كتێبی هەمەڕەنگ- كە بریتییە لە چەپكێك لە حیكایەتی فۆلكلۆری و یاریی كوردەواری.

نەجیبە خان ئافرەتێكی راستگۆی قسە لە ڕوو بوو، لە هەر كۆڕ و كۆبوونەوەیەكی ئافرەتاندا ئامادە بووایە، گوێی لێ رادەگیرا و ئامۆژگاری ئافرەتانی دەكرد بۆ هۆشیاری و وازهێنان لە دابونەریتی دواكەوتوو.

**كەریم شارەزا**

# عەقید بەکر عەبدولکەریم حەوێزی
# ١٩١٤-١٩٩٩

کوردپەروەری شۆڕشگێڕی بەجەرگی کورد، "عەقید بەکر عەبدولکەریم حەوێزی" لە ساڵی ١٩١٤دا لە شاری کۆیە، شاری خەباتی کوردایەتی لەدایک بووە، خوێندنی سەرەتایی لە کۆیە و ناوەندی و ئامادەیی و کۆلێجی عەسکەری لە بەغدا تەواو کردووە، لە ساڵی ١٩٣٦دا بەپلەی مولازمی دووەم دامەزراوە. دوای ماوەیەک چووەتە خوێندنگای تۆپخانە و بەپلەیەکی باش خوێندنیشی تەواو کردووە و پلەی بەرز کراوەتەوە بۆ مولازمی یەکەم.

مولازم بەکر لەگەڵ دامەزراندنی حزبی هیوا لەسەر هەیکەلی (کۆمەڵەی دارکەر) لە ساڵی ١٩٣٩دا بووەتە ئەندامێکی چالاکی ئەو حزبە و دەستەیەکی لە ئەفسەری دڵسۆزی هێناوەتە ناو ریزەکانی (هیوا) لە هەمان کاتیشدا فەرمانە سەربازییەکەی خۆی بەباشی بەجێ گەیاندووە، بۆیە پایەی بەرز کراوەتەوە بۆ پلەی رەئیس (نەقیب) بە (رەئیس بەکر) ناسراوە. بەڵام ئەوەندەی گوێی بەخەباتی سیاسی داوە، ئەوەندە گوێی بەپلە و پایەی عەسکەری نەداوە.

لە رێگای حزبی هیواوە پەیوەندیی بەشۆڕشی ١٩٤٣-١٩٤٥ی بارزانەوە کردووە و لە حکوومەت یاغی بووە. لەگەڵ شۆڕشگێرانی بارزان لە پایزی ١٩٤٥دا دەچێتە رۆژهەڵاتی کوردستان و دەکەوێتە پاڵ بزووتنەوە رزگاریخوازەکەی کورد لەو بەشەی کوردستاندا و بەشداری لە ئاهەنگی دامەزراندنی کۆماری دیموکراتی کوردستان بەسەرۆکایەتیی پێشەوا قازی محەمەد لە مەهاباد دەکات. فەرماندەیی فەوجێکی هێزی بارزانییەکانیش دەکات و مەشقێکی زۆریان پێ دەکات تا ببن بەپاسەوانی شەرەف بۆ سەرۆکایەتیی کۆماری کوردستان، لە هەمان کاتیشدا دەورێکی چالاکانەیشی بینی لەسەرکردایەتیکردنی لەشکری فیدکارە بارزانییەکان لە بەرگریکردن لە کیانی کۆماری دیموکراتی کوردستان و لە شەڕی (قاراوە)، کە بەشکاندنی ئەرتەشی حکوومەتی شاهەنشای ئێران کۆتایی هات، سەرکەوتنێکی گەورەی بۆ کۆماری کوردستان تۆمار کرد. بۆیە قازی محەمەد بەمەرسوومێکی کۆماری پلەی (پۆلگفینگ) واتە (موقەددەم)ی پێ دا. دوای سەرکەوتنی لەو شەڕەش کرا بەسەرکردەی لەشکری کوردستان لە سەردەشت.

دوای رووخاندنی کۆماری دیموکراتی کوردستان و لەسێدارەکانی قازی محەمەد و هەڤاڵانی لە ١٩٤٧/٣/٣٠دا، موقەددەم بەکر لەگەڵ چوار ئەفسەرە نیشتمانپەروەرەکەی هاورێی (عیززەت عەبدولعەزیز و مستەفا خۆشناو و خەیروڵڵا عەبدولکەریم و محەمەد قودسی) گەیشتنە سەر سنووری باشووری کوردستان، ئەوان هەر چواریان خۆیان بەدەستەوە دا بەپیاوانی رژێمی بەغدا کەچی ئەم ملی رێگای گرت بەرەو گوندەکەی خۆی (شیواشان) لە دەڤەری کۆیە لە ساڵی ١٩٥٤دا چووە لای شێخ مەحموودی نەمر لە "داری کەلی، لە ساڵی ١٩٥٧ عەفوو کرا و گەڕایەوە شاری کۆیە.

لە دوای شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨دا گەڕایەوە سوپای عێراق و ماوەیەک لە رەواندز سەرکردەی هێزی بەرگریی میللی بوو. ماوەیەکیش بۆ ناوەڕاستی عێراق دوور خرایەوە، بەڵام پلەی "عەقید"ی پێ درا، لەو نۆردووگایەش ئەوەندەی دڵی بەکوردستانەوە بوو، ئەوەندە دڵی بەپلە و پایەی عەسکەری خۆش نەبوو.

کە شۆڕشی رزگاریخوازی ئەیلوول لە ١١ی ئەیلوولی ١٩٦١دا هەڵگیرسا چووە پاڵ شۆڕشگێرانی کورد و لە ژێر سەرکردایەتیی بارزانی خەباتی چەکداریی کرد. لە گەلێک لە شەرەکانی بەرەی رەواندز و خۆشناوەتی و چیای سەفین وەک سەرکردەیەکی عەسکەری قاڵبووەوەی خەباتی چەکداریی تا ساڵی ١٩٦٧ لە دژی دوژمنی کورد و کوردستان جەنگا تاکو رۆژی کۆچی دوایی لە ١٩٩٩/١٢/١٣ وەک دڵسۆزێکی رێبازی کوردایەتی لە خەباتی نەتەوەیی لای نەدا. باشترین بەڵگەشمان بۆ راستی هەڵوێستی لە قۆناغەکانی ژیانیدا بەرامبەر بەکورد و کوردستان و خەباتی نیشتمانی، کتێبە بەنرخەکەیەتی بەناوی (گەشتێک بەکۆماری مەهابادا).

سەرچاوە:
١- بەکر عەبدولکەریم حەوێزی- گەشتێک بەکۆماری مەهابادا- هەولێر- دەزگای ئاراس ٢٠٠١.
٢- کەریم شارەزا- رۆژنامەی خەبات ژمارە (٢٠٠٧)ی رۆژی ٢٠٠٥/١٢/٢٠ بابەتێکی لە یادی ئەم کەسایەتییەدا.

**کەریم شارەزا**

# مەلا عەوڵای حاجی سمایل
# (عەبدوڵا ئیسماعیل ئەحمەد)
# ١٩٢٧-٢٠٠٠

**دکتۆر دلێر فەرحان ئیسماعیل**

مەلا عەوڵا ناسراو بە (مەلا ماتۆڕ) کەسایەتییەکی ناوداری شاری هەولێرە، وەک کادیر و سەرکردەیەکی سیاسی و سەربازی لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد بە تایبەتی لە ساڵانی پەنجا و شەستەکاندا کاریان کردووە.

لە ساڵی ١٩٢٧ لە گوندی (حەسەن بلباس)ی ناوچەی کەندیناوە لە خێزانێکی مەڕدار و جووتیار لەدایک بووە ، خوێندنی لە مزگەوت بووە.

لە ساڵی "١٩٥٠"دا لە بەڕێوەبەرایەتیی شەمەندەفەری هەولێر- کەرکووک وەک کرێکار کاری کردووە، هەر لەو ساڵەدا پەیوەندیی بە (پارتی دیموکراتی کوردستان) کردووە و بەشێوەیەکی ڕەسمی بۆتە پارتی لە ڕێگای (عەونی یوسف).

لە ساڵانی "١٩٥٠-١٩٥٤"دا وەک کادیرێکی پارتی دڵسۆز و ئازایانە لە دەشتی هەولێر



پەرەی بە کار و چالاکییەکانی داوە، دەورێکی باڵای هەبووە لە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی پارتی لە نێو چینی جووتیار و کرێکاراندا، هەر لەو کاتەدا بڵاوکراوەکانی (رزگاری) و (نداء کردستان)ی لە نێو خەڵکدا بڵاوکردووەتەوە.

لە ساڵی "١٩٥٤"دا لەبەر لێهاتوویی و زیرەکی لە لایەن مەکتەبی سیاسییەوە کراوە بە ئەندامی لێژنەی ناوچەی هەولێر.

لە ساڵی "١٩٥٦"دا بۆ ماوەیەک سەرپەرشتیاری ڕێکخستنەکانی پارتی لە موسڵ و ناوچەی بادینانی پێ سپێردراوە بەمەبەستی چالاککردنی ڕێکخستنەکان.

لە ساڵی "١٩٥٦"دا بە هۆی بەشداری کردنی لە خۆپیشاندانی نارەزایی خەڵکی عێراق دژ بە هێرشی سێ قۆڵی بۆ سەر وڵاتی میسر دەدرێتە دادگا.

بە هۆی چالاکیی سیاسی و ڕۆڵی لە پارتی لە ساڵی "١٩٥٧"دا لە دادگای عورفی بەغدا بڕیاری دوو ساڵ زیندانی بۆ دەردەچێت و تاوەکو (١٢ی تەمموزی ١٩٥٨) لە زیندان دەمێنێتەوە.

لە ساڵی "١٩٥٨"دا لە کاتی گەڕانەوەی بارزانیی نەمر لە یەکێتیی سۆڤیەتەوە، یەکێک بووە لە ئەندامانی حزب کە بەشداریی کردووە لە پێشوازی و بەخێرهاتنەوەی لە هوتێلی (سمیرا میس) لە بەغدا.

لە ساڵی "١٩٥٩"دا دوای

عـومـەر دەبابە بەرپرسی دووەمی پارتی بووە لە كەركووک.

لە سـالّی "١٩٥٩"دا ئەندامی سـەرەكی لیـژنەی ئامـادەكـاری كـۆنگرەی چوارەمی پارتی بووە لە بەغدا.

لـــە "٣/١٠/١٩٥٩"دا لـــە كۆنگرەی چوارەمی پارتی لە بەغدا بە ئەندامی لیـژنەی مـەركـەزی هەلبژێردراوە.

لە سالّی "١٩٦٠"دا لە سـەر داوای مەكـتـەبی سیاسی پارتی بەرپرسیاریەتی رێكخستنەكانی لە موسلّ پێ سپێردراوە.

لە سالّی "١٩٦٠"دا یەكێك بووە لەو ئەندامـانەی لیـژنەی مـەركـەزی كـە واژۆیان لە سـەر داواكـاری حـزب بۆ وەرگـرتنی مـۆڵەتی فـەرمی لە حكومـەت لە بەغدا كردووە.

لە سـەرەتای مـایسی سـالّی "١٩٦٠"دا لە كـۆنگرەی پێنجـەمی پارتی لە بەغدا بە ئەندامی لێژنەی مەركەزی هەلّبژێردراودتەوە.

لە ناوەڕاستی تەمووزی سـالّی "١٩٦٠"دا حزب رەوانەی ناوچەی بادینانی كـردووە بەمـەبەسـتی دامەزراندنی هێـزی فـریاكـەوتنی مـیللی بۆ پاراستنی ناوچەكـە لە هەر هێـرشـێكی سـەربازی حكومەت.

لە سـالّی "١٩٦٠"دا سەرپەرشتی هێزی پێشمەرگەی كـردووە لە ناوچەی هەولێـر، لەم مـاوەیەدا توانیـویەتی بەرپەرچی هێرشەكانی حكومەت بداتەوە.

لە سالانی "١٩٦١- ١٩٦٤"دا وەک سـەركـردەیەكی سـەربازی رۆڵێكی گەورەی بینیوە و چالاكانە بەشـداری لە شـۆڕشی ئەیلولی مـەزن كـردووە و كـەسێكی نزیک بووە لە بارزانی نەمـردا لە كـاتی سەردانی بۆ بەرەكانی شەڕ.

مـەلا عـەولا یەكـێک بووە لەو سـەركـردانەی كـە بەشـداری لە دامـەزراندنی یەكـەم مـەفـرەزەی شاخی كردووە، هەروەها لە زۆربەی داسـتـانەكـانی بەرگـری كـردن لە (دەشـــتی هەولێــر، دۆلّی خۆشناوەتی، دۆلّی سـمـاقـولی، قـەلادزە، سـیـدەكـان، لولان، خواكورک) بەشداریی چالاكـانەی كردووە.

لەسـالّی "١٩٦٤"دا لە كـاتی بەسـتنی كـۆنگرەی شـەشـەم لە دەستەی ئامادەكاری كۆنگرەدا بوو، بەلام لەم كۆنگرەیەدا كە لە قەلادزە بەسـترا لەگـەلا چەند ئەندامێكی تری سەر بە بالّی مەكتەبی سیاسی لە لێژنەی مەركەزی لابرا.

لە سالانی "١٩٦٤ -١٩٦٧"دا بەرپرسی كـۆمـیـەتی ناوچەی هەولێـری سەر بە بالّی مـەكـتـەبی سیاسی بووە.

سـالّی "١٩٧٤-١٩٨٨" پۆسـتی وەزیری دەوڵـەت لە حكومـەتی عیـراقـدای وەرگرتووە و بـزووتـنـەوەیـەكـی بـە نـاوی (شـۆڕشگێـڕی كـورد) لە بەغـدا دامەزراندووە.

لە سـالّی "١٩٨٩"دا خانەنیشین كـراوە و گـەڕاوەتەوە هەولێر لە وێدا نیشتەجێ بووە.

لە سـالّی "١٩٩٠"دا بەشی یەكـەمی لە بیـرەوەریـیەكـانی لە كـتـێبـێكدا بە ناوی (سـەربردەی ژیانی سـیـاسـیم) بە چاپ گەیاندووە.

لە رێكەوتی "٢٤/٤/٢٠٠٠" لە شاری هەولێر بە نەخۆشی كۆچی دوایی كردووە.

سەرچاوەكان:

١- مـەلا عـەولای حـاجی سمایل، سەربردەی ژیانی سیاسیم، (بەغدا/ ١٩٩٠).

٢- مـسـعـود البـارزاني، البـارزاني والحركـة التـحـررية الـكـرديـة، ج ٣ ، (اربـيـل/ ٢٠٠٢).

٣- جلال الطالباني، كردستان والحـركـة القـومـيـة الكردية، (بيروت/ ١٩٧١).

٤- عـەریف سلێـمـان، بیرەوەرییەكانی عەریف سلێمان، (سلێمانی /١٩٩٩).

٥- عبدالفتاح علي البوتاني، الحياة الحزبية في الموصل، (اربيل /٢٠٠٣).

٦- حبيب محمد كريم، تأريخ الحزب الديموقراطي الكردستاني، (دهوك /١٩٩٨).

٧- ميڤان عارف عبدالرحمن، الحـركـة القـومـيـة الكوردية التحررية، كـوردستـان العـراق، (اربيل /٢٠٠٥).

# مامۆستا مەلا عەزیز سەید حەسەن
# ١٩١٨- ٢٠٠٠

هەولێر گەلێک زانای ئایینی گەورە و ناوداری تێدا هەڵکەوتوون، لەوانە، کە رۆڵێکی نیشتمانپەروەرانەی پیرۆزیان هەبووە لە فێرکردن و پەروەردەکردنی خەڵکی کوردستان و پێگەیاندن و خەملاندنیان لە زانست و مەعریفەت و رۆشنبیری، زۆر لەوانە بوودتە قوتابخانە و چەندین لە نەوەکانی کوردستانیان هان داوە، کە رێگەی زانست و فیکر بگرنە بەر، ئەو زانستە بکەنە چەک بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵەکەیان و رۆشنکردنەوەی رێگەی خەباتیان. یەکێک لەوانە: (مامۆستا مەلا عەزیز کوڕی سەید حەسەن کوڕی سەید حەمەدئەمین)ە، کە لە ساڵی (١٩١٨) لە شاری دێرینی هەولێر لە گەڕەکی تەعجیل چاوی بۆ ژیان هەڵهێناوە، لە منداڵییەوە دەخرێتە بەر خوێندن، لەلای چەندین مامۆستا دەرس دەخوێنێ، لەوانە: (مەلا عەبدوڵلا، مامۆستا تاهیر) لە دوایی لە مزگەوتی شێخ مستەفای نەقشەبەندی و لەلای جەنابی شێخ دەخوێنێ، لە پاشان لەلای شێخ عەبدوڵلای کوڕی شێخ مستەفا تا خوێندنی تەواو دەکات و لەلای شێخ مۆڵەتی مەلایەتی (ئیجازەی علمی) وەردەگرێت. لە ساڵی ١٩٥٢ دەبێت بە ئیمام و خەتیبی مزگەوتی مەحموود عەلاف. لە هەمان مزگەوت خوتبەی هەینیی بە زمانی کوردی خوێندۆتەوە. دوای ئەوە بە فەرمانی شێخ مستەفا چووەتە مزگەوتی و بۆتە ئیمام و خەتیب. فەرمانی بۆ دەرچووە. هەر لەوێ ماوەتەوە تا ئەو کاتەی لە ساڵی (١٩٨٢) خانەنشین کراوە، لە پاش خانەنشینکردنی چۆتە مزگەوتی (حاجی مەحموود) لە گەڕەکی (بیرێژیان)، هەر بۆ خوا پێشنوێژی دەکرد بەبێ مووچە، ئینجا دەستی کرد بە دروستکردنی ئەو مزگەوتەی خۆی، کە رووبەری (١٢٠٠)م٢، لەگەڵا ئەوەشدا بەسالاچوو بوو، بەڵام هەردەم چالاکیی ئایینی خۆی دەنواند، سەرەڕای ئەمەش خۆی پێشنوێژی و خوتبەی دەخوێندەوە لە مزگەوتەکەیدا.

تاکو نیوەڕۆی رۆژی (٢٠٠٠/٦/٢٤)ی زایینی ماڵئاوایی لە دنیا کرد و کۆچی دوایی کرد، هەر لە مزگەوتەکەی خۆیدا نێژرا.

مامۆستای خوالێخۆشبوو هەموو ژیانی هەر بۆ دین و ئایینەکەی تەرخان کردبوو، بە ئامۆژگاریکردنی مووسڵمانان و دەرس گوتن بە فەقێ و قوتابییان لە مزگەوتەکەی، بەڵکو (مەلا سەید موئەیەد)ی کوڕی یەکێک بوو لەو قوتابییانەی دوای خوالێخۆشبوو توانی شوێنی باوکی بگرێتەوە و لە هەمان مزگەوت پێشنوێژ و وتاری ئایینی رۆژانی هەینی بخوێنێتەوە.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری بارش، ژمار (١) ساڵی ٢٠٠٠ وەرگیراوە.

# تایەر ئەحمەد حەوێزی
# ۱۹۱۹ - ۲۰۰۰

مامۆستا تایەر ئەحمەد حەوێزی لە ساڵی ۱۹۱۹دا لە گەڕەکی بەفریقەندی شاری کۆیە، کوردایەتی چاوی بەژیان هەڵێناوە. لە تەمەنی ۷ ساڵیدا لە سەرەتای ساڵی ۱۹۲٦دا لە سوختەخانەی (مەلا ئەحمەدی رەش) لە گەڕەکی قەڵات دەستی بەخوێندنی ئایینی کردووە و لە ساڵی ۱۹۲۹دا باوکی بردوویەتییە قوتابخانەی سەرەتایی کۆیە. چونکە بنچینەی خوێندنەوەی زانیوە بۆیە لە پۆلی دووەم وەرگیراوە و هەموو ساڵێک بەزیرەکی دەرچووە و لە هاوینی ساڵی ۱۹۳٤دا قۆناغی سەرەتایی بڕیوە و چووەتە هەولێر و لە قوتابخانەی ناوەندی خوێندوویەتی ئەم زاتانەی هەولێری و کۆیی هاوپۆلی بوون:

(عوسمان قوجە قەساب، مووسا سەمەد، مەسعوود محەممەد، یونس دڵدار، تایەر شاباز،



محەمەد حەوێز و بایز عەبدوڵڵا دزەیی و چەندانی دیکە).

لە ساڵی ۱۹۳۸دا قۆناغی ناوەندی دەبڕێ و دەچێتە ئامادەیی، هەر لە هەولێر لە ساڵی ۱۹٤۰دا لە تاقیکردنەوەی گشتی دەردەچێ و لە دەورەیەکی پەروەردەیی لە بەغدا بەشداری دەکات. لە ۱۹/۱۲/ ۱۹٤۰دا بۆ یەکەم جار بەمامۆستا دادەمەزرێ و دەکرێتە مامۆستای قوتابخانەی ناحیەی ماوەتی سەرەتایی لە قەزای شارباژێری پارێزگای سلێمانی و لەگەڵ مامۆستایان نووری شاوێس و محەمەد میرزا غەفوور، کە لە دواییدا بەدڵشاد رەسووڵی ناوی دەرکرد خزمەتی نەوەی نوێی کوردیان لە ناوچەکەدا کرد. دوای دوو ساڵ لە پایزی ۱۹٤۲دا بۆ قوتابخانەی قەڵادزێی سەرەتایی گوێزراوەتەوە و کراوە بە بەڕێوەبەر دەستەیەک لە مامۆستای بەتوانای وەک "رەئووف زوهدی" و "غەریب مستەفا" و "سەعدوڵڵا ئامێدی" و" فەتحوڵڵا عەبدوڵڵا" و "محەممەد تۆفیق وردی" و "نووری عەبدوڵڵا دیبەگەیی" خزمەتی کرداری پەروەردە و فێرکردنی منداڵانی کوردیان کردووە. ئەحمەد ئاغای باوکی لەو شارەدا لە ساڵی ۱۹٤۲دا لە تەمەنی ۸۲ ساڵی کۆچی دوایی کردووە و دوای چوار

ساڵ خزمەت مامۆستا تایەر گوێزراوەتەوە بۆ قوتابخانەی غازیی سەرەتایی لە ناو شاری سلێمانی و لەگەڵ مامۆستایان عەزیز محەممەد فەرەج (بەڕێوەبەری قوتابخانە) و رەئووف زوهدی و عەلی کاکە و چەند مامۆستایەکی-تر ئەرکی پەروەردە و فێرکردن جێبەجێ دەکەن، لەسەر هەڵوێستی نیشتمانی بەشێوەیەکی ئیداری دوای ساڵێک واتە لە ١٩٤٧دا هەڵدەدێردرێ بۆ قوتابخانەی سەرەتایی ناحیەی شێخ سەعدی سەر بەپارێزگای عەمارە، دوای ساڵێک دەگەڕێتەوە کوردستان و لە پارێزگای هەولێر تەنسیب دەکرێ و دەگوێزرێتەوە بۆ قوتابخانەی گوندی ئیلنجاغی گەورە لە ناحیەی تەق تەقی، ئینجا سەر بەقەزای کۆیە و چوار ساڵ لەو قوتابخانەیە بەتەنیا بەڕێوەبەر و مامۆستا دەبێ. لە پایزی ١٩٥٢دا دەگوێزرێتەوە بۆ قوتابخانەی یەکەمی سەرەتایی کوڕانەی کۆیە و دەرسی مێژوو و جوگرافیا دەڵێتەوە. ١٣ ساڵی لێ دەمێنێتەوە ئینجا دەگوێزرێتەوە بۆ قوتابخانەی (بێستوونی سەرەتایی ئێواران) دەکرێتە بەڕێوەبەر و دوای ٥ ساڵ خزمەتکردن لە ١/٧/١٩٧٠دا لەسەر داوای خۆی خانەنشین کراوە، لە ١/٧/٢٠٠٠ لە شاری کۆیە کۆچی دوایی کردووە.

**تایەر حەویزی نووسەر و مێژوونووس:**

مامۆستا تایەر لە سەرەتای چلەکانی سەدەی بیستەمەوە وتاری کۆمەڵایەتی و چیرۆکی واقیعی لە گۆڤارە کوردییەکانی وەک (گەلاوێژ) و (دەنگی گێتی تازە) بڵاو کردۆتەوە و لە پەنجاکانیشدا چیرۆک و بابەتی مێژوویی لە گۆڤارەکانی (هەتاو) و (هیوا)دا بڵاو دەکردەوە. لەگەڵ دەرچوونی گۆڤاری (کاروان)یش لە ساڵی (١٩٨٢)ەوەوە بابەتی مێژوویی و دیکۆمێنتی بڵاو دەکردەوە و نرخ و سوودێکی باشیان هەبوو.

لە ماوەی ژیانیدا گەلێک کتێبی بەنرخی داناوە. زۆربەی هەرە زۆریان بەدەسنووسی ماونەتەوە. سەرەتا ئەم بەرهەمە چاپکراوانەی دەخەینە روو:

١- مێژووی کۆیە یا کۆیسنجاق- بەرگی یەکەم- لە ساڵی ١٩٦٢دا لە چاپخانەی (الوفاء) لە بەغدا چاپ کراوە و ١٥٨ لاپەڕەی ناوەنجییە.

٢- شەوچەرە- چەپکێک نوکتە و قسەی خۆشی ناوچەی کۆیەیە- بەرگی یەکەمی لە ساڵی ١٩٧٠دا لە چاپخانەی (دار السلام) لە بەغدا چاپ کراوە و دەکەوێتە ١١٢ لاپەڕەی ناوەنجی.

٣- مێژووی کۆیە- بەرگی دووەم- بەشی یەکەم- لە ساڵی ١٩٨٤دا لە چاپخانەی (نمیر)ی بەغدا بەیارمەتیی ئەمینداریتیی گشتیی رۆشنبیری و لاوانی کوردستانی ئۆتۆنۆمی چاپ کراوە و دەکەوێتە ٣٠٤ لاپەڕەی قەبارە ناوەنجی، جگە لەم بەرهەمە چاپکراوانەشی ٢٧ دەسنووسی لە پاش بەجێماوە و چاوەڕوانی چاپ و بڵاوکردنەوەن لێرەدا هەندێکیان ناو دەهێنین:

١- مێژووی کۆیە- بەرگی سێیەم.
٢- شەوچەرە- بەرگی دووەم و سێیەم.
٣- ئەمین ئاغای حەویزی (ئەختەر)ی شاعیر و هونەرناس و سیاسی.
٤- جەمیل ئاغای حەویزی کارگێڕی سیاسی و میوانپەروەر و پەرلەمانتاری کورد.
٥- پەندی پێشینیانی کوردیی ناوچەی کۆیە.
٦- یارییە فۆلکلۆرییەکانی شاری کۆیە.
٧- یادداشتەکانی رۆژانی ژیانم.
٨- شوێنەوار و ئاسەوارەکانی وڵاتی کۆیە.
٩- مێژووی بنەماڵەکانی کۆیە.
١٠- بزووتنەوەی نواندن و شانۆگەری لە کۆیە لە سەردەمی کۆن و نوێدا.

**کەریم شارەزا**

# عەبدولمەجید نوورەدین جەلیزادە
# ١٩١٢-٢٠٠١

عەبدولمەجید کوڕی شێخ نوورەدینی جەلیزادەی کوڕی حاجی مەلا عەبدوڵلای کوڕی حاجی مەلا ئەسعەدی جەلی، لە ساڵی ١٩١٢دا لە گەڕەکی بایزاغای شاری کۆیە و لە بنەماڵەیەکی ئایین و زانستپەروەر، (بنەماڵەی جەلیزادە) پەروەردە بووە. ئەو بنەماڵەیەی کە حاجی قادری کۆیی لەبارەیەوە گوتوویەتی:

**بەغەیری جەددی ئێوە کێهە دانا**
**لە کوردستان ئەساسی عیلمی دانا**

ئەم زاتە برازای مەلای گەورەی کۆیە بووە و لە ساڵی ١٩١٩دا لە سوختەخانەی مەلا حەبیبی شەمامێ خراوەتە بەر خوێندنی ئایینی، لە دواییدا چووەتە سوختەخانەی مەلا سەعدی کوڕی مەحموود ئاکۆ و بنچینەی ئایینی و قورئانی پیرۆزی لەلا خوێندووە. لە پایزی ١٩٢١دا چووەتە قوتابخانەی سەرەتایی کۆیە، کە ئەوساکە بەڕێوەبەری قوتابخانەکەی مامۆستا



عەبدوڕەحمان شەرەف بووە و مامۆستاکانیشی خواڵێخۆشبووان: ساڵح قەفتان و عەزیز فەرەج و عەلی ئاگا و عەبدولخالیق قوتب و رەمزی رەحیمی ناسراو بەمامەند کەرکووکی و عومەر ئەمین هەولێری بوون. لەوساوە ئەو مامۆستا بەڕێزانە تۆوی کوردایەتییان لە مێشکدا چاندووە.

مامۆستا عەبدولمەجید لە ساڵی ١٩٢٨دا خوێندنی سەرەتایی تەواو کردووە و قۆناغی خوێندنی ناوەندیی لە هەولێر و لە بەغدا تەواو کردووە، لە ٤/١١/١٩٣٤دا کراوە بەمامۆستا و لە قوتابخانەی بەرزنجە لە پارێزگای سلێمانی دانراوە. لەگەڵ مامۆستا عەبدوڵلا زێوەری شاعیری ناسراوی کورد مامۆستا بوون لەو قوتابخانە سەرەتاییەدا. بنچینەی شیعر دانانی لەسەر دەستی فێر بووە و وردە وردە شیعری داناوە.

مامۆستا عەبدولمەجید جگە لە شیعرەکانی زێوەر، شەیدای شیعرە نەتەوەییەکانی حاجی قادری کۆیی بووە و دیوانێکی دەسنووسی لە شیعرەکانی حاجی قادر دوای راستکردنەوەی هەڵەکانی لەلایەن مەلای گەورەی مامی و شێخ نوورەدینی باوکی لەلای خۆی پاراستووە. کە لە دواییدا بووەتە یەکێک لە سەرچاوەکانی ساغکردنەوەی هۆنراوەکانی حاجی لە دیوانەکەی چاپی بەغدای ساڵی ١٩٨٦یدا.

مامۆستا عەبدولمەجید لە بواری سروودی نیشتمانی و ئاوازەکانییەوە دەستێکی باڵای هەبوو. گەلێک

سروودی نیشتمانیی كوردی لە ئاوازی خۆی بەقوتابییانی گوتووە، لە گوتنی مەقامی ڕەسەنی كوردیشدا وەك مامۆستا نەك وەك مەقامبێژ دەستێكی باڵای بووە.

ئەم زاتە خەباتگێڕە لەگەڵ دامەزراندنی حزبی هیوا لە ١٩٣٩دا بەسەرۆكایەتیی مامۆستا ڕەفیق حیلمی، بووەتە ئەندامێكی چالاكی ئەو حزبە نەتەوەییە و بیروباوەڕی كوردایەتی لە ناو قوتابی و مامۆستاكاندا بڵاو كردۆتەوە. كاتێكیش كە كۆماری دیموكراتیی مەهاباد لە ٢٢/١/١٩٤٦دا لە ڕۆژهەڵاتی كوردستان بەسەرۆكایەتی پێشەوا قازی محەمەد دامەزرا. بەهەموو هۆش و هەستێكییەوە پشتگیریی ئەو كیانەی كوردی كرد و بەشێك لە مووچەكەی خۆی وەك پیتاڵ دەبەخشی بۆ یارمەتیدانی كۆماری دیموكراتی كوردستان. كە پارتی دیموكراتی كوردستانیش لە ١٦/٨/١٩٤٦دا بەسەرۆكایەتیی بارزانی، وەك ئەندامێكی دڵسۆز تا سەرەتای پەنجاكانی سەدەی ڕابردوو كاری لەو حزبەدا كرد، دوای ئەوەش وەك خەباتگێڕێكی كوردپەروەر تا دوا هەناسەی ژیانی مایەوە و هەمیشە جێگەی ڕێزی هەموو دانیشتوانی شارەكەی كۆیە بوو.

**مامۆستا عەبدولمەجید نوورەدین و بیرەوەرییەكانی:**

مامۆستا لە تۆماری بیرەوەرییەكانی سەردەمی مامۆستاییدا ئەمەی خوارەوەی نووسیوە و دەڵێ:

(لە هاوینی ١٩٣٥دا كە جاری ساڵێك بوو مامۆستای قوتابخانەی بەرزنجە بووم، بەفەرمانی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی مەعاریفی عێراق دەورەیەكی پەروەردەیی لە بەغدا كرایەوە و لە پارێزگای سلێمانی بەپێی فەرمانێكی بەڕێوەبەرایەتیی مەعاریفی ژمارە (٧٣٢)ی ڕۆژی ٢٩/٦/١٩٣٥، (٣٠) مامۆستا ناردرانە بەغدا بۆ بەشداریكردن لەو دەورەیە، ئەمانە هەندێكیانن:

١- (عەبدوڵلا سولەیمان)ی ناسراو بە (گۆران)ی شاعیر، مامۆستای عەبابەیلێ.
٢- (فایق عەبدوڵلا)ی ناسراو بەفایق بێكەس، مامۆستای قوتابخانەی بازیان.
٣- نەجمەدین مەلا مامۆستای قوتابخانەی جافەران.
٤- (ڕەمزی ڕەحیم)ی ناسراو بە (مامەند كەركووكی) مامۆستای قوتابخانەی ماوەت.
٥- عەلی سەعید شەوقی ناسراو بە (عەلی ئاگا) مامۆستای ئەیوبییەی سلێمانی.
٦- شێخ محەممەد زوهدی، مامۆستای قوتابخانەی سووردash.
٧- عەبدولمەجید نوورەدین، مامۆستای قوتابخانەی بەرزنجە.

پاش دەرچوونیان لە دەورەكە بوونە مامۆستای هەمیشەیی و لە كارەكانیاندا جێگیر كران. مامۆستای كارگوزارمان دوای ٣٤ ساڵ خزمەتكردنی نەوەی نوێی كورد لە بەرزنجە و ڕانیە و هەولێر و كۆیە لە ساڵی ١٩٦٨دا خانەنشین كرا و لە شارەكەی خۆی ژیانی بەسەر برد تاكو لە ساڵی ٢٠٠١دا كۆچی دوایی كرد.

**مامۆستا عەبدولمەجید و سەندیكای مامۆستایان:**

مامۆستا عەبدولمەجید لە پاش دامەزراندنی سەندیكای مامۆستایانی كۆماری عێراق لە مانگی شوباتی ١٩٥٩دا و كردنەوەی لقی سەندیكاكە لە شاری كۆیە، لە سەرەتای هاوینی ئەو ساڵەدا بەزۆربەی دەنگ بەسەرۆكی دەستەی بەڕێوەبەری لقی كۆیەی سەندیكای مامۆستایان هەڵبژێردرا و دەستەی بەڕێوەبەر بەمجۆرە بەهەڵبژاردن دەرچوون، كە ئەمانەی خوارەوە بوون:

١- عەبدولمەجید نوورەدین جەلیزادە- سەرۆك.
٢- كەریم مستەفا شارەزا- سكرتێر.
٣- غەریب مستەفا سەڕاج- ژمێریار.
٤- خاتوو خانە ئیسماعیل- ئەندام.
٥- موعتەسەم عەبدولمەجید موفتی- ئەندام.

ئەم دەستەیە بەجوانی كاروباری لقەكەیان بەڕێوە برد و بارەگایەكی لێوەشاوەیان بۆ مامۆستایان كردەوە، كە بووە مەڵبەندێكی ڕۆشنبیری بۆیان.

**كەریم شارەزا**

# مەسعوود محەمەد
# ١٩١٩ - ٢٠٠٢

## نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو

**١- ژیانی:**
مامۆستا مەسعوود محەمەد جەلیزادە، لە ساڵی ١٩١٩دا لە شاری کۆیە، شاری ئەدەب و هونەر و خەباتی کوردایەتی هاتۆتە دنیاوە، مەلا محەمەدی باوکی کەناسراو بوو بەمەلای گەورە و کوڕی حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادە بووە.

مامۆستا مەسعوود محەمەد لە ساڵی ١٩٢٦دا چووەتە بەرخوێندنی رەسمی لە قوتابخانەی سەرەتایی کۆیە و لە ساڵی ١٩٣٢دا خوێندنی ئەو قۆناغە بەرایییەی تەواو کردووە و بۆ پاییزی ساڵی ١٩٣٤دا چووەتە هەولێر و لە قوتابخانەی ناوەندیی هەولێر وەرگیراوە و بۆ ماوەی شەش ساڵ لە ماڵی مەلا فەندی لە باداوە لەگەڵ عیزەدینی کوڕی مەلا فەندی ژیاوە تاکو لە ساڵی ١٩٤٠دا خوێندنی ئامادەیی تەواو کردووە و لە ساڵی ١٩٤١دا چووەتە بەغدا و لە کۆلێجی حقووق وەرگیراوە و هەر چوار ساڵی خوێندنی بەزیرەکی تەواو کردووە و لە ساڵی ١٩٤٥دا بڕوانامەی حقووقی وەرگرتووە و بووەتە پارێزەرێکی یاساناسی بەتوانا.

مامۆستا مەسعوود چوو لە کۆیە خۆی پاڵاوت بۆ ئەندامیەتیی پەرلەمان و لە رۆژی ١٩٥٣/١/١٩دا هەڵبژاردن کرا و بەزۆربەی دەنگ لە هەڵبژاردنەکە سەرکەوت و بووە ئەندامی پەرلەمان و لەو دەزگا تەشریعییە گەلێک داواکاریی بەنرخی پێشکەش کرد وەک گەڕاندنەوەی دوورخراوەکانی کورد بۆ زێدی خۆیان کە مەبەستی لە بارزانییەکان بوو، لە ئەنجامدا هەندێکیان گەڕاندنەوە شوێن و جێگەی خۆیان.



دوای ساڵێک دووبارە هەڵبژاردن کرایەوە و لە ناوەڕاستی بەهاری ١٩٥٤دا دیسان مامۆستا مەسعوود خۆی پاڵاوتەوە بۆ ئەو دەورەیەش و لە ئەنجامدا سەرکەوت و بەناوی بەرەی نیشتمانی لەگەڵ ٩ ئەندامی تر چۆتە ناو پەرلەمان، بەڵام زۆری نەبرد نووری سەعید وەزارەتێکی نوێی دامەزراند و ئەو پەرلەمانەی هەڵوەشاندەوە. ئینجا ئەو زاتە گەڕایەوە کۆیە و دەستی دایە پیشەی پارێزەری، تاکو هەڵگیرسانی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨.

لە دوای ئەو رووداوە گرنگە سیاسییەی عێراق، هەڵوێستی سیاسی وای خواست بچێتە بەغدا و لێی دانیشێ و دوای یەک دوو مانگ کرا بەئەندامی لیژنەی چاکسازیی کشتوکاڵ لە عێراق و لەگەڵ پسپۆڕانی یاسای کشتوکاڵ و زەویوزارو ناودێریی عێراقی و میسری توانییان یاسای چاکسازیی کشتوکاڵ لە کۆماری عێراق دابنێن و لە رۆژی ٣٠ی ئەیلوولی ١٩٥٨دا راگەیەنرا.

لە دوادوای شەستەکانی سەدەی رابردووشدا کرا بەئەندامێکی سەرەکی لە ئەنجوومەنی خزمەتی فەرمانبەران و لە دوای رێککەوتننامە مێژووییەکەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠شدا و لەگەڵ دامەزراندنی کۆڕی زانیاریی کورد لە بەغدا لە ١٩٧٠/٨/٢٩ ئەو زاتە کرا

بەئەندامێکی کارای کۆڕی زانیاری و بەجێگری سەرۆکی کۆڕ هەڵبژێردرا. لە بەڕێوەبردنی کاروباری دیوانی کۆڕ دەورێکی باڵای هەبوو، لە هەمان کاتیشدا بابەت و لێکۆڵینەوەی بەنرخی لە گۆڤاری کۆڕەکەدا بلاو دەکردەوە. تاکو لە تەمەنی ٨٣ ساڵیدا لە هەولێر کۆچی دوایی کرد و بەڕێزێکی زۆرەوە لەو رۆژەی کۆچی دواییدا کە ١/٤/٢٠٠٢ بوو.

**٢- بەرهەمەکانی:**

**کتێبەکانی:**

چەندین کتێبی لە بوارەکانی زمانەوانی، ئەدەب و فەلسەفی و ئایدیۆلۆژیایی نووسیوە، لەوانە:

**أ- کتێبەکانی بەزمانی کوردی:**

١- بەرەو راستە شەقامی ئاخاوتنی کوردی، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨، ل ٦٣.

٢- چەند حەشارگەرەکی ڕێزمانی کوردی، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦- ل ٩٨.

٣- وردبوونەوەیەک لە چەند باسێکی ڕێزمانی کوردی، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٤، ل ١٨٠.

٤- زاراوەسازی پێوانە، ئەمینداریەتیی گشتیی رۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستان، ١٩٨٨، ل ٤٤٥.

٥- چەپکێک لە گوڵزاری نالی، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦، ل ٣٥٠.

٦- حاجی قادری کۆیی، بەرگی یەکەم، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٣، ل ٤١٤.

٧- حاجی قادری کۆیی، بەرگی دووەم، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٣، ل ٣٣٥.

٨- حاجی قادری کۆیی، بەرگی سێیەم کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦، ل ٤٢٠.

٩- حەمە ئاغای گەورە، دەزگای رۆشنبیریی کوردی، بەغدا، چ. سۆمەری، ١٩٨٦، ل ١٢٢.

١٠- بۆ ئەمیری حەسەن پوور لە هەر کوتییەک بێت، دەزگای رۆشنبیریی کوردی، بەغدا، ١٩٨٤، ل ١٠٢.

١١- مرۆڤ و دەوروبەر، بەرگی یەکەم، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٧، ل ١٧٦.

١٢- مرۆڤ و دەوروبەر، بەرگی دووەم، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٨٤، ل ١٩٧.

١٣- دەستە و دامانی نالی، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٧، ل ١٠٣.

١٤- گەشتی ژیانم، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٢.

**ب- کتێبەکانی بەزمانی عەرەبی:**

١- الانسان ومحاولة، دار الثقافة والنشر الكردية، الجزء الاول، بغداد، ١٩٩٩.

٢- الانسان ومحاولة، دار الثقافة والنشر الكردية، الجزء الثاني، بغداد، ١٩٩٩.

٣- لسان الكرد، مطبعة الحوادث، بغداد، ١٩٨٧.

٤- من هموم الحياة، الامانة العامة للثقافة والشباب، مطبعة حسام، بغداد، ١٩٩٨.

٥- إعادة التوازن الى ميزان مختل- المجمع العلمي الكوردي- بغداد ١٩٧٧، ١١٢ صفحة.

٦- المجتمع البشري لماذا يشبه مستشفى المجانين- أربيل- مؤسسة أراس ١٩٩٩.

٧-الي غورباتشوف... تحية ورجاء.

٨-التفسير البشري للتأريخ.

**وتارەکانی:**

دەیەها وتار و لێکۆڵینەوەی لە گۆڤارەکانی کۆڕی زانیاریی کورد و رۆشنبیریی نوێ و کاروان بلاو کردۆتەوە.

أ- لێکۆڵینەوەکانی لە گۆڤاری "کۆڕی زانیاریی کورد" کۆڕی زانیاریی عێراق- دەستەی کورد".

١- بەکارهێنانی "ی" لە ڕێزمانی کوردیدا، گ.کۆڕ، بەرگی یەکەم، ١٩٧٣، ل ٣٩-١١٤.

٢- سوورێکی خامە بەدەوری "ڕاناو"دا،گ. کۆڕ، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٤، ل٩-١٤٧.

٣- چەپکێک لە گوڵزاری "نالی"، بەشی یەکەم، گ.کۆڕ، بەرگی دووەم، بەشی دووەم، ١٩٧٤، ل ١١-٨٠.

٤- چەپکێک لە گوڵزاری "نالی"، بەشی دووەم، گ.کۆڕ، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم،١٩٧٥، ل ١٠-٨٨.

٥- فۆنەتیک چیمان بۆ بکا، گ.کۆڕ، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٥، ل ٥٦٨-٦٢٢.

٦- چەپکێک لە گوڵزاری "نالی"، بەشی سێیەم، گ.کۆڕ، بەرگی سێیەم، بەشی دووەم،١٩٧٥م، ل ٨-٧٤.

٧- ڕێنووسی کۆڕ، گ.کۆڕ، بەرگی چوارەم، ١٩٧٦، ل ٢٣٢-٢٨٨.

٨- بەسەرداچوونەوە، گ.کۆڕ، بەرگی پێنجەم، ١٩٧٧، ل ١٣٥- ١٧٦.

٩- هەڵدانەوەی چەند رووپەڕێکی زمانی کوردی، گ.کۆڕ، بەرگی پێنجەم، ١٩٧٧، ل ٢٦٤-٣١١.
١٠- مەمدوح سەلیم، ربع قرن من النضال الكردي الدؤوب، گ.کۆڕ، بەرگی پێنجەم، ١٩٧٧، ل ٥٠٩-٥١٣.
١١- چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی رێنووس و ئەلفوبێی کوردی، گ.کۆڕ، بەرگی نۆیەم، ١٩٨٢، ل ٢٦٢- ٣٥٩.

**ب- لێکۆڵینەوە و وتارەکانی لە گۆڤاری"رۆشنبیری نوێ، کاروان، بەیان،" و هەفتەنامەی "هاوڵاتی":**

١- رەوانەدنەوەی دوو رەخنە، گ. رۆشنبیری نوێ، ژ"٨٠"، مایسی ١٩٨٠، ل ٢-١٤.
٢- تیرووپشکێ لە دەنگسازی، گ. رۆشنبیری نوێ، ژ"١٠١"، ئاداری ١٩٨٤، ل ٢٨- ٥٢.
٣- گەشتی ژیانم، ئەڵقەی یەکەم، گ. رۆشنبیری نوێ، ژ"٣-١٠٤ -١٠" ساڵی ١٩٨٤، ل٧٠-٩٠.
٤- گەشتی ژیانم، ئەڵقەی دووەم، گ. رۆشنبیری نوێ، ژ"١٠٥"، ١٩٨٥، ل ١٤٥-١٦٨.
٥- گەشتی ژیانم ئەڵقەی سێیەم، گ. رۆشنبیری نوێ، ژ"١٠٦"، ١٩٨٥.
٦- گەشتی ژیانم، ئەڵقەی چوارەم، گ. رۆشنبیری نوێ، ژ"١٠٨"، ١٩٨٥، ل ٢٩٥-٣١٤.
٧- گەشتی ژیانم، ئەڵقەی پێنجەم، گ. رۆشنبیری نوێ، ژ"١٠٩"١٩٨٦، ل ٢٧٧-٣١٠.
٨- زاراوەسازی پێوانە، بەشی یەکەم، گ. رۆشنبیری نوێ، ژ"١١١"، ١٩٨٦، ٢٠٥-٢٧٣.
٩- زاراوەسازی پێوانە، بەشی دووەم، گ. رۆشنبیری نوێ، ژ"١١٢"، ١٩٨٦، ل ١٦٢- ٢١١.
١٠- گەشتی ژیانم، ئەڵقەی شەشەم، گ. رۆشنبیری نوێ، ژ"١١٣"، ١٩٨٧، ل ١٨٩- ١٢١.
١١- گەشتی ژیانم، ئەڵقەی حەوتەم، گ. رۆشنبیری نوێ، ژ"١١٤"، ١٩٨٧، ل ١٦٣- ١٨٠.
١٢- گەشتی ژیانم، ئەڵقەی هەشتەم، گ. رۆشنبیری نوێ، ژ"١١٥"، ئەیلوولی ١٩٨٧، ل ٢٣٥-٢٥٢.
١٣- گەشتی ژیانم، ئەڵقەی نۆیەم، گ. رۆشنبیری نوێ، ژ"١١٦"، کانوونی یەکەمی ١٩٨٧، ل ١٨٣-٢٠٦.
١٤- گەشتی ژیانم، ئەڵقەی یازدەم، گ. رۆشنبیری نوێ، ژ"١٢١"، ئاداری ١٩٨٩، ل ١٣٣- ١٥٠.
١٥- گەشتی ژیانم، ئەڵقەی دوازدەم، گ. رۆشنبیری نوێ، ژ"١٢٢"، ١٩٨٩.
١٦- گەشتی ژیانم، ئەڵقەی سێزدەم، گ. رۆشنبیری نوێ، ژ"١٢٣"، ئەیلوولی ١٩٨٩، ل ٩٥- ١١٦.
١٧- گەشتی ژیانم، ئەڵقەی چواردەم، گ. رۆشنبیری نوێ، ژ"١٢٤"، کانوونی یەکەمی ١٩٨٩، ل ٨٤-٩٥.
١٨- دەستبژارێک لە کتێبی ئەنجوومەنی ئەدیبان، گ. رۆشنبیری نوێ، ژ "١٣١"، ١٩٩٣، ل ٣٤-٥٦.
١٩- بژار و گوڵبژێرێک لە هەندێ نووسراوی کوردی، گ. رۆشنبیری نوێ، ژ"١٣٤"، ١٩٩٤، ل ٢٩-٤٦.
٢٠- رەمزی نافیع قوربانییە زلەکەی هەولێر، گ. کاروان، ژ"٣٣"، حوزەیرانی ١٩٨٥، ل ٠-١١.
٢١- هەولێر تاریکستانە و دەزگ چراخانە، هەفتەنامەی هاوڵاتی، ژ "١"، ساڵی ٢٠٠٠.

**٣- هەڤپەیڤین**

دەیها هەڤپەیڤینی لەگەڵ ئەنجام دراوە، کە هەندێکیان دواتر لە دوو توێی کتێب خرانە روو، لەوانە:

١- نامەکانی مەسعوود محەمەد، ئامادەکردنی حەکیم کاکەوەیس، کە بەچەندبەشێک لە گۆڤاری رامان بڵاو کرایەوە و دواتر لە کتێبی رامان بەناوی "نامەکانی مەسعوود محەمەد" بڵاو کرایەوە.
٢- ژیان و جیهانبینی"گفتوگۆ لەگەڵ مەسعوود محەمەد"دا، ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی، ئەمە دواتر لە ساڵی "٢٠٠١" دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم لە دوو توێی کتێبێکی بەنرخ خرایە روو.
٣- دیداری رامان لەگەڵ مەسعوود محەمەد: بەغەیری ئیمان بەحەق کە لە منداڵییەوە بۆم ماوەتەوە، کەس نییە لە ژێر تەئسیریدا بم، هەڤپەیڤینی ئازاد عەبدولواحید، گ. رامان، هەولێر ١٩٩٩.

**٤- شوێنی لە کۆڕی زانیاریی کورد:**

هەر لە سەرەتای دروستبوونی دەزگای کۆڕی زانیاریی کورد، رۆڵێکی دیار و کارامەی بینیوە، بەجۆرێ سەردرای ئەوەی کرابووە ئەندامی کارای کۆڕ، لە هەمان کاتیشدا کرابووە دەمڕاست و قسەکەری یەکەمی کۆڕی زانیاریی کورد و لە هەموو لیژنەکانی"زمانەوانی، زاراوە، ئەدەب،... هتد" بەشداریی کردبوو لە هەر هەمووشیان کرابووە دەمڕاست.

# حوسێن عەبدوڵلا (حوسێن مەیاس)
# ١٩١٤ - ٢٠٠٢

فارس حوسێن مەیاس

مام حوسێن لە دەستپێکردنی جەنگی جیهانیی یەکەم ساڵی"١٩١٤"چاوی بەدنیا هەڵێناوە و ئەودەم کوردستان لە ژێر فەرمانڕەوای دەوڵەتی عوسمانیدا بوو. ئەوکات ژێرخانی ئابووریی کوردستان بەجارێک داتەپی بوو ژیان و گوزەران لە ئاستێکی زۆر نزمدا بوو کەواتە سەردتای ژیانی بە کولەمەرگی دەستی پێ کردووە، لەلای کوردەواری ساڵانی جەنگی جیهانی بە ساڵانی"گرانی" بەناوبانگە بەهۆی مردنی باوکییەوە دایکی پەروەردەی کردووە وەک هەر منداڵە بێ باوکێک رەنجی زۆری کێشاوە. ژیانی خۆی بە کشتوکاڵەوە بەڕێ کردووە تا ساڵی"١٩٤٥"دەستی بەبازرگانی و ئاژەڵداری و کڕین و فرۆشتنی دانەوێڵە کردووە. هەر بەهۆی کارەکەیەوە هاتوچۆی بەغدا و شارە گەورەکانی کردووە لە رێگاش دۆستایەتیی لەگەڵ چەند پیاوی ناوداری ئەودەمدا پەیدا کردووە لەوانە هەندێ پیاوی ناودار



و سیاسەتمەداری مەزن لەوانە"عەونی یوسف- یەحیا سەلیم، نافیع یونس، سالم حەیدەری- جەمال حەیدەری بنەماڵەی حەیدەرییەکان".

لەگەڵ ئەوەی ژیانی سیاسیی بەخەباتی چینایەتی "چەپایەتی" دەست پێ کردووە بەڵام هەستی نەتەوایەتیی مام حوسێن زۆر بەرز بووە لە یادی نەورۆزی "١٩٤٨"بەشدار بووە کە لە ماڵی حەیدەرییەکان کراوەتەوە. لە ساڵی "١٩٥٣"بەشداریی کاریگەری هەبووە لە سەرکردایەتیکردنی بزووتنەوەی جووتیاری دەشتی هەولێر کە دژی دەرەبەگەکان کرا. لە ساڵی"١٩٥٥"سەردانی شێخ مەحموودی نەمری کردووە جارێکی تریش نامەیەکی"عەلی مەحموود کاکەخانی"گەیاندووە بەشێخی نەمر. دۆستایەتییەکی بەهێزی هەبوو لەگەڵ بنەماڵەی شێخ مەحموود لەوانە: شێخ لەتیفی کوڕی. لەو سەردانانەی شێخی مەزن وتەیەکی مێژوویی بۆ گێڕاوەتەوە کە شێخ فەرمووبووی لە نەزانین و بێ توانایی ئێمە نەبوو شکستمان خوارد نەمانتوانی دەوڵەتی نەتەودیی کوردستان پارێزگاری لێ بکەین، بەڵکو بەرژەوەندیی ئینگلیز لەگەڵ عەرەبی سوننە و دنیای عەرەب یەکی دەگرتەوە. هەردەم ئەم وتەی بۆ دەگێڕانەوە، منداڵەکانی مام حوسێن"کاکل- فارس-دارا- کاوە-شوان-بۆتان-سۆران" زۆربەیان ناوی کوردین بۆ ئەودەم زۆر گرنگ بوو. خەباتی سیاسیی مام حوسێن لە پێناوی بەرگریکردن لە مافی چەوساوەکان و عەدالەتی

کۆمەڵایەتی و ئازادی و رزگاری لە داگیرکەری بووە هەردەمیش خەباتی چینایەتیی نەتەوەیی بەیەکەوە گرێ داوە.

لە دوای شۆڕشی گەلاویژی"١٩٥٨" گۆڕانێکی گەورە بەسەر عێراق و کوردستاندا هات، ئەوەی خەباتی بۆ کردبوو هەندێک دەستکەوت بەدەست هات لە ساڵی"١٩٥٩""جەمعیەی فەلاحی" باڵادەست بوو لە عێراق و کوردستان، مام حوسێن لە سەرووی ئەم جەمعیە بوو لە دەشتی هەولێر وەک پسپۆڕ و شارەزا ئیسلاحی زراعی شاری هەولێر سوودیان لە مام حوسێن بینی چ لە ڕووی چاکسازی کشتوکاڵی چ لە ڕووی دابەشکردنی زەوی لەسەر جووتیارەکان. لە ساڵی ١٩٦٢ رژێمی عەبدولکەریم قاسم هەڵگەڕایەوە و بڕیاری گرتنی بۆ دەرچوو گیرا و ڕەوانەی سەماوە کرا، بەڵام لە ڕێگای عەونی یوسف کە دۆستی وەزیر بوو ئەودەم ئازاد کرا. لە ساڵی"١٩٦٣"ی"٨ی شوبات" حکوومەتی عەبدولکەریم قاسم رووخا و عەرەبە شۆڤێنی و بەعسییەکان دەسەڵاتی سیاسییان گرتە دەست و زۆری نەبرد هێرش کرایە سەر کوردستان تەڕ و وشکیان سووتاند. ئەمجارە بەناچاری مام حوسێن چەکی شەرەف و پێشمەرگایەتیی کردە شان، ئەمجارە خەباتی چینایەتیی و نەتەوایەتی بەیەکەوە گرێ دا لەلایەک و بەرگریکردن لە خەڵکی زەحمەتکێش و ڕەنجدەر و لەلایەکی تر بەرگریکردن لە گەل و نیشتمانی کوردستان. لە عێراق و شارەکانی کوردستان زۆربەی چەپ و شیوعی و دیموکراتخواز و نیشتیمانپەروەرەکان خرانە زیندان بەسەدانیش گوللەباران کران و لەسێدارە دران، زۆریش لە ژێر ئەشکەنجە گیانیان لەدەست دا.

لە دێهات و شاخەکانیشدا هێرشی درندانە کرایە سەر پێشمەرگە و جەماوەری گەلی کوردستان، مام حوسێن ئەودەم سەرکردەیەکی لێهاتووی بەرگریکردن بۆ بارەگای مام حوسێن لە بەینی بێستانە و ئاخورە بوو، تاکو ئێستا کانییە ئاوێک هەیە کە مام حوسێن بارەگای لەسەر دانابوو بەناوی کانی حوسێن مەیاس، مام حوسێن دۆستێکی هەرە هەرە نزیکی"عەونی یوسف- کەریم ئەحمەد- عەزیز محەمەد- ئەحمەد بانی خێلانی- عەباس ئاغای سەرکەپکان" بوو، بۆیە جارێک لە شاخ سەردانی عەونی یوسف دەکات لە ماڵی عەباس ئاغا زۆریش دۆستی مەحموود عەدۆ بووە بەڵام هەندێ جار بۆچوونی جیاوازیان لە نێواندا هەبووە. دۆستایەتیی لەگەڵ حەمەد ئاغای مێرگەسۆر و فاخیر حەمەد ئاغا زۆر خۆش بووە زۆرجار سەردانی یەکتریان کردووە.

لە کاتی پێشمەرگایەتی سەرکردایەتیی چەند شەڕ و داستانی گەورەی کردووە، لێپرسراوەتی پێشمەرگەش بووە بەچەند پلەیەکی سەربازی. لە دوای بەیانی ئازادی"١٩٧٠" لە هەولێر بووە، زۆر دۆستی شێخ لەتیف بووە مام حوسێن وەک کەسایەتییەکی کۆمەڵایەتی دەوری خۆی بینیوە لە چەندەها سوڵحی کۆمەڵایەتی.

زۆریش دۆستی شاعیر و ڕووناکبیر و نووسەر و دادوەر و پارێزەرەکان و ئەو توێژە کۆمەڵایەتییە بووە لەوانە: "کەریم شارەزا- دڵزار-مومتاز حەیدەری- جەمیشد حەیدەری- حاکم ڕەشید- حاکم سەعدی- گیوی موکریانی- عەبدوڵڵا کانی مارانی- حاکم وریا- هەرچەندە مام حوسێن نە خاوەنی بڕوانامەی ئەکادیمی بەرز بووە، نە کوڕی شێخ و مەلا و ئاغا و سەرۆک خێڵ بووە. بەڵکو هەڵقووڵاوی ناو واقیعی جەرگەی کوردەواری بووە. دژ بە پاڕانەوە و دوعاو و نوزانەوە بووە. لە ساڵی"٢٢/ ١٠/ ٢٠٠٢"ماڵئاوای یەکجاری لێ کردین، هەروەها برادەرایەتیی لەگەڵ تێکۆشەران هەبووە لەوانە: ئەحمەد حەمەدەمین. سلاو لە گیانی پاکی.

# شێخە شەل
# ١٩٢٣ - ٢٠٠٢

**ئا: تاریق جامباز**

پێش ماوەیەک کەسایەتییەکی مەزنی پایتەختی باشووری کوردستان، ماڵئاوایی یەکجارەکی لێ کردین، بەڵام هەرگیز هەڵوێست و خۆڕاگری لە بیر و هزرمان لە یاد ناکرێ، چونکە تا دوا هەناسەی (راستگۆ و بوێر و قسە لەڕوو و قسەزان و دنیا دیتە) بوو لەبەرئەوەی بۆتە بەشێک لە کەلەپووری پیرە هەولێر و کە دەهاتە ئاخاوتن بیرتیژی ورد و دووربینی لە پەیڤەکانی بەدەردەکەوت، بۆیەش گەورە و بچووکی پایتەخت رێز و ستایشیان دەکرد و هەموو کەس دەیناسی، بەداخەوە ئێمەی کورد بەدەگمەن یادی مەزنەکانمان دەکەینەوە و لە بارەیان دەنووسین و...هتد، کە لە هاورێ و ناسیاو و رۆشنبیران دەپرسم دڵێم خۆزیا گەرماوگەرم یادی مەزنەکانمان دەکردەوە نەک فەرامۆش بکرێن، لەبارەی شێخە



شەل بابەتێکم لە گۆڤاری رامان بڵاو کردەوە کە لە چلەکاندا کتێبخانەی هەولێری لە هەولێر دانا و بووە سەنتەری ئەوسای خوێنەرانی دیموکرتخواز و رۆشنبیران و زۆربەی کەسایەتییە ناسراوەکانی هەولێر لە کتێبخانەی هەولێر یەکتریان دەبینی و باسی بارودۆخی ئەوسایان دەکرد، بۆیە کتێبخانەکەشی رۆڵێکی پرشنگدار و رۆشنفکری لەسەر ئەوەی ئەوسادا هەبوو... لەبەرئەوەی چەندان جار لەگەڵ ئەم مرۆڤە دانیشتووم و هەندێک لە بیرەوەری و یاد و بەسەرهاتی بۆ گێراومەتەوە بە پێویستم زانی، کە خوێنەرانی لێ بێبەش نەکەم. قسەکانی بەشێکن لە مێژووی نەتەوەکەمان، ئاشنایەتیم لەگەڵ شێخە شەل و مەلا عروس دەگەڕێتەوە بۆ شەستەکان، کە سەردانی کاک (شەریف جامباز)م دەکرد، هەردووکیان لەگەڵ کاکم کاریان دەکرد و جێی متمانە و بڕواپێکراوی بوون و لە شوێنی باڵەخانەی (شەریف جامباز و فائق نادر)ی ئێستایە و لە بەرامبەریشی پەیکەری کۆتری ئاشتی هەبوو، بەڵام بەداخەوە شوێنەکەی لەگەڵ زەوی تەخت کرا. لەبارەی چۆنیەتیی دروستکردنی شێخە شەل فەرمووی[1]: کۆتری ئاشتیی ئاشتیخوازان و

دیموکراتخوازان پاش شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ دروستیان کرد و هونەرمەندی شێوەکار جابر پیرداود[٢] کۆترەکەی لە بۆرەک دروست کرد و لە زەوی چەند مەترێک بەرز کرابۆوە، لە بەرزییەکەدا کۆتری ئاشتی نیشتبوو چراش لە دەوروپشتی دانرابوو دەشڵێ لە ژمارەیەک لە ژمارەکانی گۆڤاری (العراق الجدید) لە بەرگی دواوەی وێنەی کۆتری ئاشتی لەسەر بێ و ئەوسا مەسروفاتی مەسەلەکەی کۆتری ئاشتی ئەوا بەڕێزان ئاشتیخواز و کەسایەتییە ناسراوەکانی شاری هەولێر (شەریف جامباز و فائق نادر) گرتیانە ئەستۆی خۆیان، لە ساڵی ١٩٦٣ موتەسەریفی هەولێر (بەدرەدین عەلی) فەرمانی دەرکرد، کە دەبێ کۆتری ئاشتی نەمێنێ و لە سەردەمی شارەوانی (وەهاب سەید حەسەن) مەسەلە و کۆترەکە تێکدرا و لەگەڵ عاردی یەککرا.

هەروەها شێخە شەل گوتی: کاتێ (حەرەس قەومی) لە ساڵی ١٩٦٣ منیان گرت و لێمیان پرسی: کێ ئەمری دروستکردنی کۆتری ئاشتیی داوە؟ منیش لە وەڵامدا گوتم: موتەسەریفی پێشوو (عەلائەدین مەحموود).... لەبارەی کۆبوونەوەکانی ئاشتیخوازاندا هەندێ جار لە ماڵی قاسمی مەلا ئەفەندی، کە ئەندام بوو تێیدا دەکرا و ئەم زاتانەش ئامادەی کۆبوونەوەکە دەبوون:

١- مەلا عوسمان (باوکی حەمید عوسمان).
٢- ئەحمەد حەمەئەمین.
٣- سەید گوڵ.

لەبارەی شاعیری مەزنی عێراقی و دۆستی کورد (جەواهیری) شێخە شەل فەرمووی: وابزانم ساڵی ١٩٥٨ یا ١٩٥٩ شاعیری ئاشتیخواز و دیموکراتخواز (محمد مهدی الجواهری) ویستی ئیجازەی حزبێک وەربگرێ بەناوی حزبی (جمهوری) و داواییکی دایە لایەنە پەیوەندیدارەکان و لەگەڵ جەواهیری (شەریف جامباز) ئیمزای کردبوو، بەڵام ئیجازەی پێ نەدراوە، ڕێزدار شێخە شەل زۆر جار گیراوە (١٩٤٦، ١٩٤٨، ١٩٥١، ١٩٥٣، ١٩٦٠، ١٩٦٣) و لە ساڵی ١٩٦٣ لە بەعقوبە لە ژووری وەرزش بووین (وێنەکە لەوێ گیراوە) ئەوێ شوێنی دانپیانان (ئیعترافکردن) بوو (دوو مانگ لەوێ دەمانەوە) پاشتر ئەوجا ڕەوانەی زیندانیی روومادی دەکراین و ئەوەی سەردانی زیندانیی روومادی بکردایە، ئەوا بەڕێوەبەری زیندانەکە زۆری لە خزم و کەسوکاری گیراوان دەکرد تاکو بە هەموو جۆرێ وردەی زیندانییەکە بڕووخێنن و بەرائەت بدات، کە نۆرەی من هات گوتم: ئەنگۆ شێتن، من خاوەن تەکیەم هەرکە براکانم بەمە بزانن کە بەرائەتم داوە، ئەوا یەکسەر دەمکوژن، من و عەونی یوسف (بەرائەتمان) نەدا، چاوەڕوان بووم ولاتنامەکەم (جنسیە)م لێ بسێننەوە و لەبەر ئیعدامکردنی فەهد و هاوڕێیانی مانمان گرت (یازدە رۆژ خواردنمان نەخوارد) بەڵام نەختێک خوێ و ئاومان دەخواردەوە، دوو رۆژیش ئاومان نەخواردەوە، بۆیە زۆر لە زیندانییەکان قژی سەریان هەڵدەوەری یا چاویان کز دەبوو یا لە بێ تاقەتی دەکەوتنە خوارێ، منیش تا برسی و تێنوو نەبم بەردێکم لەسەر زگم قایم کردبوو و تا دوارۆژ گەرچی بێ تاقەتیش بووم هەر مانم گرت لە پاش شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ دروشمێک لە نێو هەولێر و دەوروبەری زۆر باو بوو تاکو ئێستاش خەڵک دەیڵێنەوە.

**بژی گەل رۆڵەی گەل**
**مام رەحمان و شێخە شەل**
**لەجیاتی**
**بژی گەل رۆڵەی گەل**
**عەبدولکەریم قاسم**

لە ١٩٦٣ لەلایەن حەرەس

قەومی گیرام، کە لەبارەی ئەم دروشمە لێیان پرسیم گوتم: کەو نیم، چونکە مام رەحمان یان ولادەت لە گوندی شێخە شەل بوو و هەروەها ١٩٤٨ ئێمە دروشمی (چیتان دەوێ... سەربەستی و ئازادی)، ناحەزان رستەیەکی دیکەیان بۆ زیاد کرد.

**(عەبا و پێچە هەڵبەستن)**

هەر لە چلەکاندا و لە شەقلاوە (نەورۆزمان کرد) ئەوسا (عەبدولباقی) بەڕێوەبەری ناحیە بوو، بەڵام ئەو لەوێ نەبوو، بۆیە (توانیمان) مفەوەزەکە لە جیاتی ئەو بەڕێوەبەر ناحیە بوو ئیقناعمان کرد بۆ یادی نەورۆز، خەڵکێکی زۆر ئامادە بوون، ئەوانەی ناویان لە بیرم مابێ (عوسمان بەگی خۆشناو و شاکر باوکی سامیە مەشخەڵ و ساڵح میران) لەم ئاهەنگە کاک رەفعەت تووتنچی وتارەکەی خوێندەوە و خەلیل خۆشناویش بەشێعرێک رازاندییەوە، مام تەها ئەحمەد تەها ئامادە بوو.

لەبارەی خوێندن و سەردەمی منداڵی فەرمووی: مامۆستا سەید نەجیب لە شێخەکانی هەڵەجە لە قۆناغی سەرەتایی، کە دەهاتە ژووری پۆل لە جیاتی (قیام) چاودێریی پۆل دەیگوت: شەگە،

لەم دانیشتنەدا خوشکەزای شێخە شەل (کاک هادی) ئامادە بوو گوتی: جگە دوو دیوی هەیە: (میر و شەگە) شەگەش واتە مانای دۆران وابزانین لە جیاتی هەڵسە، شێخە شەل گوتی، لە ئەربیلی ئولا دەمانخوێند و قوتابخانەکەمان لە خانوویێکی دوو حەوش بوو دوو دەوامان هەبوو: بەیانییان و دوای نیوەڕۆیان.... قوتابییان سیدارەی لبادیان لەسەر دەنا، ئەوەی هەیبووایە، مارکەکەشی سیمون شیمعون بوو، ئەو وەستایانەی سیدارەکەیان دروست دەکرد (شمبێل داود) کە جوولەکە بوو و دەیانفرۆشت، ئەو لە قوتابخانەدا پۆلی نیو و پۆلی یەکەمی هەبوو ئەو ناوانەی قوتابی بوون لەگەڵماندا:

(زەید ئەحمەد عوسمان) پۆلی دوو و برای (فەیسەڵ ئەحمەد عوسمان) پۆلی سێ بوو بەڕێزان حەسەن تەها کتانە و کەمال تەها کتانە و عیسمەت کتانە لەگەڵمدا قوتابی بوون، ناوی مامۆستاکانیشمان هی پۆلی (یەک) ئەمانە بوون:

١- عومەر ئەمین.
٢- سەید غەریب.
٣- عەلی حەماوی.
٤- ئەنوەر حەسەن.
٥- ئەحمەد ناجی (بەڕێوەبەر).

لە دوا چاوپێکەوتن و دیدەنیدا گوتی: زۆر کەس خەباتی نەنووسراوە و پەلە ناکا لە یەکلاکردنەوەی تاکو ئەوەی بە هەڵە نووسراوەتەوە، راست بکرێتەوە یا کەموکوریی هەیە تۆکمەتر بکرێت یا ئەوەی لەبیر کراوە بە بیرمان بێتەوە.

چەندان چاوپێکەوتنم لەگەڵ مامۆستا شێخە شەل کردووە:
١-(١٩٩٧/٩/١٦).
٢- (١٩٩٧/٩/٢٦).
٣- (١٩٩٧/٩/٢٩).
٤- (١٩٩٧/١٠/٣).
٥- (١٩٩٧/١٠/١٤).
٦- (١٩٩٧/١١/٦).
٧- (١٩٩٧/١١/١٢).
٨- (١٩٩٧/١١/٣٠).

٢- لە کتێبی (خواطر ذكريات) برای رۆژنامەنووس عومەر فەرهادی بابەتێکی لەبارەی (نصب السلام في اربيل ١٩٥٩ - ١٩٦١) بلاو کردۆتەوە لەوێ دەڵێ: جگە لە مامۆستا جابر پیرداود، جەواد وسوو ناجیش بەشداریی مەسەلەکەی کۆتری ئاشتیی کرد، بەداخەوە بە کارەساتی ئۆتۆمبێل گیانی لەدەست دا.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر، ژمارە (١٧) هاوینی ٢٠٠٦ بلاو بۆتەوە.

# عەبدولکەریم عەبدولقادر زێدبەگی
# ١٩١٦- ٢٠٠٥

**حاکم سەردار عەبدولکەریم**



ماموستا عبدولکەریم عبدولقادر لە ساڵی ١٩١٦ لە گوندی کۆزەپانکەی کەندیناوەی سەر بەپارێزگای هەولێر لەدایک بووە.

* سەرەتا هەر لە کۆزەپانکە چۆتە بەرخوێندنی ئاینی، دواتر بۆ تەواوکردنی خوێندن رووی کردۆتە شاری هەولێر ئینجا شاری کۆیە و چەندین دێهاتی کوردستان و لەسەر دەستی زانا ئاینییە ناسراوەکانی ئەو سەردەمە وەک ماموستایان مەلا مەعصومی کۆیە و مەلا صالحی کۆزەپانکە و مەلا رەشید و مەلا محەمەدی قزلجی خوێندنی تەواو کردووە و بڕوانامەی ئاینیی وەرگرتووە.

* لە دوای جەنگی جیهانی دووەم بەهەوڵ و تەقەلای خوالێخۆشبووان محەمەد عەلی عەونی بەگ لە میسر و عەلی کەمال لە بەغدا لەگەڵ دەستەیەک لە هاوەڵەکانی هەلێکیان بۆ رەخسا بۆ تەواوکردنی خوێندن لە زانکۆی ئەزهەر لە میسر. سەرئەنجام، لە ساڵی ١٩٥٠ پلەی بەکالۆریۆس لە شەریعە وەردەگرێت و بۆ ماوەی یەک ساڵ لە قوتابخانەیەکی شبرای میسر وانە دەڵێتەوە.

* هەر لە کاتی خوێندنیدا لە میسر بەهۆی بەربەرەکانی و زمان لێدانی چەند سیخوڕێکی شۆفێنی عەرەب لەلایەن دەزگا ئەمنییەکانی میسر چەند جارێک خۆی و هاوەڵەکانی تووشی گرتن و ئازاردان هاتوون، هەر ئەوەش بووە هۆی دواکەوتنی لە دامەزراندن تا ساڵی ١٩٥٤.

* لە ساڵی ١٩٥٨ لەو کاتەی کە ماموستا بووە لە کفری چۆتە کاری سیاسییەوە و لەگەڵ خوالێخۆشبوو (عەلی حەمدی) لە شارۆچکەی کفری هەردووکیان بەیەکەوە هەڵمەتێکیان بەرپا کرد بۆ بڵاوکردنەوەی هۆشیاریی نیشتمانی ونەتەوایەتی لە نێو جەماوەری گەرمیان و کفری.

* لە ساڵی ١٩٦٠ دەگوازرێتەوە بۆ ئامادەیی هەولێر ئینجا خانەی ماموستایان، لەو ماوەیەدا بەپێی توانای خۆی هەوڵی داوە گەنجان و کەسانی دەوروبەری هۆشیار بکاتەوە و هانیان بدات بۆ خوێندن و خۆپەروەردەکردن، لە هەمان کاتدا درێژەی داوە بە چالاکیی سیاسی، لە ساڵی ١٩٦٣ بەدەستی دەزگای داپڵۆسێنەری (حەرەس قەومی) دەسگیر کرا و رەوانەی زیندانی موسەیەب کرا و ماوەی زیاتر لە سێ مانگ لەوێ زیندانی کرا و ماوەی شەش مانگیش لە وەزیفەی ماموستایی دوور خرایەوە.

* وەکو ماموستا و پەروەردەکارێکی نیشتمانپەروەر هیچ کاتێک لە نێو قوتابی و هاوەڵەکانی و منداڵەکانی خۆی دریغی نەدەکرد لە بڵاوکردنەوەی بیری نیشتمانپەروەری و گۆشکردنیان بۆ خزمەتی کوردایەتی هەر ئەو کەشوهەوا شۆڕشگێڕانەی ماموستا سازی کردبوو بووە هاندەر بۆ ئەوەی دوو کوڕی لە سەرەتای هەشتاکانەوە روو بکەنە شاخ و ببن بە پێشمەرگە. هەر لەو سەردەمانە خۆیشی چەندین جار بەفیتی خۆفرۆشان تووشی راوەدوونان و گرتن و ئازاردان بووە لەسەر دەستی دامودەزگا داپڵۆسێنەرەکانی رژێمی دیکتاتۆری.

* هۆشیاری کوڕی خوالێخۆشبوو کە کادیرێکی ناسراوی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو، دوای ئەنفالەکان وەک بەرپرسی رێکخستن بەئیختیفا لە سنووری بەرانەتی مابووە. بەهۆی خیانەتی کەسانێکی بڕواپێکراوی ی.ن.ک لە کۆتایی مانگی ١٢ی ساڵی ١٩٨٨ لەلایەن دەزگای (ئەمن)ی هەولێر لە ئەنجامی پیلانێکی تایبەت دەسگیر کرا و دوای شەش مانگ لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجەدان خۆڕاگرانە و قارەمانانە ئامادە نەبوو هیچ نهێنییەکی رێکخستن ئاشکرا بکات، سەرئەنجام لە ساڵی ١٩٨٩ دەزگای (ئەمن )ی هەولێر بێ سەروشوێنیان کرد. خوالێخۆشبووش بەخۆی و خێزان و منداڵەکانی هەر لەگەڵ گیرانی هۆشیاری کوڕی گیران و رەوانەی زیندانیی (سماوە) کران و ماوەی (٧) مانگ لەوێ زیندانی کران و تووشی ئازار و ناخۆشی و سەرما و گەرمای سەخت بوون و خانووەکەشیان لەو ماوەیە دەستی بەسەردا گیرا. لە ٢٠٠٥ کۆچی دوایی کردوە.

* خوالێخۆشبوو چەندین نەوەی پەروەردە کردووە و یەکێکە لە پەروەردەکارە نیشتمانپەروەر و ناسراوەکانی شاری هەولێر.

# خاتوو ساکینە سولەیمان
# ١٩٣٠ - ٢٠٠٥

**کەریم شارەزا**



بەدرێژایی مێژووی کورد ئەو دەرفەتەی بۆ پیاو رەخساوە تا لە مەیدانی ژیاندا دەوری خۆی ببینێ، ئەو دەرفەتە بۆ ژنان نەخولقاوە. تاکو لە چلەکانی سەدەی بیستەمدا ژن شان بەشانی پیاو هاتنە مەیدانی خەبات و راپەڕین و لە پێناوی بەرەوپێشبردنی باری ژیانی کۆمەڵی کوردەواری لە هەموو رووێکی شارستانییەوە.

یەکێک لەو ژنانەی شاری هەولێر، خاتوو ساکینە سولەیمانی خوشکی خەباتگێڕی شەهید مووسا سولەیمان بوو. ئەو خاتوونە لە ساڵی ١٩٣٠دا لە شاری هەولێری دێرین لە بنەماڵەیەکی هەژار لەدایک بووە، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی بەپلەیەکی بەرز تەواو کردووە، لە ساڵی (١٩٤٧)ەوە بەشداریی لە خەباتی نیشتمانی و چینایەتیدا کردووە، هەروەکو خۆی دەیگوت: (لەبارەی بیروباوەڕ و خەباتی مارکسییەوە کەوتمە بەر کاریگەریی بیروباوەڕی کاکە مووسام)، لە رێگای ئەوەوە گەلێک گۆڤاری کوردی و عەرەبی وەکو گەلاوێژ و نزار و کتێبی مارکسی دەخوێندەوە و بیروباوەڕی نوێخوازی وەردەگرت.

لە قۆناغی خوێندنی لە خوێندنگای ناوەندیی کچانی هەولێر لە ساڵانی ١٩٤٧-١٩٤٨دا ئاهەنگی ئافرەتانی شارەکەی رێک دەخست و لە ئاهەنگی نهێنیی نەورۆز وتاری سیاسیی پێشکەش بەئاهەنگگێڕان دەکرد، لە ساڵی ١٩٤٨یشدا ئافرەتانی هان دەدا بۆ بەشداریکردن لەخۆپیشاندانەکانی راپەڕینە نیشتمانییەکەی کانوونی دووەمدا بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکەی (پۆرتسمۆپ) و لەو خۆپیشاندانانەدا وتاری سیاسیی پڕ جۆشی دەخوێندەوە و وردی ئافرەتانی پێ بەرز دەکردەوە.

خاتوو ساکینە لە ساڵی ١٩٤٩دا لە خانەی مامۆستایانی سەرەتایی لە شاری بەغدا وەرگیرا و لە ماوەی خوێندنەکەی بەشداریی لە چالاکییەکانی حزبی شیوعیدا کرد، وەک خۆپیشاندان و پێشکەشکردنی داواکاری بەناوی خێزانی بەندییە سیاسییەکان، کە (مووسا سولەیمان)ی خەباتگێڕی کاکی یەکێک لەوان بوو و لە بەندیخانەی بەغدا گیرابوو.

ئەم خاتوونە تێکۆشەرە لە ساڵی ١٩٥٢دا لە خانەی مامۆستایان دەرچوو و لە پایزی ئەو ساڵەدا بەمامۆستا لە شاری هەولێر دامەزرا. لە دوای ئەو کوشتارەی حکوومەتی نووری سەعید کە لە رۆژی ١٨/٦/١٩٥٣دا رووی دا و (مووسا سولەیمان)ی برا گەورەی شەهید کرا. خاتوو ساکینە بووە یەکەمین ئافرەتی هەولێری بۆ پێکەوەنانی رێکخستنی (کۆمەڵەی پارێزگاریکردن لە مافی ئافرەتان) لە شاری هەولێردا.

خاتوو ساکینە لە ساڵی ١٩٥٦دا لەسەر ئەو چالاکییە سیاسییەی دەینواند گیرا و، بەمە بووە یەکەمین ئافرەتی هەولێری لەسەر چالاکیی سیاسی بگیرێ. لە دوای بەرپابوونی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨دا بە یەکەمین سەرۆکی (کۆمەڵەی ئافرەتان) لە هەولێر هەڵبژێردرا و لە ساڵی ١١٩٦٣دا لەگەڵ تێکۆشەر هاشم عەبدوڵڵای هاوسەری گیرا و درا بەدادگای عورفی عەسکەری و ساڵێک حوکم درا، بەڵام جێبەجێ نەکرا و خرا ژێر چاودێریی پۆلیسەوە، لە ساڵی ١٩٨٤دا خۆی خانەنشین کرد و لە ساڵی ٢٠٠٥دا کۆچی دوایی کرد.

# ئەسعەد محەمەد حەوێزی
# "مام ئەسعەد"
# ١٩٢١ - ٢٠٠٥

كەریم شارەزا

ئەسعەد كوڕی حاجی محەمەد كوڕی ئەمین ئاغای حەوێزی، ناودار بە (ئەختەر)ی شاعیر و هونەرمەند، لە ناو خەڵكیدا بە (مام ئەسعەد) ناسراوە، لە ساڵی ١٩٢١دا لە گەڕەكی بەفریقەندی لە شاری كۆیە، شاری خەباتی نەتەوەیی و چینایەتیی چاوی بەژیان هەڵێناوە، لە خێزانێكی ئایین و ئەدەبپەروەر سەری هەڵداوە.

لە پایزی ساڵی ١٩٢٩دا چووەتە قوتابخانەی سەرەتایی كۆیە و لە ساڵی ١٩٣٧دا دەرچووە و چووەتە قوتابخانەی ناوەندی كە ئەو ساڵە بۆ یەكەم جار لە كۆیە كرابووەوە و لە



ساڵی ١٩٤١دا خوێندنەكەی تەواو كردووە و لەبەر دەستكورتی پێی نەكراوە بچێتە شاران و خوێندنی ئامادەیی و بەرزتر تەواو بكات.

لە دوای بڕانەوەی جەنگی دووەمی جیهانی، بزووتنەوەی نیشتمانی لە كوردستان و لە سەرجەم عێراق بەهێز بوو. (مام ئەسعەد)یش هەست و سۆزی نیشتمانی لەلا بەهێز بوو، بۆیە لە سەرەتای (ساڵی ١٩٤٦)ەوە چووەتە پاڵ بزووتنەوەی نیشتمانیی رزگاریخوازی كوردستانی رۆژهەڵات و كەوتە پاڵ كۆماری دیموكراتی كوردستان كە لە ٢٢/١/١٩٤٦دا بەسەرۆكایەتیی قازی محەمەد دامەزرا. كاتێكیش كە لە رۆژی ١٧/١٢/١٩٤٦دا ئەو كۆمارە ساوایەی كوردستان رووخێنرا. مام ئەسعەد لەگەڵ كوردە خەباتگێڕەكانی كوردستانی باشوور كە چوو بوونە پاڵ ئەو تاقیكردنەوە سیاسییەی كورد

گەڕایەوە کوردستانی عێراق و ماوەیەک لە ناو تەڵبەندێک لە دەشتی دیانە دەستبەسەر کران. چونکە ئەو زاتە چ فەرمانێکی حکومەتی نەبوو کە بەردرا گەڕایەوە شاری کۆیە و لە هاوینی ١٩٤٧دا چووە پاڵ حزبی شیوعی عێراق- ڕێکخستنی کوردستان و بووە کادیرێکی چالاکی ئەو حزبە مارکسییە. لەو ساوە چالاکییەکی زۆری لە ڕیزەکانی حزبەکەی نواند و لە هەموو لایەکی ناوچەی کۆیە و دەرەوەی بەکەسایەتییەکی شیوعی ناسراو چەند جار تووشی گرتن و ڕاوەدوونان بوو.

لە دوای کوودەتاکەی نوورەدین مەحموود، لە تشرینی دووەمی ١٩٥٢دا حکوومەت خۆی ئامادە کرد بۆ هەڵبژاردنێکی نوێی ئەندامانی پەرلەمانی عێراقی و لە ڕۆژی ١٩٥٣/١/١٧دا ئەو دەنگدانە دەستی پێ کرد. لەو دەمەدا حزبی شیوعی بەیاننامەیەکی دەرکرد و تێیدا هاتبوو: (تا بەند کراوە سیاسییەکان ئازاد نەکرێن نابێ هەڵبژاردن بکرێ).

لەو ڕۆژە (١٩٥٣/١/١٧) دا لە کۆیە خۆپیشاندانێکی گەورە لەلایەن حزبی شیوعییەوە ساز درا بۆ ڕێگەگرتن لە ئەنجامدانی هەڵبژاردنەکە. خەڵکێکی زۆر لە کرێکار و خوێندکار و سەرباز و ئافرەت بەسەرکردایەتیی مام ئەسعەد بەشدارییان تێدا کرد و مام ئەسعەد لەسەر جلەکانییەوە کفنێکی سپی مردووانی لەبەر کردبوو و دەمانچەی رووتی گرتبووە دەست، لە پێش خۆپیشاندەرە فیداکارەکان هێرشی بردە سەر سندووقی هەڵبژاردنەکە لە مزگەوتی گەورەی کۆیە و شکاندی، هەرچەندی حاکمی سەرپەرشتکاری هەڵبژاردنەکە فەرمانی دا بەپۆلیس تەقە لە خۆپیشاندەران بکەن، کەچی موفەوەزی پۆلیس (عەلی والی بەگ)ی ناسراو بە (عەلی قامچی ڕەش) بەقسەی حاکمی نەکرد و گوتی من فەرمانی سەر زارەکی جێبەجێ ناکەم، دەبێ لە بەڕێوەبەری پۆلیسی پارێزگاوە بەنووسین نووسراوی ڕەسمیم بۆ بێت ئەوسا جێبەجێی دەکەم. مام ئەسعەد، خۆپیشاندەران دوای شکاندنی سندووقەکەی مزگەوتی گەورە ڕوویان کردە سندووقەکەی دووەم لە مزگەوتی بایزاغا و ئەویشیان شکاند، ئینجا بڵاوەیان لێ کرد و مام ئەسعەد چووەوە ناو باخەکانی کۆیە و خۆی حەشار دا و نەهاتەوە ناو شار چونکە دەمێک بوو لە چنگ گرتن و چاودێریکردنی لەلایەن ئاسایشەوە لە دەشت و دەر دەژیا و خەباتی سیاسیی خۆی دەکرد و وەک قارەمانێکی فیداکار لە ناوچەکە دەناسرا.

مام ئەسعەد دوای شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ بەفەرمانبەر دامەزرا، دوا فرمانی، سەرۆکی چاودێران بوو لە بەڕێوەبەرایەتیی دەستەی کشتوکاڵ لە شاری هەولێر و لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو خانەنشین کرا و هەر لە هەولێر مایەوە تاکو لە ساڵی ٢٠٠٥دا لە تەمەنی ٨٤ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

# ئیبراهیم عومەر میکائیل کەلوڕی
# ١٩٢٧- ٢٠٠٧

**حاجی فاتیح دارەبەنی**

ئیبراهیم کوڕی عومەر میکائیل کوڕی لەشکرییە، لە ساڵی ١٩٢٧ لە گوند شاوەیس چاوی بە دنیا هەڵێناوە، لە عەشیرەتی (کەلوڕ)ە، لە سەرەتاوە لای مامۆستا شێخ محەمەدی برای دەچێتە بەر خوێندن لە حوجرەی فەقێیان لە مزگەوتی مەلا ساڵح لە هەولێر. ماوەی ساڵێک خەتمی قورئان دەکا. ئینجا دەچێتە مزگەوتی شێخ ئەبوبەکر لای موستەعیدەکان، کە ئەو کاتە مەلا مەجیدی گراوی لەوێندەر بووە، کە گەورە مستەعیدی شێخ موستەفای نەقشبەندی بووە، (عواملی جرجانی) تەواو دەکا، پاشان دەگەڕێتەوە لای مامۆستا مەلا شێخ محەمەدی برای، کە دەکاتە باوکی دکتۆر عەبدوڵڵا پەشێوی شاعیر، لەلای ئەو نووسراوی سەعدوڵلای گچکەی پێ دەخوێنێ، کە خۆی بە دەستنووس نووسیویەوە، خۆشی پەراوێزی بۆ نووسیوە (حاشیەی بۆ کردووە) لە ساڵی ١٩٤٤ دەگەڕێتەوە مزگەوتی شێخ مستەفای نەقشبەندی لای شێخ عەبدوڵڵا دەرس دەخوێنێ، هەرچەندە هاوتەمەن بووینە بەڵام زیرەکتر و بیر ڕووناکتر بووە و باوکی مامۆستای بووە، پیاوی زانا و ڕووناکبیری ئەوکات زۆر هاموشۆیان کردینە و چەند دەرسێکیش لای شێخ موستەفا دەخوێنێ و لە ساڵی ١٩٤٥ (سابونچی لە مووسڵ) شێخ عەبدوڵڵا و چەند قوتابییەکی دەنێرێتە قاهیرە بۆ خوێندن لە زانکۆی ئەزهەر، ساڵی ئایندە شێخ بە سەرکەوتوویی دەگەڕێتەوە لە پۆلی یەکەمی کۆلیژی شەریعە لە زانکۆی ئەزهەر، ئینجا شێخ دەبێتە فەرمانبەر لە دیوانی پاشایی لە بەغدا، هەر ئەو چوونەی شێخ بۆ زانکۆی ئەزهەر وای کردووە، کە مامۆستا ئیبراهیم بیر لە چوونە زانکۆی ئەزهەر بکاتەوە، لە ساڵی ١٩٤٦ مامۆستا ئیبراهیم بۆ خوێندن دەچێتە بەغدا لە مزگەوتی حوسێن پاشا لەلای مامۆستا مەلا محەمەدی قزڵجی دەخوێنێ، ئەو مامۆستا بەڕێزە کاتی خۆی سکرتێری سمکۆ بووە لە شۆڕشەکانی وی بەشداری کردووە، مامۆستا قزڵجی خۆی دەگەیەنێتە ئەزهەر و پاشان دەگەڕێتەوە بەغدا، دەبێتە گەورە زانا و ناسراوی کورد، لەو کاتەش مامۆستا هەژار لە مەهاباد دێتە بەغدا و لەگەڵ شوکور مستەفا، کە ئەو قوتابی بووە، سەردانی مامۆستا دەکەن، شەوەک لای دەمێننەوە، لەو ماوەیەدا مامۆستا ئیبراهیم زوو زوو سەر لە شێخ عەبدوڵلای نەقشبەندی لە دیوانی پاشایەتی دەدا، زۆر ڕێزی دەگری هەم قوتابی خۆی بووە، لەو کات و ساتی وەزارەتی ئەوقاف بڕیارێک دەردەکات، کە چەند قوتابییەک بنێرێتە زانکۆی ئەزهەر، کە شەش کەس هەڵبژاردران:

١- شێخ عەبدوڵلای نەقشبەندی
٢- ئیبراهیم عومەر
٣- ئیسماعیل عومەر سنجاوی

لەگەڵ سێ کەسی دیکە، لە پاش چوار ساڵەی خوێندن لە کۆلیژی شەریعە لە ساڵی ١٩٥٢ دەگەڕێنەوە، مامۆستا ئیبراهیم داواکاریش بەجێ دێڵێ بۆ خوێندنی باڵا، پاشان ناوی

دەردەچێ لە بەشی (القانون المقارن) بەڵام ڕێی پێ نادەن، پاشان لە شاری سلێمانی لە ئامادەیی کوڕان دادەمەزرێ، زمانی عەرەبی دەڵێتەوە، لە ساڵی ١٩٥٣- ١٩٥٤ دەگوازرێتەوە شاری هەولێر لە ئامادەیی کوڕانەی هەولێر زمانی عەرەبی دەڵێتەوە، ئەوکات ڕۆژنامە هەولێر، کە کۆمەڵەی مامۆستایانی هەولێر دەریان کردووە، مامۆستا حوسێن ڕەشوانی سەرپەرشتیی بەشە عەرەبییەکەی کردووە، مامۆستا عیزەدین فەیزی سەرپەرشتی بەشە کوردییەکەی کردووە، داوایان لە مامۆستا ئیبراهیم کردووە، کە لە بەشە عەرەبییەکەی وتار بڵاو بکاتەوە، ئەویش سێ وتار بڵاو دەکاتەوە، لێرە نووسەرایەتی مامۆستا دەست پێ دەکات و هەر لەسەر ناوەڕۆکی ئەم وتارانە مامۆستا دەگوازنەوە بۆ کفری، لەوێندەر یەکێک لە کچە قوتابییەکانی خۆی بەناوی (بەدیعە ساڵح)، کە باوکی بەرەچەڵەک لە (مەغنییەکانی سلێمانی بووە) - خێزانێکی زۆر مووسڵمان بوون- خوازبێنی دەکا، ژیانی خێزانداری پێک دێنێ و لە ساڵی ١٩٥٦ هەتا ١٩٥٩ مامۆستا گیوی، چەند وتارێکی لە گۆڤاری هەتاو بڵاو دەکاتەوە، مامۆستا لە کەرکووک لە یادی ١٤ ی تەمووز وتارێک دەنووسێ لە گۆڤاری (صوت الاحرار) لە ١٩٥٩/٧/١٧ بڵاو دەکرێنەوە، لە ١٩٦١ - ١٩٦٣ لە دادگای چەمچەماڵ فەرمانبەر بووە، لەسەر ڕاپۆرتی قائیمقامی چەمچەماڵ، کە گوایە مامۆستا شاعیری پارتییە، زیندانی دەکرێت، دەنێردرێتە (حلە) لە ١٩٦٤ ڕەها دەکرێت دەگەڕێتەوە چەمچەماڵ، زۆربەی کارەکانی دادگا دەکەوێتە ئەستۆی، مامۆستا ٣٦ وتاری لە ئێستگەی ڕادیۆی بەغدا بەشی کوردی پێشکەش کردووە، وتارەکانی ئایینی بووە، مامۆستا لە ١٩٦٨/١/٢٠ دەکرێتە دادوەری شەرعییەی سلێمانی تا ١٩٧٨/٨/١. مامۆستا ئەوکاتیش هەر بەردەوام بووە لە نووسین و وتارەکانی لە ڕۆژنامەی ڕاپەڕین و گۆڤاری شارەوانیی سلێمانی بڵاو کردۆتەوە، لە ١٩٧٨/٨/١ دەگوازرێتەوە هەولێر دەبێتە دادوەری شەرعییەی هەولێر، بە فەرمانێک لە ڕۆژنامەی ڕوداوەکانی عێراق لە ١٩٨٥/٨/١ خانەنشین دەکرێ، پاشان مامۆستا دەبێتە پارێزەری شەرعی لە هەولێر، پاشان بە فەرمانی پەرلەمانی کوردستان دەیگەڕێننەوە دادگای هەولێر شوێنی خۆی لە ١٩٩٧/٨/١ لەبەر بوونی تەمەنی بە ٦٣ ساڵ خانەنشین دەکرێ، مامۆستا نووسەرێکی بە توانا و لەسەرخۆ و ورد بوو، مامۆستا ئەو نووسراوانەی بە چاپی گەیاندوون ئەمانەن:

١- زەردەشت ١٩٦٦ معارف - بەغدا.
٢- کورد لە ئایین و مێژوودا ١٩٧٢ ڕاپەڕین - سلێمانی.
٣- پیتۆڵی دانانی ڕەوای ئیسلام ١٩٨٩ سۆمەر - بەغدا.
٤- ڕاڤەی کورد، تا سورەی اسراء ١٩٩١ زانکۆی سەلاحەدین.
٥- ڕاڤەی کورد بۆ هەموو قورئان ٢٠٠٠ پەروەردەی هەولێر.
٦- بەشی باری کەسی و سزاکان ٢٠٠١ زانکۆی سەلاحەدین.
٧- بەشی کردەوەکان ٢٠٠١ زانکۆی سەلاحەدین.
٨- ژیانی پێغەمبەر ٢٠٠٥، پەروەردەی هەولێر.

مامۆستا لە ٢٠٠٧/٣/٢٦ کۆچی دوایی کرد.

**سەرچاوەکان:**

١- لە نامیلکەیەکی بچووک کە مامۆستا خۆی نووسیویەتی بەناوی (کورتەیەکی ژیانی خۆم) لە ٢٠٠٥ لە چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە لە چاپ دراوە.

٢- لەگەڵ مامۆستا و مامی بەڕێزم (مەلا ئیبراهیم) خۆشەویستییەکی تایبەتمان بۆ یەکتر هەبوو سێ لەو نووسراوانەی کە چاپی کردوون پێشکەشی کردیمە، سەرەڕای ئەوەش یەک ڕەچەڵەکین لە باپیرە گەورەمان (لەشکری) دەگەینەوە یەک.

٣- مامۆستا لەوانەیە لە زۆر جێگای تر خوێندوویەتی، بەڵام لە نامیلکەکەی بە کورتی باسی کردووە، دەنا چەند جار لە خودی خۆی بیستوومە کە ماوەیەک لەلای مامۆستا (مەلا کەریم) لە سێبیرانی گەورە خوێندوویەتی.

٤- حاجی جەمیلی برازای یارمەتیی داوم.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە (٢٧)ی ساڵی ٢٠٠٧ بڵاو بۆتەوە.



# زانایانی ئایینی ئیسلام لە شاری هەولێر

**فاتیح یاسین مودەڕیس**

**پێشەکی:**

شاری هەولێر هەر لە سەرەتاوە بەپێی سەدە و سەردەم و چاخە یەک لە دوا یەکەکان، لە سەردەمی هەموو حوکمڕانەکاندا وەکو شارەکانی دیکەی دنیا پەرەی سەندووە و خەڵکەکەش سەرجەم، خەسڵەت و کلتووری ڕەسەنایەتی کوردییان پیادە کردووە. بەزمانی کوردی زگماکی خۆیان دواون و کاروباری خۆیان بەڕێوە بردووە.

خوێندن و نووسین یەکێک بووە لەو بارانەی، کە بەشێوەیەکی بەردەوام بایەخیان پێ داوە. جگە لەوەی کە زانایانی شاری هەولێر گەلێ شار و دێهات و دەوڵەتیان بڕیوە بۆ ئەوەی ئاستی زانستییان بەرەو پێشەوە ببەن، چەندین کەڵەزانای گەورەش ڕوویان لەو شارە دێرینە کردووە و لێی فێر بوون و پاشان لە قوتابخانە ئایینیەکان دەرسیان وتووەتەوە.

خەڵکی هەولێر بەمەبەستی برەودان بەخوێندن، چەندین قوتابخانەیان لە ناو شاری هەولێر و تەواوی دەڤەرەکانی کردۆتەوە و بەسەدان زانای لێهاتوو و کارامەیان تێدا پێ گەیاندووە. تەنانەت چەندین زانا و مامۆستا و مەلای ئایینیی شارەکانی دەوروبەر و ناو عێراق و دەرەوەی عێراق، بەتایبەت ئێران ئیجازەی زانستی یان لەسەر

دەستی زانایانی ئەو شارە وەرگرتووە.

شایانی ئاماژە پێکردنە سەبکی لە کتێبەکەیدا بەم شێوەیە باس لە خەڵکی هەولێر دەکات و دەڵێت: "بەم شێوەیە زانا و ناودارانی خەڵکی هەولێر سەری وڵاتەکەیان بەرز کردۆتەوە. چەندین چیا و شاخ و داخ و ناوچەیان بریوە، نیشتمان و سەروەت و سامان و منداڵەکانیان جێ هێشتووە، لە پێناو زێدەکردنی زانست بۆ ئەوەی بگەن بەپلە و پایەی زانایان. ئەوەتا پاش سەدان ساڵ ئەو شارە دێرینە شانازی بەزانا و کەڵەپیاوەکانی دەکات".

لە راستیدا ئەو شارە هەر لەدێرزەمانەوە هەر لەو کاتەی ئاشنا بووە بەپەیامی پیرۆزی ئیسلام، بۆتە قوتابخانەیەکی نموونەیی سەدان و هەزاران کە لە زانای لێهاتوو و بلیمەتی لێ هەڵکەوتووە. بەشێوەیەک زانایانمان بوونەتە سیمایەکی دیار و بەرچاوی کەلتوور و خاک و ژیانی ئێستا و داهاتوومان. بۆیە پێویستە ئێمە ئیمڕۆ شانازی بە رابردووی خۆمان و شارەکەمان بکەین و بەپێی توانا ئاشناتان بکەین لەگەڵ کەڵەزانا و ناودارانی خەڵکی هەولێری دێرین و پایتەخت:

١- سەفیەدین ئەربیلی ناوی ئیبن موبارەکەو مامی ئیبن مستەوفییە (٥٨٦-٦٣٧ک/ ١١٩٠-١٢٣٩ز).

٢- ئەبو عەبدوڵڵا محەمەد بن عەبدولعەزیز ئەربیلی ٥٨٠ک/١١٨٤ز.

٣- ئیبراهیم کوڕی محەمەد کوڕی عەقیل شارەزووی ناسراو بە ئەبوئیسحاق شارەزووی ئەربیلی دیمەشقی (٤٨٤ک- ١٠٩١ز).

٤- ئەبوسەعادات شارەزووی ئەربیلی مووسڵی، ناوی عەبدولقادر کوڕی عەلی (٥٣٧- ٥٧١ک/ ١١٤٢-١١٧٥ز).

٥- تەها کوڕی بەشیر کوڕی محەمەد کوڕی خەلیل هەولێری ٥٧٧ک/١١٨١ز.

٦- حەسەن کوڕی ئەبی حەسەن محەمەد ئەربیلی کوردی ٥٥٨ک/ ١١٦٢ز.

٧- عەبدولرەحمان کوڕی مەحموود کوڕی عەلی ئیبراهیم ئەربیلی ٥٩٣ک/١١٩٦ز.

٨- محەمەد کوڕی حەسەن ئەبوبەکر کوردی (٥١٠ک/١١١٦ز).

٩- ئەبومحەمەد عەبدوڵڵا کوڕی محەمەد کوڕی یونس حەمیدی ناسراو بە (ابن الاستاذ الكردي الاربيلي) ٥١٥-٦٠٠ک/ ١١٢١- ١٢٠٣ز).

١٠- ئەبوعومەر عوسمان کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی محەمەد کوڕی محەمەد کوڕی عەلی کوڕی غەیاس شێخ لەتیف ناسراو بە (خەتیب ئەبوعومەر ئەربیلی) (٥٣٢-٦٠٨ک/ ١١٣٧-١٢١١ز).

١١- محەمەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی موسلیم کوڕی سەلمان ئەربیلی (٥٦٠-٦٣٣ک/١١٦٤-١٢٣٥ز).

١٢- ئیبراهیم کوڕی موسلیم کوڕی سەلمان ٥٣٩-٦٢٥ک/١١٤٢-١٢٢٧ز).

١٣- ئەبوحەسەن عەلی کوڕی ئیسماعیل کوڕی موسلیم کوڕی سەلمان ئەربیلی ناسراو بە ئەبوحەسەن بەغدادی (٥٥٩-٦١٨ک/١١٦٣-١٢٢١ز).

١٤- حوسێن کوڕی ئیبراهیم هەزنی بەنازناوی" شەرەفەدین ئەربیلی" (٥٦٨-٦٥٦ک/ ١١٧٢-١٢٥٨ز).

١٥- حوسێن کوڕی عەلی کوڕی قاسم شارەزووری باوکی خەڵکی شاری هەولێرە نازناوی ئەبو عەبدوڵڵا (٥٥٧ک/١١٦١ز).

١٦- سەعید کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی قاسم شارەزووری بە نازناوی "ئەبو رەزا" خەڵکی شاری هەولێرە (٥٩٦ک/١١٩٩).

١٧- شبلی ئیبن خەلەکان ناوی شبلی ئیبن جونەید کوڕی ئیبراهیم کوڕی خەلەکان نازناو ئەبوبەکر کوردی ئەربیلی (٥٧٦-٦٥٣/ ١١٨٠-١٢٥٥ز).

١٨- ئەلیاس کوڕی جامع کوڕی عەلی ئەربیلی.

١٩- عەبدولقادر کوڕی ئەمیری کوڕی بەختیار.

٢٠- عوسمان کوڕی عەبدولڕەحمان کوڕی عوسمان کوڕی مووسا کوڕی ئەبی نەسر ئەلنەسر کوردی شارەزووری شەرخانی ئەربیلی ناسراو بە (ئیبن سەلامی شارەزووری).

٢١- سالار کوڕی حەسەن عومەر کوڕی سەعید ئەربیلی شافیعی.

٢٢- ئەمینەدین ئەربیلی ناوی (ئەبوحەسەن عەلی کوڕی عوسمان کوڕی عەلی کوڕی سلێمان ئەربیلی)یە.

٢٣- شێخ شەرەفەدین ناوی (یەعقوب کوڕی محەمەد کوڕی حەسەن ئەربیلی)یە.

٢٤- عەبدوڵڵا کوڕی ئەحمەد کوڕی حوسێن کوڕی ئەحمەد

کوڕی مەعال ناسراو بە (ئیبن خەباز ئەربیلی).
٢٥- شێخ سدیق کوڕی بەدر ئەربیلی کوردی.
٢٦- تەها کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەبی بەکر کوڕی ئەحمەد کوڕی بەختیار ئەربیلی هەزبانی شافیعی.
٢٧- ئەحمەد کوڕی عەلی کوڕی غالب بەنازناوی (مەجدەدین ئەربیلی)یە.
٢٨- عەبدوڵلا شێخ حوسێن کوڕی ئیبراهیم هەزبانی ئەربیلی.
٢٩- محەمەد کوڕی عەلی کوڕی جامع. ناسراو بە (ئیبن جامع).
٣٠- تەقیەدین عومەر یەعقوب کوڕی عوسمان ئەربیلی.
٣١- محەمەد کوڕی خەلیل کوڕی ئیبراهیم کوڕی شاهەنشا کوڕی حەبیب کوڕی سرور کوڕی عەلی کوڕی شاد کوڕی خەلیل کوڕی عەبدوڵلا ئەربیلی سۆفی.
٣٢- مەجدەدین ئەبوعەباس ئەحمەد کوڕی عەلی کوڕی غالب ئەربیلی.
٣٣- ئیبراهیم کوڕی مەسعوود کوڕی ئیبراهیم کوڕی مەسعوود کوڕی ئیبراهیم کوڕی سەعید ئەربیلی.
٣٤- ئەبوعەباس کوڕی شوجاع ناوی (ئەحمەد کوڕی مونعە ئەربیلی).
٣٥- ئەبونەسر ئەحمەد کوڕی عومەر کوڕی نەسر ئەربیلی.
٣٦- ئەبومحەمەد عەبدوڵلا کوڕی ئیبراهیم کوڕی موسلیم ناسراو بە (عەبدوڵلا بن ئیبراهیم).
٣٧- عەلی کوڕی ئەحمەد کوڕی زەفر کوڕی ئەحمەد ئەربیلی سۆفی.
٣٨- عەللامە شەعبان کوڕی ئەبی بەکر کوڕی عومەر ئەربیلی.
٣٩- عەللامە ئەحمەد کوڕی عەبدوڵلا کوڕی حوسێن کوڕی عەلی ئەربیلی.
٤٠- عوسمان کوڕی ئەبی بەکر کوڕی سەعید ئەربیلی لە میسر کۆچی دوایی کردووە.
٤١- حوسێن کوڕی یەحیا کوڕی حوسێن کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەبی بەکر کوڕی خەلەکان ئەربیلی.
٤٢- ئەبوبەکر کوڕی محەمەد کوڕی ئیبراهیم نەجمەدین.
٤٣- شێخ ئەحمەد خەتیبی ئەربیلی.
٤٤- عەبدوڵلا کوڕی ئەسعەد سەدرەدین کوڕی عوبێدوڵلا کوڕی سیفەتوڵلا کوڕی ئیبراهیم کوڕی حەیدەری دووەم کوڕی ئەحمەدی ئەحمەدی یەکەم کوڕی حەیدەری یەکەم.
٤٥- عەللامە سیبغەتوڵلا کوڕی ئەسعەد سەدرەدین کوڕی عوبێدوڵلا کوڕی سیبغەتوڵلا.
٤٦- شێخ ئیبراهیم فەسیح حەیدەری.
٤٧- عەبدولقادر سیدقی حەیدەری.
٤٨- عەبدولغەفوور کوڕی ئەسعەد سەدرەدین کوڕی عوبێدوڵلا کوڕی سیبغەتوڵلا حەیدەری.
٤٩- محەمەدئەمین عەبدولغەفوور حەیدەری.
٥٠- ئیبراهیم عاسم کوڕی ئیبراهیم کوڕی عاسم کوڕی ئیبراهیم کوڕی سیبغەتوڵلا کوڕی ئیبراهیم کوڕی حەیدەری دووەم کوڕی ئەحمەدی یەکەم کوڕی حەیدەری یەکەم.
٥١- مەلا شەفیع بلباس.
٥٢ مەلا مستەفا هەمزە خدر ناسراو بە (مەلا مستەفای لەک).
٥٣- مەلا قادر قەتەوی.
٥٤- عەللامە ئیبن ئادەم محەمەد تەیب ئەڵلا.
٥٥- ئەبوبەکر میرۆ ستەمی ناوی (ئەبوبەکر کوڕی محەمەدە).
٥٦- شێخ عەبدوڵلا شێخ مەحموودی.
٥٧- حاجی مەلا محەمەدئەمین کونەفلوسەیی.
٥٨- شێخ مستەفا زیارەتی.
٥٩- عەللامە سیبغەتوڵلا زیارەتی.
٦٠- شێخ عەبدولرەحیمی زیارەتی.
٦١- مەلا محەمەدی زیارەتی کوردی.
٦٢- شێخ محەمەد کوڕی عەبدوڵلا زیارەتی.
٦٣- عەبدوڵلا کوڕی شێخ محەمەد کوڕی ئیبراهیم ناسراو بەشێخ عەبدوڵلای کاکی جەلی.
٦٤- عەبدولڕەحمان جەلی ناوی (عەبدولڕەحمان کوڕی عەبدوڵلا کوڕی محەمەد مەلازادە شواشانی)یە.
٦٥- شێخ عەبدوڵلا کوڕی شێخ عەبدولڕەحمان کوڕی عەبدوڵلا جەلی کوڕی محەمەد.
٦٦- حاجی شێخ ئەسعەد جەلی ناوی (کوڕی شێخ عەبدوڵلا کوڕی شێخ عەبدولڕەحمان جەلی)یە.
٦٧- مەلا عەلی شێخ وەتمان.
٦٨- مەلا ئادەم محەمەد.

٦٩- حاجی مەلا عەبدوڵڵا سێیەمی جەلی زادە كە ناوی (عەبدوڵڵا كوڕی ئەسعەد كوڕی عەبدوڵڵا كوڕی عەبدولرەحمان كوڕی عەبدوڵڵا)یە.
٧٠- محەمەد عەبدوڵڵا جەلی زادە ناسراو بە (جەنابی مەلای).
٧١- شێخ عەبدوڵڵا كوڕی شێخ سلێمان كوردی ئەربیلی.
٧٢- مەلا مەحموودی ئەربیلی.
٧٣- شێخ وەلی ئەربیلی.
٧٤- مەلا بەكر مەلا وەلی ئەربیلی.
٧٥- هیدایەتوڵڵا كوڕی شێخ عەبدولكەریم كوڕی شێخ ئیسماعیل كوڕی عەبدولغەنی ئەربیلی- بەرەگەز هیندییە.
٧٦- شێخ محەمەدئەمین كوڕی شێخ عەبدولفەتاح فەتحوڵڵا ئەربیلی كوردی.
٧٧- مەلا ئیسحاق ئەفەندی كوڕی ئەحمەد.
٧٨- مەلا عەبدولڕەحمان ئەفەندی كوڕی مەلا ئیسحاق.
٧٩- مەلا محەمەد عەبدولكەریم سدیقی.
٨٠- محەمەد ئەفەندی كوڕی حاجی حەویز.
٨١- حاجی مەولود ئەفەندی كوڕی لوتفەڵڵا ئەفەندی كوڕی حاجی داود ناسراو بە (حەنەفی زادە).
٨٢- شێخ نیعمەتوڵڵا كوڕی شێخ عەبدولكەریم (هەزار كانیانی).
٨٣- ئەبوبەكر كوڕی عوسمان ناسراو بە (كوچك مەلا).
٨٤- ئەبوبەكر كوڕی حاجی عومەرئەفەندی ناسراو بە (كوچك مەلای یەكەم).
٨٥- مەلا عەبدوڵڵا بورهانی.
٨٦- مەلا ساڵح كۆزەپانكەیی.
٨٧- مەلا عوبێد سەریێری.
٨٨- مەلا محەمەد شێروانی.
٨٩- مەلا محەمەدئەمین سوێری.
٩٠- محەمەد خەتی شێخ سلێمانی.
٩١- شێخ عوسمان ئەفەندی مارانی.
٩٢- عومەر كوڕی ئەحمەد ناسراو بە (عومەر فەندی خەیلانی).
٩٣- حاجی مەلا ئەسعەد ئەفەندی خەیلانی ڕەواندزی.
٩٤- عەبدولكەریم كوڕی ئەسعەد ئەفەندی كوڕی عومەر ئەفەندی خەیلانی.
٩٥- عیسا كوڕی ئەحمەد كوڕی میكائیل (خەڵكی ناوچەی خۆشناوەتییە).
٩٦- عەللامە عیسا هەرتەلی.
٩٧- مەلا فەتحوڵڵا هەرتەلی.
٩٨- عەبدوڵڵا كوڕی عەللامە محەمەد خەتی شێخ سلێمانی ناسراو بە (عەبدوڵڵا خەتی).
٩٩- مه لا عەبدولفەتاح كوڕی مەلا مەحموود خەتی.
١٠٠- حاجی مەلا ئیسماعیل ماویلی كوڕی خەلیفە محەمەد كوڕی مەلا عەبدوڵڵا ماویلییە.
١٠١- مەلا عەبدوڵڵا كوڕی مەلا ئیسماعیل ماویلی.
١٠٢- ڕەسووڵ كوڕی مەلا ئەحمەد كوڕی مەلا قادر شەوكی ناسراو بە (ڕەسووڵ شەوكی).
١٠٣- مەلا محەمەد كوڕی مەلا ڕەسووڵ شەوكی.
١٠٤- مەلا ئەحمەد كوڕی مەلا محەمەد شەوكی.
١٠٥- عەللامە عوسمان كوڕی ئەحمەد كوڕی محەمەد شەوكی.
١٠٦- مەلا ئەحمەدی ئاشۆكانی.
١٠٧- مەلا عەبدوڵڵا گراوی.
١٠٨- مەلا ئیسماعیل سووسەیی.
١٠٩- مەلا ساڵح جۆلەمێرگی.
١١٠- مەلا یوسف سووچی.
١١١- مەلا سابیر نازەنینی.
١١٢- مەلا محەمەد ئەمین باڵەك.
١١٣- حاجی مەلا عومەر كوڕی مەلا ساڵح كەمبەدی.
١١٤- مەلا سدیق كوڕی مەلا ساڵح عومەر كەمبەدی.
١١٥- حاجی مەلا ساڵح كوڕی مەلا حاجی عومەر كەمبەدی.
١١٦- محەمەد شەقلاوەیی.
١١٧- تاهای شەقلاوەیی.
١١٨- مەلا حوسێن ئاكۆیی كوردی.
١١٩- محەمەد قازی ماوەرانی كوردی.
١٢٠- شێخ تەها سورسورەیی.
١٢١- مەلا ئیبراهیم دۆغرەمەچی.
١٢٢- عوسمان ئەفەندی كوڕی ئەبی بەكر عومەر كوڕی ئەبی بەكر كوڕی عوسمان كوڕی شێخ شەمسەدین.
١٢٣- حاجی عومەر ئەفەندی كوڕی ئەبوبەكر ناسراو بە (كوچك مەلا).

١٢٤- مەلا محەمەدی هەرشەمی.
١٢٥- ئەبوبەکر محەمەد عەبدوڵلا هەرشەمی ناسراو (بە غەیاسەدین).
١٢٦- شێخ بەهائەدین محەمەدئەمین.
١٢٧- شێخ عەبدولڕەحمان کوڕی شێخ ئەبوبەکر کوڕی مەلا محەمەد هەرشەمی.
١٢٨- شێخ مستەفا کوڕی شێخ ئەبوبەکر کوڕی مەلا محەمەد کوڕی مەلا عەبدوڵلا هەرشەمی.
١٢٩- ئیسماعیل مستەفا عەبدەلانی.
١٣٠- عەللامە عەبدولقادر عەبدوڵلا ئیسماعیل مستەفا عەبدەلانی کوردی.
١٣١- عەبدوڵلا مستەفا عەبدوڵلا مەحموود عەبدەلانی کوردی.
١٣٢- مەلا ئیبراهیم عەبدەلانی.
١٣٣- عەللامە ئەحمەد گراوی.
١٣٤- مەلا ڕەسووڵ کوڕی مەلا ئەحمەد ڕەسووڵ گراوی.
١٣٥- مەلا ساڵح مەلا عومەر ئەحمەد گراوی.
١٣٦- حاجی مەلا محەمەدئەمین کوڕی مەلا شێخ محەمەد کوڕی مەلا داود کوڕی مەلا عەبدوڵلا کوڕی مەلا حوسێن.
١٣٧- حاجی مەلا عەبدوڵلا کوڕی حاجی محەمەدئەمین.
١٣٨- حاجی مەلا فائیز.
١٣٩- مەلا عەبدولمەجید مەلا سەعید.
١٤٠- مەلا ئیسماعیل کوڕی محەمەد ناسراو بە (ناقص).
١٤١- مەلا عوسمان کوڕی مەعرووف گەردی.
١٤٢- مەلا عەلی باداوەیی.
١٤٣- مەلا سادق ئەفەندی.
١٤٤- مەلا تۆفیق (ئەلئیمام).
١٤٥- حاجی مەلا ئیبراهیم.
١٤٦- مەلا عەبدوڵلای سوور (یەکێکە لە زانایانی هەرتەل).
١٤٧- مەلا ئیبراهیم دۆڵەبەکرەیی ناوی (ئیبراهیم کوڕی ساڵح کوڕی حاجی مستەفا قارەمان).
١٤٨- مەلا ئەحمەد فەقێ محەمەد ئاشۆکانی.
١٤٩- مەلا مەسعوود مەلا ئەحمەد ئاشۆکانی.
١٥٠- مەلا حوسێن کوڕی فەقێ محەمەد ئەحمەد کوڕی عەزیز کوڕی ڕەسووڵ (گەردی) ئاشۆکانی.
١٥١- حاجی مەلا سلێمان ئاشۆکانی.
١٥٢- حاجی مەلا مستەفا کوڕی حاجی مەلا سلێمان کوڕی فەقێ محەمەد کوڕی ئەحمەد کوڕی عەزیز کوڕی ڕەسووڵ گەردی.
١٥٣- حاجی مەلا عەبدوڵلا بەحرکەیی.
١٥٤- مەلا محەمەدئەمین کوڕی حاجی مەلا سلێمان.
١٥٥- مەلا عەبدولقادر کوڕی حاجی مەلا سلێمان.
١٥٦- مەلا ئەحمەد کوڕی حەسەن کوڕی حەمک کوڕی محەمەد کوڕی ئەحمەد کوڕی حەمک (پیراوی) ناسراو بە (مەلا ئەحمەدی سائم دەهر).
١٥٧- مەلا سەعید کوڕی مەلا ئەحمەد سائیم.
١٥٨- مەلا شەریف کوڕی مەلا ئەحمەد سائیم.
١٥٩- مەلا عەبدولقادر ئیبراهیم سورێژی.
١٦٠- مەلا سادق فەرهادی.
١٦١- مەلا سەعید فەرهادی.
١٦٢- مەلا شێخ مەعرووف (جلبە سەری).
١٦٣- مەلا حەسەن باقرتی.
١٦٤- مەلا عەبدولکەریم حاجی مستەفا شورەزرتکەیی.
١٦٥- مەلا تەیب کوڕی مەلا ئەحمەد سائیم.
١٦٦- مەلا قادر مەلا ئەحمەد سائیم.
١٦٧- مەلا ساڵح مەلا ئەحمەد سائیم.
١٦٨- مەلا ئیسماعیل گردعازەبانی.
١٦٩- شێخ تەها کوڕی شێخ عەلی بالیسانی.
١٧٠- شێخ عەلی کوڕی شێخ تەها بالیسانی.
١٧١- شێخ عومەر کوڕی شێخ عەلی بالیسانی.
١٧٢- مەلا محەمەد شێخ تەها بالیسانی.
١٧٣- مەلا ئەبوبەکر کوڕی شێخ تەها بالیسانی.
١٧٤- مەلا محەمەدئەمین بالیسانی.
١٧٥- مەلا قادر مەلا محەمەد ئەمین بالیسانی.
١٧٦- مەلا مستەفا بالیسانی ناسراو بە (فازل).
١٧٧- مەلا ئەحمەد توتمەیی.
١٧٨- مەلا محەمەد عەبدوڵلا شێروانی.
١٧٩- مەلا محەمەد کوڕی مەلا حەسەن دێرە بروشەیی.
١٨٠- مەلا عەبدوڵلا دێرە بروشەیی.
١٨١- حاجی مەلا سلێمان کوڕی مەلا عەبدوڵلا مەلا محەمەد دێرە بروشەیی.

١٨٢- مەلا تاهیر مەلا محەممەد.
١٨٣- دکتۆر ئەحمەد شێخ محەممەد بالیسانی.
١٨٤- مەلا ئیبراهیم بالیسانی.
١٨٥- مەلا عەلی مەلا محەممەد.
١٨٦- مەلا سەید عەزیز کوڕی سەید حوسێن.
١٨٧- مەلا جەمیل عەلی قازی.
١٨٨- مەلا ئیبراهیم خەتی.
١٨٩- مەلا عومەر تەرجانی.
١٩٠- مەلا محەممەد قیرژەیی.
١٩١-مەلا بەهائەدین کوڕی ئەحمەد عەبدوڵڵا خەتی.
١٩٢- مەلا ئیسماعیل کوڕی عەلی کوڕی مەلا عەبدولقادر کوڕی مەلا مەعرووف سوسەیی.
١٩٣- مەلا تاهیر کوڕی مەلا ئەبوبەکر سوسەیی.
١٩٤- حوسێن شێخ سەعدی فەیزوڵڵا.
١٩٥- مەلا مەحموود بەربیانی.
١٩٦- مەلا عەبدولقادر کوڕی ئەحمەد.
١٩٧- مەلا سەعید کوڕی مەلا عەبدوڵڵا.
١٩٨- مەلا سەعید مەلا سلێمان ئۆمالی.
١٩٩- حاجی مەلا عەبدوڵڵا سەربیری.
٢٠٠- مەلا عومەر کوڕی مەلا ئیسماعیل گردلانکی.
٢٠١- مەلا ئیسماعیل پیرداودی.
٢٠٢- مەلا محەممەدئەمین سوێری.
٢٠٣- حاجی مەلا عەبدوڵڵا کوڕی تەها کوڕی حەسەن.
٢٠٤- مەلا عەبدولقادر کوڕی ئیبراهیم سورێژی.
٢٠٥- حاجی شێخ مەلا عەبدولکەریم بەرزنجی.
٢٠٦- شێخ محەممەد عەبدولکەریم.
٢٠٧- مەلا عەبدولقادر مەولوود سێگردکانی.
٢٠٨- مەلا مەعرووف رەسووڵ شێراوەیی.
٢٠٩- حاجی مەلا ئیسماعیل جدیدەیی.
٢١٠- حاجی مەلا یەحیا کوڕی مەلا عەلی
٢١١- مەلا عەبدولقادر ئیسماعیل ماجیدی.
٢١٢- مەلا مستەفا کوڕی سەعید.
٢١٣- حاجی مەلا سەعید مەلا مستەفا مەلا سەعید.
٢١٤- مەلا محەممەد کوڕی مەلا سەعید کوڕی مەلا مستەفا کوڕی مەلا سەعید باغەمرەیی.
٢١٥- مەلا سابیر کوڕی حەسەن دارەتوویی.
٢١٦- حاجی مەلا عەبدولواحید کوڕی حاجی عەبدولقادر کوڕی حاجی ئیسماعیل دارەتوویی.
٢١٧- مەلا شەهاب کوڕی حەمەد (خەڵکی باغەمرەیە).
٢١٨- مەلا خورشید دارەتوویی.
٢١٩- مەلا مەحموود مەرزیخی.
٢٢٠- حاجی مەلا عەبدوڵلای مەمی خەلان.
٢٢١- حاجی مەلا ئەحمەدی مەمی خەلان.
٢٢٢- مەلا مەعرووف قرشاقلویی.
٢٢٣- مەلا تاهیر مەلا مەعرووف.
٢٢٤- مەلا تەها قرشاقلویی.
٢٢٥- مەلا عەبدوڵڵا مەلا تەها قرشاقلویی.
٢٢٦- مەلا عەبدولڕەحمان مەلا تەها قرشاقلویی.
٢٢٧- حاجی مەلا ئەبوبەکری کۆیی.
٢٢٨- مەلا عەزیز کونەفلوسەیی.
٢٢٩- مەلا عوسمان کوڕی موفتی.
٢٣٠- مەلا سەید حوسێن.
٢٣١- مەلا سەید حوسێن کوڕی سەید محەممەدئەمین قولتەپەیی.
٢٣٢- مەلا شێخ محەممەد کوڕی عومەر شاوێسی.
٢٣٣- مەلا محەممەد شەریف ئەفەندی مەهری.
٢٣٤- مەلا خەلیل ترپەسپیانی دووسەرەیی.
٢٣٥- مەلا خدر کوڕی مەلا ئەحمەد دەشتی.
٢٣٦- مەلا محەممەدئەمین گردمامکی.
٢٣٧- حاجی ئەحمەد مستەفا گەزنەیی.
٢٣٨- مەلا ئەحمەد کوڕی حاجی ئەحمەد مستەفا گەزنەیی.
٢٣٩- مەلا سەید خدر کوڕی سەید عومەر.
٢٤٠- مەلا ئەحمەد تاژانی.
٢٤١- مەلا عەبدولقادر کوڕی باپیر (کانی دەربەندی).
٢٤٢- مەلا سەید عەبدوڵڵا کوڕی سەید حوسێن کوڕی سەید محەممەد.
٢٤٣- شێخ مەلا ئیبراهیم ناسراو بە (شێخ زادە).
٢٤٤- مەلا محەممەد عەبدولکەریم سەدیقی.
٢٤٥- مەلا رەشید فەتحوڵڵا.
٢٤٦- مەلا وەیسی کوڕی محەممەد (کەپەنەک رەشی).
٢٤٧- مەلا عەلی مەلا قادر (کەپەنەک رەشی).
٢٤٨- حاجی مەلا ئەحمەد کوڕی خەلیفە مەلا محەممەدئەمین عەلی عومەر خەڵکی گوندی (سەید

عوبێدە) لە کەندێناوە.
٢٤٩- مەلا عەبدولحەمید سارتکی.
٢٥٠- شێخ مەلا نور محەمەد.
٢٥١- شێخ مەلا رەشید.
٢٥٢- مەلا عەلی وەرتێ.
٢٥٣- مەلا حەسەن مەلا عەلی وەرتێ.
٢٥٤- مەلا محەمەدئەمین مەلا حەسەن مەلا عەلی وەرتێ.
٢٥٥- مەلا عەبدوڵلا مەلا محەمەد ئەمین مەلا حەسەن مەلا عەلی وەرتێ.
٢٥٦- مەلا عەبدولقادر کوڕی مەلا محەمەد ئەمین وەرتێ.
٢٥٧- مەلا محەمەد مەلا عەبدولقادر وەرتێ.
٢٥٨-مەلا ئەحمەدی وەرتێ.
٢٥٩- حاجی مەلا عەبدوڵلا محەمەد سێبەردانی.
٢٦٠- مەلا حوسێن شێخ سەعدی موفەسیر.
٢٦١- مەلا ئیسماعیل قەتەوی.
٢٦٢- مەلا سەعید فەرهاد مەولود.
٢٦٣- مەلا ئەحمەد خەڵکی دیبەگەیە.
٢٦٤- مەلا محەمەد محەمەدئەمین سەڵماسی.
٢٦٥- مەلا سەعید سەرگەڕانی.
٢٦٦- مەلا محەمەد شێخ شێروانی.
٢٦٧- حاجی مەلا عوسمان حاجی خدر سیانی.
٢٦٨- مەلا عەبدولقادر ئەحمەد قاوغی.
٢٦٩- مەلا عەبدولڕەحمان (ئەخمەس).
٢٧٠- حاجی مەلا ئیسماعیل محەمەد گردعازەبانی.
٢٧١- حاجی مەلا مەعسوم.
٢٧٢- مەلا مەحموود کوڕی مەلا عومەرشین کوڕی مەلا عەرەب.
٢٧٣- مەلا ئەحمەدی گەورە کوڕی مەلا مەحموود کوڕی مەلا عومەرشین کوڕی مەلا عەرەب.
٢٧٤- مەلا رەسووڵ کوڕی مەلا ئەحمەدی گەورە لە نەوەی مەلا عەرەبە.
٢٧٥- مەلا شەفیع کوڕی مەلا محەمەد رەسووڵ لە نەوەی مەلا عەرەبە.
٢٧٦- سیبغەتوڵلا کوڕی مەلا محەمەد شەفیع لە نەوەی مەلا عەرەبە.
٢٧٧- مەلا عەلی شێخ وەتمانی کوڕی مەلا عەلی شێخ وەتمانی.
٢٧٨- مەلا عەبدوڵلا مەلا سەعید گرتکی.
٢٧٩- مەلا عەبدوڵلا مەلا عوسمان ناسراو بە مەلا عەبدوڵلا عەوێنەیی.
٢٨٠- مەلا عەلی بندیان.
٢٨١- مەلا عوسمان دۆلەزەیی.
٢٨٢- مەلا عەبدولڕەحمان ماستاوەیی.
٢٨٣- مەلا جەوهەری هێلاوەیی.
٢٨٤- مەلا عەبدوڵلا بەگ.
٢٨٥- مەلا سدیق زەمزەمۆکی.
٢٨٦- محەمەد تاهیر کوردی مەکی کوڕی عەبدولقادر کوڕی مەحموود هەولێرییە.
٢٨٧- مەلا وەیسی مەلا عەبدوڵلا گرتکی.
٢٨٨- مەلا حەسەن مەلا عوسمان رۆستایی.
٢٨٩- مەلا خالید ئەحمەد محەمەدئەمین پیرۆمەری.
٢٩٠- مەلا عەبدوڵلا عەبابەیلی.
٢٩١- مەلا ئەحمەد حەسەنە خێل.
٢٩٢- مەلا ئەحمەد عەبدوڵلا پیرۆمەری.
٢٩٣- مەلا مستەفا مەلا خدر دارسەلامی.
٢٩٤- مەلا جەلالی خەیلانی.
٢٩٥- مەلا مەولوودی مەلەکی.
٢٩٦- مەلا نەبی گرتکی.
٢٩٧- مەلا خدر حەسەن گرتکی.
٢٩٨- مەلا قەسیم رۆستایی.
٢٩٩- مامۆستا مەلا عومەر مەولود دیبەگەیی.
٣٠٠- مامۆستا مەلا ئیسماعیل محەمەد (مەلای گەورەی دیبەگەیە).
٣٠١- رەشاد کوڕی محەمەد موفتی کوڕی مەلا عوسمان کوڕی مەلا ئەبوبەکر ناسراو بە (کوچک مەلای هەولێر).
٣٠٢- مەمدوح سەلیم نەجمەدین ناسراو بە (مامۆستا مەلا مەمدوحی مزووری).
٣٠٣- مەلا سەلیم کوڕی مەلا نەجمەدین کوڕی مەلا مستەفا کوڕی مەلا عیزەدین.
٣٠٤- مەلا قاسم پێندرۆیی.
٣٠٥- مەلا حوسێن قەڵاسنجی.
٣٠٦- مەلا شەریفی باتاسی.

٣٠٧- مەلا ئەحمەدی ئاریسەرەکان.
٣٠٨- مەلا عەبدوڵلای سیساوەیی.
٣٠٩- مەلا مستەفای بێلینگەیی- هیرانی.
٣١٠- مەلا عەلی مامەجەلکەیی.
٣١١- مەلا ئەحمەد چۆمانی.
٣١٢- مەلا عەبدولواحید باڵەکی.
٣١٣- مەلا عەلی خەتێ.
٣١٤- مەلا فەتحوڵلا خەلیفانی.
٣١٥- مەلا کەمال هەروتی.
٣١٦- مەلا شێخ عیزەدین سەرانەیی.
٣١٧- مەلا عەلی دەربەندی.
٣١٨- مەلا زاهید باڵەکی.
٣١٩- مەلا تاهیر گەرەوەیی.
٣٢٠- مەلا سامی سو،رچی.
٣٢١- مەلا مەولو،د باویانی.
٣٢٢- مەلا محەممەد کەمال.
٣٢٣- مەلا عەبدولسەمەد شێخ مستەفا بالیسانی.
٣٢٤- مەلا یوسف بالیسانی.
٣٢٥- مەلا فاروق بالیسانی.
٣٢٦- مەلا ئیدریس زراری.
٣٢٧- مەلا موتەلیب زراری.
٣٢٨- مەلا بەهائەدین باڵەکی.
٣٢٩- مەلا دلشاد هەریری.
٣٣٠- مەلا سامان باداوانی.
٣٣١- مەلا بارزان شێروانی.
٣٣٢- مەلا حامید رۆستایی.
٣٣٣- مەلا ئەحمەدی خانەقا.
٣٣٤- مەلا عومەر مەلا قەرەیی.
٣٣٥- مەلا عومەر چۆمەزەردی.
٣٣٦- مەلا عیمادەدین فائز.
٣٣٧- مەلا سەید ئەحمەد چارەگردەرەیی.
٣٣٨- مەلا عەبدوڵلای دیانا.
٣٣٩- مەلا قادر گەلاڵی.
٣٤٠- مەلا حەمەدەمین مەسیفی.
٣٤١- مەلا مەسعوودی بەحرکەیی.
٣٤٢- مەلا سەعدەدینی بەحرکەیی.
٣٤٣- مەلا عەبدولڕەحمان گردجوتیاری.
٣٤٤- مەلا ئەحمەد عەزیز باوە.
٣٤٥- مەلا کەریمی یەعقوبیی.
٣٤٦- مەلا مەجید رازیانەیی.
٣٤٧- مەلا سەنا کەوری.
٣٤٨- مەلا عەلی بیرەعارەبان.
٣٤٩- مەلا ئەحمەد بیرەعارەبان.
٣٥٠- مەلا محەممەدی سەیدا.
٣٥١- مەلا ئەحمەد مەهدی هەتاو.
٣٥٢- مەلا تەلعەت سەعید قەرەنی.
٣٥٣- مەلا برایم مەنتک.
٣٥٤- مەلا عەزیز کەردزی.
٣٥٥- مەلا نووری مەنتک.
٣٥٦- مەلا عەلی قەلاسنجی.
٣٥٧- مەلا عەبدولڕەحمان هەمزە کۆری.
٣٥٨- مەلا سادق خەتێ.
٣٥٩- مەلا زوبێر بەرزێوەیی.
٣٦٠- مەلا عوسمان- شەقلاوە
٣٦١- مەلا عەزیز- شەقلاوە.
٣٦٢- مەلا یاسین- شەقلاوە.
٣٦٣- مەلا یاسین- شەقلاوە.
٣٦٤- مەلا مستەفای باپشتیان.
٣٦٥- مەلا حەمەد ئەمین زاگەیی.
٣٦٦- مەلا عەبدولڕەحمان شەمشوکەیی.
٣٦٧- مەلا محەممەدی ئازادی.
٣٦٨- مەلا سدیق بانی مارانی.
٣٦٩- مەلا عەزیز شێواشۆیی.
٣٧٠- مەلا سەمەدی مرکەیی.
٣٧١- مەلا عابد عوسمان.
٣٧٢- مەلا عەبدولجەبار حەسەن گراوی.
٣٧٣- مەلا حەسەنی حەسەن بەگ.
٣٧٤- مەلا جەمیل عەلی رەسووڵ.
٣٧٥- مەلا عەلی عەبدوڵلا- کۆیە.
٣٧٦- مەلا تەها عەبدولقادر.
٣٧٧- مەلا میران عەبدولواحید.
٣٧٨- مەلا عەبدوڵلا محەممەد.

٣٧٩- مەلا حەمەد مستەفا.
٣٨٠- مەلا ئیبراهیم حەکیم حەمەرەش.
٣٨١- مەلا جەمال کاکۆ سەعید مەلا.
٣٨٢- مەلا فەتحی جەرجیس عەزیز.
٣٨٣- مەلا جەمال حوسێن محەمەد.
٣٨٤- مەلا جەمال عەزیز ئەمین.
٣٨٥- مەلا عەبدولڕەزاق کاکە حەمە.
٣٨٦- مەلا کەمال ئەحمەد ئەمین.
٣٨٧- مەلا بیلال نووری حەسەن.
٣٨٨- مەلا هاشم جەمال نووری.
٣٨٩- مەلا نیزامەدین یونس.
٣٩٠- مەلا عەممار عەلی.
٣٩١- مەلا جومعە خدر.
٣٩٢- مەلا ئیبراهیم بێشەیی.
٣٩٣- مەلا ئەحمەد وەردی.
٣٩٤- مەلا تەها شەقلاوەیی.
٣٩٥- مەلا ئیسماعیل قوشتەپەیی.
٣٩٦- مەلا مستەفا کەورگۆسکی.
٣٩٧- مەلا محەمەد مەخمووری.
٣٩٨- مەلا محەمەد سادق شەقلاوەیی.
٣٩٩- مەلا عوبێد سالەیی.
٤٠٠- مەلا سالح کۆلانی.
٤٠١- مەلا مستەفای باروکاوێ.
٤٠٢- مەلا عومەر تەرجانی.
٤٠٣- مەلا عەلی عەباس- بەشیریانی.
٤٠٤- مەلا سەید عەبدولقادر گردەشینەیی.
٤٠٥- مەلا عەبدولکەریم شۆرە زەرتکەیی.
٤٠٦- مەلا محەمەدی عەلیاوەیی.
٤٠٧- مەلا سالح دەباغ.
٤٠٨- مەلا غەفووری حفظ.
٤٠٩- مەلا شەکر.
٤١٠- مەلا ئیسماعیل مەلا قۆچە.
٤١١- مەلا فایز مەلا عەبدوللا.
٤١٢- مەلا خالید مەلا فایز.
٤١٣- مەلا ڕێبوار حاجی حەمەدئەمین.
٤١٤- مەلا عەبدوللا فەرهادی.
٤١٥- مەلا عەبدولکەریم مەجید عەبدوللا.
٤١٦- مەلا شێخ محەمەدی مەلا ئۆمەری.
٤١٧- مەلا محەمەد ئەحمەد محەمەد.
٤١٨- مەلا هاشم عەبدوللا مەولود حافظ.
٤١٩- مەلا مستەفا محەمەد مستەفا.
٤٢٠- مەلا نەجیب موحسین شاکری.
٤٢١- مەلا مەزهەر شێخ محەمەد تاهیر.
٤٢٢- مەلا ئەبوبەکری کۆیی.
٤٢٣- مەلا عومەری پاشتەپەیی.
٤٢٤- مەلا ئەحمەد مەلا محەمەد مەلا سەعید.
٤٢٥- مەلا محەمەدی خەلیفە.
٤٢٦- مەلا عەبدولڕەحمان گاینجی.
٤٢٧- مەلا ئەنوەر کەریم.
٤٢٨- مەلا عەبدوللای مزگەوتی سپی.
٤٢٩-.مەلا خەلیل دووسەرەیی.
٤٣٠- مەلا جەمیل بەدیع عومەر.
٤٣١- مەلا ئەبو بەکر ڕەحمان نەبی.
٤٣٢- مەلا عەبدولعەزیز حوسێن عەلی.
٤٣٣- مەلا کەمال محەمەد قادر.
٤٣٤- مەلا عەبدولقادر کورتاندروو.
٤٣٥- مەلا یاسین محەمەد عەبدوللەتیف.
٤٣٦- مەلا سەید محەمەد سەید عەبدولڕەحمان باقلان.
٤٣٧- مەلا ئەحمەد دالداغی.
٤٣٨- مەلا مەحموود حەمەد ئۆمەر.
٤٣٩- مەلا شێخ فەتاح.
٤٤٠- مەلا شەماڵ کەمال.
٤٤١- مەلا قادر مستەفا خدر.
٤٤٢- مەلا ڕەسووڵ عەلیاوەیی.
٤٤٣- مەلا شێخ حوسێن شێخ محەمەد بالیسان.
٤٤٤- مەلا مەحموود خالید حوسێن ناسراو بە (مەلا مەحموود چیوەیی).
٤٤٥- مەلا ئەبوبەکر دوزتەپە.
٤٤٦- مەلا عەبدولڕەحمان حەمەد ئەحمەد ناسراو بە (عەبدولڕەحمانی ماستاوە).



# خانەوادەی مەلا فەندی

تارا محەمەد خدر
كۆلیژی ئاداب- زانكۆی سەلاحەدین

قەلای هەولێر، سەردەمانێ لەشاری هەولێردا، شوێنێكی دردوشاوەی زانستی بووە، واتە، لە بنكەی قەلا زیاتر (بەتایبەتی مزگەوتی كۆنینەی قەلا)، هیچ شوێنێكی دیكە لەناو چەقی شاردا بوونێكی زانستیان نەبوو، بۆ هەموو ئەوانەی كەگەرەكیان بووە روو لەوەرگرتنی زانست بن بەرەو هەمان ئەو قەلایە هەلئەكشان. بەو پێیەش كەقەلا شوێنگەی بنەڕەتی بنەمالەی مەلا فەندی بووە. چونكە ژیانی زۆربەی ئەم خانەوادەیە لەناو جەرگەی قەلا بووە. هەولێریش شاری دێرینی جیهان سەدان پیاوی گەورەی زانستی و كارگێری و رامیاری ئاینی و سەربازی پێگەیاندووە خزمەتی زۆری ولات و شارەكەیان كردووە بەم كارانەشیان ناویان لەرووپەڕی گەشی و دردوشاوەی مێژووی نەتەوەی كوردمان تۆمار كردووە. نەوە دوای نەوە ناوی چاكەیان ڕێشتووەو بەرەو سەرچاوە دێرینەكەیان بردووە.

بنەمالەی مەلا فەندیش نزیكەی چوارسەد سالێك خزمەتی ئاین و نەتەوەو زانستیان كردووە. گەلێك زانای ناوداریان لێ هەلكەوتووەو زانیاری و حیكمەتیان بەناو میللەتدا بلاوكردۆتەوە.

رەچەلەكی ئەم بنەمالەیە دەچێتە سەر مەلا ئەلیاس كوڕی بەهائەدین كە زانای كوردستانی رۆژهەلاتەو خەلكی شاری (سولەد ئاباد)ی نزیك شاری سنە بووە. ئەم مەلا ئەلیاسە لەسەردەمی شا (ئیسماعیل یەكەم)ی سەفەوی دەكەوێتە بەر گوشاری قزل باشە شیعەكان لەئێران و شای

ناوبراو دەیویست رێبازی شیعە گەریەتی بەسەر هەموو دانیشتوانی ئێران بەتایبەتی مەلاکانیان و زانایان کە زۆربەیان سونی مەزهەب بوون بسەپێنێ.

بۆیە لەترسی شا و لەسەر راسپاردەی سولتان سلێمانی قانوونی کە سولتانێکی عوسمانی بوو، دوو زانای بەناوبانگی کوردستانی رۆژهەلات (مەلا ئەلیاس)ی باپیرە گەورەی مەلا فەندی و (محەمەد کوری پیرەدینی) باپیرە گەورەی حەیدەرییەکان کوردستانی ئێرانیان بەجێ هێشتووەو هاتنە کوردستانی باشوور لەناوچەی هەریرو شەقلاوەو هەولێر نیشتەجێ بوون، سولتان سلێمانی قانوونی بۆیە ئەم جێگایەی پێ بەخشین تاکو ببنە بەربەستێک بۆ ئەوەی رێگای لە دەسەلاتی سەفەوی شیعە گەریەتی بگرن، حەیدەرییەکان بەتایبەتی حەیدەری یەکەمی کوری ئەحمەدی کوری محەمەدی پیرە دینی لەهەریر جێگر بووەو مەلا ئەلیاسیش لەهەولێر نیشتەجێ بووە.

ئەگەر درەختی ئەم بنەماڵەیە لە مەلا ئەلیاسەوە بێنینە خوارەوە پاش ئەو شێخ شەهابەدین ئینجا شێخ شەمسەدین دوای ئەو مەلا ئەبوبەکری یەکەم هاتووە ناوی دەرکردووە بە (کوچک ملا) لەنێوان سالانی (١٥٨٠-١٦٨١)ز ژیاوە.

خزمەتی زۆری کردووەو خوێندنی ئایینی لەهەولێر تەواو کردووە لەمزگەوتی گەورەی قەلات لەتەمەنێکی بچووک، بۆیە نازناوی کوچک ملا بووە وەهەر لەهەولێر کۆچی دوایی کردووە. دوای ئەویش مەلا عومەر کوری ئەبوبەکری یەکەم دواتر مەلا ئەبوبەکری دووەم کوری مەلا عومەر کەبەردەوام لەحوجرە بووە بۆیە پێیانوتووە (ئەبوبەکری حوجەری) دواتر مەلا عوسمانی کوری ئەبوبەکری دووەم دێت پاشان ئەبوبەکری سێیەم دواتر مەلا عوسمانی کوری ئەبوبەکری سێیەم کە لەساڵی ١٧٩٢ز لەدایک بووە کە بۆتە قازی هەولێر دواتر بەسەرۆکی دادگای سزا لەموسڵ دواتر بۆ کەرکوک دەگوازرێتەوە دواتر عومەر ئەفەندی کوری ئەبوبەکری سێیەم و باوکی مەلا فەندی بووە. لەساڵی ١٨١٤ لەدایک بووە. لەساڵی ١٨٩١ز کۆچی دوایی دەکات لەگۆرستانی تایبەت بەبنەماڵە لەهەولێر دەنێژرێ.

**بوون و پێگەیشتنی مەلا فەندی**

زانای ناودارو کورد مەلا ئەبوبەکری کوری عومەری کوری مەلا ئەبوبەکری سێیەمە ناودار بووە بەمەلا فەندی. لە ساڵی (١٢٨٠ک-١٨٦١ز) لە قەلای هەولێر لەدایک بووە لەتەمەنی حەوت ساڵی دەستی کردووە بەخوێندن لەمزگەوتی گەورەی قەلات لەسەرەتا دەستی بەخوێندنی بنەماکانی ئیسلام کردووە. لەماوەیەکی زۆر کورت قورئانی پیرۆزی دەرخ کردووە. ئینجا کەوتۆتە بەر خوێندنی فیقەو صرف و نەحو مەنتیق و بەیان و رەوان بێژی کەلام و حیکمەت فەلسەفەی زانستی گەردوونناسی و بیرکاری.

لەتەمەنی بیست ساڵی لەلای باوکی خوێندنی زانستی مەلایەتی تەواوکردووە مەلا فەندی، لە ساڵی ١٨٩١دا کەباوکی کۆچی دوایی دەکات، ئەو تەمەنی نەگەیشتۆتە (سی) ٣٠ ساڵ لەم تەمەنە بووە جێنشینی باوکی و سەرۆکی زانایانی هەولێرو دەوروبەری جێگای باوکی پرکردۆتەوە بەتەواوی هەموو کاتێکی خۆی بۆ دەرس گوتنەوە لەمزگەوتی گەورەی قەلات تەرخان کردووە لەهەموو لایەکی کوردستان فەقێ و موستەعیدی بۆ خوێندن و زانست و فێربوون روویان کردۆتە هەولێر تاوەکو لەلای مەلا فەندی بخوێنن، لەماوەی دەرس گوتنەوەیدا لەساڵی ١٨٩١ تاوەکو ١٩٤٢ دەخایەنێ پتر لەسێ سەد فەقێ و موستەعیدو مەلا دەرسیان لەلای خوێندووە. ژمارەی ئەوانەی ئیجازەی مەلایەتی پێ بەخشین گەیشتۆتە نزیکەی سەد مەلا جگە لەمەش یارمەتی فەقێ و موستەعیدو دەست کورتەکانی مزگەوتەکەو دەوروبەری هەولێریشی داوە، هیچ دێیەک نەبوو لەدەوروبەری هەولێر مەلا و موستەعیدو کتێبی ئەوی تێدا نەبێت. سەر بڵندی شاری هەولێر مەلا فەندی پیاوێکی گەلێک کارزان و پەرێزێکی پوختەو خاوێنی لە مەیدانی ئاین بەجێ هێشتووە، نازناویشی بەکوچک مەلا دەگەرێتەوە بۆ باپیرە گەورەی ئەبوبەکری یەکەم.

بەپێی سەرچاوەکان مەلا فەندی پیاوێکی بالا مامناوەندی بووە. جل و بەرگی رێکی مەلایەتی رەنگ تێری لەبەر کردووە، کلاوێکی (فێس) تەربووشی لەبەر کردووە لەچواردەوری کلاوەکەی قوماشێکی رەنگ شینی موسڵی لەدەوری دەئالاند. سەردەمی مەلا فەندی پڕ لە رووداو و کارەسات و مەینەتی بوو، کابتن (های) سەرکردەی دادگای رامیاری سوپای ئینگلیز لەشاری هەولێر "دەڵێ کەسم نەدیت وەکو مەلا فەندی کە هیچ کەسێک

گلەیی لێ نەبوو" واتا هەموو خەڵک خۆشیان دەویست، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کارە پیرۆزەکانی و زانایی و خواپەرستی، هەروەها دەڵێت: بەهیچ شێوەیەک نەیدەویست بەشداری کورسی دەسەڵات بکات. ئەگەرچی هەموو کەسێک زیاتر بواری بۆ ڕەخسابوو.

مەلا فەندی لەساڵی ١٨٩١ بەچەند ساڵێک ژنی یەکەمی هێناوە لەماوەی ژیانی حەوتاو نۆ ساڵ چوار ژنی هێناوە لەخێزانی سێیەم تەنها کوڕێکی هەبوو بەناوی عزەدین و لەخێزانی چوارەم کوڕێک و سێ کچی هەبووە.

بەر لەهەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی ماڵی لەقەڵات بووە بەڵام لەدوای ئەم مێژووە قەسرێکی گەورەی لەگوندی باداوە، ئەو کات مولکی خۆی بووە دروست کردووە، کە سێ کیلۆمەتر لەهەولێر دوور بووە. بەڵام ئەمڕۆ کەشار گەورەیە بۆتە گەڕەکێک بەڵام هەموو کارێکی دەرس گوتنەوەی و نوێژو خواپەرستی هەر لەقەڵات بووە. لەسەر کیسەی خۆی لەساڵی ١٩٠٨ مزگەوتی گەورەی قەڵات نۆژەن دەکاتەوە.

مەلا فەندی هەروەکو بۆ خوێندنی مەلایەتی بە پەرۆش بووە بۆ کردنەوەی قوتابخانەی میریش پشتیوانی کردووە کاتێک لەدوای هاتنی ئینگلیزەکان بۆ هەولێر لەدوا دوای ساڵی ١٩١٨ بەرچەند مانگێک قوتابخانەیەکی سەرەتایی کوڕان لەشاری هەولێر کرایەوە. خەڵکی سادەو ساکارەکان بەچەند ساڵێک ئەم کارەیان بەکارێکی ناشەرعی لەقەڵەم دەدا، چونکە وایان دەزانی تەنها دەبێت لەمزگەوتەکان بخوێندرێت بۆیە مەلا فەندیش بۆ پاڵپشتی و پێشکەوتن حەزی دەکردو بیرو هەستی خەڵک بگۆڕێت، بۆیە کوڕی گەورەی ناردە قوتابخانە، ئەمەش وای کرد خەڵکەکە بیروڕای خۆیان بگۆڕن.

## کۆشکی باداوە

باداوە گوندێکی قەراخ شاری هەولێر بوو مەڵبەندو فێرگەی زانیاری و ئایین بوو تاکو حەفتاکانی سەدەی بیستەم کۆمەڵە خانوویێک هەندێ شوێنەواری ئەم باخچەو ڕەزانە مابوون، ئێستا گەڕەکێکی شاری هەولێرە.

## لەبارەی ناوی باداوە

سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن لە (باد) وشەیەکی ئێرانییە بەمانای (با) دێت ئاوە واتا ئاوەدانی ڕەنگە لەبادانەوەش هاتبێت، چونکە شوێنێک بووە هەر کەسێک لەشوێنێکی دوور هاتبێ لەم ناوچەیە دەحەسایەوە.

## کۆشکی باداوە:

شوێنێکی مێژوویی شاری هەولێر بوو. لەسەر دەستی مەلا فەندی دروست کراوە کەماوەتەوە تاکو کۆتایی ساڵانی شەست، سەدەی بیستەم وەکو قوتابخانەیەک بووە. بۆ ماوەی نیو سەدە جێگای ئاینی و کۆمەڵایەتی و رامیاری چەند ڕووداوێکی گرنگی مێژووی هاوچەرخی رامیاری عێراقی بەخۆیەوە دیوە.

ئەم کۆشکە پێک هاتبوو لەدوو نهۆم هەر یەکێکیان ژووری گەورەو ڕووناکی بەخۆوە گرتووە، بەپێی سەرچاوەکان لەبەشی باکوور ژوورێکی داخراو بەدار گوێز دروست کرابوو کە بەنەخش هەڵکەنرابوو، باخێکی گەورە لەدەو ڕوبەری کۆشکەکە حەوزێکی ئاو لەلای ڕۆژهەڵات و ناو کۆشکەکە بەوێنەی جوان نەخش ڕاو بوو و نافورەیەک لەناوەڕاستی باخچەی کۆشکەکە هەبوو. کۆشکی باداوە لەسەردەمی عوسمانییەکان چەند گەورە دەسەڵاتدارێکی دەوڵەتی عوسمانی سەردانی ئەم کۆشکەیان کردووە وەکو حجال پاشا سفاح و عون الله طاطعي و سلێمان نظیف) هتد هەروەها مەلیک فەیسەڵی یەکەم سەردانی ئەم کۆشکەی کردووە لەکاتی سەردانەکەی بۆ هەولێر لەساڵانی ١٩٢٤-١٩٢٧ وەکو میوانێک لای مەلا فەندی ماوەتەوە.

و چەند سەرۆک و دەسەڵاتدارێکی تری عێراقی وەکو نوری سەعید و یاسین هاشمی و ڕەشید عالی گەیلانی.... هتد. سەردانیان کردووە.

گرنگترین ڕووداو کە ئەم کۆشکە بەخۆیەوە بینیوە لەکاتی ڕووداوی بزووتنەوەی مایسی ١٩٤١ مانەوەی بنەماڵەی شاهانەی عێراق وەکو فەیسەڵی دووەم و شاژنە عالیە و دایکی نەفیسە خانم. لەم کۆشکە.

وە دووەم ڕووداو لەکۆتایی ساڵانی ١٩٤٣ دامەزرێنەری ئەم کۆشکە کۆچی دوایی دەکات لەلایەن عزەدین مەلا فەندی بەڕێوە چوو کاتێ سوپای عێراقی بەرەو ناوچەی ڕواندوز بەسەرکردایەتی جەنەراڵ (رنت) سەرۆکی نێردراوی سوپای بەریتانیا لەعێراق بەشاری هەولێر تێپەڕیوە میوانی

عزەدین بووە كە ئەو كات بەرپرسی عێراق بوو لەدوای شۆڕشی چواردەی تەمووز.

**دۆست و هاونشینەكانی مەلا فەندی:**

مەلا فەندی دۆست و هاونشینەكی هەموو تاكێكی ئەم كوردستانە بوو قەڵای هەولێریش ببووە بنكەی كۆبوونەوەی مەلا فەندی و دۆستەكانی راوێژیان دەكردو گفتوگۆیان لەسەر بارودۆخی ئەو كاتە دەكرد مەلا فەندی دەوڵەمەند بوو بەدۆست لەكوردستان و دەرەوەی كوردستان پەیوەندی لەگەڵ زانایانی مسرو شام و ئەستەمبۆڵ و پاكستان هەبووە.

دۆستەكانی مەلا فەندی لەوپەڕی ئارامی دابوون كاتێ لەلای مەلافەندی میوان بوون گەلێك كۆڕو كۆبوونەوە دەكرا لەگەڵ مەلافەندی سەبارەت بەبزووتنەوەی رزگاری خوازی گەلی كورد بەتایبەتی كاتێك لەسلێمانی ئەنجوومەنی نیشتمانی پێك هات لەسەر بیروڕای ئازادی و سەربەخۆیی لەسەر دەستی حمە ئاغا رەحمان ئاغاو شێخ قادری برای شێخ محمود و محەمەد ساڵح بەگ چەندانی تر كەرەشید نەجیب سكرتێری ئەم كۆمەڵەیە بووەو وە معروف جیاوك و تۆفیق وەهبی كارەكانی ئەم كۆمەڵەیان بەڕێوە دەبرد كاتێك بڕیاردرا لەهەولێر لقی لێ بكرێتەوە معروف جیاوك هاتە هەولێر لەلای مەلا فەندی مایەوەو پاڵپشتی كردو خزمەت و یارمەتی بەم كۆمەڵەیە كرد. وەبیروڕاكانی جێگای متمانەی هەموو شارەكانی كوردستان بوو وەكاتێك لاوانی شۆڕشگێڕی كورد "یانەی سەركەوتن"یان دامەزراند بۆ پشتگیری كردن و پیتاك كۆكردنەوە بۆ یانەكە معروف جیاوك و جمال عارف بەرەو ناوچەی هەولێر دێن لەگەڵ مەلا فەندی و ئامۆزاكەی ئەحمەد عوسمان كە بەڕێوەبەری هەولێر بووە. كۆدەبنەوەو بەڵێنی پشتگیری كردنیان پێ داوە وەهەڵستان بەكۆكردنەوەی پاڵپشتی لەسلێمانی بۆ یانەكە بەم جۆرە مەلا فەندی سەركەوتنی بەدەست هێنا.

هەروەها دووبارە لەساڵی ١٩٤٣ معروف جیاووك دێتە هەولێر لەلایەن كوڕەكەی مەلا فەندی پشتگیری كراوە وەیارمەتی كۆكردنەوە بۆ یانەكە كەچەندین كەسان پارەیان بەخشی بەپێی یارمەتی دیاری كراوی هەر تاكێك.

"یانەی سەركەوتن" كۆمەڵە رۆشنبیرێك لە ١٩٣٠/٥/٢٠ مۆڵەتی كردنەوەی ئەم یانەیان پێ دراوە بەسەركردایەتی ئیبراهیم حەیدەری وە معروف جیاووك باوەڕ پێكراوی یانەكە بوو دوای معروف ئیبراهیم حەیدەری مامۆستا پایە بەرز محەمەد امین زەكی كرا بەسەرۆك".

ئەم پەیوەندیەی بەهێزە لەگەڵ ئەم زاتانە لەپایەی بەرزی و سەركردایەتی و برا گەورەیی و دانایی بووە لەدەرەوەی هەولێر گەلێك سەرۆك هۆزی كوردی وەكو جەمیل ئاغای گەری، فەتاح ئاغای هەركی و خدر ئاغا سورچی میران قادر بەگ و رەشید بەگ لەدزەیان وە لەرواندوز كاكەخان و خورشید ئاغا وە لەكۆیە جەمیل ئاغا هەوێزی مەلای گەورە لەبتوێن سوارو ئاغا پیران و مامەند ئاغاو لەكەركوك رەفیق فەندی و لەسلێمانی محەمەد ئەمین زەكی لەموسڵ سلێمان نەزیف.

لەناو شاری هەولێریش زاتێكی زۆر هەبوو كە قۆناغی مەلا فەندییان چۆڵ نەكردووە یەكێك لەوانە رەشید ئاغا كە لەگەڵ مەلا فەندی بەیەكەوە بەشداری زۆر داوەت و پێشوازی كردن بەشداریان كردووە بەتایبەتی ١٩٣٠ مەلیك فەیسەلی یەكەم سەردانی شاری هەولێریان كردووە لەگەڵ مەلای گەورەو مەلا فەندی و رەشید ئاغا و مەلیك لەسەر یەك خوان نان دەخۆن.

پەیوەندی لەگەڵ فخری جمیل پاشا هەبووە كەپیاوێكی ناوداری بنەماڵەی جمیل دۆستی مەلیك فەیسەڵ و سەرۆكی مجلس نواب بووە هەروەكو باسی مەلا فەندی دەكات و دەڵێ: "من بعد ملا فندي انحرمت من لبن اربيل"

گەشت سازەكانیش بۆ شاری هەولێر بێ بەش نەبوون لەرێز لێنانی مەلا فەندی و دیوەخانەكەی ئەوەتا گەشتەوەر (علی سەدۆ گۆران) كاتێك بۆ هەولێر دێت كە لەگەڵ مامۆستاو رۆشنبیرو مامۆستای ناوەندی و ئامادەیی سەردانی مەلا فەندی دەكات و دەڵێ یەكێكە لەسامانداراني كورد.

مەلا فەندیش بەدرێژایی ژیانی هەر لەو شارە مابووەوە تەنها چەند جارێك لەم شارە دوور دەكەوێتەوە ئەویش لەكاتی كپ كردنەوەی باری ناهەمواری هۆزە كوردیەكانی دەوروبەری هەولێرو جارێكی تر سەردانی شاری موسڵ دەكات و بۆ لای سلێمان نەزیف كەهاوڕێی دێرینی باوكی بووەو بۆ چارەسەری كێشەكان لەنێوان هۆزەكان.

**لایەنی رۆشنبیری مەلا فەندی:**

بۆ پەرەپێدانی بەم بوارە بۆ ئەوەی زانیاریەکانی خۆی و بنەماڵەکەی زیاتر بڵاو بکاتەوە تاوەکو هەموو تاکێکی کورد دەوڵەمەند بێت لەرۆشنبیرو زانست پەروەر بێت بۆیە مەلا فەندی لەرێگای قوتابی و فەقێکانی خۆی توانیویەتی لەم بوارە سەرکەوتن بەدەست بهێنێ یاخود لەرێگای دەست نووسەکانی خۆی، گرینگی دەدا بەهەموو زانستێک و زانیاری زۆری هەبوو لەگشت بوارەکانی ژیان وەکو بیرکاری و فەلەک ناسی و ئەندازیاری و ئەستێرە ناسی و گۆشەناسی وەکتێبی بەنرخی داناوە لەبواری شەریعەت و ئەدەبیات و وەرگێران و شاعیریش بووە.

خوێندەوار لەسەردەمی مەلا فەندی کەم بوو زۆربەی خەڵکی نەخوێندەوار بوون تاکە فێرگە بۆ منالآن و گەوران حوجرەی مزگەوتەکان بوو بۆیە کەباسی خوێندن لەقەلآت دەکرێ و خەڵکی مێژوو نەریت و دەکەین پێویستە ئاماژە بەمزگەوتی گەورەی قەلآت بکەین: قوتابخانەیەکی ئاینی پێشکەوتوو بوو چەندین مامۆستاو قوتابی پێ گەیاندووە لەوانە مەلا ئەبوبەکری کوڕی عوسمان و کوڕی ئەبوبەکری یەکەم و مەلا جەمیل ئەفەندی تاکو دەگاتە مەلا فەندی وە دواتریش عزەدین کوڕی محەمەد رەشاد موفتی و چەندین زانای تر. بەم شێوەیە مەلا فەندیش لەو مزگەوتە قوتابیەکی زۆری پێ گەیاندووە وەکو دەرمان بڕی ژیانی و دەرس و کۆششەکەی پتر لە ٣٧٠ فەقێ و موستەعیدو مەلا کە سەد مەلاش ٥ ئیجازەی مەلایەتییان وەرگرتووە.

مەلا فەندی جگە لەو زانایانەی کە لەلای دەرچوون بەڵکو لەکتێبخانەکەی گەلێک پەرتوکی بەنرخی بەجێ هێشتووە کەئەمانە هەندێک لەپەرتوکەکانیەتی:

١- تەفسیری قورئانی پیرۆز.
٢- زانستی ئوسترلاب کە کتێبی مەنهەجی بوو بۆ دەرس بەفەقێکانی.
٣- کتێبی جەبر ئەمەشیان مەنهەجی بوو.
٤- تعليمـات مواقف الامور العـامـة في شـرح المواقف جرجاني.
٥- تعليقات لەسەر کتابی ئوسترلاب.
٦- تعليقات على تشريع الافلاك.
٧- كـتاب الفؤاد الحيسنيـة في المربع المجيب لەوەرگیراو لەتورکی بۆ عەرەبی.
٨- پەراوێز لەسەر (جمع الجوامع) لە هی مەلا ئەبوبەکری سێیەم بوو ئەویش زیاتر شیکردۆتەوە.
٩- دیوانێکی شیعری بەعەرەبی و تورکی و فارسی و کوردی لەگەڵ هەندێ تخمیسی شعرەکانی حافصی شزاری و سەعدی.

پەرتوکخانەکەی مەلا فەندی لەکۆشکی باداوە یەکجار گەورە بوو هەزاران پەرتوکی بەنرخ و چاپکراو دەست نووسی تێدابوو کە لەباوک و باپیرانی بۆی مابووەوە لەگەڵ هی خۆی ژمارەی (٢٧٠٠) پەرتوک بوو لەدوو بەش پێک هاتبوو بەشێکیان دەست نووس بوو کە ژمارەی ٧٠٠ دەست نووس بوو بەشەکەی تری چاپ کراو دارێژاوبوو وە بەشێک لەپەرتوکەکانی پێک هاتبوو لەپەرتوکی زمانەوانی و زانستی رێزمان و رەوانبێژی و رۆشنبیری و قورئان و حەدیسەکانی نەبەوی.

هەستی نەتەوایەتی و هەڵوێستی چاکەخوازی و پەیوەندی لەگەڵ بنەماڵەی شاهانەی عێراق و پەیوەندی لەگەڵ شێخ محەمودی نەمرو رۆڵی مەلا فەندی لەکێشەی موسڵ. مەلا فەندی خاوەن کەسیەتیەکی کۆمەلآیەتی رێزدار لەناوچەکە هەڵسوکەوتو کردووە، راستەوخۆ خۆی نەخزاندۆتە ناو مەیدانی سیاسەت و بەڵکو هەڵوێستی سیاسی لەروانگەی ئاینی و پایەی کۆمەلآیەتی خۆی و سەیر دەکرد لەهەر سەردەم و لەسایەی هەر حوکمڕانیەک بوو بێ لەسەردەمی عوسمانیەکان سوڵتان رێزی زۆری لێناوە کەئاگری شەڕی نێوان هۆزی پشدەرو هۆزی تری کوردی بەزووترین کات گوازێنەوە لەماوەیەکی کەم ئەم کارەی ئەنجام داوە چونکە سەرداری هەموو عەشیرەتەکان بەگوێی مەلا فەندیان کردووە بەرامبەر بەم کارە سوڵتان عوسمانی و دیسامی (خادم الحرمين الشريفين)ی پێ بەخشیوە.

وە لەدوای حوکمڕانی عوسمانی لەهەولێر لەکاتی هاتنی ئینگلیز لە هەولێر لە کۆتایی ساڵی ١٩١٨ هەندێ لەخەڵکانی دژی دەسەلآتی بەریتانیا وەستان بەتایبەتی حاکمی سیاسی هەولێر بەلآم مەلا فەندی رۆڵی هەبوو لەو کپ کردنەوەی بارودۆخە.

مەلا فەندی لە بیستەکانی تاکو چلەکانی سەدەی بیستەم یارمەتیدەر و پشتیوانی بزووتنەوەی لاوانی کورد بوو لەساڵانی بیست زۆری لاوی کورد پەروەر خوێن گەرمی وەکو رەمزی فەتاح، مەلا رئووف و مستەفا چیچۆ

لەبزووتنەوەی کوردیدا دەورێکی دیاریان هەبوو ئەگەر لەگەڵ حوکمەتی ئەو سای عێراق یەخە گیریانیان بوایە مەلا فەندی بەرگری و پشتیوانی دەکردن بەتایبەتی لەساڵانی (سی) پشت گیریان کرد بەتایبەتی کاتێ بزووتنەوەی لاوانی کورد پتر جۆشی سەند لەپێناو خوێندن بەزمانی کوردی دەیان وویست بەپێی بەڵێنی حوکمەتی عێراقی کەدایبوو بەکورد بەڵگەنامەیەکی رەسمی دابوو بەکۆمەڵەی گەلان ئینجا بەسەربەخۆی عێراق نراوە بێ مافی رۆشنبیری کورد دابین بکرێ کاتێک وەفدێک بەسەرۆکایەتی وەکیلی مەندوبی سامی لەعێراق وەکیل وەزیرانی عێراق جعفر عسکری لەساڵی ١٩٣٠دا بەکوردستان گەڕا هەر سێ پارێزگای هەولێرو سلێمانی و کەرکوک دەگەڕان پێش ئەوەی بگەنە هەولێر نێونەری رۆشنبیران و معروف جیاوک و رەمزی فەتاح کەسایەتی نیۆنەری عەشیرەت و کۆبوونەوەی داوای مافی میللەتی کورد بکەن وەفدی ناوبراو هاتە هەولێر پێشوازی لێ کران بەڵام نەیان هێشت بێنە خوارەوە وە لەسەیارەکە تاکو سوێند بەشەرەفی بەریتانیا نەخوات مافی کورد جێ بەجێ بکات ئینجا ئەحمەد ئەفەندی کەئەوسا ئەندامی ئەعیان عێراق بوو ئامۆزای مەلا فەندی بوو لەگەڵ معروف جیاووک یاداشتیان پێشکەش کرد بەگوێرایەڵی مەلا فەندی.

لەکاتێ کە ئینگلیزەکان گەیشتنە هەولێر کاروباری ناوچەکانی بەهەوەسی خۆی بەرژەوەندی دەوڵەتەکەی بەڕێوە دەبرد لەساڵی ١٩٢١ بیری دامەزراندنی (احمد عثمان) کرا بە بەڕێوەبەری هەولێر یەکەم متصرف بوو کە بۆ ماوەی شەش ساڵ مایەوە هۆی هەڵبژاردنی ئەم کەسایەتییە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە مەلا فەندی دەستێکی باشی هەبوو لەنێوان خێڵەکانی دەوروبەری هەولێر وە تاکو یەکسانی و هاوسەنگی نێوان خێڵەکان بپارێزێت وە ئینگلیزەکانیش بۆ بەرژەوەندی خۆیان و پاراستنی ئاسایش.

### پەیوەندی لەگەڵ شاهانەی عێراق

لەدوای کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهان دا کاربەدەستانی ئینگلیز بەتاقیکردنەوەی رووداوی دوو سێ ساڵێک هاتنە سەر ئەم بیروڕایەی کەوا کۆنگرەی بۆ لێپرسراوانی دەربارەی گیروگرفتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ببەسترێ، بۆ ئەم مەبەستە شاری قاهیرەیان هەڵبژارد دوای ئەوەی گەیشتنە ئەو رایەی کەمەلیک فەیسەڵ هەڵبژرێن بەڵام ناوچە کوردیەکان گەیەنرا ئەوەی دەنگ دان بکرێ لەشاری هەولێر مەلا فەندی دەوری هەبوو لەرازی کردنی خەڵک کەمەلیک فەیسەڵ لەبەر ئەوە مەلا فەندی وای بەپەسەندی زانی بەیعەت دان بەمەلیک فەیسەڵ باشە بۆ پاراستنی مافە سەرەکیەکان لەلایەن دەوڵەتی عێراقەوەش باشترە.

بۆیە دەبینین مەلیک فەیسەڵ بەرامبەر بەچاکەو پیاوەتی مەلا فەندی زۆر رێزی لەمەلا فەندی گرتووە وەسفی مەلا فەندی دەکات دەڵێ "نەک لەباکووری عێراق هاوتای نیە بەڵکو لەهەموو جیهان بێ هاوتایە".

مەلا فەندی پەیوەندی لەگەڵ مەلیک غازی دوای کۆچی فەیسەڵ یەکەم ٨-١٩٣٥ ئەیولی سەردانی هەولێر کردووە لەکاتی هەڵگیرسانی شۆڕشی مایسی ١٩٤١ی عێراق دژ بەئینگلیز کەناودار بوو بەشەڕی رەشید عالیە گەیلانی و سەرکردایەتی دەکرد وە رەشید عالی گەیلانی پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ مەلا فەندی هەبوو بۆیە لەکاتی شۆڕشی بنەماڵەی شا مەلیک فەیسەڵی دووەم مەلیکە عالیە لەرۆژی ٢٩ی مایسی ١٩٤١ تاکو ٣ی حوزەیرانی هەمان ساڵ لەلای مەلا فەندی مابوونەوە تاکو نەمانی حوکمەتی رەشید عالی گەیلانی وەهەر چەندە حوکمەتی عێراقی واتا رەشید عالی گەیلانی دەیزانی لەلای مەلا فەندی بوون بەڵام لەبەر رێزگرتنی مەلا فەندی وازی لێ هێناو لەدواییدا گەڕاونەتەوە بۆ بەغدا.

بەرامبەر بەم هەڵوێستە مەلا فەندی وەصی عبدلئیلا پلەی (ویسام الرافدین) پێ بەخشیووە کەپلەیەکی جۆری شارستانیە بەئیرادەی مەلەکی رۆژی ١٧- شوباتی ١٩٤٢.

### رۆڵی مەلا فەندی لەکێشەی موسڵ

دوای سەرکەوتنی کەمالیەکان لەتورکیاو نەمانی دەسەڵاتی خەلیفە عوسمانی دامەزراندنی حوکمەتێکی کۆماری لەتورکیا، داوای گەڕانەوەی موسڵی دەکرد بۆ ژێر دەسەڵاتی خۆی پێی وابوو کەبەشێکە لەتورکیا لەدوای هەوڵدانێکی زۆر کار گەیشتە ئەوەی سەرژمێری دانیشتوان بکەن بەڵام هەر یەکەیان بەپێی بەرژەوەندیەکانی خۆی واتا تورکیاو بەریتانیا بەڵام بەمەش چارەسەرر نەکرا لەماوەی نۆزدە مانگ دەخولایەوە بەڵام بەسێ کۆنگرەی قسطنیطیە

چارەسەر نەکرا دواتر خرایە بەردەم ئەنجومەنی گەلان بۆیە لەئەیلولی ١٩٢٤ پسپۆرو شارەزا بەم بوارە دراسەت کردن بۆ ئەم کێشەیە دەست نیشان بکرێت وەبڕیاردرا ١٩٢٤ لیژنەیەک پێک هاتبوو لەکۆنتیلکی و سەرۆک وەزیرانی مەجەر لەپشتر کەسایەتی سویدی و خانەنشینی بەلجیکی لیسترنەکە دراسەتی گشت بوارەکانی وەکو ئابووری و سیاسی و بازرگانی و کشتوکالی ئەم ناویەیان کرد پێویست بوو بیروبۆچوونی خەڵکەکەو دەوروبەری وەربگرن بۆیە مەلا فەندی لەسەردەمێکی وادابوو کەباری سیاسی زوو دەگۆڕا کاتێ دەسەڵاتی عوسمانی لەناوچەکە نەمابوو وەبەریتانیا وەکو هێزی سیاسی دەسەڵاتی نوێی کەوتە مەیدان عێراق و وە مەلا فەندیش دڵنیابوو کەعوسمانیەکان ئەم دەوڵەتە نەبوون بۆ کورد هیچ شتێک بکات وەئینگلیزیش هیچ بۆ کورد ناکات بەتایبەتی دوای لێدانی بزووتنەوەی رزگاری خوازی نەتەوەی کورد بەسەرکردایەتی شێخ محمود بۆیە ئەم هاتە پێشەوەو لیژنەکە پرسیاری کرد ئایا دەتانەوێ لەگەڵ تورکیا بن یاخود عێراق بەڵام کەسیش نەبوو بڵێ یاخود سەربەخۆیی بژین بۆیە مەلا گەورەی کۆیەو مەلا فەندی داوایان کرد جۆری پرسیارەکە بگۆڕن لەدوایدا پێیان باش بوو بچنە پاڵ عێراق داوای مافی خۆیان لەعێراق بکەن نەک لەتورکیا.

**پەیوەندی لەگەڵ شێخ مەحمودی نەمر**

شێخ مەحمودی نەمر کوڕی شێخ سەعیدی کوڕی شێخ محەممەدی کوڕی حەزرەتی کاک ئەحمەد لەساڵی ١٨٨٢ لەشاری سولەیمانی هاتۆتە دنیاو لای پیاوانی ئاینی دەرسی قورئانی پیرۆزی خوێندووەو ئەو ساڵ لەسلێمانی قوتابخانەی رۆژدیەی سەربازی خوێندووە کەوتە دونیای پڕ ئەندێشەو شوهرەتی لەدەوروبەر بلاوبووەوە لەگەرمیان کاتێ ئینگلیز هاتنە سلێمانی لەژێر ئیدارەی شێخ حوکمەتێکی نیشتمانی پێک هێناو تاچەند مانگێک بەڵام ئینگلیز سیاسەتی گۆڕی و شێخ تەحەمولی نەکرد لەئەنجامدا شەڕ کەوتە نێوانیان بۆ ئەم مەبەستە رۆڵی مەلا ئەفەندی دەردەکەوێ لەو کاتەی ئەو ناوبژیوانەی، کەپێی هەڵسا لەنێوان حوکمەتی ئەوسای عێراق و ئینگلیز لەلایەک و شێخ مەحمود لەلایەکی تر کردی. کەسەرکردایەتی شۆڕشی نیشتمانی دەکرد لەچیاکانی ناوچەی سلێمانی لەکاتێکدا، (نوری سەعید، وەزیری بەرگری عێراقی) ئەو کات هاتە لای مەلا فەندی لەبادواەو داوای لێ کرد ناوبژیوانی ئاشتی لەنێوان حوکمەت و شێخ مەحمودی نەمر بکات لەپێش ئەویش ١٩٢٦ نوێنەری سیاسی بەریتانیا لەهەولێر نامەیەکی لەلایەن (کورنوالیس) هێنابوو بۆ مەلا فەندی کە نامەی راوێژکاری وەزارەتی ناوەخۆی بوو، بۆیە مەلا فەندی بەخۆشحالییەوە ئامادەیی خۆی نیشان دا بەڵام پێویست بوو چاکی نیەتی حوکمەتی عێراق تەئکید بکاتەوە پێی باش بوو لەسەر هەقی میللەتی کوردو شەرەف و مالی و جێگای شێخ مەحمودی نەمر بۆیە داوای ئەوەی کرد کەراوێژ بکات لەگەڵ شێخ بۆیە داوای لەوەزارەتی ناوەخۆی عێراق کرد کە ئەحمەد عوسمانی ئامۆزای بگوازێتەوە لەهەولێر بۆ سلێمانی بەسەرکەوتوویی کارەکە جێ بەجێ بکات و مەلا فەندیش بەپێی سەرچاوەکان بەڵێنی بەشێخ داوە پاڵپشت و هاندەری بێت.

**کۆچی دوایی مەلا فەندی و دەنگۆی بلاوبوونەوەو کۆچەکەی لە ویژدانی شاعیراندا:**

سەر لەبەیانی پێنج شەممە ٣١- کانوونی یەکەمی ١٩٤٣ ناشتنی زانای پایە بەرزی هەولێر رێکخرا کە شەوی ٣٠/٣١ مالئاوایی کردبوو.

بەپێی سەرچاوەکان رێورەسمەکە زۆر گەورە بوو وەبەم بۆنەیەوە رێورەسمەکە بەپێی سەرچاوەکان خەڵکێکی زۆر کۆببوونەوەو هەر وبەم بۆنەیەوە چەندین نووسراوی گەورە پیاوان و دەسەڵاتداران و سەرۆک هۆز پرسەو ماتەمی خۆیان پێشکەش بەبنەماڵەکە کرد جا چ بە بەشداری کردن بێت لەتازیانەکە یاخود نووسراو پێشکەش بەقاسمی کوڕی کرا، چونکە ئەو کاتە عزەدین-ی کوڕی گەورەی لەدەرەوەی ولات بوو جگە لەمە کۆچی دوایی کاری کردە سەر هەست و سۆزی شاعیرانی کوردو عەرەب هەروەکو پیرەمێردی گەورەی شاعیر دەڵێت:

**ئاینی ئیسلام دەری خستووە**
**دوای مردنی گیانی وەلی زیندووە**
**وەلی سیفاتی خودای تێ دایە**
**نائبی نەبی و لە بەندو رەهایە**

هەروەها م. نوری (شێخ نوری شێخ سالح)

**دووبارە ئاسمانی فەرەح هەوری گرتەبەر**
**یەعنی لیباسی ماتەمی پۆشی بەنی بەشەر**

هەروەها شێخ ڕەزای تاڵەبانی
سنک تلک عزاجها نداور
سکا سوء سونسدن حفض المحبون
ولیدر کوصک ملا.

ڕەمزی مەلا مارف
تەمی ماتەم بەنەوعێ ئاسمانی داپۆشی
کەم و زۆر لەساحەی سینەما نەما خۆشی
نەما هۆش و شکا شوشەی سعودی دڵ پێ کەنی و زانی
ئەفەندی مەی لەدەست ساقی ئەجەل وەرگرت و دایپۆشی

سەرچاوەکان:

- عەلی سەیدۆ گۆران: لەعەمانەوە بۆ ئامێدی (گەشتێک بەرەو کوردستانی باشوور) وەرگێرانی: تالیب بەرزنجی، سلێمانی ٢٠٠٠.
- تەحسین چیچۆ- شێرزاد قادر، هەولێر لەیادی سەد ساڵەی دامەزراندنی شارەوانی هەولێر (کۆمەڵە وتارێکی ڕۆشنبیری مێژووی شارەوانی هەولێر. ١٩٨٥.
- عبدالخالق علائەدین، مەلای گەورە. (هەولێر- کتێبخانەی نیشتمان).
- عەلائەدین سجادی، شۆڕشەکانی کوردو کۆماری عێراق- بەغدا ١٩٥٩.
- فاضل حسین، کێشەی ویلایەتی موسڵ- وەرگێرانی محەمەد شاکەلی، سلێمانی ١٩٩٩.
- محەمەد عەلی قەرەداغی، بوژانەوەی مێژووی زانایانی کورد لەرێگەی دەستخەکانیان، بەرگی دووەم- چاپی یەکەم- بغداد ١٩٩٩.
- مەسعود محەمەد - گەشتی ژیانم- چاپخانەی یەکەم- ستۆکهۆڵم، ١٩٩٩.
- مەلا عەبدوڵلای زیوەر گەنجینەی مەردان- یاداشتی ڕۆژانی دەربەند محەمەدی مەلاکەریم. بەغداد ١٩٨٥.
- مەولود قادر بێخاڵی، هەولێرم وادیوە بەرگی یەکەم- بەغداد بەرگی دووەم١٩٩١- ١٩٩٧.
- یوسف ئەحمەد دەرگەلەی- مێژووی شاری هەولێر، سلێمانی ٢٠٠٢.
- ابراهیم السید عیسی المصري، مجمع الآثار العربیة- دمشق- ١٩٣٨.
- د.اسماعیل شکر رسول، اربیل دراسة تاریخیة في دورها الفکر السیاسي- ١٩٣٩-١٩٥٨ الطبعة الاولی- اربیل ٢٠٠٣.
- د.بدرخان سندي، المجتمع الکردي في المنظور الاستشراقي- دار ئاراس اربیل، ٢٠٠١.
- حمید المطبعي- إعلان القران في القرن العشرین- جزء الثاني بغداد ١٩٩٥-١٩٩٦.
- دبلیو ار هي، سنتان في کردستان (١٩١٨-١٩٢٠) جزء الاول طبعه الاولی- بغداد ١٩٧٣.
- زبیر بیلال اسماعیل- علماء ومدراس في اربیل (من التراث الثقافي الکردي) مطبعه الزهراء الموصل ١٩٩٤.
- عباس العزاوي، اربیل في مختلف العصور اللواء، المدینة راجعه- محمد علي قرداغي بغداد ٢٠٠١.
- عبدالرزاق الحسني- تاریخ الورزارات العراقیة- طبعة السابعة دار الشؤون الثقافة العامة- جزء الاول، بغداد ١٩٨٨.
- عبدالکریم محمد مدرس، علماؤنا في خدمة العلم والدین- محمد علي قرداغي الطبعة الاولی- مطبعة الحریة- بغداد ١٩٨٣.
- د.عزیز الحاج، القضیة الکردیة في عشرینات، المکتبة الوطنیة- بغداد ١٩٨٥.
- محمّد امین زکي، مشاهر الکرد وکردستان في الدور الاسلامي- راجعه محمد علي عوني- بغداد ١٩٤٧.
- محمد زکي حسین احمد- إسهام علماء کوردستان عراق- اربیل ١٩٩٩.
- معروف جیاوك- مسأله بارزان المظلومة، الطبعه الثانیة- ٢٠٠١.
- میر بحری- اعلام الکرد لندن- ١٩٩١.
دەستنووسی- عثمان رشاد موفتي- في سلسلة کچك ملا

گۆڤارو ڕۆژنامەکان

گۆڤار:

- گۆڤاری گولان العربي- ژمارە ٣٨- ساڵی چوارەم- ١٩٩١.
- گۆڤاری هەولێر، ژمارە (٣) ١٩٩٩.
- گۆڤاری هەولێر، ژمارە (١٥) ٢٠٠٢.
- سەنتەری برایەتی، ژمارەی یەکەم- ساڵی یەکەم- ١٩٩٧.
گۆڤاری کاروان، ژمارە ٤٨- ١٩٨٦.

ڕۆژنامەکان:

- فتی العراق- ژمارە ١٢٤٤- ١٩٩٨.
- برایەتی، ژمارە ٢٠٤٤- ١٩٩٤.
- برایەتی، ژمارە ٢٠٤٥- ١٩٩٤.
- برایەتی، ژمارە ٢٠٤٧- ١٩٩٤.
- خەبات، ژمارە ٧٤٦- ١٩٩٤.
- خەبات، ژمارە ٩٠٤- ١٩٩٤.



# مێژووی خانەوادەی سەید ئەحمەد ئاغای ئەلنەقیب

سەید برزۆ سەید سواراغا

هەڵبەتە شاری هەولێری ئەوەندە کۆن و دێرین، پڕ تەمەنترین شارێک کە ژیان و بەردەوامی بەسەرە وەبووبێت، گۆڕان و تازەبوونەوە و چوونە پێشەوەی بەخۆوە دیبێت، ئەوا فرە خەڵک و دانیشتوان وماڵبات و خێزانی لە ئامێز گرتووە، دەنگ و رەنگی جیا، رووداو و کارەساتی مەزن لە دوو توێی لاپەڕەکانی وەبەرچاو دەکەون، لە هەموو ئەوانەش بەناوبانگتر شەڕی گۆگمێلای نێوان ئەسکەندەری مەکدۆنی سوپاسالاری یۆنانی و ئیمپراتۆری رۆژئاوا و دارای سەرداری سوپای فارس و ئیمپراتۆری رۆژهەڵات بوو، کەوا لە ساڵی (٣٣١ پ. ز) رووی داوە، سەرەنجام ئەسکەندەر بەسەر دارادا سەر دەکەوێت و ئەم شار و دەڤەرە دەخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی، ئەوە بێجگە لە شەڕی نێوان دەسەڵاتی ئەمەوییەکان و عەباسییەکان و چەندین کارەساتی جەرگبڕ و ماڵوێرانکەری دیکە، بەرۆک و یاخەی ئەم شارە، بەتایبەتی قەڵای سەرسەخت و باڵابەرز و رووسووری هەولێر دەگرێت، چونکە سەردتا هەولێر بریتی بووە لە قەڵا و ئەو خەڵکەی بەسەرییەوە و لە نێو شوورەکەی، نەخاسمە لە کاتی هێرش و شەڕەکاندا خۆیان تێدا قایم و توند دەکرد و لە پەلاماری دوژمن و داگیرکاران خۆیان دەپاراست، تەنانەت جاری وا هەبووە لە داستان و نیمچە داستانێک دەچێت، دوژمن بەوەی بە چەندین رۆژ و مانگ لە هەر چوار دەوری شار چادر و باروبنەی داخستووە، جا یان بە بێزاری و بێ ئومێدی کشاوەتەوە و نەیتوانیوە بە ئاوات و خەونەکەی بگات یاخود بەهەر فڕوفێڵ و شێوە و شێوازێک دزەی کردۆتە نێو قەڵاوە و دەستی داوەتە کوشت و بڕ و تاڵان و خوێن ڕشتنێک هەر مێژوو بیگێڕێتەوە، بۆ ماوەیەکیش فەرمانڕەوا و حاکمی خۆی لە شار دامەزراندووە، بەڵام هەموو ئەوانەش تا سەر نەبووە و خەڵکەکە لە بەرامبەر زوڵم و زۆری و داگیرکاری و کاری ناڕەوا راپەڕیون و کەسانێکی مێرخاس و سەرکردە و ئازا و چاونەترسیش بۆ رزگاربوون و هاتنە دەرەوە لە ژێر نیری تژی جەوری دوژمنان و ستەمکاران پێشەوایەتیی

تەگبیرکەری و ڕێنوێنییان کردوون، نموونە گەلێکی دیار و بەرچاو لە نێو لاپەڕە پڕ سەروەرییەکانی شاری هەولێر دەبینرێت، تا دوا دڵۆپە خوێن و تا هێز و شنگ و تاقەت لە جەستەیان مابێت، تا سووکە دەرفەتێکیشیان لە پێناو بەرگری و سەربڵندی و هەولێر و شەرەفی دانیشتوانەکەی بەدیکردبێت ماندووبوونیان نەناسیوە، بگرە ڕۆحی خۆیان زۆر لەلا هەرزانتر و بێ بەهاتر دیوە لەوەی داگیرکار و ستەمکارێک فەرمانڕەواییان بکات و قەڵا سەرکز و بریندار بێت، هەریەکە و بەجۆرێک بەشێکی لەم سەروەری و ڕووسوورییەی بۆ خۆی تۆمارکردووە. ئەوە وێڕای خەڵکە ڕەش و ڕووت و ئازا و بوێرەکەی، کە بوونە قەڵغان و تەواوکەری کەسانێکی سەردار و سوارچاکی هەولێر و دەوروبەری، بۆ ڕەزامەندیی هەردوو دنیایان خەباتیان کردووە و تێکۆشاون.

ڕەنگە شتگەلێکی زۆر نادیار و ڕۆژگارێکی فرە تەماوی و چەندین ڕووداو و نووسینی نادروست و پڕ هەڵە و بێ کەڵکیش هەبن، بەڵام چاخ و سەردەمی زێڕین زۆرن و بەڵگە و ئاماژگەلێک هەن، هەولێر و هەولێرییەکان شانزی پێوە دەکەن، خودی ئەو هەموو تەمەن و مانەوە و لەسەر پێ وەستانەی قەڵا، خۆی لە خۆیدا کتێبێکی مەزن و پڕ بەها و نووسراوەی، تا دەگاتە دەورانی ئیسلامی، کە زیاتر مێژوونووس بەروونی ڕووداو و کارەسات و شتەکانیان نووسیوەتەوە و کەسانێک شتی ورد و بەکەڵکیان بۆ تۆمار کردووین یان دەکرێ بڵێین ڕەنگە



نووسین و نووسراویش هەبووبن، بەڵام ئەوانیش وەک چارەنووسی نەتەوەکە و کەوتنە بەر بای زوڵم و زۆرییەکانی داگیرکەرلان، ئاگر و ئاو قوتی دابن!!

هەرچەندە بۆ چەواشەکاری و شێواندنی مێژوو لە هەموو سەردەمێک و بە دەستی ئەنقەستیش مێژوومان شێوێنراوە و غەدری گەورەمان لێ کراوە، کە ئەم پریشکە بەر هەولێریش کەوتووە. کەچی دواتر هەندێک بەرچاوڕوونی و شتی تازە و خودی نووسەر و مێژوونووسانی هەولێر دێنە پێشەوە و مێژووی ئەو سەردەمەی شارەکەیان دەنووسنەوە، هەولێر لە سەردەمی سەلاحەدینی ئەییوبی سەرکردە و مێژوونووس و زانای بەناوبانگ (حجة الإسلام) ئیبن خەلەکان و وەزیری ناسراو (ئیبن ئەلمستەوفی) و (ئەلموزەفەر شارەزوور) و سوڵتان (موزەفەر) و (شێخولئیسلام - ئیبراهیم فەسیح حەیدەری هەولێری) و (الغوث الرفاعي) و (قطب المدار شێخ ئەحمەد ئەلرفاعی ئەلحوسێنی ئەربیلی - قدس الله سره) باپیرە گەورەی

ئەلنەقیب و ساداتی ئەحمەدی رفاعی و شێخ مستەفای نەقشبەندی و زانای ناودار مەلا ئەفەندی و یەعقوب ئاغا بەیاتی شاعیر و شێخ محەمەد نەقشبەندی و (السید السند ئیمام محەمەد ئەلحوسێن خانەوادەی سەید ئەحمەد ئەلرفاعی) و ساداتی بەرزنجە و ئەسعەدی و عوزێری و وەهاب ئاغا و گەلێکی دیکە لە کەسایەتی و ناودارانی دیکەی هەولێر، کە زۆر خزمەتیان بە ئایین و شارەکە گەیاندووە، بەڵگە و نووسین گەلێک وەبەرچاو دەکەون، ئەمانە زیاتر بەردی بناغەی خانەوادە دێرینەکانی هەولێر و دەوروبەرینە، لە هەولێر چەندین ڕێبازی (سۆفیگەری) سەری هەڵدا، یەکەم ڕێبازی سۆفی (ئەلرفاعیە ئەلعەلیە) بوو، بە هەزاران کەس دوای ئەم ڕێبازە کەوتن (شيخ الخرقة الرفاعية) یەکەم دامەزرێنەری ئەم ڕێبازەیە (شێخ سەید ئەحمەد ئەلحوسێنی ئەلرفاعی ئەربیلی) پێش سێ سەدە ئەم ڕێبازەی لە هەولێر بڵاو کردەوە، دواییش ڕێبازی قادری لەسەر دەستی

شێخ ئیبراهیم (الصدقي القادري) بڵاوبۆوە، دواتریش ڕێبازی نەقشبەندی بەهۆی شێخ محەممەدی سەعید و شێخی چۆلی و شێخ مستەفا و هی دیکە بڵاو بۆوە. ئەمە لەلایەک و لەلایەکی دیکە دەزگای (نقابة الإشراف) لە هەولێر بە پاڵپشتی و هاندانی سوڵتان مەحموودی عوسمانی ساڵی (١٢٣٩ک - ١٨١٨ز) دامەزرا، شەرەفی سەرۆکایەتیی ئەم جڤاتە درا بە ناودارترین خانەوادە، ئەویش خانەوادەی (السادة الأحمدية الرفاعية نسبا وطريقة) لە بنەچەی ئیمام سەید ئەحمەدی ڕەفاعی گەورە بنەچەی ئیمام عەلی کوڕی ئەبوتالیب، لەم خانەوادەیە سەید ئەحمەد ئاغا ئال سەید ئەحمەد بۆ سەرۆکایەتیی (نقابة الإشراف) لە هەولێر هەڵبژێردرا، سەید ئەحمەد ئاغا ئەلنەقیب پەیوەندیی توندوتۆڵی لەگەڵ سوڵتانەکانی عوسمانی هەبوو، بە تایبەتی سوڵتان مەحموود، بێجگە لەم پلە و پایەیە بە فەرمانێکی سوڵتانی ساڵی (١٢٥٥ک) بووە حاکمی کارگێڕی هەولێریش، بەمجۆرە بووە بەرپرسی دین و دنیا، بەراستیش حاکمێکی دادپەروەر و سوارچاکێکی لێهاتوو بوو، چۆن لقێک لە لقەکانی (الدوحة الرفاعية العلية المباركة) بووە نەوەی عەلی ئاغا ئەلرفاعی ئەلهاشمی بوو، پەروەردەی دەست و باوەشی پیرۆزی (سادە)ی دین و لە بنەماڵەیەکی شەریف بوو، زانایەکی گەورەی زانستەکانی (عەقلی و نەقلی) بوو، سۆفییەکی رفاعی خودایی بوو، لە نێوان جەرگەی سادەی شکۆمەندان و خەڵکی دیکە بوو، هەرکات خەڵک بۆ کاروباری دین و دنیا پرس و ڕاو ڕاوێژیان پێ دەکرد و دەگەڕانەوە لای سەید ئەحمەد پیرۆز و ناودار ئەلنەقیب، دیوەخانێکی ئاوەدانی لە قەڵات هەبووە، ئەنجوومەنەکەشی هەمیشە ئاوەدان بووە بە پیاو و ماقوڵان و حاکم و والی و زانایان و ڕۆشنبیران و جووتیاران، لە دیوەخانەکەی زیندانێکی تایبەتی هەبووە بۆ ئەو کەسانەی سەرپێچی دەکەن یان بە ساختە خۆیان دەکردە سەید، ئەلنەقیب بۆ ئاوەدانکردنەوە دەستی بە زۆر شوێن ڕاگەیشت، وەکو تەکیە و مزگەوت و مەزارگای پیاوچاکان، لەوانەش مەزارگای شێخ محەممەد خوراسانی و مەزارگای باپیرانی (سەید ئیمام محەممەد و سەید ئەحمەد رفاعی)، دواییش بەگۆڕستانی ئیمام محەممەد، کە لە نزیک منارەی چۆلییە تاکو ئێستاش بەو ناوە ناسراوە، زیاتر لە دە تەکیەی لە گوندەکانی: (دارەبەن، قوچەبڵباس، تیماری گەورە، قۆپەقران، سوێرە، تەرجان، مزەحمەد، دوزتەپە، برایم لەک) و چەندین گوندی دیکەش ئاوەدان کردۆتەوە، سوڵتانەکانی عوسمانی ئەم گوند و پارچە زەوییە کشتوکاڵییانەیان لە پای ئەو هەموو ڕۆڵەیان لە بواری ئایین و زانستییان و ڕێزیان لە ناو خەڵک و بنەچە پیرۆزەکەیان پێ بەخشیون، لە هەمان کاتیش لە گشت باج و ئەرکی سەربازیش بەخشرا بوون، پاش تەمەنێکی پڕ فیداکاری لە پێناو دین و ئال بەیت و نیشتمان، دامەزرێنەری (نقابة الإشراف) لە هەولێر، سەید ئەحمەد ئاغا ئال سەید ئەحمەد لە ساڵی (١٢٦٤ک) گەڕایەوە، بەر بارەگای خودا و لە ژێر گومبەتی باپیرەی خۆی ئیمام محەممەد نێژرا.



دووەم نەقیبی هەولێر (سەید محەممەد ئاغا ئال سەید ئەحمەد) بووە، کوڕە گەورەی سەید ئەحمەد ئاغا بوو، لە دوای باوکی لە ساڵی (١٢٦٥ک) سەرۆکایەتیی (نقابة الإشراف) گرتە دەست، هەمان ڕێوشوێنی باوکی لە خزمەتکردن درێژە پێدا، بە فەرمانی سوڵتان بووە جێگری حاکمی شار، لە تەمەنی شەست ساڵی گەیشتە بەر بارەگای خودا و لە گۆڕستانی باپیرانی بەخاک سپێردرا، نەقیبی سێیەمی هەولێر لە هەمان بنەماڵە (سەید مەجید ئاغا)ی برا بچووکی سەید محەممەد ئاغای نەقیب بوو، سەرۆکایەتی لە ساڵی (١٢٧٢ک) دوای سەید محەممەد گرتە دەست، لە هەمان کاتیش بووە (عمید)ی خانەوادەی (السادة الأحمدية) و کاروبارەکانی بنەماڵەکەیان کەوتە سەر شانی ئەو،

بە فەرمانێکی سوڵتان (عەبدولمەجید) بووە حاکمی سەربازی هەولێر و دەوروبەری، سوڵتان پێشوازیی لێ کرد و شمشێرێکی تایبەتی خۆی پێ بەخشی، لەگەڵ پلە و پایەی (سلطان البر) واتە حاکمی سەربازی و کارگێڕی و ئاییینی، هەروەها نیشانەی (وسام المجیدیە)ی پێ بەخشی. لە تەمەنی (٧٥) ساڵی کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی (السادة الأحمدیة) نێژرا. نەقیبی چوارەمی ئەم خانەوادەیە (سەید عەباس ئاغا)ی برازای سەید مەجید ئاغا بوو، پیرێکی لە خواترس بوو، هەرگیز چاوی لە شتی بێ کەڵکی دنیا نەبوو، دوای مامی بووە سەرۆکی جڤاتی هەولێر (نقابة الإشراف)، ڕۆڵێکی کاریگەری هەبووە لە نەهێشتن و کەمکردنەوەی کێشە عەشایەرییەکان، بۆیە (الصدر الأعظم) لە (باب العالي) بە فەرمانێکی (هەمایۆن) نیشانەی (وسام خادم الحرمین)ی پێ بەخشی، سەید عەباس بە نەخۆشییەکی کتوپڕ کۆچی دوایی کرد، هەر لە هەولێر لە گۆڕستانی تایبەت بەخانەوادەکەیان نێژرا.

ئیدی دوای ئەویش (سەید مەحموود ئاغا)ی برا بچووکی شوێنی گرتەوە، لە هەمان کاتیش ئەندامی کارگێڕی هەولێر بوو، کەسایەتییەکی بەهێز و سەربەرز بوو، هەمان ڕێچکەی باب و باپیرانی گرتە بەر، قوتابخانەی (الأحمدیة الرفاعیة)ی لە گەڕەکی عەرەب نۆژەن کردەوە، کەوا یەکێک بوو لەو قوتابخانە و مەدرەسە ئاییینیانەی لە ناو شاری هەولێر، خزمەتێکی بەرچاوی گێڕاوە، ئەم قوتابخانەیە لە ناو خەڵک بە (پاشا) ناوزەد کراوە. لە سەردەمی خۆی چەندین پارچە زەویی لە دەوروپشتی قەڵات (وقف)ی (نقابە) و خانەوادەی ئەحمەدی کرد، ئەمەش بە پاڵپشتی سوڵتان عەبدولمەجید بوو. دوایی سەید عەبدوڵڵا پاشای برازای شوێنی گرتەوە، هەر لەو کاتە لەگەڵ حاجی خدر ئاغا لە ساڵی (١٨٨٥ز) ئەندامی ئەنجوومەنی کارگێڕی بوو، بە پشتگیری سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم و مۆری (محەمەد نوورەدین ئەلنەقیب)ی هەموو مەمالیکی عوسمانی پێ دەسپێردرێت، ساڵی (١٣١٧ک) سەید عەبدوڵڵا تاکو ساڵی (١٩١٨ز)، واتە کۆتاییهاتنی فەرمانڕەوایی عوسمانییەکان لە ناوچەکە مایەوە، سوڵتانی عوسمانی هەریەکە لەم پلە و پایانەی: (پاشا) و (ویسامی مەجیدیەی یەکەم و دووەم و سێیەمی پیاوماقوولان)ی پێ بەخشی، سەید عەبدوڵڵا دوو جاران وەکو سەرۆک شارەوانی هەڵبژێردرا جارێکیان لە ساڵی (١٩٠٤ - ١٩٠٧) و جاری دووەمیش لە ساڵی (١٩١٤-١٩١٨ز) لەم چەند ساڵە زۆر بە دڵسۆزی خزمەتی هەولێری کرد، یەکەم شەقامی لە هەولێر بەناوی (سەرا) دروست کرد - شەقامی سوڵتان موزەفەر - هەروەها چارەسەری دیاردەی کەم ئاویشی کرد، ئەمەیش بە دروستکردنی حەوزێکی گەورە لە نزیک مزگەوتی (ئاڵتی برماغ) و بە بۆڕی دروستکراو لە قوڕی سوورەوەکراو ئاوی حەزەکەی گەیاندە ماڵەکان. وەک مامۆستا نەژاد بەرزنجیش لە گۆڤاری باریش ئاماژەی پێ داوە: (ئاوی بۆڕی لە سییەکانەوە هاتە هەولێر لە پێشدا هەر لە ساڵی هەزار و نۆ سەد و سێزدە عەبدوڵڵا پاشای عەباس ئاغای سەید ئەحمەدلی پردێکی - پردەکە لەسەر سێ تاقان دروست کرابوو، ئەمڕۆکە کەوتۆتە ناو گەڕەکێکی سەرەکی بە ناوی سێتاقان- لەسەر بەستی بارانی هەولێرێ دروست کرد، کە ئاوی کەسنەزانی بێتە ئەودیوی لای خانەقا. ئەم دوو پرۆژەیە بە گەورەترین پرۆژەی شارەوانی، هەر لە سەرەتای دروستبوونی شارەوانی ساڵی (١٨٨٥ز تا ١٩٢١ز) دادەنرێن.

لەگەڵ حاجی ڕەشید ئاغا و عەلی پاشا و ئەحمەد پاشای دزەیی و عەشایەری سوورچی و هەرکی و زراری لە کاتی هاتنی ئینگلیز بۆ ناوچەکە (جیهاد)یان دژ بە ئینگلیزەکان ڕاگەیاند، ئەمانە لایەنی بەرەنگاربوونەوە بوون، کۆششی خۆیان کرد و ڕووبەڕوویان بوونەوە، بەڵام دوو هێزی نابەرامبەر بوون و هێزیکی دیکەی دەسکێش و پشتیوان و لایەنگری بەریتانیش هەبوو، بۆیە سەرەنجام شکستیان خوارد و ئاراستەی دەسەڵاتیش بەلایەکی دیکەدا ڕۆیشت. لە (سنتان في کردستان)ی کاپتن های باس لە ڕووداو و بەرەنگاری و ئەو مەسەلەیە کراوە، بۆیە کاتێک حاکمی ئەو ڕۆژگارەی ئینگلیز وەک داوەتنامەیەک و یەکترناسین بەدوای گشت پیاوماقوولانی هەولێردا دەنێرێت، جا کاتێک پرسیار دەکات

لەوەی کێ نەهاتووە، لە وەڵامـــــدا دەڵێن تەنیا عەبدوڵلا پاشا ئامادە نەبووە. ئەویش دەڵێ کـــەوایە من دەچم، ئەم پیـــاوە دیارە گـــرنگ و خانەدانە. بۆ بەیانی خۆی دەچێتە دیوەخانەکەی.

کاپتن های لە وەسفی عەبدوڵلا پاشادا دەڵێت: (سەید عەبدوڵلا پاشا، کە پێشەوایەکی پیری پایەدار و مەزنە لە شار، هەروەها لە دەرەوە بە سواری هێستـرێکی سووریاوی نایاب دەبینـرێ)، ئەوە جگە لە چەندین شوێنی دیکە ناوی دەبات، تەنانەت ئەوەش ناشارێتـەوە، کـە دۆسـتی ئینگلیـز نییـە، بەڵکو دژایەتیی ئەوان دەکات.

سەید عەبدوڵلا پاشا برایەکی بەناوی (سەید عومەر ئاغا) هەبوو، ئەویش لە ســاڵی (١٨٩٢ز) بووە (المستوطن العام)ی هەولێر، هەروەها سەید عومەر ئەندامێکی کارا و دیاری (نقابة الإشراف) بوو، کتوپڕ کۆچی دوایی کرد و بە هەمان شێوە ئەویش لە گۆڕستانی باب و باپیرانی بە خاک سپێردرا.

نەقیبەکانی هەولێر یەک لەدوای یەک:

- سەید ئەحمەد ئاغا ئال سەید ئەحمەد ١٢٣٩ک.
- سەید محەمەد ئاغا ئال سەید ئەحمەد ١٢٦٥ک.
- سەید مەجید ئاغا ئال سەید ئەحمەد ١٢٧٢ک.
- سەید عەباس ئاغا ئال سەید ئەحمەد.
- سەید مەحموود ئاغا ئال سەید ئەحمەد.
- سەید عەبدوڵلا پاشا ئال سەید ئەحمەد ١٣١٧ک.



**کەسایەتییە ناودارەکانی خانەوادەی سەید ئەحمەدی نەقیب**

هەولێری باوەش گەرم و فراوان، ئەویش ڕەنگدانەوەی خاکەکەیەتی لە مرۆڤەکانی ئەم دەڤەرە پڕ خێـر و بەرەکەتە، بەهەژار و دەوڵەمەند و خانەوادەکانی، بە درێژایی ڕۆژگار خێـر و بەرەکەت بوونە بۆ غەوارە و لێقەوماوان، ئەمە منەت نییە، بەسەر هیچ کەسێک، بەڵکو دیاری و (نیعمەت)ێکی خوای گەورەیە بۆ ئەم خەڵکە و جێگای شانازی خەڵکەکەشە، کە تاکو ئەمڕۆش بە شایەدی دۆست و دوژمن هەولێر بە شارێکی غەریب نەوازە و پشت و پەنای بێدەرەتان و لێقەوماوانە.

تازەترین بەڵگە و ڕووداو ئەو کارەسات و سەرهاتە جەرگبڕ و پڕ ناسۆرانە بوو، کە حکومەتی بەعس و دەسەڵاتی سەدام بەسەر خەڵکی عێراق بە گشتی و کوردستان (بارزانییەکان و هەڵەبجەی ٥ هەزار شەهید و دۆڵی بالیسان و دەڤەری بادینان و کۆمەڵگای جەژنیکان و.......)ی هێنا، ڕۆژگاری ڕەش و نەهامەتییەکانی کورد زۆرن، هەولێریش وەک تەحەدا و بەرەنگاربوونەوەیەکی ئەو ڕژێمە، زۆر بوێرانە و بێ سڵەمینەوە لە کۆمەکیکردن و هاوکاری و دەستی بەخشش و یارمەتیدان کەمی نەکردووە و هەولێرییەکان ئەوەی لە دەستیان هاتبێت ئەنجامیان داوە. کۆمەکی بارزانییەکانی ساڵی ١٩٨٣ لە قوشتەپە و غەوارە و بریندار و کۆستکەوتووانی کیمیابارانی هەڵەبجە و ئاوارەکانی بادینان و کۆمەڵگای جەژنیکان و قەڵادزەییەکان و... تاد، شاهێدی چاکە و جوامێری و نیشتمانپەروەری ئەو شارە دێرین و سەربەرز و پڕ شکۆیەن.

خانەوادەی سەید ئەحمەدی نەقیب بەیەکێک لە کۆنترین و گەورەترین خانەوادەی هەولێر دادەنرێن، لەبەر پایەبەرزی و بنەچە و

خزمەتگوزارییەکانیان، لەلایەک دەگەڕێنەوە سەر بنەچەی سەید ئەحمەدی رفاعی گەورە، بە بنەماڵەوە ڕێبازی ئاینییان دەگاتەوە ئیمام حوسێن کوڕی ئیمام عەلی چوارەم خەلیفەی موسڵمانان (د. خ)، باپیرە گەورەی ئەم خانەوادەیە سەید ئەحمەد و برا گەورەکەی ئیمام محەمەد، لە حیجازەوە هاتوونەتە کوردستان و لە هەولێر گیرساونەتەوە، ئەمەش لە سەردەمی دەوڵەتی (ئەتابەگی) واتە سەردەمی عەباسییەکان، پێش (٧٠٠) ساڵ، بەڵام حەپەسام کاتێک لە پاشکۆی دیوانی مامۆستای گەورە و شاعیری ناوداری هەولێر (ناسیح حەیدەری) بە ناوی (ڕەچەڵەکی هەندێ لە بنەماڵەکانی هەولێر) سەبارەت بە (بنەماڵەی سەید ئەحمەدلی) دەڵێت: (وەکو بیستوومە شەخسێک هاتۆتە هەولێر و گوتوویەتی ناوم سەید ئەحمەدە و لە هەولێر نیشتەجێ بووە و ڕووەتێکی زۆری پەیدا کردووە، پێی گوتراوە سەید ئەحمەد ئاغا) مەبەستمە بڵێم نووسین و قسەکردن لەسەر وردەکاری و خۆڵەقەرەنەدانی بابەتی سەرەکی بە (وەکو بیستوومە.....) ناکرێ، بەتایبەتی ئەگەر ئەوەش مێژووی (٧٠٠)ساڵ بێت!!

ئیمام محەمەد بووە لە خوارەوەی قەڵات دەبێتە ئیمامی مزگەوتی (موزەفەرییە). ئەم زاتە زانایەکی پایەبەرز و سۆفییەکی گەورەش بووە، خزمەتێکی بێ پەروای هەولێری کرد، سەید ئەحمەدیش بووە شێخی ڕێبازی رفاعی لە هەولێر و یەکەم کەس بووە ئەم ڕێبازەی لە هەولێر بڵاو کردۆتەوە، هەروەها قوتابخانەی (ئەحمەدی رفاعی) دامەزراندووە، خەڵکێکی زۆر دوای ئەم ڕێبازە سۆفییە کەوتن، بە خواپەرستی و دوورکەوتنەوە لە خۆشییە خەڵەتێنەرەکانی دنیا ناوبانگی دەرکردووە، ئەم ڕێبازە یەکەم ڕێبازی سۆفی بووە لە هەولێر سەری هەڵداوە، دواتر ڕێبازەکانی دیکەی سۆفیگەری بڵاو بوونەتەوە، گۆڕی پیرۆزی هەردووکیان لە گۆڕستانی (ئیمام محەمەد)ە، ئەم گۆڕستانە لە نزیک منارەی چۆلییە لە ناوجەرگەی شاری هەولێر.

دوای ئەوەی نەوەکانیان وازیان لە تەکیە و تەریقەت و شێخایەتی هێنا، پلە و پایەی کارگێڕی و سەربازی و کۆمەڵایەتییان هەڵبژارد، چوونە جیهانی سیاسەتەوە، ئیدی سوڵتانەکانی عوسمانی بەرزترین نیشانە (وسام)یان دەبەخشییە ئەم خانەوادەیە، لەوانە: (وسام خادم الحرمین الشریفین) دوو جاران (وسام المجیدیة العظیمة) و (وسام الأشرف) و (وسام الاستحقاق والشرف) و (باب العالي)یش نازناوی (پاشا) و (ئاغا) و (میری میرانی) لەگەڵ پلەی (سلطان البر)ی پێ بەخشین، هەر لەم بنەماڵەیە (حاکمی کارگێڕی و سەربازی و قائیمقام - المستنطق - و ئەندامی کارگێڕی هەولێر و سەرۆکایەتی شارەوانی هەولێر و راوێژکاری سوڵتان) هەڵکەوتوون. خانەوادەی ئەحمەدی بۆ یەکەم جار لە ساڵی (١٢٣٩ک) بە پاڵپشتی سوڵتان محەمەد نەقابەی پیاوماقووڵانیان لە هەولێر دامەزراند. ئەم نەقابەیە تاکو ساڵی (١٩١٨ز) رووخان و دۆڕانی دەوڵەتی عوسمانی لە شەڕی یەکەمی جیهانی و گرتنە دەستی جڵەوی دەسەڵاتی عێراق لەلایەن ئینگلیزەوە بەردەوام بوو.

**گوڵبژێرێک لە کەسایەتییەکانی خانەوادەی ئەحمەدی نەقیب:**

**شێخ سەید ئەحمەد حوسێنی رفاعی ئەربیلی (١١٤٠ک - ١١٩٥ک):**

ئەم زاتە باپیرە گەورەی خانەوادەی (سەید ئەحمەدی ئەلنەقیب)ە، لە هەولێر و بەغدا، پێشتر باسی پلە و پایەی کارەکانی ئەم زاتەمان کردووە، ماوە بڵێین چەندین دانراوی هەبووە لەوانە: (تەفسیری سورەتی ئەلبەقەرە و ئەلقەدر و......تاد) دەگێڕنەوە نزیک مردنی بوو (عەبدولموحسین)ی کوڕی بەگریانەوە بەباوکی دەڵێ: ڕێبازی رفاعی بڕایەوە، ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی خەم مەخۆ کوڕم بەخودای ئەم ڕێبازە لە هەموو وڵاتدا بڵاو دەبێتەوە، لە دوای مردنی شێخی گەورەش، شێخایەتی گوێزرایەوە بۆ نزیکترین پێڕەوانی (مرید)، ئەویش شێخ عوسمانی هەولێری بوو، کە دواتریش تا ئەمڕۆ ئەم ڕێبازە لەسەر پەیڕەو و پرۆگرامی خۆی بەردەوامە، هەرچەندە وەک سەرەتا و دەستپێک نەماوە، چونکە دەبێت ئەوە بڵێین شێخی گەورە یەکجار زۆر ڕێزی لە شەرع و زانایان ناوە، وەک دەڵێت: (هیچ کێشەیەک لە نێوان سۆفیگەری و شەریعەتدا نابینم.)

**ئیمام محەمەد حوسێنی ئەربیلی (١١٦٧ک - ١٢٢٥ک):**

سەیدی سادات و پیاوی لە خواترس و شێخی دوور لە خۆشییە خەڵەتێنەرەکانی دنیا، ئیمام و پێشنوێژی مزگەوتی خوارەوە (موزەفەریە) بوو، لەگەڵ براکەی سەید ئەحمەد قوتابخانەی (ئەحمەد)یەیان دامەزراند، لەم قوتابخانەیەدا چەندین زانست لە زانستی پێشنوێژ و فیقە و نەحو... تاد، فێرە قوتابییان دەکرا، زۆر خزمەتی هەولێری کردووە. ئیبنولمستەوفی لە کتێبەکەی (تاریخ اربل) باسی رۆڵی ئیجابی ئەم زاتەی کردووە، لە تەمەنی (٩٠) ساڵی گەڕایەوە بەر بارەگای خوا و لە گۆڕستانی بنەماڵەی خۆیان نێژراوە، کە ئێستا بە گۆڕستانی ئیمام محەمەد ناودێرە لە نزیک منارەی چۆلی، ئەو پیاوە ناودارە هیچ نەوەیەکی لە دوای بەجێ نەما.

**سەید ئەحمەد ئاغای سەید محەمەد ئاغای نەوەی سەید ئەحمەد:**

لە ساڵی (١٢١٩ک) لەدایک بووە و ساڵی (١٢٧٠ک) کۆچی دوایی کردووە، لە باوەشی محەمەدی گەورەی باوکی، لەسەر خوڕەوشتی پاک و بێگەرد گەورە بوو، فێرە ئوسووڵی ئایین و قورئان خوێندن و لەبەرکردن بووە، وەکو لاوێکی دڵفراوانی رێزدار لە ناو گشت هۆزەکەی ناوی دەرکرد و بووە سەرپەرشتیاری خانەوادەکەیان (خانەوادەی ئەحمەدی). لەلایەن سوڵتان مەحموودیش ساڵی (١٢٣٩ک) بە (نەقیبی ئەشرافان)ی هەولێر هەڵبژێردرا تاکو مردنی، لە هەمان کاتدا جێگر و راوێژکاری یەکەمی حاکمی هەولێر بوو، خاوەنی زیاتر لە (٢٠) گوند بوو لە دەوروبەری هەولێر، لەم گوندانەش: (ماجید، مەلاقەرە، دوزتەپە، قوچە بلباس، میل، تەرجان، قەتەوی، تیمار، دارەبەن، قەفر، سەرکور، ئۆمەراود، مزەحمەد، عەلیاوە....) لە تەمەنی (٧٠) ساڵی کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی خانەوادەی ئەحمەدی (گۆڕستانی ئیمام محەمەد) نێژرا.



**سەید مەجید ئاغا کوڕی سەید ئەحمەد ئاغا (١٢٤٥ک - ١٣١٠ک):**

لە قەڵاتی هەولێر لەدایک بووە، هەر لە منداڵییەوە ئاشقی سوارچاکی بووە، لەسەر دەستی گەورەترین زانایانی سەردەمی خۆی، خوێندوویەتی بەتایبەتی زانای بەناوبانگ مەلا عومەری هەولێری، لە مزگەوتی گەورە ئەم مەلا بەڕێزە، کە دۆستێکی نزیکی باوکی بووە هەر لە تەمەنی لاوێتی بە سەرۆکی (عمید)ی خانەوادەی ئەحمەدی ئەلنەقیب هەڵبژێردرا، بەراستیش شایانی ئەم سەرکردایەتییە بوو، ناوبانگێکی زۆری پەیدا کردبوو، لە هەولێرەوە زۆر هاموشۆی گوندی (ماجید)ی دەکرد، ناوبانگی مەجید ئاغا بووە هۆی دڵەڕاوکێ لە نێوان هۆزەکانی دەوروبەری هەولێر، بەتایبەتی هۆزی (تەی - الطی) خواست، لەگەڵ رووداني شەڕێکی گەورە لە نێوان هەردوولا، زیرەکی سەید مەجید دیارکەوت، ئاگرەکەی بە زیرەکی خۆی کوژاندەوە، خوشکی شێخی (الطی) خواست، ئەم زیرەکییەی سەید مەجید گەیشتە گوێی سوڵتان (عەبدولحەمید)، بۆیە سوڵتان فەرمانی دا کە نیشانەی مەجیدی (وسام المجیدیة) و نازناوی (سلطان البر)ی پێ ببەخشێ، ئەمەش وەک رێزلێنانێک بۆی، چونکە گەورەترین ئاگری ناکۆکی و ململانێ کوژاندەوە، ئەو ئاگرەی نەک شاری هەولێر، بەڵکو دواتر تەشەنەی دەکرد و شوێنی دیکەشی دەگرتەوە، لە دوای خۆی تاقە کوڕێکی بەناوی (سەید ئیبراهیم) بەجێ هێشت، سەید مەجید لە گۆڕستانی ئیمام محەمەد نێژرا.

**سەید عەبدوڵلا پاشا کوڕی سەید عەباس ئاغا:**

ناوی ئەم زاتە پیرۆزە بە هەولێرەوە بەستراوە، لە دوا رۆژانی عوسمانییەکان و هاتنی ئینگلیزەکان، گەورەترین و بەهێزترین کەسایەتیی کارگێڕی ناوچەکە بوو، لە قەڵاتی سەرکەش گەڕەکی ئاغاکان لەدایک بووە، لەسەر خوڕەوشتی بەرز پەروەردە کراوە، لەسەر دەستی گەورە

زانایانی سەردەمی خۆی زانستەکانی ئایینی وەرگرتووە، هەر لە منداڵییەوە خولیای فێربوونی زانستەکانی (عەقڵی و نەقلی) بووە، زیرەک بووە، جێگای سەرنجی خەڵک بووە، تاکو بووەتە رۆشنبیرێکی سەردەمی خۆی، پلە و پایەی بەرزی لای سوڵتانەکانی عوسمانی وەرگرتووە، لە نزیکترین کەسانی (بابولعالی) بووە، باس لە دەقی فەرمانی، کە لە (باب العالی) بە مۆری سوڵتان (عەبدولمەجید) دەرچووە دەکەین، کە بۆ هەر سێ والی: (بەغدا) و (شام) و (بەسرە) و (حیجاز) دەنووسێ و تێیدا دەڵێت: سەید عەبدوڵلا پاشا لە نەوەی سەید ئەحمەدی نەقیب، لە هەولێرەوە بۆ بەجێگەیاندنی فەریزەی حەج روو لەلای ئێوە دەکات، داواتان لێ دەکەم ئاسانکاری تەواوی بۆ بکەن و رێزی بگرن، لەبەرئەوەی نەوەی (فاتیمەی زەهرا)یە رەزای خوای لێ بێت. گەنجێکە لە گەرەکێکی قەڵای هەولێر پێگەییوە. سەرەنجام (١٠٠) جەندرمە دەکاتە یاوەر و پاسەوانی و لەسەر خەرجی سوڵتان سەفەری حەج و ماڵی خوا بەجێ دێنی، ئەمەش نیشانەی پلە و پایە و خزمەتەکانی سەید عەبدوڵلا لە دەوڵەتی عوسمانی نیشان دەدات. سوڵتان (عەبدولمەجید)ی خەلیفەی عوسمانی داوا لەم سێ والییەی دەوڵەتانی ئیسلامی دەکات، رێزی بگرن، سەید بەکر بەرزنجی دەڵێ: (من لێکۆڵینەوەم لەسەر زیاتر لە (٢٠٠) فەرمان کردووە، کەچی مەختوت و بەڵگەنامەی لەم جۆرەم نەدیوە. هەروەها سوڵتانەکانی عوسمانی (عەبدولحەمید و محەمەد پاشا) رێزیان لێ ناوە، ئەم پەیوەندییەش هەروا بەئاسانی دروست نەبووە، بۆیە لای خەڵکی هەولێر و سوڵتان بە سەرۆک شارەوانی بۆ ساڵانی(١٩٠٣ - ١٩٠٧/ ١٩١٣ - ١٩١٨) هەڵبژێردراوە، زۆر خزمەتی شار و خەڵکی هەولێری کردووە، نۆبەرە و یەکەم شەقام بەناوی (سەرا) لە هەولێر لە سەر دەستی دروست دەکرێت، ساڵی (١٩٠٤ز) حەوزێکی گەورەی ئاوی نزیک مزگەوتی (ئاڵتی بەرماغ)ی دروست کردووە، دواییش لەم حەوزەی ئاوی گەیاندۆتە ماڵان بەهۆی بۆری قوری سوورکراوی (فخاری)، حەوزێکی دروست کرد لەسەر چوارگۆشەیی رووبەرەکەی (١٦) مەتری چوارگۆشەیی بوو لە ساڵی (١٩١٣ز)، شوێنەوارەکەی ئەو بارەگایەی خوالێخۆشبوو پارێزەر ئەحمەد جامبازە، کە بەرامبەر (کەبابخانەی تاجریان)ە، لەوێوەش ئاوەکە دەچووە مزگەوتی (ئاڵتی بەرماغ)، لەوێوە ئەم سەقایانەی ئاویان دەهێنا بۆ هاوولاتییانی قەلات و، ئەو ئاوە مەکشوف بوو (معقم) نەبوو، ئەم دوو پرۆژەیە بەگەورەترین پرۆژە خزمەتگوزارییەکانی شارەوانی دادەنرێ، هەر لە سەرەتای دروستبوونییەوە لە ساڵی (١٨٨٥ز)، بۆیە بە یەکەم سەرۆکی شارەوانی دادەنرێ، کە باشترین خزمەتی کردووە، ئەمەش لە کتێبی (اربیل اربع سنوات) ئاماژەی پێ کراوە، سەید عەبدوڵلا پاشا ساڵی (١٣١٧ک/ ١٨٩٦ز) بووە نەقیبی پیاوماقووڵان و شێخەکانی هەولێر، ئەمەش بەپێی فەرمانی (هەمایۆن) لە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم و بە واژۆی بەرێز (محەمەد نوورەدین ئەلنەقیب)، کە گەورەی هەموو نەقیبەکانی ئیمپراتۆریەتیی عوسمانی بووە، هەمیشە لەهەڵسوکەوت و راپەڕاندنی کاروبارەکانی خۆی بێ ترس ئەنجام دەدان.

سەید عەبدوڵلا پاشا، ساڵی (١٩٠٨ز/ ١٣٢٩ک) بە قائیمقامی هەولێر هەڵبژێردرا، لە هەمان کاتیشدا حاکمی کارگێڕی هەولێر بووە، بەپێی فەرمانی سوڵتان نیشانەی (وسام خادم الحرمين الشريفين)ی لەلایەن سوڵتان (رەشاد) پێی بەخشرا. بەهێزترین بەرەنگاری داگیرکردنی عێراقی کرد لەلایەن ئینگلیزەکانەوە، زۆربەی زۆری پیاوانی هەولێریش پاڵپشتییان کرد لەم بەرەنگاربوونەوەیەدا، لەوانە (حاجی رەشید ئاغا، وەیسی ئاغا، عەلی ئاغا عەلی پاشا دۆغرەمەچی، حاجی پیرداود دزەیی، ئەحمەد پاشای دزەیی، سەرۆکەکانی سوورچی وزراری و هەرکی و کەسانی دیکەش). لە کاتی ئاگربەستی ئێران و عوسمانییەکان و ئینگلیزەکاندا، ئەمانەی سەرەوە سەید عەبدوڵلایان کردە حاکمی هەولێر، لەو کاتەدا عوسمانییەکان هەولێریان چۆڵ کردبوو، ئەوکات کارگێڕی (رەسمی) نەمابوو، واتە بۆشایی کارگێڕی پەیدا ببوو، لەو کاتەدا گەورە پیاوانی هەولێر بوونە دووبەش، بەشێکیان دژی هاتنی دەسەلات و دگیرکاری ئینگلیزەکان بوون کە لەسەرەوە ناویان هاتووە، بەشی دووەمیش

لایەنگری ئینگلیزەکان بوون وەک زانای ناودار (مەلا ئەفەندی و ئیبراهیم ئاغای دزەیی)، ئەم دوو بەشە (کاپتن های لە دوو لە کوردستان) هەروەها مامۆستای مێژوونووس زوبێر بیلال ئیسماعیل ئاماژەیان پێ کردووە، سەرۆک هۆزەکان و ناودارانی لایەنگری سەید عەبدوڵلا نامەیان بۆ پشتگیری رەوانە کرد، بۆ سەلماندنی راستگۆیی خۆیان هێزەکانی (عەشیرەتەکان) بەرەو هەولێر بەرێ کەوتن و بۆ چەند رۆژێک هەولێریان گەمارۆ دا، لە بەرامبەریش هێزی عەشیرەتەکان بە سەرۆکایەتیی ئیبراهیم ئاغا و ئەحمەد ئەفەندی و بە پاڵپشتی مەلا ئەفەندی ئامادە بوون، بەڵام زۆری نەخایاند کاردکە بۆ ئینگلیزەکان چووە سەر و هاتنە ناو هەولێر، چونکە هێزێکی گەورەی زرێپۆش و پیادە گەیشتنە نزیک هەولێر، ئەوە بوو لەبەر هێزی نابەرامبەر بێ بەرەنگاری هاتنە ناو شاری هەولێر. (کاپتن های) بەدرێژی باسی ئەم رووداوانەی ئەوکات دەکات.

کاپتن های مەلا ئەفەندی و ئەحمەد ئەفەندی و... بەدۆستی خۆیان (ئینگلیز) دادەنێ بەرامبەر بە دوژمنی خۆیان، کە سەید عەبدوڵلا و هاوپەیمانانی بووە، دوای هێوربوونەوەی شار ئینگلیزەکان لە ساڵی (١٩٢١ز) (ئەحمەد ئەفەندی)یان کردە (موتەسەریف)ی هەولێر لە ساڵی (١٩٢١ز)، هەر لەم ساڵەش سەید عەبدوڵلا کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی ئیمام محەمەد نێژرا، ئینگلیزەکان زۆر هەوڵیان دا بچێتە ژێر باڵیان و واز لە



دوژمنکاری بێنێت، بەڵام سوودی نەبوو.

سەید عومەر ئاغا کوڕی سەید عەباس لە ساڵی (١٢٨٠ک) لە قەڵاتی سەرکەش لە گەڕەکی ئاغاکان هاتۆتە دنیاوە، خاوەنی زانست و سوارچاکیی پارێزەری ئایین و نیشتمان بووە، نموونەیەکی بەرزی راستگۆیی و ئەمانەت بووە، زۆر بڕوا بەخۆ بووە، لەسەر راستی شێلگیر بووە، زانایەکی لێهاتوو و لە زانستەکانی ئایینی زۆر شارەزا بووە، شوێنێکی بەرزی لای خەلیفەکانی عوسمانی و (بابوالعالی) هەبووە، پەیوەندی نێوان خانەوادەی ئەحمەدی ئەلنەقیب تا دوا رۆژانی عوسمانییەکان توندوتۆڵ بووە، سەید عومەر و براگەورەکەی سەید عەبدوڵلا پاشا نەقیب و سەید ئاغای یەعقوب ئاغا بەئەندامی کارگێڕیی هەولێر هەڵبژێردران، دواییش بە فەرمانێکی سوڵتانی بووە (مستنطق)ی هەولێر پەیوەندییەکی توندوتۆڵ لە نێوان سەید عومەر و مەدحەت پاشای والی بەغدا هەبووە، لە هەمان کاتدا پەیوەندیی توندوتۆڵی لەگەڵ سەعید ئاغا و عومەر ئاغا ئەسعەدی و ئەحمەد پاشای دزەیی و جوکل ئاغای دزەیی هەبووە، بەڵام فەرمانڕەوایی ئەم زاتە درێژەی نەکێشا و کورت بوو، چونکە لە هەرەتی لاوێتی و ناوادە، واتە لە تەمەنی (٤٧) ساڵیدا، لە ساڵی (١٣٢٧ک) کۆچی دوایی کرد، رێوڕەسمی بەخاک سپاردنی لە گۆڕستانی ئیمام محەمەد شایستەی ئەو مەقام و رێزلێنانە بوو، کە بۆی ئەنجام درا، دەفژەن و ئاڵای (سادەی رفاعی) و بەشداربوونی جێگری والی بەغدا - نوێنەری تایبەتی داود پاشا - و پیاوماقووڵانی هەولێر و دەوروبەری و خەڵکێکی زۆر بەشدارییان تێدا کرد، نەوەکانی سەید عومەریش: (سەید عوسمان ئاغا، سەید زێوەر ئاغا، سەید سەعید ئاغا، بەهیە خان)بوون.

سەید مەحموود ئاغای سەید محەمەد ئاغا: ئەم زاتە بە پاشا ناسرابوو، لە قەڵاتی هەولێر لەدایک بووە، خوێندنی لە قوتابخانەی مزگەوتی گەورەی قەڵات دەست پێ کردووە، ئوسووڵی ئایین و زانستەکانی قورئان لەسەر دەستی مەلا عومەری هەولێری فێر بووە، تاکو بوو بە زانایەکی پایە بەرز و رۆشنبیرێکی مەزن، بەڵام ئەویش بە تەواوی رۆنەچۆتە قووڵایی ئەم زانستانە و مۆڵەتی زانستی وەرنەگرتووە، چونکە سوڵتانەکانی عوسمانی هەر زوو یەخەگیریان بوون و کاریان پێ سپاردوون، لە وەزیفەی فەرمی و حکومی بەرز ئەندامانی ئەم

بنەماڵە ناودارەیان دامەزراندووە، دیارە عوسمانییەکان بەو راستییە گەیشتبوون، کە ئەم خانەوادەیە دەتوانن زۆر بە باشی کاروبارەکان هەڵسوڕێنن و کاتی ئاژاوەش بەباشی رۆڵی خۆیان ببینن، دەسەڵاتی ئەم خانەوادەیە تەنها لە هەولێر نەبووە، بەڵکو دەوروبەریشی گرتۆتەوە، بۆیە ساڵی (١٨٨٥ز) سەید مەحموود ئاغا کرا بە جێگری (ئەحمەد بەگ)ی حاکمی هەولێری ئەوکات، کە تورک بووە، راستی سەید مەحموود بووە، لەبەرئەوەی ئەحمەد بەگ لەلایەک لە خەڵکی دابڕابوو، لەلایەکی دیکە سەید مەحموود جەماوەرێکی زۆری هەبووە و زۆر تێکەڵاوییەتی لەگەڵ خەڵک هەبووە، خەڵکی هەولێر و دەوروبەریشی رێزێکی تایبەتیان بۆ ئەو و خانەوادەکەی هەبووە، ساڵی (١٨٨٠ز) بەرەو ئەستانە کەوتە رێ، سوڵتان عەبدولمەجید پێشوازییەکی گەرمی لێ کرد و رێزێکی تایبەتی بۆ دانا و یەکێک لە شمشێرە تایبەتییەکانی خۆی پێشکەش کرد. لە نێوان ساڵانی (١٨٨٠ - ١٩٠٠ز) ئەندامێکی کارای ئەنجوومەنی شارەوانی هەولێر بووە، لە کارە باشەکانی ساڵی (١٨٨٢ز) مزگەوت و قوتابخانەی خانەوادەکەیان (ئەحمەدی رفاعی) نۆژەن کردەوە، کە بەمزگەوتی پاشا لە گەڕەکی عەرەبی کۆن ناسراوە، هەر ئەو مزگەوتە شوێنی خواپەرستی و رێبازی (رفاعی) بوو لە سەردەمی باپیرە گەورەیان، شێخی گەورە (سەید ئەحمەدی هەولێری رفاعی حوسێنی هاشمی)، شێخ ئەحمەد تاکە کەس بووە لە هەولێر، کە لەلایەن سەید (یەحیا ئەلوەیسی) مۆڵەتدرا و بووە بۆ رێبازی (رفاعی) مۆڵەتەکەش ساڵی (١١٨٨ک) بە شێخ ئەحمەدی رفاعی درابوو، هەروەکو گوتمان نەوەکانی شێخ ئەحمەد درێژەیان نەدا بە کاری باپیریان بۆ بڵاوکردنەوەی رێبازی (رفاعی)، بەڵکو چوونە ناو کارگێڕی و سیاسەتەوە، لەبەرئەوە تەنها چەند دەروێشێک و خەلیفەیەک لەسەر ئەم رێبازە مانەوە، ئەوانیش مۆڵەتی رەسمییان نەبوو، بۆیە ئەم رێبازە وەکو (قادری و نەقشبەندی) بەردەوام نەبوو.

لە لاپەڕەیەکی تۆمارگەی ئەنجوومەنی شارەوانی نووسراوە: لە کاتی خۆی سەید مەحموود دەبێتە سەرۆکی شارەوانی (بە وەکالەت). رۆژێکیان بە مەبەستی سزادانی سەرپێچیکاران بەتایبەتی (نانەواکان) سەردانی بازاڕ دەکات، پاش تاقیکردنەوەی (ئەنگوتک) دەردەکەوێ، کە چەند گرامێک لە کێشی خۆی کەمترە، یەکسەر بڕیار دەدا ئەوانەی سەرپێچییان کردووە، کە ژمارەیان (٨) کەسە (نەفی) دووریان دەخاتەوە بۆ دەرەوەی هەولێر و رەوانەی کەرکووک دەکرێن. سەید مەحموود ئاغا لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم (١٣٢٤ک) گەیشتەوە بەر بارەگای خودا و لە گۆڕستانی ئیمام محەمەد نێژرا.

تێبینی: بەگوێرەی هۆنراوەکەی محەممەد ئەفەندی موفتی ساڵی (١٣٢٤ک) مردووە.

**سەید مەردان ئاغای سەید مەحموود ئاغا: (١٨٩٨ - ١٩٧٥ز)**

ئەم بەڕێزەش لە قەڵات و لە گەڕەکی ئاغاکان لەدایک بووە، تاقانەی باوکی بوو، لای باوکی زۆر خۆشەویست بووە، لای خەڵکی هەولێر و دەوروبەری بە پاشای سەید مەحموود ئاغا ناودێر بوو، هەر لە منداڵییەوە خولیای راو و سوارچاکی بوو لەگەڵ ئامۆزاکەی خۆی (سەید زێوەر ئاغا) وەکو جمک وابوون، سەید مەردان ئاغا خاڵی ئەم بەڕێزانە بوو، (سەید زێوەر - مووسا ئاغا - نوورەدین ئاغا و عەتاوڵڵا ئاغای کوڕانی حاجی رەشید ئاغا - فارووق حەسەن ئاغای دزەیی - جەمیل ئاغای ئەسعەدی) لە بەناوبانگترین پیاوماقووڵانی هەولێر و خانەوادەی سەید ئەحمەد بوون، هەمیشە هەڵوێستی دژ بە ئینگلیز بوو، دژ بە ئینگلیزەکان لە گوندی (قوچەبڵباس و عەلیاوە)، کە هەردووکیان هی خۆی بوون، یاخی بوو، ئەوە بوو ئەمری دەستگیرکردنی بۆ دەرچوو، بەڵام پیاوماقووڵانی هەولێر بەتایبەتی مەلا ئەفەندی توانی ئەمری لێبووردنی بۆ دەربکات، پاش ژیانێکی سەربەرزانە و دلێرانە پاش ژیانێکی بە کەیف و خۆشی ئەمری خوای کرد و لە گۆڕستانی باپیرانی بەخاک سپێردرا، پێنج کوڕی لە دوا بەجێما:

١- سەید خدر ئاغا - ساڵی ١٩٣٧ لەدایک بووە، (معهد المحاسبة العالي) تەواو کردووە.
٢- سەید شامل ئاغا - ساڵی ١٩٤٣ لەدایک بووە.
٣- سەید ئەنوەر ئاغا.
٤- سەید فەخرەدین ئاغا.
٥- سەید ئەمیر ئاغا.

لە چەند دانیشتنێکی تایبەت

لەگەڵ (سەید شامل ئاغا)ی کوڕی ئەو زانیاریاینەشمان وەرگرت، کاک شامل دەڵێ: (هەروەک بۆمان گێڕایەوە - واتە سەید مەردانی باوکی گوایە، ٣٤ ژنی هێناوە. ڕۆژێکیان لەگەڵ خوشکی گەورەم خوالێخۆشبوو تاکو ٢٤ ناومان زانی ئەوانی دیکە ناوەکانمان نەزانی، هەر لەسەر بابەتی ژنهێنان ڕۆژێکیان لە هاوینی (تەمووز) ساڵانی سەرەتای شەستەکان دەرگا لێ درا و چوومە دەرگا - واتە کاک شامل - سەیرم کرد ئۆتۆمبێلێکی پێک ئاپ تایبەت بە پۆلیس بوو، پۆلیسێک لە هەواڵی باوکمی پرسی و گوتی باوکت لە ماڵەوەیە، منیش وەڵامم دایەوە و گوتم، بەڵێ، گوتی ئەوا بەڕێوەبەری پۆلیسە لە کەرکووک نیازی هەیە باوکت ببینێ، باوکیشم خوالێی خۆش بێ نووستبوو، وەئاگام هێنا و مەسەلەکەم بۆ گێڕایەوە گوتی بڕۆ ژووری دیوەخان بکەنەوە و با بفەرموون، لەگەڵ باوکم چاک و خۆشیان کرد، پاش ئەوەی بەخێرهاتنێکی گەرمی لێیان کرد، باوکم فەرمووی بەڕێوەبەری پۆلیسەکە ناوی لەبیرمان نەماوە، گوتی وەڵلا هیچ ئیش و کارم نییە، تەنها بۆ یەک شت نەبێ، ئەویش ناوبانگی جەنابتانم بیستووە، کە ٣٤ ژنت هێناوە تەنها بۆ بینینت هاتووم، باوکیشم دەستی بە پێکەنین کرد.... کابرام زۆر بە حورمەتەوە بەڕێ کرد).

کار و کاسبی باوکم ئەوە بوو، کە جووتیارێکی شارەزا بوو لە ناوچەی قوشتەپە، بە هەزاران دۆنم گەنم و جۆی دەچاند، هەروەها لە (عەنکاوە و عەلیاوە و قوچە بڵباس) گوندی



عەلیاوە نیشتەجێی خۆی بووە، ئێمەش وەکو هاوینەهەوارێ ڕۆژانی هەینی و پشووی قوتابخانە سەردانی عەلیاوەمان دەکرد.، خۆشترین ژیانمان هەر ئەو سەردەمە بوو، کە لەوێ ڕامان دەبوارد.

جۆری وڵاخی باوکم: بەڕاستی پسپۆڕ بوو لە هەڵبژاردنی وڵاخ، دەبووایە خۆی بچێتە لای (سەعید مووسڵاوی) لە مووسڵ و بیانکڕێت و هەمووشیان دەبووایە وەکو یەک بن، تەنها لە عەلیاوە ١٨ جووت هێستری دەگەڕا، هەموو یەک ڕەنگ و یەک تەمەن، تەنها تەماشای ناو زاریانی بکردبا، دەیزانی تەمەنی چەندە، ڕۆژێکیان ئەسپێکی بۆرەی کڕی لە (ڕێس) دەرنەچوو، وتی ئێمە دەتوانین پەروەردەی بکەین، بەڕاستی ئەسپێکی زۆر چاک دەرچوو.

قسە و نوکتەکانی باوکم، باوکم ژیانێکی زۆر خۆشی بردیتە سەر، ژیانی پڕ نوکتە و دانیشتنی دیوەخانە و قسەی نەستەق و پەندی پێشینان، ناتوانین لێرەدا باس بکەین، تەنها یەک ڕووداو نەبێ، ئەویش ئەوە بوو گێڕایەوە وتی: لە ساڵانی چلەکان دوو ئۆتۆمبێلم هەبوو، پێم خۆش بوو هەردووکیان ببەمە گوندی عەلیاوە شوفێریشم نەبوو، چونکە ئەو سەردەمە کەس نەبوو وەک شوفێر لێی بخوڕێ، بۆیە بڕیارم دا هەردووکیان خۆم بیانگەیەنمە گوندی، دوو زەلامیشم لەگەڵدا بوو، هەروەکو نوکتە یەکێکیانم لێخوڕی (٥٠٠) مەتر، هاتم ئەوی دیکەیانم بردە لای ئەو، بەو نزمە هەردووکیانم گەیاندە گوندی عەلیاوە، ساڵی ١٩٥٠ مۆڵەتی لێخوڕینی ئۆتۆمبێلی وەرگرتووە.

جگە لەوەی دژ بە ئینگلیز یاخی بووە، ڕۆژێکیان وەستا (سەباح) بۆمی گێڕایەوە (وەستا سەباح بۆ کاک شاملی گێڕایتەوە) خۆی لە ژیاندا ماوە، کە گوایە باوکی نزیک ئاوی میری لەگەڵ پۆلیسێک بە شەڕ دێت و دەمەقاڵێیان دەبێت، باوکی وەستا سەباح چەقۆیەک لە زگی پۆلیسەکە دەدات و ڕادەکات و دەچێتە لای باوکت (باوکی شامل) باوکیشت کە مەسەلەکەی زانی،

یەکسەر پێی دەڵێ برۆ دیوەخان، خۆم مەسەلەکە چارەسەر دەکەم، هەواڵ دەچێت بۆ بەڕێوەبەری پۆلیس، فەرمان دەدا، کە وازی لێ بێنن، دەستبەجێ باوکم لەگەڵ بەڕێوەبەری پۆلیس چارەسەری مەسەلەکەیان کرد، هەروەها باوکم لە گوندی (کشتەک)ی دەکرد بۆ هەر منداڵێک (تا)ی بهاتبایە، یەکسەر چاک دەبۆوە.

**سەید محەمەد ئاغا ئەلنەقیب کوڕی سەید عەبدوللا پاشا (١٣٣٩ک - ١٤١٢ک/ ١٩١٨ز - ١٩٩١ز):**

لە قەڵای هەولێر لەدایک بووە، پەروەردەی دەستی باوکێتی - سەید عەبدوڵلا - ی باوکی ساڵی (١٩٢١) کۆچی دوایی کرد، ئەو تەمەنی سێ ساڵان بووە، هەر لە سەردەمی منداڵی و لاوێتی زیرەکی و راوشکاری پێوە دیار بووە، لە دوای باوکی شوێنی لە دیوەخان گرتەوە، هەرچەندە منداڵیش بووە، بەڵام کار و کردەوەی گەورە بوو، هەر لە ساڵی (١٩٢١ - ١٩٥٨) پاشای عێراق و گەورە بەرپرسانی عێراق بە گەورە و (نەقیب)ی هەولێریان دادەنا، کاتێک تەمەنی گەیشتە هەژدە ساڵان، لەلایەن پاشای عێراق و (الوصي) لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقی بۆ چەند جارێک بە نائیبی هەولێریان هەڵبژارد، پەیوەندییەکی تایبەتی هەبوو بە (ساڵح جەبر) کە زەعیمی حزبی (الأمة) بوو، کە سەردەمێکیش سەرۆک وەزیران بوو، هەر لەلایەن حزبی ناوبراو بە جێگر و سکرتێر هەڵبژێردرا، ئەو کات ئەو حزبە بەگەورەترین و بەهێزترین حزبی عێراقی دادەنرا، گەلێک هەڵوێستی نیشتمانی و نەترس و نەگۆڕی هەبووە، لەو هەڵوێستانەش وەستان دژی پەیماننامەی (پۆرتسمۆس) لەگەڵ کۆمەڵێک نوێنەری پەرلەمانی عێراقی ساڵی (١٩٤٨) دواییش دەستیان لەکار کێشایەوە، لە هەڵوێستە نەتەوەییەکانیش ساڵی (١٩٤٧) هەر چوار ئەفسەری شەهیدی کوردستان (خێروڵلا عەبدولکەریم و عیزەت عەبدولعەزیز و مستەفا خۆشناو و محەمەد مەحموود قودسی) پەیوەندییان پێوەی کرد و داوایان لێ کرد لەلایەن (الوصي) و سەرۆک وەزیران (ساڵح جەبر) لێبووردنیان بۆ دەرچێ، ئەویش زۆر ئازا و بوێرانە بەرگریی لێیان کرد، بۆ ئەم مەبەستەش چووە لای (الوصي) لە کۆشکی (ئەلرەحاب) و لای (ساڵح جەبر)، بەڵام (الوصي) پەیمانەکەی خۆی نەگەیاندە جێ بە بیانووی ئەوەی کە گوایە ئەگەر ئەمانە لە سێدارە نەدرێن (فتنە)یەکی زۆر گەورە روو دەدات، هەموو لایەک دەگرێتەوە و کۆتایی نایەت، ئەوە بوو هەر چوار ئەفسەرەکە لە ١٩ی حوزەیران ساڵی ١٩٤٧ لە سێدارەدران، سەید محەمەد نامەیەکی توندی ئاراستەی ئەنجومەنی نوێنەران کرد و داوای لە ئەنجومەن کرد، کە ئەم تاوانە مەحکوم بکەن، چونکە تاوانێکە دژ بە هەموو کورد و نوێنەرانی کوردە لە ئەنجوومەن، بەڵام داواکەی پشتگوێ خرا، هەر بۆیە بێ پەروا و نەترسا و دەستی لەکار کێشایەوە و ئەم تاوانەی مەحکوم کرد.

لەلایەکی دیکەی ساڵی (١٩٤٧) دەربارەی فەلەستین ئەم وتارەی لە بەردەم ئەنجوومەن و (الوصي) و سەرۆک وەزیران ئاراستەی حکوومەت و گەلانی عێراق کرد:

بەڕێزان من وەکو عێراقییەک و کوردێک وا دەبینم بەڵکو وەکو ئەرکێک لەسەرم، ئەم بۆنەیە پشتگوێ نەخەم و لەم کۆبوونەوەیەدا، هەستی خۆم و برایانم لە باکوور... "مەبەستی کوردستانە"... بەرامبەر بە فەلەستین دەربڕم، هەموو شتێک شێواوە و تێکچووە و کۆتایی هاتووە لە فەلەستین، لە کاتێکدا ئێمە چاوەڕوانین داگیرکاران نیازی گڵاوی خۆیان بەدیار خست، ئەویش بەدروستکردنی وڵاتێکی جوولەکە لەناو دڵی وڵاتی ئیسلام کە یەکەم روگە (قبلە) دووەمین حەرەمی لێیە، من لەگەڵ ئەوانەدام کە قسە هیچ سوودی نییە، کاتی ئەوە هاتووە کە کاری یەکلاکەرەوە بکەین بەرامبەر ئەم (خەتەرە) و بە هەموو جۆرێک نەهێڵێن ئەم بڕیارە بە ئەنجام بگات، ئێمە ئێستا بەرامبەر دوو رێگاین، یەکێکیان ژیانی سەربەرزی و ئەوی دیکەیان مردن لە پێناو شەرەفی بەرز، گومانیش لە پێناو ئەم دوو رێگایە شەرەفە.

بەڕێزان... پێویستە بۆ جیهان بیسەلمێنین کە ئێمە وەکو ئومەتی ئیسلامی کە مێژوو شایەدمانە مێژوویەکی پڕ شانازیمان هەیە، بەو ملکەچی و سووکایەتییە رازی نین، با خائینانیش بزانن کە موسڵمانان دروست بوونە، بۆ ئەوەی بەسەربەرزی بژین، سەرداری خۆیان بن، نەک کۆیلە بن.

بەڕێزان... رزگارکردنی فەلەستینی خۆشەویست لەم زوڵمە، مافێکە خوای گەورە پێویستی کردووە لەسەر گشت مووسڵمانێکی (پیاو و ئافرەت)، هەر کەمتەرخەمییەک لە مووسڵمانان خوانەخواستە، روو بدات ئەنجامەکەی پچڕپچڕکردنی وڵاتانی ئیسلامە یەک لە دوای یەک، من ئەم قسەیە دەکەم وەکو کوردێک و وەکو هەستی هەموو کوردێکی "باکووری" خۆشەویست و لە جیاتی ئەوانیش پێتان دەڵێم ئێمە لەوپەڕی ئامادەباشیداین بە هەموو شێوەیەک بۆ "جیهاد" و فیداکاری لە پێناو فەلەستین....

**برای دڵسۆزتان**
**سەید محەمەد ئەلنەقیب**
**نائیبی لیوای هەولێر "اربیل"**

تێبینی: ئەم وتارە لە لاپەڕە (٢٧)ی دانیشتنی نائاسایی (١٨)ەمین ئەنجوومەنی نوێنەرانی بۆ ساڵی ١٩٤٧ خوێندۆتەوە.

ئەمە بەشێک بوو لە هەڵوێستی نەتەوەیی و نیشتمانی و ئایینییەکانی ئەم زاتە گەورەیە، دەستێکی باڵای هەبوو لە سیاسەت، نوێنەرێکی ئازا و چەلەنگ بوو کە ردنگە ئەم جۆرە هەڵوێستانە لەم رۆژگارەدا رەخنەی لێ بگیرێ، بەڵام بۆ ئەو سەردەمە پڕ بە پێستی خۆی بووە، داکۆکیکردن لە کورد و لە فەلەستین، کە بەداخەوە تاکو ئێستا هەندێک لە برا عەرەبەکان هەر بە نۆکەرمان دادەنێن و کەمترین مافمان پێ رەوا نابینن، مافی ژیان لەسەر زێدی باب و باپیرانی خۆمان. کەچی پیاوێکی وەکو سەید محەمەد ئاغای نەقیبی هەولێر ئەو سەردەمە بەرگریی لە کێشەی فەلەستین کردووە. ئەم پیاوە نوێنەرێکی زۆر ئازا و چاونەترس بوو، بە دڵسۆزییەوە بۆ دۆزی رەوای کورد تێ دەکۆشا. کەسایەتییەکی دیار و ناودار بوو، نەک هەر لە کوردستان بگرە لە بەغدا و عێراقیش.

نوێنەرێکی راشکاو بوو لە گوفتارەکانی، دیارترین نوێنەری کوردستان بووە لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق، گوندی (قەتەوی) کە هی خۆی بووە، هەر لەو گوندەش پێشوازیی لە (نووری سەعید) و (الوصي عبدالاله) و (ساڵح جەبر) و سەعید قەزاز و گەورە پیاوانی هەولێر و عێراقی دەکرد، ئەم گوندە جوان و قەشەنگە لە چلەکانی سەدەی بیستەم ئەم شتانەی تێدا بوو، هەرچەندە سەید محەمەد بوتە هۆی هێنانی: (هێڵی تەلەفۆن، باڵەخانەیەکی گەورە، کارێزێکی گەورە، رەز و باخێکی زۆر)، هەر لەم گوندە سەید محەمەد لەگەڵ ئەندامانی (حزب الأمة الأشتراكي) کۆبوونەوەی گرێ دەدا، بێجگە لەم گوندە گوندی دیکەشی هەبوو (مزئەحمەد، ئۆمەراوە، قەفرە، سەرکوڕ، بەرحوشتر....)، دوای ژیانێکی سەربەرزانە ساڵی ١٩٩١ لە بەغدا کۆچی دوایی کرد، بەداخەوە حکوومەتی کوردی پەرلەمانی هەڵبژێردراوی بە چاوی دڵسۆزی نەبینی، خەون خۆزگەی تەمەنی بردە ژێرگڵ.

١٠- سەید عوسمان ئاغای سەید عومەر ئاغا: ئەوەش یەکێکە لە کەسایەتییەکانی ئەم بنەماڵەیە، هەڵبەتە لەبەر هەڵکەوتوویی و ناوبانگی بنەماڵەکەیان، حکوومەتی عێراقی لە سەردەمی پاشایەتی لە ساڵی ١٩٢٢ز بە سەرۆکی شاردوانی هەولێر هەڵی دەبژێرێت، بەڵام وا دیارە تەمەن دەرفەتی نادات و هەر لەم ساڵەدا بە کارەساتی ئۆتۆمبێل لە نێوان رێگای هەولێر - مووسڵ گیانی لەدەست دەدات و دەچێتەود بەر دلۆڤانی خودا و لە تەک تەرمی پیرۆزی باوکی لە گۆڕستانی باب و باپیرانی دەنێژرێت. لە دوای خۆی دوو کوڕی بەجێ هێشت:

أ- سەید قەرەنی عوسمان ئاغا لە قەڵای دایکبووی هەولێر لە ساڵی ١٩٢١ یەکێکە لە کەسایەتییەکانی شاری هەولێر، لە بواری کشتوکاڵدا کاری کردووە، بەتایبەتی لە گوندی (شێراوە)ی نزیک (قۆڕیتان)ی سەر بە ناوچەی (قوشتەپە) و لە هەرەتی لاویەتی خولیای راووشکار بوو و کەسایەتییەکی خۆشەویستە لەلایەن چینی کاسبکارانی ناوشار و لە ساڵی (١٩٤٧) لە شارەوانیی هەولێر کاری کردووە خزمەتی ئەو شارەی کردووە لە بواری کارەکەی کە (٢٥) ساڵی خایاند و ئەندامی ئەنجومەنی شارەوانی هەولێر بوو، دوو کوڕی هەیە:

١- عەباس قەرەنی ئاغا، لەدایکبووی هەولێر ساڵی ١٩٥١ دەرچووی کۆلیژی کشتوکاڵە، لە بواری پسپۆڕی خۆی کار دەکات و تەکلیف کرا ئەرکی (بەڕێوەبەری گشتیی کشتوکاڵی هەولێر) پێ بسپێردرێت لە دوای راپەڕینی ساڵی (١٩٩١) تاکو ساڵی (١٩٩٩) و دوایی ئەرکی (بەڕێوەبەری گشتیی

دیوانی وەزارەتی کشتوکاڵ)ی پێ سپێردراوە تاکو ئێستا بەردەوامە، (٨) ساڵیش ئەندامی ئەنجومەنی شارەوانی هەولێر بوو، لە خزمەتکردنی ئەو شارە هەروەکو باوک و باپیرانی، جێ پەنجەی دیار بووە.

٢- شەهید ماهیر قەرەنی ئاغا، لەدایکبووی هەولێر ساڵی (١٩٥٦) دەرچووی کۆلیژی ئەندازە، لە بواری پسپۆری خۆی لە هەولێر بەتایبەتی لە بواری بیناسازی گەشتوگوزار کاری کردووە، دوای ساڵی (١٩٩٦) ئەرکی (جێگری پارێزگاری هەولێر)ی پێ سپێردراوە و لەو ئەرکەی خزمەتی زۆری کرد لە بواری پسپۆری خۆی و جێ پەنجەی دیار بوو لەو جۆرە کارانەی بەتایبەتی دروستکردنی (کۆشکی هونەر) لە هەولێر، جێی بروا و متمانەی لێپرسراوان بوو، بەڵام بەداخەوە لە کارەساتە تیرۆریستییەکەی لقی/٢ی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ساڵی (٢٠٠٤) لەگەڵ دەستەیەک لە هەڤاڵانی شەهید بوو چووە کاروانی شەهیدانی کوردستان.

ب- نازم عوسمان ئاغا، لە قەڵای هەولێر ساڵی (١٩٢٤) لەدایک بووە، هەر لە هەرەتی لاویەتی ئیش و کاری کشتوکاڵی لە گوندی (شێراوە)ی سەر بە ناوچەی (قوشتەپە) بەڕێوە بردووە، لە پەنجاکان لە (ئیعاشەی هەولێر) کاری کردووە و دوایی کاری کارگێڕی (ئیعاشەی) وەرگرت تاکو خانەنشین بوو لە ڕێگای کارەکەی، بەتایبەتی دابینکردنی خۆراک بۆ هەولێر و ناوچەکانی سەرووی هەولێر زۆر خزمەتی شارەکەی کرد.




**سەید زێوەر ئاغای سەید عومەر ئاغای ئەحمەدی (١٨٩٨ - ١٩٦٣ز):**

سەید زێوەر لە قەڵا لەدایک بووە، لە کەسایەتییە هەرە دیارەکانی شاری هەولێر بووە و سەردەمانێک ئەو بۆتە بەرپرس و سەرداری بنەماڵەی سەید ئەحمەدییان، لە ماڵی سەید عومەری موستەنتیق، لەسەر خووڕەوشتی بەرز و مەردانە پەروەردە بوو، هەر لە منداڵییەوە خولیای دەشت و سوارچاکی بووە، قسە خۆش و ڕووخۆش بووە، تەمەندارەکان زۆر باسی سوارچاکی ئەو کەڵەپیاوە دەکەن، لەوانەش مێژوونووس (شەریفی عوسمان ئالبەند) لەو چالاکییانەی توانوویەتی... کاتێک والی بەغدا لە ساڵی (١٩١٣ز) سەردانی هەولێری کردووە، قائیمقام و نەقیبی ئەشرافانی هەولێر (سەید عەبدوڵڵا پاشا) و ئەندامانی کارگێڕی هەولێر و پیاوماقووڵان و سەرۆک هۆزەکان گەردی و دزەیی لە (پردێ) چوونەتە پێشوازی (والی)، چەندین سوارچاکیش ئامادەی پێشوازیکردنەکە بوونە، ئیدی ئەوە بوو سوارچاکان بۆ نیشاندانی خۆشی کەوتنە جلیت بازانێ و سوارسوارێ، کەرخی عەگید سواران دەرکەوت، سەید زێوەر و سەید مەردانی ئامۆزای ئامادە بوون، دوای تەواوبوونی ڕێوڕەسمی پێشوازییەکە، (والی) داوای لە سەید عەبدولکەریم کرد، کە چاوی بەم دوو لاوە بکەوێ، چونکە دیار بوو ئەسپی خۆیان باش تاو دابوو و جێگای سەرنجی (والی) بوون، بۆیە (والی) دوو لە باشترین ئەسپی لە پای ئازایەتی و بەجەرگیان پێیان بەخشی.

ئەم پیاوە وەکو کەسایەتییەکی ناودار و هەڵکەوتوو، دۆستایەتییەکی بە تینی لەگەڵ خەڵک و چەندین کەسایەتی ناودار هەبوو لەوانەش: "ساڵح جەبری سەرۆک وەزیرانی عێراق/١٩٤٧، ئەحمەد موختار بابانی سەرۆک وەزیرانی عێراق/١٩٥٨، سەعید قەزازی وەزیری ناوخۆ و ئەمین زەکی

بەگ و زۆرانی دیكە"

لە ساڵانی (١٩٢٩ز-١٩٤٠ز) لەگەڵ حاجی شەهابەدین دەباغ بە ئەندامانی بەڕێوەبردنی هەولێر و شارەوانیی هەڵبژێردران، موتەسەرفیش بێ ئەوان هیچ بڕیارێكی نەدەدا، لە دوای سەید عەبدوڵڵای مامی عەمیدی خانەوادەی (السادة الأحمدیة) بوو، لە ساڵی ١٩٦٣ كۆچی دوایی كرد، لە گۆڕستانی ئیمام محەمەد نێژرا...، كوڕەكانیشی:

١- سەید سوار ئاغا.
٢- دادوەر سەید جەلال ئاغا.
٣- سەید بەهجەت ئاغا.
٤- سەید تەڵعەت ئاغا.
٥- سەید كەمال ئاغا.

سەید سوار ئاغای سەید زیوەر ئاغای ئەحمەدی نەقیب: یەكێك لە كۆڵەگەكانی خانەوادەی ئەحمەدی بووە لە هەولێر و دەوروبەری ساڵی ١٩٢٣ لە قەڵا لەدایك بووە، پەروەردەیەكی جوان و دروست پەروەردە كراوە، هەر لە منداڵییەوە خولیای سوارانێ و راو و شكار بووە، ساڵی ١٩٢٨ چۆتە بەر خوێندن لە قوتابخانەی هەولێری یەكەمی سەرەتایی، ساڵی (١٩٣٤ - ١٩٣٩) دواناوەندی تەواو كردووە، ساڵی ١٩٤٧ بۆ یەكەم جار وەزیفەی (نووسەری یەكەمی دادگای بەرایی - كاتب أول محكمة بداءة أربیل) دروست كرا، یەكەم كەس لەو شوێنە دامەزرا، سواراغا بوو، دواییش بۆ زیاتر لە دە ساڵان بووە بەڕێوەبەری دادگای بەرایی، زۆر جاریش بەهۆی دڵسۆزی و مكوڕبوونی لەسەر كارەكانی سوپاسنامەی لە بەغداوە لەلایەن وەزیری داد و پشكێنەری گشتییەوە بۆ هاتووە. ساڵی ١٩٨١ وازی لە فەرمانبەرێتی هێنا و خانەنشین كرا، خۆی بۆ برا گەورایەتی بنەماڵەكەیان تەرخان دەكات، حەزی لە كاری سەربەخۆ بوو، بەتایبەتی كشتوكاڵ لە گوندی (دارەبەن و تیماری گەورە)، زۆر خزمەتی دڵسۆزانەی خەڵكی كردووە، تا لە ساڵی ٢٠٠٢ بە نەخۆشییەكی كۆچی دوایی كرد، ئەمەش نەوەكانیەتی:

سەید عومەر: لەدایك بووی ١٩٥٠ز، دەرچووی كۆلیژی ئەندازیاری كشتوكاڵ١٩٧٤/، لە وەزارەتی كشتوكاڵ پلەی شارەزایە"خبیر".

دكتۆر سەید سەردار: لەدایك بووی ١٩٥٩ز، دكتۆرای لە ئەندازیاری بیناسازی هەیە و ئەندامی ئەنجوومەنی شارەوانییە.

سەید بەرزۆ: لەدایك بووی ١٩٦٩ز، دەرچووی كۆلیژی كارگێڕی و ئابوورییە، بەڕێوەبەری وردبینییە لە شارەوانیی هەولێر، بە پەرۆشەوە گرنگی بە مێژووی بنەماڵەكەیان دەدات و دەستنووس و دیكۆمێنتەكانی -سەید ئەحمەدییان و نەقیبی ئەشرافان-ی لە ئەرشیفی خۆی پاراستووە.

١٣- دادوەر سەید زیوەر ئاغا سەید جەلال: لە ساڵی ١٩٣٥ز لە هەولێر لەدایك بووە، لە ساڵی ١٩٥٦ كۆلیژی یاسا و رامیاری تەواو كردووە، لە ئەندامە سەرەتاكانی یەكێتیی قوتابییانی كوردستان بووە و لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلوولیش پەیوەندی بەشۆڕشەوە دەكات، بۆیە لە دوای كارەساتی ١٩٧٥ بۆ باشووری عێراق دوور خراوەتەوە، دووچاری ناخۆشی و تەنگ و چەڵەمە بۆتەوە، هەر لە ساڵی (١٩٩٢)ەوە تا ساڵی ٢٠٠٦ ئەندامی تەمیزی كوردستان بوو.

سەید فازڵ سەید سەعید ئاغا (١٩٣٢-١٩٧٤): ئەم زاتە رۆڵی گەورەی لە دامەزراندنی یەكێتیی قوتابییانی كوردستان هەبووە، پێشتر ئەندامی حیزبی هیوا بووە و دواتر چۆتە ناو پارتی دیموكراتی كوردستان، لەو سەردەمەی قوتابی بووە لە كۆلیژی داد ساڵی ١٩٥٧ دۆستایەتی و نزیكییەكی باشی لەگەڵ ئەم بەڕێزانە: (حەبیب محەمەد كەریم، شەمسەدین موفتی، جەلال تاڵەبانی، جەمیل دزەیی، عەدنان نەقشبەندی، یەدوڵڵا) هەبووە، هەر لەو ساڵە بەشداریی ئەو نەورۆزە خۆشەی كردووە، كە لە بەغدا سازیان داوە، رەحمەتی جەلال مەدحەت خۆشناو لە نووسینێكی دەربارەی ئەم نەورۆزە دەڵێ: (هەواڵمان وەرگرت كە ئەمساڵ - واتە ساڵی ١٩٥٧-) لە دەروربەری بەغدای پایتەخت ئاهەنگی نەورۆز بە نهێنی دەگێردرێت، بۆیە هەر زوو لە بەیانی ٢١ی ئاداری ١٩٥٧ زۆر ئۆتۆمبێلی پاسە دارەكانمان بۆ ئامادە كرابوون و خەڵكێكی كوردی دڵسۆز و رۆشنبیر كەوتنە رێ بۆ ئاقاری (سەلمان پاك)، ئەوانەی سەرپەرشتی ئەو ئاهەنگەیان دەكرد و ئامادەیان كردبوو، ئەندام و لایەنگرانی پارتی دیموكراتی كوردستان بوون، لە سەلمان پاك ئاهەنگی سەیران گێڕدرا بە گۆرانی و سروود، بە هەڵپەركێ بە شیعر و وتار خوێندنەوە و یەكترناسین، بەڕاستی

سەیرانێک بوو پێشتر سەیران و ئاهەنگی وا لەو ئاقارە نەگێڕدرابوو... بۆ یەکەم جار بادینی و سۆرانی یەکتریان بەشایی و هەڵپەڕکێی خۆی دەناساند، یەکەمین جاریش بوو، کەوا ئەو هەندە کوردە لە دەوروبەری شاری بەغدا بۆ ئاهەنگ گێڕانی جەژنی میللەتی کورد جەژنی نەورۆز کۆبنەوە.

نەورۆزمان کرد و هیچ ڕووداوێکیش لە زانستی میری بۆ ئەو ئاهەنگە دەرنەکەوت و کۆتایی ئاهەنگەکەشمان بە هەڵپەڕکێی شێخانی زۆر ڕێکوپێک و گەورە بوو لە ژێر (تاقی کیسرا)، کە لەبەر ئاوازی تەمبوڵێ و دەهۆڵ و زوڕنا و سەرچۆپی شاییەکەم گرتبوو، دستەسرەکەم هەڵدەتەکاند بەرامبەر سەرسوڕمانی ئەو بێگانە و خەڵکانی بەغدا، کە بۆ سەیران لەو ئاقارە بوون.

پاش دەرچوونی بەیاننامە مێژووییەکەی یازدەی ئاداری ١٩٧٠ زۆربەی دەرچووانی کۆلیژەکان لە دامودەزگاکانی حکوومەت دامەزران، ئنجا ڕەحمەتی (سەید فازڵ) بووە بەڕێوەبەری ئەم (ناحیانە):

١- ناحیەی سەرسەنگ.
٢- ناحیەی هەورامان.
٣- ناحیەی سیروان.

سەید محەمەدی نەقیب: کەسایەتییەکی دیکەی هەڵکەوتوو و دیاری ئەو بنەماڵەیە سەید محەمەدی نەقیبە، شەرەفی ئەندامێتیی پەرلەمانی لە سەردەمی حوکمڕانی پاشایەتیی پێ دەسپێدرێت و ئەویش بە ئەمانەت و دڵسۆزییەوە لە ئەستۆی دەگرێت و لەم ڕێگایەوە خزمەتێکی زۆر بە کوردستان و هاونیشتمانییەکانی دەکات، نازناوی (نەقیب)یش لەلایەن مەلیک و وەصی و سەرەک وەزیرانەوە بەسەردا دەبڕێت، چونکە کەسێکی خانەدان و لە بنەماڵەیەکی گەورە و دیاری کوردستان و هەولێر بوو لە بنەماڵەی نەقیب.

ئەمە وێڕای چەندین کەسایەتی و پیاوماقووڵ و ناوداری دیکەی ئەو بنەماڵەیە، کە لەسەر هەردوو ڕێچکەی دین و دنیا خزمەتیان بە وڵات و شار و نەتەوەکەیان کردووە، لەوانە سەید عەبدولکەریمی خاوەنی گوندی میل، بە یەکێک لە باشترین سوارچاکی ئەو شارە دەژمێردرا، سەید سواراغاش کەسایەتییەکی دیکە و چازان و هەڵکەوتوویەکی دیکەیە، کە لە ناوەندی دادگا و قەزادا زیاتر لە پازدە ساڵ پۆستی سەرەکی ئیدارە و برا گەورەیی هەردوو گوندی (دارەبەن) و (مامزاوە)ی کردووە، سەید جەلالی زێوەراغاش، کە لە بواری دادگا و قەزادا کەسێکی دیار و بەناوبانگی عێراق و شاری هەولێرە و ئەندامی دادگای پێداچوونەوە (تمییز) لە پایتەختی کوردستان، کەسایەتییەکی دیکەی ئەم بنەماڵە ناودارەی شاری هەولێرە.

سەرچاوە: (ژێدەر)

أربيل في أربعة أعوام (موضوع البلديات) ١٩٦٢ - ١٩٦٧
سنتان في كوردستان (كابتن هاى) بەرگی یەکەم لاپەڕەکانی ٢١٢/ ٢٢٤، بەرگی دووەم لاپەڕەکانی ١٣٨/ ١٤٥/ ١٥٩/ ١٧٢/ ١٧٤.
أربيل في مختلف العصور، عباس العزاوي ص١٤٧، (بابەتی دست لەکارکێشانەوەی دژ بە لەسێدارەدانی چوار نەفسەرەکە).
تاريخ أربل، ابن المستوفي.
العراق الشمالي، محمد هادي الدفتر، ص٥٥٢ و ٥٥٣.
السيد أحمد الرفاعي، ص٢٩ و ٣٠.
الأكليل في محاسن أربيل، عبدالله فرهادي، ص٣٧٣ - ٣٩.
مێژووی گەلی کورد بەرگی دووەم، عەبدوڵلا زەنگەنە، لا٣٢٩، ٣٣٣، ٤٠٣، ٤٠٧.
اللغز المحير لعبدالكريم قاسم، بەرگی شەشەم (العميد خليل ابراهيم حسين)، لا٤٠٤، هەر لەم لاپەڕەیە وێنەی نوێنەرانی قوتابییانی کوردی تێدایە بۆ پیرۆزبایی چوونەتە لای عەبدولکەریم قاسم لە ڕێکەوتی ١٩٥٨/٩/١٩.
گەشتێک بەناو مزگەوت و تەکییەکانی شاری هەولێر، عومەر شێخ لەتیف بەرزنجی، لا٣٤، ٣٥.
تاريخ أربيل، زبير بلال اسماعيل، ص١٩٩، ٢٠٠، ٣١١، ٣١٢.
الشيخ چولي، زبير بلال اسماعيل، ص٢، ٢٣، ٢٨، ٤٨.
عشائر واسر السادة الحسينية الرفاعية، ص٣٠٥.
مذكرات المؤرخ الأربيلي (عثمان نالبند)، ص٦٧.
هەولێر لەگەڵ کاروانەی فەلەک، هادی ڕەشید چاوشلی، بەشی قەڵات، لا٢، ناودارانی هەولێر.
علماء ومدارس في أربيل، زبير بلال اسماعيل.
تراث أربيل التاريخي، هادي رشيد چاوشلي، فصل القلعة والأسر، ص٢٨.
دیوانی حەیدەری، ئامادەکردنی شێروان حەیدەری، هەولێر ٢٠٠٠.
د. سيد بكر غريب البرزنجي، ذروة اسنام الجهاد...!! الطبعة الأولى.
تاریق جامباز و نەژاد بەرزنجی، ئاماری دانیشتوانی قەڵاتی هەولێر ١٩٢٢، سەرای -تەکیە- تۆپخانە، چاپخانەی بینایی، چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠٠٦.

# ژیاننامەی شەهید (عەلی حەمە سەعید) ناسراو بە "حەمە عەلی"

خالید جوتیار

حەمە عەلی لە بنەماڵەیەکی جووتیار لەدایکبووە و لە ساڵی "١٩٤٢" لە گوندی هەڵەجەی سەر بە ناحیەی قوشتەپە چاوی بە دنیا هەڵهێناوە، لە پاشان لەبەر چەند هۆیەک گوندی هەڵەجە جێدێڵن و روودەکەنە ناوچەی قەراج لە دێی "قەبری سەید"ی سەر بە مەخموور نیشتەجێ دەبن، وەکو خۆمان گوتەنی لە هەرای جووتیاران وابزانم لە ساڵی "١٩٥٣" بووە دووبارە قەراجیان جێهێشتووە هاتوونەتە کەندێناوە لە دێی کاریتان نیشتەجێ بوونە، بەڵام لەبەر هەژاری و بێ دەرامەتی حەمە عەلی روو لە هەولێر دەکات و لە دوایدا دەبێتە کرێکاری فەرمانگەی کارەبا، حەمە عەلی هەر لە منداڵییەوە زۆر زیرەک بووە، بەڵام لەبەر نەبوونی بە ناچاری بووەتە کارمەند لەبەرئەوەی نەیتوانیوە بچێتە قوتابخانە، بەڵام بە زیرەکی خۆی توانیویەتی خوێندەوارییەکی باش پەیدا بکات، شەهید کەسێکی کۆمەڵایەتی بووە لەبەر ئەوە لەگەڵ هەموو چین و توێژەکانی گەلەکەی پەیوەندییەکی باشی هەبووە و خەڵک زۆر رێزیان لێی دەگرت، لە ساڵی شەستەکان پەیوەندی بە رێکخستنی شۆرشی ئەوکات کردووە و لە ساڵی ١٩٦٣ بۆ ماوەی "١١" مانگ لە بەندینخانەیەکی دیوانیە بەندکراوە، دوای ئەو ماوەیە ئازاد دەکرێ و دەگەرێتەوە شاری هەولێر لە ساڵی "١٩٦٨" تاکو ساڵی ١٩٧٠" دەبێتە سەرۆکی سەندیکای شوفێران، لە ساڵی ١٩٧٠ لەبەر بارودۆخی ئەوکات لە سەندیکا لادەبرێت و دووبارە دەبێتەوە کرێکار بە شوفێری لە دەواجن، لە ساڵی ١٩٧٤ بۆ دووەم جار دەبێتە جێگری سەرۆکی یەکێتی سەندیکاکانی کرێکارانی هەولێر تاکو ساڵی ١٩٧٦، جا ئەوکات بەعسییەکان داوایان لەو کەسانە کرد کە بەعسی نەبوون یا دەبێ ببنە بەعسی یان دەبێ سەندیکا بەجێبێڵن، ئەوەبوو حەمە عەلی و چەند کەسێکی تر نەبوونە بەعسی و سەندیکایان بەجێهێشت، بەڵام شەهید دووبارە گەرایەوە فەرمانگەی کارەبا.

لە ساڵی ١٩٧٨ پەیوەندی بە رێکخستنی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان کرد و تاکو ساڵی ١٩٨٥ لە لایەن بەعسییەکان فەرمانی گرتنی بۆ دەرچوو، بەڵام نەگیرا، ئیتر ئەوە بوو خۆی گەیاندە ناو ریزی پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان تا لە رۆژی "١٩٨٦/١٢/١١" لە گوندی زیارەت شەهید بوو، ئێستا گۆرەکەی لە گۆرستانی پیرداوەد و شەهید خاوەنی دوو خێزان بوو، لە خێزانی یەکەمی "٢ کور و ٢ کچ"ی بەجێهێشتووە و لە خێزانی دووەمیشی "١ کور و ٢ کچ"ی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە.

# مامۆستا خدر مەولود ئەمین

**ئا: لیژنەی ئینسکلۆپیدیا**

لەدایکبووی ساڵی "١٩٢١"ە لە بیرەبەرازەی سەر بە کەندێناوە، لە بنەماڵەیەکی هەژار لە هەولێر گەورە بووە و هەر بە یەکەمی لە قوتابخانەکان دەرچووە. لە گەنجییەوە بیر و باوەڕی کوردایەتی هەبووە و لە کۆمەڵەی "دار کەل" کاری کردووە، لەبەر بێ دەرامەتی نەیتوانیوە کۆلیژ تەواو بکا، بۆیە چووەتە پەیمانگای مامۆستایانی بەغداو لە ساڵی ١٩٤٠- ١٩٤١ بە پلەی یەکەم دەرچووە و لەناو شاری هەولێر وەکو مامۆستا لە قوتابخانەی اربیل الثانیە دامەزراوە، کە ئەوکات مامۆستا ئەحمەد ناجی بەڕێوەبەری ئەم قوتابخانەیە بووە.

لە ساڵی ١٩٥٣ بۆتە یەکەم بەڕێوەبەری قوتابخانەی "ئیبن خەلەکان" لە هەولێر، ئەو بیرەوەرییانەی لەسەر مامۆستای تێکۆشەر هەیە بریتین لە:

لە ساڵی ١٩٥٧ لە ئاهەنگی قوتابخانەکانی هەولێر سەرپەرشتی تیپێکی کرد بەناوی قوتابخانەی "ئیبن خەلەکان"، کە پێکهاتبوو لە جلوبەرگی کوردی گشت خێل و عەشیرەتەکان. ئەوە بووە هۆی سەرنج ڕاکێشانێکی گرنگ لەناو یاریگای هەولێر و هاوارکردنی بە بژی کوردستان.

لە ساڵی ١٩٦٣ مامۆستا دەستگیر کراو ڕەوانەی مسیب کرا بۆ سێ مانگ حەپس کرا، دوابەدوای ئەو ڕووداوە کە لەگەڵ دەستپێکردنی شۆڕشی ئەیلوول دەستی پێکرد، منداڵانی پێشمەرگە لە قوتابخانەکان جێگایان نەبوو، هەرچەندە زۆریان بەڵگەی نفوسیان تەواو نەبوو، هەروەها زۆر یارمەتی ماڵە پێشمەرگەکانی دەدا بە ڕێگایەکی یاسایی. تەپش کردن یان بلوز دروست کردن، بەهەرحاڵ مامۆستا خدر مەولود بوو بەڕێوەبەری قوتابخانەی یەکەمی نموونەیی هەولێر ناسراوبوو بە کوردایەتی و هەژار پەرستی.

یەکەمین جار بە کوردی ناو قوتابخانەی "ئیبن خولەکان" کە تاکە قوتابخانە بوو تابلۆکەی بە کوردی هەڵواسرێ لە هەولێر بە فەرمانی ئەو نووسراو هەڵواسرا. زۆر تووشی کێشەبوو لەسەر ئەوە.

مامۆستا خدر مەولود بە هەزارەها ڕۆڵەی کوردی پێگەیاندووە لە ناودارانی شۆڕشی ئەیلوول.

لە ساڵی ١٩٦٩ گوازرا بۆ ڕواندز، بەڵام دەست بەکار نەبوو ئەوە بوو داوای لێکرا دوای بەیانی یازدەی ئازاری ١٩٧٠ ببێتە موفەتیش، بەڵام خۆی قەبوڵی نەکرد و داوای خانەنشینی کرد.

لە ئازاری ١٩٩٩ بە نەخۆشییەکی پڕ ئەشکەنجە کۆچی دوایی کرد، دوای ئەوەی کوردستانی بە ئازادی بینی.

شایانی باسە مامۆستا خدر مەولود باوکی دکتۆر بەهرام خدر مەولودە، کە سەرۆکی زانکۆی سەلاحەدین هەولێر بوو، هاوڕێی گیانی بە گیانی مەلا تاهیر مەحمود و حاکم تەلعەت یەعقوبی و مەلا محەمەد مەلا قادر و حەمەئەمین میرخان میرگەسۆری بوو.




# شێخەكانی بەرزنجی - كۆیە

**شێخ سەربەست بەرزنجی**

شاری كۆیە هەرلەكۆنەوە چەند بنەماڵەیەكی دیار و ناوداری تێدابووە لەرەوتی كاروانی ئایینی وئەدەبی، سیاسی و رۆشنبیریدا دەوری بەر چاویان دیوە، كۆیە هەمیشە سەرچاوەی ئەدەب ومەعریفەت بووە

بنەماڵەكانی (غەفووری، شێخەكان، حەوێزی، مەلایان وزۆری تریش) لەوبنەماڵانەن خەڵكی كۆیەو ناوچەكە شانازیان پێوە دەكەن.

بنەماڵەی (شێخەكانی بەرزنجی) بە یەكێك لەبنەماڵە ناوداردكانی شاری كۆیە دەناسرێن بۆ زیاتر ناسینیان پێویستە ئاورێك لەمێژووی چەند سەدەیەك بەر لەئێستا بدرێتەوە.

شێخەكانی بەرزنجی (ساداتن) واتە لەنەوەی پێغەمبەر (محمد)ن دروودی خوای لەسەربێ لەزیكر و ئیرشاددا لەسەرڕێڕەوی تەریقەتی قادرین، كاتێ باپیرە گەورەیان (شێخ عیسا بەرزنجی وبراكەی شێخ موسای بەرزنجی) كوڕانی (شێخ باباعلی هەمەدانی) فەرمانیان پێدەكری لەهەمەدانەوە بەرەو كوردستان بڕۆن، هەردووكیان دێن ولەبەرزنجە نیشتەجێ دەبن، لەو دێیە مزگەوت وتەكیەیەك بۆ خواپەرستی و زیكرو تەقوا دروست دەكەن مێژووی ژیانی ئەو دووزاتە دوورو درێژە، شێخ موسا شەهید دەكرێ وهیچ منداڵی نابێ، شێخ عیسا بەپێی شەرع وبەڕەزامەندی كەسوكاری خێزانی شێخ موسای برای دەكاتە هاوسەری خۆی، پشت بەپشت نەوە دوای نەوەئەو بنەماڵەیە بەكاری ئیرشاد و وشیار كردنەوەی خەڵك ماندوو بوون، ئەهلی ناوچەكەش زۆر رێزیان لێگرتوون بەخزمایەتیان خۆشحاڵ بوون، شێخ عیسا بەقوتبی بنەماڵەی بەرزنجی دادەنرێ لەكوردستاندا، یەكێك لەنەوەكانی ئەو بنەماڵەیە كە بە هەشت پشت دەگاتەوە سەر شێخ عیسای بەرزنجی ناوی(سەید بابا ڕەسوولی بەرزنجی) بووە خاوەنی حەڤدە كوڕو شەش كچ بووە زۆرترینی (سادات) لەكوردستان وئێران دەچنەوە سەر ئەو زاتە. كوڕێكی سەید بابا ڕەسوول ناوی (شێخ عەلی) مەشهوور بە شێخ عەلی وندەرێنەیی بووە ئەویش دووكوڕی بووە یەكیان بەناوی(شێخ محەمەدی نۆدێ) ناسراو بەكبریت الاحمر (مربی الثقلین) ئەوی تریان (شێخ عیسای لۆتەری) كەزۆربەی نەوەكانی ئەو زاتەش لەناوچەكانی رانیەو سەنگەسەرو دەوروبەری و زۆر شوێنی

تری کوردستان نیشتەجێن.

شێخ محەمەدی نۆدێی کەسایەتیەکی زۆر پایەبەرزی سەردەمی خۆی بووە، پاش مردنی پێنج کوڕی بووە چواریان ناوو ناوبانگی گەورەیان هەبووە لەوسەردەمەدا کوڕی پێنجەمی زوو کۆچی دوایی کردووەکە ئەم زاتانەن:

١/ شێخ ئیسماعیل کە بە (شێخ ئیسماعیلی ولیانی) ناوبانگی دەرکرد بوو لەنەوەکانی ئەو زاتە (شێخ مستەفای شێخ عەبدولکەریمی دارەخورما)یە کە بە(شێخ کاکە)ی هەولێر دەناسرا، شێخانی هەشەزینی وشێخ محەمەدی وەلی عەهد و بەسەدان کەسایەتی تریان هەیە.

٢/ شێخ حەسەن کە بە(شێخ حەسەنی گڵەزەردە) ناوبانگی بوو شێخەکانی بەشێکی سلێمانی وهەولێرو کۆیەو کەرکوک و قەرەداغ و هەرەجەو دیبەگەو زۆر ناوچەی تر لە نەوەکانی ئەو زاتەن.

٣/ شێخ ئەحمەد کەبە (شێخ ئەحمەدی غەزایی) ناوی دەرکرد، حەزرەتی شێخ مارفی نۆدێ وکاکەحمەدی شێخ وشێخ مەحموودی مەلیکی کوردستان وسەدەها کەسایەتی تر لەنەوەی ئەو زاتە مویارەکەن.

٤/ شێخ عەلی کە بە(شێخ عەلی دۆڵپەمۆ) ناسراوە شێخەکانی مەریوان وبانەو زەڵێن و سورێن و زۆر شوێنی تر لەنەوەی ئەو زاتەن.

٥/ شێخ محەمەد بەمنداڵی کۆچی دوایی کردووە.

کوڕی دووەمی شێخ محەمەدی نۆدێ کە شێخ حەسەنی گڵەزەردە بوو (٨) هەشت کوڕی بووە بەناوەکانی: « شێخ محیەدینی قوولە، شێخ عەبدولکەریم، شێخ عەبدولجەبار، شێخ عەبدولڕەحیم، شێخ عەبدولسەمەد، شێخ محەمەد عارف، شێخ عیسا، شێخ مەعروف) نەوەی ئەو زاتانە لەناوچەکانی کۆیەو قەرەداغ وگەرمیان وشارەزوورو سلێمانی وهەولێرو کەرکوک وزۆر جێگای تر بلاوبوونەتەوە بەمەبەستی ئیرشادو قوولّ بوونەوەو تێگەیشتن لەئایینی پیرۆزی ئیسلام ودیفاع لە وولات.

یەکێک لەکوڕەکانی شێخ حەسەنی گڵەزەردە کەناوی (شێخ عەبدولکەریم) دەبێ دێتە گوندی(هەشەزین)وهەر لەوگوندە پاش بەسەربردنی تەمەنێکی کورت کۆچی دوایی دەکات ولەوێ بەخاک دەسپێردرێ لەپاش خۆی (٣) کوڕی دەبێ:

١/ شێخ عەبدوسەلام کەمەزاری پیرۆزی لەکۆیەیە، دوو کوڕی بووە بەناوەکانی(شێخ زوهێرو شێخ نەبیل) بەرەو ڕۆژهەلاتی ئوردن ڕۆیشتوون نەوەی زۆریان لەئوردن هەیە.

٢/ شێخ محەمەد بەمنداڵی کۆچی دوایی کردوە .

٣/ شێخ ئەحمەد ناسرا و بە (شێخ ئەحمەدی راجی) شوێنی باوکی گرتۆتەوەو لەسەر راسپاردەی حەزرەتی (شێخ مارفی نۆدێ) بۆشێخایەتی وبلاوکردنەوەی تەریقەتی قادری دێتە شاری کۆیە، بۆهاتنەکەی وایاس دەکرێ کە حەزرەتی شێخ مارفی نۆدێ وحاجی قادری کۆیی وشێخ ئەحمەدی راجی وحاجی مەلا ئەسعەدی جەلی زادە سەردانی مامۆستا مەلا محەمەدی مەشهوور بە(ئیبن وئادەم) دەکەن لەگوندی دێڵێژێی ناوچەی باڵەکایەتی، پاش بەسەر بردنی ماوەیەک دەگەڕێنەوە شاری کۆیە و لەتەکیەی حاجی مەلا ئەسعەد شێخ مارف باسی ئەوە دەکات کۆیە مامۆستای ئایینی وخوتبە خوێنی زۆر باشی هەیە کەسایەتیەکانی کۆیەش دەڵێن بەلام شێخی تەریقەتی شارەزامان نییە، حەزرەتی شێخ مارف ئەفەرموێ رازین کەسێکتان بۆ بنێرم هەردوو سیفەتەکەی تێدابێ، لەوێ بڕیار دەدات کە (شێخ ئەحمەدی راجی) بۆ ئەم پلەیە دەستنیشان کات، هەرکەسێ شێخ مارف دەستنیشانی بکربا کەس بۆی نەبوو ردتی کاتەوە، چونکە مستەشاری ئایینی وسیاسی حوکمی بابانیەکان بوو، بەم جۆرە

(شێخ ئەحمەدی راجی) بەیەکەم کەسایەتی بنەماڵەی(شێخەکانی بەرزنجی) دادەنرێ لەشاری کۆیە بۆ زانیاری زیاتر شێخ ئەحمەدی راجی لەگەڵ شێخ مارفی نۆدێ کوڕە ئامۆزان، (شێخ مارفی نۆدێ) کوڕی شێخ مستەفای شێخ ئەحمەدی غەزاییە، (شێخ ئەحمەدی راجی) کوڕی شێخ عەبدولکەریمی شێخ حەسەنی گڵەزەردەیە، هەردوو شێخ (غەزایی وگڵەزەردە) کوڕی (شێخ محەمەدی نۆدێ) کە ناسرابوو بە (کبریت الاحمر)، ئەو زاتەش دوای خۆی دووکوڕی بووە:

أ / شێخ مەعروف لەتەمەنی منداڵی مردووە.

ب/ شێخ عەبدولکەریم کەبەناوی باپیرەیەوە ناونراوەتەوە هەموو شێخەکانی (کۆیەو هەرەجە) نەوەی ئەو زاتە گەورەن کە بە (شێخ کەریمی کۆیە) دەناسرا مەرقەدەکەی لەشاری کۆیەیە

شێخ کەریم لەماوەی تەمەنیدا سێ ژنی هێناوە، هەشت کوڕو سێ کچی بووە بەم ناوانە:

١/ شێخ مەعروف ناسراوبە (شێخ مارفی هەرەجە) هەموو شێخەکانی هەرەجەو دەوروبەری لەنەوەی ئەو زاتەن، زۆر کەسایەتی ناوداریان تێدا هەڵکەوتووە لەوێنەی شێخ تایەرو کاک سەید(شێخ عەبدولقادر) مەرقەدی پیرۆزی لەگوندی هەرەجەیە.

٢/ شێخ محیەدینی کۆیە مورشدی تەکیەو رابەری تەریقەتی قادری بوو لەکۆیە، شاعیرێکی زۆر ناودار بووە لەقەبی شیعری (نیهانی) بوو تەکیەی (شێخ جەعفەر) لەهەولێر نەوەی ئەو زاتە سەرپەرشتی دەکات مەرقەدی لەگوندی هەرەجەیە.

٣/ شێخ بابا عەلی زۆربەی نەوەکانی لەکۆیە و دەور و بەرین و لەگەڵ بنەماڵەی غەفوریان خزمایەتی پتەویان هەیە مەرقەدەکەی لەکۆیەیە.

٤/ شێخ نجمەدین نەوەکانی لەکۆیە و هەولێر بلاوبوونەتەوە چەهچەو چریکەی ئەو شێخە موبارەکە لە بۆنە ئایینیەکان خەڵکی دەهەژاند وەکو باسی دەکەن لەدەنگی زوڵاڵی پیاڵەوپەرداخی سەر رەفەی تەکیەکەی هێناوەتە لەرین و بەربوونەوە، مەرقەدی پیرۆزی لەگوندی هەرەجەیە.

٥/ شێخ عەبدوسەلام نەوەکانی زۆریان لەدەشتی هەولێرو ناوچەکانی دەوروبەرین، کەس نەیتوانیوە لە پاڵەوانی وزۆرانبازیدا شان لە شانی بدات، مەرقەدی لەهەرەجەیە.

٦/ شێخ رەزا نەوەکانی زۆریان لەهەولێرو دەوروبەرین مەرقەدی لەگوندی هەرەجەیە.

٧/ شێخ ئەحمەد ناسراو بە (سید ئەحمەد) ی کۆیە شاعیرێکی ناوداری کۆیە بووە نازناوی (حسێنی) بوو دیوانی گەورەی شیعری بەزمانی کوردی وفارسی هەیە، دەستنووسێکی تری هەیە بەزمانی فارسی بەناوی (بحر الانساب للعائلة البرزنجیة)، هەموئەو دەستنووسانەی لای(شێخ ئەنوەری) کوری پارێزراون، نەوەکانی ئەم زاتە لەهەولێرو سلێمانی وکۆیەن مەرقەدی لەکۆیەیە لای باوک و باپیری نێژراوە.

٨/ شێخ سەدرەدین نەوەکانی ئەم زاتەش لەکۆیەو هەولێرو بەغدا بلاوبوونەتەوە، کەسایەتیەک بوو لە تەکیەو دیوەخانەکەی کەس بەنامەحرومی نەگەڕاوەتەوە شێخ بۆی جێبەجی کردووە، مەرقەدی لەشاری کۆیەیە نزیک باوک وباپیرانی نێژراوە.

٩/ زێباخان هاوسەری شێخ مستەفای (کاکی هیرانی) ناسراو بە(صافی) شاعیری گەورەی کورد بوو، نەوەکانی لەناوچەکانی خۆشناوەتی وکۆیەو هەولێرن لەناحیەی (هیران) نێژراوە.

١٠/ زەینەب خان ناسراو بە (حەزینە) ی شاعیر هاوسەری جەنابی حاجی مەلا عەبدوڵلای جەلی زادەی کۆیە بوو، دایکی دووەمی مەلا محەمەدە کەبە (مەلای گەورەی کۆیە) مەشهوور بوو، نەوەکانی لەکۆیەو هەولێرو بەغداو زۆر شوێنی ترن لەکۆیە نێژراوە.

١١/ عائشەخان هاوسەری شێخ عەبدولکەریمی حاجی شێخ مەحموودی حاجی شێخ محەمەدی تەکەڵتوو بوو نەوەکانی لەکۆیەو هەولێرو بەغداو هەندی شوێنی ترن لە سلێمانی نێژراوە.

لەرووداوێکی ناخۆشدا لەکۆیە هەوڵی کوشتنی(شێخ کەریمی کۆیە) دەدرێ، هەرچەندە پیلانەکە سەرکەوتوو نابێ، پاشان بەسولح کۆتایی بەکێشەکە دەهێنرێ، شێخ مارف و هەریەک لەبرایەکانی (شێخ محیەدین وشێخ رەزاو شێخ نەجمەدین وشێخ عەبدوسەلام) روو دەکەنە دەشتی هەولێر ولە گوندەکانی هەرەجەو ئاخورە و رەسول بچکۆل ولاجان وسابلاغ ومیرزاغا و هەندێ دێهاتی تر نیشتەجێ دەبن بە(شێخەکانی هەرەجە) دەردەکەون، شێخ بابا عەلی وسید ئەحمەد و شێخ سەدرەدین لە خزمەت باوکیان درێژە بەژیانی ئاسایی دەدەن تاکۆچی دواییان لەگۆرستانی (دەروێش خدر)ی کۆیە لای باوک و باپیرانیان دەنێژرێن ئەوانیش بە (شێخەکانی کۆیە) ناودار دەبن.

باس کردنی هەریەک لەخانەوادەو بنەماڵانەی ئەو شێخانە، ژیان وسەربوردەیان، هەڵدەگری چەندین کتێب ونامیلکەیان لەسەر بنووسرێ وبەهەموو خەڵکی کوردستان و عیراق ئاشنا بکرێن (شێخەکانی بەرزنجی - کۆیە) بەجۆرێ تێکەڵ بە شارستانی بوون لەهەموو بوارەکانی ئایینی وئەدەبی، رۆشنبیری وسیاسی، سەربازی و ئیداری کەسایەتی زۆر لێهاتوو وبەتواناییان تێدا هەڵکەوتووە مایەی شانازین بۆ نەتەوەکەمان.

لاپەرەکانی مێژووی کوردایەتی وکاروانی رۆشنبیری وئەدەبی بەسەربەرزیەوە باس لەو کەسایەتیانەو بنەماڵەکانیان دەکا، نەوەکانی (شێخ کەریمی کۆیە) لەکۆیەو هەولێرو ئەوشوێنانەی لێی نیشتەجێن، ئەو خزمەتەی پێشکەشیان کردووەو دەیکەن بەئەمانەتەوە، بەویژدانی ئەخلاقی ونیشتمانیەوە لاپەرەکانی سەروەری وشەرەفمەندی تۆماریان دەکات، ئەوانەی کۆچی دواییان کردووە لە خانەی نەمرانن ئەوانەش لەدونیاداماون لەش ساغ وتەمەن درێژبن تازیاتر خزمەتی گەل و نیشتمانەکەیان بکەن کەکوردو کوردستانە.



# تاهیر ئاغای تەیراوە

شوان غەمبار

**تاهیر ئاغا کێیە؟**

ناوی تەواوی تاهیر ئاغا کوڕی ئیسماعیل ئاغا کوڕی سەعدولا ئاغا کوڕی موسا ئاغایە، لە ساڵی (١٩١٠) لە گوندی چەمە دوبز هاتۆتە دنیاوە، لە ساڵی ١٩٧٤ لەشاری هەولێر کۆچی دوایی کردووە، شایانی گوتنە ناوبراو لە عەشیرەتی (بەیات) بووە.

**دیوەخانی تاهیر ئاغا**

هەموو چین و توێژێکی کۆمەڵ جێگای دەبۆوە، پیاو ماقوڵانی شار و سیاسەتمەدار و ڕۆشنبیران هاموشۆی ئەو شوێنەیان کردووە، شەوان تا نزیکەی بەرەبەیان بەردەوام دەبوو، کۆڕی لاوک و حەیران و گۆرانی و بەزم و ڕەزمی فۆلکلۆری تێدا ساز دەکرا، مقام خوێن و دەنگ خۆشەکان دەنگی خۆیانیان تێدا هەڵدەبڕی، ئەوەی گیروگرفت یان خەمێکی لە دڵدا بووایە لەوێ لەبیری دەکرد، زۆر جاریش کێشەی کۆمەڵایەتی و گرفتی ڕۆژانەی خەڵکی لێ چارەسەر دەکرا، بەڕاستی ئەو دیوەخانە وەکو کۆلێژ و فێرگەیەکی گەورە وابوو زۆر خزمەتی کۆمەڵگای کوردەواری کردووە.

**سیفاتی تاهیر ئاغا**

زۆر سەخی تەبیعات و نان بدە و چاوتێر بووە، هەمیشە لەگەڵ هەژار و بێ نەواکان دادەنیشت و نانی دەخوارد، بێزی لەکەس نەدەبۆوە.

هەموو سامان و موڵک و ماڵەکەی بەخشیوە، هەرچی داوای زەوی و پارەی لێ کردبێ، بێ بەشی نەکردووە زەویەکی زۆری بەخەڵک بەخشیوە، زۆر پۆشتە و پەرداخ و بۆن خۆش بوو، لەگەڵ ئەوەش کە بە (سابوون) خۆی نەدەشووشت و بۆن و گوڵاوی بەکار نەدەهێنا، خاوەن دڵ و دەروونێکی پاک و هەستێکی زۆر ناسک بوو، دڵ و چاوی تێر بوو هەمیشە لە خەمی فەقیر و هەژاراندا بوو.

ئەوانەی هەمیشە هاتوچوی ئەویان دەکرد لە دیوەخانەکەی بریتی بوون لەو بەڕێزانە کە زۆربەیانی چوونەتە بەر دلۆڤانی خودای گەورە.

١- عەبدوڵڵا ئاغای نەقیب.
٢- مەعروف ئاغا.
٣- عەونی یوسف.
٤- تۆفیقە درێژ باوکی هونەرمەند (تاهیر تۆفیق).
٥- گیوی موکریانی.
٦- شێخ حەسەن نیعمەتوڵڵا.
٧- حسێن ڕەشوانی.
٨- محەمەد تاهیر ئەتروشی.
٩- سەید قاسم خەیات.
١٠- مەلا عەلیە شەل.

هەندێ لەو کەسایەتیانەی کە بەردەوام لەلای تاهیر ئاغا بوون

**- مەلا عەلیە شەل :**

نوێژی نەدەکرد، مەلایەکی زانای قسەزان بوو کە دەکەوتە قسە، دانیشتووانی دیوەخان چاوان ئەبلەق دەبوو، بەردەوام دوڕ و گەوهەری لەزاری دەباری.

**- عەلۆ پالانی :**

سەرکاری تاهیر ئاغا و لاوکبێژی دیوەخان بوو، هەموو بەیت و بالۆرەو سەربردەیەکی دەزانی، دەڵێن (کاوێس ئاغا زۆر سوودی لەو زاتە وەرگرتووە). جگە لەوە سوعبەت چی و قسە خۆش بوو، بەنوکتە و نواندنە سەیرەکانی دانیشتووانی دەهێنایە پێکەنین، شتی وای دەکرد سەر بەقوری دەخستە پێکەنین، ساڵی ١٩٧٧ کۆچی دوایی کردووە.

**لاوکبێژ و حەیرانبێژەکانیش بریتی بوون لە:**

١- حەسەن خەنجەر.
٢- حەمەد مەندۆ.
٣- عەلۆ پالانی.
٤- سمایلۆک مهاجیر.

خدر مەرجان و ئەحمەد گوارێ

خدر مەرجان بلوێری دەژەنی و زوڕنا ژەنێکی بلیمەتیش بووە، ئەحمەد گواریش دۆلەنگیۆ بوو، بەیانیان زوو لەبن قەلاتی، مەنجەڵی چێشت بۆ فەقیر و هەژاران دەخرایە سەر ئاگر شایی دەکرا هەتا نان دەخورا، وەک لەزاری خۆی دەگێڕنەوە تاهیر ئاغا گوتوویەتی ڕۆژی (١٠٠) دینارم هەبووە هەر هەمووشم بەسەر فەقیر و هەژاراندا دابەش دەکرد بۆ بەیانی دوو ئەوەندە دەهاتەوە جێگای!!

**گەرەکی تەیراوە**

کە تازە گەڕەکی تەیراوە دانرابوو ئەوکاتە دزی کردن زۆر باو بوو، تاهیر ئاغا بۆ پارێزی لەماڵ و دانیشتووانی تەیراوە هەر شەوە گەنجێکی دەکردە پاسەوان و تفەنگی دەدایێ.

**تاهیر ئاغا و ڕاو**

تاهیر ئاغا زۆر حەزی لەڕاووشکار کردووە، هەمیشە لەگەڵ عەلۆ پالانی و مەعروف ئاغادا ڕاوی کردووە.

**پیرداودە کۆر**

جارێکیان هونەرمەندی شاری هەولێر پیرداودە کۆر دێتە دیوەخان دەڵێ : ئاغا (٥) دینارم بدێ منداڵمان بووە، دۆشاوی پێ دەکڕم ئەویش (٥) دیناری دەداتێ.

**حەساری تاهیر ئاغا**

تاهیر ئاغا حەسارێکی هەبوو ٣٠ ماڵە هەژاری تێدا دەژیا، هەموو جاریش بەسەر کارەکەی دەگوت : ئەگەر نەیانبوو هیچیان لێ وەرمەگرە.

جارێکیان پیاوەکەی دێتەوە دەڵێ : چووم کەسیان یەک فلسیان نەبوو، تاهیر ئاغا دەست ئەکا (بەگریان) لێیان خۆش دەبێ، پێیان دەڵێ تا ئێوە لەم حەسارە بن یەک فلستان لێ وەرناگرم.

سڵاو لە تاهیر ئاغا، لەچاکە و پیاوەتی و ئەمەکداری و ڕەوشتی بەرزی کوردەواری.

* تەواوی زانیاری ئەم نووسینەم لە مامۆستا مشیر تاهیر ئاغا کوڕی خوا لێ خۆشبوو تاهیر ئاغا وەرگرتووە.

# پرۆفیسۆر ئیحسان دۆغرەمەچی

**مەحمود چەلەبی**



پرۆفیسۆری بەناوبانگ ئیحسان عەلی پاشا ناسراو بە ئیحسان دۆغرەمەچی لە قەڵای هەولێری پایە بەرز ساڵی ١٩١٥ لە باوک و دایکێکی تورکمانی هەولێر لەدایکبووەو دوو کوڕ و کچێکی هەیە. هەروەها دەبێتە خاڵی بەڕێزان سینان و مەحموود چەلەبی و خوالێخۆشبوو حاجی فەرید چەلەبی، ناوبراو خوێندنی سەرەتایی لەهەولێر تەواوکردووەو ناوەندیشی لە قوتابخانەی(بن بوغ) لە لوبنان تەواوکرد. دەرچووەکانی لەگەڵیشی بوون"عیزەددین مەلا ئەفەندی"بووە.

پاشان لەزانکۆی پزیشکی لەبەغدا وەرگیرا، لەدواییدا خوێندنی پزیشکی لە ئەستەمبوڵ تەواوکردو پسپۆری پزیشکیشی لە ئەمریکا بە سەرکەوتوویەکی پلە بەرزانە وەرگرت.

ناوبراو کچی سلێمان حیکمەتی بەناوی ئەیسەل خانم خواست کە باوکی سەرۆک وەزیرانی عێراق بوو، لەسەردەمی حوکمڕانی پادشایی لەعێراق، هەروەها باپیری خێزانەکەشی مەحموود شەوکەت پاشا داغستانی بوو کە "صدر الاعظم"بوو لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، ئیحسان پاشا خاوەنی گوندی قونیانی نزیک شاری هەولێرە، هەر لەپلەی زانیاری و زانستی رۆژ بەرۆژ سەرکەوتووە، شایەنی باسە ئیحسان دۆغرەمەچی خاوەنی ٢٨٠بڕوانامەی دکتۆرای فەخرییەو چەندین میدالیای رێزلێنانی لەبواری پەروەردەو زانست پێبەخشراوە، لەسەر بناغەی وەرگرتنی خوێندکاران لە زانکۆکانی تورکیای نوێ.

هەروەها چەندین پرۆژەی دروستکردنی نەخۆشخانەی ناسراوی لەتورکیاو وڵاتانی دیکەی جیهان دامەزراند، هەروەها لە پەیڤە بەناوبانگەکەی کە کاتێک نەخۆشخانەی حاجی تەپە ئاگری گرت، وتی: ، "با هەمووی بسووتێ تاکو یەکێ باشتر لەسەر بناغەی زانست و سەردەمیانە دروستبکەم". هەروەها دەستی لە دامەزراندنی چەندین زانکۆی جیهانی بەناوبانگ هەبووە، وەک: زانکۆی بیلکنت لە ئەنقەرەی تورکیا، کە ئێستا لە زانکۆ هەرە بەناوبانگەکانی ئەو ١٢زانکۆ جیهانییەیە، کە هەر١٥ساڵ بۆ سەرکەوتوویی لەبواری زانستی هەڵدەبژێردرێ و هەروەها هەڵوێستێکی بەرزی هەبووە لەبواری خزمەتگوزاری بەرامبەر بە میللەتەکەیدا، هەروەها بەبەردەوامی وانەی بەخوێندکاران لە زانکۆکەی خۆی و زانکۆیەکانی جیهانی بە پزیشکانی داوە، رۆژانەش بۆ وانە گوتنەوە بە فڕۆکە هاتووچۆی زانکۆ جیهانییەکانی دەکرد، کە ماوەی چەندساڵێکی خایاند بە حەوت زمانی جیهانی وانەکانی خۆی دەوتەوەو بە نازناوی کۆمپیوتەریش لەم زانکۆیانە ناونرا، لەسەر دەستی ئەو لەو زانکۆیانەدا چەندین پزیشک و زانای بەناوبانگ و کەسایەتییەکانی جیهان دەرچوون، لەماڵەکەی خۆیدا پێشوازی لە وەزیرو پیاوە ناودارە ئایینەکان و سەرۆک کۆمارەکان وەک: جورج بۆشی باوک و حەیدەر عەلیف و رەفسنجانی و سلێمان دیمیرێل و نور سوڵتان بایف و ئەمیر حەسەن و پاشا محەممەد پاشای مەغریب و سکرتێری نەتەوە یەکگرتووەکان کۆفی ئەنان و پترۆس غالی و وەرزشوانی ناسراوی جیهان بێلیە، بە دەیان جار پێشوازی لە سەرۆکی هەرێم و جێگری سەرۆکی هەرێم و وەزیرانی هەرێمی کوردستانی کردووە، سەرەڕای ئەمەش لەسەر بودجەی خۆی بە سەدان چارەسەری نەخۆشییەکانی سەختی کردووە لە گشت وڵاتانی جیهان، کە بەملیۆنەها دۆلار مەزندە دەکرێ.

ناوداری بەناوبانگی سەردەم ئیحسان دۆغرەمەچی، کۆمەڵێک کۆمپانیای بەناوبانگی بازرگانی هەیە کە لە ٦٦ کۆمپانیای جیهانی بەرهەمهێنەر پێکدێت و داهاتەکەی بۆ بەرژەوەندی زانکۆی بیلکنت تەرخانکردووە، ئێستا پرۆژەی بناغەی مزگەوتی"عەلی دۆغرەمەچی زادەی گەورە" لەناو زانکۆی بیلکنت دروستدەکات. هەروەها لەم دواییانەدا دەستی کردووە بە پەیوەندیکردن لەگەڵ حکومەتی هەرێم بۆئەوەی ئۆردوگایەکی خوێندنگە بە بەرزترین پلەی زانستی دروستبکرێت، کە پەیڕەوی خوێندنەکەی لە بەرزترین زانکۆکانی بەریتانیا وەربگیرێت، وەک: زانکۆی"کامبریج"ی بەناوبانگ، شایەنی وتنە ئەو ئۆردوگایە لەشاری هەولێرە لە نزیک سوڵتان مزەفەرەدین گۆگبوری کە کاتی خۆی بە"دوڕ"ی ئەدەب و زانست بەناوبانگ بوو.


کردستان ١٣١٥

بسم الله الرحمن الرحيم

ڕۆژنامەی کوردستان 1898/4/22

# ڕەوتی ڕۆژنامەنووسیی لە هەولێر

دکتۆر ئازاد عوبێد ساڵح
کۆلیژی ئاداب- زانکۆی سەلاحەددین

**دەروازە**

ڕۆژنامــە،گــازیت - غــەزەتە(١)، روزنامــە، الجـریدة، الصـحیـفـة، ژورناڵ- Journal daily،(٢)News paper یان daily paper ، بە پێی پێناســەی ئینسکلۆپیــدیای بەریتانیایی، خولە بڵاوکراوەیەکی بێ بەرگە بە کاتی ڕێک و پێک بڵاو دەکــرێتــەوە، دەنگ و باس دەگــوازێتــەوە، ڕۆژانە(٣) یان هەفــتــانە دەردەچێ. هەرچی لە نێــو دوو بەرگیش دابا، پێیان دەگوت کۆڤار-گۆڤار(٤).تا ئەوڕۆژەی ڕۆژنامــە دەرچوو، چەندین هەواری بەپێی پێشکەوتنی بناغەی ئابووری کۆمەڵگا بڕیوە(٥).

بە پێی سەرچاوەکان یەکەمین ڕۆژنامە لە ساڵی ٩١١ پ.ز لە وڵاتی چین بەناوی (کین بان) دەرچووە(٦). لە فەرەنسا لە سەدەی پازدەم و لە ئینگلتەرەش لە سەدەی شازدەم و دواتریش لە ئەڵمانیا و ئیتالیا(٧). دۆزینەوەو.داهێنانی ئامێری چاپ لەلایەن زانای ئەڵمانی گۆتەنبەرگ یوحەننا (Johannes Gutenberg) (١٤٠٠-١٤٦٨) لە ساڵی ١٤٣٦ شۆڕشێکی گەورەبوو لە بواری زانست و ڕۆژنامەوانیدا(٨).

یەکەمین کاری بەرچاوی ڕۆژنامە بەتەواوی مانا ئەوەبوو کە لە ڕۆژی ٣٠ مایسی ١٦٣١ تیۆدۆفراست رینۆدۆ (١٥٨٦-١٦٥٣) ڕۆژنامەیەکی بەناوی گازیت (Gazetta) )(٩) دەرکردووە. دواتر بەپەرەسەندنی چاپ لە



سەدەی حەڤدەهەمەوە لە سـالّی ١٦٦١ لەئەڵەمانیا "Leipziger Zeitung"و ١٧٨٤، ئینگلیزەکان (غەزەتەی کـەلکەتتـا Calcutta Gazetta) یـان لـە هندسـتـان دەرکـرد و لە ١٧٨٥ رۆژنامـەی بەنـاوبـانـگی (تـایمس The Times) دەرچـوو. عـوسـمـانییـەکانیش لە سالّی ١٨٢٥ یەکەمین رۆژنامەیان بە فەرەنسی لە ئەزمیر دەرکـردووە و لەسـالّی ١٨٣٢ یشـدا رۆژنامـەی (تەقـویمی وقائع- رۆژ ژمێری رووداوەکان)یان بە تورکی دەرکرد. لە میـسـریش رۆژنامـەی (الوقـائع المصـرية) لەسـالّی ١٨٢٨ دەرچووە و لەعێـراقیش لەسالّی ١٨٦٩ رۆژنامەی (زوراء) دەرچووە. یەکـەمین رۆژنامـەی فـارسـیش لە سـالّی ١٨٥١ لەرۆژگـاری ناسـرەلدین شـا (١٨٤٨-١٨٩٦) بەناوی (وقائع اتفاقية) دەرچووە[١٠].

کوردیش وەک هەر گەلێکی سەر ئەم زەمینە لەو کاروانە دوانەکـەوتووە و بە پێی هەلی لەباری پێشـکەوتنی ژیانی سـیـاسی و رۆشنبـیـری و ئابووری و کـۆمـەڵایەتی ئەو هەنگاوەی ناوەو یەکەمین رۆژنامە بەناوی (کوردستان) لە قـاهیرەی پایتـەختی میـسـر لە (٢٢ی نیـسـانی ١٨٩٨) لەلایەن میقداد مەدحەت بەدرخانەوە دەرچوو[١١].

مێژووی رۆژنامەوانیی هەر گەلێک وێڕای تایبەتمەندیی خۆی پابەندی گـەلێک هۆی جیـاوازە، بۆ بەسـەرکردنەوەیان پێـویـسـتی بەروونکردنەوەی زۆر لایەنی سـیـاسی و کۆمەڵایەتییـەوە هەیە. بۆ کـوردیش جگە لەمـەرجـەکـانی ناوەوەی کـۆمـەڵ چەند هۆیەکی دەرەوەش دەوری زۆریـان هەبووە کـەیەکـێکیـان سـەرهەڵدان و پەرەسـەندنی دەوری رۆژنامـەوانییـە لەژیانی رووناکـبیـری و سـیـاسـیی گـەلانی دراوسێی کورد[١٢].

بواری دەرکردنی رۆژنامـە لەناو دەوڵەتی عـوسـمـانیـدا بەزمانی کوردی نەبوو، جابۆ دەرکردنی رۆژنامە دەبوایە بیر لەشوێنی دیکە کراباوە، بۆ ئەو رۆژەش قاهیرەی پایتەختی میـسـر لەبارترین شـوێن بوو، یەکـێک بوو لەو مـەڵبـەندە گرنگانەی تورکـانی لاو[١٣] کـەزۆربان بایەخ بە دەرکـردنی رۆژنامە بەچەندین زمان دەدا. ئیدی میسر لە دایک بوونی یەکـەم رۆژنامـەی لەمـێـژوودا بەرکـەوت، کە لەرۆژی پێنج شـەممەی ٣٠ی (ذو القـعـدە)ی سـالّی ١٣١٥ی کـۆچی، بەرانبـەر ١٠ی نیـسـانی ١٣١٤ی رۆمی، کـەدەکـاتە ٢٢ی نیـسـانی سـالّی ١٨٩٨ی عـیـسـایی، لەشـاری قـاهیـرەو لەچاپخانەی ( الهلال) ، لەلایەن مـیقداد مـەدحەت بەگی نەوەی بەدرخان پاشاوە، دەرچوو[١٤].

بێگومـان هەر بەتەنیـا ناونانی رۆژنامـەکـە بە(کوردسـتـان) وەک ناسنامەی نەتەوەیەک، ئەوپەڕی ماناو مەغزا بەخشە و بەڵگەی هەسـتی بەرزی کوردانەو بیرتیژی و دانایی خاوەنەکەی دەنوێنێ.

وێڕای ئەمە دەرچوونی رۆژنامەی (کوردسـتـان)خاڵێکی وەرچەرخانی ئێجگار مەزن بوو لە ژیانی رۆشنبیـری گەلی کورد، کە تا ئەو کاتە زمانی کوردی هەر زمانی قسەکردن و شـیـعـر بوو، بەلاّم بەم هەنگاوەی کـوردسـتـان، ئیـدی بووە زمـانی نووسین. لەپاڵ ئەمـەشـدا (کـوردسـتـان)ی دایک رۆڵێکی گـەورەی لە هوشـیـاریی نەتەوەیی هەبووەو خـاوەنەکـەی هەرجـارەی دوو هەزار دانەی لێ ناردۆتەوە کـوردسـتـان بۆ ئەوەی بەبێ پارە بدرێتـە خـەڵکی ، کەبێگومان کارێکی هەروا سـانا نەبووە، ئەگەر حیساب بۆ چاوەکانی سوڵتان عەبدولحەمید بکرێ[١٦].

بەهۆی گوشـاری سـوڵتان رۆژنامەی کـوردستان لەدوای ژمارە (٥) لەقاهیرە شارو شاری پێکراو هەواری گواستەوە ئەورووپاو تا ژمـارە (٣١) بەردەوام بوو[١٧]. کەئەوە لای د. کـەمـال فـوئاد هەواری یەکـەمـەو هەواری دووەمـی دوای مـەشـرووتیـەت (١٩٠٨)تـا ١٢ی نیـسـانی ١٩٠٩، سوردیا بەگ (١٨٨٣-١٩٣٨) دەری کـردووە، بـەلاّم نـازانـرێ چـەنـد ژمـارەی لـێ بلاوکـراوەتەوە، هەواری





**پیاوانی بەدرخانییەکان**

سێیەمیش لەقاهیرە لە١٢ی ئەیلولی ١٩١٧ تا کانوونی دووەمی ١٩١٨، (١١) ژمارەی لەلایەن (ازیزی احمد) کە بەقسەی محەمەد عەلی عەونی (١٨٩٧-١٩٥٢)[١٨]، ناز ناوی سوریا بەگە، بڵاو کراوەتەوە[١٩].

بەڵام بەبڕاوی ئێمە هەر (کوردستان)ەو لەکەش و هەواو شوێنی جیاوازو تایبەت بەخۆی دەرچووە، بێ ئەوەی هەواری بۆ دابنرێ.

دوای مەشرووتیەت و سەرکەوتنی شۆڕشی تورکە لاوەکان لەساڵی ١٩٠٨، بارێکی سیاسی نوێ لەدەوڵەتی عوسمانی بەگشتی و لەپایتەختدا بەتایبەتی، هاتە کایەوە. چەندین ڕێکخراوی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری کەوتنە کارو بۆ خۆناساندنیش جموجۆڵیان دەکرد، کە بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەو گۆڤار ڕێگای هەرە لەبار بوو، لەبەر ئەوەی دروشمی دەسەڵاتدارانی نوێ، پێشکەوتنخوازانی وڵاتیان لەخۆیان کۆکردەوە، ئەوا ڕێکخراوەکانی پشتگیریان لێ دەکردن. بەڵای (کوردە لاوەکان)یشەوە وابوو کە کێشەی نەتەوایەتی کوردیش چارەسەر دەکرێت ئەوەبوو یەکەمین ڕێکخراوی کوردی بەناوی (کرد تعاو وترقی جمعیتی- کۆمەڵەی هاریکاری و پێشکەوتنی کورد) لەساڵی ١٩٠٨ دامەزراو ئۆرگانی خۆی هەر بە ناوەوە دەرکرد، کە یەکەم ژمارەی لە ٥ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٠٨ دەرچوو[٢٠].

لە ٢٧/تەمووزی/١٩١٢ کۆمەڵەی هێڤی لەئەستەنبوڵ لەلایەن کۆمەڵێک قوتابییەوە دامەزراو لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩١٣ یەکەم ژمارەی گۆڤارێکی بەناوی (ڕۆژی کورد دەرکردو دواتریش گۆڤارێکی دیکەی بەناوی (هەتاو:

کورد) دەرکرد کەژمارە (١)ی لە ٢٤ی تشرینی یەکەمی ١٩١٣دا دەرچووە[٢١].

لە بەغدا جەمالەدین بابان[٢٢] (١٨٩٣-١٩٦٥) گۆڤاری (بانگی کورد)ی بەکوردی و تورکی دەرکرد کەژمارە (١)ی لە٨ی شوباتی ١٩١٤ دەرچووەو پێنج ژمارەی لێ دەرچووەو پاشان وەستاوە. لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانیش هێزەکانی بەریتانیا لە عیراق رۆژنامەی (تێگەیشتنی راستی) (١٩١٨-١٩١٩)یان دەرکرد وئیدی لەرۆژگاری بزووتنەوەی شێخ مەحموودی حەفید(١٨٨٢-١٩٥٦)یش رۆژنامەوانیی دەوری خۆی بینی[٢٣].

لە رۆژهەلاتی کوردستانیش ئەوەی تا هەنووکە ساخ بۆتەوە، لە رۆژگاری سمکۆ (سمایلا غای شکاک)دا (١٨٧٥-١٩٣٠)، رۆژنامەی (کورد) لەحوزەیرانی ١٩٢٢ بەسەرپەرشتی محەمەد قزلجی(١٨٩٥-١٩٥٩)[٢٤] دەرچووەو دواتر گۆڤاری (نیشتمان- تەموزی ١٩٤٣- مایسی ١٩٤٤)، زمانحالی کۆمەلەی ژیانەوەی کورد (ژێکاف) (١٩٤٢)[٢٥] بوو. بەلام رۆژگاری زێرینی رۆژنامەوانیی لەسەردەمی کۆماری کوردستان-مەهاباد- بوو، کە ژمارەیەک گۆڤارو رۆژنامە دەرچوون، لەوانە: رۆژنامەی (کوردستان)، (هەلالە)،(هاواری نیشتمان) و(گڕوکالی مندالانی کورد) کەیەکەمین گۆڤاری مندالانەیە لەمێژووی رۆژنامەوانیی کوردی[٢٦]. لەسالانی ١٩٣٩-١٩٤٩ گۆڤاری دەولەمەندی گەلاوێژ، دەنگێکی تازە، ١٩٤٣-١٩٤٧(٢٧) و چەندانی دیکە دەرچوون. لەدوای ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ بوارێکی دیکەی گەشەی رۆژنامەوانی رەخسا بە دەرچوونی خەبات"١٩٥٩". ئازادی، رۆژی نوێ،...هتد.

هەواری زێڕینی رۆژنامەوانی کوردی، بۆ ئەو رۆژگارە، لەدوای رێککەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ دەستپێدەکات تا سالی ١٩٧٤، کە بەدەیان گۆڤار و رۆژنامەی بەرچاوی وەک هاوکاری، برایەتی، التاخی، رۆژی کوردستان، نووسەری کورد...هتد[٢٨].

لێرەدا نابێ رۆلی رۆژنامەوانی نهێنی لەبیر بکەین، کە چ کاریگەری هەبوو لە جۆشدانی خەباتی سیاسی پێشمەرگایەتی، کە بەدەنگی راستەقینەی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان دادەنرێت. بەگشتی هەتا ئازادی هەبێ، رۆژنامەوانیش پتر گەشە دەکات و دەخەملێ[٢٩].

هەولێریش، وەک شارێکی گەورەی کوردستان پشکی خۆی لە رەوت و کاروانی رۆژنامەوانی کوردی هەیەو ئەگەرچی سەرەتا زۆر کز بووە، بەلام دواتر و بەتایبەتیش لەسالانی حەفتا بەدواوە، ژمارەیەکی زۆر گۆڤار و رۆژنامەو بلاوکراوەی لێ دەرچوون، کە شوێنی شیاوی خۆیان لە مێژووی رۆژنامەنووسی کوردیدا دیار و بەرچاوە.

*** زاری کرمانجی، گۆڤارێکی کۆمەلایەتی، مێژوویی، ئەدەبییە، خاوەنی ئیمتیازو بەڕێوەبەری بەرپرسی سەید حوسێن حوزنی موکریانی، بەڕێوەبەری کارگێڕی عەبدولڕەحمان گیو بووە.**



1926

ژمارە (١)ی لە ٢٥ی ئایاری ١٩٢٦و دوا ژمارەی لە (٢٤)ی تەمووزی ١٩٣٢ لە شارۆچکەی رەواندز دەرچووە.(زاری کرمانجی، ئامادەکردن و پێشەکی: د. کوردستان موکریانی، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی دەزگای موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٢، ل ٥٥، ٧-٨).

**حوسێن حوزنی موکریانی**



- لە ١٢ی ئەیلوولی ١٨٩٣ لە سابلاخ لە دایک بووە.
- لە سالی ١٩١٤ لە ئەلمانیا چاپخانەی کڕیوەو لە سالی ١٩١٥ لە حەلەبێ دامەزراندووە.
- لە زاری کرمانجی، رووناکی، دەنگی گێتی تازە، ژیان،

کاری ڕۆژنامەوانی کردووە.
- لە ٢٠ی تەمووزی ١٩٤٧ لە شاری بەغدا کۆچی دوایی کردووەو لە هەولێر نێژراوە.
(ئازاد عوبێد سالح، فەرهەنگی ڕۆژنامەنووسانی کۆچ کردووەی کورد، ڕۆژنامەڤانی، ژمارە (٣)، کانوونی یەکەمی ٢٠٠٠، ل٢٠٣".

*** ڕووناکی، گۆڤارێکی زانستی کۆمەڵایەتی، وێژەیی بووە. خاوەنی ئیمتیازی حوزنی موکریانی، بەڕێوەبەری بەرپرسی شێت مستەفا بووە،** ژمارە (١) لە ٢٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٥و دوا ژمارەی (١١) لە ١٦ی ئایاری ١٩٣٥ لە شاری هەولێر دەرچووە. (ڕووناکی، ئامادەکردن و پێشەکی د. کوردستان موکریانی) دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠١، ل٣،٨".



1935

**شێت مستەفا**



- لە ساڵی ١٩١٣ لە هەولێر لە دایک بووە.
- لە ساڵی ١٩٣٤ کۆلێجی مافی لە بەغدا تەواوکردووە.
- لە ساڵی ١٩٧٣ کۆچی دوای کردووە. (هەمان سەرچاوە، ل٢٢)

**هەتاو: ڕۆژنامەیەکی کوردی ئەدەبی و کۆمەڵایەتییە، ژمارە یەکی لە ١١ی ئەیلوولی ١٩٤٨، لە هەولێر دەرچووە،**



1948

خاوەنی ئیمتیاز ئەمین ڕەواندزی و بەڕێوەبەری بەرپرس پارێزەر ناجی بووە. هەر تەنیا ئەو ژمارەیەی لێ دەرچووە. (کەمال ڕەئووف محەمەد، دەستەواردێی نان بۆ مێژوو، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٤٢٩ ).

**ئەمین ڕواندزی**

(محەمەد ئەمین مەلا حەسەنی ڕەواندزی)



- لە ساڵی ١٨٩٨ لە ڕەواندز لە دایک بووە.
لە مەکتەبی جەنگاوەری ئەستەنبۆل بە ئەفسەر دەرچووە.
- لە دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی (بانگی حەق - ١٩٢٣)ی ڕۆژگاری شێخ مەحموود بووە.
- لە ١٦ی تشرینی دووەمی ١٩٥٥ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووەو هەر لەوێ نێژراوە.
(هەمان سەرچاوە ل٤٧. ٤٨. ٤٥)

**هەولێـــــــــر: رۆژنامـەیەکی وێژەیی- رۆشنبـیــریی بووە، کۆمەڵەی مامۆستایانی هەولێر، هەفتانە دەریان کردووە،**



عزەددین فەیزی

بـەڕێــوەبــەری بەرپرس جەمیل رەشید، یوسف یەحیا. دەستەی نووسەران: عەبدولمەجید حـەسـەن، عـزەددین فەیزی، ئەستێر سەعید بووە. ژمارە (١)ی لە ١٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٥٠و دوا ژمارەی (١٤٠) لە ٢٨ی کانوونی یەکەمی ١٩٥٣ بەهەر دوو زمانی کوردی و عەرەبی دەرچووە.

"رەفیق سالح، رابەری رۆژنامە نووسی کوردی، رۆژنامەڤانی، ژمارە "١١-١٢" ساڵی ٢٠٠٣، ل١٢٤)

**هەتاو: گۆڤارێکی ئەدەبی دوو هەفتە جارێک دەرچووە. ژمارە (١)ی لە ١٥ی مایسی ١٩٥٤و دوا ژمارەی (١٨٨) لە تشرینی دووەمی ١٩٦٠ لە هەولێر، بە کوردی دەرچووە.**




1954

خاوەن و سەرنووسەری گیو موکریانی بووە. بەڕێوەبەری بەرپرس ئیبراهیم عەزیز ئاغا دزەیی و محەممەد شەهابەددین دەباغ و جەلال قادر بوونە. (بڕوانە: نزار جرجيس علي، صحافة اربيل، دار الحرية، بغداد، ١٩٨٨،ل ١٧٥).

**گیـو مـوکریانی (عـەبدولڕەحـمان سـەید لەتیف شێخ ئیسماعیل).**



- لە ساڵی ١٩٠٠ لە شاری مەهاباد لە دایک بووە.
- خوێندنی سەرەتایی لە حەلەب تەواوکردووەو لە لوبنان فێری زمانی فەرەنسی بووە.
- بەشداری دەرچوونی هەردوو گۆڤاری زاری کرمانجی "١٩٢٦-١٩٣٢" و رووناکی "١٩٣٥-١٩٣٦"ی کردبووە.
- لە ٢٤ی تەمموزی ١٩٧٧ لە هەولێر کۆچی دوایی کردووە.

(هەمان سەرچاوە، ل ٢٠٧-٢٠٨)

*** ژیان: گۆڤارێکی قوتابیانە، یەکێتی گشتی قوتابیانی عێراق لقی هەولێر دەری کردووە. ژمارە (١) لە تشرینی یەکەمی ١٩٥٩ بەزمانی کوردی دەرچووەو هەر ئەو ژمارەیەی لێ دەرچووە.**

**هەولێر: پەخشنامەیەکی هەفتەییە بە زمانی کوردی و عەرەبی، شارەوانی هەولێر دەری کردووە.**




ژمارە (١)ی لە ٢٢ی ئابی ١٩٦١ و ژمارەی (٧٥) لە ٦ی حوزەیرانی ١٩٦٣ بەهەر دوو زمانی کوردی و عەرەبی دەرچووە، بەشی کوردی مەغدید سووران و بەشی عەرەبی عەبدولوەهاب حاجی حەسەن بەڕێوەیان بردووە.

**تیشک: گۆڤارێکی پەروەردەیی ساڵانەیە، قوتابخانەی مامۆستایانی کوڕان لە هەولێر دەری کردووە. دەستەی نووسەران: مەجید ئاسنگەر، حەمە کەریم هەورامی، فاتح محەمەد بوونە.**




ژمارەی (١)ی لە ساڵی ١٩٦٩و ژمارە (٢)ی لە ساڵی ١٩٧٠ بلاوبۆتەوە.

**هەڵمەت: گۆڤاری یەکێتی مامۆستایانی کوردستان لقی هەولێر بووەو بە کوردی، دەرچووە.**

تەنیا یەک ژمارەی لە نەورۆزی ٢٥٨١ی کوردی دەرچووە.

**ڕێژنە: گۆڤارێکی زانستی و کۆمەڵایەتی بووە بە کوردی لە هەولێر دەرچووە.**

ژمارە (١)ی لە کانوونی یەکەمی ١٩٧٠و ژمارە (٣)ی لە کانوونی دووەمی ١٩٧١ دەرچووە.

**موژدە: گۆڤارێکی زانستی و کۆمەڵایەتی، لقی هەولێری یەکێتی مامۆستایانی کوردستان بووە،**

ژمارە (١)ی لە تشرینی دووەمی ١٩٧١ بە کوردی دەرچووە.

**هەولێر: گۆڤارێکی مانگانە بووە، شارەوانی هەولێر دەری کردووە.**

بەڕێوەبەری سەعدی محەمەد ئەمین دزەیی و سەرۆکی نووسین: محەمەد مەولوود (مەم) بووە.

ژمارە (١)ی لە مایسی ١٩٧٠و دوا ژمارەی (١٢) لە حوزەیرانی ١٩٧٢ بەکوردی و عەرەبی دەرچووە. (ئازاد عوبێد، کاریگەریی شۆڕشی ئەیلوول لەسەر ڕۆژنامەوانیی کوردی لە باشووری کوردستان ١٩٦١-١٩٧٥، هەولێر، ٢٠٠٧، ل ٣٥٤).

**چیا: گۆڤارێکی ئەدەبی بووە. سەرنووسەرو بەڕێوەبەری بەدرخان سندی بووە. بە زاراوەی کرمانجی سەروو.**

ژمارە (١)ی لە تشرینی دووەمی ١٩٧٠ و ژمارە(٢)ی لە کانوونی دووەمی ١٩٧١ دەرچووە.(ئازاد عوبێد ساڵح، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٥٥)




**ڕەهێلە: گۆڤارێکی ڕۆشنبیری و پەروەردەی ساڵانە بووە، خوێندنگای دوا ناوەندی کوڕان لە هەولێر دەری کردووە.**

دەستەی نووسەران: عەبدولڕەحمان ئەلسەعدی. سکرتێری لێژنە: عوسمان دەشتی. ئەندامانی لێژنە: دلشاد عەبدوڵڵا سنجاوی، تاریق حوسێن، ڕەهبەر جەلال مامش.

ژمارە (١)ی لە ساڵی ١٩٧١ دەرچووە.

**بیری نوێ: گۆڤارێکی ئەدەبی گشتی ساڵانە بووە. دوا ناوەندی کوڕانی هەولێر دەری کردووە.**




دەستەی نووسەران: عەبدولڕەحمان ئەلسەعدی سەرۆکی لێژنە، کاردۆ گەلاڵی سکرتێر، عەبدوڵڵا زەنگەنە، تاهیر حوسێن هەمەوەندی ئەندامانی لێژنە.

ژمارە (١)ی لە ساڵی١٩٧٢ دەرچووە.

**نووسەری نوێ: کۆمەڵە بەرهەمێکی ئەدەبییە. یەکێتی نووسەرانی کورد لقی هەولێر دەری کردووە.**




1972

دەستەی نووسەران: عیزەددین فەیزی، کەریم شارەزا، عەزیز گەردی، حەمە کەریم هەورامی، محەمەد مەنگوڕی، جەمیل ڕەنجبەر، مەدحەت بێخەو، بوون. ژمارە (١)ی لە حوزەیرانی ١٩٧٢و ژمارە (٥)ی لە ئەیلوولی ١٩٨٠ دەرچووە.

**بەرەو ڕووناکی: گۆڤارێکی وێژەیی و ڕۆشنبیری گشتی بووە، لیژنەی زمان و وێژەی کوردی لە خوێندنگای ناوەندی گەلاڵە دەری کردووە.**




دەستەی نووسەران: ئیبراهیم سەعید بەرزنجی، نەژاد عەزیز سورمێ، ئازاد جوندیانی. غەفوور گەلاڵی. ژمارە (١)ی لە تەمووزی ١٩٧٢و ژمارە (٢)ی لە کانوونی یەکەمی ١٩٧٢ و ژمارە(٣)ی لە کانوونی یەکەمی ١٩٧٣ دەرچووە.

**ڕۆشنبیری: گۆڤاری کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کوردی لقی هەولێر بووە.**

سەرۆکی نووسین: عەبدولڕەزاق بیتووشی و سکرتێری نووسین: ئەحمەد شەریف و دەستەی نووسەران: مومتاز حەیدەری، سامیە شاکر، حازم باجەلان، عەبدولقادر حەمەد ئەمین. ژمارە (١)ی لە نیسانی ١٩٧٣ دەرچووە.

**بۆ پێشەوە: گۆڤاری یەکێتی مامۆستایانی کوردستان لقی هەولێر بووە.**

سەرنووسەر: عوسمان حەسەن دزەیی و سکرتێری نووسین: محەمەد مەنگوڕی و دەستەی نووسەران: عەزیز گەردی، کەمال غەمبار، ئەحمەد نەقشبەندی، یوسف دەرگەلەیی. لە ژمارە(٢)دوە، سەرۆکی نووسین: محەمەد مەنگوڕی، سکرتێری دەستە: عەزیز گەردی، یوسف دەرگەلەیی، ئەحمەد شەریف، عوسمان حەسەن ڕەسول. ژمارە (١) لە ٢١ی شوباتی ١٩٧٣و ژمارە (٣)ی لە ئاداری ١٩٧٤ دەرچووە.

**چوارچرا: گۆڤارێکی ڕۆشنبیری و وێژەیی کۆمەڵایەتییە، لیژنەی زمان و ئەدەبی کوردی قوتابخانەی ئامادەیی کوردستانی کوڕان لە هەولێر دەریکردووە.**



سەرۆک: عەبدولڕەحمان ئەلسەعدی. سکرتێر: عەبدوللا زەنگەنە. ئەندام: جەلال بەرزنجی، دلشاد عەبدوللا. لە ساڵی ١٩٧٣ دەرچووە.

**دەنگی قوتابیانی کوردستان: بلاوکراوەی یەکێتی قوتابیانی کوردستان لقی هەولێر بووە،** (٣) ژمارەی لە ساڵی ١٩٧٣ دەرچووە.

**ڕێبازی کرێکاری: بلاوکراوەی یەکێتی نەقابەکانی کرێکارانی- لقی هەولێر دەریان کردووە،** تەنیا یەک ژمارە لە ساڵی ١٩٧٤ بە کوردی دەرچووە. ( ئازاد عوبێد ساڵح، کاریگەریی... هەمان سەرچاوە، ل٣٤٥).

**کاروان: بلاوکراوەیەکی ئەدەبی گشتی بووە.**

**سەرپەرشتکار مامۆستای زمان و ئەدەبی کوردی لە ئامادەیی کوردستان دەری کردووە.**
ژمارە (١)ی لە ٢٩ی نیسانی ١٩٧٥ دەرچووە.

**ئۆتۆنۆمی: الحکم الذاتي: گۆڤاری ئەنجومەنی یاسادانانی ناوچەی کوردستان بووە.**
ژمارە(١)ی کانوونی دووەمی ١٩٧٦و دوا ژمارەی (٦٣) لە ساڵی ١٩٩٠ بە هەر دوو زمانی کوردی و عەرەبی دەرچووە.

**نەورۆز: گۆڤارێکی منداڵانەیە.** خاوەنی هەڵگورد عەبدولوەهاب.ژمارە (١)ی لە ئاداری ١٩٨٠ دەرچووەو (٢) ژمارەی لێ دەرچووە.

**ئابووری زان: بڵاوکراوەی کۆمەڵەی ئابووریزانەکانی عێراق لقی هەولێر بووە.**
سەرنووسەر: حەسەن ئەلنەجەفی. سەرپەرشتیاری لقی کوردی: عەبدولوەهاب تاڵەبانی، فەیسەڵ دەباغ. ژمارە (١)ی لە تەمووزی ١٩٨٠و ژمارە (٣)ی لە ١٩٨٢ دەرچووە.

**کاروان: گۆڤارێکی رۆشنبیری مانگانە بووە، ئەمینداریێتی گشتی رۆشنبیری و لاوان بە زمانی کوردی و عەرەبی دەری کردووە.**
سەرنووسەر: محەمەد ئەمین محەمەد، حیکمەت حاجی سەلیم. جێگری سەرنووسەر: حوسێن عارف، حوسێن رەشوانی. سکرتێری نووسین. سەردار حەمید میران. ژمارە (١)ی لە تشرینی یەکەمی ١٩٨٢و دوا ژمارەی (٩٣) لە ئاداری ١٩٩٢ دەرچووە.

**راپەرین: گۆڤارێکی گشتی بووە، کۆمیتەی سەرکردایەتی هەولێر دەری کردووە. خاوەنی کۆمیتەی سەرکردایەتی مەڵبەندی سێی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان**، ژمارە (١)ی لە تەمووزی ١٩٨٢، ژمارە (٣)خولی دووەم لە حوزەیرانی ١٩٨٣ دەرچووە.

**کشتوکاڵ: بڵاوکراوەیەکی وەرزی بووە. ئەمینداریەتی کشتوکاڵ و چاککردنی کشتوکاڵی ناوچەی کوردستان دەری کردووە.**
سەرنووسەر: محەمەد سەدیق مەحموود، سکرتێری نووسین: سەعید یەحیا خەتات. دەستەی نووسەران: ئەحمەد محەمەد سەعید، هادی حەسەن مستەفا، عەلی خدر شێخە، حوسێن عارف، بوونە. ژمارە (١)ی خوولی یەکەم لە ١٩٨٠و ژمارە (٢)ی خوولی دووەم لە ١٩٨٢ دەرچووە.

**ئەدەبی بێگانان: کۆمەڵە بەرهەمێکی ئەدەبییە، لە زمانی بێگانەوە کراوەتە کوردی بەسەرپەرشتی عەزیز گەردی**، ژمارە (١)ی لە ساڵی ١٩٨٢و دوا ژمارەی (٥) لە ساڵی ١٩٨٣، دەرچووە. (ئیسماعیل تەنیا، بیبلیوگرافیای رۆژنامەگەری کوردی ١٩٧٥-١٩٩٣، هەولێر، ١٩٩٨، ل٢١)

**کاروانی وەرزش: رۆژنامەیەکی وەرزشی بوو، ئەمینداریەتی گشتی رۆشنبیری و لاوان لە هەولێر دەری کردووە**، ژمارە(١)ی لە ٣٠ی تەمووزی ١٩٨٥ بەکوردی و عەرەبی بە"٤" لاپەڕە بووە، سەرەتا (١٥) رۆژ جارێک و پاشان هەفتانە دەرچووە، تا ٢ی ئابی ١٩٩٠ بەر دەوام بووە.
سەرنووسەری محەممەد ئەمین محەممەد ئەحمەد، جێگری سەرنووسەر محەمەد محیەددین بووە. (ئیسماعیل تەنیا،... ل ٢٨).

**نەورۆزی عێراق- نوروز العراق: گۆڤارێکی مێژوویی رۆشنبیری هونەری بووە، بەهەر دوو زمانی عەرەبی و کوردی لە هەولێر دەرچووە.**
بەڕێوەبەری نووسین حەسەن مەیمونی و سکرتێری نووسین یوسف دەلەوی بووە. ژمارە (١)ی لە ساڵی ١٩٨٦و ژمارە (١١)ی لە تشرینی دووەمی ١٩٨٩ دەرچووە. (ئیسماعیل تەنیا،... ل٣١).

**تەندروستی و کۆمەڵ: گۆڤارێکی مانگانەی تەندروستی گشتی بووە، ئەمینداریەتی گشتی کاروباری کۆمەڵایەتی لە هەولێر دەری کردووە.**
سەرنووسەری د. نیهاد ئەبتەر زەنگەنە و جێگری

سەرنووسەر بەهجەت عیزەت جاف و سکرتێری نووسین نافع ئاکرەیی بوون. ژمارە (١)ی لە ئەیلوولی ١٩٨٧و دوا ژمارەی"٣٥"لە پاییزی ١٩٩١ دەرچووە. (ئیسماعیل تەنیا، ل٣٣ )

**دەنگی قوتابیان و لاوان: ئۆرگانی لقی هەولێری یەکێتی قوتابیان و لاوانی دیموکراتی کوردستانی عێراق بووە.** ژمارە (١)ی لە کانوونی دووەمی ١٩٨٨و ژمارە (٢)ی لە ئاداری ١٩٨٨ دەرچووە. ژمارە (٣)ی دوای راپەڕین لە هەولێر لە ئەیلوولی ١٩٩١ دەرچووەو پاشان بۆتە (پێشڕەو)و ژمارە (٤)ی لە تشرینی یەکەم و دووەمی ١٩٩١ دەرچووە. (ئیسماعیل تەنیا، ل٣٤).

**ژیلەمۆ: گۆڤارێکی سیاسی ڕۆشنبیری گشتی بووە. لاوانی زەحمەتکێشانی کوردستان بە نهێنی لە هەولێر دەریان کردووە.**

دەستەی نووسەران: غازی حەسەن، ئیسماعیل تەنیا، گۆران جەلال، بوونە. ژمارە (١)ی لە ئابی ١٩٨٩و دوا ژمارە (٧)ی لە تشرینی دووەمی ١٩٩٠ دەرچووە.

"ئیسماعیا تەنیا،.. ل٣٧".

**کاروانی منداڵان: گۆڤارێکی منداڵان بووە. ئەمینداریەتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان لە هەولێر دەریان کردووە.**

سەرۆکی نووسین: حکمەت حاجی سەلیم، سکرتێری نووسینی نەشئەت محەمەد سالم موختار. ژمارە (١)ی لە نیسانی ١٩٩٠و ژمارە (٢)ی لە ناوەڕاستی هەمان ساڵ دەرچووە، ئیدی وەستاوە.(ئیسماعیل تەنیا،... ل٣٩).

**کاروان بۆ زانستی مرۆڤایەتی: گۆڤارێکی زانستی بووە، ئەمینداریەتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان لە هەولێر دەری کردووە.**

سەرنووسەر: حکمەت حاجی سەلیم و جێگری سەرنووسەر د. سەلاحەددین عوسمان بەکر و سکرتێری نووسین ئیسماعیل شوکر بووە. تەنیا ژمارە (١)ی لە ساڵی ١٩٩٠ دەرچووە. (ئیسماعیل تەنیا، ...ل٤٠).

**کاروانی فۆلکلۆر: گۆڤارێکی فۆلکلۆری دەوری بووە. ئەمینداریەتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان لە هەولێر دەری کردووە.**

سەرنووسەر حکمەت حاجی سەلیم. جێگری سەرنووسەر د.شوکریە ڕەسول. ژمارە (١)ی لە ساڵی ١٩٩٠ دەرچووەو پاشان وەستاوە.

"ئیسماعیل تەنیا،...ل٤١".

## بڵاوکراوەی نهێنی:

**یەکێتی تێکۆشین: زمانحاڵی کۆمەڵەی کۆمۆنیستی عێراق- لقی کورد بوو.** لە نێوان ١٩٤٤-١٩٤٥. (٣) ژمارەی لێ دەرچووە. (سەرچاوەی پێشوو..ل٢٣١).

**شۆڕش: ئۆرگانی حیزبی شۆڕش** بوو لەساڵی ١٩٤٥ لە هەولێر دەرچووە (سەرچاوەی پێشوو....ل٢٣١)

**کوردستان: لقی هیوا** بە دەستنووسی بە سەرپەرشتی عەلی عەبدوڵڵا (عەلی مەکتەبە و سەبری نەورۆز... هتد دەرچووە)

**دەنگی کورد:** سێ چوار ژمارەی لە هەولێر، بەسێ چوار لاپەڕە دەرچووە.

**بڵێسە: بڵاوکراوەیەکی دەستنووس بووە.** سەمەد محەمەدو (سەمەدمەنجەڵ) دەری کردووە و دەنگوباسی کۆیە و هەولێری تێدا بڵاوکراوەتەوە.

**تازە پێگەیشتوو و (هەڵاڵە)**: دووبڵاوکراوەی حزبی هیوا بوونە لە هەولێر، موسا سلێمان و چەند کەسێکی دیکە سەرپەرشتیان کردووە.

(سەرچاوەی پێشوو...ل٢٣٩)

**گۆڤار: بڵاوکراوەی نهێنی و سیاسی و کۆمەڵایەتی گەنجانی هەولێر** لە ساڵی ١٩٤٣ بە زمانی کوردی دەریان کردووە، (٢٠) ژمارەی لێ دەرچووە، تەنیا ژمارە (T) دۆزراوەتەوە. (بروانە: تارق جامباز، هەفتەنامەی (گۆڤار).چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر ١٩٩٨، ل١٥).



**ئازادی: بڵاوکراوەی نهێنی لقی کوردستانی پارتی کۆمۆنیستی عێراق بووە**، ژمارە (١)ی لە نیسانی ١٩٤٤و دوا ژمارەی لە تەمووزی ١٩٥٦ بە کوردی دەرچووە.

**هەولێر: بڵاوکراوەی پارتی کۆمۆنیستی عێراق- شۆڕش** لە ساڵی ١٩٤٥ بە کوردی دەرچووە.

**ڕێگای کوردستان: بڵاوکراوەی سیاسی و (نهێنی) پارتی کۆمونیستی عێراق- هەرێمی کوردستان**، ژمارە (١) لە کانوونی دووەمی ١٩٦٢ تا ١٩٧٣ بە کوردی لە هەولێر و شاخ دەرچووە . (بروانە: ئازاد عوبێد ساڵح، کاریگەریی.... ل.٣٤٠).

**ئاگر: بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیری (نهێنی) یەکێتی قوتابیانی کوردستان لقی هەولێر**، لە ساڵی ١٩٦٢ بە کوردی لە هەولێر دەرچووە. (هەمان سەرچاوە. ل٣٤٢)

**سەفین: بڵاوکراوەی نهێنی لقی دووی پارتی دیموکراتی کوردستان** لە نێوان ١٩٦٨-١٩٦٩، (١٤) ژمارەی بە کوردی لێ دەرچووە. (بروانە: سەرچاوەی پێشوو،ل٣٤٣)

**مژدە: بڵاوکراوەیەکی زانستی و کۆمەڵایەتی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان لقی هەولێر بووە.** تەنیا یەک ژمارەی لە تشرینی دووەمی ١٩٧٠ بە کوردی دەرچووە. بروانە: (هەمان سەرچاوە، ل٣٤٤)

**پێشمەرگە: پاشکۆی گۆڤاری (ڕاپەڕین)** بە دوو مانگ جارێک دەرچووە خاوەنی: مەڵبەندی (٣)ی هەولێری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان. ژمارە (١)لە کانوونی دووەمی ١٩٨٣ و ژمارە (٥)ی لە تەمووزی ١٩٨٣ دەرچووە.

**بڵاوکراوەکان بە زمانی عەرەبی:**

**الامل: گۆڤارێکی ئەدەبی ڕووناکبیری قوتابیان بووە. دەستەیەک لە قوتابیانی دواناوەندی هەولێر** بە سەرپەرشتی سەبری حوسێن مامۆستای زمانی عەرەبی. ژمارە (١)ی لە سەرەتای ئاداری ١٩٥٦ دەرچووە. (نزار جرجیس علی، صحافە اربیل، ص٥٧)

**الاخلاص: ڕۆژنامەیەکی ئەدەبی ڕۆژانەبووە، هەفتانە لە هەولێر دەرچووە**، خاوەنی ئیمتیازو بەڕێوەبەری کارگێری عەبدولعەزیز ئەلتالبی بووە. سەرنووسەری بەرپرس پارێزەر نازم یونس بووە.

ژمارە (١)ی لە سەرەتای ساڵی ١٩٦١ دەرچووە و لە ساڵی ١٩٦٢ وەستاوە. (نفس المصدر)، ص٥٥).

**البدایة: گۆڤارێکی ڕۆشنبیری بووە، لیژنەی زمانی عەرەبی لە دوا ناوەندی هەولێری کوڕان دەریان کردووە.** ژمارە (١)ی لە ئاداری ١٩٧٢ دەرچووە سەرنووسەری حسام داود خدر و ئەندامانی لیژنە: ئەبو بەکر لەشکری. پەتروس هورمز، جەنگی جەلال، سەعید فەتاح، عەبدولڕەحمان بەهجەت.




سەرچاوە:

(١) غەزەتە (Gazzetta): پارەیەکی زیو بووە کە لەسەردەمی یۆلیۆس قەیسەر ڕۆژنامەی پێ فرۆشراوە.

(٢) Journal وشەیەکی فەرەنسییە بەواتەی (ڕۆژانە).

(٣) لەکوردیشدا کۆمەڵێک زاراوەی وەک: ڕۆژنامە، ڕۆژنامەگەر، ڕۆژنامەنووس، ڕۆژنامەوان، ڕۆژنامەکار هەن کە هەریەکە و ڕاوبۆچوونی تایبەتی خۆی هەیە، بۆ زانیاریی پتر بروانە:

(٤) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لەڕۆژنامە نووسیی کوردیدا، چ کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٨، ل٥، د. جەمشید حەیدەری، پرۆژەی لێکۆڵینەوەی مێژووی ڕۆژنامە گەریی کوردی. پەیڤ، گ ژ، مەڵبەندی ڕۆشنبیری کورد لەلەندەن،١٦ ئۆگستی ١٩٩٢ ل١٣٢.

(5) The New Encyclopaedia Britannica,VO/V 15th Edition, 1975, p616.

(٦) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، س.پ. ل١٩: نەژاد عەزیز سورمێ، ڕۆژنامە گەریی کوردی چەند سەرەقەڵەمێک لەبارەی تەکنیک و هونەردکانی کتێبی برایەتی(٣)،چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر ١٩٩٩، ل١٤١-١٤٢.

(٧) میشال الغریب، الصحافة تاریخا وحاضرا، بیروت (د.ت)، ص٧٣.

(٨) هـ.س.ل ١٥- ١٦.

(٩) امیل بواڤان، تاریخ الصحافة، ت: محمد اسماعیل محمد، راجعة: د. محمود نجیب ابو اللیل، الاسکندریة

(د.ت)،ص١٤.

(١٠) هـ.س، ل١٥-١٦.

(١١) د. كـمـال مظهـر احـمـد، س.پ.ل٢٩-٣٠، ٤٧، احـمـد عـبـدالكريم الصـحـافـة الايرانيـة، مطبـعـة البـغداد، ١٩٧٢،ص٧: پەيف، س.ن، ل١٥٣٣-١٥٣٤، منير بكر التكريتي، الصحافة العراقية اتجاهاتها السياسية والاجتماعية و الثقافية ١٨٦٩-١٩٢١، بغداد، ١٩٦٩، ص٥٢.

(١٢) كوردستان یەكەمین رۆژنامەی كوردی ١٨٩٨-١٩٠٢، كۆكردنەوەو پێشەكی دوكتۆر كەمال فوئاد، بەغدا، ١٩٧٢، الفيكونت فيليب طرازي، تاريخ الصحافة العربية، بيروت، ١٩٦٧، ص١٧٤.

(١٣) د. كەمال مەزهەر ئەحمەد،س.پ.ل٤٣.

(١٤) (توركانی لاو- تركيا الفتاة)، كۆمەڵەیەك بوون لەمایسی ١٨٨٩ لەدژی سوڵتان عەبدولحەمید دامەزرابوو، دوو كورد، د. عەبدوڵلا جەودەت(١٨٦٩-١٩٣٢) و ئیسحاق سكۆتی(١٨٦٨-١٩٠٢) لەدەستەی دامەزرێنەر بوون.(د. كەمال مەزهەر ئەحمەد،س.پ،ل٥٨پ.

(١٥) هـ. س، ل٤٩، ٥٥، ٦٠، كوردستان یەكەمین رۆژنامەی كوردی، ل٣.

(١٦) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: كوردستان، یەكەمین رۆژنامەی كوردی، ل ٤.

(١٧) د. كەمال مەزهەر ئەحمەد، س.پ، ل٦١: كوردستان یەكەمین رۆژنامەی كوردی.ل٣.

(١٨) نووسەرو وەرگێری بەناوبانگ، خەڵكی سێوێركی باكووری كوردستانە.

(١٩) د.كەمال فوئاد،"كوردستان"دەوری سێیەم، نووسەری كوردستان گۆڤاری یەكێتی نووسەرانی كوردستان-شاخ، رد تعاون و ترقی جمعیتی غزەتەسی- كەبەناوی رۆژنامەی (كورد) چۆتە تۆماری مێژووەوە.

(٢٠)محەمەدامین بۆز ئارسەلان، پێشكێشیل سەر كوردتە عاون و تەردقی غەزەتەسی گۆڤارا كوردی، تركی، ڤەگوهاستن: رێبەری بەهدینا، رۆژنامەڤانی(گ)، هەولێر، ژ٩ هاوینی ٢٠٠٢،ل٧٣. جێی ئاماژە پێكردنە د.جەبار قادرو هەندێكی دیكە رۆژی ٢٢ی تشرینی دووەمیان بە رۆژی دەرچوونی ژمارە (١) داناوە، بەڵام راستەكەی ئەوەی بۆزئارسەلانە، چونكە جیاوازی ساڵی رۆمی و زایینی (١٣) رۆژە. بڕوانە: د.جەبار قادر، چەند بابەتێكی مێژووی كورد، سلێمانی ١٩٩٩، ل٨،١٠،١٣،١٣.

(٢١) نەوشیروان مستەفا ئەمین، چەند لاپەرەیەك لەمێژووی رۆژنامەوانیی كوردی ١٨٩٨- ١٩١٨، ب١، سلێمانی ٢٠٠١، ل١٠٢، بۆ زانیاریی پتر سەبارەت بەرۆژنامەوانیی لەباكووری كوردستان ، بڕوانە:

**Malmisanij & Mhamud Lewendi Li Kurdistana Bakur uili Tirkiye, ROJNAMEGERIYA KURDI (1908-1981),**

(٢٢) ئازاد عوبێد ساڵح، رۆژنامەگەری كوردی لەكوردستانی باكوورو لەتوركیا(١٩٠٨-١٩٨١)، رامان ژ٢٣، ٥ی ئایاری ١٩٩٨، ل ٢٣٤-٢٣٨، عەبدوڵلا زەنگەنە، ساخكردنەوەی ناسنامەی خاوەنی (رۆژی كورد-١٩١٣)، رامان، ژ (٥٦) ٥/شوباتی/ ٢٠٠١، ل١٩٨-٢٠٧ .

(٢٣)مافپەروەر و ئەفسەرو نوێنەر و وەزیربووە لە دام و دەزگای دەوڵەتی عێراق،فاروق عەلی عومەر،رۆژنامەگەریی كوردی لە عێراقدا بەراییەكان(١٩١٤-١٩٣٩)،و:تاریق كارێزی،دوزگای موكریان،هەولێر.٢٠٠١

(٢٤) عبدالرزاق الحسني، تاريخ الصحافة العراقية، ج١، صيدا، لبنان ١٩٧١، ص٣٥: بۆ زانیاریی پتر دەربارەی سەرەتای رۆژنامەوانیی كوردی لەباشووری كوردستان، بڕوانە: فاروق عەلی عومەر، س.پ.

(٢٥) محمد تمدن، اوضاع ايران در جنگ اول يا تاريخ رضائيه، مؤسسه مطبوعات تمدن، تهران، ١٣٥٠، ص٣٦٩-٣٧١، هێمن رۆژنامەی كوردی لەكوردستانی ئێران دا، بەیان (گ) ژ(١٧) ئەیلوولی ١٩٧٤، ل١٧، مەحمود زامدار، گەشتێك لە نێو جیهانی بزاڤی رۆژنامەگەری كوردی (١) چ رۆشنبیری، هەولێر ١٩٩٨،ل٦٢: د.كەمال مەزهەر ئەحمەد، س.ن، ل٧٨-٧٩، ئازاد عوبێد ساڵح، فەرهەنگی رۆژنامەنووسانی كۆچكردووی كورد، رۆژنامەڤانی، ژ (٣) كۆتایی كانوونی یەكەمی ٢٠٠٠، ل٢٠٥.

(٢٦) جەمال نەبەز، گۆڤاری نیشتمان، تەمووزی ١٩٤٣-مایسی ١٩٤٤، بنكەی چاپەمەنی ئازاد، سوید، ١٩٨٥، ل٢٨-٢٩.

(٢٧) عبدالجبار محمد جەباری، مێژووی رۆژنامەگەری كوردی، چ ژین، سلێمانی ١٩٧٠، ل١٤١-١٤٣. هیمدادی حوسێن، رۆژنامە نووسیی كوردی سەر بە كۆماری دیموكراتی كوردستان ١٩٤٢-١٩٤٧، سلێمانی ٢٠٠٢، گۆڤاری گروگاڵی منداڵانی كوردو سەرەتای رۆژنامە نووسیی پەروەردەیی، چ وەزارەتی پەروەردە هەولێر ٢٠٠٢.

(٢٨) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: ئازاد عوبێد ساڵح، كاریگەری شۆڕشی ئەیلوول لەسەر رۆژنامەوانیی كوردی لە باشووری كوردستان ١٩٦١-١٩٧٥، چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٧، پاشكو.

(٢٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو.



# چاپخانەی کوردستان

**مەغدید حاجی**

چاپخانەی کوردستان کە مێژوونووسی نەمری کورد حوسێن حوزنی موکریانی لە ساڵی ١٩١٤ لە ئەڵمانیا کڕیوەتی و هێناویەتە حەلەب و لە ١٩١٥ لە بازاڕی (سویقە) لە شام دانراوە، بە کۆنترین چاپخانەی کورد دادەنرێت. چاپخانەیەک بۆ ماوەی سەدەیەک لە خزمەتی وشەی کوردیدا بووە. لەم ماوە درێژەدا ئەم چاپخانەیە چ لە ڕواندز یان لە هەولێر دەورێکی کاریگەری بینیوە لە سەرهەڵدان و بەرەوپێشچوونی ڕەوتی ڕۆژنامەنووسی کوردی لە پارێزگای هەولێردا. هەروەها لەڕێگای ئەم چاپخانەیەوە بەدەیان کتێبی کوردی چاپ کراون، جگە لەو گۆڤارو ڕۆژنامانەی لەم چاپخانەیە چاپ کراون هەر لە گۆڤاری زاری کرمانجییەوە تاکو (هەتاو)ی هەولێر، کە بەتیشکەکانی قەڵای ڕووناک دەکردەوە.

### حوسێن حوزنی ڕابەر

مامۆستای ڕۆژنامەنووسی نەمر سەید حوسێن کوڕی سەید عەبدوللەتیفی موکریانی لە ١٢ ئەیلوولی ساڵی ١٨٩٣ لە شاری مەهاباد لەدایک بووە، یەکێکە لە ڕابەرانی بزووتنەوەی ڕۆژنامەنووسی کوردی، بە دامەزرێنەری چاپخانەی کوردستان دادەنرێت، لەنێوان حەلەب و ڕواندز و هەولێر و بەغدا و سلێمانییدا ژمارەیەکی زۆر ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردی دەرکردووە. ئەم کوردە موکریانییە هەر لە منداڵییەوە بایەخی بە خوێندنەوەی مێژوو و کلتووری گەلەکەی داوە و ئەم خولیایەی لە گەڵدا گەورە بووە تاکو لە دواییدا بووە بە مێژوونووس و ڕۆژنامەنووسێکی ڕابەری گەلەکەمان. پرۆفیسۆر (باسیل نیکیتن) لە بارەی حوسێن حوزنی موکریانی نووسیویەتی

و دەڵێ: (چاکەی حوسێن حوزنی موکریانی دانەر و مێژوونووسی کوردستان بەسەر هەموو ڕۆژهەڵاتناسەکان دیارو بەرچاوە) مێژوونووسی نەمر لەسەردەمانێکی هەستیاردا کتێبخانەی کوردی بە زۆر کتێبی مێژوویی دەوڵەمەند کردووە، بەمەش زۆر لاپەڕەی شاراوەی رابردووی مێژووی گەلەکەمانی لە فەوتان رزگار کردووە.

جەمال خەزنەداریش لەبارەی حوسێن حوزنییەوە لە (رابەری رۆژنامەگەری کوردی)دا دەڵێ: بۆیەکەمین جار مێژووی کوردی بەزمانی کوردی تۆمار کردووە، زۆر کتێبی داناوە و بەچاپی گەیاندوون، بە پێچەوانەی رۆژهەڵاتناسەکان، کە مێژووی کوردیان بە گوێرەی ئارەزووی تایبەتی خۆیان تۆمار کردووە.

جگە لەهەر دوو بواری مێژووی رۆژنامەنووسی مامۆستای نەمر چیرۆکیشی نووسیوە و چەندین دەقی لەدوا بەجێ ماوە.

**حوسێن حوزنی لە (رابەری رۆژنامەگەریی کوردیدا)**

جەمال خەزنەدار لە ساڵی ١٩٧٣ دا (رابەری رۆژنامەگەریی کوردی) بڵاوکردۆتەوە، کە وەکو قاموسێکی رۆژنامەنووسانی کورد وایەو لەلاپەڕەی حوسێن حوزنی موکریانی (١٨٩٣- ١٩٤٧)دا نووسیویەتی و دەڵێ: حوسێن حوزنی لەبابەت هەموو چەشنە خوێندەوارییەک دواوە، مێژوو، ئەدەب، چیرۆک، رۆژنامەگەری، مۆرهەڵکەنی، هونەری گۆڕین، بەتایبەتی ئەو گۆڕینانەی کە لە گۆڤاری دەنگی گێتی تازەدا بڵاوی دەکردەوە لەکاتی خۆیدا، دەکرێ بە سەرچاوەیێکی هونەری و ئەدەبی بەکەڵکی خوێندەواری دابنرێ..

ئەگەر بێت و چاوێک بە مێژووی چاپ و چاپەمەنی و رۆژنامەنووسی کوردی بخشێنین لەسەرەتاوە، بۆمان دەردەکەوێ، کە حوزنی دەورێکی باڵای بووە لە دامەزراندنی چاپخانەی کوردی و بڵاوکردنەوەی گۆڤار و رۆژنامەی جۆراو جۆر بەنهێنی و ئاشکرا، لە حەلەب و رواندز و هەولێر و مووسڵ و بەغدا بەردەوام بووە لەبڵاوکردنەوەی کتێب، لە شاری هەولێر (١١) ژمارە گۆڤاری رووناکی لە ساڵی ١٩٣٥ دەرکردووە، لە ساڵانی ١٩٢٦-١٩٣٢، (٣٢) ژمارەی لە گۆڤاری زاری کرمانجی دەرکردووە.

لەبارەی سەرەتای هونەری چیرۆکنووسیشدا، سەید حوسێن حوزنی بەیەکێک لە رابەرانی ئەم هونەرە دانراوەو لەم بارەیەوە لە (رابەری رۆژنامەگەری کوردی)دا هاتووە: ئەگەر بێت و چیرۆکی کوردی بەبیرۆکە لەقەڵەم بدەین دەتوانین ئەو چیرۆکانەی کە لەسەردەمی حوزنی بڵاودەکرانەوە و حوزنی بڵاویانی دەکردەوە، وەکو " "گوندی کاولبوو" "دزو رەبەن" "خۆشی و ترشی" "بزنۆکە و مەرۆکە" زۆر چیرۆکی تریش بەبنچینەیەکی سەرەتایی دابنێین بۆ گەلاڵە کردنی چیرۆکی کوردی".

**گەشتی حوسێن حوزنی لەگەڵ رۆژنامەنووسیی کوردیدا**

لە ماوەی مانەوەی خاوەنی چاپخانەی کوردستان لە حەلەب بەر لە گواستنەوەی بۆ رواندز، ئەم رۆژنامانەی دەرکردووە یان بەشدار بووە لەدەرکردنیان، هەمووشیان بەنهێنی بڵاوکراونەتەوە: "کوردستان، چیا، کرمانج، دیاربەکر، سۆران، ئارارات، بۆتان" ژمارە دەرچووەکانی هەریەک لەم رۆژنامانە لە (١٠) ژمارە تێپەڕی نەکردووە و هەمووشیان لە چاپخانەی کوردستان چاپ کراون. بەر لەو کاتەش حوسێن حوزنی لە ئەستەنبول هاوکاری لەگەڵ محەمەد میهریدا لە دەرکردنی رۆژنامەی کوردستان کردووە.

لەساڵی ١٩٢٥ حوسێن حوزنی و چاپخانەکەی هاتنە رواندز لەوێ لەم شارۆچکە جوانە و لە بەرامبەر شاخی هەندرێنی سەرکەش و بەهاوکاری سەید تەهای قائمقامی رواندز بەردەوام بووە لەسەر کاری رۆژنامەنووسی و لەساڵی ١٩٢٦ دەستی کرد بە دەرکردنی گۆڤاری (زاری کرمانجی)، کە گۆڤارێکی کۆمەڵایەتی ئەدەبی مێژوویی مانگانە بووە، (٢٤) ژمارەی لێ دەرچووە، خۆی خاوەن و سەرنووسەری بووە. دوا ژمارەی (زاری کرمانجی) لەساڵی ١٩٣٢ دەرچووە.

**(پێناسەکانی گۆڤاری زاری کرمانجی):**

لە ساڵی ٢٠٠٢ دا، د.کوردستان

موکریانی کتێبێکی سەنگینی لەبارەی زاری کرمانجی نووسیوە (١٩٢٦/٥/٢٥) تا (١٩٣٢/٧/٢٣)، لەبارەی پێناسەکانی (زاری کرمانجی)دا هاتووە: لەسەر بەرگی دەرەوەی ژمارە (١- ٣) بەم شێوەیە گۆڤارەکە بەخوێنەران ناسێنراوە: (گۆڤارێکی ئیجتماعی تاریخی فەنی ئەدەبیە). بەڵام لە ژمارە (٤) ساڵی یەکەم - ژمارە (٥)ی ساڵی دووەم - ژمارە (١١)ی تشرینی دووەم ١٩٢٨ پێناسەکەی بەم جۆرە هاتووە: (گۆڤاریکی ئیجتماعی تاریخی فەنی ئەدەبی مانگی یە) لەژمارەکانی تر (ئەدەبی کوردیە) بۆ پێناسەکە زیاد کراوە. لەدوا ژمارەدا کە ژمارە (٢٤)و لە ١٩٣٢/٧/٢٣ دا بلاو کراوەتەوە هیچ پێناسەیەکی گۆڤارەکە نەکراوە. لەژمارە (٧)ی ساڵی یەکەم تا ژمارە (٥)ی ساڵی دووەم بە ئەلف و بێی لاتینیش نێوی گۆڤارەکە نووسراوە: (ZARI-KRMANJI). هەروەها زاری کرمانجی بایەخی زۆری بە بلاوکردنەوەی هەواڵ داوە، هەواڵەکانی هەمەجۆر بوون: ئابووری، کۆمەڵایەتی، زانستی، رۆشنبیری، کارگێری.. هونەرەکانی وێژە، وتار، هۆنراوە، چیرۆک.. بەزۆری لە زاری کرمانجی بلاو کراونەتەوە. کە بۆ ئەوسا زۆر بەنرخ و پێویست بوون و لەو تاک و تەرا بابەتانە بوون، کە بەزمانی کوردی بلاودەکرانەوە و بۆ ئەمڕۆش ژێدەرێکی بە سوودن، هەروەکو د.کوردستان موکریانی بۆمانی تۆمارکردووە.

چیرۆکیش لە زاری کرمانجیدا بە دوو شێوەی هۆنراوەیی و پەخشانی بلاوکراوەتەوە، چیرۆکەکان بەگشتی بە خامەی حوزنی نووسراون و بەشێوەیەکی سەرەکیش ڕەنگدانەوەی ڕووداوی رۆژانەی کۆمەڵگەی کوردەواری بوون و بەشێوازێکی وێژەیی سادەو سانا خراونەتە ڕوو.

هەر بیست و چوار ژمارەی گۆڤاری زاری کرمانجی بەگوتەی (د.موکریانی) بە کتێبێکی بەنرخی بیری نەتەوەی کورد دەژمێردرێت. چیرۆک و هۆنراوەکان هەڵگری بیری نەتەوەیین، وتارەکان هەتا ئەوانەی کۆمەڵایەتی و هونەری و زانستین کالای نەتەوەیان بەبەردا کراوە، هەواڵەکان ئەوانەن کە سوود بەبیری نەتەوەیی دەگەیەنن، زمان و شێوازی نووسین بەزمانێکی نەتەوەیی وا نووسراوە هەموو ڕیزەکانی گەلی لەخۆی کۆکردۆتەوە. دیارە میری عێراق هەتا لەدوای کۆچی دوایی کردنی حوسێن حوزنی لە (١٩٤٧/٩/٢٠) هەر دەستی لە حوزنی و گۆڤارەکەی هەڵنەگرتوودو لە (١٩٤٩/٨/١٥)دا نووسراوی ژمارە ١٤٧٣ ی ئاراستە کردووە و داوای لێ کردووە، کە دەست لە بلاوکردنەوەی گۆڤارەکەی هەڵبگرێت، ئەگینا بەپێی یاسا سزا دەدرێت!!

**(برِاو هاوکارو رابەرێکی دیکە**

**(گیوی موکریانی)**

عەبدولرەحمانی کوری سەید عەبدوللەتیفی موکریانی لەساڵی ١٩٠٣ لەدایک بووە و لە تەمەنی منداڵی لای خاڵەکانی خوێندوویەتی و بە زانستە ئایینییەکان دەستی پێکردووە. لەتەمەنی یانزە ساڵییەوە لەگەڵ برا گەورەی حوسێن چۆتە حەلەب، لەولاتی شام، لەوێ لەسەر خوێندن بەردەوام بووە، قۆناغەکانی سەرەتایی و دواناوەندی بڕیوە، زمانی فەرەنسیشی خوێندووە، لە بەیروت لە کۆلیجی پزیشکی وەرگیراوە، دوو ساڵی تیا خوێندووە، بەڵام دواتر جێی هێشتووە و هاوڕێیەتی برا گەورەی کردووە لەگواستنەوەی چاپخانەی کوردستان لە حەلەبەوە بۆ ڕواندز. هەروەها لەڕواندز هەمیشە هاوکاری بووە لەدەرکردنی گۆڤاری زاری کرمانجی، هەربەیەکەوە ژمارەیەک کتێبی کوردییان بەچاپ گەیاندووە.

لەساڵی ١٩٣٥ دا ڕواندزی جێ هێشتووە و هاتۆتە هەولێر و چاپخانەیەکی کڕیوە و دایمەزراندووە دەستی کردووە بە دەرکردنی گۆڤاری (ڕووناکی)، لەدوایی کۆچی دوایی سەید حوسێن حوزنی برای لەساڵی ١٩٤٧ بەتەنیا چاپخانەکەی بەڕێوەبردووە و لە (١٩٥٤-١٩٦٠) گۆڤاری (هەتاو)ی بلاوکردۆتەوە.

هەروەها ژمارەیەکی زۆر کتێب و دیوانی شاعیرانی لەچاپخانەکەی (کوردستان- هەولێر) بەچاپ

گەیاندووە.

**(گیوی موکریانی ڕۆژنامەنووس):**

لە هەرسێ گۆڤاری (زاری کرمانجی) و (ڕووناکی) و (هەتاو) دەوری بینیوە و لەبارەی گۆڤاری ڕووناکیدا، گۆڤارێکی هەفتانەی کۆمەڵایەتی زانستی ئەدەبی بووە، پارێزەر شێت مستەفا خاوەنی ئیمتیازی بووە، حوسێن حوزنی بەڕێوەبەری بووە و گیوی موکریانی نووسینەکانی تێدا بڵاودەکردەوە یەکەمین ژمارەی (ڕووناکی) لە ٢٤/١٠/١٩٣٥ دەرچووە و دوا ژمارەش، کە (١١)مین ژمارە بووە لە ٢٦/٥/١٩٣٦ دەرچووە. ئەم گۆڤارە لەشاری هەولێر دەرچووە. لەبارەی گۆڤاری (هەتاویش) کە گۆڤارێکی هەفتانەی ئەدەبی بووە نووسەری سەرەکی (گیوی موکریانی) بووە، خاوەن ئیمتیازی فەرمی، ئیبراهیم عەزیز دزەیی بووە دوای ئەو محەمەد شەهابەددین دەباغ بەفەرمی بۆتە خاوەن ئیمتیازی، دوای ئەمیش ڕائیدی خانەنشین جەلال قادر بۆتە خاوەن ئیمتیاز، یەکەمین ژمارەی لە مایسی ١٩٥٤ دەرچووە و دواژمارەشی (١٨٨) هەر لەهەولێر لە ٣٠/١٠/١٩٦٠ دەرچووە.

لەخوێندنەوەیەکی ژمارەکانی ئەم گۆڤارە دوو ڕاستیمان بۆ دەردەکەوێت، یەکەمین ئەوەیە، دەرچوون و بەردەوامبوونی ئەم گۆڤارە بۆ ماوەی ٧ ساڵ بەشدارییەکی کاریگەریی هەبووە، لەبرەودان بەبزاڤی ڕووناکبیری لە شاری هەولێردا لەبارودۆخی سیاسی نالەباری ئەوکاتدا، بەتایبەتی پێش بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەمووزی ١٩٥٨.

دووەمین ڕاستیش ئەوەیە، لە (١٠) ژمارەی یەکەمین، گۆڤارەکەدا زۆربەی وتارو بابەتەکان لەلایەن گیوی موکریانی نووسراون، کە بەڕێوەبەری نووسینی گۆڤارەکە بووە، هەندێکی بەناوی ئاشکرایی و ئەوانی دیکەش بەناوی خواستراوەوە بووە، هەندێ نووسەری ناوداری دیکەش لە (هەتاو) باس و وتارو بابەتەکانیان بڵاوکردۆتەوە.

لەیەکەمین ژمارەدا (١٠) بابەت بڵاوکراوەتەوە هەمووی لەلایەن گیوی موکریانی نووسراوە، لەژمارە (٢)دا (١٥) بابەتی تیا بڵاوکراوەتەوە، تەنیا چوار نووسەری دیکە بابەتیان هەبووە، بابەتەکانی دیکە هەمووی لەلایەن گیوی موکریانی ئامادەکراون. لە (١١) بابەتی ژمارە سێیەمینیشدا (٩) بابەتیان بەدەست و خامەی (موکریانی) نووسراون. لەژمارە (٤) یشدا دیسان زۆربەی وتارەکان بە پێنووسی خۆی بووە، هەروەها تاکو ژمارە (١٠) زۆربەی بابەت و وتارەکان لەلایەن بەڕێوەبەری نووسین گیوی موکریانی نووسراون و بڵاوکراونەتەوە، بەڵام لەم دە ژمارە یەکەمینەدا ئەم نووسەر و شاعیرانەش بەرهەمیان تیا بڵاوکردۆتەوە: (پیرباڵ مەحموود، جەوهەر غەمگین، شاکر فەتاح، نەریمان، سەردار حەمەد ئاغا، مەلا خالد عەزیز دزەیی، ئەندازیار ئیبراهیم دزەیی، حەسەن کەنعان پاشای بەدرخان، مامەند هەورامی)...

ئاشکرایە کە گیوی موکریانی ئەمر جگە لە بواری ڕۆژنامەنووسی ئەم بەرهەمانەشی بە چاپ گەیاندووە یان دوای کۆچی دوایی چاپ کراون: (گیو نامە، ئەلف و بێی کوردی- وێنەدار بە پیتی لاتینی، فێربوونی زمانی کوردی، ناوی کچ و کوڕانی کوردی، خەون نامە، بۆ پێکەنین، مەلا نەسرەدین، فەرهەنگی کوردستان قامووسێکی، کوردی- کوردییە، کە (٨) بەرگی گەورەیە نزیکەی ٤٠٠٠ لاپەڕەی فولسکاب دەبێ. نۆبەرە- قامووسێکی قوتابخانەیە ٢٥٠٠٠ وشە لەخۆ دەگرێت. هەروەها گیوی موکریانی لە چاپخانەکەیدا چەندین دیوانە شیعری شاعیرانی کلاسیکی کوردی بە چاپ گەیاندووە و زۆر دەستنووسی لە فەوتان ڕزگار کردووە، لە ٢٤/٧/١٩٧٧ دڵی گەورەی ئەم ڕۆژنامەنووس و نووسەرە گەورەیە لە لێدان کەوتووە، بەڵام ناو و یادگارییەکانی بە زیندوویتی ماونەتەوە.

**سەرچاوەکان:**

١- جەمال خەزنەدار، ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردی، ١٩٧٣.

٢- نۆبەرە، دانانی گیوی موکریانی ١٩٨٦.

٣- زاری کرمانجی، ئامادەکردن و پێشەکی د.کوردستان موکریانی، ٢٠٠٢.

٤- مەغدید حاجی، کاروانە دوورو درێژەکەی چاپخانەی کوردستان، ڕۆژنامەی عێراق، ٢٣ نیسان ١٩٨١.

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری (هاوڕێ) ژمارە ٢٨ مارسی ٢٠٠٦ وەرگیراوە.**

# گیوی موکریانی
# ١٩٠٣-١٩٧٧

گیوی موکریانی نووسەرو رۆژنامەنووس و چاپگەرو فەرهەنگنووسی ناوداری کورد، نازناوی ئەدەبی و رۆژنامەنووسی مامۆستای خوالێخۆشبوو عەبدورەحمان کوڕی سەید عەبدوللەتیف کوڕی شێخ ئیسماعیل خەزایییەو لەساڵی ١٩٠٣دا لەشاری مەهاباد لەدایک بووەو خوێندنی سەرەتایی لەو شارەدا فێر بووەو ماوەیەک لەگەڵ حوزنی موکریانی کاکیدا، لەحەلەب بەپیشەی مۆرهەڵکەنی و چاپگەری ژیاون و لەساڵی ١٩٢٥دا هاتوونەتە باشووری کوردستان و (چاپخانەی زاری کرمانجی)یان داناوەو لەشاری رواندز نیشتەجێ بوون. کاتێک حوزنی لە ٢٥/٥/١٩٢٦دا یەکەم ژمارەی گۆڤاری زاری کرمانجی دەرچواند، مامۆستا گیوی لاو بەڕێوەبەری کاروباری گۆڤارەکە بوو، توانییان تاکو ساڵی ١٩٣٢ بیست و چوار ژمارەی تێرو تەسەلی پێتەو دەربچوێنن.

لەساڵی ١٩٣٥دا مامۆستا گیو هاتە هەولێرو چاپخانەکەی زاری کرمانجی هێنایە ئەم شارەو مەکینەیەکی نوێی چاپیشی کڕی و کەوتە سەر کتێب چاپ کردن، بەتایبەتی کتێبی کوردی. کە لە ٢٠/٩/١٩٤٧دا حوزنی موکریانی کاکی کۆچی دوایی کرد، چاپخانەکەی زاری کرمانجی بووە موڵکی خۆی و لەراپەڕینە نیشتمانییەکەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨دا ناوی چاپخانەکەی نا (کوردستان) و تاکو ئێستاکە هەر بەناوی چاپخانەی کوردستان لەلایەن رۆڵەکانییەوە بەڕێوەدەچێ.

**چالاکی فەرهەنگنووسیی و رۆژنامەگەری:**

مامۆستا گیو لەساڵی ١٩٥٠دا یەکەمین فەرهەنگی (عەرەبی- کوردی) بەناوی (رابەر) لەچاپخانەکەی خۆی، (چاپخانەی کوردستان) بەچاپ گەیاندو لە ١٥/٥/١٩٥٤دا گۆڤارێکی بەزمانی کوردی لەشاری هەولێر بەناوی (هەتاو) دەرچوواند تاکو رۆژی داخستنی لە ٣٠/١٠/١٩٦٠ توانی ١٨٨ ژمارەی لێ بڵاو بکاتەوەو خزمەتێکی زۆری رۆژنامەنووسی و ئەدەب و مێژووی کورد بکات.

لەساڵی ١٩٥٥دا چاپی یەکەمی فەرهەنگی (کۆڵکە زێڕینە)ی بەزمانانی (کوردی- فارسی- عەرەبی- فەرەنسی- ئینگلیزی) داناوەو چاپکردو لەساڵی ١٩٦١دا فەرهەنگێکی (کوردی- عەرەبی) بەناوی (فەرهەنگی مەهاباد) داناو بەچاپی گەیاند. جگە لەم چەند فەرهەنگە چاپکراوانەشی چەند فەرهەنگێکی نایابی دیکەی بەدەسنووسی لەپاش بەجێماوە.

١- فەرهەنگی (نۆبەرە- الباکورە): فەرهەنگێکی (عەرەبی- کوردی)یە، و (٤٠٤) لاپەڕەی گەورەیەو" دکتۆر کوردستان موکریانی"بەچاپی گەیاندووە.

٢- فەرهەنگی کوردستان: فەرهەنگێکی (کوردی- عەرەبی)یەو لە (٩٤٠) لاپەڕەی قەبارە گەورەی چاپکراوو دەزگای ئاراس- لەهەولێر لەچاپی داوە.

جگە لەم فەرهەنگە بەنرخانەیشی، مامۆستا گیو پێشەکی بۆ دیوانی گەلێک لەشاعیرە مەزنەکانی کوردی نووسیوە، وەک دیوانەکانی مەلای جزیریء نالی و سالم و کوردی و حاجی قادری کۆیی. لەچاپخانەکەی خۆیدا ئەو دیوانانەی بەچاپ گەیاندووەو لەپاڵ ئەم کارە ئەدەبییەشی چەند کتێبێکی خۆیشی نووسیوە وەک "گیونامە": کە ژیاننامە و شیعری شاعیرانی کوردە و بەپێی پیتی یەکەمی ناو و نازناویان ریزکراون و لەپاش کۆچی دوایی، دکتۆر کوردستان موکریانی چەند بەرگێکی لێ بەچاپ گەیاندووە. هەروەها کتێبی "فێربوونی زمانی کوردی وێنەدار بەتیپی لاتینی" و نزیکەی (٥٠) کتێب و گۆڤاری نووسەرانی کوردی لەچاپخانەکەی خۆیدا بەچاپ گەیاندووەو ناوبانگێکی گەورەی لەناو رووناکبیرانی کوردستان پەیدا کردووە. لەگەڵ دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی کورد لە ١٠/٢/١٩٧٠دا بووەتە ئەندامێکی دیاری ئەم رێکخراوە ئەدەبییەی کوردو لەساڵی ١٩٧٣شدا بەئەندامی یاریدەدەری کۆڕی زانیاری کورد لەبەغدا هەڵبژێردراوە. لەتەمەنی ٧٤ ساڵیدا لەرۆژی ٢٤/٧/١٩٧٧دا لەنەخۆشخانەی موسڵ بەنەخۆشی دڵ کۆچی دوایی کردووەو لەگۆڕستانی ئیمام محەمەد لەشاری هەولێر بەڕێزێکی زۆرەوەو بەئامادەبوونی نووسەرو رووناکبیرانی شارەکە بەخاک سپێردرا.

**کەریم شارەزا**




# هەولێر لە گۆڤاری (هەتاو)دا

**دکتۆر هیمدادی حوسێن**
**کۆلیژی پەروەردە- زانکۆی سەلاحەددین**


گیوی موکریانی

**پێشەکی:**

شارێکی کۆن و دێرینی وەکو هەولێر بێگومان دەبێ لە ڕۆشنبیریشدا خاوەن رابردوویەکی زێڕین بێت و بە قـەڵەمی نووسـەرانی لاپەڕەکـانی ئەدەب و رووناکبیری کوردیی رازاندبێتەوە. ڕۆشنبیریی پەنجاکـانی ئەم شارە و هەوڵی تازەکـردنەوەی ئەدەبی و کـارکردن بۆ ڕۆژنامـەوانی لە ئەرکـە سـەرەکـیـیـەکـانی روونکردنەوەی ئەم باسەن.

سنووری لێکۆڵینەوەکەمان، لە چوارچێوەی شاری هەولێر و دەوروبەری دایەو لە رووی کات و زەمـەنیشـەوە لە سەردەتاوە تا کۆتایی پەنجاکان، تا داخـستنی گۆڤاری (هەتاو) لە (١٩٦٠) دا دەگرێتەوە.

**کورتەیەک لە باری سیاسی و ڕۆشنبیری و فیکری**

بۆ ئەوەی باشتر لە باری ڕۆشنبیریی و ئەدەبیی و سیاسیی شاری هەولێر تێ بگەین، دەبێ چاوێکی خێرا بە بارودۆخی سەرجەم عێراقدا بخشێنین، چونکە هەمـان ئەو بارودۆخـەش کـەم و زۆر لە لیـوای هەولێـردا ڕەنگی داوەتەوە. دوابەدوای ڕاپەڕینیی گـەلانی عـێراق لە (١٩٤٨)دا بارودۆخی پاشـایەتی لە عـێراقدا ئارامی و سـەقـامگیرییەکی سـیاسی ئەوتۆی بەخۆوە نەبینی، بەهۆی

پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئینگلیز لە عێراقدا داروودەستەی حکومەتە یەک لە دوای یەکەکانی عێراق پەشێوی و چەوساندنەوەیەکی زۆری ئابووری و کۆمەلایەتییان سەپاندبوو، نەبوونی ئازادی فیکری ببووە خەسلەتی حکومەت لە عێراقدا. لە سەرەتای پەنجاکاندا بە تایبەتی لە سالی (١٩٥٢)دا شان بەشانی هەموو شارەکانی دیکەی عێراق لە هەولێریش خەلکی ڕژانە نێو جادەکان و پارتە سیاسییەکان شیوعی و پارتی، دەوری دیاریان لە ئاراستە کردنی خەلکی بۆ هۆشیاری نەتەوەیی و بەرزکردنەوەی ئاستی فیکری و ڕۆشنبیریی خەلک لە بەرامبەر سیاسەتی چەواشەکاریی ئینگلیز لە عێراقدا هەبوو، بە تایبەتی لەو نارەزایی و خۆپێشاندانانەدا خەلکی داوای ڕووخاندنی ڕژێمی پاشایەتی و چاککردنی باری گوزەران و هەلبژاردنی پاک و بێگەردیان دەکرد.

لە سالی (١٩٥٣)دا لە شاری هەولێر جووتیارانی دەشتی دزەیی بە هۆی زولم و زۆرداری هەندێ لە ئاغاکان و بەهاندانی هەندێ کورە ئاغای بیرکراوەو شیوعی ڕاپەڕین، خەلکی هەولێریش دوای ئەوەی، کە دامودەزگا حکومییەکان کەوتنە گرتن و بلاوە پێکردنی جووتیاران و لایەنگریی ئاغاکانیان کرد، خۆپێشاندانی گەورەیان سازکرد و تیایدا ژمارەیەک لە ڕووناکبیرەکان لەو خۆپێشاندانانەدا گیران، لەوانە: (عەونی یوسف و عەلی فەتاح دزەیی و زێوەر خەتاب و کەنعان خەتاب و جەلیل هوشیار و حوسێن حەلاق و ڕەشید عەبدولقادر و شێخەشەل و زۆری تر[1].

ژمارەیەکی زۆر لە گوندەکانی دەشتی دزەیی وێڕای داوای چاککردنی باری ژیان و گوزەرانی خۆیان، سکالایان دەکرد، بەلام ئەو نارەزاییەیان سەری نەگرت و (حکومەتی جەمیل مەدفەعی لە (٢٩)ی کانوونی دووەمی (١٩٥٣) دا بەهێز ڕووبەڕوویان بۆوە).[2]

بارودۆخی فیکریی و سیاسیی ئەو ڕۆژەی هەولێر، بریتی بوو لە ململانێی فیکریی نێوان ڕۆشنبیرەکانی شیوعی و پارتی. زۆرینەی ڕووناکبیرەکان بە هۆی سەرکەوتنی یەکیەتی سۆڤیەتەوە بەسەر ئەلمانیای نازی لە دووەمین جەنگی گیتیدا و بلاوبوونەوەی دروشمەکانی بیری




سۆسیالیستی، کەش و هەوایەکی وای دروست کردبوو، کە لایەنگرانی باوەڕی زۆر پتەویان بەو حیزبە بێت، هەر لەو بارودۆخەدا و لە سەرەتای پەنجاکاندا عەونی یوسف و عومەر مستەفا (دەبابە) و جەلال تالەبانی و عەبدوللا ئیسماعیل و وریا کانی مارانی و لەتیف بەرزنجی و نەژاد عەبدوللا عەزیز.. هتد، بەدزی و نهێنییەوە خەریکی کاری حیزبایەتی بۆ شانەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان بوون. لەولایشەوە چەندین ڕۆشنبیری وەکو عەزیز محەمەد و مەلا شەریف و جەمال حەیدەری و عاسم حەیدەری و عەلی فەتاح دزەیی و زیوەر خەتاب و شێخەشەل (خاوەنی کتێبخانەی هەولێر)و چەندانی دی سەر بە بەرەی چەپ و شیوعی بوون. [3] لەو نێوانەشدا هەندێ ڕۆشنبیری کورد بێ لایەن و دوور لە حیزبایەتی بە تەنیا خەریکی کاری ئەدەبی بوون، لەوانە: مارف خەزنەدار و جاهید و کانی و پیربال مەحموود..

لەڕووی ڕۆشنبیرییەوە لە سەرەتای پەنجاکاندا هەولێر یەکێک بوو لە سەنتەرەکانی بزووتنەوەی ڕۆشنبیریی لە کوردستاندا و بلاوبوونەوەی ڕۆژنامەی (هەولێر - اربیل) لە سالانی (١٩٥٠-١٩٥٣) دا لە لایەن کۆمەڵەی مامۆستایانی کوردستان لقی هەولێرەوە، گۆڕان و وەچەرخانێکی تازە بوو لە مێژووی ڕۆژنامەوانیی و ئەدەبیاتی کوردیدا. ڕۆڵی دیارو بەرچاوی نووسەرانی وەکوو: (عیزەدین فەیزی و زەکی ئەحمەد هەناری و مارف خەزنەدار و عەلی جوکل بەریە و گیوی موکریانی و محەمەد عەلی کوردی و حوسێن ڕەشوانی، لە ناساندنی مێژوو و ئەدەب و زمان و کەلەپووری کورد بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبییەوە، دیار و بەرچاوە).

لە یەکەمین ژمارەی ئەو ڕۆژنامەیەدا عیزەدین فەیزی نووسیویەتی:

ئەم هەولێرە قەدیمە، کە میللەتێکی دڵپاک و چاکی تێدایە، لە مێژە لە خوێندنەوەی ناوخۆی و زوبانی خۆی مەحرووممە. جا ئەی هاوولاتیەکانی خۆم، مەعلوومە لاتان کە زۆرترین شارە گەورەو بچووکەکانی عێراق، ڕۆژنامەی خۆیان لەناوخۆیاندا بلاو ئەکرێتەوە و ئەخوێنرێتەوە... ئەمە یەکەمین ڕۆژە لە هەولێر ڕۆناکی ڕۆژنامە بلاو دەبێتەوە و دڵی مامۆستایان و تێگەیشتووان گەش دەکاتەوە)[٤].

لە ناوەڕاستی مانگی مایسی (١٩٥٤) دا گۆڤاری (هەتاو) بلاوبووەوە، لەو کاتەدا کابینەی دووەمی (ارشد العمري) لە عێراق لەسەر کار بوو، ئەو گۆڤارە بە هەوڵی (گیوی موکریانی) چاوی هەڵێنا، لەوکاتەدا کە تەنیا چەند ژمارەیەکی ڕۆژنامەی (ژین) لە سلێمانییەوە دەگەیشتە هەولێر، دەنا ڕۆژنامەکانی دی هەمووی عەرەبی و هی عەرەبە چەپەکان و نەتەوەییەکانی عەرەب و عێراقییەکان بوون، وەکوو: الشعب والاحرار وام درمان... هتد.

مۆڵەتی گۆڤاری (هەتاو) فەزڵەکەی هی (سەعید قەزاز)، وەزیری ناوەخۆ بوو، کە ناوبراو کورد بووە و پاشان لە مۆڵەتی گۆڤاری (هیوا)یش لە ساڵی (١٩٥٧)دا بۆ یانەی سەرکەوتنی کوردان دەوری هەبوو.[٥]

لە گۆڤاری (هەتاو) دا بەبۆنەی گواستنەوەی موتەسەڕیفی هەولێر (ئیسماعیل حەقی شاویس) دوە نووسراوە:

(هەتاویش کە یادگاری دەوری مەعالی ئوستاد سەعید بەگ قەزازی وەزیری داخلیە خۆمان و مامۆستا ئیسماعیل حەقی بەگی وێژە پەروەر...)[٦]

هەر لە ساڵی (١٩٥٤)دا، حکومەت بۆ ئەوەی بتوانێ بەرامبەر بە شالاوی ڕاگەیاندنی حیزبە نەیارەکان و ئۆپۆزسیۆنەکان بوەستێتەوە، لەپاڵ چەندین بڕیاری دیکەدا، فەرمانی داخستنی ژمارەیەکی زۆر ڕۆژنامە و گۆڤاری ناوەوەی ولاتی دەرکرد، لەوانە ڕۆژنامەی (أخبار اليوم) و گۆڤارەکانی (الوادي، الحساب، العمل) پاشان ڕۆژنامەکانی (اخبار المساء، النهضة، النضال) بۆ ماوەی ساڵێک.[٧]

هەر لەو ساڵەدا، لە هەولێر و شارۆچکەکانی دەوروبەریشیدا، خۆپیشاندان لە دژی حکومەتی دوازدەهەمی (نوری سەعید) سازدراوە، بۆ نموونە، لە شارۆچکەی شەقلاوە لە پێناو کردنەوەی قوتابخانەی ناوەندی و چاککردنی باری گوزەرانی خەڵکدا و دواتریش لە (١٩٥٥)دا دیسان بەبۆنەی سەردانی (نووری سەعید)ەوە بۆ ئەو شارۆچکەیە و لە دژی پەیمانی بەغدا خۆپیشاندان سازکراوە.[٨].

بەشداریی عێراق لە (پەیماننامەی بەغدا)دا، جارێکی دی عێراقی دەروەست بە سیاسەتی ئینگلیز کردەوە، ساڵێک دواتر لە (١٩٥٦)دا بە هۆی هێرشی سێ لایەنە بۆ سەر هێزە نیشتیمانییەکان بە ڕێگەی ناڕەزایی و خۆپیشاندان لە عێراق بە گشتی، لە هەولێریش ڕق و تووڕەیی خۆیان و هەڵوێستی دژ بە حکومەتیان دەربڕی، حکومەت ناچار بوو لە کۆتاییدا هەڵوێستی خۆی بگۆڕێ و یارمەتی سەربازیی بۆ میسر بنێرێ، لە پاڵ ئەوەشدا کۆمەڵێ بڕیاری گرنگ دەربکا لە داخستن و ڕەتکردنەوەی مۆڵەتی هەموو ڕۆژنامەکان و داواکرا، کە نابێ لە حەوت ڕۆژنامە زیاتر لە بەغدا دەربچێ[٩].

ساڵی(١٩٥٨)، ساڵێکی گرنگە لە مێژووی هاوچەرخی عێراقدا، بە ڕووخانی ڕژێمی پاشایەتی و سەرکەوتنی هێزو ئیرادەی گەل لە بەرامبەر ئیمپیریالیزمدا، گۆڕانکارییەکی گەورە ڕوویدا. لە ڕووی ڕۆشنبیرییەوە

چەندین دەستکەوتی گەورە لە بواری چاپەمەنی و ڕۆژنامەوانیدا وەدەست هات، کە بەرهەمی ئازادیی بیرو بۆچوون و سیاسەتی ئەو سەردەمە بوون. گۆڤارەکانی (شەفەق) و ڕۆژنامەکانی (برایەتی) و (خەبات)، پاشتر ناوەندی ڕووناکبیریی کوردستانیان بووژاندەوە، بەڵام ئەو سەربەستی و ئازادییە لە دوای ساڵی (١٩٦٠)ەوە، بە هۆی ناکۆکی کوردو حکومەتەوە، بەوەی، کە حکومەت لە هەڵوێستی خۆی پەشیمان بووەوە و بارودۆخ بەهۆی شۆڕشی ئەیلولەوە کەوتەوە گرژی و ڕۆژنامە و گۆڤارەکانیش لە کار کەوتن، گۆڤاری (هەتاو)یش دوای حەوت ساڵ تەمەن و (١٨٨) ژمارە داخرا و (گیوی موکریانی)ش بە تاوانی کوردایەتی بۆ خوارووی عێراق دوورخرایەوە.

**ناساندنی گۆڤاری (هەتاو):**

دوابەدوای ئەو بارودۆخە سیاسیی و ڕۆشنبیرییەی لە ساڵانی پەنجاکان، کە لە ناوەندی ڕۆشنبیریی کوردیدا بە تەنیا ڕۆژنامەی (ژین)(١٠)، لە شاری سلێمانی بڵاودەبووەوە و ژمارەیەکی زۆر لە نووسەرو ڕووناکبیرەکانی هەموو شارەکانی باشووری کوردستانی بەشدارییان تێدا دەکرد.

لە شاری هەولێر بەهەوڵ و هیممەتی جوامێرانەی (گیوی موکریانی) خاوەنی (چاپخانەی کوردستان) توانرا جارێکی تر گۆڤار و ڕۆژنامەوانیی کوردیی لەو شارە دێرینەدا بە هەرمێن بکرێتەوە. بە تایبەتی تازە (ڕۆژنامەی اربیل - هەولێر)(١١)داخرابوو.

لە پێشدا بە پێویستی دەزانین لە ئاست خزمەتی ئەدەبی و ڕۆژنامەوانیی گیوی موکریانیدا هەڵوێستەیەک بکەین. ئەم ڕووناکبیرە بە بنەچە کوردێکی ڕۆژهەڵاتی کوردستانە و لەگەڵ (حوزنی موکریانی) کاکی لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا چاپخانەیان هێنایە کوردستان و سەرەتا لە حەلەب و پاشان لە ڕواندز و دواجار لە هەولێر گیرسانەوە. بوونی ئەم یەکەم چاپخانەیە لە مێژووی چاپ و چاپەمەنی کوردیی لەم شارەدا، هەرچەندە سادەو ساکاریش بوویێت بۆ چاپی کتێب و بڵاوبوونەوەی بزاڤی ڕۆژنامەوانیی کاریگەرییەکی زۆری بووە. لە ڕێگای ئەو چاپخانەیەوە چەندین دیوانی شیعری شاعیرانی کلاسیک و فەرهەنگ و بابەتی مێژوویی و ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردی لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا چاپ کراون، دوابەدوای کۆچی دوایی (حوزنی) کاکی لە ساڵی (١٩٤٧)دا، ئیتر بە تەواوی کاروباری چاپخانەکە کەوتە دەست گیوی موکریانی، ئەویش هەر لەسەر ڕێبازی پێشووی کاکی لە خزمەتی وشەی کوردیدا بوو، لە پێگەیاندن و ڕێگە نیشاندان و هاندانی چەندین شاعیر و نووسەری کورد لە هەموو لایەکی کوردستانەوە دریغی نەکردووە. تەنانەت لە گەنجیشدا لە سەنعەت و دەست ڕەنگینی و زمانزانییەکەی چەندین کەس بەهرەی وەرگرتووە. محەممەدی قازی وەرگێڕی بە توانای کورد، کە بەرهەمێکی زۆری تەرجەمەی سەر زمانی فارسی کردووە، بە شانازییەوە، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لەسەر دەستی گیوی موکریانی لە مەهاباد فێری زمانی فەرەنسی بووە.(١٢)

بڵاوکردنەوەی (گۆڤاری هەتاو) یەکێکە لە هەوڵە ڕۆژنامەوانییەکانی گیوی موکریانی، یەکەم ژمارەی لە (١٩٥٤/٥/١٥)دا لە هەولێر بڵاوکراوەتەوە. لەو سەردەمەدا تاقە گۆڤاری کوردی بووە لە کوردستاندا دەرچووە. بە پێی شارەزایی من، لێکۆڵینەوەیەکی فراوانی ئەکادیمی لە بارەی ئەو گۆڤارەوە نەنووسراوە، جگە لە چەند ئاماژەیەکی پەرت و بڵاو و ئەوە نەبێ، کە چەند ژمارەی لێ دەرچووە و کەی و لە لایەن کێوە، زیاتر نییە. هەروەها هەر دە ڕۆژ جارێک دەرچووە، خاوەنی ئیمتیازو بەڕێوەبەری گیوی موکریانی بووە، بەرپرسیاری پارێزەر ئیبراهیم عەزیز دزەیی بووە، ژمارە (١)ی لە ڕۆژی یەکی مایس ١٩٥٤دا دەرچووە، نزیکەی ١٨٨ ژمارەی لێ بڵاوکراوەتەوە.(١٣)

سەرنووسەری گۆڤارەکە محامی ئیبراهیم عەزیز ئاغای دزەیی بووە و خاوەن ئیمتیازو هەڵسووڕێنەر، گیوی موکریانی بووە. لە ژمارە (٤٠)ەوە سەرنووسەری بووە بە (محەمەد شەهابەدین دەباغ) و لە ژمارە (١٣٨)ەوە بووە بە (جەلال قادر). لەسەر بەرگی گۆڤارەکە نووسراوە: (گۆڤارێکی وێژەیی (ئەدەبی) هەفتەیی کوردییە جارێ هەر لە ١٠ ڕۆژاندا چەلێکی پەخش دەکرێت).

ئەم گۆڤارە بەهۆی گیروگرفتی چاپ و توانای ماددییەوە

نەیتوانیوە بە شێوەیەکی ڕێک و پێک و لە کاتی دیاری کراوی خۆیدا دەربچێت، هەندێ جار بە (١٠) ڕۆژان و هەندێ جاریش زیاتر لە (١٥) ڕۆژان ژمارەیەکی لێ دەرچووە. مەسەلەیەکی دی، کە سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە، نووسەرانی کورد، لە شارەکانی سلێمانی و بەغدا و لەدەرەوەی کوردستانیشدا بەرهەمی خۆیان بۆ ڕەوانە کردووە و بەشداری نووسینیان کردووە.

جەبار جەباری لە مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردیدا، وەها گۆڤاری (هەتاو) هەڵدەسەنگێنێ:

(ئەم گۆڤارە دەستێکی باڵای هەیە لە پێگەیاندن و هاندانی ڕۆشنبیرە تازە هەڵکەوتووەکانی گەلی کوردمان، هەمیشە بە ئسلوبێکی دڵ بزوێنەر پاڵی بە لاوەکانەوە ئەنا بۆ هۆنینەوەی هەڵبەست و بە زۆری بەرهەمەکانیشیان بڵاو ئەکرایەوە.)(١٤)

هەروەها لە میانەی گفتوگۆیەکدا لە بارەی باری ڕۆشنبیریی و ئەدەبی پەنجاکانی شاری هەولێرو کۆیەوە، (دڵزار) لە بابەت گۆڤاری (هەتاو)ەوە گوتوویە:

(ئەم گۆڤارە ئەگەر چی لەڕووی هونەری و داڕشتنەوە بەهێز نەبوو، بەڵام خزمەتێکی باشی زمان و ئەدەبی کوردی کرد، گەلێ شاعیرو نووسەری کوردی پێ گەیاند)(١٥)

بە شێوەیەکی گشتی لە بارەی ئاستی ئەدەبی و هونەری گۆڤارەکەوە دەتوانین بەسەر دوو قۆناغدا دابەشی بکەین:

**یەکەم:** بەر لە شۆڕشی چواردەی تەمووز.

**دووەمیان:** قۆناغی دوای شۆڕش.

لە قۆناغی یەکەمدا، ئاستی گۆڤارەکە لاوازیی لە ڕووی بابەت و ڕوخسارەوە پێوە دیارە، هەروەها بەشداریی ڕۆشنبیرو نووسەرانی هەولێری کەمتر تێدا بەدی دەکرێ، بە پێچەوانەی قۆناغی دوای شۆڕشەوە، نووسەرانی کورد لە هەموو لایەکەوە بەرهەمیان بۆ ڕەوانە کردووە، بەڵام دیسانەوە دەبێ ئەوە بڵێین، چونکە لەلایەن (گیوی موکریانی) و بەپارەو پوولی خۆی و بە ئیمکانیاتی کەمەوە دەردەچوو لە ئاستی پێویستدا نەبووە، لە وەڵامی ڕەخنەیەکدا کە بۆچی نووسەران زیاتر بۆ گۆڤاری (پەیام) دەنووسن، (گیوی موکریانی) دەڵێ: (هۆی ئەوەی کە دەستی یارمەتیم بۆ درێژ ناکرێت و کەمتر وتاریشم بۆ دەنێررێ، تەنها لە وەی دەزانم، کە لەم خاکەدا هەستی نیشتیمانی سست و بێ برەوە، پەیام چەورە و من و هەتاویش یەک لەیەکتر ڕووت و هەژارترین).(١٦)

**بابەتە ڕۆشنبیریی و ئەدەبییەکان:**

بابەتە ڕۆشنبیری و ئەدەبییەکانی گۆڤارەکە هەمە چەشنە و فرە لایەنن. ئێمە هەوڵدەدەین لە ئاست چەند بابەتێکدا هەڵوەستەیەک بکەین:

**شیعری کوردی:**

لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا و بە تەواوی لە دوای برانەوەی یەکەمین جەنگی جیهانی، شیعری کوردی تازەبوونەوەیەکی بە خۆوە بینی و ئەو تازەبوونەوەیە هەردوو لایەنی ڕووخسارو ناوەڕۆکی گرتەوە. لە ڕووی رووخسارەوە، گۆڕان بەسەر کێشی شیعری کوردیدا هات و زیاتر کێشی برگەیی یان کێشی گۆرانی فۆلکلۆری کوردی سەرنجی شاعیرانی ڕاکێشا، لەڕووی زمانیشەوە، وشە و زاراوەی کوردیی پەتی جێگەی وشە وزاراوەی شیعری ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی گەلانی دراوسێ لە عەرەب و فارس و تورکی گرتەوە، لەڕووی قافییەوە، زیاتر جووت قافیە و قافیەی ڕەنگاوڕەنگ بڵاوبووەوە، قاڵبە کۆنەکانی شیعری کلاسیکی وەکوو غەزەل و قەسیدە و چوارین.. کەم بوونەوە و شیعری ستوونی و پاشان شیعری ئازاد پەرەی سەند.

لەڕووی ناوەڕۆکەوە، قۆناغێکی ڕووناکبیری و لاکردنەوە بەلای کێشە سیاسی و نەتەوەییەکاندا هاتە گۆڕێ و چوارچێوە کۆنەکەی پێشوو لە غەزەل و دڵداری و وەسف جێگەیان لەق بوو، کێشە کۆمەڵایەتییەکان زەمینەیەکی بەرفراوانیان لە جەستەی شیعر داپۆشی. ڕۆڵی شاعیرانی وەکو: (زێوەر و پیرەمێرد، عەبدولرەحمان بەگی بابان و شێخ نووری شێخ ساڵح و گۆران)، لەو تازەکردنەوەیەدا شایانی ئاماژە پێکردنن. ئەو ڕەوتە نوێیەی شیعر درێژەی کێشا، تا لەگەڵ کۆتایی هاتنی دووەمین جەنگی گێتیدا بە تەواوی ئاسەواری شیعری کلاسیکی ون بوو و ڕۆژگارە پڕ لە ڕووداو و هەڵبەز و دابەزەکەی ئەو

سەردەمە ڕێگەی بۆ شیعر خۆش کرد، کە ببێتە بەشداریکەر لە گرفتەکانی سەردەم و پەیامێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی وشیارکەرەوە بهێنێت و دەروەست بوون لە شیعردا بووە دروشمی سەرەکی شیعر، لەم ڕووەوە (د. مارف خەزنەدار) دەڵێ: (هەرچی شیعریش بوو مەیلێکی ئەوتۆی بۆ شیعری کلاسیکی لە ناوەوە نەبوو. لە مەیدانی چێژی ئەدەبیدا (ژدانۆڤیزم) و قوتابخانەی (ریالیزمی سۆسیالیستی)بە هەرمێن بوون)[١٧].

لە ڕووی ڕووخساریشەوە کێشی هەمەڕەنگ و شیعری ئازاد بووە باو و لەگەڵ واقیعدا ڕێکەوت. شاعیرانی ئەو سەردەمە بە خوێندنەوە و کاریگەریی شاعیرە نوێخوازەکانی ئەو سەردەمەی عەرەب هەوڵیان دەدا ڕوو لە دنیای تازەبوونەوەی شیعریی بکەن. (جەوهەر غەمگین)ی شاعیر لەسەر ئەو کاریگەرییە وەها دەردەخا: (.. ئێمە مانان لەرێی گۆڤار و خوێندنەوەی شیعری شاعیرانی عەرەب، وەک:(نازك الملائكة، عاتكة الخزرجي، بدر شاكر السياب، محەمەد خليل شلش، علي الحلي، فاروق شوشە... هتد) کە زۆربەیان لە گۆڤاری (الاداب)ی بەیرووتی نووسینیان بلاودەکردەوە... تاموچێژی خۆیان هەبوو... ئێمەش جا چ لە رێی لاساییکردنەوە چ لە رێی سروشتی خۆرسکی کورد خۆی بێ... ڕێچکەی نوێخوازی بە دیارکەوت و جێی خۆی گرت.. من خۆم یەکێک بووم، کە (الاداب)م بەردەوام دەخوێندەوە و چێژم لێ وەردەگرت.. هەروا لە پەنجاکان (ئەدەبی مەهجەر)، کە (میخائیل نەعیمە و جوبران خەلیل جوبران) و هی تر نووسین و شیعرەکانیان، کە ئەورووپیانە بوو، دەکەوتە دەستمان و دەمانخوێندنەوە)[١٨].

بوونی گۆڤارێکی کوردی، لەو ڕۆژگارەدا، شوێن و پایەی خۆی لە دڵی ڕۆشنبیرو شاعیرانی ئەو سەردەمەدا بووە، چونکە گۆڤاری (هەتاو) لە شاری هەولێر تاقە گۆڤاری ئەو سەردەمەی باشووری کوردستان بوو، کە بتوانن وەکوو سەرچاوەیەکی ڕۆشنبیریی کوردی سوودی لێ وەرگرن.

(مەسعود کەتانی) لە ئامێدییەوە دەڵێ:

**شەڤ چ کاری بوو مە لێ دەرکەت هەتاف**
**روون کری ل من هزر و دل فکر و هناف**[١٩]

(جاهید) کە ئەو سەردەمە گیوی موکریانی تەخەلوسی (شێواو)ی بۆ هەڵبژاردبوو، وا هەستی خۆی دەردەبڕێ:

**هەتاو هەر تۆ هەتاوی ئاسمانی خاکی کوردانی**
**تروسکەی نووری عرفانی دەلیلی ڕاهی خۆمانی**[٢٠]

هەروەها (قانع)ی شاعیر وا دادەڕێژێ:

**هەتاو ئەمڕۆ وا تەواو هەتاوە ترسی تاریکی لەناو نەماوە**
**تۆ ڕابەرم بە بلێ بە کوردان شارياوەی هەزار ویلی بنبەردان**[٢١]

شیعری سیاسی و نیشتمانی لەو ڕۆژەدا بایەخی زۆری هەبوو، مەسەلە سەرەکییەکان کە بوونەتە هەوێنی شیعری شاعیران، بریتی بوون لە جۆشدانی جەماوەر بۆ خەباتی نەپساوەی کوردایەتی و خۆشەویستی خاک و نەتەوە و یەکگرتن و ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنان، عەبدولکەریم هیرانی نووسیویەتی:

**گەلی کورد نابەزێ هەرگیز لە کۆشین و هەوڵدانی**
**لە مەیدانی خەباتا چەندە ڕۆڵەی کردە قوربانی**
**لە سەرباز و کرێکار و قوتابی و ڕەنجبەر و جووتیار**
**گەلێکی تر لە ڕۆڵانی شەهیدی خاکی بارزانی**[٢٢]

بە بۆنەی لە سێدارەدانی چوار ئەفسەری شەهیدی کوردستان، کە دوای ئەوەی لە کۆماری دیموکراتی کوردستاندا بەشدارییان کرد و حکومەتی عێراق بڕیاری خنکاندنی دەرکردن، لە هەموو لایەکی کوردستانەوە رق وتووڕەیی جەماوەر درووژا، شاری هەولێریش لە کاتی ناشتنی تەرمی شەهیدە خەیروڵلادا درووژا، (لەتیف بەرزنجی) ئەو غەم و پەژارەی دەردەبڕێ:

**وا چوار قارەمانی دلێر چوار ڕۆڵەی کوردی نەرەشێر**
**وا چوار شۆرە سواری بەناو پاڵەوانی زنجیر کراو**
**لەناو بەندیخانە و زیندان دوای هەزار جۆرە ئازاردان**
**وا کاربەدەستانی ئێران فەرمانی داون بەخنکان**
**هەڵواسرێن بە قەنارەوەیەت تاکو چاوی بشکێ میللەت**
**کوردایەتی لە بن بێنن لە تێکۆشان بیوەستێنن**

**بێ گوناهن بەلام کوردن    ڕۆڵەی گەلێکی نەبەردن**
**سەریان شۆڕناکەن بۆ دوژمن    شانازی ئەکەن بە کوشتن(٢٣)**

لەڕووی ناوەڕۆکەوە، چەندین بابەتی وەکوو سروشتی کوردستان و دوورکەوتنەوە لە هەندێ دیاردەی دزێوی کۆمەڵایەتی وەکوو پۆکەر و قومار بەرچاو دەکەون.

(حەبیب عەلی میرانی) لە وەسفی بەهاری کوردستاندا، کە لەو ساڵەدا لافاو بووە، وەکوو شیوەن دەڵێ:

**لەرزین و تەرزەی لافاوی بەهار    میرانی داینا لە بۆ یادگار**
**برایان فەسڵی بەهارە ئەمڕۆ    سەرزەمین گشتی گوڵزارە ئەمڕۆ**
**هەرچەندە فەسڵی بەهارە ئەمڕۆ    هەناسەم بەفری کوێسارە ئەمڕۆ**
**عادەتە لە ڕۆژ سەیران و شادی    هەرکەس دڵداری خۆی دێتە یادی**
**لە ناوی چاوم لافاو هاتە جۆش    ڕاماڵی هێزی فکر و فام و هۆش**
**ناوی ئەم ساڵەم بەم تەرزە ساڵێ دوو لافاو چەند بوومەلەرزە(٢٤)**

(جاهید) ،کە زیاتر بە ڕاگوزاری بە شێوەیەکی سەرپێیی چەندین شیعری نووسیوە لە وەسفی هاوینەهەواری (پیرمام) دا هەستی خۆی دەردەبڕێ:

**مەسیف سێیەمین ئەمە باستە    دڵی شاعیران هەر سوپاستە**
**چریکەی بولبول لەباخ و گوڵزار    دیسان وا منی هێناوە گوفتار**
**مەنزەری بەرگی شینی سەرزەویت    گرد و ئاقاری بڵند و نەویت**
**مەوج و شەپۆلی بوخار و تەمت    هەزاران خەفەت لادەبا غەمت(٢٥)**

ئەگەر بە وردی لە ڕووی ڕووخسارەوە لە شیعرەکانی ئەو سەردەمە و ئەو قۆناغە بڕوانین، دەتوانین بڵێین، کاریگەریی قۆناغی شیعری نوێی کوردی پاش جەنگی جیهانی ئاشکرا دیارە، جووت قافیە و بەکارهێنانی وشەی کوردی پەتی و بابەتەکانی چەوسانەوە و خەباتی سیاسی، لە شێوەی ڕێبازی ریالیزمدا خۆی دەنوێنێ.

### ب- وتاری هەمە چەشنە:

دیارە هەموو گۆڤارێک، کە بلاودەبێتەوە، کۆمەڵێ وتاری هەمە چەشنەی لەڕووی ناوەڕۆکەوە تێدایە، لە وتاری مێژوویی، زمانەوانی، ئەدەبی و زانستی و.. هتد. گۆڤاری (هەتاو) یش لەم چەشنە وتارانەی بلاوکردۆتەوەو دەتوانرێ بە ئاسانی دەستنیشانی هەر یەکێک لەو چەشنانە بکرێت.

لە ناو وتارەکاندا ئەوەی زیاتر سەرنجی ڕاکێشام گرنگیدان بە وتاری هونەری بوو، بە تایبەتی (عومەر دزەیی) لە بابەتی مۆسیقاوە بە زنجیرە وتارێک، کە کۆی کردوونەتەوەو وەریگێڕاون، چێژی هونەری و زانیاریی ئەو نووسەرو وەرگێڕەمان پێشان دەدا، لە سەرەتای ئەم وتارەدا هاتووە:

(هونەری جوان ئەوەیە کە بە هۆی ئەوەوە ئادەمیزادی پێگەیشتوو دەتوانێ تام لە جوانی بکات و زاناکانی پێشینان ئەو هونەرەیان کردووە بە دوو بەشی گەورە:

**١- هۆنەرانی جوانی پایەدار**
**٢- هۆنەرانی جوانی جوولاوەیی**

هونەری جوانی پایەدار وەکوو وێنەگەرێتی، بەردتاشی و دروست کردنەو هی جوولاوەیی وەکوو مۆزیک، هەڵپەڕکێ، هۆنراوە(٢٦)

وتارنووسە دیارەکانی گۆڤارەکە بریتین لە: گیوی موکریانی، تاهیر بەهجەت مەریوانی و عومەر دزەیی و مارف خەزنەدار و ع. قرگەیی و تاهیر ئەحمەد حەوێزی.. هتد.

**تاهیر ئەحمەد حەوێزی**

بە شێوەیەکی گشتی شێوەزاری نووسینی هەموویان لە ڕووی زمانەوە لەوەدا یەک دەگرێتەوە، کە هەوڵیانداوە وشەی کوردیی ڕەسەن بەکاربێنن و لەڕووی ڕێنووسەوە کەمتر پێڕەوی ڕێنووسی عەرەبی بکەن، بە تایبەتی لە بەکارهێنانی پیتە بزوێن و بەکوردیکردنی پیتە عەرەبییەکاندا.

### پ- ڕێنووس و زمانی کوردی:

بە هۆی ئەوەی، کە (گیوی موکریانی) خاوەنی گۆڤارەکە هەر لە سەرەتاوە خەریکی کاری فەرهەنگنووسیی و گەڕان بەدوای وشەی کوردی پەتیی و زانینی زمانەکانی عەرەبی و فارسی و ئینگلیزی و فەرەنسیدا بووە(٢٧)، ئەمە



تاهیر ئەحمەد حەوێزی

وایکردووە لە گۆڤارەکەشدا گرنگییەکی تایبەت بە ڕێنووس و زمانی کوردی بدات، چ بە نووسینی خۆی و وەڵامی هەندێ کەس[٢٨] و بڵاوکردنەوەی بیروڕای نووسەرانی دی لەو بوارەدا گۆڤارەکە دەوڵەمەند بکات. بۆ یەکخستنی دیالێکتەکانی زمانی کوردی لە پێناو زمانێکی (ستاندارد)ی نووسین هەوڵیداوە و نووسیویەتی:

(پێویستە نووسینمان بە چەشنێک بێ، کە کوردێکی دیاربەکر بتوانێ نووسراوی برایەکی لوڕی خۆی بخوێنێتەوە و کوردێکی هەورامی لە نووسراوی کوردێکی شوان و زێلی و سورچی بگات. ئەوەش بە تێکەڵاوکردنی وشەی هەموو شار و خێلات و هۆز و تیرەکانی کوردستان نەبێ پێک نایە، نەک هەر وشەکانیان تێکەڵاو کرێن و بەس، بەڵکو دەستووری سەرف و نەحوشیان کۆ بکرێتەوە بەو هۆیەوە زمانەکانیان و پۆڕو فراوان و دەوڵەمەند دەبێ و ساردی و ناهومێدێتی و بێگانەیەتیش لە نێوانیدا نامێنێ.[٢٩]

لە بارەی ڕێنووسەوە، گۆڤاری (هەتاو) پێڕەوی ئەلف و بێی عەرەبی کردووە، بەڵام هەوڵیداوە هەر هیچ نەبێ، وەکوو هەنگاوی یەکەم ئەلف و بێی لاتینی بۆ کوردی بەڕاست بزانێ و خوێنەرەکانی پێ ئاشنا بکات. لە ڕێنووسی عەرەبیشدا، وەکوو دەردەکەوێت پلانێکی دیاری کراوی نەبووە، بە گوێرەی نووسینی نووسەرەکان خۆیان چۆنیان نووسیبێ، گۆڤارەکەیش هەر بەو شێوەیەی بڵاوکردۆتەوە. بۆ نموونە، لە چەندین وتاردا کە نووسەرانی سلێمانی ڕەوانەیان کردووە، پیتە قالبی (ئە) لە پێش فرماندا بەکار هاتووە و ئەوانەی هەولێریش (دە) یان بەکارهێناوە. یان لە کاتی چاپکردنی پریپۆزیشنی (لە... دا)، (دا)یەکی دواوە هەندێ جار بە وشەکە لکاوە نووسراوە، بە پێچەوانەوە لە هەندێ وتاردا بە جیا لە وشەکەوە نووسراوە، یان نووسینی پیتی (و) لە هەندێ وشەدا بەیەک واو و لەهەندێ بە دوو واو نووسراوە. هەوڵێکی دیکەی گۆڤارەکە ئەوە بووە، زمانی کوردی لە وشە و زاراوەی بێگانە پاک بکاتەوە و لە جیاتی ئەوان وشە و زاراوەی کوردی بڵاوبکاتەوە، لە هەندێ ژمارەیدا لیستێکی کردووە بۆ دانان و پێشنیازکردنی وشەی کوردی، هەروەکوو:

| باکوور | سۆران | عەرەبی |
|---|---|---|
| ڕدوش | خشڵ | زینت (زینە) |
| ڤیان | خۆشەویستی | محبت (محبە) |
| لالاش | کەعبە | کعبە |
| هەدام | ڕوو | وجە |

**. گۆڤاری (هەتاو) و چمکێ لە هونەرەکانی ڕۆژنامەوانی:**

بەر لە هەموو شتێک دەبێ بە چاوی ڕۆژگاری پەنجاکان لە گۆڤارەکە بڕوانین، دەبێ ئەو ڕاستییە بزانین، لەبەر نەبوونی ڕۆژنامە لە شاری هەولێر، لەڕووی بابەت و هونەرەکانی ڕۆژنامەوانییەوە، گۆڤاری (هەتاو) تێکەڵاوە لە هەر دووکیان، چەندین هەواڵی ڕۆژ و ئاگاداریی و ڕیپۆرتاژ و گۆشەی تایبەت بە کێشە سیاسی و زانستی و کۆمەڵایەتییەکانی ئەو دەمە نووسراون.

**١- هونەری هەواڵ:**

هونەری هەواڵ لە گۆڤاری (هەتاو)دا، جێگەیەکی تایبەتی هەیە، لەبەر نەبوونی ڕۆژنامە لەو کاتەدا گۆڤارەکە کەلێنێکی گەورەی پڕ کردۆتەوە. ئەم هونەرە بە بڕبڕەی پشتی ڕۆژنامەنووسیی دادەنرێت، بە تایبەتی بۆ ڕۆژنامەوانیی ڕۆژانەی هەواڵ، ڕەنگە لە گۆڤاردا کەمتر بایەخی هەبێ، چونکە لەڕووی کاتەوە گەرماوگەرم نییە.

وێڕای جیاوازی ئایدیۆلۆژیاو بیرو بۆچوونی جیاواز و جۆری لێکۆڵینەوەیان بۆ پێناسە و ئەرکی هەواڵ، بەڵام هەندێ فاکت هەن، کە ناتوانرێ چاوپۆشییان لێ بکرێت، هەروەکوو وەڵامی پرسەکانی (بۆ، کەی، لەکوێ، چۆن، کێ)، هەروەها تازەیی و ڕاستگۆیی و وورووژان و

سەرنجڕاکێشان و پشتگیری و بەسوودی ... هتد.[٣٠]

لە سیستمی نوێی ڕاگەیاندن و جیهانگەریدا، (هەواڵ) چەکێکی کاریگەرە لە خەباتی نەتەوەیی و نیشتمانی و ناساندنی ناسنامەی فەرهەنگی ئەو میللەتەدا، کە دەتوانرێ بەپێی بەرنامەیەکی تایبەتی بۆ مەبەستی دیاریکراو دابڕێژرێ. هەواڵ لەڕووی ناوەڕۆکەوە، هەموو بوارەکانی ژیان و چالاکی مرۆڤی گرتۆتەوە، لە سیاسی وکۆمەڵایەتی وئابووری و مێژوویيدا.. هتد.

لە هەواڵێکدا، گۆڤاری (هەتاو) سووتانی قەیسەری هەولێر وا ڕادەگەیێنێ:

(شەوی پێنج شەممەی ١٣ی مانگ ئاگرێکی سەخت قەیسەریەکی لە هەولێرێ داگرت، (١٤) دوکانی سووتاند و زیانێکی ئیجگار زۆری بە خاوەندەکانی گەیاند. ئەگەر گیانبازێتی پۆلیس و عەسکەران فریا نەکەوتبایە لەوانە بوو تەواوی بازاڕ و قەیسەری بسووتێنێ. هەموو شارەکانی عیراقێ لکی ئاگر کوژاندنەوە(أطفائیة)یان هەیە تەنها هەولێر لەو بابەتەوە بەشبراوە. ئومێد و تکا وایە، کە دەوڵەت ئەو کەم و کورتییەمان بە دامەزراندنی دائیرەی اطفائیە بۆپڕبکاتەوە)[٣١]

لە ناوەڕۆکی ئەم هەواڵە کۆمەڵایەتییەدا دەردەکەوێ، کە مەسەلەی سووتانەکە، کە ترسی زۆری هەبووە و لەڕووی ماددییەوە زیانێکی زۆری بە خەڵک گەیاندووە، بەڵام بە پێوانەی چمکەکانی هونەری ڕۆژنامەنووسیی هەواڵ کەم و کورتی زۆری تێدایە بەوەی،کە وەڵامی پرسەکانی (بۆ، چۆن، کێ؟)ی نەداوەتەوە، بۆ سووتاوە و چۆن سووتاوەو کێ سووتاندوویەتی، بەڵام ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ لە کۆتایی هەواڵەکەدا هۆکاری زوو پێڕاگەیشتن و کەم و کورتی سیاسەتی سەردەم دەردەبڕێ لە خزمەتی هاووڵاتیان و دابینکردنی ئامرازی پێویست بۆ پاراستنی گیانی هاووڵاتیان و سەروەت و سامانیان.

هەروەها چەندین هەواڵی هونەری وەکوو نواندنی هەردوو شانۆگەری (سەری گلێنەکە) و (ژیانی قوتابی) لەسەر شانۆی قوتابخانەی دواناوەندی کوڕان لە هەولێر[٣٢] و هەڵبژاردنی (کۆمەڵەی ئاوازی کوردی لە بەغدا)[٣٣]. و چەندین هەواڵی سیاسی وەکوو (یادی ڕاپەڕینەکەی٢٧ی کانون[٣٤] و (بێزاری)[٣٥] بڵاوکراوەتەوە.

**ب- هونەری ئاگاداری:**

ئاگاداری و بانگەواز، لە هۆیەکانی بانگەشە و پڕۆپاگەندەن، کە لەڕووی ناوەڕۆکەوە دەکرێ تایبەتی و گشتی بن. دیارە (تایبەتی) ئەوانەن، کە ڕووبەڕووی کەسێکی دیاریکراو دەکرێنەوەو (گشتی) یش بۆ هەموو جەماوەرە، بۆ ئاگادارکرنەوە یان بەجێ گەیاندن و پێڕەوی کردن. لە ئاگادارییدا (سەرەتا) هەوڵدەدرێت بابەتەکە ڕوون بکرێتەوە پاشان (داواکاری) دەخرێتە ڕوو. بۆ نموونە بڕوانە ئەم ئاگادارییە:

**بۆ زانین**

لەبابەت موناقەسەی نهێنی بڵاو ئەکەینەوە بە هەبوونی موناقەسەی نهێنی بۆ تەعەهودی ٧٥٧٠ مەتر موکەعەب ئیشی خۆڵ و ١٩٠٠ مەتر قاڵبی تەنیشت و ناوەندو ٨١٥٥ مەتر مورەبەع تەبلیتی شەقام و ١٨٤٥ مەتر مورەبەع تەبلیتی مەفرەقەکانی شەقام و گۆڕەپان و ٣٥ مەتر دروست کردنی پردی لوولەیی لە کۆنکرێت بۆ تەبلیتی مەدخەلی ڕێگای شەقڵاوە - ئەربیل لە ساحەی بەرامبەر نەخۆشخانەی نەخۆشیی سینگ تا بیدایەتی شەقامی هیلالی بە پانایی ٦٠ مەتر ئیستمارەی شرووتی موناقەسە لە شوعبەی هەندەسەی بەلەدیە پاش دانی ٣ دینار نەقدەن بۆ فەتحی هەر مەجموعەیەک دەست ئەکەوێ، عەتائات پێشکەش ئەکرێ لە لایەن موشتەریکەکانی لەناو زەرفێکی پێچراوە بۆ مەجلیسی بەلەدیە تا سەعات ١١ زەوالی ڕۆژی دووشەم بەرامبەر١٤/٤/٩٥٨...[٣٦]

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ، لەگەڵ ئەوەی، کە (گیوی موکریانی) خەریکی کاری فەرهەنگنووسیی و زمانی کوردی بووە، ئاگاداریی و بانگەوازەکان بە شێوەیەکی گشتی بە زمانی عەرەبێ و بەناونیشانی (اعلان) بڵاو کراونەتەوەو هەر وەکوو چۆن لە فەرمانگەکانەوە هاتوون. وێدەچێ ئەو ڕۆژانە لە کاروباری ڕەسمیدا زمانی عەرەبی پێڕەوی کرابێت نەوەکوو لەبەر ئەوەی، کە بەزۆر سەپێندرا بێت، بەڵکو ژمارەی فەرمانبەری کوردیزان، کە بتوانێ بە زمانی کوردیی بنووسێ کەم بووە، دەنا هەندێ فەرمانگە بە تایبەتی (مەحکەمەی سوڵحی هەولێر) هەمووی بە کوردی نووسیوە. لەڕووی هونەری ڕۆژنامەوانییەوە، (ئاگاداری)

کاری دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامە نییە[37]

### ت- گۆشەی تایبەت:

زۆربەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان لە هەموو جیهاندا، بە شێوەیەکی گشتی گۆشەی تایبەتییان جێ کردۆتەوە. ئەو گۆشانە هەندێکیان تایبەتن بە قەڵەمی نووسەرێکەوە و بەردەوام ئەو دەینووسێ و هەندێکیشیان هەر جارەی بە هەمان ناونیشانی جێگیر، یەکێک دەینووسێ. نەبوونی پسپۆڕیی لە ڕۆژنامەنەوانیی کوردیدا هەتا ئەم دواییە وایکردووە، کە ڕۆژنامەنەوانیی کوردیی هەمەلایەنە و گشتگیری بێت. لە گۆڤاری (هەتاو) دا چەندین گۆشەی تایبەت بۆ زمان و زانست و کۆمەڵایەتی و (ئافرەتان) و (لاوان) بەرچاو دەکەون، بە تایبەتی هەردوو گۆشەی تایبەت بۆ ئافرەتان و لاوان هەنگاوێکی تازەیە و پێشتر لە ڕۆژنامەنەوانیی کوردیدا بەرچاو ناکەون، ئەمەش وایکردووە، کە بۆشاییەکی زۆری ئەو ڕۆژگارەی ناوەندی ڕۆشنبیریی کوردی پڕبکاتەوە و هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵیش لە خۆی گردبکاتەوە. بێ گومان، گۆشەی تایبەت لە ڕۆژنامەنووسیدا خاسیەت و بنەمای خۆی هەیە، لەوەی،کە بابەتی گەرمام گەرم و هەستیار بخاتە ڕوو، بە شێوازێکی سەرنج ڕاکێشی ڕۆژنامەوانییانە، کە گفتوگۆ هەڵبگرێ و بە کورتی و بە وردی و بەشێوەیەکی ڕەخنەئامێز ڕووناکی بخاتە سەر بابەتەکە. لە گۆڤاری (هەتاو) دا چەندین گۆشە بەم ناوانە دەبینرێن: (ئامۆژگاری)، (مەتەڵ)، (باخچەی بوێژان)، (بەشی پزیشکی)، کە هەندێکیان بۆ ماوەی درێژو هەندێکیشیان بۆ ماوەیەک بەردەوام بوون. لەکەم و کورتییەکانی ئەم گۆشە تایبەتییانەدا ئەوەیە، نووسەر هەروەکوو وتارێکی ئاسایی ڕۆژنامەنەوانیی درێژ نووسیویەتی بێ ئەوەی ڕەچاوی بنەماکانی ئەو هونەرە بکات.

#### پەراوێزەکان:

١- بەکر شاکر عەبدوڵلا، عەلی فەتاح دزەیی شاعیرو نووسەر، ل٣٤.
٢- اسماعیل شکر رسول، اربیل دراسة تاریخیة في دورها الفکري والسیاسي، ص٢٧١.
٣ - چاوپێکەوتنی نەژاد عەبدوڵلا عەزیز لە هەولێر ڕۆژی ٢٠٠٠/٨/٧.
٤ - مەحموود زامدار، ڕۆژنامەی هەولێر حیکایەتی سەرهەڵدان و کۆتایی، ل١٢.
٥- بۆ زانیاری لە بارەی گۆڤاری (هیوا)وە بڕوانە: هیمدادی حوسێن، ڕۆڵی گۆڤاری هیوا لە پێشخستنی هونەرەکانی ئەدەبی کوردیدا، هەولێر، ١٩٩٨.
٦ - گ هەتاو، ژ٧٢، س ٢٠، ١٩٥٦، ل٣.
٧ - بڕوانە، عبدالرزاق الحسني، تاریخ الوزارات العراقیة، ط١، ج٩، ص١٢١.
٨- بڕوانە، ب. سیروان، چەند چالاکییەکی جەماوەری..، ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان، ژ٧٦-٧٧.
٩ - بڕوانە، عبدالرزاق الحسني، تاریخ الوزارات العراقیة، ط٦، ج٩، ص١٥١.
١٠- ڕۆژنامەی (ژین) پیرەمێردی شاعیر دایمەزراندو تا وەفاتی لە(١٩)ی حوزەیرانی(١٩٥٠)دا هەر خۆی سەرپەرشتی دەکرد.دوای ئەو چەند جارێک سەرپەرشتی کەرانی گۆڕران.(جەمیل سائیب و گۆران و نووری ئەمین بەگ و ئەحمەد زرنگ هەر یەکەیان ماوەیەک سەرپەرشتییان کردووە). بارستی (ژین) زۆر جار گۆڕا، بەڵام بەشێکی زۆری ژمارەکانی(٣٤×٣٠سم)ن، بڕوانە : د.کەمال مەزهەر، تێگەیشتنی ڕاستی... ل٢٢٢.
١١- ڕۆژنامەیێکی زانستی وێژەیی هەفتەیی بوو لە شاری هەولێر لە لایەن کۆمەڵەی مامۆستایانی هەولێر دەردەچوو، ژمارە (یەکی) لە ١٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٥٠دا دەرچووە، هەتا ساڵی ١٩٥٣ بەردەوام بووە، مودیری مسۆول جەمیل ڕەشید بووە، دەستەی نووسەران لە حسێن ڕشوانی و عزالدین فیچی و نەستێر سەعید پێک هاتبوو و مدیری ئیدارە جەمال جەمیل بووە، بڕوانە :جەمال خەزنەدار، ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردی، ل٥٩.
١٢ - بڕوانە محەممەدی مەلا کەریم، گیوی موکریانی ڕێی بۆ محەممەدی قازی خۆش کرد بێ بەو وەرگێڕە بەناوبانگەی، کە بوو.گ. ڕەنگین، ژ ١٩٩٦، ٨٨، ل٢٢-٢٥.
١٣- جەمال خەزنەدار، ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردی، ل٦٢.هەروەها بڕوانە : مەغدید حاجی، کاروانە سەخت و پیرۆزەکەی چاپخانەی کوردستان، گ. کاروان، ژ٣٢، ١٩٨٥، ل١٥.
١٤ - عەبدولجەبار محەممەد جەباری، مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی، ل١٠٤.
١٥ - گ. ڕامان، ژ ٤٠، س٥، ل١٥٣.
١٦ - گ. هەتاو، ژ٣٧، ل١٨.
١٧ - گ. ڕامان، ژ٤٠، س ٥، ل ١٥٠.
١٨- هەمان سەرچاوە، ل ١٥٠.
١٩- گ. هەتاو، ژ١٢٩، س٤، نیسانی ١٩٥٨، ل ١٠.

٢٠ - گ. هەتاو، ژ٧٨، س٣، تشرینی دووەم ١٩٥٦، ل ٩.
٢١ - گ. هەتاو، ژ١٣٧، س ٥، تەمموزی١٩٥٨، ل١٣.
٢٢ - گ. هەتاو، ژ١٦٦، س٦، تشرین دووەمی ١٩٥٩، ل١٣.
٢٣ - گ. هەتاو، ژ ١٨٠، س٧، حوزەیرانی ١٩٦٠، ل١٤.
٢٤ - گ. هەتاو، ژ١٢٦، س٤، مارتی ١٩٥٨، ل٧.
٢٥ - گ. هەتاو، ژ ١٨٠، س٧، حوزەیرانی ١٩٦٠، ل١٤.
٢٦ - گ. هەتاو، ژ١٢٦، س٤، مارتی ١٩٥٨، ل٧.
٢٧- وەرگێڕی بەناوبانگی ئێران (محەمەدی قازی)، کە کوردێکی مەهابادییە، لە یادداشتەکانی خۆیدا ئەوەی روون کردۆتەوە، کە زمانی فەرەنسی لە خزمەت (گیوی موکریانی)دا خوێندووە، بڕوانە: گ. ڕەنگین، ژ١٩٩، ٨٨، ل٢٢-٢٥.
٢٨ - لە ژمارەی (١٢٩)ی گۆڤاری (هەتاو) دا گیوی موکریانی وەڵامی تۆفیق وەهبی داوەتەوە، ل١٨-١٩.
٢٩- گ. هەتاو، ژ٧٧، س ٣١، تشرینی یەکەمی ١٩٥٦، ل١.
٣٠ - بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی هونەری هەواڵ بڕوانە د. فاروق ابو زید، فن الخبر الصحفي، ط٢، ص ٨٧- ١٥٠.د. کاظم معتمد نژاد، روزنامەنگاری، ص ١٦-٤٦.
٣١ - گ. هەتاو، ژ٣٧، س٢،ت ەمموزی ١٩٥٥، ل٣.
٣٢ - گ. هەتاو، ژ١٤٩، س ١٥، شوباتی ١٩٥٩، ل٢٦.
٣٣ - گ. هەتاو، ژ١٤٩، ل٢٧.
٣٤ - گ. هەتاو، ژ١٤٩، ل٢٧.
٣٥ - گ. هەتاو، ژ١٨٧، س ١٥، تشرینی یەکەمی ١٩٦٠، ل٣٥.
٣٦ - گ. هەتاو، ژ ١٢٧، س ٤، مارتی ١٩٥٨، ل٢٠. لە هەمان کاتدا زۆر ئاگاداریی (تایبەت) بلاوکراوەتەوە، بۆ وێنە بڕوانە: گ. هەتاو، ژمارەکانی (١٢٧، ل٢٨) و (ژ ١٥٠، ل٤٣).
٣٧- بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی خەسڵەتەکانی ئاگاداری و جۆرەکانییەوە بڕوانە:
د. عبدالعزیز الغنام، مدخل في علم الصحافة، ص ١٨٩-١٥٠.
بیار البیر، الصحافة، ترجمة محمد برجاوي، ص ٤٨-٥٦.

**سەرچاوەکان:**

١- بەزمانی کوردی:

- بەکر شاکر عەبدوللا، عەلی فەتاح دزەیی شاعیر و نووسەر، (نامەی ماجستێر)، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین، ٢٠٠٠.
- باوکی سیروان، چەند چالاکییەکی جەماوەریی شاری شەقلاوە لە ساڵانی ١٩٥٤و١٩٥٥دا، ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان، ژ(٧٦)و(٧٧) لە ڕۆژانی ١٩٩٣/٩/٢٨ و ٥//١٩٩٣١٠.
- ب. هەوراز، ڕاپەڕینی جووتیارانی دەشتی هەولێر، ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان، ژ(٤٥) و(٤٧) لە ١٩٩٣/٢/٩ و ١٩٩٣/٢/٢٣.
- جەمال خەزنەدار، ڕابەری ڕۆژنامەگەری کوردی، بەغدا، ١٩٧٣.
- ڕامان، باری ئەدەبی و ڕووناکبیری پەنجاکان لە هەولێر و کۆیە، گ ڕامان، ژ ٤٠، س٥، ١٩٩٩.
- عەبدولجەبار محەمەد جەباری، مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی، چاپخانەی ژین، سلێمانی، ١٩٧٠.
- عەبدولقادر بەرزنجی، یادی سەیرانێکی ساڵی١٩٥٤، ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان، ژ٦١، س٤٩، ١٩٩٣/٦/١٥.
- علاء الدین سجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، چ٢، بەغدا، ١٩٧١.
- قادر ڕەشید ناسک، دامەزراندنی نەقابەکانی کرێکاران و یەکێتییە پیشەییەکان بە نهێنی لە سلێمانی، ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان، ژ١٩، ٧//١٩٩٣١٠.
- د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامە نووسی کوردیدا، بەغدا،١٩٨٧.
- محەمەدی مەلا کەریم، گیوی موکریانی ڕێی بۆ محەمەدی قازی خۆش کرد ببێ بەو وەرگێڕە بە ناوبانگەی کە بوو، گ. ڕەنگین، ژ٨٨، ١٩٩٦.
- مەحموود زامدار، حیکایەتی سەرهەڵدان و کۆتایی ڕۆژنامەی هەولێر، هەولێر، ١٩٨٨.
- مەغدید حاجی، کاروانە سەخت و پیرۆزەکەی چاپخانەی کوردستان، گ. کاروان، ژ٣٢، ١٩٨٥.
- هیمداد حوسێن، ڕۆڵی گۆڤاری هیوا لە پێشخستنی هونەرەکانی ئەدەبی کوردیدا، هەولێر، ١٩٩٨.
- ژمارەکانی گۆڤاری(هەتاو).

**بەزمانی عەرەبی:**

- اسماعیل شکر رسول، اربیل- دراسة تاریخیة في دورها الفکري والسیاسي ١٩٣٩-١٩٥٨، (رسالة دکتوراه)، کلیة الاداب- جامعة صلاح الدین- اربیل، ١٩٩٩.
- بیار البیر، الصحافة، ترجمة محمد برجاوي، منشورات عویدات- لبنان، ١٩٧٠.
- عبدالرزاق الحسني، تاریخ الوزارات العراقیة، ج٩، ط٦، بغداد،١٩٨٢.
- د. عبدالعزیز الغنام، مدخل في علم الصحافة، ج١، دار النجاح، بیروت، ١٩٧٢.
- د. فاروق ابو زید، فن الخبر الصحفي، ط٢، دار الشروق- جدة،١٩٨٤.
- یعقوب القصاب، الصحافة الکردیة منذ نشأتها الی ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨، مجلة کاروان، ع ١٦، ١٩٨٤.

**بەزمانی فارسی:**

- د. کاظم معتمد نژاد، روزنامەنگاری، چ٤، مرکز نشر سپهر، تهران، ١٣٧٢.

# ڕۆژنامەی هەولێر سەرهەڵدان و کۆتایی ١٩٥٠ - ١٩٥٣

مەحموود زامدار

**سەرەتا**

سەرەتای ئەم سەدەیە بەراییەکی چاک بوو بۆ ڕاچەنینی گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و گەلێ مزگێنی گەورەشی لەگەڵ خۆ ڕەپێش دەکرد، تا دەهات شتە لەیەک ترنجاوەکان یەکلا دەبوونەوە و لە ناخی ناخەوەش خەون و ژانە متبووەکان لە هاڕژنیان ئەدا.. پیاوە کەنەفتە لێقەوماوەکەی ئەستەمبووڵ تەخت و نگینی بەرەو لێژی ئەڕۆیی. بنەمای بەهاکانی هەردوو شۆڕشی فەرەنسا و ڕۆما تا دەهات پتر ڕەگی دادەکوتا، لەملاش شۆڕشی دەستوورییەکانی ئێران تا دەهات خۆی پەرداختر و گەشتر ئەنواند.. ڕاچەنین دوای ڕاچەنین .. ئیمپریالیزمی جیهانیش تا دەهات پتر بنکە و ڕەگ و شوێنەکانی خۆی قایمتر ئەکرد و مرخی لە خێر و داهاتی بە پیت و بڕشتی عەرەبستان و تورکستان و عەجەمستان و کوردستان خۆشتر ئەکرد و بازندەی بۆ بۆڕییە نەوتەکان داژەند بوو، ململانێی نێوانیشیان تا دەهات پەرەی دەسەند.. بەرلین و لەندەن و پاریس - پەتروسبۆرگ لە ململانێی مان و نەمان دابوون، ئەویان فێڵی لە ئەوی تر ئەکرد، ئەویتریان جێ پێی بە مەی تر لێژ .. دەیەها پەیمان و سوێند لە نێوانیاندا هاتەکایەوە، کەمێکی زۆر کەم لەو سوێند و پەیمانانە جێبەجێکران. سەیریشە! گەر ئیمپریالیزم مانای سوێند و ڕێزی پەیمان بزانێ و بگرێ ... !!



تەودرەی شانۆی وەرچەرخان و پەرەسەندن زۆر بە سەیری ئەسوڕایەوە. بوارەکانی ژیانی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری بە هەزارەها ڕاچەنین تەنرابوو.. قیژەو نرکە و هاواری شەڕێکی گەورە لە ئارادا بوو... ئەوەندەی پێ نەچوو قەوما... !

گەلی ستەمدیدەی کوردیش، شان بەشانی ئەو گەلانە ڕێچکەی هیواو پاشەڕۆژی گرتبووە بەر. هەرچەندە یادی کۆنە میرنشینەکانی تاڵ بوون، هەرچەندەیش یادی شۆڕشە نووچخواردووەکان هەراسانی کردبوون، بەڵام ئەمجارەیان، هەر لە ڕەگەوە کار لە کار ترازا بوو، زەمان زەمانی ڕاپەڕین و شۆڕش و کودەتای پەیدەرپەی بوو.. ئەشبوایە وەک بوو- ئەم کوردەش بیر لە چارەنووسی خۆی بکاتەوە، خۆ چی لەو گەلانە کەمتر نییە و نەبوو، نەخوازەڵلا هەر لە کۆنەوەش داگیرکەرانی ئێران و تووران و لە پاشا ئیمپریالیزمی جیهانی مرخیان لە خاکە بەپیتەکەی خۆش کردبوو،

کەڵپیشیان لە جەستەی ئەو خاکە گیبر...!

سەردەم سەردەمی رووکردنە زانست بوو، شۆڕشی زانست هەمــوو دنیــای ئەوسای تەنیبــووەوە پەیتا پەیتاش خەریک بوو بڵێسەکەی ئەگەیشتە رۆژهەڵات و لەوێشەوە بۆ کوردستانی ئێمـــە... هەر لەو سەردەمەدا گەلێ دەستە و تاقمی پێشڕۆی سیاسی کورد لە جەمین دابوون و خەریک بوون خۆیان کۆ ئەکردەوە بەرەنگاری واقیع ئەبوون و لە چینەکانی میللەتیش خۆیان نزیک ئەکردەوە... !

تازە بە تازە رۆژنامـــــــەی (کوردستان)ی مەدحەت بەدرخان سەری هەڵدابوو، بانگەوازەکانی - کەم و زۆر- گەیشتبووە نێو کوردستان و بەردڵ و دیدەی کوردەوە... لە نێو ئەو دەستە بەندانەشدا کۆمەڵەی (هیڤی) دەوری هەرە دیاری هەبوو... کە ئەستێرە گەشەکەی بەدرخان پاشای روناکبیر و رۆژنامەنووس رژا، ئەوان لەو شەوە نووتەکەدا، چراوگی جیاجیایان دائەگیرساند. گۆڤارەکانی "هەتاوی کورد" و "رۆژی کورد" و هەروا "بانگی کورد"ی (ساڵانی ۱۹۱۳-۱۹۱٤) بەرهەمی بەپێزی ئەو دڵسۆزانە بوو.. بڕیاریان دابوو، شتێ بۆ گەلەکەیان بکەن...

مهابادی و سلێمان و سنەیی و دیاربەکری و کرماشانی ببوون بەیەک برا، هەموویان بۆ یەک ئامانج کەوتبوونە قۆناغ برین.... !

بۆ ماوەی چوار ساڵی رەبەق.. گەورەترین کارەسات بەسەر ئەو گەلانەدا هات، تا لە ئەنجامدا هەر بە تەواوی پیاوە نیوە گیانەکەی عوسمانلی لە پەل و پۆ کەوت و خاکی ئیمپراتۆریەتەکەشی لە نێوان داگیرکەران دابەش کرا...

کوردستانی ئێمەش لەو بەختە شوومە بێ بەش نەبوو.. بەڵام نە ئیمپریالیزم کۆڵی دا، نە کورد وازی لە مافی رەوای خۆی هێنا ... نەتاران رازی بوو، نە ئەستەمبوڵ .. شۆڕشی (سمکۆی شکاک) لە رووی رژێمە گەندەڵەکەی قاجار.. شۆڕشی شێخ مەحموود لە دژی پەیمانەکانی ژەنەڕاڵ مـۆد، شۆڕشی شێخ سەعیدی پیرانیش بەرامبەر بە تاوانەکانی تازە ئەفەندییەکانی تورک.



هەر لەو بارودۆخە تەنگەبەرەشدا، رووناکبیرانی پێشڕەوی وشەی کوردی (ژین) و (کوردستان)ی ئەستەموڵ و (پێشکەوتن) و (ژیانەوە) و (ژیان) و (ژین)ی سلێمانی و (زاری کرمانجی) و (رووناکی)ی هەولێر و (هاوار)ی شام یان دەردەکرد و بێ وچان شانیان دەکوتا...

ئەمجارەیان گەلانی خێرنەدیوی رۆژهەڵات لە هاتەهاتی کارەساتێکی گەورەتر بوون.. فاشیزم لەلایەک و نازیزم لە سووچێکی تر و ئیمپریالیزمیش لە قوڵێکی ترەوە، کەوتبوونە رووتاندنەوەی ئەو گەلانە و کوشتنی ئەو گەلانە و پلیشاندنەوەی هیوای هەوای ئەو گەلانە.. هەر لەو ساتە سامناکانەشدا هەمدیس روناکبیرانی کورد، وازیان لە خەونە سەوزەکانیان نەهانی بوو..

(گەلاوێژ) هەڵات، بەغدا و کوردستانی رۆشن کردەوە، لەولاش (نیشتمان) و (هاواری کورد)ی مهاباد.. ئینجا تەواو بوونی جەنگی دووەم و سەرهەڵدانی کۆماری مهاباد و رۆژنامە تاقانەکەی (کوردستان)، ئینجا تێکشاندنی کۆماری مهاباد و رۆژنامە تاقانەکەی (کوردستان)، ئینجا تێکشاندنی نازیزم و بووژانەوەی گیانی دیموکراسیزم و پەیدابوونی گەلێ لایەن و دەستەی رامیاری لەسەر رووپێوی رووداوەکان..

ئا لە نێو ئەو جەزرەبە و کوێرەوەری و خەباتە بێ وچانەدا.. هەولێری ئێمەش لەو هەموو رووداو و کارەساتانە بێ بەش نەبوو، دەیەها رۆڵەی بە جەرگی خۆی کردە قۆچی قوربانی خەبات....!

ئا لەو ساتانەدا، کە شانۆی هەولێریش گۆڕابوو. جۆرە هێمنی و ئاسایشێک پەیدا ببوو، دەبوایە ئەو کەرتە

ڕۆشنبیرەی هەولێر، مامۆستایانی هەولێر چ وەک ئەرکێکی پیشەیی و چ وەک ئەرکێکی پەروەردەیی و ڕۆشنبیری دەنگی خۆیان بگەیاندایەتە کۆمەڵانی خەڵک .. ئەو خواست و ئارەزووە پاکە بووە مایەی سەرهەڵدانی ڕۆژنامە هەرە تاقانە و هەرە ئازیز و هەرە ناودارەکەی (هەولێر - اربیل) بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی ....!

ژمارە (١)ی ئەو ڕۆژنامەیە لە ڕۆژی شەممەی ١٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٥٠ دەرچووە، دانەی بە (١٢) فلس بووە. بەشە کوردییەکەی لە چاپخانەی (کوردستان) و بەشە عەرەبییەکەی لە چاپخانەی (الحداد)ی موسڵ چاپکراوە، لە ژمارە (٤)ەوەش تا دوا دانەی ڕۆژنامەکە لەچاپخانەی (أم الربیعین)ی موسڵ چاپکراوە، لێپرسینەوەش بەمجۆرە دابەش کراوە:

خاوەندەکەی: کۆمەڵی مامۆستایانی هەولێر.
مودیری مەسئول: جەمیل ڕەشید
دەستەی نووسەران: عەبدولمەجید حەسەن - عیزەددین فەیزی - ئەستێر سەعید ) بوون ..
مدیری ئیدارەش (جومعە محەمەد) ..
ئابوونەی ساڵانە:
بۆ ناوشار: ٥٧٦ فلس.
بۆ دەرەوە: ٧٢٠ فلس.
ئابوونەی شەش مانگان:
بۆ ناوشار: ٢٨٨ فلس.
بۆ دەرەوەش: ٣٦٠ فلس.

ئیعلاناتیش، کرێکەی بە (٢٥٠)فلس بووە... نابێ ئەوەش هەڵبوێرم قەوارەکەشی (٤٠)سم بە (٧٥)سم بووە، هەرجارەش (٧٥٠) دانەی لێ چاپکراوە....!

هەر لەو ژمارە یەکەدا - بە بەشی کوردی و عەرەبییەکەی - ئەم بابەتانە دەخوێننەوە:

* ڕۆژنامە لە هەولێر - سەروتار - عیزەددین فەیزی .
* لە جۆن کیتسەوە- پەخشانی دوو هەڵبەست بە کوردی . وەرگێڕی لە ئینگلیزییەوە: گۆران.
* ئامانجی ئەدەبیات- وتار - گیو موکریانی.
* المرأة والمجتمع- مقال - عەبدولمەجید حەسەن.

بۆ زیاتر ئاشنا بوون بە جۆری دەرچوونی یا هۆی دەرچوونی ئەو ڕۆژنامەیە، سەروتارێکی کورتی مامۆستا عیزەددین فەیزی ئەمر ئەخوێنینەوە، با بە یەکەوە ژمارە (١)ی ڕێکەوتی ١٦/کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٥٠ بکەینەوە و چاوێکی پیابخشێنین:

"چەند خۆشە لە گوێمان، کە بانگ بکرێ (ڕۆژنامەی هەولێر - جریدە اربیل) کە یەکەم جارە ئەم قسە خۆشە بەم ناوە تەئریخییەوە لە شەقامەکانی هەولێر گاز ئەکرێ، چۆن خۆش نابێ ؟ ئەمە یەکەمین چرایە لە ئاسمانی هەولێردا هەڵکرا، پەردەی تاریکی لابران، یەکەمین خونچەیە کە لە باغی خوێندەواری گەش بۆتەوە، دڵی غەمخۆرانی فێنک کردەوە، روحمانی پێ تێر بوو..

ئەم هەولێرە قەدیمە، کە میللەتێکی دڵپاک و چاکی تێدایە، لەمێژە لە خوێندنەوەی ناوخۆی و زوبانی خۆی مەحرومە، جا ئەی هاوولاتییەکانی خۆم، مەعلوومە لاتان کە زۆرترین شارە گەورە و بچووکەکانی عێراق، ڕۆژنامەی خۆیان لەناو خۆیاندا بلاوئەکرێتەوە و ئەخوێنرێتەوە.. بەڵام هەولێر تا ئێستا.. کە ئێمە لە عەسریی ڕۆناکینە، ئیعلانی دائیرەکان، لەسەر دیواران بۆ ئاگاداری هەڵدەواسرێ و یا هەندێک جار، دەلالێک بانگ دەکات لەناو بازاڕ و جادەدا، ئەوەش هەمووی سەبەبی نەبوونی جەریدەیە لە شارەکەماندا.. ئینجا ئێستا بە پشتیوانی خوای مەزن و سەرۆکی معاریفەوە کۆمەڵی مامۆستایان لە هەولێر، بە دڵێکی خۆش و لەشێکی پڕ لە نەشات و ئازایی، چوونە بۆ پێشەوە و موافەقەتی وەزارەتی داخیلیەیان وەرگرت بۆ بلاوکردنەوەی ئەو ڕۆژنامە پیرۆزە..

گەورەکانم: چاک بزانن کە باری ئەم ڕۆژنامەیە، دەکەوێتە سەرشانی خوێندەوار و گەنجەکانی لیواکەمان، ئەگەر هات و موسەقەفەکانی خۆمان بە هەموو جۆرێک هەوڵ و تەقەلایان دا بۆمان وموساعەدەیان کردین، ڕۆژنامەکەمان دەژی و هیوامان وایە بژی، چونکە ئەمە یەکەمین ڕۆژە لە هەولێر ڕۆناکی ڕۆژنامە بلاوئەبێتەوە و دڵی مامۆستایان و تێگەیشتووان گەش دەکاتەوە...

ئەی لاوانی چاک: خوێندەواران و محامی و دکتۆر و مامۆستایانی دڵپاک وەرنە پێش و یاریدەمان بدەن، ئەفکار و بیری ڕێگای خۆتان لە ڕۆژنامەی هەولێردا، بە هەردوو زمانی خۆشی کوردی و عەرەبی خوێندەوارانی میللەت پیشان بدەن، تکامان وایە لە گەورە و بچووک و

ژن و پیاو، ئەو مەقالە و نووسینانەی کە بۆمان دەنێرن، خالی بێ لە سیاسەت و تەفریقەی دینی و مەزهەبی و پەلاماری کەسان، چونکە جەریدەکەمان تەنیا رۆژنامەیەکی ئەدەبی و سەقافییە ئیتر چاوەڕێی هیمەت و تەشجیع و نووسینتان دەکەین..

بۆ هەڵدانەوەی لاپەڕەیەکی تری رۆژنامەی ئازیزی (هەولێر) هەمدیس درێژە بە حیکاتەکە دەدەم و دەشزانم بۆ ئەیلێم و ئەیگێڕمەوە:

ژمارە (١)ی دانەی بە (١٢)فلس بووە، لە ژمارە (٢) وە تا ژمارە (٨) بوو بە (١٠) فلس، ژمارە (٩) بە(٢٠)فلس، ژمارە(١٠) بە (١٠) فلس... لە ژمارە(١٨) تا (١٩) بووەتەوە بە (٢٠) فلس، لەوە بەدواوەوە بووەتەوە بە (١٠) فلس، کەچی ژمارەکانی (٣٢) و (٣٣) و (٣٤) بوودتەوە بە (٢٠) فلس.. ئیتر تا دوا ژمارە دەقی بە (١٠) فلس زیادەی ئەو دەورو دوکانە بایەخی چەند بووە و چ دەورێکی لە دەرچوون و دەرنەچوونی رۆژنامەکەدا بینیوە...!

لەگەڵما وەرە و پەڕەیەکی تر هەڵدەینەوە - ئەی نەمووت من ئەرشیف بە حیکایەت ئەگێڕمەوە حیکایەتەکەش ئەکەمە ئەرشیف!

سەیری ئەم هەڵچوون و داچوونە بکەن و خۆتان بیرێکی وردی لێ بکەنەوە: لە ژمارە (١٤)وە مامۆستا یوسف شێخ یەحیا بە مدیری ئیدارە و مامۆستا (مستەفا حەسەن)یش خراوەتە نێو دەستەی نووسەرانەوە.. لە ژمارە (٦٢)وە مدیری ئیدارە بووە بە مامۆستا (جەمال جەمیل) و مامۆستا (مستەفا حەسەن) لە دەستەی نووسەران نەماوە و مامۆستا یوسف شێخ یەحیا ش لە مدیریی ئیدارەی نابینرێ ... لە ژمارە (٦٣)دا مامۆستا (نافیع دەباغ) بووە بە ئەندامی دەستەی نووسەران تا ژمارە (٨٨) لەگەڵیان بووە، لە ژمارە (٨٩)وە مامۆستا (حوسێن رەشوانی) دێتە ناو و تا دوا ژمارە دەبێ بە ئەندامی دەستەی نووسەران و مامۆستا (نافیع دەباغ) نامێنێ ....!

هەندێ بەر لە ئێستا باسی (٢٠) فلس و (١٠) فلسم کرد، هەروا باسی ئابوونەشم کرد، با سەیرێکی تری لاپەڕەکانی دیکەی رۆژنامەکە بکەین و بزانین لەم بارەیەوە چی تۆمار کردووە.

وەک وتم: ئابوونەی ژمارە(١) تانم خستە بەرچاو، کەچی لە ژمارە (٢) تا (٩٩) بەمجۆرە بووە:

(١) دینار بۆ مامۆستا و قوتابخانە لە عێراق (١) دینار بۆ غەیری مامۆستا لە هەولێر (١.٢٠٠)فلس بۆ غەیری مامۆستا لە دەرەوە (١.٥٠٠) فلس لە دەرەوەی عێراق.. تا دوا ژمارەش هەروا رۆیشتووە.

حیسابی یەکساڵەی رۆژنامەکە لە ئیعلانێکی ناو رۆژنامەکە و لە ژمارە (٦٣)ی رێککەوتی ١٨ی ئاداری ساڵی ١٩٥٢ ئاوا ئەخوێنینەوە:

| | دینار | فلس |
|---|---|---|
| وارداتی رۆژنامە | ٤٧٧ | ٢٨٠ |
| مەسروفاتی رۆژنامە | ٤٢٥ | ٦٩٦ |
| پاشماوە | ٠٥١ | ٥٨٤ |

ئەمەیش لە کانونی یەکەمی ١٩٥٠ وە دەست پێدەکات تا کانوونی یەکەمی ١٩٥١ ....!

ژان و ژووری ئەم رۆژنامەیە زۆر گەورەیە - دوایی بۆتان ساغ دەبێتەوە - با لە بواری ئەو ژان و هەژانەدا ئەمەش بخوێنینەوە: ئەمیش لە ژمارە (١١) ی (١٤) شوباتی ١٩٥١ دا:

١- تا ئێستا (١٧٦) کەس ئیشتراکیەی ساڵانەی رۆژنامەیان بۆ ناردووین و (٧٢) کەس پارەی نیو ساڵیان ناردوە و (٢٢٧) معلم و معلمە بە موشتەرەک دەژمێردرێن.
٢- یەکەم کەس کە لە ناوچەی هەولێر پارەی رۆژنامەی بۆ ناردووین کاک (فایق نادر)ە.
٣- یەکەم کەس لە دەرەوەی هەولێر پارەی بۆ ناردووین، سەعادەتی ئەمین بەگی یامولکییە.
٤- یەکەم کەس کە لە هەولێر و بە نوسراو تأییدی کردین جەنابی داود ئاغای یەعقوب ئاغا بوو.
٥- یەکەم کەس کە لە دەرەوەی هەولێر بە تەلگراف تأییدی کردین مامۆستای گەورە (فوئاد رەشید)، موفەتیشی معارفی لیوای سلێمانی بوو.

با وردە وردە، پێ بەپێ سەرکەوین، ژمارە بە ژمارە لاپەڕەکانی ئەو ڕۆژنامە ژانگرتووە هەڵگرین و بە وردیش لێی وردبینەوە، تا بزانین چۆن ژیاوە و بەچی ژیاوە و چۆنیش داو و تەپکەی بۆ دانراوە، با من بوەستم و با ڕۆژنامەکە بەوپەڕی ڕاشکاوی حیکایەتەکە لە دەمی منەوە وەرگرێت و خۆی قسە بکات و خۆیشی بیێتە دەمڕاستی شتە شاردراوەکان، با ژمارە (٣٩)ی ١٢ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٥١ هەڵدەینەوە و بزانین چی تێدایە:

"کۆمەڵی مامۆستایانی هەولێر، کە ڕۆژنامەی هەولێری بەدەرخست، غایە و هەدەفی خۆی بۆ خوێندەوارانی خۆشەویست بلاوکردەوە، کەوا لە هەموو شارەکانی عێراق، گەورە بێ یا بچووک، جەریدەی تیا دەرئەچێت. جا بۆ ئەوەی کە هەولێریش کەمێک ڕووناکی تیابێ، ئەم ڕۆژنامەیەی هێنایە مەیدان".

ڕۆژنامەی هەولێر، لەبەرئەوەی کە مامۆستایان دەریانخستووە تا بتوانێت خزمەتی (معلم) دەکات، ئینجا لە پاشان لە شتی تر دەدوێت.

ئەم ڕۆژنامەیە بەو ئومێدە دەرخرا، کە تەنیا گرانایی مەسرەفی خۆی لەسەرشانی مامۆستایان دابنێ، جا ئوسرەی معاریفی لیوای هەولێر و مامۆستایانی هەندێک لیوای تر، بە تایبەتی مامۆستایانی لیوای سلێمانی، بە هەموو هێزێکیانەوە، بەدڵسۆزییەوە یاریدەیان داین، لە پاشا ئەو خوێندەوارانەی کە نرخی (معلم) ئەزانن و تەقدیری ماندوو بوونیان ئەکەن، ئەمانیش خۆیان ئیشتراکیان کرد و ئێمەش بە دڵێکی خۆشەوە، جەریدەمان بۆ ئەناردن، بەبێ ئەوەی کە هیچ کەسێک تەکلیف بکەین کە بە زۆرداری ئیشتراک بکات.

لە پاشا گەورەکانم، ئێمە ئەعزای جەمعیەتی مامۆستایان، وا نییە کە ئیشمان تەنیا نووسینی ڕۆژنامە بێ و میهنەتمان سەحافە بێت، کە بتوانین ئاگاداری هەموو ئەخبار و دەنگ و باسەک بین، ئێمە ئەو خزمەت و ماندووبوونە زیادە لەسەر وەزیفە و ئیشی خۆمان ئەکەین، دەبێ خوێندەوارانیش بە چاوێکی بە ئینساف تەماشای ئیشمان بکەن.. ڕۆژنامەی هەولێر زۆر کەیفخۆش دەبێ، بەرامبەر بە هەموو تەنقیدێکی کە بە دڵپاکی بکرێت و لە ئینتیقاد ئیستفادە دەکات و ئەغلاتی پێ چاک ئەکاتەوە، چونکە هیچ کەسێک نییە لە غەلەت خاڵی بێت، گەر ڕۆژنامەی هەولێریش کەموکورتییەکی هەبێت، بە تەبیعەتی حاڵ ڕۆژ بە ڕۆژ باشتر ئەبێت، بە خوسوس ئەو ئینتیقادانەی کە بۆمان بنووسرێت و یا ڕووبەڕوو پێمان بڵێن، بەڵام ئەو ئینتیقادەی کە لە پەنای دیواران ئەوترێت و ئێمە خۆمان خەبەرمان لێ نییە، ئەو کەسە غایەی مەسڵەحەت نییە... ئەی خوێندەوار: ئەو ئەندامانەی کە ئیشی جەریدە ئەکەن، حساباتیان زۆر مەزبووتە، دیارە هەر کەسێک ئەتوانێت بە ئاسانی تەماشای بکات و حساباتەکەی لێ بەدەر ئەکەوێت.

هەر موشتەریکێک کە پارەی جەریدە تەسلیم ئەکا، موقابیل بەوە وەسڵ لە مودیری ئیدارەی ڕۆژنامە وەرئەگرێت. هەر قوتابخانەیەک کە پارەی جەریدەی خۆیان تەسلیم ئەکەن بەرامبەر ئەوە وەسڵ وەرئەگرن، هەر دائیرەیەک کە پارەی ئیعلانات ئەنێرێت بۆ تەئمینی حساباتی خۆی وەسڵ لە مودیری ئیدارە وەرئەگرێت.

ئینجا پارە تەسلیم ئەکات و ئەم پارانە موقابیل وەسلێک ئەدرێ بە ئەمینی سندووقی کۆمەڵ. هەر مەسروفاتێکیش هەبێت موقابیل بە موستەنەدێ سەرف ئەکرێت و ئەو موستەنەدە لەلایەن (٣) کەس تەسدیق ئەکرێت و بە قەراری ئەندامانی کۆمەڵ، تەنزیل دەکرێت لە میزانیە. بۆ تەدقیقی حساباتی کۆمەڵیش، هەیئەتێک لە (٣) کەس عیبارەتە، ئەو هەیئەتە لە بەینی مودەتێک تەدقیقی حسابات ئەکات و تەقدیری خۆی تەقدیمی سەرۆکی کۆمەڵ دەکات، لەبەر ئەوە مومکین نییە هیچ تەلاعوبێک لەم حساباتە بەکرێت.

ئەندامانی کۆمەڵ کە بە ئینتیخاباتێکی حوڕ هەڵبژێردراون، بۆ موحافەزەی شەرەفی کۆمەڵ، لەسەر ئەم خزمەتە ئەڕۆن، تا ساڵی ڕۆژنامە تەواو ئەبێت، ئینجا پرسیارێک بە هەیئەتی عامی کۆمەڵ دەکرێت، گەر موافەقەتیان لەسەر دەوامی جەریدە کرد، هەر دەڕۆین و ئیللا وازی لێ دێنین و قەپاتی دەکەین.. با تەئریخی هەولێریش تەسجیل بکات، کە مامۆستایان ڕۆژنامەیەکی لاوازییان لە هەولێر دەرخستووە، بەڵام دەوامی نەبووە...)).

کار وا ئەڕوا، مقومقۆ هەر هەیە، تەقە هەر هەیە، بەڵام

ئەوان دڵسۆزانە بەردەوامن و (مەناعە)یان پەیا کردووە و گوێ بە ئەو ناحەز و ئەم بەرچاوتەنگ و ئەو فشەکەر و ئەم داخ لە دڵە نادەن و لە کاریان بەردەوامن، ئەوەتانی لە ژمارە (٥٥)ی ڕێککەوتی (١٢)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٥٢)دا، خەبەرێکی هێمن ئەخوێنینەوە ئەڵێ: ((ئەگەر ئەتەوێ ئیشتراکی ڕۆژنامەی هەولێر بکەی، بۆ ساڵێ تکا وایە لە ئێستاوە، پارە بە ناوی مامۆستا (حەیدەر عوسمان) موعەللیمی قوتابخانەی دووەم، کە سکرتێری کۆمەڵی مامۆستایانە بنێرە. (دەستەی نووسەران).

بەپێی دابونەریتی کۆمەڵی مامۆستایان و لەبەر ڕۆشنایی پێڕەوێکدا، لە ژمارە (٩٧)ی (٢٥)ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٢ دا بانگەوازێ هاتووە و ئەڵێ:

"ساڵی ڕۆژنامەی هەولێر: لەم نزیکانە ڕۆژنامەی هەولێر ساڵی دووەمی تەواو ئەکات و پێ لە ساڵی سێیەم ئەنێت، بەم هۆیەوە دەستەی ئیدارەی کۆمەڵەی مامۆستایانی - لقی هەولێر- بە تایبەتی لەم حەفتەیە کۆئەبنەوە، بۆ گفتوگۆ و دواندن لە بەینیانا، لە بابەتی بڕیاردان، کە ڕۆژنامەمان بوەستێ یا هەروا لە (پێشکەوتن!!!) دابێت، وا دیاریشە کە دەستەی ئیدارە، هەیئەتی عام کۆ ئەکاتەوە و پرسیان پێ ئەکەن، ئینجا نەتیجەیەک ئەدرێت..."

دوا بە دوای ئەم بانگەوازە و لە ژمارە (٩٩)یدا کە لە (٩)ی کانوونی یەکەمی ١٩٥٢دا دەرچووە، ئەم خەبەرە دێتە بەرچاو:

" بۆ مودیرانی قوتابخانەی هەرێمی هەولێر... ڕۆژتان باش، لەبەرئەوەی کە ڕۆژنامەی هەولێر ساڵی دووەمی تەواو کرد و بۆ ئەوەی پێ لە ساڵی سێیەم بنێت، دەستەی ئیدارەی کۆمەڵەی مامۆستایان کۆبوونەوە و بڕیارریاندا کەوا پرس بە دەستەی گشتی بکرێت، لە پاشان دەرکەوت، کە کۆبوونەوەی گشتی ڕێک ناکەوێت، دووبارە بڕیاریاندا، بە هۆی مودیرانی قوتابخانەکان پرس لە مامۆستایان بکرێت، جا تکامان وایە ناوی ئەو مامۆستایانەمان بۆ بنێرن، کەوا ئارەزووی ئیشتراکیان هەیە بە نووسراوێکی تر ناوی ئەوانەمان بۆ بنووسن، کەوا (پەسندی) ناکەن.

لەگەڵ ئەوەش با بزانرێ، کەوا ساڵانەی ڕۆژنامە، بۆ ساڵی داهاتوو دینارێکە و بە دوو جاران ئەسێندرێ، ڕۆژنامەش دانەیەک یا دوو دانە (ئەوەستێ تا نەتیجەی وەرامی پرسیاران بۆمان دێتەوە، ئیتر سپاسی هەموو لایەک دەکەین.) - سەرۆکی کۆمەڵەی مامۆستایانی - لقی هەولێر."

دوای ئەم بانگەوازە، بە کارامەیی و بۆ ڕێگا برین و پرزە برینی هەموو ئەوانەی کە حەزیان بە دەرچوونی ئەم ڕۆژنامەیە نەکردووە چ هەندێ کەسی ئەڵقە لە گوێی حکومەتیان لێ هان داوە، چ بە چاو و ڕاو و بە بانگەشەی ناڕەوا و بە ئازاردانی دەستەی نووسەرانی چ بە چوونە بناگوێی ئەو خامە بەدەستانەی کە لەم ڕۆژنامەیەدا بەرهەمیان بلاوکردۆتەوە... بۆ ئەمە زۆر زیرەکانە و دیپلۆماسیانە هاتوون و (رای) مامۆستایانیان وەرگرتووە بە (استفتاء)یەکی گشتی، هەمدیس پەیامی ئەم ڕۆژنامە و مسۆگەرکردنی دەرچوونی ئەم ڕۆژنامەیەیان ساغ کردۆتەوە..

جارێکی تر ئەم حیکایەتەش من نەیگێڕمەوە، با (بەڵگەنامە)کەی نێو ژمارە (١٠٠)ی ٣٠ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٥٢ بدوێ و لە هەمان کاتدا، مێژووی وشە و ڕۆژنامەگەریش لەم شارە دێرینەدا هەڵوێستی مەردانەی ئەو مامۆستایانە بە ژن و پیاوەوە تۆمار بکات:

**ئەنجامی ڕاوەرگرتن**

لێرەدا ناوی ئەو مامۆستایانە - بە ژن و پیاوەوە - تۆمار ئەکەین، ئەوانەی ڕایان داوە بۆ بەردەوامبوونی ئەم ڕۆژنامەیە و خواست و ئارەزووشیان پیشان داوە بۆ بەشداری کردن:

١- دائیرەی مەعاریف: بەڕێز مامۆستا "نعمان بەکر" مودیری مەعاریف و مامۆستا "ئەحمەد مستەفا" موفەتیشی مەعاریف و مامۆستایان "شێخ جەلالی بەرزنجی" و "موسا سالح" و "نەجم وادی " و "حوسێن حەسەن".

٢- تەبابەتی معاریف: دکتۆر محەمەد سەعید ئەلبەکری، کاک خزر وادی.

٣- سانەوی کوڕانەی هەولێر: مامۆستایان عوسمان قۆجە و عەزیز مەولود و نەشئەت محەمەد سەفوەت، جەمیل

حوسێن قەساب، یونس ئەلسامەرائی، جەمیل ڕەشید ئەلعەمادی، عەبدولعەزیز (الدامرچی)، عەبدولمەسیح ئەڵڵا ویردی، خدر حوسێن دزەیی، ئیبراهیم خەتاب، حوسێن عەزیز ڕەشوانی، مستەفا حەسەن شەعبان، سەدیق عەبدولقادر، عەلی حەسەن کەسرە، جەواد ڕەسول ناجی.
٤- سانەوی کچانەی هەولێر/ خوشکە خەیریە نادر.
٥- سانەوی کۆیسنجاق: مامۆستایان شەفیق سابیر، حمود ئەلیوسف، فەزیل فتوحی، خەلیل ئەلحاج نەجم.
٦- ناوەندی کوڕانەی ڕواندز: مامۆستایان: ئەنوەر سلێمان، جەردیس چەمیل، سەدیق ئەلیاس، سەعدوڵڵا ئیبراهیم، ئەنوەر تاهیر.
٧- قوتابخانەی یەکەمی کوڕانەی هەولێر مامۆستایان: عیزەددین فەیزی- جەمال جەمیل، عەبدولکەریم عەلی قازی، فەریق جەمیل، زاهیر ئەحمەد، عەلی جوکل، حازم ئەحمەد، بەترس کورکیس، نوری ئەمین، جابر پیرداود، بویا سولاقا.
٨- قوتابخانەی دووەمی هەولێر مامۆستایان: عەبدولڕەحمان ئەحمەد هەناری، ئەحمەد عەلی ئەلحەیاوی، بەشیر مستەفا، سەدیق یونس، جیهاد عەبدولڕەزاق، محەممەد عەزیز فەتاح، حەیدەر عوسمان.
٩- قوتابخانەی ئیبن ئەلمستەوفی: مامۆستایان: سەید غەریب سەلیم، عومەر ئەمین، سەید فەتاح عەزیز، محەممەد عەبدولسەمەد، فەتاح عەبدوللەتیف، کەمال شاکر.
١٠- قوتابخانەی خالیدیە، مامۆستایان : زەکی ئەحمەد هەناری، عەبدولجەبار حەسەن، یاسین سەید محەممەد، ڕەفعەت عیزەت سامی.
١١- لە تەقاویتەکان: مامۆستا ئەحمەد ناجی.
١٢- کتێبخانەی گشتی: کاک نازم داود ئاغا.
١٣- قوتابخانەی کچانەی خانزاد: خوشکە ئەستێر سەعید.
١٤- قوتابخانەی کچانەی ئەیوبیە: خوشکان حەمدیە سابیر، ساکنە سلێمان.
١٥- قوتابخانەی کچانەی قەڵا: خوشک و خانمەکان: ڕەمزیە عادل، بەدیعە عەبدوڵڵا، فەخریە سەعید، مادلین حەبیب، بەدریە داود، سەبیحە عومەر ئەمین.
١٦- باخچەی ساوایان خوشکان و خانمان: سەلوە بیتون، شوکریە عەلی، ناهیدە مەعروف، ئەنعام شەهباز.
١٧- قوتابخانەی کچانەی عەنکاوە: فەریدە تومان عەلی بەگ، ڕەمزیە فەتاح.
١٨- قوتابخانەی کوڕانەی شەقڵاوە: مامۆستایان: محەممەد ئەمین گەردی، محەممەد ئەحمەد، عوسمان ئیبراهیم، خالید مەدحەت، کەمال عەبدولقادر، ئەحمەد حەسەن خۆشناو، یوسف تۆمار، ڕەشید خدر، مستەفا سەعید، خەلیل محەممەد خۆشناو، جەمیل مەدحەت، هورمز سبونا.
١٩- قوتابخانەی کچانەی شەقڵاوە : خوشک و خانمان: بەدریە عەبدولڕەحمان، سەلما عەزیز عەقراوی، ئاسیا یوسف.
٢٠- قوتابخانەی باتاس: مامۆستایان: بایز سادق، شەوکەت تەیمور، عاشور عۆدیش، فەیسەڵ مەدحەت، ناسیح داود.
٢١- قوتابخانەی هەریر: مامۆستایان: مەجید ڕەئوف، یوسف عەبدوڵڵا.
٢٢- قوتابخانەی ڕواندزی سەرەتایی کوڕان: مامۆستایان: ڕازیە عەلی، ئەنوار عەلی، محەممەد ساڵح جەرجیس فوئاد ڕەسول ناجی.
٢٣- قوتابخانەی کچانەی سەرەتایی ڕواندز: خوشک و خانمان: پیرۆز ئەمین ڕواندزی، ڕەمزیە یاسین، شوکریە عەبد محەممەد ئەلعەلی، هێوی ئەمین ڕواندزی.
٢٤- قوتابخانەی کوڕانەی یەکەمی ڕواندز: مامۆستایان: ئیبراهیم حوسێن، بەهنام بەترس، ئەنوار محەممەد نەورۆز.
٢٥- قوتابخانەی دیانە: مامۆستایان: ئیبراهیم ڕەسول، بۆیا شابا ڕواندزی.
٢٦- قوتابخانەی سیساوە: مامۆستایان: بەگۆک عەزیز، تەها محەممەد خۆشناو، حەبیب فەتاح.
٢٧- قوتابخانەی کوڕانەی یەکەمی کۆیسنجاق: مامۆستایان: جەلال حەویز، غەریب مستەفا، عەبدوڵڵا کاکە، تاهیر ئەحمەد، کەریم مستەفا، بیلال بەهائەدین، مرقص بەترس، عەبدوڵڵا ئەحمەد، ڕەسول خدر، ئەحمەد

سالّح.

٢٨- قوتابخانەی کوڕانەی دووەمی کۆیسنجاق: مامۆستایان: سابیر ئیسماعیل، کەمال سادق، فەتحوڵلا عەبدوڵلا، حەمید ساڵح بێتوشی، عەبدولقادر عەبدوڵلا، عوسمان حەسەن، عەبدولمەجید نورەدین حەنا، ئەنتوان شیت، عەبدولرەحمان ئەمین.

٢٩- قوتابخانەی کچانەی کۆیسنجاق: خوشکە نەزیرە محەمەد رەجەب.

٣٠- قوتابخانەی سەرەتایی رانیە: مامۆستایان: کەمال جەمیل ئیسماعیل سەرهەنگ، حەمید حەویز، موعتەسەم عەبدولمەجید ئەلحاج، غەریب ئەلحاج تەها.

٣١- قوتابخانەی میرزا رۆستەم: مامۆستایان: نوری عەلی ئەمین، سابیر خدر.

٣٢- قوتابخانەی سەرەتایی مەخموور: مامۆستا تاهیر عەبدوڵلا.

٣٣- قوتابخانەی دیبەگە: مامۆستایان: نوری عەبدوڵلا، محەمەد نوری حوسێن.

٣٤- قوتابخانەی عەزیزیە: مامۆستایان تاهیر سەعید، یوسف گۆرگیس، محەمەد سەعدوڵلا.

٣٥- قوتابخانەی گوێر: مامۆستا عەبدولئەحەد ئۆغستین.

٣٦- قوتابخانەی سۆربەش: مامۆستایان : کەمال رەشید حەویزی، محەمەد غەفور عەلی.

٣٧- قوتابخانەی قرشاغلو: مامۆستا تاهیر عەلی ئەلقهوائی .

کە ئەنجامی (را وەرگرتنەکە) جاڕدراوە خواستی مامۆستایانی دڵێر و دڵئازای هەولێر و نووسەر و شاعیرانی هەولێر سەرکەوتووە، هەر لە هەمان حەفتە و هەمان ژمارەدا، شاعیرێکی دڵناسک و ناوداری ئەوسای هەولێر مامۆستا (ئیبراهیم هۆشیار) لە پیاهەڵدان و ستایش و پیرۆزباییەکدا، شیعرێکی یەکجار بە سۆز و جۆشی بلاوکردۆتەوە و ئەڵێ:

**لەسەر چەرخی فەلەک، ڕۆژێ بە نووکی خامە نووسرا بوو**
**کەوا (ڕۆژنامەیی هەولێر) نەما لەم شاردا ئاوا بوو**
**لە ناکاو لەشکری غەم هاتە نێو دڵ، خێوەتی هەڵدا**
**نەما خۆشی، خەفەت پەرتی زەمین و دەشت و دەریا بوو**
**لەپڕ هەوری ڕەش و تاریکی داهات، ئاسمانی گرت**
**سەراپا شاری هەولێر گشتی شێوا و شێت و شەیدا بوو**
**کە مامۆستایەکانی بەرز، سەدای ئەم دەنگەیان زانی**
**هەموو کۆبوونەوە وەک شێر، بە کۆمەڵ گورج و خێرا بوو**
**کەوا ڕۆژنامەیان زوو بێتە مەیدان هەروەکو جاران**
**سەراپایەک بە یەک کۆمەڵ هەموو بڕیاریان دابوو**
**عەزیزان سەد شوکر، دیسانەوە ڕۆژنامە وا دەرچوو**
**بژی سایەی مەعاریف، شاری هەولێر و بە ئاگا بوو**
**زەمانی خوێندنە، دەردی زیللەت مەکتەبە دەرمان**
**لەسایەی خوێندن و مەکتەب بەشەر حاڵی لە دنیا بوو**
**نەزانین وەک شەوی تاریکە، بێ شک ڕۆژە مامۆستا**
**ئەگەر مەکتەب نەبایە، خۆ زەمین گشت لە شەودا بوو**
**لەبەر جەهل و نەزانین سەد هەزاران دەوڵەمەند ئیمڕۆ**
**هەموو ڕووت و پەرێشانن، بە عیلمی خۆی، گەدا شا بوو**
**بە موڵک و سەروەت و سامانی خۆت و مەغروور مەبە هەرگیز**
**مەڵێ من دەوڵەمەند بووم، ئەو گەدا بێ شوێن و مەئوا بوو**
**بەسە ئیتر بە کورتی بیبڕم، با لێرە کۆتابێ**
**هەموو دەرد و نەخۆشی، هەر بە عیلم و فەننەوە چابوو**
**برایان پڕ بە دەم هاوار ئەکا ڕۆژنامەتان دایم**
**ئەڵێ: سەرکەوتنم ئیمڕۆ لە سایەی گەنج و مەولا بوو**
**دەسا ئێوەش بە هیممەت بن لەهەر لا حورمەتی بگرن**
**هەتاکو پێشکەوێ هەولێر، ئەڵێن شارێکی ساوا بوو**

هەر لە بارەی ئەم پشتگیری و پیرۆزبایی و ستایش و نوازشتەی ڕۆژنامەی هەولێرەوەش، نابێ شیعرەکانی مامۆستایان (خادم)ی شاعیر و (بورهان جاهد) و (کەریم مستەفا حەویزی - شارەزا- هەڵبوێردرێ، چونکە خۆی لەخۆیدا ئاوێژووی حاڵەتێکی رەوتی راچەنیوی وشەی کوردی ئەکات لەم شارەدا.

لە هەمان کاتدا هەڵوێستی کوردانەی نووسەرانی کوردیش تۆمار دەکات، نەک هەر نووسەران، بگرە مامۆستایانی قوتابخانەکانیش لە (رادان) دا هەڵوێستیان هەبوو، کەچی مامۆستایەک و نووسەرێکی دیاری ئەو قۆناغە هەر بە (رادان) راناوەستێ و بگرە بە وتارێکی ئاگرین و شیرینەوە، هەر لە هەمان ژمارە (١٠٠) دا بە ناوی (کەم دوای زۆر ئەکەوێ دێتە جۆش..

با بزانین (زەکی ئەحمەد هەناری) ئەمر چی دەڵێ:

هاوڕێکان و خوێندەوارانی ڕۆژنامەی هەولێر، وەکو گوڵە ئەستێرە بەسەر هەرێمی هەولێر و جێگایانی تر نەسوڕێتەوە، بێ وەی شاگەشکەبوو بین .. بووە هۆی لێک ئاگادار بوونەوە.

جارێک وا ڕێک کەوتبایە و درەنگ لە دەمی خۆی دەرچووبایە، هەمــوو کــەس ئەیپرسی: کــوانێ.؟ بۆچ ڕۆژنامەی هەولێر دەرنەچووە؟ کە بڵاوئەکرایەوە، هێمنی و خۆشی و گەشی لە سەر ڕووی خوێندەوارانی نمایان بوو.

بۆ ئەمەی ساڵی سێیەمیش لە (بڵاوکردنەوە) پاش نەکەوێ (دەستــەی نووسەران) وایان بە باش زانی، کە پرسیار لە هەموو مامۆستایان بکەن، کە ئایا لایان باشە ڕۆژنامەی هەولێر هەر لە بڵاوکردنەوەدا بێ یا نا؟

بە زۆری وەڵامی دەرچوون و بڵاوکــردنەوەیان داوە، هەندێکیان چاوەڕوانی دوایی ئەم پرسیارەیان ئەکرد، دراوی مزەشیان لەگەڵ پەرەی دەنگیان بە پۆستەدا بۆ (دەستەی نووسەران) هەناردبوو.

بە راستی بۆ ئەم (خۆناسینەیان) سوپاس دەکرێن.. (چەند کەس !!) بە پێچەوانە، دەنگی دەرنەچوونیان دابوو، ئەوەیش وەکو تێی بگەن لە ڕووی زیزبوونە، یا ئارەزووی هەڵخڕاندنەو وا ئەزانن ئەمە بوویتە پەیژە، بۆ سەرکەوتن و هۆی خۆرەپێش کردن.

بەر لە هەمــوو شت با بەم برایە بەڕێزانە بڵێم: (ڕۆژنامەی هەولێر) کەس نانی خۆی پێ چەور نەکرد و نەبووە و نابێتە هۆی پێشکەوتن و سەرکەوتنی کەس... هەموو کەس ئەتوانێ لە دەرچوون و نووسینی ئەو ڕۆژنامەیە بەشدار بێ، دەرگــا کــراوەتەوە بۆ ڕەخنەگــران، هەر کەموکورتییەکی هەی بوو بێ و یا هەیەتی، بە ئاشکرا با بفەرمووێ.

ئێمە هەموو هاوڕێی یەکین، وەکو شاعیر دەڵێ پێویستە لەگەڵ یەکدا بین:

**دۆستێکم ئەوێ، عەیبم لە کوێ بوو**
**وەکو ئاوێنە بڵێ، ڕووبەڕوو**
**نەک وەکو شانە، بە هەزار زوبان**
**بچێتە پشت سەر بڵێ: موو بە موو**

هەموومان وەکو یەک لەم ڕۆژنامەیەدا خاوەند ماڵین هەرچی لەدڵدابێ، با بێتە سەر زار و بگوترێ، گوێ نەدەینە گێرەشێوێنان، هەروەکو شاعیر دەڵێ:

**گێرە شێوێنێ کە کای کۆنی بە بادا لە کنت**
**چاکە هەر لێی خوری سەیری دەموکاوێژی نەکەی**

جا موژدە بێ، بەپێی دەنگدانی زۆری هاووڵاتییەکان بۆ دەرچوونی (ڕۆژنامەی هەولێر) بڕیار درا، جا هەموو لایەکمان بۆ دەرچوونی ڕەنج بدەین و تێبکۆشین و ئەم بڕیارە ببێتە (پەیڕەو) بۆ هەموو لایەک و کەسی لێ دەرنەچێ، هەروەکو گوتراوە:

**شاە وەکو شاهێکی شەترەنجە، لە عالەم ئیمڕۆ**
**گەورە (قانوونە) قسەی کورت ئەمە درێژی نەکەی**

گوتراوە "ڕۆژنامە" چرای تاریکییە، ڕەهبەری نەشارەزایانە، پەنددەرە، پەیامی زانیارییە، نامەی دڵدارە، یاریدەدەری کابانانە، دەسگیری بێ نەوایانە، مێشک ڕوونکەرەوەیە، پزیشکی نەخۆشی گەلە، هاوڕێی دڵپاکە و نەشەی زیندووی زانیارانە، مێژووی ڕەگەزە، بیلبیلەی چاوی کۆمەڵە، ئاوازی هۆشیارییە، ڕێکخەری ژیانە، بولبولی خۆشخوانی کۆمەڵانە، تێکدەری قسەی زۆردارانە، پەنادەری هەژارانە، ڕووشکێنی ڕوو و ڕێگر و خوێنمژانە، سەنگەرشکێنی درۆزنانە، ڕیزدڕی دڕندانە، تەرازووی دەستی ڕاستی و ڕاستگۆیانە، سەنگی مەحەکە بۆ کۆمەڵ و گەل.

کەواتە: ڕۆژنامەیەک ئەم هەموو کارە بگەیەنێتەجێ، دیارە ئەوانەی (ڕۆژنامەی هەولێر) تێگەیشتوون لە خۆ خزمەتکردن دوورن. بۆ ئامانجەکانی سەرەوە، بە هەموو هێزیانەوە هەوڵ دەدەن ناوی خۆیان و هەرێمی هەولێر و شاری هەولێر بەرزتر بکەنەوە.

هیچ ڕۆژنامەیەک هەندەی ڕۆژنامەی هەولێر بەختیار نەبووە و نییە، کەوا کۆمەڵێکی زانیاران وەکو بۆ ڕۆژنامەی (هەولێر) هەڵکەتووە، غەمخۆرانی بن.

بێگومان! کەواتە: باشترە، بە "پێی بەرەی خۆی" (گەیاندنی پەیامی) تێکۆشێ و خاوێنی و پاکی بگەیەنێتەجێ. بێ هەڵستانی (ڕۆژنامە) کە هەر جێیەک لە هەرێمی هەولێر، وەکو مۆمێکی پێکراو دانیشتوون لایەنەکانی خۆیان ڕووناک دەکەن و پێکەوەش لە ڕۆژنامەی هەولێردا، وەکو ڕۆژ تیشک و ڕۆشنایی بە هەموو

جێگایاندا بڵاودەکەنەوە.

بەمجۆرە تاریکی (نەزانین) لە هەمموو گۆشە و جێدا، دەردەکرێت و بە توون ئەچێ.. ).

هەر لە هەمان ژمارە و بۆ هەمان مەبەست قەڵەمی بە برشتی مامۆستا عیزەددین فەیزی هەمدیس سەر هەڵئەدات و جارێکی تر لە بارەی ئەو (رادان و راوەرگرتنە) دێ و بە زاتێکی زۆر گەورە دێ و کوڵک و مووی گەڵێ شت یەکلادەکاتەوە و گەڵێ شت لە سەنگ و سوژن دەدات و بەوپەڕی سەربەرزییەوە دەڵێ:

"دەرهێنانی رۆژنامە، بە تایبەتی لەلایەن کۆمەڵەی مامۆستایان، پێویستی زۆر شتی هەیە، وەکو دراو و پارە، نووسەر ئیدارە و ماندووبوون و مەسئولیەت و نازەکێشانی برادەر و موشتەریکان، ئێمەش پێش ئەوەی، کە دەست بە ساڵی سێیەم بکەین، لەم شتانە فیکرین و وردبووینەوە بە نەتیجە لێکمان دایەوە، کە هەموو ئاسانە، تەنیا پارە و تەئیدی مامۆستایان تەئییدمان بکەن. کەوا بوو پارەش مومکین ئەبێ، ئەتوانین ئەم خزمەتە بە دڵخۆشی بکەین، چونکە هەر ئیشێک، یا خزمەتێک بە دڵی زۆرترین کەس نەبێ، ماندوو بوونەکە بە فیرۆ ئەڕوا و سوود و فایدەشی کەم ئەبێت.

لەبەر ئەوە بە پێویستمان زانی کە بگەڕێینەوە، سەر رای مامۆستایان کە: ئەگەر ئەوان پێیان خۆش نەبێت ئێمە بۆ چ ئەو حاڵە بکەین، لەبەرئەوەی دوو دانە رۆژنامەمان راگرت و لە هەموو لایێکەوە وەرامان بۆ هاتەوە تەنیا تاک تاک هەندێ قوتابخانە، کە یەک و یا دوو موعەللیمی تێدایە و جێگایان زۆر دوورە، تا ئێستا هیچیان لێ دەرنەکەوتووە.

**برایان:**

ئەم پرسیار و ئیستفتایە بۆ ئێمە زۆر باش بوو، چونکە ئەم تەئییدە وای لە ئێمەی کرد، کە لەژێر حدودی خۆمان، بە دڵێکی فراوان لەسەر ئەم رێگا راستەمان بڕوین و هیچ دڵ لەدڵ نەدەین، بەبێ شک بازان باوێین، بۆ خزمەتی مامۆستا و گەل، تا ئەگەین بە ئامانج.

ئەم ئیستفتایە زۆر بە سەربەستی تەواو بوو، هیچ کەسێک لە ئەندام و موئەییدانی ئیدارەی کۆمەڵ بەهیچ نەوت، کەوا تەئییدی بکات و هەرکەسەی بە کەیفی دڵی خۆی رای خۆی بەیان کرد، تەنیا (یەک دووانێک لە ژێرەوە بە زیدی جەریدە ئەدوان). ئێمەش ئەوەمان پێ خۆش بوو، بۆ ئەوەی بزانین نەتیجە حەق بەچی دەگات.

پێش ئیستفتا یەکێک لە ئێمە بە خسووسی جەریدە، چووە لای سەعادەتی مودیری معاریف و قسەی لەگەڵا کرد، لەم بابەتەوە کە رای ئەو وەرگرێت، فەرمووی ئەم رۆژنامەیە نەک تەنیا زبانی حاڵی مامۆستایانە، بەڵکو زبانی حاڵی هەرێمی هەموو هەولێرە.

وتی بە زمانی منەوە شتێک بنووسە، کە تکام وایە لە هەموو مامۆستایەکی ئەم لیوایە ئیشتراکی ئەم رۆژنامەیە بکات و هیچیان پاش نەکەون، بەڵام ئێمە ئەو تکایەی مودیری معارف خستمانە پاش ئیستیفتا، بۆ ئەوەی زیاتر بە سەربەستی ئیشەکە بڕوات و بۆ ئەوەی ئێمە لە خزمەتا تاکە تامێک و لەزەتێک وەرگرین.

**مامۆستایانی بەڕێز:**

نەتیجەی ئیستفتا نزیکی (٣/٢) مامۆستایان ئیشتراکیان کردووە، ئەو (٣/١) ئیشتراکیان نەکردووە دەرسی ئەحواڵمان کردن و سەبەبی دواکەتنیان بە پێنج نەوعمان دابەشکردن:

١- لەمانە کە ئیشتراکیان نەکردووە زۆریان دانیشتووی ئەم لیوایە نین و رۆژنامەی هەولێریش نیوەی بە کوردییەو تێی ناگەن و مومکینیشە پێیان خۆش نەبێت خوێندنەوەی، بەڵام دەبوایە بە مجامەلە و ئەدەبیات لە مامۆستایانی ئەم لیوایە دوا نەکەون.

٢- هەندێکیش خەلقی ئەم لیوایەنە، بەڵام دینار دوای خستن. ماڵی دینار خراپ بێ، پیاوی زۆر باش تێک ئەدات، دینارێک گەر تەقسیم بکەی بە ساڵێک رۆژی (٣) فلس کەمتر ئەکا، کە نرخی یەک جگەرەی بەتام ناکات.

٣- دووان و سێیانیش لە برادەران هەنە رقیان لەم هەیئەتەیە، کە ئەم خزمەتە ئەکەن، بەڵام ئەوان غەڵەتن، چونکە دەستەی کۆمەڵە شتێکە و جەریدەش شتێکی ترە، ئەندامانی هەیئەت دەڕوا، یا دەمرێ و یەکێکی تر دێت، بەڵام پێویستە رۆژنامە هەر بمێنێ.

موهیم ئەوەیە ئەم دەستەیە لابەن، کە دەستەیەکی تر ئەم خزمەتە باشتر بکات و ڕۆژنامەش هەر بمێنێ.

٤- هەندێک لە برادەران ئەڵێن: ڕۆژنامەی هەولێر هەموو شتێک نانووسێ، بێ کەڵکە.. کاکە گیان: هەر شتێ تۆ ئەتوانیت بینووسە و بینێرە، بۆت بڵاوکەینەوە، هەر تەنقیدێکت هەیە، مەردانە بە ئاشکرا پێمان بڵێ: کە بە گوێت بکەین، قسەی پەنادیوار پیشەی ترسنۆکە.

٥- ئەمەیان لە هەمووان سەیرترە کە (ترسە) .. ئەوانی پێشوو حەقیان نەختێک ئەدرێتێ، بەڵام مەسەلەی ترس بە موشتەریک عەنتیکەیەو جێی پێکەنینە.

ڕۆژنامەی هەولێر، لە حدودی خۆی ناچێتەدەر و هیچ شتی واش نانووسێ، کە کۆسپیی بێتە سەرڕێ. خزمەتی زمانی کـــوردیش، وا دەزانم هیچ ترسی پێ ناوێ، چونکە لە دەستـــوور ئەم ڕێگایە دەدا، ئەگـــەر ترســـیش هەبێ، بۆ ئەوانەیە کە باری ڕۆژنامەیان هەڵگرتووە، کـە دەستـەی کۆمەڵەیە، نەک بۆ ئەو کەسەیە کە کەس نازانێ ئیشتراکی کردووە.

خوێندەواری خۆشەویست شتێکت بۆ بگێڕمەوە کە زۆر پێـبکەنی: مـامۆسـتـایەک لە قـوتابخـانەی خـۆی لەگـەڵ مامۆستایان ئیمزای کردبوو، کە راغیبی ئیشتراکە، لە پاش دوو ڕۆژ ئەم مامۆستا بەڕێزە، نازانم چ چرپەیەکی ترسی لێ پەیدا بوو.

بۆچی؟ یان بە گوێیان خوێند، ئەویش زوو بروای کرد و چووەتە لای مودیری ئیدارە و داوای قایمەکەی ئەکا و ناوی خـۆی بە تەوقـیـعـەوە لەسـەرەوە ئەخـاتە ژێرەوە و ئەڵێ: (عەفووم بکەن زروف وایە، ناتوانم ئیشتـراک بکەم.. ئەم زاتە خـۆشی تا ئێـسـتـا هەر تەئـیـیـدی جەریدەی ئەکـرد و جاروباریش خۆی تیا ئەنووسێ.

لە ژمارە (١٢٣) ی ٩ی حوزەیرانی سـاڵی ١٩٥٣دا، هەمدیس مامۆستا عیزەددین فەیزی، زۆر بە ڕاشکاوی و بەوپەڕی سەربەستییەوە ئەدوێ و بە دوور و درێژی باسی دەوری شارستانیەت و مرۆڤ و ڕۆژنامەگەری ئەکات و لە پاشان با ئەداتەوە، لایەنێکی تر و ئەڵێ:

"ڕۆژنامەکانی وڵاتی ئێمە هەندێکیان تەنیا مەدحی کاربەدەستان ئەکا و یا بە شەخسێکدا، هەڵدەڵێ، یا ئەگەر ئەو کـەسـە لێکەوت و گـرفـتـێکی دیت، جـا خـراپەکـانی ئەژمـێرێ.. هەندێ ڕۆژنامـەش تەنـیـا چاکـەی خـاوەنەکـەی ئەڵێ و ئەیکا بە مەزنترین پیاو لە عێراقا، یا لە خراپەی دوژمنی خـاوەنەکـەیا ئەنووسێ، هەروەها هەمـووی لەسـەر مـەسـڵـەحـەت و غـایەی شـەخـسـی ئەڕوا.. هەندێکیـشـیـان پارەی بدەیێ.

**ئەی برادەر و مامۆستایانی بەڕێز:**

ئەی ئەوانەی ڕۆژنامەیان پەسند کرد، یا ئیـشـتـراکـیـان نەکرد، ئێـستـا مادامەکی زۆرترینی مامۆستایان و غەیری مـامۆسـتـایان لە هەمـوو لایێکەوە داوای ئەکەن، کـە ئەم جەریدەیە بمێنێ و نەمرێ، پێـویسـتـە لەسـەر هەمـوومـان، هەموو ئیـعـتـباراتێک تێهەڵدەین و فرێیی بدەین و دەست بدەینە دەستی یەک و پشت بە یەک ببەستین و بۆ خزمەتی موعەللیم و گەل ڕاوەستین و بۆ دەرهێنانی ئەم ڕۆژنامەیە بە دراو نووسین یاریدە بدەین، ڕۆژنامە شتێکی زۆر پێویستە، هی خـۆتانە، بە ناوی ئێـوەوە دەرئەچێ، هەرچەندە پێشـتـر تەئیـیدتان نەکرد، ئێستا پێویستە بە عورف و نیزام هەر مـامۆسـتـایەک کـە عـوزوە لە کۆمـەڵە، یاریدەمـان بدات بە هیمەتی خوای مەزن، هەموو لایێک لە خۆشیدا بن.

(هەندێ ڕۆژنامـــە) مـــەدحت دەکـــا، یا ئارەزوو بکەی هەرکـــەسی بتـــەوێ خـــراپەی دەرئەخـــا، جـــا ئەم چەشنە ڕۆژنامانە ڕەواجیان کەم ئەبێت و کەسیش پارەی پێنادا بۆ خوێندنەوەی جا مەجبوور ئەبێ وەک کاک حەمەد مەندۆی لاوکبێژ لە لیـواکان و ناحیە و قەزاکـاندا ئەسوڕێـتـەوە بە واسـیـتـەی کـاربەدەسـتـان لە شـێخ و ئاغـان، پارەیان بۆ کۆئەکەنەوە.

جا توخوا کاکەی خوێندەوار، چ ئومێدێک لەم چەشنە ڕۆژنامە داوا ئەکرێت؟

هەندێک لە ڕۆژنامـــەکـــانیش دەنگوباسی دەرەوە دەنووسنەوە، کە چەند ڕۆژ پێشتر لە ڕادیۆ بیـسـتـراوە، بەم چەشنە ئەم نەوعە ڕۆژنامانە زۆر ئەبن و مێشکی کۆمەڵ پڕ ئەکەن لە شتی بێ کەڵک.

ڕۆژنامە ئەبێ بیروباوەڕی خۆی بە سەربەستی بنووسێ، هەوڵبدا بۆ پەیداکردنی نووسینی باش، بێتە ڕەهبەرێک بۆ پێشخستنی کۆمەلایەتی و پیشاندانی ڕێگا و ڕەوشتی باش، ئەبێ ببێتە چاودێر لەسەر کردەوەی کاربەدەستەکان، چاکە و خراپەیان بۆ میللەت بڵاوئەکاتەوە، چونکە ڕۆژنامە

ئەندامێکی زۆر بە نرخە و (چوارەمین هێزە) بۆ داواکردنی حەقی گەل..".

کە لەو دەردە دڵ و لەم هەڵوێستە مەردانەیەی دەبێتەوە دوای دوو ژمـــارە، واتە: لە ژمـــارە (١٢٥)ی (٥) ی تەمموزی ساڵی ١٩٥٣دا، دوای ئەوەی کە گوێبیستی گەلێ چاووڕا و پروپاگەندەی بێ کەڵکی هەندێ بۆرە پیاو و بۆرە مامۆستا و بۆرە ئەڵقەلەگوێی ڕژێمی ئەبێت، بە ناچاری و بە دوور و درێژی و بە چێژ و هەوایەکی ڕۆژنامەنووسییەوە باسی دەرچوونی ڕۆژنامـەی هەولێـر ئەکـات و بە ناوی "ڕۆژنامـەی هەولێـر چۆن دروست ئەکـرێت و چۆن بەدەست ئەگا" وتارەکەی وادەس پێئەکا:

(خـوێندەواری خۆشـەویست: بەو مـوناسـەبەتەی کـە ڕۆژنامـەی هەولێـر دوو مـانگ ئەودەستێ و دەرناچێت (پشـووی هاوین-م. زامـدار) وامـان بە پەسند زانی کـە بۆتانی بلێینەوە، چۆن ئەو ڕۆژنامـەیە دروست ئەکـرێت و چۆن بەدەستت ئەگات!؟...

ئەو ڕۆژنامەیە کە ئێستا موەززیع هاتوو وتی: فەرموو ئەمـە هی تۆیە، تۆش چاوێکی لێ ئەگـێـڕی و دەنگوباس ئەخوێنیتەوە و نووسینە کـورتەکـان بەسـەریا ئەڕۆی، ئەم ڕۆژنامەیە کە بە چوار پەڕە، بە کوردی و عـەرەبی نووسراوە و بە جـوانی و ڕێک و پێکی پتـر بەدەست کـراوە، ئەمـە ئیـشی ڕۆژێک و دوو ڕۆژ نییـە، کـاری یەکـێک و دووان نییـە.. فـەرمـوو لەگـەڵمـان (یەک حـەفـتـە) بسـوڕێوە، ئاگـاداری ئەوە بە، کـە چۆن دروست ئەکـرێ و چۆن ئەگـا بە دەستت....!

لە سـەعـات پێنجی ئێوارانی ڕۆژی شـەموو (عـیزەددین فەیزی) فایلێک پڕ لە مەوادی کوردی و عەرەبی هەڵئەگرێ و ئەچێ بۆ بینای مـەکـتـەبەی عـامـە و لەگـەڵ دەسـتـەی نووسەران، کە خۆی و مامۆستا حوسێن ڕەشوانی و خوشکە ئەستێر سەعید و مودیری مەسئول مامۆستا جەمال جەمیل ڕەشـیـد- کـۆئەبنەوە، ئەم مـەوادانە یەکـە یەکـە لەوێ دەیخـوێننەوە، هەر کـەسـەی ڕای خـۆی بەیان ئەکـات.. ئەوانەی کە موافەقەت ئەکرێ لەسەر چاپیا، عەرەبییەکەی مامۆستا ڕەشوانی و کوردییەکەی عیزەددین فەیزی گلیی دەدەنەوە، بۆ ئەوەی شەو هەر یەکە بەشی خۆی تەسـحـیح بکات و حازری بکات بۆ بەیانی.

بەشی کـوردی هەمـووی نووسـینەوەی پێـویسـتـە، هەرچەندە خـاوەن مـەقـالە بە خەتێکی جوان و ڕێکی نووسیـبێـت، دیسانەوە دەبێ بنووسرێتەوە، چونکە کرێکارانی چاپخانەی (ام الربیـعین) لە مـووسڵ، کـوردی نازانن و شکڵ نووسی ئەکەن.. ئەبێ حروفەکان، کە ئەنووسی گەورە و دیار بێت..

جـا عـیـزەددین فـەیزی مـەجـبـوور ئەبێ هەمـوو کوردییەکانی بەشی ژمارە یەک بنووسێتەوە و لە بەینی هەر کەلیمەیەک و کەلیمـەیەکی ترا، بە قەڵەمی سوور خەتێک بکێشێت، بۆ ئەوەی کـەلیمـەکان تێکەڵ یەکتـر نەبن. ئەم نووسـینەوەش شـەو تەواو نابێ، ڕۆژی یەکشـەمـووش تا سـەعات یانزە و دوانزە لە گەڵیـان خەریک ئەبێت. هەر لەو وەختـەش یەکـێک ئەنێـرێت بۆ دائیـرەکـان، بۆ وەرگرتنی دەنگوباس کە بنووسرێتەوە، هەروەها بەشە عەرەبییەکەش کـاک جەمـیل ڕەشـیـد لە کـاک ڕەشـوانی وەردەگـرێ و بۆ عـیـزەددینی دەنێـرێت، ئەویش نامـەیەک بۆ چاپخـانەی مـووسڵ ئەنووسێ و مـەوادەکـان بەشی کـوردی و عـەرەبی، هەرچی هەبێ یەکە یەکە جێگایان و خەریتەی جەریدەیان بۆ بەیان ئەکا و بە فەڕاشێکی قـوتابخانەی یەکەمی هەولێر بۆ گەراجی ئەنێـرێ و لەوێ تەسلیمی ئەو سایقە بکرێ، کە تەعەهودی لەگەڵ کراوە بۆ هێنان و بردنی مەواد و ڕۆژنامە، هەندێک جاریش وا تەسادوف دەکا مـەواد ڕێک نەخراوە، یا سـایق زوو بەڕێ کـەوتووە، ئەو وەختـە خـۆمـان ئەچینە گـەراج، بە هەزار تکاو ڕجـا و بە پارەدان بە سـایقی تر ئەینێرینە مووسڵ، کە گەیشتە مووسڵ بەهەر نەوعێک بێت ئەگـا بە چاپخـانە لە ڕۆژی دووشـەمـوو، لە بەیانییـەوە تا ئێـوارە هەمـووی لە چاپ ئەدرێ و ئیشی تیـا ئەکرێت، جا گـەر لەوێ حـازر بین تەسـحـیـحـەکـە بە باشی ئەکـرێت و ئەغـلاتی نابێت و ئەگـەر لەوێ نەبین، تەسـحـیـح باش ناکـرێت و ئەغـلاتی تیـا ئەبێت. لە ڕۆژی سێـشـەمـوو تا سەعات یانزە چاوەنۆڕی ڕۆژنامە ئەکەین، کە لە مووسڵەوە بێت، سـەعـات یانزە دیسـانەوە فـەراشـێکی قـوتابخـانەی یەکـەمی هەولێـر ئەچێ بۆ گـەراج بۆ هێنانی ڕۆژنامـەی هەولێـر، هەندێ جاریش وا ئەبێ سایق لەبیـر ئەکـا لەگـەڵ خۆی بیـهـێنێت، یا مـەتبـەعـە تەواوی نەکـردووە، چەند سەعاتێک تەئخیر ئەبێ، ئێمەش بکەوینە تەقەلاوە تەئخیر

بێ لە قوتابخانە، تا پێمان ئەگات. کە رۆژنامە گەیشت کاک جەمال جەمیل کە مودیری ئیدارەیە ئەم (٧٥٠) ژمارەیە دابەش دەکات بۆ ئەم جێگایانە: بەشی ئەشراف و ئەهالی بۆ خوشکە ئەستێر سەعید، بەشی موەززەفەکانی هەولێر بۆ خوشکە حەمدیە سابیر، بەشی قەزا و ناحیەکانی هەولێر بۆ کاک حەیدەر عوسمان، بەشی دەرەوەی لیوای هەولێر بۆ کاک زاهیر ئەحمەد، بەشی عەشایر بۆ عیزەددین فەیزی دەنێرێت، ئەوانەی پوول و کاغەزیشیان پێویستە لەگەڵیاندا رەوانە ئەکات، جا ئەوانەش هەر کەسەی لە قوتابخانەی خۆی، بەشی خۆی وەرئەگرێت و لە فرسەتی نیوەرۆ لەگەڵ هەندێ قوتابیانی خۆیان ئەیپێچن و لوولی ئەدەن و ناوی موشتەریکەکان لە سەریا یەکە یەکە بە گوێرەی قایمەی ناوانی لای خۆیان ئەنووسنەوە، ئەوی بۆ پۆستە بێ، لە پاش پوول لێدان ئەینێرنە پۆستەخانە، ئەوانی دیکەش جەمال کەریمی موەززیع بەسەریان ئەگەڕێ و لێیان وەرئەگرێت. لە سەعات چوار بە خۆی و باوکی یەکە یەکە تەسلیمی دەست موشتەریکە خۆشەویستەکانی ئەکەن.

**کاکە گیان:**

هەر لە رۆژی سێشەمووەوە، تێئەفکرین و بیر ئەکەینەوە، حەفتەی داهاتوو چ حازر بکەین؟ چ مەوادێک باشە؟ چ بنووسینەوە؟ بۆ ئیفتتاحیە- چ پێویستە؟ هەر لەم دالغە و فیکرە و حازرکردنەدا ئەبین، تا رۆژی شەموو، چ دەنگوباسێکمان بیست، زوو بە زوو ئەینووسینەوە، هەندێ جار کاغەزمان چەنگ ناکەوێت، لە پشتی (پاکێت) ئەنووسینەوە تا بیرمان نەچێت؟!! بەم گوێرەیە، تا رۆژی کۆبوونەوەمان.. هەرچەندە مەوادی عەرەبیشمان کەمە، جێبەجێی هەر ئەکەین.

کاک جەمال جەمیلیش بە درێژایی حەفتە، ئیعلانات وەرئەگرێت، ئیشتراکیان بۆ دێت، وەسڵ ئەبڕێت بۆ ئوجرەتی ئیعلان، بۆ دائیرەکان نووسراو ئەنووسێت... ئیتر بەم گوێرەیە لە شەموو تا شەموو، ئەمە حاڵی هەموو لایەکمانە و دایم بە نووسین و بە فیکر لەم ئیشەداین، زۆر بە رووخۆشی و دڵفراوانی ئەم خزمەتە ئەکەین، لەبەر بڕوای سیقەی مامۆستایان و زبان و خوێندەواری.

**برایان:**

ئەو کۆمەڵە کە ئەو کارە بەجێ ئەهێنن، یەکیان و دوانیان بڕۆن بۆ لایەک، ئەبێ باری ئەوانیش بگرینە سەرشانی خۆمان و هەندێک لە ئێمە، ئەگەر هەولێر بەجێ بهێڵێ بۆ حەفتەیەک، ئەو حەفتەیە رۆژنامە دەرناچێت و رائەوەستێ، چونکە یەکی تر ئیشی ئەوی تری پێ ناکرێ، مامۆستاکانیش زۆربان بە موناسەبەتی هاوین جێیان گۆڕیوە... پێشان بۆ هەر قوتابخانەیەک لە مەرکەز بە جوملە جەریدەیان بۆ ئەچوو، مودیری قوتابخانە، خۆی بەسەر، مامۆستایان بڵاوی ئەکردەوە، ئێستا ئەبێ هەر مامۆستایەک لە هەولێر یا لە دەرەوە، بە تایبەتی بەناوی خۆی رۆژنامەی پێ بگات. ئەمەش ئیشێکی زۆری دەوێ، قوتابییەکانیش لە وەختی تەدریساتا بۆ لوولدان و پێچان زۆر یارمەتییان ئەکردین، بە هاوین ئەویش نەما. لە پاشا ئەزانی زۆری جەریدە و مجەللەی کە هی مامۆستایان بێ یا تەربەوی بێ، لە وڵاتان هاوینان رائیئەگرن و لەگەڵ کرانەوەی قوتابخانە ئەیکەنەوە، ئێمەش لەبەر ئەو ئەسبابە، وامان بە باشزانی، بۆ دوو مانگ رۆژنامەکەمان رابگرین.

**کاکەی خوێندەوار:**

مومکینە بفەرمووی ئەی ساڵانی پێشوو، بۆ چ راتان نەگرت و واتان نەکرد؟ قسەکەت راستە، بەڵام ئەزانی کە ماندووبوون ساڵ بە ساڵ کە هاتە سەر یەکتری تەئسیری بۆ شکاندنی نەشات و پێشکەوتن زۆرتر ئەبێ؟ ئەگەر کارێک ئیرهاقی تیا بوو، فایدە و سوودی کەم ئەبێ، بەڵکو قیل و قالی زیاتر ئەبێ..؟

ئەبێ لەم بابەتانەوە لێمان ببوورن، هیواشمان وایە لە پاش ئەم دوو مانگە نەشات و چاپووکی ئەندامان نوێ بێتەوە و بە دڵێکی زۆر بە شەوقەوە (رۆژنامەی هەولێر) بخرێتە پێش چاوتان.. بە خۆشی هەموو لایەکتان..!.

ئەو دوو مانگە تەواو ئەبێت، وەک دیارە هەر لە هاوینی ئەو ساڵە و لە نێوان ئەو دوو مانگەدا، تەونی پیلانێکی ورد و مارەزەردانە، لەلایەن هەندێ داخ لەدڵ و پسپۆڕ لە پیلان و داودانان و هەناسە بڕکردن، سازدرا - خۆزیا رۆژێ ئەو حەقیقەتەش ئاشکرا دەبێت! وردە وردە

زۆر وەستایانە، مۆتەکە لەسەر رێی ئەو رۆژنامە ئازیزەدا قیت دەکرێتەوە چنگڕۆکی نامەردانە بۆ قورگ و ئەوکی درێژ دەکرێت..!.

ئەوەتانێ دوای ئەو پشووە کورتە، لە ژمارە (١٤٠)ی رێکەوتی ٢٨/کانونی یەکەمی سالّی ١٩٥٣ سالّی سێیەمی رۆژنامەکە- لە سەروتارێکیدا، کە مامۆستا عیزەددین فەیزی نەمر نووسیویەتی، بە قوولّی هەست بە (دوا هەناسە) و (دواسات) و ( دوا مالاوایی) دەکرێت، لە پالّیشیا هەستێکی قوولّتر بە دلّنازایی و بە هەلّوێستی پیاوانە و کوردانە و رۆژنامەنووسانە و مامۆستایانە دەکرێت و ئەشبێتە مایەی ژان و ژووری دەیەها پرسیاری بێ وەلّام و بۆ مێژووی رۆژنامەگەری ی ئەم شارە ئەمێنێتەوە، با بۆ چەند ساتێ گوێ بۆ (هەناسەی گەرم و ساردی) ئەو وتارە مێژوویییە شل بکەین. کە بەوپەڕی راشکاوییەوە دەلّێ:

" لە کۆبوونەوەیەکی کۆمەلّی مامۆستایاندا، بڕیاردرا کەوا: دوو مانگ رۆژنامەی هەولێر بوەستێت، بۆ ئەوەی سالّی رۆژنامەگەری لەگەلّ هەلّبژاردنی ئەندامانی هەلّسوڕێنەری کۆمەلّ پێکتری بگرێتەوە، چونکە زۆری ئەندامانی کۆمەلّ و دەستەی نووسەران، وایان بە پەسند زانی کە جێگا چۆلّ بکەن بۆ ئەندامانی تر، بۆ سووڕاندنی کاری کۆمەلّ و رۆژنامە.

جا بەم موناسەبەتەوە ئەلّێم: ئێمە لە موودەی ئەم چوار سالّە، بە هەموو هێزێکمانەوە، بەقەدەر توانامان خۆمان ماندوو کرد و خزمەتی ئەم کارەمان کرد هەرچەندە لە زۆر لایانەوەش (هێرشمان ئەکرایێ!!) بەلّام ئێمە ئەم رێگەیەمان گرتبوو، زۆر بە باشمان ئەزانی لەم خزمەتانەش پێکیان بۆ بلاوکردنەوەی زوبانی کوردی بوو، گەلەکەمان زۆر دواکەوتووە لەم بابەتەوە.

**برایان:**

ئێمە هەرچەندە هەولّ و تەقەلامان ئەدا و کۆششمان ئەکرد، دیسانەوە نەمانتوانی بە تەواوی جێبەجێی بکەین، لەبەر ئەم سەبەبانەی خوارەوە:

١- تا ئێستا نووسەر و خوێندەواری کوردەواری، شارەزاییێکی تەواویان نییە لە نووسینی کوردی، لەبەرئەوە دێت لە ژمارەیێکا بە دوو سێ چەشن نووسین (املاء) وتار بلاوکراوەتەوە، ئێمەش لەبەر ئیش زۆری خۆمان نەمان ئەتوانی هەمووی بە یەک چەشن نووسین بینووسینەوە.

٢- زۆر نووسراوو مەقالەمان بۆ ئەهات کە باش نەبوو و بیرەکەی لەسەر فیکری ئێمە نەبوو و زۆر پێمان خراپ بوو، لەبەر هەندێ ئیعتبارات و کەمی مەواد بلاوەکرایەوە، کە خۆمان لە رۆژنامەکە ئەمانخوێندەوە، پێی پەست ئەبووین.

٣- زۆر خواروخێچی و ناپەسندیان، لە هەلّسوڕێنەر و فەرمانبەران و دانیشتووانی ئەم ناوەمان ئەدیت، پێویست وا بوو ئاشکرای بکەین و بلاوی بکەینەوە بۆ خوێندەوارانی خۆشەویست، کەچی لەبەر ئەوەی کە فەرمانبەرێکین ناتوانین هیچ لێی بدوێین...! شەرمەزاری ئەم و ئەویشمان ئەهاتە سەر، رەخنەشیان لێ ئەگرتین و ئەیانگوت: رۆژنامەی هەولێر، ناوێرێ هیچ شتێک بنووسێ، کەوا عیلاجی خراپەی شارەکەمان بکات.

**کاکە گیان:**

ئەوانەی ئەم چەشنە قسانەیان ئەکرد، حەقیان بوو ئێمەش لە توانامان نەبوو، لەبەر ئەوە دلّتەنگ ئەبووین.

**مامۆستایانی بەڕێز:**

ئەم هەلّسووڕاندن و گێڕاندنی کاری رۆژنامە، هەروەکو وتمان: زۆر زەحمەتە، هەر بە قسە خۆشە، ئەوی ئەم ئیشە ئەکات، ئەبێ کاری تری نەبێت و ئەبێ فەرمانبەریش نەبێت، کە بتوانێ سەربەخۆ بنووسێت و دەری بخات، ئەم ماندووبوون و تێکۆشینە مودەی ئەم چوار سالّە ئیرهاقە، ئیرهاقیش تا کاتێک (تحمل) دەکرێت، کە لە سنووری خۆی تێپەڕ بوو تاقەتت نامێنێ.

ئێمە کە ئەم رۆژنامەیەمان راگرت، تا دوو مانگ .. هیوامان وایە دەستەیێکی تر بێت، زۆر بە باشتری دەربهێنێت و بە قالّبێکی رێکتر بیخاتەوە بەرچاو.

من بە شەخسی خۆم، کە ئەمە دوو ژمارەیە، ئیش لەم رۆژنامە خۆشەویستە ئەکەم و کۆتاییشم لە ئەندامیەتی

کۆمەڵی مامۆستایان لە یەکەم حەفتەی مارتەوە دێت، کە دەست ئەکرێ بە هەڵبژاردنی ئەندامانی نوێ بۆ ساڵی تازە، زۆر سوپاسی ئەو کەسانە ئەکەم، کە یاریدەیان دا بە نووسین و قسەکردن بۆ پێگەیاندنی ئەم ڕۆژنامەیە، ئیتر ڕۆژنامەی هەولێری خۆشەویست و خوێندەوارانی بەرێز..

بە خواتان ئەسپێرم.

بەمجۆرە و وادیارە دوای لاچوونی ئەو دەستەیە و هاتنی دەستەیەکی تر- بە هەڵبژاردنێکی ساختەوە! بۆ دواجار، دوا پەردە دادەکشێت و دنیای شانۆی ئەوسای هەولێر تاریک دادێ و کارەکتەرە مەردەکان، بە زۆری زۆرەکاری لادەبرێن و خەڵکی نێو ئەو شانۆگەرییە سەوزەش پەراگەندە دەکرێن....!

بەڵام سووربوونی هەندێ لەو کەڵە پیاوانە لەسەر ئەم کارە مێژووییەدا، وا لە یەکێکی وەک (گیو موکریانی) نەمر بکات، چاپخانەکەی خۆی بکاتە مۆڵگەی ئەو دڵسۆز و خامە بەدەست و ڕۆشنبیرانە و خەڵکێکی زۆریش لە دەوری خۆی و چاپخانەی کوردستان و گۆڤاری (هەتاو)دا کۆبکاتەوە...! تا بەو داخ لە دڵانە بڵێن: ئێمە وچانمان نەداوە و قەڵەمیش وچان نادات و گیانی وشەپەروەری - نەک کورسی و پارە پەروەری و گیانی ڕۆژنامەنووسی لەم شارەدا سەر دانانەوێنێ...!

## ئیندێکس

بۆ زیاتر شارەزا بوون بە ناوەرۆکی ئەم ڕۆژنامەیە و بۆ ئەوەش ئەم وەچە نوێیەی کورد، نەخوازەڵلا (هەولێری) بە وردی و بە کارامەیی بزانێت چی لە ناو ئەم ڕۆژنامە شیرینەدا حەشار دراوە، لەبەرئەوەی کەمو زۆر، کەم کەس نەبێت، ژمارەکانی ئەو ڕۆژنامەیەی نەدیوە و یا گەر دیبێتیشی، هەر بە تاک و تەرایی و بێتاسەشکاندن...! هەر بۆ ئەوەیش ئەڵقەیەکی هەرە دیاری قەفی جووڵانەوەی ڕۆشنبیری و پیشەیی و بگرە سیاسیش لە یەک لەگرێ هەرە گرینگەکانی ئەم سەدەیە و لەم هەولێرەدا بدۆزرێتەوە و ڕۆشنتر بێتەوە، وام بە چاکتر زانی ئەم ئیندێکسە خێرایە بخەمە بەرچاو تا ئەوەی ئەیەوێ بە وردی لە یەک لەو مەسەلانە بدوێ و بکۆڵێتەوە تا بکرێ بە ئاسانی بیدۆزێتەوە و بیکا بە سەرچاوە و لێی ورد بێتەوە....!

حەزیش ئەکەم - هەرلێرەدا- ئەوەش هەڵنەبوێرم، کە : ئەوەی من لەم ڕۆژنامەیەدا مەبەستم بوو، مەبەستێکی ڕۆشنبیریی و ئەدەبیی بوو، بۆ ئەمەیش هەموو ئەو شتانەی کە بەندیواری بە جووڵانەوەی ئەدەبیمانەوە هەیە نووسیمنەوە و لە پاڵیشیا گەیشتمە گەلێ دەرەنجامی وردەوە.. پەیتا پەیتا بە شێنەیی لێرە و لەوێ بڵاویان دەکەمەوە.

نیاز خوازیشم بەم ئیندێکسە، دەروازەیەکی چکۆلانەم لە نێو دنیای ئەو ڕۆژنامە ئازیزەدا، کردبێتەوە...!

**ژ (١) شەممە ١٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٥٠**

* ڕۆژنامە لە هەولێر - سەروتار - عیزەددین فەیزی.
* لە جۆن کیتسەوە - پەخشانی دوو هەڵبەست بە کوردی وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە : گۆران.
* ئامانجی ئەدەبیات - وتار - گیوموکریانی.
* كلمه الافتتاح - مقال عبدالمجيد حسن.
* المرأة والمجتمع - مقال - استير سعيد.

**ژ (٢) شەممە ٢٣ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٥٠**

* کۆمەڵی مامۆستایان - وتار - عیزەددین فەیزی.
* جەژنی لە دایکبوونی محەممەد (ص) - وتار- عیزەددین فەیزی.
* جەریدە - وتار- جەمال جەمیل.
* حفلة وضع الحجر الاساسي لبناية مدرسة اربيل للبنات - مقال - مدير المعارف.
* بناية ثانوية اربيل للبنين - خبر -

**ژ (٣) شەممە ٣٠ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٥٠**

* هەر بژی جەلالەتی مەلیک فەیسەڵی دووەم - وتار- عیزەددین فەیزی.
* تەعزیە لە هەولێر چۆن کرا - ڕیپۆرت-
* مەلیک - شیعر - ناهیدە شێخ سەلام.
* البلد الوله في الخطب الجلل - مقال-
* الاخلاق والدين - مقال- يوسف شيخ يحيى
* فاجعة العراق الكبرى - مقال - لطفيه دباغ.

**ژمارە (٤) ٦ ی کانوونی دووەم ساڵی ١٩٥٠**

* محەممەد پاشا چۆن هاتە هەولێر- وتار- م.

عەبدولواحید.
* نووسراوێکی کراوە بۆ سەعادەتی مدیری معاریفی هەولێر - وتار - ئەنوەر عەزیز دزەیی.
* المصرف الزراعي العراقي في أربيل - مقال- محمد حسن دزەیی.
* فقیدة العراق - شعر لطفیه دباغ.

**ژمارە (٥) ١٣ی کانوونی دووەم سالّی ١٩٥٠**
* بیرەوەری فارابی - وتار- وەرگێڕانی: عیزەددین فەیزی.
* الحرکة التعاونیة - مقال- عبدالمجید حسن.
* صرخة اربیل - مقال - حیدر عثمان.
* رثاء - شعر- محمد رشاد افندی.
* جمعیة المعارف التعاونیة في اربیل.

**ژمارە (٦) ٢٠ی کانوونی دووەم سالّی ١٩٥٠**
* شاری هەولێر - وتار- عیزەددین فەیزی.
* الجمعیات التعاونیة - مقال - علي جوکل بریة.
* مکافئة المعلم في المجتمع - مقال- حمدیة صابر.
* نحو النور - نثر طلیق- احسان مصطفی المحامي.
* شکوی للحبیب - شعر - عادل شاکر.

**ژمارە (٧) ٢٧ی کانوونی دووەم سالّی ١٩٥٠**
* مەولەوی و شیعری موناسەبات - وتار- گۆران.
* مامۆستا - وتار- حەیدەر عوسمان.
* ترسان لەلای ساوایان - وتار- یوسف شێخ یەحیا.
* صحیفة اربیل - مقال- ن. ر.
* نحو النور - نثر طلیق- احسان مصطفی المحامیي.
* الجمعیات التعاونیة - مقال علي جوکل بریة.

**ژمارە (٨) ٣ی شوبات سالّی ١٩٥٠**
* ئیبن خەلەکان- وتار- وەرگێڕانی: عیزەددین فەیزی.
* مەولەوی و شعری موناسەبات- وتار- گۆران.
* الفروق الفردیة- مقال - شفیق صابر.
* البیت والمدرسة- مقال- استیر سعید.
* اثر المدارس الابتدائیة في اعداد الجیل - مقال - عطیة ولیم.

* قریتي - خاطرة- مراد عطاءالله.

**ژمارە(٩) ١٠ی شوبات ١٩٥١**
* في ذکری الراحلة الغالیة - مقال- محمد علي المدرس.
* کلمة في الحفلة التابینیة - نجم الدین صائب (المتصرف).
* کلمة في الحفلة التابینیة - عثمان قوجة.
* تحیة الی جریدة اربیل- کلمة- المحامي محمود الجلبي.
* دمعة ثرة - شعر- احمد مصطفی.
* کلمة في التأبین- یوسف شیخ یحیی.
* هل تعلم - مقال- شکیبة الصراف.
* جەلالەتی مەلیکە- ریپۆرت-
* فەیسەلم - شعر- ئیبراهیم هوشیار.
* چل ڕۆژ -وتار- ناهیدە شێخ سەلام.

**ژ (١٠) ١٧ی شوبات سالّی ١٩٥١**
* نەتەوەی بەکتەکێن - وتار- سەلیم موختار.
* مەولەوی و شیعری موناسەبات- وتار- گۆران.
* قانون الخدمة التعلمیة- مقال- عقلي جوکل بریة.
* ماذا تعرف عن جسمك - مقال - الدکتور مەردان عەلی.

**ژ (١١) ٢٤ شوبات (١٩٥١)**
* نەتەوەی بەکتەکێن- وتار- سەلیم موختار
* خوێندن - شیعر- جەلال شێخ جەمیل.
* حلقة الدراسات الاجتماعیة- مقال- ؟
* فن المطالعة - مقال- لوقا کاکة
* الام - خاطرة - نعیمة صابر.
* الواجب للنفس- مقال- سلیمان داود الطائي.
* الصحة العامة- مقال - بکر جبار.

**ژمارە (١٢) ٣ ئادار - ١٩٥١**
* لۆکە چۆن ئەچێندرێ - وتار- محەمەد ئیسماعیل.
* نەغمەی بەدوم - شیعر - ئیحسان مستەفا محامی.
* پایز - شیعری لامارتین- وەرگێڕانی مارف خەزنەدار.
* حلقة الدراسات الاجتماعیة- مقال-.
* المعلم الصالح - مقال- بسي صابر.

* عبرة على الماضي القريب - شعر - حازم ذنون.

**ژماره(۱۳) ئادار- ۱۹۵۱**

* نەتەوەی یەکتەکێن - وتار - سەلیم موختار.
* مەکتەب - شیعر- ئیبراهیم هۆشیار.
* وتەیەک- خورشید ئیبراهیم ئەمین.
* باوک و دایک - شیعر- فوئاد عیززەت.
* حلقة الدارسات الاجتماعية- مقال-.
* كلمة رئيس فرع جمعية المعلمين في اربيل السيد (عزالدين فيضي). لمناسبة انتخابات الهيئة الادارية.
* كلمة مدير ثانوية اربيل في حفل توزيع الجوائز علي المتفوقين.
* كلمة السيد يوسف شيخ يحيى.
* نداء الواجب- مقال - رفعت عزت سامي.
* انتظار - خاطرة - جمال عطاء الله.

**ژ ( ١٤) ١٧ی ئادار - ١٩٥١**

* هەڵبژاردنی کۆمەڵی مامۆستایان- ریپۆرت.
* ڕۆڵەکانم - شیعر- ناهیدە شێخ سەلام.
* تعليقات على حلقة الدراسات الاجتماعية- مقال- عبدالمجيد حسن.
* انتخابات جمعية المعلمين في اربيل.
* كلمة جميل رشيد العمادي بمناسبة الانتخابات.

**ژ (١٥) ٢٤ی ئادار- ١٩٥١**

* نەتەوەی یەکتەکێن - وتار - سەلیم موختار
* في فضل الكتب وفوائد المطالعة - مقال - لوقا كاكه
* العثور على اثار اسلامية قديمة شاخولان - خبر.

**ژ (١٦)- ٣١ی ئادار ١٩٥١**

* بۆ ڕۆژنامەی هەولێر - وتار- قاهیرە: عەبدولحەمید ئیسماعیل.
* یاری - شیعر - سەدیق یونس (سفین).
* جلسة مصاحبة لجمعية المعلمين في استانبول - مقال
* الرياضة في بلادنا - مقال- المعلمة ماري مالك.
* كلمة الطالبة نجدية سعدالله في حفلة سباق كرة الطائرة.

**ژ (١٧) ٧ی نیسان - ١٩٥١**

* هەڵبژاردنی دەستەی ئیدارەی یانەی هەولێر- ریپۆرت.
* بەهاری ساڵی تازە - شیعر- خالید دلێر.
* رواندز - شیعر- فەرهاد شاکر مجرم.
* هل تشكو الطموح المفرط- مقال - ترجمه احمد مصطفى.
* القرآن ومجد الاسلام - شعر - خالد دلير.

**ژ (١٨) ١٤ی نیسان - ١٩٥٠**

* نەتەوەی یەکتەکێن - وتار- سەلیم موختار.
* کاروان هەر ئەڕوا - وتار- جەمیل سلیمان دزەیی.
* شاری هەولێر- شیعر- مەلا شەریف مەلا ئیبراهیم.
* شۆڕش - شیعر شکسپیر- وەرگێڕانی: مارف خەزنەدار.
* تاریخی حەیاتی شاعیر سەید ئەحمەد کوڕی شێخ عەبدولکەریم بەرزنجی.
* المعلم والمجتمع- مقال.
* يوم التاج - مقال- ابو روناك.
* كيف نعلم طلاب المدارس الابتدائية الرياضيات- مقال عبدلله كاكة.
* ليلة في المقبرة - خاطرة - نورالدين خضر.

**ژ (١٩) ٢١ی نیسان- ١٩٥١**

* یاری - شیعر- ناهیدە شێخ سەلام.
* هەی گوڵ - شیعر - ناهیدە شێخ سەلام.
* هەولێر شاری شیرینم- شیعر - رازیە سابیر عەزیز.
* میللەتە یەکگرتووەکان - وتار - ج. ت.
* قسەی نەستەق - کۆکردنەوەی - ئەنوەر عەزیز دزەیی.
* دعيني - شعر - مهدي خماس البياتي.
* كيف نربي اطفالنا- مقال - حنا عبدالاحد.

**(٢٠) ٢٨ی نیسان - ١٩٥١**

* سکاڵای مانگی چواردە - شیعر - کەمال رەشید عارف دەباغ. سلێمانی.
* ضيف غريب - قصة الكاتب السويدي هاس زيتر ستروم - ترجمة: احمد مصطفى الخطيب.

**ژ (٢١) ٥ی مایس - ١٩٥١**

* قسەکەت بە تەرازوو بکێشە - وتار- وەرگێرانی: یوسف شێخ یەحیا.
* لاواندن - شیعر - ئەسیری
* ماتەمی کچێک - شیعری لاندز- وەرگێرانی: مارف خەزنەدار.
* کۆمەڵی مامۆستایانی لقی سلێمانی.
* المبالغات الشعرية في الادب الفارسي - مقال- ترجمة: احمد مصطفى الخطيب.
* المذكرة الايضاحية لميزانية اللواء المحلية لعام ١٩٥١-١٩٥٢.

**ژ (٢٢) ١٢ی مایس - ١٩٥١**

* نەتەوەی بەکتەکین - وتار - سەلیم موختار.
* لەسەر قەبرەکەت - شیعر- أ. ب. هـ سلێمانی.
* الثقافة في قضاء عقرة - مقال- شاكر فتاح.
* العلم والفضل في دار المعلمين العالية- مقال - عبدالمجيد حسن.
* حمامة الدوح - شعر- محمد الخليل.
* المذكرة الايضاحية لميزانية اللواء المحلية لعام ١٩٥١-١٩٥٢.

**ژ (٢٣) - ١٩ی مایس -١٩٥١**

* یاری و ئیستعرازی قوتابخانەکانی سلێمانی - ریپۆرت - ج- سالح عەلی.
* الثقافة في قضاء عقرة - مقال- شاكر فتاح .
* المكتبة العامة في أربيل. - خبر -

**ژ (٢٤) - ٢٦ی مایس - ١٩٥١**

* نووسینی کوردی بە لاتینی - وتار ج. ت.
* ژیان چییە - وتار- وەرگێرانی فوئاد عیززەت.
* معالي وزير المعارف في مدرسة خلكان- مقال- علي جوكل بريه .
* مشكلات الشباب - مقال - احمد الحبوش.
* مرحبا بوزير المعارف - شعر - محمد الخليل.

**ژ (٢٥) ٢ی حوزەیران- ١٩٥١**

* خانزاد - وتار- وەرگێرانی : فوئاد عیززەت.
* کاتی خۆشی - شیعری بایرۆن - وەرگێرانی: مارف خەزنەدار.
* فرقەی ئەهالی - شیعر- جاهد (لە لایەن مەسعود بێ بەشەوە هاتووە).
* مسائلنا الاجتماعية - مقال- عبدالمجيد حسن.
* عامل الخير كما تحب ان يعاملك - مقال - رفعة عزة سامي.

**ژ (٢٦) ٩ی حوزەیران- ١٩٥١**

* خانزاد - وتار- خەلیل خۆشناو.
* سکاڵای ئای - شیعر- فوئاد عیززەت- هەژار- .
* رۆڵەی شیرینم - وتار- وەرگێرانی: فازڵ شەوکەت.
* مسائلنا الاجتماعية - مقال - عبدالمجيد حسن.
* بيان إلى المعلمين لمناسبة السفر الى سوريا ولبنان ومصر.

**ژ (٢٧) ١٩ی حوزەیران- ١٩٥١**

* خانزاد - وتار- خەلیل خۆشناو.
* مانگی رەمەزان - وتار عیزەددین فەیزی.
* مسائلنا الاجتماعية - مقال- عبدالمجيد حسن.
* كتاب مفتوح الى وزير الداخلية - مقال- المقدم المتقاعد ئەمین بەگ رواندزی .

**ژ (٢٨)- ٢٣ ی حوزەیران - ١٩٥١**

* خانزاد - وتار - خەلیل خۆشناو.
* پیرەمێری شاعیر- وتار - عیزەددین فەیزی.
* شینی خاڵە- شیعر - ئەحۆل.
* کناری - شیعر - بابا شێخ (باتاس).
* سەرچنار - وتار- لە پیرەمێرد وەرگیراوە.
* وفاة پیرەمیرد - مقال- مقتبس من كتاب مشاهير الكرد و كردستان.
* التدين - مقال- پیرەمیرد (ترجمه عبدالمجيد حسن الى العربية).

* الصوم - مقال- عينكاوة: لوقا كاكة.
* طهارة النفس - مقال- علي جوكل برية.

ژ (٢٩) - ٣٠ی حوزەیرانی - ١٩٥١
* خانزاد - وتار- خەلیل خۆشناو.
* چریکەی بولبول - شیعر - فوئاد عیززەت.
* الصائمون والعيد -مقال- علي جوكل برية.
* غريزة حب الظهور والسيطرة عند الاطفال - مقال - حمدية صابر.
* رسالة المعلم - مقال- بطرس مرقص شمعون.

ژ (٣٠) ١٤ تەموز - ١٩٥١
* خانزاد - وتار- خەلیل خۆشناو.
* الريف العراقي بين الواقع والخيال - مقال - علي جوكل برية.
* الافلام السينمائية في تدريس العلوم - مقال- عبدالرحمن محي الدين.

ژ (٣١) - ٢١ی تەمووز - ١٩٥١
* خانزاد - وتار و دەقی بەیتی خانزاد- خەلیل خۆشناو.
* الريف العراقي بين الواقع والخيال - مقال - علي جوكل برية.
* الافلام السينمائية في تدريس العلوم - مقال - عبدالرحمن محي الدين.

ژ (٣٢) - ٢٨ی تەمووز - ١٩٥١
* هەنگ و کەڵکی - وتار - محەمەد جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی.
* بۆ سەر گۆڕی بێکەس - شیعر - ئەخۆڵ.
* شاعیری گەورە سافی - شیعر و وتار- جەلال بەرزنجی.
* مردن - شیعری جبران خەلیل جبران- وەرگێڕانی: فوئاد عیززەت.
* گوڵی ژیان - شیعری ئۆسکار وایڵد - وەرگێڕانی : مارف خەزنەدار.
* لوذات سوار لطمتني - مقال - عبدالمجيد حسن.
* تحية الى اربيل وابناءها الاشاوس- شعر- الشاعر الفلسطيني - كمال الرماوي.
* افسحوا الطريق - مقال - قدرية علي.
* الغلاء و بدلات الايجار - مقال- علي جوكل برية.
* يوم انتصار المصلحين في اربيل - مقال- فؤاد محمد رشيد.

ژ (٣٣)- ٤ ی ئاب - ١٩٥١
* هەنگ و کەڵکی - وتار- م. ج . ڕۆژبەیانی.
* بیرەوەری - شیعری تۆماس مۆر - وەرگێڕانی: مارف خەزنەدار.
* واجب الاباء في تربية الابناء - مقال- لوقا كاكة.
* كيف نتفنن بالاعلان - مقال- طه محى الدين (طالب في كلية التجارة).

ژ (٣٤) ١١ ی ئاب - ١٩٥١
* هەنگ و کەڵکی - وتار- م. ج . ڕۆژبەیانی.
* بەرەو ڕووناکی - وتار- وەرگێڕانی فوئاد عیززەت.
* واجب الاباء في تربية الابناء - مقال - لوقا كاكة.
* فلسفة التعليم في مغزل غاندي - مقال- .
* اعفاء الطلاب الفقراء في المدارس من اثمان الكتب المدرسية.
* الاسرة واثرها في التربية - مقال- حمدية صابر.
* صوت الاديب - خاطرة- پيربال محمود - بابان- .

ژ (٣٥) ١١ ی ئاب - ١٩٥١
* هەنگ و کەڵکی - وتار- م. ج. ڕۆژ بەیانی.
* بۆ خاوەنی بەختیار مودیری معاریفی هەولێر- وتار- عیزەددین فەیزی.
* صاحب المعالي وزير المعارف يتحدث عن مؤتمر اليونسكو .

ژ (٣٦) ٢٥ی ئاب - ١٩٥١
* هەنگ و کەڵکی - وتار- م. ج ڕۆژ بەیانی.
* غەزەلێکی سافی - جەلال بەرزنجی.
* التغيرات التي حدثت علي حياة الاسرة في بلدان الشرق الاوسط- مقال- علي جوكل برية.
* استاذ امريكي يزور اربيل فيمتدح العراق.

* اعداد معلم الريف في تركيا - مقال-
* يذهبون الى المدرسة بالبريد - مقال-

ژ (٣٧) ١ ی ئەیلول - ١٩٥١
* هەنگ و کەڵکی - وتار- م. ج . ڕۆژبەیانی.
* شایی ڕەشبەڵەک - شیعر - ئیبراهیم هوشیار.
* بۆ دایکم - شیعری هینری هاینی- وەرگێڕانی : مارف خەزنەدار.
* التغيرات التي حدثت على حياة الاسرة في بلدان الشرق الاوسط- مقال- علي جوكل برية.
* حاجتنا الى الدين - مقال - جلال سعيد خيلاني.

ژ (٣٨) ٨ی ئەیلول - ١٩٥١
* هەنگ و کەڵکی - وتار- م. ج. ڕۆبەیانی.
* کچە لادێیی- شیعر- فوئاد عیززەت.
* التغيرات التي حدثت على حياة الاسرة في بلدان الشرق الاوسط- مقال- علي جوكل برية.
* المقامرون والمائدة الخضراء - مقال- عبدالله كاكه.

ژ (٣٩) ٢٢ی ئەیلول - ١٩٥١
* هەنگ و کەڵکی - وتار- م. ج. ڕۆژبەیانی.
* دەنگی ڕۆژنامەی هەولێر - وتار- .
* الطلاب في أوقات فراغهم- ع. جوكل برية.

ژ ( ٤٠) ٢٩ ی - ئەیلول - ١٩٥١
* ئاکرێ بام بکرێ بە هاوینە هەوار - وتار - شاکر فتاح.
* الطلاب في أوقات فراغهم- ع. جوكل برية..

ژ (٤٢) ٢ی تشرینی یەکەم - ١٩٥١
* کردنەوەی قوتابخانەی ئێواران - هەواڵ-
* چاودێری و ئامۆژگاری بۆ تۆ چێنەرەکانی پەتاتە - وتار- جەمال محێدین.
* کە من دێوانەیی تۆ بم - شیعر- ئیبراهیم هوشیار.
* الكلمة الاخيرة - مقال- علي جوكل برية.

ژ (٤٣) - ٢٠ی تشرینی یەکەم - ١٩٥١
* کۆشی دایک- وتار- کەمال ڕەشید دەباغ.
* ئامۆژگاری بۆ پەمۆ چاندن - وتار- مستەفا تۆفیق.
* مەرگی جەمیل صائب (کاکینە)- هەواڵ-
* على اموالهم موكلون - مقال- ع. جوكل برية.

ژ (٥٤) ٥٠ کانوونی دووەم - ١٩٥١
* ئەلف و بێی کوردی - وتار- ئیبراهیم باڵدار.
* وتەی ژیران- کۆکردنەوە و وەرگێڕانی - زەکی ئەحمەد هەناری.
* موشکیلەی وەستا جەعفەر - چیرۆک - ئیحسان مستەفا محامی.
* ڕۆمیۆ و جولێت - شکسپیر - وەرگێڕانی: مارف خەزنەدار.
* التعاون - مقال - عبدالمجيد حسن.

ژ (٥٥) ١٢ی کانوونی دووەم - ١٩٥١
* مێژووی هەولێر - مێژوو- گیوی موکریانی.
* چوارینی خەیام - شیعر - گۆڕینی: زەکی ئەحمەد هەناری.
* هەڵبەستێکی سافی هیرانی.
* هەندێ لە وتەکانی جبران خەلیل جبران- وەرگێڕانی: پیربال مەحموود.
* عمر الخيام بين الحقيقة والاسطورة - مقال - احمد مصطفى الخطيب.

ژ (٥٦) - ١٩ کانوونی دووەم - ١٩٥٢
* مێژووی هەولێر- مێژوو - گیو موکریانی.
* ڕۆمیۆ و جولێت - شکسبیر - وەرگێڕانی: مارف خەزنەدار.
* بۆ چ پێویستە نیشتمانمان خۆش بوێ - وتار- خالید دلێر.
* کۆمەڵی کۆمەک - وتار- وەرگێڕانی: زەکی ئەحمەد هەناری.
* الكبت وأثره في النفس والجسم - مقال- الدكتور محمد سعيد البكري.
* تشكيل فرقة كرة القدم لجمعية المعلمين.

**ژ (٥٧) ٢٩ کانوونی دووەم - ١٩٥٢**
* تخطيط المدن والتصميم العام لمدينة اربيل - مقال - عبدالوهاب حسن (کوردییەکەی نەما بوو).

**ژ (٥٨) ٢ شوبات ١٩٥٢**
* مێژووی هەولێر - مێژوو - گیوی موکریانی .
* جوختێن و خوێن - چیرۆک - ئیحسان مستەفا مەحامی.
* کومەڵی کۆمەک - وتار - وەرگێرانی : زەکی ئەحمەد هەناری.
* الصحة العامة في اربيل والسل - مقال - الدكتور مردان علي.
* كافحوا معنا السل- مقال - الدكتور محمد سعيد البكري.

**ژ (٥٩) - شوبات - ١٩٥٢**
* مێژووی هەولێر - مێژوو - گیوی موکریانی.
* کومەڵی کۆمەک - وتار - وەرگێرانی: زەکی ئەحمەد هەناری.
* ناوی تیپی کومەڵی مامۆستایان.
* تیپی ئەهالی.
* عدوى الامراض من الحيوان الى الانسان - مقال - الدكتور عيسى فهمي.
* التعليم الاجباري في العراق - مقال مترجم - عصمت كتاني.

**ژماره ٦٠**
**ژ (٦١) ٤ - ئادار - ١٩٥١**
* مێژووی هەولێر - مێژوو - گیوی موکریانی.
* رومیۆ و جولیێت - شکسپیر - وەرگێرانی: مارف خەزنەدار.
* کومەڵی کۆمەک - وتار- وەرگێرانی : زەکی ئەحمەد هەناری.
* راوە کەو - شیعر- خادم.
* ضرورة انشاء البنايات على اسس هندسية حديثة - مقال - كمال حسين.

* تعقيب على مقال - عبدالله كاكة.

**ژ (٦٢) - ١١ - ئادار - ١٩٥٢**
* مێژووی هەولێر - مێژوو - گیوی موکریانی.
* خوێندەوار - وتار - ص.
* چوار فەسڵی ساڵ - شیعر - زەکی ئەحمەد هەناری.
* گوڵی ژیان - پەخشان - پیرباڵ مەحموود.
* الانتخابات السنوية لفرع جمعية المعلمين.

**ژ (٦٣) - ١٨ - ئادار - ١٩٥٢**
* مێژووی هەولێر - مێژوو - گیوی موکریانی.
* پێوەند - چیرۆک - وەرگێرانی: ز.غ - کۆیە-.
* زستانی لادێ - شیعر - فوئاد عیززەت.
* یاری لە نێوانی قوتابیانی سلێمانی و هەولێر - هەواڵ-
* بۆ قوتابیانی سلێمانی - وتار- یەحیا خضر- مەرجان.
* جمعية المعلمين وتعديل قانون الخدمة التعليمية.

**ژ (٦٤) - ٢٥ - ئادار - ١٩٥٢**
* مێژووی هەولێر - مێژوو - گیوی موکریانی
* بوێژو نووسەر - وتار - مارف خەزنەدار.
* گەرانی نەخۆشی لە حەیوانەوە بۆ ئینسان - وتار - وەرگێرانی: مارف خەزنەدار.
* ابن سینا - وتار - وەرگێرانی: ؟
* رومیۆ و جولیێت - شکسپیر - وەرگێرانی : مارف خەزنەدار.
* الشيخ الرئيس ابوعلي ابن سينا - مقال - .
* ذكرى شاعر العراق معروف الرصافي - مقال.

**ژ (٦٥) ١ - نیسان - ١٩٥٢**
* مێژووی هەولێر - مێژوو - گیوی موکریانی.
* نەورۆز - شیعر - بەنگینە.
* کابەی وەسڵی شیعر - خادم.
* گەرانی نەخۆشی لە حەیوانەوە بۆ ئینسان - وتار - وەرگێرانی: مارف خەزنەدار.
* نیشانگەی فرشتە لە هەولێر - وتار - مارف خەزنەدار.
* حاجتنا الى التعليم المهني - مقال - .
* التعليم الاجباري في العراق - مقال مترجم - عصمت

کتاني.
* من الادب الكردي الحديث - شعر مقتبس من جريدة المثال الموصلية.

**ژ (٦٦) ٨ - نیسان - ١٩٥٢.**
* مێژووی هەولێر - مێژوو - گیوی موکریانی.
* گەڕانی نەخۆشی لە حەیوانەوە بۆ ئینسان - وتار - وەرگێڕانی : مارف خەزنەدار.
* نیشانگەی فرشتە لە هەولێر - وتار مارف خەزنەدار.
* المدح في الشعر العربي - مقال-

**٦٧-٦٨**
**ژ (٦٩) ٢٩- نیسان ١٩٥٢**
* مێژووی هەولێر - گیۆ موکریانی.
* گەڕانی نەخۆشی لە حەیوانەوە بۆ ئینسان- وتار- وەرگێڕانی: مارف خەزنەدار.
* کوێرە - چیرۆک - ئیحسان مستەفا مەحامی.
* الزواج والحياة الزوجية -مقال - عبدالمجيد حسن.
* اثر البرامكة في المجتمع العباسي - مقال - پیربال مەحمود- بابان.
* المسابقة الخطابية والشعرية- مقال - پیربال مەحموود- بابان.

**ژ (٧٤) ٣ - حوزەیران - ١٩٥٢**
* مێژووی هەولێر - مێژوو - گیوی موکریانی.
* ئایا ئەزانیت - کۆکردنەوەی - محەمەد رەشید بەحری (پێنجوین).
* ڕۆمیۆ و جوولێت- شکسپیر- وەرگێڕانی: مارف خەزنەدار.
* گوڵێکی ژاکاو - شیعر - ب.
* بووکە شووشەی دەستی شەیتان - چیرۆک وەرگێڕانی: لەتیف خەزنەدار.
* گەنج و ڕێگای لە ژیاندا - وتار - وەرگێڕانی: جەمال محێدین.
* الكآبة النفسية - مقال - نافع دباغ.
* الوصف في شعر ابن المعتز - مقال- نافع دباغ.

**ژ (٧٥) ١٠- حوزەیران - ١٩٥٢**
* مێژووی هەولێر- مێژوو- گیوی موکریانی.
* ژن و پیاو - وتار- جەمال خەزنەدار.
* بووکە شووشەی دەستی شەیتان- چیرۆک وەرگێڕان: لەتیف خەزنەدار.
* ڕۆمیۆ و جوولێت - شکسپیر- وەرگێڕانی: مارف خەزنەدار.
* الادب الكردي - مقال- معروف خزنەدار.
* نظرة خاطفة في الادب الكردي - مقال- انور مائي.

**ژ (٧٦) ١٧- حوزەیران -١٩٥٢**
* مێژووی هەولێر - مێژوو - گیوی موکریانی.
* مەلا پیرۆتی جادووکەر- چیرۆک - ئیحسان مستەفا مەحامی.
* ژن هێنان - وتار- وەرگێڕانی: زەکی ئەحمەد هەناری.

**ژ (٧٩) ١٥- تەمووز - ١٩٥٢**
* مێژووی هەولێر - مێژوو- گیوی موکریانی.
* وەرام - وتار- گیوی موکریانی.
* جەژنی شەقڵاوە - وتار- عیزەددین فەیزی.
* الادب الكردي - مقال - معروف خەزنەدار.
* نظرية التطور - مقال مترجم- وريا رواندزي.

**ژ (٨٠) ٢١ - تەمووز- ١٩٥٢**
* مێژووی هەولێر- مێژوو- گیوی موکریانی.
* کێ ڕۆ - وتار- ج. ڕۆژبەیانی.
* مەدحی کانی- شیعر - مەلا مەحموودی بێخود.
* پەریی شیعر- شیعری ڤیکتۆر هۆگۆ- وەرگێڕانی: مارف خەزنەدار.
* کێلەشین- مقال - محەمەد عەلی کوردی.
* التعليم الريفي واهدافه - مقال-.
* نظرية التطور- مقال مترجم- وريا رواندزي.

**ژ (٨١) ٢٩- تەمووزی -١٩٥٢**
* مێژووی هەولێر- مێژوو - گیوی موکریانی.

* بۆ میرم کاکە گیوی بەڕێز- وتار محەمەد عەلی کوردی.
* ژن هێنان - وتار- محەمەد ڕەشید.
* لمحات في الفنون - مقال - حسيب رسول ناجي.
* کێلەشێن -مقال- محەمەد عەلی کوردی.
* الادب الكردي- مقال - معروف خزنەدار.
* تفنيد نظرية التطور- مقال مقتبس- محمد رشاد المفتي.

ژ (٨٢) ٥ - ئاب - ١٩٥٢
* مێژووی هەولێر - مێژوو - گیوی موکریانی.
* گەشتێک بۆ کۆیسنجق - وتار- مارف خەزنەدار.
* گوناهی مێردی نەزان و باوکی دڵڕەق -وتار- کەمال شاکر مەحموود.
* بابا طاهر الهمداني - مقال- معروف خەزنەدار.
* تفنيد نظرية التطور - مقال مقتبس- محمد رشاد المفتي.

ژ (٨٣) ١٢ - ئاب - ١٩٥٢
* مێرووژی هەولێر- مێژوو - گیوی موکریانی.
* گورگە - وتاری کشتسازی- تاهیر ئیسماعیل.
* گەشتێک بۆ کۆیسنجاق- وتار - مارف خەزنەدار.
* جواب مستظرف- قصة - لوقا کاکة.
* علي الترموكي - مقال- معروف خەزنەدار.
* تفنيد نظرية التطور - مقال مقتبس- محمد رشاد المفتي.

ژ (٨٤) ١٩ - ئاب- ١٩٥٢
* مێژووی هەولێر - مێژوو - گیوی موکریانی.
* ژن و ژیان - وتار- وەرگێڕانی: محەمەد عەلی کوردی.
* دیسان مەرگ - وتار - ج. ڕۆژ بەیانی.
* جواب مستظرف - تتمة قصة - لوقا کاکە.
* کێلەشێن - مقال - محەمەد عەلی کوردی.
* احمد خانی- مقال- معروف خەزنەدار.
* تأييد نظرية التطور دينيا وعلميا- مقال - ن.م.

ژ (٨٥)٢٦ - ئاب- ١٩٥٢
* مێژووی هەولێر - مێژوو- گیوی موکریانی.
* هاوینە هەوارانی عیراق - وتار - خەلیل خۆشناو.
* ناچار دزم - وتار- زەکی ئەحمەد هەناری.
* الكذب في الاسلام- مقال- جلال سعيد خيلاني.
* جواب مستظرف- تتمة قصة - لوقا کاکە.
* ئەحمەدی جزیری - مقال- معروف خەزنەدار.

ژ (٨٦) ٩- ئەیلوول - ١٩٥٢
* مێژووی هەولێر- مێژوو - گیوی موکریانی.
* غەزەلێکی هەوایی - شیعر-
* کۆستی گەورە -شیعر- ص. ی . (هەولێر).
* هاوینە هەوارانی عیراق- وتار- خەلیل خۆشناو.
* سەگ و ئەسپ- چیرۆکی زاویج- وەرگێڕانی: محەمەد عەلی کوردی.
* استعمال السلايدات في التعليم- مقال-
* مولانا خالد النقشبندي - مقال - معروف خەزنەدار.

ژ (٨٧) ١٦- ئەیلوول - ١٩٥٢
* مێژووی هەولێر- مێژوو - گیوی موکریانی.
* شوو بە کوێر ناکا - چیرۆکی زاویج - وەرگێڕانی محەمەد عەلی کوردی.
* بخوێنە- شیعر- مارف خەزنەدار.
* مولوی- مقال - معروف خەزنەدار.
* التربية الاساسية لحياة ارقى -مقال-.
* الامانة في العلم - مقال- محمد رشاد المفتي.

ژ (٨٨) ٢٣ - ئەیلوول- ١٩٥٢
* مێژووی هەولێر- مێژوو- گیوی موکریانی.
* وەکو پێک گەیشتین- پەخشان- محەمەد شێخ ڕەشید.
* حذار المحتالين- مقال- .
* الفيتامينات - مقال- وريا امين رواندزي.
* الحاج قادر الكويي -مقال- معروف خەزنەدار.
* النقد العلمي على التطور- مقال- نجم الدين المفتي.

ژ (٨٩) ٣٠- ئەیلوول - ١٩٥٢
* مێژووی هەولێر- مێژوو- گیوی موکریانی.
* خاوەر زەمین- حیکایەتی فۆلکلۆری - زەکی ئەحمەد

هەناری.
* الفیتامینات - مقال- وریا امین رواندزی.
* هجرة الرسول الاعظم- مقال محمد رشاد المفتي.
* الحاج قادر الكويي- مقال- معروف خەزنەدار.

ژ (٩٠) ٧- تشرینی یەکەم - ١٩٥٢
* مێژووی هەولێر - مێژوو- گیوی موکریانی.
* شەقلاوە- وتار- خەلیل خۆشناو.
* دۆست - شیعر- زەکی ئەحمەد هەناری.
* جبال رانیة وسهولها ومیاهها- مقال - محمد علي كوردي.
* میهرەبان خاتوون- مقال- معروف خەزنەدار.

ژ (٩١) - تشرینی یەکەم- ١٩٥٢
* مێژووی هەولێر- مێژوو- گیوی موکریانی.
* نامەیەک بۆ ئێستگەی بەغدا- مستەفا عەزیز ئاغا.
* هل الشعوب الشرقیة شبت عن الطوق- مقال حسین عزیز رەشوانی.
* الادب الكردي الحدیث- مقال - معروف خەزنەدار.

ژ ( ٩٢) ٢١- تشرینی یەکەم - ١٩٥٢
* مێژووی هەولێر- مێژوو- گیوی موکریانی.
* زانستی گیا و گۆڵ - وتار - جەمال محێدین.
* الفیتامینات - مقال- وریا امین رواندزی.
* جبال رانیه - مقال - محمد علی کوردی.
* بدري والسحاب- شعر - سلیمان الطائي.
* الادب الكردي الحدیث- مقال - معروف خەزنەدار.

ژ (٩٣) ٢٨- تشرینی یەکەم - ١٩٥٢
* مێژووی هەولێر- مێژوو- گیوی موکریانی.
* بەغیل- حیکایەت- محەمەد عەلی کوردی.
* لە پێناوی راستیدا- پەخشان.
* ئەی مامۆستای بەرز - وتار- هاوار (سلێمانی).
* الفیتامینات - مقال - وریا امین رواندزی.
* اقوی برنامج لتعلیم التعمیم -مقال - حسین رەشوانی.

* الشخصیة - مقال نفسي-
* الادب الكردي الحدیث- مقال - معروف خەزنەدار.

ژ (٩٤) ٤- تشرینی دووەم ١٩٥٢
* مێژووی هەولێر- مێژوو - گیوی موکریانی.
* غەزەلێک - شێخ جەلالی شێخ جەمیل.
* بەغیل- حیکایەت- محەمەد عەلی کوردی.
* لە پێناوی دڵپاکیا - پەخشان- مارف خەزنەدار.
* اقوی برنامج لتعمیم التعلیم- مقال- حسین رەشوانی.
* الشخصیة- مقال نفسي.
* تشطیر ابیات لابن الرومي في العتاب - شعر- عبدالسلام حلمي.
* الادب الكردي الحدیث - مقال- معروف خەزنەدار.

ژ (٩٥) ١١ تشرینی دووەم - ١٩٥٢
* المعلومات الدینیة في المدارس - مقال - حازم ئەحمەد.
* الفیتامینات - مقال- وریا امین رواندزی.
* الشخصیة- مقال نفسي.
* الادب الكردي الحدیث- مقال معروف خەزنەدار.
* (کوردییەکەم بەرچاو نەکەوت).

ژ (٩٦) ١٨ - تشرینی دووەم - ١٩٥٢
* مێژووی هەولێر- مێژوو - گیوی موکریانی.
* دیمەنی سەرچاوەیەکی بەهار - شعر- محەمەد فەرەج شارەزووری.
* خۆ رزگارکردن لە درۆ - وتار- ج - کلۆڵ.
* اقوی برنامج لتعمیم التعلیم - مقال - حسین رەشوانی.
* الفیتامینات - مقال- وریا امین رواندزی.
* حول قانون الخدمة التعلمیة - مقال-
* النفوس المریضة - مقال- الدكتور خضر فندقلي.
* الادب الكردي الحدیث- مقال - معروف خەزنەدار.

ژ (٩٧) ٢٥ تشرینی دووەم ١٩٥٢
* مێژووی هەولێر - مێژوو - گیوی موکریانی.
* وەزیر - حیکایەت - محەمەد عەلی کوردی.
* ساڵی رۆژنامەی هەولێر.
* الفیتامینات - مقال - وریا امین رواندزی.

* أقوى برنامج لتعميم التعليم- مقال- حسين رەشواني.
* الثقافة - مقال - ابراهيم محمد.
* اهمية تدريس الدين في المدارس - مقال-.
* پیرەمیرد - مقال- معروف خەزنەدار.

**ژ (٩٨) ٢ كانوونی یەكەم- ١٩٥٢**
* مێژووی هەولێر- مێژوو- گیوی موكریانی.
* بیرەوەری بوونی محەممەد - وتار- یوسف شێخ یەحیا .
* بۆ سیلیا- شیعری بین جۆنسن- وەرگێرانی: مارف خەزنەدار.
* پیرەمێرد- مقال معروف خەزنەدار.
* فيتامينات- مقال - وريا امين رواندزي.
* الشخصية - مقال نفسي-
* الدين والخلود- مقال - حسين رەشواني.

**ژ (٩٩) ٩ كانوونی یەكەم - ١٩٥٢**
* مێژووی هەولێر - مێژوو - گیوی موكریانی.
* رگەی خۆی بەدڵ - شیعر لە كلیلە و دمنە وەرگێرانی: زەكی ئەحمەد هەناری.
* أقوى برنامج لتعميم التعليم - مقال - حسين رەشواني.
* الشخصية - مقال نفسي-.
* تعليم المرأة - مقال - بكر جبار.
* استفتاء عام حول جريدة اربيل.
* پیرەمێرد- مقال - معروف خەزنەدار.

**ژ (١٠٠) ٢٠ - كانوونی دووەم- ١٩٥٣**
* ڕۆژنامەی هەولێر- وتار- محەممەد شێخ ڕەشید.
* كەم دوای زۆر ئەكەوێ - وتار- زەكی ئەحمەد هەناری.
* ڕۆژنامەی هەولێر- شیعر- ئیبراهیم هۆشیار.
* ساڵی سێیەم- وتار-
* عدد خاص بمناسبة العام الجديد للجريدة - مقال - حسين رەشواني.

**ژ (١٠٣) ٢٠ی كانوونی دووەم - ١٩٥٣**
* شارەزای شەقلاوەیە - وتار- خەلیل خۆشناو.
* دیسان خۆیان رزگار كرد - حیكایەتێک.
* جوغرافیەی ئێران - شیعر - كەریم مستەفا حەویزی.

* دڵبەر و دڵداری - حیكایەت- زەكی ئەحمەد هەناری.
* حق المعلم ايضا - مقال - حيدر عثمان.
* تعليق وايضاح - مقال- معروف خەزنەدار.
* النور نثر طليق- علي جوكل برية.

**ژ (١٠٤) ٢٧- كانوونی دووەم - ١٩٥٣**
* گەر ولاتت خۆش ئەوێ - وتار- خەلیل خۆشناو.
* تەجویدی قورئان - شیعر- بورهان جاهید.
* بیری سەربەست - وتار- ن. ل.
* دڵبەر و دڵداری - حیكایەت - زەكی ئەحمەد هەناری.
* الشخصية- مقال نفسي.
* خطوة مباركة - مقال - صالح الكرخي.
* متى ينصف المعلم- مقال- علي جوكل.

**ژ (١٠٥) ٣ - شوبات ١٩٥٣**
* كەس ناوی موستەخدەم ناهێنێ - وتار- فوئاد عیززەت.
* دڵبەر و دڵداری - حیكایەت - زەكی ئەحمەد هەناری.
* پەشیمانی پارە ناكا - وتاری چیرۆک ئامێز- مارف خەزنەدار.
* الشخصية- مقال نفسي.
* خزى لايستساغ - مقال-
* النور - نثر طليق- علي جوكل.

**ژ (١٠٦) ١٠ شوبات - ١٩٥٣**
* دڵبەر و دڵداری - حیكایەت - زەكی ئەحمەد هەناری.
* سوپاس بۆ ڕۆژنامەی هەولێر - شیعر - خادم.
* حول تعديل قانون الخدمة التعليمية- مقال.
* المعلم القروي - مقال- عبدالكريم علي القاضي.
* النور - نثر طليق- علي جوكل.

**ژ (١٠٧) ٢٤ - شوبات - ١٩٥٣**
* دڵبەر و دڵداری - حیكایەت- زەكی ئەحمەد هەناری.
* ڕۆژی خۆراک - وتار- زاهیر ئەحمەد هەناری.
* هاوڕێ -وتار- وەرگێرانی: محەممەد شێخ ڕەشید.
* تعقيب على كلمة- مقال - كمال شاكر محمود.
* الشخصية- مقال نفسي- .
* التسول جريمة اجتماعية- مقال- حازم الحمداني.

* النور - نثر طيلق- علي جوكل.

ژ (١٠٨) ٢٤- شوبات - ١٩٥٣

* زانسی گشت لایی - وتار- ز. هـ .
* دڵبەر و دڵداری - حیکایەت- زەکی ئەحمەد هەناری.
* نەخۆشیی گەنم - وتار- مستەفا تۆفیق.
* كلمة لا ينقصها الصراحة والاخلاص- مقال - حسين رەشوانی.
* وەفایی - مقال - معروف خەزنەدار.
* النور - نثر طليق- علي جوكل.

ژ (١٠٩) ١ - ئادار- ١٩٥٣

* دڵبەر و دڵداری - حیکایەت - زەکی ئەحمەد هەناری.
* شەرمە و ناشرین - .
* معلم - شیعر- کەریم مستەفا حەوێزی.
* سخط وقلق قانون الخدمة التعليمية- مقال - حازم الحمداني.
* اذا كان الكلام من فضة - مقال - خ .ر. ن.
* وەفایی - مقال - معروف خەزنەدار.
* النور - نثر طليق- علي جوكل.
* الامل الذاوي - شيعر - پيربال محمود.

ژ (١١٠) ١٠ - ئادار- ١٩٥٣

* بەرتیل - نمایش نامە- هـ.
* دڵبەر و دڵداری- حیکایەت - زەکی ئەحمەد هەناری.
* اربيل واْهلها - مقال.
* حياة جديدة- مقال - صلاح الدين حمدي.
* النور - نثر طليق- علي جوكل.

ژ (١١١) ١٧- ئادار - ١٩٥٣

* دڵبەر و دڵداری - حیکایەت - زەکی ئەحمەد هەناری.
* با پێکەنین - کۆکردنەوەی - ژ.
* چاندنی تۆوی کەتان - وتار- مستەفا تۆفیق.
* التبصر في الكلام - مقال لوقا كاكة
* العصا في التربية- مقال - هێوی امین رواندزی.

ژ (١١٢) ٢٤- ئادار ١٩٥٣

* دەستەی کۆمەڵەی نوێی مامۆستایان.
* دڵبەر و دڵداری - حیکایەت - زەکی ئەحمەد هەناری.
* هاتی - شیعر - فوئاد عیززەت.
* التبصر في الكلام- مقال- لوقا كاكة.

ژ (١١٣) ٣١- ئادار ١٩٥٣

* هەندرێن بە زستان - وتار - ص. ی.
* اربيل واهلها- مقال - حسين رەشوانی.
* النور - نثر طليق- علي جوكل.

ژ (١١٥) ١٥ - نیسان- ١٩٥٣

* زانسی گشت لایی - پەخشان - ژ.
* کۆیە و رێگای - وتار-
* التربية الخاطئة اساس الفشل- مقال- حازم الحمداني.
* اربيل واهلها - مقال- حسين رەشوانی.

ژ (١١٦) ١٢ - نیسان - ١٩٥٣

* گەنجایەتی - پەخشان - جەمال محێدین.
* لۆمەت ناکەم- چیرۆک - فوئاد عیززەت.
* الطبيعة - مقال-
* الرشواني واربيل واهلها- مقال - عبدالحكيم القاضي.

ژ (١١٧) ٢٨ - نیسان - ١٩٥٣

* دەستووری سەرکەوتن - وتار-
* کاری بێ کەڵک - وتار- زەکی ئەحمەد هەناری.
* التعليم في الهواء الطلق - مقال.
* التعليم العصري - مقال- ظاهر احمد هەناری.
* عيد التاج - شعر - محمد رشاد المفتي.
* الرشواني واربيل واهلها - مقال-.
* لحظات مع الاستاذ الرشواني - مقال - حازم الحمداني.

ژ (١١٨) ٥ - مایس - ١٩٥٣

* یەکێتی هێز - نمایشنامە- زەکی ئەحمەد هەناری.
* پادشای عیراق- شیعر- ئەحمەد شوکری.
* دەستوری سەرکەوتن- وتار- ژ.

* فرصة الشعب - مقال- سعدالدين ئيبراهيم اديب.
* التعليم العصري - مقال- ظاهر احمد هەناری.
* عودة اربيل واهلها- مقال - حسين رەشوانی.

**ژ (١١٩) ١٢- مايس - ١٩٥٣**

* دەستوری سەرکەوتن - وتار- ژ.
* پیشانگە - وتاری هونەری - زەکی ئەحمەد هەناری.
* نەخۆشی ژەنگ لە گەنم و جۆدا - وتار- مستەفا تۆفیق.
* جوغرافیەی فرەنسا - شیعر - کەریم مستەفا حەویزی.
* صيحة الحق- مقال- حازم الحمدانی.
* يا ربيع - شيعر - صلاح الدين حمدی.
* اربيل واهلها- مقال - حسين رەشوانی.

**ژ (١٢٠) ٢٨ مايس - ١٩٥٣**

* پێشکەوتنی زراعەت و فەلاحەت - وتار- مستەفا تۆفیق.
* دەردەسەری سەری مانگ - شیعر - نەریمان.
* دەردەسەری شاپێک - حیکایەتی فارس - وەرگێرانی: زەکی ئەحمەد هەناری.
* التعليم العصري - مقال - ظاهر احمد هەناری.
* سياسة التربية في العراق - مقال.

**ژ (١٢٢) ٢ حوزەیران - ١٩٥٣**

* المصائف - مقال - محمد الشيخ رشيد.
* الادب العربي بين القديم والحديث -مقال- سعدالدين ابراهيم أديب.
* السينما والاخلاق - مقال - لوقا كاكة
* التعليم في مدارسنا - مقال - صلاح الدين محمد العابد.
* حب - شعر- معروف خەزنەدار.
* (کوردییەکەم بەرچاو نەکەوت! .

**ژ (١٢٣) ٩ حوزەیران - ١٩٥٣**

* المصايف - مقال - محمد الشيخ رشيد .
* العيد - مقال - حازم الحمدانی.
* الرجل العصري - مقال ظاهر احمد هەناری.
* قيمة العلم - مقال مقتبس-
* الادب العربي بين القديم والحديث - مقال - سعدالدين ابراهيم يوسف.
* ( کوردییەکەم بەرچاو نەکەوت) .

**١٢٤**

**ژ (١٢٥) ١ تەمووز - ١٩٥٣**

* ڕۆژنامەی هەولێر- وتار - عیزەددین فەیزی.
* هیران - وتار- خەلیل خۆشناو.
* هەموو مامۆستایەک چی بزانێ - وتاری تەندروستی د. ب. مەریوانی.
* (عەرەبییەکەی بەرچاوم نەوکەت)

**ژ (١٢٦) ٧ تەمووز - ١٩٥٣ .**

* وقفة على هامات جبال كردستان - شعر پیرباڵ مەحموود.
* نفس حائرة - مقال-
* من مراة الحياة - مقال - حسين رەشوانی.
* ( کوردییەکەم بەرچاو نەکەوت).

**ژ (١٢٧) ١ - تشرینی یەکەم - ١٩٥٣**

* قەڵەم بەدەست دوژمنەوە- حیکایەت - زەکی ئەحمەد هەناری.
* بۆ مامۆستایان - وتار- عیزەددین فەیزی.
* من الدين - مقال- .
* ماذا اعددتم لها - مقال- حسین رەشوانی.
* ما سجله التأريخ عن الكرد - مقال - علي مظفر.

**ژ (١٢٨) ٢٢ی تشرینی یەکەم- ١٩٥٣**

* بەرنامەی قوتابخانەکانی ئیبتدائی -وتار- عیزەددین فەیزی.
* شالوور و گوڵ - شیعر- خەلیل خۆشناو.
* ضمير الشعب- مقال- لوقا كاكە.
* صيانة الغابات - مقال- الدكتور حسن كتاني.
* من الدين ايضا- مقال- ابراهيم عمر.

**ژ (١٣٠) ٢٢ - تشرینی یەکەم - ١٩٥٣**

* خاوەن کچ لە خوا بترسن- وتار- ژ .
* لە بابەت دینەوە - وتار- مەلا عەبدوڵلا باداوەیی.
* صیانة الغابات - مقال- الدکتور حسن کتاني.
* تحیة الملك - شعر - احمد مصطفی الخطیب.
* لا خلاف لولا الغرض - مقال - التحریر.

**ژ (١٣١) ٢٩- تشرینی یەکەم ١٩٥٣**
* چوارینەکانی خەیام- شیعر- زەکی ئەحمەد هەناری.
* خانمەکەم ژنێکی باش بە -وتار- ژ.
* دەستــەسـرێکی خـوێناوی - چیـرۆک - حـەبیب عەبدولفەتاح.
* بین الراعي والرعیه- مقال.
* الحیاة علمتني - مقال- حازم الحمداني.
* صیانة الغابات - مقال- الدکتور حسن کتاني.
* خواطر اجتماعیة- خاطرة - عبدالحمید اسماعیل.

**ژ (١٣٢) ٥- تشرینی دووەم - ١٩٥٣**
* فیڵبازی هەر ئاشکرا دەبێت- حیکایەت- ح.ب.
* لەسەرخۆیی و فەرامۆشی- وتاری تەرجەمەکراو.
* ئافرەت بۆچی خراپ دەبێ- وتار.
* چوارینەکانی خەیام"شیعر"زەکی ئەحمەد هەناری.
* تأملاتي عن الحیاة - مفاجاة - عبدالله عبدالقادر
* مدارس الریف العراقي- مقال-.
* شعر- خیرالدین الزرکلي.

**ژمارە ١٣٣-١٢تشرینی دووەمی ١٩٥٣.**
* فێڵبازی هەر ئاشکرا ئەبێت- حیکایەت- ح.ب.
* امال تنتعش - مقال-
* ایها الدینار- مقال- حازم الحمداني.
* المشاکل البیتیة - مقال- عبدالله کاکة.
* ایهم تعنین- قصة مترجمة- ظاهر احمد هەناري.

**١٣٤**

**ژ (١٣٥) ٣٠ - تشرینی دووەم - ١٩٥٣**
* وتەی مامۆستا عەبدولوەهاب حەسەن.
* وتەی مامۆستا یوسف شێخ یەحیا.
* اللقلق والعصفور - حیکایة- عبدالله عبدالقادر.
* جمال الذکری- مقال - حسین رەشواني.

**ژ (١٣٦) ٣٠- تشرینی دووەم - ١٩٥٣**
* هاواری رانیە- شیعر - محەمەد عەلی کوردی.
* قەسابی لوڕ - حیکایەت- زەکی ئەحمەد هەناری.
* تأملاتي عن الحیاة - مناجاة -عبدالله عبدالقادر.
* الاسبـاب المؤدیة الی الخلاف الزوجي- مقـال - عـادل صالح مختار.
* البضاعة الرخیصة - مقال- حسین رەشواني.

**ژ (١٣٧) ٧- کانوونی یەکەم - ١٩٥٣**
* چۆن دەوڵەمەند ئەبین - وتار- ژ.
* قەسابی لوڕ - حیکایەت- زەکی ئەحمەد هەناری.
* الاسبـاب المؤدیة الی الخلاف الزوجي - مقـال- عـادل صالح مختار.
* لعنة اربیل - مقال- حسین رەشواني.

**ژ (١٤٠) ٢٨ - کانوونی یەکەم - ١٩٥٣**
* رۆژنامەی هەولێر- وتار- عیزەددین فەیزی.
* مەلای مەزبوورە - کۆکردنەوە- ژ.
* چیرۆکی بچووک بۆ پێکەنین- وتار- عیزەددین فەیزی.
* (تەنیا کوردییەکەم بەرچاو کەوت).

**ناو**

لە پێناو یادکردنەوەی بەشێکی هەرە گەورە و دیاری، ناوی ئەو خامە بەدەستـانەی کە بە خـامـەی بە برشـتـیـان بەشداربیان لە دەرچوون و بەردەوامبوونی ئەم رۆژنامەیەدا- کـەم تا زۆر- کـردووە بۆ ئەوەی هەڵوێسـتـیـان فـەرامـۆش نەکـرێت بە تایبـەتی دیارەکـان و دڵئـاواز و نووسـەرە راستـەقـینەکـان- وام بە پێـویست زانی بە زنجیـرەو بەپێی گرینگی و بایەخیان، هەر لەم سووکە راپۆرتەدا - بە کوردی و عـەرەبی - وەک شـاباشـێک بۆ قـەڵەمـەکـانیـان ناویان تۆمـار بکەم. لاشم وایە ئێـمـە کـەوتینە زەمـانێـک کـە وەفاداری و ئەمەک، زۆر کەم بووە، یا هەر نەماوە و بنەبڕ کراوە:

عیزەددین فەیزی - گیوی موکریانی- مارف خەزنەدار- زەکی ئەحمەد هەناری- عەلی جوکل بریە - فوئاد عیزەت -خەلیل خۆشناو- ئەحمەد مستەفا ئەلخەتیب- عەبدولمەجید حەسەن- حوسێن ڕەشوانی - محەمەد عەلی کوردی- ئیحسان مستەفا مەحامی- عەبدوڵڵا گۆران - یوسف شێخ یەحیا- حەیدەر عوسمان- جەمیل ڕۆژبەیانی- سەلیم موختار- محەمەد شێخ ڕەشید دەباغ- وریا ئەمین ڕواندزی- ئیبراهیم هوشیار- جەمال محێدین- کەمال ڕەشید- مستەفا تۆفیق- شاکر فەتاح- ناهیدە شێخ سەلام- ئەنوەر مائی- پیرباڵ مەحمود- عەبدولوەهاب حەسەن - عیسمەت کەتانی- حەسەن کەتانی- جەلال سەعید خەیلانی- لوقا کاکە- حەمدیە سابیر- حازم الحمدانی- ئەخۆل - بورهان جاهید- خادیم کەریم - مستەفا حەوێزی- خالید دلێر- ئیبراهیم ئەمین باڵدار- عەبدوڵڵا کاکە - مستەفا تۆفیق- زاهیر ئەحمەد - عەبدولڕەحمان محێدین- ڕەفعەت عیزەت سامی - عەبدولحەمید ئیسماعیل- ڕەشاد موفتی - نەجمەدین موفتی- نوری عەلی ئەمین- عومەر ساقی - فازڵ شەوکەت- ئیبراهیم عومەر- عەبدولحەکیم عەلی قازی - محەمەد فەرەج شارەزووری- مستەفا نەریمان- دکتور محەمەد سەعید ئەلبەکری- دکتور عەلی مەردان- دکتور عیسا فەهمی - جەلال جۆبار- هێوی ئەمین ڕواندزی- بەکر جەبار- عادل ساڵح موختار- کەمال حوسێن -نافیع دەباغ- سەلاحەددین حەمدی - جەمال خەزنەدار- ئیبراهیم محەمەد -کەمال شاکر مەحموود- بابە شێخ باتاسی- عەبدوڵڵا عەبدولقادر- سەدیق یونس- یەحیا خدر - تاهیر ئیسماعیل- عەبدولسەلام حلمی - لەتیف خەزنەدار- مەلا عەبدوڵڵا باداوەیی- عەلی موزەفەر- سەعدەدین ئیبراهیم ئەدیب- سەلاحەددین محەمەد عابد- محەمەد عابد- محەمەد حەسەن دزەیی- ئەحمەد شوکری....تاد..

هەر بۆ زێدە سەرنجیش ئەڵێم:

هەندێکیان لەم ناوانە ماون و لە نووسین بەردەوامن و بە جۆش و خرۆشن...! هەندێکیان ماون و وازیان لە هەموو شت نەک هەر لە نووسین هێناوە و کپ و خامۆش..! هەندێکیان مردوون، هەندێکیشیان ئێستا گەر باسی ئەوسایان بکەی لە نێوی ڕۆژنامەکە ئەترسن و زەندەقیان دەچێ، خۆمان خۆش...!

بەهەمەحاڵ، دنیا و ئەوان وابوون، کەسیش گلەیی لەکەس ناکات، ئادەمیزادیش لە ڕەفتار و هەڵسوکەوتیدا سەربەست و ئازادە.

**هەڵوێستێک**

وەک وتمان: ئەم ڕۆژنامەیە و هەڵسووڕێنەرانی ئەم ڕۆژنامەیە، وەک کارێکی پیشەیی و مرۆڤانە گەلێ هەڵوێستی مەردانە و دیاریان هەیە، هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی بەڵگەنامەی ئەو هەڵوێستانەیە. با لاپەڕەیەکی ژمارە (١٠٩) ی (٣)ی ئاداری ساڵی ١٩٥٣ هەڵدەینەوە و تێی ڕامێنین و لە هەواڵەکە بپێچینەوە و بە وردی بیخوێنینەوە، کە دەڵێ:

"شەرمە و ناشیرینە.. لە شەوی (١٦)ی مانگی شوباتی ١٩٥٣دا هەندێک لە چەتە بێدەسەڵاتەکان لە کۆیە، بە شەو بە تفەنگ پەلاماری ماڵی (آنسة نظيرة محمد رجب) کە مودیرەی قوتابخانەی کچانەی کۆیەیە داوە و چەند تەقەیەکیان لە پەنجەرەوە بۆ کردووە کە بیکوژن، ئەم خێزانە بەڕێزەش ژنن و هیچ پیاویان تێدا نییە، زۆر خۆشیی، کە خوای مەزن ڕزگاری کردووە لە دەستی بەدکاران و هیچ گوللەیەکی پێ نەکەوتووە.

جا برادەران وەرن سەیرێکی ئەم سەیرانە بکەن، لە هیچ شوێنێک ئەمە نەکراوە و نەبیستراوە چەند، شەرمە و ناشیرینە کۆمەڵێک پیاو، دوژمنداری کچێک بکەن، کە چەکەکەی قەڵەم و نووسینە.

هیوایەکی زۆرمان هەیە لە دانیشتوانی کۆیە، کە هەموو خوێندەوارێکی تێگەیشتوو ئیفتخاریان پێوە دەکات، ئەم نەوعە کەسانە نەیەڵن لەناویان بژین ئاشکرایان بکەن، تەشهیر بکرێن لەناو کۆمەڵ و حکومەتدا.

بە ڕاستی: مامۆستایان لە هەموو لایەک بە تایبەتی مامۆستایانی کۆیێ بەم بزووتنەوەیە زۆر دڵگیرن.

هەموو خوشک و برایانی (آنسة نظيرة) لە لیوای هەولێر، ئیحتجاجیان پێشکەش ئەکەن.. تکایەکی زۆریش لە کاربەدەستان ئەکەن کە بنج و بناوانی ئەم ئیشە بێ جێیە دەربخەن و بە قانوون جەزای خۆیان ببینن."

# محەمەد مەولود مەم و گۆڤاری هەولێر

**دکتۆر هیمدادی حوسێن**
**کۆلیژی پەروەردە- زانکۆی سەلاحەددین**

**پێشەکی:**

محەمەد مەولوود (مەم) وەکو کەسایەتییەکی رۆشنبیریی شاری هەولێرو چیرۆکنووسێکی بەهرەوەری جیهانی چیرۆکی کوردیی لە ناوەندی رۆشنبیریدا ناسراوە. ئەگەرچی وەکو سەرەتا رووی لە شیعر کردووە، بەڵام هەر لە زووەوە لە گەنجیدا نەهامەتییەکانی ژیان و کڵۆڵی و ئاوارەیی وای لێکردووە ئەزموونی خوی لە بواری چیروکدا تاقیبکاتەوە تاوەکو بووە یەکێ لە چیروکنووسە دیارەکانی قوناغی شەستەکان و حەفتاکانی چیروکی هونەری کوردی.

بە شێوەیەکی گشتی ئەم لێکولینەوەیە باس لە ئەزموونی رۆژنامەوانی (مەم) لە سەرەتای سالانی گۆڤاری (هەولێر) دەکات، بەلام لە ئاماژەکردندا بۆ هەنگاوەکانی یەکەمی (مەم) بە ناچارییەوە بۆ سالی (١٩٤٨) گەراینەوە.

**میتۆدی لێکۆڵینەوەکە:**

رێبازێکی مێژوویی ئەدەبی



محەمەد مەولوود مەم

وەسفی لەبەر گرتووە، پێویستی ئەم رێبازەش وادەخوازێ لایەنەکانی ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی و کەسایەتی (مەم)ی رۆژنامەوان لەبەرچاو بگیرێت بۆ ئەوەی لە میانەی ئەو روانینە گشتی و هەمەلایەنەی سەردەمەکەیدا پلەو پایەی رۆشنبیریی لەسەر تۆپۆگرافیای ئەدەبی و رۆژنامەوانیی کوردیدا دیار بخرێت.

**بنیادی لێکۆڵینەوەکە:**

بریتییە لە پێشەکییەک و دوو بەش و ئەنجام و سەرچاوەکان، لەگەڵ کورتەیەکی چڕو پڕ بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی.

لە فەسڵی یەکەمدا: لە ژیان و سەرچاوەی رۆشنبیری و یەکەم بەرهەمی بلاوکراوەی (مەم) لە رۆژنامەوانی کوردیمان کۆڵیوەتەوە.

لە بەشی دووەمدا: باسی ئەزموونی رۆژنامەوانیی (مەم)مان کردووەو رۆڵی لە گۆڤاری هەولێر، کە لە سالی ١٩٧٠دا لەلایەن شارەوانی هەولێرەوە بلاوکراوەتەوە، دەرخراوەو ئاماژەمان بە هەندێ تەنزی کۆمەلایەتی (مەم) بە ناوی (خالۆی رێبوار) کردووە، کە وەکو (سەرەک نووسین) گۆڤارەکەی بەرێوەبردووە. لە کۆتاییدا ئەنجام و سەرچاوەکانی لێکۆڵینەوەکەمان بە شێوەیەکی ئەکادیمی ریزکردوون. هیوادارم سەرەتایەک بێت بۆ لێکۆڵینەوەیەکی فراوانتر.

**کورتەیەک لە ژیانی (مەم):**

لە ساڵی ١٩٢٦دا لە دایک بووە، لە بنەچەدا خەڵکی رۆژهەڵاتی کوردستانە و لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە بەرەو باشووری کوردستان هاتوون. خوێندنی سەرەتایی لە شاری (شەقڵاوە) خوێندووە و پاشان لە (هەولێر) تا سێی ناوەندیی خوێندووە و بە هۆی بە کاریی فەرمانبەرییەوە چەند ناوچەیەکی کوردستان گەڕاوە و تاساڵی ١٩٧٧ خانەنشین کراوەو لە ٧/٥/١٩٨٧دا کۆچی دوایی کردووە[١]. لە ماوەی ژیانی خۆیدا دوو بەرگ لە چیرۆکەکانی خۆی و کۆمەڵە چیرۆکێکی منداڵانی بە هاوکاری خاتوو (ئافەرین)ی خێزانی چاپ کردووەو[٢] لە دوای مەرگی، کورتە رۆمانێکی بە ناونیشانی (پاییزە خەون) بلاوکراوەتەوە، کە بە بەرهەمێکی فانتازیای ناوازەی نووسەر لە قەڵەم دەدرێت[٣]. دواجار رۆمانی (رێگا)ی بلاوکرایەوە[٤]. لە سەرەتای ساڵی حەفتادا سەرەکی نووسینی گۆڤاری هەولێر بووەو بۆ ماوەی ساڵێک لەو کارەیدا بەردەوام بووە[٥]. لە گۆڤارەکانی گەلاوێژو هیواو بلێسەو رۆژی نوێو کاروان و دەفتەری کوردەواری و رۆژی کوردستان و هاوکاری و چەندین رۆژنامەو گۆڤاری دیکەی کوردیدا بە چیرۆک و نووسینی جۆراوجۆر بەشداری کردووە. یەکەم بەرهەمی رۆژنامەوانیی خۆی بە ناوی خوازراوی (کچە کورد- خۆشناو) بە بۆنەی خۆپیشاندانەکانی ساڵی ١٩٤٨ی عیراق دژ بە سیاسەتی ئینگلیز لە گۆڤاری (گەلاوێژ) دا بلاوکردۆتەوە.[٦]

کەسیەتی (مەم)، کەسیەتییەکی هێمن و کۆڵنەدەر بوو، هەروەکو خۆی دەڵێ: (لە تاقیکردنەوەکانم ئیمان بە خاک و بە ئینسان دروشمی یەکجاریم بوون بڕواییم وابووە کە پێم لەم زەوییە چەقیون، رەگم لەم خاکە قووڵ قووڵ داکوتاون، گیانم دابەستەی ئەو خاکەیە کە لەسەری دەژیم بە ئاوو هەوای نەشونما دەکەم. خۆشەویستیم بۆ ئینسان بە گشتی و بۆ ئینسانی وڵاتەکەم بێدواییە، هۆگری پیاهەڵدان وئافەرینی ساختەو دەست لە پشت دان نەبووم. ئەمانەم بە هەڵدێرێک ژماردوون کە نووسەر بە هۆیەوە لە خشتە دەچێ و هەڵدەخلیسکێ و دەدۆڕێ)[٧].

(مەم) پێوەندی دۆستایەتی دەگەڵ ئەدیب و نووسەرانی دیاری سەردەمەکەی خۆیدا هەبووە، تەنانەت بۆ (هێمن)ی شاعیر (یەکەمین شیعری لە رۆژنامەگەری- کوردستانی عیراقدا بۆ بلاوکردەوە، واتە بە هۆی گۆڤاری هەولێر و (مەم)ەوە خوێندەوارانی کورد چاویان بە شیعرەکانی گەشایەوە)[٨]. لەسەر بلاوکردنەوەی شیعری (حەلەق- مەلەق)[٩]ی هەژار دۆستی گیانی بە گیانی، تووشی سزای ئیداری بوو لە سەرەک نووسینی گۆڤاری (هەولێر)یش دوورخرایەوە.

بە شایەدی ئەدیب و رۆشنبیرەکانی دۆستی، چیرۆکنووسێکی داهێنەرو کەسایەتییەکی کۆمەڵایەتیی دیاری سەردەمی خۆی بوو و هەموویان دان بە زیرەکی و وردبینی و کورد پەروەری ئەودا دەنێن، بە لای ئەوەوە (ئەدەب.. ژیانە..)[١٠] هەروەکو خۆی گوتەنی، ئەویش ژیانی خۆی بۆ ئەدەب تەرخان کردبوو، بەو پێیە بۆ ژیان ژیاو لە پێناوی ژیانی میللەتەکەیدا ژیانی بەسەر برد.

(مەم) ئەو نازناوەیە، کە محەمەد مەولوود بۆ خۆی هەڵیبژاردووەو بەشی زۆری نووسینەکانی بەم ناوە بلاوکردۆتەوە یان لە پاڵ ناوی خۆیدا لە نێو دوو کەوانەدا نووسیویەتی. وا پێدەچێ کورتکراوەی ناوی خۆی و باوکی بێت هەروەکو لە هەندێ جێگەدا نووسراوە، بەڵام دەپرسین ئەدی بۆ ناوی (مەم)ەکەی داستانی (مەم و زینی)خانی نەبێ، کە ئەوەندە عەشق و خۆشەویستی خاک و نەتەوەی لە دڵی محەمەد مەولووددا جۆشداوە، لەبەر بەرزی ئەو داهێنانە ئەدەبییە، ئەو ناوەی بۆ خۆی هەڵبژاردبێ، بە تایبەتی وەکو سەرنج دەدەین لە نووسینە سەرەتاییەکانی خۆیدا ئەو ناوەی هەڵنەبژاردووە، بەڵکو دواتر ئەو ناوەی هەڵبژاردووەو سەرەتا (کچە کورد)[١١]ی هەڵبژاردووە، کە لەوێشدا سەرباری ئەوەی وشەی (کورد)ی هەڵبژاردووە وەکو بەرزیی هەستی نەتەوەیی خۆی، ویستوویەتی بەردەبازێک بۆ بلاوبوونەوەی نووسینەکەی خۆی بدۆزێتەوە، کە تا ئەو کاتە ساڵی(١٩٤٨) قەڵەم بە دەستی ژن زۆر دەگمەن بوو، ئەویش گەنجێک بوو، بلاوبوونەوەی ئەو نووسینەی بە لاوە مەبەست بوو، بە تایبەتی لە گۆڤارێکی کوردیی ئاست بەرزیی

وەک (گـەلاوێژ) لـەو رۆژگـارەدا نووسەرو شاعیرو ئەدیبە هەرە دیارو بەرچاوەکانی کوردستـان لە هەمـوو لایەکـەوە لاپەڕەکانی گـۆڤـارەکـەیان دەوڵەمـەند کـردووەو پایەی تایبـەتی خۆی لە دنیای رۆژنامەوانیی کوردیدا هەیە.

لە مـیـانەی ئەزمـوون و ژیانی تـایـبـەتی خـۆی لە بـواری چیـرۆکنووسـیـدا مـەم دەڵێ: (مـامۆسـتـای یەکـەمم دایکم بووە)، دیارە ئەمـەش ئەوە دەگـەیەنێ،کـە تا چەند (مـەم) بە دایکییەوە پەیوەست بووەو بە تایبـەتی خـۆشـەویسـتی دایکی وایکردووە، کـە ئەزمـوون و کـۆڵنەدانی دایکی وای لێـبکات قسەیەکی وابکات. بە تایبەتی ئەگەر ئەوە بزانین، کە لە ڕووی خێزانییەوە هەروەکـو خـۆی لەو نامـەیدا بۆ عەبدولرەزاق بیماری رەوانە کردووە، بە مـردنی باوکی خـۆی بە ئازادو سەربەست دەزانێ و رادەی باوکساری و دەسـتەڵاتی باوک لە خێزانەکەیدا کـاریگەرییـەکی دەروونیی زۆری بەسەر (مەم)دا بە جێهێشتووە.[١٢]

پاشان خوێندنی سـەرەتایی لە شەقڵاوە، ناوەندیی لە شاری هەولێر تەواو کـردووەو ئیـسـتـر بە کـاری فـەرمـانبـەرییـەوە ژیانی هەتا سـەر بەسەربردووە.

وەکو گەنجەکانی سەردەمی خۆی سەرەتا بە شیعر دەستی پێکردووە، پاشان بە هۆی فـراوانبـوونی ئاسۆی بیرکردنەوەو خوێندنەوەی خۆی، رووی لە نووسـینی وتارو پەخـشـان، بە تایبـەتیش چیـرۆک کـردو بووە شۆڕەسوارێکی دیاری ئەو مەیدانە.

**یەکـەم بەرهەمی بڵاوکـراوەی (مەم) لە رۆژنامەوانی و شێوازەکەی ساڵی چل و هەشت!**

" ئەم لاواندنەوەم پێـشـکەش بە خوشک و برا خۆشەویستەکانم ئەکەم، ئەم هەمـیـشـە بەهارەم بە تایبـەتی پێشکەش بەو خوشکانەم ئەکـەم کە دڵسـۆزی نیـشـتـمـانن و بە شـیـری نیشتمانپەروەری گۆشی کۆرپەکانیان ئەکەن، ئەم سۆزەم، کە باڵە کوللەیەکە پێـشـکەش بە گـیـانی پاکی شەهیـدەکانی ئیـمسـاڵ ئەکەم، ئەو شەهیدانەی، کە بە چوونی خۆیان لە پێناوی حەق پەرستیدا دڵی هەزاران خوشک و برای خۆیانیان بریندار کردو پەردەی ماتەمینیان کێشا بە سەریانا !!!.."

**رواندز: کچە کورد- هـ - هۆشناو ساڵی چل و هەشت! ئەی سـەر شێن!..**

لە گـەنجـیـدا کینەو دڵ پیـسـیت ئاشکرا کـرد لە دەمـەو بەهارا پایزت ژیانـدەوە.. گـــەڵای داران وەران، بولبـولان سەریان بردەوە هێلانە، چیا رەنگاو رەنگەکانت بە رووت و قووتی هێشـتـەوە، بە دڵشکاوی و بەداخەوە ئاڵای ماتەمییان هەڵدا، تۆیش ئاڵای سـووری خـوێنت لە پاڵـیـا چەقـاند، مێرگەکان بە رەنگی گەش وەستا بوون گـێـراتنەوە، شەقـاو بە شەقـاو پێش ئەکەوتن دەستت نابەسنگیانەوە!!..

ساڵی چل و هەشت! بێ بەخت!! خـۆت لە کـەمـینا لە حـەشـاردابوو، باڵندە هەژارەکـان و فـریشـتــەی رەحـمـەتت بە تـیـری زۆرداری و بە سایەقەو کزەی بای ساردت پەشۆکاو و باڵ شکاو پەرێشان کـرد، مێـرگ و زەمینە جوانەکەت بە رەنگی ماتەمی رەنگ کرد!! لە جێگای گوڵە رەنگاو رەنگە بەهارییـەکـانی گـوڵی جوانەمـەرگیت بۆ ژیاندینەوە!!! ئای لەو رووە، لەو هونەرە؟؟!.

بولبول! دۆستی جەفام! هاوتای وەفـام، ناهومـێـد مـەبە، برۆ بەرەو پێش، ئەوا دەسـتـەی گـەلان هاتنە مـەیدان، ئەوا هاتین یا تۆڵـەت ئەستێنین، یاپێکەوە بە دڵی غەمبار و بریندارسەر ئەنێینە سەر بالیفی ناکامی و نووستنی ئەبەدی!.

ســاڵی چل و هەشت! سـاڵی شـووم، برۆ نەتبـینـمـەوە، هەڵم مەخەڵەتێنە، گوڵ بنی نایە، بولبول دەنگی ناسـوێ، هەر رۆژ لەسـەر چڵی، لە ژێر دارێ، لە بن ئەشکەوتێ گوڵێ نەسرینێ نێرگسێ ئەبینێتەوە، گوڵ ئەو گوڵ، بولبول ئەو بولبول هیوا هاتە بەر!!

ساڵی چل و هەشت! وا مـەزانە ئەو خـوێنانە، کـە رشـتـت هەروا رۆیشت! وامەزانە ئەو زۆرداریە، کە کـردت بۆت چووە سـەر!! بزانە بە دڵ بزانە تۆڵەی خۆمان و دەستە دۆستە پاک و نەبەزو خۆشەویستەکانمان لێت ئەکەینەوە!! بە کوێرایی چاوت ئەبێ ئەو پەرێزە دڕکاوییە، کە خستوونەتە ناو مێـرگە جوانەکـان و کـەژو شـیـوە رەنگینەکانەوە هەڵیکەنین، لە شوێنیا گـوڵی هیـوا بچێنین و بە دەوریا بە شـایی و ئاهەنگ و هەڵپـەڕین!! مـێـرگـەکـانمان ئەبێ برووێنینەوە، کـێـوەکـانمان بەرگی خـۆیان لەبەر کەنەوە، کانیاوەکانمان ببوژێنەوە، لە سەرچاوەی (داد) ئەبێ ئاو هەڵقوڵێ و بیخۆینەوە!!

سەرەتای سالّی چل و هەشت! بە شوومی هاتی، بەلاّم دلّنیابە بەرەو بەهار ئەڕۆین، ئێمە بەرەو ڕۆژێک ئەڕۆین، کە ئازادی و سەربەستی تێدایە، بەرەو مێرگێک ئەڕۆین پڕیەتی لە گولّ و لە بولبول، بەرەو ڕۆژێک ئەڕۆین کە هەمیشە بەهارە، لەو هەمیشە بەهارەدا یادی جوانەمەرگەکان ئەکەین و تۆلّەیان ئەستێنین!!!)[13].

**شێوازەکەی:**

ئەم پارچە پەخشانە هونەرییە بە شێوەیەکی خودی(ذاتی) گوزارشت لە هەست و سۆزی دەروونی دەکات لە بەرامبەر قوربانیانی ئەو ڕاپەڕینەی لە سەرەتای سالّی ١٩٤٨دا هەموو لایەکی عێراقی گرتەوەو کوردو عەرەب پێکەوە بە یەک دەنگ لە دژی ڕژێمی ئەوسای عێراق کە دەستی ئینگلیزەکان بوو ڕاپەڕیون و داوای سەربەستی و چاککردنی باری گوزەران و ئازادیی مافە سیاسییەکانیان کردووە[14]. ئەو ڕاپەڕینە لە گۆڤاری (گەلاوێژ)دا بۆتە هەوێنی چەندین پارچە شیعرو نووسین و وتاری نووسەرانی کوردو گۆڤارەکەش بە ناوی (پۆستەی کوردەواری)یەوە دەنگوباسی گەیشتن و بەشداری ناوچە کوردییەکانی کردووە، کە چۆن هاتوونەتە (بەغدا)ی پایتەخت، لە چالاکی پۆستەی کۆیەو هەولێردا گۆڤارەکە دەلّێ:

(لە ڕۆژی ١٣/٤/١٩٤٨دا پۆستەی کۆیەو هەولێر گەیشتنە جێ، ئەوی پێی بلّێن پیاوەتی نواندیان، بە شەقامەکانا، لەسەر گۆڕی شەهیدەکان گەڕان، چەپکە گولّیان بە دیاری بۆ بردن..)[15].

ئەم پارچە پەخشانە بە شێوەیەکی ڕۆمانسی نووسراوەو هەستی جوان پەرستی بۆ سروشت و گولّ و بولبول و یاخی بوون و هەست و سۆزی بە کولّ جەستەی پەخشانەکەیان داپۆشیوەو شێوەی گفتوگۆی وەرگرتووە لە نێوان مرۆڤ و زەمەندا.

لەڕووی شێوەزاری نووسینەوە بە شێوەزارێکی ئەدەبی نووسراوەتەوە.

**(مەم)و ئەزموونی ڕۆژنامەوانی لە گۆڤاری (هەولێر)دا**

شاری هەولێر یەکێکە لە شارە هەرە کۆنەکانی جیهان و بە گوتەی هەندێ لە مێژوونووس و شوێنەوارناسەکان کۆنترین شاری دنیایە، کە ئاوەدانی لێ ماوەتەوەو ژیانی تێدا بەردەوامە، بێ گومان شارێکی ئاوەها کۆن دەبێ خاوەنی کلتوورو ڕۆشنبیرییەکی ڕەسەن و دێرینیش بێت. لە سەدەکانی رابردوودا بەردەوام شوێنی کەلّە زانا موسلّمانەکان بووە، ئەوانەی لە لە شارستانییەتی ناوچەکەدا ڕۆلّی دیاریبان بووە و چەندین تەکیەو خوێندنگای ئاینی لێ بووە، کە لە زۆر لای کوردستان و غەیری کوردستانەوە ڕوویان تێکردووە بۆ فێربوونی زانستە ئاینییەکان، لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا لەگەلّ بلاوبوونەوەی ئامێری چاپ بە ڕۆژهەلاّتدا لە ڕێگەی ئەرمەنی و مەسیحییەکانەوە و دواتر هێنانی ئەو ئامێرانە لە لایەن ئینگلیزەکانەوە بۆ کوردستان و دواجار گواستنەوەی چاپخانە لە لایەن (حوزنی موکریانی)یەوە بۆ ڕەواندز و پاشتر بۆ شاری هەولێر بزاڤێکی تازە کەوتە شارەکەو سەرەتای ڕۆژنامەوانی لەو شارە دەست پێدەکات. دوای بلاوبوونەوەی گۆڤاری (زاری کرمانجی ١٩٢٦-١٩٣٢) لە رواندز، لە هەولێر یەکەم گۆڤار، گۆڤاری (ڕووناکی ١٩٣٥- ١٩٣٦) لە لایەن حوزنی موکریانییەوە بلاوکراوەتەوە، هەفتەنامەی (گۆڤار-١٩٤٣) و ڕۆژنامەی (ئازادی-١٩٤٤) و ڕۆژنامەی (هەتاو - ١٩٤٨) و گۆڤاری (یەکێتی تێکۆشین) بە نهێنی لە لایەن پارتە سیاسییەکانی ئەوێ ڕۆژێیی ناو شاری هەولێر بلاوکراونەتەوە.[16]

لە سالّی(١٩٥٠-١٩٥٣)دا ڕۆژنامەیەکی زانستی و وێژەیی حەفتەیی لە هەولێر بلاوکراوتەوە، کە بۆ شاری هەولێر خالّی وەرچەرخانێکی تازە بوو.[17] دوابە دوای حوزنی موکریانی، گیوی موکریانی برا بچووکی لە ڕووی ڕۆژنامەوانی و چاپ و بلاوکردنەوەی بەرهەمی نووسەران و پاککردنەوەی زمانی کوردی وفەرهەنگنووسیی کوردیدا خزمەتێکی زۆری شاری هەولێری کردووە و دەرکردنی گۆڤاری (هەتاو ١٩٥٤- ١٩٦٠) دوا بە دوای نەمانی گۆڤاری (گەلاوێژ ١٩٣٩-١٩٤٩) کەلێنێکی زۆری خستبووە نێو ناوەندی ڕۆشنبیری و ڕۆژنامەوانیی کوردییەوە، بۆیە بلاوکردنەوەی ئەم گۆڤارە لەو کاتەدا بۆشاییەکی

گەورەی ئەدەبی کوردی بە گشتی و شاری هەولێری بە تایبەتی پڕ کردەوە، کە ژمارەیەکی زۆر لە نووسەرو رووناکبیرانی شارەکەو شارەکانی دیکەی کوردستان بەشدارییان تێداکردووە.[١٨]

دیاردەیەک لە ژیانی ڕۆشنبیریی کوردیدا بەرچاودەکەوێت، ئەویش ئەوەیە، ئەگەر بۆ میللەتان سەرچاوەی رووناکبیریان بە پلەی یەکەم (کتێب) بێت، بەڵام بۆ ڕۆشنبیری کورد (ڕۆژنامە) بوو، کەمی ئیمکانیاتی ماددی و نەبوونی ئامێری چاپی پێشکەوتوو لەبەردەم چاپکردنی (کتێب) بە شێوەیەکی فراوان ئاستەنگ بوون، بۆیە ڕۆژنامەکانی سەرەتایی لە جیاتی هەموو لقەکانی ڕۆشنبیریی بووەو تارادەیەکی باش پێویستیی ڕۆشنبیری کوردی پڕ کردۆتەوە، دەبێ ئەوەمان لەبەرچاو بێت، ڕۆشنبیری کوردیش بە پێی تێگەیشتنی سەردەمەکەی و لەبەر ڕۆشنایی هۆشیاری کۆمەڵایەتی کۆمەڵی کوردەواری خۆی لە مەسەلە مەعریفییەکان نەداوەو هزری کراوە نەبووە، زیاتر (شیعر) جەستەی ڕۆشنبیریی کوردیی داپۆشیووە و بنەماکانی سۆزو ئەندێشەو خەیاڵ مەودای بیرکردنەوەی بووە تا ئاسۆیەکی دوور.

لە باشووری کوردستاندا لە دوای برانەوەی جەنگی یەکەمی جیهانی و دامەزراندنی یەکەم قەوارەی سیاسی دەستەڵاتی کوردی لە سەردەمی شێخ مەحموودا، کە بیر لەوە کرایەوە بزووتنەوەیەکی ڕۆشنبیریی و چاپەمەنی بۆ ئەو سەردەمە نوێیەی ئەو کاتە بەرپا بکرێ و بە تایبەتی چاپخانەکەی شارەوانی، کە ئینگلیزییەکان بۆ هەڵسووڕانی کاروباریی خۆیان هێنابوویان، هەلێکی باشی بۆ رەخساندن بۆ ئەوەی ئەدیب و شاعیرەکانی ئەو سەردەمە بە ئەزموونی کەسیی خۆیان و بە سوود بینین لە ڕۆژنامەی پێش خۆیان و دەوروبەر دەست بدەنە بەر کاری ڕۆژنامەوانی و لە پاڵ بەهرەی شیعریی خۆیاندا چەندین بابەتی هەمە چەشنەی ڕۆژنامەوانی بنووسن و قەڵەمیان لە زۆر بواردا تاقیبکەنەوە. شێخ نوری شێخ ساڵح و عەلی کەمال باپیرو پاشتر پیرەمێردو رەفیق حیلمی..هتد، هەمووییان بوونە ڕۆژنامەوان، بە تایبەتی حاجی تۆفیقی پیرەمێرد بە هەق بناغەیەکی چاکی بۆ ڕۆژنامەوانی لە باشووری کوردستان دانا[١٩].

ئەم دیاردەیە وەنەبێ هەر بە تەنیا مۆرک و خەسڵەتی ڕۆژنامەوانیی کوردیی بێت و ئەدیب و شاعیرەکان سەروکاریی ڕۆژنامەوانییان بەرێوەبردبێ، بەڵکو لە ئەدەبی عەرەبی و فارسی و دەوروبەردا بەرچاو دەکەوێت لەعێراقدا (معروف الرصافی) ڕۆژنامەوان و وەرگێڕو وتارنووسێکی چاکی سەرەتای سەدەی بیستەمی ڕۆژنامەوانیی عەرەبی بوو[٢٠].

ئەمەش هۆیەکەی بە پلەی یەکەم لەوەدا بووە، کە ژمارەی خوێندەوارو ڕۆشنبیر لە میللەتانی دواکەوتووی ڕۆژهەلاتی ئێجگار کەم بوو و نەخوێندەواری و هەژاری و برسیەتی لە سیما دیارەکانی میللەتانی ڕۆژهەلات بوو.

محەمەد مەولوود (مەم)، لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٠دا، بەو پێیەی کە ئەرک و وەزیفەی لە شارەوانی هەولێر بووەو لە دەستکەوتەکانی بەیاننامەی ١١ی ئازاری ساڵی (١٩٧٠)یش، دەستکەوتی ئازادیی ڕۆشنبیری و گەشەکردنی چاپەمەنیی کوردی بوو، دیارە شارەوانی ئەو سەردەمە دەروازەیەکی دیاری شاری هەولێرێ بوو، بیری لەوە کردۆتەوە، کە بلاوکراوەیەکی تایبەتی خۆی بۆ وشیارکردنەوەو بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیریی هاوولاتیانی شارەکەی هەبێ و لە دەوری ئەو گۆڤارە کۆیان بکاتەوە، ئەگەرچی بەو پێیەی کە (مەم) خۆی بەهرەی ئەدەبی هەبوو، وەکو چیرۆکنووسێک ناسراو بوو، بەرهەمە بلاوکراوەکانی گۆڤارەکەش بە پلەی یەکەم ئەدەبین و کەمتر کۆمەڵایەتی و دەنگ و باسی شارەوانیی گرتۆتەوە، ئەمەش شتێکی سەیر نییە، شارەوانییەکی کەم دەرامەت وکەم چالاکی، نەیدەتوانی بە زمانی کوردی و بابەتی جۆر بە جۆری ژیانی مەدەنی خەڵک گۆڤارێکی تایبەت بلاوبکاتەوە، بەلام حەزو خۆشەویستی وشە لە لای سەرەک نووسین و کارمەندەکانی بەسەر زۆر کۆسپی ئیداریدا زاڵی دەکەن و بە بلاوبوونەوەی هەر ژمارەیەکی ئەو ئەرک و ماندووبوونەیان لە بیر دەچووەوە.

دەرچوون و بلاوبوونەوەی ژمارەکانی گۆڤاری (سلێمانی)[٢١] بە ماوەی دوو ساڵ پێش گۆڤاری

(هەولێر)، لە شاری سلێمانی ڕێگە خۆشکەر بوو، لە هەمان کاتدا پاڵنەرو هاندانی گۆڤاری (هەولێر)یش بوو بۆ ئەوەی لە زۆر ڕووەوە سوود لە ئەزموون و تاقیکردنەوەی ئەوان ببینن، کە بەهەمان شێوەو لەهەمان قەوارەدا شارەوانی سلێمانی بڵاوی دەکردەوە.

گۆڤاری (هەولێر) لە چۆنیەتی کلێشەو گۆشەی تایبەتی و جۆری چاپ و هونەرەکانی دیکەی ڕۆژنامەوانیی لاسایی گۆڤاری ناوبراوی کردۆتەوە، نازناوی (خاڵۆی ڕێبوار)، کە (مەم) هەندێ جار بابەتی پێ بڵاوکردۆتەوە، هەمان ئەو نازناوە لە گۆڤاری(سلێمانی)شدا هاتووە، بەڵام دڵنیاین لە شێوازو شێوەزاری نووسینەکەیدا یەکێکی ترە(٢٢).

(مەم)، لە سەرەتای بڵاوبوونەوەی گۆڤارەکەوە لە (مایسی ١٩٧٠)وە تامایسی ١٩٧١ سەرەک نووسینی گۆڤارەکە بوو، لەو ماوەیەدا حەوت ژمارەی لێ بڵاوکراوەتەوە. بڵاوبوونەوەی گۆڤارێک بەم هەموو دەردی سەری و زەحمەتە کارێکی ئاسان نەبوو، لە (وتاری ژمارە)ی ژمارە(٢، ٣)ی گۆڤارەکەدا سەرەکی نووسین- مەم- نووسیویەتی:

(چەند ڕۆژێک لەمەوبەر گۆڤاری هەولێر، لە دایک بوو، وەکو چوزەرەیێکی تازە سەری لە ژێر بەستەڵەک و بەفرو باری ڕۆژانی سەخت و پڕ مەینەتی بەرزکردەوە.. بۆ ژیان.. وەک گزنگی ڕۆژ بە هەموو وڵاتدا ڕووناکی بیروباوەڕی چاکی پەخشکرد. بێگومان ئێمە هەر لەو ڕێگایەوە دەستمان داوەتە قەڵەم و هەر بە هیوای ئەو ڕووناکییەو لەبەر تیشکی ئەو بیروباوەڕانە، بەرێوە ئەڕۆین، بەرەو ژیانێکی باشتر، لە نیشتمانێکی سەربەرزو ئازاددا.

ئەگەرچی هەنگاوی یەکەم لە ژیاندا ئاسان نییەو لە ڕێگاش، مرۆڤ لەوانەیە تووشی کەندو کۆسپ و دڕک و داڵ بێت، بەڵام مەرج ئەوەیە بتوانین، لەو هەنگاوەوە پاشگەز نەبینەوەو گورجترو بە گوڕتر بەرەو ئامانج بچین.. ئەوەش دروشمی هەولێرە، هەر ئەمەش دروشمی ئەبێت)(٢٣).

لە بارەی پلەو پایەی گۆڤاری (هەولێر) لەو سەردەمەدا پرسیارمان لە (پیربال مەحموود)ی شاعیر کرد، کە ئەوکاتە کارمەندی شارەوانی و لە کادیرەکانی ئەو گۆڤارە بوو، پێی وتین: (ئەو سەردەمە هیچ گۆڤاری دیکەی ڕۆشنبیری و ئەدەبی لە مەیدانەکەدا نەبوو، ناچار ڕۆشنبیرەکانی ئەو سەردەمە وەکو عەبدولڵا پەشێو و عەزیز گەردی و جەمیل ڕەنجبەرو حەمە کەریم هەورامی و محەمەد حەسەن مەنگوڕی و کەریم شارەزاو د. خورشید دزەیی و یوسف ئەحمەد دەرگەڵەیی و چەندانی دی دەهاتن سەردانی گۆڤارەکەیان دەکردو بەرهەمی ئەدەبیی خۆیان لە بۆ دەهێنایین و گۆڤارەکەش زۆرجار بە خۆم دەچووم لە قەیسەری و لای پیاوە دەوڵەمەندەکان دەمفرۆشت و دەیانکڕی، نەوەکو لەبەر ئەوەی خوێندەوار بوون، نەخێر، زۆربەیان هەر نەیاندەزانی بە کوردی



پیربال مەحموود

بخوێننەوە، بەڵام لە بۆ بەرژەوەندی خۆیان دەیانکڕی و دەیانزانی ئیشیان بە شارەوانی دەبێ، ژمارەی خوێندەواری کورد ئەو ڕۆژە کەم بوو.)(٢٤)

کزی هۆشیاری نەتەوەیی و ڕۆشنبیری بە ئاسانی لە شاری هەولێری ئەو سەردەمە هەستی پێدەکرێ و خەڵک زیاتر خوێندنی بە عەرەبی بوو لە ئاست بە کوردی نووسین و وشەی کوردی ترس و سام دایگرتوون.

دەبێ لێرەدا ئاماژە بەوەش بکەین، کە گۆڤارەکە لە پاڵ نووسینی کوردیدا لە زۆربەی ژمارەکانیدا بە زمانی عەرەبییش چەندین بابەتی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی بڵاوکردۆتەوە. دیارترین ئەو نووسەرانەی لەوێ بەرهەمیان بڵاوکردۆتەوە گەنجەکانی ئەو ڕۆژەی هەولێر بوون، لەوانە نزار جەرجیس و تارق ئیبراهیم شەریف و







ناسر یوسف و زوبێر بیلال ئیسماعیل و..هتد.

شـــایانی ئامـــاژە پێکردن و پێـزانینیشــە، کـە قـەڵەمی چەند ئافـرەتێکیش لە گـۆڤـارەکـەدا دیارە، لەوانە: (کـوردسـتـان مـوکـریانی و گـەلاوێژ شـفـیع و دایکی سـۆران و جـەمـیلە ئیبـراهیم و سـوڵتـانە عـەبدولوەهاب و ئیـمـان و سـامـیـە چاوشلی و.. هتـد، کـە بەهەردوو زمانی کـوردی و عـەرەبی نووسـینیان بلاوکردۆتەوە.

سـەرچاوەی مـاددی گـۆڤـارەکـە بەشـێکی لەلایەن حکومـەتەوە، (شــــارەوانـی) دابـین کــــراوە، بەشێکیشی بە پیتـاک کۆکردنەوە لە بازرگان و دەوڵەمەندەکانی شار بوو، هەر لـەبەر ئەوەش بـوو، هەروەکـــو (تارق ئیـبـراهیم شـەریف) دەڵێ: "گـۆڤـارەکـە پاداشـتی نەبوو چەند نووسـینێکم لەوێ بلاوکـردەوە هیـچم وەرنەگرت"[٢٥].

زۆر کـەم ئاگـاداری و ریکلام لە گــۆڤــارەکـــەدا بلاوکــراوەتەوە، بلاوبوونەوەی رۆژنامەی (التاخی)[٢٦] لەو کـاتـەدا وەکـو رۆژنامـەیەکی سـیـاسـیی خـوێنەری زیاترو هەواڵی گەرماو گەرمیی لە هەگبەدا بوو.

گـۆڤـاری هەولێـر دوازدە ژمـارەی لێ بلاوکراوەتەوە:

**ساڵی یەکەم:** (٦) ژمارە لە (٤) بەرگدا، ژمارەکـانی(٢و٣)و (٤و٥) لە یەک بەرگـدا بلاوکـراونەتەوە و ژمارەکـانی (١و٦) بەتەنیـان، ژمارە (٦)ی بۆ یادی جەژنەکـانی (ئادار)و (نەورۆز) تەرخانکراوە.

**ساڵی دووەم:** (٥) ژمــارە لە (٤)بەرگدا بلاوکراوەتەوە.

**ساڵی سێیەم:** (١) ژمارەی لێ بلاوکراوەتەوە.

لە سـاڵی دووەمـدا دەسـتـەیەکی تازەی لە نووسـەران بۆ دانراوە، کـە بریتی بوون لە:

(ئەندازیار عـەبدولوەهاب حەسەن سـەرۆکی شــارەوانی. ئەندازیار

عەبدولمجید حەسەن، زبیر بلال، مەغدید سۆران، پیربال مەحموود)[27].

لاپەڕەی ژمارەکانی گۆڤارەکە وەکو یەک نییەو جێگیر نییە لە نێوان (٦٤، ٧٢، ٩٦، ١٢٠) لاپەڕەدایە، کلێشەی گۆڤارەکە لە بەرگی پێشەوەدا جێگیرو نەگۆڕە، کە بریتییە لە قەلاو منارەی چۆلی و لەم دیو و لەو دیوی گوڵەگەنم و گەلایەکی توتن بەدی دەکرێت و لە سەرەوە بە ئینگلیزی ناوی هەولێر نووسراوەو لە لای خوارەوەیش بە گەورەیی (هەولێر)و بە بچووکتر نووسراوە (شارەوانی هەولێر مانگێ جارێک دەریئەکات)، نەخشەو کلێشەی بەرگەکەی دەستکردی هونەرمەند (سلێمان شاکر)ەو لە ژمارە (٦) دا کلێشەی گۆڤارەکە گۆڕاوە، وێنەی قەلا بچووک کراوەتەوەو لە دوورەوە دیارە، وێنەی منارەی هەولێر بە گەورەیی و لە نزیکەوە دیارەو سێیەکی بەرگەکەی گرتۆتەوە. لە ژمارە (٣و٤)ی ساڵی دووەمەوە تا کۆتایی کلێشەیەکی تری وەرگرتووە، کە بریتییە لە ناوی هەولێرو بازنەیەک لە ژێریدا لە ناوەڕاستی گۆڤارەکەشدا هێڵێکی ڕەشی پان بە شێوەیەکی ستوونی، ئەم کلێشەیە لە دەستکردی هونەرمەندو خۆشنووس (زادە)یە.

نرخی گۆڤارەکە سەرەتا لە ژمارە (١) بە (٧٠) فلس بوو پاشان لە ژمارە (٢و٣)ەوە بووە بە (١٠٠) فلس.

لە ڕووی هونەرەکانی ڕۆژنامەوانییەوە، بە تایبەتی لە ڕووی بەکارهێنانی (وێنەی ڕۆژنامەوانییەوە) لاوازەو زۆر کەم سوود لە وێنە وەرگیراوە، کە وێنەی ڕۆژنامەوانی دەتوانێ لە ڕۆژنامەوانیدا ڕۆڵێکی کاریگەر بگێڕێ، لە هەمان کاتدا بەشداری لە زیاتر ناساندنی نووسەرەکان بە جەماوەرەوە بکات. تەنانەت کۆمەڵێک لە لێکۆڵەرانی بواری ڕۆژنامەوانی لەو باوەڕەدان ڕەنگە وێنەیەک بەقەد سەدان وشە مانا بدات و باشتر و کاریگەرتر مەبەست بە خوێنەر بگەیەنێ، کە بەداخەوە ڕۆژنامەوانی کوردی چ لە کۆن و تەنانەت ئێستاشی لەگەڵدابێ نەیتوانیوە سوودی تەواو لەو شێوازەی ڕۆژنامەوانی وەربگرێت، کە لە مێژووی ڕۆژنامەوانی جیهانیدا بۆ سەدەی حەڤدەهەم بۆ ئەوروپا دەگەڕێتەوە و پاشان لە ڕێگەی بڵاوبوونەوەی ئامێری چاپدا زیاتر گەشەی کرد و بۆ یەکەمجار لە گۆڤاری (کورد تەعاون و تەرەقی غەزەتەسی) لە ١٩٠٨ لە ڕۆژنامەوانی کوردیدا بەکارهاتووە[28]، تەنانەت وێنەی کاریکاتۆریی لەڕۆژنامەوانی سەردەمدا بۆ دەربڕینی کێشە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی ڕۆژ سەرنجی خوێنەر بەلای خۆیدا کێش دەکات و تا ڕادەیەکی زۆریش ڕەواج بۆ ڕۆژنامەکە پەیدا دەکات و تیراژی ڕۆژنامەکە ڕوو لە زیادی دەکات.

لە ڕووی تیپەکانی چاپەوە، هەست بە جۆری جیاوازی تیپەکان و شێوەو قەوارەیان لە ژمارەکاندا دەکرێت، ئەمەش هۆیەکەی ئەوە بوو کە گۆڤارەکە چاپخانەی تایبەتی خۆی نەبوو بە گوێرەی پێویست هەر جارەی لە چاپخانەیەکدا چاپکراوە، لە چاپخانەکانی (شارەوانی کەرکوک و چاپخانەی کوردستان، (الغري الحديثة).

لە ڕووی نەخشەسازییەوە، قەوارەی گۆڤارەکە (٢٢×١٦) سانتیمەترەو درێژی دێڕەکانی (١١) سانتیمەترەو پاشان بوو بە (٢١×١٥) سانتیمەتر لە هەندێ شوێندا زەخرەفەیەکی ساکاری چاپی بەکارهاتووە. (مانشێت)ی وتارەکان بە هێڵی (بۆڵد) نووسراوەو خۆشنووسیی تێدا بە کارنەهاتووە. هەر ژمارەیەکی بە تیراژی (١٠٠٠) دانە بلاوکراوەتەوە.

ناوەڕۆکی گۆڤارەکە بە شێوەیەکی گشتی ئەدەبییە،[29]. ئەگەرچی هەندێ بابەتی کۆمەڵایەتی و زمانەوانی و زانستی و گۆشەی تایبەتی بۆ ئافرەتان تێدایە، بەڵام زۆربەی لاپەڕەکانی بەرهەمی شیعرو چیرۆک و وتاری ئەدەبی و ڕەخنەی ئەدەبین، تەنانەت گۆڤارەکە لە ژمارە (یەک)دا، لە (بانگەوازێک)دا بۆ نووسەران داوای بەرهەمی ئەدەبییان لێدەکات، بێئەوەی کە ئەوەی لەبەر چاوبێ بابەتی کۆمەڵایەتی و مێژوویی و تایبەت بە کار و چالاکییەکانی شارەوانی و شارەکەی بۆ بنێرن[30].

گۆڤارەکە پرۆژەیەکی دیکەشی هەبوو، ئەویش بلاوکردنەوەی نامیلکەی (قەلاتی هەولێرو پرۆژەی ڕێکخستنی)[31] وەکو هەنگاوی یەکەم بلاوکردەوە، ئەگەر دەرفەتی

هەبووایەو تەمەنی گۆڤارەکە درێژتر بووایە ڕەنگە نامیلکەی دیکەشی بە دوادا بهاتایە.

## (مەم) و (خالۆی ڕێبوار) و تەنزی کۆمەڵایەتی:

یەکێ لە توانا شاراوەکانی زمانی مرۆڤ ئەوەیە، کە دەتوانێ وشەو ڕستە بۆ واتایەکی جیاواز لە واتاو مەبەستی ڕاستەقینەی خۆی بە کاربێنێ. ئەم شێوازە نووسینە، تەنز ئامێزو گاڵتەجارییە ڕەخنەییە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا مێژوویەکی دێرینی هەیەو تەنانەت ئەرستۆ لە کتێبی (پیوتیکا)دا ئاماژەی بۆ کردووەو لە سەردەمی یۆنانی و ڕۆمانیدا سەرنجی ڕاکێشاون.

پاشتر لە قۆناغەکانی پێشکەوتنی هزرو ئاوەزی مرۆڤ هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ دەربڕینی مەبەستی شاراوەو ڕێگەیەک بوو بۆ دەربڕینی زووخاوی دڵ و پەردە هەڵماڵین لەسەر چەوت و چەوێڵییەکانی ڕەوشت و ئاکاری مرۆڤ و ناهەمواریيەکانی کاربەدەست و دەستەڵاتە سیاسییەکان، بە شێوەیەکی ئەوتۆ، کە هەموویان بێنێتە پێکەنین ئەو ساتە دەتوانێ وایان لێبکات بە خۆیاندا بچنەوەو هەندێ جاریش ڕق و تووڕەییان بورووژێنێ.

ئەم شێوازە تەنز ئامێزە، لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامەوانیی زیاتر گەشەی سەندو بووە بەشێک لە ئەرک و پەیامی ڕۆژنامەنووسی و لەجیاتی وێنەی کاریکاتێر بووە وشەی نووسراو و خوێنراو.

لە ڕۆژنامەوانیی عەرەبیی لە عێراقدا سەرەتای ئەم سەدەیەو بە تایبەتی لەگەڵ حوکمی ئینگلیز لە عێراقدا دەنگی نارەزایی لە ڕۆژنامەوانیی کۆمیدیدا بەرز بووەوەو ژمارەیەک ڕۆژنامەو گۆڤاری عەرەبی بە زمانێکی میللی و بە شێوازێکی گاڵتەجاریی بارودۆخی ناهەمواری ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری عێراقییان بڵاوکردەوەو ئەم ڕۆژنامەو گۆڤارانەی وەکو: (جحا الرومي-١٩٢٣، الهزل-١٩٢٤، كناس الشوارع-١٩٢٥، حبز بوز-١٩٣١، الفكاهه-١٩٦٣)[٣٢] جەماوەرێکی زۆریان هەبوو و بە ژمارەی زۆر چاپ دەکران، لە دووتوێی لاپەڕەکانیاندا ڕاستی و گاڵتەو ڕەخنەو خەیاڵیان تێکەڵ دەکرد.

لە ڕۆژنامەوانیی کوردیدا، گۆشەی (ئەلف و یێ)ی مارف بەرزنجی لە ژمارەکانی گۆڤاری (شەفەق)[٣٣] دا شێوە نووسینێکی تەنز ئامێزی سەرنجراکێشەو چ لە ڕووی زمان و چ لە ڕووی هەڵبژاردنی بابەتەکانیدا سەرکەوتوودو ڕەخنەکانی مەبەستدارن.

من وای بۆ دەچم، محەمەد مەولوود(مەم) وەکو ڕۆشنبیرێک و خوێنەرێکی ڕۆژنامەو گۆڤارە عەرەبییەکان ئاگای لە گۆڤاری (الفكاهه ١٩٦٣-١٩٧١)[٣٤] و شێوە تەنز ئامێزەکانی (مارف بەرزنجی) هەبووەو خوێندوونییەتەوە، بەڵام ئەوەی شایانی سەرنجە، بابەتەکانی خالۆی ڕێبواری (مەم) بە زمانێکی میللی یان شەعبی نەنووسراون و کۆمەڵێ کاریکاتێری نووسراون، کەم و کورتییەکانی فەرمانگەکانی هەولێرو هەندێ داب و نەریتی دواکەوتووی خەڵکی شارەکەی بە شێوەیەکی کۆمیدی دەربڕیون و هاوارێکە بۆ چاککردنیان.

هەوڵدەدەین نموونەی ئەو بابەتانەی گۆشەی (خالۆی ڕێبوار) پیشان بدەین:

بانگێک لە بەڕێوەبەری پۆلیس:

(بەڕێوەبەری پۆلیس بانگی هەموو ئەوانە دەکات، لە دانیشتوانی شار کە تا ئێستا نەیانکردووە بە خوو لە چەقی جادەکان بڕۆن و جوڵانەوەی هاتوچۆ بشڵەژێنن بانگیان ئەکات بۆ ئەوەی خەڵاتیان بکات، بڕوایشی بە قسەی هەموو ئەوانە هەیە کە بۆ خەڵات وەرگرتن موراجەعەت ئەگەن و پێویستیش بە شاهێد هێنان ناکات)[٣٥].

## بانگەوازێک و (٣) خەڵات:

(شارەوانی هەولێر ئەم (٣) خەڵاتەی تەرخان کردووەو بەم پێیەی خوارەوە دابەش ئەکرێن:

١- تفەنگێکی ساچمە بۆ ئەو دایک و باوکانەی منداڵەکانیان بە (دار لاستیک) گڵۆپی شەقام و کۆڵانەکان ئەشکێنن، چونکی دارلاستیک بە چاکی بۆ ئەم کارە دەست نادات، هەروا بەردەقانیش بۆ داپیری ئەوانەی داپیریان بەرحەیاتە.

٢- جووتێک (مراوی) ڕەنگاو ڕەنگ بۆ ئەوانەی بە هۆی ئاوی پیسی ماڵەکانیان گۆمیان لەبەر دەرگاکانیان دروست کردووە.

٣- بۆ ماوەی ساڵێک (عەفو کردن) لە پارەی ئاو و کارەبا بۆ

ئەوانەی شەوان کارەبا چەنگاڵ ئەکەن و ئەوانەی سەعاتی ئاو و کارەبای ماڵەکانیان وەستاندووە.

وەبانگی هەموو ئەوانەش دەکات کە ئەم مەرجانەی سەرەوەیان (کامیل و موکەمەلن) بفەرموونە شارەوانی و خەلاتەکانیان وەربگرن، هیچ شەرمیشی پێناوێ الحمدلله پیاون و بە تایبەتی لەم ڕۆژانەش خۆ شوکور شەرم هەڵگیراوە.)[٣٦].

**بازرگانی:**

ئەڵێن لە ولاتانی ڕۆژئاوا بە تایبەتی لە فەرەنسە گۆشتی بۆق لە گۆشتەکانی تر بە نرختره! لە هەولێریش خوا بە زۆری نەبینێ لە هەر کۆڵانەو گەرەکێک گۆمێک هەیەو بە هەزاران بۆقیان تێدا دەژین.

بیری ئەوەم ئەکردەوە کە بۆچ مرۆڤ قازانجێک لەمە وەدەست نەهێنێ؟ من زۆر پێم خۆشە ئەگەر (ادارەی محلی) و (شارەوانی) ماوەم بدەن بۆ خۆم (شرکەتێک) دروست بکەم بۆ (تصدیری) ئەم بۆقانە بۆ دەرەوە، تا قازانجێک وەچەنگ بهێنم.. بڕوا ناکەم بۆ ئەم کارە (دکتۆری صحەی شار)یش ڕازی نەبێت بە هۆی ئەوە کە ئەڵێن گوایە وجودی باشە بۆ لەناوبردنی مێشوولەو مەگەزا!.. ئەرێ ئێوە ئەم بازرگانیەتان پێ چۆنە؟[٣٧]

ئەیەوێت چارەی (خەسووی) بکات:

لە ڕێگامان بەرەو (سێتاقان) لەناو (لانکەکانی.. بڵێم پاسەکانی مەسلەحە) بەرامبەر دوو ئافرەت دانیشتبووم، یەکێک لای ئەویتر سکالای لە خەسووی ئەکرد، کە.. چەند لە دەستی بە ئازارەو.. چۆن ژیانی لە خۆی و منداڵەکانی تاڵ کردووە!!.. لە دواییشدا لەخوا ئەپاڕایەوە کە یان چاکی بکات یان لە کۆڵی بکاتەوە؟!..

ئافرەتی دووەمیان بە کڕی گوێی گرتبوو.. هەر کە ئەو لە سکالاکەی بوودوە سەری بردە بنا گوێی و بەدەنگ پێی گوت:

– خوشکم بە تکاو نزا چی ئەکرێت، خەسووەکەی منیش وەکو ئەوەی تۆ بوو.. هەر گەیاندمە (خەستەخانە)، بە ئاسانی و بۆ یەکجاری کپ بوو!! ئەزانی چۆن؟.. خەستەخانە کە هەر سروشتی وایە ئەگەر یەکێک بچێتە ئەوێ لەبەر بێ عیلاجی و بێ ئاگایی.. و یان لەبەر پیسی و دژوینی لەناو نەچێت، بێشک.. لە برسانا حەیاتی لەبەر ئەبڕێ.. جا ئامۆژگاریم ئەوەیە بە قسەی خوشکی خۆت بکەی و خەسووەکەت زوو بگەیەنە خەستەخانە.

ئافرەتەکە.. سەردەمێک داما، وام بۆ هات کە خەریک بوو لە خۆشیا هاوار بکات!!.. کەچی لەبنەوەش سەیری منی کرد، منیش سەرێکم بۆ هەژاند، وەکو پێی بڵێم:

بەقسەی.. دەستە خوشکەکەت بکە.. بەقسەی دەستە خوشکەکەت بکە!!.. لە ڕاستیشا من قسەی هەردوو ئافرەتەکەم لە کونجی (مەکری ژنان) تۆمار کردن، چونکی باوەڕ ناکەم.. خەستەخانەکەی هەولێر وەکو ئەڵێن نەرمەی گۆشت بۆ خۆیان بخۆن و هێلکەکان بدەن بە نەخۆش.. نەخێر من ئەڵێم ئەمە بوختانە.. نازانم ئێوە چی ئەڵێن؟![٣٨]

**پەراوێزەکان:**

١- لە بارەی ژیان و بە سەرهاتی محەمەد مەولوود(مەم)دوە سوودمان لەم دوو سەرچاوەیە دیوە: تالیب محەمەد ئەحمەد، لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەگرانە لە چیرۆکەکانی محەمەد مەولوود (مەم)، ل٦-,٢٧
بلاوکراوەی ڕۆڤار، ژ ٢، محەمەد مەولوود(مەم)لە پایزە خەوندا، سلێمانی، ١٩٩٩/٦/٥.

٢- بڕوانە: محەمەد مەولوود(مەم)، چیرۆکەکانی مەم، ب١، ١٩٧٠.
محەمەد مەولوود(مەم)، چیرۆکەکانی مەم، ب٢، ١٩٨٤
محەمەد مەولوود(مەم) و خاتوو ئافەرین، گوڵەبەڕۆژە، بەغدا، ١٩٨١.

٣- بڕوانە: محەمەد مەولوود(مەم)، پایزە خەون، بەغدا، ١٩٨٧.

٤- محەمەد مەولوود(مەم)، ڕێگا، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٤.

٥- لە مایسی ١٩٧٠ تا مایسی ١٩٧١ بەردەوام بوو.

٦- کچە کورد، ساڵی چل و هەشت، گ گەلاوێژ، ژ٣، س٩، ل٥٣-٥٥.

٧- محەمەد مەولوود (مەم)، محەمەد مەولوود (مەم)و تاقیکردنەوەی لە چیرۆک نووسیندا، گ، کاروان، ژ ١، ل١٨.

٨- شێرزاد هەینی، (مەم)ی ڕۆژنامەنووس و فەرمانبەر، گ مەم، ژ١، ل١٥.

٩- هەژار، حەلەق، مەلەق، گ هەولێر، ژ١، س٢، ل ٣١-,٣٢

١٠- محەمەد مەولوود مەم، ئەدەب و هەندێ بیری ساکار، گ دەفتەری کوردەواری، ژ١، ل٨٩.

١١- بڕوانە ئەو وتارەی بۆ یەکەمجار لە گۆڤاری(گەلاوێژ)دا بلاوی کردۆتەوە، کچە کورد، ساڵی چل و هەشت، گ گەلاوێژ، ژ٣، س٩، ل٥٣-,٥٥

١٢- بڕوانە: محەمەد مەولوود مەم، ئەدەب و هەندێ بیری ساکار، گ دەفتەری

کوردەواری، ژ۱، ل.۸۹
١٣- کچە کورد، ساڵی چل و هەشت، گ گەلاوێژ، ژ۳، س۹، ل۵۳-۵۵.
١٤- بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ڕووداوەکانی ۲۷/۱/۱۹٤۸ لە عێراقدا بڕوانە: د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد، ل۱۹۹-۲۲۵.
١٥- گ.گەلاوێژ، ژ ۳، س۹، بەغدا، ۱۹٤۸، ل ١٤.
١٦- بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ڕۆژنامەوانی نهێنی کوردی بڕوانە: نەوزاد عەلی ئەحمەد، هونەرەکانی ئەدەب لە ڕۆژنامەگەریی نهێنی کوردیدا۱۹٦۱- ۱۹۹۱ (نامەی ماجستێر)، کۆلێژی زمان - زانکۆی سلێمانی، ۲۰۰۱.
عەبدوڵلا زەنگەنە و ڕەفیق ساڵح ئەحمەد، ڕابەری ڕۆژنامەنووسیی کوردی،گ ڕۆژنامەڤانی، ژ۱۱-۱۲، س٤، ۲۰۰۳، ل ۸۷- ۱۷۱.
١٧- لەبارەی ئەم ڕۆژنامەیەوە بڕوانە: مەحموود زامدار، حیکایەتی سەرهەڵدان و کۆتایی ڕۆژنامەی هەولێر، بەغدا،۱۹۸۸.
١٨- لەبارەی گۆڤاری (هەتاو) بڕوانە: د.هیمداد حوسێن بەکر، ڕەنگدانەوەی هونەرەکانی ڕۆژنامەنووسیی و ڕۆشنبیریی کوردی پەنجاکانی شاری هەولێر لە گۆڤاری (هەتاو)دا، گ زانکۆی سلێمانی، ژ۹، ۲۰۰۲، ل ۱۲۱- ۱۳۵.
کەریم شارەزا، دەوری گۆڤاری هەتاو لە بزاڤی ڕۆژنامەنووسی کوردیدا، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژ ۲۸٤، ۱۵/۵/۱۹۹٦.
١٩- شێخ نوری شێخ ساڵح لە گۆڤارەکانی (ڕۆژی کوردستان-۱۹۲۲) و ڕەفیق حیلمی لە ڕۆژنامەی (ئومێدی ئیستیقلال- ۱۹۲۳)و(حاجی تۆفیق)یش ناسراو بە(پیرەمێرد) لە ڕۆژنامەنووسیدا پێشەنگ بوو، سەرەتا لە تورکیاو پاشان لە شاری سلێمانی ڕۆژنامەی (ژیان-۱۹۲٦) و( ژین-۱۹۳۹)ی بەڕێوەبردووە. بڕوانە: جەمال خەزنەدار، ڕابەری ڕۆژنامەگەری کوردی، ل۲٦، ۲۹، ۳۲، ٤۲.
د. کەمال مەزهەر، تێگەیشتنی ڕاستی...، ل۲۱۹-۲۲۲.
٢٠- بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە:هیمداد حوسێن، چیرۆکی هونەریی کوردی سەرهەڵدان تا گۆڤاری گەلاوێژ، گ، کاروان، ژ ۱۵۲، ل۲-۱۱.
٢١- گۆڤاری (سلێمانی) لە بلاوکراوەکانی شارەوانی سلێمانییە، بە کوردی و عەرەبی، یەکەم ژمارەی لە مانگی گەلاوێژی ۱۹٦۸دا بلاوکرایەوە. دەستەی نووسەرانی لەم بەڕێزانە پێکهاتووە: محەرەم محەمەد ئەمین و جەمال شالی و نوری وەشتی و محەمەد مستەفا کوردی و زیوەر)، بڕوانە: عەبدولجەبار محەمەد جەباری، مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی، ل۱۳۱-۱۳۲.
٢٢- بڕوانە: گ سلێمانی، ژ۲، س۲، ۱۹٦۹ ،ل۳۸.
٢٣- سەرەکی نووسین، گ هەولێر، ژ۲، س۱، ل۳.
٢٤- چاوپێکەوتنی پیربالّ مەحموود، ٦/۱۱/۲۰۰۰ لە هەولێر.
٢٥- چاوپێکەوتنی گارق ابراهیم شریف، ٦/۱۱/۲۰۰۰ لە هەولێر.
٢٦- ڕۆژنامەی التآخی ڕۆژنامەیەکی سیاسی ڕۆژانە بوو لەبەغدا بەهەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بلاودەکرایەوە. خاوەنی ئیمتیازی ساڵح یوسفی بوو، لەڕۆژی ۲۹/٤/۱۹٦۷دا یەکەم ژمارەی لێ بلاوکراوەتەوە. پاشان لە ۱۸/۱۱/۱۹٦۸دا وەستا، پاش بەیاننامەی (۱۱)ی ئادار لە ۱۹۷۰ دووبارە بلاوکرایەوەو تا ساڵی ۱۹۷٤ درێژەی کێشا.
٢٧- محەمەد مەلوود مەم، شارەوانی و گۆڤاری هەولێر، لە کتێبی هەولێر ۱۸۸۵-۱۹۸۵، ل۲۲۷-۲٤۰.
٢٨- لەبارەی مێژوو و گرنگی وێنەی ڕۆژنامەوانیی بڕوانە:
http://www.islamonline.net/iol-arabic/dowalia/fan-37/alrawe1.asp
فوئاد عەلی ئەحمەد، مێژووی وێنە لە ڕۆژنامەوانیی کوردیدا(۱۸۹۸-۱۹۳۹)، گ ڕۆژنامەنووس، ژ ۱، ۲۰۰٤، ل ۱٦۳- ۱۷۹.
٢٩- حەمە ساڵح فەرهادی، ژمارەی بابەتە ئەدەبییەکانی هەر دوازدە ژمارەکەی دەست نیشانکردووە، بڕوانە: حەمە ساڵح فەرهادی، چەند بابەتێکی ڕۆژنامەنووسی، ل۱۲۳-۱۲٤.
٣٠- بۆدەقی بانگەوازەکە بڕوانە: قەلاتی هەولێرو پڕۆژەی ڕێکخستنی، هەولێر، ۱۹۷۱.
٣١- مەجید عومەر، قەلاتی هەولێرو پڕۆژەی ڕێکخستنی، هەولێر، ۱۹۷۱.
٣٢- بۆ زانیاری لە بارەی ئەم ڕۆژنامەو گۆڤارە کۆمیدیانەوە بڕوانە:
السيد عبدالرزاق الحسني، تاريخ الصحافة العراقية، ج۱، ط۳،۱۹۷۱،ص۱۰۷.
خالد حبيب الراوي، من تاريخ الصحافة العراقية، ص۲٦-۳۵.
٣٣- گۆڤاری شەفەق گۆڤارێکی نیو مانگی ئەدەبی و زانستی و کۆمەلایەتی بووە، لە شاری کەرکوک بە کوردی و عەرەبی دەردەچوو، خاوەنی ئیمتیازو سەرنووسەری عەبدولقادر بەرزنجی بووە، ژمارە یەکی لە (۱۵)ی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ۱۹۵۸ دەرچووە، بەردەوام بووە هەتا ساڵی ۱۹٦۲. دەستەیەک لە مامۆستایان ئیبراهیم ئەحمەدو مارف بەرزنجەیی و عەبدولسەمەد خانەقاو مارف خەزنەدارو عومەر عارف و جەمال خەزنەدار بەڕێوەیان دەبرد. لە ساڵی ۱۹۵۹ لە ژێرچاودێری محەمەدی مەلا کەریم و حەمید عوسمان و گۆران

چاپکراوە، لە پاشان ئیدارەی گواستراوەتەوە سلێمانی و ناوی بووە بە (بەیان) بڕوانە: جەمال خەزنەدار، رابەری رۆژنامەگەری کوردی، ل٦٥.

٣٤- ئەم گۆڤارە (الفكاهة) خاوەنەکەی (حميد المحل) بووەو سەرنووسەرەکانی محمود بهجت و رشيد النجار بوونەو لە بەغدا لە ساڵی ١٩٦٣دا دەرچووەو لە ١٣/٤/١٩٧١ وەستاوەو پاشان لە (٦/٥/١٩٧١)ەوە دووبارە بڵاوبۆتەوە، بڕوانە: زاهدة ابراهيم، كشاف الجرائد والمجلات العراقية، ص٢٩٨.

٣٥- خاڵۆی ڕێبوار، گ.هەولێر، ژ١، ل٣٤.

٣٦- خاڵۆی ڕێبوار، گ.هەولێر، ژ(٢، ٣)، ل٢٢.

٣٧- خاڵۆی ڕێبوار، گ.هەولێر، ژ(٢-٣)، ل١٨.

٣٨- خاڵۆی ڕێبوار، گ.هەولێر، ژ ٢-٣، ل ١٩.


**سەرچاوەکان:**

١- بە زمانی کوردی

**ا- کتێب**

- تەحسین چیچۆ و شێرزاد هەینی، هەولێر لە یادی سەد ساڵەی دامەزراندنی شارەوانی هەولێردا ١٨٨٥-١٩٨٥، چاپخانەی عەلا، بەغدا، ١٩٨٥.
- جەمال خەزنەدار، رابەری رۆژنامەگەری کوردی، بەغدا، ١٩٧٣
- حەمە ساڵح فەرهادی، چەند بابەتێکی رۆژنامەنووسیی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ١٩٩٨.
- عبدالجبار محمد جەباری، مێژووی رۆژنامەگەری کوردی، سلێمانی، ١٩٧٠.
- د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە رۆژنامەنووسیی کوردیدا، بەغدا، ١٩٧٨.
- د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٨٥.
- محەمەد مەولوود مەم، چیرۆکەکان مەم، ب١، چاپخانەی ئەسعەد، بەغدا، ١٩٧٠.
- مەم و ئافەرین، گوڵەبەڕۆژە، کۆمەڵە چیرۆکی منداڵان، چاپخانەی عەلا، بەغدا، ١٩٨١.
- محەمەد مەولوود مەم، چیرۆکەکانی مەم، ب٢، هەولێر، چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٨٤.
- محەمەد مەولوود مەم، پایزە خەون، دار الحرية للطباعة، بەغدا، ١٩٨٧.
- محەمەد مەولوود مەم، ڕێگا، پاکنووسی و ئامادەکردن و سەرپەرشتی چاپ، ئیسماعیل ئەنوەر بەرزنجەیی، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٤.
- هیمدادی حوسێن، رۆڵی گۆڤاری هیوا لە پێشخستنی هونەرەکانی ئەدەبی کوردیدا، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ١٩٩٨.

**ب- رۆژنامەو گۆڤارو بڵاوکراوە:**

- گ.دەفتەری کوردەواری، ژ١، بەغدا، ١٩٧٠.
- گ.سلێمانی، سلێمانی، ١٩٦٨-١٩٧٠.
- گ.شەفەق، کەرکوک، ١٩٥٨-١٩٥٩.
- گ.کاروان، ژ٢، هەولێر، ١٩٩٢، ژ١٥٢، هەولێر، ٢٠٠٠.
- گ.گەلاوێژ، ژ٣، س٩، بەغدا، ١٩٤٨.
- گ.مەم، ژ١، هەولێر، ١٩٩١.
- گ هەولێر، ژ١-١٢، هەولێر، ١٩٧٠-١٩٧٢.
- بڵاوکراوەی رۆڤار، ژ٢، سلێمانی، ٥/٦/١٩٩٩.

**پ- نامەی ماجستێر:**

- تالب محەمەد احمد، لێکۆڵینەوەیکی رەخنەگرانە لە چیرۆکەکانی محەمەد مەولوود (مەم)، (چاپ نەکراو)، کۆلیژی ئاداب- زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر، ١٩٩٣.

**ت- چاوپێکەوتن:**

-چاوپێکەوتنی پیریاڵ مەحموود، هەولێر، ٦/١١/٢٠٠٠.

-چاوپێکەوتنی تارق ئیبراهیم شریف، هەولێر، ٦/١١/٢٠٠٠.

**بە زمانی عەرەبی**

- زاهدة ابراهيم، كشاف الجرائد والمجلات العراقية، مراجعة عبدالحميد العلوجي، بغداد، ١٩٧٦.
- السيد عبدالرزاق الحسني، تاريخ الصحافة العراقية، ج١، ط٣، مطبعة العرفان، صيدا- لبنان، ١٩٧١.
- د.كاظم المقدادي، البحث عن حرية التعبير، ط١، منشورات العالم العربي في باريس، ١٩٨٤.




# شارەوانی و گۆڤاری هەولێر

**محەمەد مەولود مەم**

هەولێر ئەم شارە دێرینە، نەبەزە، کە حەفتا سەدە پترە وەک هەڵۆ لەسەر گردە سەربەرزەکە هەڵنیشتووە، زەبر و زەنگی ڕۆژگار.. ڕەشەباو گەردەلوولی زەمانە، نەی لەقاندووە بە هەموو تواناییەوە بەربەرەکانی لەپێناو.. بوون و مانی دەکا، تیر و مەنجەنیق و شیر و تفەنگ و تۆپی دوژمنانی بە سینگە پۆلاییینەکەی دەگێڕێتەوە،



*Ихсан Мустафа*

ИСПОВЕДЬ МЕРТВОЙ

Однажды летней ночью я сидел на кровати и читал статью моего друга «Человек и прогресс», которую он показал мне, прежде чем отправить в журнал. Статья была содержательная и интересная.

— Али! Что-то не слышно сегодня наших соседей,— заканчивая чтение, обратился я к брату.— На них это не похоже. Не случилось ли у них чего-нибудь?

— Потерпи, наверняка услышишь. А что это за статья у тебя? — Али протянул руку.— Что-то любопытное? — Он пробежал глазами несколько строк, потом отложил статью.— Нет, это не по мне, слишком уж вычурно написано.

В это время до нас донеслись звуки шимшала. Мелодия была тихая, нежная, грустная, то плавная, то отрывистая, пронизанная горем и страданием бедности.

— Ну вот! — воскликнул брат.— Я говорил тебе: потерпи немножко, а ты не верил.

Мелодия, как всегда, исполнялась мастерски, но я был удивлен тем, что в эту ночь сосед исполнял что-то новое. Прежде под его музыку так и подмывало пуститься в пляс. Сегодняшняя же мелодия была какой-то плачущей, похожей на стон девушки, узнавшей о неверности возлюбленного! Мы с Али молчали, целиком поглощенные этими звуками, и незаметно для самого себя я погрузился в сон...

* * *

Я увидел себя на берегу безбрежного моря с синей прозрачной водой. Лунный свет страстно целовал гладь воды, как целует влюбленный свою любимую после

[1] Шимшал — курдский народный музыкальный духовой инструмент

4 Заказ 1088 49

پاڵەوانانە خۆی لەبەر هێرشەکانی فارس و گریک و رۆمان و مەگۆلییەکان گرتووە... هەموو هێرشی دڕندانەی ئەو دوژمنانەی پووچەڵ کردووە و هێرش هێنەرەکانی بەسەرشۆڕی و بەزیوی ڕەتاندووە، ئەم شارە قارەمانە خۆشەویستەمان ماوەیەکی زۆر لە مێژووی پڕ شانازیدا پاش گوێ خراوە و گەلێک جار هاتووە جۆگەلەی ئاوی ژیانی لێ چک بکرێ.. بەڵام بەرگری و ئازایی ڕۆڵەکانی ئەم شارەیان هەردەم پاراستووە دوژمنیان سەرشۆڕ کردووە، لەم حەوت هەزار ساڵە تەنیا رۆژێک ئەم شارە لە ژیان و جووڵانەوە نەکەوتووە...

لە سەردەمی ئەیوبییەکان بە تایبەتی لەکاتی فەرمانڕەوایی سوڵتان موزەفەرەددین ئەم شارە بنکەیەکی زانست و هونەر و پێشکەوتن بووە... وەکو مانگ لەناو ئەستێرەکانی ئەو چاخە درەوشاوەتەوە... کۆمەڵێک زانا و داناو حەکیمی بێ هاوتای پێشکەش بە عالەم کردووە، کە ناویان هەتا ئێستاش لەریزی ئەو مرۆیانە دەهێندرێ، کە کۆڵەکەیەکی شارستانییەت و پێشکەوتن بووینە لەو عەسرەدا..

بەڵام بەداخەوە لەم ساڵانەی دواییدا... بە تایبەتی لە دەوری عوسمانلی و پاش شەڕی گەورەی یەکەمیش... تا دەوری پاشایەتی گۆڕ بە گۆڕکراوی عێراق ئەم شارە دەستی یارمەتی و ئاوەدانکردنەوەی لێ گیرابۆوە، هەتا شۆڕشەکەی ١٤ی گەلاوێژی ١٩٥٨ لەریزی شارە هەرە دواکەوتووەکانی عێراق دەهاتە ژماردن...

هەروەها لەلایەنی رۆشنبیری و بلاوکراوەش ئەگەر سەرەتایەکی کورتی ساڵانی ١٩٥٤- ١٩٥٩ز لە مێژووە دوور و درێژە پڕ مەینەتییەکەی ئەم دواییەی.... لابدەین، بۆمان دەردەکەوێ، کە شاری هەولێر تاکە رۆژنامەیەک یان گۆڤارێکی پێ ڕەوا نەبینراوە! کە بتوانێ بە هۆیەوە ئەرک و ئازار و ئاواتی دانیشتووەکانی دەربڕێ، یان دەنگی ژەنگاو و نووساوی بگەیەنێتە دەوروبەری...

ڕاستە لە سییەکان گۆڤاری ڕۆناکی لەلایەن مامۆستای گەورە و نەمرمان حوزنی موکریانی بۆ ماوەیەک سەری بەرز کردەوە، بەڵام زوو بە زوو دەستی لە هەوکێ نراو بێ نەفەس کرا. مامۆستای خوالێخۆشبووش گیوی موکریانی. ئەویش ڕەنجێکی زۆری کێشا هەتا بتوانێ درێژە بەژیانی ئەو چەند لاپەڕەیەی بەناوی (هەتاو) لەم شارەدا بلاوی دەکردەوە بدا، بەڵام جگە لە ئازار و خەم و پەژارە و جگە لە زیان و ئەرککێشان ئەوەی بۆ مایەوە، کە دڵسارد بکرێ و داری سەوز و تەڕی گۆڤارەکەی وشک بکرێ و لە ڕەگەوە هەڵکەندرێ، دەبێ ناوی ئەم دوو پیاوە دڵسۆزە وەکو دوو تابلۆی پڕ لە شانازی لەتاقی دەرگا فراوانەکەی قەڵاتە بڵند و پیرەکەی هەولێر جێگای خۆیان بگرن..

لە ساڵی ١٩٥٤ رۆژنامەیەک یان ڕاستتر هەفتەنامەیەک بە کوردی و عەرەبی لەلایەن دەستەیەک لە مووچەخۆرانی (مەعاریف) بەناوی هەولێر بۆ ماوەیەک هاتە مەیدان. ئەم دەستەیە لە مامۆستایان عزەدین فەیزی و خوشکە ئەستێر سەعید و هەڤاڵەکانیان پێک هاتبوو.. ئەم رۆژنامەیە لەگەڵ هەموو کەم و کورتی و هەژاریشەوە رۆڵێکی باشی گێڕا و ئەوەشی ساغ کردەوە، کە ئەم شارە تا چ ڕادەیەک تامەزرۆی بلاوکراوەیەکە ڕەنگ و دەنگ و روخساری دانیشتوانی دووبارە بکاتەوە، ئەم رۆژنامەیەش پاش تەمەنێکی کورت و دەورێکی پڕ مەعنا، وەکو ڕۆناکی و هەتاو کوژایەوە و.. لە ئاسۆی شارەکەدا ئاوابوو....

لە سەرەتای شەستەکان شارەوانی هەولێر چوار لاپەڕەی مام ناوەندی بەناوی هەولێر-اربیل- بلاوکردەوە، ئەوەی سەرنجی مرۆ ڕادەکێشا

ئەوەبوو، کە ئەم بلاوکرایەوە هەر چەندە لەدوای دە ساڵ لە دەرچوونی هەولێرەکەی مەعاریف و دوای سی ساڵ لە دەرچوونی ڕوناکی حوزنی موکریانی هاتە مەیدان، کەچی بەگشتی نەیتوانی تەنانەت بەشێک لەو کەلێنەی بەئاوابوونی ئەمانە کەوتە ئاسۆی ژیان و کەلتوور و کەلەپووری شاری هەولێر پڕ بکاتەوە!! بەڕای من هەر سەبارەت بە کەم تەرخەمی و گوێ نەدانیشی بوو لە لایەن کاربەدەستانی شارەکە... ئەو بلاوکراوەیەش تەمەنی کورت و پەکی کەوت و زوو بەزوو هێز و توانای لێ برا.

لە کلکەی شێستەکاندا شارەوانی سلێمانی گۆڤارێکی مانگانەی بەناوی سلێمانی دەرکرد، ئەم گۆڤارە گەیشتبووە دەستی موتەسەریفی ئەوساکەی هەولێر، ئەویش هەر لەسەر بەرگی دەرەوەی گۆڤارەکە بۆ شارەوانی نووسیبووی (ئایا.. شارەوانی هەولێریش توانای بلاوکردنەوەی گۆڤارێکی ئەوهای دەبێ...؟؟) ئیتر ئەوەبوو شارەوانی هەولێر کەوتە خۆی لە ئەنجامدا لە ساڵی ١٩٧٠ توانی یەکەم ژمارەی گۆڤاری هەولێر بە کوردی و عەرەبی لە چاپ بدا و بلاوی بکاتەوە... سەرەکی نووسینی گۆڤارەکە بە من سپێردرا، یەکەم ژمارەی لە سەردەمی بەڕێوەبەرایەتی سەرۆک شارەوانی مامۆستا سەعدی محەمەدئەمین دزەیی لە مانگی مایسی ١٩٧٠ دەرچوو.. گۆڤاری هەولێر پتر گرنگی بەم بابەتانە دەدا:

* بابەتی تایبەت بە دائیرەکانی میری و پرۆژەکانیان و ڕەخنەگرتن لە هەڵسوکەوتی چەوت و نارێکی ئەو دەزگایانە.
* بابەتی وێژە و ژیان.
* بابەتی سایکۆلۆژی.
* بابەتی پزیشکی.
* زمانەوانی و شێوەی نووسین.
* دەوری ئافرەت لە کۆمەڵ و لەکۆڕی خەباتی نیشتمانیدا.
* مێژوو.. ناودارانی هەولێر و ناوچە.
* گۆشەی خاڵۆی ڕێبوار.

ئەو براو مامۆستایانەی بەشداری نووسینی یەکەم ژمارەیان کرد، ئەمانە بوون:

مەجید عومەر ئەندازیار، خوشکە گەلاوێژ شەفیع، حەمە کەریم هەورامی، مەجید ئاسنگەر، محەمەدی مەنگوڕی، عەبدوڵلا پەشێو، مەجید عەبدولڕەحمان، باکووری، عەلی فەتاح دزەیی، پیرباڵ مەحموود، عوسمان خۆشناو، خالید، کەریم شارەزا، مام هێمن مەهابادی، دکتۆر خورشید دزەیی.

هەروەها لە بەشی عەرەبییەکەی، مامۆستایان:

حوسێن ڕەشوانی، بیلال غلام ئەندازیار، سامی شۆڕش، بەشدارییان تیاکرد.

لە ژمارەکانی دیکەش کۆمەڵێک لە نووسەر و شاعیر و ڕۆشنبیرانی کورد بەشدارییان کردووە.. بۆ یەکەم جار لەمێژووی بلاوکراوەکانی کوردیدا شیعرەکانی شاعیری بەناوبانگی کورد مامۆستا هێمن لە زۆربەی ژمارەکانی ساڵی یەکەمی گۆڤارەکە بەناوی (مام حەسەن، و (هـ...) یان هێمن بلاوکراونەتەوە...

ئەم گۆڤارە چۆن هەوڵی دەدا ژیان و مێژوو، ئەدەب و کەلەپووری نەتەوایەتیمان لەسەر لاپەڕەکانیدا بخاتە ڕوو... لایەنی ڕەخنەی کۆمەڵایەتی، کەم و کوڕ و کەلەبەرێک لە ژیانی ڕۆژانەی شارە خۆشەویستەکەمان، وەکو دیاردەیەکی نەویست سەریان هەڵدەدا، بەشێوەیەکی (کاریکاتێر) لە گۆشەی خاڵۆی ڕێبوار دەستنیشان و ئەنگوستی بۆ ڕایەڵ دەکردن، بەتایبەت ئەو ناتەواوییانەی لە لایەن دەسگاکانی میری بە زەقی دەکەوتنە ڕوو. خەڵکی شار هەستیان پێ دەکرد و بەهۆیانەوە ئەرکیان دەکێشا و بێزاریان لە ئاستیاندا دەنواند. وەکو ناتەواوییەکانی ئاو و کارەبا و نەخۆشخانەکان و ڕێگا و بان و پەروەردە و زانست و ڕاگەیاندن و ڕێکوپێکی شار، هتد.... بە توندی بەربەرەکانی دژ بە لادانی ئەو دەزگایانە، یان هەندێک کەسیان دەکرد، کە بە ئەنقەست یان بەبێ قەست، لە یاسا و نەریت، لە دادپەروەری و ڕێڕەوی ڕاستەقینەی میللەتەکەمان کەج ڕۆییان دەکرد و لایان دەدا یان بێ دەسەلاتیان دەنواند. ئەوە زۆر ڕاستە کەم کەس هەن پێ لەزاتی خۆیان بنێن و بەوە ڕازی بن سەرپۆش لە سەر عەیب و عاریان لابدرێ، کەمتریش بەوە هەڵدەچن ئەگەر تەنانەت باسی هەڵسوکەوتی نارێکیان بکرێ؟ وەکو

ئەمانە لەم شارەدا.. لەناو ئەم کۆمەڵەدا سەرپشک بن و لەهیچ کردەیێک دەیکەن بەرپرس نەبن! یان پەیوەندییان بە کۆمەڵەوە نەبێ و ئەنجامی هەڵسوکەوتی نارێکیان بەچاک یان ناچاک لە کۆمەڵ ڕەنگ نەداتەوە!! بەشێک نەبێ لە جموجۆڵ و جوولانەوەی مێژوویی ئەم شارە!! ئەمانە ڕەخنەی دروست و پاکەکانی گۆڤارەکەیان پێ قووت نەدرا بە تەمای ئەوە بوون، کە بە حوکمی جێگا و دەسەڵاتەکانیان ئەم شارە بەگشتی و گۆڤارەکەش لەخزمەتی ئەوان و لەناو کەوانەی ئەوان خول بخواتەوە.. بەسەر و سمێڵی ئەوان هەڵبدا!! تاکو لە ئەنجامی ئەم چۆنیەتییە پاش ساڵێک لە دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤارەکە، واتا لە ژمارەی دووەمی ساڵی دووەمی، کە لە مانگی ئەیلوولی ١٩٧١ دەرچوو و بلاوکرایەوە منیان لە سەرۆکی نووسین لادا.

دەستە تازەکەی نووسین و بەڕێوەبردنی گۆڤارەکە ئەم برا و مامۆستایانەی خوارەوە بوون:

ئەندازیار هاشم عەبدوڵلا بەڕێوەبەری شارەوانی، ئەندازیار مەجید عومەر، بیلال عەزیز، مەغدید سۆران، پیرباڵ مەحموود.

ئەم دەستەیەش لە ساڵی دووەمی چوار ژمارەیان لە سێ بەرگدا دەرکرد و تاقە ژمارەیەکیان بە بەشداری خاڵۆی ڕێبوار لە ساڵی سێیەم لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٢ هێنایە کایەوە، ئیتر لەو ڕۆژەوە دەنگی گۆڤارەکە کپ کراو تا ئێستاش بڕایەوە.

لە ساڵی ١٩٧٦ لەو سەردەمەی، کە مامۆستا سیروان جاف فەرمانی ئەمینداریەتی گشتی شارەوانییەکان و هاوینەهەوارەکانی بە ئەستۆوە بوو، داوای لێ کردم ڕاپۆرتێک لەبارەی گۆڤارەکەی بۆ بنووسم و ئەوەی بۆ ساغ بکەمەوە، ئەگەر بتوانرێ سەر لەنوێ بژێیتەوە مەیدانی خزمەتی شاری هەولێر و ناوچەکە، منیش ڕاپۆرتێکی دوور و درێژ و پڕ و چڕم بۆ ڕێکخست، بەڵام مەسەلەکە هەروەکو خۆی مایەوە و چۆن خەوتبوو بە ئاگا نەهاتەوە.

هیوادارم کاربەدەستانی ئۆتۆنۆمی کوردستان، فەرمانی ژیاندنەوەی گۆڤارەکە بخەنە ئەستۆ، وابکەن کە دیسان لە ئاسمانی شارەکەمان ڕووناکی بداتەوە.

لە وڵاتە پێشکەوتووەکان شارەوانی سەرەڕای ئەرکە کلاسیکییەکانی، فەرمانی کردنەوەی باخچەی ساوایان و قوتابخانە بە هەموو پلەکانیانەوە و دانشگە و دامەزراندنی دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەشیان گرتۆتە ئەستۆ، چونکی ئەوەیان بۆ ڕوون بۆتەوە، کە پەروەردەی ڕۆشنبیری لایەنێکی گرنگ لە ئاوەدانکردنەوە و پێشکەوتنیان پێک دەهێنێ.

لە مەودای کورتی تەمەنی گۆڤاری هەولێر ئەم ژمارانەی لێ چاپ و بلاوکرانەوە:

* لە ساڵی یەکەم: شەش ژمارە لە چوار بەرگدا.

* لە ساڵی دووەم: پێنج ژمارە لە چوار بەرگدا.

* ساڵی سێیەم: ژمارەیەکی تاقانە.

ژمارەکانی گۆڤارەکە لە چاپخانەی شارەوانی کەرکووک و چاپخانەی کوردستان لە هەولێر لە چاپخانەی (الغری) لە (نەجەف) لە چاپ دراوە.

جگە لەم ژمارانەش، نامیلکەیەکی تایبەت بە پڕۆژەی چاککردنەوە و پێشخستنی قەڵاتی هەولێر، وەکو پاشکۆی گۆڤارەکە بلاوکراوەتەوە، ئەم پاشکۆیە نویشکی ئەو لێکۆڵینەوە و دراساتانە بوو، کە لەو بابەتە نووسرابوون و ئەندازیار مەجید عومەر پێیان داچووبووەوە و ڕێکی خستبوو.

وەکو لە سەرەوە باسم کرد، گۆشەی خاڵۆی ڕێبوار هۆی سەرەکیی کپکردنەوەی دەنگی گۆڤارەکە بوو، هەر لە پێناو ئەوەش، کە خوێنەری بەڕێز فیکرەیەک لەو گۆشەیەوە وەربگرێ، ئەوا لێرەدا چەند نموونەیەک لە نووسینە کاریکاتێرییەکانی خاڵۆ دەخەمە پێش چاو. ئەمانە لە دووتوێی ژمارەکانی ساڵی یەک و تاقە ژمارەکەی ساڵی سێ بلاوکرابوونەوە.

**١- پاسەکانی ئێمە:**

کابرایەک لەژێر پاسەکانی (مەسلەحەی نەقلی ڕوکاب) لە ڕێگای ئازادی وەستابوو، کاتێک بە بەردەمیدا ڕادەبووردم لێی پرسیم:

- خاڵۆ ئەوە هۆی چییە هەندێک جار تا سەعاتێک سەر و سەکوتی

پاسێکی مەسلەحە دەرناکەوێ، کەچی لــە هــیــکــرا ســێ چــواریــان وەک شەمەندەفەر بە دوو یەکدا دەکشێن؟؟

منیش هەر ئەم وەڵامەم لا ماقووڵ بوو کە پێم گوت:

- ئاخر پاسەکانی مەسلەحەی هەولێر (اجتماعین) و بەپێی غەریزە ڕانەهاتوون بە تەنیا بە ڕێگادا بڕۆن!!

کابرا بزەیەک گرتی، لچی شۆڕ کردن، بە پەلە بووم بۆم نەکرا لێی بپرسم، کە مــرازی لەو بزە و لچ شــۆڕکــردنەوەی چی بوو؟

**٢- ئەنسکلۆپیدیای ئەدیبانی کورد:**

ئەمــــە لاپەڕەیەکــــە لە (دائرة المعارف)ی نووسەرانمان، بۆ شارەزایی هەمــووە ئەدەبدۆســتــان تۆمــار کــرا.. لەگەڵ سوپاس.

(ناکام) و (خەمگین) و (برسی) و (ئاوارە)؟

(خەمبار) و (پەشێو) (هەژار) (زامدارە).

(دڵزار) و (فــانی) (خــادم) و (کەساس).

(بێ کــەس) و (بێــبــەش) (بێخەو).. (پەژارە).

یــەک (دەربــەدەر). و... یــەک قوربەسەرە.

ئەمــیــان (بێ چاو)، و ئەویان (بێمار)ە..

(مەدهۆش) و (بێسەر) (حەزین) و (سەرسام).

بەرۆژ (قــــەلەندەر) بەشــــەو (بێدارە).

(دڵبەند) و (ژاکاو) (کڵۆڵ) و (داماو).

(حــەریق) و (ســووتاو) (برژاو) (هاوارە).

خاڵۆ تۆ چیتە لەم سەر ئێشەیە.

وەدەرت دەنێن ئاخیر لەم شارە.

٣- وێنەیەک لە ئیعرابی کوردی:

ئیعرابی.. وەیان ئیکرادی:

رستە: چووم بۆ دهۆک...

چوو: کــرداری رابردووی بینراوە، پاڵدراوە..

م: راناوی لکاوی پاڵپشتە..

بۆ: ئامرازی پەیوەندییە.

دهۆک: نــاوە، تەواوکـــــــەری یاریدەدەری پاڵدراوی، پاڵپــشــتــە کرداری چووە..

هەر کەسێک شەرحی ئەم ئیعرابە بە کــوردی بکا خــەڵات دەکــرێ، لەوانەیە بکرێ بە ئەندامی لێژنەکانی دانان و تەرجەمە و بلاوکردنەوە لە وەزارەتی کاروباری ژووروو، خۆیشی لە مــەجــمــەعی عــیلمی کــوردی دەخشێنێ، بە مەرجێ، شەرحەکە لە (٣٠) لاپەڕە پتر نەبێ و بەخەتێکی خۆش و زمانێکی تەڕ و کوردییەکی پەتی.. تەواو پەتی.. لەســــــەر ڕوویەکی کاغەز بنووسرێ..

پرسیــار: ئەم رستــەیە ئیــعــراب بکە....

(هەیتە لە راژەی گەلە).

**٤- بانگەوازێک:**

(بەڕێوەبەری شــارەوانی هەولێــر بانگی هەموو دانیشتوانی شار دەکا ئــەوانــەی (عــــــــەریزە) دەدەن و مــراجــعــەتی شــارەوانی دەکــەن بۆ بەشــداربوون لەپرۆژەی ئاو، جگە لە پوولەکــانی سەر عــەریزەکانیــان هەر یەکەیان پەرداخێک ئاو دەگەڵ خۆیان بهــێنن و بیکەن بە کــوپەکــەی بەر دەرگای شارەوانی، بۆ ئەوەی لەکاتی دەوام فەرمانبەرەکانی تێنوێتییان پێ بشکێنن. هەر کەسەی ئەم مەرجە جێ بەجێ نەکا.. ئاوی پێ نادرێ؟!

**٥- بازرگانی:**

دەڵێن لە وڵاتەکــانی رۆژئاوا، بە تایبــەتی لە فــەرەنسا گــۆشتی بۆق لە گــۆشــتــەکــانی تر بەنرختــرە! لە هەولێــریش خــوا بەزۆری نەزانێ، لە هەر کۆڵانە و گەڕەکێک گۆمێک هەیە و بە هەزاران بۆقــیــان تێــدا دەژین! بیــری ئەوەم دەکردەوە، کە بۆ چ مرۆ قازانجێک لەمە وەدەست نەهێنێ؟

من زۆر پێم خـــۆشــــە ئەگــــەر (ئیــدارەی مــحــەلی) و (شــارەوانی) مــاوەم بدەن بۆ خــۆم (شــەریکەیەک) دروست بکەم بۆ (تصــــدیر)ی ئەم بۆقانە! بۆ دەرەوە!

بڕوا ناکەم ئەم کــارەش (دکــتــۆری صــحــەی شــار) رازی نــەبێ، بەهۆی ئەوەی کە گــوایا وجودی بۆق باشە بۆ لەناوبردنی مێش و مەگەز ئەرێ ئێوە ئەم بازرگانیەتان پێ چۆنە.

لە کــۆتاییدا لــەیادی سەد ساڵەی دامــەزراندنی شــارەوانی هەولێــر چەپکێک گـــوڵی رەنگــاو رەنگ پێشکەش بێت، لەگەڵ هیوای خۆشی و سەرکەوتنی هەموو لایەک.

**هەولێر ١٠/٧/١٩٨٤**



# ڕاگەیاندن دوای ڕاپەڕین لە هەولێر

ئا: دەزگای بەدرخان
بە هاوكاری مەسعودی مەلا هەمزە

ئەگەر باس لە مێژووی ڕۆژنامەگەری كوردی بكەین، ئەوا بێگومان دەبێ لە ڕۆژنامەی كوردستانی دایك و میقداد مەدحەت بەدرخانەوە دەست پێ بكەین، چونكە ئەوان پێشەنگی ڕۆژنامەگەری كوردی بوونە و توانیویانە یەكەم بڵاوكراوەی كوردی بخەنە بوون، ئەگەرچی لەوانەیە كارەكەی ئەوان شێوە پچڕ پچڕیەكی پێوە دیار بووبێ، بەڵام ئەوەش هۆكاری هەبووە و بێ هۆ نەبووە، بەڵام ئافەرین بۆ بنەماڵەی بەدرخانییەكان كە كۆڵیان نەدا و لە چەندین شار و وڵاتی جیا جیا ڕۆژنامەی كوردستانیان بە چاپ گەیاند.

ئەگەر باس لە دوای كوردستانی دایك بكەین، ئەوا ناو ناوە و بە شێوەیەك لە شێوەكان چەندین گۆڤار و ڕۆژنامەی كوردی دەرچوونە، ئەزموونی دوای ئەوانیش بۆ كورد بریتییە لە بڵاوكراوەكانی شاخ و دەركردنی ڕۆژنامەی خەبات و التآخي و چەندین گۆڤاری دیكە، ئەوەی لێرەدا مەبەستمە باسی بكەم و تیشكێكی ڕوونی بخەمە سەر، ڕەوشی ڕۆژنامەگەری و ژمارەی بڵاوكراوەكانە لە شاری هەولێر لەدوای ڕاپەڕین، چونكە هەمووومان دەزانین ڕاپەڕین وەرچەرخانێكی گەورە بوو لە مێژووی خەباتی

ڕزگاریخوازی گەلی کوردستان و لە کۆتاییشدا ئەو ئاواتەی کوردان هاتە دی، بۆیە سەیر دەکەین بەپێی ئەو ئامارانەی لەبەردەستن هەر لەدوای ڕاپەڕین بە ساڵێک و لە ساڵی ١٩٩٢ مەکتەبی ناوەندی ڕاگەیاندنی "ی.ن.ک" ڕۆژنامەی کوردستانی نوێی وەکو ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە دەرکردووە.

ئەوەی سەیرە و جێگای لێ وردبوونەوەیە دەبینین دوای ڕاپەڕین لێشاوێکی یەکجار زۆر بلاوکراوە جا چ "ڕۆژانە، هەفتانە، مانگانە، نیومانگی"ی بێ لە هەولێر دەرچوونە، لێرەدا هەوڵدەدەین ژمارە و ناوی دەرچوونی بلاوکراوەکانی لە هەریەک لە ساڵەکان بخەینەڕوو...

* ساڵی ١٩٩٢ هەموومان دەزانین ئەو ساڵە کاتێکی زۆر گرنگ و حەساس بووە بۆ کوردستان، هەر بۆ یەکەم جاریش لە ١٩٩٢/٥/١٩ لە مێژووی کورد هەڵبژاردن ئەنجامدرا و کابینەی یەکەمی حکومەتی هەرێم پێکهێنراوە، لە بەرامبەر ئەوەشدا دەبینین لەگەڵ خەباتە سیاسییەکەشیدا کورد هەوڵی چەسپاندن و برەو پێدانی لایەنی ڕۆشنبیری خەڵکی داوە و لەو وەزعە ناهەموارەدا مەکتەبی ڕاگەیاندنی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان دوو بلاوکراوەی دەرکردووە، ئەو دوو بلاوکراوەیەش بریتین لە:

١- کوردستانی نوێ- ڕۆژانە- بلاوکراوەی مەکتەبی ڕاگەیاندنی "ی.ن.ک".

٢- الشرارة/ الاتحاد- هەفتانە- بلاوکراوەی مەکتەبی ڕاگەیاندنی "ی.ن.ک".

* ساڵی ١٩٩٣: بە بەراورد لەگەڵ ساڵی ١٩٩٢ سەیر دەکەین ژمارەی بلاوکراوەکان لەو ساڵەدا بە ڕێژەی ٣ بەرابەر و بگرە زیاتریش زیادی کردووە، ئەو بلاوکراوانەی لەو ساڵەدا دەرچوونە بریتین لە:

١- خەبات- ڕۆژانە- بلاوکراوەی مەکتەبی ڕاگەیاندنی "پ.د.ک".

٢- برایەتی- ڕۆژانە- بلاوکراوەی مەکتەبی ڕاگەیاندنی "پ.د.ک".

٣- طريق الشعب- هەفتانە- بلاوکراوەی حزبی شیوعی عێراقی.

٤- کوردستان نیوز/E- مانگانە- بلاوکراوەی پارتی دیموکراتی کوردستان.

٥- پێشکەوتن- تایبەت بە بۆنە و یادەکان- بلاوکراوەی یەکێتی قوتابیانی کوردستان.

٦- دەنگی زانا- خولەکی- بلاوکراوەی یەکێتی زانایانی ئایینی کوردستان.

٧- کادیر- وەرزی- بلاوکراوەی "پ.د.ک".

* ساڵی ١٩٩٤: لەو ساڵەشدا بە هەمان شێوەی ساڵی پێشوو ژمارەی بلاوکراوەکان بەشێوەیەکی بەرچاوتر و چالاکانەتر رووی لە زیادبوون کردووە، ئەو بلاوکراوانەی لەو ساڵەشدا دەرچوونە، بریتین لە:

١- یەکگرتوو- هەفتانە- بلاوکراوەی یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان.

٢- خەباتی قوتابیان- بلاوکراوەی "پ.د.ک".

٣- زەنگ- هەفتانە- بلاوکراوەی "پ.د.ک".

٤- تەرازوو- وەرزی- بلاوکراوەی یەکێتی مافپەروەرانی کوردستان.

٥- ڕێبازی نوێ- گۆڤار، بلاوکراوەی مەکتەبی ڕێکخستنی "ی.ن.ک".

٦- مەشکە- (دیار نییە کە بلاوکراوەی کێیە).

٧- حەدیاب- بلاوکراوەی "پ.د.ک".

٨- پەروەردە و سایکۆلۆجی- (دیار نییە کە بلاوکراوەی کێیە).

٩- بيت النهرين/ ئاسوری- مانگانە- بلاوکراوەی ئاشوورییەکان.

* ساڵی ١٩٩٥: زۆر بەداخەوە لەو ساڵەدا ژمارەی دەرچوونی بلاوکراوەکان رووی لە کەمی کردووە و لەو ساڵەدا تەنها دوو بلاوکراوە دەرچوونە، ئەوەش لەوانەیە کاریگەری شەڕی ناوخۆ بێ، کە وایکردبێ ئەو مەجالە نەبووبێ، دوو بلاوکراوەکەی ئەو ساڵە بریتین لە:

١- پاڵە- مانگانە- بلاوکراوەی مەکتەبی ڕاگەیاندنی پارتی کرێکاران و ڕەنجدەرانی کوردستان.

٢- میدیا- هەفتانە- بلاوکراوەی یەکێتی نەتەوەی دیموکراتی کوردستان.

* ساڵی ١٩٩٦: هەموومان دەزانین ئەو ساڵە گەرمەی شەڕی ناوخۆ بوو لە کوردستان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە شاری هەولێر ٤ بلاوکراوەی تر دەرچوونە، ئەوانیش بریتین لە:

١- شانەدەر- مانگانە- بلاوکراوەی بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوار.

٢- هۆزان- مانگانە- (دیار نییە کە بلاوکراوەی کێیە).

٣- دەنگی میللەت- مانگانە- بڵاوکراوەی بزووتنەوەی میللی کوردستان.
٤- ڕێگای کوردستان- هەفتانە- بڵاوکراوەی حزبی شیوعی کوردستان.

* ساڵی ١٩٩٧: جێی دڵخۆشییە و لە زیادبوونی ژمارەی ئەو بڵاوکراوانە لەو ساڵەدا دەردەکەوێ، کە ئەگەر کورد کێشەی نەبێ هەردەم حەز بەکاری ڕووناکبیری و ڕۆژنامەنووسی دەکا، چونکە دەبینین تەنها بە تێپەڕبوونی چەند مانگێک بەسەر شەڕی ناوخۆدا کەچی لەو ساڵەدا تەنها لە شاری هەولێر ١٠ بڵاوکراوەی تر دەرچوونە، کە ئەمانەن:

١- ئاینده- مانگانە- بڵاوکراوەی یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان.
٢- قارداشلق/ تورکی- هەفتانە- بڵاوکراوەی یانەی برایەتی تورکمان.
٣- بەهرا- مانگانە- بڵاوکراوەی بزووتنەوەی دیموکراتی ئاشووری.
٤- یاساپارێزی- ساڵانە- (یەکێتی مافپەروەرانی کوردستان).
٥- خۆری ئیسلام- وەرزی- بڵاوکراوەی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی.
٦- کشتوکاڵ- وەرزی- بڵاوکراوەی وەزارەتی کشتوکاڵ و ئاودێری.
٧- تەندروستی- مانگانە- بڵاوکراوەی وەزارەتی تەندروستی.
٨- مەلای مەشهوور- هەفتانە.
٩- تیشکی زانکۆ- مانگانە- بڵاوکراوەی زانکۆی سەلاحەدین.
١٠- نووسەری نوێ- مانگانە- بڵاوکراوەی یەکێتی نووسەرانی کورد- لقی هەولێر.

* ساڵی ١٩٩٨: لەو ساڵەشدا هەستدەکەین گەرموگوڕییەک لەناو کاری ڕۆژنامەگەری کوردیدا بوونی هەبووە، بۆیە لەو ساڵەشدا چەندین بڵاوکراوە دەرچوونە، ئەوانیش:

١- مەشخەڵی تورکمان- بڵاوکراوەی حزبی ڕزگاری نەتەوەیی تورکمان.
٢- یەنی دەورەم- بڵاوکراوەی حزبی وەتەنی تورکمانی.
٣- ڕەنگارە- وەرزی.
٤- گوڵان- هەفتانە- بڵاوکراوەی "پ.د.ک".
٥- ڕامان- هەفتانە- بڵاوکراوەی "پ.د.ک".
٦- گوڵانی عەرەبی- هەفتانە- بڵاوکراوەی "پ.د.ک".
٧- پەیامی مامۆستا- بڵاوکراوەی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان.
٨- ماف- نیو مانگی.
٩- پەیڕەو- مانگانە- بڵاوکراوەی یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی کوردستان.
١٠- سروشت- وەرزی- بڵاوکراوەی وەزارەتی پیشەسازی و وزە.
١١- ڕۆژنامەڤانی- بڵاوکراوەی سەندیکای ڕۆژنامەنووسان.
١٢- هەولێر- وەرزی، (پارێزگای هەولێر دەریکردووە).

* ساڵی ١٩٩٩: ساڵ لە دوای ساڵ و بە تێپەڕبوونی کات ژمارەی بڵاوکراوە کوردییەکان لە کوردستان بەگشتی ڕووی لە زیادبوون کردووە، ئەو ساڵەش بەدەر نەبووە لەو کارە، بڵاوکراوەکانی ئەوساڵەش خۆیان لەو بڵاوکراوانەی خوارەوە دۆزیوەتەوە:

١- ئاراس- مانگانە- بڵاوکراوەی "پ.د.ک".
٢- دیجلە.
٣- کاروان- مانگانە- گۆڤار- بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری.
٤- هەنگ- بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری.
٥- دەنگی قەڵات.
٦- نەهرینیتا- سریانی- وەرزی- بڵاوکراوەی یەکێتی ئافرەتانی ئاشووری.
٧- المثقف الكلداني- وەرزی- بڵاوکراوەی کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کلدان.
٨- الايمان- وەرزی.
٩- بارش- مانگانە- بڵاوکراوەی ڕۆشنبیری تورکمانی.
١٠- میزلتا- مانگانە- بڵاوکراوەی قوتابیانی ئاشووری.
١١- تورکمان ئیلی- نیو هەفتانە- بڵاوکراوەی بەرەی تورکمانی.
١٢- هەژان- مانگانە- بڵاوکراوەی ڕۆشنبیری ئازاد.

* ساڵی ٢٠٠٠: لە دەستپێکی ساڵەکانی سەدەی بیست و یەکەم، لە هەولێر چەندین بڵاوکراوە دەرچوونە،

ئەمانەن:
١- شارەوانی- هەفتانە- بلاوکراوەی وەزارەتی شارەوانی.
٢- الحقیقة- بلاوکراوەی کۆمەڵەی ڕۆشنبیری تورکمان.
٣- عەدالەت- وەرزی- بلاوکراوەی لقی هەولێری یەکێتی مافپەروەرانی کورد.
٤- ئەندازیار- وەرزی- بلاوکراوەی سەندیکای ئەندازیاران.
٥- ئاوەدان کردنەوە- بلاوکراوەی وەزارەتی ئاوەدان کردنەوە.

* ساڵی ٢٠٠١: ئەو ساڵە لەگەڵ ساڵی پێش خۆی لە دەرچوونی بلاوکراوەکان لەیەکتر نزیکن، بلاوکراوەکان ٢٠٠١ ئەمانەن:
١- هاوبیر- هەفتانە.
٢- چرا- مانگانە- بلاوکراوەی بەڕێوەبەرایەتی نەخۆشخانەی رزگاری.
٣- دم دم/ لاتینی- مانگانە- بلاوکراوەی هوتێلی دم دم
٤- شاوشکا- وەرزی.
٥- پارێزەر- وەرزی- بلاوکراوەی سەندیکای پارێزەرانی کوردستان.
٦- هاڤیبوون- مانگانە- ئەو گۆڤارە لە وڵاتی ئەڵمانیا دەردەچێ و سالمێ جاسم خاوەن ئیمتیازیەتی.

* ساڵی ٢٠٠٢: لەو ساڵەشدا وەکو هەموو ساڵەکانی دیکە، ٨ بلاوکراوەی نوێ لە شاری هەولێر دەرچوونە، کە ئەمانەن:
١- نیشتمان- هەفتانە، بلاوکراوەی پارتیکاری سەربەخۆی کوردستان.
٢- ژمێریاری/ک/ع- نیو ساڵانە، بلاوکراوەی سەندیکای ژمێریاران و وردبینی.
٣- خازر، گۆڤار، وەرزی، لە بەردەڕەش دەردەچێ.
٤- ئابووری سیاسی/ گۆڤار، وەرزی، بلاوکراوەی سەندیکای ئابووریناسان.
٥- نما/ک- گۆڤار- وەرزی- بلاوکراوەی سەنتەری نما.
٦- الحوار- مانگانە، بلاوکراوەی یەکگرتووی ئیسلامی.
٧- نواڵەی نوێ- گۆڤار- مانگانە- گۆڤارێکی ئەهلییە و سەنتەری ڕۆشنبیری بەهرە دەریدەکا.
٨- فێرکاری ڕۆشنبیری- مانگانە- بلاوکراوەی وەزارەتی پەروەردە.

* ساڵی ٢٠٠٣: لەو ساڵەشدا وەکو دەردەکەوێ بەهۆی باری ئەمنی عێراق و ئازادکردنی دەرچوونی بلاوکراوەکان پێشڤەچوونێکی وای بەخۆوە نەدیوە و کەمتر لە ساڵی پێش خۆی ٦ بلاوکراوە دەرچوونە، کە ئەمانەن:
١- کوردستان سپۆرت- بلاوکراوەی ئەنجوومەنی باڵای وەرزش.
٢- پارێزگاران- بلاوکراوەی پارتی پارێزگارانی کوردستان.
٣- الصحفي- نیومانگی- بلاوکراوەی سەندیکای ڕۆژنامەنووسان.
٤- ئاسۆ- ڕۆژانە.
٥- کەپر- مانگانە.
٦- خاتووزین- گۆڤار- مانگانە- بلاوکراوەی سەنتەری خاتووزین.

* ساڵی ٢٠٠٤: ئەو ساڵە ساڵێک دوای ئازادکردنی عێراقە و ئەو ئازادییە تەواو ڕەنگی داوەتەوە لە دەرکردنی بلاوکراوەکان و لەو ساڵەدا ١٨ بلاوکراوەی نوێ دەرچووە، کە ئەوانەن:
١- نەخۆشیار- مانگانە- بلاوکراوەی کۆمەڵەی نەخۆشیارانی کوردستان.
٢- هەورێ- ساڵانە- بلاوکراوەی "پ.د.ک".
٣- گوڵەگەنم- وەرزی- بلاوکراوەی سەنتەری خاتووزین.
٤- الینابع- نیومانگی.
٥- ئۆراسیا- وەرزی- بلاوکراوەی کۆمپانیای ئۆراسیا.
٦- زانکۆی نوێ- مانگانە- بلاوکراوەی زانکۆی سەلاحەدین.
٧- ڤێترنەری- مانگانە- بلاوکراوەیەکی ئەهلی بووە.
٨- ئاراسی وەرزشی.
٩- ئاوات- وەرزی- بلاوکراوەی کۆمەڵەی چاودێری و چارەسەری منداڵ نەبوون.
١٠- شەقلاوە- وەرزی- بلاوکراوەی کۆمەڵەی ڕۆشنبیری شەقلاوە.
١١- دەنگی نوێ- وەرزی- بلاوکراوەی یەکێتی ئافرەتان.
١٢- ئاسۆ- بووە بە ڕۆژنامە- بلاوکراوەی یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان.
١٣- پەیامی ڕزگاری- هەفتانە- بلاوکراوەی حزبی ڕزگاری کوردستان.

١٤- جەماوەر- هەفتانە- بلاوکراوەی "پ.د.ک".
١٥- هزری یاسایی- یاسایی.
١٦- بێت عنکاوە- مانگانە- بلاوکراوەی ڕۆشنبیری کلدان.
١٧- ستایل- بلاوکراوەی "پ.د.ک".
١٨- خانمانی ئەمڕۆ- مانگانە- بلاوکراوەی کۆمەڵەی خانمانی میللی کوردستان.
١٩- بەڵێندەران- وەرزی- بلاوکراوەی یەکێتی بەڵێندەرانی کوردستان.
٢٠- موکریانی- وەرزی- بلاوکراوەی "پ.د.ک".
٢١- زامیار- مانگانە- بلاوکراوەی سەندیکای خاوەن پیشە تەندروستییەکان.

* ساڵی ٢٠٠٥: دوابەدوای ئازادکردنی عێراق و بەرقەراربوونی ئاشتی و ئازادی لە کوردستان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ژمارەی بلاوکراوەکان لە زیاد بوون بووە، لەو ساڵەشدا دەبینین ١٧ بلاوکراوە دەرچوونە، کە ئەمانەن:

١- زاری کرمانجی- بلاوکراوەی دەزگای ئاراس.
٢- هەولێر- بلاوکراوەی پارێزگای هەولێر.
٣- گەنج لاند- هەفتانە- بلاوکراوەی ڕێکخراوی تواناسازی لاوانی کوردستان.
٤- هەولێر پۆست- نیو مانگی.
٥- ئاسۆ- ڕۆژنا ڕۆژێک- بلاوکراوەی یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان.
٦- خۆری زانکۆ- وەرزی- بلاوکراوەی کۆمەڵێک خوێندکاری زانکۆی کۆیە.
٧- ڕاگەیاندن- مانگانە- بلاوکراوەی بەشی ڕاگەیاندنی پەیمانگای تەکنیکی هەولێر.
٨- بازاڕی ئابووری- هەفتانە.
٩- جیهانی نوێ/ک- مانگانە- بلاوکراوەی مەڵبەندی ٣ی ڕێکخستنی "ی.ن.ک".
١٠- تەکنیکی سەردەم- وەرزی- بلاوکراوەی سەندیکای خاوەن پیشە ئەندازەییەکان.
١١- شیت- بلاوکراوەی دەزگای ئاراس.
١٢- ستاندەر/ک- مانگانە.
١٣- نیوستی- نیو مانگی- بلاوکراوەی سوپەرمارکێتی نیو ستی.
١٤- شرۆڤە- وەرزی- بلاوکراوەی "پ.د.ک".
١٥- پاراسایکۆلۆجیا- وەرزی- بلاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری.
١٦- کۆمپیوتەر- مانگانە- بلاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری.
١٧- مێرگ- مانگانە- گۆڤار- بلاوکراوەی دەزگای مێرگ.
١٨- زێرەڤانی کوردستان- وەرزی- بلاوکراوەی وەزارەتی ناوخۆ- فەرماندەی زێرەڤانی.

* ساڵی ٢٠٠٦: لەو ساڵەدا بەرێژەیەکی بەرچاو و فراوان ژمارەی بلاوکراوەکان زیادبووە و خۆی لە ٢٧ بلاوکراوە دەبینێتەوە، کە ئەهلی و حزبی و حکومی دەگرێتەوە، ناوەکانیشیان بریتییە لە:

١- بایۆ نیوز- وەرزی.
٢- دەشت- مانگانە- بلاوکراوەی "پ.د.ک".
٣- بەیبی/ک- مانگانە.
٤- ڕاشان- وەرزی- بلاوکراوەی مەکتەبی ناوەندی جەماوەری "پ.د.ک".
٥- شانۆ/ک/ع- مانگانە- بلاوکراوەی سەندیکای هونەرمەندان.
٦- سەفین- مانگانە- بلاوکراوەی "پ.د.ک".
٧- دایک- مانگانە- بلاوکراوەی یەکێتی ڕۆشنبیرانی نەتەوەی کورد.
٨- گەشت و گوزار- وەرزی- بلاوکراوەی بەڕێوەبەرایەتی شارەوانی.
٩- تەزوێنە- مانگانە- بلاوکراوەی کۆمەڵەی کاریکاریستانی کوردستان.
١٠- کوردی ڕەسەن- مانگانە.
١١- پایتەخت- مانگانە- بلاوکراوەی سەنتەری ڕۆشنبیری پایتەخت.
١٢- ڕۆمانسی- گۆڤار- وەرزی، ئەو گۆڤارە هەڵکەوت زاهیر خاوەن ئیمتیاز و ڕێدار سابیر سەرنووسەری بوو.
١٣- زێ- وەرزی.
١٤- مرۆڤ- وەرزی- بلاوکراوەی وەزارەتی مافی مرۆڤ.
١٥- عەدالەت/ک/ع/ تورکمانی- مانگانە.
١٦- نووهات- مانگانە.
١٧- هەڵبژاردن- وەرزی- بلاوکراوەی دەزگای گشتی هەڵبژاردن.

١٨- پیشەسازی- مانگانە- بڵاوکراوەی وەزارەتی پیشەسازی.
١٩- لاپەڕە زەردەکانی هەولێر- نیو ساڵانە.
٢٠- دێرین- نیو مانگانە- بڵاوکراوەی کۆمەڵەی پێشمەرگە دێرینەکانی کوردستان.
٢١- بازرگانی سەردەم- هەفتانە- بڵاوکراوەی ژووری بازرگانی و پیشەسازی هەولێر.
٢٢- کوردڤین- هەفتانە- بڵاوکراوەی سەنتەری ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی کوردڤین.
٢٣- جیهان- هەفتانە- بڵاوکراوەی گرووپی کۆمپانیای جیهان.
٢٤- ئاڵا- نیو مانگی- بڵاوکراوەی لقی ١٢ی "پ.د.ک".
٢٥- بارزان- مانگانە.
٢٦- نویَ/ک/ تورکی/ سریانی- هەفتانە.
٢٧- تەنین- بڵاوکراوەی سەنتەری بووژانەوە و پەرەپێدانی کلتووری کوردستان.

* ساڵی ٢٠٠٧: لە ساڵی ٢٠٠٧ و دوای ٤ ساڵ تێپەڕبوون بەسەر ئازادکردنی عێراق، ژمارەی بڵاوکراوەکان لە شاری هەولێر ژمارەیان یەکجار زۆر بوو، بەرادەیەک گەیشتۆتە ٣٦ بڵاوکراوە، کە ئەمانەن:

١- باواجی- هەفتانە- بڵاوکراوەی مەکتەبی سکرتاریەتی کۆمەڵەی ڤاری دیموکراتی- کۆیە.
٢- دیموکراتی- هەفتانە- بڵاوکراوەی ناوەندی ڕاگەیاندنی کاری دیموکراسی- کۆیە.
٣- ئاوێزان/ک- نیومانگی.
٤- ئاشتی نامە- هەفتانە- بڵاوکراوەی بزووتنەوەی دیموکراتی گەلی کوردستان.
٥- ball foot/ک- بڵاوکراوەی یەکێتی تۆپی پێی کوردستان.
٦- کورد- نیومانگی.
٧- ڕای تورکمان/ک/ تورکمانی- مانگانە- بڵاوکراوەی حزبی تورکمان.
٨- گوڵشەن- مانگانە.
٩- گەنجان- هەفتانە- بڵاوکراوەی دەزگای ئاراس.
١٠- سی فۆر کورد- هەفتانە.
١١- ڤاڵا- نیو مانگی- بڵاوکراوەیەکی ئەهلی بووە.
١٢- ستاندەر/ک- هەفتانە- بڵاوکراوەی کۆمپانیای سەلام طالب
١٣- وەرزین- وەرزی- بڵاوکراوەی دەزگای ئاراس.
١٤- سێوە- نیومانگی- کۆیە.
١٥- تاو- مانگانە.
١٦- پەروەردەی باڵا- مانگانە- بڵاوکراوەی وەزارەتی خوێندنی باڵا.
١٧- فریا- وەرزی- بڵاوکراوەی کۆمەڵەی فریا بۆ کاروباری مین.
١٨- گێژاو- مانگانە- بڵاوکراوەی دەزگای ئاراس.
١٩- کوردستان ئیکۆنۆمیک- بڵاوکراوەی کۆمپانیای هونەری ڕاگەیاندن.
٢٠- هونەرستان- مانگانە- بڵاوکراوەی سەنتەری ڕۆشنبیری بەهرە.
٢١- هەڵبوون- مانگانە.
٢٢- ژێنوار- مانگانە- بڵاوکراوەی وەزارەتی ژینگە.
٢٣- عینکاوە- مانگانە- بڵاوکراوەی شارەوانی عینکاوە.
٢٤- پەیامی ئەیلوول- وەرزی- بڵاوکراوەی کۆمەڵەی مامۆستایانی شۆڕشی ئەیلوول.
٢٥- دیپلۆماتیک- مانگانە.
٢٦- لاپەڕەی زێڕین- ساڵانە.
٢٧- کۆوار- مانگانە- بڵاوکراوەی دەزگای ئاراس.
٢٨- گەشبین- هەفتانە- بڵاوکراوەی دەزگای ئاراس.
٢٩- سایە- نیو مانگی- بڵاوکراوەی کۆمپانیای ئۆتۆ پارت. ئای. سی.تی.
٣٠- هاوبەشی- مانگانە- کۆمەڵێک لە خاوەن پێداویستییە تایبەتەکان دەری دەکەن.
٣١- بزاو- هەفتانە- بڵاوکراوەی دەزگای ئاراس.
٣٢- صوت الرعية- وەرزی- بڵاوکراوەی کڵێسەی عەنکاوە.
٣٣- سوبارتو- وەرزی- بڵاوکراوەی سەندیکای شوێنەوارناسانی کوردستان.
٣٤- کوردناسی- وەرزی- بڵاوکراوەی ماڵی کورد بۆ پاراستنی کلتووری میللی.
٣٥- نەوجەوان.
٣٦- وێ- مانگانە- بڵاوکراوەی یەکێتی ئافرەتان.

٣٧- زووم/ک- مانگانە- بڵاوکراوەیەکی ئەهلی بووە.
٣٨- ڕاویژ- مانگانە- بڵاوکراوەیەکی ئەهلی بووە.
* ساڵی ٢٠٠٨: لەو ساڵەدا وێڕای ئەوەی ژمارەیەکی زۆر بڵاوکراوە دەرچوونە و ئەوەش ئازادی کوردستان دەسەلمێنێ، بڵاوکراوەکانی ٢٠٠٨ بریتین لە:
١- k21 وەرزی- بڵاوکراوەیەکی ئەهلییە و مومتاز حەیدەری دەریدەکات.
٢- پەڕی زەرد- بڵاوکراوەیەکی ئەهلییە.
٣- EIA- مانگانە- بڵاوکراوەی فڕۆکەخانەی هەولێر.
٤- کەکۆن- نیومانگی- بڵاوکراوەیەکی ئەهلییەو لەکۆیە دەردەچێ.
٥- عیلموثا- بڵاوکراوەی یانەی کۆمەڵایەتی لاوانی عینکاوە.
٦- پەنات- مانگانە- بڵاوکراوەی وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی.
٧- زانکۆی جیهان- مانگانە- بڵاوکراوەی کۆمپانیای جیهان.
٨- تەندروستی منداڵ- وەرزی- بڵاوکراوەی نەخۆشخانەی ڕاپەڕین- وەزارەتی تەندروستی.
٩- IT- مانگانە- بڵاوکراوەی سەنتەری ئاریا IT
10- بینین- مانگانە- بڵاوکراوەیەکی ئەهلییە.
١١- بین- وەرزی- بڵاوکراوەی خێزانی
١٢- گەڵا- مانگانە.
١٣- پەرلەمانتار- وەرزی- بڵاوکراوەی یەکێتی پەرلەمانتارانی کوردستان.
١٤- جەنائن نامە- وەرزی- بڵاوکراوەی کۆمپانیای جەنائین.
١٥- نثار- بڵاوکراوەی پارێزگای هەولێر.
١٦- چرای ڕووناکی- مانگانە.
١٧- چاوی منداڵ- مانگانە- بڵاوکراوەی ڕۆشنبیری منداڵان- یەکێتی لاوان.
١٨- تاوی فۆتۆگرافی و کۆمەڵایەتی- وەرزی- بڵاوکراوەی "پ.د.ک".
١٩- چلاواز- وەرزی- بڵاوکراوەی ئینستیتوتی کەلەپووری کوردە.
٢٠- رایة الموصل- وەرزی- بڵاوکراوەی یەکێتی ژوورەکانی بازرگانی و پیشەسازی هەرێمی کوردستان.
٢١- ڕووداو- هەفتانە- بڵاوکراوەی کۆمپانیای ڕووداو.
٢٢- کوردستان بزنس- هەفتانە- بڵاوکراوەی یەکێتی پیاوانی خاوەنکاری عێراق.
٢٣- پێرس- نیومانگی- بڵاوکراوەی یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان
٢٤- reklam for step هەفتانە- بڵاوکراوەی کۆمپانیای هوما.
٢٥- قەرات- هەفتانە.
٢٦- زمان- مانگانە- بڵاوکراوەی بزووتنەوەی دیموکراسیخوازانی کوردستان.
٢٧- بازرگانی ئازاد- مانگانە- بڵاوکراوەی یەکێتی ژوورەکانی بازرگانی و پیشەسازی هەرێمی کوردستان.
٢٨- ژینگەو ژیان- مانگانە- بڵاوکراوەی بەڕێوەبەرایەتی گشتی هۆشیاری و ڕاگەیاندنی وەزارەتی ژینگە.
٢٩- الافق الجدید- ڕۆژانە- بڵاوکراوەی یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان.
٣٠- العراق الجدید.

*** ئەو سەتەلایتانەی لەدوای ڕاپەڕین هەن و بارەگای سەرەکییان لە هەولێرە، بریتین لە:**
١- سەتەلایتی کوردستان
٢- سەتەلایتی گەلی کوردستان
٣- سەتەلایتی الفیحاء
٤- سەتەلایتی السومریة
٥- سەتەلایتی ڤین
٦- سەتەلایتی کوڕەک
٧- سەتەلایتی زاگرۆس
٨- سەتەلایتی کوردسات

*** ئەو کەناڵە لۆکالییانەی لە هەولێر پەخشی خۆیان دەکەن بریتین لە:**
١- تەلەفزیۆنی بەرەی تورکمانی
٢- تەلەفزیۆنی ئاشووری
٣- تەلەفزیۆنی تەرزین
٤- تەلەفزیۆنی ڕەزڤان
٥- تەلەفزیۆنی ئەڤین فیم
٦- تەلەفزیۆنی میوزیکی کوردی kmc

7- تەلەفزیۆنی سیما
٨- تەلەفزیۆنی کوردستان- av
9- تەلەفزیۆنی ئازادی
١٠- تەلەفزیۆنی نیگا
١١- تەلەفزیۆنی سیدی
١٢- تەلەفزیۆنی ئارۆ
١٣- تەلەفزیۆنی چرا
١٤- تەلەفزیۆنی چاکسازی تورکمانی
١٥- تەلەفزیۆنی سۆسیالیست
١٦- تەلەفزیۆنی گەرمیان
١٧- تەلەفزیۆنی یەکگرتووی ئیسلامی
١٨- تەلەفزیۆنی کۆمەڵ
١٩- تەلەفزیۆنی بەیان
٢٠- تەلەفزیۆنی هەڵەبجە سپۆرت
٢١- تەلەفزیۆنی ئازادی
٢٢- تەلەفزیۆنی پەروەردە
٢٣- تەلەفزیۆنی خاک
٢٤- تەلەفزیۆنی سالی
٢٥- تەلەفزیۆنی هەرێم
٢٦- تەلەفزیۆنی cpa
٢٧- تەلەفزیۆنی نیگا
٢٨- تەلەفزیۆنی ئارۆ
٢٩- تەلەفزیۆنی قەڵات
٣٠- تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان- هەولێر
٣١- تەلەفزیۆنی ئاسۆ سپۆرت
٣٢- تەلەفزیۆنی ئازادی سپۆرت
٣٣- تەلەفزیۆنی هەتاو
٣٤- تەلەفزیۆنی جیهان

*** ئەو رادیۆیانەی لە هەولێر پەخشی خۆیان دەکەن، بریتین لە:**

١- رادیۆی بزووتنەوەی ئیسلامی.
٢- رادیۆی دەنگی دیموکراسی.
٣- رادیۆی منارە.
٤- رادیۆی کومۆشی عێراق
٥- رادیۆی الدفاءه
٦- رادیۆی دەنگی قورئانی پیرۆز
٧- رادیۆی نیگا
٨- رادیۆی بەهرە
٩- رادیۆی هێزڵ
١٠- رادیۆی سالی
١١- رادیۆی نیشتمان
١٢- رادیۆی بیت نهرین
١٣- رادیۆی زانکۆ
١٤- رادیۆی بزووتنەوەی دیموکراتیخواز
١٥- رادیۆی نەوا
١٦- رادیۆی ژین
١٧- رادیۆی هەتاو
١٨- رادیۆی ئاکرێ
١٩- رادیۆی دیموکراسی کۆیە- کۆیە
٢٠- رادیۆی C.T.M ریکلام
٢١- رادیۆی سیما
٢٢- رادیۆی کۆیە "یەکگرتوو"
٢٣- رادیۆی الحیاه الجدیده- عینکاوە
٢٤- رادیۆی تەرزین
٢٥- رادیۆی دەنگی نوێ
٢٦- رادیۆی ئاشتی
٢٧- رادیۆی دەنگی ئازادی
٢٨- رادیۆی BBC
٢٩- رادیۆی کۆمپانیای GRD لوبنان
٣٠- رادیۆی زانکۆی سلێمانی
٣١- رادیۆی سۆسیالیست
٣٢- رادیۆی سۆسیالیست- سلێمانی
٣٣- رادیۆی تەواری گەرمیان
٣٤- رادیۆی وازام
٣٥- رادیۆی CPA
٢٦- رادیۆی کۆمەڵ
٣٧- رادیۆی دەنگی هاموون
٣٨- رادیۆی کۆپاک
٣٩- رادیۆی خاک
٤٠- رادیۆی خەبات

*** ئەو ئاژانسانەی لە هەولێر کاردەکەن بریتین لە:**

١- AKNEWS
٢- پەیامنێر



# بیۆگرافیای بەشێک لە ڕۆژنامەنووسانی هەولێر بەپێی پیشە ڕۆژنامەنووسییەکەیان لە ساڵی ٢٠٠٩ دا

حەمید ئەبوبەکر بەدرخان



فەرهاد عەونی
نەقیبی ڕۆژنامەنووسانی کوردستان
١٩٤٦/ کۆیە



زیرەک کەمال
ئەندامی ئەنجومەنی سەندیکای ڕۆژنامەنووسان
١٩٦٦/ڕانیە



مومتاز حەیدەری
سەرنووسەر
١٩٤٢/ هەولێر



ئەکەد موراد
ئەندامی ئەنجوومەنی سەندیکای ڕۆنامەنووسان
١٩٥٧/ نەینەوا



خالد بەکر ئەیوب
جێگری سەرنووسەر
١٩٤٨/ هەولێر



حامد محمد عەلی
سکرتێر سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان
١٩٦٤/ خانەقین



تەحسین محمد خلیل
نووسەر
١٩٤٢/ هەولێر



یونان مرقس هوزایا
نووسەر
١٩٥٥/ زاخۆ



تارق جەمباز
سەرنووسەر
١٩٤٨/ هەولێر



ئیبراهیم سالح ئیسماعیل
پەیامنێر
١٩٦٨/ هەولێر



ڕۆمیل شمشون شمونیل
سەرنووسەر
١٩٥٨/ ئەنبار



ئازاد حەمەدەمین
سەرۆکی لقی هەولێر
١٩٥٨/ هەولێر



ئینتسار بەکر سالح
نووسەر
١٩٥٩/ بەغداد



خالد عەبدوڵلا ئیسماعیل
نووسەر
١٩٦٦/ هەولێر



ئاکۆ محمد
سەرنووسەر
١٩٧٤ / دیانا



محەممەد زادە
نەخشەساز
١٩٤٦ هەولێر



ئیسماعیل عبدالکریم(سمکۆ)
نووسەر
١٩٧٠/ هەولێر



ئومێد خەلیفە
سەرنووسەر
١٩٥٤/ هەولێر



یاوەر نامق سالم
نووسەر
١٩٥٤/ بەغداد



محمد عەلی عوزێری
سەرنووسەر
١٩٧١/ هەولێر



شێرکۆ عومەر حەبیب
نووسەر
١٩٥٧/ کۆیە



حوسامەدین یاسین سەرداری
ئەندامی دەستەی نووسەران
١٩٥٧/ هەولێر



زاگرۆس ئەحمەد کەمال
پەیامنێر
١٩٧١/ هەولێر



عوسمان پیرداود کواز
نەخشەساز
١٩٦٠/هەولێر



عصام موحسین نادر
نەخشەساز
١٩٦٢/هەولێر



یاسین عاسم یحیی
نەخشەساز
١٩٦٥/ هەولێر



مەهدی عەباس قادر
نووسەر
١٩٦٧-هەولێر



ئەردەلان سلێمان خالید
نەخشەساز
١٩٨١/ هەولێر



نەجات باوەکر قادر
نووسەر
١٩٦١/ هەولێر



خوناو محمود تاهر
پەیامنێر
١٩٧٦/ هەولێر



پەیان فەرهاد محمد ئەمین
نەخشەساز
١٩٧١/ هەولێر



پەیان ئەمین رەسوڵ
پەیامنێر
١٩٧٩/ هەولێر



هاوڕێ محەممەد زادە
نەخشەساز
١٩٨١/ هەولێر



جەلال مەلود سنجاوی
نووسەر
١٩٥٤/ هەولێر



عەبدوڵلا زەنگەنە
سەرنووسەر
١٩٥٣/ هەولێر



دلێر محمد شەریف
سەرنووسەر
١٩٦٥/ هەولێر



سەعید محمد کەریم
نووسەر
١٩٧٦/ سەلاحەدین



هەندرێن ئەحمەد عەبدوڵلا
نووسەر
١٩٧٠/ هەولێر



کەریم ئەحمەد حوسێن
نووسەر
١٩٥٣/ هەولێر



زەیتوو فازڵ یونس
نووسەر
١٩٦٧/ هەولێر



دلێر عوسمان عەونی
نووسەر
١٩٥٥/ کۆیە



هاشم ئەبابەکر خانۆ
نووسەر
١٩٦٨/ مێرگەسۆر



تامان عەبدوڵڵا شاکر
نووسەر
١٩٦٢/ کۆیە



ڕێزان عبدالباقی ئیبراهیم
وەرگێر
١٩٧٢/ هەولێر



عەزیز ڕەشید هەریری
نووسەر
١٩٤٩/ هەریر



جەمال عوسمان خدر(بڕیار)
پەیامنێر
١٩٦٦/ هەولێر



حەیدەر جەمیل محمد سالح
نووسەر
١٩٧٧/ هەولێر



کەریم قادر کەریم
نووسەر
١٩٦٨/ هەولێر



زەمان عوسمان محەمەد
نەخشەساز
١٩٧٤/ هەولێر



محمد حسین ئەحمەد
نووسەر
١٩٦٦/ هەولێر



فارس سەعدی مستەفا
وێنەگر
١٩٥٥/ هەولێر



عەلی سالح میران
سەرنووسەر
١٩٥٥/شەقلاوە



محمد وسمان عەزیز
ئەندامی دستەی نووسەران
١٩٥٣/ هەولێر



تالب محمد احمد
پەیامنێر
١٩٧٥/ هەولێر



سالار قادر سەعید
نووسەر
١٩٥٧/ رواندز



سلێمان خالد ئاژگەیی
پەیامنێر
١٩٥٥ / هەولێر



تارق ئیبراهیم شەریف
نووسەر
١٩٥٠/ هەولێر



مەحمود عەبدوڵلا زامدار
نووسەر
١٩٤٤/ هەولێر



سۆران عزالدين فەيزی
ئەندامی دەستەی نووسەران
١٩٥١/ هەولێر



بەهزاد ئەرشەد حەویزی
نووسەر
١٩٦٠/ کۆیە



چەتۆ فازڵ یونس
نووسەر
١٩٧١/ هەولێر



ئوسامە جەمیل عەلی
نووسەر
١٩٦٦/ هەولێر



رەشید هەمزە عەلی
نووسەر
١٩٦٨/ هەولێر



فەهد قادر ئەحمەد
سەرنووسەر
١٩٧٨/ هەولێر



پترس هرمز توما
نووسەر
١٩٥١/ هەولێر



محەمەد حوسێن شەریف (گۆران)
نووسەر
١٩٧٥/هەولێر



جەرگیس یونان خوشابا
نووسەر
١٩٧٠/ هەولێر



زادوق ئادەم باوید
سەرنووسەر
١٩٥٣/ هەولێر



ئەیوب محەمەد بابەکر
نەخشەساز
١٩٨٥/ هەولێر



محمد فخرالدین محمد نوری
پەیامنێر
١٩٨٤/ هەولێر



ئەحمەد شەریف عەلی
نووسەر
١٩٤٢/ هەولێر



پەخشان سەلیم خالند
نیگارکێش
١٩٧٦/ هەولێر



زیرەک عەبدوڵڵا کەریم
دەستەی نووسەران
١٩٧٥/ هەولێر



ڕۆستەم باجەلان
دەستەی نووسەران
١٩٤٦/ هەولێر



موخلس سابیر خۆشناو
نووسەر
١٩٦٨/ هەولێر



د. ئازاد عوبێد سالح
سکرتێری نووسین
١٩٥٥/ هەولێر



سەلاح عومەر فەرحان
بەڕێوەبەری نووسین
١٩٥٣/ هەولێر



شیرین عبدالواحید عەبدوڵلا
جێگری سەرنووسەر
١٩٧٦/ هەولێر



دلزار حەسەن قادر
نووسەر
١٩٧٥/ هەولێر



کامەران عبدالکریم خۆشناو
سەرنووسەر
١٩٧٠/ هەولێر



فوئاد عوسمان تەها
پەیامنێر
١٩٧١/ هەولێر



عەبدوڵلا قادر محەممەد گۆران
نووسەر
١٩٥٠ هەولێر



عبدالحەمید محمد سەعید
نووسەر
١٩٧٢/ ئاکرێ



عیماد رفعت جەمیل
پەیامنێر
١٩٧٧/ هەولێر



سەفەر عەلی شەریف
نووسەر
١٩٦٩/ هەولێر



سالح عومەر قادر(ڕۆژگار پالانی)
نووسەر
١٩٦٣/ هەولێر



محمود عەزیز عەزیز
نووسەر
١٩٦٠/ هەولێر



بۆتان تەحسین محمد
نووسەر
١٩٧٣/ رواندز



موحسین یاسین عەبدوللا
نووسەر
١٩٤٩/ هەولێر



نەوزی چەتۆ حەسەن
هەڵەچن
١٩٧٣/ هەولێر



احمد اسماعیل محمد
سەرنووسەر
١٩٧٢/ هەولێر



ئەیوب سابیر گەلالی
خاوەن ئیمتیاز
١٩٧١/ هەولێر



محمد رشید محمد ئەمین
(محمد وانی)
نووسەر
١٩٦٠/ هەولێر



ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل
نووسەر
١٩٦٩/ هەولێر



ڕەفیق عوسمان ئەحمەد
وێنەگر
١٩٦٦/ هەولێر



حەسەن یاسین عەبدولرەحمان
سەرنووسەر
١٩٦٦/هەولێر



ئاریان عبدالخالق سەرسام
نیگارکێش
١٩٧٣/ هەولێر



هێمن کەریم مام ڕەش
پەیامنێر
١٩٨٠/ هەولێر



کەیفی مقصود کەریم
پەیامنێر
١٩٧٦/ پیرمام



دلدار ڕەزا ئۆمەر
نووسەر
١٩٧٥/ هەولێر



کاروان مهدی عوسمان
جێگری سەرنووسەر
١٩٨٠/ هەولێر



عەباس عەزیز لەشکری
وێنەگر
١٩٦٠/ هەولێر



# وەرزشی هەولێر

ڕەنجبەر ئەكرەم ڕەشید
سەرتیپ فاریق حەسەن

## پێشەكی

گومان لەوەدا نییە كە شاری هەولێر لە شارە هەرە كۆنەكانی جیهانە، مێژوونووسان لە هەموو بوارەكانی ژیانی ئابووری و ئاوەدانی و رامیاری و كۆمەلایەتی و رۆشنبیری و ئایینی زۆریان باس كردووە. بەلام بوارێكی شاراوەی هەیە، كە تا ئێستا زۆر بەكەمی لەسەری نووسراوە. ئەویش لایەنی وەرزشی شاری هەولێرە. بۆیە بە پێویستمان زانی، كە شتێك كۆ بكەینەوە لەسەر بواری وەرزش لە شاری هەولێر. پێشتر (مەزۆ لەشكری) هەولێكی دابوو بۆ دیارخستنی وەرزش و وەرزشوانان بەلام وەكوو خۆی دەلێ هەولێكی سەرەتای و سەرپێی بوو، ئێمەش ئێستا ئەو هەولەمان داوە كە مافی ئەو پالەوانانە و وەرزشوانانەو كارگێرانە نەسووتێ و لە لایەنی كەم نەوەكانیان بیریان بكەنەوە، كە ئەوان پیاوی سەردەم بوون بۆ دانانی بناغەی وەرزش لە شارە خۆشەویستەكەمان و بەدرێژای تەمەنیان خزمەتی ئەم بوارەیان كردووە. لەبەرئەوەی هیچ دیكۆمێنتێكی وەرزشیمان نەبووە لە كوردستان و مێژووی وەرزش و سەرهەلدانی نەنووسراوەتەوە و نەبوونی چاوگ بۆ پەرتوكەكەمان، ناچار بووین كە زۆر ماندووببین و هەوڵ بدەین كە چاومان بەو كەسە تەمەندارانە بكەوێت كە تا ئێستا لە ژیان ماون و ئەمەش زۆر زەحمەت بوو، چونكە زۆربەیان كە باسیان بۆمان دەكرد، هەریەكە لە ڕوانگەی خۆی باسی لە وەرزش دەكرد و ناچار دەبووین لە نێوان سێ چوار كەس بەراورد بكەین تا ڕاستییەكان دیار بكەین و بینووسینەوە و بێ گومان لەو حالە بێ هەلە و كەم و كوڕی نابێ و دەبێ كەسانێك هەبن كە خزمەتی وەرزشیان كردووە و لە بیر بكرێن یان هەندێ لە ڕێكەوتەكان جیاوازی هەبێ لەگەڵ ڕوداوەكان.

بە هەرحاڵ هیواداریین كە هەولەكەمان سەركەوتوو بێ و شتێكمان كردبێ بۆ تۆمار كردنی مێژووی وەرزش لە شارە دێرینەكەمان.

**دانەران**

**مێژووی وەرزشی هەولێر لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە:**

مێژووی وەرزش دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سەرەتای ژیان لە جیهان، چونکە هەر لە سەرەتای مرۆڤی (نیئاندەرتاڵ)ەوە، مرۆڤ پێویستی بە وەرزش هەبوو. بۆ نموونە، پێویستی بە هێز و پشووی درێژی هەبووە بۆ ڕاکردن بە دوای نێچیر کەوتن و بۆ بەدەست هێنانی بژێوی ژیانی ڕۆژانەی هەر لە مەشقکردندا بووە. ئەمەش هەر وەرزش بووە.

سەرهەڵدانی وەرزش لە شاری هەولێر دەگەڕێتەوە بۆ پاش جەنگی یەکەمی جیهانی، کە ئینگلیزەکان عێراقیان داگیر کرد، لە پێش هەموو شتێک وەرزشیان بڵاوکردەوە. بەتایبەتی تۆپی پێ، کە لە ئۆردوگاکانی سەربازانیان یارییان دەکرد و دانیشتووانی ناوچەکە لێیان فێر دەبوون چونکە پێش هاتنی ئینگلیزەکان زۆر یاری میللی هەبووە، کە لاوان دەیان کرد. بەتایبەتی لە وەرزی بەهاران لەسەر جۆخینان، وەکوو یاری قاشوانێ و کێلە بەردانێ و خوریشکانێ و پیسکە پیسکانێ و گەلێک یاریدیکە، بەڵام وەکوو وەرزش و سەرهەڵدانی وەرزشی نوێ دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دامەزراندنی حکومەتی عێراقی نوێ لە سەرەتای ساڵانی بیست لە سەدەی رابردوو، کە قوتابخانەی زۆر دامەزران، بە تایبەتی لە شارەکان و وەزارەتی مەعارف پێشبڕکێی بۆ قوتابخانەکان بەرێوەبەرایەتی مەعارفی شارەکان رێکدەخست، بەرە بەرە یاری تۆپی پێ و یاری تۆپی بالە ئەنجام دەدرا و تیپی میللییان دادەمەزراند بە ناوی تیپی ئەهلی و ڕۆڵی مامۆستایانی وەرزش زۆر گرنگ بوو بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو یاریانە و ساڵانە فستیڤاڵێکی وەرزش بۆ قوتابخانەکان دەکرا. لەو مامۆستا پێشەنگانە (عەلی حەمادی)، کە دەرچووی پەیمانگای مامۆستایان بووە، و بەردی بناغەی وەرزشی لە شاری هەولێر دامەزراند. لەو سەردەمەشدا هەتا پاش جەنگی دووەمی جیهانی و سەرەتای پەنجایەکان، تەنها وەرزشی قوتابخانان هەبوو، کە وەرزش بەرە بەرە پێش دەکەوت و چەند تیپێکی میللی پەیدا بوو، کە پێشبڕکێیان دەکرد لەگەڵ تیپی قوتابخانەکان و پۆلیس و سوپا، هەندێ جاریش لەگەڵ تیپە ئەهلییەکانی شاری موسڵ و کەرکووک و خانەقین یاریان دەکرد، بەڵام سەرهەڵدانی راستەقینەی وەرزشی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٥٦)، کە بۆ یەکەم جار یانەی ئەهلی بە ناوی یانەی (بروسک) بە شێوەیەکی رەسمی کرایەوە. لە وەرزشدا سەردەمێکی نوێی دروست کرد، بەتایبەتی تۆپی پێ و یاری هەڵگرتنی قورسایی و لەش جوانی و چەندین یاری دیکەی بە خۆوە گرت و جۆرە ململانێیەکی پەیدا کرد لە نێوان تیپی قوتابیان، کە سەر بە (معاریف- پەروەردە) بوون و تیپی ئەهلی، لە دواییدا وەرزش بەرە بەرە پێشکەوتنی بە خۆوە بینی. بەبڵاوبوونەوەی تیپە میللییەکان کە لە سەرەتای شەستەکان ئەو دیاردەیە پەرەی سەند، لە پێشبڕکێی تۆپی پێ تا دامەزراندنی یانەی دووە. کە یانەی (هەولێر) لە ساڵی (١٩٦٨)دامەزرا، یانەی بروسک ڕۆڵی خۆی بینی بۆ پێشخستنی وەرزش و لەگەڵ دامەزراندنی یانەی هێرش لە ساڵی (١٩٦٩) زیاتر وەرزش بڵاو بووەوە و پەرەی سەند. لەگەڵ ئەوەشدا تیپە میلییەکان رۆڵێکی گرنگیان هەبوو بۆ دروستکردنی یاریزانی باش، کە زۆربەیان لەم سێ یانەیە و هەڵبژاردەی هەولێر یاریان دەکرد. جگە لەوانەش هەڵبژاردەی یارییە جۆراو جۆرەکانی سەر بەپەروەردە بەردەوام بوون لە پەرەپێدانی ڕەوڕەوەی وەرزش لە شاری هەولێر بە هەمان هێزو توانای پێشوویان، هەر لە سەرەتای هەفتاکانەوە کە بۆ یەکەمین جار بنکەی وەرزش و لاوانی هەولێر بووە بەردی بناغەی وەرزش بۆ پێگەیاندنی لاوانی کورد لە هەموو جۆرە یارییەکاندا. و لە کۆتایی ساڵانی شەستەکان یەکێتی تۆپی پێی لە شاری هەولێر دامەزرا. ئەویش ڕۆڵی خۆی هەبوو بۆ رێکخستن و پەرەپێدانی یاری تۆپی پێی. لە سەرەتای هەفتایەکانیش چەند یەکێتییەکی وەرزش دامەزران وەکوو: (شەترەنج و هەڵگرتنی قورسایی و تۆپی دەست)، ئەمانەش بۆ پێشکەوتنی وەرزش لە شاری هەولێر هاندەر بوون.

بەڵام بەداخەوە پاش پیلانە شوومەکەی (جەزائیر) ساڵی (١٩٧٥) و نسکۆی شۆڕشی ئەیلوولی پیرۆز بە سەرکردایەتی پاڵەوانی کورد (مستەفا بارزانی) حکومەتی بەعس یانەکان، هەڵوەشاندەوە تەنها یەک یانەی هێشتەوە، ئەویش یانەی (هەولێر) بوو.

لە ساڵی (١٩٧٧) نوێنەرایەتی لیژنەی ئۆلۆمپی عێراقی لە هەولێر دامەزرا و دەتوانین بڵێین لەو ساڵەوە سەرهەڵدانی وەرزش لە هەموو بوارەکانی لە شاری هەولێر

دەستی پێ کرد، یەکێتییە وەرزشییەکان دامەزران، کە هەموو کادیرە وەرزشییەکانی شاری هەولێری بەخۆوە گرت و قۆڵ لێهەڵکرد و دەستیان کرد بە چالاکی وەرزشی، بۆ مێژووش ئەو سەردەمە بۆ وەرزش کارێکی زۆر باش کرا، لە زۆربەی یارییەکان پاڵەوانی لێهاتوو لەسەر ئاستی عێراق و عەرەب و ئاسیا پێ گەیشتن و هەر ئەو سەرکەوتنانە بەردەوام بوون تا ناوەڕاستی ساڵانی هەشتایەکان کە شەڕی نێوان عێراق و ئێران گەیشتە گەرمەی و درێژەی پێدرا. لە ئەنجامدا لاو نەما وەرزش بکات و سەرەڕای ئەوەش یانەیێکی نوێ بە ناوی یانەی (برایەتی) لە ساڵی ١٩٨٤ دامەزرا و کەوتە ململانێ و دەستەوایی وەرزش لەگەڵ یانەی هەولێر، ئەم یانەیەش لە یارییە جۆراوجۆرەکانی وەرزشی خزمەتی وەرزشی کرد.

لە دوای راپەرینە مەزنەکەی بەهاری ساڵی ١٩٩١ وەرزش سەربەخۆییەکی باشی بەخۆوە بینی. بەڵام بەبێ سوود و لە گۆترە بوو. سەرەتا لیژنەی بەرەی کوردستانی پێکهێنرا کە هەموو حزب و لایەنە سیاسییەکان نوێنەریان تێدا بوو و سەرەتای چالاکییەکانی بە خولی پێشمەرگەی کوردستان دەست پێ کرد، ئەم لیژنەیە پێکهاتبوو لەم بەڕێزانە، کە لیژنەی بەڕێوەبردن تیپە میلییەکان بوو:

١- سەمیر عەبدوڵڵا محەمەد / نوێنەری پارتی دیموکراتی کوردستان.
٢- فازل عەباس / نوێنەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان.
٣- شێروان محەمەد سەعید / نوێنەری حزبی شیوعی کوردستان.
٤- هیوا عەبدولحەمید / نوێنەری پارتی گەل.
٥- رەحمان محەمەد سەعید / نوێنەری سۆشیالیست.
٦- رزگار محەمەد / نوێنەری زەحمەتکێشان.

ئەم لیژنەیە لە خزمەت کردنی وەرزشی هەولێر بۆ ماوەی دوو ساڵ تەنها لە بواری یاری تۆپی پێ بەردەوام بوو.

وەکو کردنەوەی خولی تۆپی پێی پێشمەرگەی کوردستان، کە یەکەمین خول بوو بۆ یانەکانی هەولێر بەسەرپەرشتی وەزارەتی پێشمەرگە، خولی تۆپی پێی پەرلەمانی کوردستان بەبۆنەی دامەزراندنی، خولی (نەسرەوتن تاکو سەرکەوتن).

مانگی تەمموزی ساڵی ١٩٩٥ یەکەمین کۆنگرەی وەرزشی بە ئامادەبوونی (١٤٠) سەد و چل نوێنەری وەرزشی لە کوردستان لە شاری سلێمانی کۆنگرەی دامەزراندنی لیژنەی ئۆلۆمپی کوردستان/ عێراق بە پێک هێنانی دەستەی تەنفیزی کە لەم بەڕێزانە پێکهاتبوو دامەزرا.

١- مەلا بەختیار / سەرۆکی نوێنەرایەتی لیژنەی ئۆلۆمپی کوردستان / عێراق.
٢- سەلاح حەسەن خەسرۆ / جێگری سەرۆک.
٣- ئەسعەد محەمەد ساڵح / جێگری سەرۆک.
٤- سەرتیپ فاریق حەسەن / ئەمینداری گشتی.
٥- محەمەد سۆفی محەمەد ئەمین / ئەمینی دارایی.
٦- سائر عەبدولئەحەد / لێپرسراوی یەکێتییە وەرزشییەکان.
٧- سەرهەنگ عەبدولخالق / ئەندام.
٨- هەڵگورد عارف / ئەندام.
٩- سەلاحەددین عسام / ئەندام.
١٠- تاریق / ئەندام.
١١- سەلاح پەرلەمان / لێپرسراوی پەیوەندییەکان و راگەیاندن.

پاش دامەزراندنی ئەم لیژنەیە دەستی کرد بە چالاکی وەرزش لە هەموو بوارەکانی وەرزش لە کوردستان تا ناوەڕاستی ساڵی ١٩٩٦، دوای ساڵی ١٩٩٦ بۆشاییێکی زۆر هەبوو لە نێو بواری وەرزشی، پارەو پولێکی زۆر خەرج، کرا بەبێ ئەوەی سوودی لێ وەربگیرێ، وەرزش بەرەو پێش بیات، بۆیە چەندین جار بیرو بیرۆکەیەک هەبوو، کە ئەنجومەنێکی باڵای وەرزش لە کوردستان دابمەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە چەندین کۆبوونەوە کرا لە نێوان لاوان و وەرزشکاران و بەڕێوەبەرایەتی گشتی وەرزش و لاوان و خودی وەزیری رۆشنبیری بەڕێز (مەحموود محەمەد) لیژنەی دانا بۆ ئەم مەبەستە بەتاوتوێ کردنی پرۆگرامێک بۆ دانانی ئەنجومەنێکی باڵا بۆ وەرزش، ئەم لیژنەیە بە سەرۆکایەتی بەڕێز (وەزیری رۆشنبیری بوو، دکتۆر محەمەد ئیحسان و مامۆستا چیای تەیموور بەڕێوەبەری گشتی وەرزش و لاوان یەکەمین کۆنگرەی ئەنجومەنی باڵای وەرزشی لە شاری هەولێر لە هۆڵی رۆشنبیری بەسترا پاش دوو رۆژ دوای گفتوگۆ کردن لەسەر ئەم پرۆژەیە یەکەمین دەستەی راپەڕاندنی هەڵبژێردرا لە

هەڵبژاردنێکی ئازاددا، کە لەم بەڕێزانە پێکهاتبوو:
١- نێچیرڤان بارزانی / سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای وەرزشی کوردستان.
٢- مەحموود محەمەد مەحموود / جێگری سەرۆک.
٣- جەودەت نەجار / سکرتێری ئەنجومەن.
٤- سامی سەعید / لێپرسراوی نووسینگەی یانە و یەکێتییە وەرزشییەکان.
٥- فەرسەت دۆلەمەری / لێپرسراوی پەیوەندییەکان و ڕاگەیاندن.
٦- سەگڤان ئیبراهیم / ئەمینداری گشتی دارایی.
٧- چیای تەیمور عەبدال / نوێنەری وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان.
٨- سابیر عەبدوڵلا / نوێنەری لاوان.
٩- عەقید جومعە / نوێنەری وەزارەتی پێشمەرگەی کوردستان.
١٠- دڤوار فایەق / نوێنەری وەزارەتی ناوخۆی کوردستان.
١١- دەشتی وەهاب / نوێنەری خوێندنی باڵا.
١٢- دەست نیشان کردنی سێ شارەزای وەرزش لە لایەن بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای وەرزش بەپێی یاسای ئەنجومەن، کە پێکهاتبوو لەم بەڕێزانە:
١- هیمداد بارزانی.
٢- د. سەعید عەلی.
٣- د. ئالان قادر.

بەڕێز (هەمداد بارزانی) دەستێکی باڵای هەبووە، لە بەڕێوەبردنی کارەکانی ئەنجومەنی باڵای وەرزش بە حوکمی ئەوەی، کە ئەلقەی بەیەکگەشتن بووە، لە نێوان بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای وەرزش و ئەندامانی تەنفیزی و بەدواداچوونی داواکارییەکانی ئەنجومەن.

٤- پاش تەواو بوونی ئەو دوو لێژنەیە و دانانی پەیکەری ڕێکخستن و دانانی ڕێنماییەکانی بۆ ئاسانکردنی جێبەجێ کردنی کارەکان ئەنجومەنی باڵای وەرزش بارەگای لە بەرامبەر یاریگای (شەهید فەرەنسۆ هەریری) بۆ گیرا، ئینجا دەست بەکار بوون و چالاکییەکانی دەستی پێ کرد بە نیشان کردنی نوێنەرانی کوردستان بۆ یەکێتییە وەرزشییە ناوەندییەکانی عێراقی فیدراڵ.

لە ڕۆژی ١٢ / ٧ / ٢٠٠٤ لە هەنگاوێکی گەلێک پیرۆز و گرنگی ئەنجومەنی باڵای وەرزش دەستەی وەرزشوانە دێرینەکانی کوردستان دامەزرا. ئەمەش بە پشتگیری ڕاستەوخۆی بەڕێز جەودەت نەجار سکرتێری ئەنجومەنی باڵای وەرزشی کوردستان، ئەمەش خۆی لە خۆیدا دەستکەوتێکی مەزن بوو بۆ وەرزشوانە دێرینەکان کە لە یەک دەستە بەیەک بگەن بۆ داوا کردنی ماف و پێداویستییەکانیان بەرامبەر بەو خزمەتەی کە پێشکەشیان کردووە. لە مێژەوە لە شارو شارۆچکەکانیان و هۆیەک بوون بۆ پێشخستن و بەردەوامی وەرزش لە کوردستاندا، کە تا ئێستا زیاتر لە (٦٠٠٠) شەش هەزار وەرزشوانی دێرینی لە خۆگرتووە. بێ گومان ئەم دەستکەوتە پیرۆزە هەرگیز لە بیر ناکرێ بەدەست و پەنجە شایەدی بۆ ئەدرێ، لە هەرە هەنگاوەکانی جگە لە کۆمەک کردنی وەرزشوانە دێرینەکان بڕینەوەی مووچەی مانگانە بەبەردەوامی بۆ (٦٢٥٠) شەش هەزار و دوو سەد و پەنجا وەرزشوانی دێرین لە هەموو کوردستان بە پشتگیری بەڕێز نێچیرڤان بارزانی سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان.

تا ئێستاش لە چالاکییەکانی بەردەوامە و ڕۆژانە بەدەیان کەس لە وەرزشوانە دێرینەکان لە خۆی دەگرێت، کە بۆتە مایەی پێک گەیشتن و هەماهەنگی هەموو وەرزشوانە دێرینەکان بۆ گۆڕینەوەی بیروڕاو بۆچوون و تاوتوێ کردنی بواری وەرزش و پێشکەوتنی و خزمەت کردنی ئەو توێژە گرنگەی کۆمەڵ، و لە هەنگاوێکی ئەم دەستەیەدا بڕینەوەی مووچەی مانگانە بۆ ئەو پاڵەوانانەی، کە لەسەر ئاستی وڵاتە عەرەبییەکان و ئاسیا ئەنجامی باشیان بەدەست هێناوە، و ڕاگەیاندنی ئەم دەستەیە هەفتانە هەڵساوە لە ڕۆژی دامەزراندییەوە بۆ بەسەر کردنەوە و ناساندنی یەکێک لە وەرزشوانە دێرینەکان بە نەوەی تازە، هەروەها ئەم دەستەیە دریغی نەکردووە بۆ یارمەتی دانی وەرزشوانە دێرینەکان لە هەموو بۆنە و یادێکدا جگە لەوەی دەستی یارمەتی درێژ کردووە بۆ بەسەر کردنەوە و یارمەتی دانی خێزانی وەرزشوانە خوالێخۆشبووەکان دەستەی وەرزشوانە دێرینەکان لەم بەڕێزانە پێکهاتووە:
١- ئەحمەد خدر زیندین - سەرۆکی دەستە.
٢- خالس قۆجە فەتحوڵلا - جێگری سەرۆک.
٣- مەهدی محەمەد سالح - سکرتێر.

٤- سابیر ئەحمەد حوسێن - ئەمینداری دارایی.
٥- رێنجبەر ئەکرەم رەشید - بەرپرسی راگەیاندن و پەیوەندییەکان.
٦- ساڵح ئەحمەد حەمەد - پلان و بەدواداچوون.
٧- ئاورینگ سابیر ئەسعەد - بەرپرسی بەشی ئافرەتان و کارگێری.
٨- مـوژدە ساڵح نەورۆز - بەرپرسی چالاکی وەرزشی ئافرەتان.
٩- هاشم ئیبراهیم کورەچی - شارەزای وەرزش لە دەستە.
١٠- بەرێز سەلاح بەتروس شەمعوون لە شوێنی بەرێز مەهدی محەمەد ساڵح بە سکرتێر دانرا پاش لە دەست کێشانەوەی مامۆستا مەهدی محەمەد ساڵح، ئەمەش لە رێکەوتی ١١ / ١٢ / ٢٠٠٥.

- دەستەی وەرزشوانە دێرینەکان لە هەموو شارەکانی کوردستان دامەزرا بە ناوی وەرزشوانە دێرینەکان لە شاری (کەرکووک و دهۆک و سلێمانی) و دامەزراندنی لێژنەی شارۆچکەکانی کوردستان کە هەمان خزمەت پێشکەش بە وەرزشوانەکانی گشت شار و شارۆچکەکانی کوردستان دەکات.

لە رێکەوتی ٥ / ١١ / ٢٠٠٦ هەردوو دەزگـای وەرزشی (لێژنەی ئۆلۆمپی کوردستان و ئەنجومەنی باڵای وەرزشی کوردستان) لە هەنگاوێکی پیرۆزدا یەکیان گرتەوە بە ناوی (ئەنجومەنی ئۆلۆمپی کوردستان)، لە کۆبوونەوەیەکی قەشەنگدا و بە ئامادەبوونی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستان بەرێز (نێچیرڤان بارزانی) کـە بە وتارێک یەکبوونەوەی هەردوو دەزگـای راگەیاند. ناوی ئەندامانی ئەنجومەنی ئۆلۆمپی کوردستان راگەیەنرا، کە لەم بەرێزانە پێکهاتبوون:

١- حیکمەت محەمەد کەریم - ناسراو بە مەلا بەختیار / سەرۆک.
٢- د. سەعید عەلی عەبدوڵلا - جێگری سەرۆک.
٣- سەلاح حەسەن خەسرۆ - جێگری سەرۆک.
٤- سامی سەعید قادر - ئەمینداری گشتی.
٥- سەکڤان ئیبراهیم حەسەن - ئەمینداری دارایی.
٦- سەلاح محەمەد کەریم - ئەندام.
٧- فەهیم عەبدوڵلا حەمۆ - ئەندام.
٨- سەلاحەددین حوسامەددین - ئەندام.
٩- د. ئالان قادر رەسوڵ - ئەندام.
١٠- کەمال نووری غەریب - ئەندام.
١١- خالید رەسوڵ بایز - ئەندام.
١٢- د. سەرهەنگ عەبدولخالق - ئەندام.
١٣- سامی عەزیز - ئەندام.
١٤- سەفین کانەبی ئەحمەد - ئەندام.
١٥- سەمیرە عەبدوڵلا ئەحمەد - ئەندام.
١٦- حەربی خالید ئەحمەد - ئەندام.
١٧- نەوزاد قادر عەلی - ئەندام.
١٨- شێردل تەحسین - ئەندام.
١٩- موئەیەد مەغدید - ئەندام.
٢٠- سەرتیپ فاریق حەسەن - شارەزا.
٢١- ئازان شەریف فەتحوللا - شارەزا.
٢٢- د. سائر عەبدولئەحەد - شارەزا.
٢٣- ژیان جەمال - شارەزا.
٢٤- ئیبراهیم رەسوڵ - شارەزا.
٢٥- کەژاڵ ئەحمەد - شارەزا.

## رۆڵی بنکەکانی وەرزش و لاوان بۆ پێشخستنی وەرزش لە پارێزگـای هەولێر:

بێ گـومـان بنکەی وەرزش و لاوان لە هەولێـر لە سەرەتای هەفتایەکان دەست بەکار بوو بۆ نواندنی چالاکی، لەبەرئەوەی دەزگایێکی فەرمی بوو، کارو ئامانجەکانی پێش خستن و پەرەپێدانی بەچینی لاوان بوو. هەر چەندە بیرۆکەیەکی حیزبی بەعس بوو، بەڵام ئەو سیستەمە لە وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵات وەرگیرا بوو و لەبەرئەوەی سەرەتای دەست پێ کردنی لە ساڵانی سەرەتای هەفتایەکان بوو و لە کاتی دانووستاندنی شۆرشی کورد و حکومەت بوو، بە شێوەیەکی پاک و تەمیز دەستی بەکار کردوکادیرانی کـارگێری و هونەری هەر هەمـوویان کـوردی پاک و مرۆڤی لێهاتوو بوون.



قادر حەمەد ئەمین مستەفا - یەکەم بەرێوەبەری بنکەی وەرزش و لاوانی هەولێر ١٩٧٢

بۆیە رۆڵێکی گرنگی هەبوو بۆ دانانی ژێرخانی وەرزشی و دامەزراندنی بناغەی وەرزشی بەشێوەیەکی زانستی و ئیمکانیاتێکی چاکیان هەبوو بۆ دامەزراندنی راهێنەر و هونەری و زانستی و رۆڵی خۆی بینی بۆ پێگەیاندنی سەدان وەرزشوان و قارەمانی لێهاتوو کە زۆربەیان گەیشتنە ئاستی جیهانی لە هەڵگرتنی ئاسن و و لەش جوانی و زۆرانبازی و بۆکسێن و پینگ پۆنگ و ئەنجامی باشیان بەدەست هێنا لەسەر ئاستی عێراق و وڵاتە عەرەبییەکان و ئاسیا تاوای لێهات بنکەی وەرزش و لاوانی هەولێر دەستێکی باڵای هەبوو لە پێشخستنی وەرزش لە هەولێر و ساڵانە دەیان قارەمانی پێشکەش دەکرد بە هەڵبژاردە جۆراوجۆرەکانی وەرزشی عێراق و لە بەر ئەوەی بناغەی بنکە و وەرزش و لاوانی هەولێر هەر لە سەرەتاوە بە پاکی دەستی پێ کرد بەکادیری کورد هەروەکوو خۆی ماوە بە پاکی و تا ئێستاش هەر بەردەوامن لە پێشخستنی رەورەوەی وەرزش.

## وەزارەتی وەرزش و لاوان

لەتەواوکەری رەورەوەی وەرزش و پێشخستنی بڕیاری حکومەتی هەرێمی کوردستانە بەدامەزراندنی وەزارەتی وەرزش و لاوان لەساڵی ٢٠٠٦ و بەدانانی وەزارەت، بنیاتنانی وەرزش تەواوبوو. چونکە بوونی وەزارەتی وەرزش و لاوان فاکتەرێکی گرنگە بۆ پەرەپێدانی وەرزش لەکوردستان، لەبەر ئەوەی کار و کردەوەکانی وەزارەت پێویستی بەنەخشە و پلاندانان هەیە لەهەموو بوارەکانی وەرزش، ئەمەش هەر لەژێرخانی وەرزش و ئامادەکردنی کادری بەتوانا و ئەکادیمی تا دەگاتە ئامێر و پێداویستی وەرزشی، بێگومان لەو حاڵەتە وەرزش گواستنەوەیەکی باش بەخۆیەوە دەبینێ.

ئەگەر بێتو بەراوردێکی ورد لە نێوان وەرزشی پێش راپەرین و سەردەمی پاش راپەرین بکەین، دەبینین وەرزشوانانمان لە ژێر هەموو فشاری دەروونی و دژ بە دژی لاوانی کورد دەکرا و دەچەوسانەوە سەرەڕای ئەمەش وەرزش زۆر پێشکەوتووتر بوو لە هەولێر لەبەر ئەوەی لاوی کورد هەردەم بۆ گەیشتنە مەرامی خۆی لە هەموو بوارەکانی ژیان و تێکۆشاوە، بەتایبەتی لە بواری وەرزش، کە بە دەیان وەرزشوانی قارەمان گەیشتنە هەڵبژاردە جۆراوجۆرەکانی وەرزشی عێراق و چەندین پاڵەوانێتی و میدالیای کیشوەری و عەرەبی و عێراقیان بە دەست هێناوە، بەڵام پاش راپەرین بەو هەموو پشتگیری ماددی و مەعنەوییە لە حکومەت و حیزبە سیاسیەکان بۆ وەرزشوانان و هەر چەندە هەموو شارەکانی عێراق لە تەنگ و چەڵەمەیەکی حکومەتی، ناوچودا هەبوون، بەڵام وەرزشوانانمان چ هەڵبژاردەکان چ یانەکان نەمان توانی بناغەیەکی وەرزشی پتەو دابمەزرێنین بۆ ئەوەی گەلێک زیاتر پێشکەوین رێژە بە وەرزشوانانی شارەکانی دیکە چونکە هەموو کارو کردەوەکانمان بۆ ئەنجامی دەستکەوتی نزیک بوو بێ، ئەوەی بیر لە دووا رۆژ بکەینەوە یان ئەو کاتەی لە دەستمان بوو لەگەڵ ئەو هەموو پشتگیرییە بەدوو پلانی پێنج ساڵی بتوانین پشت بە یاریزانەکانی خۆمان ببەستین ئەوەتە تا ئێستاش کە شانزە ساڵە سەربەخۆین و بە ملیۆنەها دینار سەرف کراوە پشت بە یاریزانە هاوردەکان دەبەستین لە هەموو بوارەکانی وەرزش، بەتایبەتی یانەکانی پێشەنگ ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ بیر نەکردنەوەی لێپرسراوانی وەرزش بۆ دووا رۆژ کەوتنە دووی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان و کارکردنیان بەبێ پلان و نەخشە.

## ئەو کەسانەی کە هۆکار بوون بۆ پێشخستن و بەرزکردنەوەی ئاستی وەرزشی لە شاری هەولێر:



**عەلی حەمادی:** یەکەمین مامۆستای وەرزش بوو لە شاری هەولێر، کە دەرچووی پەیمانگای باڵای مامۆستایان بووە، و یەکەمین کەس بوو کە وەرزشی بە فەرمی لە شاری هەولێر دەست پێکرد و دەتوانین بڵێین یەکەمین راهێنەر و ناوبژیوان بووە، لە هەمان کاتدا لە زۆربەی یارییەکان.

**محەمەد عەزیز فەتاح:** مامۆستایێکی لێهاتووی وەرزش بووە و رۆڵێکی بەرچاوی هەبووە لە پێشخستنی وەرزش لە شاری هەولێر بەتایبەتی لە قوتابخانەکان و لە دیدەوانی، هەموو بوارەکانی وەرزش.

**عەلی حوسێن کەسرە:** لە مامۆستا پێشینەکانی وەرزشە

لە شاری هەولێر، لە خێزانێکی وەرزشوانی پێشکەوتوو بوون بە خۆی و براکانی و کوڕەکانی.

**شەعلان حوسێن کەسرە:** لە مامۆستا پێشینەکانی وەرزشە لە شاری هەولێر و گەلێک خزمەتی بزاڤی وەرزشی لە هەموو بوارێکدا لە ساڵانی چل و پەنجاکان کردووە.

**حەیدەر عوسمان:** مامۆستا و یاریزانی دێرینی شاری هەولێر بووە، و ڕۆڵی گرنگی هەبووە، لە پەرەپێدانی وەرزشی قوتابخانەکان و تیپی ئەهلیش، یاریزان و ناوبژیوان و ڕاهێنەر بووە، لە ساڵانی چلەکان.

**عەزیز مەولوود:** مامۆستا و وەرزشوانی دێرینی شاری هەولێرە، چەندین ساڵ بەڕێوەبەری چالاکییەکانی دیدەوانی و وەرزش بووە، لە مەعاریفی هەولێر، لەو کەسانەیە وەرزشی لە قوتابخانەکانی هەولێر پەرەپێداوە.

**ئیبراهیم حەلاق:** وەرزشوان و یاریزانی دێرینی شاری هەولێر بووە، و لە دامەزرێنەرەکانی تیپی ئەهلی و بروسک و یانەی هەولێر بوود، خزمەتێکی زۆری وەرزشی کردووە بەتایبەتی لە بواری تەندروستی وەرزشی و یارمەتییێکی زۆری هەموو وەرزشوانانی ئەم شارە دەکرد، جگە لەمەش خزمەتێکی زۆری هێزی پێشمەرگەی کوردستانی کردووە وەکوو برین پێچ.



**نورەدین حاجی محەمەد:** وەرزشوانێکی دێرینی شاری هەولێر بووە و لە دامەزرێنەرەکانی تیپی ئەهلی و یانەی بروسک بووە، کابرایێکی ڕوح سوک و قسە خۆش بووە.

**شەهید فرەنسۆ هەریری:** فرنسۆ توما هەریری سەرکردەی تێکۆشەر و ناسراوی بزاڤی شۆڕشی کوردستانی و وەرزشوانانی ناودار و بەتوانای هەولێر و کوردستان.

لە شارۆچکەی هەریری شاری هەولێر لە بنەماڵەیەکی ئاشووری کوردستانی لەدایک بووە.

قۆناغی سەرەتایی لە شارۆچکەی هەریر تەواوکردووە.

بۆ خوێندنی ناوەندی و ئامادەیی و مامۆستایان ڕوو لە شاری هەولێر دەکات و قوتابییەکی چالاک و ژیر و وەرزشوانێکی بە توانا و لێهاتوو بووە، لە یانەی بروسک و هەڵبژاردەی پەروەردە یاری کردووە و خۆشەویستی و هاوڕێیەتی پتەوی لەگەڵ هەولێرییەکان دروست کردووە و خۆشەویستی وەرزشوانان بووە. دوایی تەواوکردنی ئامادەیی مامۆستایان، وەک مامۆستا ڕوو لە دەڤەری سەربڵندی بارزان دەکات ئینجا بە تەواوی تێکەڵی شۆڕشی ئەیلوولی مەزن دەبێت و ئاشنای باوکی ڕوحی کورد و سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان دەبێت. سەرەنجام دەبێتە باوەڕپێکراو و متمانەی بارزانی نەمر لە ساڵی ١٩٦٣ تا شەهید کردنی لە شۆڕش و پێشمەرگایەتی دانەبڕاوە.

دوای ڕاپەڕینی مەزنی ١٩٩١ دەگەڕێتەوە کوردستان و هەولێر دووبارە ئاشنای وەرزش و وەرزشوانان دەبێتەوە.

لە ماوەیەکی کورتدا دەبێتە سەرکردە و خۆشەویستی سەرجەم وەرزشوانانی کوردستان و ڕۆڵی کاریگەری دەبێت لە بزاڤی وەرزشی و بە تایبەت دروستکردنی ژێرخانی وەرزشی، کە کوردستان یەکجار هەژار بوو، بنیادنانەوەی یاریگای هەولێریش باشترین شایدی بۆ دەدات. ئێستا یاریگا و مەلەوانگە و هۆڵی داخراوی شەهید فرنسۆ جوانترین سیماکانی شاری هەولێرن.

بەڵام داخەکەم لە ١٨ی شوباتی (..........) دەستی ڕەشی تیرۆرستان خەڵتانی خوێنی دەکەن وەرزش و هەولێر لەم سەرکردە ماندوونەناسە هەتا هەتایە بێ بەش دەکەن.

**محەمەد سۆفی محەمەد ئەمین:** وەرزشوان و مامۆستای دێرینی شاری هەولێر بووە ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لە پێشخستنی وەرزش لە قوتابخانەکان و یانە جۆراوجۆرەکانی شاری هەولێر (یانەی بروسک و تەئاخی و هێرش)، چەندین ساڵ سەرۆکی یەکێتی باسکەی هەولێر بووە، هەروەها تەواوکەری مامۆستا (محەمەد عەزیز



فەتاح) بووە لە چالاکی دیدەوانی و بەددیان خول بەناوی عێراق بەشداری لە خولی دیدەوانی عەرەبی کردووە.

**کەمال تەیب:** مامۆستا و وەرزشوانی شاری هەولێر بووە، خزمەتێکی زۆری بواری چالاکی وەرزشی لە قوتابخانەکان کردووە وەکوو مامۆستا و سەرپەرشتیار.

**یاسین تاهیر مەعرووف:** وەرزشوانێکی دێرینی شاری هەولێرە لە تۆپی پێی هەروەها مامۆستا و کارگێڕێکی وەرزشی دڵسۆز و خزمەتگوزار بووە و دەستی راهێنەری و ناوبژیوانێکی لێهاتوو بووە، کەس تۆزی ناشکێنێ لە بواری کارگێڕی، لە ساڵی شەستەکانەوە تا ئێستا لە خزمەتکردنی گۆڕەپانی وەرزش بەردەوامە.

**ناسر یوسف:** مامۆستا و راهێنەری تۆپی پێی بوو رۆڵێکی گرنگی هەبوو لە پێشخستنی یاری تۆپی پێ، بەتایبەتی لە یانەی بروسک و یانەی هەولێر جگە لەمەش دەستێکی باڵای هەبوو لە نووسین و رەخنەگرتن و کابرایێکی رۆشنبیر بووە و لە دامەزرێنەرەکانی یانەی ئەکادی عینکاوە بووە.

**فاروق سەید حەسەن:** یاریزانی دێرین و مامۆستای وەرزش بووە، رۆڵێکی گرنگی هەبووە لە پێشخستنی وەرزش، بەتایبەتی لە لایەنی کارگێڕی، لە دامەزرێنەرەکانی یانەی هەولێر بووە ساڵی (١٩٦٨)، چەندین ساڵ سەرۆکی ئەم یانەیە بووە، هەروەها ماوەیەک لێپرسراوی نوێنەرایەتی ئۆلۆمپی عێراق بووە لقی هەولێر.

**ناسح بەننا:** مامۆستا و راهێنەر و ناوبژیوان و کارگێڕ بووە لە بواری وەرزش، کاری یانەی بروسک و هێرش کردووە وەکوو سکرتێر چەندین ساڵ و ناوبژیوانێکی نێودەوڵەتی بوو لە تۆپی باسکە دەستێکی باڵای هەبوو لە دروست کردنی باک گراوندی یاریگاکان.

**هاشم ئیبراهیم سەلیم کورچی:** یاریزانی دێرینی شاری هەولێر بووە لە بواری هەڵگرتنی قورسایی و لە پاڵەوانەکانی عێراق بووە لە ساڵانی شەست و سەرەتای هەفتایەکان پێشمەرگەیێکی دێرینی شۆڕشی ئەیلوولی مەزن بووە، چەندین جار بریندار بووە لە کاتی خزمەتکردنی پێشمەرگایەتی. لە ساڵانی شەستەکان و لە کاتی پێشبڕکێیە بەناوبانگەکانی عێراق لە بەرزکردنەوەی قورسایی کاتێ کە ئاسنی بەرز دەکردەوە هاواری دەکرد (کوردستان)..

**هاشم محەممود مەلا حەمە:** یاریزان و مامۆستای وەرزش و راهێنەری یاری هەڵگرتنی قورسایی بووە لە ساڵانی شەستەکانەوە، دەتوانین بڵێین یەکێکە لەو کەسانەی، کە گەلێک یاریزانی ئاست بەرزی پێ راگەیاندووە،دەستێکی باڵای هەبووە لە راهێنەرایەتی و ناوبژیوانی جگە لەمەش چەندین ساڵ وەکوو کارگێڕ خزمەتی یانەی بروسک و هەولێری کردووە.



**رەمزی وەلی عەلی:** یاریزان و مامۆستا و راهێنەر و ناوبژیوانی شاری هەولێرە، لە زۆربەی یارییەکان یاری کردووە لە ساڵانی پەنجا و شەستەکان، خزمەتێکی زۆری تۆپی بالە کردووە، چەندین یاریزانی لاوی لەم یارییەدا پێ گەیاندووە، جگە لەمەش پێشمەرگەیێکی دێرینی شۆڕشی ئەیلوولی مەزن بووە.

**عادل محەممەد عەبدوڵلا:** مامۆستای دێرینی شاری هەولێرە و یەکەمین سەرۆکی یەکێتی تۆپی دەست بووە لە هەولێر چەندین ساڵ لە پەروەردەی هەولێر بەڕێوەبەری چالاکی وەرزشی قوتابخانەکان بووە.

**خالید رەسوڵ:** یاریزان و راهێنەر و کارگێڕی دێرینی شاری هەولێرە لە هەرە یاریزانە باشەکانی شاری هەولێر بووە لە یاری تۆپی پێ و تۆپی باسکە جگە لە یارییەکانی گۆڕەپان و مەیدان چەندین ساڵ راهێنەری هەڵبژاردەی هەولێر و یانەی ئاسۆ و ئەکاد بووە لە تۆپی باسکە، ئاستێکی بەرزی هەبووە لە راهێنەرایەتی لە هەردوو یاریدا تۆپی پێ و باسکە هەروەها کارگێڕێکی لێوەشاوەیە لە بواری وەرزش لە ساڵی شەستەکانەوە تا ئێستا لە خزمەت کردنی وەرزشی هەولێر و کوردستان بەردەوامە.



**ئەسعەد محەممەد قەساب:** پاڵەوانی عێراق بووە لە کۆتایی ساڵانی شەستەکان لە یاری هەڵگرتنی قورسایی و راهێنەر و ناوبژیوانی نێودەوڵەتییە دەستێکی باڵای لە پێگەیاندنی

چەندین پاڵەوان لە بەرزکردنەوەی قورسایی لە سەر ئاستی عێراق و عەرەب و ئاسیا هەبووە.

**ئیسماعیل عەدۆ:** یەکەمین پاڵەوانی یارییەکانی گۆڕەپان و مەیدان بووە لە کاتی کردنەوەی یاریگای خۆجێیەتی هەولێر ساڵی (١٩٥٧).

**ئەنوەر شەکرچی:** مامۆستا و وەرزشوانێکی دێرینی شاری هەولێر بووە و کارگێڕیکی بە توانا بوو لە بواری وەرزشی، چەندین ساڵ بەڕێوەبەری چالاکییەکانی دیدەوانی وەرزشی بوو لە پەروەردەی هەولێر، بەڵام بەداخەوە زوو لە کاری وەرزشی کشایەوە.

**نەوزاد شێخ تەیب:** لە هەرە کارگێڕە باشەکانی شاری هەولێر بووە و راهێنەر و ناوبژیوانیش بووە لە بواری تۆپی پێ و چەندین ساڵ بەڕێوەبەری لاوانی هەولێر و دهۆک بووە و جگە لە یەکێتی تۆپی پێی هەولێر، لە سالانی هەفتایەکان ئەندامی یەکێتی ناوەندی عێراقیش بووە.

**نەمیر نورەدین:** یاریزان و راهێنەری تۆپی باسکە بووە لە سالانی شەستەکان و هەفتایەکان، رۆڵێکی گرنگی هەبووە لە پێشخستنی وەرزش لە بواری بنکەکانی وەرزش و لاوان، کاتێک کە بەڕێوەبەری وەرزش و لاوان بووە توانیویەتی بناغەیێکی پتەوی وەرزش بۆ بنکەکانی وەرزش و لاوان دابمەزرێنێت، مرۆڤێکی خاوەن کەسایەتییەکی بەهێز بووە و لە کارکردن سەرکەوتوو بووە.

**یونس عەلی مەحموود:** وەرزشوانێکی دێرینی شاری هەولێر و یاریزانێکی لێهاتووی یارییەکانی گۆڕەپان و مەیدان بووە.



**محەمەد عوسمان:** یاریزانی دێرینی بەناوبانگی شاری هەولێرە، رۆڵێکی گرنگی هەبووە لە پێشخستنی یاری تۆپی پێ وەکوو یاریزان و راهێنەر و ناوبژیوان و کارگێڕ، چەندین ساڵ ئەندامی یەکێتی تۆپی پێی هەولێر بووە، هەروەها کارگێڕی یانەی هەولێر و سەردەمێک نوێنەری لیژنەی ئۆلۆمپی عێراق بووە لە شاری هەولێر، چەندین یاریزانی ئاست بەرزی پێ گەیاندووە.

**محەمەد خەلیل:** بە مەمۆ بەناوبانگە، یاریزانی دێرینی شاری هەولێرە لە بواری تۆپی پێ، خزمەتێکی زۆری بواری وەرزش کردووە وەکوو راهێنەری و کارگێڕی و راهێنەری تیپی پۆلیس و هەڵبژاردەی هەولێر بووە لە سەردەمی زێرینی.

**قانیعە مەحموود عەلاف:** لە مامۆستایە دێرینەکانی شاری هەولێرە لە بواری وەرزش، یەکێکە لە کارگێڕە گرنگەکانی وەرزشی ئافرەتان، لە پێشخستنی وەرزش لە بواری وەرزشی کچان لە قوتابخانەکانی هەولێر رۆڵێکی گرنگی هەبووە.

**عالیە مەحموود:** لە مامۆستایە دێرینەکانی شاری هەولێرە لە پەروەردەی هەولێر، دەستێکی بالای هەبووە لە رێکخستن و بەڕێوەبردن چالاکی وەرزشی کچان لە بەڕێوەبەرایەتی چالاکی و دیدەوانی لە شاری هەولێر.

**د. سەرهەنگ عەبدولخالق:** یاریزان و مامۆستا و راهێنەر و پاڵەوانی عێراق بووە. لە هەڵگرتنی قورسایی بەشداری کردووە لە ئۆلۆمپیادی بەرشلۆنە وەکوو سەرۆکی شاندی بەرزکردنەوەی قورسایی.

**عەبدولخالق مەسعوود:** لە کارگێڕە باشەکانی وەرزشییە لە شاری هەولێر، لە دامەزرێنەرەکانی یانەی برایەتییە جگە لەمەش ئەندامی یەکێتی ناوەندی تۆپی پێی عێراقە و سەرۆکی یەکێتی تۆپی پێی هەولێرە و یەکەمین کوردە، کە بەڕێوەبەری تیپی ئۆلۆمپی عێراق بێ لە تۆپی پێی، کە پلەی چوارەمیان لە ئۆلۆمپیادی (ئەسینا) بەدەست هێنا، ئێستاش لە خزمەتکردنی بزاڤی وەرزش وەکوو کارگێڕ جێگری سەرۆک لە یانەی هەولێر بەردەوامە.

**نامق عەزیز حاجی سادق:** یەکێکە لە وەرزشوانە دێرینەکانی شاری هەولێر، یەکێکە لە دامەزرێنەرەکانی یانەی هەولێر و یەکەمین سەرۆکی یانەی دهۆکە و دامەزرێنەری ئەم یانەیە هەروەها دەستەی کارگێڕی یانەی بابل بوو، کاتێک کە دوورخرابووەوە لە کوردستان پاش پلانە شوومەکەی جەزائیر خزمەتێکی زۆری وەرزشوانانی شاری هەولێری کردووە.

**دەشتی وەهاب شەهاب:** یاریزانێکی دێرینی شاری هەولێرە لە یاری تۆپی باسکەدا لە سەرەتای سالانی شەستەوە، یەکێکە لە دامەزرێنەرەکانی یەکێتی تۆپی باسکەی هەولێر ساڵی ١٩٧٣ و بەردەوام تا ساڵی ١٩٩٦



سەرۆکی یەکێتی تۆپی باسکەی هەولێر بووە، لە ساڵی ١٩٧٦ بەڕێوەبەری وەرزش و لاوانی هەولێر بووە، توانیویەتی گەلێک خزمەتی بزاڤی وەرزشی شاری هەولێر بکات.

نابێ رۆڵی هەندێک لە سەرۆک تیپە میللییەکان لە یاد بکەین، چونکە ساڵانە چەندین یاریزانی بەتوانایان دەگەیاندە ئاستی یانە و هەڵبژاردە جۆراوجۆرەکانی شاری هەولێر و لەمانەش ئەم بەڕێزانە بوون:

١- نووری عارەب: تیپی رزگاری
٢- حاجی کانەبی: تیپی سەفین
٣- موحسین رەحمەتوڵلا: تیپی ڤێستا
٤- بورهان نەجار: تیپی ئەنوار
٥- سدیق محەممەد: تیپی ئەتلەس
٦- ئیسماعیل (ئەبوحەقی): تیپی سپۆرت
٧- شێرزاد خوادە: تیپی سیروان
٨- نەجمەدین خەلیل: تیپی گەڕەکی عەرەب
٩- موحسین رەشید قەلەو: تیپی تەحریر
١٠- سەید سەباح و حاجی صالح: تیپی سمود
١١ سەلیم حەسەن خۆشناو: تیپی ٨ شوبات (خەبات)
١٢- فاروق عەبدوڵلا: تیپی ئیسکان
١٣- ستار سادق: تیپی ئەهلی
١٤- کەمال رەشید: تیپی سکە

**هاندەرەکانی وەرزشی شاری هەولێر:**

کەسانێک هەن کە بە درێژایی تەمەنیان شەیدای وەرزش و هاندانی تیپەکانی هەولێر بوون، هەمیشە لە هەموو یارییەکان شوێن و دەنگ و رەنگیان لە گۆڕەپانەکانی یاری دیار بووە، ئەمەی خوارەوە ناوەکانیانە، داوای لێ بوردن دەکەین لەو کەسانەی کە ناوەکانیان لێرە نەهاتووە و رۆڵی کاریگەر و بەرچاویان هەبووە.

١- مام جبرائیل ٢- هادی عەباس ٣- موعتەسەم کارەسوڵ ٤- ئەحمەد شەوقی ٥- سابیر بەننا ٦- عەبدولخالق ئیبراهیم (کەکوش) ٧- حاجی کانەبی ٨- عەبدوڵلا نەبی ٩- سلێمان سێودین ١٠- سابیر ئەحمەد حوسێن ١١- حاجی سالح ئەحمەد حەمەد ١٢- عوسمان محەمەد چایچی ١٣- ئیدریس قۆچە ١٤- جەمال خدر ١٥- تەلعەت موشیر ١٦- محەمەد بیلال (شێمە قەساب) ١٧- عەبدوڵلا عارەب ١٨- نووری عارەب ١٩- سەباح غوفوور ٢٠- سەلیم حەسەن ٢١- تەلعەت ئەمین ٢٢- ئەسکەندەر رەئیس ٢٣- ئەحمەد جەمیل ٢٤- جەودەت سادق ٢٥- دلشاد شێخ تەیب

## تۆپی پێ

**مێژووی تۆپی پێ:**

ئەگەر بێت و باسی مێژووی تۆپی پێ بکەین لە جیهان و کەی دەستی پێ کردووە، ئینگلیزەکان دەڵێن ئێمە خاوەنی دۆزینەوەی ئەو یارییەین و پێش هەموو جیهان یاری تۆپی پێمان کردووە، بەڵام نەک وەکوو تۆپی پێی ئێستا بەڵکو بەشێوەیەکی سەرەتایی یەکەمین یاری لە نێوان دوو شار کراوە بەبێ دیار کردنی یاریگا و کات و چەندی یاریزان، بەڵکو لە بەیانی تاکو رۆژئاوا بەردەوام بووە و ئەوەی ماندوو بووە یان تووشی پێکان هاتووە چووەتە ماڵێ و چارەسەری خۆی کردووە و نانی خواردووە پاشان دیسان گەڕاوەتەوە یاری کردن و گۆڵیش ئەوە بووە، کە کام شار تۆپ بگەیێنێتە شارەکەی دیکە و خاڵ تۆمار بکا.

بەڵام زۆر لە گەلان و وڵاتان باس لەوە دەکەن، کە تۆپی پێ لەوێ دۆزراوەتەوە، وەکوو چینی دەڵێن کە لە ساڵی (١١٥ پ. ز) لە لای ئەوان پەیدا بووە. هەروەها مێژوونووسەکان دەڵێن لە عێراق دۆزراوەتەوە، بەڵگەشیان ئەوەیە، کە لەشاری (نفر لە شاری عەفەک) لە پارێزگای



دیوانیەی ئێستا وێنەیەکی کۆنیان دۆزیوەتەوە، کە دەگەڕێتەوە سەردەمی بابلییەکان و ئاشورییەکان، وێنەکەش دوو لاقی مرۆڤێک نیشان دەدات کە شتێکی خڕی لە پێشە لە شێوەی تۆپ، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت، لە سەدەی هەژدەهەم لە وڵاتی ئینگلستان سەری هەڵداوە و بەرەبەرە یاسایان بۆ داناوە و لەوێوە بۆ ئەوروپا و ئەو شوێنانەی ئینگلیز داگیریان کردبوو چونکە ئەو کاتە دەیان گوت ئالآی ئینگلیز ڕۆژی لێ ئاوا نابێ.

لە ساڵی ١٩٠٤ یەکێتی تۆپی پێی جیهان دامەزراوە، کە لە (فەرەنسا و بەلجیکا و هۆلەندا و سوید و دانیمارک و مەجەر و ئیسپانیا) پێکهاتبوو، خولی ئۆلۆمپی چوارەم لە ئینگلیزستان لە ساڵی (١٩٠٨) کەوتە ناو یارییە ئۆلۆمپییەکان.

لە ساڵی ١٩٣٠ یەکەم جامی جیهانی تۆپی پێی لە (ئۆرۆگوای) بەڕێوەچوو. و عێراق ساڵی ١٩٤٨ یەکێتی تۆپی پێی دامەزراند و لە ساڵی (١٩٥٠) چووە ریزی یەکێتی جیهانی تۆپی پێی (FiFA).

یەکێتی تۆپی پێی شاری هەولێر بۆ یەکەم جار لە ساڵی (١٩٦٨) دامەزرا. ئەگەر بێت و باسی مێژووی سەرهەڵدانی تۆپی پێ بکەین، بێ گومان تۆپی پێ لە عێراق بە شێوەیەکی گشتی پاش جەنگی یەکەمی جیهانی کە سوپای بەریتانیا عێراقی داگیر کرد لەگەڵ خۆیان یاری تۆپی پێیان هێنایە عێراق، بە تایبەتی لە شاری بەسرە، کە پێش هەموو پارێزگاکانی دیکەی عێراق داگیرکرا، بەڵام تا دامەزراندنی حکومەتی عێراقی بەشێوەیەکی ڕێک و پێک نەبوو، بەڵکو خەڵک بۆ خۆی یاری دەکرد و ئامادە دەبوون لە یارییەکانی داگیرکەران تاوای لێهات، کە بتوانن یاریشیان لەگەڵ بکەن لە شاری هەولێر پێش جەنگی چەند قوتابییێک لە (ئەستانە) دەیان خوێند لە کاتی گەڕانەوەیان بۆ هەولێر تۆپییان لەگەڵ خۆ هێناو ئەوەبوو بە سەرەتای یاری تۆپی پێ، بەڵام بەشێوەیەکی نایاسایی، تا چەند قوتابخانەیەک دامەزران پاش دامەزراندنی حکومەتی عێراق، لەوانە قوتابخانەی (ئولا و سانیە و سالسە)، کە لە قوتابخانەکان لە نێوان قوتابخانەکان یاری دەکرا هەروەها تیپی (میللی)یش پەیدا بوون کە پێیان دەگوت تیپی ئەهلی. دەتوانین بڵێین لە ساڵی (١٩٣٠) بە هاتنەوەی مامۆستای بەڕێز خوالێخۆشبوو (عەلی حەمادی) یاری تۆپی پێ پێشکەوتنێکی باشی بەخۆوە بینی، چونکە تازە لە بەغدا دەرچوو بوو و بە خۆشی وەرزشوانێکی لێهاتوو بوو توانی بەشێوەیەکی سەردەمی تیپ بۆ قوتابخانەی (ئەربیل ئولا) (اربیل الاولی) دابمەزرێنێت، هەروەها تیپی ئەهلیش، بەڕێوە دەبرد بەڵام یارییەکان وەکوو بڵێی وەرزی بوو، بەتایبەتی لە وەرزی بەهار و کاتی بوونی قوتابخانەکان، ئیستر بەرەبەرە یاری تۆپی پێ خۆشەویستانی پەیدا بوو، چەند تیپێکی ئەهلی و حکومی وەکوو تیپی ئەهلی و تیپی پۆلیس و تیپی مەعارف، بەتایبەتی خانەی مامۆستایان تا ساڵی (١٩٥٦)، کە یانەی بروسک دامەزرا، کە بووە چەرخی سەرهەڵدانی تۆپی پێ لە هەولێر، لەبەر ئەوەی یانەی بروسک دەستی کرد بە یاری کردن لەگەڵ شارانی دیکە و یارییەکە جەماوەری بۆ پەیدا بوو بۆ نموونە کە یاریێکی قوتابخانەکان دەبوو لە نێوان دوو قوتابخانە جەماوەرێکی زۆر ئامادەی یارییەکە دەبوو.

پاش دامەزراندنی یانەی وەرزشی بروسک چەند تیپێکی دیکە دامەزرا، لەوانە تیپی پۆلیس و مەعاریف لە هەمان کاتدا ڕۆڵی قوتابخانەکان و هەڵبژاردەی مەعاریف ڕۆڵیان گرنگ بوو لە پێشخستنی یاری تۆپی پێ و بەرەبەرە چەند تیپێک دامەزران، وەکوو تیپی نەقابەی مامۆستایان کە مامۆستا ئەحمەد حەسەن و فاروق حەسەن و تەهۆ و عیزەدین حوسێن و ئەدیب دانیال و یاسین تاهیر و زۆرانی دیکە یاریان تێدا دەکرد، و لەگەڵ ئەوانەش چەند تیپێکی میللیش وەکو سەفین و خانەقا و تەعجیل و (رزگاری) و (دور ضباط الصف)، کە لە تەیراوە بوو و زۆربەی یاریزانیان عەرەب بوون، لە هەمان کاتدا هەڵبژاردەی هەولێر بە هێزتر بوو و یاریزانی تازەی پێراگەیاند جگە لە یاریزانە کۆنەکان (رەمزی وەلی و فەتحی ئیبراهیم و فاروق تەوفیق و محەمەد عوسمان و کانەبی گچکە و مورسل حوسێن و ئەکرەم حوسێن).

لە ساڵی (١٩٦٦) بۆ یەکەم جار خولێکی تۆپی پێ کرایەوە بۆ تیپە میللییەکان، کە نزیکەی (١٠) دە تیپ بەشدارییان تێدا کرد، کە لە یاری کۆتایی تیپی کابتن جەمولی بە حەوت گۆڵ بەرامبەر بەیەک گۆڵ لە تیپی رزگاری بردەوە، ئەوە لە ساڵی (١٩٦٦) بوو، کە تیپی کابتن جەمولی لە یاریزانان (محەمەد عوسمان و خالید

رەسوڵ و مورسل حوسێن و ئەدیب دانیال و ئەنترانیک نیکۆلا و دەروێش جەمیل و کانەبی محەمەد و سمکۆ ئیبراهیم و سەرتیپ فاریق و رەفعەت سلێمان و محەمەد زاهیر و ولیەم عۆدیشۆو ئەنوەر کەللە و فاروق تەوفیق) پێکهاتبوون و تیپی رزگاریش لەم یاریزانانە پێکهاتبوو: (نووری عارەب و کەریم هۆدەقران و رەقیب شێخانی و ئیحسان و رەمزی وەلی و بەسەرپەرشتی هاشم کورەچی بوو.

لە ناوەڕاستی ساڵی شەستەکان تیپی عەسکەری فیرقە (١) هاتە هەولێر کە چەندین یاریزانی باشی عێراقی لە ناودا بوون وکو (فالح وەسفی و رەزاق ئەحمەد و جەمیل حەنون)

ئەوانە هاندەرێکی باش بوون لە پێشکەوتنی تۆپی پێ و هەڵبژاردەی هەولێر بۆ یەکەم جار لە هەڵبژاردەی کەرکووک بباتەوە بە (٢ گۆل بەرامبەر بە گۆلێک) لە یارییەکانی پارێزگاکان کە پێیان دەگوت پاڵەوانێتی (کۆماری) ئەو کاتە مامۆستای خوالێخۆشبوو (ناسر یوسف) راهێنەری تیپەکە بوو لە ساڵی (١٩٦٨) یەکەمین یەکێتی تۆپی پێ دامەزرا لە هەولێر.

بە دامەزراندنی یانەی هەولێر لە ساڵی ١٩٦٨ سەردەمێکی تازە دەستی پێ کرد، بۆ یەکەم جار لە شارەکانی کوردستان دوو یانەی وەرزشی هەبێ لە شارێک بوونی یانەی هەولێر پێشبڕکێی پەیدا کرد لە نێوان هەردوو یانە، لە هەمان کاتدا تیپە میللییەکان پەرەیان سەند بە سەدان یاریزانی باش و لێوەشاوە هاتنە مەیدان.

لە ساڵی ١٩٦٩ یانەیەکی دیکە لە تەیراوە دامەزرا بە ناوی یانەی (هێرش) کە چەندین یاریزانی لاوی تێدا پەیدا بوون و بوونە پاڵپشتێکی دیکە بۆ وەرزش تۆپی پێ لە





هەولێر، و لە هەمان ساڵدا تیپی پۆلیسی هەولێر لە سەر دەستی شەهیدی خوالێخۆشبوو (عەقید حوسێن شێروانی) دامەزرا، کە یاریزانە باشەکانی هەولێری دامەزراند بە پۆلیس و بۆ یەکەم جار یاریزانانی هەولێر مووچە وەربگرن بۆ بژێوی ژیان یاریزانەکانی پێکهاتبوون لە:

١- محەمەد مەولوود ٢- شێرۆ خەلیل ٣- محەمەد عوسمان ٤- کانەبی محەمەد زەینەل ٥- باقی عوسمان ٦- نەجات عەبدولواحید ٧- سەلاح سەید ئەحمەد ٨- حازم عوسمان ٩- زیوەر قەساب ١٠- رەشاد سابیر ١١- غازی حوسێن ١٢- جەمال عەساف ١٣- ئەنوەر کەللە ١٤- ئەکرەم حوسێن ١٥- سەلاح بەترۆس ١٦- خالس قۆجە ١٧- ئەبو زێد محەمەد ١٨- عەبدولئیلاە عەبدوڵلا مەردان ١٩- مامەند رەمەزان ٢٠- ساڵح شەریف ٢١- موشیر محەمەد ٢٢- محەمەد خەلیل ٢٣- خالید رەسوڵ ٢٤- مورسەل حوسێن ٢٥- ئەسعەد محەمەد عەلی ٢٦- سەباح شێخ جەلال ٢٧- عەونی سەید ئەحمەد ٢٨- عەلی حەسەن باپیر.

لەبەر ئەوەی تیپی پۆلیسی هەولێر خەرجی و پارەی باشیان هەبوو و سەر بە دەزگایێکی حکومی فەرمی بوون توانییان جولەیەکی باش بخەنە ناو وەرزشی تۆپی پێ لە هەولێر بەبەشداری کردنیان لە خولەکانی پۆلیسی عێراق و بانگێشت کردنی تیپە باشەکانی عێراق، وەکوو تیپی پۆلیس و قوەجەویە و فیرقەی سێ و تیپی یانەکانی شارەکانی دیکەی عێراق، بۆیە دەتوانین بڵێین کە تیپی پۆلیس یەکێک بوو لە تیپە هەرە باشەکانی عێراق و ئەنجامی باشیان بەدەست هێنا لەسەر ئاستی عێراق و چەندین یاریزانیان لە هەڵبژاردە جۆراوجۆرەکانی عێراق وەرگیران و یارییان کرد لە تیپە نایابەکانی عێراق (خولی



وەکوو لەش جوانی و یاریێکی (میللی) بووە لە شاری هەولێر لە گەڕەکی (تەعجیل) لە ناوچەی (گلکەند) کەرەستەی ئەم یارییەش نەبووە، بەڵکو بە خۆیان دروستیان کردووە وەکوو، دیشلی ئۆتۆمبێل و شەفتی دەستکرد و قالبی چیمەنتۆ ئەو یاریزانانەی کە ئەو کاتە یاریان کردووە: (تەها حەوت کورتەک، رەمزی وەلی، کامل حەداد، بەکر مەلەک، ئیبراهیم کۆیی، تەحسین شێخۆ و عەلی ئەحمەد و محەمەد سۆفی) ئەمانە یاریزان و پالەوانانی شاری هەولێر بوونە ئەو کاتە و لە ماوەی ناوبراودا لە گەڕەکی (جوولەکان) خانوویێکیان هەبووە یارییان لە ناوی کردووە: هیچ ناوێکی نەبووە. تا ساڵی ١٩٥٦ کە یانەی بروسک دامەزرا ئەم یارییە پێشکەوتنێکی بەخۆوە بینی، ئەویش بەجیاکردنەوەی یاری (لەش جوانی) لەگەڵ یاری (هەڵگرتنی قورسایی)، ئەم جیابوونەوە لە ساڵی (١٩٥٩) رووی دا، ئەویش پێشبرکێیەک لە هەڵگرتنی قورسایی، کرا، کە هەموو ئەو وەرزشوانانەی کە لە سەرەوە ناویان هاتووە بەشداریان کردوە، لەم پێشبڕکێیەدا، کە لەسەر ئاستی شاری (هەولێر) ئەنجام درا و دوای ئەم پێشبرکێیە یاریزانی نوێ هاتنەکایەوە بۆ یاری (هەڵگرتنی قورسایی، ئەوانیش ئەمانەن:

١- هاشم ئیبراهیم سەلیم کورەچی
٢- موحسین تەوفیق
٣- عوسمان کەریم حەداد
٤- عەساف محەمەد
٥- نیازی دەلاڵ
٦- لەتیف سابیر
٧- هاشم مەحموود مەلا حەمە
٨- موشیر بەزاز
٩- فەرهاد محەمەد قەساب

**لە نێو ئەو کۆمەڵە وەرزشوانەدا یاریزانی ئاست بەرز پەیدا بوون، وەکو:**

١- هاشم ئیبراهیم کورەچی
٢- عوسمان کەریم
٣- موحسین تەوفیق / یاریزانی هەڵگرتنی قورسایی و لەش جوانی بوو
٤- موشیر بەزاز
٥- فەرهاد محەمەد قەساب

ئەم یاریزانانە ئاستی بەرزیان پیشاندەدا کاتێک لە پاڵەوانێتییەکان بەشداریان دەکرد.

بۆ ساڵی (١٩٦٤) یاریزانیدیکەیش پێ راگەیشتن و ئاستی بەرزیان پیشان دەدا لە پێشبڕکێیان، کە پلەی یەکەمیان لەسەر ئاستی عێراق بەدەست دەهێنا، و ئەو هەموو راهێنانەی کە ئەکرا لە یانەی (بروسک) ئەنجام دەدرا و راهێنەری تایبەت نەبووە بەم جۆرە یارییە، بەڵکو یاریزانی لێهاتوو وەکوو: (هاشم ئیبراهیم کورەچی و هاشم مەحموود مەلا حەمە) وەکوو سەرپەرشتیارێک بوونە لە سەر ئەم جۆرە یارییە، بۆ ساڵی (١٩٦٦) یاریزانی تریش پەیدا بوون، وەکوو: (ئەسعەد محەمەد قەساب) کە لە ساڵی (١٩٦٨) توانی پلەی یەکەم لەسەر ئاستی عێراق بە دەست بهێنێت، هەروەها ئیدریس تەوفیق ئەویش پلەی دووهەمی بەدەست هێناوە ئینجا ئەم تیپە بێ راهێنەر مایەوە ئاستیان باش بووە تا ساڵی (١٩٧٢) کە یەکەم راهێنەری شاری هەولێر پەیدا بوو، ئەویش (ئەسعەد محەمەد ساڵح) بوو، کە خولی راهێنەری لە شاری

(بەغــدا) بینی و بوو بە راهێنەری یانەی (هەولێــر) و بنکەی وەرزش و لاوانی هەولێر، لەم ماوەیەدا کە دەکاتە ساڵی (١٩٧٣) یەکەمین یەکێتی هەڵگرتنی ئاسن و لەش جوانی شاری هەولێر بوو دامەزرا، کە پێکهاتبوو لەم بەڕێزانە:-

١- محەمەد عەلی / سەرۆکی یەکێتی هەڵگرتنی ئاسن و لەش جوانی.

٢- ئەسعەد محەمەد ساڵح / جێگری سەرۆک

٣- خالید سابیر / سکرتێری یەکێتی

٤- ئەکرەم جەبار بەقال / ئەندام

لە ساڵی ١٩٧٠ یاریزانیدیکە پەیدا بوون تا ساڵی ١٩٧٧ وەکوو:

١- شەمسەددین رەقیب

٢- نیازی عەلی دەلاڵ

٣- موحسین مستەفا

٤- عەزیز خدر

٥- سەردار عومەر ئیسماعیل

٦- سەردار کەریم

٧- سەباح فەقێ خدر

٨- ئیدریس تەوفیق

٩- یاسین تەوفیق

١٠- جەمال کەمال

١١- دلشاد رائیق

١٢- رەعد عەبدوڵلا ئەسکەندەر

لە نێوان ئەم کۆمەڵە وەرزشوانەدا یاریزانی ئاست بەرز پەیدا بوون، وەکوو:-

یاریزان:-

١- نیـازی عـەلی دەلاڵ: ئەم یاریزانە زۆر جـار پلەی یەکەمی لەسەر ئاستی عێراق بەدەست هێناوە.

٢- سەردار کەریم: ئەم یاریزانەش لە ساڵی (١٩٧١)ەوە تا ساڵی (١٩٧٤) پلەی یەکەمی لەسەر ئاستی عێراق بەدەست دەهێنا.

٣- سەردار عومەر ئیسماعیل: ئەم یاریزانە لەساڵی (١٩٧٢) توانیویەتی پلەی یەکەم بەدەست بهێنێت لەسەر ئاستی تازە پێگەیشتووانیش و لە سەر ئاستی لاوان دیسان پلەی یەکەمی بەدەست هێناوە لەسەر ئاستی پێشکەوتووان پلەی سێیەمی بەدەست هێناوە.

٤- یاریزان عەزیز خدر: ئەم یاریزانە زۆر جار لە سەر ئاستی عێراق پلەی یەکەمی بەدەست هێناوە لە ساڵی (١٩٧٢)ەوە تا سەرەتای ساڵی هەشتایەکان.

٥- موحسێن مستەفا: ئەم یاریزانە لەسەر ئاستی عێراق ساڵی (١٩٧٨ تا ساڵی ١٩٨٠) بۆ ماوەی سێ ساڵ پلەی یەکەم و دووەمی بە دەست هێناوە.

لە ساڵی (١٩٧٦)ەوە تا ساڵانی نەوەدەکان یاریزانی دیکە لە شاری هەولێر لە یاری هەڵگرتنی قورسایی لە ژێر چاودێری راهێنەر (ئەسعەد قەساب)پەیدا بوون.

١- سەبری مەتی ٢- کانەبی حەویز ٣- محەمەد یاسین ٤- بەهجەت سلێوە ٥- موحسین عەزیز عەلی ٦- تاهیر سابیر خۆشناو ٧- سەرهەنگ عەبدولخالق ٨- موحسین عەزیز عەلی ٩- موحسین تەحسین قەساب ١٠- رزگار شاکر ١١- د. دەهام خدر ١٢- یوسف حەمەد ئەمین خەیات ١٣- خوالێخۆشبوو ئیبراهیم مستەفا ١٤- عەلی مەعرووف ١٥- ئازاد تەحسین شێخۆ ١٦- تەوفیق یونس کورەچی ١٧- سەمەد محەمەد رەزا ١٨- فەتحی عەباس ١٩- محەمەد سەدیق ٢٠- شاخەوان مستەفا ٢١- جەعفەر قادر چاوشین ٢٢- فەرهەنگ خەسرۆ میرزا ٢٣- نەجات ئەحمەد عەبدوڵلا ٢٤- ئیدریس وەیسی ٢٥- داود حەسەن رەمەزان ٢٦- سەدرەدین عوسمان ٢٧- ساڵح بەکر ٢٨- نەوزاد عەبدوڵلا سلێمان ٢٩- محەمەد فوئاد ٣٠- ئەرسەلان ساڵح ٣١- سەرتیپ محەمەد ٣٢- خەسرۆ ئیسماعیل کەریم ٣٣- عەبدولخالق ئەحمەد ٣٤- حەویز عەباس حوسێن ٣٥- محەمەد مەولوود ساڵح ٣٦- ئیسماعیل مەولوود ساڵح ٣٧- فەرەیدون خەسرۆ میرزا ٣٨- ئاراس سەعید ٣٩- رۆستەم محەمەد حەویز ٤٠- قاسم هاشم ٤١- کەریم شاکر ٤٢- رشدی شاکر ٤٣- سەلاح فەقێ

لە نێوان ئەم یاریزانانەدا یاریزانی ئاست بەرز دروست بوون، لەمانە:-

١- محەمەد یاسین محەمەد: گەلێک پاڵەوانێتی لەسەر ئاستی دەرەوەی عێراق ئەنجام داوە گرنگترینیان ئەمانەن: ساڵی (١٩٧٩) پلەی سێیەمی لە پاڵەوانێتی (ئاسیا) لەسەر ئاستی (تازە پێگەیشتووان) بەدەست هێناوە، لە هەما ساڵدا لە پاڵەوانێتی عەرەب پلەی (یەکەمی) بەدەست هێناوە،

لە کێشی (٥.٦٧) کلغم کە لە کوردستانی عێراق لە (سەری ڕەش) ئەنجام درا، لە ساڵی (١٩٨٠) لە ئۆلۆمپیادی (مۆسکۆ) پلەی هەڤدەهەمی لەسەر ئاستی جیهان بەدەست هێناوە، بۆ ساڵی (١٩٨٢ - ١٩٨٣) پلەی سێیەمی لەسەر ئاستی لاوانی جیهان بەدەست هێناوە و لە هەمان ساڵدا لە سەر ئاستی پێشکەوتووان لەسەر کیشوەری ئاسیا پلەی سێیەمی بەدەست هێناوە، بۆ ساڵی (١٩٨٤) لە ئۆلۆمپیادی (لوس ئەنجلس) بەشداری کردووە لەسەر ئاستی پێشکەوتووان و پلەی پێنجەمی لەسەر ئاستی جیهان بەدەست هێناوە.

٢- یاریزان تاهیر سابیر خۆشناو: پاڵەوانی عێراق بووە لەسەر ئاستی تازە پێگەیشتووان و لاوان و پێشکەوتووان تا ساڵی (١٩٨٥)، بەشداری لە پاڵەوانێتی (ئاسیا) لە نیپال کردووە، سێ مەدالیای زێڕی لەم پاڵەوانێتییەدا بەدەست هێناوە، بۆ ساڵی (١٩٨٦) بەشداری لە خولی ئاسیا کردووە لە (سیئول) و ساڵی (١٩٨٧) لە پاڵەوانێتی (ئەنادۆلی) نێودەوڵەتی کردووە لە وڵاتی (تورکیا) و لەم پاڵەوانێتییەدا یەک میدالیای زێڕ و دوو زیوی بەدەست هێناوە و لە ساڵی (١٩٨٧) بەشداری لە پاڵەوانێتی ئاسیا لە وڵاتی (چین) کردووە بۆ ساڵی (١٩٨٩) بەشداری لە پاڵەوانێتی مینیسک) لە مۆسکۆ کردووە، بۆ ساڵی (١٩٩٠) ژمارەی پێوانی تۆمار کردووە کە (١٦٥) کلغم خەتف و (٢٠٢.٥) کلگم نەتر بووە.

٣- یاریزان رزگار شاکر: ئەم یاریزانە پاڵەوانی عێراق بووە لە سەر ئاستی پێشکەوتووان و بەشداری گەلێک پاڵەوانێتی لە دەرەوەی وڵات لەسەر ئاستی وڵاتە عەرەبییەکان و جیهان کردووە و لەسەر ئاستی وڵاتە عەرەبییەکانیش پلەی یەکەمی ساڵی (١٩٨٦ و ١٩٨٧) بەدەست هێناوە.

٤- عەزیز خدر پیربال: ئەم یاریزانەش لە ساڵی (١٩٧٥)ەوە پاڵەوانی عێراق بووە و گەلێک جار لەسەر ئاستی عێراق پلەی یەکەمی بەدەست هێناوە.

٥- غازی عەزیز عەلی: ئەم یاریزانە لە ساڵی (١٩٧٨) پلەی دووەمی لەسەر ئاستی لاوانی عێراق بەدەست هێناوە، لە ساڵی (١٩٧٩ و ١٩٨٠) پلەی یەکەمی لەسەر ئاستی عێراق بەدەست هێناوە. (لەسەر ئاستی لاوان و تازە پێگەیشتووان).

٦- نەجات ئەحمەد: یەکێکە لە پاڵەوانەکانی عێراق لە ساڵی (١٩٨٦ تا ساڵی ١٩٩١).

٧- سەدرەدین عوسمان: لە ساڵانی (١٩٧٦ و ١٩٧٧) پلەی دووەم و یەکەمی لەسەر ئاستی لاوانی عێراق بەدەست هێناوە و لە ساڵی ١٩٨٠ ژمارەی نوێی لە کێشی (٥٦ کگم) لەپاڵەوانێتی عێراق لە هەولێر تۆمار کرد.

٨- ئەرسەلان ساڵح: یەکێکە لە پاڵەوانەکانی عێراق لە ساڵانی ١٩٨٧ و ١٩٨٩ لە سەر ئاستی لاوانی عێراق.

٩- خەسرۆ ئیسماعیل قەساب: یەکێکە لە پاڵەوانەکانی عێراق لەسەر ئاستی لاوان و پێشکەوتووان پلەی دووەمی بە دەست هێناوە.

١٠- موحسین عەزیز عەلی: ئەم یاریزانەش یەکێکە لە پاڵەوانەکانی عێراق لەسەر ئاستی لاوان لە ساڵی (١٩٧٧ - ١٩٨٢)، پاڵێوراوە بۆ بەشداری کردن لە پاڵەوانێتی جیهان لەسەر ئاستی لاوان.

١١- سەرهەنگ عەبدولخالق: ئەم یاریزانەش پاڵەوانی عێراق بووە لە ساڵانی هەشتایەکان، گەلێک جار لەسەر ئاستی عێراق پلەی یەکەمی بەدەست هێناوە، لە دیدارێکی دۆستانەدا لەگەڵ وڵاتی (سعودیە) پلەی یەکەمی بەدەست هێناوە.

١٢- ئازاد تەحسین شێخۆ: ئەم یاریزانە لە سەرەتای ساڵانی هەشتاوە تا کۆتایی ساڵانی هەشتایەکان زۆر جار پلەی یەکەمی لەسەر ئاستی عێراق بە دەست هێناوە. لە کێشی ٦٠ کگم و یەکێک بووە لە پاڵەوانە بەتواناکانی عێراق.

١٣- فەرهەنگ خەسرۆ میرزا: ئەم یاریزانەش لە ساڵی (١٩٨٤ تا ساڵی ١٩٩٠) زۆر جار لەسەر ئاستی عێراق لەسەر ئاستی لاوان و تازە پێگەیشتووان پلەی یەکەمی بەدەست هێناوە.

١٤- دەهام خدر مەحموود: پاڵەوانی عێراق بووە لە سەر ئاستی لاوان و پێشکەوتووان چەندین جار لە پاڵەوانێتی وڵاتە عەرەبیەکان بەشداری کردووە، و لە وڵاتی میسر ساڵی ١٩٨٨ پلەی سێیەمی بەدەست هێناوە و خاوەنی چەندین میدالیای نێودەوڵەتی بووە،

و لە پاڵەوانێتی سەدامی نێودەوڵەتی بەشداری کردووە و پلەی یەکەمی بەدەست هێناوە هەڵبژێردرا بۆ پاڵەوانیەتی (التنین الفچی) لە بەریتانیا ساڵی ١٩٨٩.

١٥- شاخەوان مستەفا مەولود: یەکێکە لە پاڵەوانەکانی عێراق و خاوەنی ژمارەی پێوانی عێراقە لە کێشی (٦٧ کلغم) لەساڵی ١٩٨٨ تا ساڵی ١٩٩٠ و ساڵی (١٩٨٨) بەشداری لە پاڵەوانێتی عەرەب کردووە لە وڵاتی (میسر) و پلەی یەکەمی بەدەست هێناوە. بەشداری کردووە لە پاڵەوانیەتی تونسی نێودەوڵەتی ساڵی ١٩٨٩ و پلەی یەکەمی بەدەست هێناوە.

١٦- خوالێخۆشبوو جەلیل مەولود مستەفا: ئەم یاریزانە لە ساڵی ١٩٨٧ بەشداری پاڵەوانێتی عێراقی کردووە لە سەر ئاستی وەرزشوانە دێرینەکان و پلەی یەکەمی بەدەست هێناوە و لە هەمان ساڵدا هەڵبژێردراوە بۆ بەشداری کردن لە پاڵەوانێتی جیهان لە وڵاتی (دانیمارک).

١٧- فەتحی عەباس مەجید:
ئەم یاریزانە یەکێکە لە پاڵەوانەکانی عێراق لەسەر ئاستی لاوان.

١٨- نەوزاد عەبدوڵلا سلێمان: پاڵەوانی عێراق بووە. لەسەر ئاستی عێراق پلەی دووەمی بەدەست هێناوە لە پێشکەوتووان ساڵی ١٩٩٤.

١٩- قاسم هاشم: ئەم یاریزانەش پاڵەوانی عێراق بووە.

٢٠- محەمەد سەدیق: ئەم یاریزانەش لەسەر ئاستی عێراق پلەی سێیەمی بەدەست هێناوە بۆ ماوەی زیاتر لە ١٠ ساڵ.

٢١- عەبدولخالق ئەحمەد: ئەم یاریزانەش یەکێکە پاڵەوانەکانی عێراق لەسەر ئاستی لاوان ئەم یاریزانانەی کە باسمان کردن وەکوو گوتمان لە ناوەڕاستی هەفتایەکان پەیدا بوون هەندێکیان بەردەوام یاریزان بوونە تاکۆتایی ساڵانی هەشتایەکان و سەرەتای ساڵانی نەوەد.

٢٢- یاریزان محەمەد مولود ساڵح: پاڵەوانی عێراق بووە لە سەر ئاستی لاوان لە کێشی (٥٢ کلگم) بۆ ساڵی (١٩٨٧) پلەی یەکەمی بەدەست هێناوە.

٢٣- یاریزان موحسین تەحسین قەساب: (١٩٧٨-١٩٧٩) پاڵەوانی عێراق بووە لە ساڵی.

٢٤- ڕۆستەم محەمەد حەوێز: ئەم یاریزانەش پاڵەوانی یانەکانی عێراقە لە سەر ئاستی لاوان لە کێشی (٤٨) کلغم لە ساڵی١٩٨٥.

هەندێک یاریزانی دیکە پەیدا بوون ئەمەش دوای ساڵانی (١٩٩٠)ەوە تاکو ئێستاش هەندێکیان بەردەوامن، لە نێوان زۆربەی زۆری ئەم یاریزانانە پاڵەوانن لەسەر ئاستی عێراق و وڵاتە عەرەبییەکان و لەم یاریزانانەش:-

١- ئادەم نادر: ئەم یاریزانە یەکێکە لە پاڵەوانەکانی یانە عەرەبییەکان و پلەی سێیەمی بەدەست هێناوە.

٢- ئیدریس وەیسی: یەکێکە لە پاڵەوانەکانی عێراق و ژمارەی پێوانەیی وڵاتە عەرەبییەکانی لە کێشی (٧٧ کلغم) ساڵی (١٩٩٨) تۆمار کردووە، کە توانیویەتی (١٤٠ کلغم) خەتف و (٥.١٦٠) کلغم نەتر بکات و یەکێک بووە لە یاریزانە بە تواناکانی شاری هەولێر.

٣- ئیسماعیل مەولود ساڵح: ئەم یاریزانەش پاڵەوانی یانەکانی عێراقە و لەسەر ئاستی یانەکانی وڵاتە عەرەبیەکان پلەی سێ یەمی بە دەست هێناوە و لە پاڵەوانێتی سەدامی نێودەوڵەتی ساڵی (١٩٩٣) سێ میدالیای زێڕی لە بەغدا بەدەست هێناوە. هەروەها خاوەنی میدالیای زێڕە لە پاڵەوانیەتی وڵاتە عەرەبییەکان لە ئوردون.

٤- سوارە محەمەد پیرباڵ: پاڵەوانی عێراق و عەرەب و جیهانی یە و خاوەنی سێ میدالیای زێڕە لە پاڵەوانێتی عەرەب لە وڵاتی (سوریا) ساڵی (٢٠٠٣) یاریزانێکی لێهاتووە و دوارۆژێکی گەشی لە پێشە..

٥- گۆران عەبدولرەزاق: پاڵەوانی عێراق و یانەکانی وڵاتە عەرەبییەکانە ساڵی (٢٠٠٣-٢٠٠٤) و خاوەنی یەک میدالیای زێڕ و پێنج میدالیای زیوە لەسەر ئاستی وڵاتە عەرەبییەکان.. یەکێکە لە هیواکانی شاری هەولێر لە دوارۆژدا..

٦- عەلی محەمەد عەبدولقادر: خاوەنی شەش میدالیای عەرەبییە سێی زیوە و سێی برۆنزیە ساڵی (٢٠٠٣-٢٠٠٤).

٧- عەبدوڵلا عەبدولرەحمان: پاڵەوانی عێراق و یانە عەرەبییەکانە سێ میدالیای زیوی ساڵی (٢٠٠١ -

٢٠٠٢) بەدەست هێناوە.
٨- هەرێم تەها: پاڵەوانی عێراق و عەرەب و رۆژ ئاوای ئاسیایە، بەشداری لە پاڵەوانێتیجیهانی کردووە، پلەی پێنجەمی لەسەر ئاستی جیهان بەدەست هێناوە و هەڵبژێردراوە بەباشترین یاریزان لە عێراق لەسەر ئاستی هەموو یارییە وەرزشییەکان لە ساڵی (٢٠٠٥) و خاوەنی حەوت میدالیای زێڕ و سێ میدالیای زیوو دووی برۆنزییە.
٩- محەمەد جەعفەر ساڵح: ئەم یاریزانەش پاڵەوانی عێراقە بۆ ماوەی دە ساڵ لە ساڵی (١٩٩٦ - ٢٠٠٥).
١٠- رزگار حەمەد سلێمان: پاڵەوانی عێراقە و بەشداری لە پاڵەوانێتی وڵاتە عەرەبییەکان کردووە.
١١- یاریزان زۆراب حەسەن رەمەزان: ئەم یاریزانە پاڵەوانێتی عێراقی بەدەست هێناوە لەسەر ئاستی لاوان لە ساڵی (١٩٩٨ تاکو ساڵی ٢٠٠٦).
١٢- یاریزان ئیدریس زرار عەزیز: ئەم یاریزانە ساڵی (٢٠٠٥) پلەی یەکەمی لەسەر ئاستی لاوانی عێراق بەدەست هێناوە.
١٣- یاریزان محەمەد هاشم کەریم: ئەم یاریزانە لەسەرئاستی تازە پێگەیشتووان و لاوان پلەی یەکەمی لەسەر ئاستی عێراق بە دەست هێناوە لەسەر ئاستی یانەکانی عێراق و ئێستاش یاریزانی هەڵبژاردەی عێراقە.
١٤- یاریزان فوئاد فەرهاد عوسمان: ئەم یاریزانە ساڵی (٢٠٠٤-٢٠٠٥) پلەی یەکەمی لەسەر ئاستی تازە پێگەیشتوانی عێراق بەدەست هێناوە.

ئەو کەسانەی کە لە سەرەتای دەست پێ کردنی یاری هەڵگرتنی قورسایی لە شاری هەولێر جێگای دەست و پەنجەیان دیارە لە دامەزراندن و پێ راگەیاندنی وەرزشوانان و گەیاندنیان بۆ ئاستی بەرز و پێشخستنی ئەم یارییە وەکوو راهێنەر ئەمانەن:-

١- هاشم ئیبراهیم سەلیم کوردچی: وەکوو یاریزانێکی ئاست بەرز لە ساڵی (١٩٦١) سەرپەرشتی یاریزانەکانی (هەڵگرتنی قورسایی) شاری هەولێری دەکرد و لە ساڵانی شەستەکان پاڵەوانی عێراق بووە.
٢- هاشم مەحمود مەلا حەمە: لە ساڵی (١٩٦٦)ەوە وەکوو یاریزانێکی ئاست بەیرز سەرپەرشتی یاریزانەکانی شاری هەولێری دەکرد وەکوو راهێنەر و ساڵانی هەشتاکان و نەوەدەکان وەکوو باوکی بەرزکردنەوەی قورسایی دەژمێردرا، چەندین جار سەرۆکایەتی وەفدی عێراقی کردووە لە دەرەوە.
٣-راهێنەر ئەسعەد محەمەد ساڵح قەساب: ساڵی (١٩٧٢) وەکوو یەکەم راهێنەری هەڵگرتنی قورسایی خزمەتی وەرزشی شاری هەولێری کردووە دوای ئەوەی، کە خولی راهێنەری لەشاری (بەغدا) دیوە بەسەرپەرشتی پسپۆری روسی لە ساڵی ١٩٧٣ راهێنەری بنکەی وەرزش و لاوانی هەولێر بووە و راهێنەری هەڵبژاردەی هەولێر بووە لە (هەڵگرتنی قورسایی) و لە ماوەی خزمەت کرندیدا وەکو راهێنەر گەلێک یاریزانی گەیاندۆتە ئاستی پاڵەوانەکانی عێراق، وڵاتە عەرەبییەکان و ئاسیا و جیهان.
٤- راهێنەری خوالێخۆشبوو فەرهاد محەمەد وەهاب قەساب: ئەویش راهێنەری بنکەی وەرزش و لاوانی هەولێر بووە دوای ساڵی (١٩٨٠)، زۆر جێگای دیارە وەکوو خزمەتکردنی ئەم جۆرە وەرزشە و زۆر یاریزانی لاوی پێ راگەیاندووە و یەکێک بووە لە پاڵەوانە بەناوبانگەکانی عێراق.
٥- راهێنەر سەرهەنگ عەبدولخالق: ئەم راهێنەرەش لە ساڵی (١٩٨٥)ەوە تاکو ساڵی (١٩٩٢) راهێنەری یانەی هەولێر بووە. لە هەمان کاتدا ساڵی (١٩٩٠) راهێنەری هەڵبژاردەی لاوانی عێراق بووە. گەلێک یاریزانی گەیاندۆتە ئاستی بەرز.
٦- راهێنەر سەباح فەقێ عەزیز: ئەم راهێنەرە لە ساڵی (١٩٨٠) تا کۆتایی ساڵی هەشتایەکان راهێنەری بنکەی وەرزش و لاوانی هەولێر بووە.
٧- راهێنەر رزگار جەوددت: راهێنەری بنکەی وەرزش و لاوانی هەولێر بووە لە ساڵی (١٩٨٦-١٩٩٠).
٨- راهێنەر سەمەد محەمەد ردزا: لە ساڵی (١٩٩٠)ەوە یاریدەدەری راهێنەری یانەی هەولێر بووە ئینجا لە ساڵی (١٩٩٢) بۆتە راهێنەری یانەی هەولێر و هەڵبژاردەی هەولێر تاکو ئێستا و لەم ماوە درێژەدا گەلێک یاریزانی، لە سەر ئاستی عێراق و وڵاتانی عەرەب گەیاندۆتە پلەی بەرز.

٩- راهێنەر سەردار عومەر ئیسماعیل: ئەم راهێنەرە لە ساڵی (١٩٩٥)ەوە راهێنەری یانەی هەولێر بووە شان بە شانی راهێنەر (سەمەد محەمەد رەزا) تا ساڵی (٢٠٠١)، رۆڵی بەرچاویان هەبووە لە پێگەیاندنی ئەو یاریزانانەی کە لەم سەردەمەدا یاریان کردووە و ئێستاش راهێنەری یانەی (بروسکە).

١٠- راهێنەر خەسرۆ ئیسماعیل کەریم: لە ساڵی ٢٠٠٢ بۆتە یاریدەدەری راهێنەری یانەی هەولێر و هەڵبژاردەی هەولێر لە ساڵی ٢٠٠٥ بۆتە راهێنەری یانەی هەولێر، تا ئێستاش بەردەوامە.

١١- راهێنەر رزگار شاکر: راهێنەری بنکەی وەرزش و لاوانی هەولێر.

١٢ - راهێنەر موحسێن عەزیز عەلی: لە ساڵی (١٩٩٢)ەوە وەکوو راهێنەر خزمەتی وەرزشی شاری هەولێر دەکات تاکو ئێستاش راهێنەری یانەی (تورکمان)ە.

١٣- یاسر هاشم: راهێنەری هەڵبژاردەی لاوانی هەولێرە.

١٤- نەوزاد عەبدوڵلا: راهێنەری یانەی (بروسک)ە.

١٥- راهێنەر ئیدریس تەوفیق راهێنەری بنکەی لاوانی هەولێر ساڵانی ١٩٧٥ - ١٩٧٨.

ئەو ناوبژیوانانەی کە لە یاری (هەڵگرتنی قورسایی) لە سەرەتاوە تا ئێستا خزمەتی وەرزشی شاری هەولێریان کردووە:-

١- ئەسعەد محەمەد ساڵح قەساب: ناوبژیوانی نێودەوڵەتی

٢- خوالێخۆشبوو هاشم محمود مەلا حمە: ناوبژیوانی نێودەوڵەتی

٣- د. سەرهەنگ عەبدولخالق: ناوبژیوانی نێودەوڵەتی

٤- د. دەهام خدر: ناوبژیوانی نێودەوڵەتی

٥- موحسێن تەحسین: ناوبژیوانی نێودەوڵەتی

٦- محەمەد سەدیق ئیسماعیل: ناوبژیوانی پلە یەک

٧- هاشم ئیبراهیم کوردچی: ناوبژیوانی پلە یەک

٨- فەتحی عەباس مەجید: ناوبژیوانی پلە یەک

٩- نەوزاد عەبدوڵلا: ناوبژیوانی پلە یەک

١٠- یوسف حەمەد ئەمین خەیات: ناوبژیوانی پلە دوو

١١- جەعفەر محەمەد رەزا: ناوبژیوانی پلە دوو

١٢- یوسف سابیر حەسەن: ناوبژیوانی پلە دوو

١٣- عەزیز خدر: ناوبژیوانی پلە دوو

١٤- فەرەیدون ئەحمەد: ناوبژیوانی پلە دوو

ناوی سەرۆک و ئەندامانی یەکێتی بەرز کردنەوەی قورسایی لە شاری هەولێر لە سەرەتای دامەزراندنییەوە تا ئێستا:-

**- ساڵی ١٩٧٢:**

١- محەمەد عەلی
٢- موشیر یونس
٣- ئەسعەد محەمەد
٤- نەقیب فەراهم
٥- خالید سابیر

**- ساڵی ١٩٧٣:**

١- محەمەد عەلی
٢- حەیدەر ئەیوب
٣- ئەسعەد محەمەد قەساب
٤- خالید سابیر
٥- زەکەریا ئەڵلا وێردی
٦- نیازی عەلی
٧- موشیر یونس

**- ساڵی ١٩٧٥:**

١- خالید سابیر
٢- ئەسعەد محەمەد
٣- هاشم محموود
٤- زەکەریا ئەڵلا وێردی
٥- موشیر یونس

**- ساڵی ١٩٧٦:**

١- حەیدەر ئەیوب
٢- سەلاح رەشید
٣- بەشیر بەکر
٤- محەمەد عەلی
٥- موشیر یونس

**- ساڵی ١٩٧٧:**

١- ئەسعەد محەمەد ساڵح
٢-هاشم مەحموود مەلا حەمە
٣- موشیر یونس
٤- بەشیر بەکر

**- ساڵی ١٩٨١:**

١- هاشم مەحموود
٢- خالید سابیر
٣- نیازی عەلی
٤- حوسێن عومەر
٥- بەشیر بەکر
٦- تەها یاسین
٧- موشیر مەجید
٨- رەشاد مستەفا

**- سالی ١٩٨٥:**

١- هاشم مەحموود
٢- خالید سابیر
٣- ئەسعەد محەمەد
٤- زەکەریا ئەڵڵا ویردی
٥- بەشیر بەکر
٦- فەتحی عەباس

**- سالی ١٩٨٦:**

١- هاشم مەحموود
٢- خالید سابیر
٣- ئەسعەد قەساب
٤- زەکەریا ئەڵڵا ویردی
٥- سیروان بەحری

**- سالی ١٩٨٧:**

١- هاشم مەحموود
٢- زەکەریا ئەڵڵا ویردی
٣- موحسێن عەبدوڵڵا قەساب
٤- خالید سابیر

**- سالی ١٩٩٠:**

١- ئەسعەد محەمەد سالح
٢- هاشم مەحموود مەلا حەمە
٣- زەکەریا ئەڵڵا ویردی

**- سالی ١٩٩١:**

١- هاشم مەحموود مەلا حەمە
٢- تاهیر سابیر

**- سالی ١٩٩٦:**

١- هاشم مەحموود مەلا حەمە
٢- فەتحی عەباس

**- سالی ١٩٩٧:**

١- تاهیر سابیر سەعید
٢- هاشم مەحموود مەلا حەمە
٣- زەکەریا ئەڵڵاویردی

**بنیاتنانی لەش (لەش جوانی)**

وەرزشی بنیاتنانی لەش بەکۆنترین وەرزش دەژمێردرێت لە جیهان لەبەرئەوەی، لەگەڵ بوونی مرۆڤ ئەو وەرزشەی کردووە، هەر لە کۆنەوە کە مرۆڤی کۆن لە ئەشکەوتەکان دەژیا ئەم وەرزشەی کردووە و کارەکانی رۆژانەی وەرزش بووە لە دابین کردنی پێداویستییەکانی کە زۆربەی لە بەردی گەورە و دار پێکهاتبوو، هەر وەرزش بوو کە بەردی گەورەیان بەرز دەکردەوە و پێشبرکیان لەگەڵ یەکتر دەکرد، ئەوەش دەبوە هۆی ئەوەی لەشیان جوان بێت و ماسوولکەکانی لەشیان گەشە بکات و گەورە و بەهێز بێت.

وەرزش کردنی مرۆڤی کۆن بەشێوەی بەرنامە و زانستی نەبوو بەڵکو هەرەمەکی یاریان دەکرد، بەپێچەوانەی ئێستا



کە وەرزش لە ئەوپەری پەرەسەندن دایە و بۆتە شتێکی زانستی و تەندروستی و پەیدا کردنی پەیوەندی و خۆشەویستی و هاوکاری لە نێوان گەلانی جیهان، کە بە هەزاران یاریزان و پسپۆر و راهێنەر و پزیشکی تایبەتی هەیە، جگە لە هەزاران یانە و بنکەی مەشق و راهێنان لە هەموو کون و قوژبنێکی جیهان، ولات نییە لە جیهان وەرزشی بنیاتنانی لەشی لێ نەکرێ، بەلکو بنیاتنانی لەش زۆر پێویستە لەگەل هەموو یارییەکانیدیکە پێکەوە بکرێت، ئەگەر هەر یاریزانێک بنیاتنانی لەش نەکات بناغەی پتەوی نابێت بۆ هەر یارییێکیدیکە. بەشێوەی رێک و پێک وەرزشی بنیاتنانی لەش لە ئەمەریکا بۆ یەکەم جار بلاو بۆوە دوایی تەشەنەی کرد بۆ هەموو جیهان، لە ولاتی عێراقیش ماوەیەکی زۆرە ئەم یارییە بلاو بۆتەوە لە سالانی سییەکانی سەدەی رابردوو زۆر پالەوانی چاک و بە توانا هەبوو لە عێراق کە پێشتر پێیان دەگوت زۆرخانە، هەر بۆ خۆیان کەل و پەل و ئامێری ساکاریان دروست دەکرد و مەشقیان پێدەکرد، دوایی یانەی بە هێز دروست بوون و پالەوانی ئاست بەرز پەیدا بوون، کە ئەنجامی باشیان هەبوو لە سەر ئاستی ولاتانی عەرەبی و ئاسیا و جیهان وەکوو (عەلی گەیار و عەباس هینداوی و ئەحمەد روبەیعی) و هەر لەو کاتەدا لە شاری هەولێریش، کە دەکاتە کۆتایی سالانی چلەکان ئەم یارییە دەکرا، بۆ یەکەم جار لە مالان و هەندێ چایخانە دەستی پێ کرد کە یاریزانەکان هەر بە خۆیان کەل و پەلیان دروست دەکرد لە کۆنە ئاسنی ئۆتۆمبێل یان چیمەنتۆ و جیاوازی نەدەکرا لە سەرەتادا لە نێوان یاری هەلگرتنی قورسایی و لەش جوانی تا سەرەتای سالانی شەستەکان ئینجا ئەم یارییە جیاوازی پێ کرا لەگەل هەلگرتنی قورساییدا و لێک جیا بوونەوە، یاریزانەکانی شاری هەولێر، کە ئەو کاتە یارییان دەکرد ئەمانە بوون:

١- خوالێخۆشبوو موحسین تەوفیق ٢- خوالێخۆشبوو حوسێن سالح ٣- خوالێخۆشبوو حوسێن عەلی ٤- خالید ئەحمەد ٥- جاسم رەمەزان ٦- زەکەریا شاکر ٧- عەلی مەولوود ٨- ئیدریس تەوفیق ٩- خەسرۆ بەکر ١٠- جەلال غەریب ١١- کامل حەداد ١٢- تەها بۆریچی ١٣- عەلی ئەحمەد

لە سالی شەستەکان و هەفتایەکان یاریزانیدیکە پەیدا بوون:-

کە دەکاتە دوای دامەزراندنی یانەی بروسک و ئینجا یانەی هەولێر سالی (١٩٦٨)، لە پالەوانە دیارەکانی ناو شاری هەولێر لە سالانی شەست و هەفتایەکان:

١- ئەنوەر پالەوان ٢- بەکر کۆی ٣- دلاوەر قەساب ٤- جاسم رەمەزان ٥- عەبدوللا فەتاح ٦- بابە شێخ ٧- ئیسماعیل کەریم ٨- نەوزاد حەمە سالح ٩- جەلال جابی ١٠- چەتۆ خدر ١١- سەید عەزیز ١٢- رەشاد مستەفا ١٣- محەمەد ئەنوەر ١٤- تەها یاسین ١٥- جەلال غەریب ١٦- هاشم مەحموود ١٧- مامۆستا بەشیر ١٨- بەشیر فیتەر ١٩- ئیحسان فیتەر ٢٠- موحسین تەوفیق ٢١- ئیدریس تەوفیق

دەیان یاریزانی دیکە هەبوون، کە سالانی هەفتایەکان ئەنجامی بەرچاویان لە سەر ئاستی عێراق، هەبوو وەکوو:

١- شێرکۆ عەلی ٢- بەکر کۆیی ٣- مەحموود کوردی ٤- ئەحمەد قادر ٥- خەلیل بابە ٦- خالیدئەحمەد

دوای سالانی هەفتا و تا سالانی نەوەدەکان یاریزانی دیکە پەیدا بوون لە شاری هەولێر وەکوو:

١- بورهان عەلی ٢- موئەیەد هەمەوەندی ٣- فرسەت ٤- ناسر کانەبی

دوای سالی نەوەدەکان پاش راپەرینی پیرۆزی سالی (١٩٩١) و تا ئێستا یاریزانی ئاست بەرز لەشاری هەولێر پەیدا بوون و رۆلی کاریگەریان لە بەرزکردنەوەی ناوی کورد و کوردستان لە ولاتانی عەرەب و ئاسیا ئەم پالەوانانەش هەبوو.

١- سەردار ئیسماعیل: کە توانی پلەی یەکەم بهێنێت لەسەر ئاستی ولاتانی عەرەب و رۆژهەلاتی ناوەراست و پلەی سێیەمی لەسەر ئاستی کیشوری ئاسیا بەدەست هێنا.

٢- عادل کەمال: ئەم یاریزانەش توانی پلەی دووەم لە سەر ئاستی ولاتانی عەرەب و رۆژهەلاتی ناوەراست بەدەست بهێنێت و پلەی چوارەمی لەسەر ئاستی ئاسیا بەدەست هێنا.

پالەوانی تریش بەشداریان لە چەندین پالەوانێتی نێودەولەتی کردووە و چاوەروان دەکرێت ئەنجامی باشتر بەدەست بهێنن، وەکوو یاریزان:

١- نەزار ئەحمەد
٢- تالب فازل

٣- دانا جومعه
٤- ئەحمەد مەجید

دەتوانین بڵێین، كە زۆربەی ئەم یاریزانانە دوای ساڵانی نەوەدەوە لە ژێر چاودێری راهێنەر (بورهان عەلی جومعە) گەیشتوونەتە ئاستی بەرز.

ساڵی (١٩٩١) یەكەمین یەكێتی بنیاتنانی لەش لە شاری هەولێر دامەزرا، كە لەم بەرێزانە پێكهاتبوو.

١- بورهان عەلی جومعه
٢- جاسم رەمەزان شێخۆ
٣- ئەحمەد عەزیز

## یاری بۆكسێن

یاری بۆكسێن هەر لە سەرەتای بوونی مرۆڤایەتی لەبەر پێویستی ئادەمیزاد و راكردن و رۆیشتن بۆ پەیدا كردنی پێداویستییەكانی رۆژانەی و خۆ پاراستن و بەرگری لە خۆ كردن هەبووە، هەر لە سەرەتای ژیانی چەكی سەرەتای دەستی بۆ خۆ پاراستن مستی بووە.

لە مێژووە لە سەردەمی سۆمەریەكان پارچە رەسمێكیان دۆزیوەتەوە لە (٢٠٥٠) سال پێش لەدایك بوونی مەسیح یاری بۆكسێن هەبووە تا دەگاتە یونانییەكان، كە لە چەرخی ئەوان ئەم یارییە بلاوە بۆوە لە سەردەمی نوێش یەكەمین قوتابخانەی بۆكسێن دامەزراوە، كە (فلیج) سەرپەرشتی دەكرد، لە ساڵی (١٧٢٩) ژمارەی قوتابخانەكان گەیشتە (١٢) دوانزە قوتابخانە.

یاری بۆكسێن لە سێیەمین خولی ئۆلۆمپیا (سانت لویس) ساڵی (١٩٠٤) هاتە ناو یارییەكانی ئۆلۆمپی، كە (٤٤) چل و چوار یاریزان بەشداریان تێدا كردبوو.

لە عێراقی فیدراڵ ساڵی (١٩٣٣) لیژنەی بۆكسێن بەسەرپەرشتی (حیفزی عەزیز) دامەزرا، ساڵی ١٩٣٨ یەكەمین یاری بۆكسێن لە نێوان تیپی بەغدا و بەرەدای سوری ئەنجام درا.

## مێژووی یاری بۆكسێن لە شاری هەولێر

سەرەتای یاری بۆكسێن بۆ ساڵی (١٩٦٤) دەگەڕێتەوە، كە یەكەمین تیپی بۆكسێن لە یانەی (بروسك) لەسەر دەستی (زەید مەحموود عەلی) دامەزرا، كە تاكە یانە بوو لە هەولێر و دواى لە دەستەی كارگێری



ئەو كاتە كردووە كە (ئەنوەر شەكرچی و هاشم مەحموود و هاشم كورەچی) بوونە، كە یارمەتی بدەن بۆ دامەزراندنی تیپێك بۆ ئەم یارییە و دەستەی ناوبراو پێشتیوانیان كردووە وئەویش تیپێكی دامەزراندووە، و ئەو كەسانەی كە ئەو كاتە یاریان كردووە وەكوو (سەباح عەونی و خالید مەحموود و سەفین سەددیق و مەحموود عەزیز و رەشاد محەمەد و شاهین سەدیق بوون، بەلام هیچ ئەنجامێكیان بەدەست نەهێناوە، پاش دامەزراندنی یانەی هەولێر ساڵی (١٩٦٨) دیسان سەر لە نوێ تیپی بۆكسێن دامەزراوە، بەلام بوو لە بەر بێ دەرامەتی و كەمی پێداویستییەكانی ئەم یارییە هەر لاواز تا ساڵی (١٩٧١) كە پاڵەوانی عێراق (ئەحمەد سەعدوون) هاتە هەولێر كە كوردێكی فەیلی بووە و لە یانەی هێرش تیپێكی بۆكسێنی دامەزراند، كە چەند یاریزانێكی پەروەردە كرد وەكوو:-

١- مەزۆ لەشكری
٢- خوالێخۆشبوو ئەكرەم عەنكاوەی
٣- جەمال محەمەد
٤- سەدیق سەعید
٥- محەمەد قادر
٦- نەجدەت سەباح
٧- شێرزاد قادر

وە ئەم تیپە بەردەوام بوو تا ساڵی (١٩٧٤) كاتێك كە راهێنەری ناوبراو (ئەحمەد سعدوون) گەیشتە ریزی پێشمەرگەی كوردستان و بەم رووداوە یاری بۆكسێن لە یانەی هێرش تاواوە.

بەلام ئەم یارییە لە بنكەی وەرزش و لاوانی هەولێر بەردەوام بوو بەلام بێ ئەنجام دوای ئەم یاریزانانە لە

ناوەڕاستی هەفتایەکان و لە بنکەی وەرزش و لاوانی هەولێر چەند یاریزانێکی لێهاتوو پەیدا بوون، وەکو:-
١- عەبدولخالق حەمەد
٢- عەباس عەزیز
٣- هیمداد لەشکری
٤- خەسرۆ محەمەد
٥- قارەمان محەمەد
٦- نەهرۆ عەباس
٧- سالار ڕەحمان
٨- سەتار قادر

تا ساڵی ١٩٧٨ کە یەکەمین یەکێتی بۆکسێنی شاری هەولێر دامەزرا، لەگەڵ دامەزراندنی نوێنەرایەتی لێژنەی ئۆلۆمپی عێراق، کە ئەم یەکێتییە لەم بەڕێزانە پێکهاتبوون:
١- مستەفا ئەحمەد محەمەد: سەرۆک
٢- حەربی مەرهون: جێگر
٣- تەحسین خەلیل: سکرتێر
٤- زەید مەحموود عەلی: ئەندام
٥- نەجدەت ساڵح عەبدوڵڵا: ئەندام

دوای دامەزراندنی یەکێتی بۆکسێن چالاکی ئەم یەکێتییە دەست پێ کراوە و هەڵبژاردەی تازە پێگەیشتووان و لاوان دامەزراوە هەروەها لە دوای ئەم یاریزانانە دەستە یاریزانێکیدیکە لە ژێر دەستی ڕاهێنەری لێهاتوو (زەید مەحموود عەلی) پەروەردە کران، وەکوو:

١- موزەفەر عەلی ٢- فەرسەت زوبێر٣- سیروان سلێمان ٤- کاوە سلێمان ٥- عومەر عەبدوڵڵا ٦- محەمەد ڕەزا ٧- محەمەد عەبدولڕەحمان ٨- ئەسعەد محەمەد ٩- وەلید مەحموود ١٠- عەزیز نەبی ١١- یوسف حوسێن ١٢- دیار مەغدید ١٣- بیلال خەلیل ١٤- چۆلی جەمیل ١٥- سەمیر زرار ١٦- دلدار عەلی ١٧- وەهاب بەکر ١٨- کامەران سەلمان ١٩- لوقمان حوسێن ٢٠- یوسف بەشیر

لە نێوان ساڵانی (١٩٧٨ تا ١٩٨٣) هەڵبژاردەی تازە پێگەیشتووان و لاوان چەند پلەی باشیان بەدەست هێناوە لە سەر ئاستی ناوچەی باکووری عێراق، کە پارێزگاکانی (سلێمانی و دهۆک و هەولێر و کەرکووک و موسل و دیالە) بەشدارییان تێدا دەکرد هەروەها پلەی دووەم و سێهەمیانی لەسەر ئاستی عێراق بەدەست هێناوە، ئەو یاریزانانەی کە ئەنجامی باشیان بەدەست هێناوە و یاریان کردووە ئەمانەن:-
١- وەلید مەحموود: لە یاریزانە باشەکانی بۆکسێن بوو و پاڵاوترا بۆ هەڵبژاردەی عێراق بۆ پاڵەوانێتی جەزائیر.
٢- مەلا عومەر: ئەنجامی باشی لەسەر ئاستی عێراق بە دەست هێناوە.
٣- فرسەت زوبێر: لە یاریزانە باشەکانی هەولێر بووە.
٤- بەدرەدین شەریف: لە پاڵەوانەکانی عێراق بووە.
٥- کامەران سلێمان: لە یاریزانە باشەکان بوو پاشان بووە ڕاهێنەر.
٦- سیروان سلێمان: لە هەڵبژاردەی هەولێر بوو.
٧- زیاد سەلمان وێردینا: لە هەڵبژاردەی هەولێر بوو ئەنجامی باشی بەدەست هێنا.
٨- خوالێخۆشبوو ئەمیر حەبیب قاقۆز: ئەنجامی باشی لە سەر ئاستی عێراق بەدەست هێناوە.
٩- دیار مەغدید ئەحمەد: لە پاڵەوانەکانی عێراق بووە.
١٠- عەباس عەزیز لەشکری: لە یاریزانە باشەکانی هەڵبژاردەی هەولێر بووە.
١١- پشتیوان عەبدولواحید: لە پاڵەوانەکانی عێراق بووە.
١٢- کارلۆ ئەدوەر: یاریزانی هەڵبژاردەی هەولێر بووە.
١٣- تەوفیق ڕەمەزان: یاریزانی هەڵبژاردەی هەولێر بووە.
١٤- زانا محەمەد: یاریزانی هەڵبژاردەی هەولێر بووە.
١٥- نەجات عەوڵڵا: یاریزانی هەڵبژاردەی هەولێر بووە.
١٦- فەتحی عەباس: یاریزانی هەڵبژاردەی هەولێر بووە.
١٧- رزگار حەمەد ئەمین: یاریزانی هەڵبژاردەی هەولێر بووە.
١٨- دلشاد عومەر: یاریزانی هەڵبژاردەی هەولێر بووە.
١٩- خالید مەحموود: یاریزانی هەڵبژاردەی هەولێر بووە.
٢٠- فەتحی باوە: یاریزانی هەڵبژاردەی هەولێر بووە.
٢١- جەوەدەت عیزەدین: یاریزانی هەڵبژاردەی هەولێر بووە.
٢٢- عەبدولعەزیز قاسم: یاریزانی هەڵبژاردەی هەولێر بووە.
٢٣- خالید داود: یاریزانی هەڵبژاردەی هەولێر بووە.
٢٤- عودەی بەترۆس: یاریزانی هەڵبژاردەی هەولێر بووە.

٢٥- جەوهر: یاریزانی هەڵبژاردەی هەولێر بووە.

ئەو ڕاهێنەرانەی کە خزمەتی ئەم یارییەن کردووە لە سەرەتاوە، تا ئێستا:-

١- ئەحمەد سەعدوون: پاڵەوانی عێراق و ڕاهێنەری یانەی هێرش بوو، کابرایەکی کورد پەروەر و بەتوانا بووە.

٢- زەید مەحموود: ڕاهێنەری هەڵبژاردەی هەولێر و یانەی بروسک و هەولێر و بنکەکانی وەرزش و لاوان بووە تا ئێستاش لە یەکێتی ناوەندی بۆکسێنی کوردستان بەردەوامە.

٣- مەزۆ لەشکری: یەکەم جار یاریزان بووە ئینجا بۆتە ڕاهێنەری بنکەی وەرزش و لاوانی هەولێر.

٤- عیماد مەحموود: ڕاهێنەری هەولێر و بنکەی وەرزش و لاوانی عینکاوە بووە.

٥- نەجدەت ساڵح: ڕاهێنەری یانەی هەولێر بووە.

٦- ڕەشاد مەحموود عەلی: ڕاهێنەری یانەی کرێکاران بووە.

٧- جەبار عەتشان: ڕاهێنەری یانەی هەولێر بووە.

٨- عەبدولکەریم قاسم: ڕاهێنەری هەڵبژاردەی لاوانی هەولێر بووە.

٩- محەممەد کازم: ڕاهێنەر بووە.

١٠- یاسین: ڕاهێنەری بنکەی وەرزش و لاوان بووە.

١١- کامەران سلێمان: ڕاهێنەری بنکەی وەرزش و لاوانی هەولێر بووە، ماوەیەکی کورت ڕاهێنەری هەڵبژاردەی هەولێر بووە.

١٢- محەممەد تاهیر: ڕاهێنەری بنکەی لاوانی هەولێر و هەڵبژاردەی هەولێر ساڵی ١٩٨٤.

لە مێژووی یاری بۆکسێن لە شاری هەولێر ناحیەی (عینکاوە) ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لە پێشکەوتنی یاری بۆکسێن، هەروەها بنکەی وەرزش لاوانی هەولێر بناغەی یاری بۆکسێنی دامەزراندووە و ڕۆڵێکی باڵای هەبوو بۆ پێگەیاندنی یاریزانانی بۆکسێن.

سەرۆک و ئەندامانی یەکێتی بۆکسێنی شاری هەولێر لە سەرەتاوە تا ئێستا:-

**- ساڵی ١٩٧٨:**

١- مستەفا ئەحمەد محەممەد: سەرۆک

٢- حەربی مەرهون: جێگر

٣- تەحسین خەلیل: سکرتێر

٤- زەید مەحموود عەلی: ئەندام

٥- نەجدەت ساڵح عەبدوڵڵا: ئەندام

**- ساڵی ١٩٧٩ تا ساڵی ١٩٨٥:**

١- عیماد مەحموود

٢- سەلاح نووری

٣- دڵدار حوسێن

٤- زەید مەحموود

**- ساڵی ١٩٨٥:**

١- عەبدولڕەشاد مەحموود

٢- خەلیل ڕەحیم

٣- عیماد مەحموود

٤- محەممەد تەوفیق

٥- حەسەن خدر

لە ساڵی (١٩٨٦)ەوە یەکێتی ئەم یارییە نەما، تەنها سکرتێر هەبوو، کە کاری دەکرد لەگەڵ یەکێتی ناوەندی بۆکسێنی عێراق ئەم بەڕێزانەش ئەمانە بوون:-

١- لە ساڵی ١٩٨٦ - ١٩٩٢ محەممەد تەوفیق.

٢- لە ساڵی ١٩٩٢ - ١٩٩٥ عیماد مەحموود عەلی.

## تۆپی باسکە

یەکەم کەس یاری تۆپی باسکەی دانا (جیمس نایسمش)ی ئەمریکی بوو. لە ساڵی (١٩٣٧) پەرتوکێکی داناوە لەبارەی چۆنیەتی دۆزینەوەی ئەم یارییە. ڕاگری پەیمانگای پەروەردەی وەرزشی کۆلێژی (سیرجنلفیلد) لە ساڵی (١٨٩١) داوای لێ کرد، کە یارییەک بدۆزێتەوە بۆ پڕکردنەوەی کاتی بەتاڵی قوتابیان لە پاش تەواو بوونی وەرزی وەرزشی لە زستان، بەتایبەتی لە هۆڵە داخراوەکان بۆ ئەوەی پارێزگای توانای جەستەی یاریزانان بکات، بەتایبەتی یاریزانانی تۆپی پێی ئەمریکی، هەروەها ئارەزووی قوتابیان لە جوڵە و چالاکی پڕبکاتەوە و ململانێشی تێدا بێ، پاش بیرکردنەوەی (نایسمس) لە بیردۆزی شیتەل و بەیەک گرتنەوە بڕیاری دا، کە دەبێ یارییەکە بەدەست بێ نەک بەپێ.

بەم جۆرە یاری باسکە لە دایک بوو و ناوی باسکەی وەرگرت چونکە یەکەمین گۆڵ سەبەتەی خۆخ بوو، کە بنی گیرا بوو، ئەوەش ناوبژیوانی ماندوو دەکرد بۆ تۆپ هێنانە خوارێ تا بنی سەبەتەکە، کە بنیانیش لێکردەوە بەم جۆرە



تۆپەکە بە خۆی دەهاتە خواردوە، لە ساڵی (١٩٠٤) لە خولی ئۆلۆمپی (سان لویس) تیپی ئەمریکی پێشاندانێکی ئەو یارییەیان کرد بۆ زانین وئاشنا کردنی بە خەڵک.

لە ساڵی (١٩٣٦)، لە خولی ئۆلۆمپی بەرلین ئەم یارییە هاتە ناو پرۆگرامی پێشبڕکێیەکانی ئۆلۆمپیاد لە شاری هەولێر ئەم یارییە لەگەڵ دامەزراندنی قوتابخانەکان بەربڵاوە بۆوە تا سەرەتای شەستەکان لە سەددەی ڕابردوو تەنها لە قوتابخانەکان یاری دەکرا، و چەند کەسانێک لە هەولێر دەستی و درێژیان هەبوو لە پێشخستنی یاری باسکە بە تایبەتی خوالێخۆشبوو مامۆستا (محەمەد سۆفی) کە یاریگایێکی باسکەی لە پشت قوتابخانەی (مەریوان) دروست کرد کە ڕۆژانە بەدەیان یاریزانی لاو یاری و مەشقیان تێدا دەکرد. هەروەها مامۆستا (موحسین خەلیل و ناسح بەننا و سالم جەبار) ڕۆڵیان هەبووە لە پێشخستنی یاری باسکە، تا ساڵانی (١٩٧٣)، کە یەکێتی باسکەی هەولێر دامەزرا. لەسەر دەستی مامۆستا نەمیر نورەدین و دەشتی وەهاب و محەمەد عەبدوڵلا حەسوون) و زۆرانیدیکە سەردەمێکی نوێ دەستپێ کرد، هەروەها بوونی تیپی سەربازی فیرقەی یەک، کە هاتە هەولێر لە ساڵی (١٩٦٦) ئەو کاتە غازی تالب ڕاهێنەریان بوو، چەند یاریزانێکی لاوی دروست کرد لە شاری هەولێر لەوانە.

١- مەهدی جاسم
٢- جاسم نیعمە
٣- عەبدولئەمیر عەتیە

کە ڕۆژانە لە یارێگای بەڕێوەبەرایەتی خۆجێیەتی (الادارە المحلیە) مەشقیان دەکرد، ئەو سەردەمە بووە هۆی پێشکەوتنی یاری باسکە، چونکە لەوانە زۆرانیان گەیشتنە ئاستی هەڵبژاردەی عێراق و چەند یاریزانێکی لاو پەیدا بوون لەو سەردەمە، وەکووو: (نەمیر نورەدین و دەشتی وەهاب و خالید ڕەسوڵ و بورهان ڕەسوڵ و خالس قۆجە و شێرزاد خەلیل و فاروق عەبدولعەزیز و محەمەد مستەفا و شامل مەردان و ئەکرەم حوسێن و سەیفەدین شەریف و جەمال ئەحمەد و جەرجیس ئیبراهیم و یوسف مەنگور و ئەنترانک نیکۆلا و شێرزاد نووری و گەیلان ئیبراهیم و قانع محەمەد).

هەر ئەمانە بوون بە پێشەوای تۆپی باسکە لە هەولێر تا نەوەی نوێ پەیدا بوون لە هەفتایەکان بەربەرە یاری باسکە پێش کەوت پاش دامەزراندنی یانەی هێرش و یانەی هەولێر و تیپی پۆلیس، چونکە تەنها یاری باسکە لە قوتابخانە و هەڵبژاردەی پەروەردە یاری دەکرا. یاریزانەکانی هەڵبژاردەی پەروەردەی هەولێر لە کۆتایی ساڵانی شەست تا ساڵی (١٩٧٣) لە ژێر چاودێری ڕاهێنەران مامۆستا (ناسح بەننا و عەبدولرەحمان تەباخ و سالم جەبار و موحسین خەلیل) بوون.

١- خالید ڕەسوڵ ٢- نەمیر نورەدین ٣- شێرزاد نووری ٤- خالس قۆجە ٥- ئەکرەم حوسێن ٦- گەیلان ئیبراهیم ٧- محەمەد مستەفا ٨- شامل مەردان ٩- فاروق عەبدولعەزیز ١٠- دەشتی وەهاب ١١- سەیفەدین شەریف ١٢- قانع محەمەد ١٣- نیهاد جەمال ١٤- بورهان ڕەسوڵ ١٥- سامی عەبدوڵلا ١٦- شەهاب ئەحمەد ئەمین ١٧- سەرتیپ فاریق ١٨- دلشاد تەحسین ١٩- شوان تەلعەت ٢٠- سەعدی فەتاح ٢١- هوشیار عەبدولرەحمان ٢٢- محەمەد مستەفا ٢٣- سالم جەبار ٢٤- شەهید ملازم جەمال ئەحمەد ٢٥- نەریمان

عەبدولفەتاح
ئەم یاریزانانە تا ساڵی (١٩٧٣) لە سەر ئاستی هەولێر و هەڵبژاردەکانی پەروەردە یاریان دەکرد.

لە ناوەراستی ساڵی هەفتایەکان مامۆستا (قانیعە مەحموود عەلاف و عالیە مەحموود) رۆڵێکی گرنگیان هەبوو بۆ پەیدا کردن و پێراگەیاندنی یاریزانی کچ لەسەر ئاستی هەڵبژاردەی پەروەردە و ئینجا هەڵبژاردەی هەولێر لەگەڵێک یاریدا و لەمانە یاری تۆپی باسکە).

لە دوای ساڵی (١٩٧٣)ەوە ئەم یارییە ئاستێکی ئەوتۆی نەبووە، کە باس بکرێت تا ساڵی (١٩٧٧)، کە یەکەمین یەکێتی تۆپی باسکە بەشێوەیەکی (فەرمی) دامەزرا، لەو کاتەدا هەنگاوێکی نوێی تۆپی باسکە دەستی پێ کرد بەدانانی راهێنەر و تیپی هەڵبژاردەی هەولێری کچان و کوران، کە یاریزانەکانی هەڵبژاردەی هەولێر لەم یاریزانانە پێکهاتبوون:

١- دلزار جەلال ٢- ئازاد رەشید ٣- سامی سەعید ٤- رەمزی خدر ٥- شوان تەلعەت ٦- خالید رەسوڵ ٧- سەردار حەیدەر ٨- هەلکۆ فەتاح ٩- فوئاد عوبەید ١٠- عادل عەبدوڵلا ١١- دارا بایز ١٢- حاجۆ شەریف ١٣- شوان حافز ١٤- رزگار سەرسۆر ١٥- رەمزی خدر ١٦- دلێر رەسوڵ ١٧- مەعرووف محەمەد سالح

ئەم تیپە لە ژێر چاودێری هەردوو راهێنەر (نەمسیر نورەدین و محەمەد عەبدوڵلا حەسوون) دا بوون.

وە هەڵبژاردەی هەولێر لە تیپی باسکەی ئافرەتان لەم یاریزانانە پێکهاتبوو لە ژێر چاودێری راهێنەر مامۆستا (مەهدی محەمەد سالح)بوو:

١- وەلادە داود ٢- وەهبیە محەمەد ٣- شلێر سەید ئەحمەد ٤- ئاوربنگ سابیر ئەسعەد ٥- سامیە محەمەد ٦- مریەم هورمز ٧- هەنا وادی ٨- ماجدە خدر ٩- بەیان محەمەد ١٠- سەلوا ئەحمەد ئەمین ١١- نەرمین بەهجەت ١٢- باسیمە حەننا ١٣- گولسەران ئەحمەد ١٤- پەروین عەبدولرەحمان ١٥- مونیرە عومەر

ئەم تیپە چەند دەستکەوتێکی باشی بەدەست هێنا لە سەرەتادا و ئاستێکی بەرزیان هەبوو، بەڵام بەداخەوە تەمەنیان درێژ نەبوو لە ناو یاریگا، ئەویش لەبەر بایەخ نەدان بەوەرزشی ئافرەت و کەمی بەشداربووان و چەند هۆیەکی کۆمەڵایەتی.

هەڵبژاردەی هەولێری کوران، کە لە ساڵی (١٩٧٧) دامەزرا، کە ناومان هێنان تا ساڵی (١٩٨٢) ئەم یاریزانانە یاریان دەکرد و لەم ماوەیەدا، کە دەکاتە ساڵی (١٩٧٧ تا ساڵی ١٩٧٩) یەکێتی باسکەی هەولێر هەڵسا بە دامەزراندنی تیپی (مینی باسکت) تۆپی باسکەی بچووک لە ژێر چاودێری هەردوو راهێنەر (موحسین خەلیل) و (حەسیب ئەنوەر) و ئەم هەڵبژاردەیە ئاستێکی زۆر بەرزی هەبوو و توانی بۆ ماوەی سێ ساڵ پلەی یەکەم لەسەر ئاستی عێراق بەدەست بهێنن، کە یاریزانەکان ئەمانە بوون:-

١- نەوزاد عەزیز
٢- دلشاد عەزیز
٣- دلێر تاهیر
٤- فاروق ئیبراهیم
٥- نەجمەدین خدر
٦- فەیسەل جەوهەر
٧- عیماد عادل
٨- حەکیم خالید
٩- دلێر رەسوڵ
١٠- دلێر خدر

ساڵی (١٩٨٤) شاری هەولێر دوو تیپی باسکەی هەبوو:

١- تیپی یانەی برایەتی
٢- تیپی بنکەی وەرزش و لاوانی هەولێر

تیپی یانەی برایەتی راهێنەرەکەی (خالید رەسوڵ) بوو، کە یاریزانەکان ئەمانە بوون:-

١- نەوزاد عەزیز ٢-دلشاد عەزیز ٣- حەکیم خالید ٤- دیار محەمەد سۆفی ٥- دلێر رەسوڵ ٦- فاروق ئیبراهیم ٧- فەیسەل جەوهەر ٨- مەکسیم نەجیب ٩- شێرزاد محەمەد رەشید ١٠- عەبدولخالق عەبدولقادر ١١- شێرزاد عومەر ١٢- دلێر تاهیر ١٣- فوئاد عوبێد ١٤- رەمزی خدر ١٥- نەجمەدین خدر ١٦- دلێر رەسوڵ ١٧- سەردار حەیدەر ١٨- رزگار بەکر ١٩- شەریف قادر ٢٠- شوان حافز

هەردوو یاریزان (سەردار حەیدەر و دلێر رەسوڵ) لەم ماوەیەدا بانگهێشت کران بۆ هەڵبژاردەی لاوانی عێراق، وەکوو یاریزان و یاریزان (دلێر رەسوڵ) بەشداری لە

پاڵەوانێتی لاوان لە دەرەوەی عێراق لە وڵاتی یوغسلافیا ساڵی (١٩٨٤) کرد، ئەم تیپە لە یاری کردن تا ساڵی (١٩٩٠) بەردەوام بوو.

تیپی بنکەی وەرزش و لاوانی هەولێر لە ژێر چاودێری هەردوو راهێنەردا بوون، ئەویش (شێخ حەسیب بەرزنجی و سالم جەبار) بوون، کە یاریزانەکان ئەمانە بوون:-

١- سابیر سەعید ٢- مەسعوود عەبدوڵڵا ٣- جەعفەر محەمەد ٤- فوئاد مامەند ٥- کامەران عومەر ٦- ئیبراهیم حەسەن ٧- رۆستەم محەمەد ٨- خالید نورەدین ٩- نەجات مامەند ١٠- سەمەد ئەسعەد ١١- دلێر خدر ١٢- شەریف قادر ١٣- ئەرجمان تەحسین

ئەم تیپە ساڵی (١٩٨٦) بوون بە یاریزانەکانی یانەی وەرزشی (هەولێر) لە ژێر چاودێری راهێنەران (خالید رەسوڵ) و (سامی سەعید). هەروەها ساڵی (١٩٧٩ تا ساڵی ١٩٨٢) بنکەی وەرزش و لاوانی هەولێر هەڵبژاردەی باسکەی هەبوو لە ژێر چاودێری راهێنەر مامۆستا (ناسح بەننا)، کە یاریزانەکانی ئەمانە بوون:

١- سەردار عەزیز
٢- نەجات مامەند
٣- دلێر تاهیر
٤- ئەبو زێد مەعرووف
٥- شێرزاد عەزیز
٦- شاکر عەبدولکەریم
٧- عەبدوڵڵا سەرسۆر
٨- فاروق ئیبراهیم
٩- سەباح

ساڵی ١٩٩٢ شاری هەولێر دوو تیپی یاری باسکەی کوڕانی هەبوو:-

١- تیپی باسکەی یانەی برایەتی.
٢- تیپی باسکەی یانەی هەولێر.

تیپی باسکەی یانەی برایەتی لەم یاریزانانە پێکهاتبوو لە ژێر چاودێری راهێنەر (سالم جەبار).

١- دلێر رەسوڵ ٢- شوان رەحمان ٣- سەباح مەولوود ٤- ئیسماعیل ئیبراهیم ٥- شێرزاد عومەر ٦- مەسعوود عەبدوڵڵا ٧- شێرزاد ئەحمەد ٨- فەیسەل جەوهەر ٩- خالید نورەدین ١٠- دلێر خدر ١١- موئەیەد جەمیل ١٢- سیروان کەریم

ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٩٤) توانی پلەی یەکەم لە خولی یانەکانی کوردستان بە دەست بهێنێت.

لە ساڵی (١٩٩٦) بەشداری لە پاڵەوانێتی خولە یانە پلە دووەکانی عێراق کرد لە پالاوتنی کۆتایی لە شاری (بەغدا) و نەیتوانی سەرکەوێ بۆ ئاستی یانە پلە یەکەکانی عێراق.

ساڵی (١٩٩٢) تیپی باسکەی یانەی هەولێر پلە سێ بووە لە سەر ئاستی یانەکانی عێراق، دوای ئەنجامدانی پاڵەوانێتی یانەکانی پلە سێی عێراق، کە لە شاری (رەمادی) ئەنجام درا تیپی یانەی هەولێر بە پلەی یەکەم سەرکەوت بۆ ریزی پلە دووی یانەکانی عێراق لە ژێر چاودێری راهێنەر (خالید رەسوڵ)، یاریزانەکانی ئەم تیپە ئەمانە بوون:-

١- فاروق ئیبراهیم ٢- شێرزاد محەمەد رەشید ٣- شەریف قادر ٤- فازل عەباس ٥- دەرباز جەلال ٦- حازم کازم ٧- رزگار بەکر ٨- سەردار عەزیز ٩- رۆستەم محەمەد ١٠- فەرهاد ١١- نەوزاد عەزیز ١٢- نەزار ١٣- دلێر تاهیر ١٤- هەڤال عەبدوڵڵا

ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٩٣) بەشداری لە خولی یانە پلە دووەکانی عێراق کرد، و لە هەمان ساڵدا ئەم تیپە لە یانەی هەولێر تا ئێستا نەما.

لە ساڵی (١٩٩٥) یانەی ئاسۆ تیپی باسکەی کوڕانی دامەزراند لە ژێر چاودێری راهێنەر (رزگار بەکر) بوو، کە یاریزانەکان ئەمانە بوون:

١- حازم کازم ٢- شوان رەحمان ٣- حەسەن سوبحی ٤- شێرزاد عومەر ٥- هەڤال عەبدوڵڵا ٦- مەسعوود عەبدوڵڵا ٧- شێرزاد ئەحمەد ٨- دلێر خدر ٩- سیروان کەریم

ئەم تیپە لە سەرەتاوە دەستی بە چالاکی کرد لەسەر ئاستی هەولێر و کوردستان ئینجا بۆ ساڵی (١٩٩٧) بەشداری کرد لە خولی یانە پلە دووی عێراق، کە لە شاری کەرکوک ئەنجام درا توانی بە پلەی یەکەم سەرکەوێ بۆ خولی پلە یەکی عێراق.

ساڵی (١٩٩٢) کە یانەی ئەکاد لە شاری هەولێر دامەزرا (شارۆچکەی عەینکاوە) تیپی باسکەشی دامەزراند، کە ئەم تیپە لە ژێر چاودێری راهێنەر (موئەیەد سلێوە شابۆ) بوو و یاریزانەکانی ئەم تیپە، ئەمانە بوون:-

١- گوهدار حەبیب ٢- ساهر یوسف فردنسی ٣- هەژار مەتی ٤- زیاء حەبیب هورمز ٥- سەرمەد پۆلس برادۆستی ٦- لیدن سەلاح خدر ٧- لەیس لەتیف گلیانا ٨- سامان ناسر یوسف ٩- ئەسیر مەرقەس ١٠- فورات سەلیم مەتی ١١- ئیڤان یوسف ١٢- سوڤان یوسف ١٣- سروود سەبری توما ١٤- نەشوان شەمعون

ئەم تیپە تا ساڵی (١٩٩٨) هیچ چالاکییەکی وای نەبووە، کە باس بکرێت بۆ ساڵی (١٩٩٩-٢٠٠٠) ئەم تیپە بەشداری لە پاڵەوانێتی یانە پلە یەکەکانی عێراق کرد (لە ژێر چاودێری راهێنەر خالید رەسوڵ).

ساڵی (١٩٩٦) یانەی ئەکاد تیپی باسکەی ئافرەتان لە ژێر چاودێری هەردوو راهێنەر (فوئاد سەراج و فورات سەلیم) دامەزراند یاریزانەکانیش ئەمانە بوون:-

١- رەجوە عەبدولئەحەد
٢- سلڤانا نەجیب
٣- لانا سالم
٤- دینا یەلدا
٥- ئاڤان لازار
٦- لانا گورگیس
٧- سوزان حەننا
٨- فلورین گورگیس
٩- سولین جەمال
١٠- ئان حەبیب

ئەم تیپە رۆڵێکی گرنگی هەبوو لە پێشخستنی باسکەی ئافرەتان لە شاری هەولێر لە ساڵی (١٩٩٨ تا ساڵی ٢٠٠٤) ئەم تیپە لەسەر ئاستی یانەکانی کوردستان پلەی یەکەمی بەدەست هێنا.

لە ساڵی (١٩٩٩) یاریزانی نوێ پەیدا بوون لەم



تیپەدا کە ئەمانە بوون:-

١- نەدا گورگیس
٢- لینا گورگیس
٣- هەنا غازی
٤- لیڤین جەبار
٥- جوان عەباس

راهێنەرەکانی ئەم تیپە لە سەرەتای دامەزراندنییەوە تا ئێستا ئەمانەن:-

١- فوئاد سەراج
٢- فورات سەلیم
٣- دلێر رەسوڵ
٤- تاریق ئیلیاس
٥- یونس نەواف

راهێنەرەکانی یاری تۆپی باسکە لە شاری هەولێر لە سەرەتاوە تا ئێستا ئەمانەن:-

١- عەزیز مەولوود ٢- نووری ئەمین ٣- ناسح عەبدوڵڵا ٤- موحسین خەلیل ٥- مەهدی محەمەد ساڵح ٦- محەمەد عەبدوڵڵا حەسوون ٧- نەمیر نورەدین ٨- خالید رەسوڵ ٩- حەسیب ئەنوەر ١٠-ئازان شەریف ١١- سەرتیپ فاریق حەسەن ١٢- سەردار حەیدەر ١٣- دلێر رەسوڵ ١٤- سالم جەبار ١٥- شوان تەلعەت ١٦- سامی سەعید ١٧- رەمزی خدر ١٨- شوان حافز ١٩- عەبدولخالق عەبدولقادر ٢٠- عەبدولعەزیز جەوهەر بابە ٢١- حازم کازم ٢٢- رزگار بەکر ٢٣- فازل عەباس ٢٤- شەریف قادر ٢٥- شاکر ئیسماعیل ٢٦- بێزار سەفین ٢٧- ئیسماعیل ئیبراهیم ٢٨- دلێر تاهیر ٢٩- دلێر خدر ٣٠-لاوەند قەرەنی ٣١- موئەیەد سلێوە شابۆ ٣٢- هەژار مەتی مروگی ٣٣- شەریف قادر ٣٤- نەبیل عەبدوڵڵا ٣٥- تاریق ئیلیاس ٣٦- سوبحی فاروق سوبحی

ناوبژیوانانی یاری تۆپی باسکە لە شاری هەولێر لە سەرەتاوە تا ئێستا:-

١- ناسح عەبدوڵڵا بەننا ٢- عەبدولرەحمان تەباخ ٣- فوئاد عوبێد ٤- مەهدی محەمەد ساڵح ٥- سەلاح حەسەن خەسرۆ ٦- شاکر حەمەد ٧- خەسرۆ بەکر ساڵح ٨- شوان تەلعەت ٩- ئازان شەریف ١٠- دەشتی شەهاب وەهاب ١١- عەبدولعەزیز جەوهەر هەرووتی ١٢- فاروق

عەبدولعەزیز ١٣- سابیر سەعید ١٤- تەحسین عەلی ١٥- شۆڕشڤان نامیق ١٦- رزگار مەجید ١٧- لوقمان ئەحمەد ١٨- مەسعوود رەشاد ١٩- شەمال عەبدوڵڵا ٢٠- ئازاد عەبدولرەحمان ٢١- فەرهەنگ سابیر ٢٢- رەحمان ئەحمەد

سەرۆک و ئەندامانی یەکێتی تۆپی باسکەی هەولێر لە سەرەتاوە تا ئێستا:-

**- ساڵی ١٩٧٢:**

١- محەمەد سۆفی

٢- ناسح عەبدوڵلا

٣- عەبدولجەبار مەیاحی

٤- ئەمجەد مستەفا

**- ساڵی ١٩٧٥:**

١- محەمەد سۆفی

٢- نەمیر نورەدین

٣- ناسح عەبدوڵلا

٤- عالیە مەحموود

**- ساڵی ١٩٧٦:**

١- نەمیر نورەدین

٢- ناسح عەبدوڵلا

٣- یاسین تاهیر

٤- دەشتی وەهاب

**- ساڵی ١٩٧٧:**

١- محەمەد سۆفی

٢- دەشتی وەهاب

٣- مەهدی محەمەد ساڵح

٤- عالیە مەحموود

٥- نەجم عەبدوڵلا

**- ساڵی ١٩٨١:**

١- شوان تەلعەت

٢- بورهان رەسوڵ

٣- فوئاد عوبێد

٤- دلزار جەلال

**- ساڵی ١٩٨٥:**

١- محەمەد سۆفی

٢- شاکر محەمەد

٣- شوان تەلعەت

٤- گورگیس عیسا

**- ساڵی ١٩٨٦:**

١- محەمەد سۆفی

٢- شاکر حەمەد

٣- ئیسماعیل عەدۆ

**ساڵی ١٩٨٨ تا ١٩٩١**

١- محەمەد سۆفی

٢- شاکر حەمەد

٣- شوان تەلعەت

**لە ساڵی ١٩٩٢ یەکێتی تۆپی باسکە نەما تا ساڵی ١٩٩٤:**

**ساڵی ١٩٩٤ تا ساڵی ١٩٩٦**

١- شوان تەلعەت

٢- بورهان رەسوڵ

**ساڵی ١٩٩٧ تا ساڵی ٢٠٠٣**

١- سامی سەعید

٢- خالید رەسوڵ

٣- عەبدولعەزیز جەوهەر

٤- موئەیەد سلێوە

## یارییەکانی گۆڕەپان و مەیدان

وەکو، لە مێژوو باس دەکرێت کە مرۆڤ هەر لە سەردەمی چەرخی بەردی و کاتی پەیدا بوونی یاری کردووە، بۆ ئەوەی ئەو وزەیەی لە لەشی دەری بکات، بە گوێرەی بیردۆزی وزەی زیاد (نظریە الگاقە الزائدە) جگە لەمەش مرۆڤ پێویستی بە کات رابواردن و یاری هەیە، هەر لە سەرەتای ژیانی پێویستی بە وەرزش هەبوو بۆ پەیدا کردنی بژێوی ژیانی رۆژانەی لە ڕاو کردن و بازدان و راکردندا بوون و بەرەبەر بۆ رابواردن پێشبرکێیان، دەکرد و ئەو پێشبرکێیانە پەرەی سەند و رێکخستنی بەخۆوە دیت تا ئەو کاتەی ئۆلۆمپیادی کۆن لە ساڵی (٧٧٦ پ. ز) پەیدا بوو.

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم ساڵی (١٨٩٦) ئۆلۆمپیادی نوێ دەستی پێ کردەوە لە سەر دەستی (دی کۆبرتانی) فەرەنسی و یەکەم خولی لە یۆنان بەڕێوە چوو.

لە عێراق لەگەڵ دامەزراندنی حکومەتی عێراق لەسەرەتای بیستەکان لە قوتابخانەکان و ئۆردووگاکانی



سوپای عێراق ئەم یارییە دەكرا وەكوو فستیڤالی سالانە تا سالی (١٩٤٨)، كە یەكێتی گۆڕەپان و مەیدانی عێراق دامەزرا و هەر لەو كاتە ئەو یاریانە لە عێراق پەرەی سەند.

سەرەتای دەست پێ كردنی یارییەكانی گۆڕەپان و مەیدان لە شاری هەولێر دەگەڕێتەوە بۆ پاش دامەزراندنی حكومەتی عێراق لە سالی (١٩٢١)، پاش دامەزراندنی دائیرەی مەعارف، كە سەرپەرشتی قوتابخانەكانی دەكرد و لە ناو چالاكی سالانەی قوتابخانەكان سالێ جارێك لە بەهاران فستیڤالیكی قەشەنگیان ساز دەكرد بۆ یارییەكانی گۆڕەپان و مەیدان، بەم ڤیستیڤالەیان دەووت (ئیستعراج) هەر چەندە ئەم ڤیستیڤالە یارییەكانی گۆڕەپان و مەیدانی دەگرتەوە بەلام زیاتر بۆ ڤیستیڤال بوونە بۆ یاری كردن و بەدەست هێنانی دەستكەوت و پێشخستنی یارییەكانی گۆڕەپان و مەیدان، هەروەها پاش دامەزراندنی سوپای عێراق سالانە سوپا لە نۆردییەكانیاندا فستیڤالی گۆڕەپان و مەیدانیان رێک دەخست تا سالانی (١٩٥٦)، پاش دروست كردنی یاریگای خۆجێیەتی (شەهید فرەنسۆی) ئێستا بۆ یەكەمین جار لە سالی (١٩٥٧)، فستیڤالیكی گەورە لە یارییەكانی گۆڕەپان و مەیدان، بۆ هەموو قوتابخانەكانی سەر بە پارێزگای هەولێر بەڕێوە چوو بەم جۆرە بەردەوام بوو كە تەنها سالانە ئەم ڤیستیڤالە ئەنجام دەدرا.

لە سەرەتای دەست پێكردنی یارییەكانی گۆڕەپان و مەیدان زۆران كەس خزمەتی ئەم یارییەیان كردووە لە رووی رێكخستن و پێشخستن، یاخود یاریزان بوونە لە سەر ئاستی قوتابخانەكانی شاری هەولێر لەم كەسانە:-

١- عەزیز فەتاح ٢- كەمال تەیب ٣- عەلی حەمالی ٤- عەلی حوسێن كەسرە ٥- موئەیەد حوسێن كەسرە ٦- حەیدەر عوسمان ٧- عەزیز مەولوود ٨- نەزیف عەبدولكەریم ٩- ئەحمەد ناجی ١٠- مەعرووف عەبدوللا ١١- داود محەمەد ١٢- عەزیز عەدۆ ١٣- شەعلان حوسێن كەسرە ١٤- حاجی خورشید ١٥- ناسح رەشید

لە سەرەتای سالانی پەنجایەكان یاریزانەكانی ئەم یارییە ئەمانە بوون:-

١- رەفیق مستەفا
٢- بەكر عوسمان
٣- عەساف نادر
٤- حاجی خورشید
٥- زیاء ئیبراهیم
٦- ئیسماعیل حەیدەر
٧- محەمەد عەزیز

دوای دامەزراندنی یانەی بروسک سالی (١٩٥٦) یاریزانەكانی ئەو كاتەی یارییەكانی گۆڕەپان و مەیدان، ئەمانە بوون:-

١- رەمزی وەلی عەلی
٢- ئیسماعیل عەدۆ
٣- یوسف شێخیل
٤- كەریم عەبدوللا
٥- محەمەد مەلا
٦- محەمەد محیەدین
٧- یونس عەلی مەحموود
٨- سولتان مەردان
٩- وەعدوللا شەریف
١٠- فەتحی خەلیفە

لە سالەكانی (١٩٦٠ - ١٩٦٥) یاریزانی نوێی ئەم یارییە پەیدا بوون:-

١- فاروق عەبدولعەزیز
٢- شێرزاد نووری
٣- سالم جەبار
٤- سەلاحەددین سەید ئەحمەد
٥- غازی عەبدوللا
٦- خالید رەسوڵ
٧- سەباح عەونی

٨- سەید عەلی
٩- سەیفەدین شەریف
١٠- هۆشەنگ سەید ئەحمەد
١١- نەوزاد محەمەد تەیب
١٢- مەحموود چەلەبی

دوای سالەکانی (١٩٦٥ - ١٩٧٥) یاریزانیدیکە پەیدا بوون، کە بەشدارییان لە یارییەکانی گۆڕەپان و مەیدان دەکرد لە فستیڤالی قوتابخانەکانی شاری هەولێر و هەندێکیان بەشداریان لە پالەوانی پەروەدەکانی عێراق دەکرد، کە ئاستیان بەرز بوو لە هەندێک یاریدا، ئەویش وەکوو یاریزان.

١- جەبار یاسین کە لە سالی ١٩٧٣ توانی لەسەر ئاستی پەروەردەکانی عێراق پلەی دووەم بەدەست بهێنێت لە یاری هەلدانی قورسایی و ساب هاویشتن. و ئەم یاریزانە بەباشترین یاریزانی ئەو کاتەی یارییەکانی گۆڕەپان و مەیدان دەژمێردرێت لە شاری هەولێر.

٢- سەرکار عەزیز توانی پلەی سێیەم لە سەر ئاستی پەروەردەکانی عێراق بەدەست بهێنێت لە یاری بازی بەرز، ئەم یاریزانە لەگەل یاریزان (جەبار یاسین) لەم ماوەیەدا توانیویانە لە سەر ئاستی پەروەردەکانی عێراق پلەی دووەم و سێیەم بە دەست بهێنن و لەگەل ئەم یاریزانانە یاریزانیدیکەیش هەبوون، لەم ماوەیەدا کە دەکاتە پاش سالانی (١٩٦٥ هەتا سالانی ١٩٧٥):-

١- نەریمان عەبدولحەمید ٢- شەهاب ئەحمەد حەلاق ٣- فوئاد محەمەد مەجید کەبابچی ٤- سەدیق سەعید ٥- عەبدوللا ئەحمەد ٦- عوسمان عەزیز ٧- سەید یونس ٨- مەزۆ لەشکری ٩- عەلی حوسێن ١٠- خالس قۆچە ١١- عەلی رەسول ١٢- شێردل تەحسین ١٣- دلشاد تەحسین ١٤- سەردار حەیدەر ١٥- هۆشیار عەبدولرەحمان

دوای سالانی (١٩٧٥) بۆ سالی (١٩٧٨) بۆ یەکەمین جار یەکێتی گۆڕەپان و مەیدانی شاری هەولێر لە ژێر بالی نوێنەرایەتی ئۆلۆمپی عێراق لە هەولێر دامەزرا، کە لەم بەرێزانە پێکهاتبوو:-

١- فوئاد محەمەد مەجید / سەرۆکی یەکەمین یەکێتی گۆڕەپان و مەیدانی شاری هەولێر.
٢- سلێوە ئەللاوێردی/ جێگری سەرۆک
٣- سەرتیپ فاریق حەسەن / سکرتێر
٤- شەهاب ئەحمەد / دارایی
٥- هوشیار عەبدولرەحمان / ئەندام
٦- عەلی عەناد / ئەندام
٧- سمکۆ ئیبراهیم / ئەندام

لێرەدا سەردەمی نوێ دەستی پێ کرد بۆ دانانی تیپی هەمیشەی و دەست نیشان کردنی راهێنەران و تۆمار کردنی ناوی یاریزانان و دەست بە مەشقکردن و بەشداری کردن لە پێشبڕکێیەکانی عێراق و دەرەوە، راهێنەرەکانی ئەم کاتە ئەمانە بوون:-

١- فوئاد محەمەد مەجید
٢- فاروق عەبدولعەزیز
٣- شەهاب ئەحمەد ئەمین

یاریزانەکانی ئەو سەردەمە ئەمانە بوون، کە سەرەتای دەست پێ کردنی یارییەکان و مەشقکردنی بەشێوەیەکی هونەری و زانستی دەستپێکرا:-

١- جەبار یاسین ٢- رەعد عەبدوللا ئەسکەندەر ٣- رێنجبەر ئەکرەم رەشید ٤- عەبدوللا کەریم دەرویش سەلیم ٥- سەید ئەحمەد عومەر ٦- سەرتیپ عەبدولحەمید ٧- عەهدی عەلی حوسێن کەسرە ٨- موعین عارەب ٩- پشکۆ عەبدولخالق ١٠- کەریم حەسەن ١١- سەلاح نووری ١٢- ئەمیر محەمەد قادر ١٣- وریا جەلال ١٤- فوئاد مەجید ١٥- سەلاح تاهیر ئیسماعیل ١٦- زاهیر ئیبراهیم ١٧- مەریوان عەدنان ١٨- غازی عوسمان ١٩- حەمید سالح ٢٠- حوسێن عەلی ٢١- سالم قادر ٢٢- سەلاح نووری ٢٣- کەریم عوسمان ٢٤- ئازاد محەمەد عەلی ٢٥- ئەبوبەکر کەرکووکی ٢٦- دەسکۆ حەسەن خەسرۆ

ئەم سەردەمە کە دەکاتە سالانی (١٩٧٧ - ١٩٨٢) دەتوانین بلێین بە باشترین سەردەمی پێشکەوتنی یارییەکانی گۆڕەپان و مەیدان دادەنرێت، ئەویش وەکوو بەدەست هێنانی دەستکەوت.

لە سەر ئاستی عێراق و دەرەوە و لەم یاریزانانەی، کە ئەو کاتە ناوبانگیان دەرکرد لەم یارییەدا:-

١- جەبار یاسین: ئەم یاریزانە پێشتریش کە دەکاتە سالانی (١٩٧٢ - ١٩٧٤) بەشداری لە یاری هاویشتنی (قورسایی) کردووە لە سەر ئاستی پەروەردەکانی عێراق و

پلەی دووەمی بەدەست هێناوە. ئینجا بۆ سالّی (١٩٧٩) توانی لەسەر ئاستی عێراق لە پالّەوانێتی نەقابەی مامۆستایان پلەی یەکەم بەدەست بهێنێت لە هەلّدانی قورسایی، و لە سالّی (١٩٨٢) کاتێک کە خزمەتی سەربازی دەکرد لەوێش توانیویەتی ئەنجامی باش لەسەر ئاستی سوپای عێراق و یانەکانی عێراق بەدەست بهێنێت.

٢- یاریزان رەعد عەبدوللا ئەسکەندەر: ئەم یاریزانە لە سەرەتای سالآنی (١٩٧٨)وە توانی ئەنجامی باش لە سەر ئاستی عێراق و لاوانی عێراق بەدەست بهێنێت، ئەوەبوو لە سالّی (١٩٧٩) توانی لە یاری بازدانی بەرز پلەی یەکەم لە سەر ئاستی پەروەردەکانی عێراق بەدەست بهێنێت و توانی لە هەمان سالّدا بەشداری لە پالّەوانێتی پەروەردەکانی عەرەبی بکات و پلەی سێیەمی لەسەر ئاستی ولآتە عەرەبییەکان بەدەست هێنا. لە ولآتی (سۆمال)، و بۆ سالّی ١٩٨٠، سالّی (١٩٨١) دوو سالّ لەسەر یەک توانی پلەی یەکەم لە هەلّدانی بەرز لە سەر ئاستی پەروەردەکانی عێراق بەدەست بهێنێت و دەتوانی ژمارەیەک تۆمار بکات ئەویش (٩٧.١)م کاتێک کە سەربازیش بووە توانیویەتی گەلێک دەستکەوتی چاک بەدەست بهێنێت لەسەر ئاستی یانەکان و سوپای عی

٣- یاریزان رەنجبەر ئەکرەم رەشید: ئەم یاریزانە توانیویەتی سالّی (١٩٧٩) پلەی یەکەم لە سەر ئاستی لاوانی عێراق لە هاویشتنی (رم) بەدەست بهێنێت ئینجا بۆ سالّی (١٩٨٠) توانیویەتی لە سەر ئاستی عێراق لە دوو یاریدا بەشداری بکات، ئەویش هاویشتنی رم هەلّدانی قورسایی توانیویەتی پلەی دووەم لەسەر ئاستی پەروەردەکانی عێراق بەدەست بهێنێت.

بۆ سالّی (١٩٨١) لە سێ یاریدا لەسەر ئاستی پەروەردەکانی عێراق بەشداری کردووە، ئەویش هەلّدانی (قورسایی و رم و ساب) توانیویەتی پلەی یەکەم بەدەست بهێنێت و نازناوی (پالّەوانی گۆڕەپان و مەیدانی لە سەر ئاستی عێراق وەرگرتووە)، لە هەمان سالّدا لە هەلّبژاردەی نیشتمانی عێراق وەکوو یاریزان وەرگیراوە و دەستنیشان کراوە بۆ بەشدار بوون لە پالّەوانێتی لاوانی جیهان، کە لە ولآتی (مەکسیک) ئەنجام درا. ئەم یاریزانە کاتێک کە قوتابی زانکۆ بووە لە ولآتی (ئوردن) لەوێش لە ریزی یاریزانەکانی هەلّبژاردەی ئوردن یاریزان بووە و بەشداری لە پالّەوانێتی پەیمانگا و زانکۆکان کردووە و سێ سالّ لەسەر یەک لە سێ یاریدا پلەی یەکەمی بەدەست هێناوە نازناوی (پالەوانی گۆڕەپان و مەیدانی) بۆ هەر سێ سالّ وەرگرتووە ئەو ژمارانەی کە تۆماری کردوون لە یارییەکانی هەلّدانی رم (١٧.٥٧)، هەلّدانی قورسایی (٩٧.١٤ م) بووە.

٤- یاریزان سەلاح نووری: توانی پلەی دووەم لە پالّەوانێتی نەقابەی مامۆستایان سالّی ١٩٨١ بەدەست بهێنێت، کە لە شاری بەغدا کرا.

٥- یاریزان عەبدوللا کەریم: ئەم یاریزانەش یاریزانی بازی بەرز بووە و لە سالّی (١٩٧٩) پلەی سێ یەمی لەسەر ئاستی پەروەردەکانی عێراق بەدەست هێناوە، لەم یارییە دا کاتێک کە سەرباز بووە ئەنجامی باشی بەدەست هێناوە.

٦- سەید ئەحمەد عومەر: ئەم یاریزانە یاریزانێکی لێهاتوو بووە لە گەلێک یاری لە یارییەکانی گۆڕەپان و مەیدان، لەمانەش (هاویشتنی رم)، کە سالّی (١٩٧٧) توانی پلەی یەکەم لەسەر ئاستی لاوانی عێراق بەدەست بهێنێت.

٧- یاریزان مەریوان عەدنان: ئەم یاریزانەش پلەی سێیەمی بەدەست هێناوە لە پالّەوانێتی لاوانی عێراق لە یاری (بازدانی بەرز) سالّی (١٩٧٧)، کە لە شاری بەسرە ئەنجام درا.

٨- یاریزان غازی عوسمان: ئەم یاریزانە لە راکردنی دوور گەلێک ئەنجامی باشی بەدەست هێناوە لەسەر ئاستی عێراق و سوپای عێراق کاتێک کە سەرباز بووە.

پاش دەست پێ کردنی شەڕی نێوان عێراق و ئێران یاری گۆڕەپان و مەیدان بەرەو کزی چوو دوای سالآنی (١٩٨٣) و پاش گۆڕینی سەرۆک و ئەندامانی یەکێتی گۆڕەپان و مەیدانی شاری هەولێر، دەتوانین بلّێین تەنها لە سەر ئاستی قوتابخانە و پەروەردەکانی عێراق چالاکی مابوو، تا سالّی (١٩٨٦) یانەی برایەتی تیپی یارییەکانی گۆڕەپان و مەیدانی لە ژێر چاودێری راهێنەر مامۆستا (سەرتیپ فاریق) دامەزراند لەو کاتەدا ئەم راهێنەرە توانی تیپێک بۆ گۆڕەپان و مەیدانی هەلّبژاردەی هەولێر و یانەی (برایەتی) دروست بکات، کە یاریزانەکانی ئەو کاتە ئەمانە بوون:

١- شوان مەجید

